ژیانی ئەمیری باوەڕداران
خەلیفەی دووەم

# عومەری کوڕی خطاب

خوا لێی ڕازی بێت

نووسینی
دکتۆر علی محمد الصلابی

وەرگێڕانی
عفان شێخ صدیق سەرگەتی



دار المعرفة
بەیرووت

ژیانی ئەمیری باوەڕداران

خەلیفەی دووەم

# عومەری کوڕی خطاب

خوا لێی ڕازی بێت

نووسینی

دکتۆر علی محمد الصلابی

وەرگێڕانی

عفان شێخ صدیق سەرگەتی

ناریـن

دار المعرفة
بەیـرووت

ناوی کتێب بەعربـــی: سيرة أمير المؤمنين عمر بن خطاب شخصيته و عصره
نوسینـــــــــــــی: د. علي محمد الصلابي
ناوی کتێب بە کـوردی: ژیانی ئەمیری باوەڕدان ـ خەلیفەی دووەم ـ عومەری کوڕی خطاب
وەرگێڕانــــــــــی: عفان شێخ صدیق سەرگەتی
بلاوکار کتێبخانەی نارین
نەخشەسازی نـاوەوە: شنۆ حمدامین مجید
نۆرە و ساڵی چـــاپ: یەکەم/ ١٤٣٠ك ـ ٢٠٠٩ز

**کتێبخانەی نارین**

هەولێر ـ چوارڕیانی شێخ مەحمودی حەفید

بازاڕی زانست بۆ کتێب وچاپەمەنی

تەلەفۆن : ٢٥١١٩٨٢-٦٦(٠٠٩٦٤)

E- mail: nareen_١@yahoo.com

# پێشەکی

إنّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرر انفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، أشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ (ال عمران: ١٠٢).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾(النساء: ١).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا﴾الاحزاب:٧٠-٧١).

أما بعد:

ئەم پەڕتوکە بریتیە لە ژیاننامەی : ( جوێکەرەوە: عومەری کوڕی خەتاب، کەسایەتی و سەردەمی).

فەزڵ و گەورەیی نووسینی ئەم پەڕتوکە دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە و پاشان بۆ کۆمەڵە کەسێکی باش لە زانایان و پیاو چاکان، ئەو بانگخوازانەی هانیان دام لەسەر بەردەوام بوونم لە لێکۆڵینەوەی سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین، تەنانەت یەکێکیان پێی وتم: تۆ لێرەدابویتە پردێکلە نێوان ڕۆڵەی موسڵمانان و مێژووداا، تێکەڵیەك لەنێوان ڕێکخستنی یەکەمی بەکاتدا ڕوویدا بەجۆرێك کە زۆرێك لە ڕۆڵەی موسڵمانان زیاتر شارەزاترن لەژیانی بانگخوازان و زانایان و چاکسازان لەچاو خەلیفەکانی ڕاشیدین، ئەم سەردەمەش زیاتر دەوڵەمەندترە، بە لایەنە سیاسی و پەروەردەیی و ئیسلامی و ئەخلاقی و ئابووری و ڕۆشنبیری و جیهادی و ئەو فیقهیەی، کە ئێمە زۆر پێویستیمان پێیەتی، ئێمە لێرەدا پێویستە شوێن پێی دام و دەزگا ئیسلامیەکان بگرینە بەر، کە چۆن لەگەڵ ڕەوتی ساتەوەختەکاندا پشکەوتووە، هەروەك دام و دەزگا دادپەروەریەکان و داراییەکان و ڕژێمی خەلافەت و دەزگا سەربازیەکان و دامەزراندنی والیەکان و ئەوەی کە ڕوویداوە لە هەوڵ و تێکۆشانی ئەم سەردەمە بەتایبەتی کاتێك کە ئومەتی ئیسلامی لەگەڵ شارستانیەتی فارسی و ڕۆمانی و سروشتی بزاوتی جەنگە ڕزگاریخوازە ئیسلامیەکان بەریەك کەوتن.

بیرۆکەی نوسینی ئەم پەڕتووکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خوای گەورە ویستی لێبوو ببێتە

ڕاستیەك، هیدایەتی دام و هەموو تەنگەبەری و سەختیەکانی بۆ ئاسان کردم، کۆمەکی کردم لە گەیشتن بە سەرچاوەکان و چاکی و شیاویش بۆ ئەو خودایەیە کە لەم کارەدا هاوکاری کردم .

هەمووان دەزانین مێژووی خەلیفەکانی ڕاشیدین پڕن لە پەند و ئامۆژگاری کە لە ناوەڕۆکی چەند کتێب و سەرچاوەیەکدا هەڵێنجراون مەبەستیش دورە پەرێزیە لەوبۆچونانەی ی هاندەرن لەسەر ناشیرینکردن و شکاندن و بێڕێز کردن، بۆیە من هەستام بە لێکۆڵینەوەی بە پێی هەوڵ و توانام، من مادەیەکی مێژوویم دیتەوە کە سەختە لەسەر ڕاستیەکەی بوەستین لەو پەرتووکە مێژوویە ناسراو و دەستاو دەست پێکراوەکاندا بە تەنهایی، بۆیە هەستام بە کۆکردنەوە و ڕێکخستنی و بەڵگە دارکردن و شیکردنەوەی ، یەکەم پەرتووکیشم لەسەر ئەبو بەکری صدیق(رضي الله عنه) لە چاپ دراوە و ناوم لێنا (ئەبو بەکری صدیق، کەسایەتی و سەردەمی).

بەیارمەتی خوای گەورە ئەم کتێبە لە کتێبخانە عەرەبی و پێشانگای نێو دەوڵەتیەکاندا بڵاو بوویەوە و گەیشتە دەستی زۆرێك لە خوێنەران و بانگخوازان و زانایان و زانست خوازان و ئەوانیش هانیان دام لەسەر بەردەوام بوونم لە لێکۆڵینەوەی سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین ، بە زمانێکی سادەو پێشکەشم کرد بە ئومەتی ئیسلامی بە شێوازێکی گونجاو هاچەرخانە.

مێژووی خەلیفەکانی ڕاشیدین پڕە لە پەند و ئامۆژگاری، ئەگەر بە باشی بیان خوێنینەوە و دوور بکەوینەوە، لە ڕیوایەتی لاواز و، نوسراوەکانی ڕۆژهەلات ناسان و، ئەلقە لە گوێکانیان، لە عەلمانیەکان و...هتد.

ئێمە لەم نوسینەدا پشتمان بە نوسراوەکانی ئەهلی سونەو جەماعە بەستوە بە شێوازێکی نوێ دامان ڕشتووە بە سەرنج دان و رامان لە مێژوی زێڕینی ئەو دەمە ، ڕەچاو کردنی بارو دۆخ و حاڵو وەزعی ئەو گروپو تاقمەی کە خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرمویەتی: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (التوبة: ١٠٠).

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا﴾ (الفتح: ٢٩).

پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (باشترینی ئومەتم لەو سەردەمە دایە کە من تیایدا ڕەوانەکروام)[١] .

هەروەها عبدالله کوڕی مەسعود(رضي الله عنه) دەربارەیان دەفەرموێت: (هەرکەس دەیەوێ چاو لەکەسێ بکات با چاو لە مردوان بکات، چونکە بەڕاستی زیندوو لە فیتنە پارێزراونیە ، ئەوانە هاوەڵ و یارانی محمد(صلى الله عليه وسلم) بوون، سوێند بە خوا باشترینی ئەم ئومەتەن خاوەنی بێگەرد ترین دڵ و فراوانترین زانست و

١ ـ مسلم (١٩٦٣/٤ - ١٩٦٤).

کەمترین داخوازی بوون و ئومەتانێك بوون خواوەند هەڵیبژاردوون بۆ بەرز ڕاگرتنی ئاینەکەی و هاوەڵی کردنی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، جا ئێوەش بە چاکەکانیان بزانن ، هەتا دەتوانن دەست بگرن بەئاین و ڕەفتار و کرداریانەوە، بەڕاستی ئەوان لەسەر شارێی ڕێنموونی بوون .[1]

هەوەڵان هەستاون بە چەسپاندنی حوکمەکانی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی لەمپەڕی ڕۆژهەڵات و لەوپەڕی ڕۆژئاوا، سەردەمی ئەوان باشترین سەردەم بووە، بەڕاستی هەر ئەوان بوون ئومەتیان فێری قورئان کرد و سوننەت و شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) یان بۆ گێڕاوینەتەوە، مێژوویان بریتیە ئەو گەنجینەیە، کە پڕە لەوبەها بەرزانەی ئومەتی پڕ کرد لەبیرو ڕۆشنبیری و زانیاری و زانست و جیهاد و بزاوت و جەنگە ڕزگاریخوازەکان و مامەڵەکردن لەگەڵ گەلاندا. لەم مێژووەشدا چەندین چین و توێژ بەدی دەکەیت، کە دامەزراوە لەسەر درێژەدان بە ڕێبازەکەی لەسەر پەیڕەوی ڕاست و دروست و ڕێنموونی ژیرانە، هەر لەم میانەشدا دروستی پەیامەکەی و ڕۆڵی لە دونیای خەڵکیدا بۆ دەردەکەوێت، ئەم چاکەیە، کە خۆراکی ڕۆحەکانە و دەروونەکان پاراو دەکات عەقڵەکان ڕۆشن دەکاتەوە و گەورەکان دەکاتە عودالّی ئەو حەقیقەتەو چەندین وانە پێشکەش دەکات و پەندەکان ئاسان دەکات و بیرەکان پێ دەگەیەنێت و بانگخوازان و زانایان و پیاوچاکان و ڕۆڵەکانی ئومەت لەوەدا بەدی دەکات کە دامەزراون لەسەر ئامادەکردنی نەوەیەکی موسڵمان و پەروەردەکردنی لەسەر ڕێڕەوی پەیامبەری(ﷺ)و شارەزا دەبن لەسەر بنەماکانی خەلافەتێکی زانستیانە و سیفەتی سەرکردە و نەوەیەکی سەرکەوتو.

ئەمە دووەمین پەرتووکە دەربارەی خەلیفەکانی ڕاشیدین ، کە باس لە ژیانی عومەری کوڕی خەتاب و کەسایەتی و سەردەمی دەکات، دیارە عومەر خەلیفەی دووەم و باشترین یار و هاوەڵی ڕێزدار بووە لە دوای خەلیفە ئەبو بەکری صدیق(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) هانمان دەدات و فەرمانمان پێ دەکات بە شوێنکەوتنی سونەتەکانیان ورەچاو کردنی ڕێنموونیەکانیان، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : (بەجێهێنانی سونەتەکانی من و خەلیفەکانی ڕاشیدینتان لەسەر واجبە لە دوای خۆم)[2]، عومەر(ﷺ) باشترین پیاوچاکان بووە لە دوای پێغەمبەران و نێردراوان و ئەبو بەکری ڕاستگۆ. پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەیانەوە دەفەرموێت: (لە پاش من پابەند بن بەو دوانەوە، ئەبو بەکر و عومەر).[3]

کۆمەڵێکی زۆر فەرمووده و ئاسەواری ڕاست هاتوون دەربارەی شیاوی و شایستەیی عومەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەیەوە دەفەرموێت : ( لە نێو ئومەتانی پێش ئێوە(محدث)هەبوون، ئەگەر لە ئومەتی منیشدا(محدّث) هەبێت ئەوە عومەرە).[4]

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (من لە خەونمدا بینیم، کە ئاوم لە بیرێکی هەڵنەبەستراو هەڵدەگۆزی، ئەبو بەکر هات و دۆڵچەیەك یان دوو دۆڵچەی بە لاوازی هەڵکێشا,خوا لێی خۆشبێت، پاشان عومەری کوڕی خەتاب هات دۆڵچەی خۆی بە فراوانی ڕاکێشا کەسێکی لێهاتووم نەبینیوە کە

---

١ ـ شرح السنة للبغوي (٢١٤/١-٤١٥).
٢ـ سنن ابي داوود (٢٠١/٤)، الترمذي (٤٤/٥) حسن صحيح.
٣ـ صحيح سنن الترمذي للالباني (٢٠٠/٣).
٤ـ البخاري (٣٦٨٩)، مسلم (٢٣٩٨).مەبەست لە محدث ئەوانەی قسەی ڕاست لەسەر زمانیان دێت پێش ڕوودانی

وەکو عومەر بەم کارە هەستا بێت تاوەکو خەڵکی بە تەواوی تێراوبوونو گەرانەوە شوێنی حەوانەوە) .[1]

عەمری کوڕی عاص دەفەرموێت وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چ کەسێکت زۆر لا خۆشەویستە؟ ئەویش فەرمووی: (عائیشە)، منیش وتم: لەنێوان پیاواندا؟ فەرمووی:(بابی)، دواتر وتم کێی تر؟ ئەویش فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب و چەند کەسێکی تری ژمارد.[2]

ژیانی عومەری جوێکەرەوە لاپەڕەیەکی پڕشنگدارە لە مێژووی ئیسلامی دا، کە هەموو نەداریەکانی پێش خستووە بە جۆرێك، کە مێژووی گەلانی تر بەو شێوەیە ڕەشماڵی شەرەف و نەبەردی و دڵسۆزی و جیهادو بانگەوازی لە ڕێگەی خوادا بۆ هەڵنەداوە هەر لەبەر ئەوەش بوو هەستام بەکۆکردنەوەی ژیان و سەردەمی لەنێو کتێب و سەرچاوەکاندا.لە ناوەڕۆکی ئەوکتێبانە دەرم هێناون و هەستام بەڕێکخستن و خشتکردن و بەڵگەدار کردن و شیکردنەوەیان، هەتا ببێتەتوێشویەکی ناوازەی بەردەستی بانگخوازان و وتارخوێن و زانایان و سیاسەتمەداران و بیریاران و سەرکردەکانی سوپاو فەرمانڕەواکانی ئومەت و فێرخوازانی زانست و هەموو خەڵکانی تر. بەئومێدی ئەوەی بتوانن لەژیانیاندا سوودینی لێ وەربگرن و لە کارەکانیاندا پابەند بن پێوەی و خوای گەورەش بە سەرکەوتنی هەوو دونیا ڕێزداریان بکات.

من بە شوێن ژیانی عومەردا ڕۆیشتم و هەر لەمنداڵیەوە هەتا شەهیدبوونی دەربارەی ڕەچەڵەکی و بنەماڵەکەی و ژیانی سەردەمی نەفامی و موسڵمان بوونی و کۆچی و شوێنەواری قورئانی پیرۆز و پێویست بوونی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕێکخستن و داڕشتنی کەسایەتی گەورەی ئیسلامی دواوم و باسم لە هەڵوێستەکانی کردووە لە غەزاکان و لە نێو کۆمەڵگای مەدەنی لە ژیانی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر(رضي الله عنه)، هەروەها باسی سەردەمی خەلافەت و ڕێساکانی حوکمەکەیم ڕوون کردۆتەوە وەك ڕاوێژ و بەرز ڕاگرتنی دادپەروەری و یەکسانی نێوان خەڵك و ڕێزگرتنی بۆ ئازادیەکانی و ئاماژەم بۆ گرنگترین سیفەتەکانی و ژیانی لەگەڵ خێزانەکەی و ڕێزی بۆ خاو و خێزانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) کردووە لەگەڵ ئاماژەکردن بە ژیانی لە نێو کۆمەڵگادا پاش ئەوەی کە بوویە خەلیفەی موسڵمانان، بایەخدانی و چاودێری کردنی بۆ ژنانی کۆمەڵگاو پارێزگاریکردنی لە پێشهاتی چاکە و بۆ چاودێری کردنی و سووربوونی لەسەر بەرێکردنی پێویستیەکانی خەڵکی و ڕێکخستنی بۆ هەندێ سەرکردەی کۆمەڵگاو نکۆڵی کردنی لە هەندێ هەڵسوکەوتی لادراو و بایەخدانی بە تەندروستی ژێردەستەکانی و ڕژێمی ژمێرەیی و بە بازاڕ و بازرگانیەوە و سووربوونی لەسەر بەدەستهێنانی مەبەستە شەرعیەکان لە کۆمەڵگادا وەك پارێزەرێك بۆ لایەنی یەکتاپەرستی و بە گژا چوونی ئارەزوو و داهێنراوەکان و بایەخدانی بە کاری پەرستشەکان و پارێزگاریکردن لە شەرەفی موجاهیدان.

هەروەها باسی بایەخدانی عومەرم بەزانیاری و زانست و ئامۆژگاری کردنی ژێر دەستەکانی بە

---

١ـ مسلم (٢٣٩٣).

٢ـ الاحسان في صحيح ابن حبان (١٥/٣٠٩).

فێربوون کردووە کە ئەو ئەم شوێنەی کردۆتە مۆلگەیەك بۆ فتوا و فیقەو قوتابخانەیەك، کە زانایان و بانگخوازان و والی و قازیەکان تیایدا دەرچوون، هەروەها شوێنەواری عومەریم لە قوتابخانەی شارەکەدا ڕوون کردۆتەوە وەك قوتابخانەی مەکی و مەدەنی و بەحیرەیی و کوفەیی و شامی و میسریەکان ڕوون کردۆتەوە، عومەر بایەخی تەواوی داوە بە کادیرە زانستی و پسپۆڕەکان و ڕەوانەی شارەکانی کردوون و لەگەڵ فراوان بوونی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکاندا ڕێنمایی سەرکردەکانی کردووە بە کردنەوەی مزگەوت لەو شوێنە ڕزگارکراوانە هەتا ببنە مەڵبەنبینی بانگخواز و پەروەردە و فێربوون و بڵاوکردنەوەی شارستانیەتی ئیسلامی، بێگومان مزگەوتەکان بریتی بوون لە یەکەمین دەزگای زانستی لە ئیسلام و لە سایەیدا زانایانی هاوەڵان هەستاون بەکردنەوەی خولی فێرکردن، بۆ ئەو گەلە نوێیانەی کە بە ئارەزووی خۆیان و دوور لە هەر فشارێك هاتوونەتە ژێر سایەی ئیسلام ، لە سەردەمی خەلیفە عومەردا ژمارەی ئەو مزگەوتانەی کە نوێژی هەینیان تێدا کراوە گەیشتوونەتە ١٢ هەزار مزگەوت.

مزگەوتەکان کۆمەڵە دام و دەزگایەکی پشت ئەو دەزگا سەربازیانەن کە هەستان بە ڕزگارکردنی عێراق و ئێران و شام و میسر و وڵاتانی ڕۆژئاوا، ئەم دەزگایانەش ڕابەرایەتی ژمارەیەك کادیری زانستی و فیقهی و بانگخوازی کردووە کە لە شاری مەدینە لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەروەردەبوون، عومەریش سوودبینی لەم وزانە وەرگرتووە و بەچاکی ئاراستەی کردوون و لە شوێنی خوی دایناون و ئەم وزە و توانایانەش ئەو کادێرانەیان دامەزراندووە و بۆ بزووتنەوەی زانستی و فیقهیەکە و کەژاوەی لەبار بوون بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی.

من سەبارەت بە بایەخدانی عومەر بە شیعر و شاعیران دواوم ، عومەر(ﷺ) یەکێکە لەو خەلیفە ڕاشیدیانە کە گوێی بۆ شیعر بەهێزکردنی گرتووە هەروەك ئەوەی کە بۆ نموونە دەیهێننەوە و دەڵێن عومەری کوڕی خەتاب هەر کارێکی بەرچاو دەکەوت چەند بەستەیەك شیعری لە بارەوە دەوت، عومەر زۆر بە توانا و لێهاتوو بووە لەبواری ڕەخنەی ئەدەبی و پێوەرێکی هەبووە کە کاری پێ کردوون لە پتەوی یان خروشانی دەقێك لەسەر دەقێکی تر، یان خستنە بەردەست شاعیرێکی تر ، لەو پێوەرانەش: سەلامەتی زمانی عەرەبی و هۆگری زاری و دوور کەوتنەوە لە کۆمەڵگیری و ئاڵۆزی و ڕوونی و ئاشکراکاری، پێویستە ئەو دەستە واژانەش بە ڕێژەی ماناکان بن لەگەڵ جوانیان لە شوێنی خۆیاندا و بەجوانی دربڕدرێن، ئەو ڕێگری شاعیرانی دەکرد لە دەربڕینی وتەی ناشرین و ئەو شتانەی کە ڕووبەڕوو دەبوونەوە لەگەڵ مەبەستە شەرعی و ئیسلامیەکاندا و چەندین ڕێگای گرتۆتە بەر لە تەمێ کردنیان ، لەوانە سێ هەزاردرهەمی دابە (حطیئة)ی شاعیرهەتا موسڵمانان بپارێزێت لە شیعرەکانی بۆیە حطیئة ووتی:

وأخذت أطراف الكلامِ ولم يــدع
مـشتـماً يضر ولا مديحاً يـنـفـع
ومـنـعتني عـرض البخيل فـلـم يخـف
شتمي فأصبح آمــنـاً لايـفــزعُ

هەروەها باسم لە پێشکەوتنی ئاوەدانی و نەهێشتنی تەنگژەکان کردووە لە سەردەمی عومەر و بایەخی عومەرم بە ڕێگە یان هۆکارەکانی گواستنەوەی وشکانی و دەریایی و دامەزراندنی ناوەند و شارەکان داوە وەك پێگەیەکی سەربازی و مەڵبەندێکی بڵاوکردنەوەی شارستانی.

هەروەها قسەم لەسەر پەرەسەندنی شارە گەورەکانی وەك بەسرە و کوفە و قسطاط و سرت کردووە لەسەردەمی عومەر، باسم لەو نەخشە سەربازی و ئابووریانە کردووە، کە عومەر لەکاتی بنیاتنانی شارەکاندا دایناون و پشتی پێ بەستون، سەرباری ئەو شێوازانەی کە عومەر گرتوونیە بەر لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ساڵی برسێتی و چۆن لە خۆی پێشەوایەکی بۆ خەلکی دروست کردووە لەگەڵ ئەو کەمپە پەنابەریەدا لەو ساڵە و کۆمەکی کرانی بە دانیشتوانی شارەکان.

داوای کۆمەکی کردن لە خوای گەورە و نوێژە بارانە و هەندێ اجتیهاداتێ فیقهی لە ساڵی برسێتیدا وەك ڕاگرتنی حەددی دزی کردن و دواخستنی زەکات لەو ساڵەدا. لەگەڵ سەرگوزشتەیەکی خالدی کوڕی وەلید(ﷺ)و لەکار لابردنی(عزل) بۆجاری یەکەم و دووەم لەگەل کورتەی هۆکارەکانی لەسەرکار لابردنی و هەڵوێستی کۆمەڵگای ئیسلامی لەم بارەیەوە و هەڵوێستی خالدی کوڕی وەلیدیش سەبارەت بەم بڕیارە، ئایا عومەر لەسەر جێگەی مردنەکەی چی وت.

هەروەها پێناسەی ڕزگارکردنی عێراق و ئێران و شام و میسر و لیبیام کردووە لە سەردەمی فاروقداو لەگەڵ چەندین وانەو پەندو ئامۆژگاری و سوودەکانیان و سونەتەکانی ئەم جەنگە ڕزگاریخوازانە، هەڵوێستەم کردووە وتیشکم خستۆتە سەر ئەو نامەو پەیامانەی، کە لە نێوان عومەر و سەرکردەی سوپاکانیدا هەبووە، هەروەها مادەیەکی زانستی پەروەردەییم لە ئامۆژگاری کردنی گەلان و بنیاتنانی دەوڵەتاندا لێ هەڵێنجاوە لەگەڵ پەروەردەکردنی کۆمەڵگاکان و ڕێنموونی سەرکردەکان و هەندێ هونەری جەنگی و هەر لەو نامانەشدا، کە عومەر ئاراستەی سەرکردەکانی کردووە مافی خوام هەڵێنجاوە وەك: هێورکردنەوەی دوژمن و مەبەست لە کوشتنیان سەرخستنی ئاینی ئیسلام و گەیاندنی ئەمانەت و نەبوونی یارمەتی بێت لەسەرکەوتنی ئاینی خودایی و مافی سەرکردەکان وەك پابەند بوون بەئەمرو فەرمانیان و بەجێهێنانی فەرمانەکانیان و دیاری کردنی مافی سەرباز وەك: دیدار و بەسەرکردنەوەی بارودۆخیان و هاوەڵی کردنیان لە ڕێگا و هاندانیان لەسەر جیهاد و...هتد.

هەروەها باسم لە پەیوەندی عومەر کردووە لەگەڵ پادشایان و ئاکامی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی عومەر و دواین ڕۆژەکانی ژیانی و تێگەیشتنی بۆ ئەو ئەمرانەی کە لە لایەن خوداوە هاتووە، کە چاودێر بووە لەسەری لەناخیدا تێکەڵ بووە لە یەکەم ڕۆژی موسڵمان بوونیەوە تا شەهید بوونی.

هەوڵم داوە لەم پەرتووکەدا ئەوە ڕوون بکەمەوە کە چۆن عومەر لە ئیسلام تێگەیشتووە و بە دنیای خەلکەوە پێوەی ژیاوە و چۆن کاری کردۆتە سەر ڕەوڕەوەی کارەکان لە سەردەمی خۆیدا، هەروەها باسم لە چەند لایەنێکی ژیانی کردووە وەك: لایەنەکانی سیاسی و سەربازی و کارگێڕی و

دادوەری و ژیانی لەنێو کۆمەڵگادا لەوەی کە یەکێك بووە لەو کەسانەی دوای خەلیفە ئەبو بەکر کاروباری خەلافەتی گرتۆتە دەست، هەروەها تەرکیزم خستۆتە سەر ڕۆڵی لە پێشخستنی دام و دەزگا دارایی و دادوەری و کارگێڕی و سەربازیەکاندا.

ئەم کتێبە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی عومەر ئەوەش بۆ خوێنەر دەسەلمێنێت کە عومەر گەورە بووە بەئیمان و زانیاری و بیرو بۆچوون و بەرچاو ڕوونی ڕەفتارو کرداری، عومەر گەورەیی لەدەوروبەری خۆی کۆکردوەتەوە و ئەم گەورەیشی لە پیادەکردنی ئیسلام و پابەندبوونی بە فەرمانەکانی خوای گەورەو شوێن کەوتەیی بۆ ڕێنموونیەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرچاوەی گرتووە.

عومەر(ﷺ) یەکێکە لەوکەسانەی وەك پێشەوایەك نەخشەی ڕەوتی خۆیان بۆخەڵکی نەخشاندووەو خەڵکی بەوتەکانی و کردەکانی سەرسام بوون، ژیانی عومەر(ﷺ) لە بەهێزترین سەرچاوەکانی باوەڕو سۆزی ڕاستەقینەی ئیسلام و تێگەیشتنی دروستە بۆئەم ئایینە.

ئومەتی ئیسلامی ئەمڕۆ زۆر پێویستی بەو پیاوە لێهاتوانەیە، کە پابەند دەبن بە هاوەڵانی بەڕێزەوە و ماناکنی قورئان و فەرمودە لە خۆیاندا بەرجەستە دەکەن و زیندووی دەکەنەوە بە قوربانیدانێك کە خەڵکی بەدی دەکەن و هەستی پێ دەکەن!

بەڕاستی مێژووی خەلیفەکانی ڕاشیدین و هاوەڵانی ئازیز وەك ئەستێرەیەکی درەخشان لە نێو تەواوی چین و توێژەکاندا دەمێنێتەوە سوود وەرگرتنیش لێی بە پابەند بونی کەسایەتیەکانی ناو ریزەکانی رابوون و کاری ئیسلامی دەبێت لەگەڵ چەسپاندنی هەڵوێستە مەردانەکان لە ژیاندا لە لایەن ئەو کەسایەتیانەوە کە چرای ڕێگای تاکەکانی ئومەتن لە هەلومەرجی ژیانی هاوچەرخدا تا هەموان بزانن مێژوی ئێمە تەنها چیرۆکی بەردەم ئاگردان نین، بەڵکو ئەم هەڵوێستانە پەند و وانە و ئامۆژگاری بەپێزیان تێدایە بۆ هەموو سەردەمێك لە هەمو دەمێکدا تازەن و شیاون و دووبارە بوونەوەیان پێویستی ڕۆژگارێکی هاوشێوەی خۆی هەیە ڕاستیەکەش ئەوەیە هەر کاتێك هۆکاری ئیمان بەهێز بووو موسڵمانان سوور بوون لەسەر ئەوەی کاربە بەرنامەی خوای گەورە بکەن، ئەوا خوای گەورە زامنکار دەبێت بە سەرکەوتنی بەندەکانی و دابین کردنی ژیانێکی باش بۆیان.

هەوڵم داوە لە لێکۆڵینەوەی ژیانی عومەر و سەردەمەکەی بە پێی توانام بێگوێدانە هیچ ئەگەرێکی توانج و گلەیی و شەرم و بەبێ بێزاربوون بەم ئەرکە هەستم، تەنها مەبەستیشم ئەوە بووە ئەم کارە بۆ خوای گەورە بێت و پاداشتەکەیم مەبەست بووە کە ئەو بەرپرسە لە یارمەتیدان و بەسودبونی ئەم بەرهەمە، خوای گەورە هەرخۆی خاوەنی ناوی باش و بیسەری نزا و پاڕانەوەکانە.

بەم شێوەیەش ڕۆژی چوارشەممە کاتژمێر(٧,٠٥) خولەکی بەیانی ڕۆژی(١٣ی ڕەمەزانی ١٤٢٢)ی کۆچی بەرامبەر(٢٨ی تشرینی دووەم ٢٠٠١) ی زایینی لەنوسینی ئەم کتێبە بوومەوە، کە چاکی و شیاوی سەرەتا و کۆتا دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە، لە خودا دەپاڕێمەوە ئەم کارەم لێ وەربگرێت و سینەی بەندەکانی بکاتەوە هەتا سووبینی تەواوی لێ وەربگرین بەرێزی خۆی پیرۆزی بکات هەروەك

دەفەرمووێت: ﴿مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ (فاطر: ٢).

لەکۆتایی ئەم پێشەکیەدا هیچم نەماوە جگە لەوەی، کە لەبەر دەم خوای گەورەدا بە ئەگەردن کەچیەوە بوەستم و سوپاسی ئەو خودایە بکەم لەسەرەتاوە هەتا کۆتا ئەم منەتەی لەسەر نام و ئەم توانایەی پێبەخشیم ، بە ناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی لێی دەپاڕێمەوە کە ئەم کارەم بە پوختی بۆ خۆی لێ وەربگرێت و سوودمەند بێت بۆ بەندەکانی.

وە لەسەر پیت و بە پیتی پاداشتم بداتەوە و لە تەرازووی چاکەکانم دای بنێت و تۆماری بکات و پاداشتی هەموو ئەو برایانەشم بداتەوە کە یارمەتیان دام لە تەواوکردنی دا و خوازیارم هەموو موسڵمانێك چاو بگێڕێت بەم کتێبەدا هەتا ئەوەی لە یاد نەچێت کە بەندەیەکی هەژار پێویستی بە لێبووردنی خوای گەورەی هەیە پێویستی بە لێبووردەیی و سۆز و بەزەیی و ڕەزامەندیەکانیەتی لە نزاو پاڕانەوەکانیدا، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾(النمل: ١٩)

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد ان لا اله الا انت أستغفرك وأتوب اليك، وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

**الفقير الى عفو ربه ومغفرته ورحمته ورضوانه**

**علي محمد الصلابي**

**١٣ رمضان ١٤٢٢ك**

# دوانگەی یەکەم

## ناو و ڕەچەڵەکی و ناوبانگ و سیفەت و بنەماڵەو ژیانی

## لە سەردەمی پێش ئیسلامدا

### یەکەم: ناو و ڕەچەڵەك و شۆرەت و نازناوی:

ناوی: عومەری کوڕی خەتابی کوڕی نوفەیلی کوڕی عبدالعزی کوڕی ڕەباح کوڕی عبداللە کوڕی قرط کوڕی رزاح کوڕی عەدەی کوڕی کەعب کوڕی لوئەی[١] کوڕی غالبی قورەیشی عەدەویە،[٢] ڕەچەڵەکی عومەر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لە کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالب[٣] کۆ دەبێتەوە و ناسراوە بە ئەبو حەفص[٤] ونازناوی فاروقە[٥]، فاروقە چونکە موسڵمان بونی بویە هۆی کرانەوەی دەروازەیەکی نوێ لەروی موسڵمانانداو خوای گەورە بە هۆیەوە ئیسلام وکوفر لێکجودا کردەوە.[٦]

### دووەم: لەدایك بوونی:

عومەر بە ١٣ساڵ پاش ڕووداوی (عام الفيل) لە دایك بووە،[٧] کەسێکی سپی پێستی سوور باو بووە، دەم و لووت و گۆناو چاوێکی جوانی هەبووە و دەست و پێ و مەچەك ئەستوور و کەسێکی

١ـ الطبقات الكبرى (٣/٢٦٥) محض الصواب لابن عبدالهادي (١/١٣١).
٢ـ محض الصواب في فضائل امير المؤمنين عمر بن الخطاب (١/١٣١).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق عمر بن الخطاب (ص: ١٥).
٥ـ هەمان سەرچاوە، لا: ١٥.
٦ـ هەمان سەرچاوە، لا: ١٥.
٧ـ تأريخ الخلفاء، للسيوطي (ص: ١٣٣).

باڵابەرز و پتەو چوار شانە و سەر ڕووتەڵە بووە، لەنێو خەڵکیدا دیار بووە، میانڕەو و لاواز نەبووە[١] خەنەی بەکارهێناوە، سمێڵی[٢] درێژ بووە لە ڕۆیشتندا خێرا بووە ئەگەر قسەی بکردایە گوێی بۆ دەگیرا و لێدانی بە ئازار بووە.[٣]

## سێیەم: بنەماڵەکەی:

باوکی خەتابی کوڕی نوفەیلە، باپیری عومەر نوفەیلی کوڕی عبد العزی یەکێك بووە لەو کەسانەی کە فەرمانڕەوایی قورەیشی کردووە،[٤] بەڵام دایکی حەنتەمەی کچی هاشم کوڕی موغیرەیە و دەڵێن: کچی هاشمی خوشکی ئەبو جەهلە[٥] کە زۆرێك لە مێژوونوسان دەڵێن کچی هاشم کچە مامی ئەبو جەهلی کوڕی هشامە،[٦] .

عومەر لەسەردەمی پێش ئیسلامدا لەگەڵ زەینەبی کچی مەظعون خوشکی عوسمانی کوڕی مەظعون کاری هاوسەرگیری ئەنجام داوەو عبداللە و عبدالرحمن و حەفصەی لێ بووە.

هەروەها مەلیکەی کچی جەرولی هێناوە کە بووەتە دایکی عوبەیدوڵا و پاشان لەسوڵحی حودەیبیەدا لێی جیابۆتەوە و پاشی ئەو أبو الجهمی کوڕی حوزەیفە خواستوویەتی، دواتر لەگەڵ قورەیبەی کچی ئەبی ئومەییەی مەخزوومیدا هاوسەری پێکهێناوە و لەسوڵحی حودەیبیەدا لێی جیابۆتەوە ، قورەیبەش دوای ئیامی عومەر کاری هاوسەری لەگەڵ عبدالرحمن کوڕی ئەبو بەکر ئەنجام داوە .دوای ئەمیش ئوم حەکیم کچی الحارسی کوڕی هشام هێناوە، پاش ئەوەی، کە عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهلی هاوسەری لە شەڕی شامدا کوژراوە،[٧] ئوم حەکیم دەبێتە دایکی فاطمة و پاشان لێی جودابۆتەوە دەڵێن لێی جودانەبۆتەوە،[٨] دواتر جەمیلە[٩]ی کچی عاصم کوڕی ثابت کوڕی ئەبی ئەفلەح لە ئەوس هێناوە، دواتر عاتیکەی کچی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەفیل هێناوە، کە پێشتر لە لای عبداللە کوڕی ئەبو بەکر[١٠] بووە و کاتێك، کە عومەر شەهید کراوە زوبێری کوڕی عەوام کاری هاوسەرگیری لەگەڵ ئەنجام داوە، دەڵێن عاتیکە دایکی عەیاز بووە خوای گەورەش باشتر دەزانێت.

هەروەهاداخوازی ئوم کەلسومی کچی ئەبو بەکری کرد ، کە کچێکی بچووك بوو کاتێك عائیشەی ناردووەبۆ لای ئوم کەلسوم و وتوویەتی: من پێویستیم پێ نیە، عائیشە دەفەرمووێت: ئایا بە ئەمیری

---

١ ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٥).
٢ـ السبلة طرف الشارب كان إذا غضب او حزنه امر يمسك بها ويفتلها.
٣ـ تهذيب الاسماء (١٤/٢) للنووي، أوليات الفاروق للقرشي (ص: ٢٤).
٤ـ نسب القريش للزبيدي (ص: ٣٤٧).
٥ـ اوليات الفاروق السياسة (ص: ٢٢).
٦ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٢).
٧ـ البداية والنهاية (١٤٤/٧).
٨ـ هەمان سەرچاوە (١٤٤/٧).
٩ـ ترتيب وتهذيب البداية والنهايتن خلافة عمر للسيوطي (ص: ٧).
١٠ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٧).

باوەڕداران قایل نابیت؟ ئەویش دەفەرموویت: بەڵێ، بەڵام ژیانی سەخت و نارەحەتە ، دواتر عائیشەی نارد بۆ لای عەمری کوڕی عاص ئەویش ئەنجامدانی ئەم کارەی بەچاك نەزانی، بۆیە ئوم کەلسوم کچی عەلی کوڕی ئەبو تالیبی بۆ دەست نیشان کرد، کە لە فاطمەی کچی پێغەمبەری خۆشەویستە(ﷺ)، فەرمووی: لەم ڕێگەیەوە دەگەمە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)،عومەر ٤٠ هەزاری کردۆتە ماریی ئەویش دەبێتە دایکی زەید و ڕوقیە،[1] هەروەها هاوسەرگیری لەگەڵ لوهیە ئەنجام داوە کە ئافرەتێکی بە ڕەگەز یەمەنیە ئەمیش دایکی عبدالرحمنی بچووکە کە پێشی وتراوە عبدالرحمنی ناوەنجی، واقبینی دەڵێت: (ام ولد) بووە نەك هاوسەر،[2] هەروەها دەڵێت ئەو فەکیهەی(ام ولد) لا بووە ئەمیش دایکی زەینەبە ، واقبینی دەڵێت ئەمە بچووکترین منداڵی بووە،[3] تەواوی منداڵەکانی عومەر(ﷺ) ١٣ منداڵ بوون کە بریتی بوون لە: زەیدی گەورە، زەیدی بچووك، عاصم، عبدالله، عبدالرحمنی گەورە، عبدالرحمنی ناوەنجی، عبدالرحمنی بچووك، عبیدالله، عیاض، حفصە، ڕوقیە، زەینەب، فاطمة (خوا لێیان ڕازی بێت)، ئەو خێزانانەشی کە لە پێش ئیسلام و لە سەردەمی ئیسلامیشدا هەیبوون بەوانەشەوە کە لای مردوون یان لێی جودا بوونەتەوە (٧) ئافرەت بوون،[4] عومەر(ﷺ) تەنها لە پێناوی زۆربوونی منداڵ و وەچە خستنەوە کاری هاوسەرگیری ئەنجام داوە، عومەر(ﷺ) فەرموویەتی: من بۆ ئارەزووبازی خێزانم پێکەوە نەناوە، بەڵکو لەبەر منداڵ و زیاد بوونی ئومەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خێزانم پێکەوە ناوەو ژنم هێناوە،[5] خوازیارم خوای گەورە وەچەیەکم لێ بخاتەوە، کە یاد و زیکری خوا بکەن.[6]

## چوارەم: ژیانی لە پێش ئیسلام:

عومەر نیوەی تەمەنی لەپێش ئیسلامدا بەسەر بردووە، هەروەك هەموو لاوانی هاوشێوەی لە ڕۆڵەکانی قورەیش، بەوە جیاکراوەتەوە کە فێری خوێندنەوە بووە و ئەمەش ژمارەیەکی زۆر کەم لە لاوانی قورەیش پێی بەهرەدار بوون،[7] هەر لە منداڵیەوە بەرپرسیاریێتی کەوتۆتە ئەستۆ و زۆردژوارژیاوەو پەروەردەیەکی زبری هەبوە، هیچ ڕەنگێکی ئاسوودەیی و دەوڵەمەنبینی بەخۆوە نەبینیوە، باوکی کردوویەتی بە شوانی حوشتر ، مامەڵە ی توندو سەختی باوکی شوێنەوارێکی خراپی لە ناخی عومەر(ﷺ)دا بەجێ هێشتووە و ئەمەش وای لێ کردووە بە درێژایی تەمەنی لە یادی بووە و باسی لێوە کردووە، عبدالرحمنی کوڕی (حاطب) دەفەرموویت: من لەگەڵ عومەردا(ﷺ) لە

---

١ـ الكامل في التأريخ (٢/٢١٢).
٢ـ تأريخ الامم والملوك للطبري (١٩١/٥).
٣ـ تأريخ الامم والملوك للطبري (١٩٢/٥).
٤ـ البداية والنهاية (١٤٤/٧).
٥ـ الشيخان ابو بكر وعمر برواية البلاذري، تحقيق الدكتور إحسان صدقي (ص: ٢٢٧).
٦ـ فوائد القلام للخلفاء الكرام، قاسم عاشوور (ص: ١١٢).
٧ـ الادارة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب،فاروق مجدلاوي (ص: ٩٠).

(ضجنان)[١] بووم فەرمووی: شوانیم لەم شوێنەدا کردووە بۆ خەتاب ، دەیفەرموو هەندێ جار شوانیم دەکرد و هەندێ جاریش دارم کۆدەکردەوە،[٢] سەعیدی کوڕی موسەیب (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمێت: عومەر حەجی دەکرد کاتێك کە لە (ضجنان) بوو دەیفەرموو (لا اله الا الله العظيم المعطي مايشاء، لمن شاء)، من حوشترم لەم شیوە لە لەوەڕگاری (صوف) دەلەوەڕاند بۆ باوکم، کە زۆر بە زەبرو زەنگ و تورە بوو ، کاتێك ئیشی پێدەکرد ماندووی دەکردم، ئەگەر کەمتەرخەمیم بکردایە لێی دەدام، ئێوارەم دەکردەوە و لە نێوان من و خوای گەورەدا هیچ کەسی تر نەبوو پاشان ئەم هۆنراوەی دەوتەوە:

لا شئ مما تـرى بشاشتـه
تبقى الاله ويردي المال والولد
لم تغن عن هرمز يوماً خزائنه
والخلد قد حاولت عاد مما خلدوا
ولا سليمان إذ تجري الرياح له
والانس والجن فيما بينها يـردُ
اين الملوك التي كانت نواهلها
من كل أوب اليها راكب يفد
حوضاً هنالك مورود بلا كذب
لابد من ورده يوماً كما وردوا[٣]

عومەر(رضي الله عنه) شوانی تەنها بۆ باوکی نەکردووە، بەڵکو شوانی ماڵی خاڵەکانیشی بوو لە تیرەی بەنی مەخزووم و هەر خۆی باسی ئەوەمان بۆ دەکات کاتێك ئەمیری باوەڕداران بووە، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە خۆی بناسێنێت ـ وەك ئەوەی من بزانم ـ ڕۆژێك لە نێو موسڵمانان وەستا و وتی من جگە لە لە شوانی مەڕ و ماڵات هیچی تر نەبوم، مەڕ و ماڵاتی ماڵی خاڵوانم لە تیرەی بەنی مەخزووم لەوەڕاندووە، محمدی کوڕی عومەری مەخزوومی لە بارەیەوە دەگێڕێتەوە: عومەر لە نوێژی هەینیدا کاتێك خەڵکی کۆبوون سەرکەوت بۆ سەر مینبەرەکەی و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد بەو شێوازەی شیاوی خوای گەورەیەو درود و ڕەحمەتی بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نارد و فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ڕۆژێك من شوانیم بۆ ماڵی خاڵوانم دەکرد لە بەنی مەخزووم ئەوان هەندێ خورما یان مێوژیان پێ دەدام و ئەمڕۆش بەم شێوەیە دەم بینن ، دوای ئەمە لە مینبەر هاتە خوارەوە، عبدالرحمن کوڕی عەوف وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ شتێکت نەوت کە پلەو پایەت بەرز بکاتەوە بەڵکو تەواو پێچەوانە قسەت کرد، عومەر فەرمووی: هاوار بۆتۆ کوڕی عەوف من لەگەڵ خۆمدا

١ـ ضجنان: چیایەکە لە دووری ٢٥ کم لە شاری مەککەوە.
٢ـ أخرجه ابن عساكر في تأريخه(٢٨٦/٥٢) طبقات ابن سعد(٢٢٦/٣) وقال الدكتور عاطف عاضة: صحيح الاسناد.
٣ـ الفاروق مع النبي، د. عاطف عاضة ص: ٥، نقله عن ابن عساكر (٢٦٩/٥٢).

دەدوام، نەفسم پێی وتم: تۆ ئەمیری باوەڕدارانی کێ هەیە لە تۆ باشترو پلە بەرز تر بێت ؟ منیش ویستم خۆمی پێ بناسێنم، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:شتێکم لە ناخی خۆمدا بەدی کرد، بۆیە ویستم سنوورێکی بۆ دابنێم.[١]

گومانی تێدا نیە کە ئەم پێشەیە ـ شوانی ـ بوەتە هۆی ئەوەی، کە عومەر لە ڕێیانەوە کۆمەڵە ئاکارو ڕەوشتێکی بەرز بەدەست بێنێ لەوانە : خۆگری، چوست و چالاکی ، هەروەها شوانی عومەری لە سەردەمی پێش ئیسلامدا سەرقاڵ نەکردووە،[٢] بەڵکو هەر لە سەرەتای لاوێتیەوە سەرقاڵی چەندین وەرزش بووە وەك زۆران بازی و ئەسپ سواری و شیعر ..هتد ، [٣] لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی داوە بە مێژووی گەلەکەی و سوور بووە لەسەر ئامادە بوون لە بازاڕی گەورەی عەرەب وەك بازاڕەکانی (عوکاز)و (جنة)و (ذي المجاز)و لێرەشدا سوودبینی لە بازاڕگا و ناسینی مێژووی عەرەب وەرگرتووە هەروەها شارەزای مێژووی شەڕەکانی عەرەب بوەو ئەم ڕووداوانەی لە چوارچێوەی چەندین شوێنەواری ئەدەبیدا نەخشاندووە .کە ئەو ڕوداوانە بونەهەوێنی گەلێك ئاسەواری ئەدەبی و جێی ڕەخنەو لێکۆڵینەوە کەڵە شاعیرانی ئەو سەردەمەو جێی پیا هەڵدان لەناو هەموو هۆزو تایفەکانی عەرەبدا. لە مێژووی عەرەب کردووە، کە نمایشێکی هەمیشە بزواو بێت و پەردەی لە بیرچوونەوە نەتوانێت پەردەپۆشی بکات و ڕەنگە شەڕی ئەم ڕووداوانەی ڕفاندبێت، هەروەها خوبینی عوکاز هۆیەکی ڕاستەوخۆ بووە لە ڕوودانی چوار جەنگ کە بە جەنگەکانی (الفجار) ناسراون.[٤]

عومەر سەردەمێك سەرقاڵی بازرگانی کردن بووە و ئەمەش وای لێ کردووە ببێتە یەکێك لە سەرمایەدارانی شاری مەککە لەکاتی سەردانیشیدا بە مەبەستی بازرگانی کردن بۆ ناوچەکانی دەرەوەی مەکە شارەزایی پەیدا کردووە بە خوڕەوشتی خەڵکانی ناوچەکە، هاوینیان بەرەو شام و زستانیش بەرەو یەمەن ڕۆیشتووە،[٥] پلەوپایەیەکی دیاری لەناو کۆمەڵگای جاهیلی مەککەدا هەبووە بەشێوەیەکی بەرچاو بەشداری لە کارەسات وروداوەکانی کردووە و ئەمەش هاوکاری کردووە لە ئاشنابوون بە مێژووی باوباپیرانی، هەروەها نەفیلی کوڕی عبدالعزی باپیری دەم ڕاستی قوڕەیشیەکان بوە بۆ چارەسەری کێشەکانیان و قورەیشیەکان دەچوونە لای و سەرباری ئەوەش باپیرە گەورەی کەعب کوڕی لوئەی لای عەرەب پلەوپایەیەکی گەورەی هەبووەو ساڵی مردنیان بە ساڵی فیل نەخشاندووە.[٦]

هەروەها عومەر ئەم پلەوپایەیەی لە باپیرانیەوە بۆ ماوەتەوە، کە بە هۆیەوە شارەزایی تێگەیشتنی بە بارودۆخی عەرەب و ژیانیان بەدەست هێناوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکی و هۆشیاری، ئەمەش

١ـ الطبقات الکبری لابن سعد (٢٩٣/٣) و له شواهد تقوية.
٢ـ الفاروق مع النبي، ص: ٦.
٣ـ التأريخ الاسلامي العام،علي حسن ابراهيم،ص:٢٢٦، الادارة الاسلامية في عهد عمربن الخطاب،ص:٩٠
٤ـ عمر بن الخطاب، حياته، علمه، أدبه، د. علي أحمد الخطيب، (ص: ١٥٣).
٥ـ عمر بن الخطاب، د. احمد ابو النصر (ص: ١٧).
٦ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٦).

وای لە دەوروبەرەکەی کردووە، کە لە کاتی سەختی و ئاڵۆزیەکاندا پەنای بۆ بەرن، ئیبنو سەعد دەڵێت: عومەر لە سەردەمی پێش ئیسلامدا دادوەری نێوان عەرەبەکانی دەکرد لە گێرەو کێشەکاندا.[١]

عومەر (کەسایەتیەکی دانا و تێگەیشتوو و کارامە و ژیر و بەهێز و بەڕێز بووەو ئەمەش وای لێ کردووە ببێتە باڵوێزێك بۆ قورەیشیەکان، بەر پرسی پەیوەندیە دەرەکیەکانیان بووە،[٢] ابن الجوزی دەفەرمووێت: باڵوێزی دراوە بە عومەرو ئەگەر جەنگێك لەنێوان قورەیش و هۆزێکی تردا رووی بدایە ئەوا قورەیشیەکان دەیانکردە باڵوێزی خۆیان و مایەی ڕێزو فەخرو شانازیان بووە وەك کەسێکی شیاو ناردوویانە بەملا و بەولادا و پێی قایل بوون.[٣]

عومەر(ﷺ) بەهەموو شێوەیك بەرگری لەو خوڕەشت و پەرستش وباوو نەریتانە دەکرد کە موڵکی قورەیش بوون و سروشتێکی پاراوی هەبووە و ئەمەش وای لێ کردووە خۆی بکاتە قوربانی ئەو بەرخودانەی باوەڕی پێ هەبووە بەمەش وای لێ هاتووە زۆر لێبڕاوانە بەرگری لەو شتانە بکات ، عومەر لە سەرەتای بانگەوازدا ڕێگری لە ئیسلام کردووە و ترساوە لەوەی ئەم ئاینە نوێیە ئەو یاسا و ڕێسا مەککیانە بهەژێنێت کە سەقامگیر بوون و لە نێوان عەرەبدا پلەو پایەیەکی تایبەتیان بۆ مەککیەکان نەخشاندووە چونکە مەککەماڵی خوای لێیە ئەمەش وای لە قورەیشیەکان کردووە ڕێزێکی تایبەتیان لەناو عەرەبەکاندا هەبێت، ئەو ماڵەش لە مەککەدا بۆتە هۆی بەدەستهێنانی بەروبوومی ڕووحی و مابینی بۆ مەککە و هۆی گەشەکردن و دەوڵەمەنبینی ناوخۆیی بووە، هەر لەبەر ئەمە مەککیەکان ڕێگریان لەم ئاینە دەکرد و زەبر و زەنگیان لەگەڵ بێ دەسەڵاتەکانیاندا بەکاردەهێنا و عومەریش توندڕەوترینی ئەو کەسانە بووە،کە بە زەبر و زەنگ بووە لەگەڵ بێ دەسەڵاتەکاندا.[٤]

کە نیزەکێك موسڵمان بوو بوو عومەر هێندەی لێدا هەتا دەستەکانی لاواز بوون و قامچیەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و لە ماندوویەتیدا وەستا و ئەبو بەکر بەلایداتێپەڕی کە ئەم دیمەنەی بینی کەنیزەکەکەی کڕی و ئازادی کرد.[٥]

عومەر لە سەردەمی جاهیلیدا چاو بەرز بووە و ئاکارو ڕەشتی و ڕەفتار و کرداری ئەو سەردەمەی ناسیوە و بە هەموو شێوەیەك بەرگری لێ کردووە، هەر لەبەر ئەوەش بووە کاتێ موسڵمان بووە جوانی و ڕاستی ئیسلامی بۆ دەرکەوتووەو هەستی بە جیاوازیەکی زۆر کردووە لەنێوان ڕووناکی و تاریکی و کوفر و ئیمان و ڕاستی و ناڕاستیدا هەر لەبەر ئەوەش فەرموویەتی: پەیوەندیە ئیسلامیەکان وردەوردە لێك دادەبچڕێن ئەگەر یەکێك لە نێو ئیسلامدا پێ گەیشت ئەوا هیچ لە جاهیلیەت نازانێت.[٦]

---

١ـ تأريخ خلفية بن خياط (ص:١/٧) نقلا عن د. العاني (ص: ١٦).

٢ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٦).

٣ـ مناقب عمر (ص: ١١).

٤ـ الفاروق عمر بن الخطاب، عبدالرحمن الشرقاوي (ص: ٨).

٥ـ هەمان سەرچاوە.

٦ـ الفتاوى (٣٦/١٥) فرائد الكلام للخلفاء الكرام (ص: ١٤٤).

# دوانگەی یەکەم

# موسڵمان بوون و هیجرەتی

## یەکەم: موسڵمان بوونی:

یەکەمین پڕشنگ لە نوری ئیمان دڵی عومەری ڕووناك کردەوە ئەو دەمە بوو، کە ئافرەتانی قوڕەیشی بینی بە پێی خۆیان لە ترسی ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی بە دەستی عومەر و هاوشێوەکانیەوە دووچاری دەبن وڵاتی خۆیان بەجێ دێڵن بەرەو وڵاتی غەریبی بەڕێ دەکەون، بۆیە ویژدانی ئازاری دا و چوو بۆ لایان و هەندێ لەو قسە خۆشانەی بۆ کردن کە پێشتر لە عومەر و هاوشێوەکانیەوە بەر گوێیان نەکەوتبوو.[1]

أم عبدالله کچی حنتمە وتی: لە کاتێکدا ئێمەی کۆچکەران بەرەو حەبەشە دەڕۆیشتین عومەر بەرەو ڕوومان هات هەتا لە ڕێگەکەماندا وەستا و ئێمەش لە دەستی ئەوەوە ئەشکەنجەو ئازاری زۆرمان چەشت بوو، کە پێم گەشت ، پێی وتم: ئەمە دەرچوونە ئەی ام عبداللە؟ منیش وتم: بەڵێ، سوێند بە خوا لە زەوی خوا دەردەچین، ئێوە ئازارتان داین و ڕقتان لێ هەڵگرتین،دەڕۆین هەتا خوای گەورە دەروویەکمان لێ دەکاتەوە، عومەر وتی: خواتان لەگەڵ بێت، من نەرمیەکم لێوە بینی کە لەوەو پێش لێم نە بینی بوو. کە عامری کوڕی ڕەبیعە هات کە چوو بو بە دەم هەندێ پێویستی خۆیەوە ڕۆیشتبوو ئەمەم بۆ گێڕایەوە وتی:وا دیارە تەماح لە موسڵمان بون عومەرە ؟ منیش وتم: بەڵێ، عامر وتی: هەتا کەرەکەی خەتاب موسڵمان نەبێت ، ئەو موسڵمان نابێت.[2]

ئەم هەڵوێستە زۆر کاری کردە سەر عومەر ، هەستی دەکرد کە سنگی توند بووە، ئەمە چ گرفتێکە کە شوێنکەوتووانی ئەم ئاینە نوێیە بە دەستیەوە گیرۆدەن لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خۆڕاگرن! دەبێت نهێنی ئەم هێزە برندەیە چی بێت؟! هەستی بە دڵتەنگی دەکرد و ئازار دڵی گرت ،[3] پاش کەمێك لەم ڕووداوە عومەر (رضي الله عنه) موسڵمان بوو ئەویش بەهۆی نزایەکی پێغەمبەری خۆشەویستەوە(ﷺ)، کە هۆکاری سەرەکی بوو لە موسڵمان بوونی عومەر و فەرمووی: ((خوای گەورە ئەم ئیسلامە سەرفراز بکەیت بەیەکێ لەم دوانە، کامیان خۆشەویسترە لەلات: ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، یان عومەری کوڕی خەتاب)).

---

١ـ اخبار عمر الطنطاوي (ص: ١٢).

٢ـ سيرة ابن هشام (٢١٦/١) فضائل الصحابة للامام احمد (٣٤١/١) اسناد حسن.

٣ـ الفاروق، عمر (ص: ٩).

هەروەها دەفەرمووێت: خۆشەویستترینتان لای خودا عومەر بوو،[١] خوای گەورە چەند هۆیەکی بۆ موسڵمان بوونی عومەر فەراهەم هێنا، عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: هەرگیز گوێم لە عومەر نەبووە بەشتێك بڵێت: گومان دەکەم وابێت، نەبێکا بێت، جارێکیان عومەر دانیشتبوو پیاوێکی جوان بە لایدا تێپەڕی، عومەر وتی: گومانەکەم، یا هەڵە یە، یا ئەم پیاوە لە جاهیلیەتدا لەسەر دینەکەی بووە یان ئەمە قەشە بوو، ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەن، پیاوەکەیان بۆ بانگ کرد، پاشان وتی: تا ئێستا نەمدیووە کە لە لایەن پیاوێکی موسڵمانەوە پێشوازی لێ بکرێت، ئەویش وتی: وازت لێناهێنم، تا راستیم پێ نەڵێیت ، پیاوەکە وتی: من قەشەیان بووم لە سەردەمی جاهیلیەتدا.

ئەویش وتی: سەرسوڕهێنەر ترین شتێ کە لە جنۆکەوە وەرت گرتبێت چیە؟ نائومێدیان لە پاش نسکۆی بینیوە،[٢] پێگەیشتنیان بە ئەگەرانەوەی سێبەریان و نەرفەزین یان بینیوە.[٣]

عومەر فەرمووی: ڕاستە، کاتێك ئێمە لای خوداکەیان نوستبووم، پیاوێك مەڕێکی لەگەڵ خۆی هێنا و بە توندی هاواری بۆ کرد، کە بە جۆرێك هەرگیز گوێم لە هاوری وا نەبوو، کە دەیوت: ئەی جلیح، فەرمانی داوە نەجیح، پیاوێکی پاراو دەفەرمووێت: لا اله الا الله، منیش هەستام، ئێمە هیچ هەرایەکمان لێوە نەهات هەتا ئەو وتی: ئەمە پێغەمبەرە.[٤]

سەبارەت بە هۆیەکانی موسڵمان بوونی عومەر چەندین چیرۆك هاتوون بەڵام بە سەرنجدان بە سەنەدەکانیان لە ڕووی فەرموودەوانیەوە زۆربەیان ناڕاستن،[٥] وە لە میانی ئەو چیرۆکانەی کە لە سیرە و مێژوودا هاتوون دەتوانین هۆکارەکانی موسڵمان بوونی عومەر دابەش بکەین بەسەر چەند ناو و نیشانێکدا لەوانە:

### ١- سوور بوونی لەسەر شەهیدکردنی پێغەمبەر(ﷺ):

قوڕەیش کۆبوونەوە دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: کێ محمد دەکوژێت؟ عومەر وتی: لێبگەڕێن بۆ من، وتیان ئەی عومەر ئەو کارە دەسپێرین بە تۆ، عومەر هاتە دەرەوە ، لە ڕۆژێکدا کە زۆر گەرم بوو، دڕندانە شمشێرەکەی بەدەستەوە گرت بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و چەند کەسێك لە یارانی، لەوانە ئەبو بەکر و عەلی و حەمزە(ﷺ) لە نێو ئەو موسڵمانانەدا بوون کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا مابوونەوە و لە مەککە دەرنەچووبوون بۆ حەبەشە، قوڕەیش هەواڵیان دا بە عومەر، کە موسڵمانان لە (دار الارقم) لە خوارووی (الصفا)وە کۆبوونەتەوە، لەم کاتەدا نوعەیمی کوڕی عبداللە ی نەححامی پێ دەگات، ئەویش لێی دەپرسێت: عومەر بۆ کوێ دەچیت؟

---

١ـ الترمذي (٣٦٨٢) المناقب وصحيحه لالباني، صحيح الترمذي (٢٩٠٧).

٢ـ نسکۆ: هەڵگەڕانەوەیە.

٣ـ نەرمەزین: دەخرێتە سەر پشتی حوشتر.

٤ـ البخاري (٣٨٦٦).

٥ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق، (ص: ٢٣) وقد ذكر اروايات التي ذكر منها الاسلام عمر و خرجها وحكم على اسانيدها.

ئەو شێتەم دەوێ کە بووەتە مایەی ناکۆکی ناو قورەیش و خەونەکانی تێک داون و ئاینەکەی لەنگ کردوون و خواکەیانی ناشرین کردووە، دەمەوێ بیکوژم، نوعەیم پێی وت: رێگەیەکی خراپت گرتۆتە بەر ئەی عومەر، سوێند بە خوا نەفست وای کردە لە خۆی یاخی بووە ، زیادە رۆییت کردوە و تیاچوونی بەنی عەدەیت دەوێت، پێت وایە بەنی (عبدمناف) لێت دەگەڕێن کە بەسەر زەویدا بگەڕێیت پاش ئەوەی کە محمدت کوشت؟ مشتو مڕیانبەردەوام بوو تا دەنگیان لێ بەرز بویەوە، عومەر وتی: من گومان دەکەم کە تۆش شێت بویت ؟ ، ئەگەر بزانم وابێت لەتۆوە دەست پێدەکەم ، کاتێك نەحام بینی عومەر هەر واز ناهێنێت وتی: دەی من هەواڵت پێ دەدەم کە کەس و کارت و کەس و کاری زاواکەت موسڵمان بوون لێت ئەگەڕاون کە لەسەر ئەم گومڕاییەت بێنیتەوە، عومەر کاتێك کە گوێی لەم قسانە بوو وتی: کامیان؟ ئەویش وتی: زاواکەت و ئامۆزاکەت و خوشکەکەت.[1]

## ٢- هەڵکوتانە سەر ماڵی خوشکەکەی و خۆڕاگری فاطمەی کچی خەتاب لە بەرامبەر براکەیدا:

کاتێك عومەر بیستی خوشکەکەی و زاواکەی موسڵمان بوون تورەیی و پەستی گرتی و رۆیشت بۆ لایان وکە لە دەرگاکەیانی دا وتیان ئەوە کێیە؟ وتی: کوڕی خەتابم، ئەوان سەرقاڵی خوێندنی قورئان بوون، کە گوێیان لەدەنگی عومەر بوو هەستان دەستیان کرد بە خۆشاردنەوە و لەبیریان چوو کە قورئانەکە لاببەن، کاتێك هاتە ژوورەوە خوشکەکەی بینی زانی کە شەڕ لە نێوچەوانی دەبارێت هەستا بە شاردنەوەی قورئانەکە لە ژێر ڕانیدا، عومەر وتی: ئەم دەست بەسەراگرتن و چرپە چرپە چیە کە لای ئێوە گوێم لێیەتی، ئەوان لەو کاتەدا سورەتی (طه)یان دەخوێند.

وتیان: چەند قسیەکی بەینی خۆمان بوو ، عومەر وتی: ڕەنگە ئێوەش شێت بووبن؟ زاواکەشی وتی: رات چیە لەسەر ئەوەی راستی لەو ئاینەدا بێت؟ عومەر هەڵی کوتایە سەر زاواکەی و بەتوندی ڕیشی گرت و هەردووك تێك هەڵگڕان و عومەر لەبەر ئەوەی کە زۆر بەهێز بوو دای بە زەویدا و چوویە سەر سنگی لەم کاتەدا فاطمەی خوشکی هات عومەر لابات، لەسەر سنگی هاوسەرەکەی، بەڵام عومەر مشتەکۆڵەیەکی دا بەناو دەمیدا و پڕی کرد لە خوێن و فاطمة وتی:لە کاتێکدا زۆر تورە بوو ئەی دوژمنی خوا! ئایا لەسەر ئەوە لێم دەبێنی، کە بومەتە یەکتاپەرست؟ وتی : بەڵێ لەسەر ئەوەیە.فاتیمە وتی: دەی چی دەکەیت بیکە، أشهد ان لا الـه الا الله وأن محمداً رسول الله، ئێمە موسڵمان بووین ، عومەر کاتێك ئەمەی بیست پاشگەز بوویەوە و لەسەر سنگی زاواکەی هەستا و دانیشت، پاشان وتی: ئەو کتێبەی کە لاتانە بمدەنێ با بیخوێنمەوە، خوشکەکەی وتی: پێت نادەم، عومەر وتی: بەڕاستی ئەو قسیەت کاری تێکردوم، بمدەرەوە با سەیری بکەم، منیش بەڵێنت پێ دەدەم کە خیانەتت لێ نەکەم بتدەمەوە، خوشکەکەی وتی: تۆ پیسی و ئەم قورئانە جگە لەپاکان نابێت کەس

---

[1] ـ سيرة ابن هشام (٣٤٣/١) وفيه انقطاع، الطبقات لابن سعد (٢٧٦/٣) عن القاسم بن عثمان البصري عن أنس، والقاسم ضعيف، وقد حقق الروايات الدكتور وحي الله محمد عباس في تحقيقه (فضائل الصحابة). للامام احمد بن حنبل (٣٤٢/١).

دەستی لێبدات: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ (الواقعة: ٧٩)،هەستە خۆت بشۆ یا دەست نوێژێك بگرە، عومەر هاتە دەرەوە تا خۆی بشوات و دواتر ئەگەرایەوە لای خوشکەکەی و ئەویش ئەو پارچە قورئانەی پێدا کە سورەتی (طـه) و چەند سورەتێکی تری تێدا بوو، سەرەتاکەی (بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان) بوو ، کاتێك عومەر ئەمەی خوێندەوە (بەخشندە و میهرەبان)ترسا، پاشان قورئانەکەی لە دەست کەوت، دواتر ئەگەرایەوە سەر خۆی و گرتیەوە بە دەستیەوە دەستی بە خوێندنەوە کرد:

﴿طه ۝ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ۝ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ۝ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ۝ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ۝ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى﴾ (طه: ١-٧).

بەلایەوە زۆر پیرۆز گەورە بوو وتی: قورەیش لەمە ڕایان کردووە؟دواتر دەستی کرد بە خوێندن،تا گەشتە ئایەتی:

﴿إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ۝ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ۝ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ﴾ (طه: ١٤-١٦).

وتی: هەر کەسێك ئەم قسانە بکات تەنها ئەو شیاوی پەرستنەو نابێت کەسی تری لەگەڵ بپەرسترێت ببە بۆ لای محمد.[١]

## ٣- چوونی بۆ لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و ئاشکراکردنی موسڵمان بوونی:

کاتێك کە خەباب (رضي الله عنه) گوێی لەمە بوو( کە مامۆستاکەیان بوو)خۆی حەشار دابوو هاتە دەرەوەو وتی: مزگێنی بێت ئەی عومەر من تکام وایە نزاکەی ڕۆژی دووشەممەی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) پێشی بە تۆ گرتبێت کە فەرمووی: ((خوای گەورە ئەم ئیسلامە سەرفراز بکەیت بەیەکێ لەم دوانە، کامیان خۆشەویستترە لەلات: ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، یان عومەری کوڕی خەتاب).[٢]

پاشان عومەر وتی: شوێنی پێغەمبەری خوام (ﷺ) پێ نیشان بدەن، کاتێك کە زانیان ڕاست دەکات وتیان: ئەوەتا لە خواری (الصفا)وە، عومەر شمشێرەکەی لە کالان دەرهێناو بەرەو لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و یارانی بەڕێکەوت و لە دەرگای دا، ئەوانیش کە گوێیان لە دەنگی بوو

---

١ـ فضائل الصحابة للامام احمد (١/٣٤٤).
٢ـ عمر بن خطاب الطنطاويات (ص: ١١٧).

لەرزین و کەسێك لەوان نەیتوانی دەرگاکەی بۆ بکاتەوە لەبەر ئەوە توند و تیژی و رق ئەستوری ئەویان بینی بوو بەرامبەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، کاتێك حەمزە(ﷺ) ئەم دیمەنەی بینی خەڵکەکەی راچڵەکاند و فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ وتیان: عومەری کوڕی خەتابە، حەمزە فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب، دەرگاکەی لێ بکەنەوە، ئەگەر خودا چاکەی ئەوی بوێت موسڵمان دەبێت، ئەگەر وانەبێت ئەوا کوشتنی بەدەست ئێمە زۆر ئاسانە، دەرگاکەیان لێ کردەوە، لەم کاتەدا حەمزە و پیاوێکی تر دەستیان گرت و بردیان بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و ئەویش فەرمووی: (لێی ئەگەڕێن)،[1] پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)هەستا و دامەنی گرت ، بە کۆکردنەوەی عەباکەی توند توند گوشی فەرمووی: (چی تۆی گەیاندۆتە ئێرە ئەی کوڕی خەتاب؟ سوێند بە خوا من نابینم تۆ کۆتاییت پێ بێت هەتا خوای گەورە رۆژێگارێکی سەخت و دژوارت بەسەرتا نەبێت )، عومەریش پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووم هەتا باوەڕ بە خودا و پێغەمبەرەکەی و ئەوەش بهێنم کە تۆ لە لای خوداوە هێناوتە، پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) (الله اکبر) ی کرد و خاو و خێزان و یارانی زانیان عومەر موسڵمان بووە بڵاوەیان لێ کرد و سەرفراز بوون. کە بینیان عومەر موسڵمان بووە و لەگەڵ حەمزەی عبدالمطلب دایە، دڵنیا بون لەوەی ئەم دوو پیاوە بەرگری دەکەن لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)و لە دوژمنەکانی دەپارێزن.[2]

## ٤- سوور بوونی عومەر(ﷺ) لەسەر ڕاست وتن بەبانگەوازو بەرگەگرتنی دژواریەکانی ڕێگای:

عومەر زۆر بە دڵسۆزانەوە چوویە نێو ڕێزی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و کاری دەکرد لەسەر چەسپاندنی ئیسلام بە هەموو هێزێکیەوە ، بە پێغەمبەری خۆشەویستی(ﷺ) فەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەمان و مردن هەر لەسەر هەق نین؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە ئێوە لەسەر هەقن ئەگەر بمرن یان بژین، عومەر فەرمووی: ئەی بۆ خۆمان حەشار بدەین؟ سوێند بەو زاتەی تۆی بە ڕاستی ناردووە ئاشکرای دەکەین و واز لەم نهێنیە دەهێنین، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەیزانی ئێستا کاتێکی لەبارە بۆ بانگەواز و بانگەوازیش سەرەتای بەهێز بوونیەتی و پێویستە بەرگری لە خۆی بکات، ڕێگەی بە ئاشکرا کردنی دا و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هاوەڵان بەدوو ریز هاتە دەرەوە بەجۆرێك عومەر لە ڕیزێك و حەمزەش لە نێو ریزەکەی تردا بوو، هەروەکو ئارد تۆزێکی نەرمیان هەبوو هەتا چوونە نێو مزگەوتەوە، قورەیشیەکان زوو زوو سەیری عومەر و حەمزەیان دەکرد و بەمەش دووچاری خەمۆکیەك بوون کە پێشتر بە خۆیانەوە نەیان بینبوو هەر ئەو ڕۆژەش پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) عومەری ناونا (الفاروق) جوێکەرەوە.[3]

---

١- أخبار عمر, الطنطاويات (ص: ١٨).
٢- فضائل الصحابة للامام احمد (١/٣٤٤).
٣- حلية الاولياء (١/٤٠) صفة الصفوة (١/١٠٣-١٠٤).

بەڕاستی خوای گەورە بە موسڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) ئیسلام و موسڵمانانی سەرفراز کرد، عومەر پیاوێکی ئازا و بەجەرگ بوو باکی لەو شتانە نەبوو کە بە دوایەوە بوون، یارانی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ)بەوو حەمزە دڵخۆش بوون [١] بووبونە بەرگری کەریان، عومەریش بەرەنگاری بێباوەڕانی قوڕەیش بوویەوە هەتا لە کەعبە[٢] نوێژی خوێند و موسڵمانانیش نوێژیان لەگەڵ بەجێ هێنا، عومەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر ئەشکەنجەدانی دوژمنانی ئیسلام بە هەر شێوەیەك بێت با لێنەگەڕێن خۆی ئەمەمان بۆ بگێڕێتەوە:

عومەر(ﷺ) دەفەرموێت: من نەمدەویست پیاوێك لە موسڵمانان ببینم ، چووم بۆ لای ئەبو جەهلی خاڵم، کە پیاوێکی دەسسەلاتدار بوو، لە دەرگایم دا، وتی کێیە؟ وتم: کوڕی خەتاب، هاتە دەرەوە بۆ لام و وتم: دەزانی من شێت بوم؟ وتی: ئەمەشت کرد؟ وتم بەڵێ، وتی: شتی وا نەکەی، وتم: بەڵێ، وتی: شتی وا نەکەی: وتم: بەڵێ، ئەویش چویەوە ژورەوەودەرگاکەی لەسەر داخستم و وتم ئەمە هیچ نیە، دواتر چووم بۆ لای پیاوێکی تر لە بەرێزەکانی قوڕەیش و لە دەرگام دا و وتی: ئەوە کێیە؟ وتم: کوڕی خەتابم، ئەویش هاتە دەرەوە بۆ لام و وتم: ئایا دەزانی کە موسڵمان بووم؟ وتی ئەمەشت کرد ؟ وتم بەڵێ، وتی نەکەی، پاشان چوویە ژورێ و دەرگاکەی لەسەرم داخست،منیش وتم ئەمە هیچ نیە، دواتر پیاوێك وتی: دەتەوێ خەڵکی بەموسڵمان بوونت بزانن؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەگەر خەڵکی دانیشتن و کۆبوونەوە بچۆرە لای (جمیل کوڕی موعەمەر الجمحی) لە لای ئەو دانیشە و بڵێ: زانیوتە موسڵمان بووم؟، هەر کە خەڵکەکە کۆبوونەوە چوم بۆلای و پێم وت زانیوتە موسڵمان بووم؟، هەستایە سەر پێ و بە هەموو دەنگی هاواری کرد: کوڕی خەتاب شێت بووە، بەم شێوەیە خەڵکی هاتن لێیان دام و منیش لێم دان.[٣]

لە ڕیوایەتی عبدالله کوڕی عومەر(ﷺ)یشدا هاتووە دەفەرموێت: کاتێ عومەر موسڵمان بوو قوڕەیش نەیانزانی ، عومەر فەرمووی: کێ لە ئەهلی مەککە قسە بە باشی دەگوێزێتەوە؟ وتیان (جمیل کوڕی موعەمەر الجمحی) ئەویش چوو بۆ لای و منیش شوێنی کەوتم تا بزانم چی دەکات چونکە لەو کاتەدا من منداڵێکی ژیر بووم و هەستم بەو شتانە دەکرد کە دەم دبینی و دەمبیست، عومەر هاتە لای جەمیل و پێی فەرموو: من موسڵمان بووم، سوێند بە خوا جەمیل هیچی نەوت هەتا عومەر چمکێکی عەباکەی گرت و ڕایکێشا، پاشان باوکم شوێنی کەوت و منیش شوێنیان کەوتم، هەتا گەیشتنە بەر دەرگای مزگەوت لە کاتێکدا خەڵکی سەرقاڵی بت پەرستی بوون، جەمیل بە دەنگی بەرز هاواری کرد عومەر شێت بووە، عومەریش لە دواوە دەیفەرموو: درۆ دەکات بەڵکو موسڵمان بووم و شاهێدم داوە کە یەك خوا هەیە ئەویش (الله)یە و محمد بەندە و پێغەمبەری خوایە، بەم شێوەیە خەڵکەکە بەگژیدا هاتن و ئەویش هەڵیکوتایە سەر عەتبەی کوڕی ڕەبیعە و دای بە زەویدا و لێیدا و دەستی کرد بە چاویدا و ئەمەش وای لە عوتبە کرد هاوار بکاتە خەڵکەکە عومەر دوور بخەونەوە و

---

١ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب (ص: ٢٦-٢٧).

٢ـ الرياض النضرة (٢٥٧/١) لمحب الطبري.

٣ـ شرح المواهب (٣٢٠/١)، اخبار عمر، الطنطاويات (ص: ١٩).

پاشان عومەر هەستا و کەس نەیدەوێرا ورتەی لێوە بێت و تەنانەت دەسەڵاتدارەکانیش بێدەنگ بوون ، خەڵکی لە عومەر کۆبوونەوە ئەویش دەڕۆیشت و لە کۆڕی بێباوەڕاندا دادەنیشت و باسی ئیسلامی بۆ دەکردن، [١] ، بەردەوامیش لەگەڵیان دەجەنگا هەتا خۆر دەیدا لەسەر سەریان دواتر عومەر قولانجی دەگرت و دادەنیشت و ئەوانیش لەسەری هەڵدەوەستان و ئەویش دەیفەرموو: چۆنتان پێ باشە ئەنجامی دەن، سوێند بە خوا ئەگەر سێ سەد پیاو چوینایە لێی دەگەڕان بۆمان یان وازیان لێ دەهێنا بۆ ئێوە، کاتێك ئەمان لەم مشت و مڕەدا بوون پیاوێك هات کە پۆشاکێکی ئاوریشم و کراسێکی ڕەنگاوڕەنگی لەبەر بوو و وتی ئەوە چیتانە؟ وتیان کوڕی خەتاب شێت بووە، ئەویش وتی: چی تیایە، پیاوێکە و ئایینێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، ئایا ئێوە پێتان وایە بەنی عەبینی ئەو هاوەڵەی خۆیانتان بەدەستەوە دەدەن؟ ئەمە وەك پۆشاکێك وایە کە هەڵماڵرابێت و ئاشکرا بوبێت، دواتر لە مەدینە وتم باوکە ئەو پیاوەی ئەو ڕۆژە کێ بوو؟ ئەویش وتی کوڕم ئەوە عاصی کوڕی وائلی سەهمی بوو. [٢]

## ٥- کاریگەری عومەر لەسەر بانگەواز:

عبدالله کوڕی مەسعود(ﷺ) دەفەرمووێت: لەو ڕۆژەوە عومەر موسڵمان بوو ئێمە چاومان کردەوەو هەناسەیەکی ئاسودەییمان هەڵکێشا، ئەمان دەتوانی تەوافی بەیت بکەین نوێژی لێ بکەین هەتا ئەو ڕۆژەی عومەر موسڵمان بوو، پاش ئەوەی عومەر موسڵمان بوو لەگەڵیان دەجەنگا هەتا لێمان دەگەڕان ئێمەش نوێژمان لە بەیت کرد و تەوافی کەعبەمان کرد، [٣] هەروەها عبدالله دەڵێت: موسڵمان بوونی عومەر پاکسازیەك بوو، کۆچکردنیشی سەرکەوتنێك بوو، هەروەها ئەمیرایەتی کردنیشی ڕەحمەت و بەزەیی بوو، ئەمان دەتوانی لە کەعبە نوێژ بکەین و تەوافی بکەین، کاتێ عومەر موسڵمان بوو ئێمە لەگەڵ بێباوەڕان دەجەنگاین هەتا لێمان ئەگەڕێن نوێژەکانمان بکەین، [٤] هەروەها سوهەیبی کوڕی سینان دەفەرمووێت: کاتێك عومەر موسڵمان بوو ئیسلام دەرکەوت و بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ دەکراو و لە دەوری کەعبەدا دادەنیشتین و ئەڵقەمان پێك دەهێنا و تەوافمان دەکرد و ڕیزمان دەدا بە دەوری ئەو کەسانەی، کە ڕقیان لێمان دەبوویەوە. [٥]

شاعیر ڕاستی فەرمووە دەربارەی عومەر دەڵێت:

أعني به الفاروق فرقة عنوةً
بالسيف بين الكفر والايمان
هو أظهر الاسلام بعد خفائه
ومما الظلام وباح بالكتمان [٦]

---

١ـ الرياض النضرة (ص: ٣١٩).
٢ـ فضائل الصحابة للامام احمد (٣٤٦/١) إسناد صحيح.
٣ـ فضائل الصحابة (٣٤٤/١) إسناد حسن.
٤ـ الشيخان ابو بكر وعمر برواية البلاذري (ص: ١٤١).
٥ـ الطبقات الكبرى (٢٦٩/٣) صفة الصفوة (٢٧٤/١).
٦ـ نونية القحطاني (ص: ٢٢).

## ٦- مێژووی موسڵمان بوونی و ژمارەی ئەوکەسانەی لەو ڕۆژەدا موسڵمان بوون:

عومەر(ﷺ) لە مانگی (ذي الحجة) ی ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی موسڵمان بووە لە کاتێکدا تەمەنی ٢٧ ساڵان بووە،[1] عومەر بە سێ ڕۆژ[2] پاشی حمزە(ﷺ) موسڵمان بووە، ئەو دەمە ژمارەی موسڵمانان تەنها(٣٩ کەس بووە و عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت بینیم کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا تەنها ٣٩ کەس موسڵمان بوون و بە منەوە بوون بە چل کەس و پاشان خوای گەورە ئاینەکەی ئاشکرا کرد و ئیسلامی سەرفراز کرد، دەگێڕێتەوە ئەوان ژمارەیان چل یان چل و چەند کەسێك بووە لەگەڵ ١١ ئافرەتدا بەڵام عومەر هەموویانی نەناسیوە لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ترسی بێباوەڕان موسڵمان بوونی خۆیان شاردۆتەوە بە جۆرێك کە عومەر پێشتر زۆر توند و تیژ بووە بەرامبەریان و باس لەوە دەکات ئەو ژمارەی کردوونەتە چل کەس و ناوی ئافرەتیشی نەهێناوە.[3]

### دووەم: هیجرەتی عومەر

کاتێك عومەر کۆچی کرد بۆ مەدینە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە دەبێت بە ئاشکرا کۆچ بکات، ئیبنو عباس (ﷺ) دەفەرمووێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) بۆی باسکردم: هەمو هاوەڵان بەنهێنی کۆچیان کرد، عومەرنەبێت ،کاتێك ویستی هیجرەت بکات, شمشێرەکەی کردە ملی و تیرو کەوانەکەی ئامادە کرد و چەند تیرێکی دەرهێناو کەوانەکەی بەدەستەوە گرتو بە بەردەم کەعبەدا تێپەڕی و قورەیش لە بەردەرگای کەعبەدابوون ، حەوت جار بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوە ، پاشان هاتە مەقامی ئیبراهیم و نوێژی تێدا خوێند و دواتر یەك یەك لەسەر ئەڵقەکان وەستا و فەرمووی: ڕووەکان ناشرین بوون، خوای گەورە ئەم لوتانە خوارو زەلیل دەکات، هەر کەس دەیەوێت دایکی جەرگ سوتاو بێت و منداڵەکانی هەتیو بکەوێت و خێزانی بێوەژن بێت با لە پشت ئەم شیوەوە پێم بگات، عەلی(ﷺ) دەفەرمووێت: کەس شوێنی نەکەوت جگە لە کەسانێکی لاواز نەبێت کە فێری دەکردن و ڕێگەی پێ نیشان دەدان و بەرەو شوێنی مەبەست ڕۆیشت.[4]

چوونی عومەری کوڕی خەتاب بۆ مەدینە پێش چوونی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بوو، کۆمەڵێ خزم و کەسیشی لە ڕێگا پێگەشت و هەموان پێکەوە کۆچیان کرد، لەوانە: زەیدی کوڕی خەتاب و عەمر و عبالله ی کوڕانی سوراقەی کوڕی موعتەمەر و خەنیسی کوڕی حوزافەی سەهمی کە هاوسەری حەفصەی کچی بوو لەگەڵ سەعیدی کوڕی زەیدی ئامۆزای کە یەکێکە لە دە مژدە پێدراوەکەی بەهەشت و واقبینی کوڕی عبدالله تەمیمی کە هاوپەیمانیان بووهەروەها خەولای کوڕی ئەبی خەولا و مالکی کوڕی ئەبو خەولا، کە هەردوو هاوپەیمانی تیرەی بەنی عەجل و بەنو بەکیرو ئیاس و خالیدو

---

١- تأريخ الخلفاء (ص: ١٣٧).
٢- أخبار عمر الطنطاويات (ص: ٢٢).
٣- أخبار عمر الطنطاويات (ص: ٢٢).
٤- هەواڵی گرنگ نەبێت، بنواڕە (صحيح التوثيق في سيرة الفاروق ص: ٣٠).

عاقل و عامری هاوپەیمانیان لە تیرەی ساعیبینی کوڕی لەیس، کە دابەزینە سەر ڕووقاعیبینی کوڕی مونزر لە تیرەی عەمری کوڕی عەوف لە بەقا ،[١] بەرائی کوڕی عازب(رضي الله عنه) دەفەرموویت یەکەمین کەسێك هات بۆ لامان موصعەبی کوڕی عومەیرو ئیبنو ئوم مەکتووم بوون کە قورئانیان بۆ خەڵکی دەخوێند پاشان بلال و سەعد و عەماری کوڕی یاسر هاتن و پاشان عومەری کوڕی خەتاب هات، کە ٢٠ کەسی لە یارانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەگەڵدا بوو دواتر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هات و منیش خۆشی خەڵکی مەدینەم نەبینیوە وەك ئەو خۆشیە بێت کە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)یان دەربڕی.[٢]

بەم شێوەیە عومەر لە خزمەتی ئایین و بیر و بڕواکەیدا بە کردار و گوفتار مایەوەو لە پێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا، سەرباری ئەوەش عومەر(رضي الله عنه) چەکێك و هاوکاریەك بووە بۆ هەر موسڵمانێکی مەککە کە بە نیازی کۆچ بوویێت هەتا دەرچووە و ئەوەتا ئەم شاندە گەورەیەی لە دۆستانی و هاوپەیمانانی لەگەڵ بووە و عومەر(رضي الله عنه) هاوکاری کەسانی تری کردووە کە حەزیان بە کۆچ کردووە و لەوەش ترساوە کە ئەو جۆرە کەسانە دووچاری فیتنە و بەلایەك ببنەوە[٣] لە ناخی خۆیاندا، با لێرەشدا لێگەڕێین خۆی لەو بارەیەوە بۆمان بدوێت:

من و عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و هیشامی کوڕی عاصی کوڕی سەهمی کە بە نیازی هیجرەت بووین بۆ مەدینە و بەڵێنمان دا لە نێو دارەکانی (أضاءة)[٤]ی بەنی غەفاری سەر (سرف)[٥] کۆببینەوە و وتمان: هەر کام لە ئێمە لەوێ نەبوو، بەند کرا با هاوەڵەکانی تری بەجێی بهێڵن و چاوەڕێی نەکەن عومەر دەفەرموویت من و عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە لە نێو دارەکاندا بووین، بەڵام هیشام گیری کرد و گێچەڵی بۆ سازداین،[٦] کاتێك بەرەو مەدینە بەڕێ کەوتین لە بەقا لای بەنی عەمری کوڕی عەوف ماینەوە و لەم کاتەدا ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و حارسی کوڕی هیشامی کوڕی ئەبی ڕەبیعە هاتنە دەرەوە کە هەم ئامۆزا و هەم برای دایکیان بوو، هاتن لەگەڵمان بەرەو مەدینە و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)یش لە مەککەدا بوو ئەوان قسەیان لەگەڵ عەیاش کرد و وتیان: دایکت سوێندی خواردووە هەتا نەئەگەڕێیتەوە شانە لە سەری نەدات و لەبەر خۆریش دانیشتووە و ناڕواتە سێبەرەوە هەتا نەتبینێت، ئەمیش دڵی بۆی نەرم بوو، عومەر دەفەرموویت: وتم ئەی عەیاش ئەمانە دەیانەوێت لەسەر ئەم ئاینەت لە خشتە بەرن، وریایان بە بە خوا دایکت ئەگەر ئەسپێ بدات لەسەری ئەوا شانەی دەکات و ئەگەر ئەگەرمای مەککەش بێزاری بکات ئەوا دەڕواتە سێبەرەوە، دواتر عەیاش وتی: دەمەوێت بە باشی بە دەم سوێندەکەی دایکمەوە بچم و لەوێش پارە و پولێکم هەیە لەگەڵ خۆمی

---

١ـ فتح الباري (٧/٢٦١) نقلا عن صحيح التوثيق (ص: ٣١).
٢ـ البخاري رقم ٣٩٢٥.
٣ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق عمر بن الخطاب (ص: ٣١).
٤ـ (أضاءة) دە میل لە مەککەوە دوورە.
٥ـ کێوێکە لە مەککە.
٦ـ الهجرة النبوية المباركة، عبدالرحمن عبدالبر (ص: ١٢٩).

بهێنم، عومەر دەفەرموویێت وتم:تۆ دەزانی کە من یەکێکم لەوانەی کە زۆرترین ماڵم هەیە لە مەککەوە نیوەی ماڵەکەمت دەدەمێ بەس مەگەڕێوە، بەڵام عەیاش نکوڵی کرد و بڕیاری دا لەگەڵ ئەوان بگەڕێتەوە، عومەر دەفەرموویێت وتم: ئەگەرچی هەر دەتەوێت ئەم کارە بکەیت ئەم حوشترەی من لەگەڵ خۆت ببە ئەم حوشترە زۆر ڕەسەن و گوێڕایەڵە بەکاری بهێنە بۆ سواری ئەگەر بەدەست ئەمانەوە گرفتێکت بۆ هاتە پێش خۆتی پێ دەرباز بکە، عەیاش بەو حوشترە لەگەڵ ئەوان بەڕێکەوت، پاش ئەوەی کە هەندێ ڕێگەیان بڕی ئەبو جەهل بە عەیاشی ووت براکەم سوێند بە خوا ئەم حوشترەم کەوتووە بە ڕقدا ئایا لەسەر ئەو حوشترەی خۆت سوارم ناکەیت؟[1] عەیاش وتی: بەڵێ، وتی: بیخە، بیخە، هەتا بڕواتە سەر پشتی، کاتێك کە حوشترەکە نزم بوویەوە بۆ زەوی هەردووکیان هێرشیان کردە سەر عەیاش و کۆت و زنجیریان کرد و بردیانەوە بۆ مەککە گێچەڵێکیان پێ هەڵایساند،[2] عومەر دەفەرموویێت: ئێمە دەمان وت: خوای گەورە شایستەیە لەوەی کەسێك فیتنەیەك ساز بدات بەبێ خەوشی و ناداردوەری و پەشیمان نەبوونەوە، گەلانێك خودایان ناسیوە کەچی دەگەڕێنەوە بۆ ناو کوفر بۆ دووچار بوونی ئەو نەهامەتیەی کە دێتە ڕێگایان، پاشان وتی: ئەوان هەر ئەمە بە خۆیان دەڵێن، هەر کە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە شاری مەدینە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموویێت:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ (الزمر: ٥٣-٥٥).

عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دەفەرموویێت: ئەم ئایەتانەم بە دەستی خۆم نووسی و ناردم بۆ هیشامی کوڕی عاص و پاشان هیشام دەفەرموویێت کاتێك کە نامەکەم پێ گەیشت لە (ذي الطوى)[3] دەمخوێندەوە و پیایدا سەرکەوتم و سەرم بۆ نزم دەکردەوە و لێی تێنەدەگەیشتم هەتا وتم: خوای گەورەا تێم بگەیەنە لەم ئایەتانە و دواتر هیشام دەڵێت بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی لەسەر ئێمە دابەزاندووە، سەبارەت بەوەیە کە ئێمە دەربارەی خۆمان دەیلێین و خەڵکی باسمان لێوە دەکەن هەروەها دەڵێت پاشان سواری حوشترەکەم بووم و خۆم گەیاندە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەدینە،[4] ئەم ڕووداوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە عومەر(ﷺ) چۆن پلانی بۆ هیجرەتی خۆی و هاوەڵەکانی عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و هیشامی کوڕی عاصی کوڕی وائلی سەهمی دارشتووە کە هەر یەکەیان لە هۆزێك بوون و شوێنی بەیەك گەیشتنیان جێگایەکی دوور بووە لە دەرەوەی مەککە و لەسەر ڕێی

---

١ـ واتا پێکەوە با سواری حوشترەکەی تۆ بین
٢ـ السيرة النبوية الصحيحة (١/٢٠٥).
٣ـ (ذي الطوى) یەکێکە لە شیوەکانی مەککە.
٤ـ الهجرة النبوية المباركة (ص: ١٣١).

مەدینە بووە هەروەها ئەو بە تەواوی کات و ساتی بە یەکگەیشتنەکەی دیاری کردووە بە جۆرێك ئەگەر یەکێکیان دواکەوت ئەوا هاوڕێکانی بەجێی دێڵن و چاوەڕوانی ناکەن لەبەر ئەوەی کە گیراوە هەروەك ئەوەی کە چاوەڕوانیان دەکرد، ئەوەتا هیشامی کوڕی عاص(ﷺ) بەند دەکرێت و لە هەمان کاتدا وعمەر و عەیاش درێژە دەدەن بە کۆچەکەیان و پلانەکە بەتەواوی سەردەکەوێت و هەروەك بە سەلامەتی دەگەنە مەدینە[١] و قورەیشیەکانیش بەردەوام دەبن لەسەر شوێن کەوتنی کۆچەرەکان و هەر لەبەر ئەمەش ئەبو جەهل و حارس هەڵدەستن بە ئامادەکردنی پلانی دادگایی کردن کە هەردووکیان لە دایکەوە برای عەیاش بوون و ئەمەش وای لە عەیاش کرد کە دڵنیا بێت لێیان و بە تایبەتیش لە کارێکدا کە پەیوەندی بە دایکیەوە هەبوو، ئەبو جەهل ئەم فێڵەی سازدا لەبەر ئەوەی دەیزانی عەیاش ڕەحم و سۆزی بۆ دایکی هەیە بە جۆرێك ئەم کارە ڕوون و ئاشکرا دەبێت کاتێك کە عەیاش قایل بوونی خۆی لەسەر ئەگەرانەوە نیشان دەدات و هەروەك چۆن ڕووداوی هەستێکی ئاسایشی و سەقامگیری بەرز دەردەکەوێت کە عومەر(ﷺ) چێژی لێ وەردەگرێت و هەر چۆنێك پەی بە کاری ئەو ڕفاندنەیان[٢] هەروەها عومەر لێرەدا ئاستێکی گەورە لە کاری ئەو برایەتیەی دەردەخات کە ئیسلام لە ناخیدا بنیاتی ناوە ئەویش بەوەی کە نیوەی ماڵەکەی دەبەخشێت لە پێناوی سەلامەتی براکەی و لەوەش کە بێباوەڕان پاش ئەگەرانەوەی عەیاش بەلایەك بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ساز بدەن، بەلام هەستی سۆزداری زاڵ دەبێت بەسەر عەیاشدا بەرامبەر بە دایکی و چاکەی بۆی لەبەر ئەوە بڕیار دەدات کە بەرەو مەککە بگەڕێتەوە هەتا سوێندەکەی دایکی بەجێ بهێنێت و ئەو ماڵ و پاە و پولەشی هەیەتی لەگەڵ خۆی بیهێنێت و هەر لەم کاتەشدا دەست پاکی وای لێ دەکات کە لە نیوەی ماڵی براکەی بگەڕێت لە کاتێکدا ماڵەکەی خۆی لە مەککەیە و دەستی لێ نەدراوە سەرباری ئەوەش پێشبینی عومەر زۆر لەوە دوورتر بوو هەروەك بە دوو چاوی سەر ئەو چارەنووسە بەدفەڕە بەدی بکات کە چاوەڕوانی عەیاشە ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ مەککە هەروەها عومەر کاتێك کە نەیدەتوانی قایلی بکات حوشترە ماندووە ڕەسەنەکەی خۆی پێدا هەر ئەوەش هاتە ڕێگای عەیاش کە عومەر پێشبینی دەکرد[٣] لە زوڵم و ستەمی بێباوەڕان.

وە لە ڕیزی موسڵمانان ڕەش کرایەوە چونکە خوای گەورە بێخەوشی و نادادوەری لە کەسانێك ناوێ کە ئاژاوە بسازێنن و لە نێو کۆمەڵگای نەفامیدا بژین هەر بۆیە خوای گەورە ئایەتی خۆی دادەبەزێنێت و دەفەرموێت:

﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ (الزمر: ٥٣).

---

١ـ التربية القيادية (٢/١٥٩).
٢ـ السيرة النبوية عرض وقائع وتحليل الاحداث للصلابي (ص: ٥١٢).
٣ـ التربية القيادية (٢/١٦٠).

هەر کە ئەم ئایەتە دابەزیە خوارەوە دەست بەجێ عومەر(ﷺ) نامەیەکی نارد بۆ دوو هاوەڵە ئازیزەکەی (عەیاش و هیشام) هەتا هەوڵ و کۆششی خۆیان نوێ بکەنەوە بۆ دەربازبوون لەسەربازگەی کوفر، ئەمە چ سیفەتێکی گەورەیە کە لای کوڕی خەتابە؟! ئەو هەوڵی خۆی لەگەڵ عەیاش دا و نیوەی ماڵەکەی پێ بەخشی لەسەر ئەوەی، کە شار بەجێ بهێڵێت، حوشترەکەی خۆی پێدا، هەتا پێی هەڵێ و لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا بێنە و بەردەی بە براکەی نەکرد و ناو چاوی لێ گرژ نەکرد بەهۆی ئەوەی کە سەرپێچی کردووە و ئامۆژگاریەکانی وەرنەگرتوە و بۆچوونەکانی پشت گوێ خستووە، بەڵکو ئەو هەست کردن بەخۆشەویستی و وەفاداریە بۆ براکەی، کە ئەو لێرەدا زاڵ دەبێت بەسەریداو هەر،کە ئایەتەکەش دێتە خوارەوە ئاراستەی مەککەی دەکات، هەتا بگاتە دەستی ئەوان تەواوی بێ دەسەڵاتەکانی مەککە، بەڵکو هەستن بەچەند هەوڵێکی نوێ بەمەبەستی خۆگەیاندنە پێگەنوێکەی ئیسلام.[1]

بەم شێوەیە عومەر گەیشتە مەدینە و بوو بە وەزیرو پرسو راوێژ پێکراوی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ) برایەتی لە نێوان عومەر و عرەیمی کوڕی ساعدە[2] پێك هێنا و هەندێکیش دەڵێن ئەو برایەتیە لە نێوان عومەر و عوتبانی کوڕی مالك[3] و هەندێکی ترش دەڵێن لە نێوان عومەر و موعازی کوڕی عەفرائدا بووە.[4]

ئیبنو عەبدول هابینی لەم بارەیەوە دەنوسێت :

ئەم گێڕانەوانە دژ یەك زو لێك هەڵوەشێن نین، چونکە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە چەند کاتێکی جیاوازدا برایەتی لە نێوان عومەر و هەموو ئەمانەدا دروست کردووە، ئەمەش ڕێگری ناکرێت، کە لەچەند کاتێکی جیاوازدا ئەو برایەتیە لە نێوانی ئەو و هەموو ئەمانەدا بوبێت.[5]

---

١ـ التربية القيادية (٢/١٦٠).
٢ـ مناقب امير المؤمنين عمر بن الخطاب لابن الجوزي (٣١).
٣ـ الطبقات لابن سعد (٣/٢٧٢).
٤ـ مناقب امير المؤمنين عمر بن الخطاب لابن الجوزي (٣١).
٥ـ محض الصواب في فضائل امير المؤمنين عمر بن الخطاب (١/١٨٤).

# بەشی دووەم

# پەروەردەی قورئانی و پێغەمبەرایەتی بۆ عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه)

## دوانگەی یەکەم

## ژیانی فاروق لەگەڵ قورئاندا

**یەکەم: پێشبینی سەبارەت بەخوداو گەردوون و ژیان و بەهەشت و دۆزەخ و قەزاو قەدەر:**

بەڕاستی ئەو پەیڕەوە پەروەردەییەی، کە عومەری کوڕی خەتاب و تەواوی هاوەڵانی بەڕێز لەسەر پەروەردە بووە بریتیە لەقورئانی پیرۆز کە لەلایەن خوای گەورەی جیهانیانەوە بەخەڵات هاتووە،بۆتە تاکە سەرچاوەی بەیەك گەیشتن،هەر ئەوەش بویە هاندەری پێغەمبەری ئازیز(ﷺ)لەسەر یەکتاپەرستیو یەکخواناسی و ئەوەشی یەکلایی کردۆتەوە کە قورئانی پیرۆز بریتیە لە تەنها پەیڕەو و بیری سەرەکی، کە تاکی موسڵمان و خێزانی موسڵمان و کۆمەڵگەی موسڵمانی لەسەر پەروەردە دەبێت.

ئەو ئایەتانەی کە عومەر دەیبیستن ڕاستەوخۆ شوێنی خۆیان لە دارشتنی کەسایەتی ئیسلامی عومەر دەکردەوە و دڵی پێ خاوێن دەبوویەوە و ناخی پێی پاراو دەبوو،لەگەڵ ڕوحیدا کارلێکی دەکرد، بەمەش عومەر گۆڕاو بۆیە مرۆڤێکی تری پڕپایەخ و خاوەن هەست و ئامانج .[١]

عومەر لە میانی ئایەتەکانی قورئانەوە ئەوەی زانیووە کە کێ ئەو خوای گەورەیە، کە دەبێت ئەو بپەرستێت،هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەناخیدا مانای ئەو ئایەتە بەرزانەی دەچاندو پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) سوور بووە لەسەر ئەوەی کە یارانی پەروەردە بن لەسەر پێشبینی دروستیان بەرامبەر بە خوای گەورەو مافی خوای گەورە بزانن کە چیەلەسەریان، بەڕاستی تێڕوانینی عومەر بۆ خواو گەردوون و ژیان و بەهەشت و دۆزەخ و قەزا و قەدەر و ڕاستی ئادەمیزاد و بەربەرەکانی لەگەڵ شەیتان لە قورئانی پیرۆز و هیدایەتی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە سەرچاوەی گرتووە.

هەروەهاخوای گەورەی بەدووورە لە هەموو کەم و کورتیەك و پێناسە کراوە بەو شێوە تەواویانەی کە بێ پایانە،هەر ئەو خوای گەورەە پاك و بێەگەردەیە کە هاوەڵی نیە و هیچ هاوسەر و منداڵێکی بۆ خۆی نەگرتووە.

---

١ـ السيرة النبوية للصلابي (١/١٤٥).

• خوای گەورە دروستکەری هەموو شتەکانە و هەر خۆی خاوەن و بەدیهێنەریەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (الاعراف: ٥٤).

• خوای گەورە سەرچاوەی هەموو ناز و نیعمەتێکە لەم بوونەوەرەدا جا ئەو نیعمەتە ورد یان درشت لەبەر چاو بێت، یان شاراوە: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ﴾(النحل: ٥٣).

• زانیاری بێسنووره هیچ شاراوەیەکی لەسەر زەوی و لە ئاسمانیشدا لیٚ ئاشاردرێتەوە و تەنانەت ئەوەش کە مرۆڤ پەنای دەدات و ئاشکرای دەکات.

• خوای گەورە بەهۆی فریشتەکانیەوە کاری مرۆڤەکان وابەستە دەکات پێیانەوە لە قورئانێکدا کە نە لە گەورە و نە لە بچووك و هەموویانی هێناوەتە هەژمار و ئەمەش لە کات و شوێنی شیاوی خۆیدا ئاشکرا دەبێت و بڵاو دەبێتەوە: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾(ق: ١٨).

• بەندەکانی خۆی تاقی دەکاتەوە بە پێچەوانەی حەز و ئارەزووەکانیان، هەتا مرۆڤەکان پێکهاتەی خۆیان بناسن، تیایاندا هەیە کە ڕازیە بە قەزا و قەدەری خوا و بە ئاشکرا و پەنهانی خۆی بۆ بە دەستەوە دەدات و بەمەش دەبێتە شیاوی خەلافەت و پێشەوایەتی وسەرکردایەتی و هەشیانە تووڕە دەبێت و شیاوی هیچ نابێت: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾ (الملك: ٢).

• خوای گەورە کەسێك دەپارێزێت و پشتیوانی لیٚ دەکات و سەرکەوتنی پیٚ دەبەخشێت بە مەرجێك پەنای بۆ بەرێت و چێژ لەو خواترسی و تەقواکەی وەربگرێت و بە فەرمانی خوای گەورە کار بکات: ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (الاعراف: ١٩٦).

• مافی خوای گەورەیە لەسەر بەندەکانی کە تەنها ئەو بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن بە هیچ شێوەیەك: ﴿ئایەتە نە نوسراوە بینووسە﴾ (الاعراف: ٦٦).

• ئەو پەرستنەنها دەبێت بەپێی ئەوهێڵە گشتیانە بێت کەقورئانی پیرۆز دەست نیشانی کردوون.[1] ڕوانینی بۆگەردوون لەئایەتەکانی خواوە چنگ کەوتووە،کە دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٩ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِيٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ۝١٠ ثُمَّ

---

١ ـ منهج الرسول في غرس الروح الجهادية (ص: ١٠-١٦).

ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ (فصلت: ٩-١٢).

هەروەها ئەم ژیانە هەرچەند درێژە بکێشێت هەر دەڕەوێتەوە و خۆشیەکانی هەرچەنبینی گەورەبن کەم و فێزەونن ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾(يونس: ٢٤).

هەروەها ڕوانینیشی بۆ بەهەشت هەر لە میانەی ئەو ئایەتانەوەیە کە پێناسەی بەهەشت دەکەن، حاڵی ئەو لە حاڵی ئەو کەسانە بووە کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (السجدة: ١٦-١٧).

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ڕوانینی بۆ دۆزەخ بە هەمان شێوە بووە و لە ئایەتەکانی قورئان هەڵێنجاون و ئەم پێشبینیەش بۆتە پشتگیرێك لە ژیانیدا لە هەر لادانێك لە شەریعەتی ئیلاهی، بەمەش پەیڕەویکەر بۆ ژیانی فاروق قوڵایی و ناخی ماف وەرگرتنی بەدی دەکات بۆ ئەو تێگەیشتنە پێشهاتەی لەسەر خوای گەورە و زۆری ترسان لە سزا و عەزابی خوایی، عومەر(ﷺ) شەوێك دێتە دەرەوە و بە ناو مەدینەدا دەسوڕێتەوە بە لای ماڵی موسڵمانێکدا تێدەپەڕی دەبینێت بەو شەوە خەریکی نوێژکردنە، عومەر لەم کاتەدا وەستا و گوێی لێ بوو پیاوەکە سورەتی (طور) دەخوێند :

﴿وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ﴿٣﴾ وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ﴾(طور: ١-٧).

عومەر فەرمووی: سوێندی خوای گەورەی کەعبە ڕاست و دروستە، پاشان لەسەر وڵاخەکەی دابەزی و پاڵی دایەوە بە دیوارەکەوە ماوەیەك مایەوە و پاشان گەرایەوە ماڵەوە و بۆ ماوەی یەك مانگ نەخۆش کەوت خەڵکی سەردانیان دەکرد و لە نەخۆشیەکەیان نەدەزانی.[١]

---

١ـ الرقة والبكاء، عبدالله بن احمد المقدسي (ص: ١٠٦).

تێگەیشتنیشی بۆقەزاو قەدەر لە قورئان و پاشان لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)وەرگرت، تێگەیشتنی قەزا و قەدەر لە دڵیدا چەسپابوو ، پلەکانی قەزا و قەدەری لە قورئانی پیرۆزەوە فەراهەم هێناوە و یەقینی هەبووە بەرامبەر بەوەی کە زانیاری خوای گەورە دەوری هەموو شتەکانی داوە، ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ (يونس: ٦١).

خوای گەورەش هەموو شتێکی لە تۆمارێکدا نووسیوە: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ (يس: ١٢).

ویستی خوداش ڕەوایە و توانا و دەسەڵاتیشی تەواوە: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ (فاطر: ٤٤).

خوای گەورەش دروستکەری هەموو شتەکانە: ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ (الانعام: ١٠٢).

هەروەها عومەر بیروباوەڕی چەسپاوو دڵ و دەروونیشی دامەزراو بوو بەرامبەر قەزاو قەدەر، بەروبوومی سوودمەند و بەکەڵك لە ژیانیدا دەرکەوتوون و بەکۆمەکی خودالەم پەرتووکەدا بەدی دەکەین، عومەر لە میانی قورئانی پیرۆزەوە ڕاستی دەروونی خۆی و مرۆڤەکانی ناسیوە،لای ڕوون بووە کە ڕاستی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ لای دوو بنەمای سەرەکی: بنەمایەکی دوور کە بەدیهاتنیەتی لە قوڕ کاتێك کە دروستی کردووە و فووی ژیانی کردووە بەبەردا، بنەمای دوهەم کە بەدیهێناوە لە (تۆوە)،[١] خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ ۝ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾ (السجده: ٧-٨).

هەروەها ئەوەشی زانیووە کە خوای گەورە ئەم ئادەمیزادەی بە دەستی خۆی بەدیهێناوە و ڕێزی لێناوە بە شێوەیەکی باش و بەژن و باڵایەکی مامناوەند و عەقڵ و مەنتقێکی نایابی پێ بەخشیووە، هەموو شتێکی لە ئاسمانەکان و زەویدا بۆ فەراهەم هێناوە و فەزڵی داوە بەسەر زۆربەی دروستکراوەکانی تردا و ڕێزی لێناوە بە ناردنی پێغەمبەران بۆی و بەڕاستیش لە جوانترین ڕووکارەکانی ڕێزلێنانی خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان ئەوەیە کە کردوونیەتیە ئەهلی خۆشەویستی و ڕەزامەندی خۆی و ئەمەش بەشوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ) کە خەڵکی بانگ کردووە بۆ سەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەتا

---

١ـ اصول التربية للنحلاوي (ص: ٣١).

لە ژیانی دونیادا بەخۆشی بژین و لە ژیانی دوارۆژیشدا ژیانی خۆش و ئارام بەدەست بهێنن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ (النحل: ٩٧).

هەروەها عومەر(ﷺ) دژایەتی نێوان ئادەمیزاد و شەیتانی زانیووە ، دڵنیابووە لەوەی کە ئەم دوژمنە لە پێشەوە و پاشەوە و سەر و خوارەوە بینی بۆ لای ئادەمیزادەکان و تووشی دڵەڕاوکێی دەکات بۆ ئەنجامدانی خراپە و سەرپێچی کردن و هەستەکانی شەهوەتی تێدا دەوروژێنێت، بۆ سەرکەوتنیش بەسەر ئیبلیسی دوژمنیدا خوای گەورەی کردبووە یارمەتی دەری خۆی و لە ژیانیدا سەرکەوتوو بوو بەسەریدا، هەروەك لە ژیانەکەیدا دیارە، لە چیرۆکی باوکە ئادەم و شەیتاندا ئەوە فێربووە کە ئادەم بنەچەی مرۆڤایەتیە و ئیسلامیش ملکەچی ڕەهایە بۆ خوای گەورە و ئادەمیش شایستەبوونێکی تێدایە بۆ کەوتن لە نێو هەڵەوە و هەر لەو هەڵەیەی باوکە ئادەمەوە فێری ئەوە بووە کە پێویستە موسڵمان هەموو پشتیوانیەکی لەسەر خوای گەورە بێت و تەوبە و پەشیمانیش بایەخ و بەهایەکی زۆر گرنگی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە لەگەڵ پێویست بوونی خۆپاراستن لە ئیرەیی و خۆ بەگەورە زانین و بایەخی ئاخاوتن بە جوانترین شێوە لەگەڵ یاراندا بۆ ئەو پەیڤە جوانەی خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ (الاسراء: ٥٣).

عومەر بۆ تەزکیەی ڕوحی لەسەر پەیڕەوی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ڕۆیشتووەو بە جۆرەها پەرستش دڵ و دەروونی پاك و پاراو کردووەتەوە .

خوای گەورە و باڵادەست ڕێزی لە عومەر گرتووە بەو ئیسلامەی، کە باوەڕی پێهێناوەو بویە هۆی پێچانەوەی بیر باوەڕە کۆنەکەی لە بت پەرستی و مەرایی کردن بۆ بت و بڕیار دانی کچو ژن و ژنخوازی لە نێوان خوای گەورە و تاقمی جندا و ڕاست زانینی فێڵ و تەڵەکەی ئەستێرەناسیان بۆ دیاریکردنی ڕەوتی کۆمەڵگا لوت بەرزی بەدبینی و ئینکاری کردنی ژیانی دوای مردن،[1] هەموو ئەمانە کۆتایی هات و لەپاش خۆی بیروباوەڕو ئیمان بە تەنهای خودای بێهاوەڵ و بێ منداڵ و درۆ زن بونی ئەستێرەناس و بڕوا بون بە ژیانی دوای مردن . هەروەها ژیانی گاڵتەجاڕی جاهیلیەت و هەست نەکردن بە بەرپرسیارێتی لەبەردەم ئاییندا کۆتایی هات و بە بویە کەسێك بنیات نەر و هەستکار ە مەسئولیەت بەرامبەر ئایین و بیرو باوەڕەکەی. تەمەن بە تەواوی لە نێو ئەم ئاینەدا توایەوە، خوای گەورە و پێغەمبەرەکەشی لە هەموو شتەکانی تر بەلاوە خۆشەویستتر بوو، بە شێوەیەك بەندایەتی بۆ خوا دەکرد بەجۆرێك کە دەیبینێت،[2] عومەر لەسەر قورئان و گواستنەوەی پێی لەیاسادانانەوە بۆ

---

١ـ عمر بن الخطاب، علي الخطيب (ص: ٥١).

٢ـ عمر بن الخطاب، حياته، علمه، وادبه (ص: ٥٢).

ڕەوشتبەرداری لەمێژووەوە بۆ حیكمەت،خۆ گونجان لەگەڵ بەرنامەكەی خودای گەورەو ژیان لەگەڵ ئەو قورئانە پیرۆزەی كە كاری كردبوویە سەر دڵ و دەروون و ناخ و ڕوح و بەرهەمی ئەم پێكەوە ژیانەش لەسەر دڕندەییدا ئاوەژوو بوویەوە و هۆی ئەمەش ـ پاشئاسانكردنی لەلایەن خوای گەورەوە بۆی ـ لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا وەك قوتابییەك فەراهەم هات.[١]

## دووەم: هاودەنگیەكانی عومەر(ﷺ) بۆ قورئانی پیرۆز و ئاشنایی بە هۆی هاتنەخوارەوەی قورئان و ڕاڤەی بۆ هەندێ لە ئایەتەكان:

### أ– هاودەنگی عومەر بۆ قورئانی پیرۆز:

عومەر لە زۆرترینی یاران ئازا و لێهاتوو بوو، زۆرجار پرسیاری دەربارەی ئەو شتانە لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەكرد،كە حیكمەتەكەی نەدەزانی هەر وەك ئەوەی كە عومەر(ﷺ) بە ڕا و بۆچوونی خۆی و بە هەموو ڕوون و ڕاستبێژیەكەوە دەست پێشخەری كرد، بۆ زۆر تێگەیشتنی و وەرگرتنی بۆ مەبەستەكانی قورئان لە هەندێ كاتدا قورئان بە هاودەنگی هەڵوێستی ئەو دەهاتە خوارەوە، عومەر(ﷺ) دەفەرموێت: لە سێ شوێندا هاودەنگی خودا بووم، یان لە سێ شوێندا هاودەنگی پەروەردگام بووم، دەفەرموێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا بریا مەقامی ئیبراهیمت بۆ نوێژگە بڕیار دەدا، خوای گەورە ئایەتێكی لەو بارەیەوە دابەزاند، وتم ئەی پێغەمبەری خوا چاك و خراپ دێن بۆ لات بریا فەرمانت دەدایە دایكانی موسڵمانان كە حیجاب بپۆشن، خوای گەورە لێرەدا ئایەتێكی دابەزاند سەبارەت بە حیجاب، پێیان ڕاگەیاندم كە هەندێ لە خێزانەكانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) سەرزەنشتی پێغەمبەریان(ﷺ) كردووە منیش چوومە لایان و پێم وتن دەست هەڵگرن لەم كارە یان خوای گەورەش باشتر لە ئێوە دەداتە پێغەمبەرەكەی(ﷺ)، تەنانەت یەكێك لە خێزانەكانی هات و فەرمووی: ئەی عومەر، ئایا لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)ەوە شتێكت بیستووە كەلە خێزانەكانی دڵگران بو بێت وا تۆ گازاندەیان دەكەیت؟[٢] خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا﴾ (التحريم: ٥).

### ب . لە هاودەنگیەكانی سەبارەت بە وازهێنانی نوێژ لەسەر دووڕووان:

عومەر(ﷺ) دەفەرموێت: كاتێك عبدالله كوڕی ئوبەی مردهاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بۆ ئەوەی بڕوات نوێژی لەسەر بكات، ئەویش لەسەری وەستا، كاتێ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەسەری وەستا بۆ نوێژ ڕۆیشتم و هەتا لەسەر سنگی وەستام و وتم ئەی پێغەمبەری

---

١ـ عمر بن الخطاب، حياته، علمه، وادبه (ص: ٥٢).

٢ـ البخاري، كتاب التفسير، رقم (٤٢١٣).

خوا(ﷺ) ئایا عبدالله کوڕی ئوبەی دوژمنی خوا نوێژی لەسەر دەکەیت کە ئەو ڕۆژە وای وت و ئەو ڕۆژە وای وت و تەواوی ڕۆژە خراپەکانیم ژمارد، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) پێکەنی و تەنانەت منیش درێژەم بە قسەکانم دا و پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (لێم دوور کەوە ئەی عومەر من چاکەم هەڵبژاردووە)، پاشان پێیان وتم ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوە: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾(التوبة: ٨٠).

پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) نوێژی لەسەر کرد و ڕۆیشت بۆ سەر گۆڕەکەی هەتا لە سپاردنی بوونەوە، منیش سەرم لەخۆم و بوێریم سوڕما سەبارەت بە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، خوا و پێغەمبەرەکەشی(ﷺ) باشتر دەزانن سوێند بە خوا ئەو هەر بەم شێوەیە نەبووایە نەدەڕۆیشت هەتا ئەم دوو ئایەتە هاتە خوارەوە، کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ إِنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمۡ فَٰسِقُونَ﴾ (التوبة: ٨٤).

لەپاش ئەمە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هەتا کۆچی دوایی فەرموو لەسەر گۆڕی هیچ دووڕوویەك نەوەستا و نوێژی لەسەر نەکرد.

### ج . هاودەنگی لەگەڵ بەدیلگیراوانی بەدردا:

عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: کاتێك کە ڕۆژی بەدر بێباوەڕان ڕووبەڕووی شکستێکی گەورە بوونەوە(٧٠) کەسیان لێ کوژراو(٧٠) کەسی تریان لێ بەدیل گیرا، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ڕاوێژی بە ئەبو بەکر و عومەر و عەلی و عوسمان کرد، پێی فەرموم: (ئەی کوڕی خەتاب تۆ دەڵێیت چی؟) منیش وتم وام پێ باشە کە من بدەم لە گەردنی فلان کە خزمی عومەرە و عەلیش بدات لە نەگەردنی عوقەیل[1] و حەمزەش بدات لە گەدنی فلان و هەتا خوای گەورەش ئاگادار بێت بەوەی کە لە دڵ و دەروونی ئێمەدا نەرمیەك نیە بۆ بێباوەڕان، چونکە ئەمانە گەورە و پێشەوا و سەرکردەی بێباوەڕانن، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئارەزووی ئەوەی نەبوو کە وتم و لە بری ئەوە سەرانەی لێ وەرگرتن، پاشان کە بۆ سبەینێ چوم بینیم پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەگەڵ ئەبو بەکر دانیشتوون دەگریەن منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەوە چیە کە تۆ و هاوەڵەکەتی هێناوەتە گریان؟ ئەگەر منیش هۆی ئەو گریانە بزانم دەگریم ئەگەر نەشزانم ئەوا گریانم بۆ گریانەکەی ئێوە بینی، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ( بەوەی کە یارانت ئەو سەرانەیان خستە پێش چاوم، ئا بەو شێوەیەش وەك ئەو دارە ئەشکەنجەی ئێوەم خراپە پێش چاو)، دارەکە نزیك بوو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ

---

١ـ عوقەیل کوڕی ئەبی تالیب کە ڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوو لە سەرەتای خەلافەتی یەزید مرد.

تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٧) لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (الانفال: ٦٧-٦٨).

کاتێکیش کە ساڵی داهاتوو هاتە پێشێ و موسڵمانان (٧٠) کەسیان لێ شەهید بووە، یارانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هەڵهاتن دانی[1] شەهید بوو خودەکەی شکا و لە سەریدا خوێن بەنێو چەوانی پیرۆزیدا دەهاتە خوارەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (ال عمران: ١٦٥).

## د. هاودەنگی لە مۆڵەت وەرگرتن:

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە کاتی چێشتەنگاودا لاوێکی ئەنصاری نارد بۆ لای عومەر هەتا بانگی بکات، کاتێك لاوەکە هات نووستبوو، هەندێ لە جەستەی بە دەرەوە بوو، کاتێك کە بێداربوویەوە فەرمووی: خوای گەورە لەکاتی نووستندا سەرداغمان قەدەغە بکە، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێم خۆش بوو کە خوای گەورە فەرمان و ڕێگری ئەکردین لە کاتی مۆڵەت وەرگرتن،[2] پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (النور: ٥٨).

## هـ . نزای عومەر لە قەدەغەکرانی مەیدا:

کاتێك ئایەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ﴾ (البقرة: ٢١٩).

هاتە خوارەوە عومەر فەرمووی: خوای گەورەا دەربارەی شەراب ڕوونکردنەوەیەکی باش و دروستمان پێ بدە و پاشان ئایەتێك لە سورەتی (النساء)دا هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾ (النساء: ٤٣).

---

١ـ لە نێوان دانی بڕندە و کەڵبەدایە.

٢ـ مسند احمد (٢٥٠٨) رقم (٢٢١) وصحيحه احمد شاكر، مسلم بنحوه رقم (١٧٦٣).

ئەو دەمە بانگەوازکاری پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، کە نوێژی دابەست دەیوت: با سەرخۆشتان نزیکی نوێژ نەبنەوە پاشان عومەر بانگ کرا و ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێنرایەوە، کە دەفەرمووێت: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ (المائدة: ٩١). عومەر فەرمووی وازمان هێنا، وازمان هێنا،[١] عومەر لەمشێوازی پرسیار کردنە تێگەیشت کە مەبەست پێی قەدەغەکردنە، لەبەر ئەوەی کە ئەم پرسیارلێکردنە (الاستفهام) بەهێزتر و بڕاوەترە لە قەدەغەکردندا لە ڕێگری کردنی ئاسایی، لە دەربڕینی ئایەتەکە و پێکهاتە و داڕشتنەکەیدا هەڕەشەیەکی مەترسیدار و ڕوون وەك خۆر لە قەدەغەکردندا بەدی دەکرێت.[٢]

### و- ئاشنایی بە هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان:

عومەر(ﷺ) هەموو قورئانی لەبەر کردووە[٣] لەو ماوەیەی کە موسڵمان بووە هەتا کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەگەڵ هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان تەنانەت ئەو ئایەتانەش کە پێش موسڵمان بوونی هاتوونەتە خوارەوە، ئەمەش بەوەی کە هەمووی تێکڕا کۆکردۆتەوە و زیادەڕەوی نیە ئەگەر بڵێین عومەر زانیاری لەسەر هۆی دابەزینی زۆرێك لە ئایەتەکان هەبووە بە تایبەتی لەکاتی ژیانی موسڵمانێتیدا بەهۆی ئەوپەیوەندیە بەهێزەی بە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)ەوە هەیبوو، پاشان تەواوی ئەو ئایەتانەی لەبەر کردووە کە لە دەستی دەرچوون، ئەگەر ئاماژەی بۆ هۆیەکی هاتنەخوارەوەی قورئان کردبێت پێش هاتنە خوارەوەکە بووە، ڕووداوەکانیش بەردەوام بەدی دەکرێن و ئەمەش کارێکی سانایە.[٤]

هەروەها عومەر هۆی دابەزینی کۆمەڵێ ئایەت بووە، هەندێکیان هاودەنگی لەسەر مەککیەکەی و هەندێکیان لەسەر مەدینەییەکەی هەبووە، بەڵکو هەندێك لەئایەتەکان عومەر بەختەوەربووە بەزانینی سات و شوێنی بە شێوەیەکی زۆر ورد، سەبارەت بە ئایەتی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾(المائدة: ٣).

عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت، سوێند بەخوا من ئەو ڕۆژە و ئەو ساتەم دەزانی کە ئەم ئایەتەی تیا هاتە خوارەوە: لە کێوی عەرەفە و لەڕۆژی هەینی دابوو[٥] ئیتر عومەر هەر خۆی بوو بێت یا لەگەڵ کەسێکی تر بووبێت هۆی ڕاستەوخۆی دابەزینی هەندێ لە ئایەتەکان بووە لەوانە: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ

---

١ـ صحيح احمد شاكر في تخرجه الاحاديث المسند، رقم (٣٧٨).
٢ ـ شهيد المحراب للتلمساني (ص: ١٠١).
٣ـ الاتقان في علوم القرآن، للسيوطي (٧٢/١).
٤ ـ عمر بن الخطاب، د. علي الخطيب (ص: ٩٠-٩٢).
٥ـ اسناده صحيح على شرط الشيخين الموسوعة الحدثية، مسند احمد رقم(١٨٨).

ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ (التوبة: ١٩-٢٢).

لە صەحیحدا هاتووە: پیاوێك وتوویەتی بە لامەوە گرنگ نیە کە لە دوای ئەوەی کەعبە ئاوەدان دەکەمەوە هیچ کارێکی تر بکەم، عەلی کوڕی ئەبو تالیب فەرموویەتی: جیهاد لە پێناوی خوادا لە هەموو ئەمانە پیرۆزترە، عومەریش دەفەرمووێت: لەسەر مینبەری پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) دەنگتان بەرز مەکەنەوە ئەگەر کاتی نوێژ هات پرسیاری لێ دەکەم پاشان کە دەپرسێت ئەم ئایەتە دێتە خوارەوە و بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە ئیمان و جیهاد پیرۆزترە لە ئاوەدان کردنەوەی کەعبە و حەج و عومرە و تەواف و ئاودانی حاجیان، هەر لەبەر ئەمەشە ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: (مانەوەی یەك شەوم لەسەنگەردا پێ خۆشترە لە شەونوێژی شەوی قەدر لە تەنیشت بەردە ڕەشەکەدا.[1]

## پرسیارکردنی لە پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) دەربارەی هەندێ ئایەت:

عومەر(رضي الله عنه) پرسیاری لە پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم)دەکرد سەبارەت بە هەندێ ئایەت و هەندێ جار هاوەڵێکی دەبینی، کە پرسیاری لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکرد دەربارەی ئایەتێك دەست بەجێ لەبەری دەکرد و کەسێکی تری فێر دەکرد کە بە دوای زانستدا دەگەڕا، لە عەلی کوڕی ئومەییەوە دەگێڕنەوە کە دەفەرمووێت: پرسیارم لە عومەر کرد : (ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە کە هەندێ لە نوێژەکان کورت کەنەوە ئەگەر ترسان ئەوانەی بێباوەڕن جەنگتان لەگەڵ بکەن بەڕاستی بێباوەڕان بۆ ئێوە دوژمنێکی ڕوون و ئاشکران)، خوای گەورە ئاسایشی خەڵکی مەبەستە؟ عومەر وتی: منیش هەر سەرم لەوە سوورمابوو کە تۆ سەرت لێی سوورماوە، پرسیارم لە پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم)کرد سەبارەت بەوە فەرمووی: (ئەمە چاکەیەکە و خوای گەورە لەگەڵ ئێوەی کردووە ئێوەش چاکەکەی لێ وەربگرن)،[2] هەروەها پرسیاریان لە عومەر کرد سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الاعراف: ١٧٢).

---

١ـ الفتاوى (٢٨/١٠).

٢ـ اسناده صحيح على شرط مسلم، مسند احمد رقم: (١٧٤)، الموسوعة الحديثة.

فەرمووی: بیستم کە پرسیار لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) کرا دەربارەی، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە ئادەمی خەلق کردووە و پاشان بە لای ڕاستی سرپیوەتی و نەوە و وەچەی لێ دەرهێناوە)، فەرمووی ئەمانەم خولقاندووە بۆ بەهەشت و بە کردەوەی بەهەشتیان دەجوولێنەوە، پاشان جارێکی تر پشتی سرپیوە و نەوە و وەچەی لێ دەرهێناوە و فەرموویەتی: ئەمانەم خولقاندووە بۆ دۆزەخ و بە کردەوەی دۆزەخیان دەجوولێتەوە)، پیاوێك وتی: لە کامیان کار بکەین؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ( خوای گەورە ئەگەر بەندەی بۆ بەهەشت خولقاندبێت بەکاری دێنێت بۆ کاری بەهەشتیان، هەتا دەمرێت لەسەر کارێك لە کارەکانی ئەهلی بەهەشت دەبێت و بە هۆیەوە دەیخاتە بەهەشت، ئەگەر بەندەیەك بۆ دۆزەخ خولقابێت بەکاری دێنێت بە کردەوەی دۆزەخیان، هەتا دەمرێت لەسەر کارێك لە کارەکانی ئەهلی دۆزەخ دەبێت و بەهۆیەوە فڕێی دەداتە دۆزەخ)،[1] وەکاتێك ئایەتی: ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾ (القمر: ٤٥)هاتە خوارەوە، عومەر(ﷺ) فەرمووی: چ کۆمەڵێك دەشکێنرێت؟ چ کۆمەڵێك سەردەکەوێت؟ فەرمووی: کاتێك جەنگی بەدر هاتە پێشێ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)م بینی کە لە نێو قەلغانەکەی دامەزرا بوو، دەیفەرموو: (بێگوما کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێت و هەڵدێن) و ئەو ڕۆژەش من ڕاڤەی ئەو ئایەتەم زانی.[2]

## ج- هەندێك لێدوان و ڕاڤەی عومەر بۆ هەندێ ئایەت:

عومەر(ﷺ) بەڕای خۆی شەرمی لە تەفسیری قورئان دەکرد، لەبەر ئەوە کاتێك پرسیاریان لێ کرد دەربارەی: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا﴾ (الذاريات: ١)،فەرمووی ئەوە ڕەشەبایە و ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)نەبوایە کە ئەمەی فەرمووە منیش نەمدەوت، پرسیان دەربارەی: ﴿فَٱلۡحَٰمِلَٰتِ وِقۡرٗا﴾(الذاريات: ٢)، فەرمووی: ئەوە هەورەو ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)نەبوایە، کە ئەمەی فەرمووە منیش نەمدەوت، دواتر پرسیاریان دەربارەی: ﴿فَٱلۡجَٰرِيَٰتِ يُسۡرٗا﴾(الذاريات: ٣)، فەرمووی: ئەوە پاپۆڕو کەشتین، ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) نەبوایە کە ئەمەی فەرمووە منیش نەمدەوت، پاشان پرسیاریان دەربارەی: ﴿فَٱلۡمُقَسِّمَٰتِ أَمۡرًا﴾ (الذاريات: ٤) کرد، فەرمووی ئەوە فریشتەن، ئەگەر گوێم لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) نەبوایە ئەمەی فەرموو منیش نەمدەوت.[3]

هەروەها عومەر(ﷺ) پەیڕەوێکی تایبەتی هەبووە لە ڕاڤە بۆ ئایەتەکان، ئەگەر ڕاڤەیەکی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)ی بۆ ئایەتەکان بەدی بکردایە ئەوا بە هەند وەریدەگرت و کاری پێ

١ـ صحيح لغيره مسند احمد رقم: (٣١١) الموسوعة الحديثة.
٢ـ تفسير ابن كثير (٤/٢٦٦).
٣ـ اخبار عمر بن الخطاب، الطنطاويات، (ص: ٣٠٨) نقلا عن الرياض النضرة.

دەکرد و ئەوەی سەرەوەش باشترین نموونە بوون ، ئەگەر داخوازی خۆی لە شوێنی گومانیدا بەدی نەکردایە لای هەندێ لە هاوەڵانی وەك: ابن عباس و ئوبەی کوڕی کەعب و عبداللە کوڕی مەسعود و معاذ و ئەوانی تر(ﷺ)، ئەمەش نموونەیەکە لەسەر ئەم لایەنە، ڕۆژێك عومەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: ئەم ئایەتە چۆن دەبیننەوە، کە دەفەرمووێت: ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾(البقرة: ٢٦٦).

ئەوانیش وتیان: خوای گەورە دەزانێت، عومەر بێتاقەت بوو و فەرمووی ئێوە بڵێن ئێمە دەزانین یان نازانین، ابن عباس دەفەرمووێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران من لە ناخمدا شتێکم لەو بارەوە پێیە، فەرموو: ئەی برازاکەم بیڵێ و خۆت بە کەم مەزانە، ابن عباس فەرمووی: ئەمە نموونەیەکە لەسەر کارکردن هێنراوەتەوە، عومەر فەرمووی: چ کارێك؟ئیبن و عباس فەرمووی: پیاوێکی دەوڵەمەند بە ملکەچی بۆ خوا بەندایەتی دەکات پاشان خوای گەورە شەیتانێکی بۆ ڕەوانە دەکات و کار بە سەرپێچی دەکات هەتا تەواو کارەکانی نقوم دەبێت،[1] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە ابن عباس دەفەرمووێت: مەبەست لەم کارکردنە مرۆڤ لە کارەکانیدا بە مەبەستی هەنگاونان بەرەو بەهەشت کەم دەکاتەوە کە بەساڵدا چووە ژمارەی منداڵەکانی زیادی کردووە و زۆر بوون، ئەوەی ئادەم هەژارترین کەس دەبێت بۆ کارەکەی ڕۆژی قیامەت، عومەریش فەرمووی: ڕاستت فەرموو ئەی برازا.[2]

هەروەها هەندێ تەفسیری بۆ هەندێ ئایەت هەیە وەك:

﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَـٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ﴾ (البقرة: ١٥٦-١٥٧).

عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: دوو دادوەری باش و ڕووکێشێکی باش، مەبەستی لەو دادوەریەش نوێژ و بەزەیی و مەبەست لەو ڕووکێشەش هیدایەتدانە.[3]

هەروەها گوێی لە قورئانخوێنێك بوو کە ئایەتی:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلْكَرِيمِ ﴿٦﴾﴾ (الانفطار: ٦).دەخوێند فەرموی مەبەست بەوە جەهل و نەزانیە.

١ـ فتح الباري (٨/٤٩).
٢ـ الخلافة الراشدة والدولة الاموية، د. يحيى اليحيى (ص: ٣٠٥).
٣ـ الخلافة الراشدة والدولة الاموية، د. يحيى اليحيى (ص: ٣٠٥).

هەروەها تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتی: ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾ (التکویر: ٧). بەوە کردوە چاك لەگەڵ چاکدا، خراییش لەگەڵ خرابدا [1]

ڕاڤەی ئایەتی: ﴿تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا﴾ (التحریم: ٨).

بەمە کردەو کە دەفەرمووێت: بگەڕێنەوە و جارێکی تر نەگەڕێنەوە سەر گوناهکردن، ئەم ئەگەڕانەوەیە گەڕانەوەیەکی تەواوە.[2]

ڕۆژێکیش عومەر بەلای کەنیسەی ڕاهیبێکدا دەڕوات و بانگی لێ دەکات: ئەی عەودالّ عەودالّیەت پیرۆز بکە، عومەر سەیری دەکات و دەست دەکات بە گریان، وتیان ئەی ئەمیری ئیمانداران چی تۆی لەمەدا هێنایە گریان؟ ئەویش فەرمووی: ئەو ئایەتەی خوای گەورەم بیرکەوتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ۝٣ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً﴾ (الغاشیە: ٣-٤).[3]

هەروەها ڕاڤەی جادووی بە سیحر و تاغووتی شەیتان کردووە لەو ئایەتەی سوڕەتی (النساء)دا کە دەفەرمووێت: ﴿يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ (النساء: ٥).[4]

---

١ـ الفتاوی (٤٤/٧).
٢ـ الفتاوی (٣٨٢/١١).
٣ـ تفسیر ابن کثیر (٥٣٧/٤).
٤ـ تفسیر ابن کثیر (٥٢٤/٤).

# دوانگەی دووەم

## هاوەڵیەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

عومەر(ﷺ) یەکێکە لەو مەککیانەی، کە توانیویەتی لە نێو کۆمەڵگاکەیدا بنووسێت و بخوێنێتەوە، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر تێکەڵ بوونی لەگەڵ زانستدا هەر لە منداڵیەوە، هەوڵی بۆ ئەوە بووە کە یەکێك بێت لەو کەسانەی کە نەخوێندەواری خۆیان کوژاندۆتەوە و دەروونی خۆیان پاك کردۆتەوە پلە و پایەیەکی بەرز و بڵندیان لە سەردەمی پەیامدا بەدەست هێناوە بۆ کۆمەڵێك شتی بەهادار لەوانە ئاشنابوونی خوێندن و خوێندنەوە کە ئەمەش ڕووداوێك بووە لەو دەمەدا بەهای خۆی هەبووە، عومەر وانەکانی یەکەمینی خوێندووە و نووسینی لەسەر دەستی حەربی کوڕی ئومەییەی باوکی ئەبو سوفیان[1] پێ گەیشتووە و ئەم سیفەتە نایابەی ڕێخۆشکەری بۆ کردووە هەتا خوێبینی خۆی بە ڕۆشنبیری نەتەوەکەی ڕۆشن بکاتەوە لەو دەمەدا، ئەگەر ئێمە پێداگری بکەین و جەخت بکەین لەسەر ئەوەی ئەو پاڵنەرە بەهێزەی کاری لە کەسایەتی عومەر و زاخاودانی بەهرەکانی کردبێت و تواناکانی خستبێتەگەڕ بریتی بێت لە هاوەڵی کردنی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و بەقوتابی بوونی و پەروەردەبونی لەسەر دەستی پیرۆزی و لە قوتابخانەی پێغەمبەرایەتیدا ئەمە لەبەر ئەوە بووە کە عومەر لە مەککەدا و لە پاش موسڵمان بوونی هاوڕێ و هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، هەروەك چۆن لە شاری مەدینەی نورین هاوڕێی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)بووە بە جۆرێك لە گەرەکی (العوالی) نیشتەجێ بووە کە یەکێکە لە گەرەکەکانی شاری مەدینە، ئەگەر ئێستاش پێی بگەیشتایە دەبوویە دراوسێی مزگەوتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە جۆرێك خانوبەرە درێژەی دەکێشا و شار فراوان بووە و سنگەخشەی لەسەر ئەو گەرەکانە کردووە و لەم گەرەکەشدا عومەر خۆی ڕێك خستووە و سوور بووە لەسەر بەقوتابی بوون لە نێو قوتابخانەی پێغەمبەر(ﷺ) داو لە چەندین لقی جۆربەجۆر لە بواری زانیاری و زانستدا لەسەر دەستی مامۆستا و ڕێنموونی کاری مرۆڤایەتی کە بە باشترین شێوە خوڕەوشتی داداوە وەرگرتوەو فێر بووە .

هیچ زانیاریەکی لە قورئان و فەرموودە و ڕووداو و ئامۆژگاریەکی لە دەست نەداوە و لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: من و هاوسێیەکم لە ئەنصاریەکان لە هۆزی ئومەییەی کوڕی زەید کە لە پیاوە ناو دارو گەورەکانی مەدینە بوو سەردانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)مان کردبوو بە نۆبە ڕۆژێك ئەو سەری دەدا و ڕۆژێکیش من، هەر ڕۆژێك من سەرم بدایە ئەو ڕۆژە لە نیگا و شتی تر هەواڵم دەهێنا و ئەگەر ئەویش سەری بدایە بە هەمان شێوە دەبوو.[2]

---

١ ـ عمر بن الخطاب، د. محمد احمد ابو النصر (ص: ٨٧).

٢ـ هەمان سەرچاوەی(ص: ٨٧).

ئەم گێڕانەوەیە هەڵوێستەیەکمان پێ دەکات لەسەر سەرچاوەیەکی تەقیو کە عومەر زانیاری و پەروەردە و ڕۆشنبیری خۆی لێ هەڵێنجاوە کە بریتیە لە پەیامی بەرزو پیرۆزی خوای زانا و دانا کە دادەبەزی بۆ سەر گیانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە سەرچاوەگیراوی لەسەر ئەو واقع وئەو ڕووداوانە و پێغەمبەر(ﷺ) یش دەیخوێندەوە بۆ یارانی بە تایبەتی لەوانە کە لەسەر ماناکەی دەوەستانەوە و قوڵ دەبوونەوە لە تێگەیشتنی و کاریگەر دەبوون بە بنەماکانی، دیارە ئەمەش کاریگەری زۆری دەبوو لە ناخ و دڵ و دەروون و گیانیاندا، هەروەها عومەر یەکێك بووە لەو کەسانەی کە کاریگەر بوون بە پەیڕەوی قورئانی لە پەروەردە و فێرکردندا. لەسەر هەموو نوێژەرێکی مێژووی ژیانی عومەر پێویستە هەڵوێستەیەکی پڕ هیوا بکات لەبەردەم قورئانی پیرۆزدا، کە خۆراکی بەهرەکانی و بەنداوی بلیمەتیەکانی بووە و گەشەی بە ڕۆشنبیری ئەم گەلە داوە ، هەروەها عومەر هەر لەو دەمەوە کە موسڵمان بوو و باوەڕی هێناوە بە خودا سوور بووە لەسەر لەبەرکردنی قورئان و تێگەیشتن و سەرنج پێدانی و بەردەوام هاوەڵێك بووە بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و لە وەوە هەموو ئەوانەی پێ گەیشتووە کە دابەزیونەتە سەری هەتا لەبەرکردنی هەموو ئایەت و سورەتەکانی لەبەر کردوە، هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هەندێکیانی پێ خوێندۆتەوە و سوور بووە لەسەر گێڕانەوەی ئەوانەی کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) پێی خوێندۆتەوە،[1] هەندێ جار عومەر شەرەفی ئەوەی پێ دراوە دەست پێشخەری کردووە بۆ گوێ بیستی ژمارەیەك لە ئایەتەکان لە هەمان کاتی دابەزینیدا هەروەك چۆن بایەخی داوە بە پێداچوونەوەی ئەوەی کە لەبەرکردووە، عومەر لەسەر پەیڕەوێکی قورئانی پەروەردە بووە و ڕاهێنەرەکەشی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بووە و خاڵی سەرەتاش لە پەروەردەبوونی عومەردا بریتیە لە دیداری لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا، تەنها عومەر بە پەیوەندی کردنی بە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە گۆڕانێکی سەرنج ڕاکێشو هیدایەتێکی کتوپڕی لە ناخدا ڕوودا و لە شەوی تاریکەوە دەرچوو بۆ ناو ڕۆژێکی ڕووناك و پرشنگدار و ئیمانی بەدەست هێنا و کوفری وەلاناو بەهێزبوو لەسەر بەرگەگرتنی دژواری و مەینەتیەکان لە پێناو ئاینە نوێکەی و بیروباوەڕە جوامێرانەکەی، بە ڕاستی کەسایەتی پێغەمبەر(ﷺ) هۆکاری یەکەم بوو بۆ ئیسلام، کەسیەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خاوەن هێزی ڕاکێشان و کاریگەرە لەسەر هەمووان، بێگومان خوای گەورە لەسەر چاوگەی خۆی دروستی کردووە و کردوویەتیە کامڵترین وێنە بۆ مرۆڤ لە مێژووی زەویداو گەورەش هەمیشە خۆشەویست و دەورەدراوە بە خەڵکانێك بە سەرسامیو خۆشەویستیەوە بە دەوریدا دەسوڕێنەوە پێوەی دەنووسێن.

بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەمە بۆ گەورەییەکەی زیاد دەکرێت کە ئەو پێغەمبەری خودایە و نیگا و سروشتی لە خوداوە پێ دەگات و ڕاگەیەنەریەتی بۆ خەڵکی و ئەمەش پاش کۆتایی کاریگەری خۆی هەیە کە چۆنیەتی خرۆشانی هەستی ئەو ئیماندارە بە ئاراستەی خۆی، ئەو تەنها

---

١ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو(ل: ٨٨).

شتەکانی بۆ خۆی پێ خۆش نەبووە هەروەك ئەوەی مرۆڤە گەورەکان لەنێو خەڵکیدا پێیان خۆشە، ئەوە لەگەڵیدایە لە ئامادەبوونی نیگای ئیلاهی بەڕێز و پاشان لە کەسایەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دا مرۆڤێکی گەورە و پێغەمبەرێکی مەزن یەك دەگرنەوە کە پاشتر و لە کۆتاییدا دەبنە یەك کە نە لە سەرەتادا و نە لە کۆتاییدا ناشایستە نین، خۆشەویستیەکی قووڵی گشتگیر بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، مرۆڤ بۆ مرۆڤی پێغەمبەر(ﷺ)و گرێدانی خۆشەویستی خودایە بە خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و لە ناخیدا تێکەڵ دەبن و لە هەستەکانیدا دەبنە خالی تەرکیزکردن و دەبنە فاکتەری بزواندنی هەست و ڕەفتاری گشتی.

ئەمە ئەو خۆشەویستیە بوو کەڕەورەوەی یەکەمی یارانی بزواند و بریتی بوو لە کلیلی پەروەردەی ئیسلامی و خالی تەرکیزکراوی ئەو پێگەیەی کە لێوەی دەردەچێت،[1] هەروەها پیرۆزی هاوەڵی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بۆ یارانی بە تەواوی فەراهەم هاتووە لەگەڵ پەروەردەبوونیان لەسەر دەستی خۆی بە کەش و هەوای بەرزی ئیمانی، سید قطب سەبارەت بەم پاککردنەوەیە دەفەرموێت: ئەوە باشترین پاککردنەوەیە و ئەمەش بۆ پوختەکردنەوەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەریدەگرێت بۆ پاککردنەوەی ویژدان و هەستەکان و پاککردنەوە بۆ کارێك ڕەفتارێك و پاککردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی و کۆمەڵایەتی و بەم پاککردنەوەیەش دەروونەکان لە بیروڕای شرکەوە بەرز دەبنەوەبۆ بیروڕای یەکتاپەرستی و لە پێش بینی پوچەڵەوە بەرەو بیروڕایەکی ڕاست و دروست هەنگاو هەڵدەگرن ، لە داستانە لێڵەکانەوە بەرەو بێگومانیەکی ڕوون و ئاشکرا ملی ڕێگا دەگرنەبەر ، دەروونیش لە پۆخڵەیی ناهێمنی ئەخلاقیەوە بەرز دەبێتەوە بۆ پاکژی ڕەفتاری ئیمان ، لە چەپەڵی سووخۆری و حەرامەوە لە شەقەی باڵ دەدەن بەرەو پاکی وحەلاڵی داهات ، ئەمەیە پاکژی گشتگیر بۆ تاك و کۆمەڵ ، بۆ ژیانی واقیعانە پاکژیەکەش مرۆڤ و پێشبینیەکانی لە تەواوی ژیان و ناخی و پێگەیشتنیدا بەرز دەکاتەوە بۆ بێداربوونەوەو بوارێك تیایدا بە خوای گەورەی دەگات و هەڵسوکەوت لەگەڵ فریشتەی بەرز و بەڕێزدا دەکات.[2]

عومەر(ﷺ) لەسەر دەستی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بویە خوێندکارێك و هەر لەوەوە فێری قورئان و سوونەتە پیرۆزەکان و حوکمەکانی تیلاوە و پاککردنەوەی دەروون بوو، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ﴾ (ال عمران: ١٦٤).

هەروەها عومەر سوور بووە لەسەر قوڵبونەوە لە ڕێنموونیەکانی پێغەمبەری ئازیز لە غەزاکانی و لە کاتی ئاشتیدا و ئەمەش بۆ عومەر(ﷺ) بۆتە زانیاریەکی بەرفراوان و لێزمەبارانێکی تێگەیشتنی

١ـ منهج التربية الاسلامية، محمد قطب (ص: ٣٤-٣٥).
٢ـ الظلال (٦/٣٥٦٥).

بتەو و بە پیت و فەڕ بە سوونەتی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) کە کاری کردۆتە سەر کەسایەتی و تێگەیشتنی عومەر، هاوەڵی کردنی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و گوێگرتن لێی و وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری ئامادە بون لە هەموو کۆڕێکی پێغەمبەردا(ﷺ) هۆکارێکی ترن لەسەر ئەو پەروەردە گەورەیە، هەروەها سوور بووە لەسەر پرسیارکردن لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەربارەی هەموو ئەو شتانەی کە دەروونیان هەژاندووە یان هزر و هۆشیان سەرقاڵ کردووە.[1]

عومەر لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)ەوە زانیاری و زانست و پەروەردەی چنگ کەوتووە لەگەڵ شارەزابوون بە مەبەستەکانی ئەم ئاینە گەورەیە و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) تایبەتی کردووە بە چاودێریکردنی و گشتگیری و بە بەستنەوە و پاشان پێغەمبەر(ﷺ) شاهێدی بۆ داوە بە زانیاری،لەو بارەیەوە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دەفەرمووێت: (کاتێك کە من نووستبووم پەرداخێك شیریان بۆ هێنام، من لێم خواردەوە هەتا بینیم لە نێوانی پەنجەکانمەوە جۆگەی بەستبوو پاشان دامە دەستی بەرێزەکەم ) واتا عومەر(ﷺ).

وتیان: ئەوە بە چی تەفسیر دەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: ((زانست)).[2]

ابن حجر دەفەرمووێت: مەبەست لێرەدا بە زانست: زانیاریە بە سیاسەتی خەلکی ، بە قورئان و سونەتەکانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)[3] و ئەمەش شارەزاییەکە بەدەست نایەت بۆ کەسێك نەبێت کە پێی جێگیر بوو بێت، سوور بێت لەسەر تێگەیشتن لە قورئان و سونەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و رێگەی ئەمەش: ڕۆچوونە لە تێگەیشتنی زمان و ئادابەکانی و شارەزابوونیەتی لە زانینی شێوەکانی و دەوڵەمەند کردنیەتی بە هەموو ئەو شتانەی کە هاوکاری دەکەن لەسەر تێگەیشتنی لە شارەزایی و پسپۆڕیەکانیدا، عومەر(ﷺ) بەم شێوەیە بووە.[4]

پێویستە ئەوەش بوترێت لە نێوان عومەر(ﷺ)و پێغەمبەر(ﷺ)دا خۆشەویستیەکی زۆر هەبووە ئەم خۆشەویستیەش هۆکارێکی گرنگ بووە لە دروست بونی زەمینەیەك لە نێوان مامۆستا و قوتابیەکەی کە بە باشترین ئەنجامی زانستی و ڕۆشنبیری دێتە پێشەوە بەوەی کە بەخششی نوێکەرەوەی هەیە، عومەر زۆر پێغەمبەری خوای(ﷺ)خۆش دەویست و دڵی پەیوەست بوو پێوەی و گیان و دەروونی خۆی بۆ کردبوویە قوربانی و گیان بەختکردن لە پێناو بڵاوبونەوەی بانگەوازەکەیدا، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دا هاتووە دەفەرمووێت: (باوەڕی تەواو نابێت هەر یەك لە ئێوە ئەگەر منی لە خۆی و باوکی و کوڕی و هەموو خەلکی خۆشتر نەوێت.[5]

لێرەدا عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)تۆ لە لای من لە هەموو کەس خۆشەویستتری جگە لە خۆم، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ئەی عومەر هەتا لە

١ـ عمر بن الخطاب، د. محمد احمد ابو النصر (ص: ٩١).
٢ـ البخاري رقم (٣٦٨١).
٣ـ فتح الباري (٣٦/٧).
٤ـ عمر بن الخطاب، د. محمد احمد ابو النصر (ص: ٩٣).
٥ـ البخاري رقم (١٥).

خۆشتم زیاتر خۆش بوێت، عومەر فەرمووی: تۆم زیاتر لە خۆم خۆشتر دەوێت، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (ئێستا ئەی عومەر).[١]

ڕۆژێك عومەر مۆڵەتی لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەرگرت بۆ بەجێهێنانی عومرە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) پێی فەرمو: ((براکەم لە نزا و پاڕانەوەکانتدا لە یادمان نەکەیت))،[٢] عومەریش فەرمووی: ڕۆژێکم لێ هەڵنەهاتووە، کە بە لامەوە لە وشەی ((ئەی برام)) پێ خۆشتر بێت.[٣]

وە هەر ئەم خۆشەویستیە گەورە و پیرۆزە بووە وای لە عومەر(رضي الله عنه) کردووە هاوڕێ و هاودەمی پێغەمبەر(ﷺ) بێت لە هەموو غەزاکانیدا ئەمەش هاوکاری بووە بۆ شارەزایی و ڕاهاتن و پەی بردن بە کاروباری جەنگ و ناسینی سروشتی دەروونەکانی و غەریزەکانی، هەروەك ئەوەی کە هاوڕێیەتی کردنی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و زۆر ئاخاوتن لەگەڵیدا جوامێری کردووە لەسەر ڕەوانبێژی و، زمان پاراوی و هونەری دوان وچۆنێتی قسەکردن،[٤] لەم خاڵانەی داهاتوودا بە یارمەتی خوای گەورە هەڵوێستەکانی لە گۆڕەپانە جیهادیەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ)و هەندێ وێنەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە مەدینە و لە ژیانی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دا ڕوون دەکەینەوە:

## یەکەم: عومەر لە گۆڕەپانی جیهاد لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ):

زانایان هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە عومەر(رضي الله عنه) بەشداری لە غەزای بەدر و ئوحوددا کردوە و ئامادەی هەمو غەزاکانی تریش بووە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ):[٥]

### ١- غەزای بەدر:

عومەر(رضي الله عنه) بەشداری غەزای بەدری کردووە کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) پێش دەست پێ کردنی جەنگەکە ڕاوێژی بە یارانی کرد یەکەمین کەس کە قسەی کرد ئەبوبەکر بوو(رضي الله عنه) کە بە جوانی هاتە ئاخاوتن و فەرمووی : باجەنگی بێ باوەڕان بکەین عومەریش(رضي الله عنه) هەمان رای ئەوی هەبوو[٦] و یەکەمین کەسێکیش لە ڕیزی موسڵمانان لە بەدردا شەهید کرا (موهەجەع) ی ئازادکراوی عومەر(رضي الله عنه) بوو.[٧]

---

١ـ البخاري رقم: (٦٦٣٢).

٢ـ ابو داود في الصلاة (١٤٩٨) والترمذي في الدعوات (٣٥٦٢)، وقال هذا الحديث حسن صحيح وابن ماجة في المناسك (٢٨٩٤) كلهم عن عمر وهناك من ضعفه.

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ عمر بن الخطاب، د. محمد احمد ابو النصر (ص: ٩٤).

٥ـ مناقب امير المؤمنين عمر بن الخطاب لابن الجوزي (ص:٨٩).

٦ـ الفاروق مع النبي، د. عاطف لماضة (ص:٣٢).

٧ـ الطبقات لابن سعيد (٣/٣٩١،٣٩٢) ضعيف لانقطاعة.

عومەر(ﷺ) عاصی کوڕی هشام[1] ی خاڵۆی کوشت . دوای تەواو بونی جەنگەکەش ئامـاژەی بەکوشتنی بە دیل گیراوانی قورەیشی کرد( چونکە ئەوانەی بە تاوانکاری شەڕ (مجرموا الحرب) لەقەڵەم دەدا) لەم ڕوداوەشدا چەندین پەند و ئامۆژگاری گەورە بەدی دەکرێت کە لـە کتێبی (السیرة النبویة عرض وقائع وتحلیل احداث) دا باسم لێوە کردووە .کاتێ عەباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) بەدیل گیرا عومەر سور بوو لەسەر هیدایەت دانی و پێی فەرموو : ئەی عەباس موسڵمان بە، سوێند بە خوا موسڵمان بوونی تۆم لە موسڵمان بوونی خەتاب پێ خۆشترە، لە مەشدا هیچ نابینم جگە لەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە موسڵمان بوونی تۆ پێخۆشحاڵ دەبێت.[2]

هەروەها لەنێو دیلەکاندا سوهەیلی کوڕی عەمری وتار بێژی قورەیشیەکان بەدی دەکرا، کە عومەر بە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ی فەرموو : لێم گەڕێ با زمانی ببڕم تا زمان درێژی نەکات و لە هیچ جێگایەکدا وتارت لە دژ نەدات، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی (من هیچ کات زمانی نابڕم، خوای گەورە لەتۆڵیدا زمانم دەبڕێت ئەگەر چی پێغەمبەر بم، دەخوازم کە پلە و پایەیەك بە دەست بهێنێ کە مایەی شانازی بێت و تۆش لۆمەی لەسەر نەکەیت)[3] دەی هەر ئەمە بەتەواوی پاش وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ڕووی دا کاتێك کۆمەڵە کەسانێك لە مەکە بەئاز بوون پاشگەز ببنەوە ، لە ترسانا عیتابی کوڕی ئوسەید والی مەکەهەڵهات بۆ مەدینە، سوهەیلی کوڕی عەمر هەستاو وتارێکی بۆ دان، پاش لەسوپاس و ستایشی خوای گەورە،و باسی وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد و ووتی: ئەم ڕووداوە هێزو گوڕو تینێکی بە ئیسلام بەخشیوە، هەرکەسیش بیەوێت گومان بخاتە دڵمانەوەو دڵە ڕاوکێ دروست بکات لەناوماندا لە گەردنە دەدەین .ئەمەش وای کرد خەڵکی لە بۆچونەکەیان پەشیمان ببنەوە.[4] هەروەها عومەر فەرموودەیەکمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێ گوێی لەوە بووە پێغەمبەر(ﷺ) قسەی لەگەڵ کوژراوەکانی قورەیش کردووە، ئەنەس ئەفەرموێ : ئێمە لەگەڵ عومەر لەنێوان مەککە و مەدینەدا بووین و مانگمان بینی ، من چاوم زۆر تیژ بوو زۆتر چاوم کرد و بینیم، ووتم بەعومەر: تۆ نایبینی؟ ئەویش فەرمووی من کاتێ دەبینم کە لە سەر جێگەکەی خۆم ڕاکەشا بووم، پاشان باسی ئەهلی بەدری بۆ کردین و فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێ پێش لە دەست پێکردنی شەڕەکە شوێنی کوژرانی سەرانیقورەیشی پێ نیشان داین و فەرمووی (ئەمە سبەینێ شوێنی کوژرانی فلانە کەس و ئەمەش شوێنی کوژرانی کەسە ـ ان شاء الله ـ، عومەر ووتی هەرلەو شوێنەدا ڕوبەڕو بونەوە و منیش وتم سوێند بەو زاتەی کە تۆی بەڕاستی ناردووە، ئەوجێیەی تۆ دەست نیشان کرد ، کەلە وێدا دەکوژرێ هەر لەو جێیەدا کوژران،دوای شەڕەکەفەرمانی دا تەرمەکان کۆ کرانەوە فڕێدەدرانە بیرێکەوە، پاشان بەرەو ڕێیان دەرچوو، فەرمووی ئەی فلان کەس ئەی فیسار کەس ئایا ووتیان کە خوای گەورە بەڕاستی بەڵێنی پێ داون، من بینیم کە پەر وەردگارم بەڕاستی بەڵێنی پێداوم)

---

١ـ السیرة النبویة (٣٨٨/٢) لابن هشام صحیح التوثیق (ص:١٨٧).
٢ـ الخلافة الخلفاء الراشدین، للبهنساوی (ص:١٥٤)
٣ـ البدایة والنهایة (٢٩٨/٣).
٤ـ البدایة والنهایة (٣١١/٣).

عومەر فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا گەلێك دەدوێنیّ کە بۆگەنیان کردووە؟ پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی (ئەی فلان و ئەی فلان،ئایا ئەوەی خوا بەهەق بەڵێنی پێدابوون بینیتان، بەڕاستی من ئەوەی خوای گەورە بەڵێنی پێدا بووم هاتە (ﷺ) و بینینم) عومەر فەرموی چۆن قسە لەگەڵ مردواندا دەکەی؟ فەرموی: ئێوە لەوان باشتر نابیستن، بەلام ناتوانن وەلام بدەنەوە).[1]

کاتیّ عومەیری کوڕی وەهەب پێش موسلمان بوونی و پاش جەنگی بەدر هات بۆ تیرۆر کردنی پێغەمبەر(ﷺ) عومەر(ﷺ) لەنێوان کۆمەلە موسلمانێکدا بوو کە باسی ڕوداوەکانی بەدریان دەکرد و باسی ئەو ڕێزەیان دەکرد کە خوا لێی ناون ، لەم کاتەدا عومەیر کە هێشتا موشریك بوو بەسواری ئەسپەکەی هات و ئەسپەکەی لە بەردەم مزگەوتدا بەستەوە و شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا بوو بەدەستیەوە بوو، عومەر فەرمووی: ئەوە دوژمنی خوا عومەیری کوڕی وەهەبە، هاتووە بۆ ئەوەی خراپەیەك بێنیتە ڕێگامان و نێوانمان بشوێنیّ عومەر چوویە لای پێغەمبەری خودا و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە عومەیری کوڕی وەهەبی دوژمنی خودایە ئەو شمشێرەکەی ئامادەکردووە و هاتووە بۆ ئێرە، پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی (بیهێنن بۆ لام) ئەفەرمویّ: عومەر ڕۆیشت شمشێر بەندەکەی گرت بە دەستیەوە[2] و لە ئەگەردنی توونـد کرد[3] و بە ئەنصاریەکانی هاوەڵی فەرموو بچنە ژووریّ بۆ لای پێغەمبەری خواو لەلای دابنیشن، لە دەستی ئەم شەپەڵە وریای بن، چونکە ئەم عومەیرە باوەڕ پیّ کراو بیّ زیان نییە، پاشان عومەر بردیە ژورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ،کاتیّ کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بەو شێوەیە بینی کەشمشێرەکەی لەکالان دەرهێناوەو بەدەستیەوە گرتوە، فەرمووی (ئەی عومەر لێی گەڕیّ بابێتە پێشەوە ، پاشان فەرموی: دانیشە)عومەیر دانیشت و ووتی: بەیانیتان باش، ( ئەمەش سلاوێك بوو کە جاهلیەت لە سەردەمی خۆیاندا بەکاریان هێناوە)، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی (خوای گەرە سلاوێکی جوانتری پیّ ئەمر کردوین ، کە سلاوی ئەهلی بەهەشتە.)[4] پاشان فەرمووی (عومەیر بۆ هاتوی یا چی تۆی گەیاندۆتە ئێرە)؟ عومەیر ووتی هاتووم بۆ لای ئەو دیلە بەلکو چاك بن لەگەلیدا، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی : ( ئەو شمشێرە چییە لەگەردنتا) عومەیر ووتی : نەفرەتی خوا لە هەموو شمشێرەکان! چ سودێکیان بۆمان هە بوو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی (ڕاست بلیّ، بۆچی هاتووی) عومەیر ووتی بۆ ئەوە نەبیّ بۆ هیچی تر نەهاتووم.

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (بەلکو لەگەلّ سەفوانی کوڕی ئومەییە لەژوورێك دانیشتوون و باسی کوژراوەکانی بەدرتان کرد ، تۆش وتت : ئەگەر قەرزار نەبوومایە و مالّ و منداڵم نەبوایە دەردەچووم هەتا محمدم دەکوشت ، سەفوانیش قەرزەکەیت لەئەستۆ گرتو، ژیانی مالّو منداڵەکەشتی خستە سەر خۆی، تۆ هەتا من بکوژی و خوای گەورەش پارێزەری منەو ناتوانی

---

١ـ مسند احمد رقم (١٨٢) الموسوعة الحديثية اسناده صحيح على شرط الشيخين.

٢ـ شمشێر بەند: ئەویە، کە شمشێر پەیوەست دەکات بە لەشیەوە.

٣ـ توند کرد: واتە بەستییەوە

٤ـ صحيح السيرة النبوية للعلي (ص:٢٥٩)

بمکوژی.)عومەیر ووتی:شاهیدی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای، ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە تۆمان بەدرۆ دەزانی لەوەی کە بۆت دەهێناین لە هەواڵی ئاسمان و ئەو قورئانەی کە بەنیگا بۆت دەهاتە خوارەوە، ئەم پیلانە جگە لە من و سەفوان کەس ئامادەی نەبوە وئاگای لیٚ نییە، من دەزانم کە جگە لە خوا هیچ کەسێك ئەم هەواڵەی بەتۆ نەگەیاندوە، سوپاس بۆ خوا کە هیدایەتی دام بۆ ئیسلام. پاشان شایەت و مانێکی دروستی هێنا و پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ) فەرمووی (براکەتان لە ئیسلام تێبگەیەنن و قورئانی فێربکەن و دیلەکەشی ئازاد بکەن) و ئەوانیش فەرمانەکەیانە جیٚ بەجیٚ کرد.[1]

لەم چیرۆکەدا ئەوە دەردەکەوێت عومەر کەسێکە چالاك و وریا بوە ئەوەتا هەر بەبینینی عومەیری کوڕی وەهەب و وریایی داوە، ئەوەی بۆ دەرکەوتوە عومەیر بۆ خراپە هاتووە ئەمەش وەك فەراسەتێك وایەو خوای گەورە پێی بەخشیوە، ژیانی عومەیر لای عومەر زانراو بوە کە هەردەم ئازارو ئەشکەنجەی موسڵمانانی داوە لە شاری مەککە و هەر ئەویش بوە کەسور بووە لەسەر هەڵگیرساندنی جەنگی بەدر لەگەڵ موسڵمانان و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ژمارەیان و هەموو ئەمانەش ڕێگەیان دا بە عومەر بۆ لەبەر گرتنی هۆکاری پێویست لە پێناو پارێزگاری کردن لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، عومەرشمشێرەکەی لە گەردنیدا توند کردو وای لیٚ کرد کە نەیتوانی بەکاری بهێنیٚ بۆ هێرش کردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) و فەرمانی دا بەسەر هاوەڵانی دا کە چاودێری پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بکەن.[2]

## ٢- غەزای ئوحد و بەنی (المصطلق والخندق):

هەندێك لە سیفەتە جیهادیەکانی فاروق ئەوە بوو کە: هیممەت بەرز و ڕەفتار گەورە بووە و زەلیلی لە خۆی هەڵماڵیوە هەرچەند تێك شکان لەبەر دەمیدا ببوایەتە تابلۆیەك هەروەك ئەوەی کە لە غەزای ئوحود دا ڕویدا، کە دووەمین غەزای موسڵمانان بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕابەرایەتی کرد، کاتیٚ ئەبو سفیان لە کۆتایی جەنگەکەدا وەستا و بە موسڵمانانی ووت: ئایا محمد تان لەناو دایە؟ پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی (وەڵامی مەدەنەوە ) پاشان وتی ئەبو قوحافەتان تێدایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(وەڵامی مەدەنەوە، پاشان ئەبو سوفیان وتی: کوڕی خەتابتان تێدایە؟ پاشتر وتی: ئەمانە کوژراون ئەگەرنا زیندوبونایەو وەڵامیان دەدایەوە، لەم کاتەدا عومەر(رضي الله عنه) خۆی پیٚ نەگیراو فەرمووی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا، خوا بتهێڵیٚ بۆ شەرمەزاریت، ئەبوسوفیان وتی: بەرزو پیرۆزە هوبەل،[3] لەم کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (وەڵام بدەنەوە) موسڵمانان وتیان: چی بڵێین؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرموی بڵێن (خوای گەورە بەرزو پیرۆزو بڵندە) ئەبو سفیان ووتی: ئێمە (عوزا) مان هەیە بەڵام ئێوە عوزاتان نییە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی (وەڵام بدەنەوە) وتیان چی بڵێین؟ فەرموی بڵێن

---

١ـ صحيح السيرة النبوية للعلي (ص:٢٦٠)
٢ـ السيرة النبوية عرض وقائع وتحليل احداث للصلاي (ص:٨٦٨).
٣ـ ئاینەکەت ئاشکرابکە.

خوای گەورە سەرخەرو یاوەری ئێمەیە ، ئێوە هیچ سەرخەرو یاوەرێکتان نیە،ئەبو سوفیان ووتی:ئەمڕۆ بە رۆژی بەدر و جەنگیش ، لوت و گوێ بڕین و لاشە تێکچونێك لەناو تەرمەکانتاندا هەیە نە فەرمانم پێ داوە ونە پێشم ناخۆش بووە ،[1] لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە عومەر فەرمویەتی: (کوژراوانی ئێمەو ئێوە وەك یەك نین، کوژراوانمان لە بەهەشتان، کوژراوانی ئێوەش دۆزەخین).[2]

پاشان ئەبو سوفیان پێی وتم : سوێند ئەدەم بە خوا ئەی عومەر ئایا ئێمە محمدمان کوشتوە؟ عومەر فەرموی: بەخودا نەخێر، ئەو ئێستا گوێی لەم قسانەی تۆیە. ئەبو سوفیان ووتی: تۆ بە لای منەوە راست بێژ تری لە ئیبنو قەمئە، کە دەڵێت: من محمدم کوشتووە.[3]

بەڕاستی پرسیار کردنی ئەبو سوفیان سەبارەت بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و ئەبوبەکر و عومەر بەڵگەیەکی رون و ئاشکرایە لەسەر بایەخدانی بێباوەڕان بەوکەسایەتیە بەڕێزانە زیاتر لە خەڵکانی تر، لەبەر ئەوەی ئەوان زانیارییان هەیە بەرامبەر بەوەی ئەمانە ئەهلی ئیسلامن و هەر بەهۆی ئەمانیشەوە ئەم ئیسلامە ئاشکرا بووە و بنەمای دەوڵەتەکەن و دەوڵەت لەسەر شانی ئەمان ڕاگیراوە، بێباوەڕان پێیان وایە بەمردنیان چرای ئیسلام دەکوژێتەوە لەنێو دەچێ ، بێدەنگ بون و وەڵام نەدانەوەیان بەبچوك سەیرکردنی ئەبو سوفیان بوو هەتا ئەگەر لەخۆی بایی بووە خۆیی لێگۆڕاوە، بە بیستنی ئەم هەواڵە و ڕاستی مەسەلەکان خۆی بناسێتەوە و وائەزانێ کە هەمو شتێ تەواو بوە.[4]

لە غەزای (بەنی المصطلق) یشدا عومەر(رضي الله عنه) خاوەنی هەڵوێست بووە ، ئەوەتا یەکێ لە بینەران و ئامادە بوانی ئەو غەزایە بەم شێوەیە بۆمان باس دەکات:

جابری کوڕی عبدالله ی ئەنصاری ئەفەرموێ: لە غەزادا بووین، پیاوێکی موهاجیر لە پیاوێکی ئەنصاری داو پیاوە ئەنصاریەکەش بانگی کردە ئەنصاریەکان و کابرای موهاجیریش بانگی کردە موهاجریەکان ، پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، کە گوێی لەمەبوو فەرمووی: (لێی گەرێن ئەمە بۆگەنییە)، کاتێ عبدالله ی کوڕی ئوبەی ئەمەی بیست وتی : سوێند بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە مەدینە دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدارو بەڕێزو پیاو ماقوڵە ئەوە دەر بکات لەشار کە بێ ڕێزو بێ دەسەڵاتە ، کەمەبەستی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)و موهاجیرەکان بوون، عومەر کە گوێی لەمە بوو چوویە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، ڕێم پێ بدە با لە گەردنی ئەو دووڕووە بدەم، پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ( لێی گەرێ با خەڵکی نەڵێن محمد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت)،[5] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە عومەر دەفەرمووێت: فەرمان بدە کە عوبابێنی کوڕی بشیر بیکوژێت، پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (چۆن ئەی عومەر! خەڵکی بڵێن محمد هاوەڵانی

---

١ـ البخاري، المغازي، رقم (٤٠٤)، السيرة الصحيحة (٣٩٢/٢).
٢ـ السيرة النبوية الصحيحة (٣٩٢/٢).
٣ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص:١٨٩).
٤ـ السيرة النبوية الصحيحة (٣٩٢/٢).
٥ـ السيرة النبوية الصحيحة (٤٠٩/٢).

دەکوژێت) ئەمەش لەکاتێکدایە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ناڕوات و خەڵکەکە دەستیان کرد بە ڕۆیشتن.[١]

لەم هەڵویست و ئامۆژگاریانەی پێغەمبەردا عومەر(ﷺ) تێگەشت کە ڕێسایەك هەیە دەبێت ڕەچاو بکرێت لە وەها هەلو مەرجێکدا ئەویش ( فقه المصالح و المفاسد)ە ، ئەم تێگەیشتنەش لەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دا دەردەکەوێت کە دەفەرمووێت:(پێت چۆنە ئەی عومەر خەڵکی بڵێن محمد هاوەڵەکانی دەکوژێت،)[٢] دیارە ئەمە پارێزگاری کردنێکی تەواوە لە سومعەی سیاسەت و یەکڕیزی ماڵی موسڵمانان، جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ئەوەدا هەیە کە خەڵکی باسی خۆشەویستی یارانی محمد بکەن بۆ محمد، جەخت لەسەر ئەوە دەنەکەوە بە زمانی ئەبو سوفیان کە سەرکردەی گەورەیان بووەو دەڵێت: کەسێکم نەبینیوە کە کەسێکی تری خۆش بوێت وەك خۆشەویستی یارانی محمد بۆ محمد،[٣] ئەوەشی ڕوون کردەوە کە خەڵکی پڕو پاگەندە بڵاو دەکەنەوە سەبارەت بەوەی کە محمد یارانی خۆی دەکوژێت، ئەمەش گومانی تێدا نیە کە لە پشتەوەی دا چەندین هەوڵ و تەقەلای گەورە هەیە بە هەوڵی چوونە نێو مەدینە و ڕیزی نێوخۆیی موسڵمانان پڕدەبێت لە دوژمن لە کاتێکدا کە ئەوانَ ئێستا بیَ ئومێدن وبیَ توانان بەسەر لاواز کردنی ئەم خۆشەویستیە و ئەم قوربانیدانەدا.[٤]

لە غەزای خەندەکیشدا جابر دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: ڕۆژێ خەندەق وپاش ڕۆژئاوابون عومەر هات و قسەی بە بێباوەڕانی قوڕەیش دەوت و دەیفەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژم نەکردووە و ئەوە ڕۆژیش ئاوابوو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) یش فەرموی: (سوێند بە خوا منیش نوێژم نەکردووە) پاشان دابەزین بۆ (بطحان)[٥] ئەو دەست نوێژی گرت و ئێمەش دەست نوێژمان گرت، پاش ئەوەی کە ڕۆژئاوا بوو نوێژی عەسری خوێند و دواتر نوێژی شێوانی خوێند.[٦]

## ٣- ڕێککەوتننامەی حودەیبیە، لەشکر بۆ هەوازن و غەزای خەیبەر:

لە ڕێککەوتننامەی حودەیبیەدا پێغەمبەر(ﷺ) عومەری بانگ کرد هەتا بینێرێت بۆ مەککە و گەورە پیاوانی مەککە ئاگادار بکات لەوەی کە بۆی هاتووە، عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، من بۆ خۆم لە قورەیش دەترسم، لە مەککەدا هیچ نەوەیەکی هۆزی عەدەی کوڕی کەعبی لەویَ نیە تا بم پارێزێ، بەلاّ م کەسێکت نیشان دەدەم کە لە من سەرفرازترە ئەویش عوسمانی کوڕی عەفانە، بەم شێوەیە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) عوسمانی بانگ کرد وناردیبۆ لای ئەبو سوفیان و پیاو ماقولانی قورەیش تا هەواڵیان بداتیَ کە بۆ جەنگ نەهاتووە بەڵکو وەك میوانێك هاتووە بۆ

١ـ السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣١٩).
٢ـ السيرة النبوية الصحيحة (٢/٤٠٩).
٣ـ التربية القيادية (٣/٤٦٣).
٤ـ التربية القيادية (٣/٤٦٣).
٥ـ یەکێکە لە شیوەکانی مەدینە.
٦ـ البخاري رقم (٥٧١).

کەعبە لەبەر گەورەیی و پیرۆزی ئەو شوێنە،[١]، پاش بڵاو بونەوە هەواڵی ڕێککەوتن و پێش تۆمارکردنی بەندەکانی نارەزاییەکی توند و بەهێز لەنێو ڕیزی موسڵمانان بۆ ئەم ڕێککەوتننامەیە دەرکەوت بە تایبەتی لەو دوو بەندەی کە باس لەوە دەکات ئەگەر هەر کەس هات و موسڵمان بوو پەنای هێنا بۆ مەدینە پێغەمبەر(ﷺ) بیگێڕێتەوە و هەر کەسیش لە موسڵمانان مورتەد بوویەوە و بێباوەڕان وەریدەگرن و پێشوازی لێ دەکەن ، بەندەکەی ترش ئەوە بوو کە موسڵمانان ئەو ساڵە بگەڕێنەوە و نەچنە نێو مەککەوە، زۆرترین کەسێکیش، کە نارەزا بوو بەرامبەر بەم ڕێککەوتنە و ڕەخنەی لێ دەگرت: عومەر و ئوسەیبینی کوڕی حوزەیر گەورەی ئەوسیەکان و سەعدی کوڕی عویادەی گەورەی خەزرەجیەکان بوو، مێژوونووسان دەڵێن عومەر چووەتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و نارەزایی خۆی بۆ ئەم ڕێککەوتنە نیشان داوە و فەرموویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ): ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟ فەرمووی: ((بەڵێ))، عەرزی کردوە: ئەی ئێمە موسڵمان نین؟ فەرموویەتی: ((بەڵێ))، عەرزی کردوە : ئەی ئەوان بێباوەڕنین؟ فەرموویەتی: ((بەڵێ))، عەرزی کردوە: ئەی لەسەر چی ئاینەکەمان بە سوکو کەم بگرین ؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فورمووی: ((من پێغەمبەری خودام و سەرپێچی لە فەرمانەکانی ناکەم ))،[٢] لەڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێت:((من بەندو پێغەمبەری خودام و سەرپێچی کارەکانی ناکەم و ئەویش لە یادم ناکات)).[٣] عەرزم کرد: ئەی تۆ نەبووی باسی ئەوەت بۆ دەکردین کە دەچنە کەعبە و تەوافی دەکەین؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ، بەڵام من وتم ئەمساڵ دەڕۆین؟)) عەرزم کرد: نەخێر پاشان هاتم بۆ لای ئەبوبەکر وتم ئەی ئەبو بەکر: ئایا ئەو پێغەمبەری خودا نیە؟ ئەبو بەکر فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی ئێمە موسڵمان نین؟ فەرمووی: بەڵێ، وتم: ئەی ئەوان بێباوەڕ نین؟ ئەویش وتی: بەڵێ، منیش وتم: ئەی لەسەر چی سووکایەتی بەرامبەر ئاینەکەمان قبوڵ بکەین، ئەبو بەکریش ئامۆژگاری عومەری کرد و داوای لێ کرد کە واز لەم نارەزاییە بهێنێت بەرامبەر بە ڕێککەوتنەکە و دان بە خۆیدا بگرێت، ئەبو بەکر فەرمووی: من شایەتی دەدەم کە ئەو پێغەمبەری خودایە وئەوەی کە ئەو فەرمانی پێ دەکات ڕاست و دروستە و ئێمەش سەرپێچی فەرمانی خودا ناکەین و خوای گەورەش ئەو لە یاد ناکات.[٤]

پاشان کۆمەڵێك موسڵمان کە عومەر یەکێ بوو لەوان چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)و سەرلەنوێ نارەزایی خۆیان ئاشکرا کردەوە بۆ ڕێك کەوتنەکەو بەوەش، کە خوای گەورە ئارامی و دانایی و ژیری و نەرم و نیانی بەخشیبوویە پێغەمبەری خۆشەویست، پێغەمبەر(ﷺ) توانی ئەم کۆمەڵە قایل بکات بە ئەنجامەکانی ڕێککەوتنەکە و ئاماژەشی بەوە دا کە ئەم ڕێککەوتنە لە بەرژەوەندی موسڵمانانە و سەرکەوتنی ئەوانی بە دواوەیە[٥] و خوای گەورەش دەروویەك و دەروازەیەك

---

١ـ السيرة النبوية لابن هشام (٢٢٨/٢). واخبار عمر (ص:٣٤).
٢ـ من معين السيرة للشامي (ص: ٣٣٣).
٣ـ البخاري رقم (٣٠١١)، تأريخ الطبري (٦٣٤/٢).
٤ـ السيرة النبوية لابن هشام (٣٤٦/٣).
٥ـ صلح حديبية، محمد احمد باشميل (ص: ٢٧٠).

والا دەکات بۆ چەندین کەسانی بێ دەسەلاتی وێنەی ئەبو جەندەل . ڕاستی ئەم هەواڵەش بەو شێوەیە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی لەسەر دابوو بەمەش عومەر(ﷺ) لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە فێری ڕێزگرتنی ناڕەزایی هێمنانە بووە، هەر لەبەر ئەمەشە کە لەسەردەمی خەلافەتیدا دەبینین کە هانی هاوەڵانی دەدات لەسەر دەربڕینی ڕای دروست کە خزمەت بە بەرژەوەندی گشتی بکات.[١] ئازادی ڕا دەربڕینیش لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا بۆتە ئەرکی سەر شانی موسڵمانان و هەر تاکێکیش لە کۆمەڵگەی موسڵماناندا ئازادە لە دەربڕینی ڕای خۆی ئەگەرچی ئەو ڕایە ڕەخنەیەك بێت بۆ هەڵوێستی فەرمانڕەوایەك یان خەلیفەیەك لە خەلیفەکان، مافی هەر تاکێکی موسڵمان ئەوەیە کە بیروبۆچوونی خۆی ڕوون بکاتەوە لەکەش و هەوایەکی هێمن و سەقامگیردا بێ تۆقاندن و هەڕەشەو چاو زیت کردنەوەیەك کە ئازادی وشە و فیکر بخنکێنێت ، لەم ناڕەزایی دەربڕینەی عومەرەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوە تێدەگەین کە ناڕەزایی دەربڕین لەبەرامبەر سەرکردەی دەوڵەتێك لە یەکێك لە بۆچوونەکانی یان هەڵوێستەکانی تاوان نیە و نابێت سزای بە دوادا بێت و خاوەنەکەی ڕەوانەی زیندان بکرێت.[٢]

ئەم هەڵوێستە لە عومەردا دوور بوو لە گومان و دوودڵیەك کە گرفتێك پاڵی پێوە نابێت بەڵکو داوایەك بوو بۆ ئاشکراکردنی شتێك کە لە لای ئەو شاراوە بوو لەسەر زەلیل کردنی بێباوەڕان بەوەی کە دەیزانی هێزێکی بەتوانا هەیە بۆ سەرخستنی ئیسلام،[٣] کاتێك کە حیکمەتی کارەکەی بۆ دەرکەوت دەربارەی هەڵوێستی خۆی سەربارەت بە حودەیبیە فەرمووی: تا ئێستا بەردەوام چاکە دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و نوێژ دەکەم تا خوای لێم خۆش بێت لەو هەڵوێستەی کە ئەو ڕۆژە هەمبوو .[٤]

لە مانگی شەعبانی ساڵی حەوتەمی کۆچیدا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەگەڵ سێ پیاوی تردا عومەری نارد بۆ عوجزی هەوازن کە ناوچەی (قەبلاء)[٥] ەو چوار قۆناغ لە شاری مەککەوە دوورە،[٦] عومەر ڕۆیشت و کەسێکی وەك ڕێ نیشاندەر لە هۆزی بەنی هیلال[٧] لەگەڵدا بوو، کە بەشەو دەڕۆیشت و بە ڕۆژ خۆی پەنا دەدا، هەواڵ گەیشتە هۆزی هەوازن و هەڵاتن پاشان عومەر(ﷺ) هاتە شوێنەکەیان و ڕووبەڕووی کەسیان نەبوویەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ مەدینە،[٨] لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە ڕێ نیشاندەرەکە وتی: ئایا دەتوانی ئەو کەلوپەلانە کۆبکەیتەوە کە ئەوان بەجێیان هێشتووە لە کاتێکدا کە تۆ وڵاتەکەیانت وشك کردۆتەوە؟ عومەر فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)

١ـ القيادة العسكرية في عهد رسول الله (ﷺ) (ص: ١٥٩).
٢ـ غزوة الحديبية لابي فارس (ص: ١٣٤-١٣٥).
٣ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص:١٩١).
٤ـ مختصر منهاج القصدين (ص:٢٩٣)، فرائد الكلام للخلفاء (ص: ١٣٩).
٥ـ لە بنەڕەتدا (الفلا)یە و ئەوەش لادانە.
٦ـ کە شیوێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی حیجاز کە لار دەبێتەوە بە ئاراستەی نەجددا.
٧ـ هلال بن عامر بن صعصعة بن معاوية بن بكر بن هوزان.
٨ـ الطبقات لابن سعد (٣/٢٧٢).

فەرمانی پێ نەداوم، بەڵکو فەرمانی پێ داوم کە بوەستم بۆ جەنگی هەوازن لەم خاکەدا،[١] ئەم لەشکرەش ڕێنماییمان دەکات بۆ سێ ئەنجامی سەربازی لەوانە:

**یەکەم:** عومەر ئامادەی سەرکردایەتی کردن بوو، ئەگەر ئەو نەبووایە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) نەیدەکردە سەرکردەی لەشکرێك لە لەشکری موسڵمانان و ڕەوانەی ناوچەیەکی زۆر مەترسیداری نەدەکرد کە یەکێك لە بەهێزترین و خۆیە زل زانترین تیرەی عەرەبی تێدابوو.

**دووەم:** عومەرێك بەڕۆژ خۆی پەنا دەدات و بە شەو ڕێدەکات بەمەستی پەلاماری لەناکاو هەڵکوتانە سەر دوژمن لە بێئاگایی دوژمندا ئەمەش گرنگترین بنەماکانی جەنگە و ئەمەش وای لێ کردووە کە لە ناکاو بدات بەسەر دوژمنەکەیدا و ناچاری بکات بە هەڵاتن، بەمەش ئەو هێزە کەمەی کە لەگەڵیدا بوو سەرکەوت بەسەر هێزی گەورەی بێباوەڕاندا.

**سێیەم:** عومەر بەشێوەیەکی دەقاودەق و گیانەوایی فەرمانی سەرکردەی باڵای خۆی بەجێ دێنێت و لێی لانادات، ئەمەش ڕووحی ڕێکخستنی سەربازی و گیانی سەربازیە لە هەموو جێگە و شوێن و سات و زەمانێکدا.[٢]

هەروەها لە غەزای خەیبەردا کاتێك پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بە ئامادەیی ئەهلی خەیبەر دابەزی و ئاڵاکەی[٣] دایە دەست عومەر (ﷺ) لەم کاتەدا خەڵکانێك لەگەڵی هەستانە سەرپێ و ئەهلی خەیبەر و عومەر و هاوەڵانیان ئاشکرا کرد و دواتر گەرایەوە بۆ لای پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ،پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سبەینێ ئەم ئاڵایە دەدەینە دەست پیاوێك کە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت وخواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت ))، کاتێك کە بەیانی دەرکەوتن[٤] لە نێو کۆمەڵە خەڵکەکەدا ئەبو بەکر و عومەر دانیشتبوون پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) عەلی بانگ کرد لە کاتێکدا کە نەخۆش بوو چاوی ئێشی دەکرد ، دەست بە چاوی دا هێناو چاك بویەو ئاڵاکەی دایە دەستی و خەڵکانێك لەگەڵی هەستانە سەرپێ و ئەهلی خەیبەریش پێشوازیان لێ کرد و یەکێك لە پێشوازی کەران ناپاکی نواند و وتی:

شـــاك السلاح بـــطل مجربٌ    إذا الليوث أقبلت تَـــلَهَّب
قد علمت خيبر أني مرحب    أطعن أحياناً وحيناً أضرب

پاشان ئەو و ئیامی عەلی(ﷺ)کەوتنە جەنگ و عەلی زۆر بوێرانە شمشێرەکەی دا بەسەریدا هەتا خودەکەی لەتکرد بەمەش هەموو ئەهلی سەربازگەکە گوێیان لەو دەنگە بوو، بەم شێوەیە تا دوایین

١ـ السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٢٨)، اخبار عمر (ص: ٣٤).
٢ـ الفاروق، القائد (ص:١١٧-١١٨)، شيت خطاب.
٣ـ ئاڵا: تەنها خاوەن سوپا دەیگرێت بە دەستەوە.
٤ـ لەنێو خەڵکەکە سنگیان دەرپەڕاند.

هاوەڵ کەوتنە دوای عەلی و خوای گەورەش سەرکەوتنی بە هەمووان بەخشی.

کاتێك هەندێ لە یاران لە خەیبەر پێشوازیان لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) کرد پێیان وت: فلاّن کەس شەهید بووە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)یش فەرمووی: (نەخێر، من لە نێو دۆزەخ بینیم لە نێو کراسێکی ملداری خەت خەت کە تەوقی دەکرد، یان عەبایەك )، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی کوڕی خەتاب! بڕۆ لە نێو خەڵکیدا هاوار بکە و بڵێ: کەس ناڕواتە بەهەشتەوە مەگەر ئیمانداران، عومەر دەفەرمووێت چوومە دەرەوە و هاوارم کرد: کەس ناچێتە بەهەشتەوە مەگەر ئیمانداران.

## ٤- فەتحی مەککە و غەزای حونەین و تەبووك:

کاتێك قورەیشیەکان بە ستەمکاری خۆیان بەندەکانی ڕێککەوتننامەی حودەیبیەیان شکاند ترسان لەو مەترسیە گەورەیەی کە لە دەرئەنجامی شکاندنی بەندەکانی ئاشتەوایی حودەیبەوە دروست دەبن، لەبەر ئەوە ئەبو سوفیان چوو بۆ مەدینە تا ڕێککەوتنەکە توند و تۆڵ بکاتەوە و ماوەکەی درێژ بکاتەوە ، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە هیچ وەڵامی نەدایەوە، پاشان چوو بۆ لای ئەبو بەکر و پێی وت کە قسە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بکات، ئەبو بەکر فەرمووی: من شتی واناکەم، دواتر ئەبو سوفیان چوویە لای عومەر(رضي الله عنه) قسەی لەگەڵ کرد، عومەر فەرمووی: من داوای شەفاعەتتان بۆ بکەم لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ؟ سوێند بە خوا، ئەگەر تەنها گەردیلەیەك شك بەرم و هیچی تر بەدی نەکەم ئەوا بەو گەردیلەوە لەگەڵتان دەجەنگم،[1] کاتێك کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خۆی ئامادەکرد بە مەبەستی فەتحی مەککە، حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە نامەیەکی بۆ خەڵکی مەککە نوسی و تیایدا هەواڵی پێدابوون کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ئەوان بێنی بەڵام خوای گەورە لە ڕێگای نیگاوە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لەم نامەیە ئاگادارکردەوە ئەویش هەر لە سەرەتای ئەم کارەدا کۆنترۆڵی دۆخەکەی کرد و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) عەلی و مقدابینی نارد ئەو ئافرەتە بگرن کە نامەکەی پێیە و پاشان نامەکەی لێ وەربگرن، ئەم ئافرەتە(١٢) میل لە مەدینە دوور کەوتبوویەوە بەڵام ئەوان پێی گەیشتن و بە هەڕەشە نامەکەیان لێ سەند دواتر پێغەمبەر(ﷺ) حاتەبی بانگ کرد بۆ لێکۆڵینەوە و ئەویش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) پەلەم لێ مەکە من خۆم لکاندووە بە قورەیشەوە ـ من هاوپەیمانی ئەوانم و لەوان نیم ـ تۆ هەر کەست لە موهاجرین لەگەڵدایە دۆستیان لە مەککە هەیە و کەس و کاریان بۆ دەپارێزن، منیش پێم خۆش بوو ئەگەر شتێ بکەم بۆ قورەیش تا گیانی ماڵو منالم بپارێزم، من ئەم کارەم نەکردووە وەك ئەوەی کە لە ئاینەکەم هەڵگەڕێمەوە و بە کوفر قایل بم لە پاشی ئیسلام، پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (ئەم پیاوە ڕاست دەکات )،عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! ڕێگەم بدە با لە گەردنی ئەم دووڕووە بدەم، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((ئەو بەدری بینیوە، خوای گەورە بەئەهلی بەدری فەرموە

---

١ـ السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٦٥)، اخبار عمر (ص: ٣٧).

چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بوم.[١]

لە گفتو گۆیەك لە نێوان عومەر و پێغەمبەر(ﷺ) دا ڕویدا سەبارەت بەکێشەیەکی حاتەب دەتوانین چەندین پەند و ئامۆژگاری وەربگرین لەوانە:

- حوکمی سیخوڕ کوشتن: عومەر ئەم هەواڵەی ڕاگەیاند و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) نکولی لێ نەکرد بەڵام ڕێگەی لە بەرێکردنی سزا کەدا بەهۆی ئەوەی کە حاتەب یەکێك بووە لە بەشدار بوانی بەدر.
- سور بونی عومەر لەسەر پاراستنی ئاینەکەی: ئەمەش لەوەدادەردەکەوێت کە عومەر داوای کرد کە لەملی حاتەب بدات.
- گوناهی گەورە ئیمانت لێ ناسێنێتەوە: ئەوەی کە حاتەب پێی هەستا گوناهێکی گەورە بوو کە بریتی بوو لە سیخوڕی کردن لەگەڵ ئەوەشدا بە ئیمانداری مایەوە.
- عومەر لە ڕوی زمانەوانییەوە سیفەتی دوو ڕوی دایە پاڵ حاتەب نەك لە ڕوی زاراوەیی یەوە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دا لەکاتێکدا دوڕویی شاردنەوەی کوفر و دەرخستنی ئیمانە، بەڵام ئەوەی کە عومەر دەیویست سەرپێچی یەکی شاردراوە بوو کە دەرکەوتبوو بە جۆرێ کە ئیشێك کە لەگەڵ ئیماندا ناگونجێ ئەنجامی دابوو کە بریتی بوو لەوەی بڕواتە دەرەوە بەمەبەستی تێکۆشان لە پێناویدا و ڕشتنی خوێنەکەی لە پێناویدا.[٢]
- عومەر بەم وەڵامەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر کاریگەر بوو هەر لە ساتە چرکەکانی پیاوێکی توڕەوە کە هاواری سزایەکی گەورەی دەکرد لەسەر حاتەب گۆڕا بۆ پیاوێك کە بە هۆی کاریگەری و لە خوا ترسانیەوە دەگریا و دەیفەرموو: خوای گەورە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) باشتر دەزانن ئەمەش لەبەر ئەوەی کە زانی تووڕەبوونەکەی لەبەر خاتری خوا و پێغەمبەرەکەیەتی بەڵام کاتێك کە بۆی ڕوون بوویەوە کە ئەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی قایل دەکات ئەوە نیە کە ئەو دەیبینێت چاوپۆشی لەو هەڵەیە کرد و گەرایەوە بۆ ئەوەی مامەڵەی باش لەگەڵ هاوەڵەکەیدا بکات ئەوەش وەك ڕێزلێنانێك بوو بۆ بەشداربوونی لە جیهاد و بە دەمەوە هاتنیدا.[٣]

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە (الظهران) سوپاکەی لادا ئەبو سوفیان ترسا و عباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە ئەبو سوفیان کرد کە داوایپاراستنی گیانی خۆی لە پێغەمبەر(ﷺ) بکات و ئەویش بەم داوایە قایل بوو، عەباسی کوڕی عبدالمطلب دەڵێت وتم: بەڵام لێدای ئەبو سوفیان ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)و لەنێو خەڵکیدا و سوێند بە خوا ئەوەشتایندەی قوڕەیشە، ئەویش وتی: چار چیە؟ دایك و باوکم بە قوربانت بێت، عەباس وتی: سوێند بە خوا ئەگەر سەرکەون بە سەرتدا لە گەردنت دەدەن، وەرە لە پشتی ئەم ئێسترەوە سوار ببە هەتا دەتگەیەنمە لای پێغەمبەر(ﷺ) و داوای

---

١ـ البخاري في المغازي رقم (٤٣٧٤).
٢ـ السيرة نبوية لابي فارس (ص:٤٠٤).
٣ـ التأريخ الاسلامي (٧/١٧٦-١٧٧).

پاراستنی گیانی تۆی لێ دەکەم، عەباس وتی: سەرکەوت و هاوڕێکانی گەڕانەوە و منیش هێنام و هەر کاتێك دەماندا بە لای چەند موسڵمانێکدا دەیان پرسی: ئەوە کێیە؟ ئەگەر ئێسترەکەی پێغەمبەری خوایان بدیایە کە منی لەسەر بوو دەیان وت ئەوە ئێسترەکەی پێغەمبەری خۆشەویستە(ﷺ) ئەوە مامیەتی لەسەری هەتا دام بە لای عومەردا فەرمووی: ئەوە کێیە؟، لەبەر دەمم هەستایەوە، کاتێك کە ئەبو سوفیانی بینی لە دوای ئێسترەکەوە فەرمووی: ئەبو سوفیان دوژمنی خوا، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە توانا و دەسەڵاتترە لە تۆ بێ هیچ گرێ بەست و پەیماننامەیەك، پاشان بەخێرایی بەرەولای پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات و چوویە ژورەوە بۆ لای و عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوە ئەبو سوفیانە خوای گەورە بە دەسەڵاتتر و بە تواناترە لەو، بەبێ هیچ پەیمان و بەڵێنی هاتوەو لەبەر دەستماندایە، لێم گەڕێ با لە گەردنی بدەم، عەباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من لەگەڵ خۆمم هێناوە، کاتێك عومەر زیاتر لەم بارەیەوە دوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: پەلە مەکە ئەی عومەر، سوێند بە خوا ئەگەر ئەبو سوفیان لە تیرەی بەنی عەدا بوایە وات نەدەوت بەڵام تۆ ئەوە دەزانی کە لە پیاوانی تیرەی عبد المنافە، عومەریش فەرمووی: تۆش پەلە مەکە ئەی عەباس سوێند بە خوا موسڵمان بوونی تۆ ئەو ڕۆژەی کە موسڵمان بوویت زۆر دڵخۆشتری کردم لە موسڵمان بوونی خەتاب ئەگەر موسڵمان ببێت، من هیچ نازانم ئەوە نەبێت کە موسڵمان بوونی تۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر خۆشترە لە موسڵمان بوونی خەتاب ئەگەر موسڵمان ببێت، پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عەباس بیبە بۆ لای کۆچبارەکەت ئەگەر موسڵمان بوو بیهێنەرەوە بۆ لام)،[1] ئەمە هەڵوێستی عومەرە(رضي الله عنه) کە دوژمنی خوا دەبینێت بە لای هێزی موسڵماناندا تێدەپەڕێت بە پارێزگاری عەباسی مامی پێغەمبەر(ﷺ) بە سەرشۆڕی و ترسەوە، عومەر ئومێدی ئەوە دەکات لە گەردنی دوژمنی خوا بدات بە هیوای نزیك بوونەوە لە خواو جیهادێك لە پێناویدا، بەڵام خوای گەورە چاکەی بۆ ئەبو سوفیان دەوێت و سنگی دەکاتەوە بۆ ئیسلام و گیان و خوێنی دەپارێزێت.[2]

لە غەزای حونەیندا سوپای بێباوەڕان زاڵ بوون بەسەر سوپای موسڵماناندا و خەڵکەکە خێرا گەڕانە دواوە کەس بە کەسەوە نەبوو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە لای ڕاستیدا ڕوانیو فەرمووی:(ئەی خەڵکینە ئێوە لە کوێن؟ وەرن بۆ لام من پێغەمبەری خوام، من محمدی کوڕی عبدالله م)).

کەس گوێی لەو قسانە نەبوو حوشترەکانیش بە یەکدا دەهاتن و دەچوون هەموو خەڵکەکە بۆی دەرچوون تەنها چەند کەسێك نەبێت لە کۆچکەران و پشتیوانەکان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) مانەوە لەوانە ئەبو بەکر و عومەر لە ئەهلی بەیتیش عەلی و عەباسی کوڕی عبدالمطلب و فضل کوڕی عباس و ئەبو سوفیانی کوڕی حارث و کوڕەکەی و ڕەبیعەی کوڕی حارث و چەند کەسێکی تر،[3] ئەبو قەتادە

---

١ـ السيرة النبوية (ص: ١١٨-١١٩-١٢٠).
٢ـ الفاروق مع النبي، د. عاطف عاضة (ص: ٤٢).
٣ـ السيرة النبوية لابن هشام (٢/٢٨٩)، اخبار عمر (ص: ٤١).

هەڵوێستی عومەر لە غەزای حونەیندا دەگێڕێتەوە و دەفەرموویێت: ساڵی حونەین لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ)چووینە دەرەوە کاتێك کە ڕووبەڕووی بێباوەڕان بووینەوە تاوێك سەرکەوتن بۆ موسڵمانان بوو پاشان پیاوێکم لە بێباوەڕان بینی کە موسڵمانێکی بەرزکردەوە و لە پشتەوە دای لە گەردنی و بە شمشێرێك پۆشاکە جەنگیەکەی بڕی، پاشان بە ڕووی مندا هات و باوەشی پێدا کردم و بۆنی مردنی لێوە دەهات ناردمی بۆ لای عومەر و کاتێك کە چووم وتم: ئەمڕۆ موسڵمانان چیانە؟ ئەویش فەرمووی: فەرمانی خودا بوو، پاشان گەڕانەوە.[1]

خوای گەورە سەبارەت بەم غەزایە دەفەرموویێت: ﴿لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾ (التوبة: ٢٥).

خوای گەورە ئەم چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموویێت: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ﴾ (التوبة: ٢٦).

پاش جەنگی حونەین موسڵمانان گەڕانەوە بۆ مەدینە کاتێك کە بە (جعران)[2]دا تێپەڕین پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) زیوی لە جلەکانی بیلال لێ دەکردەوە و دەیبەخشیە خەڵکی، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی محمد دادوەر بە، پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ) فەرمووی: (بەڵام لێدای، ئەگەر من دادوەر نەبم کێ دادوەر دەبێت؟ ئەگەر من دادوەر نەبم ئەوا تۆ ئومێد بڕاو و دۆڕاوی)، لەم کاتەداعومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە من ئەم پیاوە دووڕووە بکوژم، ئەویش فەرمووی: (پەنا بە خوا ئەگەر خەڵکی بڵێن محمد هاوەڵانی دەکوژێت، ئەو پیاوە و هاوڕێکانی قورئان دەخوێنن و سوود لەو قورئانە وەرناگرن کە دەیخوێنن، لەدین دەردەچن هەروەکو تیرێك کە لە کەوانەکەی دەردەچێت.).[3]

لەم هەڵوێستەدا کردەوەیەکی چاك و گەورە بۆ عومەر(رضي الله عنه) بەدی دەکرێت ئەویش ئەوەیە ئارامی لێ دەبڕێت ئەگەر لەبەر دەمیدا سنووره قەدەغەکراوەکان ببەزێنرێت، لێرەدا هێرش کراوەتە سەر مەقامی پێغەمبەرایەتی و پەیامەکەی، لێرەدا هیچ لە فاروق نەوەشایەوە ئەوە نەبێت پەلەی کرد و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێم گەڕێ با ئەو دووڕووە بکوژم، ئەمەیە وەڵامدانەوەی عومەر لەبەردەم کەسانێك کە لە پیرۆزی پێغەمبەرایەتی و پەیامەکەی کەم دەکەنەوە،[4]، لە جعرانەدا

---

١ـ البخاري رقم: (٤٠٦٦-٤٠٦٧).
٢ـ دەکەوێتە باکووری مەککە بە لاریوونەوەیەك بە لای خۆرهەڵاتدا بە دووری (٩٩ میل).
٣ـ مسلم رقم: (١٠٦٣)، البخاري رقم: (٣١٣٨).
٤ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة فاروق (ص: ٢٠٠).

عومەر(ﷺ)ئارەزوویەکی عەلی کوڕی ئومەییە هێنایە بینی (کە یەکێك بوو لە هاوەڵە بەناوبانگەکان ) و بە هیوای بینیی وحی بوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ)،[1] صەفوانی کوڕی یەعلا دەگێڕێتەوە کە عەلی دەیوت: بریا پێغەمبەرم(ﷺ) دەبینی لە کاتێکدا وەحی بۆ بینی. کاتێك کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە جعران بوو، پۆشاکێکی بەسەر شانەوە بوو کە نوێژی پێوە دەکرد چەند کەسێك لە یارانی لەگەڵدا بوو لەم کاتەدا دەشتەکیەك هات و جبەیەکی لەسەر شان بوو بۆنی خۆشی لێدابوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! پیاوێك چۆن دەبینی کە پۆشاکی عەمرەی لەبەر کردووە پاش ئەوەی کە بۆنی خۆشی لێداوە؟ لەم کاتەدا عومەر بە دەستی ئاماژەی بۆ یەعلا کرد و ئەویش هات و بیی، کە پێغەمبەر(ﷺ) سوور هەڵگەراوە پرخەی دەهات هەروەك کاتژمێر پاشان فەرموی بڕۆ: (ئەوەی کە پێتە سێ جار بیشۆرە ئەو جبەیەش لەبەرت لابە و بە جۆرێك جل و بەرگ لەبەر بکە کە بۆ حەجی لەبەر دەکەیت).[2]

لە غەزای تەبووکدا نیوەی ماڵەکەی بەخشی و ئامـاژەی دایە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) کە دوعای بەرەکەت بکات بۆ خەڵکی کاتێك دوچاری برسیەتی بوون، ئەبی هورەیرە(ﷺ)دەفەرمووێت: کاتێك لە غەزای تەبووك بووین،[3] خەڵکی دوچاری برسیەتی بوون، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ڕێگەت پێ دابـاین ئەوا حوشترەکانی خۆمـان سەردەبڕی و دەمـانخوارد، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)یش پێی فەرموون: ((ئەو کارە ئەنجام بدەن، لەم کاتەدا عومەر هات و فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەگەر ئەمە بکەن ئەوا ژمارەی سوارەکان کەم دەکات، بەڵام داوایـان لێ بکە با خواردنەکانیان بهێنن،دوعـای بەرەکەتی بەسەردا بخوێنی، بەم شێوەیە پیاوێك مشتێك زەڕات و یەکێکی تر خورمـا و یەکێکی تر ورتکەنانی هێنـا و شتێك کۆکرایەوە و پێغەمبەر(ﷺ) دوعـای زۆربوونی بۆ کردن و، پاشان فەرمووی: ((دەفرەکانتان پڕبکەن)) ئەوانیش دەفرەکانیان پڕکرد و تەنانەت کەسێك نەمایەوە کە دەفرەکەی پڕنەکردبێت و تێری نەخواردبێت، لەمەشدا فەزڵێك دەرکەوت و پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((شاهێدی دەدەم کە یەك خوای گەورە هەیە ئەویش (الله) یە و منیش پێغەمبەری خوام و خوای گەورە هیچ بەندەیەکی خۆی لەبیر ناکات جگە لە گازاندەکار کە ڕێگەی بەهەشتی لێ دەگرێت).[4]

## دووەم: هەڵوێستەکانی لە کۆمەڵگەی مەدەینەدا:

عومەر سوور بوو لەسەر هاوەڵی کردنی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەو(ﷺ) هەر کاتێك لە کۆڕێکی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دا ئامادە بوایە بەجێی نەدەهێشت هەتا کۆتایی پێ دەهات و یەکێك بوو لەو چەند کەسە کەمانەی کە پێغەمبەر(ﷺ)ی بەجێ نەهێشت کاتێك کە کاروانەکە هاتە مەدینە و

---

١ـ محض الصواب في فضائل امير المؤمنين عمر بن الخطاب (٢/٤٠٨).

٢ـ البخاري رقم (٤٧٠٠)، مسلم رقم (١١٨٠).

٣ـ ناوچەیەکە دەکەوێتە نێوان مەدینە و وادی القری.

٤ـ مسلم، کتاب الايمان، رقم (٢٧).

پێغەمبەر(ﷺ) وتاری بۆ دەدان.[١]

هەروەها عومەر لە ئەلقە و وانە و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە وریایی دادەنیشت شتی لا ڕوون دەبوویەوە و تێدەگەیشت و لە بواری کاروباری تایبەتی و گشتیەوە[٢] پرسیاری دەخستە بەردەم پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و هەر لەبەر ئەوەشە، کە (٥٣٩)[٣] فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕیوایەت کردووە، هەندێ کەس دەڵێن(٥٣٧)[٤] فەرموودەیە و موسلیم و بوخاریش پێکەوە(٢٦) یان لێوە ڕیوایەت کردوە و بوخاری بە تەنها (٣٤)ی لێوە ڕیوایەت کردوە و موسلیمیش بە تەنها(٢١)ی لێوە ڕیوایەت کردوە و ئەوانی تریش لە کتێبەکانی تری فەرموودەدایە،[٥] خوای گەورە پارێزگاری لێ کردووە بۆ گێڕانەوەی کۆمەڵە فەرموودەیەك کە نرخی سەرەتایی هەیە لە دەرخستنی ڕاستی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان و قەزا و قەدەر و زانیاری و زانست و یادی خوا و دوعا و پاك و خاوێنی و نوێژ و بەخاك سپاردن و زەکات و چاکەکردن و ڕۆژووگرتن و حەج و مارەبڕین و تەلاق و وەچەو فەرزەکان و وەسیەت و کۆبوونەوەو مامەڵەکردن و سنوورەکان و پۆشاك و خواردن و خواردنەوە و قوربانیکردن و ڕەوشت و لە خوا ترسان و نەرمی نواندن و پیاوەتی و قیامەت و خەلافەت و ئەمیرایەتی و دادوەری. هەموو ئەم فەرموودانەش شوێنی خۆی لە نێو زانستە ئیسلامیەکاندا کردۆتەوەو بەردەوامیش ڕووبارێکە درێژە بەوزانیاریانە دەدات[٦] ئەمەش هەندێ هەڵوێستی فێرکاری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیە لە ژیانی عومەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەدینەدا.

## ١- پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە پرسیارکەرێك لە عومەر دەپرسێت:

عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) فەرمووی: کاتێك ئێمە لە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین پیاوێك هات بۆ لای کە ڕوخسارجوان و سەر و قژ ڕێك و پۆشاکێکی سپی لەبەردا بوو، خەڵکەکە هەموویان سەیری یەکتریان دەکرد و دەیان وت ئێمە ئەم پیاوە ناناسین و ئەمەش لە ڕێبوار ناکات،هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هێندەی لێ نزیك بویەوە تا ئەژنۆی نا بە ئەژنۆی پێغەمبەری خۆشەویستەوە(ﷺ) و دەستی خستە سەر ڕانەکانی و وتی: ئیسلام چیە؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: ((شاهێدی بدەیت کە یەك خوا هەیە ئەویش (الله)یە و محمد پێغەمبەری خوایە و نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژوو بگریت و حەج بەجێ بهێنیت))، وتی ڕاست ئەکەی، ئێمەش پێمان سەیر بوو پسیار دەکات و دوایش دەڵێت ڕاست ئەکەیت. پاشان وتی: ئەی ئیمان چیە؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: ((باوەڕت هەبێت بە خوا و فریشتەکان و

---

١ـ الاحسان في تقريب صحيح إبن حبان (١٥/٣٠٠)، مسلم، رقم (٨٣٦).
٢ـ عمر بن الخطاب، د. علي الخطيب (ص: ١٠٨).
٣ـ تأريخ الخلفاء للسيوطي (ص: ١٣٣).
٤ـ عمر بن الخطاب، د. علي الخطيب (ص: ١٠٩).
٥ـ دليل الفالحين لطرق رياض الصالحين (١/٤٠).
٦ـ عمر بن الخطاب، د. علي الخطيب (ص: ١٠٩).

پەیامەکانی و پێغەمبەرەکانی خواو و زیندووبوونەوەی دوای مردن وقەدەر بەخێرو شەڕیەوە))، دواتر وتی: ئەی چاکەکردن چیە؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: (( بە شێوەیك خواپەرستیت وەك ئەوەی کە دەیبینی، ئەگەر تۆ ئەو نەبینی ئەواخوای گەورە تۆ دەبینێت))، پاشان وتی: کەی ڕۆژی دوای بەرپا دەبێت؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ( پرسیار لێکراو زانا تر نیە لەوەی پرسیار دەکات) پاشان پرسی : ئەی نیشانەکانی چین؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی (( ئەگەر کەسانی ڕووتەڵەی پێ پەتی مشەخۆر بوونە سەردار و گەورەی خەڵکی و کۆشك و تەلارەکان بەرزکرانەوە و خزمەتکارەکان خاوەندارەکانیان لەدایك بوو)) دوای ئەمانە ڕۆشت ، دواتر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (( ئەی کوڕی خەتاب! ئەزانی ئەو کەسە کێ بوو کە پرسیاری دەربارەی ئەو شتانە کرد؟ منیش وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)دەزانن: پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە جبریل بوو هاتبوو ئاینەکەتان فێربکات))،[1] ئەم فەرموودەیەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە عومەر مانای ئیسلام و ئیمان و چاکەی بە ڕێگەی پرسیار و وەڵام لە باشترین فریشتە و پێغەمبەرەوە فێربووە.

## ٢- پێکانی ڕای پێغەمبەر(ﷺ):

ئەبو هورەیرە(ﷺ)دەفەرمووێت: ئێمە لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوین و عومەر و ئەبو بەکریشمان لەگەڵدا بوون لەگەڵ چەند کەسێکی تر، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لەنێوانماندا هەستا و بەجێی هێشتین، ئێمەش ترساین کە بەبێ ئێمە بڕوات توشی نارەحەتی و بەڵایەك بێت ، بۆیە ئێمەش هەستاین بە دوایدا ڕۆشتین، من یەکەم کەس بووم کە ترسام و هاتمە دەرەوە و دوای پێغەمبەر(ﷺ)کەوتم تاوەکو گەیشتمە نزیك باخی بەنی نەجار ، سوڕامەوە بە دەوریدا بزانم کە دەرگای هەیە بەڵام دەرگام نەدۆزیەو، بینیم جۆگەیەکە دەڕواتە نێو دیوارەکەوە لە بیرێکی دەرەوە، جولام و چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەبو هورەیرە))، وتم: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ((ئەوە چیتە؟)) وتم: تۆ لە نێوماندا بوویت و هەستای و ئێمەت بەجێ هێشت، ترساین کە لێمان دوور کەویتەوە، ئێمەش ترساین لەسەر گیانی تۆ و منیش یەکەم کەس بووم هاتم بۆ لای ئەم دیوارە و هەروەك ڕێوی جولام و خەڵکەکەش بە دوامەوەیە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (( ئەی ئەبو هورەیرە، نەعلەکانی دایە دەستم ـ بەم نەعلانەوە برۆ هەر کەست بینی لە پشتی ئەو دیوارەوەو بەبێ گومان و دوودڵیەوە شایەتومانی هێنا مزگێنی بەهەشتی پێ بدە))، یەکەمین کەس کە پێی گەشتم عومەر بوو فەرمووی: ئەم نەعلانە چین ئەی ئەبو هورەیرە؟ منیش وتم ئەوە نەعلەکانی پێغەمبەری خوان(ﷺ) بەوانەوە ناردوومی کە بە هەر کەس بگەم بێ دوودڵیەوە شایەتومان بهێنێت ئەوا مزگێنی بەهەشتی پێ بدەم، عومەر بە هەردوو دەستەکانی دای بە سنگمدا و خرەی لێوە هات و پاشان وتی: ئەی ئەبو هورەیرە بگەرێرەوە، منیش گەرامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە گریان و

---

١ـ اسناده صحیح علی شرط الصحیحین، مسند احمد، رقم (١٨٤).

عومەریش شوێنم کەوت پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە چیتە ئەبو هورەیرە؟))، منیش وتم: گەیشتم بە عومەر و ئەو هەواڵەم پێدا کە تۆ منت پێ نارد[1] ئەویش دای لەسەر سنگم خڕەی لێوە هات، پاشان فەرمووی: بگەڕێوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: (( ئەی عومەر چی وای لێ کردی ئەم کارە بکەیت؟))، ئەویش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا تۆ ئەبو هورەیرەت ناردووە بە نەعلەکانتەوە کە بە هەر کەس بگات بێ گومان و دوودڵی شایەتومان بهێنێت مزگێنی بەهەشتی پێ بدەیت؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: ((بەڵێ))، عومەر فەرمووی: کاری وا مەکە، من دەترسم کە خەڵکی پشت بەمە ببەستن و پاڵی لێبدەنەوە، لێیان گەڕێ با کاری خۆیان بکەن، پاشان پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: ((لێیان گەڕێن)).[2]

## ٣- سووربوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەوەی کە یاران لە یەك سەرچاوە شتیان پێ بگات:

جابری کوڕی عبداللە دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ)پارچەیەك تەوراتی بە دەستی عومەرەوە بینی فەرمووی: ((ئایا سنوورتان بەزاندووە، ئەی کوڕی خەتاب؟ من بەپاکی و پوختی ئەم ئاینەم بۆم هێنان، ئەگەر موسا زیندوو بوایە جگە لە شوێن کەوتنی من هیچ هەوڵێکی تری نەدەبوو))، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ((ئەگەر موسا زیدنوو بوایە و شوێنی من بکەوتایە و لەوە نەگەرابا سەرگەردان دەبوو)).[3]

## ٤-پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)سەبارەت بەسەرەتای دروست بونی بونەوەر دەدوێت:

طارقی کوڕی شەهاب دەفەرمووێت: گوێم لە عومەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوانماندا هەستا و هەواڵی پێداین دەربارەی سەرەتای دروست بونی بونەوەر تاوەکو چوونە بەهەشتی بەهەشتیان بۆ شوێنی خۆیان و دۆزەخیان بۆ شوێنی خۆیان هەندێ کەس ئەمەیان لەبەر کرد و هەندێکیان لە یادیان کرد،[4] ئەم فەرموودەیە دەڕواتە چوارچێوەی ئەو فیقهەی کە هاتووە لە لایەن ئەو خودایەی کە عومەر (ﷺ) لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە تێی گەیشتبوو.

## ٥-توڕە بوونی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لە سوێند خواردن بە باوکان و سووربوونی لەسەر پشت بەستن بە خودا:

عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: عومەر فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە دەیفەرموو: (( خوای گەورە نەهی لێ کردوون کە سوێند بە باوباپیرانتان بخۆن))، عومەر(ﷺ)

---

١ـ محض الصواب في فضائل امير المؤمنين (٢٥٨/١).
٢ـ مسلم، الايمان رقم (٣١).
٣ـ الفتاوى (٢٣٢/١١) مسند احمد (٣٨٧/٣) عن جابر.
٤ـ البخاري، كتاب بدء الخلق، رقم (١٩٢).

فەرمووی: سوێند بە خوا لەو ڕۆژەوە ئەو فەرموودەیەم بیستووە تەنانەت باسم نەکردوون وەك یادکردنەوەش نە بادا ئەو ەهیە ئەمەش بگرێتەوە [1]، عومەر (ﷺ) گوێی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە، کە دەیفەرموو: ((ئەگەر ئێوە بە ڕاستی پشت بە خوا ببەستن، ڕزق و ڕۆزیتان دەدات هەروەك چۆن ڕزق و ڕۆژی باڵندەیەك دەدات، کە بە برسیەتی دەڕوات و بە تێری دەگەڕێتەوە)). [2]

## ٦- قایل بووین بە خوای گەورەی خودا و بەوەی کە ئیسلام ئاینمانە و محمد نێردراو و پێغەمبەرمانە:

ئەبو موسا دەفەرمووێت: پرسیار دەکرا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی کۆمەڵە شتێك کە پێی خۆش نەبووکە پرسیارکان زۆر دەبوون تووڕە بونێك لە دەمو چاوی پێغەمبەری خۆشەویستدا(ﷺ) بەدی دەکرا ، بە خەڵکەکەی فەرموو: ((پرسیارم لیّ بکەن لە هەر بارەی هەرچیەوە دەتانەوێت))، پیاوێك وتی: باوکم کێیە؟ پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: ((باوکت حذافتیە)) یەکێکی تر هەستا و وتی: باوکم کێیە؟ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((باوکی تۆ سالم مەولای شەیبەیە)). [3]

کاتێك عومەر لە دەم و چاوی پێغەمبەری خۆشەویستدا(ﷺ) ئەوەی بەدی کرد کە بێتاقەتە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! خوا تەوبە دەکەین؟ [4]، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە عومەر لەسەر ئەژنۆی دانیشتوو فەرمووی:ڕازی بووین بەوەی کە خوا خوای گەورەمانە و ئیسلام ئاینمانە و محمد پێغەمبەرمانە و پاشان بێدەنگ بوو. [5]

## ٧- نەخێر، بە تەنها بۆ تۆ نیە بەڵکو بۆ تەواوی خەڵکە:

ابن عباس دەفەرمووێت: پیاوێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب وتی: ئافرەتێك هاتووە بۆ لای تاوەکو بەیعەتی پیّ بدات و ئەویش کردوویەتیە ژوورە بچووکەکەیەوە هەمو شتێکی لەگەڵدا ئەنجامداوە بێجگە لە جیماع، عومەر فەرمووی: بەڵای خوام لێدای ڕەنگە هاوسەرەکەی بۆ جیهاد چوبێت و تەنها کەوتبێت؟ لەم کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾ (هود: ١١٤).

پاشان فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خو(ﷺ)! ئەمە بە تەنها بۆ منە یان بۆ خەڵکی تریشە؟ پێغەمبەری خو(ﷺ)بەدەستی کێشای بەسنگی عومەردا و فەرمووی: نا ئەمە بە تەنها بۆ تۆ نیە بەڵکو بۆ تەواوی خەڵکیە، پاشان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی : (( عومەر ڕاستی کرد)). [6]

---

١ـ اسناده صحیح علی شرط البخاري، مسند احمد، رقم (٢٢)، الموسوعة الحدیثة.
٢ـ إسناده قوي، مسند احمد رقم (٢٠٥)، الموسوعة الحدیثة.
٣ـ سعد کوڕی سالم مەولا شەیبە کوڕی ڕەبیعە صحابی، محض الصواب (٧٠٠/٢).
٤ـ البخاري رقم (٩٢)، مسلم رقم (٢٣٦٠).
٥ـ البخاري رقم (٩٣)، مسلم رقم (٢٣٥٩).
٦ـ مسند احمد (٤٧٤) رقم (٢٢٠٦)، قال احمد شاکر: اسناده صحیح.

## ٨- حوکمی ئەو کەسەی لە خێرەکەی پەشیمان دەبێتەوە:

عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: سواری ئەسپێك بووبووم کە پیاوێك کردبوی بە خێر لە ڕێناو خوای گەورەدا، ویستم بیکڕم و گومانم وا بوو کە هەرزان دەیفرۆشێت، وتم: تاوەکو پرسیار لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لێی نەکڕیت ئەگەر بە درهەمێکیش بتداتێ، ئەو کەسەی کە پاشگەز دەبێتەوە لە چاکەکردنەکەی وێنەی ئەو سەگەیە، کە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی)).[1]

## ٩- خێرو خێرات و وەقفەکانی:

ئیبنو عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: عومەر لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا ماڵێکی بەخشی کە پێیان دەوت: (ثمغ) کە خورمای تێدابوو، عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)قازانج و خێرێکم لێ بینیوە و ئەوەیش لای من گران بەهایە، دەمەوێت بیکەم بە خێر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (( بیە بەخێر، نەبفرۆشرێت و نەببەخشرێت و ننبکرێتە میراتی، بەڵام بەرهەمەکەی دەبەخشرێت))، عومەریش کردیە خێر لە پێناوی خوادا ، لەڕێی ئازادکردنی کۆیلە و هەژاران و میوان و ڕێبوارو خزم و دۆست و، گوناه نیە ئەگەر خاوەنەکەی بە چاکە لێی بخوات و هاوڕێیەکو دۆستێکیشی لێی بخوات،[2] ، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر لە خەیبەر پارچە زەویەکی بەر کەوت و هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) عەرزی کرد: زەویەکم وەرگرتوە وماڵم بەر نەکوتوە، ئەو پارچە زەویەش ەبەها ترین شتە لای من فەرمانت بەچیە؟پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: (( ئەگەر توانیت بیکەی بەخێر لە پێناوی خوادا)) عومەریش کردی بەخێر: ئەو زەویە کەس بۆی نیە بیفرۆشێت، ناشبەخشرێت و ناشکرێتە میرات، بەر و بومو داهاتەکەشی بۆ هەژاران و خزمان و ڕێی ئازادکردن و لە پێناوی خوادا و میوان و ڕێبوار و ئەوەی سەرپەرشتیشی دەکات بۆی هەیە بەشی کرێکەی لێی بخوات یان هاوڕێیەك و دۆستێکیشی بۆی هەیە لێی بخوات[3].... ئەمەیە هەڵوێستی عومەر کە چاکەیەکی دیار و شیاوی تێدایە بۆ فاروق(ﷺ) و ئارەزوومەنبینی بۆ پەلەکردن لە چاکەدا و فەزڵدانی قیامەت بەسەر ژیانی دونیاییەکی کەم و کورتدا.

## ١٠- دیاری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عومەرو کوڕەکەی:

ئیبنو عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: عومەر پیاوێکی بینی کە کراسێکی درێژی ئاوریشمی لەبەر کردبوو ، عەمەر هێنای بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە بکڕە و لەبەری بکە کاتێك کە شاندێك دێنە خزمەتت، پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ) فەرمووی: ((کەسێك جلی

---

١ـ اسناده صحيح على شرط الشيخين، مسند احمد، رقم (٢٨١).
٢ـ البخاري، الوصايا، رقم (٢٧٧٢)، رواية أخرى.
٣ـ البخاري، الوصايا، رقم (٢٧٧٣)، رواية أخرى.

ئاوریشم لەبەر دەکات لە قیامەتدا هیچ بەشێکی نابێت ))، ماوەیەك بەسەر ئەمەدا تێپەڕی و پاشان پێغەمبەر(ﷺ) کراسێکی ئاوریشمی نارد بۆ عومەر، عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و عەرزی کرد: ئەمەت بۆ ناردوە هەر ئەوەشت فەرموو دەربارەی عەبا ئاوریشمەکەی وردە فرۆشیەکە[1] ؟ پێغەمبەری خۆشەویست عومەر فەرمووی: (( ناردوومە بۆت تاوەکو لە ڕێگەیەوە پارەیەکت دەست بکەوێت))،[2] عومەر بەخشیە برایەکی لە مەککە پێش موسڵمان بوونی،[3] سەبارەت بە دیاری پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بۆ ئیبن و عومەر، عبداللە کوڕی عومەر(رضي الله عنه)دەفەرموێت: ئێمە لە سەفەرێکدا بووین من بەسەر ولاخێکی سەرکەشەوە بوم کە هی عومەر بوو، زۆر خێراو سەرکەش بوو پێش لەکاروانەکە دەکەوت و پێشی بە خەلکەکەی دەگرت عومەریش تێی دەخوڕی و دەیگەڕاندەوە، لەم کاتەدا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی بە عومەر: ((پێم بفرۆشە))، عومەر فەرمووی: بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دووبارە پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: ((پێم بفرۆشە))، عومەریش فرۆشتی بە پێغەمبەر(ﷺ)و پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ)فەرمووی: ((ئەمە بۆ تۆیە ئەی عبداللە کوڕی عومەر چیت پێ خۆشە پێی بکە))،[4] واتا چۆن پێت خۆشە بۆ لێخوڕین بەکاری بهێنە.

## ١١- هاندانی بۆ کوڕەکەی و مزگێنی بۆ ئیبن مەسعود:

عبداللە کوڕی عومەر دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ)و فەرمووی: ((لە نێو دارەکاندا دارێك هەیە کە گەلای ناوەرێت، بە وێنەی مرۆڤی موسڵمان وایە، پێم بلێن بزانم چیە؟)) خەلکی کەوتنە ناوهێنانی دارو درەختی بیابان، منیش لە ناخی خۆمدا دەمزانی کە خورمایە، عبداللە دەلێت شەرمم دەکرد کە بیلێم، خەلکەکە وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! پێمان بفەرموو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە خورمایە))، عبداللە دەفەرموێت: دواتر ئەوەم بۆ باوکم گێڕایەوە کە من دەمزانی، ئەویش فەرمووی: ((ئەگەر ئەوەت بوتایە زۆرم پێ خۆش دەبوو لەوەی کە فلانە شت و فلانە شتم هەبێت.[5]

سەبارەت بە مزگێنی عومەر بۆ ئیبن مەسعود، دەگێڕنەوە کە لە ماڵی ئەبو بەکردا سەربووردەی موسڵمانانیان دەگێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە و ئێمەش لەگەڵیدا هاتینە دەرەوە، پیاوێکمان بینی کە لە مزگەوت نوێژی دەخوێند، پێغەمبەر(ﷺ) وەستا و گوێی لە قورئان خوێندنەکەی گرت، ئێمە لەوەدا بووین کە بیناسینەوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((لە نهێنیەکانی ئەم پیاوە ئەوەیە، کە قورئان بە پاراوی و بەو شێوەیە دەخوێنێت کە دابەزیووە، با خەلکیش وەك

١ـ التميمي الدارمي.
٢ـ البخاري، الادب، رقم (٥٦٣٦).
٣ـ مسلم، رقم (٢٠٦٨).
٤ـ البخاري، ك: التبيوع، رقم (٢٠٠٩).
٥ـ البخاري، ك: العلم، رقم (١٣١).

خوێندنەوەی کوڕی ئوم عەبد بیخوێننەوە))، پاشان پیاوەکە دانیشت و لە خوا پاڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ)یش فەرمووی: (( داوا بکە پێت دەبەخشێت، داوا بکە پێت دەبەخشێت))، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا بەڕاکردن دەچم بۆ لای ئەو پیاوە و مزگێنی دەدەمێ ، کاتێك کە ڕام کرد ئەبو بەکر پێشم کەوت و مزگێنیەکەی پێدا، سوێند بە خوا لە هیچ کارێکی چاکەدا پێشم بە ئەبو بەکر نەگرتووە بەڵکو هەر ئەو پێشی من کەوتووە.[1]

## ١٢-خۆپارێزی لە داهێنراوەکان (الابتداع):

مەسوری کوڕی مەخرەمە و عبدالرحمن کوڕی عبدالقاریْ دەفەرموون: گوێیان لە عومەر(رضي الله عنه) بووە کە فەرموویەتی: گوێم لە هیشامی کوڕی حکیم کوڕی حوزام بوو کە سورەی (الفرقان)ی دەخوێند لە ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) ، گوێم گرت بۆ قورئان خوێندنەکەی کە ئەو لەسەر چەند پیتێك دەیخوێندکە پێغەمبەر(ﷺ) بەو جۆرە نەمبیستبوو بیخوێنێ، منیش دەمویست کە هەڵمەتی بدەمێ لە نوێژدا، چاوەڕوانم کرد تاوەکو سڵاوی دایەوە، منیش گوشاردم و ڕامتەکاند و وتم: کێ ئەم سورەتەی بۆ خوێندویتەوە بەو شێوەیەی کە دەیخوێنیتەوە؟ ئەویش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) بەو شێوەیە پێمی خوێندۆتەوە، منیش وتم: درۆ دەکەیت، سوێند بە خوا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو سورەتەی بۆ من خوێندۆتەوە کە لە دەمی تۆوە گوێم لێ بوو، پاشان بە پەلە بردم بۆ لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و پێشی کەوتم و وتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)، من ئەمم بینیوە کە سورەتی فورقانی بە شێوەیەك دەخوێند کە تۆ نەتخوێندووە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: ((ئەی هیشام بۆمی بخوێنەوە))، ئەویش بەو شێوەیە خوێندیەوە کە گوێم لێ بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بەم شێوەیە دابەزیووە))، پاشان فەرموی: ((ئەی عومەر بیخوێنەوە))، منیش بەو شێوەیە خوێندمەوە کە پێی خوێندبوومەوە، پاشان فەرمووی: ((بەم شێوەیەش دابەزیووە)، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((قورئان بە حەوت پیت دابەزیووە ئێوەش بە ئاسانەکەیان بیخوێنن)).[2]

## ١٣- لەو پارەیە ببە کە بۆت هاتووە لە کاتێکدا کە تۆ نە چاوت لێیەتی و نە سواڵکەری:

عبدالله کوڕی عومەر(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: گوێم لە عومەر بوو دەیفەرموو: پێغەمبەر(ﷺ) ماڵی پێ دەبەخشیم و منیش دەموت: بیدە بە یەکێك، کە لە من هەژارتر بێت تاوەکو جارێك پارەیەکی پێدام و منیش وتم: بیدە بە یەکێك لە من هەژارتر بێت، پێغەمبەر(ﷺ)یش فەرمووی: ((لەو پارەیەی کە بۆت بینی وەریبگرە تۆ نە چاو لەدوی ئەو پارەیەی نە داواشی ، ئەمە ماڵێکە کە تۆ بە دوایدا نەچوویت)).[3]

---

١ـ الزهري له ولابيه صحبة توفي سنة (٦٤) هجري.
٢ـ البخاري، كتاب: فضائل القرآن، رقم (٤٧٥٤)، مسلم، رقم (٨١٨).
٣ـ مسلم، كتاب: الزكاة، رقم (١٠٤٥).

## ١٤- پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ عومەر (ﷺ) کردووە:

ڕۆژێـك پێغەمبـەر (ﷺ) عومـەری بینـی کـە کراسـێکی سـپی لەبـەردا بـوو، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەم کراسەت تازەیە یان شۆراوە؟))، عومەر فەرمووی: شۆراوە، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ((پۆشاکی نویٚ لەبەر بکەیت، بە خۆشی بژیت و بە شەهیدی بمریت)).[1]

## ١٥- کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) پێیدا تێپەڕی زانیم پیرۆز دەبێت :

جابری کوڕی عبداللە دەفەرموێت: باوکم مردو(٣٠) بـارە حوشـتر خورمـای قـەرزی لـە پیـاوێکی جوولەکە کردبوو نەیدابویەوە، کابراش هات بۆ قەرزەکەی جـابر داوای لێکـرد مـۆڵەتی بـداتێ ئـەویش مولتی نەدایێ، جابر چـوو بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) تـا تکـای بـۆ بکـات لای کـابرای جولەکـە ، پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لای جوولەکەکە تاوەکو بەرهەمی خورمای ئەو ساڵەی لێ وەربگرێت لە بریتی قەرزەکەی، بەڵام جوولەکەکە قایل نەبوو پێغەمبەر(ﷺ)یش چوویە نێویاخە خورماکەو بەناویدا گەراو، پاشان بە جابری فەرموو: (هەولێ بۆ بدە و بە وەفابەو قەرزەکەی بـدەرەوە)، ئـەویش پـاش ئـەوەی کـە پێغەمبەر(ﷺ)گەرایەوە، چویە ناو باخە خورماکەی و(٣٠) بارەکەی دایەوە جولەکەکە و(١٧) باری لێ جیاکردەوە بۆ خۆی، دوای ئەوە هات بۆ ئەوەی ئەم هەواڵە بداتە پێغەمبەر(ﷺ) بینی کە نوێژی عەسر دەکات، کاتێك کە لێ بوویەوە هەواڵەکەی پێدا و ئەویش فەرمووی: (ئەم هەواڵە بدەرە کوڕی خەتاب)، جابر ڕۆیشت تا هەواڵەکە بداتە عومەر ، پاشان عومەر فەرموی: کاتێـك کـە پێغەمبـەر (ﷺ) پێیـدا تێپەڕێ زانیم کە خوای گەورە بەرەکەتی تێدەخات .[2]

## ١٦- هاوسەرگیری حەفصەی کچی عومەر لە پێغەمبەر(ﷺ):

عومەر(ﷺ)دەفەرموێت: کاتێك کە حەفصەی کچی بێوەژن کـەوت و خەنیـسی کـوڕی حوزافـەی مێربینی کە یەکێك بوو لە هاوەڵان و لـە مەدینـە کۆچـی دوایـی کـرد، چـوومە لای عوسـمانی کـوڕی عـەفان و باسـی حەفـصەم لا کـرد و وتم: ئەگـەر بتـەوێ ئـەوا حەفـصەت لێ مـارە دەکـەم؟ عوسمان فەرمووی: جارێ با بزانم چۆن دەبێت، چەند ڕۆژێك تێپەڕین، پاشان پـێم گەیـشت و فـەرمووی: وام پـێ باشە کە ژن نەهێنم، عومەر دەفەرموێت: گەیـشتم بـە ئـەبو بـەکری صدیق(ﷺ)و پـێم وت: ئەگـەر بتەوێ حەفصەی کچی عومەرت لێ مارە دەکەم؟ ئەبو بەکر بێدەنگ مایەوە و هیچی وەڵام نەدایەوە، من زۆر یم خۆش بوو کە ئیمام ئەبو بـەکر بیخوازێـت تـا عوسمان. چەند شـەوێك تێپـەڕی و پاشـان پێغەمبەر(ﷺ) مارەی کرد و منیش ئەبو بەکرم پێ گەیشت و فەرمووی: مـن هـیچ ڕێگریـەکم نـەبوو لەوەی کە بێم بە دەم داواکاریەکەتەوە کە خستتە بـەر دەمـم، ئـەوە نـەبێت کـە مـن ئـەوەم زانـی کـە پێغەمبەر(ﷺ) باسی حەفصەی کردووە، من نەم دەویست نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاشکرا بکەم ئەگـەر ئەویش لێی گەرابا ئەوا ئەو داوایەم پەسند دەکرد.

---

١ـ حسنه الالباني في السلسلة الصحيحة، (٣٥٢) وهو في الصحيح الجامع (١٢٣٤).

٢ـ البخاري، كتاب: الاستقراض، رقم (٢٢٦٦).

## سێیەم: هەڵوێستی عومەر (ﷺ) لە ناکۆکی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خێزانەکانیدا:

ئیبن عەباس(ﷺ) دەفەرمووێت: سوور بووم لەسەر ئەوەی کە پرسیار بکەم لە عومەر(ﷺ) سەبارەت بەو دوو خێزانەی پێغەمبەر(ﷺ) کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا﴾ (التحريم: ٤).

تاوەکو عومەر حەجی کرد و منیش حەجم لەگەڵ کرد کاتێك کە لە ڕێگەدا بووین ئەو هەندێك بە لای مندا هات و منیش بە لایدا نزیك بوومەوە پاشان دەرکەوت و هات بۆ لام و ئاوم کرد بە دەستیدا و دەستنوێژی گرت و وتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران! ئەو دوو خێزانەی پێغەمبەر(ﷺ) کامانەن کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا﴾ (التحريم: ٤).

عومەر فەرمووی: ئای کە سەیری کوڕی عەباس، زەهری دەفەرمووێت: پێی ناخۆش بوو، سوێند بە خوا نە لێی پرسی و نە لێی شاردۆتەوە و پاشان فەرمووی: حەفصە و عائیشەیە ، دواتر درێژەی بە قسەکانی دا و فەرمووی: ئێمە هۆزی قورەیش بووین و زاڵ بووین بەسەر ژناندا، کاتێك کە هاتینە مەدینە هۆزێکمان دیتەوە کە ژن زاڵ بوون بەسەر پیاوانیاندا، بەم شێوەیە ژنەکانمان لە ژنەکانی ئەوانەوە فێر بوون، ماڵی من لە تیرەی ئومەییەی کوڕی زەید بوو لە (عەوالی) ڕۆژێك لە خێزانەکەم تووڕە بووم بینیم بەروومدا هەڵدەشاخێ، مـیش تووڕەتربووم وتم ئەوە چیە؟، وتی: پێت سەیرە من وا ڕووبەڕووت دەوەستمەوە؟ سوێند بە خوا خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یش لە ڕویدا قسە دەکەن ، هەیانە بەیانی تا ئێوارە دەنگی لێ دادەبڕێت، عومەر دەفەرمووێت: بە خێرایی دەرچووم و خۆم گەیاندە لای حەفصە و وتم: ئایالەناو ئێوەدا کەس هەیە بەیانی تا ئێوارە قسە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا نەکات؟ وتی: بەڵێ، منیش وتم:ڕەنج بە خەسار زیان مەندە هەرکام لە ئێوە وای کردبێت ، ئایا ناترسن لەوەی کاتێ ئێوە پێغەمبەر(ﷺ) تووڕەو زویر دەکەن خوای گەورە لێتان تووڕەو زویر بێت ئەو کاتەش ئیتر هەرگیز ڕزگاری نابێت و ڕەنجی بە بادا دەڕوات؟ لەڕوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەوەستیت و داوای هیچییشی لێ نەکەیت، هەرچیەکت ویست لە منی داوا بکە.یاخی و سەرکەش نەبیت لەبەر ئەوەی دراوسێکەت جوانترو خۆشەویستترە لای پێغەمبەر(ﷺ) ـ کە مەبەستی عائیشە بووـ پاشان فەرمووی: من دراوسێیەکی ئەنصاریم هەبوو بە نۆبە دادەبەزینە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕۆژێك دەهات و منیش ڕۆژێك دەهاتم ئەو ڕۆژەی ئەو دەهات هەواڵی وەحی و چەند شتێکی تری دەدامێ و ڕۆژی منیش بە هەمان شێوە، ڕۆژێك قسەمان دەکرد و دەمان وت غەسان وڵاخەکەکانیان ناڵ دەکەن تا لەگەڵمان بەشەڕ بێن، ڕۆژێك هاوڕێکەم دابەزی و شێوان هاتەوە لە دەرگاکەی دا و بانگی کرد م منیش هاتمە دەرەوە، وتی: شتێکی گەورە ڕوویداوە، وتم: چیە؟ ئایا غەسان هاتووە بۆمان؟ وتی: نا زۆر لەوە گەورەترو گرنگتر، پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکانی تەڵاق داوە، منیش وتم: حەفصە ڕەج بەخەسارو زیانمەند بوە،دەمزانی شتێکی ئاواهی لە ڕێدایە، نوێژی بەیانیم کرد و خۆم توند و تۆڵ کردەوە، دابەزیم و

چوومە ژوورەوە بۆ لای حەفصە بینیم دەگری ، وتم: ئایا پێغەمبەر(ﷺ) تەلاقی داون؟ وتی: نازانم ، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەتا گۆشەگیرە لەوێدا دانیشتوە، پێغەمبەر(ﷺ) غولامێکی ڕەشتاڵەی هەبوو بینم وا هات ، پێم ووت: مۆڵەت وەرگرە بۆ عومەر لای پێغەمبەر (ﷺ) ، کوڕەکە چوویە ژوورەوە و هاتە دەرەوە بۆ لام، وتی: باسی تۆم بۆ کرد بێدەنگ بوو، منیش ڕۆیشتم تا گەیشتمە مینبەرەکە، کۆمەڵە خەڵکێك دانیشتبوون و هەندێکیان دەگریان، کەمێك دانیشتم، خۆمم پێنەگیرا دووبارە چومەوەبۆ لای غولامەکەو وتم: : مۆڵەت وەرگرە بۆ عومەر لای پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش چوویە ژوورەوە و پاشان هاتە دەرەوە و وتی: باسی تۆم بۆ کرد بێدەنگ بوو، لێمدا ڕۆشتم، غولامەکە بانگی کردم ، وتی: وەرە ژوورەوە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێداوی، منیش چوومە ژورەوە، سڵاوم لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد بینیم ەسەر حەسیرێکی خۆڵاوی پاڵ کەوتوە شوێنەواری حەسیەکە بەلا رومەتی پیرۆزیەوەدیارە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا خێزانەکانت تەلاق داوە؟ سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: نەخێر، منیش وتم: الله اکبر، ئەگەر دەمان بینی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئێمە هۆزی قورەیش بووین و بەسەر خێزانی خۆماندا زاڵ بووین، کاتێك هاتینە مەدینە تیرە و هۆزێکی لێ بوون کە ژن تیایاندا بەسەر پیاوان زاڵ بوون ژنانی ئێمەش لەوانەوە فێری ئەم خووە بوون، من ڕۆژێك لە ژنەکەم تووڕە بووم ئەویش لە رومدا وەستا، پاشان وتم: بۆ وا دەکەیت؟ وتی: سوێند بە خوا خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یش بە هەمان شێوەن، هەیانە بەیانی تا ئێوارە قسە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) ناکات ، منیش وتم: هەر کام لەوان ئەم کارەی کردبێت زیانمەندو ڕەنج بەخەسارە ،ئایا ناترسن لەوەی خوای گەورە لەبەر تورەیی پێغەمبەر ئەویش لێتان تورە بێت .

پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) پێکەنی و منیش وتم: چوومە لای حەفصە و پێم وت: وریببە جارێکی تر ئیرەیی نەبەی بەوەی کە هەوێکەت جوانترە و لای پێغەمبەری خۆشەویستیش(ﷺ) خۆشەویستترە.عەرزم کرد : ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خزمەتدا بمێنمەوە ؟ فەرمووی: (بەڵێ) ، پاشان دانیشتم و سەرم بەرزکردەوە سوێند بە خوا لەو ماڵەدا هیچم تێدا بەدی ەکرد تەنها سێ پێستە نەبێت ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خوا بخوازە و دوعا بکە تا خوای گەورە خێرو بەرەکەت بڕژێنێ ەسەر ئەم ئومەتەدا ئەوتا ڕژاندویەتی بەسەر فارس و ڕۆم دا، کە ئەوان خودا ناپەرستن موشرکن، ڕاکشا بوو ڕاست بوویەوە و دانیشت و فەرمووی: ((ئایا گومانت هەیە ئەی کوڕی خەتاب؟ ئەوانە گەلێکن خێروبەرەکەت و خۆشیەکانیان لە دونیادا پێبەخشراوەو بۆینل پێشخراوە))، عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێخۆش بوونم بۆ بکە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێنبینی خواردبوو بەهۆی زۆر بێتاقەتی و بێزاریەوە بۆ ماوەی یەك مانگ نەڕوات بۆ لایان تاوەکو خوای گەورە سەرزەنشتی کرد.[1]

---

١ـ اسناده صحيح على شرط الشيخين، مسند احمد، رقم (٢٢٢)، الموسوعة الحديثة.

## چوارەم: چەمکێك لە چاکە و پسپۆڕیەکانی

عومەر بە دوای ئەبو بەکری صدیقدا هاتووە لە چاکیدا، عومەر دوای پێغەمبەران و ئەبو بەکر باشترین کەسی سەر زەویە، ئەمەش وا دەکات کە لەسەر بڕوادار پێویستە باوەڕی بەم فەزڵەی هەبێت، کە ئەمەش یەکێکە لە بنەماکانی ئیمانی ئەهلی سونەت و جەماعەت، [١] هەر لەم بارەیەوە فەرموودەی زۆر و هەواڵی راست و دروست هەن سەبارەت بە چاکی و پسپۆڕی عومەر(ﷺ) هاتووە لەوانە:

### ١- باوەڕ و زانست و زانیاری و ئیمانەکەی:

سەبارەت بە پلە و پایەی ئیمانی عومەر(ﷺ) عبداللە کوڕی هاشم دەفەرمووێت: لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووین کە دەستی عومەری گرت، عومەریش عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! تۆ لە هەموو شتێك بۆ من خۆشەویستتری جگە لە خۆم، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((نا، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، تاوەکو لە خۆت خۆشترم نەوێت))، عومەریش پێی فەرموو: ئا ئێستا سوێند بە خوا، تۆم لە خۆشم خۆشتر دەوێت، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((ئێستا ئەی عومەر)). [٢]

سەبارەت بە زانست و زانیاریشی، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((کاتێك خەوتبووم شیرم دەخواردەوە تاوەکو سەیرم کرد لە نێوانی پەنجەکانمەوە دەڕژێت، پاشان دامە عومەر، وتیان: ئەوە چۆن لێك دەدەیتەوە؟ فەرمووی: ((زانست و زانیاری))، [٣] هۆی لێکدانەوەی بەم جۆرە، هاوشێوەیی شیر و زانیاریە لزۆر روەوە، لەوانە هەردووکیان هۆیەکن بۆ چاکسازی، شیر خۆراکی جەستەیە و زانیاریش خۆراکی مەعنەویە، لەم فەرموودەیەشدا فەزڵو گەورەیی تێدایە بۆ عومەر، خەونیش وا باشە نەبرێت بەسەر زاهریدا ئەگەرچی خەونی پێغەمبەران وەحیە، هەندێ جار خەون پێویستی بە شەرح و لێکدانەوەیە هەندێجاریش بە زاهریەکەی چۆنە هەروا باس دەکرێت، مەبەست لە زانیاریش لە فەرموودەکەدا بەڕێوە برنی حەکیمانەی کاروو بارەی وڵاتە بەپێی قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەمەش بویە هۆی ئەوەی کاروبارەکان لەسەردەمی عومەردا تایبەتمەنبینی خۆیان هەبێت، ماوەی خەلافەتی لە ماوەی خەلافەتی ئەبو بەکر درێژ تر بوو، خەلکیش زیاتر ملکەچ و گوێدێر بوون بو نیسبەت عوسمانەوە، ماوەی خەلافەتی ئەبو بەکر کەم و کورت بوو، وڵاتان ئازاد نەکران و بیرو ئەندێشەی جۆراوجۆر نەهاتنە ناو گەلانی موسڵمانەوە، بە پێچەوانەی سەردەمی عومەر لەگەڵ ئەوەشدا سیاسەت و بەڕێوە بردنی کاروبارەکان هێندە حەکیمانە بوو بەجۆرێك کە هیچ کەس سەرپێچی نەدەکرد، بەڵام لەسەردەمی عوسماندا کە وڵات بەرفراوان بوو قسە و قسەڵۆك بڵاوبوویەوە بۆچوونەکان

---

١- عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام، د. ناصر علي عائض حسن الشيخ (١/٢٤٣).

٢- الصحيح المسند في فضائل الصحابة (٦٦).

٣- فتح الباري (٧/٤٦).

جیاواز بوون، بەڵام گەردن کەچی بۆ ئیامی عوسمان وەك عومەر نەبوو، فیتنەیەك سەری هەڵدا تاوەکو گەیشتە شەهیدکردنی عوسمان، پاش ئەویش عەلی خەلافەتی گرتە دەست و کێشەکان قوڵتر بوون و گرفتی وڵات زیاتر بوو پەرەی سەند، سەبارەت بە ئاینیشی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((کاتێك کە خەوتبووم کۆمەڵە کەسانێکم بینی کە کراسیان لەبەردابوو، هەندێکیان کراسەکانیان دەگەیشتە سەر سنگیان هەندێکی تریان کەمێك خوارتر و عومەریشم بینی کە کراسێکی لەبەردابوو کە بە دواوەی خۆیدا ڕایدەکێشا))، وتیان: ئەمەیا چی دەبەخشێت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟فەرمووی: ((ئاین)).[1]

## ٢- هەیبەتو سامی عومەر و ترسانی شەیتان لێی:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص(ﷺ) دەفەرموێت: عومەر داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، کە مۆڵەتی بدات بڕوات بۆ لای لەم کاتەدا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)ژمارەیەك لە ژنانی قوڕەیشی لابوو کە قسەی بۆ دەکردن و ئەوانیش هەندێ جار دەنگیان بەرز دەکردەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەر(ﷺ)دا، کاتێك عومەر مۆڵەتی وەرگرت ئافرەتەکان هەستان وخۆیان توندو تۆڵ کردەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی بە عومەر دا بچێتە ژوورەوە کە چوو بینی پێغەمبەر(ﷺ)پێدەکەنی، عومەر فەرمووی: پێغەمبەری خوا تەمەنت پڕ بکات لە پێکەنین ئەو پێکەنینەت لە چیە ؟ ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سەرسام بووم لەم ئافرەتانەی کە لام بوون کاتێك کە گوێیان لە دەنگی تۆ بوو هەستان و خۆیان توندە تۆڵ کردەوە )، عومەریش فەرمووی: تۆ لە پێشتری کە خۆیان توندو تۆڵ بکەنەوە کاتێ لە خزمەتتدان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دوایی عومەر فەرمووی: ئەی دوژمنانی خۆتان لە من شەرم دەکەن و لە پێغەمبەر(ﷺ) شەرم ناکەن؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ، چونکە تۆ ڕق ئەستوورتری لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەی کوڕی خەتاب! سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە شەیتان لە ڕێگەیەکەو ناچێت کە تۆی پێدا دەچیت )).[2]

ئەم فەرموودەیە بە ڕوون و ئاشکرایی چاکی و فەزڵ وگەورەیی عومەری تێدایە و ئەو زیاتر پابەندە بەڕاستیەوە و شەیتان هەرگیز نەیتوانیوە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە تاوەکو بە هۆیەوە زەفەری پێ بەرێت.[3]

ئیبن حەجەر دەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە فەزڵو گەورەیی عومەری تێدایە ئەویش ئەوەیە کە شەیتان هیچ ڕێگەیەکی بە دەستەوە نیە بۆ ڕێگەگرتن بە عومەر، ئەمەش بۆ ئەوە نیە کە لەبەر شەرم بوویێت، ئەمەش جگە لە هەڵاتنی شەیتان لێی هیچی تری تێدانیە کە هاوبەشی لەو ڕێگەیەدا بکات کە گرتوویەتیە بەر، ئەمەشمانای ئەوە نیە ناتوانێ وەسوەسە بخاتە دڵیەوە، ئەگەر بڵێین کە نەیتوانیووە لە ڕێگەی وەسوەسە زاڵ بێت بە سەریدا کەئەمەش زاهری دەقەکەیە ، لە کاتێکدا نەتوانێت ڕوبەڕوی

---

١ـ مسلم، رقم (٢٣٩٠).
٢ـ البخاري، رقم (٣٦٨٣)، مسلم، رقم (٢٣٨٦).
٣ـ عقيدة اهل السنة والجماعة، (٣٨٤/١).

بێتەوە ، کە وابو ناتوانێ وەسوەسەش بخاتە دڵیەوە، ئەمەش وا دەگەیێن کە مەعسوم بوە، بەڵام وانیە چونکە مەعسوم تەنها پێغەمبەرانن، دەشکرێت تاکە کەسانێکیش هەبن کە ئەم عیسمەتەیان پێ ببخەشێت.

لە فەرموودەی حەفصەشدا هاتووە لای (الطبراني) لە(الاوسط)دا بەم بێژیە: ((لەوەتەی عومەر موسڵمان بووە شەیتان نەهاتۆتە ڕێگای بەڵکو لێی هەڵهاتووە))، دیارە ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر پتەوی عومەر لە ئیسلامدا و بەردەوامی ژیانی لەسەر ئەم ڕاستیە، نەوەوی دەفەرمووێت: ئەم فەرموودەیە لە ڕووکارەکەیدا وا دیارە کە شەیتان ئەگەر عومەر بیبینێت هەڵهاتوە، عەیاض دەفەرمووێت: دەکرێت کە ئەمە وەك پەندو درکە هاتبێت، عومەریش جوێکەرەوەی ڕێگەی شەیتان و ڕێگەی خوا بێ، وە ڕێبازی ڕاستەقینەی گرتوەو پێچەوانەی ئەو ڕەفتارانەیە کە شەیتان پێی خۆشە، ابن حجریش دەفەرمووێت: ڕای یەکەم ڕاسترو لە پێشترە.[1]

## ٣- پێشگۆی ئەم ئومەتە:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((لە نێو گەلانی پێش ئێوەدا نوێکەرەوە هەبوون، ئەگەر لە نێو ئەم ئومەتەی مندا هەبێت ئەوا عومەرە))،[2] ئەم فەرموودەیە چاکەیەکی گەورە بۆ عومەر(ﷺ) لەخۆ دەگرێت، زانایان ناکۆك بوون لەسەر مەبەستی ئەو نوێکەرەوەیە، هەندێکیان دەڵێن مەبەست لە نوێکەرەوە دڵخورپێنەر و هەندێکی تریان دەڵێن مەبەست لێی ئەویە کە بەبێ مەبەست ڕاستی بینی لە زمانیدا و هەندێکی تر دەڵێن: دوێنراوە، واتا فریشتەکان قسەیان لەگەڵ کردوە ، بەو مانایە لە نەفسیدا قسەی لەگەڵ دەکات ، خ ئەگەر قسە لەگەڵ کراویش نەبێت ئەوە لە شێوەی ئیلهامە و هەندێك بە فەراسەت لێکیان داوەتەوە.[3]

ئیبن حجر دەفەرمووێت: هۆی سەرەکی لە باسکردنی عومەر دەگەرێتەوە بۆ زۆری ئەو شتانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا بۆ عومەر ڕوویداوە لەو هاودەنگیانەی کە لە قورئاندا هاتون و ڕاستەوانە بوون لەگەڵ بۆچوونەکانی عومەر و لە پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)یش هەندێ شتی پێکاوە،[4]، تایبەت بونی عومەر(ﷺ) بەم ڕێزە گەورەیە و جیا کرانەوەی لە هاوەڵانی مانای وا نیە کە عومەر لە ئەبو بەکر(ﷺ) باشتر بووە،[5] ئیبن القیم دەفەرمووێت: گومان نەکەیت کە ئەمانە وا دەکەن فەزڵی عومەر بدەن بەسەر ئەبو بەکردا ،بەڵکو ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر لەسەر فەزڵو گەورەیی ئەبوبەکر، چونکە ئەبوبەکر بە تێراو بونی لە حەزوری پێغەمبەرایەتی و شیر خواردنی لە مەمکی پێغەمبەرایەی بێنیاز بوە لە پێشگۆی و ..هتد ئەوەی لە هەبانەی پێغەمبەرایەتی وەرسگرتوە

---

١ـ فتح الباري (٧/٤٧-٤٨)، شرح النووي (١٥-١٦٥-١٦٧).
٢ـ البخاري، رقم (٣٦٨٩)، مسلم، رقم (٢٣٩٨).
٣ـ فتح الباري (٧/٥٠)، شرح النووي (١٥/١٦٦).
٤ـ فتح الباري، (٧/٥١).
٥ـ عقيدة اهل السنة والجماعة، (١/٢٥١).

گەورەترە لەوەی پێشگۆیی شتێ بکات .لەمە رامێنەو هەرکام مافی خۆیی بەدەرەوە و بشزانە کارەکانی خوای گەورە هەمویان بەجێو راست و رێکن.[١]

## ٤- بەهێزێزێکی وەك ئەوم نەبینیوە کە هێندە بەتواناو لێهاتوو بێت :

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویێت: (لە خەومدا بە دۆلکێك ئاوم لە بیرێکی هەڵبەستراو دەردەهێنا پاشان ئەبو بەکر هات و دۆلکەیەك یان دوو دۆلکەی بە لاوازی دەرهێنا و خوا لێی دەبوورێت و پاشان عومەری کوڕی خەتاب هات و پڕ بە دۆلکەیەکیکی گەورەی ئوەرهێنا ، بەهێزێزێکی وەك ئەوم نەبینیوە کە هێندە بەتواناو لێهاتوو بێت، هێندە ئاوەکە زۆر بو خەڵکی و حوشترەکانیشیان تێراو بون، حوشترەکانیان بەرەو مۆڵگەکانیان بردن)).[٢]

ئەم فەرموودەیە باسی فەزڵ و گەورەیی عومەر(ﷺ) دەکات، دەفەرمێت ( عومەری کوڕی خەتاب هات و دۆلکەکەی گەورە تر کرد...)، مانای (گەورە تر بونی دۆلکەکە) بە هێزی و دەسەڵات و توانای عومەرە، ئەم خەونەش کە پێغەمبەر(ﷺ) بینیویەتی نمونەیەکی روونە بۆ ئەوەی کە بۆ ئەبو بەکر و عومەر(ﷺ) روویداوە لە سەردەمی خەلافەت و دەرکەوتنی شوێنەواریان و سوودمەند بوونی خەڵکی لێیان ، لە سەردەمی ئەبو بەکردا جەنگی هەڵگەڕاوەکان روویدا و بنەبڕ کران و لەو ماوە کورتەی خەلافەتیشیدا ئیسلام پەرەی سەند، ماوەی خەلافەتی تەنها دوو ساڵ و یەك مانگ بوو ، چەندین سووبینی زۆری تێدا فەراهەم هات ،کاتێك ئەبو بەکر کۆچی دوایی کرد عومەر شوێنی گرتەوە و لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەودا حوکومەتی ئیسلامی بەرفراوان بوو، بویە هۆی سەقامگیر بونی ئاشتی و ئاسایش،ژیانی خەڵکی پڕ بو لە خێرو بەرەکەت ، عومەر لە سەردەمی خەلافەتیدا شاری بنیات نا و چەندین دیوانی دامەزراند وسنووری دەسلاتی ئیسلامی بەرفراوان بوو چەندین وڵات هاتنە ژێر رکێفی ئیسلامەوە، مانای فەرمودەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) هاتە بینی کە دەفەرمێت : ((بەهێزێزێکی وەك ئەوم نەبینیوە کە هێندە بەتواناو لێهاتوو بێت)) کە مانای ئەوەشی لێ وەردەگیرێت ئیمای عومەر کەسایەتیەکی بە هێزو بە توانایەو توانای راپەڕاندنی ئیشو کارەکانی بەسەرکەوتویی هەیە و خەڵکی ملکەچی ئەمرو فەرمانەکانی دەبن ، قازی(عەیاض) دەڵێت: زاهرەکەی وادەگەیێنێت کە مەبەستی تەنها عومەرە،هەندێکیش پێیان وایە ئەو بەکریش دەگرێتەوە، چونکە بە عەقڵ و کارایی هەردویان بو کە توانرا زاڵ بن بەسەر ئەو گرفتانەی دوای وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دروست بون.(خەڵکی و حوشترەکانیا تیراو بون حوشترەکانیان بەرەو لای مۆڵگەکانیان بردن) ئەمەش بەوە لێك دەدرێتەوە، کە ئەبو بەکر توانی پاشگەز بوەکان بنە بڕ بکات، و موسڵمان یەك بخاتەوە ، ببێتە رێ خۆشکەر و زەمینە سازیەك فەراهەم بێنێ بۆ عومەر و سەردەمی فتوحات دەستی پێکرد، و بەرو بوومەکەی هاتە سەمەر.[٣]

---

١ـ مفتاح دار السعادة، (١/٢٥٥).
٢ـ مسلم، رقم (٢٣٩٣).
٣ـ شرح النووي (١٥/١٦١-١٦٢).

## ٥- ئازایی عومەر(ﷺ) مزگێنیدانی پێغەمبەر(ﷺ) بەکۆشکێك لە بەهەشت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((کاتێك لە ماڵی (رمیصاء) خێزانی ئەبو(طلحة) بووم لە خەوما بینیم چوومە بەهەشت و گوێم لە خشپەخشپێك بوو وتم ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە بیلالە، پاشان کۆشکێکم بینی کە کچێك لە حەوشەکەیدا بوو وتم: ئەمە بۆ کێیە؟ وتیان: بۆ عومەرە، ویستم بچمە ناوی و سەیری بکەم بەڵام غەیرەی تۆم وەبیر هاتەوە))، عومەر فەرمووی: دایك و باوکم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا بە رامبەر بەتۆ غەیرە بگرێت؟![1]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((کاتێك کە نوستبووم لە بەهەشتدا ئافرەتێکم بینی کە لە تەنیشت کۆشکێك دەست نوێژی دەشۆرد وتم: ئەم کۆشکە بۆ کێیە؟ وتیان : بۆ عومەر، غەیرەی ئەوم وەبیر هاتەوە و لێمدا ڕۆیشتم))، عومەریش دەستی کردە گریان و فەرمووی: غەیرە بەسەر تۆدا بکەم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).[2]

ئەم فەرموودەیە باس لە چاکی و فەزڵی ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دەکەن بە جۆرێك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دەداتێ بە کۆشکێك لە بەهەشت دا،ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پلە و پایەو ڕێزی عومەر لای خوای گەورە.[3]

## ٦- لە دوای ئەبو بەکر(ﷺ) خۆشەویسترین هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بووە:

عەمری کوڕی عاص(ﷺ) دەفەرمووێت: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کێ زۆر لات خۆشەویستە؟ فەرمووی: ((عائیشە))، وتم: لە پیاوان؟ فەرمووی: ((باوکی))، وتم: پاشان کێی تر؟ فەرمووی: ((عومەری کوڕی خەتاب))، چەند پیاوێکی تری ژمارد.[4]

## ٧- مزگێنی بەهەشت بۆ عومەر:

ئەبو موسای ئەشعەری دەفەرمووێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە باخێك لە باخەکانی مەدینە بووین، پیاوێك هات و لە دەرگای باخەکەی دا تاوەکو لێی بکەینەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بۆی بکەرەوە و موژدە بەهەشتی پێ بدە))، دەرگاکەم بۆ کردەوە، بینیم ئەبو بەکرە و موژدە بەهەشتم پێدا لەسەر فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش سوپاسی خوای کرد، پاش ئەو پیاوێکی تر هات بە هەمان شێوە لە دەرگای دا ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بۆی بکەرەوە و موژدە بەهەشتی پێ بدە))، منیش دەرگاکەم کردەوە و بینیم عومەرە، موژدە بەهەشتم پێدا لەسەر فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش سوپاسی خوای کرد، دواتر پیاوێکی تر هات و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی:

---

١- مسلم رقم (٢٣٩٤)، صحيح التوثيق، (ص: ٥٤)، البخاري، رقم (٣٤٧٦+٦٦٢٠).
٢- مسلم، رقم (٢٣٩٥).
٣- عقيدة اهل السنة والجماعة، (١/٢٤٥).
٤- الاحسان في الصحيح ابن حبان، (٢٠٩/١٥)، الحديث في مسلم،رقم (٢٣٨٤) والبخاري باب غزوة ذات السلاسل برقم (٤١٠٠).

((دەرگاکەی بۆی بکەرەوە و موژدەی بەهەشتی پێ بدە لەسەر ئەو بەڵایەی کە تووشی دەبێت))، کاتێك کە دەرگاکەم کردەوە بینیم عوسمانە، موژدە بەهەشتم پێدا لەسەر فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش سوپاسی خوای کرد و فەرمووی: خوا یارمەتی دەرمە.[١]

## پێنجەم: هەڵوێستی عومەر لە نەخۆش کەوتنی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و وەفاتی:

### ١- لە نەخۆشی پێغەمبەری خۆشەویستدا (ﷺ):

عبدالله کوڕی زمعە دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) نەخۆش کەوت بیلال(ﷺ) چووە ژوورەوە بۆ لای و بانگی کرد بۆ نوێژ و پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((فەرمان بدە، کە یەکێك نوێژ بە خەڵکەکە بکات))، عبدالله وتی: هاتمە دەرەوە و عومەرم بینی ئەبو بەکر لەوێ نەبوو وتم: ئەی عومەر هەستە نوێژ بە خەڵکی بکە و ببە بە ئیمام، عومەر هەستا و کاتێك کە (الله اکبر)ی کرد پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) گوێی لێ بوو لەبەر ئەوەی کە دەنگی عومەر گەورە بوو، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)فەرمووی: ((کوانێ ئەبو بەکر خوای گەورە و موسڵمانانیش ناڕازین بەمە ، خوای گەورە و موسڵمانانیش ناڕازین بەمە)) عبدالله دەفەرمووێت: ناردیان بە دوای ئەبو بەکردا ئەویش پاش ئەوەی کە عومەر ئەو نوێژەی کرد هات و نوێژی بۆ خەڵکی کرد، عبدالله دەفەرمووێت: عومەر پێی وتم: بەڵای خوام لێدای چیت پێ کردم ئەی کوڕی زمعە، سوێند بە خوا گومانم هەبوو کاتێك کە فەرمانت پێدام پێغەمبەری خۆشەویست ناڕازین بەمە فەرمانی بەمە داوە، ئەگەر ئەوە نەبوایە نوێژم بۆ خەڵکی نەدەکرد، عبدالله وتی: منیش وتم: سوێند بە خوا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدام بەمە، بەڵام کاتێك کە ئەبو بەکرم نەبینی بینیم کە تۆ لەپێشتری لەوانەی کە ئامادەی نوێژن.[٢]

ئیبن عباس دەگێڕێتەوە: کاتێك کە نەخۆشی زۆری هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ((شتێکم بۆ بهێنن با نوسراوێکتان بۆ بنووسم کە لە پاشی سەرگەردان نەبن))، عومەر(ﷺ)فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) ئازارەکە زاڵ بوو بەسەریدا و ئێمەش قورئانمان لەبەر دەستدایە، لەم کاتەدا بویە هەرا هەراو دەنگەدەنگ و ژاوەژاو پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((ڕاستم بکەنەوە،نابێت لەلای مندا ئاوەها دەنگە دەنگو ناکۆکی هەبێت))، پاشان ئیبن عباس هاتە دەرەوە و فەرمووی: بەڵا و نەهامەتی گەورە ئەوەی بویە هۆی جودایی نێوان پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و ئەوەی دەیویست بینوسێ .[٣]

زانایان بەجوانی ڕاڤەی ئەم فەرمودەیان کردوە بە شێوەیەك کە جێی پرس و گومانی تێدا نەماوە، نەوەوی لە شەرحی موسلمدا دەفەرمووێت: من دەزانم کە پێغەمبەر(ﷺ) پارێزراوە لە درۆ و لە گۆڕانی

---

١ـ البخاري، كتاب الصحابة رقم (٣٢٩٠).
٢ـ حديث اسناده صحيح، أخرجه ابو داود (٤٦٦٠).
٣ـ البخاري، كتاب العلم، رقم (١١٢).

شتێك لە حوکمە شەرعیەکان لە حالەتی لەش ساغی و نەخۆشیدا و خوای گەورە پاراستویەتی لە شاردنەوەی ئەوەی بۆی هاتوە ،یا ئەوەی خوای گەورە گەیاندنی واجب و پێویست کردبێت لەسەری ،ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە خوای گەورە مەعسومی کردوە لە لادان لە پەیامەکە یا خوا نەخواستە شاردنەوەی هەندێك و نەگەیاندنی، بەڵام پارێزراو نیە لەوەی کە نەخۆش نەکەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) جادووی لێ کراوە تاوەکو وایان زانیوە کارێکی ئەنجام داوە و لە ڕاستیشدا ئەنجامی نەداوە و لەم کاتەشدا کەلیمەیەکی لە دەم دەرنەچووە لە حوکمەکاندا کە پێچەوانەی ئەوانەی پێش خۆی بێت لەو حوکمانەی کە بڕیاری لەسەر داوە. زانایان چەند ڕان لەونامە و وەسیەتەی کە پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی پێ بووە و بۆی پەرۆش بووە، دەڵێن ویستویەتی خەلافەت بداتە دەست کەسێکی دیار تا ناکۆکی و دووبەرەکی نەکەوێتە ناو هاوەڵان ، هەروەها دەڵێن: نوسراوێکی نووسیووە شەرحی ئەو دەقانەی کردوە کە چەند ئەگەرێك هەڵدەگرێت نەبادا دوایی ناتەبایی بکەوێتە نێو هاوەڵانەوە لەسەر تێگەشتنیان، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بە پەرۆش بووە بۆ ئەو نووسراوە بەر لەوەی بۆی دەرکەوێت ئەم نوسینە بەرژەوەندیە یان وەحی ، پاشان دەرکەوتووە کە بەرژەوەندیەو پەرژەوەندیەکەش لەوەدایە وازی لێبێنێ، دوایی وازی لێ هێناوە یان وەحی بۆ نەهاتووە و ئەمەش گرفتی یەکەمی سڕیوەتەوە، بەڵام قسەکەی عومەر(ﷺ) زانایان لەسەری کۆك بوون لە ڕاڤەی فەرموودەیەك لەسەر ئەوەی کە ئەمە لە بەڵگەکانی تێگەیشتن و دانایی عومەرە، لەبەر ئەوەی کە دەترسا شتێك بنووسێت لەوانەیە نەتوانن جێبە جێی بکەن و لەسەری سزا بدرێن لەبەر ئەوەی ئەمە دەقێکە و بواریرا دەربڕین و ئیجتیهابینی تێدا نیە، عومەریش دەفەرمووێت: ڕێبەرمان قورئانە ، ئاماژە بۆ ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێت: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ۚ﴾ (الانعام: ٣٨).

هەروەها ئەو ئایەتەی، کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ (المائدة: ٣).

ئەو کاتە زانی کە خوای گەورە ئاینەکەی کامڵ کردووە، ئەم ئومەتەشی لە گومڕا بون و سەر لێشیواوی سەبارەت بە پەامەکەی پاراستوە، وە مەبەستیشی بوە کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە ئاسودەیی بگەڕێتەوە خزمەت خوای گەورە، عومەر لەم کاتەدا تێگەیشتووتر بووە لە ابن عباس و هاودەنگەکانی .خەتابی دەفەرمووێت: ناکرێت کە بەو شێوەیە سەیری ئەم قسەیەی عومەر بکرێت کە ئەمە ئەندێشەیەکی هەڵەیە لەسەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) یان گومانی خرابی بەرامبەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) هەبوبێت حاشا .بەڵام عومەر وا تێگەشت کە مادام پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) نەخۆشی تینی بۆ هێناوە تایاکی زۆر دایگرتوە، ترسا لەوەی ئەو قسانەی وەك قسەی ەخۆش وابن کە لە تاو نەخۆشیەکەی هەندێ شت بەدەمیدا دێت، ئەمەش دەبێتە دەلاقەیەك و دوو ڕوەکان تانەی ل ئاین پێ دەدەن، ئەوەتالە هاوەڵان لە زۆر شتا دەچونە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و پرسیان دەکرد و داوای ڕونکردنەوەیان دەکرد لەسەر مەسەلەکان ،بەر لەوەی دەقی تێدا بێت و بیبڕیتەوە، وەك ڕێککەوتن نامەکەی حودەیبیە،بەڵام دوای ئەوەی کە دقێك هانبێت و

مەسەلەکەی یەکلایی کردێتەوە ئیتر کەس قسەی نەکێردوە و هەوان رازی بون.[١] قـازی دەفـەرمووێت: فەرمودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) (أهجر )؟ بەم شێوەیە لە صحیح مسلم و ئەوانی ترشدا واهاتووە، أهجر لە شێوەی پرسیاردا. ئەمە دروستترە لەو ڕیوایەتەی کە ڕیوایەتی دەکات بەبێژی (هجر ـ یهجر)، لەبەر ئەوەی کە هەموو ئەمانە لە پێغەمبەر(ﷺ) دروست نیـە، لەبـەر ئـەوەی مانـای هجـر: هەرزەگۆییـە، ئەمەش لە کەسێکەوە هاتوە کەمەبەستی پرسیاری نکولی کردنە لەسەر ئـەو کەسـەی کـە وتوویـەتی: مەنووس، بە مانای ئەوەی پشتەئەمری پێغەمبـەری خۆشەویـست(ﷺ) مەکـەن و فـەرمودەکانی وەك قسەو هەزەگۆیی کەسانی تر مەخوێننەوە،چونکەپێغەمبەری خۆشەویـست(ﷺ) شـتی بـایخ بەدەمیـدا نایێت. ئەووەش کە عومـەر(ﷺ)دەفەرمووێت: قورئانمان بەسە، بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسەیە کە مشتو مڕی لەگەڵ عومەردا کردوە، نەك ئەمرەکەی پێغەمبەر(ﷺ)[٢]، شێخ عەلی (الطنطاوي) وەك شەرح و ڕاڤەی ئەمە دەفەرمێت: ئەوەی کە من بەدی دەکەم ئەوەیە، کە عومەر لەمیانی هاوەڵی دوورو درێژی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ویستی ڕایەکی هەبێت ، چونکە لە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) ی ڕادەبینی، لەو بابەتانەی تشکمان خستنە سەر ل ژیانی عومـەر لەخزمـەت پێغەمبـەری خۆشەویـستدا(ﷺ)،چـەندین هەڵوێستی هەبوون، کە پێشنیاری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کردووە و داوای هەنـدێ کـاری لێ کـردووە و لـە هەندێکی تریاندا پرسیاری دەربارەی چەند بابەتێك کردوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئـەوەی چـاك و ڕەوا بوبێـت وەری گرتوە و ئەوەشی بە نا دروست زانیبێ بۆی ڕاست کردتەوە، کاتێك کـە پێغەمبـەر(ﷺ): ((داوای ئەوەی کرد کە شتێك بنووسێت))، عومەر لەسەر ئەو خوو ڕەفتارانەی کە گرتبـووی فـەرمووی: تـەنها قورئان بەسە ،پێغەمبەریش (ﷺ) بێدەنگ بوو لەسەری ، خۆ ئەگـەر پێغەمبـەری خۆشەویـست (ﷺ) مەبەستی بوایە شتێکت بنوسێت عومەری بێدەنگ دەکردو نوسراوەکەی دەنوسی.[٣]

## ٢- هەڵوێستی عومەر لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)دا:

کاتێك کە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) گەیشتە خەڵکی مشت و مڕێکـی گـەورە ڕوویدا، چونکە بە ڕاستی کۆچی دوایـی پێغەمبـەر(ﷺ) کۆسـتێکی گـەورە بـوو بـۆ موسـڵمانان و بـە تایبەتی عومـەر، ئەبو هورەیرە(ﷺ) کە هاوەڵێکی بەرز و بەڕێزە ئـەم ڕووداوەمـان بـۆ دەگێڕێتـەوە و دەفەرمووێت: کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد عومـەر هەستایە سەر پێ و فەرمووی: کۆمـەڵێك لەدووڕووان پڕوپاگەندەی ئەوە دەکـەن کـە پێغەمبـەر(ﷺ) مـردووە، پێغەمبـەر(ﷺ) نـەمردووە بـەڵام ڕۆیشتووە بۆ لای خوای گەورەی هەروەك چۆن موسا کوڕی عمران بۆماوەی چل شەو لەگەڵەکەی دابڕا و پاشان گەڕایەوە بۆ لایـان پـاش ئـەوەی کـە وتیـان: موسـا مـردووە، سـوێند بـە خـوا پێغەمبـەر(ﷺ) دەگەڕێتەوە هەروەك ئەوەی کە موسا گەڕایەوە، دەست و پێی ئەوانـە دەبڕێـت کـە پڕوپاگەنـدەی ئـەوە

---

١ـ صحيح السيرة النبوية، (ص: ٧٥٠)، نقلا عن شرح المسلم (١١/٩٠).

٢ـ شرح النووي، (١١/٩٠)، فصل الخطاب في المواقف الاصحاب للغرسي، (ص: ٤١ ).

٣ـ اخبار عمر (ص: ٤٦).

دەکەن کە مردووە،[١] ئەبو بەکر کاتێك کە هەواڵەکەی پێگەیشت هات تاوەکو لەبەر دەرگای مزگەوت دابەزی و لەم کاتەشدا عومەر قسەی بۆ خەڵك دەکرد و ئەبو بەکر ئاوڕی بۆ هیچ شتێك نەدایەوە تاوەکو چوویە لای پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) و پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی کە لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا داپۆشراوە عەبایەکی بەسەردا دراوە، ئەبو بەکر ڕۆیشتە پێشەوە تاوەکو عەباکەی لەسەر لادا و پاشان لێی نزیك بوویەوە و ماچی کردو فەرمووی: دایك و باوکم بە قوربانت بن، ئەو مردنەی، کە خوای گەورە لە سەری نووسیبووی ئەوا چەشتت، پاش ئەمە هەرگیز دووچاری مەرگ نابێتەوە، پاشتر عەباکەی دایەوە بەسەر دەم و چاویدا و هاتە دەرەوە، عومەریش هەر قسەی بۆ خەڵکی دەکرد و فەرمووی: لەسەرخۆبە ئەی عومەر، بێدەنگ بە، بەڵام عومەر هەر بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن، کاتێك کە ئەبو بەکر بینی بێدەنگ نابێت لە خەڵکەکە نزیك بوویەوە، خەڵکی کاتێ گوێیان لە قسەکانی ئەبوبەکر بوو لێی هاتنە پێشێ و لە عومەر گەڕان، ئەبو بەکر سوپاس و ستایشی خوای کرد و، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە! هەر کەس محمد دەپەرستێت ئەوا محمد مرد، هەر کەس کە خوا دەپەرستێت ئەوا خوای گەورە نامرێت و پاشان ئەم ئایەتەی خوێند کە دەفەرموێت:

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ﴾ (ال عمران: ١٤٤).

ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەفەرموێت: سوێند بە خوا خەڵکی ئەوەیان لە بیر نەمابوو، کە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوە تاوەکو ئەو کاتەی ئەبو بەکر خوێندیەوە، فەرمووی: خەڵکی ئەمەیان لە ئەبو بەکر وەرگرت، بەڵکو هەر ئەوەش لەسەر زاریاندا بوو، ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەفەرموێت: عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا، کاتێ ئەو ئایەتەم بیست، کە ئەبو بەکر خوێندیەوە برینەکەم سارێژ بوو و کەوتمە سەر زەوی پێیەکانم توانای ئەوەیان نەما کە ڕامگرن و ئەو دەمەش زانیم کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردووە.[٢]

---

١ـ السيرة النبوية لابن أبي شهبة (٢/٥٩٤).
٢ـ البخاري، كتاب: الجنائز، رقم (١٢٤٢).

# دوانگەی سێیەم

## عومەر( ﷺ ) لە ماوەی خەلافەتی ئەبو بەکردا

### یەکەم: هەڵوێستی عومەر لە ساباتی هۆزی ساعدە و بەیعەتکردنی بە ئەبو بەکر

پاش وەفاتی پێغەمبەر(ﷺ)، لە ساباتی بەنی ساعیدە بە سەرپەرشتی سەعدی کوڕی عوبادە پشتیوانان کۆبوونەوەو وتیان دەبێت لەئێمە ئەمیرێك هەبێت و لە ئێوەش ئەمیرێك، پاشان ئەبو بەکرو عومەر وئەبو عوبەیدەی جەڕاح (خوایان لێ ڕازی بێت) چوون بۆ لایان و عومەر ویستی قسە بکات ئەبو بەکر بێدەنگی کرد و عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا نەمدەویست لەمەدا هیچم دەست بکەوێت جگە لەوەی کە خۆم ئامادە کرد بۆ چەند وشەیەك و ترسام ئەبو بەکر نەیانگەیەنێت و منیش بە قسەکانی خۆم زۆر سەرسام بووم، دواتر ئەبو بەکر هاتە قسەو و لە قسەکانیدا خەڵکی ئاگادار کردەوە و فەرمووی: لە ئێمە ئەمیر و لەئێوەش وەزیر، حەبابی کوڕی مونزیر وتی : سوێند بە خوا کاری وا ناکەین پێویستە لە ئێمە ئەمیرێك و لە ئێوەش ئەمیرێك هەبێت، ئەبو بەکریش فەرمووی: نەخێر، ئێمە ئەمیرین و ئێوەش وەزیرن ، دەی ئێوە بەیعەت بدەنە عومەر یان ئەبو عوبەیدە، عومەریش فەرمووی: نا بەڵکو بەیعەت دەدەینە تۆ، تۆ گەورە و باشترینمانی و خۆشەویستترینمانی لای پێغەمبەر(ﷺ) پاشان عومەر دەستی ئەبو بەکری گرت و بەیعەتی پێدا و موسڵمانانیش بەیعەتی خۆیان دایە ئەبو بەکر.[1] بەم شێوەیە عومەر خوای گەورەی لێ ڕازی بێت، کاتێك کە دەنگە دەنگ و ژاوەژاو لە ساباتەکە بەرز بوویەوە، عومەر ترسا لە دووبەرەکی کە سامناکترین خەتەرێك بوو کە لێی دەترسا و پاشان مەترسی ئەوەی دەکرد کە بەیعەت بدرێتە یەکێك لە پشتیوانەکان و بەمەش فیتنەیەکی گەورە بەرپا بێت و لەبەر ئەوەش ئاسان نەبوو کە پاش ئەوەی بەیعەت درایە پشتیوانێك (انصاری) بەیعەت بدرێتە یەکێکی تر، بۆیە عومەر پەلەی کرد لە خامۆشکردنی ئەو فیتنەیە[2] و بە پشتیوانانی فەرموو: ئەی هۆزی پشتیوانان! ئایا ئێوە نازانن، کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی داوە بە ئەبو بەکر کە ئیمامەت بۆ خەڵکی بکات؟ دەی کێ خۆی بە باشتر دەزانێت کە پێشی ئەبو بەکر بکەوێت؟ پشتیوانان وتیان: پەنا بە خوا دەگرین ئەگەر پێشی ئەبو بەکر بکەوین.[3]

پاشان عومەر(ﷺ) دەست پێشخەری کرد و بە ئەبو بەکری فەرموو: دەستت بێنە ئەویش درێژ

---

١ـ مسند احمد (١/٢١٣) وصحيح واسناده احمد شاكر.

٢ـ الحكمة في الدعوة الى الله، سعيد القحطاني، (ص: ٢٢٦).

٣ـ محض الصواب في فضائل امير المؤمنين عمر بن الخطاب، (١/٢٨٠).

کرد و سەرەتا عومەر بەیعەتی پێدا و پاشان کۆچکەران و دواتریش پشتیوانەکان بەیعەتیان پێدا.[١]

ڕۆژی سێ شەمە کاتێك ئەبو بەکر لەسەر مینبەر بوو، عومەر هەستا و پێش ئەبو بەکر کەوتە قسەکردن سوپاس و ستایشی خوای کرد لەسەر ئەو ناز و نیعمەتەی کە پێی داون، ئەوجا فەرمووی: من دوێنێ شتێکم پێ وتن ، نە لە قورئاندابەو شێوەیەیەو و نە عەهدو بەڵێنێکیشە کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)بۆی نوسیبم یا ئەمری پێ کردبم ، بەڵام من وای دەبینم کە پێغەمبەر(ﷺ) کارەکانمان بەڕێ دەکات و بەرنامە ڕێژی بۆ کردبوو، خوای گەورە ئەو قورئانەی پێداون کە ڕێنموونی پێغەمبەر(ﷺ)ی پێ کردووە، ئەگەر ئێوە دەستتان پێوە گرت ئەوا خوای گەورە ڕێنموونیتان دەکات بەوەی کە ڕێنموونیە بۆی، خوای گەورە کاری ئێوەی داوەتە دەست باشترین هاوڕێی پێغەمبەر(ﷺ)، دوەمی دووەمین کەس کە لە ئەشکەوتەکەدا بووە، دەی هەستن بەیعەتی پێ بدەن، دوای ئەوە خەڵکی هەستان و بەیعەتێکی تریان دایە ئەبو بەکر کە پاش بەیعەتی ژێر ساباتەکە بە بەیعەتی گشتی ناسرا،[٢] عومەر(ﷺ) ورەی بەخەڵکی دەبەخشی و هانی دەدان لەسەر بەیعەت دان بە ئەبو بەکر تاوەکو خوای گەورە لەسەر ئەوەی کۆکردنەوە و خوای گەورەش لە دەستی دووبەرەکی و دەستەدەستەیی و فیتنە ڕزگاری کردن، ئەو هەڵوێستەی کە عومەر پێی قایل دەبوو لەگەڵ خەڵکیدا تەنها لە پێناوی کۆکردنەوەیان بوو لەسەر پێشەوایەتی ئەبو بەکر، ئەمە هەڵوێستێکی گەورە بوو لە گەورەترین ئەو هەڵوێستە پڕ لە حیکمەتانەی کە دەبوو بە ئاوی زێڕ بنووسرێتەوە.[٣]

عومەر زۆر لە دووبەرەکی نێوان موسڵمانان و هەڵگیرسانی ئاگری فیتنە دەترسا لەبەر ئەوە دەست پێشخەری کرد بە بەیعەتدان بە ئەبو بەکر بەمەش ئاگری فیتنەی خامۆشی کرد، ئەم کارەی عومەر هۆیەك بوو بۆ ڕزگار کردنی موسڵمانان لە گەورەترین کۆست کە دەبیە هۆی هەڵوەشانەوەی یەك ڕیزی موسڵمانان ئەگەر پاکی و بێەگەربینی عومەر و ڕاستی و ڕێکی سەرنجدانی نەبووایە لە دوای یارمەتی خوای گەورە.[٤]

## دووەم: هاندانی ئەبو بەکر لە بەگژاچوونی ڕێگرانی زەکات و ناردنی سوپای ئوسامە:

ئەبو هورەیرە(ﷺ) دەفەرموێت: پاش ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کردو ئەبو بەکر کرایە خەلیفە و هەندێ لە عەرەب لە ئاین وەرگەڕان ، عومەر فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر چۆن جەنگی خەڵکی دەکەیت؟ و پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((فەرمانم پێکراوە کە جەنگی خەڵکی بکەم تاوەکو دەڵێن: لا اله الا الله، هەر کەس وتی: لا اله الا الله، ئەوا گیان و ماڵی لە من پارێزراوە و حیسابیشی لەسەر خوای گەورەیە))، ئەبو بەکر فەرمووی: سوێند بە خوا جەنگی هەر کەسێك دەکەم کە جیاوازی

---

١ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٦٦٨).
٢ـ البداية والنهاية، (٦/٣٠٥-٣٠٦) إسناده صحيح.
٣ـ الحكم في الدعوة الى الله، (ص: ٢٢٧).
٤ـ الخلفاء الراشدون، عبدالوهاب النجار، (ص: ١٢٣).

بخاتە نێو نوێژ و زەکات، چونکە زەکات مافی ماڵە، سوێند بە خوا ئەگەر کاژەڵەیەکی زەکاتیش بێت و ئەوان نەیدەن لەگەڵیان بەشەڕ دێم لەسەری، عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا ئەوەش تەنها ئەوەبوو کە خوای گەورە ڕێنومایی ئەبوبەکری کردبوو بۆ ئەو جەنگەو پاشتر بۆم دەرکەوت کە ئەوە هەقە.[١]

کاتێك هەندێ لە یاران پێشنیازی ئەوەیان خستە بەردەم ئەبو بەکر کە سوپاکەی ئوسامە لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە تاوەکو کەمێك باردۆخەکە هێور دەبێتەوە، ئوسامە لە سەربازگەکەی خۆی عومەری بۆ ئەم مەبەستە نارد بۆ لای ئەبو بەکر تاوەکو مۆڵەتی بۆ وەربگرێت بە گەرانەوەی خەڵکەکە و وتی ئەم سوپایە گەورە پیاوان و لێهاتوانی هاوەڵانم لەگەڵە و ترسم هەیە لە لەسەرخەلیفەی موسڵمانان و پێغەمبەری خواش حەرامی کردووە کە بێباوەڕان موسڵمانان بڕفێنن،[٢] بەڵام ئەبو بەکر ڕای لەسەر ئەمە نەبوو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو هەڵمەتە سەربازیە بەردەوام بێت و سوپا ڕێی خۆی بگرێت بەرەو شام بارودۆخ و ئاکامەکانیش هەرچی بن ، پاشان ئەنصار داوایان کرد کە پیاوێکی بە تەمەنتر لە ئوسامە سەرپەرشتی کارو فەرمانی ئەو سوپایە بکات و بۆ ئەم مەبەستەش عومەریان ناردە لای ئەبو بەکر و فەرمووی: ئەنصار داوای ئەوە دەکەن کە پیاوێکی بە تەمەنتر لە ئوسامە ئەمیری ئەو سوپایە بێت، ئەبو بەکر(ﷺ) هەستایە سەرپێ و ڕیشی عومەر(ﷺ)ی توند گرت و فەرموی: دایکت جەرگ بڕاو بێت! پێغەمبەر(ﷺ) ئوسامەی بە ئەمیر داناوە تۆش فەرمانم پێ دەکەیت کە لای بەرم؟[٣] عومەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکە و وتیان: چیت کرد؟ ئەویش فەرمووی: دایکتان جەرگ بڕاو بێت! بۆ ئەوەی کە بە هۆی ئێوەوە لە لایەن پێغەمبەر(ﷺ)ەوە دووچاری بووم.[٤]

## سێیەم: عومەر و گەرانەوەی موعاز لە یەمەن، فەراسەتێکی ڕاست و دروست بەرامبەر ئەبو موسلیم الخولانی، ڕای لە دامەزراندنی ئەبانی کوڕی سەعید لە بەحرەین:

### ١- عومەر و ئەگەرانەوەی موعاز لە یەمەن:

موعازی کوڕی جەبەل لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) لە یەمەن مایەوە و تێکۆشانێکی بانگەوازی هەبوو هەر وەها بەرامبەر هەڵگەراوەکان، پاش وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) موعاز گەرایەوە بۆ مەدینە، عومەر(ﷺ) بە ئەبو بەکری(ﷺ) فەرموو: بنێرە بە دوای ئەو پیاوەدا و شتێکی بدەرەوە کە پێی بژی و ئەوەی تری لێ وەربگرە، ئەبو بەکر(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردوویەتی تا بێنیازی بکات وەمن هیچی لێوەرناگرم و لێی ناسەنمەوە مەگەر خۆی بۆم بێنێ، لێرەدا عومەر ئەوەی بینی کەوا ئەبو بەکر ڕاکەی پەسند نەکرد و لێی وەرنەگرت، بەڵام عومەر قەناعەتی بە

---

١ـ البخاري، كتاب: إستتابة المرتدين والمعاندين، رقم (٦٥٦٦).
٢ـ الكامل لابن كثير، (٢/٢٢٦).
٣ـ تأريخ الطبري، (٤/٤٦).
٤ ـ تأريخ الطبري، (٤/٤٦).

ڕاستی و دروستی ڕاکەی خۆی هەبوو، بۆیە چوو بۆ لای موعاز تاوەکو قایلی بکات، بەڵام موعاز وتی: پێغەمبەر(ﷺ) ناردوومی تا تا بێنیازم بکات من ئەم کارە ناکەم، عومەر مەبەستی دەست درێژی کردن نەبو لەسەر لەسەر دەسەڵاتی ئەبو بەکر، بەڵام چاکەی بۆ موعاز و موسڵمانان دەویست، موعازیش ئامۆژگاریەکانی عومەر بەرپەرچ دەداتەوە، عومەریش ئەوە دەزانێت کە دەسەڵاتی بەسەر موعازدا نیە، لەبەر ئەوە بە بێدەنگی دەڕوات، بەڵام دواتر موعاز دەبینێت کە ئامۆژگاریەکانی عومەر لە جێی خۆیدایە دەڕوات بۆ لای عومەر و پێی دەڵێت: گوێڕایەڵیت دەکەم، هەرچی تۆ فەرمانم پێ بکەیت من ئەوە دەکەم، من لە خەونمدا خۆم لە حەوزێکی ئاودابینی خەریك بوو دەخنکام و تۆش هاتی ڕزگارت کردم، پاشان موعاز چوو بۆ لای ئەبو بەکر(ﷺ)و هەموو ئەمانەی بۆ باس کرد و سوێندی دا کە هیچی لێ نەشارێتەوە، ئەبو بەکریش(ﷺ) فەرمووی: من هیچت لێ وەرناگرم و من بەخشیومە بە تۆ، عومەریش(ﷺ) فەرمووی: ئەمە ئەو کاتەیە کە ڕەوا و باش بوو،[1]، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە: ئەبو بەکر بە موعازی فەرموو: حیسابی خۆت ڕاست بکەرەوە، موعازیش فەرمووی: ئایا هەردووکیان، حیسابی خودا و حیسابێك لە ئێوەوە؟ سوێند بە خوا ئیتر هەرگیز کارتان بۆ ناکەم.[2]

## ٢- فەراسەتێکی ڕاست و دروست بەرامبەر ئەبو موسلیم الخولانی:

عومەر(ﷺ) خاوەنی فەراسەتێك بوو دەگمەن لەم ژیانەدا، ئەلمەزهەبی دەگێڕێتەوە کە ئەسوەبینی عەنەسی لە یەمەن ـ پروپاگەندەی پێغەمبەرایەتی دەکرد ـ ناردی‌بە دوای ئەبو موسلیمی ئەلخولانیداو ئاگرێکی گەورەی بۆ کردەوە وخستیە ناو یەوە هیچ زیانێکی پێنەگەیاند، بە ئەسوەد وترا: ئەگەر ئەم کابراە دوور نەخەیتەوە هەموو دواکەوتوکانت لێت وەردەگەڕێن و پشتت لێدەکەن، ئەویش فەرمانی پێدا بە ڕۆیشتن، کە گە=شتە مەدینە و لەسەر وڵاخەکەی هاتە خوارەوە و چوویە مزگەوت عومەر چاوی کرد چوو بۆ لای و وتی: ئەم پیاوە لە کوێوە هاتووە؟ ئەویش وتی: یەمەن، پاشان وتی: ئەو پایاوەی درۆزنەکە خستیە ناو ئاگرەکەوە چی لێهات؟ ئەویش وتی: ئەوە عبداللە کوڕی سوەبە، دواتر وتی: سوێندت دەدەم بە خوا تۆ ئەوی؟ ئەویش وتی: بە خوا بەڵێ، پاشان عومەر باوەشی پێداکرد و گریا و بریینی داینیشاند و لە نێوان خۆی و ئەبو بەکردا، پاشان وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە زیندووی هێشتم تاوەکو لە ئومەتی محمد کەسێکم بینی کە ئەوەی بەسەردا هات کە بەسەر ئیبراهیمی خەلیلدا هاتبوو.[3]

---

١ـ شهيد المحراب، (ص: ٦٩) نقلا عن الاستيعاب، (٣٣٨/٣).
٢ـ عيون الاخبار، (١٢٥/١).
٣ـ سيرة اعلام النبلاء، (٨٩/٤)، أصحاب الرسول، (١٣٧/١).

## ٣- ڕاو بۆچوونی لە دامەزراندنی ئەبانی کوڕی سەعید لە بەحرەین:

ئەبو بەکر(ﷺ) ڕێبازی شوراو پرس و راوێژی بڕیاردابوو، عوسمان دەفەرمووێت: پیاوێك بنێرە کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانەی کردووە و دەست پێشخەری لەسەری کردووە[1] بە موسڵمانیەتی و ملکەچیان و ئەوانەی ناسیویانە و ئەویش دەیان ناسێت و شارەزای وڵاتەکەیانە ـ واتا عەلای کوڕی ئەلحەزرەمی ـ عومەر رای لەسەر ئەمەنەبوو فەرمووی ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص دابنێ چونکە هاوپەیمانیانە، ئەبو بەکر بەرپەرچی ئەوەی دایەوە کارەکەی بە ئەبان سپاردو فەرمووی: من پیاوێك دانانێم کە بلێت لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) کار بۆ هیچ کەسێك ناکەم پاشان ئەبو بەکر کۆك بوو لەسەر دانانی عەلای کوڕی ئەلحەزرەمی بۆ بەحرەین.[2]

## چوارەم: ڕای عومەر لە پەسەند نەکردنی خوێن بایی کوژراوی موسڵمانان و ڕەخنە گرتنی لەسەر بڕینەوەی بەشی ئەقرەعی کوڕی حابس و عویەینەی کچی حسن:

### ١- ڕای عومەر لە پەسەند نەکردنی خوێن بایی موسڵمانان لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا:

شاندی بوزاخە لە ئەسەد و غەتفان هاتن بۆ لای ئەبو بەکر و داوای ڕێککەوتنیان لێ کرد، ئەویش سەرپشکی کردن لە نێوان شەڕ و ئاشتیدا، ئەوانیش وتیان: ئاشکراکە مەعلوم و دیارە، بەڵام ئەم ڕیسوابیە چیە؟ ئەبو بەکر فەرمووی: هەرچی قەڵغان و پەرە لێتانی دادەماڵین و هەرچیەکتان هەیە بە غەنیمەت دەیگرین و هەرچیەکمان لە لاتانە بۆمانی دەگێڕنەوە و خوێن بایی کوژراوەکانمان دەدەن و کوژراوەکانی ئێوەش لە دۆزەخدان، لە گەلانێك دەگەڕێن کە بە دوای کلکی حوشتردا دەڕۆن تاوەکو خوای گەورە شتێك بخاتە دڵی خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ)و کۆچکەران و ببێتەهۆکاری بێدەنگ بوون بەرامبەرتان.

ئەبو بەکر ئەم قسانەی پێخنش نەبوو ، لەم کاتەدا عومەری کوڕی خەتاب هەستایە سەرپێ و فەرمووی: ڕایەکم هەیەی دەمەوێت ڕاوێژی لەسەر بکەین ، ئەوەی کە باست کرد لە شەڕو ئاشتی ئەوە بوو کە باست کرد، ئەوەی کە باست کرد لەوەی کە ماڵ و سامانیان بە غەنیمەت بگرین و هەرچیەکیان لە ئێمە بردووە بیگێڕنەوە باست کرد، بەڵام سەبارەت بە خوێن بایی کوژراوانمان و کوژراوانیان لە دۆزەخدان، ئەوا کوژراوانمان جەنگان و لەسەر فەرمانی خوا کوژراون و پاداشتیان لە لای خودایە و خوێن باییان نیە، خەڵکەکەش لەسەر ئەم قسانەی عومەر بەیعەتیان دا.[3]

---

١ـ کنز العمال، (٦٢٠/٥)، رقم (١٤٠٩٣).
٢ قیود الواردة علی سلطة الدولة، عبدالله الکیلاني، (ص: ١٦٩).
٣ اخبار عمر (ص: ٣٦٢)، نقلا عن الریاض النضرة، نیل الاوطار (٢٢/٨).

## ٢. ڕەخنەی لە ئەبو بەکر لەسەر بڕینەوەی بەشی ئەقرەعی کوڕی حابس و عویەینەی کوڕی حصن:

عویەینەی کوڕی حصن و ئەقرەعی کوڕی حابس هاتنە لای ئەبو بەکر(ﷺ) وتیان ئەی خەلیفەی موسڵمانان ئێمە زەویەکی شۆرەکمان هەیە کە نە گژ و گیای تێدایە نە بەروبووم، ئەگەر پێمان بدەیت ڕەنگە بیکێڵین یان بیکەینە شینایی بەڵکو لەمڕۆ بە دواوە خودا بەرەکەتی تێبخا، ئەبو بەکر بە کەسانی دەوروپشتی فەرموو ئێوە چی دەڵێن ؟ ئەگەر زەویەکە شۆرەکە و سوودبینی نیەپێمان باشە بۆیان ببڕیتەوە، واتا بیاندەیتێ، بەڵکو لەمڕۆ بە دواوە سوودبینی لێ ببینن، ئەبو بەکریش زەویەکەی پێدان و نووسراوێکی بۆ نووسین و عومەری تێدا کرد بە شاهێد و لەوێ ئامادە نەبوو، ئەوانیش چوون بۆ لای عومەر سەرقاڵی ئامادەکردنی حوشترێکە، وتیان: ئەبو بەکر لەم نووسراوەدا تۆی کردۆتە شاهێد جا نووسراوەکەت بۆ بخوێنینەوە یان بیدەن بەخۆت بیخوێنیتەوە ؟ عومەر فەرمووی: ئێوە من بەم شێوەیە دەبینن ئەگەر دەتوانن بۆمی بخوێننەوە، گەرنا چاوەڕێ بن تاوەکو لێ دەبمەوە و دەیخوێنمەوە، کاتێك کە ئەوەی لە نووسراوەکەدا بوو بەر گوێی کەوت لە دەستیان فڕانبینی و پاشان تفێکی تێکرد و کوژاندیەوە و ئەوانیش کەوتنە بۆڵە بۆڵ و چەند قسەیەکی خراپیان کرد ، دواتر عومەر فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) دڵی ڕاگرتبون چونکە ئەو دەمە ئیسلام لاواز بوو بەڵام ئێستا خوای گەورە ئیسلامی سەر بڵند کردوە بڕۆن هەوڵێشو کارێ بدۆزنەوە، پاشان بە بۆڵەبۆڵ چوونەوە لای ئەبو بەکر و وتیان: سوێند بە خوا نازانین تۆ خەلیفەی یان عومەر؟ ئەبو بەکر فەرمووی: ئەوە ئەگەر بیەوێت، پاشان عومەر بە توڕەیی هات و لەسەر ئەبو بەکر وەستا و فەرمووی: هەواڵم پێ بدەن دەربارەی ئەو زەویەی کە ئەم دوانە دەیانەوێت بیبەن، ئەم زەویە موڵکی تۆیە یان موڵکی موسڵمانانە بە گشتی؟ ئەبو بەکر فەرمووی: بەڵکو موڵکی موسڵمانانە بە گشتی، عومەر فەرمووی: چی وای لێ کردی کە ئەم زەویەی موسڵمانان بدەی بەم دوانە؟ ئەبو بەکر فەرمووی: ڕاوێژم بەمانەی دەوروبەرم کرد ڕاوێژەکەیان بەم جۆرە بوو، عومەر فەرمووی: ڕاوێژت بەوانەی دەوروبەرت کرد، هەموو موسڵمانان ڕاوێژ و ڕەزامەندیان بەرفراوان بووە؟! ئەبو بەکر(ﷺ) فەرمووی: من بە تۆم وت کە تۆ لەمەدا لە من بەهێزتری بەڵام سەرکەوتی بە سەرمدا.[1]

ئەم ڕووداوە بەڵگەیە حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا بە شورا بەڕیوە چووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) سوور بووە لەسەر ڕاوێژ کردن بە موسڵمانان لە هەر کارێکی گەورە و بچووکدا، هیچ کارێکی بە بێ ڕاوێژی براکانی ئەنجام نەداوە.[2]

ئەو روداوەی پێشتر باسمان کرد دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی کە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو کاروبارەکانی موسڵماناندا دەستەی ڕاوێژی بەسەر کردۆتەوە و بەڵکو هەندێ جار وازی لە ڕای خۆی

---

١ ـ محض الصواب في فضائل امير المؤمنين عمر بن الخطاب، (٢٦٢/١).
٢ـ استخلاف ابي بكر الصديق، جمال عبدالهادي، (ص: ١٦٦-١٦٧).

هێناوە، ئەمە نمونەی شورای ڕاستەقینە کە هاوئاهەنگی ڕێساو بنەما داڕێژراوەکانی قورئانە، نەك شورایەکی ڕووکەشکراو، کە لە ژێر گومەزی ئەنجومەنە دەستووریەکاندایە و پشکی گەلانیش تەنها تاڵی و نەهامەتی و ستەم و سەرگەردانی هیچی تریان بۆ نەماوەتەوە.[١]

## پێنجەم: کۆکردنەوەی قورئان:

لە نێو شەهیدانی موسڵمانان و لە جەنگی یەمامە ژمارەیەکی زۆر لەوانە بوون کە قورئانیان لەبەر بوو ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی، کە ئەبو بەکر(ﷺ) بە ڕاوێژی عومەر(ﷺ) هەستێت بەکۆکردنەوەی قورئان لەسەر ئەوپارچە گەڵاو ئێسك و پەل و پۆ و سنگی هاوەڵان[٢] دا بوو، ئەبو بەکر ئەم کارەی سپارد بە هاوڵێکی بەڕێز، کە (زەیدی کوڕی ثابت) ی ئەنصاری بوو، زەید(ﷺ) دەفەرمێت: ئەبو بەکر دوای شەهیدبونی ئەهلی یەمامە[٣] ناردیبە دوامدا کاتێك، کە چووم عومەری لا بوو، ئەبو بەکر فەرمووی: عومەر هاتۆتە لام و دەڵێت: ڕۆژی یەمامە کۆمەڵە هاوەڵێکی زۆر شەهید بون و زۆربەشیان لە قورئان خوێنانن، من دەترسم بەشەهید بونی ئەم قورئان خوێنانە قورئانیش تیا بچێت ، لەبەر ئەوە پێم باشە کە فەرمان بە کۆکردنەوەی قورئان بدەیت، منیش وتم: عومەر! چۆن کارێکی وا بکەم کە پێغەمبەر(ﷺ) نەیکردووە؟ عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ئەمە کارێکی چاکە، عومەر بەردەوام ئەمەی دووبارە دەکردەوە تاوەکو خوای گەورە سنگی کردمەوە بۆ ئەوەی کە عومەری لەسەر سەقام گیر بوبو دواتر منیش ڕام چویە سەر ڕاکەی عومەر، زەید دەفەرموێت: ئەبو بەکر فەرمووی: تۆ پیاوێکی لاو و ژیر و پاکیت و وەحیت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەنووسیەوە، قورئان کۆبکەوە لەو شتانەی لای منە و لای کەسانی ترە، زەید فەرمووی: سوێند بە خوا ئەگەر داوای لێ بکردمایە، کە چیایەك لە چیاکان بگوێزمەوە پێم ئاسانتر بوو لەوەی داوای لێ کردم هەستم بە کۆکردنەوەی قورئان.[٤]

## لە کۆکردنەوەی قورئاندا هەندێ سەرنج بەدی دەکەین لەوانە:

١- کۆکردنەوەی قورئان بەهۆی ترسی فەوتانی هاتە کایە ئەویش بە سەرنجدان بەشەهید بونی زۆرێك لە قورئان خوێنان لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا، ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی، کە قورئان خوێنان و زانایان زۆر بە پەلەتربوون لە خەڵکی تر بۆ جیهادکردن بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام و موسڵمانان بە بیر و ڕەفتار و شمشێر. بەڕاستی ئەوان باشترین گەلێك بوون کە هاتوون بۆ نێو خەڵکی و دەکرێت پابەند بین پێیانەوە بۆ هەموو ئەوانەی کە پاش ئەوان دێن.

---

١ـ استخلاف ابي بكر الصديق، جمال عبدالهادي، (ص: ١٦٧).
٢ـ حروب الردة وبناء الدولة الاسلامية، احمد سعيد (ص: ١٤٥).
٣ ـ ئەو جەنگەی کە دژی موسەیلەمەی درۆزن و براکانی کرا.
٤ـ البخاري، رقم: (٤٩٨٦).

٢- کۆکردنەوەی قورئان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بووە، بەڵگەش لەمە باشتر نیە کە عومەر بە ئەبو بەکر دەفەرمووێت: کاتێك ئەبو بەکر دەپرسێت: پێغەمبەر(ﷺ) کارێکی وای نەکردووە چۆن ئێمە بیکەین؟ عومەر دەفەرمووێت: سوێند بە خوا ئەمە خێرە، لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە عومەر فەرموویەتی: سوێند بە خوا ئەمە چاکەیەکە و بەرژەوەندی موسڵمانانی تێدایە ئەمەش دیارە هەمان وەڵامەکە ئەبو بەکر دەیداتە زەید کاتێك کە هەمان پرسیاری لێ دەکات، ئەگەرچی ئەو ڕیوایەتی وشەی بەرژەوەندی تێدایە ڕاست بێت یان نا ئەوا دەستەواژەی وشەی (چاکەیە) هەمان واتای دەبێت، کە بریتیە لە بەرژەوەندی موسڵمانان لە کۆکردنەوەی قورئان، بەڕاستی کۆکردنەوەی قورئان بنیات نراوە لەسەر بەرژەوەندی لە سەرەتای کارەکەدا پاشان کۆبوونەوەی بۆ ساز درا و هەمووان کۆك بوون لەسەر دان پێدانانی ڕاشکاوانەیان ئەمەش خۆگرانە بوو، ئەمەش دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی، کە بەرژەوەندی دەکرێت یەکێك بێت لە پشت گیرەکانی کۆدەنگی(الاجماع ) بەلای ئەوانەی، کە پێیان وایە دەکرێت بەڵگە بێت و کاری پێ بکرێت، وەك لە کتێبەکانی (أصول الفقه)دا هاتووە.

٣- لەم ڕووداوەدا ئەوەمان بۆ ڕوون بوویەوە کە یاران لە کەش و هەوایەکی پڕ لە ئارامیدا کە خۆشەویستی و ڕێزلێنان باڵی بەسەردا گرتووە چۆن هەوڵ دەدەن و ئامانجیشیان لەمەدا دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گشتیە بۆ کۆمەڵی موسڵمانان و هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن کە بگەنە ڕای دروست و دڵیان بۆی والا دەبێت لە پاش قایل بوونیان و گەیشتنیان بەرای تەواو ، ئەگەر قایل بوون بە بۆچوون و ڕایەك ئەوا بەرگری لێ دەکەن بەو شێوەیەی کە هەر لە سەرەتادا هاتووە، هەر بەم گیانەشەوە کۆبوونەوەکانیان بە سەرکەوتوویی بەڕێوە چووە سەبارەت بەزۆرێك لە حوکمە ئیجتهادیەکان.[١]

١ـ الاجتهاد في الفقه الاسلامي، عبدالسلام السليماني، (ص: ١٢٧).

# بەشی سێیەم

# جێنشینکردنی عومەر(ﷺ) لەلایەن ئەبو بەکر یاسا و ڕێسا ی دەسەڵات و حوکمەکەی،ژیانی لە کۆمەڵگەدا

## دوانگەی یەکەم

## جێنشینکردنی عومەر لەلایەن ئەبو بەکر و یاساو ڕێسای دەسەڵات و حوکمەکەی

### یەکەم: جێنشینکردنی عومەر لەلایەن ئەبو بەکرەوە

کاتێك کە نەخۆشی فشاری بۆ ئەبوبەکر هێناخەڵکی کۆکردەوە و فەرمووی:

ئەوەتا دەمبینن، کە دوچاری نەخۆشیەکی ئاوا بووم و ئەوەی کە من گومان دەکەم تەنها ئەوەیە کە مردنم لە پێشە و خوای گەورەش بەیعەتیەنی لە گەردنی ئێوە لابردوەو هیچ پەیمانێکتان بەرامبە من لەسەرتان نەماوەو کارو فرمانتن دەکەوێتەوە دەستی خۆتان ، دەی ئێوەش کەسێك بکەنە ئەمیری خۆتان کە خۆشتان دەوێت، ئەگەر لە ژیانی مندا کەسێك بکەنە ئەمیری خۆتان باشترە لەوەی کە لە دوای من دووبەرەکیتان تێکەوێت ،[1] هاوەڵان هەموویان ڕاوێژیان کرد، هەر کەس هەوڵی بۆ خۆی دەداو داوای لە براکەی دەکرد کە ئەو شیاویەی تێدا بە بینی بکات، لەبەر ئەوە گەرانەوە بۆ لای و وتیان: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرنجی ڕایەکەماندا، ئەویش فەرمووی: لێم گەرێن تا سەرنجێك بدەم و بزانم بەرژەوەندی ئاینی خوای گەورە و بەندەکانی بدەم و بیرێ بکەمەوە، پاشان عبدالرحمن کوڕی عەوفی بانگ کرد و فەرمووی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی عومەری کوڕی خەتاب، عبدالرحمن فەرمووی: سوێند بە خوا ئەوەی، کە تۆ پرسیاری لێوە دەکەیت خۆت زیاتر شارەزاتری لێی لە من، ئەبوبەکر فەرمووی: ئەگەر، عبدالرحمن وتی: سوێند بە خوا ئەو زۆر باشترە لەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوە، پاشان لە سەرووی ئەوەشەوەیە ئەی ئەبو عبداللە، عوسمانیش فەرمووی: خوای گەورە تۆ دەزانی ناسینی من

---

١ ـ البداية والنهايةِ (١٨/٧)، تأريخ الطبري (٢٣٨/٤).

بۆی ئەوەیە نهێنیەکەی لە ئاشکراکەی باشترەو لەناو ئێمەدا یەکێکی تری هاوشانی ئەوی تێدانیە، ئەبوکریش فەرمووی: خوای گەورە ڕەحمت پێ بکات، سوێند بە خوا ئەگەر دڵم ئاوی خواردبایەتەوە پاش تۆ پرسیارم لەکەسی تر نەدەکرد، پاشان ئوسەیبینی کوڕی حوزەیری بانگ کرد و هەمان شتی پێ وت، ئوسەید وتی: خوای گەورەا چاکەی فێر بکە بەرەزامەنبینی تۆ رازی بێت و لەسەر تورەیی تۆش تورە بێت، ئەو کەسەی چاکە دەشارێتەوە باشترە لەو کەسەی ئاشکرای دەکات،هیچ کەسێك تر نیە بەهێز ترو بەتوانا تر بێت لەسەر بەرێوە بردنی ئەم ئیشە لەو ، هەروەها ئەبوبەکر ڕاوێژی بە سەعیدی کوڕی زەید و ژمارەیەك لە پشتیوان و کۆچەرەکان کرد و هەموویان یەك دەنگ بوون جگە لە طلحەی کوڕی عبیداللە کە وتی بەئەبو بەکر: تۆ چی بە خوای گەورەت دەڵێی ئەگەرپرسارت لێ بکات بۆ کەسێکی وا تورەو توندت بە خەلیفەیان کردوە؟ ئەبو بەکر فەرمووی: دامنیشێنن، ئایا ئێوە بە خوای گەورە دەمترسێنن؟ بێ ئومێد دەبێت ئەو کەسەی توێشو بە ستەم کردن لە ئێوە پڕ بکات ، دەڵێم خوای گەورەا لەسەر شوێنکەوتووانت باشترین کەسم جێنشین کردووە،[1] پاشانباسی لە توندو تیژی و رق ئەستوری عومەری بۆ کردن و فەرمووی: لەبەر ئەوەی کە منی بە نەرمی بینیوە، ئەگەر ببێتە کار بەدەستئەوا بەو شێوەیە نامێنێتەوە،[2]پاشان پەیماننامەیەکی نووسی و لە مەدینە و شارەکانی تردا لە ڕێگەی فەرماندەی سوپاکانەوە دەخوێنرایەوە و ئەمەش دەقی ئەو نووسراوە بوو: ((بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە ئەبوبەکر ی کوڕی قەحافە لە دواین کاتی ژیانیدا و لە کاتی لە دونیا دەرچوونیدا لەسەری ڕێککەوتووە و ئەمەش یەکەمین پەیمان و بەڵێنی چوونە ژوورەوەیەتی بۆ دوارۆژی بە جۆرێك بێباوەڕان هێور دەکاتەوە و خراپەکارانیش بێگومان دەکات و درۆزن ڕاست دەکاتەوە و باوەڕی پێ دێنێت، من جگە لە چاکە هیچم بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیو خۆم و ئێوەش نەویستووە ئەگەر ئەمە ڕاست و دروست بێت ئەوا گومانەکەم پێی و شارەزاییەکەم تیایدا تەواو بووە، ئەگەر گۆڕا ئەوا بۆ هەموو کەسێك هەر ئەوە هەیە کە فەراهەم بینی و چاکەم ویستووە و لە غەیبیش نازانم: ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ (الشعراء: ٢٢٧).

عومەر دواین چاکەی ئەبوبەکر ی بوو بۆ ئومەت ، پێش وەخت چاوی بە دونیا هەڵهێنابووە لە نێو گەلەکەیدا نیازمەندیەکی تەمەندار بوو کە هەستی پێدەکرد، ئەگەر روی تێکەن ئەوا ئارەزووەکانیان دەبنە سەروەریان و بەمەش تیا دەچن و رسوا دەبن،ئەمەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئاگاداری کردوینەتەوە،[3] پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێت: ( سوێند بە خوا لە هەژار کەوتنتان ناترسم بەڵام دەترسم لەوەی کە دونیا باڵی خۆی ڕاکێشێت بە سەرتاندا هەروەك گەلانی پێش ئێوە، ئێوەش کێبڕکێی لەسەر بکەن هەروەك ئەوەی کە ئەوان کردوویانە، تیاتان دەبات بەو شێوەیەی کە ئەوانی تیا بردووە)).[4]

---

١ ـ الكامل لابن الاثير (٧٩/٢)، التأريخ الاسلامي، محمود شاكر (ص: ١٠١).
٢ـ الكامل لابن الاثير (٧٩/٢).
٣ ـ تأريخ الاسلام للذهبي عهد الخلفاء، (ص: ٦٦-١١٧)، ابو بكر رجل الدولة، (ص: ٩٩).
٤ ـ البخاري، كتاب: الجزية والموادعة، رقم (٣١٥٨).

ئەبوبەکر هەستی بە نەخۆشی ئەوانی کرد و چارەسەرێکی سەرکەوتوی بۆ دانان ... چیایەکی سەرکەشی بۆ هێنان ئەگەر دونیا بەو شێوەیە بیدیایە ئەوا هەموو کارسازیەکی خۆی بۆ لادەدات، عومەر هەر ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرموویێت: ((ئەی کوڕی خەتاب! سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە شەیتان لە ڕێگەیەکدا پێت ناگات، ئەگەر هاتە ڕێگات ئەوا ڕێگایەکی تر دەگرێتە بەر)).[١] تەواوی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنانەی کە هاتنە ڕێگەی ئومەتبە کوشتن و تیرۆرکردنی عومەر دەستیان پێکرد، ئەم بە پیت و فەڕیە شاهێدن لەسەر پەی پێبردنی ئەبو بەکر و پێشبینی لەو سەردەمەدا بۆ عومەر، عبدالله کوڕی مەسعود(رضي الله عنه) دەفەرموویێت: فەراسەت زانانن سیانن ، یەکیان ئەو ئافرەتەبوو کە بەباوکی وت لە بارەی موسا پێغەمبەرەوە کە فەرمووی:﴿قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَـٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ ۖ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ﴾ (القصص: ٢٦).

هاوەڵکەی یوسف کە دەفەرموویێت: ﴿أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ﴾ (یوسف: ٢١).

ئەبو بەکر کاتێك عومەری کردە جێنشین،[٢] عومەر ئەو بەربەستە بەهێزە بوو کە بویە بەهێزترین بەر بەست لە نێوان ئومەتی ئیسلامی و شەپۆلەکانی فیتنەدا.[٣]

هەربەم شێوەیە عومەر ئاگادرا کردوە سەبارەت بە هەنگاوەکانی داهاتووی، عومەر کاتێك، کە چوویە لای ئەبو بەکر دەست بەجێ هەستی بە عەزیمەتێك کرد ئەویش قایل نەبوو کە پەسەندی بکات بۆیە ئەبو بەکر بە شمشێرەکەی هەڕەشەی لێ کرد و بەم شێوەیە هیچ لەبەردەم عومەر نەمایەوە ئەوە نەبێت کە داواکەی پەسەند بکات،[٤] ئەبو بەکریش دەیویست بە زمانێکی هێمنانەو عاقڵانە ئاگاداری خەڵك بکاتەوە تاوەکو هیچ چەواشە کاریەك ڕوونەدات، پاشان ئەبو بەکر سەرپەرشتتی خەڵکەکەی کرد و پێی فەرموون: ئایا قایل دەبن بەوەی کە کردم بە جێنشین بە سەرتانەوە؟ سوێند بە خوا من بەرای خۆم دام نەاوە، خزم خوێشی خۆشم نەکردە خەلیفە، من عومەری کوڕی خەتابم بە خەلیفە بۆ ئێوە هەڵبژاردووە دەی ئێوەش گوێی لێ بگرن و ملکەچی بکەن ئەوانیش هەموو بە یەك دەنگ وتیان: بیستمان و گوێڕایەڵ بووین،[٥] پاشان ئەبو بەکر و پاڕایەوە و ڕووی کردە خوای گەورە و داوای لێ کرد کە ڕزگاری بکات و پەنهانیەکانی ناخیشی پاك بکاتەوە دواتر فەرموی : خوای گەورە! من بەبێ فەرمانی پێغەمبەرەکەت عومەرم کردە خەلیفە، بەمەش جگە لە چاکەی موسڵمانان هیچی ترم مەبەست نەبووە، ترسام فیتنە ڕوویان لێ بنێت و بە ڕای خۆم هەوڵم بۆ دان، باشترینیانم لێ کردنە

١ ـ البخاري، كتاب فضائل اصحاب النبي (ﷺ)، رقم (٤٦٨٣).
٢ ـ مجمع الزوائد، (١٠/٢٦٨)، صحيح الاسناد.
٣ ـ ابو بكر رجل الدولة، (ص: ١٠٠).
٤ـ تأريخ الطبري، (٤/٢٨٤).
٥ ـ مآثر الانافة، (١/٤٩).

کاربەدەست و ئەویش سوورترینیانە لەسەر ڕێنمایی کردنیان، لە فەرمانی تۆ ئەوەی ئامادە بوو ئامادە بوو دەی منیش بکەرە شوێن کەوتەیان چۆن ئەوانیش بەندەی تۆن.[١]

پاشان ئەبو بەکر(ﷺ) داوای لەعوسمان(ﷺ) کرد کە ئەم پەیمان و بەڵێننامەیە بخوێنێتەوە بۆ خەڵکی و پێش مردنی خۆی بەیعەتیان بۆ عومەر لێ وەربگرێت پاش تەواوکردنی زۆرێك لە ئەرك ئەنجامدانی کارەکان بەبێ بەجێ هێشتنی هیچ شوێنەوارێکی خراپ، عوسمانیش بە خەڵکەکەی فەرموو: بەیعەت دەدەنە ئەو کەسەی کە لەم نووسراوەدا هەیە؟ وتیان: بەڵێ، پاشان هەموان دانیان پێدانا و پێی قایل بوون.[٢] دوای ئەوەی، کە عوسمان نووسراوەکەی خوێندەوە خەڵکەکە پێی قایل بوون و پەسەندیان کرد و بەیعەتیان پێدا،[٣] ئەبو بەکر و عومەر پێکەوە دانیشتن و ئەبو بەکر بە چەند ڕاسپاردەیەك ئامۆژگاری عومەری کرد بۆ دەربڕینی ئەستۆپاکی خۆی لە هەر شتێك تاوەکو بە ئەستۆ پاکی و پاش ئەوەی کە ئەو پەڕی توانای خۆی بەکارهێنا بگەڕێتەوە لای خوای گەورەی،[٤] لە وەسیەتەکەدا هاتووە کە: ئەی عومەر لە خودا بترسە، ئەوەش بزانە کە خوای گەورە چەند کارێکی لە ڕۆژدا هەیە کە شەو وەریان ناگرێت و چەند کارێکیشی لە شەودا هەیە کە لە ڕۆژدا وەریان ناگرێت، سوونەتت لێ وەرناگرێت تاوەکو فەرزەکانی بۆ بەجێ نەهێنیت، هەر کەس تای تەرازووەکەی قورس بێت بە شوێنکەوتنی حەق ئەوا مافی خۆیەتی سبەینێ تایەکەی قورس بێت، هەر کەسیشبە شوێنکەوتنی پووچەڵ و بێباوەڕی هەڵبژاردتای تەرازووەکەی سووك دەبێت ئەوەش پاداشتی خۆیەتی، خوای گەورە باسی بەهەشتیانی کردووە بە چاکی کارەکانیان و واز هێنان لەخراپەکان، کاتێ باسیان دەکەم دەڵێم : دەترسم پێیان نەگەم،کاتێ باسی ئەهلی دۆزەخ دەکات بەهێنانی خراپترین کردەوەیان و وەرنەگیرانی چاکەکایان باسیان دەکات،کە بیر لەوانە دەکەمەوە دەڵێم ئومێد هەیە، کە لە ناو ئەوانەدا ناوم نەنوسرابێت،تابەندەکان بە ویستو ئارەزوی خۆیان ڕێبازی ژیان هەڵبژێرن ،کەس بەتەماڵی و هیواوە پای لێنەداتەوە کەسیش لە ڕەحمو میهرەبانی خوای گەورە نائومێد نەبێت، ئەگەر تۆ ئەم وەسیەتەی منت لەبەر کرد ئەوا هیچ نادیاریەك لە مردن لێت پەست نابێت و تۆش کەنار گیری ناکەیت.[٥]

هاوکات لەگەڵ کۆچی دوایی ئەبوبەکر(ﷺ) عومەر(ﷺ) وەك خەلیفەی موسڵمانان دەست بەکار بوو،[٦] لێکۆڵەر کاتێ سەرنجی ئەوە دەدات هەڵبژاردنی عومەر(ﷺ) لە لایەن ئەبوبەکرەوە(ﷺ)دەستووری نەبوە، چونکە دەبێت ڕای زۆرینەی لەسەر بێت ئەو کات یاسایی و دەستوریە، ئەمەش هاتە بینی ئەو دەمەی ئەبوبەکر خەڵکی سەرپشك کرد لەوەی بچن و خەلیفەیەکبۆ

---

١ـ طبقات ابن سعد، (٣/١٩٩)، تأريخ المدينة لابن شبهة (٢/٦٦٥-٦٦٩).
٢ـ طبقات ابن سعد، (٣/٢٠٠).
٣ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع، (ص: ٢٧٢).
٤ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع، (ص: ٢٧٢).
٥ـ صفة الصفوة (٢/٢٦٤-٢٦٥).
٦ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع، (ص: ٢٧٢).

خۆیان هەڵبژێرن، ئەوانیش کارەکەیان بە خۆی سپارد و پێیان وت: ئێمە ڕای تۆمان پێ باشە،[١] لەگەڵ ئەوەشدا ئەبو بەکر کەسی دەست نیشان نەکرد تاوەکو ڕاوێژی بە هەندێك لە هاوەڵە سەراست و دەمڕاستەکان کردو هەر یەکەش بە تەنها پرسیاری لێ کردن، کاتێك کە زانی یەك دەنگن ڕای خۆی بە هەڵبژاردنی عومەر ئاشکرا کرد و هەڵبژاردنی عومەیش لە لایەن ئەبو بەکرەوە لە خوێندنەوەی ئەبو بەکر لە شارەزاییانیەوە سەرچاوەی گرت و ئەمەش مانای وابوو کە هەڵبژاردنی خەلیفە ڕەوالی یاسایی وەرگرتبوو هیچ سەرپێچی لادانێی لە دەستور و یاسا تێدا نەبوە.

ئەمەش مانای ئەوەیە هەڵبژاردنی حاکم مافێکی ئومەتە و خەلیفەش بە وەکیلی ئومەت و گەلەو پێویستە ڕەزامەندی تەواوی لەسەر بێت لەبەر ئەوە ئەبو بەکر ڕووی کردە هاوەڵان و پێی فەرموون: ئایا قایل دەبن بەو کەسەی کە کردوومەتە خەلیفە؟ سوێند بە خوای گەورە، من لە تێکۆشانی ڕام نە کەس و کار و نە خزم و دۆستی خۆم دانەناوە، من عومەری کوڕی خەتابم کردۆتە خەلیفە، ئێوەش گوێڕایەڵی و ملکەچی بن، ئەوانیش وتیان: ئەوا گوێڕایەڵ و ملکەچی بووین،[٢] لەم لێکدوانەی ئەبو بەکردا هاتووە کە: ئایا قایل دەبن بەوەی کە کردومەتە خەلیفەتان، ئەمەش ئاماژە کردنێکە بەوەی، کە فەرمان فەرمانی ئومەتە و ئەمەش خاوەنی پسپۆڕیە.[٣]

عومەر(ﷺ) بە هاودەنگی ئەهلی(حل و عقد) خەلافەتی گرتە دەست ، چونکە هەر ئەوان بوون لە هەڵبژاردنی ئەبوبەکر بۆ خەلافەت دەسەڵاتیان دایە و کردیانە خەلیفەی خۆیان، ئەویش بە هەمان شێوە ڕاوێژی کرد و پاشان خەلیفەی دەست نیشان کرد، پاشتر ئەم دەست نیشان کردنەی خستە بەر دەمیان و دواتر بۆی خوێندنەوە و ئەوانیش واژۆیان کرد و لەسەری یەك دەنگ بوون، ئەهلی (حل و عقد)یش بریتین لە نوێنەرانی گەل و ئومەت، کەواتە جێنشینکرانی عومەر(ﷺ)لەسەر باشترین شێوازی ڕاوێژی و دادپەروەرترینیان بوو.[٤]

بەڕاستی هەنگاوەکانی ئەبو بەکر بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە لە دوای خۆی لادان نەبوە لە شورا بەڵکو هەمان شێوازی وەرگرتنی دەسەڵات بووکە خوبینی ئەبو بەکر دەسەڵاتی پێ گرتە دەست.[٥]

بەم شێوەیە پەیانی خەلافەت بۆ عومەر(ﷺ) کۆتایی پێ هات بە ڕاوێژ و ڕێککەوتن و مێژوو هیچ خەلافەتێکی تری بە خۆیەوە نەدیووە پاش ئەمە کە لە هەڵبژاردنی خەلیفەکەیدا ڕوویدابێت وە کەسێکیش نەبووە کە لە سەردەمی عومەردا لێی هەڵسێت و دژایەتی کردبێت بەڵکو دەنگ و کارێکی بەکۆمەڵ هەبووە لەسەر بەخەلیفە بوونی و ملکەچی لەکاتی فەرمانڕەوایەتیدا و هەمووانیش تەنها هەر یەك یەکە بوون.[٦]

---

١ـ القيود الواردة على سلطة الدولة في الاسلام، (ص: ١٧٢).
٢ـ تأريخ الطبري، (٤/٢٨٤).
٣ـ القيود الواردة على سلطة الدولة في الاسلام، (ص: ١٧٢).
٤ـ ابو بكر الصديق، علي الطنطاوي، (ص: ٢٧٣).
٥ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع، (ص: ٢٧٢).
٦ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**دووەم: ئەو دەقە شەرعیانەی کە ئاماژە بە ڕەوایەتی مافی فاروق دەکەن بۆ بە خەلیفە بوون:**

١- لە قورئانی پیرۆزدا دەق هەیە لەسەر دروستی خەلافەتی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان (خوایان لێ ڕازی بێت) و لەسەر پێویست بوونی ملکەچیان ئەوەتا خوای گەورە لەبارەی(اعراب)ەوە پێغەمبەرەکەی(ﷺ)دەدوێنێت و دەفەرموویت:﴿فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ﴾ (التوبة: ٨٣).

دابەزینی(بەری بوونێکی گەورە)کە ئەم حوکمەی تێدایە بێگومان لە دوای غەزای تەبوك بووە،[1] کە ئەوسێ کەسەی تێدا دواکەوت کە خوای گەورە لە سورەتی (براءة — التوبة) لێیان خۆش بووە پێغەمبەر(ﷺ) لە دوای تەبوك تاوەکو وەفاتی فەرموو بەشداری هیچ غەزایەکی نەکردهەروەها خوای گەورە دەفەرموویت:﴿سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ﴾ (الفتح: ١٥).

ئەمە ڕوونی دەکاتەوە کە عەرەب هەر بۆ ئەمە پاش تەبوك لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستدا(ﷺ) نایەنە غەزا، پاشان خوای گەورە سۆزی نواند بە سەریاندا بە هۆی ڕێگریان لە غەزا لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموویت:

﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَـٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ (الفتح: ١٦).

خوای گەورە هەواڵی دا کە بەبێ پێغەمبەر(ﷺ)بانگیان دەکات بۆ سەر قەومێك کە یان لەگەڵیان دەجەنگن، یان خۆیان موسڵمان دەبن، لەسەر گوێڕایەڵی ئەوەی کە بانگی کردوون بەڵێنی پێدان بە وەرگرتنی پاداشتی زۆر باش و بە سەرپێچی کردنیشیان بەڵێنی سزای سەختیان پێ دەدات.[2]

ئەبو محمد کوڕی حەزم دەفەرموویت: ئەو دەشتەکیانە لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) کەسیان بانگ نەکردووە بە مەبەستی بەشداری کردن لەو جەنگانە یان موسڵمان بوونی ئەو گەلە جگە لە ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئەبو بەکر(ﷺ) بانگی کردن بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکانی

---

١ـ الدر المنثور في التفسير المأثور، (٤/١١٩-١٢٢).
٢ـ عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (٢/٦٣٤).

عەرەبی هۆزی حەنیفە و یارانی ئەسوەد و سوجاح و (طلیحة) و ڕۆم و فارس و ئەوانی ترش، هەروەها عومەر بانگی کردن بۆ جەنگی ڕۆم و فارس و عوسمانیش بانگی کردن بۆ جەنگی ڕۆم و فارس و تورکەکان،[١] بەم شێوەیە گوێڕایەڵی و ئیتاعەتی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان (خوایان لێ ڕازی بێت) بەو دەقە قورئانیە واجب بوو کە بە هیچ شێوەیەك ناکرێت تەئویل بکرێت ، کەواتە ملکەچی و گوێڕایەڵی و ئیتاعەتیا واجبەو پێشەوایەتی و خەلافەتیان دروست و ڕاست بووە.[٢]

٢- پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویت: ( لە خەومدا بە دۆلکێك ئاوم لە بیرێکی هەڵبەستراو دەردەهێنا پاشان ئەبو بەکر هات و دۆلکەیەك یان دوو دۆلکەی بە لاوازی دەرهێنا و خوا لێی دەبوورێت و پاشان عومەری کوڕی خەتاب هات و پڕ بە دۆلکەیەکیکی گەورەی ئەو ەرهێنا ، بەهێزێزێکی وەك ئەوم نەبینیوە، کە هێندە بەتواناو لێهاتوو بێت، هێندە ئاوەکە زۆر بو خەڵکی و حوشترەکانیشیان تێراو بون، حوشترەکانیان بەرەو مۆڵگەکانیان بردن.))[٣]

ئەم فەرموودەیە ئاماژە بە خەلیفایەتی ئەو دوو کەڵەپیاوە دەکات (خوایان لێ ڕازی بێت) هەروەك ئەوەی کە ئاماژە بە خەلافەتی عومەر(ﷺ) دەکات ، هاوکات باس لەو فەتحانەش کە لەسەردەمی دەسەڵاتیدا اوو دەدەن، ئەم خەونەی پێغەمبەریش(ﷺ) نموونەیەکی ڕوونە لەوەی کە ڕوویداوە بۆ ئەبو بەکرو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) لە خەلافەتیاندا و باشی ژیانیان و دەرکەوتنی شوێنەواریان و سوود گەیاندنیان بە خەڵکی و هەموو ئەمانەش وەرگیراوە لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە، پێغەمبەر(ﷺ) هەر خوبینی خۆی خاوەنی ئەم کارەیە و پێی هەستاوە و تەواوی کردووە بەجۆرێك بڕیاری ڕێسای ئاین و لانکەی فەرمانەکانی داوە و ئەصل و فەرعی ئاینی ڕوون کردۆتەوە و خەڵکی پۆل پۆل چوونەتە نێو ئاینی خودا و پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە کە دەفەرموویت: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا﴾ (المائدة:٣).

کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) پەیوەندی کردەوە بە هاوڕێی باڵادەست ئەبو بەکر(ﷺ) بۆ ماوەی دووساڵ و چەند مانگێك بۆ خەلیفە و مەبەست لە پەیڤەکەشی(ﷺ): ((دۆڵچەیەك یان دوو دۆڵچە)) ئەمە گومانێکە لە چیرۆك خوان و مەبەست لە دوو دۆڵچەش هەروەك لە لێدوانەکەدا هاتووە بەمە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە،[٤] لە سەردەمی خەلافەتیدا(ﷺ) جەنگی هەڵئەگەراوەکانی کردووە و ڕیشکی دەرهێناون و زەوی ئیسلام لەسەردەمی ئەودا زیاتر بەرفراوان بووە و لە حوکمەکانی خۆی کۆمەڵە بڕیارێکی داوە کە بێ وێنە بوون بە هۆی درێژی دەسەڵاتی و بەرفراوان بوونی دەوڵەتی ئیسلام و زۆری ماڵی خەڵکی لە غەنیمەت و چەندین شتی تر، فەرموودەکەش گشتگیرە لەسەر مافداری خەلافەتی عومەر(ﷺ)و دروستی و ئاشکرای سیفەتی و سوودمەنبینی موسڵمانان لێی.[٥]

---

١ـ الاعتقاد للبيهقي، (ص: ١٧٣).

٢ـ الفصل في الملل والاهواء والنحل، (٤/١٠٩-١١٠).

٣ـ مسلم، رقم (٢٣٩٣).

٤ـ عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (٢/٦٣٥).

٥ ـ عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (٢/٦٣٥).

٣- حوزەیفە(ﷺ) دەفەرمووێت: ئێمە لای پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین فەرمووی: ((من نازانم ماوەی مانەوەم لە نێو ئێوەدا چەندە، لەبەر ئەوە پەیوەندی بکەن بەوانەی دوای من و ئاماژەی کرد بە ئەبو بەکر و عومەرەوە و پابەند بن بە ڕێنموونی عەممار و ئەو فەرموودانەش کە لە ابن مسعود بۆتان دەگێڕێتەوە بە ڕاستی بزانن))[١] ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر مافداری خەلافەتی عومەر(ﷺ) فەرموودەکەی(ﷺ): ((پابەند بن بەوانە)) واتا ئەو دوو خەلیفەیەی، کە دوای من دێن: ( ئەبو بەکر و عومەر)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی داوە بە ملکەچیان کە ستایشی لەسەریان دەوێ لەبەر ئەوەی کە ئەم دووانە شیاوی ئەوەن بە گوێیان بکرێت لە هەر فەرمانێك کە دەری دەکەن یان ڕێگری لێ دەکەن، مۆڵەت بە باشی ژیانیان و ڕاستی نهێنیەکانیان و لەبەر ئەوەی کە ئەوان دوو خەلیفەن لە دوای خۆی و، هۆی سوور بوون لەسەر پابەند بوون بە پێشینە یەکەمیەکان و ئەوەی کە لەسەری ڕاهاتوون لەسەر ڕەوشتی پەسەندی و سرشتی کە شیاوە بۆ چاکەکردن لەبەر ئەوە ئەوان باشترین کەسن لە دوای پێغەمبەران و باشترین دروست کراون لە دوایان و لەوانەی کە بە چاکە شوێنیان کەوتوو تا ڕۆژی دوایی.[٢]

٤- پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ((کاتێك کە خەوتبووم دەفرێکی پڕ شیریان هێنا تێرم لێ خواردەوە و بینیم بە نێو پەنجەکانمدا دەڕژێن، پاشان ئەم چاکەیەم دایە دەستی عومەری کوڕی خەتاب)) وتیان: ئەمە مانای چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ((زانیاری)).[٣]

لەم فەرموودەیەدا ئاماژەیەك بە مافداری خەلافەتی عومەر دەکرێت و مەبەست بە زانیاری و زانست لێرەدا: زانیاریە بە سیاسەتی خەڵکی بە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)و عومەریش لەمەدا پسپۆڕ بووە بۆ درێژی ماوەی خەلافەتی لەچاو ئەبو بەکردا و بە هاودەنگی خەڵکیش لەسەر ملکەچی لە چاو عوسماندا، بەڕاستی ماوەی خەلافەتی ئەبو بەکر کەم بووە و پاکسازی تێدا زۆر نەبووە کە لە گەورەترین هۆکارەکانە لە دووبەرەکیدا لەگەڵ ئەمەشدا عومەر سیاسەتی خۆی تێدا بەکار هێناوە لەگەڵ درێژی ماوەکەیدا خەڵکی بە هیچ شێوەیەك ناکۆك نەبوون لەگەڵیدا پاشان بەرفراوانی لە سەردەمی خەلافەتی عوسماندا زیادی کرد و وتی وتی بڵاوبوویەوە و بۆچوونەکان جیاواز بوون، بەو شێوەیەی کە ملکەچی بۆ عومەر دەکرا بۆ عوسمان بەو شێوەیە نەبوو، بێ گوێیی پەرەی سەند تاوەکو فیتنەیەکی وا بەرپا بوو کە بوویە مایەی شەهید بوونی، پاش ئەو عەلی کرایە جێنشین و جگە لە ناکۆکی هیچی تر زیادی نەکرد و فیتنە پەرەی سەند[٤] و ئەم فەرموودەیەش ئاماژە پێکردنێکی بوونی تێدایە بۆ مافداری عومەر بۆ گرتنە دەستی خەلافەت(ﷺ).[٥]

---

١ـ سلسلة الاحاديث الصحيحة للالباني (٣/٢٣٣-٢٣٦)، صحيح ابن حبان (١٥/٣٢٨) ومصنف إبن أبي شيبة (٧/٤٣٣) وصحيحة الالباني في الصحيح (٣/٣٣٣-٣٣٦).

٢ـ فيض القدير للمناوي (٢/٥٦).

٣ـ مسلم (٤/١٨٥٩-١٨٦٠).

٤ـ فتح الباري (٧/٤٦).

٥ـ عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (٢/٦٣٧).

٥- ئەبو بەكر(ﷺ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((كێ لە ئێوە خەوێكی بینیوە؟)) پیاوێك وتی: من خەوێكم بینیوە لە خەومدا تەرازوویەك لە ئاسمان هاتە خوارەوە تۆ و ئەبو بەكری كێشا تۆ قورستر بووی دزاتر عومەرو ئەبوبەكری كێشا ئەبو بەكر قورستر بوو پاشان عومەر و عوسمانی كێشا عومەر قورستر بوو پاشان تەرازووەكە بەرزكرایەوە و ئێمەش ڕووگرژیەكمان لە نێوچەوانی پێغەمبەر(ﷺ) بەدی كرد.[١]

ئەم فەرموودەیە ئاماژەكردنێكە بە ڕێكخستنی ئەو سێ كەسە لە چاكیدا و باشترینیان ئەبوبەكرو پاشان عومەرو دواتر عوسمان (خوایان لێ ڕازی بێت) بووە هەروەها ئەم فەرموودەیە ئەو ئاماژەیە لە خۆی دەگرێت كە مافاری زیاتر دەدات بە عومەر(ﷺ) كە دەسەڵاتی خەلافەت لە دوای ئەبو بەكر بەدەست بگرێت و وتەی لەم فەرموودەیەدا هاتووە كە: گرژیەكمان لە نێوچەوانی پێغەمبەر(ﷺ) بەدی كرد ئەویش كاتێك كە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) زانی بەرزكردنەوەی تەرازووەكە دابەزاندنی پلە و پایەی كارەكان و دەركەوتنی فیتنەیە لە دوای خەلافەتی عومەر.[٢]

٦- ابن عەباس(ﷺ) دەفەرمووێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و وتی من ئەمشەو لە خەومدا كەپرێكم بینی كە ڕۆن و هەنگوینی لێ دەچۆڕا،[٣] منیش خەڵكم بینی كە بڕێوی خۆیان لێ دەبرد[٤]: پەرەسێنەر و ئازاتد، ئەم هۆكارەش پەیوەندار بوو لە نێوان زەوی و ئاسمان و بینیم تۆ لێت بردو بەرز بوویەوە پاشان پیاوێكی تر لێی برد و ئەویش بەرز بوویەوە دواتر پیاوێكی تر لێی برد و بڕا و پاشان بەردەوام بوویەوە، ئەبوبەكر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! باوكم بە قوربانت بێت ئەگەر ڕێگەم بدەیت من لێكی دەدەمەوە، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((لێكی بدەوە))، ئەبوبەكر فەرمووی: كەپرەكە ئیسلامە و ئەوەش كە دەچۆڕا لە هەنگوین و ڕۆنەكە قورئان و چێژەكەیەتی لە قورئان پەرەسێنەر و ئازاد دەچۆڕێت، هۆی پەیوەستداریش لە ئاسمان بۆ سەر زەوی ئەو حەقەیە كە تۆی لەسەری و لێی دەبەیت و پێی بڵند دەبیەوە پاشان پیاوێكی تر بینی و بە هۆیەوە بڵند دەبێتەوە و دواتر پیاوێكی تر بینی و بە هۆیەوە دەپچڕێت و پاشتر كەسێكی تر پێی دەگات و پێی بەرز دەبێتەوە، هەواڵم پێ بدە ئەی پێغەمبەری خوا، ڕاستم وت یان هەڵە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەندێ پێكا و لە هەندێكی هەڵە بوویت))، دواتر ئەبوبەكر فەرمووی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەر ئەوەیانم پێ دەڵێیت كە تیایدا هەڵەم كرد، پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: ((سوێند مەخۆ))،[٥] ئەم فەرموودەیەش ئاماژە بۆ مافداریێتی عومەر(ﷺ) دەكات و ئەمەش نیگاكردنێكە بۆ ئەو وتەیەی كە لە قسەكردنەكەدا هاتووە كە دەڵێت: پاشان پیاوێكی تر گرتی و پێی بەرز بوویەوە ئەوا

---

١ـ سنن أبي داود (٢/٥١٢)، سنن الترمذي (٤/٥٤٠).
٢ـ عون المعبود شرح سنن ابي داود (١٣/٣٨٧).
٣ـ النهاية في غريب الحديث (٥/٧٥).
٤ـ النهاية في غريب الحديث (٤/١٩٠).
٥ـ مسلم (٤/١٧٧٧-١٧٧٨).

ئەبوبەکرە(ﷺ) و وتەی دووەمیشی کە دەفەرمووێت: پیاوێکی تر هات و بچڕانبینی، ئاماژەیە بۆ خەلافەتی عومەر(ﷺ).[١]

٧- ئەنەس(ﷺ) دەفەرمووێت: بەنو موستەلەق ناردمیان بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە بپرسم لە دوای خۆی چاکەکانمان بدەینە دەستی کێ؟ منیش چووم و پرسیارم لێ کرد و فەرمووی: ((کە بیدەنە دەست ئەبوبەکر))، منیش هاتم و هەواڵەکەم پێدان، بەڵام ئەوان وتیان بڕۆ بپرسە ئەگەر ئەبوبەکر شتێکی بەسەرهات؟ منیش هاتم و پرسیم، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرمووی: ((بیدەنە دەست عومەر))، دواتر منیش ئەگەرامەوە و هەواڵەکەم پێدان.[٢]

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بە مافداری عومەر(ﷺ) بۆ گرتنە دەستی خەلافەت و کاری موسڵمانان لە دوای کۆچی دوایی ئەبوبەکر(ﷺ).[٣]

٨- لەو شتانەی تر کە بەڵگەن لەسەر مافداری عومەر(ﷺ) بۆ خەلافەت و کۆبوونەوەی هاوەڵانە کە بۆ ئەوەی باشترینیان و چاکترینیان بخەنە ڕوو لەگەڵ ئەو وتەیەی ئەبو بەکر(ﷺ) سەبارەت بە عومەر، وتەی ئەبوبەکر ئەمەیە کە دەفەرمووێت: خوای گەورەا من چاکترین کەسی ئەهلەکەتم کردۆتە فەرمانڕەوایان،[٤] سەبارەت بە وشەی عەلی ئەوەیە کە بوخاری لە محمد کوڕی خەنەفیە کە کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب(ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: وتم بە باوکم لە دوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) کێ باشترین کەسە؟ فەرمووی: ئەبوبەکر، وتم پاش ئەو؟ فەرمووی: پاشان عومەر، منیش ترسام بڵێت عوسمان، بۆیە وتم: پاشان تۆ؟ ئەویش فەرمووی: من تەنها پیاوێکم لە نێو موسڵماناندا.[٥]

هەموو ئەم فەرموودانەی کە باس کران بەڵگەیەکی ڕوون بووە لەسەر مافداری عومەر(ﷺ) بۆ خەلافەت.[٦]

سەفارینی (ڕەحمەتی خوا لێ بێت) دەفەرمووێت: دەزانم خەلافەتی ڕێزدارمان عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) ڕێکخەر و پێویستە بۆ مافداری خەلافەتی ڕاستگۆی گەورە کە ئەبوبەکرە(ﷺ)، زانایان بە هەموو دەنگ و کتێبەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن و سونەتیش لەسەر مافداری خەلافەتیەتی، ئەوەی کە سەلمێنراوە بۆ بنەچەی کە بریتیە ئەبوبەکر لە مافداری خەلافەتدا بە هەمان شێوە چەسپاوە بۆ لقەکەشی کە عومەری کوڕی خەتابە تیایدا، چاوی تەماع بۆ کەسێك نیە لە جیاوازی گومڕایی لە تانە و تەشەرلێدان و دووبەرەکی لە مافداری ئەو خەلافەتەدا، زانایان زۆر بە پێویستیان زانیووە کە یارانی بەڕێز کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە ئەبوبەکر دەسەڵاتی خەلافەت بگرێتە دەست، هەر کەس شاز

١ـ عقيدة اهل السنة والجماعة (٢/٦٣٨).
٢ـ المستدرك (٣/٧٧)، هذا حديث صحيح الاسناد ووافقه الذهبي.
٣ـ عقيدة اهل السنة والجماعة (٢/٦٣٩).
٤ـ الطبقات الكبرى (٣/٢٧٤).
٥ـ البخاري، كتاب: الصحابة، رقم (٣٦٧١).
٦ـ عقيدة اهل السنة والجماعة (٢/٦٤٠).

بێت جگە لە تاڵی بە هیچ شێوەیەك لێوانی خۆی پڕ ناکات.[١]

## ٣- سازدانی کۆبوونەوە لەسەر بە خەلیفەبوونی عومەر:

بەرهەڤبوونی یاران (خوایان لێ ڕازی بێت) و لە دوای ئەوانیش ژمارەیەك لە زانایان و بە تایبەتیش ئەوانەی کە پشتیان پێ دەبەسترێت هەندێك شتیان بۆ گوێزاوینەتەوە لەوانە:

١- ئەبوبەکراحمبینی کوڕی حوسەینی بەیهقی لە سەنەبینی بۆ عبداللە کوڕی عەباس(ﷺ) دەفەرمووێت: چوومە لای عومەر کاتێك کە بەنێزە لێیدابوو، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران مزگێنی بەهەشتت لێ بێت موسڵمان بوویت کاتێك کە خەڵکی بێباوەڕ بوون، جیهادت کرد لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) لە کاتێکدا کە خەڵکی شەرمەزاریان دەکرد، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وەفاتی کرد و لێت قایل بوو، لە سەردەمی خەلافەتی تۆدا کەس بەرامبەر بە کەسێکی تر ناکۆك نەبوو، بە شەهیدی کوژرای، پاشان عومەر فەرمووی: بۆم هەژمار بکە، منیش هەژمارم کردنەوە دواتر عومەر فەرمووی: سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو خوای گەورە تر نەی، ئەگەر تەواوی زەردایی و سپیایی سەر زەویم هەبووایە، هەر لە پەژەنگی دەرگەوە دەمکردنە فیدای ئەم ئاینە.[٢]

٢- ئەبو نەعیمی ئەسبەهانی ئەم بەرهەڤبوونە لەسەر خەلافەتی عومەر(ﷺ) ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت: کاتێك کە ئەبوبەکر(ﷺ) لە کارزانی عومەر(ﷺ) زانی بەوەی کە ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد لەسەرئەوەی، کە بە شوێن پێی خۆیدا دەڕوات و لەسەر ئەو شتانەش دامەزراوە کە لە ڕۆژانی ژیانیدا هاریکاری تەواو و — هەوڵی نەبوون لە خوبینی خودا و هاواری بۆ بەندەکانی خودا — بە جۆرێك کە ئەم کارەی لێ لابدات بۆ کەسێکی تر و کاتێکیش کە کاری کرد لە فەرمان و کاروباری یاران (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەو کاتە زانیان کە هەست بە شتێك دەکەن کە ئەو هەستی پێ دەکات و لەم کارەشیدا هیچ بارگرانیەك لەسەر شانی ئەوان دروست ناکات، لەبەرئەوە ئەبوبەکر بە خۆشحاڵیەوە پێی گەیاندن و ئەوانیش پێی قایل بوون و پێیان سپارد، ئەگەر لە کارەکانیدا جۆرێك لە گومان یان دوودڵیان بۆ دروست ببووایە ئەوا نکوڵیان لێ دەکرد و شوێنی نەدەکەوتن بەو جۆرەی، کە شوێنی ئەبوبەکر(ﷺ) کەوتبوون بە جۆرێك کە خوای گەورە کۆبوونەوەی لەسەر فەرز کردبوو، ئیمامەت و خەلافەتی سپاردبوو لەسەر ئەو ڕووەی کە بۆ ئەبوبەکر چەسپابوو، ئەمەش بەڵگەیە بۆیان لەسەر کارزانی و شیاوی و تەواوی و هەر لەسەر ئەمەش شوێنی کەوتن و پێی ڕازی بوون.[٣]

٣- ئەبو عوسمانی ئەلصابونی پاش باسکلادنی خەلافەتی ئەبوبەکر بە هەڵبژاردنی یاران و بەرهەڤبوویان لەسەری دەفەرموێت: پاش خەلافەتی عومەر(ﷺ) بە جێنشینکرانی ئەبوبەکر(ﷺ) بۆ عومەر و هەماهەنگی یاران لەسەری لە دوای و دەسکەوتنی خودایی بە ئەو پلە و پایەیەی کە هەیبوو لە سەرخستنی ئیسلام و پیرۆزی کاروباری و ئامادەکاریەکانی.[٤]

---

١ـ لوامع الانوار البهية (٢/٣٦٢).

٢ـ الاعتقاد للبيهقي، (ص: ١٨٨).

٣ـ كتاب الامامة والردة على الرافضة (ص: ٢٧٤).

٤ـ عقيدة السلف وأصحاب الحديث ضمن مجموعة الرسائل المنبرية (١/١٢٩).

٤- نەوەوی لە(معرض)، کە باسی بەرهەڤبوونی یارانی کردووە لەسەر چەسپاندنی سەردەمی ئەبوبەکر بە خەلافەتی بۆ عومەر دەفەرموێت: ڕێککەوتن لەسەر هەڵبژاردنی ئەبوبەکرو لەسەر بەجێ هێنانی پەیمانی بۆ عومەر.[1]

٥- ئیبن تەیمیە: سەبارەت بەعومەر ئەبوبەکر بەڵێنی پێداوە و موسڵمانانیش پاش مردنی ئەبوبەکر بەیعەتیان پێدا بەو شێوەیە بوویە پێشەوا کاتێك کە بەیعەتەکەی ئەوان تواناو دەسەڵاتداری بۆ فەراهەم هات.[2]

٦- شارح الطحاویة دەفەرموێت: پاش ئەبوبەکر(ﷺ) خەلافەت چەسپا بۆ عومەر(ﷺ) ئەمەش بە دەسەڵات پێدانی ئەبوبەکر بۆ عومەر و ڕێککەوتنی ئوممەت پاش ئەو لەسەری.[3]

لە هەموو ئەم گواستنەوانەی کە باسکران دەرکەوت کە خەلافەتی عومەر(ﷺ) بە کۆی دەنگی یارانی پێغەمبەر(ﷺ) تەواوکاری بۆ کراوە بە جۆرێك کە بەڵێنی ئەبوبەکر، یان(ﷺ) پێ گەیشتووە بەدەسەڵاتی خەلافەت بۆ عومەرو بە پەسەندی و تەسلیم کردنی و لەمەشدا کەس بەربەست نەبووە هەروەها تیمی قوتاربوونیش کە ئەهلی سونە و جەماعەن بەرهەڤبوون لەسەر ئەوەی کە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری کۆك بوون، کەس سەرپێچی نەکردوون جگە لە کەسانێك کە پەلاماردەر بووە بە ناکۆکیان لەوانەی کە بە هەندێ یاران تاقیکراوەتەوە وەك شیعە و (رافضة) و کەسێك کە بەرێی ئەواندا ڕۆیشتووە و فیتنەیی پێ کردوون، ئەگەر کەسێك دژەکار بوو بەرامبەر ئەم بەرهەڤبوونەی یاران کە پێشتر باسکرا ئەوا هەر ئەو دەنگۆیەیە کە ئیبن مەسعود و ئەوانی تر ڕیوایەتیان کردووە کە هەندێ لە یاران گوێیان لێ بووە کە عبدالرحمن کوڕی عەوف و عوسمان چوونەتە ژوورەوە بۆ لای ئەبوبەکر و پێیان فەرموو: چی وەڵامی پەروەردگات دەدەیتەوە ئەگەر پرسیاری لێ کردی سەبارەت بە خەلیفەکردنی عومەر لە سەرمان لە کاتێکدا ئەم توندڕەویەی تێدا بەدی دەکەیت؟ ئەبوبەکر فەرمووی: دامنیشێنن، ئایا بە خودا دەمترسێنن؟ هەژار و نەدار کەون کەسێك کە لە کار و فەرمانی ئێوەدا بە ستەم زیادەڕۆیی کرد، من دەڵێم: خوای گەورە من باشترین ئەهلی تۆم کردە جێنیشین بە سەریانەوە، دەی تۆش ئەمەی من بگەیەنە بە هەر کەسێك کە بە دواتەوەیە[4] وەڵامیش سەبارەت بەم نکۆڵیە ـ ئەگەر دروست بێت ـ لەم بێژەرەدا، سەبارەت بە نەفامی نیە بۆ کارزانی عومەر دوای ئەبوبەکرو مافداری بۆ خەلافەت، بەڵکو مەترسیە لە توندی و ئەستووری نەك تاوانبارکردنی بۆی لە هێز و ئەمانەتی.[5]

---

١ـ شرح النووي على صحيح المسلم، (٢٠٦/١٢).
٢ـ منهاج السنة (١٤٢/١).
٣ـ شرح الطحاوية (ص: ٥٣٩).
٤ـ الطبقات لابن سعد (١٩٩/٣).
٥ـ كتاب اللإمامة والردة على الرافضة (ص: ٢٧٦).

### چوارەم: وتاری عومەر لەکاتی گرتنە دەستی خەلافەتدا:

گێڕەرەوەکانی ناکۆك بوون لە گێڕانەوەی یەکەم وتاری فاروقە، هەندێکیان دەڵێن ئەو سەرکەوتۆتە سەرمینبەرو فەرموویەتی: خوای گەورە! من قسە ڕەقم نەرمم بکە، من لاوازم بەهێزم بکە، من ڕووم جوامێرم بکە،[1] دەگێڕنەوە کە یەکەم وتاری ئەوە بووە کە فەرموویەتی: خوای گەورە لە پاش هاوڕێیەکەم منی بە ئێوە و ئێوەشی بە من تاقی کردەوە، سوێند بە خوا شتێکم لەکاروباری ئێوە پێ ناگات کەسێکی تر شانی بە دومدا بینێ، لێم ون نابێت لەبەر ئەوە پەرگاری تێدا بکەن لەسەر ئەهلی کفایە و ئەمانەت، سوێند بە خوا ئەگەر چاکم لەگەڵ بکەن ئەوا چاك دەبم بۆیان، ئەگەر خراپ بوون ئەوا لاڕێیان پێ دەگرم، ئەو کەسەی کە وتارەکەی بینی و لێوەی گێڕایەوە فەرمووی: سوێند بە خوا زیادی نەکرد لەسەر ئەمە تاوەکو دونیای بەجێ هێشت.[2]

دەگێڕنەوە کە عومەر کاتێك کە بۆتە خەلیفە سەرکەوتۆتە سەر مینبەر پەژارە دایگرتووە، کە لە شوێن ئەبوبەکر بوەستێت پاشان فەرموویەتی: ناکرێت کە خوای گەورە بەدیم بکاتکە من خۆم بەدی دەکەم کە کەسێك بم لە کۆڕی ئەبوبەکر، پاشان دابەزیوەتە سەر پلەکان و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردووە و فەرموویەتی: قورئان بخوێنن، کێشانەی خۆتان بکەن پێش ئەوەی بتانکێشن، خۆتان بڕازێننەوە بۆ نمایشی گەورە ڕۆژێك کە دەخرێنە بەردەم خوای و هیچ شتێکی پەنهانتان لێ ناشارێتەوە، مافی هیچ مافدارێك نەکرداوە کە ملکەچی کرابێت لەسەرپێچی کردنی خوادا ئایا من نەفسی خۆم دابەزاندووە لە ماڵی خودا بە شوێنی بەخێوکاری هەتیوێك: ئەگەر دەستم لێ هەڵگرت ئەوا پاکیم نواندووە، ئەگەر لێت بوومەوە ئەوا بە شێوەیەك چاك خواردوومە،[3] دەکرێت کە کۆکردنەوەیەك لە نێو ئەم گێڕانەوانەدا بکەین بەوەی کە عومەر وتارێکی لەبەردەم هەموو ئامادەبواندا داوە و هەندێکیان بەشێکیان لێ لەبەر کردووە و گێڕاویانەتەوە و هەندێکی تریان بەشێکی تریان لێ لەبەر کردووە و باسیان کردووە و نامۆش نیە، کە عومەر لە سەرەتای وتارەکەیدا تێکەڵ بوونێکی لە نێوان ڕوونکردنەوەی سیاسی و کارگێڕی و ئامۆژگاری ئاییندا کردبێت، دیارە ئەمەش پرۆگرامی ئەو پێشەوایە کەمینانەیە کە جیاوازیان بەدی نەکردووە لە نێوان لە خوا ترسان و فەرمان پێکردنیدا و لە نێوان سیاسەی مرۆیی، کە شوێنکەوتەی پەیڕەوی شەریعەتە. هەروەك کە نامۆ نیە لەسەر ئەوەی کە عومەر چاوپۆشی لە مافی ئەبوبەکر ی پێش خۆی بکات و پارێزگاری لەو مافە بکات، ئەو لە شوێنێ دانانیشێت کە ئەبوبەکر تیایدا دانیشتووە چونکە هاوسەنگی دەبێت، بەمەش لە چاوی خەڵکیدا، بۆیە عومەر لێرەدا بە خۆیدا چوویەوە و لە شوێنی ئەبوبەکر(ﷺ) هاتە خوارەوە،[4] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دوو ڕۆژ دوای بە خەلیفەبوونی خەڵکی باسیان لەوە کردووە لە قسەڕەقی و بە سامی

---

١ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ١٧٠-١٧١).

٢ـ الطبقات (٣/٢٧٥).

٣ـ كنز العمال، رقم (٤٤٢١٤) نقلا عن الدولة الاسلامية، د. حمدي شاهين، (ص: ١٢٠).

٤ـ الدولة الاسلامي في عصر الخلفاء الفراشدين، د. حمدي شاهين، (ص: ١٢٠).

عومەر دەترسن، عومەر هەست بەوە دەکات کە پێویستە خۆی بە دەم ئەم کارەوە بچێت، هەر بۆیە دەچێتە سەر مینبەرو وتاریان بۆ دەدات و هەندێك کاروباری ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبەکر(ﷺ)باس دەکات کە چۆن وەفاتیان کردووە و لێی ڕازی بوون،بەڵام بە ڕاستی لە ستەمکاران و تەعەداچیان دەبم، ڕێ نادەم کەسێك ستەم لە کەسێك بکات یان تەعەدای لێ بکات تاوەکو ڕوومەتی دەنێمە سەر زەوی و پێم دەخەمە سەر ڕوومەتی ئەوی تر تاوەکو سەر شۆڕ دەکات بۆ هەق، من پاش ئەم توندیەم ڕوومەتم دادەنێم بۆ ئەهلی داوێن پاك و خاوەن ڕۆزی، ئەی خەڵکینە ئێوە چەند خەسڵەتێکتان لەسەرمە بۆتان باس دەکەم و ئێوەش بەوە بمگرن: لەسەر من پێویستە کە لە خەرجی ئێوە هیچ شتێك کۆ نەکەمەوە، نە لەوەش کە خوای گەورە ئەگەڕاندوویەتیەوە بۆتان جگە لەوەی کە لە پێناوی خۆیدایە، هەروەها ئەوەتان لەسەرمە ئەگەر شتێکم چنگ کەوت بە مافی ڕەوای خۆی نەبێت لە دەستم دەرنەچێت، هەروەها ئەوەتان لەسەرمە کە بەخشش و ڕۆزیتان زۆر بکەم - ان شاء الله تعالى -، کون و کەلەبەرتان دەگرم، ئەوەشتان لەسەرمە کە لە شوێنی لەناوبردنی پێتان نەگەم و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ و دور لە کەس و کارتان لە گۆڕەپانی جەنگدا ڕاتان نەگرم لە دەروازەکانتان، ئەگەر لە نێو شاندەکاندا دیار نەمان ئەوا من بابی منداڵەکانتانم هەتا دەگەڕێنەوە، بەندەکانی خودا لە خوا بترسن، بەدەسەڵاتی ئەو لەسەر من لەسەر خۆتانم دامەزراو بکەن، لەسەر خۆمم دامەزراو بکەن بە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و ئامادەییم بۆ ئامۆژگاری لەوەی کە خوای گەورەم لە کار و فەرمانی ئێوەدا کردومیە بەرپرستان، من ئەم پەیڤانەی خۆم دەڵێم و داوای لێخۆش بوون لە خوادەکەم بۆ خۆم و بۆ ئێوەش،[1] لە ڕوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرموێ: نمونەی عەرب وەك نمونەی لوت وایە، شوێنی سەرکردەی بکەوە، باسەرکردەی شوێنی بکەوێت بەوشێوەیەی کە سەرکردایەتی دەکات، بەڵام من سوێند بە خوای گەورەی کەعبە هەڵیان دەگرم لەسەر ئەم ڕێگەیە.[2]

لەم گێڕانەوانەیەشدا بۆ وتارەکەی عومەر(ﷺ) کاتێ کە خەلافەی گرتۆتە دەست پەیڕەوەکەی لەو حوکمەیدا دەردەکەوێ کە لێی لای نەداوە، دیارترین داستانەکانیشی ئەمانەن:

١- بەشێوەیەك سەیری خەلافەتی کردووە کە ئەمە تاقیکردنەوەیەکە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لەسەر بەجێگەیاندنی ئەرك ومافەکان، حوکم لای خەلیفەکانی ڕاشیدین پێ سپاردن و واجب و تاقی کردنەوەیە نەك وەجاخ و شەرەف و بەرز بونەوە.

٢- ئەم جێنشینکرانە داوای لی دەکات کە پەیوەندی بکات بە هەڵگرتنی بەیداخی دەوڵەت لەوەی کە ئامادەی دەکات لە کار و فەرمانی، چاکترین و چاپوك ترین کەسێك بکاتە بەرپرس بەسەر میللەتەکەیەوە لە کاتێکدا خۆی ئامادە نەبێت جگە لەمەش - عومەر بەدی دەکات- تەنها ئەوەی لا بەس نییە کە ئەستۆی خۆی لە بەردەم خوای گەورەدا بێ بەری بکات، بەڵکو ئەوە بەدی دەکات کە چاودێری کردنی کاربەدەستان و والیەکان فەرزێکە و قوتار بوونی لێ نییە هەر کەس لەوان چاکەیەك

---

١ـ الادارة العسكرية فى عهد الفاروق (ص:١٠٦).

٢ـ السيسة الشرعية. د. اسماعيل بدوي (ص:١٦٠)ز

بکات چاکەی زیاتر دەبێت، هەرکەس خراپەییەك بکات سزای دەدات و سەرزەنشتی دەکات [١]، ڕوون کردنەوەی ئەمەش بە یارمەتی خودا لە کاتی ئاخاوتنمان لە سەر دەزگای ولایەتی و تێگەیشتنی عومەر لە پێشکەوتنیدا بەدی دەکەین.

٣- ئەو توندیەی عومەر کە خەڵکی لێ دوور دەکەوتەوە گۆڕا بە دادپەروەری ، هەرکەس ستەمی بکردایە و هەڵی بکوتایەتە سەر کەسێکی تر جگە لە لاڕێ گرتن و ڕسوابوون هیچی تر نەدەهاتە ڕێگای ( ڕێگە بە کەس نادەم کە ستەم لە کەسێکی تر بکات و هەڵبکوتێتە سەری تا ڕوومەتی دەخەمە سەر زەوی...) بەڵام هەرکەس دوای ئاین و داوێن پاکی بگرێتە بەر چاکترین پاداشتی دەبێت (ڕمەتم دەخەمە سەر زەوی بۆ داوێن پاکان) [٢]، دادپەروەری عومەر(ﷺ) لە بەڕێکردنی کارەکانیدا دەردەکەوێ لە میانی هەڵوێستەکانی بایەخدانی بە دەزگای دادوەری و گەشەسەندنی بە جۆری کە کۆنترۆڵی دادپەروەری کرد بوو لە هەموو لایەنەکانی دەوڵەتدا.

٤- خەلیفە ڕاسپێردراوە بەوەی کە بەرگری لە ئوممەت و ئاینەکەی بکات و دەروازەکانی بگرێت و ئەو مەترسیانە دوور بخاتەوەکە ڕوی لێ دەنێ، نابێت ستەم کردن لە جەنگاوەران بکرێت و لە شوێنێکدا بمێننەوە بۆ ماوەیەکی درێژ، ئەگەر شەهید بوون خەلیفە و والیەکانی منداڵ و خێزانی ئەو سەربازە چاودێری دەکەن، [٣] هەروەها عومەر هەستا بە پێش خستنی دەزگای سەربازی و کردیە هێزێکی لێدەر، کە لەسەر ئاستی جیهان و لەسەردەمی ئەودا بێوێنە نەبوو.

٥- خەلیفە بەڵێنیدا بە بەجێهێنانی مافەکانی دارایی بە تەواوی... لە خەرجی و بەخششدا، دەست بەسەر هیچ داناگرێت و لەشوێنی خۆیدا نەبێ داینانێت ، بەڵکو لە بەخشش ڕزقیان زۆر دەکات بەبەردەوامی لەجیهاد و غەزاکاندا و سوردەبێت لەسەر کارکردن و دارایی دەوڵەت ڕێکدەخات، [٤] هەروەها عومەر هەستا بە بەرەودان بەدەزگای دارایی و ڕێکخستنی سەرچاوەکانی بەیتولماڵ شێوازەکانی بەخشین لە دەوڵەتدا.

٦- لە بەرامبەر ئەمەدا لەگەڵ داوای بەجێهێنانی ئەرك و کاری سەرشانی خۆی دەکات لە ئامۆژگاری بۆ خەلیفەکەی و گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆی و فەرمان کردن بەچاکە و بەرگری کردن لە خراپە و ئەمەش دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی چاودێری ئیسلامی لەنێو کۆمەڵگەدا.

٧- ئاگاداری داوە بەوەی کە هیچ کەسێك لەسەر ئەمەدا دامەزراو نابێت بە لەخواترسان نەبێت لەگەڵ لێپرسینەوەی خود و بانگەشە بۆ مەسئولیەت لە ڕۆژی دوایی دا. [٥]

٨- سەبارەت بەو فەرمودەیەی عومەر(ﷺ): ((نمونەی عەرەب وەك نمونەی حوشترێکی پۆز وایە)) شێخ عبدالوهاب النجار ئەفەرموێت: حوشتری پۆز: حوشترێکی دەستە مۆی مردوە کە پۆز لەسزا و

---

١ـ الدولة الاسلامية فى عصر الخلفاء الراشدين (ص:١٢١).
٢ـ هەمان سەرچاوە.، محض الصواب (ص:١/٣٨٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص:١٢١).
٤ـ الدولة الاسلامية فى عصر الخلفاء الراشدين (ص:١٢٢).
٥ـ هەمان سەرچاوە (ص:١٢٢)

ئازار و لێدان دەدات و، ئەوەی کەلە ڕۆیشتن پێیەتی بەئاسانی دەیبەخشێ، ئەمەش دیاری کردنێکی باش بووە بۆ ئوممەتی ئیسلام لەسەردەمی ئەودا ئەو بیسەرێکی گوێ ڕایەڵ بووە ئەگەر فەرمانی بەسەردا بدرایە بەجێی دەهێنا، ئەگەر ڕێگری لە کارێك بکردایە ڕایدەپەڕاند و ئەمەش شوێن پێی بەپرسیارێتی یەکی گەورە هەڵدەگرێ لەسەر ڕابەرەکەی ، پیویستە کە دار دۆزی بۆ بکات و بە ئەقڵ و ژیری فەرمان دەربکات و بە جێ بێت بۆ جیاکردنەوەی تا نەکەوێتە نێو شەپۆلی مەترسی یەوە و لە تیا چونێکدا تێکی نەشکێنێ و لە کارو بارەکانیدا کەم تەرخەم نەبێت بەجۆری لەدوای خۆی شاگەشکەی بێتە کایەوە، بەم ڕێگەیە ویستویەتی: ڕێگە بەهێزەکە دەستە بەر بکات کە بەهیچ شێوەیەك لاری تیدا نییە و چاکی نواندوە بەوەی کە سوێندی پێ خواردووە.[1]

٩- سوننەتی خوا لە دڵڕەقی و توندو تیژی و نەرمیدا: سوننەتی خوا تێپەڕیوە بەوەی خەڵکی هەمو کۆ دەبن و یەك ڕادەبن لەهەما کاتدا گوێدێرۆ گوێڕایەڵی ئەوانە دەبن نەرم و نیان و لەسەر خۆن، بەهەمان شێوەش هەڵدێن لەدەست ئەوانەی دڵڕەقن و میهرەبانیان لەدڵدا نیە بەرامبەر خەلکی،[2] دیارە ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ﴾ (ال عمران ١٥٩).

لەمەوە بوو کە عومەر کاتێ دەسەلاتی خەلافەتی گرتە دەست فەرموی: خوای گەورە، من دڵڕەقم نەرمم بکە و خوای گەورەش دوعاکەی وەرگرت و ناخی عومەری پڕ کرد لە سۆزو بەزەیی و نەرم و نیانی و ئەمەش بویە یەکێك لەسیفەتەکانی پاش گرتنە دەستی خەلافەت. خەلکی لەسەردەمی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و ئەبوبەکر(ﷺ) عومەریان بەکەسێکی دڵڕەق و دوربین ناسیوە و مێژووش ئەوەی تۆمار کردوە، تاکە کەسێك بووە کە- لەسەرەتای موسوڵمان بونیەوە تا گرتنە دەستی خەلافەت- ڕۆڵی توند و تیژی و بەهێزی گێڕاوە دەوری پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)و ئەبوبکرو دوای ئەوان خوای گەورە ئەم توندو تیژیەی گۆڕیوە بەنەرمی و سانایی و بەزەیی.[3]

١٠- لەژیانی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا بەیعەتی گشتی لە ئەهلی مەدینە و موسڵمانان بەگشتی وەرگیراوە، ڕەنگە عەربە دەشتەکیەکان و ئەو تیرە و هۆزانەش ئامادەی بەستنی بون کە بە دەوری مەدینەوە بوون یان تیای دا نیشتەجێ بوون، بەلام شارەکانی تر پاپەند بوون بەوەی کە لە مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری لەسەردراوە و ئەمەش توانج گرتن نیە لە بەیعەت و لە شەرعیەتی کەم نەکردووەتەوە لەبەر ئەوە کە کۆکردنەوەی موسڵمانان لە تەواوی شوێن و شارەکاندا کارێکی گران بووەو

١ـ الخلفاء الراشدين (ص:١٢٢)
٢ـ السنن الحمية في الامم والجماعات والافراد، زيدان (ص:٢٨٢).
٣ـ الادارة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب (ص:١٠٧).

پێویست بووە، کە دەوڵەت بەم کارە هەڵبستێ، هەرگیز شیاو نیە بەرژەوەندی خەڵکی لەبەر چاو نەگیرێت، پێویستە ئەوەش بوترێ کە سوێندەکانی تر لە بەیعەتێکدا پشتیوانیان لە ئەبوبکر و عمر و عثمان کرد بەوەی لە مەدینە ڕویداوە، بە شێوەیەکی ڕاشکاوی و گومانیشی تێدانی یە کە ئەوشێوازانەی کە خەڵکی پەنایان بۆ بردووە لەسەرەتای ئیسلامدا تەنها کۆمەڵە تاقیکردنەوە و ئەزمونێك بوون کە لە کێڵگەو مەزراوی پێشکەوتنی دەوڵەت و دام و دەزگاکانیدا ئالودە بوون.[١]

١١- ئافرەت و بەیعەت: لە میانی لێکۆڵینەوەکەمدا ئاماژەیەکم بەوە داوە کە ئافرەتان لەسەردەمی ئەبوبکر و عومەر و خەلیفەکانی راشدیندا بەیعەتیان داوە، هیچ کتێبێکی سیاسیش کە کۆن و شەرعی بێت ئاماژەی بە مافی ئافرەتان و ئەرکیان لە بەیعەتدا نەکردووە ـ لەسەر سنوری زانستی بایەخ- ئاشکراو روونە کە لەزۆربەی سەردەمە ئیسلامیەکاندا بەیعەت خراوەتە سەرشانی پیاوان بەبێ ئافرەتان، نە بانگ کراون و نە ئەوانیش داوایان کردووە ئامادەبن و نادیاری ئافرەتانیش لەم کارەدا شتێکی سروشتی بووە بەجۆرێ کەزانایانی مافە دەستوری یە ئیسلامیەکان ئاماژەیان پێ نەکردووە کەم تا زۆر، جگە لەوەش ئەم واقعە مێژووی فیقهیە لە دروستی حوکمی شەرعی هیچی نەگۆڕیوە، چ لە قورئان و چ لە سوننەتی پێغەمبەریشدا کە ئەوان سەرچاوەی سەرەکی شەرعن، ڕێگر نەبوون کە ئافرەت لە بەیعەتدا هاوبەشی پیاوان بن.[٢]

١٢- گەڕاندنەوە ئافرەتە دیل کراوو بە سەبایا کراوەکانی عەرەب : یەکەمین بڕیارێك عومەر لەسەردەمی دەوڵەتەکەیدا ڕایگەیاند گەڕاندنەوەی سەبایای هەڵگەڕاوەکان بوو بۆتیرە و هۆزەکانیان، دەفەرمووێت: پێم ناخۆش بووە سەبایا گرتن لە سوننەتی عەرەب بێت،[٣] ئەمەش هەنگاوێکی بوێرانە بوو کە بەشداری کرد لە هەست و نەستی عەرەب بەگشتی کە ئەوان لەبەردەم شەریعەتی خودادا یەکسانن و ڕێزی هیچ تیرەیەك بەسەر تیرەیەکی تردا نی یە بە چاکی شۆرەتی ،تەنها بەوەی نەبێت کە پێش کەش بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمانانی دەکات، ئەم هەنگاوەش هەنگاوێکی تری بەدوادا هات کە بریتی بوو لە لێخۆش بوون لەو هەڵگەڕاوانەی تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە و بەشداری دەکەن لەو جەنگانەی لەدژی دوژمنانی ئیسلام بەرپا دەکرێت، دیارە ئەوانیش جوامێرییان لە جەنگ و خۆگریان لە ڕوو بەڕوو بونەوەدا نیشانداو وەفایەکیان بۆ دەوڵەتی ئیسلامی هەبوو کە هاوشێوەی نەبوو.[٤]

١٣- پۆستی خەلافەت لەدڵی ئوممەتی ئیسلامدا ڕیشکی داکوتاو بەمەش بویە هێماو نیشانەیەك بۆ یەکێتی و بە هێزی موسڵمانان، لێرەشدا توێژەر توانایەکی نایاسا بەدی دەکات کە یارانی بەڕێز چێژیان لێ وەرگرتووە و مەودای ڕەسەنایەتی لە کارەکانیدا دەر کەوتووە بەجۆرێ کە لە کاتێکی کورتدا

١ـ نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الاسلامى (ص:٢٦٠).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص:١/٢٧٧).
٣ـ الخلافة الخلفاء الراشدين (ص:١٦٠).
٤ـ جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين، د. محمد سيد الوكيل (ص:٨٩).

هەمان ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)دا پێی هەستان کە ڕوخانی پێویستی بەیەك چارەکە سەدە بوو لە نەخشە و پلانی بەریتانی، سەرباری ئەوەی کە بەریتانیەکان خودی خۆیان لەو ماوەیەدا بە خەلیفەیان دەگووت پیاوە پیرەکە، ئەمە چ بڵندی و شکۆداری یەکە بۆ ئەو خەلافەتە، چ تۆکمەییی یەکە بە جۆرێ کە پێویستی بە ڕوخاندنیەتی، پاش ئەوەی کە خەلافەت بویە شێوە یەکی نابابەتی- یەك چارەکە سەدەی تەواو، پاش ژیانێك کە چەندین سەدە بەردەوام بوو.[1]

١٤- جیاوازی نێوان میر و خەلیفە: عومەر(ﷺ) دەفەرموویێت: سوێند بە خوا نازانم خەلیفەم یامیرم، ئەمە شتێکی گەورەیە، لەم کاتەدا یەکێك پێی ووت: لە نێوانیاندا جیاوازی هەیە، خەلیفە هەرچی مافی خۆی نەبێت وەری ناگرێت، پەنجە لەسەر هەق نەبێت دانانێ، تۆش سوپاس بۆ خودا بەو جۆرەی بەڵام میر ستەم لە خەڵکی دەکات لەم دەبات و لەو دەبەخشێ، عومەر بێدەنگ بوو،[2]، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر(ﷺ) لە سەلمانی فارسی پرسی: من میرم یان خەلیفە؟ سەلمان فەرموی ئەگەر تۆ درهەمێك یان زیاترت لە زەوی هەڵگرت و لە شوێنەکەی خۆیت دانەنایەوە ئەوا تۆ میری نەك خەلیفە، عومەر لەمە پەندی وەرگرت.[3]

## پێنجەم: ڕاوێژ

یەکێك لە ڕێساکانی دەوڵەتی ئیسلامی پێویست ڕاوێژکاری سەران و فەرمانڕەوایانی دەوڵەتە لەگەڵ موسڵمانان و ڕازی بوونە بە ڕەزامەندی ڕای ئەوان و درێژەدانە بە یاسا و دەستوور بە شێوەی ڕاوێژ، خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (ال عمران: ١٥٩).

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ (الشورى: ٣٨).

ئەم ئایەتە پیرۆزە کاروباری ڕاوێژی نێوان موسڵمانانی لە بەجێهێنانی فەرزی نوێژ نزیك کردۆتەوە و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حوکمی ڕاوێژ وەك حوکمی نوێژ وایە و حوکمی نوێژیش واجبێکی شەرعیە و بە هەمان شێوەش شورا واجبێکی شەرعیە.[4]

---

١ـ الحضارة الاسلامية، د. محمد عادل (ص:٣٠).
٢ـ الشيخان ابوبكر الصديق وعمر بن الخطاب من رواية البلاذري (ص:٢٧٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە (ص:٢٥٦).
٤ـ النظام السياسي في الاسلام لأبي فارس (ص: ٩).

عومەر(رضي الله عنه) ڕاوێژی لەدەوڵەتەکەیدا کردبوویە بنەمایەك، بەبێ موسڵمانان هیچ کار و فەرمانێکی نەدەخرۆشان و لە هیچ کاروبارێکی گشتیدا دەست پێشخەری نەدەکردە سەریان، ئەگەر کارێکی بۆ بهاتایە پێشێ ڕای لەسەر دەرنەدەکرد تاوەکو موسڵمانانی کۆدەکردەوە و تاوتوێی ڕاوبۆچوونی لەگەڵ دەکردن و ڕاوێژی پێ دەکردن.

لەعومەرەوە گێڕدراوەتەوە فەرموویەتی: چاکەم لە کارێکدا نەبینیوە کە بەبێ ڕاوێژ بەڕێم کردبێت،[١] هەروەها فەرموویەتی: ڕاوبۆچوونی تاکە کەس وەك پەتی لوس وایە، دوو ڕاوبۆچوونیش وەك دوو پەتی بادراو وایە و سیانی ش هیچ کاتێك ناپسێت ،[٢] هەروەها فەرموویەتی: لە کارو فەرمانی خۆت ڕاوێژ بکەبە کەسێك کە لە خوا دەترسێت،[٣] وە فەرموویەتی: پیاوان سێ جۆرن: پیاوێك کارگەلێك ڕووی لێ دەنێت بەڕای خۆی بەڕێی دەکات، پیاوێك ڕاوێژ دەکات لەسەر شتێك کە لەسەری دەبێتە گرفت، وەك خاوەن ڕایان ڕووی فەرمانی پێ دەکەن، پیاوێك سەرسام و بیرقووڵ، نە فەرمان بە بیرکردنەوە دەکات نە لە ڕابەریش دادەبڕێت،[٤] هەروەها فەرموویەتی: پێویستە لەسەر موسڵمانان کە کار و فەرمانیان بە ڕاوێژ ڕاپەڕێنن لەنێوان خۆیان و خاوەن ڕاوبۆچوونەکانیاندا بێت، خەڵکی شوێن کەوتووی کەسێکن کە هەستاوە بەم کارە، ئەوەی لەسەری کۆبوونەتەوە پێی قایل بوون خەڵکی پابەند بووە پێوەی و ئەوان تیایدا شوێن کەوتەین، هەرکەس بەم کارە هەستاوە شوێنکەوتەی یەکەمین ڕای خۆیانە و ئەوەی کە دیویانە پێی قایل بوون و لە فرت و فێڵی جەنگ کە ئەوان پێشتر شوێنکەوتە بوون،[٥] عومەر هانی سەرکردەکانی سوپای دەدا کە کار بە ڕاوێژ بکەن ، کاتێك ئەبو عوبەیدەی سەقەفی نارد بۆ بەرەنگاربوونەوەی فارسەکان لە عێراق پێی فەرموو: گوێڕایەڵ و ملکەچی یارانی پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم)ببەو بەشداریان بکە لە کاروبارەکان، بە تایبەت ئەوانەیان، کە ئەهلی بەدرن،[٦] هەروەها پەیامی دەنووسی بۆ سەرکردەکانی لە عێراق فەرمانی پێ دەدان، کە لە کاروباری سەربازیاندا بە عەمری کوڕی مەعدیکرب و (طلحة الاسدي)و دەفەرمووێت: لە جەنگ و جەنگەکاندا ڕاوێژ بە (طلحة الاسدي) و عەمری کوڕی مەعدیکرب بکەن و هیچ شتێکیان لە کاروبارەکان مەگرنە ئەستۆیان چونکە بە ڕاستی هەموو دروستکارو کارسازێك شارەزایە بەرامبەر بە پێویستیەکانی خۆی،[٧] هەروەها نامەیەکی ئاراستەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص کرد و تیایدا نووسی: با لە عەرەبەکان ئەو کەسانەیانت لەخەڵکی ئەو ناوچانە لا بێت کە دڵنیای لە ئامۆژگاری و ڕاستگۆییان، چونکە درۆزنەکان

---

١ـ الخلفاء الراشدون، للنجار (ص: ٢٤٦).
٢ـ سراج الملوك للطرطوشي، (ص: ١٣٢).
٣ـ الإدارة الاعسكرية في الدولة الاسلامية، سليمان آل كمال، (٢٧٣/١).
٤ـ هەمان سەرچاوە، (٢٧٣/١).
٥ـ الطبري (٤٨١/٣)، نقلا عن إدارة العسكرية.
٦ـ مروج الذهب، (٣١٥/٢).
٧ـ سير اعلام النبلاء، (٣١٧/١).

سوودت پێ ناگەیەنن ئەگەرچی هەندێك لە هەواڵەکانیان ڕاست بێت، تەڵەکەبازیش چاوی لە سەرتە نەك بۆت ببێتە چاو.[١]

هەروەها عومەر(ﷺ) بە عوتبەی کوڕی غەزوانی فەرموو کاتێك بەرەو بەسرە بەڕێکەوت: من بۆ عەلائی کوڕی ئەلحەزرەمیم[٢] نووسیووە کە عەرجەفەی کوڕی هرشەمە بنێرێ بۆ یارمەتیت[٣] کە خاوەنی تێکۆشانە دژی دوژمن ،ئەگەر هاتە لات ڕاوێژی پێ بکە،[٤] ڕێڕەوی عومەر(ﷺ) لە کاری ڕاوێژدا زۆر زیرەکانەو لێزانانە بووە هەر لە سەرەتای کارەکەیدا ڕاوێژی بە هەمووان کرد و گوێی بۆ گرتن پاشان گەورە یاران و خاوەن ڕا و بۆچوونەکانی لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) کۆکردەوە و کارەکەی لا وروژاندن و پرسیاری لێ کردن کە دڵسۆزی لەگەڵ بنوێنن بۆ ڕای ڕاست و دروست هەر کە ئەوان لەسەر ڕایەك کۆبوونایە دانی پێدادەنا، ئەم کارەشی هاوشێوەی کاری ئەو ڕێکخراوە دەستووریانە بووە کە لە زۆرێك لە مێرنشینە یاساییەکاندا هەیە، ئەگەر کارێك خرایە بەر دەست ئەنجوومەنی نوێنەران ، پاشان بەزۆرینەی دەنگ ڕەزامەندی لەسەر نیشان بدرێت ئەوا هەمان بڕیار دەخرێتە بەردەم ئەنجومەنی پیران و لە هەندی دەوڵەتیشدا ئەنجومەنی لۆردات، ئەگەر ئەنجومەن لە ڕاپۆرتەکەی بوویەوە ئەوا مێر واژووی دەکات، جیاوازیش لە نێوان کاری و عومەر و کاری ئەم میرانەدا ئەوەیە کە کارەکە لێرەدا هەوڵێك بووە لە خۆیەوە بەبێ هیچ یاسایەکی شوێنکەوتە یان ڕێسایەکی بە سونەتکراو،[٥] زۆرجار عومەر کۆشش دەکات لە شتێك و ڕاوبۆچوونی خۆیی تێدا نیشان دەدا و پاشان دەهاتە لای خەڵکانی تر ڕووی ڕاست و بەهێزی بەڵگەیان بۆ ڕوون دەکردەوە دواتریش عومەر ئەمەی پەسەند دەکرد و پاشگەز دەبوویەوە لە هەڵەیەك کە ڕاستی تێدا بەدی دەکرد و بۆی ڕوون دەبوویەوە.[٦]

چوارچێوەی ڕاوێژ لە سەردەمی خەلافەتی عومەر(ﷺ)دا بەرفراوان بوو بۆ زۆرێك لە نوێگەریی و ڕووداوەکان و درێژ بوونەوەی پانتاییەکانی زەویەکانی ئیسلام بۆ وڵاتانی خاوەن شارستانیەت و کەلەپوور و نەزمی بەرچاو و دیار، چەندێن گرفتی نوێ سەریان هەڵدا و پێویستیان بە ئیجتیهادێکی فراوانتر هەبوو وەك: مامەڵەی زەوی ڕزگارکراو و ڕێکخستنی خەلافەت بەپێی ڕێسا نوێیەکان تاوەکو دەسکەوتە جەنگیەکان بەسەر دەوڵەتەکەدا دابەش بکرێت، عومەر بۆ دەستەی ڕاوێژ گەورەترین ژمارەی گەورەیارانی کۆکردبوویەوە[٧] و پیرانی بەدر شوێنی تایبەتیان هەبوو لە نێو ئەم دەستەیەدا بە هۆی کارزانی و شارەزایی و ڕابردووی زێڕینیان، جگە لەوەش عومەر(ﷺ) چەند لاوێکی دەهێنانە بەرچاو لەبەر ئەوەی کە ئەوان لەسەر ڕێگەی خۆیانن و لە پێناوی ئەوان و ڕەحمەت و لێبووردەیی خودایان مابوونەوە وە دەوڵەتیش پێویستی بە نوێکردنەوەی پیاوانی هەیە، عومەر زۆر بلیمەت بووە

١ـ نهاية الارب (٦/١٦٩).
٢ـ الإدارة الاعسكرية في الدولة الاسلامية، سليمان آل كمال، (١/٢٧٤).
٣ـ الاصابة (٢/٤٩١).
٤ـ الإدارة الاعسكرية في الدولة الاسلامية، سليمان آل كمال، (١/٢٧٥).
٥ـ الخلفاء الراشدون للنجار، (ص: ٢٤٦).
٦ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٤٧).
٧ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٩٠).

زۆر هەستیارانە هەنگاوی بەرەو ئەم ڕاستیانە ناوە و لە نێو لاوانی ئومەتی ئیسلامیدا ئەوانەیانی دەست نیشان کردوە، کە فێری زانیاری و زانست و ئاشتیخوازی و پاراستن بوون، عبداللە کوڕی عەباس لە پێش هەموویانەوە بووە، عومەر بەردەوام هەوڵی داوە کە سەر پشك بێت لە هەڵبژاردنی ئەو لایەنەی کە خوێنەری قورئان بوون بۆ کاری ڕاوێژ و ئەوانیش کۆمەڵێك بوون، تاوەکو عبداللە کوڕی عەباس دەفەرمووێت: خوێنەرانی قورئان یارانی کۆڕی عومەر و ڕاوێژکارانی بوون ئەگەرچی بە ساڵاچوو یان لاوان بووبن،[١] زەهری بە چەند لاوێکی تازەپێگەیشتووی فەرمووە: خۆتان بە کەم مەزانن بەهۆی کەم تەمەنی و لاویتانەوە، عومەر(ﷺ) ئەگەر گرفتێك ڕووی تێ بکردایە لاوانی بانگ دەکرد و ڕاوێژی پێ دەکردن رای لێوەر دەگرتن،[٢] محمد کوڕی سیرین دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) ڕاوێژی لە هەر کارێکدا دەکرد، تەنانەت ئەگەر بە ئافرەتێکیش بووایە بەڵکو ئەو ئافرەتە بەرچاو ڕۆشن بووایە و لە قسەکانیدا شتێکی بە کەڵکی بدرکاندایە و ئەو کاتە عومەر لێی وەردەگرت، گێڕدراوەتەوە جارێك ڕاوێژ بە حەفصە (خوای لێ ڕازی بێت) ی دایکی باوەڕداران دەکات،[٣] هەروەها عومەر دەستێیەکی ڕاوێژی هەبوو کەێکهاتبو لگەورە هاوەڵانی وەك عەباسی کوڕی عبدالمطلب و عبداللە ی کوڕی، هەرگیز نە لە سەفەر و نە لە شوێنی خۆیشیدا لێی نەدەبڕا، هەروەها عوسمانی کوڕی عەفان و عبدالرحمن کوڕی عەوف و عەلی کوڕی ئەبو تالیب[٤] و مەعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت[٥] و هاوشێوەکانیان لەوانە بوون کە عومەر ڕاوێژی پێ دەکردن و بۆچوونەکانی بە هەند وەردەگرتن.[٦]

هەروەها ڕاوێژکاران بۆچوونەکانی خۆیان بە ئازادی و ڕاشکاویەکی تەواوەوە دەردەبڕی عومەر(ﷺ)یش هیچ کامیانی تۆمەتبار نەدەکرد لە دادپەروەری و ئەمانەت پارێزیدا، عومەر(ﷺ) ڕاوێژی لەو کارانە دەکرد کە دەقی قورئان و فەرموودەی پیرۆزی لەسەر نەبوو و ئامانجی لەمەش ئەوە بوو کە بەڵکو یەکێك لە یاران فەرموودەیەکی لەو بارەیەوە لەبەر بێت، چونکە هەندێك لە یاران چەند دەقێکیان لەبەر بوو کە ئەوانی تر لەبەریان نەبووە هەروەها ڕاوێژی دەکرد سەبارەت بەو دەقانەی زیاتر لە یەك مانا و واتایان هەبوو بۆ زانینی ماناو ڕوانگە جیاوازەکان، لەم دوو کارەدا تێڕادەما بە یەك ڕاوێژ یان ژمارەیەکی کەم، بەڵام لە دانیشتنە گشتیەکاندا یارانی کۆدەکردەوە ڕووبەری بەرفراوان دەکرد بەو پێیەی کە دەیتوانی هەروەك لە کاتی ڕووداوی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تاعوونەکەدا ئەنجامی دا و ڕووی لێنا،[٧] عومەر هەواڵەکەی پێگەیشت لە کاتێدا لە سەرغ بوو ـ ناوچەیەکی نزیك شامە ـ عومەر ژمارەیەك لە موهاجیر و ئەنصارەکانیشی لەگەڵدا بوو کۆیکردنەوە تا ڕاوێژیان پێ بکات کە

١ـ هەمان سەرچاوە (ص: ١٤٧).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٩٠).
٣ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٩٠).
٤ـ السنن الکبری للبیهقي (٢٩/٩)، نقلا عن عصر الخلافة الراشدة (ص: ٩٠).
٥ـ الخلفاء الراشدون للنجار، (ص: ٢٤٧).
٦ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٩٠).
٧ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٩١).

بڕواتە نێو ئەو شارەوە یا بگەڕێتەوە؟ ئەوانیش چەند وەڵامێکیان هەبوو، هەندێکیان دەیان وت: تۆ لە پێناوی خوادا دەرچوویت و ئەمەش ڕێگریت لێ ناکات و هەندێکی ترش دەیان وت: ئەمە بەڵا و فەوتێنەرە ئێمە پێمان باش نیە کە بڕۆیتە نێو ئەو شارەوە پاشان عومەر هاتە لای ژمارەیەك لە کۆچەریەکانی فەتح لە قوڕەیش بەڵام ئەمان لە وەڵامدا یەك دەنگ بوون و ئاماژەیا بە گەڕانەوە کرد، پاشان عومەر لە نێو خەڵکەکەدا هاواری کرد کە من سپێدە لەسەر پشتی وڵاخەکەم دەکەمەوە، ئەبو عوبەیدە فەرمووی: ئایا لە دەست قەدەری خوا هەڵدێی؟ عومەر فەرمووی: بەڵێ لە قەدەری خوا هەڵدێین بۆ قەدەری خوا، سەیر بکە ئەگەر تۆ حوشترێکت هەبێت و لە شیوێك بێتە خوارەوە و دوو نەیاری هەبێت یەك بە پیت و ئەوەی تریان بێ فەڕ، ئایا حوشترەکەت ئەگەر لە لای بە پیتەکەیان پەروەردە بکەیت ئەمە قەدەری خوا نیە؟ یان ئەگەر حوشترکەت لای بێ فەڕەکەیان بەخێو بکەیت ئەمەشیان قەدەری خوا نیە؟ لەم کاتەدا عبدالرحمن کوڕی عەوف گوێی لەم قسانە بوو هات بۆ لای و فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرموویت: ((ئەگەر هەواڵی ئەم پەتایەتان لە وڵاتێك بیست مەچنە ناوی، ئەگەر ئەم پەتایە کەوتە وڵاتتانەوە لێی دەرمەچن)).[1]

سەرەڕای ئەمانە بوارەکانی ڕاوێژ لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا زۆر بوون، لەوانە لە بواری کارگێڕی و سیاسی وەك هەڵبژاردنی کاربەدەست و ئەمیرەکان و کاروباری سەربازی و لەوانەش لە بواری شەرعیلە ڕووی حەڵاڵ و حەرام و مەسەلە قەزاییەکانەوە ،[2] بوارەکانی ڕاوێژ و چەسپاندنەکانی و توێژینەوەی عومەر(ﷺ) لەسەر بەهێزترین بەڵگە لە میانی ئەم لێکۆڵینەوەیەداو هەر یەکەیان لە شوێنی خۆی ڕوون دەکەینەوە — بە یارمەتی خوا —ئەوەی کە پێمان خۆشە جەختی لەسەر بکەینەوە ئەوەیە کە خەلیفەکانی ڕاشیدین لەسەر بنەمای ڕاوێژێك وەستاوە کە پەیوەست بووە بە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)و لە سەردەمی عومەریشدا شورا ڕەسمێکە نەبووە کە لەسەر دیوارێك کێشا بێتی یان داهێنانێك بێت کە ئەو هێنابێتی، بەڵکو ڕێسایەك بووە لە ڕێساکانی پەیڕەوی خوای گەورە.

## شەشەم: دادپەروەری و یەکسانی:

یەکێك لە ئامانجەکانی حوکمی ئیسلامی جەختکردنەوەیە لەسەر بەرز ڕاگرتنی یاساکانی ڕژێمی ئیسلامی،کە هاوکارە لەپێکهێنانی کۆمەڵگەی موسڵماندا، لەگرنگترین ئەم ڕێسایانەش دادپەروەری و یەکسانیە، لە وتاری عومەر بۆ ئومەتی ئیسلامی جەخت لەسەر ئەم بنەمایانە کراوە، دادپەروەری و یەکسانی عومەر لە دەقی ئەو وتارەیدا دەردەکەوێت کە ڕۆژی گرتنە دەستی خەلافەت ئاراستەی ئومەتی ئیسلامی کرد، گومانیشی تێدا نیە دادپەروەری لە بیری عومەردا بریتیە لە دادپەروەری ئیسلامی کە ئەو تاکە هاوکاری سەرەکیە لە بنیاتنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و حوکمی ئیسلامی، هەر کۆمەڵگەیەك کە جەور و ستەم باڵی ڕەشی بەسەردا بگرێت و دادپەروەری تێدا بەرپا نەبێت ئیسلام تیایدا جێی نابێتەوە.

---

١ـ مسلم، كتاب السلام (٤/١٧٤٠)، رقم (٢٢١٩).

٢ـ القيود الواردة على السلطة الدولة في الاسلام، (ص: ١٦٧-١٦٨).

بەرزڕاگرتنی دادپەروەری لە نێوان خەڵکیدا چ تاك و چ کۆ و چ دەوڵەتیش لـەو کـارە خۆبەخشیانە نیە کە بوارێك بۆ میزاجی فەرمانڕەوا و ئارەزووی سـەرکردەکان بـەجێ بهێڵێـت، بـەڵکو بـەرزڕاگرتنی دادپەروەری لە نێوان خەڵکی لە ئاینی ئیسلامدا بە پیرۆزترین و گرنگترین ئەرکەکان هەژمار دەکرێت و ئومەتیش کۆکن لەسەر پێویست بوونی ،[1] فەخری ڕازی دەفەرموویت: ئەوان کۆك بوون لەسەر ئـەوەی هەر کەس بوویە حاکم لەسەری پێویستە دادپەروەرانە کار بکات.[2]

ئەم فەرمانڕەواییەش دەقە قورئانی و فەرموودەکان پشتیوانی لێ دەکەن، لە ئامانجەکانی دەوڵەتی ئیسلامیش بەرزڕاگرتنی ئەو کۆمەڵگە ئیسلامیەیە کە دادپەروەری و یەکسانی باڵی پڕ میهری خۆی بەسەردا دەکێشێت و جەور و ستەم بنەبڕ دەکات و بە هەموو شێوەیەك بەرهەڵستی دەکات و بوار دەکاتەوە و کارئاسانی دەکات لەبەردەم هەموو مرۆڤێك کە داوای مافی خۆی بکات و بە ئاسانی پێی بگات بە کورتترین و خێراترین ڕێگا بێ ئەوەی پێویست بە هەوڵێك، یان سەرمایەیەك هەبێت هەروەها پێویستە بەرهەڵستی هەموو ئەو هۆکارانەش بکات، کە دەبنە کۆسپ لە بەردمە خاوەنی هەقدا کە بگات بە مافی خۆی، ئەوەش ئەمە بوو، کە عومەر لە دەوڵەتەکەیدا بە ئامانجی گەیاند، دەرگای لەسەر گرفتەکان واڵا دەکرد تاوەکو هەمووان بە مافی خۆیان بگەن، خۆی خەڵکی بەسەر دەکردەوە و دەیپاراستن لەو ستەمەی کە چاوەڕوانی لێ دەکرد و دادپەروەری لە نێوان کاربەدەستان و خەڵکیدا بەرزڕاگرت لە جوانترین تابلۆدا کە مێژوو ناسی، عومەر دادپەروەری لە نێوان دوو بەرامبەردا بەکاردەهێنا و حوکمی بە ڕەوا دەکرد، هیچ گوێی بەوە نەدەدا کە ئەوانەی حوکم دەدرێت بە سەریاندا دۆست و کەس و کار یان دوژمن و نەیار بن، یان دەوڵەمەند یان هەژار بن خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (المائدة: ٨).

عومـەر(ﷺ) پێـشەنگ بـووە لـە دادپەروەریەکەیـدا بـە جۆرێـك دڵـەکانی بەختـەوەر کـردووە و ئەقڵەکانی پێشخستوون، لە ڕوانگـەی عومـەر(ﷺ)دا دادپـەروەری بانگەشـەیەکی کردەیـی بـووە بـۆ ئیسلام بە هۆیەوە دڵی خەڵکی ئاوەڵا بووە بۆ ئیمان، و بۆ ئەم کـارە لەسـەر پـەیڕەوی پێغەمبـەر(ﷺ) بەڕێوە چووە و سیاسەتی ئەو لەسەر دادپەروەریەکی گشتگیر پیادە بووە و لەمەشدا سەرکەوتووە لەسەر واقع و چەسپاندن بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ، بەجۆرێك ناوی لە دادپـەروەری نزیـك بۆتـەوە و زۆر ئەستەم بووە کە یەکێك شتێکی لە ژیانی زانیبێت بە ئاسانی تـوانیبێتی لێکیـان جیـا بکاتـەوە دیـارە ئەمەش کە هاوکاری عومەر(ﷺ)ی کردووە، کە سەرکوتوو بێت لەم بوارەدا کۆمەڵـە هۆکارێـك بـوون

---

١ـ فقه التمكين في القرآن الكريم، للصلابي، (ص: ٤٥٥).
٢ـ تفسير الرازي، (١٤١/١٠).

لەوانە:

١- ماوەی خەلافەتی عومەر درێژتر بووە لە خەلافەتی ئەبوبەکر بە جۆرێك کە دە ساڵی تێپەڕاند،لە کاتێکدا خەلافەتی ئەبوبەکر تەنها دوو ساڵ و چەند مانگێك بوو.

٢- زۆر بە توندی پابەند بووە بە هەقەوە و تەنانەت لەسەر کەس وکاری توندتر بووە لە خەڵکی هەروەك ئەوەی بەدی دەکەین.

٣- ئەو هەقەی هاتووە لە لایەن خوداوە زۆر بەرزتر بوو لە لای بە جۆرێك هەر کارێکی کە ئەنجام دەدا ڕەزامەندی خوای لە پێش ڕەزامەندی خەڵکی مەبەست بووە، لە خوا ترساوە و لە هیچ کەسێکی تر نەترساوە.

٤- شیاوی شەرع هێندە لە ناخی یاران و تابعیندا بەهێز بووە بە جۆرێك عومەر لە کارەکانیدا پشیوانی و هاوکاری و بە دەمەوەچوونی لە هەمووانەوە پێ گەیشتووە.[1]

٥- ئەمەش هەندێ هەڵوێستی عومەرە لە بەرزڕاگرتنیدا بۆ دادپەروەری و بە دادبوون لە نێو خەڵکی: بە ڕەوا حوکمی پیاوێکی جولەکەی داوە بەسەر موسڵمانێکدا و بێباوەڕی جوولەکەکە لەسەر ستەم و زۆر بێدادی نەبوونەتە بار بە سەریەوە، مالك[2] لە ڕێگەی سەعیدی کوڕی موسەییبەوە هێناویەتی: عومەر(ﷺ) موسڵمانێك و جوولەکەیەك سکاڵایان هێنایە لای، جوولەکەکەش وتی سوێند بە خوا کارێکی ڕەوات کرد،[3] عومەر داوای لە کاربەدەستانی دەکرد کە لەگەڵ خەرمانچیان سەردانی بکەن، کاتێك کە کۆدەبوونەوە دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە من کاربەدەستانم نەناردۆتە سەر ئێوە تاوەکو لە نوقڵانە و ماڵ و داراییتان ببەن بەڵکو ناردوونم تاوەکو لە نێوانتاندا دادوەر ن و دەستکوتە جەنگیەکان دابەش بکەن لە نێوانتاندا ، هەرکامیان پێچەوانە جوڵاوەتەوە سزا دەدەین، پیاوێك هەستایەوەو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران کاربەدەستەکەت سەد قامچی لێداوم، عومەر فەرمووی: لەسەر چی لێداوە؟ هەستە تۆڵەی لێ بکەرەوە، لەم کاتەدا عەمری کوڕی عاص هەستایە سەرپێ و فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر تۆ ئەمە بکەیت زۆر بە سەرتدا دەشکێتەوە و ئەوانەی دوای تۆش کاری پێ دەکەن، عومەر فەرمووی: من تۆڵە ناکەمەوە، ئایا تۆ پێغەمبەرت(ﷺ)بینیوە کە لە خۆیەوە تۆڵەی سەندبێتەوە؟! عبدالرحمن فەرمووی: لێمان گەڕێ با قایلی بکەین، عومەر فەرمووی: لەگەڵ خۆتان قایلی بکەن، بۆیە بە دووسەد دینار لێی دوور کەوتەوە، واتا هەر قامچیەك بە دوو دینار[4]، ئەگەر قایلیان نەکردایە عومەر(ﷺ) تۆڵەی خۆی لێ دەسەندەوە.

پیاوێك لە میسرەوە هات سکاڵای لە کوڕی عەمری کوڕی عاص کرد و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران پەنات پێ دەگرم لە جەور و ستەم، عومەر فەرمووی: پەنات پێ گرت، پیاوەکە وتی:

---

١ـ نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين، حمد محمد عبدالصمد، (ص: ١٥٤).
٢ـ الوسيط في القرآن الكريم للصلابي، (ص: ٩٦).
٣ـ الموطأ، كتاب الاقضية، باب الترغيب في القضاء بالحق، رقم (٢).
٤ـ الطبقات الكبرى لإبن سعد، (٣/٢٩٣-٢٩٤).

پێشبڕکێم کرد لەگەڵ کوڕی عەمری کوڕی عاص و پێشیم دایەوە لەبەر ئەوە لێیدام و بە قامچی و وتی من کوڕی ڕێزلێنراوانم، لەم کاتەدا عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ عەمری کوڕ عاص نووسی و تیایدا فەرمانی پێکرد کە بە خۆی و کوڕەکەیەوە بگاتە لای، پاشان عەمر هاتە پێشەوە و عومەر فەرمووی: کوا پیاوە میسریەکە؟ قامچیەکە بگرە و بیوەشێنە، ئەو قامچی دەوەشاند و عومەر دەیفەرموو: لە کوڕی ڕێزلێنراوان دەدەی؟ ئەنەس دەفەرمووێت: سوێند بە خوا ئەو لێیدەدا و ئێمەش لێدانەکەیمان پێ خۆش بوو، لێی نەگەرا و دەستی لە لێدانەکەی هەڵنەگرت تاوەکو خوازیار بووین کە دەستی لێ هەڵبگرێت، پاشان عومەر بە میسریەکەی فەرموو: لەسەر ڕووتانەوەی عەمر کاربکە، پیاوەکەش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! بەڵام کوڕەکەی لێیداوم و لێی خۆش بووم، دواتر عومەر(ﷺ) بە عەمری فەرموو: لە کەیەوە خەڵکیتان کردۆتە بەندە و کۆیلەی خۆتان لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایك بوون؟ عەمریش فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من ئەمەم نەزانیووە و نەهاتۆتە لاشم.[١]

بەڕاستی دەوڵەتی خەلیفەکانی ڕاشیدین لەسەر بنەمای دادپەروەری دامەزرا بوو، ئیبن تەیمیە دەفەرمووێت: خوای گەورە دەوڵەتی دادپەروەر سەرکەوتوو دەکات ئەگەرچی بێباوەڕیش بێت، دەوڵەتی ستەمکاریش دەرمێنێ ئەگەرچی موسڵمانیش بێت، هەر بە دادپەروەری پیاوان چاکساز و دارایی و سامانەکانیش پتەوتر دەبن.[٢]

بەڵام ئەو بنەما یەکسانیەی کە عومەر لە دەوڵەتەکەیدا پشتی پێ بەستبوو بە یەکێك لەو بنەما گشتیانە دەهاتە هەژمار کە ئیسلام دانی پێدانابوو، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾ (الحجرات: ١٣).

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە خەڵکی یەکسانن فەرمانڕەوا و فەرمان بەسەردادراو، عەرەب و عەجەم، ڕەش و سپی، ئیسلام جیاوازی نێوان خەڵکانی بە هۆی ڕەگەز و ڕەنگ و ڕەچەڵەك و چینایەتیەوە هەڵوەشاندەوە و فەرمانڕەوا و فەرمان بەسەردادراوانیش لە ڕوانگەی شەرعەوە یەکسانن،[٣] بە دواداچوونی عومەریش بۆ ئەم بنەمایە باشترین شایەتە و ئەمەش ژمارەیەك لەو بنەمایانەیە کە یەکسانی لە دەوڵەتەکەیدا بەرجەستە کردووە:

* لە سەردەمی خەلافەتی عومەر(ﷺ) خەڵکی لە شاری مەدینە و دەوروبەری دووچاری وشکە ساڵی بوون، خاك و خۆڵ و زەوی ڕەنگی خۆڵەمێشیان گرت،[٤] لەبەر ئەوە ئەو ساڵە بە ساڵی خۆڵەمێشی یان سووتەك ناسرا، عومەر پەیمانی دا کە تام و چێژی ڕۆن و شیرەمەنی و گۆشت نەکات

---

١ـ وسطية أهل السنة بين الفرق، محمد باكريم (ص: ١٧٠).
٢ـ السياسة الشرعية، (ص: ١٠).
٣ـ فقه التمكين في القرآن الكريم، (ص: ٥٠١).
٤ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

تاوەکو خەڵکی وەك جاری جاران دەژین، ڕۆژێك کەشکەڵەیەك لە ڕۆن و کوندەیەك سیر هاتە بازاڕ و لاوێك کە لای عومەر دەژیا کڕی بە چل درهەم و هات بۆ لای عومەر و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! خوای گەورە سوێندەکەتی بەجێ هێنا و پاداشتی بە گەورە لێ وەرگرتی، ئەمڕۆ مەشکەیەك سیر و کەشکەیەك ڕۆن هاتە بازاڕ و بۆمان کڕیت بە چل درهەم، عومەر فەرمووی: گرانت کردووە، بڕۆ بیان بەخشەوە من پێم ناخۆشە زۆرخۆری بکەم ،هەروەها عومەر فەرمووی: چۆن وەك ژێردەستەکانم دەژیم ، ئەگەر دەست لە شتێك بدەم کە ئەوان دەستیان پێی ناگات،[1] ئەمە هەڵوێستی ئەمیری باوەڕدارانە لە ساڵی نەهامەتی کە بە ساڵی برسێتی ناسراوە، ساڵی گرانیش عومەر هەڵوێستی نەگۆڕا، خەڵکی دووچاری گرانی هاتن، ڕۆن گران بوو ئەو کاتە عومەر دەستی کردە خواردنی زەیت و بەمەش ورگی عومەریش دەستی کردە بۆڕاندن و عومەریش دەیفەرموو: بقۆڕێنە تاوەکو دەتوانی سوێند بە خوا ڕۆن ناخۆیت تاوەکو خەڵکیش ڕۆن نەخۆن.[2]

پەیڕەوی یەکسانی لای خەلیفەکانی سەردەمی یەکەم لەسەر مامەڵەی تاك بۆ تەواوی خەڵکی بوە، بەڵکو سنووری لادانەکەی بۆ کاروباری کۆمەڵگەیەکی تایبەت بووە بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندی بەخزمەتکار و خزمەتکراوەوە بووە، ئیبن عەباس دەفەرموێت: عومەر هات بۆ پێویستیەکی خۆی و سەفوانی کوڕی ئومەیە خواردنێکی بۆ دروستکرد و خواردنەکەش لە مەنجەڵێکی گەورەدا هێنا کە چوار پیاو هەڵیانگرتبوو ئەم خواردنە خرایە بەردەستی ئامادەبووان کە بخورێت لەم کاتەدا خزمەتکارەکان هەستان بێنە دەرەوە، عومەر فەرمووی: ئایا لە وانی دەگرنەوە؟ سوفیانی کوڕی عبداللە وتی: نا سوێند بە خوا ئەی ئەمیری باوەڕداران بەڵکو لە سەریانی دەپۆشین، عومەر زۆر تووڕە بوو و فەرمووی: چ بێ بۆ گەلەی کەشت لە خزمەتکارەکانیان دەشارنەوە خوای گەورە خراپی پێ کردوون و پێیان دەکات، پاشان عومەر بە خزمەتکارەکانی فەرموو: وەرن دانیشن بخۆن، ئەوانیش دانیشتن و دەستیان کردە نان خواردن و خۆی لە نانەکەی نەخوارد،[3] هەروەها عومەر لە خواردنێکی نەدەخوارد ئەگەر بە ئاسانی دەستی تەواوی موسڵمانان نەکەوتایە، بە درێژی ڕۆژگار ڕۆژووی دەگرت، لە ساڵی سووتەکدا ئەگەر ئێوارە بهاتایە نان و زەیتی دەکردە ترێت و دەیخوارد هەتا ڕۆژێك خەڵکی هەندی ئاژەڵیان سەربڕی بوو،[4] خەڵکەکە لە گۆشتەکەیان خوارد و لە ژوورێکدا هەندێ گۆشتی باشیان بۆ دانا کە بیخوات ئەویش هات و گۆشتەکەی بینی کە گۆشتی وشکەوە بووە لە دووك و جگەر، عومەر فەرمووی: ئەمە چیە؟ وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران! لەو ئاژەڵانەیە کە ئەمڕۆ سەربڕاون ئەویش فەرمووی: بخ... بخ، چ خراپە ئەو والیەی کە چاکەکە دەخوات و خەڵکیش ئێسکەکانی بخۆن، سەری ئەو مەنجەڵە بەرزبکەرەوە و خواردنێکی تر بهێنە، ئەوانیش نان و زەیتیان بۆ هێنا و نانەکەی بە

---

١ـ تأريخ الطبري، (٤/٩٨)، نقلا عن نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي، (١/٨٧).
٢ـ منافب أمير المؤمنين، لإبن الجوزي (ص: ١٠١).
٣ـ منافب أمير المؤمنين، لإبن الجوزي (ص: ١٠١).
٤ـ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي، (١/٨٧).

دەستی خۆی وردکرد و لەگەڵ زەیتەکەدا کردیە تریت.[١]

عومەر(ﷺ) پەیڕەوی یەکسانی تەنها لەشاری مەدینەدا بەڕێ نەدەکرد تاوەکو کاربەدەستانی تری لەهەرێمەکانی تر ئاگادار دەکردەوە تەنانەت لەمەسەلەی خواردن و خواردنەوەدا،[٢] کاتێ عوتبەی کوڕی فەرقەد گەیشتە ئازربیجان تێکەڵەیەکیان بۆ هێنا، خواردی بینی شتێکی خۆش و بە لەزەتی تێدایە پاشان وتی: سوێند بە خوا زۆر باشە ئەگەر لەمە بۆ ئەمیری باوەڕداران دروست بکەین پاشان دوو دەفری گەورەی لێ پڕکردو نایە سەر پشتی حوشترێك و دوو پیاوی لەگەڵدا نارد تاوەکو بیدەنە عومەر کاتێ گەیشتنە لای سەری مەنجەڵەکانی پێ کردنەوەو پاشان فەرمووی: ئەمە چیە؟ وتیان: تێکەڵەیە، عومەر چێژی کردو بینی زۆربەتامە دواتر فەرمووی: ئایا موسڵمانان تێر بوون لەمە؟ فەرمووی: نەخێرو کەگەڕاینەوە نامەیەکی نووسی بۆعوتبەو: لە پاشدا، هەمو موسڵمانان لەمەتێر بکە.[٣]

لە نموونەی پیادە کردنی یەکسانی نێوان خەڵکی ئەوەیە کە عومەر پێی هەستاوە کاتێك، کە داهاتێکی بۆ هاتووە و لە نێوان خەڵکیدا دابەشی کردووە ئەوان لەسەری کردوویانەتە قەرەباڵغی، لەم کاتەدا سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص هاتە پێشێ و خەڵکی ئەزیەت دا تاوەکو کۆتایی پێ هێنا بۆی لەبەر ئەوە عومەر گەوهەرێکی وەك سەرمووچە پێدا و فەرمووی: تۆ پەسەندت کرد کە دەسەڵاتی خوا لەسەر زەویدا دوور بکەوێتەوە، منیش پێم خۆش بوو کە فێرت بکەم کە دەسەڵاتی خوا دوورت ناخاتەوە،[٤] لەبەر ئەوەش کە زانیمان سەعد یەکێك بووە لە مژدەپێدراوانی بەهەشت و ڕزگاریکەری عێراق و مەدائینی کیسرا و یەکێك بووە لەو شەش کەسەی کە عومەر دەست نیشانی کرد بۆ دەستەی ڕاوێژ لەبەر ئەوەی، کە پێغەمبەر(ﷺ) تاوەکو وەفاتی کرد لێی ڕازی بوو، پێی دەوت - سوارچاکی ئیسلام ـ لێرەدا ئەمە ڕێژەی پابەندی عومەرمان بە یەکسانیەوە ناسی،[٥] ئیبن جەوزی دەگێڕێتەوە کە عەمری کوڕی عاص حەدی مەی داوە لە عبدالرحمن کوڕی عومەر کاتێك کاربەدەست بووە لە میسر، باو بووە کە حەد لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی گشتی شاردا بەجێ بهێنرێت بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگاری تێدابێت بۆ جەماوەر بەڵام عەمری کوڕی عاص ئەم کارەی لەگەڵ کوڕی خەلیفەدا لە ماڵەکەیدا بەجێ هێنا، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر، نامەیەکی بۆ عەمری کوڕی عاص نووسی: لە بەندەی خوا عومەری کوڕی خەتاب بۆ سەرپێچیکاری کوڕی عاص من سەرم لە خۆت و بوێریت و جیاوازی سەردەمم سووڕدەمێنێت، من وەك یارانی بەدرو بەگەورەو دادگەر سەیرم دەکردی، تۆم هەڵبژارد بۆ پرس و راو راوێژ کەچی دەبینم وا نیت، لە کارەکەت لات دەبەم زۆر بە خرابی، لە ماڵەکەت لە عبدالرحمن دەدەیت و دەشزانیت کە بەمە سەرپێچیم دەکەیت؟ عبدالرحمن پیاوێکە لە ژێردەستەکانت ئەو کارەی پێ دەکەیت کە بە موسڵمانانی تری دەکەیت بەڵام وتت: ئەمە کوڕی ئەمیری

---

١ـ نظام الحکم في الشریعة والتأریخ الاسلامي، (١/١٨٨).
٢ـ هەمان سەرچاوە، (١/١٨٨).
٣ـ مناقب أمیر المؤنین، لإبن الجوزي (ص: ١٤٧).
٤ـ الخلفاء الراشدون، (ص: ٢٤٣).
٥ـ نظام الحکم في الشریعة والتأریخ الاسلامي، (١/٨٨).

باوەڕداران، زانیوتە ئەگەر لای من لە هەقێك لای خودا پێویست بێت لەسەری هەواداری نیە کەواتە ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەیشت لە نێو عەبایەکی کۆچ و باردا بۆمی بنێرە تاوەکو خراپەی ئەو کارە بزانێت کە ئەنجامی داوە،[1] پاشان عبدالرحمن هێنرایە مەدینە و بە ئاشکرا داری حەدی لێدرا، ئەم ڕووداوە ئیبن سەعد گێڕاویەتیەوە و کوڕی زوبێریش ئاماژەی پێ کردووە و عبدالرزاق بە سەنەدێکی دروست لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی،[2] بەم شێوەیە یەکسانی بەدی دەکەین لەبەردەم شەریعەتدا لە بەرزترین پلە و پایەدا، تاوانبار کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە، والی لە سزادانی خۆش نەبووە بەڵام عومەر بینبویەتی کە کوڕەکەی هەندێ چاوپۆشی لێکراوە ئەمە ئازارێکی زۆری پێ گەیاندووە و والیەکەی سزا داوە — کە ڕزگارکەری میسر بووە — بە توندترین سزا و کوڕەکەی بە شێوەیەك سزا داوە کە شیاوی بووە تاوەکو سوور بێت لەسەر پاراستنی سنورەکانی خودا، ئارەزووی لە تەمێکردن و ڕاستکردنەوەی کوڕەکەی هەبووە ،ئەگەر ئەمە بەرنامەی بووبێت لەگەڵ نزیکترین کەسەکانی خۆی دەبێت تۆ بۆ کەسانی تر چۆن بوبێت؟[3]

لە نموونە مێژووییەکان، کە زۆر گرنگن و دانەران کردوویانەتە بەڵگە لەسەر بێلایەنی چەسپاندنی یەکسانی ئەوەیە عومەر لەگەڵ جبلەی کوڕی ئەیهەم ئەنجامی داوە: جبلە دوایین ئەمیرەکانی هۆزی غەسان بوو لە پێش هەرقل، غەسانیەکان لە شام لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ڕۆژئاوا بوون، ڕۆمەکان هەمیشە هانیان دەدان بۆ داگیرکردنی دوورگەی عەرەب و بە تایبەت پاش هاتنی ئیسلام، کاتێك جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلام سەرکەوتنی یەك لە دوای یەکی موسڵمانان بەسەر ڕۆمەکاندا بەدواوە بووو هۆزە عەرەبیەکانی شامیش موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد ئەمەش وای کرد ئەمیری غەسانیەکانیش موسڵمان بێت، پاشان خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون موسڵمان بوون و نامەیەکی بۆ عومەر نووسی و داوای لێ کرد کە ڕێگەی بدات کە بڕوات بۆ مەدینە، عومەر بە موسڵمان بوون و هاتنی بۆ مەدینە بەختەوەر بوو ئەویش هات بۆ مەدینە و ماوەیەك تیایدا مایەوە ، عومەر چاودێری دەکرد و بەخێرهاتنی کرد پاشان بڕیاریدا کە بڕوات بۆ حەجکردن، لەکاتی تەوافی کەعبەدا پیاوێکی هۆزی فەزارە پێی نا بە جلەکانیدا و دڕاندی و لەم کاتەدا جبلە تووڕە بوو — لە کاتێکدا کە تازە موسڵمان بووبوو — بۆیە مشتەکۆڵەیەکی توندی دا بە نێو دەمی پیاوەکە و لووتی پڕاو پڕ بوو لە خوێن، پیاوەکەش ڕای کرد بۆ لای عومەر و سکاڵای خۆی کرد کەچی بەسەر هاتووە عومەر ناردی بە دوای جبلەدا و بانگیان کرد و پاشان لێی پرسی و ئەویش دانی نا بەوەدا کە ڕوویدابوو عومەر فەرمووی: ئەی جبلە چی وای لێ کردی کە ستەم لە براکەت بکەیت و وای لێبکەیت؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە زۆر بەزەیی بەم دەشتەکیەدا هاتۆتەوە (ئەگەر لە نێو کەعبە نەبوایە هەردوو چاوانی دەردەهێنا).

---

١ـ مناقب أمير المؤنين، لإبن الجوزي (ص: ٢٣٥).
٢ـ الخلافة الراشدة والدولة الاموية، يحيى اليحيى، (ص: ٣٤٥).
٣ـ فن الحكم في الاسلام، د. مصطفى أبو زيد (ص: ٤٧٦-٤٧٧).

عومەر فەرمووی: دانت پێدانا، کەواتە یان ئەم پیاوە قایل دەکەیت یان تۆڵەیت لێ دەکەمەوە.

سەرسامی جبلەی کوڕی ئەیهەم بە هەموو ئەم ڕووداوانە زۆرتر دەبوو بۆیە وتی: شتی وا چۆن دەبێت لە کاتێکدا ئەو بازاڕیە و من پادشام.

عومەر فەرمووی: ئیسلام یەکسانی خستۆتە نێوانتانەوە پادشای غەسان وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران گومانم وابوو کە لە نێو ئیسلامدا سەرفرازتر دەبم وەك ئەوەی لە نێو نەفامیدا بووم.

عومەر فەرمووی: لەمانە گەڕێ، ئەگەر تۆ ئەم پیاوە قایل نەکەیت ئەوا من تۆڵەیت لێ دەکەمەوە.

جبلە وتی: دەی دەبمەوە بە گاور.

عومەر وتی: ئەگەر ببیەوە بە گاور ئەوا لە ملت دەدەم چونکە تۆ موسڵمان بووی، ئەگەر پاشگەز بیتەوە دەتکوژم.[1]

لێرەدا جبلە بۆی دەرکەوت کە قسە لەگەڵ عومەردا سوودی نیە و بێ کەڵکە داوای لە عومەر کرد مۆڵەتی بدات تا بیر بکاتەوە ، عومەر مۆڵەتی پێدا، جبلەی کوڕە ئەیهەم بیری کردەوە و گەیشتە بڕیارێکی هەڵە و سەرکەوتوو نەبوو لە بڕیارەکەیدا، داخرۆشا کە خۆی و هۆزەکەی بە تاریکی شەو مەککە بەجێ بهێڵن و بەم شێوەیە هەڵهات بۆ قوستەنتنیە و گەیشتە ئەوێ پاش ئەوە بە توندی پەنجەی پەشیمانی گەست ، ئەم ڕووداوەش لە هۆنراوەیەکی جوان و قەشەنگدا داپڕشتووە تاوەکو ئێستاش مێژوو دەیلێتەوە، لەم چیرۆکەدا سووربوونی عومەر لە پەیڕەوی کردنی یەکسانیدا لەبەردەم شەرعی خوادا بەدی دەکەین، ئیسلام وەك یەك سەیری پادشایەك و پیاوێکی بازاڕی دەکات، دەکرێت کە بۆ ئەم یەکسانیە واقعێکی زیندوو هەبێت نەك تەنها چەند وشەیەك کە لەسەر پارچە کاغەزێك تۆمار بکرێت و زمان بیلێتەوە.[2]

عومەر(ﷺ) بنەمای ئەو یەکسانیەی بەرجەستە کرد کە شەریعەتی خوای گەورەی جیهانیان هێناویەتی و کردیە واقعێکی زیندوو کە لە نێوان خەڵکیدا ببزوێت، لەبەردەم سۆزی باوکایەتی پاشگەز نەبوویەوە و لەبەردەم نازناوی پیاوچاکیدا سەری دانەدەنواند، یەکسانی چۆك پێ دانەدەنا لەبەردەم جیاوازی ئاین و تێکەڵاوی پیاوانی پاکساز، ئەم بنەما پیرۆزە واقعێکی زیندوو بوو کە هەموو فەرمانڕەوا و فەرمان بەسەردا دراوێك هەستی پێ دەکرد هەموو ستەم لێکراو و خەمبارێك دەیدۆزیەوە،[3] چەسپاندنی بنەمای یەکسانی کاریگەری خۆی هەبوو لە کۆمەڵگەی ڕاشیدیدا ئەم کارە بزوێنەری هەستەکان بوو لەسەر دەروونی ئەم چین و توێژە و دەمارگیری کەلتووریان بنە بڕ کردووە لەبانگەشە بە پێشەنگی و زەعامەتەوە دەکات و ماف بە کەرامەت دەدات و جیاوازی ڕەسەنایەتی و نەفامی ڕادەماڵێت و گەورەیەك چاو نابڕێتە خوار خۆی و بێ دەسەڵاتیش نائومێد نابێت لە وەرگرتنی

---

١ـ إبن خلدون (٢٨١/٢)، نقلا عن نظام الحكم للقاسمي، (٩٠/١).

٢ـ فن الحكم في الاسلام، د. مصطفى أبو زيد (ص: ٤٧٧-٤٧٨).

٣ـ هەمان سەرچاوە، (ص: ٤٧٨).

مافی خۆی، هەمووان یەکسانن لە بەجێ هێنانی ئەرکدا، بە ڕاستی بنەمای یەکسانی لە کۆمەڵگەی ڕاشیدیدا نوورێکی نوێ بوو، کە ئیسلامی پێ ڕۆشن کرایەوە لە تەواوی لایەنەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و ئەم بنەمایەش کاریگەریەکی بەهێزی هەبوو لە دامەزراندنیدا.[1]

## حەوتەم: ئازادیەکانی:

بنەمای ئازادی و سەربەستی یەکێك بووە لەو بنەما سەرەکیانەی کە کاری پێکراوە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا، ئەم بنەمایە فەرمان دەدات بە سەقامگیری و زامنی ئازادی گشتی بۆ تەواوی خەڵکی لە چوارچێوەی سنووری گشتی شەرعی ئیسلامی بەوەی کە ناکۆك نەبێت لەگەڵیدا، بە ڕاستی بانگەوازی ئیسلام بۆ ئازادی خەڵکی ـ تەواوی خەڵك ـ بانگەوازێکی فراوان و بەرین بووە زۆر دەگمەنن ئەو بانگەوازانەی کە لە مێژوودا هەن گشتگیر بن، یەکەمین بانگەواز کە لەم بوارەدا ڕەهای کرد بانگەوازی خەڵکە لە زۆرێك لە ئایەتە قورئانیەکان بۆ یەکتاپەرستی خوا و ئامۆژگاریکردنی خەڵك بە پەرستنی تەنها خوای گەورە لەگەڵ تەواوی بوونەوەر و دروستکراوەکانیەوە و لەم بانگەوازی یەکتاپەرستیەدا هەموو مانایەکی ئازادی و سەربەخۆیی بۆ ئادەمیزاد بەدی دەکرێت سەرباری ئەوەی کە ئیسلام ئازادی بەهەموو واتا و ناوەڕۆك و زاراوەکانیەوە، جارێك ئەرێیی دەبێت وەك فەرمان بە چاکە و ڕێگری لەخراپەو جارێك نەرێیی دەبێت، ئەوەی کە بە زەبر و زەنگ کەسێك بهێنرێتە نێو ئایینەوە، لەزۆر کاتدا ماناکەی تێکەڵ بە مانای ڕەحمەت دەبێت لەگەڵ دادپەروەری و ڕاوێژ و یەکسانی، چونکە هەموو ئەم بنەمایانەی، کە ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات کاری سەقامگیر و چەسپاو ناکەن بە بوونی ئازادی نەبێت هاتنەدی بەرجەستە ناکرێت بە ڕاستی بنەمای ئازادی ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە بڵاوبوونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە تایبەتی لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا، لە ئاسانی پاکسازیەکانی موسڵمانان و بەرفراوانبوونی پانتایی دەوڵەتەکەیان، چونکە ئیسلام ڕێزی لەمرۆڤ گرت و ئازادیەکانی لە بەرفراوانترین چوارچێوەدا سپارد، لەبەر ئەوە ڕێکخراوە سیاسیەکانی تری ئەو سەردەمە لە دەوڵەتی ڕۆم و فارسدا تەنها کۆمەڵە ڕێکخراوێکی زۆرو ستەمکردن بوون ، بە شێوەیکی تایبەت سیاسەتمەداران و کەمایەتیە ئاینیەکان بەپلەیەکی زۆرتوند بەردەوام خەریکی سەرکوتکردن و چەوسانەوەو ستەم کردن بوون.

بۆ نموونە: دەوڵەتی فارس مەزهەبی ملکانی فەرز دەکرد بەسەر مەزهەبی یەعقوبی — بە تایبەت لە میسر و شام، هەر کەس سەرپێچی بکردایە ئەوا لەسەر جەستەیان ئاگر دەکرایەوە تاوەکو چەوری ڕۆنی جەستەیان بەملا و بەولایاندا دەچۆڕایە سەر زەوی، ستەمکاران و دڵڕەقان باری قورسیان لەسەر ئیمان دەخستە سەر شانیان بەوەی کە کۆمەڵگەی مەکدۆنی بڕیاری لەسە دابوو، یان دەیانخستە کیسی پڕ لە خۆڵ و پاشان فڕێیان دەدایە قووڵایی دەریاکانەوە، هەروەها دەوڵەتی فارس لە سەردەمە جۆراوجۆرەکانیدا دەست لە ملان بوانی ئاسمان بە تایبەت مەسیحیەکانەکانی دەچەوساندەوە ئەمەش

---

١ـ المجتمع الاسلامي، دعائمه وآدابه، د. محمد أبو عجوة، (ص: ١٦٥).

پاش ئەو جەنگە زۆرەی کە لە نێوان ئەوان و دەوڵەتی ڕۆمدا بەرپا بوو، بەڵام لە سایەی ئیسلام و لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و خەلیفەکانی ڕاشیدیندا ئازادی گشتی ناسراوە و لە ڕۆژانی ئەمرۆماندا دیارو تەواوە[١] و پارێزراوە ئەمەش درێژەدانە دەربارەی ئازادیەکان لە سەردەمی عومەر(ﷺ)دا:

## ١- ئازادی بیروڕای ئاینی:

ئاینی ئیسلام فشاری نەخستۆتە سەر هیچ کەسێك کە دەست لە ملانی بێت بەڵکو بانگەشە بۆ سەرنجدان و تێڕامان لە بوونی خوا و دروستکراوەکانی دەکات، ئەم ئاینە فەرمانی داوە بە شوێنکەواتووانی کە بە چاکی خەڵکی بدوێنن بەو شێوەیەی کە زۆر باشە، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ (البقرة: ٢٥٦).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ﴾ (الشورى: ٤٨).

هەروەهادەفەرمووێت: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ (النحل: ١٢٥).

لە شوێنێکی تریشدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ (العنكبوت: ٤٦).

ئایەتەکان لەمەدا زۆرن هەر لەبەر ئەوەش دەبینین کە عومەر لە دەوڵەتەکەیدا جەختی کردۆتەوە لەسەر پارێزگاری کردن لە ئازادی ئاینی، تێبینی ئەوە دەکەین عومەر لەم بوارەدا لەسەر ڕێنموونی پێغەمبەری خۆشەویست و ئەبوبەکری خەلیفە هەنگاوی هەڵگرتووە ولێگەڕاوە لە ئەهلی کتاب کە لەسەر ئاینی خۆیان بن و سەرانەی لێ ستاندوون و پەیمانی لەگەڵ بەستوون هەروەك ئەوەی کە لە درێژەکەیدا هاتووە، پلانی بۆ پەرستگاکانیان داناوە و وێرانی نەکردوون و وەك خۆی هێشتوونیەتیەوە ئەویش لەبەر ئەو ئایەتەی خوای گەورە: ﴿وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ﴾ (الحج: ٤٠).

بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی لە سەردەمی عومەردا، کە یاران پێی هەڵدەستان شاهێدی دەدات لەسەر ڕێزگرتنی ئاینەکانی تر لە لایەن ئیسلامەوە لەگەڵ سووربوونی سەرکردەکان لە فشار نەخستنە سەر

---

١ـ نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين، محمد عبد الصمد (ص: ١٥٧-١٥٨)

هیچ کەسێك بۆ هاتنە نێو ڕیزەکانی ئیسلامەوە تەنانەت عومەر ڕۆژێك ئافرەتێکی مەسیحی هاتەلای بۆ پێویستیەکی خۆی، عومەر پێی فەرموو: موسڵمان ببە، خوای گەورە محمدی بە هەق ناردووە، پیرە ژنەکە وتی: من بە ساڵاچووم و مردن لێمەوە نزیکە، پاشان کارەکەی تەواو کرد و ڕۆیشت، عومەر ترسا لەوەی کە لێرەدا بە هۆی ئیستغلالی ئەو پێویستیەوە فشاری خستبێتە سەر ئەو ئافرەتە بۆ موسڵمان بوون بۆیە داوای لێخۆش بوونی لە خودا کرد بۆ ئەو کارە و فەرمووی: خوای گەورە، من ڕێنموونیم کرد نەك زەبر و زەنگ،[1] هەروەها عومەر(ﷺ) بەندەیەکی مەسیحی هەبوو ناوی (ئەشق) بوو وتی: من بەندەیەکی مەسیحی بووم لای عومەر پێی فەرمووم: موسڵمان ببە تاوەکو هەندێ لە کاروباری موسڵماناندا پشتت پێ ببەستین، لەبەر ئەوەی نەدەکرا کە ئەوان پشت بە یەکێك ببەستن کە لە وان نەبێت، منیش ئەو داوایەم پەسەند نەکرد پاشان عومەر فەرمووی: (زەبر و زەنگ لە ئایندا نیە)، کاتێك کە کۆچی دوایی کرد فەرمووی: بەو شێوەیەی کە دەتوانی بڕۆ[2]، مەسیحیەکان درێژەیان بە کاری ئاینی و خەڵوەت و پەرستشەکانیان دەدا لە نێو پەرستگا و ماڵەکانی خۆیان کەس ڕێگری لێ نەدەکردن ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەستووری ئیسلامی مافی ئازادی بیروڕای بۆ پاراستبوون، طبری لەو بەڵێننامەیەی کە عومەر نووسیویەتی بۆ ئەهلی ئیلیا (قودس) هێناویەتی، کە دەفەرموێت: بەخشینی سەقامگیری بۆ ئەهلی ئیلیا لەسەر خۆیان و ماڵ و منداڵ و کەنیسە و دێریان،[3] هەروەها نامەیەك دەنووسێت بۆ عەمری کوڕی عاص لە میسر کە تیایدا هاتووە: بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەمەیە، کە عەمری کوڕی عاص دەیداتە ئەهلی میسر لە ئارامی لەسەر خۆیان و ئاینەکەیان و ماڵ و منداڵ و کەنیسە و دێرەکانیان و وشکانی و ئاوەکەیان، ئەم پەیمانە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەسەر تێپەڕینی ئەم نووسراوە و پەیمانی خواو زامنی پێغەمبەر و ئەمیری باوەڕداران و زامنی باوەڕدارانی[4] لەسەرە و هەموو زانایانیش کۆکن لەسەر ئەمەی[5] کە بۆ ئەهلی زیمە هەیە کە درێژە بەدروشمی ئاینی خۆیان بدەن و ئەوان هەرگیز لەمە ڕێگری ناکرێن ئەگەر بێت و سنور نەبەزێنن و مافی موسڵمانان پێشێل نەکەن ، ئەگەر ئەوان ویستیان درێژە بەدروشمی ئاینی خۆیان بدەن بە ئاشکرا و هێمای خاچەکانیان بهێننە دەرەوە ئەوا ئەوان ئەو بەدی دەکەن کە ڕێگری دەکرێن لە وڵاتی موسڵماناندا و ڕێگری لەمە ناکرێن لە شار و گوندەکانیاندا.[6]

شێخی غەزالی سەبارەت بە زامنی ئیسلام بۆ ئازادی بیر و ڕا دەفەرموێت: بەڕاستی ئەو ئازادی یە ئاینی یەی کە ئیسلام زامنی کردووە بۆ خەڵکی سەر زەوی هاوشێوەی نەبوو ، لە(٥) کیشوەرەکەی سەرزەویدا هەرگیز ڕوی نەداوە کە تاك ئاینی بە دەسەڵات بێت و ڕێگە بدات بە سەرپێچی کەرانی لە

---

١ـ معاملة غير المسلمين في المجتمع الاسلامي إدوارد غالي، (ص: ٤١).
٢ـ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي، (٥٨/١).
٣ـ تأريخ الطبري، (١٥٨/٤).
٤ـ البداية والنهاية (٩٨/٧).
٥ ـ السلطة التنفيذية، د. محمد الدهلوي، (٧٢٥/٢).
٦ـ هەمان سەرچاوە. (٧٢٥/٢) وقد فصل المسئلة.

بیر و باوەڕدا بە هەموو هۆکارێکی مانەوە و گەشەکردن هەروەك ئەوەی کە ئیسلام کردوویەتی.[١]

هەروەها عومەر سور بووە لەسەر ڕاپەڕاندنی بنەمای ئازادی بیر و ڕا لە کۆمەڵگەدا و سیاسەتی خۆی لە بەرامبەر گاور و جولەکەکان کورت کردۆتەوە بەوەی کە دەفەرموویێت: ئێمە بەڵێنمان پێدان کە لەخۆیان و کەنیسەکانیان بگەڕێن کە چی باشە تیایدا بیڵێن و ئێمە نابینە ئەرك لەوەی کە گەمارۆ بدرێن، ئەگەر دوژمنەکان خراپەی ئەمانیان بوێ ئەوا لەگەڵیان دەجەنگین و ڕێگەش بە فەرمانڕەواکانیان دەدەین کە کاری خۆیان بکەن تا بێن و بە فەرمانی ئێمە قایل بن، ئەگەر لە ئێمە بران ئێمە ڕێگەیان پێ ناگرین.[٢]

عومەر زۆر لێبوردە بوە لەگەڵ زامنکراواندا بەجۆرێ لێیان خۆش دەبێت لەسەرانە کاتێ کە ناتوانن بیدەن، ئەبو عوبەیدە لە کتێبی(الاموال) باس لەوە دەکات کە عومەر(ﷺ) بەشوێنێکدا تێپەڕ دەبێ و دەبینێت پیاوێك سواڵ دەکات: پیاوەکە کەسێکە بە ساڵاچووە و چاوەکانی لە بینین کەوتوون، عومەر لە سەر شانی دەدات و پێی دەفەرمووێت: تۆ لەسەر چ ئاینێکی پیاوەکە وتی: جولەکە، عومەر فەرموی: ئەی چی وای لێکردویت سواڵ بکەی؟ ووتی: سواڵ بۆ سەرانە و بژێوی پیری دەکەم، دواتر ووتی: عومەر دەستی گرت و بردیەوە بۆ ماڵێ خۆی و بەخشش و خەڵاتێکی لە ماڵەکەی پێدا، پاشان ناردی بەدوای بەر پرسی بەیتولمالدا و پێی فەرموو سەیری ئەم نابینایە بکە، سوێند بەخوا ویژدانمان بۆی نەبووە، کە گەنجێتی یەکەی مان خواردووەو لەپیریشدا شەرمەزاری دەکەین، بۆیە سەرانەی لەسەرخۆی و هاوشێوەکانی،[٣] هەڵگرت و نامەیەکی بۆ کاربەدەستەکانی نوسی و ئەم فەرمانەی بەسەردادان،[٤] ئەم کردارانەش بەڵگەن لەسەر دادپەروەری ئیسلام و سووربوونی عومەر لەسەر ئەوەی کە دەوڵەتەکەی لەسەر بنەمای بەزەیی و دادپەروەری بێت بەسەر خەڵکەکانیەوە ئەگەرچی موسڵمانیش نەبێت بەم شێوەیە ئازادی ئاینی وەك مامۆستایەکی دیار و بەرچاو لە سەردەمی خەلافەتی ڕاشیدیندا مایەوە و لەبەردەم دەوڵەتدا زامنکراو و پەیڕەوکراو بوو بە دەستووری ڕەبانیەوە.

## ٢- ئازادی هاتوو چۆ :

عومەر زۆر جەختی لەسەر ئەم ئازادیە دەکردەوە بەڵام لە هەندێ حاڵەتی جیادا کە هەر کات پێویست بوایە کۆتی دەکرد، بەڵام ئەو حاڵەتە جیاجیایانەی کە تیایدا ئازادی هاتن و چوون و ئازادی شوێنی تێدا کۆت و بەند کراوە زۆر کەم بوون، هێندە بەسە کەمە سەیری ئەم دوو حاڵەتە بکەین لەبەر گرنگیان:

- عومەر گەورە یارانی لە مەدینە هێشتنەو و ڕێگەی پێ نەدان کە بچن بۆ ناوچە ئازادکراوەکان بە مۆڵەتی خۆی نەبێت یان بۆ ئەرکێکی گرنگ و فەرمی نەبێت وەك دامەزراندنی

---

١ـ حقوق الانسان بين تعاليم الاسلام واعلان الامم المتحدة (ص:١١١).
٢ـ نظام الحكم عهد الخلفاء الراشدين (ص:١١٧).
٣ـ الاموال لأبي عوبيدة (ص:٧٥)، احكام اهل الذمة لابن القيم (٣٨/١).
٤ـ نصب الراية للزيلعي، (٤٥٣/٧).

هەندێکیان وەك والی و سەرکردەی سوپا، ئەویش تاوەکو بتوانێت ڕاوێژیان پێ بکات و بگەڕێتەوە لایان لەو گرفتانەی لە حوکمدا دێنە ڕێگای، لە هەمان کاتدا ڕوودانی هەر فیتنەییەك یان پەڵاوێژیەك لە ڕیزی موسڵماناندا دەگوێزێتەوە و سەرکوتی دەکات لە کاتی دەرچوونیان بۆ شوێنەکانی ترو سەقامگیربوونیان تیایدا،[1] دیارە ئەمەش داناییەك بووە لە سیاسەتیدا و شارەزاییەکی ورد بووە بۆ ناخی مرۆڤەکان و دەروونیان، عومەر گەمارۆی گەورە یارانی دابوو لە مەدینەدا و دەیفەرموو: ئەوەی کە من لێی دەترسم لە نێو ئەم ئومەتەدا بڵاوبونەوەتانە لە وڵاتدا،[2] بڕوای وابوو کە ئەمە وڵات لە فیتنە دەپارێزێ ، خەڵکیش لەدەوری کەسانی ناسراو کۆدەبنەوە و هەرچی گومان و ڕارایی دروست دەبێت ،[3] عومەر(ﷺ) لە فرەیی مەڵبەندەکانی هێزی سیاسی و ئاینی لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا دەترسا بەجۆرێ بۆ کەسایەتی ئەم یارە بەرێزە یان ئەوە جۆرێ لە گەورەیی و ڕێزداری دەبێت لەسەر بەیداخ و ئەمەش بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاستی بڕیاری دەرچوو لە دەسەڵاتی گشتی یەوە، بۆ دوورکەوتنەوە لە فرەیی مەڵبەندەکانی هێز، بۆیە عومەر بێ ی کە گەورە یاران لە مەدینەدا بهێڵێتەوە تا بەشداری بکەن لە بڕیاردانداو ئاژاوەی ئیجتهادی تاکەکەسی دووربخەنەوە، ئەگەر ئەم بەڵگە شەرعی یە نەبوایە ئەوا بڕیار لە عومەرەوە دەردەچوو بەبێ لێبڕان و ناچاربوون، بۆ ون کردنی ئەو بڕیارە شەرعی یەی کە بۆی دەلوێ، هەڵسوکەوت بۆ ئەو ژێردەستانەوە بکات کەوا بەستەن بە بەرژەوەندی یەوە.[4]

- بەڵام حاڵەتی دووەم کاتێ ڕویدا کە عومەر هەستا بە ڕاگواستنی گاورانی نەجران و جولەکەی خەیبەر لە قەڵایی وڵاتی عەرەبی یەوە بۆ عێراق و شام و هۆی ئەمەش ئەوە بوو کە جولەکەی خەیبەرو گاورانی نەجران پابەند نەبوون بەبەڵێن و ئەو مەرجانەی کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) گرێیان دابوو لەگەڵ ئەبوبەکر(ﷺ) نوێیان کردبویەوە، ئەو دەمە بارەگای جولەکەکانی خەیبەر و گاورانی نەجران بوو بوو بەپێگەی خیانەت و فرت و فێڵ بۆیە دەبوو ئەم قەڵا شەیتانیانە کۆتایی پێ بهێنرێ و هێزیان لاواز بکرێت بەڵام جولەکە و گاورانی تر وەك تاك لەنێو کۆمەڵگەی مەدەنیدا دەژیان خاوەنی تەواوی مافەکانیان بوون، بەیهەقی لەکتێبی (سنن)ەکەیدا ریوایەتی کردووە و عبدالرزاق کوڕی همام ئەلصنعانی لە ((مصنف))ە کەی لە ابن المسیب و ابن شهام هێناویەتی، کە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێت: ((دوو ئاین لە دەوورگەی عەربدا کۆ نابنەوە)) مالك دەفەرمووێت: ابن شهاب فەرموویەتی: عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) ئەم پشکنینەی ئەنجام داوە هەتا بەفر و بێگەمانی پێ گەیشتووە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: ((دوو ئاین لە دوورگەی عەرب کۆ نابنەوە)) لەبەر ئەوەی جولەکەی خەیبەری ڕاگواستەوە.

---

١ـ نظام الحكم عهد الخلفاء الراشدين (ص:١٠٦).

٢ـ المرتفى سيرة أمير المؤمنين لأبي الحسن الندوي، (ص: ١٠٩).

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ القيود الواردة على سلطة الدولة (ص:١٥١).

مالك دەفەرمووێت: عومەرجولەکەی نەجران وشاندەکەی ڕاگوێزایەوە.[1]

بەڕاستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) بە نسبەت یارانەوە شتێکی بێگومان بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی کە جولەکە و گاوری نەجران نەیان توانیوە کە پابەند بن بە پەیمان و بەڵێنەکانیانەوە لەبەر توندی دژایەتی و کینەو ئیرەی یان بۆ ئیسلام و موسڵمانان جولەکە لە خەیبەر هۆی ڕاگواستنەوەیان ئەوە بوو کە عومەر(رضي الله عنه) ریوایەت دەکات و دەفەرمووێت: کاتێ ئەهلی خەیبەر جومگەیەکی عبدالله ی کوڕی عومەریان شکاندبوو عومەر هەستا وتارێکی داو فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) جولەکەی خەیبەری کردە کاربەدەست لەسەر ماڵ و دارایی خۆیان و فەرمووی (سەقام گیرتان دەکەین بەوەی کە خوای گەورە سەقام گیری کردوون)، عبدالله کوڕی عومەر چۆتە دەرەوە بۆ ماڵەکەی لەوێ و بەشەو پەلاماری دراوە و دەست و پێی شکێنراوە ، ئێمە جگە لەوان دوژمنمان نی یە، ئەوان دوژمنی ئێمەن و رام ئەوەیە کە ڕایان گوێزین، کاتێ عومەر لەسەر ئەم کارە خۆی کۆکردەوە یەکێك لەپیاوانی هۆزی (الحقیق) هاتە لای و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا دەرماندەکەیت لەکاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) سەقامگیری کردووین و کاربەدەستمان لەسەر ماڵەکانمانەو مەرجی ئەمەش بۆ ئێمەیە؟ عومەر فەرمووی: ئایا تۆ گومانت وایە کە من ئەوەم لەبیر چووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((چۆنە بۆت ئەگەر لە خەیبەر چویتە دەرەوە ئەو حوشترە ئارامەی لە ڕۆیشتندا پێتە شەو لەدوای شەو لەسنور لات بدات))؟ پیاوەکە ووتی ئەمە لاوازیەك بووە لە ئەبی ئەلقاسمەوە عومەریش فەرموویەتی: درۆت کرد. خوا عومەر ڕایگواستن و نرخێکی پێدان کە لە بەرو بووم ودارایی و حوشتر و چەند نمایشێك لە کوچ و بار هیچی تریان نەبوو،[2] جولەکە ناپاکیان کرد و بەڵێن و پەیمانەکەیان شکاند بۆیە زۆر ئاسایی لە دورگەی عەرەب بچنە دەرەوە وەك بەجێ هێنانێك بۆ ڕاسپاردەی پێغەمبەر(ﷺ)و عومەریش ڕایگواستن بۆ (تیماء) و ئەریحا.

بەڵام گاوری نەجران پابەند نەبوون بەو مەرج و بەڵێنانەی کە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)ئیمزایان کردبوو بوو، لەگەڵ ئەبوبەکردا نوێیان کردبویەوە، هەندێکیان پوچەڵ کردەوە و دەستیان کردە خواردنی سوو مامەڵەیان پێوە دەکرد لەبەر ئەوە عومەر لە نەجران دەری پەڕاند بەرەو عێراق و ئەمەی بۆ نوسین: لەپاشدا، هەرکەس لەوالیەکانی عێراق و شام ئەمەی بەرکەوت با دایان بڕێت لەو زەویەی کە نە شینایی تیادایە نە دار و دەوەن، هەر کارێ کە دەیکەن ئەوا لە پێناوی خودا بۆ خۆیانە و پاشکۆیە لە زەویان پاشان هاتنە عێراق و لە گوندی نجرانی کوفە نیشتەجێ بوون،[3] ئەبو یوسف باس لەوە دەکات کە عومەر لەبەر بەرژەوەندی موسڵمانان،[4] کەمێك ترسی لە گاورەکان هەبووە لەبەر ئەوە سیاسەتەکەی وای لێ کردووە کە پاش فەراهەم هێنانی چەند هۆکارێکی تر دەری پەڕاندون سەرباری

---

١ـ السنن الكبرى للبيهقي (٢٠٨/٩)، مصنن عبدالرزاق (٥٣/٦).

٢ـ البخاري، ك: الشروط رقم ٢٧٣٠.

٣ـ الاموال لابي عوبيد (ص:٢٤٥).

٤ـ الخراج لابي يوسف (ص:٧٩).

ئەوەی کە ڕاسپاردەکەی پێغەمبەر(ﷺ)یشی بەدەستەوە بووە و تێگەیشتنی فاروق لە وەشاندنی گورزی جەرگ بڕدا بۆ بارەگاکانی جولەکە لە خەیبەر و گاوران لە نەجران درەدەکەوێت ئەویش پاش ئەوەی کە چەن بەڵگەیەکی پێویستی دۆزیەوە بۆ دەرکردنیان لە دورگەی عەرەب بەبێ جەور و ستەم و چەوسانەوە، بەشێوەیە ڕێگری لەلانکەی فرت و فێڵ و ناپاکیەکان کرا کە هەناسەیەکی درێژ وەربگرێت بۆ پلان دارشتن لە پێناو زاڵ بوون بەسەر دەوڵەتی ئیسلامیدا.

## ٣- مافی ئاسایش، ڕێزی نیشتە جێ بوون و ئازادی موڵکداری:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام دانی بە مافی ئاسایش و ئارامیدا ناوە لە زۆربەی ئایەتە قەرئانی و فەرمودە پیرۆزەکاندا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (البقرة:١٩٣).

﴿ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة: ١٩٤)

هەروەها ئیسلام مافی ژیانی دیاری کردوە کە بەرفراوانترە لە مافی ئارامی و ئاسایش لەبەر ئەوەی ئەمەی دوایی کردەیەکی نەرێی لەلایەنی دەوڵەتەوە دەگرێتەوە کە تەعبیری لێ دەکات بە ڕێگرتن لە سەر دەست درێژی کردن و هەڕەشە، لە هەمان کاتدا مافی ژیان لەسەر و ئەمەوە کارێکی ئەرێ لە خۆ دەگرێت کە بریتی یە لە پارێزگاری کردن لە مرۆڤ و گیانی لە هەردەست درێژی کردنێك و هەڕەشە کردنێك ، هەر ئەم پارێزگاری کردنەش بەرپرسیاریتی یەکی گشتی یە لەگەردنی تەواوی خەڵکی لەبەر ئەوەی کە دەست درێژی کردن بەبێ ماف لەسەر یەکێکیان ئەوە وەك دەست درێژی کردنە بۆ سەر هەمویان،[١] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ﴾ (المائدة:٣٢)

هەر لەم ئاراستە قورئانیە و بەدواداچونە پێغەمبەرەوەیە عومەر لەسەردەمی خۆیدا زامنی مافی ئارامی و ئاسایش و ژیانی بۆ تاکەکانی کۆمەڵگاکەی دابین کردووە لەگەڵ چاودێری کردنی لە هەرگاڵتە پێکردن و دەست درێژی یەك، عومەر(رضي الله عنه) دەفەرموێت: من کاربەدەستانم نەکردۆتە بار بەسەرتانەوە تا خۆشیەکانتان لێ زەوت بکەن وبەدگۆییتان بەرامبەر بکەن و موڵك وماڵتان ببەن بەڵکو بەکارم هێناون تا فێری قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان بکەن، هەرکەس کاربەدەستەکەی من ستەمی لێ کرد با پێمی بگەیەنێ تا تۆڵەی لێ بکەمەوە بۆی.[٢]

---

١ـ نظام الحكم في عهد الراشدين (ص:١٦٣).

٢ نظام الحكم في عهد الراشدين (ص:١٦٤).

هەروەها عومەر دەفەرمووێت: پیاو باوەڕ پێکراو نابێ لەسەر خۆی ئەگەر من برسیم کرد یان ترساندم یان بەندم کرد بەوەی کە بڕیار لەسەر خۆی بدات،[1] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەگونجاوە گومان لێ کراوێك لەسەر تاوانێك بخرێتە ژێر فشار و هەڕەشە بۆ دان نان بەو تاوانەدا، ئیتر گرنگ نی یە ئەو هۆکارە بەکار هاتووە مادی بێت (وەك قەدەغەکردنی لە بەخشین یان دەست بەسەر داگرتنی داهاتەکانی) یان مەعنەوی(وەك پەنابردن بۆ هەڕەشەلێ کردن و تۆقاندنی بەهەر جۆرێکی بێت)، ئەبو موسی ئەشعەری دەفەرمووێت: مافێکی نادیار یان بەڵگەیەکی روون و دیار دابنێ بۆ داواکار کە کۆتایی پێ بهێنێ، ئەگەر بەڵگەکەی ئامادە بوو ئەوا مافی خۆی وەردەگرێت، ئەگەرنا دادگا ڕوی لێ دەنێت ئەمەش گومان نایەڵێت،[2] ئەمەش دەلالەت دەکاتە سەر ئەوەی کە مافی بەرگری کردن لە خۆ پارێزراوە.[3]

ئەوەی کە پەیوەستە بە ڕێزی نیشتەجێ بونەوە خوای گەورە یا ساغی کردووە کە بەبێ مۆڵەتی خاوەن ماڵ یان بە ڕێگەیەکی نەشیاو بچنە نێو ماڵی خەڵکیەوە خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ (النور: ٢٧-٢٨).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ﴾ (البقرة:١٨٩).

هەروەك ئەوەی دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًا﴾ (الحجرات:١٢).

ڕێزی نیشتەجێ بوون زامن کراوو پارێزراو بووە لەسەردەمی عومەر و خەلیفەکانی ڕاشیدیندا.[4]

ئازادی مولکداریش زامن کراوو پارێزراو بوە لەسەردەمی ڕاشیدیندا و لەچوار چێوەی ئەو سنورەی کە دەستوری ئیسلام لەم بوارەدا بڕیاری لەسەر داوە،کاتێ عومەر(رضي الله عنه) ناچار بوو لەبەر هۆکاری سیاسی و جەنگی گاوری نەجران و جولەکەی خەیبەر وەدەرنێ لەنیوە دورگەی عەرەب بۆعێراق و شام و فەرمانی دا بەوەی زەویان پێ بدرێ وەك زەوی یەکانی خۆیان لەو جێگایانەی کە گوێزراونەتەوە بۆی ئەویش وەك ڕێزێك و دان نانێك بە مافی مولکداری تاکەکسدا کە ئیسلام دەیسپێرێ بە ئەهلی زایمە وەك ئەوەی کە زامن کراوە بۆ موسڵمانان،[5] کاتێك عومەر ناچار بوو بۆ داماڵینی مولکداری هەندێ

---

١ـ نظام الحكم في عهد الراشدين (ص:١٦٥).
٢ ـ القضاء ونظام في كتاب والسنة د. عبدالرحمن الحفيض (ص:٤٨).
٣ ـ نظام الحكم في عهد الراشدين (ص:١٦٥).
٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص:١٦٨).
٥ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٨٩).

خانوو لە پێناو کارکردن لەسەر بەرفراوانکردنی ڕووبەری مزگەوتی بەڕێز و پیرۆزی مەککە ئەمە پاڵی پێوەنا بۆ قەرەبوو کردنەوەی دادپەروەرانە جگە لەوەی کە دانی نا بەو مافی تاکە کەسەی کە ناکرێت دەستی بەسەردا بگرێت تەنانەت لە حالەتی زۆر پێویستدا مەگەر بە ڕەزامەندی خاوەنەکانیان،[1] ئازادی موڵکداری لە سەردەمی ڕاشیدیندا ڕەها نەبووە بەڵکو وابەست بووە بە سنووری شەرعی و چاودێریکردنی بەرژەوەندی گشتی، دەگێڕنەوە کە بیلال کوڕی حارث مزنی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەی پارچە زەویەکی بداتێ، ئەویش پارچە زەویەکی درێژ و بەرفراوانی پێدا کاتێك خەلافەت درایە دەستی عومەر فەرمووی: ئەی بیلال، تۆ داوای پارچە زەویەکی درێژ و بەرفراوانت کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش پێی دایت، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی نەدەنا بە ڕووی هیچ کەسێکەوە ئەگەر داوای شتێکی لێ بکردایە، تۆش توانای ئەوەت نەماوە کە لە دەستت دایە، بیلال فەرمووی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: ئەوەی کە توانات بەسەریدا دەشکێت بیبە بۆ خۆت، ئەوەشی کە توانا و هێزتی بەسەرەوە نەماوە بماندەرەوە با بەسەر موسڵماناندا دابەشی بکەین بیلال فەرمووی: سوێند بە خوا من کاری وا ناکەم ئەمە شتێکە کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بۆی بڕیومەتەوە، پاشان عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا کاری وا ناکەیت، ئەو زەویەی کە لە تەلارەکەی دابڕابوو بردی و دابەشی کرد بەسەر موسڵماناندا،[2] هەروەها ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موڵکایەتی تاکە کەس بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بەرژەوەندی کۆمەڵەوە، ئەگەر خاوەن موڵك هەستا بەوەی کە داوای لێ دەکرێت بە مانای جێنشین کردن لە چاودێری و بەرهەم هێنان ئەوا هیچ کەس بۆی نیە کە دژایەتی بکات، ئەگەر نا بەرپرسی کارەکە لەگەڵ پشتگوێ خستنی خاوەن موڵکەکە هەڵس و کەوت بەو موڵکەوە دەکات.[3]

## ٤- ئازادی بیروڕا:

ئاینی پیرۆزی ئیسلام زامنیەکی تەواوی ئازادی بیروڕای بۆ تاك کردووە، ئەم ئازادیە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا پارێزراو بووە، عومەر (ﷺ) لە خەڵکی دەگەڕا کە ڕای خۆیان دەربڕن، نەیدەبەستنەوە و ڕێگری نەدەکردن لە دەربڕینی ئەو ڕاو بۆچونانەی هەیان بوو،[4] ڕێگەی پێ دەدان ڕای خۆیان بدون لەو بوارانەی دەقیان لەسەر نەهاتوە، عومەر دەگێڕێتەوە گەیشتووە بە پیاوێك و پێی فەرمووە: چیت کرد؟ ئەویش گوتوویەتی عەلی و زەید بەم شێوەیە داریان کردووم، عومەر فەرمووی: ئەگەر من بوومایە ئاوا دارم دەکردی، پیاوەکە وتی: دەی بۆ نایکەیت لە کاتێکدا دەسەڵات لای تۆیە؟ عومەر فەرمووی: ئەگەر من بتگێڕمەوە بۆ لای قورئان و سونەت ئەوا دەمکرد بەڵام من دەتگێڕمەوە بۆ لای ڕا و بۆچوون، ڕاو وبۆچوونیش تەنها ئەوەی ئەوان هەڵدەگرێت ،[5] بەم شێوەیە عومەر ئازادی

---

١ـ نظام الحكم في عهد الراشدين (ص: ١٩٠).
٢ـ المغني (٥٧٩/٥) نظام الارض، محمد أبو يحيى (ص: ٢٠٧).
٣ـ نظام الحكم في عهد الراشدين، حمد الصمد (ص:١٩٢).
٤ـ السلطة التنفيذية للدهلوي، (٧٣٨/٢).
٥ـ اعلان الموقعين، (٦٥/١).

داوەتـە یـارانی کـە ڕای خۆیـان دەربـڕن، ڕێگـری لـێ نـەکردوون لـە ئیجتیهـادو را دەربـڕین ، نەیبەستوونەتەوە بە ڕایەکی دیاریکراوەوە،[١] هەروەها ڕەخنە یان ئامۆژگاری بۆ حاکمیش لە سـەردەمی عومەرو خەلیفەکانی ڕاشیدیندا کراوە بووە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا، عومەر(رضي الله عنه) هەستا وتارێکی بـۆ خەڵکی داو فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەر کەس لە ئێوە لاریەکی بینی با ڕاستی بکاتەوە، لەم کاتـەدا پیاوێك هەستایە سەرپێ و وتی: سوێند بە خوا ئەگەر لاریەکت تیا بەدی بکەین ئەوا بـە شمشێرەکانمان ڕاستت دەکەینەوە، پاشان عومـەر فـەرمووی: سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی کـە لـە نێـو ئـەم ئومەتـەدا کەسێکی داناوە کە عومەر بە شمشێرەکەی ڕاست دەکاتـەوە،[٢] کاتێـك کـە عومـەر خەلافـەتی گرتـە دەست لە وتارەکەیدا فەرمووی: یارمەتیم بدە لەسەر فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لـە خراپـە و ئامۆژگاریم بکەن، هەروەها عومـەر ئـازادی ڕەخنـەی بنیاتنـەری بەیـەکێك لەئەرکـەکانی سەرشـانی میللەت دانـاوە مـافی حاکمیـشە کـەداوای بکات،ئـەی خەڵکینـە، ئێمـە مافێکمـان لەسـەر ئێوەیـە: ئامۆژگاری کردنو هاوکاری کردنە لەسـەر چـاکە،[٣] عومـەر پێـی وابـووە کـە مـافی هـەموو تاکێکـە چاودێری بکات و هەستێ بە ڕاستکردنەوەی ئەگەر چی بە شمشێریش بێت ئەگەر لـە ڕێگـە لایـدا بۆیـە فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەرکەس لە ئێوە لاری یەکی بینی با ڕاستی بکاتەوە.[٤]

دەیفەرموو: خۆشەویست ترین کەس لام ئەو کەسەیە کە عەیبەکانم دەخاتە ڕوو،[٥] هەروەها دەیفەرموو: من دەترسم هەڵەیەك بکەم و کەس لە ترسی من نەوێرێ پێم بڵێ،[٦] ڕۆژێك پیاوێك هات و لە بەر چاوی خەڵکەوە پێی ووت: لە خوا بترسە ئەی عومەر، هەندێ لە ئامادەبوان تووڕە بوون ویستیان بێدەنگی بکەن ، عومەر پێی فەرموون: چاك ناکەن ئەگەر ئەوەی پێتانە نەیڵێن و ئیمەش خراپین ئەگەر گوێتان بۆ نەگرین،[٧] ڕۆژێك عومەر وەستا بوو وتاری بۆ خەڵکی دەدا و دەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە، گوێ بگرن و ملکەچ بن) کەسێك قسەی پێ بڕی و ووتی: گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ تۆ نی یە، عومەر زۆر لەسەر خۆ و بەهێمنی یەوە ووتی: بۆچی ئەی بەندەی خوا؟ پیاوەکە ووتی: لەبەر ئەوەی ئیمە یەکی یەك کراسمان بەر کەوتووە کە خۆمانی پێ داپۆشین، عومەر بانگی عبدالله ی کوڕی کرد و ئەویش ئەوەی بۆ باس کرد کە بەشەکەی خۆی داوەتە باوکی هەتا جکەکانی پێ تەواو بکات دواتر یاران قایل بوون و پیاوەکەش بەڕێز و ملکەچی یەوە ووتی: ئێستا گوێڕایەڵ و ملکەچ دەبین ئەی ئەمیری باوەڕداران،[٨] ڕۆژێکی تر عومەر وتاری دەدا و دەیفەرموو: مارەی ئافرەتان لە چل ئوقیە زیاتر مەکەن، هەرکەس ئەمە زۆربکات زیادەکەی دەخرێتە بەیتولمالەوە، لەکاتێکدا ئافرەتێك دژی ئەم ڕایە

---

١ـ السلطة التنفيذية للدهلوي، (٧٣٨/٢).
٢ ـ أخبار عمر (ص: ٣٣١-٣٣٢)، نقلا عن الرياض النضرة.
٣ـ نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين (ص:١٩٧).
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ هەمان سەرچاوە. (ص:١٩٨)، الشيخان ابوبكر و ئيمامى عومەتر من رواية البلاذري (ص:٢٣١).
٦ـ هەمان سەرچاوە (ص:١٩٨).
٧ـ هەمان سەرچاوە(ص: ٢٠٠).
٨ ـ عيون الاخبار (٥٥/١)، نفلا عن محضى الصواب (٥٧٩/٢).

بوو ووتی: ئەوە بۆ تۆ نی یە، عومەر فەرمووی: بۆ؟ ئافرەتەکە ووتی: لەبەر ئەوەی خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾(النساء:٢٠).

عومەر فەرمووی: ژنێك ڕاستی کرد و پیاوێك هەڵە،[١] لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرموویت: خوای گەورە داوای لێ خۆش بون دەکەم هەموو مرۆڤێك لە عومەر تێگەیشتوو ترە پاشان هات و سەرکەوتە سەر مینبەر و فەرمووی: ئەی خەلکینە، من ڕێگریم کردن لەوەی کە مارەیی ئافرەت زۆر بکەن بۆ چوار سەد درهەم، هەرکەس توانی لە ماڵەکەی ئەو شتەبدات کە پێی باش و خۆشە ئەوا با ئەو کارە بکات،[٢] ئازادی و ڕای سەربەست لەڕوانگەی شەریعەتەوە بەم شێوەیە نی یە کە هەموو ئەو شتانە دەربڕێ کە دەتەوێ بەڵکو بەسراوەتەوە بە زیان نەگەیاندنی کەسانی تر وەك زیانە گشتی یا تایبەتی . لەوەی عومەر (ﷺ) ڕێگری لێ کرد و سنوری بۆ دانا:

## أ- ڕاوبۆچونی سەر لێ شێواوو گومڕا لەئاین و شوێن کەوتنی لێك چووەکان:

لەمەدا چیرۆکی(نەبتی)یە لەشام[٣] نکۆڵی لەقەدەر دەکرد، هاتە ڕێگای عومەر کاتێك کە لە شام وتاری دەدا، عومەر فەرمووی: هەرکەس خوا سەرلێشێواوی بکات ڕێنموونە کاری بۆنابێت، بۆیە نەبەتیە ڕێگەی بەعومەر گرت و نکۆڵی لەقەدەری خوا کردو وتی: خوای گەورە هیچ کەسێك گومڕا ناکات! پاشان عومەر هەڕەشەی کوشتنی لێ کرد ئەگەر جارێکی تر ئەم قسە قەدەریەی دوپات بکاتەوە،[٤] لەسائیبی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە کە دەفەرموویت: پیاوێك هات بۆلای عومەر(ﷺ)وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرْوًا ۝١ فَٱلْحَٰمِلَٰتِ وِقْرًا﴾ (الذاریات: ١-٢).

عومەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا ئەوە تۆی؟ بۆی هەستایەوە و قۆڵی هەڵماڵی و هێندەی لێدا تاوەکو مێزەرەکەی کەوتە خوارەوە پاشان فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی عومەری بە دەستە ئەبێ بتبینم بە سەر تاشراوی پاشان جلەکانیان لەبەر کرد خستیانە سەر پشتی حوشترێك و بردیان تاگەیاندیانەوەوڵاتەکەی، پاشان کەسێك هەستایە سەر پێی و وتی: صبیغ[٥] داوای زانیاری کرد و بە هەڵەی برد ئەو لە نێو هۆزەکەیدا سووك و ڕیسوا بوو تاوەکو مرد.[٦]

---

١ ـ تفسیر ابن کثیر(٢/٢١٣)، عزاه للزبیر بن بکار وفیه انقطاع، أخرجه أبو حاتم في سنده والبیهقي في السنن وقال: مرسل جید.

٢ ـ قال أبو یعلی: اسنادة جید، مجمع الوائد(٤/٢٨٣).

٣ ـ هو قسطنطین الجاثلیق بطریق الشام.

٤ـ الاهواء والفرق والبدع ووو السلف منها، د. ناصر العقل (ص: ٢٢٣).

٥ـ صبیغ بن عسل الحنظلي، سأل عمر عن القرآن

٦ـ شرح أصول اعتقاد اهل السنة اللالکائي (٣٠/٦٣٤-٦٣٥).

## ب- جنێو دان و سوکایەتی کردن بە خەڵکی بە بیانووی ئازادی:

عومەر(ﷺ) جەرول کوڕی مالکی کوڕی جەرولی بەندکرد بە هۆی ئەوەی کە جنێوی بە زەبرقانی کوڕی بەدر دابوو بەوەی کە وتبووی:

دع المكارم لاترحل لبغيتهـــــا
وأقعد فإنك أنت الطاعم الكاسي[١]

لەبەر ئەوەی کە شویهاندوویەتی بە ئافرەت و ئەوانیش نان و ئاو دەدرێن دادەپۆشرێن،[٢] بۆیە عومەر بەڵێنی دا هەرکەسی بینی جنێو بدات بە موسڵمانان زمانی ببڕێت، عومەر بەزەیی پێداهاتەوە لە زیندانەکەیدا بە دێرە هۆنراوەیەك کە جەرول بۆی وت:

ماذا أقول لافراغٍ بذي مــــــرخ
زغب الحواصل لاماء ولا شجــــر
ألقيت كاسبهم في قعر مضلمــــةٍ
فأعفو عليك سلام الله يا عمــــر
أتن الأمير الذي من بعد صاحبــه
ألقى إليك مقاليد النهي والبشر

بەمە دڵی عومەر بۆی نەرم بوو، بەریدا و بەڵێنی لێ وەرگرت کە چی دی جنێو بە موسڵمانان نەدات،[٣] وا هاتووە کە عومەر ئەمەی سێ هەار درهەمی لە برێتی جەول داوە، ئەم هۆنەرە دەڵێت:

أخذت أطراف الكلامِ فلم تـدع
شتماً يضر ولا مديحاً ينفـــع
ومنعتني عرض البخيل فلم يخف
شتمي وأصبح آمناً لايفـــرغ[٤]

## ج- ڕای عومەر لە هاوسەرگیری لەگەڵ جوولەکە و مەسیحیەکاندا:

کاتێك کە عومەر(ﷺ) زانی حوزەیفەی کوڕی یەمان لەگەڵ جوولەکەیەکدا هاوسەرگیری کردووە نامەیەکی بۆ نووسی و پێی وت کە وازی لێ بهێنێت، حوزەیفەش نامەیەك دەنووسێت بۆ عومەر و دەڵێت تۆ پێت وایە کە ئەمە حەرامە بۆ من تاوەکو وازی لێ بهێنم؟ عومەر فەرمووی: من ناڵێم کە حەرامە بەڵام دەترسم کە سۆزانیان لێ وەریگرن و لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: دەترسم واز لە کچانی موسڵمانان بهێنن و سۆزانیەکان مارە بکەن.[٥]

---

١ـ السلطة التنفيذية (٧٤٥/٢).
٢ـ تفسير القرطبي (١٧٣/١٢-١٧٤).
٣ـ الشعر والشعراء لإبن قتيبة (٣٢٧/١) عمر بن الخطاب، د. أحمد أبو النصر (ص: ٢٢٣).
٤ـ أصحاب الرسول (١١٥/١) محمود المصري، محض الصواب (٣٧٦/١).
٥ـ وإسناده صحيح تفسير إبن كثير (٢٦٥/١).

ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێویستە لێرەدا بڕیار بدەین یەکەم شت بۆ موسڵمان ئەوەیە کە جگە لە موسڵمان هاوسەرگیری لەگەڵ کەسی تردا نەکات ئەویش لە پێناوی تەواوکردنی ئولفەت لە هەموو روویەکەوە، عومەر لەبەر مەترسیەك وەك پەیوەندی سیاسی بە مەبەستی ئەوەی کە هەموو دڵەکان دەگرێتەوە.[1]

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا روونی کردۆتەوە، کە کاری هاوسەرگیری لەگەڵ کچانی باوەڕداردابێت باشترە لەوەی لەگەڵ ئافرەتێکی بێباوەڕدا بێت ئەگەرچی ئافرەتە باوەڕدارەکە کەنیزەکێك بێت و ئافرەتە بێباوەڕەکە ئازاد و سەربەست بێت، ئەوەتا خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُواْ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ (البقرة: ٢٢١).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە ڕێگری دەکات لە مافی هاوسەرگیری بە ئافرەتانی هاوبەش پەیداکەر هەتا باوەڕ دێنن بە خوا و پێغەمبەرەکەی بە ڕاست دەزانن هەروەها فەرمانی بە چاکی کەنیزەکێکی باوەڕدار داوە بە خوا و پێغەمبەرەکەی – ئەگەرچی ئافرەتە باوەڕدارەکە ڕەش پێست – فەزڵی داوە بەسەر ئافرەتێکی هاوبەش پەیداکەری ئازاد دا ئەگەرچی جوان و دەوڵەمەند و سەرمایەدار بێت، لە بەرامبەردا ڕێگری لە ئافرەتێکی باوەڕدار دەکات کە کاری هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی هاوبەش پەیداکەردا ئەنجام بدات ئەگەرچی ئەو پیاوە هاوبەش پەیداکەرە باشتر و جوانتر بێت و دەوڵەمەند و سەرمایەدارتر بێت لە پیاوە باوەڕدارەکە،[2] ئەگەر کاری هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی هاوبەش پەیداکەردا یاساغ بێت بە دەقی ئەم ئایەتە ئەوا کاری هاوسەرگیری بە ئافرەتێکی ئەهلی کتابەوایە بە دەقێکی تر خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ (المائدة: ٥).

ئەمە دەقێکی تایبەتە بۆ هەموان لە دەقی یەکەمدا و ئەمەش ڕای جمهورە،[3] وە ئەگەرنا دەیان وت: هاوسەرگیری لە ئافرەتێکی موسڵمان زۆر باشترە ئەگەر لێرەدا خراپەکاریەك نەبێت بگاتە هاوسەرگیری یان نەوە و کۆمەڵگەی موسڵمان بەڵام ئەگەر خراپەیەك بەدی دەکرا ئەوا حوکم ڕێگری لێ کردن، ئەمەش هەر ئەوەیە کە هەندێ لە زانایانی هاوچەرخ پەنایان بۆ بردووە،[4] ئەمەش ڕایەکە کە

---

١ـ الاحوال الشخصية لأبي زهرة (ص: ١٠٤).

٢ـ فقه الاولويات دراسة في الضوابط، محمد الوكيل، (ص: ٧٧).

٣ـ فقه على المذاهب الاربعة، عبدالرحمن الجزائيري (٥/٧٦-٧٧).

٤ـ فقه الاولويات دراسة في الضوابط، محمد الوكيل، (ص: ٧٧).

عومەر پەنای بۆ بردووە، بە جۆرێك یەکەمین کەس بووە کە ڕێگری هاوسەرگیری کردووە لە ئەهلی کیتاب و لەمەشدا پەنای بۆ دوو بەڵگە بردووە:

أ- لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی بێباوەڕی کچانی موسڵمانان و مانەوەیان.

ب- لەبەر ئەوەی ئافرەتانی ئەهلی کیتاب خوڕەوشت و ئاینی منداڵی موسڵمانان دەشێوێنن.

ئەم دوو بەڵگەیە بۆ ئەو سەردەمە بوە، ئەگەر سەیری ئەم سەردەمەی ئێستامان بکەین چەندین خراپەی تر بەدی دەکەین کە ئەم ڕێگریە توندتر دەکاتەوە،[1] هەروەها مامۆستا جمیل محمد مبارك کۆمەڵێك لەم خراپانەی خستۆتە پێش چاو لەوانە:

ج- ئافرەتانی ئەهلی کیتاب لێرەدا کاری گرنگیان دەبێتە سیخوڕی کردن بەسەر موسڵمانانەوە.

د- خوڕەشتی بێباوەڕان دەهێننە نێو وڵاتی ئیسلامیەوە.

هـ- موسڵمان ڕووبەڕووی ئەوە دەبێتەوە کە ڕەگەزنامەی بێباوەڕان هەڵگرێت .

و- لاوازی و نەزانی ئەو پیاوە موسڵمانەی دەبێتە هاوسەری ئافرەتیکی ئەهلی کیتاب، ئەمەش وایان لێ دەکات کە ببنە هەویرێکی باش لە دەستی ئەو ئافرتانەدا

ز- پیاوانی هاوسەرگیر لە ئافرەتانی ئەهلی کیتاب هەست بە کەم و کورتی دەکەن ئەمەش دەبێتە هۆی جەهل بە ئاینی خودا.[2] ئەمەش کۆمەڵە خراپەیەکن بەسن بۆ بەڵگە گرتن لەسەر یاساغی هاوسەرگیری بە ئافرەتانی ئەهلی کیتاب لەم سەردەمەدا.

ئەو کۆت و بەندانەی کە عومەر لەسەر هاوسەرگیری بە ئەهلی کیتاب بەرجەستە هاوئاهەگە لەگەڵ بەرژەوەندی گەورەدا بۆ دەوڵەت و ئامانجی گەورە بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی،ئەو مەترسیانەی کە لەم هاوسەرگیریەدا هەیە ئەوەیە کە نیشتیمان دووچاری عەیبە دەکات ئەگەرچی بە نەزانی بێت یان بە ئەنقەست، بۆ ئەمە چەند کۆت و بەندێکی دانا و بە تایبەتیش بۆ ئەو کەسانەی کە نوێنەرایەتی دەکەن لە بوارە گشتیەکاندا کە ئەمەش یەدەکێکە بیانووگەلێکی ئاراستەکراوی هەیە، ژن زۆرێك لە نهێنیەکانی هاوسەرەکەی دەزانێت ئەگەر بێت و هەمووی نەزانێت بە هۆی ئەو دۆستایەتی و تێکەڵیەی کە لە نێوانیاندایە، بۆ ئەم لایەنەش لە بایەخی عومەر(ﷺ) پلە و پایەیەکی مامۆستایانەی دووربین هەیە کە هەژمارە بۆ هەر یەکێك پاش ئەو هاتووە وەك فەرمانڕەوایەك بە درێژایی زەمەن، هاوسەرگیری لە ئەهلی کیتاب چەندین خراپەی گەورەی تێدایە، ئەوان نامۆن بە ئێمە و سەرپێچیمان دەکەن لە هەموو شتێکدا و زۆربەشیان لەسەر ئاینی خۆیان دەمێننەوە و چێژ لە شیرینی ئیمان وەرناگرن و ئەمەش وەفا و ڕێزی تێدایە بۆ هاوسەر.

عومەر ئەوەی بۆ تێگەیشتنی ئاینەکەی داناوە، بە ڕاستی ڕێزەکەی بۆ سروشتی مرۆڤە بە باشی شارەزایشی بۆ ئەوەی کە سوود و زیان بە موسڵمانان دەگەیەنێت، هەر لەمەدا و دەست بەجێ و لە چارەسازدا دەردەکات.[1]

---

١ـ فقه الاولويات دراسة في الضوابط، محمد الوكيل، (ص: ٧٨).

٢ـ شهيد المحراب، عمر التلمساني، (ص: ٢١٤).

بە ڕاستی ئازادی لە سەردەمی ڕاشیدیندا پارێزراو بووە و سنووری تایبەتی و کۆت و بەنبینی خۆی هەبووە، لەبەر ئەوەشە کە کۆمەڵگە گەشە دەکات و لە مەودایەکی قەشەنگدا دەبێتە پێشەنگ، ئازادی مافی سەرەکیە بۆ تاك و کۆمەڵ و چێژی لێ وەردەگرێت لە بەدی هێنانی خود و دەرکەوتنی تواناکانیدا و دابڕینی ئازادی لە کۆمەڵگەدا دابڕینە بۆ گرنگترین بەهادارەکانی و ئەو بە مردوونا لێك دەچووێت.

هەروەها ئازادی لە ئیسلامدا خواستێکی نیە کە لایەنەکانی ناخی مرۆڤ پڕدەکات بە پەیوەست بوونی بە خوداوە، مرۆڤ بەم پەیوەستیە بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستی شکۆمەندی و بڵندی و ناخیش عەودالی دەکات بۆ کاری چاکە و پەلەکردن لە چاکەکاری ، هەروەها ئازادی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا یەکێکە لە پایەکانی کە لە کۆمەڵگەی ڕاشیدیندا لە جوانترین تابلۆدا فەراهەم هاتووە کە ڕووناکیەکانی شکاوەتەوە بەسەر لاپەڕەکانی سەردەمدا.[٢]

## هەشتەم: موچەی خەلیفە، دەستکردن بە مێژووی کۆچی و نازناوی ئەمیریباوەڕداران:

### ١- موچەی خەلیفە:

کاتێك خەلافەت هۆکارێك بێت مرۆڤی پێ نزیك بێتەوە بۆ لای خودا، ئەوا ئەو کەسەی کە دەیگرێتە دەست و چاکەی تێدا دەکات ئومێدی پاداشتی بۆ دەکرێت و پاداشتی لای خودایە هەر ئەویشە کە پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە بە چاکە و خراپەکارانیش بە خراپەکەی ،[٣] خوای گەورە دەفەرمووێت:

((ئینجا هەر کەس هەرچەندە لە کردەوە چاکەکان بکات و باوەڕداریش بێت ئەوە پاداشتی کۆششەکەی ون نابێت و بە فیڕۆ ناڕوات بە ڕاستی ئێمە بۆ کردەوەکانی ئەو نووسەرین)).

ئەمە سەبارەت بە پاداشتی ڕۆژی دوایی بەڵام سەبارەت بە پاداشتی دونیایی خەلیفە سوودو قازانجەکانی بۆ بەرژەوەندی ئومەت بەند دەکرێت و کاردەکات لەسەر بەجێ گەیاندنی ئەو ئەرکانەی کە ڕووی لێ دەنێن و ئەمەش شیاوی قەرەبووکردنەوەیەك دەبێت لەو ڕوانگەیەدا بە جۆرێك ئەگەر سوودەکان دەستیان بەسەردا گیرا ئەوا بە دوو قەرەبوو پەسەند دەکرێت،[٤] ڕێسای فیقهیش ئەوەیە کە: هەر کەس خۆی تەرخان بکات بۆ ئیشێك و تەنها ئەو ئیشە بکات پێویستی بە مووچە و خەرجی دەبێت وەك موفتی و دادوەر و والی،[٥] و وەرگرتنی قەرەبوو لەسەر ئەو کارەی ئەنجامی دەدات ئەمەش لەسەر ڕێو شوێنی پێغەمبەری خۆشەویستە(ﷺ) ،[٦] کاتێك عومەر پاش ئەبوبەکری صدیق کاروباری

---

١ـ شهيد المحراب، عمر التلمساني، (ص: ٢١٤).
٢ـ المجتمع الاسلامي، د. محمد أبو عجوة (ص: ٢٤٥).
٣ـ السلطة التنفيذية، (٢١٥/١).
٤ـ المبسوط (١٤٨/١٥-١٦٦)، المغني (٤٤٥/٥).
٥ـ السلطة التنفيذية، (٢١٥/١).
٦ـ السلطة التنفيذية، (٢١٦/١).

موسڵمانانی گرتە دەست بۆ ماوەیەك لە پارەی (بیت المال)ی نەدەخوارد تاوەكو خۆی تەرخان كرد تەنها بۆ ئەو ئیشە، ئەو بازرگانیەی دەیكرد سوودی پێ نەدەگەیاند لەبەر ئەوەی كە تیایدا بە كاروباری ژێردەستەكانیەوە سەرقاڵ بووبوو،ناردی بە دوای یارانی پێغەمبەر(ﷺ)و لەوبارەیەوە ڕاوێژی پێ كردن و فەرمووی: من خۆم سەرقاڵ كردووە بەم كارەوە چ چاكەی منی تێدایە؟ عوسمانی كوڕی عەفان فەرمووی: بخۆ و بخۆرەوە، هەروەها سەعیدی[١] كوڕی یەزیدی كوڕی عەمری كوڕی نەفیل هەمان شتی وت و پاشان عومەر بە عەلی(ﷺ) فەرموو: تۆ لەم بارەیەوە چی دەڵێیت؟ عەلی فەرمووی: خواردنی بەیانیان و ئێواران، عومەریش ئەمەی پەسەند كرد و عومەر ژیانی خۆی لە (بیت المال) بەدی كرد و فەرمووی: من نەفسی خۆمم لە ماڵی خودا بە پلە و پایەی هەتیوێك بینی ئەگەر دەوڵەمەند بووم هیچم لێ ناوێ و ئەگەر هەژاریش كەوتم ئەوا بەچاكی لێی دەخۆم،[٢] لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە عومەر چوویە دەرەوە بۆ لای كۆمەڵێك لە یاران و پرسیاری لێ كردن: ئەوەی كە دەیبینن حەڵاڵە بۆ من لە بەیتولمال؟ یان فەرمووی: لەم ماڵە؟ ئەوانیش وتیان: ئەمیری باوەڕداران لە ئێمە باشتر شارەزاترە، عومەر فەرمووی: ئەگەر بتانەوێت پێتانی دەڵێم كە چیم لێی پێ حەڵاڵە، من حەج و عومرەی لەسەر ناكەم، قوڕێكم لە زستاندایە و قوڕێكیشم لە هاویندایە، تیكەی منداڵەكانم لێی وەردەگرم و بەشم لە نێوان موسڵمانانداییە، من پیاوێكم لە موسڵمانان، عومەر وتی: كەواتە ئەوەی كە حەج و عەمرەی لەسەر دەكات بە یەك حوشتر دەڕوات.[٣]

بە ڕاستی عومەر(ﷺ) وەك خەلیفەیەك جوانترین نموونەی لە بەجێ هێنانی ئەمانەتی ژێر دەستی كەیاندۆتە فەرمانڕەوایان، ئەبو داود لە مالكی كوڕی ئەوسی كوڕی حدثان ڕیوایەتی كردووە كە دەفەرمووێت: ڕۆژێك عومەر باسی سێبەری كرد و فەرمووی من لەكەستان مافدارتر نیم بەم سێبەرە و كەسیش لە كەسی تر مافدارتر نیە پێی مەگەر من لەسەر وشێنەكانمان لە قورئان و سوێندی پێغەمبەر(ﷺ) پیاو و هاتنی و پیاو و نەهامەتی و پیاوخاوو خێزانی و پیاو و پێویستی،[٤] هەروەها ڕەبیعی كوڕی زیاد حارثی دەگێڕێتەوە كە نێردرا بۆ لای عومەر(ﷺ)و سەری سووڕما لەدامەزراوی و زمان پاراوی و پاشان وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران! مافدارترین كەس بەخواردنی نەرم و سواری نەرم و پۆشاكی نەرم تۆیت، لە كاتێكدا عومەر نانێكی ڕەقی دەخوارد لەم كاتەدا عومەر هەواڵنامەیەكی لەبەر دەستدا بوو دای بە سەریدا و پاشان فەرمووی: سوێند بە خوا نایبینم بەمە خودات ویستبێت تۆ بەمە نزیك بوونەوەی منت ویستووە، من چاكەیەكت تێدا دێنە هەژمار،بەڵام لێدای! ئایا تۆ وەك من و ئەو خەڵكە دەزانی؟ ئەویش فەرمووی: وەك تۆ و ئەوان چیە؟ عومەر فەرمووی: وەك گەلێك كە كۆچیان كرد خەرجیەكەیان دایە بەر دەستی پیاوێك لە خۆیان، پاشان وتیان: خەرجیمان بدە، ئایا بۆ ئەو حەڵاڵە كە شتێكی لێ گل بداتەوە؟ ئەویش وتی: نەخێر ئەی ئەمیری باوەڕداران، دواتر عومەر

---

١ـ سعيد بن يزيد العدوي أحد العشرة المبشرين بالجنة.

٢ـ سنده صحيح، الخلافة الراشدة، د. يحيى اليحيى (ص: ٢٧٠).

٣ـ مصنف عبدالرزاق، رقم (٢٠٠٤٦)، نقلا عن السلطة التنفيذية.

٤ـ سنن أبي داود رقم (٢٩٥٠).

فەرمووی: ئەوە وەك من و ئەوان وایە،[١] زانایان لە ڕوانگەی ڕێنموونی پێغەمبەر و زەمەنی ڕاشیدیندا کۆمەڵە حوکمێکیان هەڵێنجاوە کە وابەستە بە خەرجی خەلیفەوە لەوانە:

١- دەکرێت کە خەلیفە موچەیەك لەسەر کارەکەی وەربگرێت، دەقی ئەوەوی[٢] و إبن العربي[٣] والبهوتي[٤] وإبن فلح[٥] لەسەر ئەمە هاتووە.

٢- هەردوو خەلیفە ئەبوبەکرو عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) بژێویان لەسەر ئەمە بووە.

٣- وەرگرتنی ئەو مووچە لە بەرامبەر سەرقاڵ بوونەوە بووە بە کاروباری موسڵمانانەوە هەروەك ئەوەی کە ئەبوبەکرو عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویانە.

٤- خەلیفە دەتوانێت ئەو بڕەی بۆی دیاری کراوە وەربگرێت ئەگەر پێویستی بێت یان نا: إبن المنير[٦] وای دەبینێت کە باشتر وایە وەری بگرێت لەبەر ئەوەی ئەمە وەربگرێت هاوکاری زیاتری دەکات وەك لەوەی کە وازی لێ بهێنێت، لەبەر ئەوەی کە هەست بەوە دەکات کە ئەو کارە ئەرکی سەر شانیەتی.[٧]

## ٢- دەست پێکردنی مێژووی کۆچی:

لە ڕوانگەی شارستانیەوە مێژووی کۆچی پێشکەوتنێکە بە شتێکی پڕ مەترسی دێتە هەژمار، یەکەمین کەسێك کە مێژووی کۆچی داهێنا عومەر(ﷺ) بوو، دەگێڕنەوە کە لە هۆی ئەمەشدا چەند گێڕانەوەیەك هەیە، لە مەیمونی کوڕی میهران دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: چەکی شوێنی کارەکەی عومەریان هێنا بۆ عومەر لە مانگی شەعبان، پاشان عومەر فەرمووی: ئایا شەعبان مانگی پێشوو بوو یان داهاتووە وەیان ئەم مانگەیە کە ئێمەی تێداین، پاشان یارانی پێغەمبەر(ﷺ)ی کۆکردەوە و فەرمووی: شتێك دابنێین بۆ ئەو خەڵکە با بزانێت، یەکێك وتی: لەسەر مێژووی ڕۆم بڕۆین، هەندێکی تر وتیان: ئەمە دوور و درێژە ئەوان لە (ذي القرنين)ەوە دەنووسن.

کەسێکی تر وتی: لە مێژووی فارسەوە بنووسین، وتیان: هەر پادشایەك هاتبێت پێشنیاری ئەوەی خۆی کردووە، پاشان هاتنە سەر ئەوەی بزانن پێغەمبەر(ﷺ) چەندی لە مەدینە ماوەتەوە بینیان کە (١٠) ساڵ بووە پاشان مێژوویان لەسەر کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) نووسی.[٨]

---

١- محض الصواب (١/٣٨٣)، الطبقات الكبرى (٣/٢٨٠-٢٨١).
٢- روضة الطالبين، (١١/١٣٧).
٣- البداية والنهاية (١٢/٢٢٨-٢٢٩).
٤- الأعلام للزركلي (٨/٢٤٩).
٥- السلطة التنفيذية، (١/٢١٨).
٦- السلطة التنفيذية، (١/٢١٩).
٧- شرح المسلم للنووي (٧/١٣٧).
٨- محض الصواب (١/٣١٦)، إبن الجوزي (ص: ٦٩).

عوسمانی کوڕی عبیداللە[١] دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو کە سەعیدی کوڕی موسەیب دەیفەرموو: عومەرئەنصار و موهاجیری کۆکردەوە و فەرمووی: کەی مێژوو بنووسین؟ عەلی کوڕی ئەبی تالیب(ﷺ) فەرمووی: لەو کاتەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە زەوی هاوبەش پەیداکەران هاتە دەرەوە، پاشان سەعید فەرمووی: عومەر(ﷺ) ئەمەی نووسی،[٢] هەروەها سەعید دەفەرمووێت: یەکەمین کەس کە مێژووی بۆ دوو ساڵ و نیوی خەلافەتی خۆی نووسی عومەربوو، بە ڕاوێژی عەلی کوڕی ئەبی تالیب[٣](ﷺ) بۆ شازدەی مانگی موحەڕەمی نووسی، ئەبو زناد[٤] دەفەرمووێت: عومەر ڕاوێژی لەسەر مێژوو کرد و هەمووان کۆك بوو لەسەر سەرەتای کۆچ،[٥] إبن حجر ڕیوایەتی کردووە کە دەفەرمووێت: ئەوەی وای لێ کردن کە مانگی محرم لە بری مانگی ڕەبیعی یەکەم بکەنە سەرەتای مێژوو ئەوە بوو کە مانگی ڕەبیعی یەکەم کۆچی پێغەمبەر(ﷺ)ی تێدا تەواو بوو، یاران ئاماژەیان بە عومەردا کە دەکرێت سەرەتای مێژوو مانگی ڕەبیعی یەکەم بێت لەبەر ئەوەی کە چوار شتی تایبەت پێغەمبەری خۆشەویستی تێدایە ئەوانیش: لە دایك بوونی و پێغەمبەرایەتی و کۆچی و وەفاتی، بەڵام ئەوەیان بینی کە لە دایك بوونی و بە پێغەمبەر بوونی بەتاڵ لە ناکۆکی لە دیاریکردنی ساڵی ڕوودانیان، ناکۆکیش بوون بە مێژووی وەفاتی لەبەر ئەوەی کە مایەی دڵتەنگی و نیگەرانیە بۆ موسڵمانان، هیچ نەمایەوە جگە لە کۆچ، ئەویشیان لە ڕبیعی یەکەمەوە دواخست بۆ محرم لەبەر ئەوەی، کە سەرەتای خۆئامادەکردن بۆ کۆچ لە مانگی محرمدا بوو، ئەگەر پەیمانی عەقەبەی دووەم بکەوێتە مانگی (ذي الحجة)وە کە بریتیە لە سەرەتای کۆچ ئەوا یەکەمین مانگ کە هەڵاتبێت لە دوای ئەو پەیمانە و خۆئامادەکردن بۆ کۆچ، ئەوا مانگی محرم بووە لەبەر ئەوە شیاوە کە ببێتە سەرەتا... پاشان إبن حجر دەفەرمووێت: ئەمە شیاوترینە کە ئیمزای لەسەر کراوە لە بۆنەکانی سەرەتا بە مانگی محرم.[٦]

بەم ڕووداوە ئیدارەییە نایابە عومەر بەشداری کرد لە نوێکردنەوەی یەکێتیەکی تەواو بە هەموو ئەوەی کە وشە هەڵیدەگرێت لە واتادا لە نیوە دورگەی عەرەب، بەجۆرێك یەکێتی بیروباوەڕی بە بوونی یەك ئاین دەرخست لەگەڵ یەکێتی ئومەت بە داماڵینی جیاوازیەکان و یەکێتی ئاراستەی بە وەرگرتنی یەك مێژوو توانی بەرەنگاری دوژمنەکەی ببێتەوە و دڵنیاش بوو لە سەرکەوتن.[٧]

## ٣- نازناوی ئەمیری باوەڕداران:

کاتێك کە ئەبوبەکر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد بە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) بانگیان دەکرد، موسڵمانان وتیان: ئەوەی دوای ئەو عومەرە کە پێی دەڵێن: خەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) ئەمە

---

١ـ إبن أبي رافع مولى النبي يروي عن أبيه.
٢ـ المستدرك (١٤/٣) وصحيحه ووفقه الذهبي.
٣ـ تأريخ الاسلام للذهبي، (ص: ١٦٣).
٤ـ عبدالله بن ذكران القرشي، ثقة وفقيه، التقريب (ص: ٣٠٢).
٥ـ محض الصواب، (٣١٧/١).
٦ـ فتح الباري (٢٦٨/٧) الخلافة الراشدة، يحيى اليحيى (ص: ٢٨٦).
٧ ـ جولة تأريخية في خلفاء الراشدين، محمد الوكيل (ص: ٩٠).

زۆر دوور ودرێژە، لەبەر ئەوە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە ناوێك بدۆزنەوە کە خەلیفەی پێ بانگ بکەن، لە پاش ئەویش خەلیفەکانی تری پێ بانگ بکەن، هەندێ لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئێمە ئیمانداریین و عومەر ئەمیرمانە، پاشان عومەر بە ئەمیری باوەڕداران ناوزەدکرا، یەکەمین کەس بوو کە ئەو ناوەی لێنرا.[1]

لە ابن شهابەوە دەگێڕنەوە: کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پرسیاری کرد لە ئەبوبەکر ی کوڕی سلێمانی کوڕی ئەبی خەیثەمە[2]: ئەبوبەکربۆچی دەینووسی لە ئەبوبەکرەوە خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ)و پاشان عومەریش پاشی ئەو دەینووسی: لە عومەری کوڕی خەتابی خەلیفەی ئەبوبەکر، ئەی کێ یەکەمین جار نووسی ئەمیری باوەڕداران؟ ئەویش فەرمووی: شیفائی نەنکم[3] بۆی گێڕامەوە کە ئەو یەکێك بووە لە موهاجیرەکانی یەکەم، عومەر ئەگەر نیازی بازاڕی بکردایە دەچوو بۆی، پاشان وتی: عومەرنامەیەکی بۆ کاربە دەستەکەی لە عێراق[4] نووسی: کە دوو پیاوی بۆ بنێرێت تاوەکو هەواڵی عێراق و دانیشتوانەکەی بپرسێت، ئەو کاربەدەستەش لەبیبیی کوڕی ڕەبیعەی عەدەی حاتەمی نارد، پاش ئەوەی گەیشتە مەدینە ئەسپەکانیان لە لای مزگەوت بەستەوە و پاشان چوونە مزگەوت و عەمری کوڕی عاصیان لەوێ بینی و پێیان وت: لە لای ئەمیری باوەڕداران مۆڵەتی چوونە ژوورەوەمان بۆ وەربگرە، عەمر چوویە ژورەوە و فەرموو: السلام علیك، ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر پێی فەرموو: چیت داوە لەم ناوە ئەی کوڕی عاص؟ لەوەی کە وتت بچۆرە دەرەوە، ئەویش وتی: بەڵێ، پاشان لەبید و عەدەی هاتن و وتیان: لای ئەمیری باوەڕداران مۆڵەتی چوونە ژوورەوەمان بۆوەربگرە، منیش وتم: سوێند بەخوا ئێوە ناوەکەتان پێکا، ئەو ئەمیرە و ئێمەش ئیمانداریین، ئیتر لەو ڕۆژەوە بەم شێوەیە ناسرا.[5]

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر(رضي الله عنه) فەرموویەتی: ئێوە ئیماندارن و من ئەمیری ئێوەم، ئەو ناوی خۆی بەو شێوەیە ناوە،[6] بەمەش عومەر یەکەمین کەسە نازناوی ئەمیری باوەڕدارانی لێنراوەو هەنگاوی پێش وەختی بۆ ناوە، ئەگەر توێژەر سەرنج بداتە قسەی یارانی پێغەمبەر(ﷺ) دەبینێت کە هەموویان کۆك بوون لەسەر ناولێنانی عومەر بەم ناوەوە و ئەمەش بۆ ئەو مایەی دڵخۆشی بووە لە تەواوی وڵاتان و لە سەردەمی ولایەتەکەیدا.[7]

---

١ـ الطبقات الكبرى لإبن سعد (٢٨١/٣)، محض الصواب (٣١١/١).
٢ـ العدوي المدني، ثقة، عارف بالنسب من الثالثة، التقريب (ص: ٦٠٧).
٣ـ الشفاء بنت عبدالله العدوي، أسلمت قبل الهجرة.
٤ـ محض الصواب، (٣١٢/١).
٥ـ المستدرك (٨١/٣-٨٢)، قال الذهبي الصحيح.
٦ـ محض الصواب، (٣١٢/١).
٧ـ محض الصواب، (٣١٣/١).

# دوانگەی دووەم

## سیفەتەکانی عومەر، ژیانی لەگەڵ خێزانەکەی، ڕێزگرتنی بۆ خاوو خێزانی پێغەمبەر(ﷺ)

### یەکەم: گرنگترین سیفەتەکانی:

کلیلی کەسایەتی عومەر بریتی بوو لە باوەڕی بە خوا و خۆئامادەکردن بۆ ڕۆژی دوایی، ئەم ئیمانەش هۆیەك بوو لە هاوسەنگی و دلڕفێنی لە کەسایەتی عومەر(ﷺ)، لەبەر ئەوە توندی عومەر زاڵ نەبووە بەسەر دادپەروەریەکەیدا و دەسەڵاتەکەشی بەسەر بەزەییەکەیدا و پیاهەڵدانەکەی بەسەر سادەییەکەیدا ، عومەر شیاوی ئەوە بووە کە خودا پشتیوانی و هاوکاری بکات، ئەم کەڵەپیاوە مەرجەکانی یەکتاپەرستی فەراهەم هێناوە لە زانیاری و زانست و بێگومانیدا و دڵسۆزی و خۆشەویستی، ئەو لەسەر تێگەیشتنی دروست بووە و بۆ ڕاستی ئیمان و وشەی یەکتاپەرستی، عومەر شوێنەواری ئیمان پتەوی خۆی لە ژیانیدا نیشان دا کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

#### ١- زۆری ترسانی لە خودا بە لێپرسینەوەی خۆی:

عومەر(ﷺ) دەیفەرموو: یادی دۆزەخ زۆر بکەنەوە، ئەو ئەگەرماییەکەی زۆر سەخت و قوڵاییەکەی دوو و پایەکانی ئاسنن،[١] ڕۆژێك عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ لای وتی:

یا عمر الخير جزيت الجنة
جهز بنياتي و أمهنه
أقسم بالله لتفعلنه

عومەر فەرمووی: ئەی عەرەبی دەشتەکی ئەگەر نەیکەم چی دەبێ؟

ئەویش وتی:

أقسم إني سوف أمضيت

پاشان عومەر فەرمووی: ئەگەر واژووم نەکرد چی دەبێت ئەی دەشتەکی؟

ئەویش وتی:

والله عن جالي لتسألنه     يوم تكون الاعطيان منه
والواقف المسؤل بينهنه     إما الى نار وإما جنة

١ـ فوائد الكلام للخلفاء الكرام، (ص: ١٥٥).

عومەر گریا تاوەکو فرمێسکەکانی ڕیشیان تەڕکرد پاشان فەرمووی: ئەی لاو ئەم کراسەمی بدەرێ بۆ ئەمڕۆی نەك بۆ هۆنراوەکەی سوێند بە خوا جگە لەمە کراسێکی ترم نیە،[١] بەم شێوەیە عومەر(ﷺ)ئەمیری باوەڕداران بە کوڵ گریا بۆ هۆنراوەی ئەم عەرەبە دەشتەکیە کە لە هۆنراوەکەیدا باسی هەڵوێستی ڕۆژی فەسڵانی کرد لەگەڵ ئەوەی کە باسی ئەوە ناکات کە ستەمی لە هیچ کەسێك کردبێت بەڵام لەبەر گەورەیی زات و ترسی لە خوای گەورە فرمێسکەکانی وەك ئاوی باران جۆگەیان هەڵبەست لەبەردەم هەر یەکێك کە ڕۆژی فەسڵان باسی بکات.[٢]

عومەر(ﷺ) لەبەر گەورەیی ترسی لە خوای گەورە موحاسەبەی خۆی دەکات، بە هزریدا هات کە هەڵەی کردووە لە پێدانی مافی کەسێك کە داوای کردووە و پاشان فەرمانی پێکرد کە تۆڵەی لێ بکاتەوە، ئەوەش پەسەند دەکات کە پرسیار لە خەڵکانی تر بکات دەربارەی پێویستیەکان، ئەگەر کارێکیان دوایی پێ هێنا ئەوا بەجێی دەهێنا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگری لێ دەکردن کە سەرقاڵی بکەن بە سکاڵایەکی تایبەتەوە ئەگەر خۆی یەکلایی کردەوە بۆ کارێکی گشتی، ڕۆژێك عومەر سەرقاڵی هەندێ کاری گشتی بوو،[٣] پیاوێك هاتە لای پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، وەرە لەگەڵم بۆ سەر فلان کەس لەبەر ئەوەی کە ستەمی لێ کردووم، عومەر لەم کاتەدا قامچیەکەی بەرزکردەوە و قامچیەکەی دا بەسەری پیاوەکەدا و فەرمووی: لە عومەر دەگەڕێن کە بێتە سەرتان، تەنانەت ئەگەر سەرقاڵیش بێت بە کاروباری موسڵمانانەوە و هەر دێنە لای، بەم شێوەیە پیاوەکە بە ترسەوە ملی ڕێگەی گرت و ڕۆیشت، پاشان عومەر فەرمووی: ئەو پیاوەم بۆ بهێنن، کاتێك کە پیاوەکەیان گەڕاندەوە عومەر قامچیەکەی دایەوە دەستی و فەرمووی: بیگرە و بیدە بە سەرمدا هەر بەو شێوەیەی کە من لە تۆم دا، پیاوەکە وتی: نا ئەی ئەمیری باوەڕداران من لێی دەگەڕێم بۆ خوا و پاشان بۆ تۆ، عومەر فەرمووی: بەم شێوەیە یان لێی دەگەڕێی بۆ خوا و پاداشتی یان دەیگێڕیتەوە لەسەرم و منیش بەوە دەزانم، بەڵام پیاوەکە وتی: لێی دەگەڕێم بۆ خودا ئەی ئەمیری باوەڕداران، پاشان پیاوەکە ڕۆیشت، بەڵام عومەر لەگەڵ هەندێ کەسی تردا لەوانە ئەحنەفی کوڕی قەیس کە ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە ڕۆیشت تاوەکو چوویە ماڵی ئەو پیاوە،[٤] دەستی کرد بە نوێژ و دوو ڕکاتی خوێند و پاشان دانیشت، پاشان بە خۆی فەرمووی: ئەی کوڕی خەتاب تۆ کەسێکی سووك و ڕیسوا بوویت و خوای گەورە شکۆداری کردی پاشان کردیتیە بار بەسەر گردنی موسڵمانانەوە و پیاوێك هات کە سکاڵات لابکات لێتدا، سبەینێ چی بە خوای گەورەت دەڵێیت ئەگەر پێی گەیشتیت؟ بە شێوەیەك سەرزەنشتی خۆی دەکرد گومانم کرد کە باشترین کەس بێت لەسەر زەوی.[٥]

١ـ تأريخ بغداد (٣١٢/٤).
٢ـ التأريخ الاسلامي (٤٦/١٩).
٣ـ الفاروق للشرقاوي (ص: ٢٢٢).
٤ـ الفاروق للشرقاوي (ص: ٢٢٢).
٥ـ محض الصواب، (٥٠٣/٢).

ئیاسی کوڕی سەلمە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: عومەر(ﷺ) دەڕۆیشت و منیش لە بازاڕ بووم، هاتبوو بۆ کڕینی شتێ، قامچیەکەی بە دەستیەوە بوو، پاشان فەرمووی: بەم شێوەیە پاڵی پێوە بنێ لە ڕێگە ئەی سەلمە، پاشان قامچیەکەی لێدام بە شێوەیەك کە تەنها بەر جلەکانم کەوت و منیش لە ڕێگەکە لامدا، لێم بێدەنگ بوو تا ساڵی داهاتوو کە لە بازاڕ پێم گەیشت فەرمووی: ئەی سەلمە، ئەمساڵ ویستت حەج بکەیت؟ منیش وتم: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران،دەستی گرتم و بەری نەدام تاوەکو چووە ماڵەکەی دواتر کیسەیەکی دەرهێنا کە شەش درهەمی تێدابوو پاشان فەرمووی: ئەی سەلمە، پشتت بەمە ببەستە و ئەوەش بزانە کە ئەمە هی ساڵی یەکەمی قامچیەکەمە کە قامچیەکم لێتدا، منیش وتم: سوێند بە خوا ئەی ئەمیری باوەڕداران باسم نەدەکرد تاوەکو خۆت باست نەکردایە، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا هێشتا هەر لە یادمە،[1] عومەر سەبارەت بە لێپرسینەوە و چاودێری نەفس دەفەرمووێت: لە خۆتان بپرسنەوە پێش ئەوەی لێتان بپرسنەوە و خۆتان هەڵبسەنگێنن پێش ئەوەی هەڵتان بسەنگێنن، خۆتان ئامادە بکەن بۆ نیشاندانی گەورە: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ (الحاقة: ١٨).

عومەر لەبەر گەورەیی ترسی لە خودا و لێپرسینەوەی بۆ نەفسی خۆی دەفەرمووێت: ئەگەر هێسترێك لە کەناری فورات بمرێت دەترسم خوای گەورە لەسەری لێپرسینەوەم لەگەڵ بکات،[2] عەلی(ﷺ)دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ)م بینی لەسەر بارێك ڕای دەکرد پاشان وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ کوێ دەڕۆیت؟ فەرمووی: حوشترێك هاوجۆر لە حوشترەکانی صەدەقەیە دەچم دەیهێنمەوە، منیش وتم خەلیفەکانی دوای خۆت کەساس کرد، ئەویش فەرمووی: ئەی باوکی حسن، لۆمەم مەکە سوێند بەو کەسەی کە محمدی بە پێغەمبەرایەتی ناردووە ئەگەر چتێرێك لە کەناری فورات گیر بخوات ئەوا لە ڕۆژی دوایی عومەر گیر دەخوات بە دەستیەوە.[3]

ئەبی سەلامە دەفەرمووێت: گەیشتمە لای عومەر کە لە حەرەم و لەسەر حەوزێك دەست نوێژیان دەگرت لە ژنان و پیاوانی دەدا تاوەکو بڵاوەی پێ کردن پاشان فەرمووی: فڵان کەس منیش وتم: ئامادەی ڕێزلێ گرتنتم، ئەویش فەرمووی: نە ڕێز لێ گرتنت و نە پیرۆزیت، ئایا من فەرمانم پێ نەدایت کە چەند حەوزێك بۆ پیاوان و چەند حەوزێك بۆ ئافرەتان دروست بکەیت پاشان کە هەڵچوو عەلی(ﷺ) پێی گەیشت و فەرمووی: ئەترسم تیاچووبم، ئەویش فەرمووی: چی تیات بەرێت، عومەر فەرمووی: لە حەرەمی خوادا لە ژنان و پیاوانم داوە، ئەویش وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ بەرپرسی ئەمانەی ئەگەر تۆ لەسەر ئامۆژگاری و چاکسازی لێت دابن ئەوا خوای گەورە سزات نادات، ئەگەر

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٢٤٤)، وإسناده ضعيف.
٢ـ مختصر منهاج القاصدين (ص: ٣٧٢)، فائد الكلام (ص: ١٤٣).
٣ـ مناقب عمر (ص: ١٦٠-١٦١).

لەسەر فرت و فێڵیش لێت دابن ئەوا تۆ ستەمکاریت.[١]

حسن البصري دەفەرمووێت: کاتێك کە عومەر لەنێو گەڕەکەکانی مەدینەدا دەسوڕایەوە ئەم ئایەتەی نیشان درا: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾(الاحزاب: ٥٨).

پاشان عومەر ڕۆیشت بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب، چوویە ماڵەکەی و بینی لەسەر ڕاخەرێك دانیشتووە، ئوبەی ڕاخەرەکەی لە ژێر دەرهێنا و وتی: ئەوە بۆ تۆ نیە ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەو وتی: عومەر ڕاخەرەکەی بە پێی ئەفەرۆز کرد و دانیشت و ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە و فەرمووی: ئەترسم من خاوەنی ئەو ئایەتە بم کە ئەزیەتی باوەڕداران دەدەم، ئوبەی وتی: تۆ ناتوانیت بەڵێن بدەیتە ژێردەستەکانت، فەرمان دەدەیت و ڕێگری دەکەیت، پاشتر عومەر فەرمووی: ئەزانم،[٢] عومەر(ﷺ) ڕەنگە ئاگر هەڵگیرسێنێت و دەستی تێ بگیرێت، پاشان دەفەرمووێت: ئەی کوڕی خەتاب ئایا دەتوانی لەسەر ئەمە بە ئارام بیت؟.[٣]

لە ڕۆژانی جەنگی قادسیە کاتێك کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کڵاوەکە و شمشێرەکە و کەمەربەند و شەرواڵ و کراس و خوفەکانی کیسرای نارد بۆ عومەر، عومەریش سەیرێکی قەدو باڵای دەورەبەرەکەی کرد و بینی کە بە شان و شەوکەتترینیان سوراقەی کوڕی جەعسەمی مەولەجیە، بۆیە فەرمووی: ئەی سوراقە هەستە ئەمە لەبەر بکە، سوراقەش هەستایە سەرپێ و لەبەری کرد و تەماعگیری بوو، دواتر عومەر پێی فەرموو: پشتی هەڵکرد و پشتی هەڵکرد، پاشان فەرمووی: ڕووی تێکرد و ڕووی تێکرد، پاشان فەرمووی: بخ بخ، عەرەبێکی دەشتەکیە لەتیرەی مەولەج کڵاو و شمشێر و کەمەربەند و شەرواڵ و کراس و خوفەکانی کیسرای پۆشیوە و ئەمەش شکۆمەندیەکە بۆ تۆ و قەومەکەت دایکەنە، سوراقە دایکەند، پاشان عومەر فەرمووی: تۆ ڕێگریت کردووە ئەمە پێغەمبەر و نێردراوی تۆیە ئەو لای تۆ لە من خۆشەویستترە و لای تۆ لە من ڕێزدارترە، ئەبوبەکر ڕێگری لێ کردووە، ئەو لای تۆ لە من خۆشەویستتر و ڕێزدارتر بووە پاشان داتەوە پێم، من پەنات پێ دەگرم لەوەی کە ئەمەت پێ بەخشیوم بۆ ئەوەی کە فێڵم لێ بکەیت، پاشان گریا هەتا بەزەییەکی لێوەهات و پاشان فەرمووی بە عبدالرحمن: سوێندت دەدەم کە برۆی بیفرۆشی و پاشان دابەشی بکەیت پێش ئەوەی تاریکی دابێت[٤]، هەڵوێستەکانی عومەر لەم بەشەدا زۆر زۆرن.

## ٢- ئاینگەرێتی عومەر:

عومەر لە میانی پێکەوە ژیانی لەگەڵ قورئان و هاوڕێگرتنی بۆ پێغەمبەری دەستپاك(ﷺ)و بیرکردنەوەی لە ژیانی ئەم دونیایە لەوە تێگەیشتبوو کە ئەم جیهانە خانەی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە،

---

١ـ مصنف عبدالرزاق (١/٧٥-٧٦) وإسناده حسن، محض الصواب (٢/٦٢٢).

٢ـ مناقب عمر (ص: ١٦٢)، محض الصواب (٢/٦٢٣).

٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٦٢).

٤ـ محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب، (٢/٦٢٥).

لەسەر ئەمەشەوە مەزرای دوارۆژەبەم چاوەش سەیری دونیای کردوە، لەبەر ئەوە ملکەچ و فەرمانبەر بووە و خۆی داوەتە دەست خوای گەورەی بە ئاشکرا و پەنهانی، هەروەها گەیشتۆتە کۆمەڵە ڕاستیەك کە لە دڵیدا دامەزراوە و هاوکاری بووە بۆ ئاینگەریتی لەم دونیایەدا و لەو ڕاستیانەش:

أ- دڵنی بوە لەوەی کە ئێمە لەم دونیایەدا وەك نامۆ یان ڕێبوار واین هەروەك ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویت: ((لە دونیا وەها بە کە تۆ نامۆ یان ڕێبواری)).[1]

ب- ئەم دونیایە لای خوای گەورە هیچ کێش و بەهایەکی نیە مەگەر ملکەچی خوای گەورەی تێدا بکەیت هەر لەبەر ئەوەشە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئەگەر ئەم دونیایە لای خوای گەورە یەکسان بوایە بە باڵی مێشوولەیەك ئەوا بێباوەڕێك تەنها یەك چۆڕ ئاوی لێ نەدەخواردەوە))،[2] هەروەها دەفەرموویت: ((دونیا نەفرەت لێکراوە ئەوەشی کە تیایدایە نەفرەتی لێکراوە جگە لە یادی خوا، ئەوەی کە تیایدا سەرداره یان زانایە یان فێرخوازە)).[3]

ج- عومەر تەمەنی لە کۆتایی ژیانی نزیك دەبێتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((من نێردراوم و من و قیامەتیش ئا ئەوهاین))، ئاماژەی بە پەنجەی شایەتی و ناوەڕاستی کرد.[4]

د- ڕۆژی دوایی کە ژیانی نەمریە و لانکەی ئارامیە هەروەك ئەوەی کە ئیماندارەکەی هۆزی فیرعەون دەفەرمویت: ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ ۝٣٩ مَنۡ عَمِلَ سَيِّئَةٗ فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَاۖ وَمَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ يُرۡزَقُونَ فِيهَا بِغَيۡرِ حِسَابٖ﴾ (غافر: ٣٩-٤٠).[5]

ڕاستیەکان لە دڵی عومەردا سەقامگیر بووبوون، ئەو(ﷺ) لە دونیا و ماڵ و داراییەکە کەم و زۆرەکەی خۆی دوور دەخاتەوە و تیایدا ئاینگەریتی دەکات، ئەمەش شتێکە لەو هەڵوێستانەی کە بەڵگەن لەسەر ئاینگەریتی لەم دونیا پوچەدا، ئەبی ئەشهەب دەفەرموویت[6]: عومەر(ﷺ) دای بە لای زبڵدانێکدا لەوێ مایەوە یاران زۆر پێی ناڕەحەت بوون، پاشان فەرمووی: ئەمە دونیای ئێوەیە کە سوورن لەسەری و بۆی دەگریەن.[7]

---

١ـ الترمذي، كتاب: الزهد، رقم (٢٣٣٣) وهو حديث صحيح.
٢ـ الترمذي، كتاب: الزهد، رقم (٢٣٢٠).
٣ـ الترمذي، كتاب: الزهد، رقم (٢٣٢٢)، حسن غريب قاله الترمذي.
٤ـ مسلم، كتاب: الفتن وأشراط الساعة، رقم (١٣٢-١٣٥).
٥ـ من أخلاق النصر في جيل الصحابة، د. السيد محمد نوح، (ص: ٤٨-٤٩).
٦ـ جعفر بن حيان السعدي.
٧ـ الزهد للإمام أحمد (ص: ١١٨).

سلمی کوڕی عبدالله دەفەرموویت: عومەردەیفەرموو: سوێند بە خوا، بە تام و چێژی دونیا کۆنابینەوە کە فەرمان بدەیت بە گیسکەکان ببە بە سفرە و خوان و ئێمەش فەرمان بدەین بە پوختەکان، کە نانمان بۆ بکەن، فەرمان بدەین بەکوندەی ئاوی تاوەکو ئەگەر وەك چاوی کەوی لێهات ئەوا ئێمە ئەوە دەخۆین و دەخۆینەوە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت، کە باشیەکانمان بمێنێتەوە، ئێمە بیستوومانە، کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾ (الاحقاف: ٢٠).

ئەبی عمران جوقی دەفەرموویت: عومەرفەرموویەتی: ئێمە شارەزاترین بە نەرمی خواردن لە زۆرێك لە بخۆرانی بەڵام ئێمە لێی دەگەڕێین بۆ ڕۆژێك:

﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ (الحج: ٢).

عومەر(ﷺ) دەفەرموویت: من تێبینی ئەم کارەم کردووە و وام لێهاتووە ئەگەر دونیام بوێت ڕۆژی دوایم نابێت ئەگەر کارەکە بەم شێوەیە بێت ئەوا من با دونیای پڕ و پوچم زیانەدرتر بێت،[1] عومەر(ﷺ) کاتێك کە خەلیفە بوو وتاری بۆ خەڵکی دەدا شەرواڵێکی لە پێدا بوو کە(١٢) پینەی پێوە بوو،[2] تەوافی کەعبەی کرد و شەرواڵێکی لە پێدا بوو، کە(١٢) پینەی پێوە بوو، کە یەکێکیان پارچەیەکی سوور بوو،[3] ڕۆژی هەینی لە خەڵکی دواکەوت و پۆزشی بۆ بەندبوونەکەی هێنایەوە و فەرمووی: ئەوەی کە دوای خستم شوشتنی جلەکانم بوو — شۆڕابوو —هیچ جل و بەرگێکی ترم نەبوو کە لەبەری بکەم.[4]

عبدالله کوڕی عامر کوڕی ڕەبیعە دەفەرموویت: لەگەڵ عومەر بۆ کارێك لە مەدینە چووینە دەرەوە بەرەو مەککە تاوەکو گەراینەوە هیچ دێرە هۆنراوەیەك یان پۆزشێکی بۆ نەهێنایەوە، عومەر پارچە قوماشێك[5] یان پێستەیەکی دابوو بەسەر ئەو دارەی کە لە ژێر سێبەرەکەیدا بوو.[6]

ئەمە ئەو ئەمیری ئیماندارەیە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواناوبانگی هەیە و لەسەر زەوی دادەنیشێت و ڕاخەرێکی لە ژێردا دەبێت هەروەك ئەوەی کە کەسێکی سادەیە یان لە خەڵکانی ئاساییە، جارێك حەفصەی دایکی باوەڕداران (خوای لێ ڕازی بێت) دەچێتە ژوورەوە بۆ لای، بینی ئەوەی کە ئەوی تێدایە سەختی ژیان و ئاینگەرێتی ئاشکرایە لەسەری و پاشان فەرمووی: خوای گەورە زۆرترە لە

---

١ـ الحلية (١/ ٥٠) وهو ضعيف لانقطاعه، مناقب عمر لإبن الجوزي، (ص: ١٣٧).
٢ـ الزهد لامام أحمد (ص: ١٢٤) له طرق تقوية.
٣ـ الطبقات الكبرى (٣/٣٢٨)، إسناده صحيح.
٤ـ محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب (٢/٥٦٦).
٥ـ في الطبقات والمناقب الكساء والنطع.
٦ـ الطبقات لإبن سعد (٣/٢٧٩) وإسناده صحيح.

چاکەکردن، فراوانترە لەسەر ڕزق و ڕۆزی تۆ، بۆخواردنێك ناخۆی باشتر لەمە و پۆشاکێك ناپۆشی نەرمتر لەم پۆشاکەت؟ عومەر فەرمووی: دەتکەم بە حەکەم بەسەر خۆتدا، پاشان باسی پێغەمبەر(ﷺ)ی کرد و کە چۆن بە سەختی ژیاوە، بەردەوام باسی ئەوەی دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ)ی تێدا بووە و حەفصە لەگەڵیدا مایەوە تاوەکو گریا، پاشان فەرمووی: من دوو هاوڕێم هەبوو کە ئەم ڕێگەیەیان گرتۆتە بەر، ئەگەر منیش ئەو سەختیە بگرمە بەر ڕەنگە هەست بەوە بکەم کە لەگەڵیان دەگەمە ژیانێکی خۆشگوزەرانی،[١] بە ڕاستی دونیا بووبوو بە شتێکی سادە لە نێو چنگ و ژێر پێی عومەردا(ﷺ)، لە سەردەمی خەلافەتیدا ولاتانی دونیای ڕزگار کرد و دونیا بە ملکەچیەوە پێشوازی لێ کرد و هیچ چاوێك بۆی نەتروکاوە و دڵی بۆی نەهەژاوە بەڵکو هەموو بەختەوەریەکی لە پێناو سەرفرازی ئاینی خوادا بووە لەگەڵ بڕینەوەی درك و داڵی هاوبەش پەیداکەران، بە ڕاستی ئاینگەریتی سیفەتێکی دیار بووە لە کەسایەتی عومەر،[٢] سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) دەفەرموێت: سوێند بە خوا عومەرلە کۆچکەرانی پێش ئێمە نەبووە، ئەو زانی بە شتێك لە ئێمە باشتر دەبێت، بەدین ترمان بووە لە دونیا.[٣]

## ٣- خواناسی عومەر:

ئەوەی کە دەلالەت دەکاتە سەر خواناسی عومەر(ﷺ) ئەوەیە کە ئەبو زەید عومەر کوڕی شەیبە لە هەواڵی مەدان کوڕی ئەبی طلحةی یەعمەری هێناویەتی کە چووە بۆ لای عومەر(ﷺ) بە چەند بۆشکە ترێ و خواردنێکەوە، ئەویش فەرمانی بەسەردا دا کە دابەشی بکات پاشان فەرمووی: خوای گەورە، تۆ دەزانی کە من ڕزقیان نادەم و لەسەریان ناخرۆشێم جگە لەوەی کە دەست دەخەمە خواردنەکانیانەوە، من ترسام لەوەی کە لە ورگی عومەردا بیکەیتە ئاگر، مەعدان وتی: پاشان من لانەچووم تاوەکو بینیم عومەر دەفرێکی لە پوختی ماڵەکەی برد و لە نێوان خۆی و خەڵکەکە داینا، ئەمیری باوەڕداران عومەر(ﷺ) ئارەزووی ئەوە دەکات کە لەگەڵ تەواوی موسڵمانان نان بخوات لەبەر ئەوەی ئەمە بەرژەوەندی کۆمەلایەتی تێدایە، بەڵام پێی گوناه بوو کە لە خواردنێك بخوات کە لە ماڵی تەواوی موسڵمانان دروستکراوە، بۆیە فەرمان دەدات کە خواردنە تایبەتیەکەی بۆ بهێنن کە لە پوختی ماڵەکەی دروست کراوە، ئەمەش نموونەیەکی بەرزە لەسەر دەست پاکی و خواناسی، بە جۆرێك کە خواردن لە ماڵی موسڵمانان بە گشتی لەگەڵیان هیچ گرفتێکی نیمچە حەرامی تێدانیە لەبەر ئەوەی کە ئەویش تاکێکە لەوان بەڵام ئەو خۆی لەمە پاك دەکاتەوە وەك داواکردنێك لەوەی لای خوایە و لەبەر زۆری ترس و بیمی لە خودا کە ترساوە ئەمە لە گومان لێکراوەکان بێت و خۆی لێ پاراستووە،[٤]

---

١ـ الزهد للإمام أحمد (ص: ١٢٥)، الطبقات (٣/٢٧٧).
٢ـ الفاروق أمير المؤمنين، د. عاضة (ص: ١١).
٣ـ إسناده جيد أخرجه إبن أبي شيبة (٨/١٤٩) في مصنفه وإبن عساكر (٥٢/٢٤٤).
٤ـ التأريخ الاسلامي (١٩/٣٧).

عبدالرحمن کوڕی نەجیح دەفەرمووێت: لای عومەر(ﷺ) لامدا، حوشترێکی هەبوو دەیدۆشی، خزمەتکارەکەی ڕۆژێك ڕایکرد و شیرێکی بۆ هێنا بیخوات بەلاّم نکوّلی لیّ کرد و فەرمووی: بەلاّم لێدایت ئەم شیرەت لە کوێ هێنا؟ ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران حوشترەکە بێچووەکەی شیرەکەی خوارد و منیش حوشترێکم لە بەیتولمال بۆ دۆشیت، دواتر عومەر فەرمووی: بەلاّم لێدایت ئاگرم دەرخوارد دەدەیت؟! ئەم شیرە لای هەندێ کەس حەلاّڵ کرا و وتیان ئەوە حەلاّڵە بۆ تۆ ئەی ئەمیری باوەڕداران هەروەها لەگەڵ گۆشتەکەیدا،[1] ئەمەش نمونەیەکە لە خواناسی ئەمیری باوەڕداران عومەر(ﷺ) بە جۆرێك کە ترساوە لە سزای خوای بەرز و بڵند بەوەی لەو شیرەی خوارد و لەگەڵ ئەوەی کە ئەم کارەی بە ئەنقەست نەبوو، دڵنیا نەبوو تاوەکو شیرەکەی لای هەندێ لەو گەورە یارانەی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە بۆ حەلاّڵ کرا کە نوێنەری موسڵمانان بوون لەم کاتەدا، ئەم هەواڵە و هاوشێوەکانی بەڵگەن لەسەر کە یادی ڕۆژی دوایی بەوەی کە لێپرسینەوە و ناز و نیعمەت و سەختی تێدایە بەرۆکی عومەری گرتووە و مێشکی پڕکردووە لە بیرکردنەوە تاوەکو ئەمە ببێتە ئاراستەیەك بۆ ڕەفتاری لەم ژیانەدا،[2] عومەر(ﷺ) زۆر خواناس بووە و ئەم خواناسیەش گەیاندوویەتیە ئەوەی کە چی بە مافی خۆی بزانێت یان نا، عومەر ڕۆژێك نەخۆش کەوت و هەنگوینیان نووسی بۆ چارەسەرکرانی، بەیتولمال هەنگوینی تێدابوو کە لە هەندێ وڵاتی ڕزگارکراوەوە هێنرابوو، عومەر نەیدەویست بە هەنگوین چارەسەر بکرێت هەروەك ئەوەی پزیشك بۆی دیاری کردبوو تاوەکو خەڵکەکەی کۆکردەوە و چووە سەر مینبەر و مۆڵەتی لە خەڵك وەرگرت و فەرمووی: ئەگەر ڕێگەم پێ بدەن بە کاری دێنم ئەگینا ئەوە بۆ من حەرامە، خەڵکەکەش گریان و بەزەییان پێدا هاتەوە و هەموویان مۆڵەتیان پێدا و هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەوت: هەستت بۆ خودایە ئەی عومەر! بە ڕاستی خەلیفەکانی دوای خۆت ماندووکرد.[3]

### ٤- خۆ بەکەمزانینی عومەر:

عبدالله کوڕی عەباس دەفەرمووێت: عەباس پلوسکێکی لەسەر ڕێگای عومەر هەبوو ڕۆژی هەینی عومەر پۆشاکێکی لەبەر کردبوو، عەباس دوو بەچکەی سەربڕیبوو، کاتێك کە ئاوی پلوسکەکە بە خوێنی ئەو بەچکانەوە هاتە خوارەوە بەر جلەکانی عومەر کەوت ، عومەر فەرمانی دا بە دەرهێنانی پلوسکەکە ، پاشان عومەر گەڕایەوە و جلەکانی فڕێدا و جلێکی تری لەبەر کرد، دواتر هات و نوێژی بۆ خەڵکی کرد، لە پاشدا عەباس هات و فەرمووی: سوێند بە خوا ئەمە هەر ئەو شوێنەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) دیاریکردووە، عومەر بە عەباسی فەرموو: من فەرمانت پێدەکەم کە بچیتە سەر پشتم تاوەکو پلوسکەکە لەو شوێنە دابنێی کە پێغەمبەر(ﷺ) دایانابوو، پاشان عەباس ئەم

---

١ـ تأريخ المدينة المنورة (ص: ٧٠٢).
٢ـ التأريخ الاسلامي (٢٨/١٩).
٣ ـ فوائد الكلام للخلفاء الكرام (ص: ١١٣) الفاروق للشرقاوي (ص: ٢٧٥).

کارەی کرد،[١] شێخ حسنی بصری دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) ڕۆژێکی زۆر گەرم هاتە دەرەوە و عەباکەی دابوو بەسەریدا لاوێك بە گوێ درێژەکەیەوە لایدا بەلایداو عومەر فەرمووی: ئەی لاو، لەگەڵ خۆت سوارم بکە، لاوەکە لەسەر گوێ درێژەکەی بازی دا و هاتە خوارەوە و وتی: سوار بە ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: نا، تۆ سوار بە و منیش لە پشتەوە سوار دەبم، دەتەوێت لەسەر شوێنی نەرمیەکە سوارم بکەیت و خۆشت لە شوێنە ڕەقەکەیدا بیت؟ پاشان لە پشت لاوەکەوە سوار بوو تاوەکو چوویە مەدینە ئەو لە پشتەوە بوو، خەڵکی سەیریان دەکردن،[٢] سنان کوڕی سەلمەی هەذلی دەفەرمووێت: لەگەڵ دوو لاو چوومە دەرەوە و خورمامان کۆدەکردەوە، لەم کاتەدا عومەر هات و قامچیەکەی بە دەستەوە بوو کاتێك کە لاوەکان دیان هەڵاتن و منیش هەستام و هەندێك لە چاکمدا بوو کۆم کردبوویەوە پاشان وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمە با وەراندوویەتی، عومەر(ﷺ) سەیرێکی کرد و لێی نەدام، منیش وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوانەی لەگەڵمدا بوون هەرچیم پێیە لێم دەسێنن، ئەویش فەرمووی: نەخێر بڕۆوە لەگەڵم هات تاوەکو ماڵێ.[٣]

ڕۆژێکی زۆر گەرمی تاودار شاندێك لە عێراقەوە کە ئەحنەفی کوڕی قەیسی تێدا بوو چوون بۆ لای عومەر لەو کاتەدا خۆی داپۆشیبوو بە عەبایەك سەرقاڵی ئامادەکردنی حوشترێك بوو لە حوشترێکی سەدەقە، عومەر فەرمووی: ئەی ئەحنەف جلەکانت دابنێ و هاوکاری ئەمیری باوەڕداران بکە لەسەر ئەم حوشترە چونکە حوشترێکی سەدەقیە و مافی هەتیو و بێوەژن و هەژارانی پێوەیە، پیاوێك لە ئامادەبووان وتی: خوا لێت ببورێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، بۆ فەرمان ناکەیت بەسەر بەندەیەك لە بەندە خێرخوازەکاندا کە بۆت تەواو بکات؟ هەر کەس کە ببێتە بەرپرسی موسڵمانان پێویستە لەسەری ، ئەوەی لەسەر بەندەیەك پێویستە بۆ گەورەکەی لە ئامۆژگاری و گەیاندنی ئەمانەت،[٤] عەروەی کوڕی زوبێر(ﷺ) دەفەرمووێت: عومەرم(ﷺ) بینی، کە کوندەیەك ئاوی بەسەر شانەوە بوو وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمە بۆ تۆ باش نیە، عومەر فەرمووی: کاتێك کە کۆمەڵێك شاندی گوێڕایەڵ و ملکەچ هاتن بۆ لام، نەفسم تەکەبورێکی بۆ پەیدا بوو تیا دروست بوو، ویستم بیهاڕم،[٥] ئەنەسی کوڕی مالك(ﷺ) دەفەرمووێت: لەگەڵ عومەر چوومە دەرەوە تاوەکو چوویە ناو پەرژینێك گوێم لێ بوو کە لە نێوان من و ئەو دیوارێك هەبوو لە ناو پەرژینەکەدا بووکە دەیفەرموو: عومەر ئەمیری باوەڕداران، بخ، سوێند بە خوا ئەی کوڕی خەتاب، دەبێتە بەندەی خوایان ئەشکەنجەت دەدات،[٦] جوەیری کوڕی نەفیر ئەگێڕێتەوە کە چەند کەسێك وتیان بە عومەر: نەمان بینیوە کەسێك دادپەروەرانەتر لە تۆ کار بکات و بە ڕاستی بۆ حەق بڵێت و توندتر بێت بۆ دووڕووان ئەی ئەمیری باوەڕداران، تۆ لە پاش

---

١ ـ صفة الصفوة (١/٢٧٥).
٢ـ أصحاب الرسول(ﷺ)، محمود المصري (١/١٥٧).
٣ ـ صلاح الامة في علو الهمة سيد العفاني (٥/٤٢٥).
٤ـ أخبار عمر (ص: ٣٤٣)، أصحاب الرسول(ﷺ) محمود المصري (١/١٥٦).
٥ـ مدارج الساكنين (٢/٣٣٠).
٦ـ مالك في الموطأ (٢/٩٩٢) إسناده صحيح.

پێغەمبەر(ﷺ)باشترین کەسیت، لەم کاتەدا عەوفی کوڕی مالك(رضي الله عنه)[١] فەرمووی: درۆتان کرد ـ سوێند بە خوا لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) پیاوی باشمان بینی، وتیان کێیە؟ فەرمووی: ئەبوبەکر، عومەر فەرمووی: عەوف ڕاستی وت، ئێوە درۆتان کرد، سوێند بە خوا ئەبوبەکر لە بۆنی میسك خۆشتر و باشتر بووە، من لە حوشتری ماڵەکەم گومڕاتر بووم ـ واتە پێش ئەوەی موسڵمان بێت ـ چونکە ئەبوبەکر شەش ساڵ پێش ئەو موسڵمان بووە.[٢]

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خۆ بەکەمزانینی عومەر و ڕێزی بۆ پیاوچاکان و کەمتەرخەم نەبووە لە شەرمکردن لێیان، بەڵام مردووەکانی لێ دەگرتنەوە هەروەها قایل نەدەبوو کە نکۆڵی چاکەیان بکات و لە یادیان غافڵ ببێت، بەردەوام لە هەموو هەڵوێستەیەکدا بە چاکە ناوی دەبردن و خەڵکی بەرپرسیار دەکرد لە ڕێزگرتنی ئەم مانا جوانە و لە یادکردنی ئەوەی کە پێشکەشیان کردووە لە کاری پیرۆز، ئەوەی کە دەمێنێتەوە کاری سوود بەخشی بەردەوامە، کە دەستاودەست دەگاتە جێ و کاری چاکیش بە مردنی یان دیارنەمانی خاوەنەکەی لە یاد ناکرێت و لەمەشدا وەفا و ئیمانی تێدایە.[٣]

عومەر(رضي الله عنه) قایل نابێت بە کەم باسکردنی ئەو کەسەی کە لەم پلە و پایەیەدا پێشی کەوتووە، هەرگیز قایل نابێت کە چاکە کاری پێشینەکان بڕواتە ڕێزی لەیادچووانەوە، ئەو ئومەتەی کە ناوداران وپیاو چاکانی لە یاد دەکات یان لێیان بێئاگا دەبێت ئومەتێکە لەناو چوو بایخە، یێ باش نیە کە مرۆڤەکان لەسەر ئەم سرکە فرۆشی و دروستکەرە بە ناوبانگە پەروەردە دەبن؟ عومەر لەسەر قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) پەروەردە بووە کە شتانێکیان فێرکردووە کە تەواوی کتێبە پەروەردەیی و ئەخلاقیەکان بە کۆن و نوێیانەوە لێی بێ بەش بوون، ئێستاش قورئان لەبەر دەستماندایە و سونەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یش پارێزراون لە لامان و زانیاری و پەروەردە و ئەخلاقی وەهایان تێدایە کە پێوەری لەسەر نیە.[٤]

### ٥- دڵنەرمی عومەر:

إبن عباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت: عەینەی کوڕی حصن کوڕی حوزەیفە هات و لای حەڕی کوڕی قەیسی[٥] برازای مایەوە، یەکێك بوو لەوانەی کە عومەر قەرزی پێدەدان،وە خوێندەواران یار و یاوەری کۆڕی عومەر و ڕاوێژکارانی بوون چ پیر و چ لاو، عویەینە بە برازاکەی وت: برازا، ڕووت هەیە، یان وتی: ڕووت هەیە لای ئەمیر مۆڵەتم بۆ وەربگری، ئەویش وتی: مۆڵەتت بۆ وەردەگرم، ابن عباس دەفەرموێت: حەڕ مۆڵەتی بۆ عویەینە وەرگرت و کاتێك هاتە ژورەوە وتی: ئێهـ، ئەوە کوڕی خەتابە، سوێند بە خوا فرەمان پێ نادەیت و لە ناوماندا بە دادپەروەری حوکم ناکەیت، عومەر هێندە پەست

---

١ـ الاشجعي، صحابي مشهور، من مسلمة الفتح.
٢ـ مناقب عمر إبن الجوزي (ص: ١٤)، محض الصواب (٢/٥٨٦).
٣ـ شهيد المحراب (ص: ١٤٤).
٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٤٤-١٤٥).
٥ـ الحر بن قيس الفزاري، صحابي أسلم مع وفد بني فزارة.

بوو کە خەریك بوو لێی بدات، حەڕ پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە: ﴿خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ (الاعراف: ١٩٩).

ئەمەش لە نەفامان و نەزانانە سوێند بە خوا کاتێك عومەر ئەو ئایەتەی بەسەردا خوێنرایەوە بە سەریا تێنەپەڕی و سست و هێواش بوو لە بەردەم قورئان[١] و کاتێك کە گوێی لە ئایەتەکە بوو لە تۆڵە سەندنەوە هێور بوویەوە و پشتی کردە ئەو پیاوەی کە خراپەی لەگەڵ کردبوو کاتێك کە تۆمەتباری کردبوو بە ڕژد و بە ستەم کردن لە سوێندەکەدا، ئەمەیە کە عومەر بایەخی پێ دەدات و بۆی دادەمەزرێت کێ لە ئێمە لە کاتی تووڕەییدا خۆی پێ دەگیرێت؟ بە تایبەتی ئەگەر بۆ ئەو پەستیەی کە لە سەریەتی کەسانێکی زۆر هەبن؟ گومان ناکەمکەمانێیش هەبن،دەبێت کەی ئێمە ببینە نموونەیەکی قورئانی و بەپێی ئەو ئایەتە بجولێینەوە کە لە قورئاندا دەیخوێنین؟ کەی خوڕەوشتمان قورئانی دەبێت؟[٢]
کاتێك عومەر لە ئەستێل و حەوزێك لە شام وتاری دەدا سەبارەت بە داهاتەکان و چۆنەیتی دابەشکردن و هەندێ کاروباری تردا کە باس کراوە لەوانە... من سەبارەت بەخالدی کوڕی وەلید پۆزشتان بۆ دێنمەوە، من فەرمانم پێکرد کە ئەو ماڵە ی دەستی کەوتوە رایگرێت ودابەشی بکات بەسەر هەژارەکۆچکەراندا بەڵام ئەو دەیبەخشی بە دەوڵەمەندو بە تواناکان ،منیش لامبرد فەرمانم کرد، کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح شوێنی بگرێتەوە، لەم کاتەدا عەمری کوڕی حفص کوڕی ئەلمونیرە[٣] وتی: سوێند بە خوا عوزرت نەهێناوەتەوە ئەی عومەر، کاربەدەستێکت لابردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) بەکاری هێناوە شمشێرێکت خستۆتەوە کێلان کە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیکێشاوە و کارێکت وەلاناوە کە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دایمەزراندووە ڕەحمێکت پساندووە و چاو لە دووی ئامۆزاکەت بووی، عومەر فەرمووی: تۆ نزیکترین و دۆست و تازەپێگەیشتووی لە ئامۆزاکەت قەڵس دەبێت.[٤]

ئەمە هەندێ لەو سیفەتانەی بوو، کە بەرهەمی یەکتاپەرستی و باوەڕی بە خوا و خۆئامادەکردنی بوو بۆ بە بەدەمەوە چوونی فەرمانەکانی خودا، هەروەها زانایان و توێژەران سەبارەت بە سیفەتەکانی ئەم کەسایەتیە دەدوێن، کە گرنگترینیان: هێزی ئاینی و نەبەردی و باوەڕی پتەو و دادپەروەری و زانست و زانیاری و شارەزایی و بەئاگابوون سام و هەیبەت و هێزی کەسایەتی سوارچاکی و هۆشیاری پاش سەرنج و تێڕامان و دڵفراوانی و توانا و هێزی باش و بەزەیی و توند و تۆڵی و ئارامی و سەختی و ئاینگەرێتی خواناسی، سەبارەت بە سیفەتی ڕەفتاری سەرکرایەتی لای خەلیفە عومەر دواون کە گرنگترینیان: گوێگرتنە بۆ ڕەخنە و توانا لەسەر بەکردەوە کردنی خەڵك و دۆزینەوەی کار و بەشداری کردن لە وەرگرتنی بڕیارەکانی تواناداری لەسەر ڕووداوەکانی گۆڕانکاری و پەشیمان بونەوە لە

---

١ـ البخاري، رقم (٦٨٥٦، ٤٣٦٦).
٢ـ شهيد المحراب (ص: ١٨١).
٣ـ المخزومي.
٤ـ محض الصواب (٢/٦٠٢).

هەڵوێستی نادروست پاش دەرکەوتنی راستی و توندی چاودێریەکانی بۆ والی و ئەمیرەکانی تر، لە ناوەڕۆکی ئەم توێژینەوەیەدا خوێنەری بەڕێز تێبینی ئەم سیفەتانە و زیاتریش دەکات و من نامەوێت لەم دوانگەیەدا کورتیان بکەمەوە.

## دووەم: ژیانی لەگەڵ خێزانەکەی:

عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: خەڵکی ئەوە بەجێ دێنن بۆ پێشەوا کە ئەو بەجێی دێنێت بۆ خوا و ئەگەر پێشەوا چەڕی ئەوا ژێردەستەکانیشی دەچەڕن،[١] هەر لەبەر ئەوەش بوو عومەرتوند بوو لە لێپرسینەوەی خۆی و خاوخێزانەکەی.

دەیزانی کە چاوی تێبڕاوە وهیچ گومانیشی تێدانیە ئەگەر دەڵڕەق بێت لەسەر خۆی و خاو و خێزانی بچەڕن ئەوا لەسەر ئەوان لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا و لە دونیاشدا کەس بەزەیی پێدا نەهاتۆتەوە عومەر ئەگەر ڕێگری شتێکی لە خەڵکی کردبێت دەست بەجێ چۆتە لای خاو و خێزانەکەی و پێی فەرموون: من ڕێگری خەڵکم کرد لەوە و لەوە و خەڵکیش سەیری ئێوە دەکەن هەروەك چۆن باڵندەیەك سەیری پلە گۆشتێك دەکات، ئەگەر ئێوە بیانخەن ئەوا ئەوانیش دەکەون و ئەگەر بێدار ببنەوە ئەوانیش بێدار دەبنەوە، سوێند بە خوا پیاوێك ناهێنم کە بکەوێت لەوەی کە ڕێگری خەڵکی لێ دەکەم تاوەکو ئازار و ئەشکەنجەی لەسەر کەم نەکەمەوە بۆ جێگەی خۆی لە من کێ لە ئێوە دەتوانێت بێتە پێشێ، کێ لە ئێوە دەتوانێت بچێتە دواوە[٢]، عومەر بە توندی چاودێری و بە دواداچوونی هەڵس و کەوتی منداڵەکانی و خێزانەکانی و دۆستەکانی دەکرد و ئەمەش هەندێ هەڵوێستە:

### ١- داهاتە گشتیەکان:

عومەر(ﷺ) ڕێگری خاو و خێزانی دەکرد لە سوود وەرگرتن لەوداهاتە گتیانەی، کە دەوڵەت بۆ کۆمەڵێك لەخەڵکی پشتیوانی دەکرد، لە ترسی ئەوەی کە خاوو خێزانەکەی بەهۆیەوە دوچاری گوناھ و تاوان بن، عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: حوشترێکم کڕی و بەخێوم کرد کاتێك قەڵەو بوو بردمە بازاڕ، دەفەرمووێت: عومەر هاتە بازاڕ و حوشترێکی قەڵەوی بینی، پاشان فەرمووی: ئەم حوشترە هی کێیە؟ وتیان: عبداللە کوڕی عومەر، هەر بۆیە فەرمووی: ئەی عبداللە کوڕی عومەر، بخ بخ... کوڕی ئەمیری باوەڕداران، فەرمووی: ئەم حوشترە هی کێیە؟ منیش وتم: حوشترێکە کڕیومە و ناردوومە بۆ ناوپاوان و هەر ئەوەم داوا کردووە کە موسڵمانان داوای دەکەن، عبداللە وتی: عومەر فەرمووی: دەڵێن حوشتری کوڕی ئەمیری باوەڕداران بیلەوەڕێنن، ئاوی حوشتری کوڕی ئەمیری باوەڕداران بدەن، ئەی عبداللە کوڕی عومەر، چەند پێداوە وەریبگرەوباقیکەشی بخەرە بەیتولمالی موسڵمانانەوە.[٣]

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب، د. محمد قلعجي (ص: ١٤٦).
٢ـ محض الصواب (٣/٨٩٣).
٣ـ مناقب عمر لإبن الجوزي، (ص: ١٥٧-١٥٨).

## ٢- لێپرسینەوەی بۆ عبداللە کوڕی دەکات بۆ ئەوەی، کە لە جەلەولا کڕیویەتی:

عبداللە کوڕی عومەر دەفەرمووێت: بەشداری جەنگی جەلەولام کرد کە یەکێك بوو لە جەنگەکانی وڵاتی فارس، بای چل هەزار لە غەنیمەتەکانم فرۆشت، کاتێك کە چوومە لای عومەر فەرمووی بیهێنە، ئەگەر کەوتیتە سەر ئاگر و پێیان وتی: بە فیدای بە، ئایا تۆ بە فیدای دەبیت؟ منیش وتم، سوێند بەخوا، هیچ شتێك نیە زیانت پێ بگەیەنێت مەگەر لە و ببمە فیدات، عومەر فەرمووی: وەك ئەوەی من، کە شاهێدی خەڵکی بم کاتێك کە بەیعەتیان دەدا وتیان: عبداللە کوڕی عومەر هاوەڵی پێغەمبەری خودا و کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە و خۆشەویستترین کەسە لە لای، تۆش بە هەمان شێوەی ئەوان ئەگەر هەرزانی بکەن لەسەرت پێیان خۆشترە وەك ئەوەی کە گرانی بکەن، من کەسێکم بەرپرس، زیاترت پێ دەدەم لەوەی کە بازرگانێك لە قورەیش دەستی دەکەوێت تۆ یەکاویەك قازانجت هەیە، دەفەرمووێت:پاشان بازرگانەکانی بانگ کرد و حوشترەکەیان لێ کڕی بە(٤٠٠) هەزار درهەم،(٨٠) هەزار درهەمی لێ دایە من و ئەوی تری نارد بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص تاوەکو دابەشی بکات.[1]

## ٣- ڕێگری ڕاکێشانی قازانج بە هۆی پەیوەندی خزمایەتی لێوەی:

ئەسلەم دەفەرمووێت: عبداللە و عبیداللە کوڕانی عومەر لەگەڵ سوپایەکدا چوون بۆ عێراق کاتێك کە گەرانەوە لای ئەبو موسای ئەشعەری(رضي الله عنه) لایاندا کە ئەمیری شاری بەحیرە بوو، پێشوازیەکی گەرمی لێ کردن و فەرمووی: ئەگەر بمتوانیایە بە جۆرێك سوودتان پێ بگەیەنم ئەوا دەمکرد، پاشان فەرمووی: بەڵێ، لێرەدا پارەیەك هەیە لە ماڵی خودا و دەمەوێت ڕەوانەی بکەم بۆ ئەمیری باوەڕداران، لەو پارەیە پێشینەتان پێ دەدەم، کە ئێوە کاڵای عێراقی پێ بکڕن و لە مەدینە بیفرۆشنەوە، پاشان سەرمایەکە دەدەنە ئەمیری باوەڕداران و ئێوەش قازانجێکتان دەست دەکەوێت، ئەوانیش بە گوێیان کرد نامەیەکی نووسی بۆ عومەر تاوەکو پارەکەیان لێ وەربگێت کاتێك کە عبداللە و عبیداللە گەیشتنەوە لای عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: ئایا هەموو سوپاکە وەك ئێوە پێشینەی وەرگرت؟ وتیان: نەخێر، عومەریش(رضي الله عنه) فەرمووی: پارەکە و قازانجەکەشیم پێ بدەن بەم شێوەیە عبداللە بێدەنگ بوو بەڵام عبیداللە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمە نیازی تۆ نیە، ئەم پارەیە بفەوتایە یان کەمی بکردایە ئەوا ئێمە زامنیمان دەکرد، بەڵام عومەر هەر دەیفەرموو: پارەکەم پێ بدەن، عبداللە هەر بێدەنگ و (عبیداللە)ش دەیگێڕایەوە تاوەکو پیاوێك لە ئامادەبووان وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ نایکەیتە هاوبەش،[2] پاش ئەوە عومەر سەرمایەکە و نیوەی قازانجەکەی برد و نیوەکەی تری دایە عبداللە و عبیداللە و ئەمەش بوویە یەکەمین هاوبەش لە ئیسلامدا.

---

١ـ تأريخ الاسلام للذهبي عهد الخلفاء الراشدين (ص: ٢٧٠-٢٧١).
٢ـ الخلفاء الراشدون للنجار (ص: ٢٤٤).

## ٤- پەسەندکردنی ئوسامەی کوڕی زەید بەسەر عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ) لە بەخشیندا:

عومەر(ﷺ) داهاتی بەش دەکرد و جیاوازی دەکرد لە نێوان خەڵکیدا و لەسەر بنەمای پێشینە و ڕەچەڵەك، چوار هەزار درهەمی دایە ئوسامەی کوڕی زەید و سێ هەزار درهەمی دایە عبداللە کوڕی، عبداللە فەرمووی: بابەگیان، چوار هەزار درهەمت داوەتە ئوسامەی کوڕی زەید و سێ هەزار درهەمت داوەتە من؟ ئەو جیاوازیە چیە کە باوکی ئەو هەیەتی و تۆ نیتە؟ ئەو جیاوازیە چیە کە ئەو هەیەتی و من نیمە؟ عومەر فەرمووی: باوکی ئەو لای پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) خۆشەویستتر بوو لە باوکی تۆ، ئەویش لای پێغەمبەر(ﷺ) خۆشەویستترە لەتۆ.[١]

## ٥- خەرجی مانگێکم پێداوی:

عاصم کوڕی عومەر دەفەرمووێت: عومەر یەرفای خزمەتکاری نارد بە دوامدا و منیش چووم بۆ لای بینیم لە مزگەوت دانیشتووە سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و پاشان فەرمووی: من وا دەبینم کە ئەم پارەیە حەڵاڵی بۆ من تێدا نیە تاوەکو پێش ئەوەی کە مافی خۆی لێ نەدەم پاشان حەرامە لەسەرم کاتێك کە نزیك بوومەوە ئەمانەتەکەم گەڕایەوە، من خەرجی یەك مانگم لەو ماڵەی خودا بۆ داناوی و تۆم لەسەر زیاد نەکردووە، من بەرهەمی خۆتم بە بەرزکردنەوەی خەلآتێك پێدای، دەی تۆش نرخەکەی بگرە پاشان بازرگانێك بهێنە و بە تەنیشتیەوە ئەگەر شتێکی فرۆشت ببە بە هاوبەشی و خەرجی خۆت و خاو و خێزانی لەسەر دەربکە، عاصم وتی: چووم و ئەو کارەم ئەنجام دا.[٢]

## ٦- ئەی موعەیقیب بیگرە و بیخەرە بەیتولمالەوە:

موعەیقیب دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) لە چێشتەنگایەکدا ناردی بە دوامدا لە کاتێکدا لەماڵ بووە و وانەی بە عاصمی کوڕی وتۆتەوە پێی وتم: دەزانی ئەمە چی کردووە؟ ڕۆیشتووە بۆ عێراق و هەواڵی پێداون کە کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە و داوای خەرجی و موچەی لێ کردوون و ئەوانیش هەندێ زیو و کالا و کەل و پەل و شمشێرێکی ناوەکیان داوەتێ عاصم وتی: من ئەمەم نەکردووە بەڵکو چووم بۆ لای کەسانێکی خزم و خوێشی خۆم، ئەمانەیان پێداوم، عومەر فەرمووی: ئەی موعەیقیب بیگرە و بیخەرە بەیتولمالەوە،[٣] دیارە ئەمەش نموونەیەکە لە پشکنین لەو ماڵەی کە مرۆڤ لە ڕێگەی وەجاخ و پلە و پایەوە پەیدای دەکات بە جۆرێك ئەمیری باوەڕداران هەست دەکات کە عاصمی کوڕی ئەم ماڵەی لەو ڕێگەوە پەیدای کردووە کە کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە و بەمەش شەرمەزاری دەکێشا کە ماڵەکە لە لای بمێنێتەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کوڕەکەی بەبێ هەوڵ و کۆششێك ئەم ماڵەی دەست کەوتووە و ئەمەش چۆتە بواری گومان لێکرانەوە.[٤]

---

١ـ فوائد الكلام للخلفاء الكرام، (ص: ١١٣).
٢ـ الطبقات (٢٧٧/٣) إسناده صحيح، محض الصواب (٤٩١/٢).
٣ـ عصر الخلافة الراشدة للعمري، (ص: ٢٣٦)، الاثر حسن.
٤ـ التأريخ الإسلامي (٤٠/١٩).

## ٧- عاتکەی خێزانی عومەر و میسك:

لە وڵاتی بەحرێنەوە میسك و عەمبەر بە دیاری هات بۆ عومەر(ﷺ)، عومەر فەرمووی: بریا من ئافرەتێکی باشم دەست بکەوتایە و ئەم بۆن و بەرامە خۆشەی بۆ بکێشامایە و دابەشی بکردایە بە نێو موسڵماناندا، لەم کاتەدا عاتکەی کچی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەفیل کە خێزانی بوو وتی: من زۆر باشم لە کێشانە و بێنە بۆتی بکێشم، عومەر فەرمووی: نەخێر، عاتکە وتی: بۆ نا؟ عومەر فەرمووی: من دەترسم وەری بگریت و ئاوای لێ بکەیت ـ پەنجەی کرد بە ناو لاجانگیدا ـ بیدەیت لە گەردنت، ئەو کاتە من لە موسڵمانان زیاتر سودی لێ دەبینم،[١] ئەمە نموونەیەکە لە خواناسی عومەر(ﷺ)ی ئەمیری باوەڕداران و یەدەك کردنی لە ڕادەبەدەری بۆ کاری ئاینەکەی لەبەر ئەوە ڕێگە نادات بە خێزانەکەی کە ئەو بۆن و بەرامە دابەش بکات، تاوەکو گەردنی پێ بۆن خۆش نەکات و شتێك لە ماڵی موسڵمانانی بەربکەوێت.

ئەمەش زۆر وردبوونەوەیەکی لەڕادەبەدەرە لە تێبینی کردنی ئەو ئەگەریانەی، کە خوای گەورە شوێنکەوتووە پێشینەکان دێنێتەوە بۆ چاکەکاری، قورئانێك، کە حەڵاڵ و حەرام و ڕاستی و پوچەڵیەکانی پێ لە یەك جیا بکەنەوە لە کاتێکدا کە ئەم تێبینیانە ناگەنە ئەو کەسانەی کە بیر و هۆشی خۆیان سەرقاڵ ناکەن بە پاراستنی خۆیان لە سەرپێچی کردنەکان.[٢]

## ٨- پەسەند نەکردنی دیاریەك بۆ خێزانەکەی:

إبن عمر دەفەرمووێت: ئەبو موسای ئەشعەری ڕاخەرێکی کردە دیاری بۆ عاتکەی کچی زەیدی خێزانی عومەر، من بینیم کە چەند باڵێك و بستێك دەبوو، عومەر ڕاخەرەکەی لای عەتکە بینی، پێی فەرموو: ئەمەت لە کوێ بوو؟ عاتکە فەرمووی: ئەبوموسای ئەشعەری بە دیاری بۆی ناردوم عومەر گرتی و دای بە سەری عاتکەدا هەتا سەری لە جوڵە دەلەرزی پاشان فەرمووی: ئەبوموسام بۆ بهێنن ، بە ماندویی و خەریك بوو هەناسەی لێببڕێت هێنایان لەگەڵ ئەوەشدا ئەیووت: پەلەم لێ مەکە ئەی ئەمیری باوەڕداران، پاشان عومەر(ﷺ) فەرمووی: چی وای لێکردی کە دیاری بۆ ژنەکانم بنێری پاشان عومەر ڕاخەرەکەی هەڵگرت و دای بە سەریداو پێی فەرموو: بیبە ئێمە هیچ پێویستمان پێی نیی یە،[٣] عومەر(ﷺ) ڕێگری خێزانەکانی دەکرد کە دەست وەردەنە کاروباری دەوڵەت، کاتێ کە خێزانەکەی دواندی و ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، چیت لێ بینیوە؟ عومەر فەرمووی: ئەی دوژمنی خوا ئەی تۆ چیت داوە لەمە؟ بەڕاستی تۆ یاری و گەمەیەکی یاریت پێ دەگرێت و پاشان لێ دەگەڕێی وەلەریوایەتێکی تردا هاتووە: لەسەر دەست بازی خۆت بمێنەوە خۆت لە کاروباری هەڵمەقورتێنە کە کاری تۆ نی یە.[٤]

---

١ـ الزهد للإمام أحمد (ص: ١١)، نقلاً عن التأريخ الإسلامي (١٩/ ٣٠).

٢ـ التأريخ الإسلامي (١٩/ ٣٠).

٣ـ الشيخان أبوبكر وعمرحسن رواية البلاذري (ص:٢٦٠).

٤ـ أخيار عمر (ص:٢٣٩)، الشيخان رواية البلاذري (ص:١١٨).

## ٩- دیاری شازادەی ڕۆم بۆ ئوم کەلسومی خێزانی:

مامۆستا خضری لەوانەکانیدا دەڵێت: کاتێ پاشای ڕۆم وازی لە جەنگ هێنا عومەر و خزمەکانی نامەیان بۆ نوسی و عومەر لەگەڵ پۆستەچی دا بۆی نارد هەروەها ئوم کەلسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆنی خۆش و چەند دەفرێك و چوو دارێکی بۆ نارد دای بە پۆستەچی و ئەوانیش بردیان، لەم کاتەدا ژنەکەی قەیسەر ژنانی دەورو بەری خۆی کۆکردەوە و پێی ووتن: ئەمە دیاری پادشا و میری عەرەب و کچی پێغەمبەرەکەیانە، پاشان خێزانی قەیسەر نامەیەکی بۆ نوسی و دیاری یەکی تیادا نارد بۆی کە ئەمووستیلەیەکی بەنرخ و بەبەها بوو کاتێ کە پۆستەکە گەیشتە جێ عومەر فەرمانیدا بەوەرگرتنی و بانگی دا بۆ نوێژی بەکۆمەڵ ئەوانیش کۆبونەوە و دوو ڕکات نوێژیان خوێند و عومەر فەرمووی: چاکە لە کارێکدا نی یە ئەگەر من بەبێ ڕاوێژ بەسەریدا تێپەڕم، ئێوە شتێك بڵێن سەبارەت بەم دیارییەی کە ئوم کەلثوم بەدیاری داویەتی بە خێزانی پاشای ڕۆم، هەندێك ووتیان: ئێمە پۆشاکمان دەدا بەدیاری بۆ ئەوەی بیسەلمێنین و بینێرین پیایدا هەتا بفرۆشرێت و شتێکمان دەست بکەوێت، پاشان عومەر فەرمووی: بەڵام نێردراوەکە پەیام بەری موسوڵمانان و پۆستەکەش هەر هی ئەوان بووە کە لە سینەیدا گەورەیان کردووە هەر بۆیە فەرمانی دا کە بیگێڕنەوە بۆ بەیتولمال و بەقەدەر خەرجی یەکەی بۆ بنێرنەوە.[1]

## ١٠- ئوم سەلیط مافدارترە پێی:

سەعلبەی کوڕی مالك دەفەرموێت: عومەر(ﷺ) هەندێ ڕایەخی لەنێوان ژنانی مەدینەدا دابەش کرد لەنێوان ئەو ڕایەخانەدا دانەیەکی باش مایەوە هەندێ لەوانەی بە دەوریدا بوون ووتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەمە بدە بەو کچەی پێغەمبەر(ﷺ)، کە لە لاتە ـ مەبەستیان ئوم کەلسوم کچی عەلی بوو ـ عومەر فەرمووی: ئوم سەلیط مافدارترە پێی، ئەم ئافرەتە یەکێك بوو لەو ژنە ئەنساریانەی کە بەیعەتی دابویە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، عومەر(ﷺ) فەرمووی: کە ئەو ڕۆژی جەنگی ئوحود هەناسەی قوڵی بۆ هەڵدەکێشاین.[2]

## ١١- فێڵت لە باوکت کرد و خزمەکانت ئامۆژگاری کرد:

بڕێك پارەیان هێنا بۆعومەر(ﷺ) ئەمە گەیشتە دەمی حەفسە دایکی باوەڕداران و هات فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مافی خزمەکانت لەم پارەیە بدە، خوای گەورەش ئامۆژگاریمان دەکات بە خزم و دۆستان لەو پارەیە،عومەر فەرمووی: کچەکەم مافی دۆستانم لەماڵەکەی خۆمدایە، بەڵام لەمەداپشکی موسوڵمانانی تێدایە، تۆ فێڵت لە باوکت کردو ئامۆژگاری دۆستانت کرد،هەستە بڕۆ.[3]

---

١ـ الخلفاء الراشدين د. عبدالوهاب البخار (ص:٢٤٥).
٢ـ فتح الباري (٤٢٤/٧)، (٩٣/٦) الخلافة الراشدة(ص:٢٧٣).
٣ـ الزهد للامام أحمد (ص:١٧) فرائد الكلام (ص:١٣٩).

## ١٢- ئەتەوێ وەك پادشایەکی خیانەتکار بگەمە خودا:

زاوایەکی عومەر هات بۆ لای و داوای لێ کرد کە لە بەیتولمال بڕێ پارەی بداتێ، عومەر لێی داو فەرمووی: ئەتەوێ وەك پادشایەکی خیانەتکار بگەمە خودا: ئەمەش پاش ئەوە بوو کە عومەر لە ماڵەکەی خۆی ١٠ هەزار درهەمی پێدا.[١]

ئەمە هەندێ هەڵوێستی عومەرە، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە داهاتی گشتی بەرز ڕاگرتووە و خزم و کەس و کار و خاو وخێزانی لە سود وەرگرتن لە دەسەڵات و پلە و پایەی ڕێگیر کردووە، ئەگەر عومەر جلەوی شل بکردایە بۆ خۆی و خاو و خێزانی ئەوا ئەوان و ئەوانی دوای خۆشیان بەخۆشی دەژیان و ماڵی خوداش تایبەت دەبووبە کاربەدەستان، یەکێ لەبنەما سروشتیەکان ئەوەیە ئەگەر فەرمانڕەوا دەستی برد بۆ ماڵی دەوڵەت وبەیتولمال ماڵی دەوڵەت خاڵی دەبێتەوە و ئەم گەندەڵیە دەگاتە لای هەموو لقەکانی و دەبێتە هۆی پاراستنی بەرژەوەندی تاك و هەڵدانەوەی پەردەی خیانەت و هەڵوەشانەوەی یاسا و دەستور و ڕژێم، ئاشکرا و ڕونیشە، کە مرۆڤ ئەگەر قایل و دەست پاك بێت لە ماڵی خەڵکی، پارێزگاری لە مافیان بکات بانگیان دەکات بۆ خۆشویستنی و ڕێز لە نێویاندا، ئەگەر ئەو کەسە فەرمان ڕەوابێت ئەوا هەموان بۆی دەچەمێنەوە و لەگوێڕایەڵیدا ملکەچی دەکەن و ئەویش لایان بەڕێز دەبێت زیاتر لە خۆیان.[٢]

لەمیانە ژیانیدا لەگەڵ خێزانەکەی و دۆستانیدا مامۆستایەتیەك لە مامۆستایەتیەکانی عومەرمان لە بەدواداچونی پلەو پایەی خەلافەتدا بۆ دەردەکەوێت کە ئەو پێشەوا و پێشەنگێکی باش بووە لە ژیانی تایبەتی خۆی و هەموانیشدا هەتا عەلی کوڕی ئەبی تالیب لە مافی عومەر دا دەفەرموێت: دەست پاك بویت و ژێردەستەکانت دەست پاك، ئەگەر بە خۆشی ژیانت بگوزەراندایە ئەوانیش بەهەمان شێوە دەبوون هەروەها بۆ پابەند بوونیشی بەوەی کە بانگەشەی بۆ دەکات، لێپرسینەوەی لەگەڵ خۆی و خاوخێزانی زۆرزۆر تربوو لەلێپرسینەوەی لەگەڵ والی و کاربەدەستەکانی، ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو لە زۆرکردنی سام و هەیبەتی دا لە ناخ و دەرونی خەڵکیدا.[٣]

ئەوە عومەری خەلیفەی ڕاشیدی یە لە پێشەنگی دا ئیسلام گەیاندی یە لوتکە باوەڕهێنان بە خوای گەورە سەر دڵی گرتبویەوە، بەڕاستی ئەمە باوەڕی قوڵە کە لە عومەر پێشەنگ و پێشەوایەکی دروست کرد بۆ نەوەکان، تەنها باوەڕ بەخودا بوون پەروەردە لەسەر ڕەفتاری ئەم ئاینە وەك هۆکارێکی گەورە دەمێنێتەوە لەوەی کە فەرمان ڕەوا پێشەنگ بێت لەجوانترین پێشەنگی دا لێرەوە هەتا ڕۆژی دوایی.[٤]

---

١ـ تأريخ الاسلام للذهبي (ص:٢٧١).
٢ـ الخلفاء الراشدوون للذهبي (ص:٢٧١).
٣ـ القيادة والتغيير (ص:١٨٢).
٤ـ فن الحكم (ص:٧٤).

## سێ یەم: ڕێز و خۆشەویستی بۆ خاووخێزانی پێغەمبەر

گومانی تێدا نی یە کە خاووخێزانی پێغەمبەر(ﷺ) پێگە یەکی بەرز و پلەیەکی بڵندیان هەبوو لە ڕێز و شکۆمەندی لای ئەهلی سوننە و جەماعە بەجۆرێ چاودێری مافەکانیان دەکردن بەو شێوەیەی کە خوای گەورە بڕیاری بۆ دابوون،خۆشیان دەویستن و پشتگیری یان دەکردن و پارێزگاری یان لێ دەکردن و ئەوان ئەو ڕاسپاردەی پێغەمبەر(ﷺ) یان لە لابوو کە فەرمووی: ((یادی خواتان دەخەمەوە لە خاووخێزانم))،[1] بەڕاستی ئەوان بەختەوەرترین کەس بوون بە وەرگرتنی ئەم ڕاسپاردە و چەسپاندنی دا ، ئەوان بێ بەری بوون لە ڕێگەی ئەوکەسانەی ناپاکی یەکی لە ڕادە بەدەریان دەکرد بە هەندێك لە ئەندامانی بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)و ڕێگەی ئەو دامەزرێنەرانەی کە ئەشکەنجەیان دەدان و بێتاقەتیان دەکردن، ئەهلی سوننە کۆکن لەسەر پێویست بوونی خۆشەویستی خاووخێزانی پێغەمبەر و یاساغ کردنی ئازاردان و خراپە پێ کردنیان ئەگەر چی بەقسە بێت یان بە کردەوە،[2] ئەمەش عومەرە(ﷺ) کە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەمان بۆ ڕوندەکاتەوە دەربارەی خاووخێزانی پێغەمبەر(ﷺ) لە میانی هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانی لەگەڵیاندا.

### ١- مامەڵەی بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ):

عومەر(ﷺ) سەردانی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد و خەڵات و بەخششی پێ دەدان، هیچ شتێکی نوێ و میوەیەکی نەدەخوارد ئەگەر بێت و بەشی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی تێدا نەبوایە، دوایین کەسێك کەشتی بۆ دەنارد حەفصەی کچی بوو، ئەگەر کەم وکورتی یەکی هەبوایە ئەوا لە بەشی خۆی دەدایە،[3] هەمیشە دیاری بۆ دەبردن ئەمە چیرۆکێکە کە لەگەڵ زەینەبی کچی جەحشی(ﷺ) دایکی باوەڕداران ڕویداوە: کاتێ بەخششەکان هاتنە دەرەوە عومەر بەشی زەینەبی کچی جەحش(ﷺ)ی نارد بۆی، کاتێ کە چویە ژوورەوە بۆلای زەینەب فەرمووی: خوای گەورە لە عومەر خۆش بێت، خوشکەکانی ترم زیاتر نیازمەند بوون لەمن ، ئەوانیش وتیان: هەموو ئەمانە بۆ تۆن، زەینەب فەرمووی: سبحان الله، بە پۆشاکێك لەو شتانەی کە بۆی هاتبوو خۆی داپۆشی، دواتر زەینەب فەرمووی: هەڵیبڕێژن، پاشا پۆشاکێکیان بۆ پێشنیار کرد بە (بەرەزەی کچی نافیع) ی فەرموو دەستی پێدابکە و پارچەیەکی لێ دەربهێنە بۆ منداڵەکانی فلان کەس و فلان کەس (لە خزمانی و هەتیوەکانی) ئەویش دابەشی کرد هەتا لەژێر جلەکە مایەوە، بەرەزە فەرمووی: خوا لێت ببورێ ئەی دایکی باوەڕداران، سوێند بە خوا ئەمە مافی ئێمەشی تێدایە، ئەویش فەرمووی: ئەوەی کە لە ژێر جلکەکەدایە بۆ ئێوە، کاتێ جلەکەمان بەرزکردەوە ٨٥ درهەمان لەژێر دەرهێنا پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: خوای گەورە، بەخەڵات و بەخششێکم پێببەخشە بابە عومەر نەزانم،

---

١ـ مسلم، کتاب: نضائل الصحابة رقم ( ٢٤٥٨).

٢ـ العقیدة فی أهل البیت الافراط والتفریط (ص:٥).

٣ـ الزهد (ص:١٦٦) من طریق مالك واسناده الصحیح.

پاشان(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و یەکەمین خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە گەیشتە پێغەمبەری خۆشەویست،[١] لە وێنەی ڕێزداریەکانی بۆ خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) عائیشە(ﷺ) دەفەرمووێت: عومەر بەشی خۆمان لە سەرانە بۆ دەناردین.[٢]

کاتێ کە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی حەج کردنیان لە عومەر وەرگرت بەپەرچی ئەوەی دایەوە کە مۆڵەتیان پێبدات بەڵام کە بەردەوام بوون لەسەر داواکەیان عومەر پێی فەرموون: ساڵێکی تر ڕێگەتان پێ دەدەم و ئەمەش لە بۆچوونی من نیە و پاشان عوسمانی کوڕی عەففان و عبدالرحمن کوڕی عەوفی لەگەڵ ناردن و فەرمانی پێ دان کە بە نێوانی عوسمان و عبدالرحمن دا بڕۆن واتە یەکێکیان لە پێش و ئەوی تریان لە دواوە کەسی تر نەڕوا لەگەڵیان ئەگەر دابەزین با لە شەعب دابەزن و ئەگەر چونە ژوورێ با کەسی تر لەگەڵیان نەڕواتە ژوورێ، ئەگەر تەوافی کەعبەیان کرد جگە لە ئافرەت کەسی تر تەوافیان لەگەڵ نەکات.[٣]

## ٢- عەلی کوڕی ئەبوتالب (ﷺ) و منداڵەکانی:

عومەر(ﷺ) زۆر ڕێزی خاوخێزانی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەگرت و بە جۆش و خرۆش بوو لەسەر نەوەکانی و خێزانی و لێرەدا هەندێ لەو هەڵوێستانە دەخەینە ڕوو:

حسین کوڕی عەلی(ﷺ) ئەگێڕێتەوە عومەر ڕۆژێك پێی فەرمووم: بۆچی ڕۆژێك نایەی بۆ لامان و بەسەرمان بکەیتەوە؟ منیش ڕۆژێك چوم و بینیم لەگەڵ معاویە سەرقاڵن و عبداللە ی کوڕی عومەر لەوێ بوو ڕێگەی پێ نەدرابوو بە چونە ژورەوە، منیش گەرامەوە و ڕۆژێك عومەر پێم گەیشت و فەرمووی: ناتبینم کە سەردانمان بکەیت؟ منیش وتم: هاتم و تۆ لەگەڵ معاویە بووی، بینیم عبداللە ئەگەرایەوە منیش گەرامە دواوە، عومەر فەرمووی: تۆ مافدارتری لە مۆڵەت پێدان لە عبداللە ی کوڕی عومەر دەستی برد بۆ سەری و فەرمووی: ئەوەی کە لە سەری ئێمەدا ڕواوە دەیبینی: خودا و پاشان ئێوەن.[٤]

هەروەها ابن سعد لە جعفری کوڕی محمدی باقر ئەویش لە عەلی کوڕی حوسێن دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: چەند کراسێکی درێژ لە یەمەنەوە گەیشتنە دەستی عومەر خەڵکی خۆیان پۆشتەکرد و چوون بۆ لای شتەکان و عومەریان بینی کە لە نێوان گۆڕ و مینبەر دانیشتووە، خەڵکی دێن بۆ لای و سڵاوی لێ دەکەن و بۆی دەپاڕێنەوە، پاشان حسن و حوسێن لە ماڵی دایکیان هاتنە دەرەوە و هەنگاویان لە گەڵ خەڵکی دەنا و لەو شتە باشانەش هیچیان نەبوو عومەر سەرتاپا لەنێوچەوانیدا بوو، فەرمووی: سوێند بە خوا: بۆم نەلوا کە باش بتان پۆشم، ئەوانیش وتیان ئەی ئەمیری باوەڕداران،

---

١ـ خبر حسن: أخرجة ابن سعد (١٠٩/٨) أخبار عمر (ص:١٠٠).
٢ـ خبر صحيح: أخرجة ابن سعيد (٢٠٣/٣).
٣ـ الادارة في عهد بن الطاب (ص:١٢٦)، والفتح (٨٧/٤).
٤ـ المرتضي للندوي (ص:١١٨) نقلا عن الاصابة (١٣٣/١).

ژێردەستەکانت پۆشی کاری چاکت کرد، عومەر فەرمووی: لە پێناوی ئەم دوو لاوە خەڵکی شوێن پێ هەڵدەگرن و هیچ شتێکیان لەسەر نی یە ئەوا لای ئەوان گەورە یە، ئەوانیش لای ئەو بچوك بوون پاشان نامەیەکی نوسی بۆ یەمەن و تیایدا فەرمویوی کە دوو کراسی درێژ بنێرن بۆ حەسن و حوسێن و پەلە بکەن لە ناردنی، دواتر دوکراسەکەی پێ گەیشت و ئەویش لەبەری کردن.[1]

ئەبو جەعفەر دەگێڕێتەوەکاتێ پاش ئەوەی کە خوای گەورە دەروی لێ کردەوە ویستی چەند شتێك دابەش بکات بەسەر خەڵکیدا لەبەر ئەوە کۆمەڵە خەڵکێکی لەیارانی پێغەمبەر(ﷺ) کۆکردەوە، عبدالرحمن کوڕی عەوف فەرمووی: لە خۆتەوە دەست پێ بکە، عومەر فەرمووی: ناسوێند بەخوا، بەنزیکی لە پێغەمبەر(ﷺ)و بەنی هاشم و بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)و پاشان فەرزی کرد بۆ عباس و پاشان بۆ عەلی بۆ نێوانی پێنج هۆز و تیرە هەتا کۆتایی هات بە عودەی کوڕی کەعب، دواتر نامەیەکی بۆ نوسی: هەرکەس کە لەبەنی هاشم و خەڵاتەکانی پێدان و هەروەها بەشی حسن و حوسێنی دا بەهۆی نزیکیان لە پێغەمبەر(ﷺ) ەوە،[2] زانای گەورە شیلە نوعمانی لە کتێبی (الفاروق)دا دەربارەی (چاودێری ماف و ئاداب لە خاوخێزان و یاراندا دەفەرموێت: عومەر(ﷺ) لەکارە گرنگەکانیدا هیچ شتێکی ڕانەدەپەڕاند هەتا ڕای عەلی(ﷺ)ی وەرنەگرتایە لەکاتێکدا کە عەلی بەمەبەستی ئامۆژگاری و پاڵنەرێك لە دڵسۆزی ڕاوێژەکانی خۆی ئەنجامدەدا، کاتێ عومەر چوو بۆ قودس عەلی کردە جێ نشینی خۆی لە تەواوی کاروبارەکانی مەدینەدا و ئەویش مەودای بەر جەستەبوون و هاوکاری لەنێوانیاندا نواند کاتێ کە عەلی(ﷺ) کاری هاوسەرگیری لە ئوم کەلسومی کچی فاطمە(ﷺ) بۆ ئەنجامدا،[3] یەکێك لە منداڵەکانی ناو لێنا عومەر و یەکێکی تریانی ناونا ئەبوبکر سێیەم یانی ناونا عوسمان،[4] مرۆڤ منداڵەکانی ناونانێ ئەگەر خۆشەویسترین ناو نەبێت و بەوەش نەبێت کە پێشەنگ و نمونەی،[5] تێدا بەدی دەکات، عەلی(ﷺ) یەکەمین ڕاوێژکاری عومەر(ﷺ)بوو، عومەر لەهەموو کارێکی گەورە و بچوکیدا ڕاوێژی پێ دەکرد، کاتێ موسڵمانان فەتحی قودسیان کرد لەگەڵ شاری مەدائین و کاتێ عومەر ڕووی کردە شاری نەهاوەند بۆ جەنگی فارسەکان و ڕوی کردە جەنگی ڕۆمەکان و لەبابەتی ڕۆژنامەی کۆچی داو چەند کارێکی تریش،[6] عومەر ڕاوێژی بە عەلی دەکرد و عەلیش(ﷺ) بە درێژایە ژیانی ڕاوێژکاری عومەر بووە و ئامۆژگاری کردووە و لەوە ترساوە کە دوچاری هەر خراپەیەك بێتەوە، عومەر عەلی زۆر خۆشدەویست و سۆز و خۆشەویستی و متمانەی ئاڵوگۆڕ لە نێوانیاندا هەبووە لەگەڵ ئەمەشدا

---

١ـ المرتضي للندوي (ص:١١٨) نقلا عن الاصابة (١٠٦/١).
٢ـ المرتض للندوي (ص:١١٩).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ البداية والنهاية (٣٣١/٧-٣٣٢).
٥ـ المرتض للندوي (ص:١١٩).
٦ـ علي ابن أبي طلب مستشار أمين الخلفاء الراشدين محمد الحاجي (ص:٩٩).

خەڵكێكی زۆر سەرپیچی ئەوەیان كردووە كە ساختە لە مێژوو نەكەن و هەندێ ڕیوایەتان دەگێرایەوە كە لەگەڵ مەزاج و خواردن و خواردنەوەیان بگونجێ هەتا ماوەی خەلافەتی ڕاشیدیمان بۆ نەخش و نیگار بكەن كە بریتی یە لەوەی: هەریەكە لەوان چاوەڕێی ئەوی تری دەكرد لە خولگەكەیدا هەتا بشكێتەوە بەسەریدا، هەموو كارەكانیان لە پشتی تارمایی یەكانەوە دەبوو.[1]

دكتۆر بوطي دەڵێت: گەورەترین و دیارترین شتێك لە نێوان عومەر و عەلی دا بەدی دەكرێت، عەلی یەكەمین ڕاوێژكاری عومەر بووە لە تەواوی كاروبارو گرفتەكاندا و لەوەش كە عەلی پێش نیاری دەكرد لەسەر عومەر لەسەر ڕای خۆی ، ئەگەرنا پەنای دەبرد بۆ ڕاپەڕاندنی قەناعەتی خود، ئەمەش لەو وتە یدا دەردەكەوێت كە دەفەرمووێت: ئەگەر عەلی نەبوایە عومەر لەناو دەچوو، بەڵام عەلی ئامۆژگاری پوختی دەكردەوە لە هەموو كارو بار و دۆخێكدا، من بینیم كە عومەر ڕاوێژی پێ دەكرد لەوەی كە خۆی بڕوات بۆ جەنگی فارس، عەلی بەشێوەیەكی خۆشەویستانە ئامۆژگاری كرد كە نەڕوات وەكاری جەنگەكە بداتە دەستی یەكێك لە كەڵە پیاوانی ئیسلامی دەوری خۆی ولەبری خۆی دابینێ و ئاگاداری كردەوە لەوەی ئەگەر بڕوات بەم زوانە دەروازەی مەترسیدارتر لەو دوژمنەی كە ڕووبەڕوی دەبێتەوە لە دەوڵە تەكەیدا پەرەدەستێنێ، بینی بەم شێوەیە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ئیعلانی خەلافەتی بكردایە ئەوا لەدوای عومەر(ﷺ) عەلی دەبوو، دەی دەبوو كە عەلی سەرپێچی كاری پێغەمبەر(ﷺ) بكات و ڕەش پۆشان داكۆكی لە مافی بكەن بەڵكو بۆ واجبی لە خەلافەتدا بەوێنەی ئەو هاریكاری یەی دڵسۆزانە بنیات نەرەی؟ ئەی ئایا بۆ هەموو یاران(ﷺ)ئەو فەرمانەی پێغەمبەیانر(ﷺ) لەیاد كرد؟ بەڵكو ئایا بۆیان هەبوو، كە بۆ ئەم مەبەستە كۆبنەوە وعەلی(ﷺ) لەپێشی هەموویانەوە دەبێت؟ پاش كەمێك دوای ئەمە دەفەرمووێت: كەواتە ئێوە دەتوانین ئەوە بزانین بە هەموو بێگومانی یەوە كە موسڵمانان هەتا ئێستاش -كۆتایی سەردەمی عومەر-(ﷺ)و تەنانەت هەتا كۆتایی خەلافەتی عەلیش یەك كۆمەڵ بوون، لە هزرو هۆشی موسڵماناندا نەبووە كە كێ شایستەی خەلافەتە بەهەرشێوەیەك لەشێوەكان[2] بێت.

## ٣- ناكۆكی نێوان عباس و عەلی(ﷺ) لەبەشە دەستكەوتی پێغەمبەر(ﷺ) لە هۆزی(النضير):

مالكی كوڕی ئەوس دەفەرمووێت: كاتێ پێش خۆر ئاوابوون من لەناو كەسەكانم دانیشتبووم، نێردراوێكی عومەر هات و ووتی: وەڵامی ئەمیری باوەڕداران بدەرەوە، منیش لەگەڵی چوم و ڕۆیشتمە لای عومەر كە لەسەر زەوی دانیشت بوو، هیچ ڕاخەرێكی لە ژێردا نەبوو، پاڵیدابویەوە بەسەرینێكی لە چەرم دروست كراو، منیش سڵاوم لێ كرد و دانیشتم، عومەر فەرمووی لە كەسەكانی تۆ چەند

---

١ـ علي ابن أبي طلب مستشار أمين الخلفاء الراشدين محمد الحاجي (ص:١٣٨).

٢ـ فقه السيرة النبوية (ص:٥٢٩).

هۆنەرێك هاتوون و فەرمانم داوە بەوەی کە بەخشش و خەڵاتیان پێ بدەم، بۆیان بەجێ بهێنە و لەنێوانیان بەشی بکە ووتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، فەرمان بەکەسێکی تر بکە جگە لەمن، ئەویش فەرمووی: بەجێی بهێنە ئەی پیاو، کاتێ من لای دانیشتبووم (یەرفەء) ی خزمەتکاری هات و ووتی: عوسمان و عبدالرحمن کوڕی عەوف و زوبێر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاتوون مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەیان پێ دەدەی؟ عومەر فەرمووی: بەڵێ، ڕێگەی پێدان و هاتنە ژوورێ سڵاویان کرد و دانیشتن، جارێکی تر (یەرفەء) هات و ووتی: عەلی و عباس هاتوون بێنە ژوورێ؟ عومەر فەرمووی: بەڵێ، ئەوانیش هاتنە ژوورێ سڵاویان کرد و دانیشتن، عەباس فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دادوەری لە نێوانمان بکە ئەوا بەرامبەر کێیان دەکرد لەبەشە دەستکەوتی جەنگی پێغەمبەر(ﷺ) لە دارایی بەنی (النضیر)ئامادە بوان عوسمان و یارانی فەرموویان: ئەی ئەمیری باوەڕداران دادوەری نێوانمان بکە و یەکێکیان لەوی تریان بمدێنەوە، عومەر فەرموی: بەسۆزبن، سوێندتان دەدەم بەو خودایەی کە بە مۆڵەتی ئەو ئاسمان و زەوی ڕاگیراوە ئایا ئێوە ئەوە دەزانن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((میرات گر نین و ئەوەشی لێمان جێ دەمێنێ دەکرێتە خێرو سەدەقە)) پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دەوێت؟ کۆمەڵەکە ووتیان: پێغەمبەری خۆشەویست ئەمەی فەرمووە پاشان عومەر ڕوی کردە عەلی و عباس و فەرمووی: سوێند تان دەدەم بە خودا ئایا ئێوە ئەوە دەزانن کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی فەرمووە، هەردووکیان فەرمویانە: ئەمەی فەرمووە، عومەر فەرمووی: من لەم بارەیەوە بۆتان دەدوێم، خوای گەورە پێغەمبەر(ﷺ)ی لەم بەشە دەس کەوتە جەنگیەدا تایبەت کردووە بە بەشێك کە بەهیچ کەسی تری نەداوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند کە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾(الحشر:٦)

ئەمە تایبەت مەندی بوو بۆ پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا من بەشی ناکەم لەنێوان ئێوەدا، بەوەوە خۆم بەسەرتاندا ناخرۆشێنم بەڵکو ئەو پێداون و لەنێوانتاندا بڵاوی کردۆتەوە، هەتا شتێك لەو ماڵە ماوەتەوە و پێغەمبەر(ﷺ) لەو داهاتە خەرجی یەك ساڵی داوە بە خاووخێزانی و ئەوی تری کردۆتە داهات و دارایی بەیتول مال بەمە ژیانی خستۆتەکار، سوێندتان دەدەم بەخودا ئایا ئێوە ئەمە دەزانن؟ ووتیات: بەڵێ پاشان فەرمووی: بە عەلی و عەباس: سوێندتان دەدەم بەخودا ئایا ئێوە ئەمە دەزانن؟ فەرموویان: بەڵێ، عومەر فەرموی: پێغەمبەر(ﷺ) فەوتی کرد و دواتر ئەبوبکر فەرمووی: من جێنشینی پێغەمبەر(ﷺ)م ، سوێند بەخوا ئەبوبکر داوای کردن، وەبەو شێوەیە کاری پێ کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) کاری پێدەکرد، خوای گەورەش دەیزانی تیایدا ڕاستگۆ و چاکە خواز و دانا و شوێنکەوتەی حەق پاشان ئەبوبکر کۆچی دوایی کرد و منیش جێ نشینی ئەبوبکر بووم و دووساڵ لە ئەمارەتی خۆم بەجێم هێناوە بەو شێوەیە کاری تیادا دەکەم کە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبکر کاریان تیادا کردووە، خوای گەورەش دەزانێ کە من تیایدا ڕاستگۆ و چاکە خواز و دانا و شوێن کەوتەی حەق بووم پاشان ئێوەش هاتنە لام و قسەدەکەن و قسەکەشتان هەر یەکە و کارەکەشتان هەریەکە، ئەی عەباس

تۆ دێی و داوای بەشی خۆت لە برازاکەت دەکەیت و ئەمەش ((عەلی)) هاتووە داوای بەشی خێزانەکەی لە خەزوری دەکات، پاشان من پێم ووتن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی ((ئێمە میرات گرنین و ئەوەش، کە لێمان جێ دەمینێ دەکرێتە خێرو سەدەقە)) کاتێ کە ویستم پێتانی بدەم ووتم: بتانەوێ پێتانی دەدەم هەتا ئێوە بەڵێن و پەیمانی خواتان لەسەر بێ: هەتا ئەوەی لێ بزانن کە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبوبکر چۆن کاریان تیادا کردووە و منیش چۆن کارم تێداکردووە لەو کاتەوەی کە خەلافەتم گرتۆتە دەست؟ ئێوە ووتتان پێمانی بدە هەر بەمەش من دام بە ئێوە، من سوێندتان دەدەم بەخوا ئایا پێم دان؟ ووتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئێوە لە من بەجێ هێنانی شتێکی تر لە من وەردەگرن، ئەگەر ئێوە لێی دابڕان ئەوا بۆمی بگێڕنەوە دەستبەردارتان دەبم لێیان.[1]

## ٤- ڕێزی عومەر بۆ عباس و عبدالله ی کوڕی (ﷺ):

عومەر(ﷺ) ناسینی بۆ عەباسی کوڕی عبدالمطلب مامی پێغەمبەر(ﷺ)و مەودای ڕێز و سادەیی و شارەزایی بۆ مافی ئەو بۆ تەواوی ئوممەت ڕون کردەوە، ئەمەش کاتێك بوو کە ئاوی لێ داواکرد و لە سالی برسێتیدا هەروەك ئەوەی بە یارمەتی خوای گەورە بینی بەڵکو عومەر(ﷺ) سوێندی بۆ عەباس خوارد هەروەك پێشتر باسمان کرد و فەرمووی: موسڵمان بونی پێ خۆشترە لە موسڵمان بوونی باوکی ئەگەر موسڵمان بێت لەبەر ئەوەی کە موسڵمان بوونی عەباس خۆشترە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)،[2] لەو خۆشەویستی یەی کە عومەر هەیەتی بۆ ئامۆزاکەی پێغەمبەر(ﷺ)عبدالله ی کوڕی عەباس(ﷺ)، هەر ئەو بوو کە عبداللەی دەبردە نێو گەورە پیاوانی بەدر(ﷺ)، ئەوانیش منداڵی لەو تەمەنەیان هەبوو بەڵام هیچ کام لە منداڵان ئەو ڕێزەیان پێ نەبڕابوو، لەمەشدا ڕونی یەك بۆ کارزان و پلە و پایەی زانستی لای عومەر(ﷺ) بۆ هەموان نیشان دەدات، بۆخاری دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) لەگەڵ گەورە پیاوانی بەدر(ﷺ)دەیبردە ژوورێ و هەندێك پێیان دەوت: بۆچی ئەم کورە دێنیتە ژوورێ ئێمەش وەك ئەم کوڕەمان هەیە؟ عومەر دەیفەرموو: ئەمە لەو کەسەیە کە ئێوە دەیناسن، پاشان ڕۆژێك بانگی کردن و منیشی لەگەڵیان بانگ کرد، فەرمووی: وادەزانم بۆیە بانگی کردم هەتا ئەویان نیشان بدات کە لەمندایە و دواتر فەرمووی: ئێوە چی دەڵێن دەربارەی ئایەتی:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾ (النصر:١-٢).

هەتا سورەتەکەی تەواو کرد هەندێکیان ووتیان: نازانین و هیچیان نەوت پاشان بە منی فەرموو: ئەی کوڕی عەباس تۆش هەروەها دەڵێی؟ وتم: نەخێر، فەرمووی: ئەی چی دەڵێیت؟ ووتم: ئەوە مەرگی پێغەمبەرە(ﷺ)، خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە بە فەتحی مەککە و ئەمەش نیشانەی مەرگیەتی،

---

١ـ مسلم رقم (١٧٥٧).

٢ـ العقيدة في أهل البيت بين الافراد والتفريط(ص:٢١٠).

ئەوسا ئیتر خوای گەورەت بە پاك ڕابگرە بەهۆی ستایشەوە داوای لێبووردنی لێ بکە، چونکە بێ گومان ئەو زۆر گیرا کەری پەشیمانی یە عومەر فەرمووی: منیش هەرئەوەی لێ دەزانم کە تۆ دەیزانی،[1] ابن حجر- ڕەحمەتی خوای لێبێ – و بەغەوی،[2] هێناویەتی، کە دەفەرموویێت لە فەرهەنگی یاراندا لەرێگەی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە(ﷺ) ابن عمر هێناویەتی کە دەفەرموویێت: عومەر ابن عباسی بانگ دەکرد و نزیکی دەکردەوە و دەیفەرموو: من پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی کە ڕۆژێك تۆی بانگ کرد ودەستی هێنا بە سەرتدا وفەرمووی: ((پەروەدگارا لە ئاین شارەزای بکە و فێری تەفسیری بکە،[3] عومەر (ﷺ)ئەمەی کرد وەك ڕێزێك بۆ گەورەیی ابن عباس و وەك گەورەیی یەك بۆ پلە و پایەی لە زانست و تێگەیشتندا، هەروها ابن کثیر باسی ئەوە دەکات، کە عومەر(ﷺ) دەیفەرموو: باشترین وەرگێڕی قورئان عبداللە ی کوڕی عەباس، دەفەرموویێت: ئەگەر بهاتایە پێشەوە: لاوانی ماندوو زۆر پرسیار کەر و خاوەن دڵانی ژیر دەهاتن،[4] بەڕاستی خۆشەویستی و دۆستایەتی ئاڵوگۆڕ لەنێوان عومەر و خاوخێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دا هەبووە.

---

١ـ البخارة رقم (ص:٤٢٩٤).
٢ـ العقيدة في أهل البيت بين الافراد والتفريط(ص:٢١٠).
٣ـ فتح الباري (١/١٧٠).
٤ـ الباية والنهاية (٣٠٣/٨).

# دوانگەی سێ یەم

## ژیانی عومەر لە نێو کۆمەڵگا و بایەخدانی بەرژێمە پاراستن و خەڵات

### یەکەم: ژیانی عومەر لە کۆمەڵگادا

ژیـانی عومـەر(ﷺ) لـە کۆمـەڵگادا بـەجێ هێنـانێکی زینـدوو بـوو بـۆ قورئـان و سـوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، لە میانی هەڵوێستە هەمەڕەنگەکانی ئیسلام بە بەرجەستەیی دەبیـنین لـە ژیانیـدا و ئەمەش هەندێ لەو هەڵوێستانەیە:

### ١- عومەر(ﷺ) و چاودێری کردنی ژیانی کۆمەڵگە:

عومەر(ﷺ) بایەخی دەدا بە ژنان وکچانی موسڵمان و لاواز و بێنـەواکانیان و مـافی خۆیـان پـێ دەدات و جەور و ستەمی لەسەر لادەبردن و کاروباری ئەو خێزانانەی بەڕێ دەکـرد کـە پیاوەکانیـان لـە جیهاد و تێکۆشـان بـوون ، سـوور بـوو لەسـەر گەیانـدنی مـافی بێـوە ژنـان بۆیـان و هـەتا ئـەو ووتـە بەناوبانگەی فەرمووە: سوێند بە خوا ئەگەر خوای گەورە سەلامەتم بکات وادەکەم لە بێوەژنانی عێراق کە پاش من پێویستیان بە کەسی تر نەبێ،[١] ئەمـەش هەنـدێ لـەو دیمەنانەیـە کـە لەسـەر لاپـەڕەکانی مێژوو بە دەدرەوشێنەوە:

دایکت جەرگ بڕاوت بکات! خلیسکانەکانی عومەر شوێن پێ دەگرێ؟!:

شەوێك لە تارمایی دڵێکی شەودا عومەر(ﷺ) هاتە دەرەوە، طلحةی کوڕی عبیـدالله(ﷺ)بینـی، عومەر چویە ماڵێك و پاشان چـویە مـاڵێکی تـر، کاتـێ کـەڕۆژ بویـەوە طلحـة چـوو بـۆ ئـەو ماڵـە و پیرێژنێکە کەساسی بینی، پێی ووت: ئـەو پیـاوە چـیتە کـە بینـی بـۆ لات؟ ئـەو ماوەیـەکی زۆر زۆرە بەڵێنی بە من داوە بینی بۆ لام بەوەی کە بۆم چاکە ئازارەکـانم دەرەوێنێتـەوە، طلحـة ووتـی: دایکـت جەرگ بڕاوت بکات! خلیسکانەکانی عومەر شوێن پێ دەگیرێ؟!.[٢]

بێ گومان بایەخدا بە سـست و لاوازانـی کۆمەڵگـە لـە بنـەماکانی سـەرکەوتن، لـەو نزیکبونـەوە گەورانەیە کە مرۆڤی پێ نزیك دەبێتەوە بۆ لای خودا- دەکرێ کە سەرکردەی بزوتنەوە ئیسلامیەکان و

---

١ـ صحيح التوثيق في سيرة حياة الفارقة عمر بن الخطاب (ص:٣٧٣).
٢ـ أخبار عمر (ص:٣٤٤) محض الصواب (٣٦٥/١) فية ضعيف لاعضالة.

فەرمانڕەوای گەلانی ئیسلام و پێش نوێژی مزگەوتەکان و ڕۆڵەی مزگەوتەکان موسڵمانان بایەخ بەم لایەنە مرۆیی یە بدەن لە کۆمەڵگا و مافی خۆی پێ بدەن.

ئەمەئافرەتێکە، کە خوای گەورە لەسەروی حەوت ئاسمانەوە گوێی لەسکاڵای بووە:

عومەر(ﷺ) ڕۆژێك لەگەڵ جاریینی عەببینی لەمزگەوت هاتە دەرەوە، ژنێ لەناوەنبینی ڕێگە کە دەرکەوت و عومەر سڵاوی لێ کرد و ئەویش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، ژنەکە ووتی: ئەی عومەر، بەڵێنم پێدایت کاتێك کە بە عومەیر ناوزەند کرایت لە بازاڕی عوکاز و لەنێو منداڵاندا بە گۆچانەکەت دەت ترساندن، ڕۆژگار زۆر تێنەپەڕی هەتا عومەر و زۆری ترش تێنەپەڕی تا بویتە ئەمیری باوەڕداران، دەی لە شواندارێدا لە خوا بترسە، ئەوەش بزانە هەرکەس لە پەیمانی خراپە و شەڕدان بترسێ دووری لێی نزیك دەبێتەوە، هەرکەس لە مردن بترسێ دەترسێ لەناوچوون، جارود ووتی: ئەی ژن زۆرت ووت بە ئەمیری باوەڕداران، عومەریش فەرمووی: لێی ئەگەرێ ئەی تۆ ئەم ژنە ناناسیت؟ ئەوە خەولەی کچی ثعلبتیە کە خوای گەورە لە سەروی حەوت ئاسمانەوە گوێی لە دەنگی بوو، عومەر مافدار ترە لە گوێی بۆ بگرێ،[1] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر دەفەرموێت: دەی سوێند بە خوا ئەگەر ئەو هەتا شەو بوەستایە ئەوا جێم نەدەهێشت مەگەر بۆ نوێژ و دواتر دەگەڕامەوە لای،[2] لە ڕیوایەتێکە تردا هاتووە کە دەفەرموێت: ئەوە ئەو خەولەیە کە خوای گەورە ئایەتی...

﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا﴾ (المجادلة:١).[3]

## سڵاو لە نەژادێکی نزیك:

زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) دەرچوم بۆ بازاڕ، عومەر گەیشت بە ئافرەتێکی لاو کە ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران مێردەکەم تیاچوو، منداڵێکە بچوکی بەجێماوە سوێند بەخوا پێناگەن و نە کشتوکاڵێکیان هەیە نە هاوشێوەکانی و ئەترسم لەوەی کە چی یان بدەمێ وەمن کچی خەفافی کوڕی غەفاریم،[4] باوکم جودەیبیەی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بینی ووە، عومەر لەگەڵیدا وەستا و نەڕۆیشت و پاشان فەرمووی: سڵاو لە نەژادێکی نزیك، پاشان عومەر بە حوشترێکی خێرا ڕۆیشت کە لە ماڵەوە بەسترابویەوە، دوو جەواڵی خستە سەر پشتی حوشترەکە و پڕی کردن لە خواردن و خۆراك خەرجی خستە نێوانیانەوە و پاشان هەوساری دایە دەستی و فەرمووی: بەڕێوە ببە تەواو نابێ هەتا خوای گەورە چاکەیەکتان پێ دەگەیەنێ، پیاوێك فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران زۆرت بۆ کرد؟ عومەر فەرمووی: دایکت جەرگ بڕاوت بکات! سوێند بە خوا من باوك و دوو برای ئەمەم بینی کە گەمارۆی قەڵایەکیان دابوو پاش

---

١ـ محض الصواب (٧٧٧/٣) ضعيف لانقطاعة بين قتادة وعمر بن الخطاب.

٢ـ الدارمي الرد على الجهمية (ص:٤٥).

٣ـ الحلم للعلي الغفار للذهبي (ص:٦٣).

٤ـ إمام غفار وخطيبهم شهد الحديبية وتوفي في خلافة عمر.

ماوەیەك ئێمە ڕزگارمان کردو، پاشان بەشی ئەوانمان تێدا دەکردە سابات.[١]

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر وەفای فاروق بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە شتێکیان بەم ئیسلامە پێشکەش کردوە ئەگەر چی بچوکیش بوبێت، ئای لەو وەفایەی کە ئێمە لەسەردەمێکدا پێویستمان پێیەتی کە خەریکە لای زۆرێك لە خەڵکان وەفاداری لە سێدارە دەدرێت.[٢]

### داخوازی کردنی بۆ ئوم کەلسوم کچی ئەبوبکر:

عومەر(ﷺ) چوو بۆلای عائیشەی دایکی باوەڕداران(ﷺ) هەتا داوای ئوم کەلسومی خوشکە بچکەکەی بکات، عائیشە ئەم داخوازی یە گەیاندە ئوم کەلسوم و ئەویش پەسەندی نەکرد و ووتی: من پێویستیم بەوە نی یە، عائیشە پێی فەرموو: ئایا دەست بەرداری ئەمیری باوەڕداران دەبێت، ئەویش وتی: بەڵێ، ئەو ژیانی سەختە و توڕەیە بەسەر ژناندا، عومەرناردیبە دوای عەمری کوڕی عاص و هەواڵی پێدا و ئەویش وتی: ئەی دایکی باوەڕداران، مەبە بەدەرگاوان من لەم کارەت ڕزگارت دەکەم پاشان ڕۆیشت بۆ لای عومەر و فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، هەواڵێکم پێ گەیشتووە کە پەنات بەخوا پێ دەگرم لێ، عومەر فەرمووی: چی یە؟ عەمر ووتی: داخوازی ئوم کەلسومی کچی ئەبوبکرت کردووە؟ عومەر فەرمووی: بەڵێ، ئایا دەست بەردارت کردووم لێی یان بەئەو دەست بەردارم بووی؟ ئەویش ووتی: نەئەمیان و نەئەویان، بەڵام ئەو نوێ یە و لەکۆششی نەرم و نیانی عائیشەی دایکی باوەڕداران پەروەردە بووە و تۆش دڵ ڕەقی یەکت تێدایە ئێمە لێت دەترسین، وەناتوانین، کە بتگێڕینەوە بۆ ڕەفتێك لە ڕەفتەکان، ئەی چۆنە ئەگەر ئەو سەرپێچی یەکی کردی و تۆ قامچی یەکت لێدا؟ تۆ سەرپێچی ئەبوبکرت کرد لە کوڕەکەی بەبێ ئەوەی مافتی تێدابێت، عومەرفەرمووی: ئەی چۆن بە عائیشە کە من دواندوومە؟ ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران،[٣] من دەست بەرداری عائیشەت دەکەم، لە ریوایەتێکی تر هاتووە عەمری کوڕی عاص(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، چۆنە ئەگەر ئافرەتێك لەگەڵت پێك بێت؟ عومەر فەرمووی: بریا ئەوە لەم ڕۆژانەی ئێستاتدا بوایە، عەمر ووتی: ئەی باسی کێ کراوە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عومەر فەرمووی: ئوم کەلسومی کچی ئەبوبکر، عەمر ووتی: تۆ چیت بەو کیژۆڵەیەوە کە باوکی شەو و ڕۆژ ئەی مراند بۆت، عومەر فەرمووی: ئایا عائیشە فەرمانی بەمە پێ کردوی؟ عەمر ووتی: بەڵێ، پاشان عومەر وازی لێ هێنا و طلحتی کوڕی عبیداللە کاری بویەهاوسەری.[٤]

یەکێك لە ئامانجە شیرینەکانی ن ئەندێشەی کچان ئەوەیە ببنە هاوسەری گەورە پیاوانی هۆزەکانیان ، لێرەدا ئەمیری باوەڕداران بە زۆر ناچێتە پێشەوەبۆ داخوازی بەڵکو هەلا وەك

---

١ ـ البخاري، كتاب المغازي رقم (٣٩٢٨).
٢ـ أصحاب الرسول، محمود المصري (١/١٧٧).
٣ـ الفاروق عمر للشرقاوي (: ٢١٠-٢١١).
٤ـ شهيد المحراب (ص:٢٠٤).

هەرکەسێکی ئاسایی دەچێت، داخوازیکراویش ئەمیری باوەڕداران پەسند ناکات و کاتێ ئەم هەواڵەش دەگاتە عومەر ڕێوازدێنێت و دەکشێتە دواوە بەبێ بێزاری و دڵگیر بوون و هەڕەشە و گوڕەشەکردن، لەبەر ئەوەی دەست بەرداری مێردانی کیژێك نابێت بۆ کەسێك نەیەوێت، هەروەها عەمر زۆر زیرەك بووە لە چونە ژورەوەو گەیاندنی وەڵامی نەرێ ، هەروەك ئەوەی عومەریش ئەوەی خوێندەوە لە نێ چاوانی هەواڵهێنەوە ، لەگەڵ وردبینی عەمر لە دەربڕینیدا،[١] بەڵکو عومەر(ﷺ) لایەنگری کچانی دەکرد لە مافی خۆیان لە هەڵوێستەکانیاندا بۆ ئەوانەی دەچنە پێشێ لێیان دەفەرموێت: زۆر مەکەن لە پیاوەکانتان بۆ پیاوێکی ناشیرین، ئەوان ئەوەیان خۆش دەوێ کە ئێوە خۆشتان دەوێ،[٢]

## - پیاوێك لە ڕێگەدا قسە لەگەڵ ئافرەتێك دەکات:

کاتێ عومەر (ﷺ) بە ڕێگە یەکدا تێدەپەڕی، پیاوێکی بینی کە لەگەڵ ژنێك قسەی دەکرد، عومەر قامچی یەکەی لێ بەرز کردەوە ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە خێزانەکەمە، عومەر فەرمووی: ئەی کەواتە بۆ لەسەر ڕێگە دەوەستن موسڵمانان دوچاری غەیبەت دەکەن؟ پیاوەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران هەر ئێستا گەیشتینە شار و ڕاوێژی ئەوە دەکەین لەکوێ دابنیشین، عومەر قامچی یەکەی بۆ هەڵدا و فەرمووی: تۆڵەم لێ بکەوە ئەی بەندەی خودا، ئەویش ووتی: ئەمە بۆتۆیە ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: بیگرە و تۆڵەم لێ بکەوە، پاش سێ یەم جار پیاوەکە ووتی: ئەمە بۆ خودایە و عومەر فەرمووی: بەشی تۆشی تێدا بێت بۆ خودا.[٣]

## - ژنێك لای عومەر سکاڵای مێردەکەی دەکات:

ژنێك هات بۆلای عومەر(ﷺ)و شکاتی لە مێردەکەی کرد و ووتی: پیاوەکەم خراپەی زیاد بووە و چاکەی کەم بۆتەوە، عومەر پێی فەرموو: کامەیە پیاوەکەت؟ ژنە وتی: ئەبو سەلمە، عومەر(ﷺ) دەیناسی یەکێك بوو لە هاوەڵان ، بۆیە بە ژنەکەی فەرموو: جگە لەچاکە هیچی تر لە پیاوەکەت نازانین ،پاشان بە پیاوێکی تەنیشت خۆی ووت: تۆ دەڵێی چی؟ ئەویش ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران جگە لەوە ئێمە هیچی تر نازانین، پاشان ناردی بەدوای هاوسەرەکەیداو فەرمانی دایە ژنەکە، کە لە پشتیەوە دابنیشێ، زۆری پێنەچوو مێردەکەی هات، عومەر فەرمووی: ئەمە دەناسیت؟ پیاوەکە وتی: ئەمەکێ یە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عومەر فەرمووی: ئەمە خێزانەکەتە، پیاوەکە ووتی: ئەی چی دەڵێت، عومەر فەرمووی: ئەوەی کە تۆ خراپەت زۆر و چاکەت کەم بۆتەوە، پیاوەکە وتی: خراپی ووتووە ئەی ئەمیری باوەڕداران، سوێند بەخوا ئەوە پۆشتە ترین ژن وخۆشگوزەرانتریشیانە لەماڵدا بەڵام مێردەکەی سستە لەسەر جێ ی کردندا، عومەر فەرمووی بە ژنەکە: چی دەڵێیت، ئەویش ووتی: ڕاست دەکات، عومەر قامچی یەکەی هەڵگرت و ئەم دەست و ئەو دەستی پێ دەکرد و دەیفەرموو: ئەی

---

١ـ شهيد المحراب (ص:٢٠٥).
٢ـ عيون الاخبار (١١/٤)، فرائد الكلام (ص:١٤١).
٣ـ أخبار عمر (ص:١٩٠)، نقلا عن الرياض النضرة.

دوژمنی خودا لاویتیت برد، بەسەر سەروەت و سامانیەوە ژیایی ، ئێستەش داوای شتێکی لێدەکەیت کە دەسەڵاتی بەسەریدا نی؟ ژنە ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەم جارە لێم ببورە، سوێند بەخوا هەرگیز لەم شوێنە نامبینی، پاشان بە هەرسێ بەرگەکە بانگی کرد و پێی فەرموو: لە خوا بترسە و بە چاکی هاوەڵی ئەم پیرە بکە پاشان لێی چویە پێشێ و پێی فەرموو: ڕێگریت ناکات لەوەی کە بینیت چیم پێ کرد تۆش لەگەڵی باش بە، پیاوەکە ووتی: وادەکەم ئەی ئەمیری باوەڕداران، گێڕەرەوەکە دەڵێت: من واسەیری دەکەم کە هەرسی بەرگە دەرپەڕیوەکەی بردووە پاشان من گوێم لە عومەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو: گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: ((باشترین ئوممەتم ئەوەیە کە منی تێدام پاشان دوای ئەو ئەوانەی کەدێن و دواتر ئەوانەی کە دوای ئەوان دێن، پاشان گەلانێك دێن کە شایەتیان بەر لەسوێندیا دەکەوێت، شایەتی دەدەن بەر لەوەی داوایان لێبکرێت، لە بازاڕەکانیاندا دەنگە دەنگ و تەرازوو هەیە.[١]))

## - بۆتەلاقی دەدەیت؟ خۆشم ناوێت:

پیاوێك پەرۆشی تەلاقدانی ژنەکەی بوو عومەر(ﷺ) فەرمووی: بۆ تەلاقی دەدەیت؟ پیاوەکە ووتی: خۆشم ناوێت، عومەر فەرمووی: ئایا هەموو ماڵێك لەسەر بنەمای خۆشەویستی نراوە؟ ئەی کوانێ چاودێری و لە پاش و لەدوان.[٢]

## - ڕۆزی منداڵەکانی خنساو:

کاتێ کە خنساء چوار کوڕی لە جەنگی قادسیە شەهید بوون و ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر (ﷺ) فەرمووی: ڕۆزی ئەو چوار کوڕە بدەنە خنساء و لەسەر ئەمە پاداشتی بدەنەوە هەتا دەمرێ، ئەو هەتا مرد مانگانە بۆ هەریەکێکیان دووسەد درهەمی وەردەگرت.[٣]

## - هندی کچی عوتبە لە بەیتولمال قەرز دەکات و بازرگانی دەکات:

هاوسەری پێشی ئەبوسفیانی حەفسی کوڕی موغیرەی مامی خالدی کوڕی وەلید لەسەردەمی نەفامیدا، هند لە باشترین و ژیرترین ژنانی قورەیش بوو پاشان ئەبوسفیانیش لێی جیابویەوە، دواتر هند چوار هەزار درهەمی لە عومەر لە بەیتولمال قەرز کرد و ڕۆیشت بۆ وولاتی (کلب)و دەستی کردە کڕین و فرۆشتن، کوڕەکەی(معاویە) کە والی بوو شام لەگەڵ خۆی هێنای و ووتی: کوڕەکەم ئەمە عومەرە و بۆ خوا کاردەکات.[٤]

---

١ـ مجمع الزوائد (١٠/٩١) رجاله ثقات.
٢ـ البيان والتبين (٢/١٠١) فرائد الكلام (ص:١١٣).
٣ـ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية سليمان الكمال (٢/٧٦٤).
٤ـ تأريخ الاسلام، الخلفاء الراشدين (ص:٢٩٨-٢٩٩).

بەڕاستی ژنان لەسەردەمی ڕاشیدیدا کە پلە و پایەییّکیان هەبوو بەهۆی ئیسلامەوە بووە، ئەوەتا لەسەردەمی ڕاشیدیندا دەبینین لە زۆرێك لە بوارە فیکری و ئەدەبی و بازرگانیەکاندا ڕۆڵی بینیوە، ڕێزداران ئوم سەلمە و حەبیبەی کچی ئوم حەبیبە و ئەروای کچی کریزی کوڕی عبدالشمس و ئەسمای کچی سلمەی تەمیمی بلیمەت بوون لە فەرموودە و فیقھ و ئەدەب و جوانکاریدا، هەندێکی تریان شاعیر بوون وەك خنساءی کچی عوقبە،[1] عومەر ڕێزی ژنانی لابوو، هەستی بەوە دەکرد کە کەسێکی خاوەن هەست و نەستە و خاوەن راو سەرنجە، عومەر هەر چۆن ڕاوێژی بەپیاوان دەکرد بەهەمان شێوەش ڕاوێژی بە ئافرەتان دەکرد، لە شیفای کچی عبداللهی عەدەوی دەچویە پێشێ لە ڕاوەرگرتندا ،کەواتە چی ماوەتەوە بۆ ئافرەت لە دەرەوەی ئیسلامدا بەدوای بگەڕێت ئەگەر ئەمیری باوەڕداران لەکاروباری دەوڵەتدا ڕاوێژی پێ بکات و بە ڕایەکەی قایل بێت،[2] عومەر(ﷺ) خۆی بە باوکی منداڵان دەزانێ و دەڕوات بۆ لای ئەو ئافرەتانەی کە پیاوەکانیان لەماڵەوە نین و لەبەر دەرگایان دەوەستێ و دەفەرموویت: ئایا هیچتان پێویست نیە؟ و من هاتووم بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکتان بوێ بۆتان بینم؟ چونکە من زۆرم پێ ناخۆشە لە کڕین و فرۆشتندا بخەڵەتێنن، هەر لەبەر ئەوە بەتەنیشتیاندا دەڕۆیشت بازاڕ هێندە ئافرەت و منداڵی لەگەڵدا بوو کە نەدەژمێردران هەر خۆی کاڵاو پێویستیەکانیانی بۆ دەکڕین، هەرکەس هیچی نەبوایە ئەوا لە گیرفانی خۆی شتی بۆ دەکڕین، ئەگەر پەیامنێرێك لە هەندێ دەلاقەوە بەدیار کەوتنایە ئەوا خۆی بە دوایان دەکەوت لە ماڵەکانیان دا بەنامەی مێردەکانیانەوە دەیفەرموو: پیاوەکانتان لە ڕێی خوادان و ئێوەش لە وولاتی پێغەمبەری خوادان(ﷺ)، ئەگەر کەسێکتان هەیە با ئەم نامەیەتان بۆ بخوێنێتەوە، ئەگەرنا لە دەرگاکان نزیك ببنەوە هەتا بۆتانی بخوێنمەوە، پاشان دەیفەرموو: پەیام هێنەکە چەند ڕۆژی تر دەگەڕێتەوە، ئەگەر نامەتان هەیە با بۆیانی ڕەوانە بکەین پاشتر بە قەڵەم و کاغەز وەرنە لای دەرگاکان با نامەکانتان بنوسم دواتر دەچویە لای ئەو ئافرەتانەی کە پیاوەکانیان لە ماڵ نەبوون، نامەکانیانی لێ وەردەگرتن و دەینارد بۆ لای مێردەکانیان.[3]

## ٢- پاراستنی پێشینەی چاکە بۆ خەڵکی:

عومەر(ﷺ) پێشینەی چاکەی بۆ موسڵمانان دەپاراست، پێوانەیەکی تایبەتی هەبوو لە هەڵسەنگاندنی پیاواندا، لەم بارەیەوە عومەر(ﷺ) فەرموویەتی: باسام و هەیبەتیپیاو سەرسامت نەکات بەڵام ئەو کەسانە سەرسامت بکات ئەمانەت دەپارێزێ و دەست لە ناموسی خەڵکی هەڵدەگرێت، بەڕاستی ئەمە پیاوە،[4] هەروەها عومەر ئەیفەرموو سەیری نوێژ و ڕۆژوی پیاو مەکەن، بەڵام سەیری ژیری و ڕاستگۆیی بکەن، دەیفەرموو: من لەدوو پیاوتان ناترسم: یەکێکیان ئیماندار بێ و ئیمانەکەی بخاتە ڕوو، ئەوی تریان کافر بێ و بێ باوڕیەکەی بخاتە روو بەڵکو لە دوڕویەك دەترسم کە

---

١ـ تطور تأريخ العرب السياسى الحضارى د. فاطمة المستامة (ص:١٧٥).
٢ـ شهيد المحراب (ص:٢٠٥).
٣ـ أخبار عمر (ص:٣٣٩)، سراج الملول (ص:١٠٩).
٤ـ فقه الائتلاف، محمود محمد الخزندار (ص:١٦٤).

پەنا بگرێت بە ئیمان و کار بۆ کەسێکی تر بکات، عومەر پرسیاری لە پیاوێك کرد، کە شایەتیەکی دابوو، ویستی ئەوە بزانێ کە ئایا یەکێك هەیە پشتراستی بکاتەوە؟ پیاوێك ووتی: من شایەتی بۆ دەدەم و پەسەندی دەکەم ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر(ﷺ) فەرمووی: ئایا تۆ دراوسێیت؟ پیاوەکە ووتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: ئایا ڕۆژێك تێکەڵیت کردووە؟ پیاوەکە ووتی: نەخێر، عومە فەرمووی: ئایا ڕۆژێك سەفەرت لەگەڵ کردووە، چونکە سەفەر و نامۆیی بوون تاقیکردنەوەی پیاوانە؟ پیاوەکە ووتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: ڕەنگە لە مزگەوت بینیبێت کە نوێژی خوێندووە؟ پیاوەکە ووتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: دەبڕۆ تۆ نایناسی.[١]

هەندێ لە موسوڵمانان بەختەوەر بوون بە ستایش و ڕێز لێنان لەلایەن عومەرەوە(ﷺ) بەهۆی کارزانی یان و گونجاوی خودا بۆیان بەهۆی کاری سەرفرازی یان بۆ خزمەتی ئیسلام و ئەمەش هەندێ لەو هەڵوێستانەیە کە بەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستی یە.

## - باوەڕت هێنا کە کوفریان دەکرد، هاتیتە پێشێ لەکاتێکدا کە ئەوان هەڵدەهاتن بەوەفابویت لەکاتێکدا کە ئەوان فێڵیان دەکرد:

عەدەی کوڕی حاتەم دەفەرموێت: لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەم هاتم بۆلای عومەر، عومەر زۆ رووی لەانی تر دەکرد وپشتی لە من دەکرد، عەدەی فەرمووی: من هەرلێی دەچومە پێشێ و ئەو هەر پشتی تێدەکردم، پاشان هاتم و ڕووبەڕووی بومەوە بەڵام هەر پشتی تێدەکردم، منیش ووتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا دەمناسی؟ پێکەنی هەتا لەسەر پێ خۆی پێ نەگیرا پاشان فەرمووی: بەڵێ، سوێند بە خوا من باشت دەناسم، باوەڕت هێنا کە کوفریان دەکرد، هاتیتە پێشێ لە کاتێکدا ئەوان هەڵدەهاتن، بەوەفا بوویت لەکاتێکدا کە خەڵکی فێڵیان دەکرد، یەکەمین چاکەیەك کە ڕووی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و یارانی سپی کردەوە چاکەی نوشتانەوە بوو، تۆ هێنات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)و ئەویش بە پۆزشەوە وەری گرت، پاشان فەرمووی: ئەمەم فەرز کردووە بۆ گەلێك کە هەژاری و نەداری ڕایماڵیون و ئەوا گەورەی هۆزەکانیانن لەوەی کە دەبنە نوێنەریان لە مافەکانیاندا،[٢] لەریوایەتەکەدا هاتووە کە دەفەرموێت: کەواتە باوکم نی یە.[٣]

## - پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانان سەری عبدالله ی کوڕی حوزافە ماچ بکەن و من دەست پێ دەکەم:

ڕۆمەکان هاوەڵی بەرز و بەڕێز عبدالله ی کوڕی حوزافەی سەهمی یان بە دیل گرت و هێنایان بۆلای پادشاکەیان، پادشا پێی ووت: ببە بە گاور کچەکەمت لێ مارە دەکەم، عبدالله پێی فەرموو: ئەگەر هەموو ئەوەی تۆ هەتە و عەرەبیش هەیەتی بمدەیتێ بۆ ئەوەی بۆ یەك چاو تروکان لە ئاینی محمد

---

١ـ عمر بن الخطب، صالحبن عبدالرحمن بن الله (ص:٦٦).
٢ـ مسلم رقم ٢٥٢٣،مسند أحمد رقم ٣١٦.
٣ـ الخلافة الراشدة د. يحى اليحى (ص:٢٩٧)، فتح الباري (٧/٧٠٦).

پاشگەز ببمەوەئەوا پاشگەز نابمەوە، پادشا ووتی: کەواتە دەتکوژم، عبدالله فەرمووی: ئەوە شیری تۆ و ئەوەش گەردنی من، پادشا فەرمانی دا لە خاچی بدەن و فەرمانی دا بە تیرهاوێژەکانی کە ئەملاو ئەولای تیرباران بکەن و ئەویش داوای لێ دەکات کە ببێتە گاور و عبدالله ش هەر قایل نەدەبوو پاشان پادشا فەرمانی دا کە دایگرن و فەرمانی دا کە مەنجەڵێك ئاوی گەورە گەرم بکەن، دواتر چەند موسوڵمانانێکیان هێناو تێیان فرێ دا عبدالله بینی کە ئێسکەکانی دەرکەوتن، جارێکی تر پادشا داوای لێ کردو ئەویش قایل نەبوو، بۆیە فەرمانی دا کە خۆی بخەنە نێو ئاوەکە، کاتێ کە بەستی یانەوە و بەپەتێك شۆڕیان کردە نێو مەنجەڵەکە عبدالله دەستی کردە گریان پادشا چاوی تێبڕی و بانگی کرد، عبدالله فەرمووی: من دەگریم لەبەر ئەوەی کە یەك گیانم هەیە ، حەزم دەکرد بەقەدەر هەموو تاڵە موەکانی لەشم گیانم تێدا بوایە و ئەم ئازارەی لە پێناوی خودا بچەشتایە، لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە پادشای ڕۆم عبدالله ی زیندانی کردووە و ڕێگری کردووە لە خواردن و خواردنەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژ و پاشان گۆشتی بەراز و مەی داوەتێ هەتا بیخوات بەڵام عبدالله لێی نزیك نەبۆتەوە، پاشان بانگی کردووە و لێی پرسی، بۆچی نانەکەت نەخوارد؟ عبدالله فەرمووی: بەڵێ ئەوە بۆمن سازکراوە، من نامەوێ کە بەوە بۆنی خۆمت پێ بکەم، پادشا ووتی: سەرم ماچ بکە هەتا بەرت بدەم و ئازادت بکەم، عبدالله فەرمووی: لەگەڵمدا هەموو دیلە موسڵمانەکان ئازاد دەکەیت؟ پادشا ووتی؟ بەڵێ عبدالله سەری ماچ کرد و هەموو دیلە موسڵمانانەکان لەگەڵی ئازاد کران ،کاتێ گەڕایەوە عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: لەسەر هەموو موسڵمانەکان پێویستە کە سەری عبدالله ی کوڕی حوزافە ماچ بکات و من لەخۆمەوە دەست پێ دەکەم پاشتر عومەر(رضي الله عنه) هەستا و سەری ماچ کرد.[1]

## ئایا وەیسی کوڕی عامرتان تێدایە؟

عومەر ئەگەر خەڵکی یەمەن بهاتنایە بۆ لای پرسیاری لێ دەکردن کە: ئایا وەیسی کوڕی عامرتان تێدایە؟ هەتا هاتە لای وەیس و فەرمووی: ئایا تۆ وەیسی کوڕی عامری؟ ئەویش ووتی: بەڵێ عومەر فەرمووی: لە موراد و پاشان لە قەرن؟ وەیس ووتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: تۆ گولیت هەبوو ڕزگارت بوو لێی تەنها شوێنی درهەمێك نەبێت کە ماوەتەوە وایە؟ وەیس ووتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: ئەی دایکت هەیە؟ وەیس ووتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: ((لەگەڵ ڕەوەندی یەمەندا لە موراد و پاشان لە قەرن وەیسی کوڕی عامر دێ بۆ لاتان، ئەو گولی هەبووە و لێی ڕزگار بووە ئەو نەبێت کە شوێنی درهەمێکی پێوە ماوە، دایکێك هەیە، کە زۆر باشە بۆی ئەگەر سوێند بە خوا بخوات ئەوا بەچاکی وەڵامی دەداتەوە ئەگەر توانیت داوای لێبکە با دوعای خێرت بۆ بکات)) کەواتە داوای لێ بوردنم بۆ بکە، ئەویش داوای لێبووردنی لای خوا بۆ کرد.

عومەر پێی فەرموو: کوێت دەوێت؟ وەیس ووتی: کوفە، عومەر فەرمووی: نامەیەکت بۆ نەنوسم بۆ کاربەدەستەکەی؟ وەیس ووتی: ئەگەر لەنێو خەڵکیدانە ناسرێم باشترە بۆم دوای ئەمە و لەساڵی

---

١ـ تفسیر إبن کثیر (٢/٦١٠).

داهاتوو پیاوێك لە گەورەکانیان گەرایەوە و عومەری بینی و پرسیاری لێ کرد سەبارەت بە وەیس و ووتی: (( پەرتوکی،[1] بەجێم هێشتووە و کەم پێداویستی بووە، عومەر فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو، کە دەیفەرموو: (( لەگەڵ ڕەوەندی یەمەندا و لە قوراد و پاشان لە قەرن وەیسی کوڕی عامر دێتە لاتان و ئەو گوڵی پێوە بوو و لێی ڕزگار بووە جگە لەوەی کە شوێنی درهەمێکە پێوە ماوە، ئەو دایکێکی هەیە و زۆر بۆی باشە ئەگەر سوێند بخوات بە خودا ئەوا چاکی بۆ دەکات، ئەگەر توانیت با داوای لێ بوردنت بۆ بکات بیکە)) پاشان هات بۆلای وەیس و وتی: داوای لێبوردنم بۆ بکە، ووتی: تۆ زۆر نوێتری بە سەفەرێکی باش، داوای لێبوردنم بۆ بکە، پاشان ووتی: داوای لێ بوردنی بۆ کردنی بۆ کردم و ووتی: گەیشتی یە عومەر پیاوەکە ووتی: بەڵێ داوای لێ بووردنی بۆ بکە، ووتی: خەڵکی بۆی هوشیار بونەوە و ڕای کرد بە ڕویدا.[2]

## عومەر(ﷺ) موجاهیدێکی چاکە خواز بە دایکی:

کۆمەڵێ جەنگاوەرلە شامەوە هاتن و بەنیازی چوون بۆ یەمەن بوون، عومەر چەند کاسەیەکی هەبوو ئەگەر نوێژی بەیانی بکردایە دای دەنا و پیاوێك لەوان هات و دەستی کردە خواردنی، بە دەستی چەپی نانی دەخوارد عومەر پێی فەرموو: ئەو سەرەنجی خەڵکی دەدات لە نان خواردنی دا بەدەستی ڕاستت بخۆ، پیاوەکە وەڵامی نەدایەوە عومەر(ﷺ) لێی دوبارە کردەوە، پیاوەکە ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەستم گیراوە و کاتێ لەنان خواردنەکەی بانگی کرد و فەرمووی: دەستی ڕاستت چی یەتی؟ پیاوەکە دەری هێناو بینی کە بڕاوەتەوە عومەر فەرمووی: ئەمە چیە؟ کابرا وتی ڕۆژی جەنگی یەرموك پێکراوە، عومەر فەرمووی: کێ دەست نوێژت بۆ دەشوات؟ پیاوەکە ووتی بەدەستی چەپم دەست نوێژ دەشۆم و خواش ئاگای لێیە، عومەر فەرمووی: بۆ کوێ دەچیت؟ پیاوەکە ووتی: یەمەن، بۆ لای دایکم کە چەند ساڵێکە نەمبینیوە، عومەر فەرمووی: ئایا ئەویش هەروا چاکە، خزمەت کارێکی بۆ گرت لەگەڵ(٥) حوشترو بۆی بار کرد.[3]

## پیاوێك لە پێناوی خوادا وا لێی درا، کە نێوچەوانی چاڵ بووە.

کاتێ کە خەڵکی خەڵاتەکانیان لە دەستی عومەر(ﷺ) وەردەگرت سەری بەرز کردەوە و بینی پیاوێك لە ناو چاوی دراوە، پرسیاری لێ کرد و ئەویش هەواڵی پێدا کە: لە جەنگێکدا لێی دراوە کە بەشداری تێدا کردووە، فەرمووی: هەزار درهەمی بۆ بژمێرن و پاشان هەزار درهەمەکەی پێدا، دوبارە فەرمووی هەزار درهەمی بۆ بژمێرن ئەویشی پێدا، عومەر چوار جار ئەمەی پێ ووت و هەموو جارێك هەزار درهەمی پێ دەدا، پیاوەکە لەم زۆر وەرگرتنە شەرمەزاری کێشا و هاتە دەرەوە، عومەر

---

١ـ لفظ مسلم: ماڵی پەرپوت.

٢ـ مسلم، ك: فضائل الصحابة رقم (٢٥٤٢).

٣ـ الشيخان أبوبكر وعمر (رضي الله عنهما) من رواية البلاذري (ص:١٧٤)، ١٧٥.

کاتێ کە هەواڵی پرسی پێیان ووت: بینیمان کە شەرمەزاری کێشاوە لە زۆری ئەوەی وەری گرتووە و چۆتەدەرەوە، عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا، ئەگەر بمایەتەوە بەردەوام پارەم دەدایە هەتا یەك درهەمم لا دەما، پیاوێك لە پێناوی خوادا والیی دراوە کە نێو چەوانی چاڵ بووە.[١]

## ئومێدە عومەریەکان:

ئەگێڕنەوە کە عومەر(ﷺ) بە یارانی فەرمووە: ئومێد بکەن، یەکێکیان ووتویەتی: خۆزیا پڕ بەپڕی ئەم ماڵە زێڕم هەبوایە و لە پێناوی خوا بمبەخشیایە و بمکردایەتە خەڵات.

پیاوێکی تر ووتویەتی: بریا پڕی ئەم خانووە زومروتی زەرد و خشڵم هەبوایە و لە پێناوی خوادا بمبەخشیایە و بمکردایەتە خێر، پاشان عومەر فەرمووی: ئومێد بکەن، ئەوان ووتیان: نازانین ئومێدی چی بکەین ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: ئومێد دەکەم پڕی ئەم ماڵە پیاوانی وەك ئەبوعوبەیدەی جەڕڕاح و موعازی کوڕی جەبەل و سالم مولای ئەبوحوزەیفە و حوزەیفەی کوڕی یەمانم،[٢] هەبوایە و بەکارم بهێنانایە لە ملکەچی خوادا،[٣] ئەمانە برائیمانیەکانی ئەون، عومەر فەرمووی: پێناسەی براکانی ئەبوبکری صدیقی کردو فەرمووی: پێویستە هاوڕێی ڕاستگۆت هەبێت، لەنێو خەلافەتی ئەواندا بەختەوەری، ئەوان جوانی و قەشەنگی خۆشگوزەرانی و کەرەستەی تاقیکاریەکانن، کار و باری براکەت لەسەر باشترین دۆخی دابنێ هەتا ئەوەی کە مایەی ڕەزایەتی لە ئەوە، پێت بگات، دوژمنت کەنار بخەوە ئاگات لە هاوڕێکەت بێت ، هەرکەس لەخوا نەترسێ دەست پاك نابێت، هاوەڵی خراپە کار مەکە چونکە خراپەکەی فێر دەبی، ئاگاداری مەکەرەوە لە نهێنی خۆت، هەرکەسێ لە خواترسا لە کارەکانتدا ڕاوێژی پێ بکە،[٤] عومەر(ﷺ) یادی یەکێك لە براکانی دەکردەوە لە شەو و دەیفەرموو: ئای لە درێژی یەکەی لە شەوێکدا عومەر هەکە نوێژی بەیان دەخوێند بەپەلە دەچوو بۆ لای و هەر لە پێی دەکەیی ڕای دەگرت یان باوەشی پێدا دەکرد،[٥] دەیفەرموو ئەگەرلە پێناوی خوادا نەڕۆیشتمایە یان لاتەنیشتی خۆم نەختستایە سەر خەڵکی خودا یان لەگەڵ کەسانێك دانیشتمایە کە قسەی باشیان لێ دەبارێ هەروەك ئەوەی بەروبومەکان دەکەونەخوارەوە ئەوا پێم خۆش بوو کە بگەمە بەر بارەگای خوا.[٦]

## - کار لای ئەو سەنگی ئەمەکداری نێوان خەڵکی بوو:

کارکردن لای عومەر(ﷺ) بریتی بوو لە سەنگی ئەمەکداری لەنێوان مرۆڤەکاندا،کاتێك کۆمەڵێك لەگەورە پیاوانی قوڕەیش و لەسەرووی هەموویانەوە سوهەیلی کوڕی عەمری کوڕی حارث و ئەبو

---

١ـ مناقب عمر لابن الجوزي (ص:٧٤) واسناده الضعيف لإنقطاعة، محض الصواب (١/٣٦٨).
٢ـ الحاكم في مسند ك: (٣/٢٦٦) وصححة الذهبي أصحاب الرسول (ﷺ) (١/١٧٤).
٣ـ تذهيب الكمال للمذي (٥/٥٠٥) حذيفة بن اليمان، إبراهيم محمد العلي (ص:٨٦٢).
٤ـ مختصر منهاج القاصدين (ص:١٠٠)، فرائد الكلام (ص:١٣٩).
٥ـ أخبار عمر (ص:٣٢٨).
٦ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:٣٦٧).

سوفیان و هەندێك لە کۆیلەکانی پێشوی قورەیش هاتن بۆلای وەك سوهەیب و بیلال، مۆڵەت وەرگیرا لە دیدارەکەیدا بۆ خزمەتکارە هەژارەکان و پاشان بۆ گەورە پیاوانی قورەیش، گەورە پیاوان بەمە پەست بوون، ئەبو سوفیان بە هەندێ لە یارانی ووت: هەرگیز وەك ئەم ڕۆژەم نەبینیوە، مۆڵەت بەو کۆیلانە دەدات و لەبەر دەرگاکەیدا واز لە ئێمە دێنێ؟ دواتر سوهەیل ووتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا من نێوچەوانتان دەخوێنمەوە ئەگەر ئێوە پەست و قەڵسن لەخۆتان پەست بن ئەو خەڵکە بانگکرا -بۆ ئاشتی- و ئێوەش بانگکران، ئەوان بە پەلە هاتن و ئێوەش لەسەر خۆ، ئەی چی دەڵێن ئەگەر ئەوان ڕۆژی پەسلان بانگ بکرێن و لە ئێوە بگەرێن؟!.[١]

### عومەر (ﷺ) شاهیدی بۆ مردوویەك دەدات:

ئەبو ئەسوەد دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: هاتم بۆ مەدینە ، مەدینە نەخۆشی یەکی تێکەوت بوو کە خەڵکەکەی زۆر بە خێرایی دەمردن لای عومەر دانیشتم، تەرمێك بەلایدا تێپەڕی و بەچاکە بەسەر خاوەنەکەیدا هەڵیدا و فەرمووی: پێویست بوو پاشان تەرمێکی تر بەلای دا تێپەڕی و بەچاکە بەسەر خاوەنەکەیدا هەڵیدا و فەرمووی: پێویست بوو، دواتر تەرمی سێ یەم بەلای دا تێپەڕی و عومەر بە خراپە بەسەر خاوەنەکەیدا هەڵیدا و فەرمووی: پێویست بوو، ئەبو ئەسوەد دەفەرموێت: چی پێویست بوو ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عومەر فەرمووی: هەر ئەوەم ووت، کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (( هەرموسڵمانێ چوار کەس بە باش شاهیدی بۆ بدەن ئەوا دەچێتەت بەهەشتەوە)) عومەر دەفەرموێت: وتمان ئەگەر سێ کەس شاهیدیان بۆدا پێغەمبەری خۆشەویست دەفەرموێت: ((سیانیش)) وتمان بە دوو کەسیش؟ فەرمووی ((دووکەسیش)) دواتر فەرمووی: ئیتر پرسیارمان لێ نەکرد دەربارەی یەك کەس.[٢]

### - عومەر(ﷺ)و خەڵاتی حەکیمی کوڕی حوزام(ﷺ):

عوروەی کوڕی زوبێر دەگێڕێتەوە، کە حەکیمی کوڕی حوزام دەفەرموێت: داوام لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد خەڵاتی کردم پاشان داوام لێ کردەوە هەمدیس خەڵاتی کردم پاشان فەرمووی پێم (( ئەی حەکیم ئەم دارایی یە سەوزەیەکی بەتام و چێژە، هەرکەس بە دڵ فراوانی یەوە وەری بگرێت خوا پیرۆزی دەخاتە ئەوەی کە بۆی تیایەتی، هەرکەس بەدەرونێکی شەڕخوازەوە وەری بگرێت ئەوا پیرۆزی تیادا نابێت بۆی وەك ئەو کەسەی کە هەردەخوات و تێری نابێت، وەدەستی سەرەوە باشترە لە دەستی خوارەوە)) حەکیم دەفەرموێت ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە هەق ناردووە، لە دوای تۆ هیچ شتێك لە ماڵەکەم کەم ناکاتەوە هەتا دونیا بە جێ دێڵم، ئەبوبکر حەکیمی بانگ کرد هەتا خەڵاتی بکات بەڵام هیچی لێوەرنەگرت، پاش ئەو عومەر بانگی کرد تا خەڵاتی بکات بەڵام قایل نەبوو کە داواکەی پەسند بکات بۆیە عومەر فەرمووی: ئەی موسڵمانان من ئەو

---

١ـ مناقب عمر (ص:١٢٩)، فن الحكم (٣٦٧).
٢ـ البخاري رقم (٢٦٣٤)، مسند أحمد رقم (١٣٩)الموسوعة الحديثية.

بەشەی دەخەمە پێش چاو كە خوای گەورە لەم غەنيمەتە بەشيداوە بەڵام نايەوێت، لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) كەس نەی توانيوە لە ماڵەكەی حەكيم شتێك كەم بكاتەوە.[١]

## عومەر سەری عەلی (ﷺ) ماچ دەكات:

عەلی(ﷺ) سكاڵايەكی هێنا بۆلای عومەر(ﷺ)، كاتێ كە عومەر دانيشت هەتا سەيری سكاڵاكە بكات بە عەلی فەرموو: ڕێكی بەرامبەرەكەت بوەستە ئەی ئەبولحسن، عەلی ڕەنگی گۆڕا و عومەر لە سكاڵاكە كۆڵيەوە پاشان بە عەلی فەرموو: قەڵس بووی ئەی ئەبولحسن لەبەر ئەوەی كە من تۆم وەكو ئەو سەير كرد لەم دادوەريەدا؟ عەلی فەرموی: بەڵكو لەوە پەست بووم كە تۆ من و بەرامبەرەكەمت وەك يەك سەير نەكرد ئەی ئەميری باوەڕداران بەوەی كە ڕێزت لێنام و بە ئەبولحسن بانگت كردم كە شۆرەتەكەمە، بەرامبەرەكەمت بە شۆرەتەكەی بانگ نەكرد، عومەر سەری عەلی ماچ كردو فەرمووی:خوا لە زەويەكم نەهێڵێ كە ئەبولحسنی تێدا نەبێت.[٢]

## جورەيری بەجلی ئامۆژگاری عومەر(ﷺ) دەكات:

عاصمی كوڕی بەهدەلە يەكێك لە يارانی عومەر دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: ئێمە لای عومەر بوين بۆنێك لە پياوێكەوە دەرچوو، ئامادەی نوێژ كردن بوو عومەر فەرمووی: ئەو كەسەی ئەو بۆنەی لێ دەرچوو بابڕوات دەست نوێژ هەڵبگرێت، جورەيری كوڕی عبدالله فەرمووی: ئەی ئەميری باوەڕداران، بڕيار بدە بەسەر هەموو ماندا كە هەستين و دەست نوێژ بگرين ئەمە پۆشەر ترە، عومەر بە گوێی كرد.[٣]

## پياوێك لەدەربەدەريدا لە قورەيش دەخوازێ:

عومەر(ﷺ) هانی هاوسەر گيری لەنێوان هۆزەكاندا دەدا، وەك هۆكارێك بۆ هۆگری نێوانيان، هەتا پياوێك لەدەر بەدەريدا داوەای لە پياوێكی قورەيشی كرد كە خوشكەكەی خۆی بداتێ و قورەيشی يەكە ئەم داخوازی يەی پەسند نەكرد، عومەر لەم كاتەدا دەستی وەردايە ناو باسەكە وفەرمووی: چی ڕێگريت دەكات كە ژنی پێ بدەيت؟ ئەو چاكەيەكی هەيە، ئەو بە چاكەی دونيا (دارايی)و چاكەی ڕۆژی دوايی (لەخواترسان هاتۆتە ڕووت، لێی مارەبكە و پياوەكەش خوشكەكەی لێ مارە بڕی.[٤]

---

١ـ النجدي رقم(٢٩٧٤), مسلم رقم (١٠٣٥).
٢ـ عمر بن الخطاب، صالح بن عبدالرحمن (ص:٧٩).
٣ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:٢١٩).
٤ـ المرتضى للندوى (ص:١٠٧).

## ٣- شان وشکۆی لەکۆمەڵگەو جەخت کردنەوەی لەسەر دابین کردنی پێویستی خەڵکی:

### - شان وشکۆی لە نێو کۆمەڵگادا:

عومەر(ﷺ) گەورەیی لەسەر دڵ و دەرونـدا هەبوو شان و شکۆشی ئارەزووی دەرون دادەمرکێنێتەوە ڕاست ترین بەڵگەش لەسەر ئەمە لەکار کەنار خستنیەتی بۆ خالدی کوڕی وەلید(ﷺ) کە لە چڵە پۆپەی شۆرەتیدا بوو، وەئەزمونەکانی سەرکەوتنی لە هەموو جەنگێکدا لێ نزیك بوە و بەمەش گەمارۆی خەرمانەی مانگی ئەو کەسانەی دەدا کە سەریان لە خۆیان سوڕدەماو خۆیان بە گەورە دەزانی، عومەر ڕۆژێك فەرمانی لابردنی خالدی ڕاگەیاند کە خەڵکی زۆریان پێویست بوو،فەرمانەکە گەشتوو موسڵمانانیش لە جەنگی یەرمووکدا بوون، ئەبو عوبەیدە فەرمانی دا بەسەر سوپاکە دا و خالید فەرمووی: گوێ ڕایەڵ و ملکەچین ئەی ئەمیری باوەڕداران کاتێ یەکێك لەسەر بازەکان ووتی: ئەم گۆڕانە فیتنەیەك بەرپا دەکات، خالید فەرمووی: تا عومەر مابێ بوار بە فیتنە نادرێ،[1] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ملکەچی خالید- کە ئەو سەرکردەیەکی سەرکەوتوو و خۆشەویست بووە- بۆ فەرمانی خەلیفە و دەست هەڵگرتنی لە سەرکردایەتی لە سادەیی و خۆنەویستی ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەهێزی عومەر(ﷺ)لە بەڕێوە بردنی کارەکان،[2] عومەر سام و هەیبەتێکی گەورەی لە دڵی خەڵکیدا هەبووە، حەسەنی بەسری - رەحمەتی خوای لێبێت – دەفەرموێت: هەواڵ گەیشتە عومەر(ﷺ)، کە موسڵمانان باسی ئافرەتێك دەکەن و ئەویش ناردی بە دوایاندا، دەفەرموێت: عومەر پیاوێکی بە سامو بەهەیبەت بوو، کاتێ کە فروستادەکە هات، ئافرتەکە ووتی: هاوار بۆی، ئەو چی داوە بە عومەرەوە، ئافرەتەکە هاتە دەرەوە و ژان گرتی و دای بەلای چەند ئافرەتێکدا و زانی یان کەچی یەتی، منداڵێکی بوو پاشان قریشکاندیو مرد، ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر(ﷺ)و ئەویش هەموو ئەنصار و موهاجرەکانی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێ کردن، لەدوای خەڵکەکە پیاوێك هەبوو، ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، تۆ دەبێت ئامۆژگاری گەرو خۆت بە پەرپرس بزانی، عومەر فەرمووی: تۆ چی دەڵێیت؟ پیاوەکە ووتی: ئەڵێم ئەگەر ئەم خەڵکە شوێنت کەوتون لەسەر ئارەزووەکانت سوێند بەخوا ئامۆژگار نەبوون، ئەگەر ئەم تەقەلادان و ڕای ئەوان بێت سوێند بەخوا ڕاکانیان هەڵە بوو، ئەی ئەمیری باوەڕدارانئەو خوێنەت لەسەرەو دەبێت دیەی بدەیت، ووتیان بە حسن: ئەو پیاوە کێ بوو؟ ووتی: عەلی بوو،[3] هەریەکە لە عەلی و عوسمان و طلحة و زوبێر عبدالرحمن و سعد(ﷺ)کە بوێرترینیان لەسەر عومەر عبدالرحمن کوڕی عەوف بوو،موسڵمانان وتیان ئەی عبدالرحمن،کەسی وا هەیە دێت و دەیەوێت پرسیارێ یا گرفتێباس بکات بۆ ئەمیری باوەڕداران بەڵام لەبەر سام وهەیبەتی

---

١ـ المرتضى للندوي (ص: ١٠٧).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ مناقب عمر (ص:١٣٥) مراسل الحسن، محض الصواب (٢٧٣/١).

بۆی باس ناکرێتو بەدەستی خاڵی دەگەڕێتەوە،عەبدول ڕەحامن چوە لای و ئەمەی بۆ باس کرد عومەر فەرمووی: ئەی عبدالرحمن، سوێندت دەدەم بەخوا ئایا عەلی و عوسمان و طلحة و زوبێر و سعد و هەندێکی تریان بەمە فەرمانیان پێ نەدای؟ عبدالرحمن ووتی: بەخودا بەڵێ، عومەر فەرمووی: ئەی عبدالرحمن سوێند بەخوا هێندە نەرمیم نواند بۆ خوڵکی هەتا تاترسام لەسەر ئەوەی هەندێ هەق باس نەکرێن، هێندە توندو بەزەب بووم ەسەریان تا ترسام خوای گەور هەقم لێبسێنێ، کەواتە کوانێ دەربازی؟ پاشان عبدالرحمن هەستایە سەر پێ و دەستی کردە گریان و جلەکانی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشاو دەیفەرموو: لەدوای تۆ ئۆف لەدەستی ئەوان، لەدوای تۆ ئۆف لەدەستی ئەوان،[1] عومەری کوڕی مورڕە،[2] دەفەرمووێت: پیاوێکی قورەیشی گەیشتە عومەر و پێی ووت: هەندێ نەرم و نیان بە بۆمان بەڕاستی دڵمان پڕ بوە لە ترس، عومەر فەرمووی: لە ستەمدا؟ پیاوەکە ووتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: دەی خوای گەورە ترسی من لە سینەتاندا زۆرتر بکات،[3] عبدالله کوڕی عباس(ﷺ) دەگێڕێتەوە: ساڵێك مامەوە و من دەمویست پرسیارێك لەعومەر(ﷺ) بکەم سەبارەت بە ئایەتێك بەڵام لە سام و هەیبەتیانەمتوانی پرسیاری لێ بکەم،[4] عکرمەی خزمەتکاری إبن عباس دەگێڕێتەوە کەڵە شاخ گرەوەیەك کە پیاوێکی بەڕێز بوو کاتێ عومەری بریندار کرد عومەریش ئەم ئەمی کرد کەڵە شاخ گرەوەکە بۆینەکەی نوێ کردەوە عومەر فەرمانی بەسەرادا بەچل درهەم،[5] ئەم پیاوە کاتێ، کە بینی خەڵکە زۆر لەعومەر ترساون ووتی: خوای گەورە! تۆ دەزانی من لە تۆ زیاتر جیاوازم لەوان و لەخۆم.[6]

## سوربوونی لەسەر دابین کردنی پێویستی خەڵك:

إبن عباس دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) هەرکاتێ نوێژی دەکرد لەنێو خەڵکی دادەنیشت، هەرکەس پێوەیستی یەکی هەبوایە لێی دەڕوانی جارێك عومەر نوێژی کرد و لەپاشی نوێژەکان نەمایەوە، منیش هاتمە بەردەگا و ووتم: ئەی (یەرفەء) ئایا ئەمیری باوەڕداران بەهانەیەکی هەیە لە سکاڵا کردن؟ وتی: نەخێر، کاتێ کە من بەم شێوەیە بووم عوسمان هات و یەرفەء چویە ژووری پاشان هاتە دەرەوە بۆلامان و ووتی: هەستە ئەی کوڕی عەففان، هەستە ئەی کوڕی عەباس، چوینە ژووری بۆلای عومەر و بینیمان کە چەند شارایەك پارەی بە دەستەوە بوو، فەرمووی: من سەیرم کرد لە مەدینەدا کەسم نەبینیەوە کە لە ئێوە زیاتر کەسو کاری زۆرتر بێت ئەو پارەیە بگرن و بیبەن دابەشی بکەن لە نێوان خەڵکیدا، ئەگەر زیادەی هەبوو ئەوا بیگێڕنەوە إبن عباس دەفەرمووێت: لەسەر ئەژنۆم کەوتم،

---

١ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:٢٢٠).
٢ـ التقريب (ص:٤١٧).
٣ـ مناقب عمر لإبن الجوزي (ص:١٣٥)، محض الصواب (٢٧٣/١).
٤ـ مسلم، ك: الطلاقة رقم (١٤٧٩).
٥ـ الطبقات لإبن سعد (٢٨٧/٣) منقطع، مناقب عمر (ص:١٣٤).
٦ـ مناقب عمر لإبن الجوزي (ص:١٣٤) منقطع.

ووتم: ئەگەر کەمی هێنا بۆمانزیاد دەکەیت؟ عومەر فەرمووی: ئەوە خویەکە من لەخەزێمەوە دەیزانم،[١] ئەمە لەکوێ و ئوەی کەمحمد(ﷺ)و یارانی تریتیان دەخوارد؟ منیش ووتم: ئەگەر خوا دەروی بکردایەتەوە ئەوەی دەکرد کە تۆ نایکەی، عومەر فەرمووی: ئەی چی کرد؟ منیش ووتم: دەیخوارد و ئێمەشی تێر دەکرد.

إبن عباس دەفەرمووێت: عومەر دەگریا هەتا ئەبرۆکانی لێك جیا بونەوە فەرمووی: پێم خۆش بوو کە من لەم کارەم دەر بچم بە بژێوی ڕۆژانەم و نە لەسەرم بێ و نە بۆمن بێ،[٢] سەعیدی کوڕی موسەیب دەفەرمووێت: حوشترێك لەناو ساباتەکاندا نەخۆش کەوت و عومەر(ﷺ) سەری بڕی هەندێکی لێ نارد بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەوی تری کە مایەوە چاکی کرد و کۆمەڵێك لە موسڵمانانی بۆ بانگ کرد ،عباس فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر هەموو ڕۆژێك لەمەت بۆ دروست بکردنایە ئەوا لای تۆ نانمان دەخوارد و قسەمان پێکەوە دەکرد، عومەر فەرمووی: ناگەڕێمەوە بۆ ئەم کارە، هاوەڵەکانم چون و کارێکیان ئەنجامداو ڕێگەیەکیان گرتە بەر، ئەگەر من کارێك بکەم لە کاری ئەوان نەچێ ئەوا ڕێگەیەکی تر و جیاواز لەوان دەگرمە بەر.[٣] ئەسلەکی خزمەتکاری عومەر دەگێڕێتەوە: عومەر خزمەتکارێکی کردە پاسەوان و فەرمووی ئەی خۆشماڵنەرمو میان بە لە ڕوی موسڵمانان و خۆت بپارێزە لە دوعاو نزای ستەم لێکراو و موڵەی خاون غەنیمەت و پێویستی بدە کە بێنە ژوورەوە، هەروەهاکوڕی عەوف و ئیبنو عەففانیش ، ئەگەر ماڵاتەکانیان تیا بچێ ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ لای کشتوکاڵ و خورما، ئەگەور خاوەن غەنیمەت و ماڵاتیش ، ماڵاتەکەیا تیا بچێت بە بەڵگە دێنە لام و دەڵێن: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا لێیان دەگەڕێم و چاپۆشی دەکەم باوکت نەبێ، ئاوو گژوگیا لای من زۆر لە زێڕ و زیو ئاسانترە، ئەوە ووڵاتی ئەوانە و لە جاهیلیەتدا لەسەری جەنگاون و لەسایەی ئیسلامیشدا لەسەری موسڵمان بوون، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەو پارەیە نەبوایە کە لە پێناوی خوادا لەسەری وەردەگرم پارێزگاریم لە یەك بستێ لە ووڵاتەکەیان نەدەکرد،[٤] موسا کوڕی ئەنەسی کوڕی مالك دەگێڕێتەوە کە إبن سیرین- باوکی محمد کوڕی سیرین- داوای ئەوەی کرد بەڵێن نامەی بۆ بنوسی، تا خۆی بکڕێتەوەو خۆی ئازاد بکات لە ئەنەس و ئەویش لەبەرئەوەی کە دەوڵەمەند بوو داواکەی پەسەند نەکرد، پاشان چوو بۆلای عومەر و پێی فەرموو: بەڵێن نامە بنوسە تا خۆی بکڕێتەوە خۆی ئازاد بکات بۆیکە بەلام هەر پەسەندی نەکرد، عومەر لێیدا لە کاتێکدا ئایەتی: ﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾ (النور:٣٣).

١ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:٢٢١).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ الطبقات الكبرى (٣/٢٨٨) الشيخان من البلاذري (ص:٢٢٢).
٤ـ تأريخ الذهبي عهد الخلفاء الراشدين (ص:٢٧٢).

بۆیە پێی فەرموو:بەڵێن نامە پڕکردنەوە بۆ خۆکڕینەوەو ئازاد بوون ،[١] بۆ بکەوە لە دوایین چیرۆکدا دەبینین کە بەندەیەك داوای ئازاد بوونی خۆی دەکات و گەورەکەی بەرپەچی دەداتەوە حاکمێکیش ویژدان بەکار دێنێ و ڕای بەندەکە ڕادەپەڕێنێ و واز لە ڕای گەورەکەی دێنێ، تۆ ئەم مێژووە دەدۆزیتەوە لە درێژایی و پانتایدا.[٢]

## ٤- شێوازی پەروەردە کردنی بۆ هەندێ لە سەرانی کۆمەڵگە:

عومەر(ﷺ) لە سایەی خەلافەتەکەیدا ڕێگەی بە گەورەکان نەداوە کە ببنە دەسەڵاتدار بەسەر ڕەشو رووتانی کۆمەڵگە و دەست درێژی بکەنە سەریان یان هەست بکەن بە جۆرێك لە بەرزی و بلندی بەسەر خەڵکییەوە و ئەمەش هەندێ هەڵوێستی عومەرە لەم بارەیەوە.

### - ئەبو سفیان (ﷺ)و ماڵەکەی لە مەککە:

عومەر ڕۆیشت بۆ مەککە و خەڵکی هاتن بە دەمی یەوە و وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ئەبوسفیان ماڵێکی پێکناوە و ئاوەڕۆی بەند کردووین هەتا ماڵەکانمان بڕوخێ، عومەر بەخۆی و قامچی یەکەی هات و بینی کە ئەبوسفیان چەند بەردێکی داناوە بۆیە فەرمووی: ئەو بەردانە لابە،ئەوەش و ئەمەش، هەتا زیاتر لە پێنج تا شەش بەردی پێ زیادکردەوە و لایبرد و عومەر هات بۆ کەعبە و فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە وای کردووە لە عومەر کە فەرمان دەدات بەسەر ئەبوسفیاندا و ئەویش گوێڕایەڵی دەکات.[٣]

### - عویەینەی کوڕی حصن و مالکی کوڕی ئەبو زەفر:

عویەینەی کوڕی حصن چوو بۆلای عومەر(ﷺ)و مالکی کوڕی ئەبو زەفرەی کە لە موسڵمانە هەژارەکان بوو، وتی: بێ دەسەڵات بۆتە دەسەڵات دار نامەردیش بەرز بۆتەوە، مالك فەرمووی: ئەمە شانازیمان بەسەرەوە دەکات بە گەورەیی جەستەی و کۆمەڵە کەسانێکی جەهەنەمی، عومەر بێتاقەت بوو کاتێ عویەینە ڕەخنەی لەم تۆڵە وەرگرتنە گرت، پێی فەرموو: لە ئیسلامدا کەنەفت ببە، سوێند بە خوا لێت ڕازی نابم هەتا مالك داوای شەفاعەتت بۆدەکات، عویەینە نەیتوانی لە مالك بڕواتە پێشێ و لای عومەر داوای شەفاعەی بۆ بکات.[٤]

### - جارود و ئوبەی کوڕی کەعب (ﷺ):

جارود چووە لای عومەر(ﷺ) پیاوێك ووتی: ئەمە گەورەی ڕەبیعەیە عومەر قامچی یەکەی بەرزی کردەوە وفەرمووی: ترسام لەوەی کە دڵت تیایدا تێکەڵ بە شتێك بێت، عومەر ئەم کارەی

---

١ـ محض الصواب (٣/٩٧٥).
٢ـ شهيد المحراب (ص:٢٢٢).
٣ـ أخبار عمر (ص:٣٢١)، مناقب أمير المؤمنين لابن الجوزي (ص:١٢٨).
٤ـ تأريخ المدينة المنورة لابن شيبة (٢/٦٩٠) الدور السياسي للصفوة (١٩١).

لەگەڵ ئوبەی کوڕی کەعب کرد و کاتێ کە بینی خەڵکی لێی کۆ دەبنەوە و پاش هاتنە دەرەوەی لە مزگەوت پرسیاری لێ دەکەن، فەرمووی: ئەمەیە فیتنەیەك دەسازێنێ بۆ شوێنکەوتوان و دەبێتە هۆی رسوایی ئەوەی ڕاو بۆچونی وایان فێر دەکات.[١]

## ٥- نکۆڵی کردنی لە هەندێ ڕەفتاری ناو کۆمەڵگە:

ژیانی عومەر(ﷺ) گونجاو بوو لەگەڵ شەرعی خودای دانا و زانا، لەبەر ئەوە قایل نەدەبوو لە هەر ڕەفتێکی لادەریان یا خویەك کە خراپەی کۆمەڵگەی ئیسلامی تێدابێت، ئەمەش هەندێ لە هەڵوێستی عومەرە کە تیایدا هەڵەکارانی ڕاست کردۆتەوە.

### قەسابخانەکەی زوبێری کوڕی عەوام(ﷺ):

عومەر(ﷺ) ڕۆیشت بۆ قەسابخانەکەی زوبێری کوڕی عەوام کە تەنها قەسابخانەی مەدینە بوو، عومەر قامچی یەکەی پێ بوو هەر، کە پیاوێکی دیبایە کە دوو ڕۆژ لەسەر یەك گۆشت دەکڕێت بە قامچیەکەی لێی دەدا و پێی دەفەرموو: ئایا ورگت ناگوشی بۆ دراوسێکەت، یان ئامۆزاکەت.[٢]

### ئێستا چیت دەوێت داوای بکە:

عومەر(ﷺ) پیاوێکی بینی سواڵی دەکردو تورەکەیەکی پێ بوو، کە پڕ بوو لە خواردن، عومەر خواردنەکەی لێ وەرگرت و ڕژاندی یە بەردەم حوشترێك لە حوشترەکانی صەدەقە پاشان بە پیاوەکەی ووت: ئێستا چیت دەوێت داوای بکە.[٣]

### - لەم ڕێڕۆشتنە بگەڕێ:

پیاوێك لە ڕۆیشتندا دەستەکانی شل و پێ یەکانی فڕێ دەدا و پۆزی لێ دەدا، عومەر(ﷺ) پێی فەرموو: واز لەم ڕێڕۆشتنە بهێنە کابرا وتی : ناتوانم، عومەر جەڵدی لێدا و پیاوەکە هەر پۆزی لێدەدا پاشان عومەر جارێکی تر جەڵدی لێداو پیاوەکە وازی لە پۆز لێدان هێنا، عومەریش فەرمووی: ئەگەر جەڵد لەمە نەدەم لە کێی بدەم، پیاوەکە دوای ئەمە هات و وتی: خوای گەورە پاداشتی چاکەت بداتەوە، ئەمە ئەگەر کاری شەیتانیش بێ ئەوا خوای گەورە بەهۆی تۆوە،[٤] ڕەواندی.

### ئاینەکەمان بەسەردا مەمرێنە:

عومەر(ﷺ) سەیری پیاوێکی کرد، کە بەڕوکار بۆسۆفیگەرێتی خۆی مراند بوو، عومەر بەقامچی یەکەی چەخماخەی لێ هەساندو پێی فەرموو: خوا بتکوژێ ئاینەکەمان بەسەردا مەمرێنە.[٥]

---

١ـ تأريخ المدينة المنورة لإبن شيبة (٢/٦٩٠) الدور السياسي للصفوة (١٩١).
٢ـ الدورة السياسي للصفوة (ص:٢٣١) نقلا عن مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي.
٣ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (١٠١).
٤ـ أخبار عمر (ص:١٧٥).
٥ـ هەمان سەرچاوە. (ص:١٩٠).

شیفائی کچی عبدالله دەفەرموویێت: عومەر چەند لاوێکی بینی، کە لەڕۆیشتندا ئارام بوونو کەمکەم قسەیان دەکرد، شیفاء پرسی: ئەمانە کێن؟ ووتیان: سۆفین، شیفاء فەرمووی: سوێند بەخوا عومەر ئەگەر قسەی بکردایە گوێی دەگرت و ئەگەر بڕۆیشتایە پەلەی دەکرد و ئەگەر لە هەرکەسی بدایە ئازاری پێ دەگەیاند، سوێند بە خوا ئەمەیە سۆفی ڕاستەقینە.[۱]

## - بایەخدانی بە تەندروستی خەڵکی:

عومەر(ﷺ) بایەخی دەدا بە تەندروستی خەڵکی و ئاگاداری دەکردنەوە لە قەڵەوی و مەترسی یەکانی و داوای لێ دەکردن کەکێشی خۆیان کەم بکەنەوە لەبەر ئەوەی لە مەیداندا بەهێزی لەسەر کارکردن و توانای بەجێ هێنانی ئەرکەکانی تیایە، عومەر دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە خۆتان لە قەڵەوی و خواردن بپارێزن چونکە دەبێتە هۆی تەمەڵی بۆ نوێژەکان و شێوانی جەستە و زۆر بونی نەخۆشی و دەردو بەلاّ، خوای گەورە تورە دەبێت لە زوخالاّوی قەڵەو، پێویستە میانە ڕەو بن لە جەستەشدا، چونکە ئەو لە زیادەڕەوی ئیسرافەوە دورە و نزیکە لە میانە ڕەو بون، بەهێزترە بۆ بەندەکانی خودا و بەندەش دوچاری تیاچون نابێت، هەتا ئارەزوی لەسەر ئاینەکەی دەخرۆشێ،[۲] إبن جەوزی باسی ئەوە دەکات کە: عومەر(ﷺ) پیاوێکی ورگ زلی بینی فەرمووی: ئەمە چی یە؟ پیاوەکە ووتی: بەرەکەتە لە خوداوە، عومەر فەرمووی: بەڵکو ئەشکەنجەیەکە لە خوداوە.[۳]

لە شێوازەکانی گرنگیدانی بە تەندروستی گشتی بۆ هاولاّتیان، ڕێگری ئەو کەسانەی دەکرد، کە نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە تێکەڵی خەڵکانی تر بکەن لەپێناو بلاّو نەبونەوەی نەخۆشیەکە ،هەروەها ئامۆژگاری نەخۆشی دەکرد بە مانەوە لە ماڵەوە تا چاك دەبویەوە دەگێڕنەوە، کە عومەر(ﷺ) داویەتی بەلای ئافرتێکی گوڵدا کە تەوافی کەعبەی دەکرد، عومەر پێی فەرموو: ئەی بەندەی خودا، ئەگەر لەماڵەکەت دابنیشی ئەزیەتیان ناکەیت، ئافرەتەکە دانیشت، پاشان پیاوێك دای بە لایدا و پێی ووت: ئەوەی کە ڕێگری لێ دەکردی مرد وەرە دەرەوە، ئافرەتەکە ووتی: سوێند بەخوا من، کە لە ژیاندا گوێڕایەڵیم کردووە لە مردنیدا سەرپێچی ناکەم،[٤] هەروەها عومەر جەختی کردەوە لەسەر وەرزش و پادە ڕشتن و ئەسپ سواری ودەیفەرموو: منداڵەکناتان فێری مەلەوانی و تیر ئەندازی بکەن و فەرمانیان پێ بکەن کە لەسەر ئەسپ خۆڕابگرن، هۆنراوەی جوانیشیان بۆیان بگێڕنەوە.[٥]

## - ئامۆژگاری عومەر بۆ مەی خۆران:

عومەر(ﷺ) پیاوێکی بەتوانای شامی بەرسەر کردەوە پێیان ووت: ئەو کابرایە هەمیشە خەریکی مەی خواردنە، عومەر بە کاتبەکەی فەرموو: بنوسە لە عومەری کوڕی خەتاب بۆ فلاّن کەس، سلام

---

۱ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:۲۲٦).
۲ـ الخليفة الفاروقة د. عبدالرحمن العاني (ص:۱۲٤).
۳ـ مناقب عمر أمير المؤمنين (ص:۲۰۰).
٤ـ الخليفة فاروق (ص:۱۲٤) نقلا عن الرياض النضرة.
٥ـ هەمان سەرچاوە.

علیك، من سوپاسی خوا دەکەم کە هیچ خودایەك نیە جگە لەخۆی، بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ۝٢ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ۝٣﴾ (غافر:١-٣).

لەپاشدا، نامەکەی کۆتایی پێ هێنا و دای بە نامەبەرەکەی و پێی فەرموو: نەیدەیتە دەستی هەتا بێدار دەبێتەوە، پاشان فەرمانیدا بەوانەی کە لەگەڵیدا بوون دوعای خێری بۆ بکەن، تا واز لەو کارە بهێنێ ، کاتێ ئەم پیاوە نامەکەی پێگەیشت بەردەوام دەیخوێندەوە و دەیووت: خوای گەورە بەڵێنی پێداوم کە لێم خۆشبێت و ئاگاداری کردومەتەوە لە سزاکەی، بەردەوام ئەم قسانەی دوپات دەکردەوە هەتا گریا پاشان بە چاکی خۆی داماڵی و تەوبەیەکی باشی کردو کاتێ ئەم هەواڵە گەشتە عومەر فەرمووی: ئەوا دروستی بکەن، ئەگەر بینیتان یەکێکتان دوچاری گوناهوتاوان بوە ڕێگری لێ بکەن و مەبنە هاوکاری شەیتان لەسەری.[1]

لەم هەڵوێستەدا بلیمەتی عومەر دەردەکەوێت لە پەروەردەکردنی دەرون و ناسینی سروشتی مرۆیی و هۆکاری دروست ئەوەی کە سود بە کەسێك دەگەیەنێت زیان بۆ کەسانی تر دەبێت، ئەمەش وانەیەکە لە وانەکانی پەروەردەی سەرکەوتووە شێوازی نەرم و نیانیە لە ئامۆژگاری و ڕێنمونیدا، عومەری ئەمیری باوەڕداران لە سەروی گەورەیی دەسەڵات و سەرقاڵ بوونەوە یەکێك لە دانیشتوانی کۆڕەکەی دیار نابێت عومەر نایەڵێت بەسەریدا تێپەڕێت، دەپرسێت تا بزانێ گرفتی چیە بۆ ئەوەیە چارەسەری بکات، ئەمرۆش برا لەبرا ون دەبێت کەچی کەسیان هەست بە دیارنەمانی ئەوی تریان ناکات، ئەگەر هەستی کرد لە هۆی ون بون و بەدوا داچوی پرسیارەکەی ناگەرێت بەدوای چارەسەردا هەوڵی خۆی نادات ئەگەر ئەو کارە پێویستی بە چارەسەریش بێت، ئەم بەدەمەوە نەچونە یەکێکە لەهۆکارەکانی ڕوخانی برایەتی ئیسلامی و ئەمەش بە حاڵی موسڵمانان نی یە کە وادەزانن ئەوان بران، دەبێت کەی ئاوڕێك لەمە بدەینەوە؟ ڕەنگە و بریا.[2]

### - ڕای عومەر لە کۆڕی تایبەتدا:

عومەر(ﷺ) ئارەزوی ئەوەی دەکرد کە کۆڕەکانی خەڵکی بەگشتی بەو شێوەیە بێت، خەڵکان لە هەموو چین و توێژەکانیاندا ئارەزوی دەکەن، عومەر هەمیشە ڕقی لەوە دەبویەوە کە کۆڕو دانیشتنەکان داخراوو تایبەتی بن، لەبەر ئەوە ئەمە هانی دەدات بۆ ئەوەی هەمیشە ڕاو بۆچونی جیاوازو دیاریان هەبێت و بە گروپ گروپی ڕا جیا ،[3] إبن عباس ریوایەتی کردووە کە عومەر بە خەڵکێکی قورەیشی فەرمووە: هەواڵم پێگەیشتووە کە کۆڕو کۆبونەوە سازدەکەن، دووکەستان دادەنیشێ هەتا دەڵێن من لە هاوەڵانی فلان کەسم و لە کۆڕگرانی فلان کەسم، کۆڕو کۆبونەوکان بونەتە

---

١ـ تفسير القرطبي (١٥/٢٥٦).
٢ـ شهيد المحراب (ص:٢٠٨).
٣ـ الخلفاء الراشدين حسن أيوب (ص:١١٥).

مەیدانی جەنگ، سوێند بەخوا ئەمە زیانمەندە بۆ ئاینەکەتان و زیانمەندە بۆ شەرەفتان و زیانمەندە بۆ نێوانی خۆتان، پێم وایە کە ئەو کەسەی دوای ئێوە دێت دەڵێت: ئەوە ڕای فلان کەس بووە کەوا ئیسلامیان پارچە پارچە کردوە، کۆڕ و کۆبونەوەکانتان پوچەڵ بکەنەوەو پێکەوە دابنیشن و ئەمە درێژە پێدەری ئولفەتتانە و بەمەش خەڵکی لێتان دەترۆقێت،[1] لەڕاستیدا دورکەوتنەوەی تایبەت لە خەڵکان بە گشتی و تایبەتمەند کردنی کۆڕەکان بۆ ئەو تاکانەی کە چاوەڕوان دەکرێت لە پەروەردەی تایبەت بۆ خەڵکان بە گشتی و کۆبونەوەی سودمەندیان کە بریتیە لەگواستنەوەی وتەکان و قسەکان وەکو خۆیان بێکەم کردن و زیاد بۆ کردن، پاشان زۆری کۆڕ و کۆبونەوەکانی بە بێ گومان بانگەشە بۆ زۆری جیاوازی یەکان دەکات لەو گرفتانەی کە ڕوبەڕوبان دەبێتەوە و بەمەش قسەی جیاواز و جۆراوجۆر لە دین دەکرێت، ئەمەش هەر ئەوەبوو، کە عومەر(ﷺ) لێی دەترسا لە خەڵکی و لەوەش کە لە داهاتودا دەبێت.[2]

## دووەم: بایەخدانی بە لێپرسینەوە (فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە)

خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی یارانی پێغەمبەرە بەڕێزەکەی(ﷺ) کە ماڵ و شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە دوای دامەزراو بوون و دەسەڵات پەیدا کردن لەسەر زەوی هەڵدەستن بە چوار فرمان: نوێژکردن، زەکات دان، فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە و ئەمەش لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژەی پێ کراوە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ۝٤٠ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾ (الحج: ٤٠-٤١).

ئیمام ئەبوبکری جەساس لە تەفسیرکەیدا دەفەرموێت: ئەمە سیفەتی کۆچ بەران بوو لەبەر ئەوەی کە ئەوان لە ماڵ و وڵاتیان بە ناهەق دەرکرابوون، خوای گەورە هەواڵی دابوو کە ئەگەر دەسەڵاتمان پێ دان لە زەویدا نوێژەکانیان بەجی دەهێنن و زەکات دەدەن و فەرمان بە چاکە دەکەن و بەگریش لە خراپە، ئەمەش سیفەتی خەلیفەکانی ڕاشیدینە کە خوای گەورە لەسەر زەویدا دەسەڵاتی پێدان کە بریتی بوون لە ئەبوبکرو عومەرو عوسمان و عەلی(ﷺ)،[3] مێژووشاهیدی لەسەر ئەمە داوە و بەکۆی

---

١ـ فرائد الكلام (ص:١١٦) تأريخ الطبري (٣/٢٨١).
٢ـ الخلفاء الراشدين حسن أيوب (ص:١١٥).
٣ـ أحكام القرآن (٣/٢٤٦).

دەنگ سەلماندویەتی، کە عومەر(ﷺ)هەستاوە بە ئەنجامدانی ئەم کارانە،[١] و بایەخیداوە بەپارێزگاری و بەرەوپێش بردنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت وەك دارایی وداد و سەربازی و دام ودەزگاکانی پەیوەست بە والی و هەوڵی داوە کە خەڵکی بەرپرس بکات لەسەر فەرمان بەرداری فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و کارکردن لەسەر ئەوەی کە خەڵکی بەرپرس بن لە بەجێ هێنانی ئەو کارانەی کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ڕێگری لێ کردوە لە میانی پۆستەکەی وەك خەلیفەیەك بۆ موسڵمانان و لەمیانی ولایەتە پەرش وبڵاوەکاندا لە دەوڵەتی ئیسلامیدا کە إبن تعییە - ڕەحمەتی خوای لێبێت - دەفەرمووێت: کە تەواوی ولایەتەکانی ئیسلام دەگرێتەوە کە مەبەست تیایدا فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری کردن بووە لە خراپە.[٢]

هەروەها عومەر(ﷺ) هەستاوە بەلایەنی یەکتاپەرستی و بە گژدا چونەوەی ناڕەوایی و لەڕێگەی ڕاستی لادان و بەرز ڕاگرتنی پەرستشەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا و بەگژی خراپەدا چۆتەوە و هانی چاکەی داوە.

## ١- پاراستنی لایەنی یەکتا پەرستی و بە گژاچونەوەی ناڕەوایی و داهێنراوەکان:

بەوەی کە یەکێك لە مەبەستە تایبەتەکانی دەوڵەتی ئیسلامی پارێزگاری کردن لە ئایینە، ئەوا گرنگترین ئەو کارانەی کە فاروق پێی هەستاوە لەم ڕاسایەدا بریتی بوو لە پاراستنی بنەماکانی ئایین بەرپرسکردنی خەڵکی لە بیر و باوەڕی ڕاست و دروست و پوخت کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری بەجێ هێشتون ، بەرەنگاری گومانی دڵ نەخۆشانی کدوە و فێڵ و تەڵەکەی ئەو دوژمنانەی ئیسلامی بەرپەرچ داوەتەوە کەڕێ خۆشکەر بوون بۆ بیر و باوەڕی لادراو و وتەی بێ سودی خراپ کە شەیتان بۆی ڕازاندونەتەوە ئەوان وایان دەزانی کە چاك دەکەن، ئەمەش هەندێ هەڵوێستی عومەرە کەشاهیدی دەدەن لەسەر ئەوەی کە لایەنی یەکتاپەرستی پاراستووە و بەگژی گومان و ناڕاستی و ناڕەوایدا چۆتەوە.

### - بوکی نیل:

عەمری کوڕی عاص کەسێکی نارد بۆلای عومەر(ﷺ) بە نامەیەك تیایدا هەواڵی پێدا سەبارەت بە کەلتوری خەڵکی میسر کە ساڵانە کچێك هەڵدەدەنە ئاوی نیل و پێیان ووت: ئەی ئەمیر، نیلی ئێمە ئەمساڵ ناڕوات هەتا ئەوەی کە ئەیەوێ بۆی نەکەین، عەمر فەرمووی: ئەوە چی یە؟ ووتیان: ئەگەر دوانزە (١٢) ڕۆژ لەم مانگە ڕۆیشت باوەڕمان وایە کە کچێکی تازە پێگەیشتو لە باوکی وەربگرین و دایك و باوکیمان قایل کردووە و پۆشاك و خشڵی جوانمان پێوە کردووە کە فڕێی بدەینە ئاوی نیلەوە، عەمر پێی فەرموون: ئەمە لە ئیسلامدا نی یە و ئیسلامیش هەموو کەلتورەکانی پێش

---

١ الحسبة في الراشدي د. فضل إلهي (ص:١٥).

٢ـ الحسبة في الاسلام (ص:٦٠)، السلطة التنفيذية (٣٠٩/١).

خۆی پوچەڵ دەکاتەوە، خەڵکەکە تاماوەیەك وەستان و ئاوی نیل کەم تا زۆر نەدەجولاّ و ڕێی نەدەکرد ئەوانیش پەژارە دایگرتن، لەم کاتەدا عەمر نامەیەکی نوسی بۆ عومەر، عومەریش وەلاّمی دایەوە : ڕاستت کردووە بەوەی کە پێی هەستاوی، من پسولەیەکت بۆ دەنێرم لەنێو ئەم نامەیەدا تۆش فڕێی بدەرە ئاوی نیلەوە، کاتێ کەنامەکە گەیشتە دەستی عەمر، کە تیایدا نوسرابوو: لەبەندەی خودا عومەر ئەمیری باوەڕداران بۆ نیلی خەڵکی میسر، پاشان، ئەگەر تۆ هەروەك جاران دەڕۆیت و بە فەرمانی ئەو کەسانەی کە فەرمانیان پێداوی ئەوا لەجێی خۆت مەبزوێ ئێمە پێویستمان بە تۆ نییە، ئەگەر تۆ بە فەرمانی خوای تاك و تەنها و بە دەسەلاّت دەبزوێی و ئەو بەڕێت دەکات، ئەوا داوا لە خوا دەکەین کە بەڕێت بکات ،عەمر دەفەرمووێت: کە پسولەکەمان فڕێ دایە نیلەوە ڕۆژی شەممەدا بوو لە شەوەکەیدا١٦باڵ زیادی کرد، خوای گەورە ئەم سوننەتە خراپەی ئەهلی میسری لەو ساتەوە هەتا ئەمڕۆ لە ڕیشە هێناوە.[١]

عومەری فاروق(ﷺ) مانای یەکتاپەرستی لەم پسولەیەدا ڕوون کردۆتەوە و نیلیش بە ویست و توانای خوای گەورە کەوتۆتە بزوان و، تەڵەکەی بیروبڕوا خراپەکەی بۆ خەڵکی ئاشکرا کردووە کە لەناخیاندا بەخێرایی ڕۆیشتووە عومەر بەڕەفتی پڕ لە هۆشیاری و دانایی خۆی ئەم بیرو باوەڕە خراپەی لەناخی میسریە کۆنەکاندا ڕیشە کێش کردووە.[٢]

## تۆ بەردی نە سودت هەیە نە زیان:

عابسی کوڕر ڕەبیعە دەگێڕێتەوە عومەر(ﷺ) هاتۆتە لای بەردە ڕەشەکەو ماچی کردووە و فەرموویەتی: من دەزانم کە تۆ بەردی نە سودت هەیە نە زیان، ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ)م نەبینیایە ماچی کردوی هەرگیز ماچم نە دەکردی،[٣] ئەمە شوێنکەوتنە لە باشترین شێوەیدا و لە جوانترین مانا و واتایدا،[٤] ابن حجر دەفەرمووێت: طبراني فەرموویەتی: عومەر ئاوهای فەرمووە لەبەر ئەوەی کە خەڵکی تازە بوون لە بەندایەتی و پێشتر بتیان دەپەرستیو عومەر کە نەفامان وا گومان بکەن کە وەرگرتنی بەرد لە بەشی گەورەکردنی هەندێ لە بەردەکانە هەروەك ئەوەی کە عەرەبەکان لە جاهیلیەتدا پەیڕەویان کردووە، عومەر ویستی ئەوە بزانێ کە وەرگرتنی ئەم کارە شوێنکەوتنە بۆ کارێکی پێغەمبەر(ﷺ) پاشان ابن حجر -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرمووێت: لە وتەکەی عومەردا ئەمە تەسلیم بوونێکە بەدەستووری شەرعی لە کاروباری ئایینیدا و باشترین شوێنکەوتنە، لەوەش کە مانا و واتاکەی ئاشکرا نەکردووە ئەمە بریتیە لە ڕێسایەکی گەورە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرە(ﷺ) لەوەی، کە دەیکات ئەگەر چی حیکمەتەکەشی نەزانێ.[٥]

---

١ـ البداية و النهاية(٧\١٠٢-١٠٣) قال علي طنطاوي: نشرناها لشهرتها لا لصحتها.

٢ـ من الحكم (ص:٣٤٧).

٣ـ البخاري رقم ١٥٩٧.

٤ـ أصحاب الرسول (١\١٦١).

٥ـ فتح الباري (٣\٥٩١،٥٩٠).

ئەم ڕەفتەش- بریتییە لە شوێنکەوتنی سوننەت و سوربوون لە سەری ولە ڕەفتارەکانی سەرکەوتنە لە چین و توێژی هاوەڵاندا (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەوان دەیانزانی کە هەر دەبێ شوێنکەوتەی سوننەت بن هەتا خوای گەورە خۆشیانی بوێ بە سەرکەوتن و پشتیوانی لێکردنیان.[۱]

### -بڕینەوەی داری( رضوان ):

ابن سعد بەسەنەدێکی دروست لە نافعەوە هێناویەتی: هەواڵیان دایە عومەر کۆمەڵە کەسێك دێن بۆلای داری(رضوان)و نوێژی لا دەکەن ئەویش فەرمانی دا بەبڕینەوەی دارەکە دواتر دارەکەی بڕییەوە.[۲]

ئەمە هەڵوێستی عومەری ئەمیری باوەڕداران(ﷺ) بووە لە پاراستنی یەکتاپەرستیدا و سەرکوتکردنی هۆیەکانی فیتنە بەجۆرێ ئەو شوێنکەوتوانە هەستاون بە کارێك کە هاوەڵان(خوایان لێ ڕازی بێت) نەیان کردووە، دیارە ئەمەش کارێکی داهێنراوە و دوایی ئەبێتە هۆی پەرستش و عومەر فەرمانی کرد بە بڕینەوەی دارەکە و بڕایەوە.[۳]

### -گۆڕی دانیال:

کاتێ کە تەرمەکەی دانیالی بوتوستەر کەوتە دەرەوە ئەبو موسی بە نامەیەك عومەری(ﷺ) ئاگادار کردەوە و ئەویش نامەیەکی بۆ نووسی و پێی فەرموو کە بە ڕۆژ۱۳گۆڕ هەڵبکەنێ و بە شەو لە یەکێکیاندا بیشارێتەوە و گۆڕەکەی خۆڵاوی کرد، هەتا خەڵکی خراپەو فیتنەی پێوە نەکەن.[٤]

### -ئایا ئەتانەوێ کە شوێنەواری پێغەمبەرانتان وەك مزگەوت وەرگێڕن:

بە سەنەدێکی ڕاست و دروست سەلمێنراوە کە عومەر(ﷺ) لە سەفەردا بووە و کۆمەڵێکی بینیوە کە ڕوو لە شوێنێ دەکەن و نوێژی تێدا دەکەن، عومەر فەرمووی ئەمە چی یە؟ وتیان شوێنێکە کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی تێدا کردووە، عومەر فەرمووی: گەلانی پێش ئێوە بەم کارە تیاچوون، ئەوان شوێنەواری پێغەمبەرانیان دەکردە مزگەوت، هەرکەس نوێژ هەستی بزوانـد با بیکات، ئەگەرنا با تێیپەڕێنێ.[٥]

### حەزم کرد بزانن کە خوای گەورە کار ساز( ئافەریننند )ە:

بەڕاستی لابردنی خالیدی کوڕی وەلید لە سەرکردایەتی کردنی سەپا لە شام هیچ هۆکارێکی نەبوو جگە لەوەی کە بەرژەوەندی گشتی ئومەتی ئیسلامی تێدا بوو، عومەر دەترسا لەوەی کە خەڵکی

---

۱ـ من أخلاق النصر في جيل الصحابة (ص:۲۳).
۲ـ التأريخ الاسلام (۲۰،۱۹\۲٦۰) طبقات ابن سعد (۲\۱۰۰).
۳ـ هەمان سەرچاوە. (۲۰،۱۹\۲٦۰).
٤ـ الفتاوى (۱۵\۹۰).
٥ـ الفتاوى (۱۰\۲۳٥).

دابەستە بن بە عومەرەوە و ئەوان باوەڕیان وابوو سەرکەوتن پەیوەستە بە پیرۆزی و جیهاندیدەی جەنگی خالید، ئەوان لەسەر ئەوە دەهاتنە ئاخاوتن، عومەریش نیازی کرد کە فێریان بکات خوای گەورە پشتیوان و سەرخەرە و هەر کارێك کە بیەوێت ئەنجامی دەدات، لەبەرئەوە بڕیاری لابردنی ڕاگەیاند ، لە نوسراوە ڕاڤەکراوەکەیدا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە ئەم بڕیارە دەبێت گشتاندنی بۆ بکرێت بە ویلایەتەکاندا وەك سووربوونی لەسەر لایەنی یەکتاپەرستی بەجۆرێ کە لە نامەکەدا هاتووە: من خالیدم لانەبردوە بەهۆی قەڵسی و خیانەتەوە، بەڵام خەڵکی فیتنەیی یان پێوە دەکرد، منیش حەزم کرد بزانن کە خوای گەورە خۆی کارساز و ئافەرینندەیە.[1]

### -بەڕاستی پشت بە خوا بەست ئەوەیە کە دەنکۆڵە تۆوێك فڕێ بداتە سەر زەوی:

موعاویەی کوڕی قوررە ئەگێڕێتەوە عومەر (ﷺ) گەشت بە خەڵکانێکی ئەهلی یەمەن و پێی فەرموون: ئێوە کێن؟ ئەوانیش وتیان ئێمە پشت بەستانین بە خودا، عومەر فەرمووی: بەڵکو ئێوە شەکەستبوانن، بەڕاستی پشت بە خوا بەستوو ئەوەیە کە دەنکۆڵە تۆوێك فڕێبداتە سەر زەوی و پشت بە خودا ببەستێ.[2]

### هۆشیاربەکە ئێمە پەیڕەوکەرین ودەست پێ کەرنین، شوێن کەوتەین وداهێنەر نین:

عومەر(ﷺ) لەسەر مینبەر فەرمووی ئاگاداربن کە خاوەن ڕاکان دوژمنی سوننەتەکانن، فەرموودەکان شەکەتیان کردوون تا لەبەریان بکەن و بەڕای خۆیان فتوا بدەن ئەوان گومڕا و گومڕا کارن هۆشیاربە کە ئێمە پەیڕەوکەرین ودەست پێ کەرنین، شوێن کەوتەین و داهێنەر نین سەرگەردان نابین بەوەی کە بە شوێنەوار گرتوومانە، عەمری کوڕی مەیمون لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: پیاوێك هات بۆ لای عومەر و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێمە کاتێ کە فەتحی مەدائینمان کرد کتێبێکی سەیرمان تێدا بینیەوە ئایا ئەوە کتێبی خوایە، عومەر فەرمووی: نەخێر دواتر داوای قامچیەکەی کرد و دەستی کرد بە لێدانی ئەم چەند ئایەتەی خوێند کە دەفەرموێت:

﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ۝١ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ۝٢ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾(یوسف:١-٣).

بەڕاستی پێش ئێوە گەلانێك تیاچوون کە کتێبی زانا و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەیڕەویان و وازیان لە تەورات و ئینجیل و تەنانەت لە کەل و پەل و هەرچی تیایدا بوو لە زانیاری و زانست،[3]

١ـ البداية و النهاية(٧\٨٢).
٢ـ أصحاب الرسول، اسناده صحيح (١\٢٦٤).
٣ـ قيد ضعف لا نقطاعه، مناقب عمر لابن الجوزي (ص:٢٣) وله طرق تقوء.

دەڕۆیشت و تێدەپەڕی، ئەسلەم دەفەرمووێت: گوێم لە عومەر(ﷺ) بوو ئەیفەرموو: خێرایی ڕۆیشتنەکەی لە چی دایە ئێستا؟! لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە واز لە هیچ کارێك ناهێنین کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) پێی هەستاوین،[١] حسن بەصری دەفەرمووێت: عەمرانی کوڕی حەصین(ﷺ) ڕێگری چوونە نێو شاری بەصرەی لێ کراو بەم هۆیەوە هات بۆ لای عومەر بۆی تورە بوو، ڕێگری لێ کرد لەو کارەو فەرمووی:

خەڵکی باس لەوە دەکەن کە یەکێك لە یارانی محمد(ﷺ) ڕێگەی چوونە ناو یەکێك لە شارەکانی لێ گیراوە،[٢] ئەبی دائل،[٣] دەفەرمووێت: من لەسەر کورسیەکەی شیبەی کوڕی عوسمان،[٤] دانیشتبووم لە کەعبەدا، فەرمووی: عومەر لەم کۆڕەدا دانیشتووە، وتی: من پەرۆشی ئەوە بووم،کە زەردایی و سپیایی تێدا لێنەگەڕێم و دابەشم کرد، وتم: من نەمدەویست ئەم کارە بکەم، وتی: بۆ چی؟ وتم: هاوەڵەکانت ئەم کارەیان نەکردووە، وتی: ئەوان دوو پیاون کە من پەیڕەویان پێوە دەکەم.[٥]

ئەمە هەندێ لەو هەڵوێستانەی فاروق کە ڕێنمایمان دەکات بۆ پاراستنی لەلایەنی یەکتاپەرستی و بە گژدا چوونەوەی بیدعە، عومەر لە مانای ئەو یەکتاپەرستی یە تێگەیشتووە کە ئیسلام ڕێنمونی بۆ کردووە و ناسیویەتی و کاری پێ کردووە و سوربووە لەسەر شوردنەوەی هەر شوێنەوارێك لە شوێنەوارە بت پەرستیەکان لەنێو ناخ و دڵ و دەروونداو دەربڕینی یەکتاپەرستی لە ناخی مرۆڤایەتیدا زیندوو کردۆتەوە، عومەر کاری کردووە لەسەر قوڵ کردنەوەی ڕاستی ئیمان لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا بە هەموو مانا و بنەماکانیەوە بەتەواوی و بە گژدا چوونەوەی هاوبەش پەیدا کردن بە هەموو شێوەکانی و جۆرەکانی پەنهانیەکانی و بەگژدا چوونەوەی بیدعە و پابەند بوون بە پێغەمبەر(ﷺ) لە کردارو گوفتاریدا، ئەم ڕەسەنەتیانەش دەچێتە نێو چوار دیواری فیقهی تەواو کاری کە عومەر تێی گەیشتووەو لە دنیای خەڵکیدا پێی ژیاوە.

## بایەخدانی بە کاری پەرستن:

عومەری فاروق(ﷺ) لە قورئان و سونەتەوە ئەوە تێگەیشتووە کە ئایین هەمووی لەنێو پەرستشدایە و ئاینیش پرۆگرامی خودایە هاتووە تا ژیان بە تەواوی بگرێتەوە و هەموو کار و فەرمانەکانی خۆی ڕێك بخات لە ئادابی خواردن و خواردنەوە و بەجێ هێنانی پێداویستیەکان بۆ بنەمای دەوڵەت و سیاسەتی حوکم و سیاسەتی دارایی و کاروباری مامەڵە و سزادان و دەستوری پەیوەندیە دەوڵەتیەکان لە ئاشتی و جەنگدا ، هێماکانی پەرستش لە نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج بایەخ و پلە و پایەی خۆیان هەیە بەڵام ئەمە تەواوی پەرستشەکان نین بەڵکو بەشێکن لەو پەرستشانەی

---

١ـ محض الصواب (٢\٥٣٢).

٢ـ محض الصواب (٢\٥٣٢).

٣ـ شفیق کوڕی سلمە.

٤ـ شیبە کوڕی عوسمان کوڕی ابی طلحتی قورەیشی عەبدەری حاجی کەعبە.

٥ـ محض الصواب (٢\٥٣٧) اسنادە صحیح.

که خوای گەورە دەیەوێن[۱] و چەسپاندنی ئەم تێگەیشتنە بۆ پەرستش لە دونیای خەڵکیدا لەمەر جێ نیشتەجێ بوون لەسەر زەویدا.

هەروەها پەرستش بایەخی تەواوی لەژیانی مرۆڤدا هەیە بۆ دامەزراندنی بیر و باوەڕ و دامەزراندنی بنەما ئەخلاقیەکان و چاکسازی لایەنی کۆمەڵایەتی، ئەمەش هەندێك لە بایەخەکانی عومەرە بە هێماکانی نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج و یادی خودا و سوربونیەتی لەسەر فەراهەم هێنانی مانای پەرستش لە ناخیدا و لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا.

## - نوێژ:

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی نوێژ کردنی دەدا بەسەر موسڵماناندا و زیادە ڕۆیی لە نکۆڵی لەسەر ئەو کەسە دەکرد کە لە نوێژی بە کۆمەڵ دوا دەکەوت و ئەم نکۆڵیەی توند تر کردەوە لەسەر ئەوکەسانەی کە وازیان هێناوە، ئەبوبەکریش لەسەر ئەم ڕێنمونی یەی شوێن پێی هەڵگرتووە، کاتێ عومەر دەسەڵاتی خەلافەتی گرتە دەست بایەخی دەدا بە نوێژ کردن وخەڵکی بەرپرس کردووە لەسەری و سزای ئەو کەسەی داوە کە وازی لێ دێنێ و نامەی نوسی بۆ کاربەدەستانی بەم شێوەیە: گرنگترین کار و باری ئێوە نوێژە، هەرکەس پارێزگاری لێ بکات ئەوا پارێزگاری لە ئاینەکەی کردووە، هەرکەس لە یادی بکات ئەوە بۆ هاوشێوەکانی لە یادکراو ترە.[۲]

هەروەها عومەر(ﷺ) زۆر سوربووە لەسەر ملکەچی لە نوێژدا، عبداللە ی کوڕی عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە، لە پشت عومەرەوە نوێژم دەخوێند لەدوای سێ ڕیزەوە،[۳] گوێم لە ناڵەناڵی بوو، لە ڕیوایەتێکی تر دا هاتووە کە ئەو لە نوێژی بەیانیدا ئەو ئایەتەی دەخوێند دەفەرمووێت: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٨٦﴾(یوسف: ۸٦).

عومەر هێندە گریا هەتا ناڵەناڵی لەدوایین ڕیزدا بەر گوێ کەوت.[٤]

عومەر(ﷺ) بەو کەسانە دەڵێت کە گاڵتە لە نوێژەکانیاندا دەکەن ئەگەر دڵی ملکەچ بوایە ئەوا پەل و پۆکانیشی ملکەچ دەبوون.[٥]

هەروەها عومەر ئەگەر هەواڵی سوپاکانی بە هێوری پێ بگەیشتایە ئەوا دوعای قنوتی دەخوێندەوە،[٦] لە نوێژەکانیدا دوعای بۆ موجاهیدەکان دەکرد و قنوتی بۆ ئەمە دەخوێند، کاتێ کە جەنگی جولەکە و مەسیحی یەکانی ئەنجامدا لە نوێژە فەرزەکاندا لە قنوتدا دوعای لێکردن.[۷]

---

۱ـ فقه التمكين في القرآن الكريم للصلابي (ص:۱۸۱).
۲ـ الفتاوى (۱۰/۲٤۹)، الموطأمع ش ح أو جزء المسألك (۱/۱٥٤).
۳ـ حلية الاولياء (۱/۲۲).
٤ـ الفتاوى (۱۰/۳۷٤).
٥ـ الفتاوى (۱۸/۱٥٤).
٦ـ الفتاوى (۲۳/٦۲).
۷ـ الفتاوى (۹۱/۲۱).

عومەر(ﷺ) خۆی و خەڵکیشی پەروەردە دەکرد لەسەر بایەخدان بە نوێژە فەرز و سوننەتەکان و ڕێنمونی خەڵکی دەکرد بۆ بەجێ هێنانی سوننەتەکان و ڕێگری دەکردن لە بیدعە، کاتێ عومەر لە بەجێ هێنانی نوێژی شێوان دواکەوت هەتا دوو ئەستێرە هەڵهاتن بەهۆی سەرقاڵ بوونی بەهەندێ کارەوە پاش نوێژەکەی دوو بەندەی ئازاد کرد.[1]

عومەر کۆکردنەوەی (جمع) دوو نوێژی پێکەوە بە تاوانی گەورە لە قەڵەم دەدا و ڕێگەی نەدەدا بە هیچ کەسێك کە لە پاش نوێژی عەسر،[2] نوێژ بخوێنێ و پەشیمان دەبویەوە لەدواکەوتن لە دەربارەی پێشخستنی نوێژی هەینی، لەسالمی کوڕی عبداللە و لە عبداللە ی کوڕی عومەر(ﷺ) دەگێڕنەوە: کاتێك کە عومەر وتاری نوێژی هەینی دەخوێند پیاوێك لە کۆچەریە بە کەمینەکانی یارانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتە ناو مزگەوت و عومەر بانگی کرد: ئەمە چ وەختێکە؟ پیاوە وتی: من سەرقاڵی کاروبار بووم و نەگەراومەتەوە بۆلای کەس و کارم هەتا گوێم لە بانگ بوو هیچم پێ نەکرا جگە لە دەست نوێژێك کە بیگرم، عومەر فەرمووی: دەست نوێژت گرتووە؟ وەزانیوتە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە خۆشۆردنیش داوە،[3] هەروەها ڕێگری کردووە لە بەرزکردنەوەی دەنگ لە نێو مزگەوت، هەروەها سائبی کوڕی ئەبی یەزید فەرموویەتی: لە مزگەوت بووم پیاوێك وره بەردێکی لێدام کە سەرنجمدا بینیم عومەرەو فەرمووی بڕۆ ئەو دوانەم بۆ بهێنە ، منیش چووم هێنانم، عومەر فەرمووی: ئێوە کێن؟ یان لە کوێوە هاتوون؟ وتیان: ئێمە خەڵکی طائفین، عومەر فەرمووی: ئەگەر خەڵکی ئەم وڵاتە بونایە ئەوا ئازارم دەدان، دەنگتان لە نێو مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) دا بەرز دەکەنەوە،[4] عومەر(ﷺ) ئامۆژگاری یەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی بەهەند وەردەگرت، عبداللە ی کوڕی عومەر(ﷺ)دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (( ئەگەر یەکێکتان خێزانەکەی داوای لێ کرد کە بڕوات بۆ مزگەوت با ڕێگری لێ نەکات)) ئەو وتی: خێزانەکەی عومەر(ﷺ) نوێژی لە مزگەوت دەکرد و پێی فەرموو: تۆ دەزانی کە من چیم خۆشدەوێت، خێزانەکەی ووتی: سوێند بەخوا کۆتایی پێ ناهێنم هەتا ڕێگریم لێ دەکەیت، ئەو وتی: عومەر سەر زەنشتی کرد و ئەو لە مزگەوت بوو،[5] ئەم هەواڵەش دەلالەت دەکاتە سەر گەورەیی ئەمیری باوەڕداران عومەر(ﷺ) بۆ کارو فەرمانی شەریعەتی ئیسلام و وەستانی لەسەر قورئان و سوونەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەجۆرێ کە ڕاپەڕاندنی ئەم کارەی خستۆتە پێش ئەو شتەی کە خۆی پێی خۆشە.[6]

عومەر(ﷺ) لە نێو قوڵایی شەودا حەزی بە نوێژ کردن دەکرد، عومەر تا کۆتایی شەوگارو پاشان کەس و کارەکەی بێدرا دەکردەوە دەیفەرموو: نوێژ... نوێژ و ئەم ئایەتەی دەخوێند کە

---

١ـ التأريخ الاسلام الحمدي (٤٢، ٢٠، ١٩) نقلا عن تأريخ دمش.
٢ـ الفتاوى (٢١/٩٨) (٣٢/٢٣).
٣ـ الفتح (٢/٣٠، ٤١٥) الخلافة الراشدة (ص:٢٩٤) د. يحي اليحى.
٤ـ الفتح (١/٦٦٨).
٥ـ البخاري رقم (٨٦٥).
٦ـ التأريخ الاسلام (٢٠، ١٩/٤٠).

دەفەرمووێت: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ (طه[1] :١٣٢).

شەوێك عومەر هەستا بۆ نوێژ و پەژارە دایگرت لە بیرکردنەوە لەکار و باری خەڵکی و بەم هۆیەوە نەیتوانی نوێژەکەی بخوێنێ و نەیتوانی کە بێدار بێت، فەرمووی:سوێند بەخوا ناتوانم نوێژ بکەم و بێدار بم، من سورەتێك دەکەمەوە کە نازانم لەسەرتاکەیدام یان لە کۆتایی یەکەیدا، کاتێ کە لێیان پرسی: بۆچی ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ فەرمووی: لە پەژارەم بۆ خەڵکی،[2] هەرچی یەك کە بەشەو لە دەستی دەربچوایە بەڕۆژ قەرەبوی دەکردەوە هەروەها عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: هەرکەس شتێکی لە پاڕانەوەکەی یان زیکرو ویردەکەی لەدەست چوو لە شەودا، لە نێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا خوێندی وەك ئەوە وایەکە بە شەو خوێندبێتی،[3]هەروەها عومەر خوازیار بووە کە بانگدەر بێت و لەو بارەیەوە فەرموویەتی: ئەگەر لەگەڵ کاری خەلافەتەکەمدا بانگم پێ بدایە بانگم دەدا،[4] عومەر زۆری دوعای دەکردو لە خودا خۆی نزیك دەکردەوە، لە نزا و وتەکانیدا سەبارەت بەدوعا دەیفەرموو: خوای گەورە، هەموو کارەکانم چاك بکە و وای لێ بکە کە بە پوختی لە پێناوی تۆ دابێت هیچی بۆ کەسی تر تێدا نەبێت،[5] هەروەها لە دوعاکانیدا هاتووە کە دەفەرمووێت: خوای گەورە ئەگەر تۆ منت بەلاسار نوسیوە ئەوا بمکوژێنەوە و بەبەختەوەربم بنوسە چونکە تۆ هەرچی یەکت بوێ دەیسڕیتەوە و دامەزراوی دەکەیت،[6] پاشان دەیفەرموو: من توانای پەژارەی وەڵام دانەوەم نی یە بەڵکو پەژارەی دوعا هەڵدەگرم، ئەگەر نیگای دوعام کرد ئەوا وەڵامەکەی لەگەڵدا بێت.[7]

هەروەها عومەر هانی خەڵکی دەدا بەمەبەستی نزیك بوونەوە لەوانەی کە ملکەچن و دەیفەرموو: لەدەم و زاری ملکەچان نزیك ببنەوە و چی دەڵێن گوێڕایەڵیان بکەن چونکە ئەوان کار و فەرمانی ڕاستەقینەیان بۆ وەدەردەکەوێت،[8] هەروەها عومەر(ﷺ) زۆری حەز لە یادی خوا بوو، هەموو کات بە ئەبوموسای ئەشعەری(ﷺ) دەفەرموو: ئەی ئەبو موسا، خوای گەورەمان، یاد بهێنەرەوە، ئەویش قورئانی دەخوێند و عومەر گوێی خۆی دەگرت و پێکەوە دەوستیان دەکردە گریان،[9] سەرباری ئەمەش عومەر پێی خۆش بوو لەگەڵ ئەو کەسانەدا دابنیشێ کە یادی خوا دەکەنەوە، ئەبو سعید مەولا ئەبو

---

١ـ محض الصواب (٦٣٥/٢) إسناده ضعيف.
٢ـ الفروق عمر للشرقاوي (ص:٢١٤).
٣ـ مسلم رقم (٧٤٧).
٤ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:٢٢٥).
٥ـ الفتاوى (٢٣٢/١).
٦ـ الفتاوى (٢٧٥/١٤).
٧ـ الفتاوى (١١٨/٨).
٨ـ الفتاوى (٦٠/١٥).
٩ـ الفتاوى (٥١/١٠).

ئوسەید دەفەرمووێت: عومەر لەدوای نوێژی خەوتنان لە مزگەوت کێشك چی یەتی دەکرد و هەرکەسی بەرچاو بکەوتایە دەری دەکرد تەنها پیاوێك نەبێت، کە نوێژی دەکرد، عومەر بەلای هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)دا تێپەڕی، کە ئوبەی کوڕی کەعبیان تێدابوو، فەرموی: ئەمانە کێن؟ ووتیان: چەند کەسێك لە دۆستانی تۆ ئەی ئەمیر باوەڕداران، عومەر فەرمووی: چی لە نوێژ دوای خستون؟ ووتیان: دانیشتین یادی خودا بکەینەوە، عومەر لەگەڵیان دانیشت پاشان بەوەی خوارەوەیانی فەرموو دوعا بکە و ئەویش دەستی کردە دوعا خوێندن، عومەر پیاو بە پیاو دوعای پێ دەخوێندن هەتا گەیشتە من و منیش بە تەنیشتیەوە بووم فەرمووی: وەرە، گەمارۆ درام و ئەو منی گرت هەژاندمی دواتر فەرمووی: بڵێ، هەرچەند خۆی دەیفەرموو: خوای گەورە لێمان خۆش ببە، خوای گەورە بمان بەخشە، دواتر ووتی: دواتر عومەر دەستی بگرێ ئینجا فەرمووی: هەستن بڵاوەی لێ بکەن.[1]

## - تەراویح:

یەکەم کەسێك خەڵکی کۆکردەوە بۆ بەجێ هێنانی نوێژی تەراویح عومەر(ﷺ) بوو، بەم هۆیەوە نامەیەکی نوسی بۆ ناوچەکانی تر، هۆی ئەمەش ئەوە بوو کە شەوێك لە شەوانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان عومەر خۆی کرد بە ناو مزگەوتدا بینی خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ و جیا جیا هەرکەسە و بۆ خۆی نوێژ دەکات، و هەرکەسێکیش کە نوێژ بۆ خۆی دەکات نوێژەکەی پۆل پۆل دەکات، لەم کاتەدا عومەر فەرمووی: من وادەزانم ئەگەر هەموو ئەمانە کۆببنەوە لەسەر یەك قورئان خوێن ئەوا جوانترە پاشان لێبڕا و کۆیکردنەوە لەسەر دەستی ئوبەی کوڕی کەعب گێڕەرەوەکە(عبدالرحمن کوڕی عبدالقاری) ئەفەرموێ: پاشان شەوێك لەگەڵی چومە دەرەوە و خەڵکی بە نوێژی خوێنەرەکەیان نوێژیان دەخوێند، عومەر فەرمووی: باشترین داهێنان ئەمەیە و، ئەوەی کە لەسەری دەنون باشترە لەوەی کە لەسەری هەڵدەستن- واتە کۆتایی شەوگار- چونکە خەڵکی لە سەرەتای شەودا هەڵدەستان بۆ نوێژ.[2]، هیچ کەسیش گومانی بۆ ئەوە نەدەچوو، کە عومەر تەراویحی دانابێ، یەکەمین کەسیش نەبووە کە دایناوە بەڵکو ئەم تەراویحە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە هەبووە بەڵام عومەر یەکەمین کەس بووە کە خەڵکی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بە کۆمەڵ و لەپشتی یەك کەسەوە نوێژەکەیان بکەن، خەڵکی بە تەنها و هەریەکەیان بۆ خۆی نوێژی دەکرد بەڵام عومەر کۆی کردنەوە لە پشتی یەك قورئان خوێن،[3] بەڵگەی ڕەسەنی لە ڕێنمونی یەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ەکە هانی خەڵکی دەدا بۆ ئەنجامدانی شەو نوێژی مانگی ڕەمەزان، پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) فەرموویەتی:(( هەرکەس ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بە دڵێکی پڕ باوەڕەوە بگرێت ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت))،[4]

---

١ـ الشيخان من الرواية البلاذري (ص:٢٣٦).
٢ـ البخاري رقم ٢٠١٠.
٣ـ محض الصواب (١\٣٤٩).
٤ـ البخاري رقم ٢٠٠٩.

عەروەی کوڕی زوبێر دەگێڕێتەوە، کە عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێداوە کە شەوێك لە نیوە شەودا چۆتە دەرەوە و لە مزگەوت نوێژی خوێندووە، خەڵکیش لەگەڵیدا نوێژیان کردووە، خەڵکی لەنێوان یەکتردا باسی ئەمەیان کردووە و ژمارەیەکی زۆریان کۆبوونەتەوە و نوێژیان لەگەڵ کردووە، دواتر خەڵکەکە بەردەوام بوون لە باس کردنی و لە شەوی سێیەمدا خەڵکەکە زۆر زۆر بوون، پێغەمبەر(ﷺ) هاتۆتە دەرەوە و خەڵکەکە بۆ خۆیان نوێژیان کردووە، کاتێ کە شەوی چوارەم داهات خەڵکی لە مزگەوت دابڕان هەتا پێغەمبەری خۆشەویست هات بۆ نوێژی بەیانی، کاتێ کە لە نوێژی بەیانی بویەوە لە خەڵکی هاتە پێشێ فەرمووی: ((لە پاشدا، بەڕاستی شوێنی ئێوەم لەبەرچاو ون نەبووە بەڵام ترسام کە ئەم نوێژەتان لەسەر فەرز بێ و پاشان لێی دابڕێن، پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی فەرموو، کارەکەش هەر بەم شێوەیە مایەوە،[1] بەڵام سەبارەت بە وتەکەی عومەر! ئەمە باشترین بیدعەیە، ئەو ناوی لێناوە بیدعە چونکە لە زەمانەوانیدا داهێنانە، واتە هەموو کار و فەرمانێك کە لەسەر ئەم نموونەیەی پێشوو نەبێت لە زەمانەوانیدا پێی دەوترێت بیدعە،[2] ئەوەش عومەر خەڵکی لەسەر کۆ کردەوە کە یەك پێش نوێژ نوێژەکەیان بۆ بکات و ئەمەی گشتاند بە ولایەتەکاندا بە ڕێگەیەك لەسەر خۆشەویستی و پەرۆشی عومەر بە یاسا و دەستوورەوە.

## -زەکات، حەج، ڕەمەزان:

عومەری فاروق زۆر بایەخی بە زەکات داوە و ئەم فەرزەی ڕێکخستووە و بۆتە یەکێك لەسەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەت، ئێمە لەکاتی دوانمان سەبارەت بە دام و دەزگای دارایی بە یارمەتی خوا سەبارەت بەم فەرزە دێینە ئاخاوتن، بەڵام حەج کردن، عومەر لە ماوەی خەلافەتیدا فەرزی حەجی بە خەڵکی بەجێ دەهێنا و دەڵێن، کە دە ساڵ واتە ماوەی تەواوی خەلافەتی حەجی کردووە و هەندێکیش دەڵێن کە نۆ حەجی کردووە،[3] لە ئەرکەکانی خەلیفە یان ئەو والیانەی، کە لە ولایەتەکاندا نوێنەرایەتیان دەکرد ئەمانە بوون:

-ئاگادار کردنەوەی خەڵکی لە کاتی حەج و دەرچوون بۆ هەست و هۆشیاری یەکان.
-ڕێکخستنیان بۆ شێوازی حەج کردن بە پێی شەرع.
-ڕێزدانانی بۆ وێستگەکان بەو شوێنەی کە تیایدا بوو.
-شوێن پێ هەڵگرتنی لە بنەما شەرعی و ڕێگە پێ دراوەکاندا.
-پێش نوێژی کردنیان لە نوێژەکان و خوێندنی وتاری ڕێگە پێدراو بۆیان.[4]

عومەر(ﷺ) هانی خەڵکی دەدا لەسەر حەج کردن و فەرمانی بەمە دەدا بەسەریاندا و تەنانەت فەرموویەتی: هاتووە بە خەیاڵمدا کە چەند پیاوێك ڕەوانەی ناوچەکانی تر بکەم و چاو بگێڕم بەوەی

---

١ـ البخاري رقم ٢٠١٢.
٢ـ الفتاوى (٣١\٢١).
٣ـ السلطة التنفيذية (١\٣٨٢).
٤ـ هەمان سەرچاوە. (١\٣٨٣).

هەرکەس کە توانای هەیە و حەجی نەکردووە، سەرانەی لەسەر دابنێن،[١] هەروەها عومەر هەوڵی داوە بەجۆرێ کە کەعبە ئاوەدان بێت تەنانەت لەو مانگانەش کە مانگی حەج کردن نین، ئەوان واز لەمانگەکانی تر دێنن و لە ناوچەکانی خۆیاندا عومرەی تێدا ناکەن، بەم شێوەیە کەعبە بێ کەم و کوڕی دەبێت لە عومرەچیان، خەڵکی ناوچەکانی تەواوی دەوروبەر، عومەر فەرمانی پێدان بەوەی کە تەواوترە بۆیان بەوەی کە عەمرە لە دوای مانگەکانی فەرزی حەج بکەن، بەم شێوەیە کەعبە هەمیشە دەبێتە جێگەیەکی ئاوەدان لە مانگەکانی فەرزی حەج و تەواوی مانگەکانی ترشدا، هەر ئەمەش بوو کە عومەر بۆی هەڵبژاردن و بریتی بوو لە باشترینیان تەنانەت لای بێژەرانیش وایە کە کەڵك ـسود وەرگرتنە لە تەنها کردن و لێك نزیك بونەوە زۆر باشترە، لە ئەوەی کە ئیمام أحمد و ئەوانی ترش دەفەرموون،[٢] لەسەری چەسپاوە کە عومەر هەموو ساڵێ بە جل و بەرگی کەعبەوە چاکەی کردووە و دابەشی کردووە بەسەر حاجیاندا.[٣]

سەبارەت بە ڕۆژوش، عومەر لەسەر پەیڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتووە، بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە لە ڕۆژی هەوراویدا ڕۆژوی شکاندووە و پاشان خۆر دەرکەوتووە و عومەر(ﷺ) فەرموویەتی: کاروبار دەچێت بەڕێوە و ئێمەش هەوڵی خۆماندا.[٤]

کاتێ کە هەواڵ گەشتە عومەر کە پیاوێك بەدرێژایی ساڵ بەڕۆژوو بووە عومەر هات بۆ لایی و قامچی یەکەی لێ بەرز کردەوە و فەرمووی: بخۆ ئەی پیری کۆنە ساڵ،[٥] عومەر(ﷺ) خاوەنی پەرستشی زۆر و هەوڵدان بوو لە ملکەچی یەکان، لە نوێژ کردندا گەیشتبوو بە بەرزترین لوتکە، لە ڕۆژووشدا مەبەستی خۆی تێدا پێکا بوو بەتایبەتی لە کۆتایی ژیانیدا و چاکەی زۆریشی تێدا دەکرد، عومەر کاتێ کە خەلافەتی گرتە دەست هەموو ساڵێ حەجی دەکرد و لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بەشداری هەموو غەزاکانی کردووە و پاش ئەویش هەر لە غەزادا بووە بەشداری تەواوی ئەو غەزا و جەنگە پاکسازیی یانەی کردووە کە لە ماوەی خەلافەتەکەیدا ڕوویان داوە و پاداشتی خۆی وەرگرتووە لەبەرئەوەی کە ئەو هۆکاری بووە،[٦] عومەر لەو کەسانە بووە کە یادی خوا دەکەن و هەر لەو بارەیەشەوە فەرموویەتی: پێویستە لەسەرتان یادی خوا بکەنەوە، چونکە ئەوە شیفایە و نەکەن باسی خەڵکی بکەن چونکە ئەوە نەخۆشی یە،[٧] هەروەها دەیفەرموو: بەختی خۆتان وەرگێڕن لە گۆشە گیریدا.[٨]

---

١ـ فرائد الکلام (ص:١٧٣).
٢ـ الفتاوی (١٤٦،١٤٧/٢٦).
٣ـ الفتاوی (١٤/٣١).
٤ـ الموطأ (٣٠٣/١) نقلا عن الخلافة الراشدة (ص: ٣٣٠).
٥ـ الفتح (٢٦١/٤).
٦ـ محض الصواب (٦٣٧/٢).
٧ـ تفسیر القرطبي (٣٣٦/١٦) محض الصواب (٦٧٧/٢).
٨ـ الزهد، لوکیع (٥١٧/٢) إسناده صحیح.

## ٣-بایەخدانی عومەر بە بازاڕ و بازرگانیەوە:

عومەری فاروق سوور بوو لە سەر بەسەر کردنەوەی ئەو کەسانەی، کە لە بازاڕەکاندا مامەڵەی کڕین و فرۆشتن دەکەن و هۆشیاری دەکردنەوە لەوەی کە مامەڵە بە پێی شەرعێکی پوخت و پاراو بکەن، کەسێکی تریشی دەکردە کارگێڕی بازاڕ لەبەرئەوەش بوو کە سائب کوڕی یەزید(ﷺ)ی کردە کارگێڕی بازاڕی مەدینە لەگەڵ عبداللە کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود و چەند کەسێکی تر.[١]

توێژەر لێرەدا تێبینی ئەوە دەکات کە دەستووری لێپرسینەوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بەپێی ڕێساکانی شەریعەتی ئیسلامی گەشەی کردووە و پەرەی سەندووە و لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەنگاوی بەرەو پێشەوە ناوە هەتا بۆتە یەکێك لە ولایەتەکانی ئیسلام و چەند مەرجێکی هەیە کە لە بەڕێوەبەرەکەیدا سەرچاوە دەگرێ و مەرجیشە لەسەر ئەوەی کە لێپرسینەوەی لەسەرە، خەرجیشە لەو کارانەی کە تیایدا بینە هەژمار.[٢]

بەڵگە هەن لەسەر ئەوەی عومەر بایەخی تەواوی داوە بە لێپرسینەوە لە بواری بازاڕ، خۆی لە بازاڕدا دەسوڕایەوە و قامچی یەکەی پێ بوو دەیدا لەو کەسەی بێ ئەمری دەکرد ، ئەنەسی کوڕی مالك(ﷺ) دەفەرموێت: لەسەر جل و بەگەکەی عومەر(ﷺ) چواردە پینە و پارچەم بینی کە هەندێکیان چەرم بوون، هیچ کراس و عەبایەکی لەسەر نەبوو، تاریك و لێڵ بوو، قامچی پێ بوو بەنێو بازاڕی مەدینەدا دەسوڕایەوە،[٣] زەهەبی لە قەتادەوە هێناویەتی : عومەر(ﷺ) کاتێ خەلیفە بوو جلێکی لەبەر دەکرد کە خوری بوو، پارچە پارچە بوو کە هەندێك لە پارچەکان چەرم بوونو بەنێو بازاڕدا دەسوڕایەوە و قامچی یەکەی لە ملی دابوو خەڵکی پێ تەمێ دەکرد.[٤] لە لێپرسینەوەکانی لە بواری لە بازاڕدا ئەوە کە موسلیم لە مالك کوڕی ئەوسی کوڕی ئەلحدسان ڕیوایەتی کردووە: چوومە پێشی و وتم: کێ درهەم ئاڵوگۆڕ پێ دەکات؟ طلحةی کوڕی عوبەیداللە(ﷺ) کە لای عومەر بوو وتی: زێڕەکەتمان نیشان بدە و بڕۆ کاتێك وەرەوە کە شاگردەکانمان دێنەوە ئەو کاتەپارەکەت دەدەینێ،[٥] عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ) فەرمووی: نەخێر، سوێند بە خوا یان پارەکەی پێ دەدەیت یان زێڕەکەی بۆ دەگێڕیتەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((پارە بەپارە گۆڕینەوە سووە مەگەر بێنە و بگرە بێت، زێڕ بە زێڕ گۆڕینەوە سووە مەگەر بێنە و بگرە بێت، زیو بە زیو گۆڕینەوە سووە مەگەر بێنە و بگرە بێت، خوێ بە خوێ گۆڕینەوە سووە مەگەر بێنە و بگرە بێت، خورما بە خورما گۆڕینەوە سووە مەگەر بێنەو بگرە بێت))،[٦] لە پرسینەوەکانی لە بواری بازاڕدا ئەوە بووە کە لاوێکی بینیوە ئاوی تێکەڵ بە

---

١ـ السلطة التنفيذية.

٢ـ الرقابة المالية في الاسلام د.عوف الكواخري (ص: ٦٦).

٣ـ الطبقات الكبرى (٣/ ٣٣٠).

٤ـ تأريخ الاسلام, عهد الراشيدين (ص: ٢٦٨).

٥ـ زیوەکەت دەدەینێ.

٦ـ مسلم رقم ١٥٨٦.

شیر کردووە بۆ فرۆشتن و ئەویش ڕژاندنی،[١] عومەر ڕێگری لە شاردنەوە دەکرد لە بازێڕی موسوڵماناندا، عومەر پرسیاری حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە کرد و فەرمووی: چۆن فرۆشیاری دەکەیت ئەی حاتەب؟ ئەویش فەرمووی: قەرزدار، عومەر فەرمووی: لەبەر دەرگا و مەزاتخانە و بازاڕەکانماندا شتەکنتان دەفرۆشن و قۆڵمان لە بندا دەبڕنەوە و پاشتر هەرچۆن بتانەوێ شتەکانتان دەفرۆشن یەك کەوچك بفرۆشە. کەوچکێك چواردەم بووە. ئەگەر نا لە بازێڕی ئێمەدا کالاّ مەفرۆشە، بڕۆن بەسەر زەویدابگەڕێنو کێشان و پێوانە بکەن و پاشان چۆنتان دەوێ شت بفرۆشن،[٢]جارێك عومەر چوو بۆ بازێڕ بینی خەڵکانێك بەهۆی ڕەتکراوەکانیانەوە شت دەشارنەوە، عومەر فەرمووی: ، تەنانەت خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیمان نادات بەنیعمەتی چاویش هەتا ئەگەر کەسانێك دابارنە بازێڕەکانمان و بەهۆی ڕەتکراوەکانیانەوە کەل و پەل لە بێوەژن و هەژاران بشارنەوە، هەتا ئەگەر هاوردەکانیش دەرچوون و فرۆشران لەسەر ئەو شێوازە بێت کە خۆیان دەیانەوێ لە کۆنترۆڵ کردنی؟ بەلاّم کام کێشندەیەك حوشترێکی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە لەسەر ناو شانی لە زستان و هاویندا هەتا دابەزێتە بازێڕەکانمانەوە، ئەمەش میوانی عومەرە با چۆن دەیەوێ بفرۆشێ و چۆن دەیەوێ دەست بگرێ بە کالاکانیەوە، مسلم کوڕی جندب دەفەرموێت: کۆمەڵێك خواردەمەنی بەرەو مەدینە هات و خەڵکی بازێڕ بۆی چوونە دەرەوە و کڕیان، عومەر پێی فەرموون: ئایا لە بازێڕەکانی ئێمەدا بازرگانی دەکەن؟ خەڵکی بکەنە هاوبەشی خۆتان یان بڕۆنە دەرەوە و شمەك بکەن و بیهێنن بیفرۆشن،[٣] عومەر(ﷺ) دریغی شاردنەوەی نەدەکرد لەسەر خواردنی خەڵکی و گیانلەبەران بەلاّم دەکردە گشتی لە هەموو ئەوانەی لە نەمانیدا زیانی بە خەڵکی دەگەیاند، مالك لە((الموطأ)) ڕیوایەتی کردووە، کە عومەر دەفەرموێت: شاردنەوە لە بازێڕی ئێمەدا نی یە، پیاوانیش بە ئەنقەست بە دەستیان کارزانی ڕەتکراوەکانیان بۆ ڕزقی خودا نابەن کە دابەزیوەتە گۆڕەپانی ئێمە و پاشان کاری شاردنەوەمان لەسەر بکەن بەلاّم هەر کێشندەیەك بەناوشانی لە زستان و هاویندا کۆڵ بکێشێ ئەوە میوانی عومەرە. با چۆن دەیەوێ کالاّ بفرۆشێ و چۆنیش دەیەوێ دەست بگرێ بە کالاکانیەوە.[٤]

دەقەکان باس کران ئاماژە بەوە دەکەن کە مەبەست لە شاردنەوە بریتیە لە کۆنترۆڵ کردنی نرخ و بەها لەوەی کە کاریگەری بۆ سەر هەژار و هەتیو و بێوەژن دەبێت، ئەمەش لە وتەکەی عومەر بۆ حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە ڕوون و دیارە.

ئەو شتی بە درهەمێك دەفرۆشتە قەرزدارـ کالاکانتان لەسەر دەرگاکانمان و مەزاتخانە و بازێڕەکانمان دەفرۆشن و قۆڵمان دەبڕن و پاشتر چۆنتان بوێ کالاکانتان دەفرۆشن!! کەوچکێك بفرۆشە- کەوچکێك چوار دەمە - وتەی بۆ خەڵکی بازاڕ ئەوانەی کەشمەك دەشارنەوە- دەفەرموێت: خوای

---

١ـ الحسبة في الاسلام لإبن تيمية (ص: ٦٠), الحسبة لا فضل إلهي (ص: ٢٤).
٢ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب قلعجي (ص: ٢٨).
٣ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٨).
٤ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٩).

گەورە ڕزق و ڕۆزیمان بۆ دەنێرێ، هەتا ئەگەر کەسانێك دابەزێنە بازێڕ و بەهۆی ڕەتکراوەکانیانەوە کالاو کەل و پەل لە بێوەژنان و هەژاران بشارنەوە، هەتا ئەگەر کێشندەکان بە شێوەیەی لە کۆنترۆڵ کردنی بارودۆخ بیانەوێ کالاکانیان بفرۆشن، عومەر بەمە توندترین نکۆڵی لەسەر دەکردن،[1] عومەر(ﷺ) دەستی وەردەدا بۆ فەرز کردنی نرخ و بەهای شیاو بۆ کالا پێویستیەکان ئەگەر پێویستی بەو دەست تێوەردانە هەبوایە دیارە ئەمەش پارێزگاری کردن بوو لە مافی بازرگان و بەکارهێنراوەکان، جارێك پیاوێك زەیتی هێنابوویە بازێڕ و بە نرخێکی جیاواز لە بازاڕ دەیفرۆشت، عومەر پێی فەرموو: یا بە نرخی بازاڕ دەیفرۆشی، یا لەم بازاڕە دەڕۆیت، ئێمە ناچارت ناکەین لەسەر نرخەکەی، ئەویش خۆی لێ وەلانان.[2]

## -کۆڵپێدانی بازرگانەکان بە ناسینی حەرام و حەلاڵ لە کاری فرۆشتندا:

عومەری فاروق(ﷺ) بە قامچی دەیدا لەو کەسەی کە لە بازاڕ دادەنیشێ و لە حوکمەکان نەشارەزایە و دەیفەرموو: هەرکەس لە سوو شارەزا نەبێ لە بازاڕی ئێمەدا دانانیشێ،[3] عومەر بەنێو بازاڕدا دەسوڕایەوە و بە قامچی لە هەندێ بازرگانی دەدا و دەیفەرموو: کەسێك لە بازاڕی ئێمە شمەك نافرۆشێ مەگەر لێی تێبگات وچونکە بیەوێ یا نەیەوێ توشی سوو خواردن دبێت،[4] هەموو لایەنەکانی حوکم شوێنی بایەخی عومەر بوون و لایەنێکی نەدەدا بەسەر لایەنێکی تریدا، حاڵەتەکان لەنێو چنگی حاکم و فەرمانڕەوادا بە زۆر نە دەزانران، بۆ بازرگانی چەند ڕێسایەکی دادەنا کە بۆ بازاڕەکان شیاو بوایە، کڕین و فرۆشتنی ڕێکدەخست و زامنی کاری دامەزران و سەقامگیری دەکرد، نە بەش خوران هەبوو نە فریودان و نە شاردنەوەش، نە بازاڕی ڕەش هەبوو نە بازاڕی شین، نە نەفامی بەوەی کە گونجاو بێ و نەگونجاو بێ لە جیهانی بازرگانیدا، بڕیارێکی کورتی گشتگیری دەرکرد بەسەر هەموو خراپە کاریەکاندا و هەموو شتێکی ڕێك دەخست و دەیفەرموو هەرکەس پێی قایل نەبێت لە بازاڕی ئێمە بازرگانی ناکات.[5]

ئەمەش هاوشێوەی ئەو یاسایەی ئەمڕۆ بوو بۆ نموونە دەڵێت: هەرکەس مۆڵەتێکی وای نەبێت لە یەکێك لە زانستەکاندا ناتوانێت فلان کار ئەنجام بدات،[6] مانای وایە کە وڵاتانی ئەمڕۆ هەڵدەستن بە ڕێکخستنی بازاڕەکان و سەرپەرشتی کردنیان، ژووری بازرگانیەکان یان ئەو دەزگایانەی هاوشێوەین هەڵدەستن بە ڕێنمایی و چاکسازی و ڕێك و پێك کردنی هەموو ئەو شتانەی لە بواری ڕێك کردنی بازاڕ کە لەسوود و قازانجی جەماوەر دایە، هەروەها عومەر(ﷺ) کارزانی پێشینەی لە مەودا هەبوو

١ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٩).
٢ـ تأريخ المدينة المنورة (٧٤٩/٢) موسوعة فقه عمر (ص: ١٧٧).
٣ـ نظام الحكومة الاسلامية للكتاب (١٧/٢).
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ شهيد المحراب (ص:٢٠٩).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

کاروبارەکانی بەپشێوی لەبازاڕەکاندا بەجێ نەدەهێشت، بەڵام کۆمەڵە سەرپەرشتیاری پێ هەڵدەستان و چاودێریان لێ دەکرد و ڕێکیان دەخست و دەیان پاراست، عومەر سولەیمان کوڕی حەسمەی لە بازاڕەکاندا بەکار دەهێنا، هەروەك ئەوەی کە سائب کوڕی یەزید لەگەڵ عبداللە کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود لە بازاڕی مەدینە کار بەدەست بوون، پاشان سەرپەرشتکارێکی گشتی هەبوو لەسەر بازاڕەکان، سەرپەرشتیاران لەسەر هەر بازاڕێك کاریان بە فەرمانی ئەو دەکرد، ئەوەی کە بە قازانجی دەبڕایەوە ئەوە بوو کە بایەخدان بە بازێڕەکان ڕێك و پێك و ئاسان بۆ داهاتێکی گەورەی هەبوو لە ئارامیش دان بە خەڵکی و زۆرێك لەو بایەخانە لە فەراهەم سەر پێداویستیە یەکانیان بوو، ئەگەر فەرماندار بایەخی دا بەم لایەنە واتە ئەو بایەخەی کە شایستەیەتی ئەوا لەلایەن خوای گەورەوە پاداشت دەکرێت و ئەمەش ڕەفتاری ڕاست و دروستی عومەر(ﷺ) چەسپاند لەگەڵ کارێکی ورد، ئیسلام بەرنامەیەکی شیاو و گونجاوە بۆ هەموو سەردەمێك و لە هەموو جێگایەکی سەر ڕووی زەویدا، پاڵ بە گەلانی دواکەوتووەوە دەنێت کە هەنگاو بەرو پێشەوە هەڵبگرن و پارێزگاری لە ولاتانی پێشکەوتوو دەکات لە ڕۆچوون و داڕووخانێك، نابێتە بەربەست لە ڕێگەی یەکێکدا کە بیەوێ پێش بکەوێت، لە مرۆڤی بێ ئاگاناگەڕێکە لەنێو گێژاوی قوڵی سڕبوونیدا بمێنێتەوە.[1]

### -فەرمانی دەدا بە خەڵکی بە هەوڵدان و هانی دەدان لەسەر نان پەیدا کردن:

عومەر(ﷺ) هانی خەڵکی دەدا لەسەر هەوڵدان و پەیداکردنی پارووی بژێوی، محمد کوڕی سیرین لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: لەگەڵ عومەر ئامادەی نوێژی شێوان بووم و بەستەیەکم پێ بوو عومەرفەرمووی: ئەمە چی یە لەگەڵت؟ وتم: بەستەیەکی دروستە لەم بازاڕەدا، من دەکڕم و دەفرۆشم وتی: ئەی هۆزی قورەیش: ئەمانە و هاوشێوەکانی لە بازرگانیدا لێتان ئەبەنەوە چونکە ئەمە سێ یەکی ئەمیرایەتی یە هەروەها لە حەسەنەوە ڕیوایەت کراوە کە دەفەرمووێت: عومەر فەرموویەتی: هەر کەس سێ جار لە بازرگانیەکدا هیچی دەست نەکەوت با کارەکەی بگۆڕێت بە شتێکی تر،[2] عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: پیشەیەك فێربن کە پێویست بێت،[3] دەفەرمووێت: ئەگەر ئەم فرۆشیاری یە نەبوایە دەبوونە بار بەسەر خەڵکەوە،[4] پاشان دەفەرمووێت: نان پەیدا کردنێك هەندێ گەندەڵی تێدا بێ باشترە لە سواڵ کردن،[5] دەفەرمووێت: ئەگەر یەکێك لەئێوە حوشترێکی کڕی با حوشترێکی گەورە و قەڵەو بکڕێت، ئەگەر لە سوودەکەیدا هەڵە بکات لە ڕاگوێزانەکەیدا هەڵە ناکات دواتر دەفەرمووێت: ئەی هەژاران سەرتان بەرز بکەنەوە و بازرگانی بکەن، ڕێگە ڕوونە و مەبنە بار بەسەر خەڵکەوە،[6]

---

١ـ شهيد المحراب (ص:٢١٠).
٢ـ نظام الحكومة النبوية (٢/٢٠).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ نظام الحكومة النبوية (٢/٢٠).

هەروەها دەفەرموویت: با هیچ کەسێك بۆ داواکردنی ڕزقی خۆی دانەنیشێ و بڵێت خوای گەورە، ڕزق و ڕۆزیم بدە لە کاتێکدا کە دەزانێ ئاسمان نە زێڕ و نە زیو نا بارێنێ و خوای گەورەش ڕۆزی خەڵکی دەدات بەوەی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا و پاشان ئەو ئایەتەی خوێند کە دەفەرموویت: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الجمعە[1]: ١٠).

عومەر(ﷺ) کاتێك لاوێکی ببینیباو پێی سەرسام با لێی دەپرسی ئایا پیشە دارە؟ ئەگەر ئەو لاوە بیوتایە: نەخێر ئەوا عومەر دەیفەرموو لەبەر چاوم کەوت،[2] هەروەها فەرمووی: ئەگەر مەرگم لە هەرجێگەیەك ڕێگەم پێ بگرێ جگە لەگۆڕەپانی جیهاد لەپێناوی خوا پێم خۆشترە لەوەی کە ئێخەم پێ بگرێ و من لەنێو پەلەکانی ولاخەکەمدا بم،من داوا لەفەزڵی خودادەکەم و دواتر ئەم ئایەتەی خوێندکە دەفەرموویت: ﴿وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ﴾ (المزمل: ٢٠).[3]

## -ترسانی عومەر لەلێکەڕانی گەورە پیاوانی موسوڵمان لە بازرگانی:

عومەر(ﷺ) لە میانی خەلافەتەکەیدا چوویە بازێڕ و کەسی تێدا نەدی لە دەسەڵاتداران جگە لە چەند دەم و چاوێکی تازە نەبێ، بەمە زۆر دڵگیر بوو، هەر بۆیە خەڵکەکەی کۆ کردەوە و ئەم هەواڵەی پێدان و سەر زەنشتی کردن لە وازهێنان لە بازاڕ، ئەوان وتیان: خوای گەورە بەو دەروەی کە لە بازێڕ لێی کردینەوە سەرمایە داری کردین، عومەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بە خوا ئەگەر وا بکەن ئەوا پیاوانتان پێویستیان بە پیاوەکان و ژنانتان پێویستیان بە ژنەکانیان دەبێت،[4] عومەر(ﷺ) زۆر بە پەنهانی و ترسەوە سەیری دواکەوتوویی گەورە پیاوانی موسوڵمانی دەکرد-لە غەیری موجاهیدان لەسەر بازرگانی و هەوڵدان لە داواکردنی ڕزق و ڕۆزیدا.[5]

## -شەو سوڕانەوەکانی عومەر:

گومانی تێدا نی یە کە کاری کێشکچی شەوی لە کارەکانی هێزی پۆلیسە، هەندێ لە مێژوو نووسان باسی ئەوە دەکەن کە عبداللە کوڕی مەسعود(ﷺ) ئەمیری پاسەوانەکانی سەردەمی خەلافەتی ئەبوبکر بووە و عومەر خۆی کاری پاسەوانی بە ڕێ دەکرد ، لەم کاتەدا ئەسلەمی خزمەتکاری هاوەڵی دەکرد و ڕەنگە عبدالرحمن کوڕی عەوفیش ڕێزی ئەم هاوەڵی کردنەی پێ بەخشرا بێ، کێشکچی شەوی بریتیە لە سوڕانەوەی شەو بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی جەردە و داخوازی خراپەکاران و

---

١ـ فرائد الكلام (ص: ١٢٩) تنبية الغافلين (ص: ٢١١) للسمرقندي.
٢ـ نظام الحكومة الاسلامية (٢/٢٠).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ نظام الحكومة الاسلامية (٢/١٨).
٥ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشيدين (ص: ١٦١).

هەموو ئەو کەسانەی کە لە خراپەیان دەترسن، باش وایە کە ئێمە لە هەنگاوی یەکەم لە ڕێکخستنی دەزگای پۆلیسدا بهێنینە هەژمار لەبەرئەوەی کە باوەڕداران خودی خۆیان پاسەوانی خۆیان دەکرد و ڕێگری خراپەیان لەنێوانی خۆیاندا لە ڕۆژدا دەکرد، هەتا ئەگەر بنوستنایە ئەوا پیاوانی پاسەوان کارەکەیان لێ وەردەگرتن، پاشان کاتێ کە خراپەکاران زۆر بوون و خراپەیان ئاشکرا کرد لە ڕۆژدا کارەکە دروست تر بوو بۆ کەسانێك کە بە ڕۆژ بە دوویاندا دەگەڕێن و بەمەش دەزگای پۆلیس دامەزرا پۆلیس کەواتە پاسەوانی هەمیشەیی ئەگەر ئەم دەربڕینە دروست بێت.[1]

عومەری فاروق(ﷺ) خۆی هەڵدەستا بە پاسەوانی کردنی موسوڵمانان، ئەمەش هاوکاری دەکرد لەسەر شارەزا بوون بە واقعی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە مەدینەی پێغەمبەر(ρ)دا کە ئەو دەمە پایتەختی دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی و شوێنی بەیەکگەیشتنی مرۆڤەکان و بارەکانی فەرمان بوو. لە ڕێگەکانیدا هەوڵی دەدا بە شەو هەتا بە چاوی خۆی ببینێ و ئەمەش ببیستێ کە کار بەدەستانی لەوەی کە دەنگ دەداتەوە پێی بگەیەنن یان ئەوەی کە پێی دەگەیەنن بەسەریاندا تێپەڕ بێت. عومەر چەند ڕێسای دانا و چەندی ڕاست کردەوە لە کاتێکدا کە بینی واقع ئەمە فەرز دەکات لەسەری یان فەرزی ئەوە دەکات کە ئەم ڕێسایە ڕێك بکرێتەوە و یان هەڵبوەشێنرێتەوە ئەمەش چەند نموونەیەکی بەڵگە دارە لەسەر ئەوەی کە عومەر بۆی چووە.[2]

## -ڕێگە گرتن سەبارەت بە پەلە کردن لە شیر بڕینەوەی منداڵ:

ئەسلەم مولای عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: چەند بازرگانێك هاتنە مەدینە و لە مزگەوت لایاندا، عومەر بە عبدالرحمن کوڕی عەوفی فەرموو: ئایا ئەتوانی ئەم شەو پاسەوانیان بکەیت؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، ئەوان مانەوە پاسەوانیان دەکرد و نوێژیان دەخوێند لەم کاتەدا عومەر گوێی لە دەنگی گریانی منداڵێك بوو بە ڕووی دەنگەکە ڕۆیشت و بە دایکی فەرموو: لە خودا بترسە و لەگەڵ ئەو منداڵە چاك بە پاشان گەرایەوە شوێنی خۆی، کاتێ کە شەوگار بەرەو دواین چرکەکانی هەنگاوی دەنا جارێکی تر عومەر دەنگی گریانی منداڵەکەی بەر گوێ کەوتەوە بۆیە هات بۆ لای دایکی و پێی فەرموو: بەڵام لێدایت چ دایکێکی خراپی من نازانم بۆ ئەم منداڵەی تۆم ئەوێ کە ئەم شەو بێدەنگ کۆڵ لە گریان بدات؟ دایکەکە وتی: ئەی بەندەی خوا، من سەرقاڵی دەکەم بە خواردن و ئەو نایەوێ بخوات، عومەر فەرمووی: بۆچی؟ دایکەکە وتی: عومەر سەرانە بۆ منداڵێك نابڕێتەوە کە لە شیر بڕا بێتەوە، عومەر ئەوەی فەرز کردبوو کە هەموو منداڵێکی لە شیر براوە خواردنی بدرێتێ لە بەیتولمال، عومەر فەرمووی: ئەی تەمەنی منداڵەکەت چەندە؟ ئافرەتەکە وتی چەند مانگێك، عومەر فەرمووی: بەڵام لێدای پەلەی لێ مەکە بۆ لەشیر بڕینەوەی، کاتێ کە نوێژی بەیانی کرد لەبەرئەوەی کە بە کوڵ دەگریا کەس لە قورئان خوێندنەکەی تێنەدەگەشت بۆیە فەرمووی: کلۆڵی و داماوی بۆ عومەر، چەندێ لە نەوەی موسوڵمانانی کوشتووە! پاشان فەرمانی دا بە جارچی کە جاڕ بدات پەلە لە منداڵەکانتان

---

١ـ عبقرية الاسلام في أصول الحكم (ص: ٣٢٢).
٢ـ من الحكم (ص: ٣٦٤).

مەکەن بۆ لە شیر بڕینەوەیان، ئێمە سەرانە بۆ هەموو لە دایك بوویەك لە ئیسلامدا دەبڕینەوە، بەم شێوەیە نامەی نووسی بۆ وەخۆهاتنەوە،[1] ئای لە جوانی ئەم ڕووداوە و ئای لە گەورەیی ئەم دادپەروەری یە، بەمەش هەموو کۆرپەکان لە دیوانی بەخششدا ناویان تۆمار کرا و لە بەیتولمالی موسولمانان سەرانەی بۆ بڕایەوە، لەبەر ئەوەی کە بەیتولمال مافی هەموو موسولمانێکە، لەبەرئەوەی کە بەرپرس لێی کەسێکی دەست پاکە کە لەسەری وەستاوە و شیاو نیە هیچ شتێکی بە نابەجێ لێ خەرج بکات و بۆی نیە ڕێگری لە مافێك بکات کە پێویست بووە تیایدا.

## دیاری کردنی ماوەی دیار نەمانی سەربازان لە خێزانەکانیان:

لە بەرهەمەکانی کێشکچی شەوی عومەر(ﷺ) ئەوەیە شەوێك چوویە دەرەوە هەتا بە نێو مەدینەدا بگەڕێ گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو کە بە دڵ نەرمی یەوە دەیووت:

تطاول هذا الليل تسري كواكبه    وأرقني أن لا ضجيع ألاعبه

الاعبه طورا و طوراً كأنمـــــا    بدا قمراًفي ظلمة الليل حاجيه

يُسرُّ به من كان يلهو بقر بـــــه    لطيف الحشا لا تجتوبه أقاربه

فوالله لو لا الله لا شيء غيره    لحرك من هذا السري جوانبه

ولكنتي أخشى رقيباً موكلاً    بأنفسنا لا يفتر الدهر كاتبه.[2]

عومەر فەرمووی: ڕەحمەتی خوات لێ بێ، پاشان جل و بەرگ و خەرجی بۆ نارد و نامەیەکی بۆ نووسی بەوەی کە هاوسەرەکەی بێتەوە بۆ لای،[3] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە عومەر هاتە دەرەوە و دای لە دەرگای ماڵی حفصەی کچی(ﷺ) حفصە فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، چی تۆی لەم کاتەدا هێناوە؟ عومەر فەرمووی: کچەکەم ئافرەت چەندێ لە دووری هاوسەرەکەی ئارام دەگرێت؟ ئەویش فەرمووی: مانگێك و دوومانگ و سێ مانگ و لە مانگی چوارەمدا ئارامی لێ دەبڕێت، هەر بۆیە عومەر نامەیەکی نووسی بۆ سەرکردەی سوپاکان کە لە چوار مانگ،[4] زیاتر سەربازان بەند مەکەن، ئەمە سیاسەتی عومەر بوو لە دیاری کردنی ماوەی دیار نەمانی سەرباز لە خێزانەکەی و عومەر لەمەدا هیچ سەرپێچی یەکی نەکردووە،[5] سەبارەت بەو سەربازانەی کە پابەند نە دەبوون بەو ماوەیەوە عومەر پێش وەخت یاسایەکی دانا بۆ دیاری کردنی ماوەی نەهاتنەوەیان، پاش ئەوەی کە ژمارەی ئەو سەربازانەی زانی، کە ماوەیەکی دوور و درێژە دیارنین و خەرجی خێزانەکانیان نەداوە لەو

١ـ البداية و النهاية (٧/١٤٠).
٢ـ محض الصواب (٣٨٨/١) سنده فيه إنقطاع.
٣ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ٨٩).
٤ـ هەمان سەرچاوە(ص: ٨٩) أوليات الفاروق (ص: ٢٨٩).
٥ـ أوليات فاروق (ص: ٢٨٩).

نادیاری یەیانداو کاتێ کە ناوەکانی زانی نامەیەکی نووسی بۆ سەرکردەی سوپاکان و داوای لێ کردن ئەم پێشنیارانە بخەنە بەر دەمیان یان دەگەڕێنەوە بۆ لای خێزانەکانیان یان نەفەقەی تەواویان بۆ دەنێرن، یان تەلاقیان دەدەن و ئەگەر تەلاقیان دان پێویستە پابەند بن بە ناردنی ئەو خەرجی یەی کە ماوەکەی ڕابردووە و تێپەڕیوە.[١]

## -پاراستنی ناموسی موجاهیدان:

یەکێك لە دەستکەوتەکانی تری بەسەرکردنەوەی حاڵی خەڵکی بە شەو پاراستنی ناموسی موجاهیدان بوو شەوێك عومەر چوویە دەرەوە بۆ ئەوەی بەنێو شاری مەدینەدا بسوڕێتەوە، گوێی لە هۆنراوەیەك بوو کە مایەی نیگەرنی بوو، ژنێك لەناو جەرگەی شەودا ئارەزووی بە مەی خوارنەوە یان نزیك بوونەوە لە لاوێکی جوان دەکات کە بەردەوام بە هیوا و ئومێدی بووە ئیتر ئەگەر ئەم داخوازی یە بەڕاست بێت یان تەنها پیا هەڵدانێك بێت بە بێ هیچ مەبەستێك، ئەوەی کە لەم نیگەرانیەدا دەرکەوت بە دێڕە هۆنراوەیە دەستی پێ کرد کە دەڵێت:

هل من سبيل إلى خمر فأشربها          أم من سبيل إلى نصر بن حجاج

عومەر گوێی لەمە بوو دەست بە جێ نصری کوڕی حجاجی بانگ کرد کە لاوێکی جوان و ڕێك و پێك بوو، عومەر فەرمانی پێکرد کە سەری بتاشێ کەچی نصر هێندەی تر قەشەنگ بوو، پاشان عومەر فەرمانی پێ کرد بە بەستنی جامانە کەچی نصر هێندەی تر جوان بوو لەبەر ئەوە عومەر نصری ڕەوانەی بەصرە کرد،[٢] لەترسی ئەوەی کە ئافرەتان بەهۆیەوە دوچاری فیتنەو خراپەکاری بن و ئەم کارەش بەرگرتنێك بێت لەو هۆکارە و پارێزگاری کردنە بێت لە ناموسی سەربازانی ئێشکگر لە پێناوی خوادا. ئەم کارەی عومەر دووربینی یەکمان دەداتێ لە سیاسەتی گشتی و دانایی و ژیری لە پێشکەش کردنی بەرژەوەندی گشتیدا، لە جوانی نصرو هۆگری بە خودی خۆی و نادیاری سەربازان لە خێزانەکانیان و فەراهەم هێنانی ئارامی و ئاسایش و سەقامگیری لە مەدینەدا هۆکارێك بوو بۆ نانەوەی فیتنە عومەر ئەم لاوە نازدارەی ڕەوانەی شارێکی سەربازی کرد هەتا لەوێ شارەزایی یەك لە بواری جەنگیدا دەستەبەر بکات، یان سود لەو پاڵەوانیەتی هیمەتی پیاوانەیە وەربگرێ کە لەوێ بەدی دەکات، بەصرەش ئەو دەمە شارێکی سەربازی بوو کە شیاوتر بوو بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئەم جۆرە لاوانە.[٣] ئەو ئافرەتەی کە عومەر گوێ بیستی هۆنراوەکەی بوو ترسا لەوەی کە عومەر گوێی لەو هۆنراوەیە بوو بێت و بە شتێك دەستپێشخەری بۆ بکات لەبەر ئەوە چەند دێڕە هۆنراوەیەکی بۆ هۆنیەوە کە دەڵێت:

قل للامام الذي تخشى بوادره          مالي وللخمر أو نصر بن حجـــاج

---

١ـ أوليات فاروق (ص: ١٠٧).
٢ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ٩١).
٣ـ أوليات الفاروق (ص: ٨٢).

إني عنيت أبا حفصة بغيرها | شرب الحليب وطرف فاتر ساجي
إن الهوى زمة التقوى فقيده | حتى أقر بإلجام و إسراج
لا تجعل الظن حقاً لا تبنه | إن السبيل سبيل الخائف الراجي

پاشان عومەر(ﷺ) هەواڵی بۆ نارد کە لە تۆوە کارێکی باشم پێ گەیشتووە، من نصرم لە پێناوی تۆ وەدەرنەناوە بەڵام هەواڵم پێ گەیشتووە کە دەچێتە لای چەند ئافرەتێك کە مـن لێیـان دڵنیـا نـیم پاشان عومەر گریا و فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئارەزووەکانی کۆت و بەنـد کـردووە، دانـی نـاوە بـە جڵـەو و چـراخانیدا،[1] پاشـان عومـەر نامەیـەکی بـۆ کـار بەدەسـتەکەی بەصـرەی نووسـی و پەیامنێرەکەی چەند ڕۆژێك لە لای مایەوە و پاشان بانگی کرد ئایـا پۆسـتەبەری موسـوڵمانان نایـەوێ بڕواتە دەرەوە، هەر پێویستیەکی هەیە با بینوسێ، پاشان لە نامەکەدا نووسی: بەناوی خوا بەخشندە و میهرەبان، بۆ بەندەی خوا ئەمیری باوەڕداران: سلاوی خوای گەورەت لێ بێ پاشان:

لعمري لئن سيرتني أو فضحتني | وما نلته في عليك حرامُ
فأصبحت منفياً على غير ريبة | وقد كان لي بالمتكين مقامُ
أإن غنت الزلفاء يوماً بمنية | وبعض أماني النساء غرامُ
طننت ي الظن الذي ليس بعده | بقاء فمالي في اللذي كلامُ
ويمنعني مما تظن تكرمي | وآباء صدق سالفون كرامُ
ويمنعها مما تظن صلاتها | وحال اها في قومها و صيامُ
فهذان حالان مهل أنت راجعي | فقد جب في كاهل و سنامُ
إمام الهبينى لا تبتل الطرد مسلماً | له حرمة معروفة و زمامُ

عومەر فەرمووی: هـەتا مـن دەسـەڵاتدار بم نـەخێر، نـصر نەگەرایـەوە بـۆ شـاری مـەدینـە هـەتا عومەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد.[2]

هەرلەسەردەمی خەلافەتی عومەردا چیرۆکێکی هاوشێوەی ئەمـە ڕوویـدا کـە عومـەری فـاروق بەڕوویدا وەستایەوە لە شەوگەرانێکیدا، کـاتێ عومـەر شـەوێك بـەنێو کۆڵانـەکانی شـاری مەدینـەدا دەسوڕایەوە گوێی لەدەنگی چەند ئافرەتێك بوو کە قسەیان دەکـرد و لـە یـەکتریان دەپرسـی: کـام لاوی مەدینە زۆر جوانە؟ یەکێکیان وتی: ئەبو ذوئێب، عومەر داوای ئەو لاوەی کرد و بینی لـە جـوانترین خەڵکانی ناوچەکەیە، عومەر پێی فەرموو: نازانی کـە تـۆ بۆیـان بوێتـە گـورگ بـڕۆ هـەرگیز لێـرە دامەنیشە، لاوەکە وتی: ئەگەر تۆ ئەم کارەم لەگەڵ دەکـەیت بمگەیەنـەرە لای نـصرەی کـوڕی حجـاجی ئامۆزام، ئەم دوانە لە هۆزی بەنی سەلیم بوون و عومەر ڕەوانەی لای نصری کرد.[3]

---

١ ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ٩٢).
٢ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص:٩٢,٩٣).
٣ـ الشيخان من رواية البلاذري (ص: ٢١١,٢١٢).

ئەمە کارێکی عومەریە کە واقعی ئومەت فەرزی دەکات بەسەریدا لەگەڵ ئەو کەسایەتی یە بەهێزەی عومەردا تێکەڵ دەبێت کە دەستەبەری وزەی تاکە جۆراو جۆرەکان دەکات، پێویستە ئەوەش بزانرێ کە سەردەمی فاروق سەردەمی ئامادەکردن و بە کۆمەڵکردن بوو بۆ سوپاکان و ڕەوانەکردنیان بۆ گۆڕەپانەکانی جەنگ لە پێناوی خودا کە هەموو ئەو کەسانەی دەگرتەوە کە لەم بارەیەوە بە توانا بوون، دەرکردنی ئەم دوو لاوە زۆر باشتر بوو لە پۆلێنکردنی هۆنراوە و دانیشتنی ئافرەتان بۆ ئەم جۆرە باس و خواسانە.[1]

## ئایا تۆ ڕۆژی قەسلان گوناهەکانم لێ دەگری:

ئەسلەمی مەولای عومەر(ﷺ) ئەگێڕێتەوە عومەر(ﷺ) چوو بۆ ناوچەی واقم و منی لەگەڵدا بووم هەتا ئێمە سێ میل لە مەدینە دوورکەوتینەوە بەجۆرێ گڕکانەکان دەهەژان، عومەر فەرمووی: ئەی ئەسلەم من لێرەدا چەند ڕێبوارێك دەبینم کە شەویان بەسەردا هاتووە و سەرماتەنگی پێ هەڵچنیون خێراکە بانگەیەنەرە ئەوێ، ئێمە هێندە بە پەلە ڕۆیشتین هەتا لێیان نزیك بووینەوە، ئافرەتێکمان بینی چەند منداڵێکی لەگەڵ بوو، لەپاڵ ئاگرێك دانیشتبوون و منداڵەکانی دەیان ناڵاند، عومەر فەرمووی: سڵاوی خواتان لێ بێت ئەی خەڵکی بەردەم ڕووناکیەکە، پێی باش نەبوو کە بڵێت یارانی ئاگرەکە، ئافرەتەکە وتی: سڵاو لە ئێوەش، عومەر فەرمووی: دابنیشم، ئافرەتەکە وتی: دانیشە بەخێر و داوابکە، عومەر لە لایان دانیشت و فەرمووی: ئێوە چیتانە، ئافرەتەکە وتی: سەرما وتاریکی شەو تەنگی پێ هەڵچنیوین، عومەر فەرمووی: ئەی ئەم منداڵانە بۆ دەناڵێنن؟ ئافرەتەکە وتی: لە برساندا، عومەر فەرمووی: ئەی چی لەم دەفرەدایە؟ ئافرەتەکە وتی: ئاوە بەو ئاوەش بێ دەنگیان دەکەم هەتا دەخەون، خوای گەورە لە نێوانی ئێمە و عومەردایە، عومەر فەرمووی: وەی خوا ڕەحمت پێ بکات، عومەر چوزانێ ئێوە چیتانە؟ ئافرەتەکە وتی: ئەوکاروباری ئێمەی گرتۆتەوە دەست و لێمان بێ ئاگایە، عومەر لێم هاتە پێشێ و فەرمووی: بڕۆ دەرچۆ، ئێمە بە پەلە ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە باراشێ ئەو هەندێك ئاردی لێ دەرهێنا لەگەڵ چەند گلۆڵە چەوریەك و فەرمووی: بیدە بە کۆڵم دا منیش وتم: من بۆت هەڵدەگرم، عومەر فەرمووی: ئایا ڕۆژی قیامەت تۆ گوناهەکانم بۆ هەڵدەگری؟! منیش کۆڵەکەم دا بەشانیدا بە پەلە ڕۆیشت و منیش لەگەڵیدا، ئەو ئەمەی گەیاندێ و، لەبەر هۆرەکەی سەر شانی شتێکی دەرهێنا و پێی فەرموو: تۆ بۆم چاك بکە و منیش بۆتی دەبرژێنم عومەر هێندە فوی لەژێر مەنجەڵەکە دەکرد کە من بینیم دووکەڵ لە نێو تاڵەکانی ڕیشیدا دەهاتنە دەرەوە و هەتا خواردنەکەی بۆ چاك کردن و پاشان فەرمووی: دەفرێکم بۆبهێنە ئەویش دەفرەکەی هێناو خاڵی کردە ناوی و عومەر فەرمووی: من خواردنەکەیان بۆ سارد دەکەمەوە و تۆش تێریان بکە، عومەر هەڵنەستا هەتا منداڵەکان تێر بوون، کارزانی ئەمەی لە لای ئافرەتەکە بەجێ هێشت و هەستاو منیش لەگەڵیدا و ئافرەتەکە وتی: خوا پاداستی چاکەت بداتەوە، تۆ بەم کارەت لە ئەمیری

---

١ـ أوليات الفاروق (ص: ٨٣).

باوەڕداران باشتر بویت، عومەریش دەفەرموویت: ئەی ژن شتێکی باش بێژە، ئەگەر هاتی بۆ لای ئەمیری باوەڕداران، إن شاء الله لەوێ دەمبینیتەوە! پاشان عومەر لێی دووركەوتەوە و دواتر پێشوازی لێ کرد و چۆکی دادا و منیش وتم: جگە لەمە هیچ کارێکت هەیە؟ منی نەدواند تا منداڵەکانم بینی هەندێ یاریان کرد و پاشان نووستن و بێ دەنگ بوون ئەویش هەستا و سوپاسی خوای کردو لێم نزیک بوویەوە و فەرمووی: ئەی ئەسلەم، برسیەتی شەوخونی پێ کێشان و گریاندنی، من پێم خۆش بوو کە ئەوان بە جێ نەهێڵم هەتا ئەوەی کە بینیم بە چاوی خۆم بینیم.[1]

شاعیری گەورە (حافظ ابراهیم) نیگاری ئەم تابلۆیەی بۆ کێشاوین ئەڵێت:

ومن رآه إمام القدر منبطحاً — والنار تأخذ منه وهو يذكيها
وقد تخلل في أثناء لحيته — منها الدخان وفوه غاب في فيها
رأى هناك أمير المؤمنين على — حال تروع – لعمر الله – رائيها
يستقبل النار خوف النار في غده — والعين من خشية الله مآقيها

## -ئەی ئەمیری باوەڕداران مزگێنی کوڕێك بدەرە هاوەڵەکەت:

کاتێ عومەر لە یەکێك لە شەوەکانی خەلافەتیدا پاسەوانی دەکرد، بە لای یەکێك لە بەردەم ماڵەکانی مەدینەدا تێپەڕی و کە کولکن بووە و پێشتر بوونی نەبووە، عومەر لێی نزیك بوویەوە و گوێی لە هات و هاواری ئافرەتێك بوو، پیاوێکی بینی کە بە پێوە وەستا بوو، لە پیاوەکە نزیك بوویەوە و سلاوی لێ کرد پاشان پێی فەرموو: تۆ کێی؟ پیاوەکە وتی: خەڵکی ئەم دەشت و دەرەم هاتووم بۆ لای ئەمیری باوەڕداران بەڵکو برێك لە چاکەیم دەستگیر کەوێ، ، عومەر فەرمووی: ئەی ئەم دەنگە چیە کە لە ژورەوە دەیبیستم، پیاوەکە وتی: خوا ڕەحمت پێ بکات بۆ پێویستیت، عومەر دیسان فەرمووی: لەسەر ئەوە چی هەیە؟ پیاوەکە وتی: ژنێك ژان دەیگرێ ، عومەر فەرمووی: ئەی کەسی لە لایە؟ پیاوەکە وتی: نەخێر عومەر ڕایکرد و هەتا گەیشتە ماڵەوە بە ئوم کەلسوم کچی علی خێزانی فەرموو: ئایا ئەتەوێت پاداشتێکت چنگ بکەوێت کە خوای گەورە بۆی ڕەوانە کردوویت؟ خێزانی فەرمووی: چی یە؟ عومەر فەرمووی: ئافرەتێکی دەربەدەر ژان دەیگرێ و کەسی لەلا نیە، خێزانی فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر تۆ بتەوێ. عومەر فەرمووی: دەی لەگەڵ خۆت هەموو ئەو شتانە بهێنە کە شیاوە بۆ ژن لە کاتی منالْ بوونیدا لە سمین و ڕۆن، هەندێ چەوری و دانەوێڵە لەگەڵ خۆت بهێنە، ئوم کەلسوم شتەکانی ئامادەکرد و عومەر فەرمووی: خێراکە وەرە، عومەر شتەکانی هەڵگرت و خێزانەکەی بە دوایدا هات تا گەیشتنە ماڵەکە و دواتر عومەر بە خێزانی فەرموو: بڕۆ ژورێ بۆ لای ژنەکە، خۆیشی هات و لای پیاوەکە دانیشت و پێی فەرموو: ئاگرێکم بۆ بکەرەوە و ئەویش ئاگرەکەی کردەوە عومەر خواردنەکەی خستە سەر ئاگرەکە هەتا پێگەیی و لەم کاتەدا خێزانی هاتە دەرەوە و فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، مزگێنی کوڕێك بدەرە هاوەڵەکەت کاتێ کە

---

١ـ الكامل في التأريخ (٢/٢١٤)، الطبراني (٥/٢٠٠).

دەشتەکی یەکە گوێی لە زاراوەی(( ئەمیری ئیمانداران بوو)) هەروەك ئەوەی کە ترسا بێ لێی دوورکەوتەوە، ، عومەر فەرمووی: لە شوێنی خۆت بە هەر چۆنێکی پاشان خواردنەکەی برد و لە بەردەم دەرگاکە داینا و بە خێزانی فەرموو تێری بکە، خێزانەکەشی ژنەکەی تێر کرد و پاشتر خواردنەکەی هێنایە دەرەوە و لە بەر دەرگا دانا، عومەر هەستایە سەر پێ و خواردنەکەی هێنا و خستیە بەردەم پیاوەکە و فەرمووی: بخۆ بەلاّم لێدای، تۆ ئەم شەو شەوخونیت کێشا، دواتر بە خێزانەکەی فەرموو: وەرە دەرەوە و بە پیاوەکەشی فەرموو: سبەینێ هاتنە لامان فەرمان دەدەین کە ئەوەت بۆ بکەن کە بۆت شیاو و لەبارە، کاتێ کە ڕۆژ بوویەوە پیاوەکە هات و عومەر ئەوەی کە بۆ منالاّن هەبوو فەرزی کرد و پێی بەخشی.[1]

## -سوێند بە خوا ئەوە من نیم کە ملکەچی بکەم لە قەربالّغیدا و سەرپێچی بکەم لە چۆلّەوانیدا:

ئەسلەمی مەولای عومەر(ﷺ)دەفەرمووێت: کاتێ من و عومەر پێکەوە دەڕۆیشتین و پاسەوانی مەدینەی دەکرد و لەکاتێکدا کە هەموو شوێنێ کش و مات بوو، عومەر خۆی دایە لای دیوارێك لە قولاّیی شەودا و گوێی لە ئافرەتێك بوو دیوت بە کچەکەی: ئەی کچی شیرینم هەستە ئاو بکەرە شیرەکەوە، کچە وتی: دایە گیان: ئەوەت لە مافی ئەمیری باوەڕداران نەزانیوە؟ دایکە وتی: کامەیە مافی ئەمیری باوەڕداران؟ کچە وتی: فەرمانی داوە بە جارچیان کە هاوار بکەن: کە شیر و ئاو تێکەلّ ناکرێت. دایکەکە وتی: کچەکەم، هەستە سەر پێ و ئاو بکەرە شیرەکەوە تۆ لە جێگایەکدای کە نە عومەر و نە جارچی عومەریش ناتبینێ، کچەش وتی: سوێند بە خوا ئەوە من نیم کە لە قەرەبالّغیدا ملکەچی بکەم و لە چۆلّە وانیشدا سەرپێچی بکەم، عومەر(ﷺ) گوێی لە هەموو ئەمانە بوو بۆیە فەرمووی: ئەی ئەسلەم دەرگاکە دیاری بکە و شوێنەکە بناسە پاشان ڕۆیشت بە دەم پاسەوانیەکەیەوە، کاتێ، کە ڕۆژ بوویەوە عومەر فەرمووی: ئەی ئەسلەم: بڕۆ بۆ ئەو شوێنە و بزانە قسەکەر کێ یە ، ئایا ئەوان مەڕ و مالاّتیان هەیە؟ منیش هاتم بینیم کە کچێکی ڕەبەند و مەڕ و مالاّتی نی یە، دایکی بێوەژنە و مێردی نی یە پاشان هاتمە لای عومەر و هەوالّەکەم پێ گەیاند و ئەویش کوڕەکانی بانگ کردو کۆی کردنەوە و پێی فەرموون: ئایا کەسێك لە ئێوە هەیە کە پێویستی بە هاوسەر بێ و من بۆی پەیدا بکەم، ئەگەر باوکتان جولّەیەکی تێدا بوایە بەرەو ئەم کارە هیچ کام لە ئێوە نەیدەتوانی پێش من خۆی بگەیەنێتە ئەو کیژۆلّەیە، عبداللە فەرمووی: من هاوسەرم هەیە، عبدالرحمن بە هەمان شێوە و عاصم فەرمووی:من خێزانم نی یە لەمنی مارەبکە عومەر ڕۆیشت بۆ لای کچەو مارەی کردلەعاصم و خوای گەورە کچێکی پێ بەخشین و ئەو کچەش بوویە دایکی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ).[2]

---

١ـ البداية و النهاية (١٤٠/٧).
٢ـ منقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ٨٩,٩٠).

إبن عبدالهادی دەفەرمووێت: هەندێکیان دەفەرموون: بەم شێوەیە لە ڕیوایەتەکەدا هاتووە، ئەو هەڵەی کردووە و هەر ئەوەش دروست بووە و عاصم بووە باوکی کچێك و کچەش بوویە دایکی عومەری کوڕی عبدالعزیز-ڕەحمەتی خوای لێ بێ-.[1]

بەم شێوەیە عومەر بەخۆی خەڵکی بەسەر دەکردەوە و شەو پاسەوانی دەکرد و بە ئەرك و کاری خۆی هەڵدەستا بەرامبەر خەڵکەکە بەوەی کە پاراستنی لای خودا دیاری کراوە، عومەر(ﷺ) لە سوربونی لەسەر شارەزا بوون بە واقعی دەوڵەت کەمتەرخەم نەبووە بەتەنها لەسەر پایتەخت بەڵکو ئەم سووربوونەی درێژ دەبوویەوە بۆ تەواوی ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی هەروەك ئەوەی کە بەیارمەتی خوا لە لاپەڕەکانی تردا بەدی دەکەین.

## ٥-سۆز و بەزەیی هاتنەوەی بە گیانداراندا:

عومەری فاروق لەو نەرم و نیانی و بەزەیی یەی کە هەیبوو زۆری بەزەیی بە گیانداراندا دەهاتەوە و چاکەی بۆ هەموو شتێك هەبووە، ئەویش تەنها لەبەرئەوەی کە دڵی وا بەستە بووە بە یادی خواوە، عومەر بەزەیی بە دروستکراوەکانی خوادا دەهاتەوە ،ئەوە لە ئیسلام تێگەیشتبوو کە لە تێر کردنی جگەر تەڕێکدا پاداشت هەیە، بە پێی یاسا شیاو نیە کە گیانداران نە بە خراپ بەکاربهێنرێن و نەدەربکرێن و نە بەکاربهێنرێن بۆ کارێك کە کاری خۆیان نەبێ و نە لە توانای خۆیان زیاتر بار بکرێن،[2] عومەر بانگەوازی بۆ ئەوە کردووە کە وڵاخێك لە عێراق پێی بکەوێ بەلادا و ڕێگەکەی بۆ چاك نەکرابێ ئەو لێی بەرپرسیارە، ئەمەش هەندێ لەو لاپەڕانەیە کە بە ئاوی زێڕ نەخشێنراوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا:

### -ئایا حوشترەکەت بار دەکەیت بەوەی کە لە توانایدا نی یە:

موسەیبی کوڕی دارم دەفەرمووێت: عومەرم(ﷺ) بینی کە دەیدا لە حوشترەوانێك و دەیفەرموو: حوشترەکەت بەجۆرێ بار کردووە کە لە توانایدا نی یە.[3]

### -ئایا نەتانزانیوە کە ئەو مافی بەسەرتانەوە هەیە:

ئەحنەفی کوڕی قەیس دەفەرمووێت: بە فەتحێکی گەورەوە ڕەوەندێکمان چووینە لای عومەر، فەرمووی: لە کوێ دابەزین؟ منیش وتم: لەو جێ یە و لەو جێ یە؟ عومەر لەگەڵم هەستا تا هاتینە لای وڵاخەکانمان چاوی پێدا دەگێڕان و دەیفەرموو: ئایا لە خوا نەترساون بۆ ئەم سوارانەتان؟ ئایا نەتانزانیوە کە ئەوانە مافیان بەسەرتانەوە هەیە؟ ئایا لێی تەگەڕاون کە لە شینایی زەوی بخوات؟[4]

---

١ـ محض الصواب (٣٩١/١).
٢ـ شهيد المحراب (ص: ٢٢٦).
٣ـ محض الصواب (٤٦٩/٢).
٤ـ نظام الحكم في الشريعة و التأريخ (٦٠٥/٢).

### -تیماری حوشترێکی صەدەقە دەکات:

ڕەوەندێك لە عێراقەوە هاتن بۆ لای عومەر(ﷺ)، کە لە نێوانیاندا ئەحنەفی کوڕی قەیس بەدی دەکرا لە ڕۆژێکی زۆر گەرمی هاویندا، عومەر عەبایەکی دابوو بەسەر خۆیدا و تیماری حوشترێکی صەدەقەی دەکرد و قەترانی لێدەدا، عومەر فەرمووی: ئەی ئەحنەف جلەکەت دانێ و خێرا وەرە و ئەمیری ئیمادارانی لەسەر ئەم حوشترە دامەزرێنە ئەوە حوشتری صەدەقەیە، مافی هەتیو و بێوەژن و هەژارانی تێدایە، پیاوێك لەناو خەڵکەکە وتی: خوای گەورە لێت خۆش بێ ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ فەرمان نادەیتە بەندەیەك لە بەندەکان کە دەستت بگرێت؟ عومەر فەرمووی: کام بەندە لە من و لە ئەحنەف بەندە ترە، ڕاستە هەرکەس کە کاری موسوڵمانانی پێویستە لەسەری بەو شێوەیە ڕەفتار بکات کە بەندەیەك بۆ گەورەکەی دەیکات لە ئامۆژگاری و گریاندنی ئەمانەت.[1]

### -لەبەر ئارەزوی عومەر گیانداریکت ئەشکە نجە داوە:

عومەری فاروق حەزی لە ماسی یەکی تەڕ و تازە کرد، (یەرفەء)ی مولای ولاخێکی گرت و دوو شەو و دوو ڕۆژ ڕێگەی بڕی ماسی یەکی کڕی و لەگەڵ خۆی هێنای و پاشان(یەرفەء) هەستا دەستی کردە شۆرینی ماسی یەکە و عومەر سەیرێکی کرد و فەرمووی: لەبەر ئارەزوی عومەر گیانداریکت ئەشکەنجە داوە، سوێند بە خوا عومەر نای جەژێت.[2]

### -من دەترسم پرساری تۆم لێ بکرێ:

عومەر(ﷺ) حوشترێکی بینی کە ڕوکاری پەککەوتەیی و نەخۆشی پێوە دیار بوو، لەحوشترەکە نزیك کەوتەوە و دەستی لەسەر پشتی دانا و بە زمانێکی پاراو پێی فەرموو: من دەترسم پرسیاری تۆم لێ بکرێ.[3]

ئەمانە هەندێ هەڵوێستی عومەری بوون، کە دەلالەت دەکەنە سەر ئەوەی عومەر بەسۆزو بەزەیی بووە بۆ گیانداران، بە ئاگابە خۆزیا لاوانی سەرسام مێژووی عومەریان دەخوێندەوە و لۆمەی موسوڵمانیەتی خۆیان دەکرد، هەتا بزانێ کە هیچ ڕێسایەکی سودمەند بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی نییە ئەگەر لە ئیسلامدا بنەما و ڕێکخستنی نەبێ، دامەزراندی کۆمەڵەو ڕێکخراوی بپارێزگاری مافی بوگیالەبەران، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەمە شێوەیەکە لە شێوەکانی مرۆیی کارزان و هونەرمەند، هەتا لاوانمان چاویان لێ نەکەن و گومانیان وا بێ کە ئەوان دۆست و هاوەڵی ئێمەن، هەتا هەست بەوە بکەن کە ئێمە مامۆستایانین لە بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا،[4] لە هەموو سودمەندی یەك بەڕاستی بە چاودێر گرتنی خودا یەکێکە لەنهێنی یەکانی هیدایەت و لوتکەی چاکە و کرۆکی پەرستش و

---

١ـ أخبار عمر (ص:٣٤٣) تقلا عن إبن الجوزي.
٢ـ الرياض النضرة (ص: ٤٠٨).
٣ـ الطبقات (٣/٢١٥).
٤ـ شهيد المحراب (ص: ٢٨٨).

تەنانەت عومەر لەوەش دەترسێ کە خوای گەورە پرسیاری لێ بکات دەربارەی حوشترێکی نەخۆش، ئەمەش هەر ئەوەیە کە ئیسلام مەبەستیەتی و چاودێری کران و ترسیش ئارامی دەداتە دڵ، ئایا فەرمانبەردار بە غەیری ئەمە سەرکەوتوو دەبێت تا لە لێپرسینەوەی خودا ڕزگاری بێت، کار و باری بەندەکانی بداتە دەست.[1]

## ٦-ئەرد هەژینێك لە سەردەمی عومەردا:

لە سەردەمی عومەردا(ﷺ) ئەرد هەژینێك ڕوویدا، عومەر فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەم هەژینە هیچ نی یە جگە لەوەی کە لەسەر شتێکە نوێتان کردۆتەوە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر ئەگەرایەوە هەرگیز ئارامشتان پێ نادەم تیایدا.[2]

١ـ شهيد المحراب (ص: ٢٢٩).

٢ـ قرائد الكلام (ص: ١٤٠) تقلا عن الراء و الرواء لإبن القيم (ص: ٥٣).

# دوانگەی چوارەم

## بایەخی عومەر بە زانست و زانایان و بانگخوازان

### یەکەم/ بایەخی عومەر بە زانیاری و زانست:

زانست یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی بەهێز کردنی ئوممەتی ئیسلامی، لەبەر ئەوەی ئەستەمە خوای گەورە ئوممەتێکی نەفام بەهێز بکات کە لە کاروانی زانستیدا دواکەوتبێ، ئەوەی کە سەرنجی قورئانی پیرۆز دەدات ئەوە بەدی دەکات کە ڕونکردنەوەیەکی تێدایە و قورئان لێوان لێوە لەو ئایەتانەی کە بایەخ بە بواری زانستی دەدەن، هاندەرن بۆ بەدەست هێنان و فەراهەم کردنی، یەکەمین ئایەت لە قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات بە زانست و زانیاری و خوێندنەوە: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ﴾ (العلق: ١).

هەروەها قورئان زانیاری کردۆتە بەرامبەری ئەو کوفر و بێ باوەڕیەی کە نەفامی و گومڕایی یە:
﴿أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾(الزمر:٩).

تاکە شتێك، کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە بەسەر پێغەمبەرەکەیدا(ﷺ) ئەوە بوو کە داوای هەوڵی زۆرتری تیا کردووە بریتی یە لە زانیاری و زانست،[1]: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا﴾ (طه: ١١٤).

هاوەڵانی بەڕێز لەمە گەیشتوون کە زانیاری و تێگەیشتن لە ئاین لە هۆکارەکانی دەستەبەر کردنی سەرکەوتن و هاوکاری پشتیوانی خوداین، هەر لەبەر ئەوەش بووە، کە سوربوون لەسەر تێگەیشتن لەدین و فێر بوونی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)و داخوازیان بۆ زانیاری و سوربوونیان لەسەر زانینی و ناسینی بەڵگە لە حوکمەکاندا،یاران و هاوەڵان لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ەوە فێری دوعایەك بوون کە دەیفەرموو:(( خوای گەورە پەنات پێ دەگرم لە زانیاریەی کە سودی نەبێ، لە دڵێك کە نەترسێ و ملکەچ نەبێ، لە نەفەسێك کە تێر نەبێ، لە دوعایەك کە وەڵامی نەدرێتەوە و گیرا نەبێ))[2] ئوممەتی ئیسلام شاهیدی بۆ ئەوە دەدەن کە عومەر(رضي الله عنه) خاوەنی زانیاری بووە و یەکێك بووە

---

١ـ التمكين للامة الاسلامية (ص: ٦٢).
٢ـ مسلم رقم ٢٧٢٢.

لە تێگەیشتوانی ئەم ئوممەتە لە نیوەی یەکەمیدا و بە بێ هیچ بەهانەیەك، عومەر بەوە ناسراوە کە خاوەنی تێگەیشتنێکی قوڵ و بە توانا بووە لە شیکاری و بلیمەت بووە لە هەڵێنجان ، هەر ئەمەش بووە کە پاش یارمەتی خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئەو شوێنە دلڕفێنە، عومەر پاش ئەوەی کە دەسەڵاتی خەلافەتی گرتە دەست بویە تێگەیشتووترینی ئوممەتی ئیسلامو بە هەوڵ و کۆششەکانی خۆی ڕێساکانی دادپەروەری لەنگەر پێ گرت هەر بەو شێوەیەی کە لەناو کرۆکی ئیسلام و ڕاستی یەکەی تێی گەیشتبوو، عومەر(ﷺ) لەپێشەوەی تێگەیشتوانی یاران بووە سەلەفی صالحی بە زانست و پێزانینەکەی و شارەزایی وردی بە حوکمە شەرعی یەکان بتەوتر کردبویەوە، عومەر(ﷺ) لە وەرگرتنی فەرموودەدا یەدەکی بۆ خۆی دەکردو بایەخی بە ڕاپۆرتی یارانی دەدا لە زانیاری و زانستدا، هەمیشە لەو کاروبارانەی کە لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە فێری نەبوبو پرسیاری لە هاوەڵانی دەکرد و سەبارەت بە هاندانیش لە داخوازی زانیاری و زانستدا چەند وتەیەکی هەیە و هەمیشە شوێن پێی خەڵکانی هەڵدەگرت بە ئامۆژگاری و فێربوون و بەمەش مەدینەی کردبویە یانەیەك بۆ تێگەیشتن و فتوا و لەگەڵ ئەوەشدا مەدینە قوتابخانەیەك بوو کە والی و دادوەرەکان لەوێوە دەردەچوون، کۆمەڵێکی باشی لە یاران ئامادە کرد کە دەبوونە ڕابەری دام و دەزگا زانستی یەکان (مزگەوتەکان) لە بزافە پاکسازیەکاندا هەستاون بە پەروەردە و فێرکردن گەلانی ڕزگار بوو لەسەر قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)و دانانی دەنکۆڵەکانی یەکەم لە دامەزراندنی ئەو خوێندنگە زانستیانەی کە کاریگەر بوون لە نێو گەلانی ئیسلامیدا ئەوانەش وەك خوێندنگەی بەصرە و کوفە و شام و خوێندنگەکانی مەککە و مەدینەی بەرەو پێش برد.

## یەدەك کردنی لە وەرگرتنی فەرموودە و یادەوەریەکانی بۆ زانیاری و پرسیارکردن لەوەی کە نەیدەزانی:

### ١/ یەدەك کردنی لە وەرگرتنی فەرموودە و داخوازیی بۆ چەسپاندنی:

ئەبو موسای ئەشعەری داوای مۆڵەتی کرد تا بڕوات بۆ لای عومەری(ﷺ) بەڵام مۆڵەتی پێ نەدرا وەك ئەوەی کە عومەر سەرقاڵ بوو لەبەر ئەوە ئەبو موسی گەڕایەوە دواوە، کاتێ عومەر لەکارەکەی بوویەوە فەرمووی: ئایا من گوێم لە دەنگی عبداللە کوڕی قەیس نەبوو؟ مۆڵەتی بدەن با بێتە ژوورێ، وتیان: گەڕاوەتەوە، عومەر بانگی کرد و ئەویش فەرمووی: ئێمەوا فەرمانمان پێ کراوە، ئایا بەڵگەیەکم لەسەر ئەمە بۆ دێنی، ئەبو موسی بەرەو کۆڕی ئەنصاریەکان بەڕێ کەوت و پرسیاری لێ کردن و ئەوانیش وتیان: جگە لە بچوکترینمان کەسمان ناتوانێ لەسەر ئەمەشاهیدی بۆ بدات بۆیە ئەبو سعید هەستایە سەر پێ و فەرمووی: ئێمە وا فەرمانمان پێ کراوە، پاشان عومەر فەرمووی: لە فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە لە من شاراوەتەوە ! و مامەڵە کردنی نێو بازاڕەکان بێ ئاگای کردووم- واتە دەرچوون بۆ بازرگانی-[1] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەبوو سەعیدی خدری

---

١ـ المسلم رقم ٢١٥٣.

دەفەرمووێت: لەنێو یەکێك لە کۆبوونەوەکانی ئەنصاردا بووم ئەبو موسی هەروەك ئەوەی ترسابێ فەرمووی: سێ جار داوای مۆڵەتم لە عومەر کرد ڕێگەی نەدام بچمە ژووری منیش گەرامەوە، ئەویش فەرمووی: چی ڕێگری لێ کردی؟ وتم: سێ جار داوای مۆڵەتم کرد بەلام پێم نەدرا وگەرامەوە پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێت: (( ئەگەر کەسێکتان سێ جار داوای مۆڵەتی کرد و پێی نەدرا با بگەڕێتەوە دواوە)) عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا لەسەر ئەمە شایەتێکم بۆ دێنی، ئایا لەنێو ئێوەدا کەسێك هەیە کە ئەمەی لە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)ەوە بەر گوێ کەوتبێ، ئوبەی کوڕی کەعب فەرمووی: سوێند بە خوا جگە لە بچووکترینی ئەم دەستەیە کەس لەگەڵت هەڵناسێ و منیش بچوکترینیان بووم لەبەر ئەوە لەگەڵی هەستام و هەواڵم دایە عومەر پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) وای فەرمووە.[1]

## -وە بیرهێنانەوەی عومەر بۆ زانیاری و پرسیار کردن لەوەی کە نایزانێ:

ئەبوهریرە(ﷺ) فەرمووی: ئافرەتێك هات بۆ لای عومەر کە خاڵ کوت بوو، عومەر هەستایە سەر پێ و فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خودا کێ لە ئێوە شتێکی دەربارەی خاڵ کوتان بیستوە؟ ئەبو هریرە دەفەرمووێت: هەستام و وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران من بیستومە، عومەر فەرمووی: چیت بیستووە؟ وتم: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بووە کە فەرموویەتی: ((خاڵ مەکوتە و داوا مەکە خاڵت بۆ بکوتن))،[2] موغیرەی کوڕی شوعبە لە عومەر(ﷺ)ەوە هێناویەتی کە دەفەرمووێت: عومەر ڕاوێژی پێ کردوون لە هەلاتنی ژنان، پاشان موغیرە فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) بە تیغی شمشێر بەندەیەك یان کەنیزەکێکی دادگایی دەکرد و فەرمووی: کەسێك بێنە کەشاهیدی لەگەڵ بدات بۆیە محمد کوڕی موسلمە پێغەمبەر(ﷺ)ی بینی کە فەرمانەکەی پێ کرد،[3] عومەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پرسیاریان لێ کرد سەبارەت بە پیاوێك لە سەفەردا دوچاری جەنابەت دەبێ و ئاو نیە خۆی بشوات چی بکات؟ عومەر فەرمووی: هەتا ئاو نەبینێتەوە نوێژ ناکات. عەمار بە عومەری فەرموو: ئەی.ئەمیری باوەڕداران، لەیادت نیە کە من و تۆ لەسەر حوشترێك بووین و دوچاری جەنابەت بووین و من وەك هەر گیانداریێ خۆم گەوزاندە خۆڵەکە و بەلام تۆ نوێژت نەخوێند و ئەمە باس کرا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی: بەڕاستی ئەمەت بەسە[4] و پاشان بە دەستی دای لە زەوی و دەم و چاو و مەچەکەکانی پێ ڕامالی، عومەر(ﷺ) فەرمووی: لە خوا بترسە ئەی عەمار، عەمار فەرمووی: ئەگەر بتەوێ باسی ناکەم عومەر فەرمووی: بەڵکو ئێمە لەم کارەدا تۆ دەکەینە یاریدەدەر ئەمە ساڵێکە کە عومەر دیویەتی و پاشان لە یادی کردووە و هەتا بە پێچەوانەیەوە فتوای دا و ئەمەش کە عەمار باسی کرد باس نەکرابوو، ئەو عەماری بە درۆ نەخستەوە و بەڵکو فەرمانی پێدا کە بیگێڕێتەوە.[5]

---

١ـ المسلم رقم ٢١٥٣.
٢ـ البخاري رقم ٥٩٤٦.
٣ـ البخاري رقم ٦٩٠٦.
٤ـ النسائي في الطهارة ٣١٧.
٥ـ الفتاوى (١٣٥/٢٥).

## - لە وتەکانی عومەر سوبارەت بە هاندان لەسەر زانست و زانیاری:

عومەر(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: پیاو لە ماڵەکەی دەردەچێت و وەك کێوێکی دەست هەڵبەست وایە، ئەگەر گوێی لە زانست بوو ترسا و ئەگەرایەوە و پەشیمان بوویەوە، ئەوا دەگەرێتەوە بۆ ماڵەکەی و هیچ گوناهێکی لەسەر شان نامێنێ، بە هیچ شێوەیەك لە کۆڕ و کۆمەڵی زانایان دامەبڕێن.[١]

هەروەها عومەر(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: پیاو نابێتە زانا هەتا ئێرەیی بەسەروی خۆی نەبات و خواری خۆی بە کەم نەزانێ و لەسەر کارەکەی پاداشت وەرنەگرێ، عومەر(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: ئێوە تێبگەن پێش ئەوەی ببنە گەورەی هۆزەکەتان، چونکە دواتر لوتکە بەرزی ڕێگری فێربوونتان لێ دەکات و بە نەفامی دەژین.[٢]

عومەر(رضي الله عنه) دەفەرمووێت: زانست ئەگەر سودت پێ نەگەیەنێ زیانت پێ ناگەیەنێ.[٣]

دەفەرمووێت: مردنی هەزار بەندە ساناترە لە مردنی زانایەکی بەرچاو ڕۆشن بە حەلاڵ و حەرامی خودا.[٤]

دەفەرمووێت: ببنە دەماری کتێبەکان و کانیاوی زانست و ڕۆژ بە ڕۆژ داوای ڕزقی خۆتان لە خوا بکەن، زیانتان پێ ناگەیەنێ مەگەر بۆتان زۆرتر بکات.[٥]

هەروەها دەفەرمووێت: فێری زانست و زانیاری بن و خەڵکیش فێر بکەن، فێری سەلاری و هێمنی بن، بێ فیز بن لە بەرامبەر کەسێ کە لێوەی فێر دەبن و لە بەرامبەر ئەو کەسەش کە فێری دەکەن، لە زانایانی زۆردار مەبن چونکە زانیاریتان بە نەفامیتان بەهێز نابێت.[٦]

لە کۆتایدا عومەر(رضي الله عنه) هۆشیاری داوە بەرامبەر کەسانی زانا و فەرموویەتی: ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە کەساسی زانایان و گفتوگۆی دوڕوان بە قورئان و پێشەوایانی سەرگەردان دەڕوخێت.[٧]

## ٢- شوێنکەوتنی بۆ خەڵکی بە ئامۆژگاری فێر کردنیان لە مەدینە:

عومەری فاروق بەڵێنی بە ئامۆژگاری کردن و فێرکاری و پەروەردە دەدا لە میانی لێکخشانی ڕۆژانەیان بە تایبەتی ڕۆژانی هەینی کە وتاری هەینی لە مینبەرە گرنگەکانەوە بۆ ئامۆژگاری کردن و ڕێنمونی ئومەتەوە مێژوو زۆرێك لە وتارەکانی عومەری لەبەر کردووە و پاراستووە و ئەمەش ئاماژەیەکی خێرایە بۆ هەندی لە وتارەکانی:

عومەر(رضي الله عنه) لەسەر مینبەری پێغەمبەری خۆشەویست(صلى الله عليه وسلم)وتارێکی دا و فەرمووی: ئەوە سەبارەت بە یاساغ کرانی مەی ئایەت هاتۆتە خوارێ کە پێنج شمەکە لەوانە: ترێ، خورما، گەنم، جۆ،

---

١- مفتاح دار السعادة (١٢٢/١), قرائد الكلام (ص: ١٣٥).
٢- التبيان في آداب حملة القرآن للنوي (ص: ٦٠), قرائد الكلام (ص: ١٦٣).
٣- الزاهد للإمام أحمد (ص: ١٧٤), قرائد الكلام (ص: ١٦٨).
٤- قرائد الكلام (ص: ١٥٧), مفتاح دار السعادة (١٢١/١).
٥- قرائد الكلام (ص: ١٥٩), البيان و التبين للجاحض (٣٠٣/٢).
٦- أخبار عمر (ص: ٢٦٣), محض الصواب (٦٨٦/٢).
٧- محض الصواب (٧١٧/٢).

هەنگوین و مەیش ئەوەیە کە ئەقڵ مەست بکات، لەبەر سێ شت حەزم دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ) لێمان دانەبڕێ هەتا بەڵێنی ئەو سێ شتەی پێ دەداین کە: هەوڵ و تەقەلا و شەکەتی و بەشێك لە بەشەکانی سوو.[1]

ڕۆژێکی هەینی وتارێکی دا ئامۆژگاری خەڵکی کردو ڕون کردنەوەی مافیان لەسەری و فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەندێ تەماعکاری هەژاریە و هەندێ بێزاریش دەوڵەمەندیە و ئێوە ئەوە کۆ دەکەنەوە کە نایخۆن سەرنج دەدەن و هەستی پێ ناکەن، ئێوە مۆڵەت پێ دراون لە ماڵی خوراپی، ئێوە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) کارتان بە سروش دەکرد، هەرکەس شتێك بشارێتەوە بە شاردنەوەکەی وەردەگیرێ و هەرکەسیش شتێك ئاشکرا بکات بە ئاشکرایی یەکەی وەردەگیرێ، ئێوە باشترین ڕەفتار و کرداری خۆتانمان بۆ ئاشکرا بکەن و خوای گەورەش بە پەنهانی یەکان دەزانێ، بشزانن هەرکەس شتێکمان بۆ ئاشکرا بکات و پڕو پاگەندەی ئەوە بکات کە پەنهانی یەکان باشترن ئەوا بڕوای پێ ناکەین. وە هەرکەس باشیەکمان بۆ ئاشکرا بکات ئەوا گومانی باشی پێ دەبەین وە ئەوەش بزانن کە هەندێ کاری ڕژدی جۆرێکە لە دوڕویی، ئێوە ماڵ ببەخشن کە چاکترە بۆتان: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (التغابن: ١٦).

ئەی خەڵکینە خانە و لانەکانتان خۆش و کار و فەرمانتان چاك بکەن و لە خوای گەورەتان بترسن هەرگیز پۆشاکی کەتانی سپی و ناسك مەکەن بە بەری ئافرەتەکانتاندا ئەوە ئەگەر هاتنە ڕوو بێ بێگومان وەسف کردنیەتی. ئەی خەڵکینە من پێم خۆش بووە کە بە بژێوی ڕۆژانەم ڕزگارم بێ نە هیچم دەست بکەوێ و نە هیچم لەسەر بێ وە خوازیارم ئەگەر تەمەنێکم لە ناوتاندا کرد چ زۆر و چ کەم إن شاء الله بە هەق کار بکەم، هەموو موسوڵمانێك تەنانەت ئەوەشی کە لە ماڵەکەی خۆیدایە ماف و بەشی خۆی وەربگرێ لە بەیتولمال و نەفسی کاری بۆ نەکات و ڕۆژێك نەیەت کە بۆی بچەمێنێتەوە، ئەو ماڵ و داهاتانەی کە خوا پێی داون چاکی بکەن، کەسێك بەزەیی یەکی کەمی هەبێت باشترە لەوەی توند و تیژیەکی زۆری هەبێ، کوشتنیش جۆرێکە لە تیاچونەکان کە چاکەخواز وخراپەکاریش دەچەمێنێتەوە، شەهیدیش ئەوەیە کە لە خۆی دەپرسێتەوە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە حوشترێکی ویست با ئارەزوی حوشترێکی درێژ و گەورە بکات و بە گۆچانەکەی لێی بدات، ئەگەر دڵڕەقێکی بینەوە با بیکرێت.[2]

### دەستورێکی گەورە لە وتاردا:

عومەر(ﷺ)وتارێکی بە دەستورێکی گەورە و پیرۆز کردەوە و تیایدا ڕونی کردەوە کە دەوڵەمەندی ڕاستەقینە بە قەناعەتە. و هەژاری ڕاستەقینە بە تەماعکاری یە، بنەچەی قەناعەتیش نا

---

١ـ الخلافة الراشدة (ص: ٣٠٠) د. يحيى اليحيى.

٢ـ قرائد الكلام (ص: ١٩٠) تقلا عن التأريخ الطبري.

ئومێدی ئەو شتەیە کە لە نێو چنگی خەڵکیدایە، هەرکەس نا ئومێد بێ بەوەی کە لە چنگی کەسانی تردایە قایل دەبێت بەوەی کە هەیەتی، هەرکەس قانع بێت بەوەی کە هەیەتی دەوڵەمەند دەبێت ئەگەر چی هەژاریش بێت، هەرکەس بە چاوی تەماعەوە شتێك بکڕێ و سەیری ئەوە بکات کە لە نێو چنگی خەڵکیدایە لە ناخیدا هەژار دەکەوێ ئەگەر چی دەوڵەمەندیش بێت وماڵەکەشی دەوڵەمەندی ناکات لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی نەفسە و ئەقڵی تەندروستیش وا دەکات کە مرۆڤ لە دونیادا زیاتر لەو کۆ نەکاتەوە کە پێویستی پێیەتی و ئامانجەکانی دونیایی نەبن پەیوەست بن بەوەی کە نیەتی، بەشێوەیەك سەیری دونیا بکات کە ماڵی ڕەوینەوەیە، گومڕا نەبێت بەوەی کە تیایدایە لە سەرنجی ڕاکیشراو و گومڕا کەرەکان.[1]

## - گرتنی خەڵکی بە ڕووکاریان ولێگەڕانی پەنهانی یەکانیان:

لەم وتارەدا بنەمایەك هەیە لەسەر ئەوەی کاروباری لەسەر جێگیر بووە لە پاش پچڕانی وەحی لە وەرگرتنی خەڵکی بە ڕووکاریان ولێگەڕانی پەنهانیەکانیان بۆ لای خودا، لەم وتارەدا ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئەوەی، کە والی بەرپرس نی یە لە دەستور لەسەر نهێنی یەکانی دڵ و هەرگیز ناتوانێ ئەوەش بکات، بەڵکو ئەو بەرپرسە لە چاککردنی ڕوکاری خەڵکی، لە چاککردنی ڕوکاری خەڵکیدا کۆمەڵگەی چاك بێنە کایەوە ئەو فەرمانبەرداری بۆ کۆمەڵگە دەکات و بەمەش ئەگەر ڕوکاری باش بێت و خراپەکاری تێدا ڕانەگەیەنێ و تیایدا و کەسێکی تێدا دەرنەکەوێ کە خراپەکاری ئاشکرا بکات و بەرگری لێ بکات ئەگەرچی چەند تاکێکی تێدا بێت کە خراپەیان بە هاونیشتیمانیەکانیان کردبێ ئەویش لەبەر ئەوەی پرۆتۆکۆلاتی کۆمەلایەتی سەراپا دەبێت لەگەڵ ئەوەی کە ئاشکرا دەبێت لە چاکسازی و ڕێزداری و بەرزی و بلندی و خو و ڕەوشتەکان بەلام ئەوەی کە لە پەنهانیدایە لە لادان ئەوا نەریتی ئیسلامی پەسەندی ناکات هاوەلانی ناچار دەکات بە داپۆشین و گۆشەگیر کردنی.

## - هەندێ ڕژدی بەشێکە لە دوڕویی:

ئەو وتەیەی عومەر(ﷺ) کە تیایدا دەفەرمووێت: ئەوەش بزانن کە هەندێ ڕژدی بەشێکە لە دوڕویی، ئەمە بەڕون و ئاشکرایی لەو کەسانەدا دیارە کە دوا دەکەون لە ماڵ بەخشین لەپێناوی خودا و ئەوا دەوڵەتان و تایفە گەلێك لە ئومەتەکەیان بەدی ناکەن کە بێ باوەڕان هەڵدەکوتنە سەریان و ناموسیان دەڕوشێنن و ولاتیان وێران دەکەن، ئەو کەسانەی کە هێرشیان کراوەتە سەر بۆ جیهاد ڕادەپەڕن و جگە لە کەسانێکی موسوڵمانی کەم نەبێ کەسی تر شك نابەن کە بە ماڵ و داهاتیان هاریکاریان بکەن، ئەو کەسانەی کە لە ڕیزی باوەڕدارانـدا دوچاری ڕژدی بوون بە دوڕویی کردەیی پێناسە دەکرێن کە ئەمەش بریتی یە لە نیشادانی لاوازی ئیمان.[2]

---

١ـ التأريخ الاسلام (٢٠/٢٦٦).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٢٠/٢٦٧).

**- پێم خۆش بوو بە بژێوی ڕۆژانەم ڕزگارم بێ و نەهیچم دەست بکەوێ و نەهیچم لەسەر بێ:**

هەستێکی بڕندە و نیگا کردنێکی زۆر وردە لە هەست کردن بە بەرپرسیارێتی. ئەگەر والی نشین چوویە پێشێ و لە کارێك لە لوتکەی کارە باشەکان، بەلاّم هەڵخلیسکانی سامناکی تێدایە کە ڕایەگوێزێ بۆ کارێك لە خراپترین کارەکان، چەندێ لە بەرپرسان کارەکەی بەرز بووەو لای خودا و پیاوچاکان لە خەڵکی باسی کردووە بەوەی کە پێی هەڵدەستێ لە لێپرسینەوەی خۆی لەسەر هەموو گوناهێکی گەورە و بچوك، چەندێ لە بەرپرسان کارەکەی بە دژی ئەمە بووە لەبەر ئەوەی کە شوێنی هەوا و ئارەزوەکانی خۆی کەوتووە ڕازیکردنی خەڵکی خستۆتە پێش ڕەزامەندی خوای گەورە، بەڕاستی عومەر(ﷺ) لە گەورەترینی کەسانی مێژوو بووە کە لە دیارترین وێنەیاندا نەخشە و نیگاری دادپەروەریان کێشاوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم وتارە وا دەڵێت و ترس و بیمی گەورە لە خوای گەورە بەرپرسیاری دەکات لە دەرخستنێکی وەها لە کارەکەیدا لە هەرێمەکەیدا لە پێناوی پاداشتێك لە بەرامبەر ئەوەی بە دەرونێکی پاکەوە بێتە دەرەوە لەوەی کە گوناه و تاوانی تێدایە.[1]

## ٣- لەو دەستورەی کە لە نێو خەڵکیدا دەچوو بەڕێوە:

عومەر(ﷺ) دەفەرموێت: هەرکەس نهێنی یەکی خۆی بشارێتەوە ئەوە چاکە لە دەستی دایە، هەرکەس خۆی نیشان بدات بۆ ئەنجامدانی تۆمەتێك ئەوا کەسێکی تر لۆمە ناکات ئەگەر گومانی خراپی پێ بەرێت، گومان بە وشەیەك نەبەیت کە لە دەمی براکەت بە خراپی بێتە دەرەوە و تۆش لە چاکەدا دەلاقەیەکی بدۆزیتەوە، کاروباری براکەت لەسەر باشەکەی دابنێ هەتا لەوەوە سەرکەوتنت پێ دەگات، سوێندی زۆر بەجێ مەهێنە چونکە خوای گەورە سوکایەتیت پێ دەکات، بە وێنەی ئەوەی کە لە ملکەچی کردنت بۆ خودا خەلاّت دەکرێیت لەسەرپێچی کردنیشدا چیت دەست کەوت، پێویستە لەسەرت کە برای ڕاستەقینە و ڕاستگۆ بگریت، دەستە بەریان بکەن لەبەر ئەوەی جوانی و قەشەنگی و خۆشگوزەرانی و کەرەستە و پێداویستی نەهامەتی هەر ئەوانن.[2]

ئەمە دەستورێکی لە ڕادە بەدەرە، هەموو دەستورێك خۆشگوزەرانیەك لە جیهانی پەروەردەدا دەکاتەوە، ئەمەش لێدوانێکی بە سودە لەسەر ئەم دەستورە:

**- هەرکەس نهێنی یەکی خۆی بشارێتەوە ئەوا چاکەی لە دەستی خۆی دایە:**

مرۆڤ خۆی فەرمانبەرداری خۆیەتی هەتا نهێنی یەکانی لە نێو لەپیدا بێت ئەگەر ئەم نهێنیە گەیشتە لای کەسێك یان زیاتر، ئەوا ئەو بەرژەوەندی خۆی لە نەدرکاندنی ئەو نهێنی یەدا بەدی دەکرد، ناتوانێ کارەکەی بگەڕێنێتەوە بۆ پەنهانی.

---

١ـ التأريخ الاسلامي (٢٠/٢٦٧).
٢ـ تأريخ دمشق (٤٤/٣٥٩)، التأريخ الاسلام (٢٠/٢٦٧).

**- هەرکەس خۆی نیشان بدات بۆ ئەنجامدانی تۆمەتێك ئەوا با لۆمەی کەسێکی تر نەکات کە گومانی خراپی پێ بەرێت:**

مرۆڤەکان پێش هەر کەسێکی تر خۆیان لە خۆیان بەرپرسن. مرۆڤ پێویستە بە هەموو ئەوەی کە لە توانایدایە نەفسی خۆی بە پاکی بپارێزێ، ئەگەر گومانی برد کەسانێك لە ڕەفتەکانی تێدەگەن بە پێچەوانەی ویستەکانی با پەلە بکات لە ئاشکرا کردنی کارەکەی ئەگەر جێی متمانە بوو، خاوەنی کەسایەتی یەکی بەرزی نێو کۆمەڵگە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ کە دوو پیاو لەگەڵ ئافرەتێکدا بەدیان کرد کە بە شەو ڕێی دەکرد پێی فەرموون: لەسەر خۆتان بن ئەوە سەفیەی کچی حویە یە.[١]

**گومان نەبەیت بەوشەیەکی خراپ کە لەدەمی براکەت دەردەچێت وبیکەیتە حیکایەتی سەر زاران:**

ئەمە ئامۆژگاری یەکی بەڕێزی عومەرە لە خۆپاراستن لە گومانی خراپ، گومان بردنی باش بە موسوڵمانان خوازراوە لە موسوڵمان و پێویستە هەوڵی گێڕانەوەی ئەو وشانە بدات کە خراپە بەوەی کە لە چاکە هەڵیدەگرێت هەتا ئەو وشەیە دەدۆزیتەوە کە هۆکارە بۆ خراپە، ئەمەش لە موسوڵمانان خوازراوە لەگەڵ وشیاریدان بە دەرونی و بۆ کەسێك کە پەرۆشە لەژێر سایەی هەرێمەکەیدا هەتا لەسەر گومڕایی وەرنەگیرێ.[٢]

**- سوێند زۆر مەخۆ با خوا سوکایەتیت پێ نەکات:**

سوێند خواردن بە خوای گەورە، گەورەیی و پیرۆزیە بۆی، ئەگەر سوێند خواردنەکەت بەپێی پێویست بوو لە گەورەکردندا بۆ خوای گەورە و ترسان لێی، ئەوە لە یەکتاپەرستی و پیرۆزی و بەرزی یەتی، بەڵام ئەگەر موسوڵمان سوێندی زۆری خوارد بە خوای گەورە تەنانەت لە کارە قێزەونەکانیشدا ئەوا ئەمە نابێتە هاوەڵیەکی باش بۆ گەورەیی خوای پاك و بێگەرد بەڵکو دەڕواتە بەشی سوکایەتی پێ کردنەوە ، دوا ڕۆژی ئەمە دەبێتە ڕوبەڕو بوونەوەی زۆر لە سوێند خواردن بۆ سوککردنی خوای گەورە و هەر کەسیش ڕوبەڕوی ئەمە بێتەوە ئەوا بە ئاشکرا دۆڕاوە.

**بە وێنەی ئەوەی کە لە ملکەچی کردنت خەڵات دەکرێیت لەسەرپێچی کردنت چیت دەست کەوت:**

ئەگەر لەنێوان تۆ و یەکێك لە هاوەڵەکانت ناکۆکیەك ڕویدا و بەهۆی تۆوە سەرپێچیەکی کرد، ئەویش یان بە پەلاماردان و هەڵکوتانە سەرت، یان بەسوکایەتی پێکردنت و بردنی ماڵ و سامانت، باشترین پاداشتیش ئەوەیە کە تێیپەڕێنیت و بەهۆی تۆوە ملکەچی خودا بێت و ئەمەش بە پابەند بوون

---

١ـ التأريخ الاسلام (٢٠/٢٧١).
٢ـ التأريخ الاسلام (٢٠/٢٧١).

بە ئەدەبی ئیسلامی یەوە لە ناکۆکی و پاراستنی مافی برای موسوڵمانت، بەوەی کە بەو ئاستە نزمەوە وەڵامی نەدەیتەوە کە ئەو پێی دواندویی، پاشان ئەگەر لێبورایت و پاشەکشێت کرد لە داواکردنی مافی خۆت ئەوە لە تەواوی ملکەچی تۆیە بۆ خوای گەورە.

## پێویستە لەسەرت هاوەڵی راستگۆ بگریت:

ئەوە باشترین برایە بۆت، کە لە دایکت نییە، بەڵکە هاوەڵی باش ئەوانەن کە دڵیان لەسەر تەقوا ئولفەتی کردووە گەورەترین قوربانیدانە و چاکترە لە برایەکی شیری ئەگەر وا نەبێ، هاوەڵی باش بەڕاستی مایەی بەختەوەرین بۆ مرۆڤەکان لەکاتی خۆشگوزەرانیدا و شاد دەبن بە دیداریان و بەشداریان لەگەڵ دەکەن لە کاری باش و چاك، ئەگەر بەڵاو نەهامەتی هاتە رێگە ئەوا دەکەونە هەوڵ و کۆشش دان و ئەوان کەرەستەی پێویستن بۆ براکانیان و کێ بەر کێ دەکەن بۆ هەوڵ و قوربانیدان و پێشبڕکێ دەکەن لە بەجێ هێنانی کارە سەختەکان و فەزڵی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیاندا و ئەگەر چی خۆشیان زۆریان پێویست پێی بێ،[1] ئەمە هەندێ لە دەستورەکانی عومەر بوو بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی لە سەردەمەکەیدا، ئەگەر تا ئەمرۆش رەخە گران سەرسام بن بە شیعرەکانی موتەنەبی،وە وا دەبینن کە ئەو شیعرەکان چەردەیەکی ژیانی خەڵکن و لە دووتوێی هونراوە هەڵبەستێکدا نوسراون،ئەمە نابێتە هۆکارێك تا شیعرو هۆنراوەکانی موتەنەبی وتەکانی عومەر پێکەوە باس بکرێن چونکە بواری کاری هەرکام سەربەخۆو جودایە،موتەنبی شیعرەکانی کورتکراوەی ئەزمونی خەڵکن،بەڵام عومەربە فەرمودەکانی دەستورە رێسایەکی بۆ خەڵکی دانا،ئەم رێساو دەستورانەش بە ئاڵۆزی ەهاتون بەڵکو بونەتە قسەی ئاسایی و بە ئاسانایی دەماو دەم هاتون و هەموان پەندو ئامۆژگاریان لێوەرگرتون، لە نمونەی وتەکانی: تاکەی خەڵکی دەکەنە کۆیلە لەکاتێکدا بە ئازادی لە دایك بوون؟هەروەها دەفەرمووێت: ئەم کارە دەبێت نەرمو نیانی بیت نەك لە لاوازیدا توندو بەهێزیش بیت نەك لە ستم و نا دادگەریدا، هەروەها دەفەرمووێت: پیاوێکم دەوێ بۆ ئەم میرنشینە، ئەگەر لەنێو گەلەکەیدا ئەمیریان بێ ئەوا گومان دەبەن کە یەکێك بێ لێیان، ئەگەر یەکێك بوو لێیان ئەوا گومان دەبات کە ئەمیریانە، سەبارەت بە والیەکان دەفەرمێت: سکاڵای جەور و ستەمی بەهێز و گۆشەگیری خۆ پارێزی بۆ لای خوا دەبەم، هەروەها دەفەرمووێت: هەر کەس، کە خراپە نە ناسێ زۆر نزیکە لەوەی کە تێبکەوێ ، هەروەها دەفەرمووێت: من گێل ئیم و گێلانیش ناتوانن فریوم بدەن،[2] پاشان دەفەرمووێت: خوای گەورە فەرمانی بە هەر شتێك دابێ هاوکاریشی لەسەر نواندووە و رێگری لە هەر شتێکیش کردبێ ئەوا خۆی لێ بێ نیاز کردووە.[3]

---

١ـ التأريخ الاسلام (٢٠/٢٧٢).

٢ـ أخبار عمر (ص: ٢١٢).

٣ـ ادب الدنيا و الدين (ص: ٣١١) للماوردي, قرائد الكلام (ص: ١١١).

## دووەم: شاری مەدینەی کردە مەڵبەندی فتوا و تێگەیشتن

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ)وەفاتی فەرموو، شاری پیرۆزی مەدینە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، نیشتیمانی شیرینی خەلافەت بوو، تیایدا ئەقلی هاوەڵان پێدەگەیشتن لە دەرهێنانی حوکمی ئیسلامیدا، شیاو دەبوو بۆ ئەوەی کە لە کاروباری کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بدۆزرێتەوە ئەویش پاش ئەو جەنگە پاکسازیانەی کە ڕویان لە زیاد بوون کرد و بەهۆیەوە زەوی ئیسلام بەرفراوان بوو، مەدینە شوێنێکی پیرۆزی هەبوو لە نێو تەواوی ناوچەکانی تردا، پێغەمبەر(ﷺ) لەنێو کۆمەڵگایەکی مەدەنی ژیاوە و لەسەر دەستی ئەو یەکەمین گروپو تاقم پەروەردە بوون بۆ ئومەتێکی باش کە بۆ خەڵکی هاتونەتە دەر.بوونی عومەر لەسەر لوتکەی خەلافەت لە مەدینە- ماوەی ١٠ ساڵ- لە تایبەتمەندی یە خودیەکانی بووە و سیاسەتی بووە لە حوکمدا کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەر ئەوەی کە مەدینە بکرێتە یەکەمین خوێندنگا بۆ فەرموودەکان و فیقه و یاسا دانان لە هەردوو سەدەی یەکەم و دووەم و، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە هاتووە:

شاری مەدینە لە سەردەمی عومەردا مەڵبەندی یاران بووە بە تایبەتی ئەوانەیان کە پێشتر هاتبوونە ڕیزی ئیسلامەوە عومەر(ﷺ) ئەمانەی لە دەوروبەری خۆی هێشتەوە بە مەبەستی ئەوەی ببنە هاوکاری لە بەڕێکردنی سیاسەتی ئومەتدا و هەروەها کۆمەکی لە زانیاری ئەوان وەردەگرت و پشتی بە دڵسۆزیان دەبەست و ڕاوێژی بەوان دەکرد و زانیاری و زانستی ئەوان لە مەدینەدا مایەوە و ژمارەی هاوەڵانی تێگەیشتوو گەیشتە ١٣٠ هاوەڵ کە لە نێوانیاندا عومەر و عەلی و عبداللە کوڕی مەسعود و عائیشە و زەیدی کوڕی ثابت و عبداللە کوڕی عباس و عبداللە کوڕی عومەر بەدی دەکران، ئەبو محمدی کوڕی حەزم دەفەرموێت: دەکرێ لە نێوان هەر یەکێکیان توێشویەکی گەورە کۆ بکرێتەوە.[1]

ناوەنجی یەکان لە هاوەڵان کە ڕیوایەتیان لێ کراوە: ئەبوبکر ماوەیەکی کورت مایەوە دوای پێغەمبەر(ﷺ)، ئوم سەلەمە و أنس کوڕی مالك و ئەبی سعیدی خدری و ئەبوهریرە و عوسمانی کوڕی عەفان و عبداللە کوڕی زوبێر و ئەبوموسای ئەشعەری و سعدی کوڕی ئەبی وەقاص و جابری کوڕی عبداللە و معازی کوڕی جەبەل و طلحة و زوبێر و عبدالرحمن کوڕی عەوف و عمرانی کوڕی حەصین و عوبادەی کوڕی صامت، دەکرێ لەهەر یەکە لەمانە بەشێکی بچوك فەتواکۆ بکرێتەوە،[2] لەوانەی کە باسمان کردن بە گەورەیی لە مەدینە لە سەردەمی عومەردا مانەوە، تەنها ئەوانەیان نەبێ کە گرنگی یەکی فێرکاری یان جیهادیان هەبووە کە عومەر پێی سپاردوون ئەویش لە ئاکامی بەرفراوان بوونی دەوڵەت و پێویستی وڵاتە ڕزگارکراوەکان بۆ هەرکەسێ کە خەڵکەکەی فێری قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاك و بێگەردی پێغەمبەر(ﷺ)، سیاسەتی عومەر ئەوەی فەراهەم هێنا کە مەدینە بکاتە لانکەی فیقه و زانیاری و زانست و ماڵی خاوەن ڕایان و ڕاوێژکاران و ئەمەش دەلالەت دەکاتە سەر ئەو

---

١ـ المدينة النبوية فجر الاسلام و العصر الرشدي (٤٢/٢).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

سیاسەتەو ئەوەی کە إبن عباس ڕیوایەتی کردووە کە دەفەرموویت: من قورئانم بە هەندێ لە پیاوانی موهاجر دەوت لەوانە عبدالرحمن کوڕی عەوف، کاتێ کەمن لە ماڵەکەیدا بووم لە((مینا)) ئەولای عومەر بوو لە دواین حەجیدا کە بەجێی دەهێنا، کاتێ کە گەرایەوە بۆ لای عبدالرحمن فەرمووی: ئەمڕۆ پیاوێکم بینی کە هات بۆ لای عومەر ئەمیری باوەڕداران و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ئایا فلان کەست لا نیە، پاشان وتی: ئەگەر عومەر مردبا، بەیعەتم دەدایە فلان کەس و بەیعەتم نە دەدایە ئەبوبکر مەگەر پێخلیسکانێك بێ و تەواو بێت، ئەمە عومەری پەست کرد و فەرمووی: إن شاء الله من سەرەتای شەو لە نێو خەڵکیدا بەرز ڕادەگرم، بە ئاگایان دێنمەوە لەو کەسانەی کە دەیانەوێ کارەکانیان بە زۆر لێ داگیر بکەن عبدالرحمن دەفەرموویت: نا ئەی ئەمیری باوەڕداران، کاری وا مەکە ئەم وەرزە خەڵکی و کەتە کوتیان کۆ دەبنەوە و ئەوانەش هەر ئەو کەسانەن کە سەرکەوتوو دەبن لە نزیك بوونەوەت کاتێ کە تۆ لە نێو خەڵکی دەوەستی، من دەترسم هەستێ و شتێك بڵێیت کە هەموو باڵدارێکت لێ بفڕێنێ و لێی تێنەگەن و لە شوێنی خۆی دانەنێن، مۆڵەت بدە هەتا مەدینە ئەوە پێشکەش بکات کە شاری هیجرەت و سوننەتە و پاك بۆتەوە بە ئەهلی تێگەیشتن و پێشوازی خەڵکی، ئەوەی کە دەیفەرمووێت شتێکی گونجاو و شیاوە و زانایان لە وتەکانت تێدەگەن و لە شوێنی خۆی دایدەنێن عومەر فەرمووی: إن شاء الله یەکەمین شتێك کە لە مەدینەدا پێی هەڵدەستم ئەو کارە دەبێت.[1]

إبن حجر دەفەرموویت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خەڵکی شاری مەدینە پسپۆڕی زانیاری و زانست وتێگەیشتنن، هەروەها دەفەرموویت: ئەمە ڕاستە لە مافی خەڵکی ئەم سەردەمە کە سەردەمی دەسەڵاتی عومەرە و ئەو کەسانەش کە شان لە شانیان دەدەن و لەمەدا پێیان دەگەن و ناچار نابێت لە مەککە ئەمە لە هەموو سەردەمێکدا و لە لای هەموو تاکێك،[2] بەردەوام بێت، ئەوەی کە کاریگەری لەسەر ئەم سەدەیە کرد ئەو خوێندنگە زانستیانە بوون کە لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگەو بەرفراوان بوونی جەنگە ڕزگاریخوازەکان پەرەیان سەند، قوتابیانی قوتابخانەکەی عومەر تەنها لە مەدینە بوون زانستەکانیان هەر لە مەدینە بلاّو دەکەنەوە قوتابیەکان پێگەیشتن و بونە زانا بەهۆی نزیکیان لە سەرچاوەکەوە و مانەوەیان لە ژینگەی مەدینەدا، هەندێ لە قوتابیەکانی عومەر ڕەوانەی وڵاتە ڕزگار کراوەکان کران بۆ فێرکردن و شارەزا کردنی و پەروەردە کردنی ئەو گەلانەی کە دەهاتنە نێو ڕیزی ئیسلامەوە.

مەدینە شوێنێکی بەرزی لە زانیاری و شارەزایی دەرکرد و قوتابخانەی مەدینەش زۆر کاریگەرتر بوو لەو قوتابخانانەی کە لە شاری بەصرە و کوفە و شارەکانی تردا هەبوون و بە دوایی یەکداهاتنی بنکەکانی فیقه لە مەدینەدا بەم شێوەیە بوون:

- مەدینە شوێنی دابەزینی سروش و یاسا دانان بوو، لە سەردەمی ڕاشیدیدا هیچ وڵات و شارێك دووبەرەکی لەگەڵدا نەدەکرد.

---

١ـ البخاري، كتاب الحدود رقم ٦٨٣٠.
٢ـ الفتح (١٥٥/١٢)، المدينة فجر الاسلام (٤٦/٢).

- لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیدا مەدینە بنکەی هاوەڵانی شارەزا و تێگەیشتوو بووە، کە عومەر(ﷺ) لە سەروی هەموویانەوە بوو.

- عوسمان لە ساڵی ٣٥ ی کۆچیدا شەهید کرا و عەلی ڕوی لە کوفە کرد و لەگەڵ ئەوەشدا مەدینە بە بنکەی زانایان و موفتیان مایەوە بەهۆی درێژی تەمەنی هاوەڵانی شارەزاوە، لە مەدینە و هەتا هەندێکیان زیاتر لە نیوەی سەدەی یەکەمیان ئاوەدان کردەوە کە بریتی بوون لە: عائیشە و ئەبو هریرە و جابری کوڕی عبداللە و إبن عمر و سعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەند کەسێکی تر.

قوتابخانەی گەورە شوێنکەوتووان لە مەدینە پەرەی سەند و لەوانە حەوت شارەزا کە هاوشێوەیان نەبووە لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا ئەو حەوت کەسەش لەم دێڕە هۆنراوەیەدا ناویان هاتووە:

ألا كل من لا يقتدي بأئـــمة ... فقسمته ضيزى عن الحق خارجه

فخذهم عبيد الله عروة قاسم ... سعيد أبو بكر سليمان خارجـه

پاشان سەردەمی ئیمام مالك هات کە تابعینی تابعین بوو، ئەو شارەزاترین کەسانێك بوو بەزانیاری یەك لەوانەی پێش خۆی لە گەورە و بچووکی تابعین.

پێویستی خەڵکی ناوچەکانی تر بۆ حیجاز وکۆچ کردنیان بۆ مەدینە لە داوا کردنی ئەوەی کە لە ناوچەکانی تردا نەناسراوە شاهیدی لەسەر زانایی خەڵکی مەدینە دەدەن، بە دڵنیاییەوە زانایانی ناوچە ئیسلامیەکانی تر ڕویان دەکردە مەدینە لەپێناو بەدەست هێنانی زانیاری و زانست و نیشاندانی ئەوەی کە هەیانە لەسەر زاناکانیان چونکە ئەوان سەرچاوە بوون لەم کاروبارەدا، زانایانی مەدینە هەروەك دادوەر و مامۆستا ڕویان لە ناوچەکانی تر دەکرد،[1] سەرەتا لەو کەسانەوە کە عومەر(ﷺ) دەینارد لە کاتی فەتحی شام و عێراق هەتا خەڵکی فێری قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) بکەن بەم شێوەیە عبداللە کوڕی مەسعود و حوزەیفەی کوڕی یەمان و عمران کوڕی حەصین و سەلمانی فارسی و چەند کەسێکی تر بەرەو عێراق هاتن و هەریەکە لە موعازی کوڕی جەبەل و عوبادەی کوڕی صامت و ئەبو دەرداء و بلال کوڕی ڕەباح و... بەرەو شام هاتن و لای عومەریش عوسمان و عەلی و عبدالرحمن کوڕی عەوف و ئوبەی کوڕی کەعب و محمد کوڕی موسلم و زەیدی کوڕی ثابت و چەند کەسێکی تر مانەوە، إبن مسعود زۆرباش دەیزانی کە لە یاران ئەو دەمە کێ لە عێراقدا بووە ئەو فتوای دەدا و پاشان دەهاتە شاری مەدینە و پرسیاری لە شارەزایانی خەڵکی مەدینە ئەوانیش لەسەر قسەکەی خۆی دەیان گێڕایەوە پاشان دەگەرایەوە بۆ لایان،[2] بەڕاستی قوتابخانەی مەدینە لە تەواوی قوتابخانەکانی تر بە جۆش تر بوو، تەواوی ناوچەکانی تر جگە لە کوفە دەنوکیان لە زانیاری و زانستی ئەهلی مەدینە دەداو لێهاتوویی و بە توانایی خۆیان لە زانیاری و زانستدا نەدەهەژمارد وەك ئەهلی شام و میسر بە وێنەی ئەوزاعی و ئەوەشی لە پێش و دوای ئەوەوە هاتوون لە شامیەکان. بەوێنەی لەیسی کوڕی سعدو

---

١ـ المدينة النبوية فجر الاسلام و العصر الاشدي (٢/٤٧).

٢ـ الفتاوى (٢٠/١٧٦).

ئەوانەی کە لەپێش و دوای هاتوون لە میسریەکان، دیارە گەورە کردنیان بۆ کاری خەڵکی مەدینە و شوێن کەوتوانی بۆ مەزهەبە کۆنەکانیان ڕون و ئاشکرایە، هەروەها زانایانی خەڵکی بەسرەش وەك ئەیوب و حمادی کوڕی زەید و عبدالرحمن کوڕی مەهدی و هاوشێوەکانیان، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە مەزهەبی خەڵکی مەدینە لەو ناوچانەدا دەرکەوتن.[١]

متمانەی خەڵکی ناوچەکانی تر بەرامبەر زانیاری و شارەزایی خەڵکی مەدینە وای لێکردوون کە لێی بێنە پێشیێ لە هەموو زانیاریەکدا کە خەتیبی بغدادی دەیگێڕێتەوە: محمد کوڕی حسن شەیبانی ئەگەر باسی ئیمام مالکی بۆ بکردنایە ئەوا ماڵەکەی پڕ دەبوو لە خەڵکی، بەڵام ئەگەر باسی کەسێکی تری بۆ بکردنایە خەڵکانێکی کەم نەبێت کەس نەدەهات بە دەمیەوە، بۆیە دەیوت: کەسێك ناناسم لە ئێوە کە بەخراپی هاوەڵێکیدا هەڵبدات، من کە باسی ماڵێکتان بۆ دەکەم ماڵەکەم پڕ دەکەن بەڵام کە باسی کەسێکی ترتان بۆ دەکەم لە هاوەڵانی خۆتان ئەوا بە ڕق لێبونەوە دێنەلام .[٢]

خەڵکانی دەرەوەی مەدینە بە ڕێژەی ئەو زانیاری شارەزایی یەی کە لە خەڵکی مەدینەیان وەردەگرت ڕێزدار دەبوون لە شارەزایی خەڵکی مەدینەشدا پێوەرێکیان بۆ پێشکەوتن خوازی دەدی، موجاهید و عەمری کوڕی دینار و چەند کەسێکی تر لە خەڵکی شاری مەککە دەڵێن کاروباری ئێمە هاوشێوە و هاوشانی کاروباری خەڵکی مەدینە نەبوو هەتا ئەو دەمەش کە عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح هاتە مەدینە و هەر کە گەرایەوە فەزڵی خۆی ڕون کردەوە بەسەرماندا.[٣]

لە هۆکارەکانی بونی ئەو گەنجینە فیقهە گەورەی مەدینە لە ڕۆژانی دەسەڵاتی عومەردا پێی بەختەوەر بوون کەسایەتی کارامەو لێهاتوی عومەر بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بەمە شاهیدی بۆ داوە.

عومەر کارێکی وای کردووە کە لە پایتەختی دەوڵەت قوتابخانەیەك هەبێت و چەندین زاناو بانگخواز و دادوەر بە پلەی بەرزەوە تیایدا دەربچن، ئەگەر سەرنجێکمان دا لە قوتابخانە یەکەمینەکانی جیهانی ئیسلامی ئەوا شوێنەواری عومەرییان لەسەر بەدی دەکەین لەبەر ئەوەی کە تەواوی دامەزرێنەران- تا ڕادەیەك-کاریگەربوون بە شارەزایی عومەری فاروق(ﷺ)، ئەمەش چەند پوختەیەکی کورتە دەربارەی ئەم قوتابخانانە:

## ١- قوتابخانەی مەککە:

ئەم قوتابخانەیە شوێنی خۆی لە دڵی مەککەییەکان و نیشتەجێ بووان و ئەوانەی کە بۆ سەردان دەهاتنە کەعبە و حاجی و عومرەچییان و میوانان، بەڵکو مەککە ئەقڵ و هۆشی هەموو ئەو باوەڕدارانەی دەگرت کە دەیان بینی یان خوازیار بوون کە لە نزیکەوە ببیینن، هەروەها زانیاری و زانست لە مەککەدا و لە سەردەمی یاراندا بەڕێوە دەچوو و پاشان لە کۆتاییەکانی سەدەی ئەواندا و لە سەردەمی تابعینیشدا ڕوی لە زیاد بوون کرد، لە سەردەمی یارانی وەك إبن أبی نجیح و إبن جورەیج[٤]

---

١ـ الفتاوی (٢٠/١٧٤).

٢ـ المدینة النبویة فجر الاسلام و العصر الراشدي (٢/٤٨).

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ الاعلان و التوبیخ لمن ذم التأریخ (ص: ٢٩٢).

بوو ئەوە نەبێ کە مەککە لە سەردەمی تابیعین تایبەت بوو بە گەوهەری ئومەو تەرجومانی قورئان إبن عباس کە هەمو تواناو کۆششێکی خستۆتە کار و مەبەستی هەوڵ و تێکۆشانی بۆ زانستی ڕاڤەی قورئان بووە و یارانی لەسەر ئەوە پەروەردە کردووە کە لە نێوانیاندا چەند ئیمام و پێشەوایەك هەن کە لە ڕیزی پێشەوەی قوتابیانی قوتابخانەکانی تردا بوون لە ڕاڤەی قورئاندا، زانایان کۆمەڵێ هۆکاریان باس کردووە کە بوۆتە هۆی پێشکەوتنی قوتابخانە و گرینگترینی ئەو هۆکار و بنەمایانەی کە تیایدا هاتووە پێشەوایەتی إبن عباس و مامۆستاکانی بووە بۆی،[1] زانایان دەربارەی کۆمەڵێك لەو هۆکارانە ئیمامەتی إبن عباس بەوە ناساندوە کە زانا و بە توانا بوە لەم بوارەدا ،یارمەتی یارانیشی داوە لە تێگەیشتنی قورئان و بەتوانا بووە بەسەر ڕاڤەی قورئاندا و ئەمەش بەکۆی دەنگ بریتی بووە لە دوعای پێغەمبەر(ﷺ) بۆی بە شارەزا بوونی لە دین ، وەرگرتنی زانست لە گەورە هاوەڵان، بەهێزی لەسەر هەڵێنجان،بایەخدانی بە تەفسیر و پەیڕەوی نایاب و جیاخوازی لە فێرکردنی یارانیدا و سوربوونی لەسەر بلاوکردنەوەی زانیاری و زانست و گەشت و گوزارەکانی و تەمەن درێژی و نزیکی ماڵەکەی لە عومەر(ﷺ).[2] هەروەها عومەرەگرنگی تایبەتی پێداوە کاتێ کە جلەوی پیاو سالاری و زیرەکی و بەتوانایی و لێهاتوویی تیا بەر دەست کەوت، عومەر هەمیشە دەیبردە نێو کۆڕو کۆبوونەوەکانی و لەخۆیی نزیك دەکردەوە و ڕاوێژی پێ دەکرد و لەو ئایەتانەشدا کە گرفت و کێشەی هەبوو ڕای إبن عباسی وەردەگرت و لەو دەمەش إبن عباس لاو بوو. بۆ ئەمەش کاریگەری یەکی لە ڕادەبەدەر هەبوو لە پاڵنەری و هاندانی لەسەر پێشکەوتن و فەراهەم هێنان، بەڵکو زۆرتر کردن لە بەشی تەفسیر و بەشەکانی تری زانیاری و زانست، لە عامری شەعبی لە إبن عباسەوە هاتووە کە دەفەرمووێت: باوکم پێی وتم: کوڕەکەم، دەبینم ئەمیری باوەڕداران لێت نزیك دەبێت و پشتت پێ دەبەستێ ڕاوێژت پێ دەکات لەگەڵ خەڵکانێك لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) ، لە منەوە سێ شت لەبەر بکە: لە خوا بترسە ێنی،و هەرگز نهێنی نەدرکێنی، با درۆت لەدەم دەرنەچێ، لای خەلیفە هەرگیس غەیبەتی کەس نەکەیت،[3] عومەر(ﷺ) ئەیبردە نێو کۆڕی گەورە هاوەڵان، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە بووە کە هێزی تێگەیشتن و نایابی بیر و بۆچوونی تیا بەدی دەکرد و لە هەڵنجانیش ورد بوو، هەروەها إبن عباس(ﷺ) دەفەرمووێت: عومەر لەگەڵ یارانی محمد(ﷺ) پرسیاری لێ دەکردم و هەموو جارێ پێی دەوتم هیچ مەڵێ هەتا ئەوان قسە دەکەن، هەر کە قسەم دەکرد دەیفەرموو: ئێوە لە منتان بردۆتەوە ئەگەر بتوانن ئەوەم بۆ بهێنن کە ئەم لاوە هێناویەتی و کەهێشتا مێشکی[4] کۆ نەبۆتەوە، إبن عباس لەبەر بەتوانایی ئەدەبی ئەگەر لە کۆڕێکدا دابنیشتایە و لە خۆی گەورەتری تێدا بوایە قسەی نەدەکرد هەتا مۆڵەتیان پێ دەدا ، عومەریش ئەمەی لێوەرگرتبوو بۆیە هانی دەدا لەسەر قسەکردن بۆ وریا کردنەوە و چالاککردنەوەی دەرونی و ئەمەش دەبوویە هاندەرێك بۆی لە بەدەست

---

١ـ تفسر التابعين (٣٧١/١) د. محمد الخضري.

٢ـ هەمان سەرچاوە (٣٧٤/١-٣٩٥).

٣ـ الحلية (٣١٨/١) تفسير التابعين (٣٧٦/١).

٤ـ المستدرك (٥٣٩/٣) و صحيح إسناده الحاكم و وافقه الذهبي.

هێنانی زانیاری و زانستدا، [١] هەروەك ئەوەی کە ئەو لەگەڵماندا مانای ئەو ئایەتەی لێکدایەوە کە دەفەرموێت: ﴿أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ (البقرة: ٢٦٦).

ئایەتی:

﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴾ (النصر: ١).

عومەر خەڵکانێکی لەلا بوو کە تیایدا گوێی لە لاوان دەگرت و فێری دەکردن و ئەو دەمە إبن عباس لە پێشەوەی ئەو کەسانەوە بوو کە لای عومەر بوون، عبدالرحمن کوڕی زەید دەفەرموێت: عومەر(ﷺ) ئەگەر نوێژی ستایشی بکردایە و هەر کە لێبوایەتەوە دەچوویە شوێنەکەی خۆی و دەینارد بە دوای چەند لاوێکدا کە قورئانی بۆ بخوێنن لەوانە إبن عباس، دەیفەرموو: ئەوان دەهاتن و قورئانیان دەخوێند و دەیان وتەوە، کاتی چێشتنگا کە دەهات ئیتر هەرکەس دەچوو بەدوای ئیشی خۆیدا، کە ئەم ئایەتەش دەخوێنرایەوە:

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ (البقرة: ٢٠٦،٢٠٧).

إبن عباس بە هەندێك لە کەسەکانی دەوروبەری فەرموو: دوو پیاو بوویە شەڕیان، عومەر گوێی لێ بوو، کە چی ی وت: فەرمووی: ئەوە چیت وت؟ فەرمووی: هیچ ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: چیت وت دوو پیاو بوو بە شەڕیان؟ فەرمووی: کاتێ بینی إبن عباس هاتە گۆ و فەرمووی: من لێرەدا کەسێك دەبینم کە ئەگەر فەرمانی پێ بکرێت بە لە خوا ترسان دەمارگیری دەیگرێت بۆ بەد کاری و من کەسێك دەبینم ئەگەر گیانی بفرۆشێت بۆ ڕەزامەندی خوا، ئەوا ئەمەیان هەڵدەستێ و فەرمان دەدات بەسەر ئەوی تریاندا بە لە خوا ترسان ئەگەر بێت و پەسەندی نەکات ئەوا دە جار دەیگرێ بۆ بەد کاری، فەرمووی: ئەوە منم زو گیانی خۆم دەکڕم! بە گژیدا چوویەوە، دوو پیاوەکە بوو بە شەڕیان، عومەر فەرمووی: ڕکە بەریت بۆ خودا بێت ئەی إبن عباس، [٢] هەروەها عومەر سەبارەت بە شتێك لە قورئان پرسیاری لە إبن عباس دەکرد و پاشان دەیفەرموو: مەلەوانەکە پارچە پارچە بوو، [٣]

---

١ـ تفسير التابعين (٣٧٧/١).

٢ـ تفسير الطبري (٢٤٥/٤) الدر المنثور (٥٧٨/١).

٣ـ فضائل الصحابية لأحمد (٩٨١/٢) ١٩٤٠.

عومەر ئەگەر گرفتێکی بۆ پێش هاتبا بە إبن عباسی دەفەرموو: ئەی إبن عباس: کت و پڕ چەند کێشەیەکی دژوار ڕووی تێکردین و تۆش بۆ ئەوە و هاوشێوەکانیشی، پاشان عومەر ڕای إبن عباسی وەردەگرت، جگە لە إبن عباس بۆ ئەمە کەسی تری بانگ نەدەکرد ئەگەر دژوار بوایە،[1] سعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەفەرمووێت: کەسێکم نەبینیوە کە تێگەیشتنی ئامادە و ئەقڵی پوخت زانیاری زیاتر و نەرم و نیانتر بێت لە إبن عباس، من عومەرم بینی کە إبن عباسی بانگ دەکرد بۆ گرفتە دژوارەکان پاشان دەیفەرموو: لای خۆت گرفتێکت بۆ هاتووە پاشان قسەکەی تێنەپەڕاند و ژمارەیەك لە بەشداربووانی جەنگی بەدری لە ئەنصار و موهاجرەکانی لە دەوروپشت بوو،[2] عومەر پێناسەی دەکردو دەیفەرموو: ئەمە لاوێکی بەساڵا چووە لە نێو ئێوەدا کە زمانێکی پرسیاراوی و دڵێکی ژیری هەیە،[3] طلحەی کوڕی عوبەیداللە دەفەرمووێت: کەسم نەبینی لە عومەری کوڕی خەتاب بیخاتە پێش إبن عباس،[4] إبن عباس(ﷺ) زۆر پەیوەستی عومەر بوو سور بوو لەسەر ئەوەی کە پرسیاری لێ بکات و زانیاری لێ وەربگرێت، لەبەر ئەوە إبن عباس(ﷺ) لە زۆرترینی ئەو هاوەڵانە بوو کە ڕیوایەتی تەفسیرو زانیاری عومەری کردووە، هەندێ لە زانایان ئاماژە بەوە دەکەن کە إبن عباس تەواوی زانیاری یەکانی لە عومەرەوە وەرگرتووە و خوای گەورەش لە هەمووان ڕازی بێت،[5] ئەمەش هەندێ لەو شتانەیە کە إبن عباسی پێش نوێژی قوتابخانەی مەککە بوو لە بایەخی عومەر و نزیك بوونەوە لێی، گومان دەکەم کە ئەمە هاوکاری إبن عباسی کردووە و هانی داوە بۆ ئەوەی کە پێشتر تێپەڕیوە لە ڕێگەی زانیاری بە گشتی و تەفسیر بە تایبەتی.[6]

## ٢- قوتابخانەی مەدینەیی:

باسی بایەخی عومەرمان کرد سەبارەت بە شاری مەدینە کە کردیە مەڵبەندی فتوا و شارەزایی و زانیاری و زانست، بەناوبانگترین ئەو کەسانەی کە لە مەدینەدا خۆیان یەکلایی کردبوویەوە بۆ ژیانی زانستی زەیدی کوڕی ثابت(ﷺ) بوو، کە عومەر(ﷺ) لە مەدینەدا هێشتیەوە هاوەڵانی زۆر بوون، إبن عمر(ﷺ)دەگێڕێتەوە عومەر یارانی بە نێو شارەکاندا بڵاوکردەوە و زەیدی کوڕی ثابتی لە مەدینە هێشتەوە بۆ ئەوەی فتوا بۆ خەڵکەکەی بدات، حەمیدی کوڕی ئەسوەد دەفەرمووێت: خەڵکی مەدینە دوای هیچ رایەك نەدەکەوتن رای زەیدی کوڕی ثابت نەبێت ،هەروەك ئەوەی کە لاسایی مالکیان[7] دەکردەوە، یەکێك بوو لەو یارانەی کە خوای گەورە هاوەڵانی وا لێکردبوون وتەکانی لەبەر

١ـ تفسير التابعين (٣٧٩/١).
٢ـ طبقات إبن سعد (٣٦٩/٢).
٣ـ تفسير التابعين (٣٧٩/١) فضائل الصحابه لأحمد رقم ١٢٥٥.
٤ـ طبقات إبن سعد (٣٧٠/٢).
٥ـ تفسير التابعين (٣٨١/١).
٦ـ تفسير التابعين (٥٠٦/١).
٧ـ العلل لأحمد (٢٥٩/٣) ٥١٤٥, تفسير التابعين (٥٠٦/١).

بکەن و زانیاری و زانست و شوێنەواری پاش خۆی[1] بلاو بکەنەوە، عومەری شەعبی(ﷺ)دەفەرموویت: زەید خەلکی سەرخست بەسەر دوو شتدا: بەسەر فەرزەکان(میرات) و بەسەر قورئاندا،[2] لە زانستی میرات دا پێغەمبەر(ﷺ) شاهیدی بۆ زەید داوە و فەرموویەتی: (( زەیدتان لەسەر دادەنێم))،[3] زەید هاوەڵی هەندێ لە شارەزایانی شاری مەدینەی کردووە، شەش کەس لە یارانی و ئەوانەی زانیاریان لێوەرگرتووە لە تابعین ناوبانگیان دەرکردووە، إبن مەدینی دەفەرموویت: هەندێ کەس بە زەید گەیشتوون، ئەوانەی کە پێی گەیشتوون: سەعیدی کوڕی موسەیب و عروەی کوڕی زوبێر و قەبیسەی کوڕی زوئەیب و خارجەی کوڕی زەید و ئەبانی کوڕی عوسمان و سولەیمانی کوڕی یەسار[4] بوون، قوتابخانەی مەدینە کاریگەری گەورەی هەبووە لە نێو قوتابخانە زانستی یەکانی تر هەروەك ڕونمان کردەوە.

## ٣- قوتابخانەی بەسرە:

یەکەمین کەس کە بەسرەی کردە شار عوتبەی کوڕی مەروان(ﷺ) بوو، لە ساڵی ١٤ی کۆچیدا هەنگاوی بۆ ناو بەشێوەیەکی ترش باسی دەکەن، بە فەرمانێك لە عومەر(ﷺ) و بە یارمەتی خوای گەورە لە کاتی باسەکەمان بۆ گەشەکردنی بیناسازی لە سیاسەتی عومەردا باسی لێوە دەکەین، بەسرە سێ[5] ساڵ لەشاری کوفە کۆنترە و کێ بەرکێ کاری قوتابخانەی کوفەیە لە هەموو هونەرەکانیدا، ژمارەیەکی زۆری هاوەلان تیایدا ژیاون،[6] لەوانە ئەبو موسی ئەشعەری و عمران کوڕی حەصین (ﷺ) و چەند هاوەڵێکی تر کە دوایینیان ئەنەسی کوڕی مالك بوو،[7] بەلام ئەبو موسی لەوانە بووە کە هاتۆتە مەککە و موسوڵمان بووە و لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کە کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە کۆچی کردوە، ئەبو موسی بە یەکێك لە شارەزاترین هاوەلاندێتە هەژمار پاشان هاتۆتە شاری بەسرە و لەوێ فێری زانیاری و زانست بووە،[8] ئەبو موسی زۆر بە عومەر کاریگەربووە و لە نێوانیاندا نامە گۆڕینەوە هەبوو.، بەیارمەتی خودا لە کاتی باسکردنمان سەبارەت بە دەزگای والی و دادوەرەکان باسی لێوە دەکەین، ئەبو موسا ناوبانگی بە زانیاری و زانست و لە خوا ترسان و شەرم و سەربەرزی و دەروون پاکی و خواپەرستی لە دونیا و دامەزراوی لەسەر ئیسلام و بەندایەتی دەرکردووە، ئەبوموسا بە یەکێك لە گەورە زانایانی هاوەلان و شارەزاترینیان و فتوا دەرترینیشیان دێتە هەژمار، زەهەبی لە یاداشت نامەی پارێزەردا لە چینی یەکەم و لە ڕیزی یاران(ﷺ) باسی دەکات و لەبارەیەوە دەفەرموویت:

---

١ـ تفسير التابعين (٥٠٦/١).
٢ـ تهذيب تأريخ دمشق (٤٤٩/٥) تفسير التابعين (٥٠٨/١).
٣ـ سنن الترمذي قال الترمذي: حديث حسن صحيح رقم ٣٧٩١.
٤ـ تفسير التابعين (٥٠١/١).
٥ـ هەمان سەرچاوە (٤٢٢/١).
٦ـ عدّ إبن حيات أكثر من٥٠ صحابياً من المشاهر الذين دخلوا البصرة هەمان سەرچاوە.
٧ـ طبقات إبن سعد (٢٦/٧)، مسلم (٦٥/١).
٨ـ تفسير التابعين (٤٢٣/١).

زانایەکی کارکەری باش و شوێنکەوتەی قورئان بووە و دەنگێکی زولاڵی هەبووە لە قورئان خوێندن و زانیاری یەکی باش و پیرۆزی ڕیوایەت کردووە و قورئانی بەخەڵکی بەسرە وتوەتەوە و شارەزای کردوون لە ئاین،[١] هەروەها زۆر پەیوەستی پێغەمبەر(ρ) بووە، هەروەك چۆن لەگەڵ گەورە یارانی وەك عمر و عەلی و ئوبەی کوڕی کەعب و عبداللە ی کوڕی مەسعود بەیەکگەیشتوون و هەروەها ئەبو موسای ئەشعەری زۆرکاریگەربووە بەتایبەتی و بەزۆریش بە عومەر، عومەر هەمیشە و کاتێ کە کردبوویە والی بەصرە ئامۆژگاری و نامەی بۆ دەنارد و هەروەها ئەبوموساش لە هەموو گرفتێکدا کە دەهاتە ڕێگەی دەگەڕایەوە بۆ لای عومەر هەتا عومەری شەعبی بە یەکێك لەو چوار دادوەرەی دێنێتە هەژمار کە لە بەناوبانگترین دادوەرانی ئومەتی ئیسلامین، شەعبی دەفەرموێت: ئەم چوار دادوەرە: عومەر و عەلی و زەیدی کوڕی ثابت و ئەبوموسای ئەشعەرین.[٢]

ئەبوموسی هەر، کە دەهات بۆشاری مەدینە خۆی دەگەیاندە لای عومەرو دانیشتنەکانی و زۆربەی کاتی خۆی لە مەدینە لای عومەر بەسەر دەبرد، ئەبوبکر کوڕی ئەبوموسی دەفەرموێت: ئەبوموسا پاش نوێژی خەوتنان هات بۆ لای عومەر، ئەویش پێی فەرموو: چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟ ئەبوموسا فەرمووی: هاتووم قسەت لەگەڵ بکەم، عومەر دەفەرموێت: لەم کاتەی شەودا، ئەبوموسا فەرمووی: ئەمە تێگەیشتنە، عومەر دانیشت پێکەوە بۆ ماوەیەکی زۆر قسەیان کرد پاشان ئەبو موسا فەرمووی: کاتی نوێژە ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: ئێمە لە نوێژداین،[٣] ئەبو موسا هەرچۆنێك سوور بووە لەسەر داواکردنی زانیاری و زانست و فێربوونیش هەرواش سووربوە لەسەرئەوەی کە خەڵکی فێر بکات و بە باشی شارەزایان بکات، هەروەها لە وتارەکانیدا هانی خەڵکی دەدا بۆ فێر بوون، ئەبی مەهلەب دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: گوێم لە ئەبوموسا بوو لەسەر مینبەرەکەی دەیفەرموو: هەرکەس خوای گەورە زانیاری یەکی پێدا با فێری ببێت، لە شتێکدا کە زانیاری نی یە با قسە نەکات چونکە ئەو دەمە لە چینی زۆر لە خۆ کردوان دەبێت و لە ئاین دەردەچێت،[٤] ئەبوموسا مزگەوتی بەسرەی کردبوویە مەڵبەندی چالاکیە زانستی یەکانی و بەشێکی زۆری ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ کۆڕە زانستی یەکان، ئەبوموسا هەر بەوەشەوە نەدەوەستا و ڕێگەی نەدەدا کە کاتی بەبێ سود بڕوات، لە فێرکردن و شارەزاکردنی خەڵکدا سودی لێ وەردەگرت، هەر کە لەنوێژەکەی دەبویەوە و سڵاوی دەدایەوە دەست بەجێ لە خەڵکی دەچووە پێشێ و دەستی دەکردە فێرکردنیان و ڕێك و پێك کردنیان لە خوێندنەوەی قورئان، إبن شوذەب دەفەرموێت: ئەبو موسا هەر کە لە نوێژی بەیانی دەبویەوە ڕیز بە ڕیز دەهاتە لای پیاوان و قورئانی بۆ دەخوێندنەوە[٥]،ئەبوموسا لەنێو یارانیدا بەڕێکی و پێکی و دەنگ خۆشی ناوبانگی دەرکردبوو، کاتێ کە قورئانی دەخوێند خەڵکی لێی کۆ دەبوونەوە و

---

١- تذكرة الحفاظ (٢٣/١).
٢- سير أعلام النبلاء (٣٨٩/٢).
٣- أبو موسى الاشعري الصحابي العالم المجاهد, محمد طهماز (ص: ١٢١).
٤- الطبقات (١٠٧/٤).
٥- سير أعلام النبلاء (٢٨٩/٢).

گوێیان لێ دەگرت، هەر کاتێ کە لەلای عومەر دادەنیشت عومەر داوای لێ کرد کە هەندێ قورئانی بۆ بخوێنێ،[١] خوای گەورە ئەبو موسای ساز کردبوو بۆ فێرکردنی موسوڵمانان و ئەویش بە هەموو توانایەکی هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی خەڵکی فێری قورئانی پیرۆز بکات و لەنێو خەڵکیدا و لە هەموو ئەو شوێنانە وا بلاو بکاتەوە کە ڕووی لێ دەنا، ئەبو موسا لەم کارەیدا پشتی بە دەنگی زوڵاڵی و خوێندنەوە پاراوەکەی دەبەست و بەمەش خەڵکی لێ کۆدەبویەوە، لە دەوری فێرخوازانی زانستی مزگەوتی بەسرە دەبوویە قەرەباڵغی و ئەویش دابەشی دەکردن بۆ چەند گروپ و ئەڵقەیەك، ئەو بەردەوام بە دەوریاندا دەسوڕایەوەو گوێی بۆ دەگرتن و گوێی لێ دەگرتن و خوێندنەوەکەیانی بۆ ڕێك و پێك دەکردن،[٢] بەڕاستی قورئان بە تەواوی ئەبوموسای سەرقاڵ کردبوو، زۆربەی کاتەکانی تەمەنی لە دانیشتنی و لە سەفەریدا بۆ تەرخان دەکرد، ئەنەسی کوڕی مالك دەفەرمووێت: ئەشعەری ناردمی بۆ لای عومەر(ﷺ) ئەویش پێی فەرمووم: چۆن ئەشعەریت بەجێ هێشت؟ وتم: جێم هێشت کە خەڵکی فێری قورئان بکات، عومەر فەرمووی: بەڵام ئەو تێگەیەنەرە و کەس وەك ئەو گوێی بۆ ناگرێ،[٣] تەنانەت کاتێ کە ئەڕوات بۆ جیهاد بەردەوام خەڵکی فێر دەکات و شارەزایان دەکات، خەتتابی کوڕی عبداللە ڕەفاسی دەفەرمووێت: ئێمە لەگەڵ ئەبوموسای ئەشعەری(ﷺ) بووین لە ڕیزی سوپادا لە کەنار ڕوباری دیجلە، ئەگەر کاتی نوێژ بهاتایە بانگبێژەکەی بانگی دەدا و خەڵکی هەڵدەستان بۆ دەست نوێژ گرتن و خۆیشی دەست نوێژی دەگرت و پاشان نوێژی دەخوێند و دواتر بە شێوەی بازنەیی دادەنیشتن، کاتێ کە کاتی نوێژی عەسر دەهات و بانگبێژ بانگی دەدا و ئەبوموساش پێی دەفەرموو: ئەوەی دەست نوێژی هەیە با دەست نوێژ نەشوات، ئەبوموسی(ﷺ)هەوڵی زانستی یانەی خۆی بەردار دەکرد و چاوی دەگەشایەوە بە بینینی ئەو ژمارە گەورەیە لە خوێنەرانی قورئان و زانایانی لە دەوروبەری بوون و تەنها لە شاری بەصرە ژمارەیان گەیشتە ٣٠٠ سێ سەد کەس، کاتێ کە عومەر نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی نووسی هەتا ناوی ئەو کەسانەی بۆبنێرن، کە قورئانیان لەبەر کردووە، تا خەڵاتیان بکات و ڕێزیان لێ بگرێ، ئەبو موسا لە نامەیەکدا کە بۆعومەر(ﷺ) نوسیبوو ژمارەی ئەو کەسانەی لای ئەو سێ سەد(٣٠٠) و هەنتر.[٤] هەروەها ئەبوموسی(ﷺ) بایەخی داوە بە سوننەت و گێڕانەوەشی لە پێغەمبەر(ﷺ) یشەوە زۆر فەرموودەی ڕیوایەت کردووە هەروەك ئەوی کە لە گەورە یارانیشەوە(ﷺ)فەرموودەی تری گێڕاوەتەوە لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان و تابعینەکان فەرموودەیان گێڕاوەتەوە زەهەبی-ڕەحمەتی خوای لێ بێ- بەریدەی کوڕی حەسیب و ئەبو ئومامەی باهلیو ئەبوسعیدی خدری و ئەنەسی کوڕی مالك و طارق کوڕی شەهاب و سەعیدی کوڕی موسەیب و ئەسوەدی کوڕی یەزید و ئەبودائل شەفیق کوڕی سەعد و ئەبو عوسمانی نەهەدی و کەسانی ترش

---

١ـ أبو موسى الاشعري الصحابي العالم (ص: ١٢٥-١٢٦).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٢٧).
٣ـ أبو موسى الاشعري الصحابي العالم (ص: ١٢٨).
٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٢٩).

فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە،[١] ئەبو موسی زۆر بە توندی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ی گرتووە و بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوە بووە کە لەکاتی مردنیدا وەسێتی بۆ منداڵەکانی کردووە کە بایەخی پێ بدەن، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر سوور بووە لەسەر سوننەت بەڵام ڕیوایەتی زۆری فەرمووده پیرۆزەکانی نەکردوە هەروەك ئەوەی کە گەورە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) کردوویانە و ترساون لە فەرمووده گێڕانەوە لە پێغەمبەر(ﷺ)، لە ترسی لادان و هەڵە کردن، عومەر وەسیەتی بۆ کاربەدەستەکانی دەکرد کە بایەخ بدەن بە قورئان و زۆر شۆڕنەبنەوە بە ڕیوایەتی سوننەت. ئەبو موساش نەبەردانە ملکەچی عومەری دەکرد،[٢] ئەنەسی کوڕی مالکی نەجاری خەزرەجی کە خزمەتکاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو بەوە ناوزەدکراوە و شانازی پێوە کردووە و ئەمەش مافی خۆی بوو،[٣] ئەنەس(ﷺ)دەفەرموێت: ماوەی دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) کردووە و من منداڵ بووم،[٤] هەروەها دەفەرموێت: کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) هات من تەمەنم ١٠ ساڵان و کاتێ وەفاتی فەرموو من تەمەنم ٢٠ ساڵان بوو،[٥] پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بۆ کردووە بە ماڵ و منداڵ زۆری بەرەکەتیان لە تەمەن و فەرموویەتی:(( خوای گەورە ماڵ و منداڵی زۆر بکەیت و بەرەکەتیان تێ بخەیت))،[٦] زەهەبی دەفەرموێت: خاوەنی فێرکردن دەربارەی٢٠٠ دوو سەد کەس لەوانەی فەرموودەیان لە ئەنەسەوە گێڕاوەتەوە بەڵگەی هێناوەتەوە و[٧] ئەنەس(١٢٨٠) هەزار و دوو سەد و هەشتا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، بوخاری و مسلم پێکەوە کۆکن لەسەر ١٨٠ فەرمووده و بوخاری بەتەنها(٨٠) هەشتا فەرمووده و موسلیمیش بەتەنها(٩٠) نەوەد فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوە،[٨] ئەنەسی کوڕی مالك بە مامۆستای گەورە زانایانی تابعینی وەك: حەسەنی بەسری و سولەیمانی تیمی و ثابت بەناتی و زەهریی و ڕەبیعەی کوڕی ئەبو عبدالرحمن و إبراهیم کوڕی قەیسەرەو یەحیا کوڕی سەعیدی ئەنصاری و محمد کوڕی سیرین و سەعیدکوڕی جوبەیر و قەتادە و ئەوانی تریش دێتە هەژمار،[٩] ئەنەس بایەخی دەدا بە گێڕانەوە و فێربوونی سوننەت و سیفەتی زانستیش سەرکەوتووە بەسەریدا و هەستاوە بە هەندێ کاری گرنگ لە خزمەتی خەلیفەکانی ڕاشیدی و خەلیفەکانی ڕاشیدیش هەندێ پۆستی بەرزیان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا پێداوە بەتایبەتی لە سەردەمی ئەبوبکر و عومەردا (ڕەزای خوایان لەسەر بێت)، کاتێ ئەبوموسای ئەشعەری(ﷺ) لە سەردەمی عومەردا کرایە والی بەصرە ئەنەسی لە خۆی نزیك کردەوە و بە یەكێك لە پیاوە

---

١ـ سیر أعلام النبلاء (٣٨١/٢).
٢ـ أبوموسی الاشعري الصحابي العالم المجاهد (ص: ١٣٢).
٣ـ تهذیب الاسماء و اللغات (١٢٧/١).
٤ـ تفسیر التابعین (٤٢٣/١).
٥ـ مسلم رقم ٢٠٢٩.
٦ـ مسلم رقم ٢٤٨٠.
٧ـ سیر أعلام النبلاء (٣٩٧/٣).
٨ـ هەمان سەرچاوە. (٤٠٦/٣), تفسیر التابعین (٤٢٣/١).
٩ـ أنس إبن مالك الخادم الامین, عبدالحمید طهماز (ص: ١٣٥).

تایبەتەکانی خۆی هێنایە هەژمار ثایتی کوڕی ئەنەس دەفەرمووێت: ئێمە لەگەڵ ئەبوموسا لە ڕێگەدا بووین و خەڵکیش قسەیان دەکرد و باسی دونیایان دەکرد، ئەبو موسا فەرمووی ئەی ئەنەس ئەوانە خەریکە یەکێکیان بە زمانی خۆی پێستەیەکی خۆشە کراو ئامادە دەکات، دەی وەرە با ئێمە ساتێك یادی خوا بکەین، پاشان فەرمووی: چی خەڵکی وا دووچاری کاولکاری کردووە؟ منیش وتم: دونیا و شەیتان و ئارەزووەکانیان ئەویش فەرمووی: نەخێر، بەڵام دونیا پەلەی کرد و دوا ڕۆژیش دیار نەما، بەڵام سوێند بە خوا ئەگەر دەست نیشانیان بکردایە ئەوا نە ڕاستیان دەکردەوە[1] نە خوار، لەبەر ئەوەی کە ئەبو موسا متمانەی تەواوی بە ئەنەس هەبوو ئەنەسی کردبوویە پەیامنێری خۆی بۆ لای عومەر ، ئەنەس دەفەرمووێت: ئەبوموسا لە بەصرەوە منی دەنارد بۆ لای عومەر هەواڵی خەڵکی لێ دەپرسیم،[2] پاش فەتحیش ئەبوموسا پەیامەکانی بۆ لای عومەر بە دیلکراوان و غەنیمەتەکان دەپۆشی و بە هورمزانی[3] هاوەڵێدا لە عومەر دەچوویە پێشەوە و لە ئەنەسەوە چەندین خوڕەوشتی گەورە لەلایەن هاوەڵان و تابعینەوە ڕیوایەت کراوە بە تایبەتی لە شاری بەصرە، ئەنەس شوێنەواری خۆی لە خوا پەرستی و پەرستشدا لە نێو خەڵکانی دەوروبەری بەجێ هێشت، هەروەها ئەنەس سوربوە لەسەر فێرکردنی یارانی و زۆری خۆشویستوون و لێیان نزیك دەبوویەوە و ڕێزی لێ دەگرتن و دەیفەرموو: ناتان چوێنم بە یارانی محمد(ﷺ)سوێند بە خوا ئێوەم لە چەند کوڕێکی خۆم خۆشتر دەوێ مەگەر لە کارزانیدا وەك ئێوە بن، من لە بەرەبەیاندا[4] دوعاتان بۆ دەکەم لەوەی کە دایمەزراندووە لە نوێژی ئەو زانایانەی کە زانستیان لێ وەرگرتووە و گەیاندوویانە بە کەسانی تر و ئەوانیش گوێزاویانەتەوە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان، بەم شێوەیە یارانی ئەنەس بە بڕوا پێکراوی مانەوە هەتا دوای(١٥٠) سەد و پەنجاش.[5]

## ٤- قوتابخانەی کوفەیی:

سێ سەد (٣٠٠) کەس لە پەیمان بەستوانی داری (رضوان) و ٧٠ کەس لە شداربووانی بەدر (ڕەزای خوای گەورەیان لێ بێت) دابەزینە شاری کوفە و عومەر نامەیەکی بۆ خەڵکی کوفە نووسی کە تیایدا هاتووە: ئەی خەڵکی کوفە، ئێوە سەرداری عەرەب و جومگەکانینی ، ئێوە ئەو تیرەی منن کە تیر بارانی دوژمنێکی پێ دەکەم ئەگەر لێرە و لەوێ ڕوم تێ بکات ، من بەندەیەکی خودام بۆ ناردوون، بەهۆی ئەوەوە فەزلی ئێوەم داوە بەسەر خۆمدا،[6] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرمووێت: لەپاشدا ئەوە من عەممارم وەك ئەمیرێك و عبداللە م وەك مامۆستا و گەوهەرێك ناردووە بۆتان، هەردووکیان لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون بۆیە داواتان لێ دەکەم کە گوێڕایەڵیان بن و پابەند بن

---

١ـ أنس إبن مالك الخادم الامين, عبدالحميد طهماز (ص: ١٤٩).
٢ـ أنس إبن مالك الخادم الامين (ص: ١٤٩).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٩٥).
٥ـ الانصار في العصر الاشدي (ص: ٢٧٦).
٦ـ مجمع الزوائد (٩/٢٩١) رجاله رجال الصحيح غير حارثة وهو ثقة.

پێیانەوە، من فەزلی ئێوەم داوە بەسەر خۆمدا بە عبداللە،[١] عومەر بایەخی داوە بە کوفە إبن مسعودی نارده ئەوێ نامەیەکی بۆ نووسی کە قورئان بە زمانی قورەیش هاتۆتە خوارێ تۆش قورئان بەو زمانە بە خەڵکی بخوێنەوە نەك بە زمانی خێرا[٢]، کاتێ کە کۆمەڵێك لە یارانی بەڕێ کرد بۆ کوفە پێی فەرموون: ئێوە دەچنە لای خەڵکی گوند- واتە خەڵکی کوفە- ئەوان وەك هەنگ لە دەوری قورئان کۆ دەبنەوە، بەفەرمووده باریان مەکەن چونکە سەرقاڵیان دەکەن، خۆتان یەکلایی بکەنەوە بۆ قورئان و لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە ڕیوایەت بکەن، ئێوە بمێننەوە منیش هاوبەشتانم،[٣] عومەر زیاتر هانی دەدان قورئانیان فێر بکەن و کەمتر فەرموودەیان فێر بکەن، لەمەشدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کاتێ ویستی فەرموودە بنوسێتەوە ڕاوێژی بە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) کردو ئەوانیش ڕاوێژیان پێدا بە نووسینی بۆیە یەك مانگ پێش ئەوەی کە دەست پێ بکات داوای خێری تێدا کرد پاشان ڕۆژێك خوای گەورە بێ پەروایی بێ داو فەرمووی: من نیازم کرد کە فەرموودەکانتان بۆ بنووسمەوە بەڵام من گەلێکم یاد کەوتەوە کە چەند کتێبێکیان نووسیەوە و کەوتن بەسەریدا و لە کتێبی خودایی دوور کەوتنەوە، سوێند بەخوا هیچ شتێك ناکەم بە بەری کتێبی خوای گەورەدا.[٤] بەڕاستی بەرنامە و پەیامی عومەر ئەوە بوو، کە پشت ببەستێ بە چەسپاندنی قورئان لە ناخی خەڵکی و دوور نەکەوتنەوەیان لێی هەتا واتاکانی لە ژیانی کۆمەڵگەدا ڕیشك دابکوتێ و زانیاری جێگیر بێ و خەڵکی جیاوازی لە نێوانی و نێوان کتێبەکانی تردا بکەن لە زانستە ئیسلامی یەکانی تر بە فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)یشەوە،[٥] دڵنیا بوون لەقورئانی پیرۆز هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) و وریایی دان بووە بە دوورکەوتنەوە لە کتێبەکانی تر، هەروەها ئەم کارە هەر لەو سەردەمەوە هەبووە، عومەریش(ﷺ)کەسێك نەبووە جگە لە شوێنکەوتەیەك بۆ فێرخوازی یەکانی پێغەمبەر(ﷺ).[٦]

عبداللە ی کوڕی مەسعود هەوڵی هاتنە کایەی توێژێکی داوە کە بە تێگەیشتن و زانیاری یەوە هەڵگری بانگەوازی خودایی بن، عبداللە کاریگەری لە ڕادە بەدەری هەبووە لە هاوەڵە پەیوەستەکانی یان ئەوانەی کە لە دوای ئەوان هاتوون، عومەر بە شارەزایی شاهێدی بۆ داوەو زەیدی کوڕی وەهەب دەفەرموێت: من لای عومەر لەناو چەند کەسێك دانیشتبووم کە پیاوێکی ناوقەد باریك هات و عومەر سەیری دەکرد و دەگەشایەوە پاشان فەرمووی: پەرژینکراوێك لێوان لێو لە زانست، پەرژینکراوێك لێوان لێو لە زانست، کە ئەوە إبن مسعود بوو، قوتابخانەی کوفە کاریگەربوون بە إبن مسعود،[٧] کە لە زۆرترین ئەو قوتابخانانە بووە کە مامۆستاکانی تەنانەت دوای مردنیشی شوێن

---

١ـ السلطة التنفيذية (١/٢٥٢).

٢ـ الفتح (٨/٦٢٥), الخلافة الراشدة د.يحيى (ص: ٣٠٩).

٣ـ الطبقات إبن سعد (٣/١٥٦), الحلة (١/١٢٩).

٤ـ تأريخ المدينة (٢/٧٧٠) موسوعة فقه عمر (ص: ٦٥٩).

٥ـ الانصار في العصر الرشدي (ص: ٢٦٨).

٦ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٦٠).

٧ـ طبقات إبن سعد (٣/١٥٦), الحلية (١/١٢٩).

کەوتەی بوون و پابەند بوون پێوە. کاریگەری إبن مسعود لە کوفەدا هەتا ماوەیەکی دوورودرێژی دوای خۆیشی ماوەتەوە،[١] إبن مسعود تا ئەوپەڕی ڕادە کاریگەربووە بە شارەزایی عومەر، لە وتەکانی خۆی دەگەڕا بۆ ئەو و هەمیشە دەیفەرموو: ئەگەر زانست و زانیاری عومەر(رضي الله عنه) بخرێتە تای تەرازوویەك و زانستی خەڵکانی سەر زەویش بخرێتە تاکەی تروە ئەوا تاکەی عومەری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) سەنگین تر دەبێت.[٢]

إبن مسعود لە نێو هاوەڵاندا دیار بووە و لە زانستی خوێندنەوەدا کەسێکی کۆن بووە لە زاری پێغەمبەر(ﷺ)ەوە حەفتا (٧٠) و هەندێك سورەتی قورئانی وەرگرتووە، شەقیق کوڕی سەلمە دەفەرمووێت: عبدالله کوڕی مسعود وتاری بۆ دەداین لە وتارەکەیدا فەرمووی: سوێند بە خوا لە زاری پێغەمبەر(ﷺ)ەوە حەفتا و هەندێ سورەتی قورئانم وەرگرتووە، سوێند بە خوا یارانی پێغەمبەر(ﷺ) دەزانن کە من زاناترینیانم بە قورئان.[٣]

مەسروق دەگێڕێتەوە کە: باسی عبدالله لای عبدالله ی کوڕی عەمر کرا و ئەویش فەرمووی: ئەو پیاوەم ئێستاش خۆش دەوێ بەتایبەتی پاش ئەوەی، کە لە پێغەمبەر(ﷺ)م بیست کە فەرمووی: قورئان لای ئەم چوار کەسە بخوێنن: عبدالله ی کوڕی مەسعود کە پێغەمبەر بە ئەو دەستی پێکرد، سالم مولی أبی حوزەیفە، ئوبەی کوڕی کەعب، موعازی کوڕی جەبەل.[٤]

هەروەها عومەر توانای إبن مەسعودی زانیوە لە خوێندنەوە و پێ خوێندنەوەدا، عەلقەمە دەفەرمووێت: پیاوێك هات بۆ لای عومەر کە دەیناسی و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، من لە کوفەوە هاتووم، کەسێکم تێدا جێ هێشتووە کە کتێبەکان لە پشتی دڵیەوە پڕ دەکات، عەلقەمە دەفەرمووێت: عومەر(رضي الله عنه) قەڵس بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا هەتا خەریك بوو ئەم لاو ئەو لای پیاوەکەی پڕ دەکرد و پاشان فەرمووی: ئەوە کێ یە بەڵام لێدای؟ ئەویش وتی: عبدالله ی کوڕی مەسعودە، ئەو هێشتا دادەمرکێنێتەوە و پەستی و قەڵسی بەرێ دەکات تا گەڕاوەتەوە لەسەر ئەو نەریتەی کە لەسەری بووە پاشتر فەرمووی: بەڵام لێدای، سوێند بە خوا ئەوەی کە من دەیزانم ئەوەیە کە کەسێك لە موسوڵمانان ماوە کە لەو ئیماندار تر بێت،[٥] إبن مسعود کۆمەڵێك قوتابی بەجێ هێشت کە بە شارەزایی و زانیاری و زانست و ئاینگەری و خواپەرستی بەناوبانگ بوو لەوانەش: عەلقەمەی کوڕی قەیس و مەسروقی کوڕی ئەجدەع و عوبەیدەی سەلمانی و ئەبو قەیسەرەی کوڕی شەرحەبیل و ئەسوەدی کوڕی یەزید و حارسی جەعفی و موڕڕەی هەمەدانی بوون.[٦]

---

١ـ تفسير التابعين (٤٦٢/١).
٢ـ العلم لأبي حنيفة (ص: ١٢٣)، تفسير التابعين (٤٦٣/١).
٣ـ البخاري رقم ٥٠٠٠.
٤ـ البخاري رقم ٣٧٥٨.
٥ـ المستدرك (٢٢٧/٢) صحيحه الحاكم و وافقه الذهبي.
٦ـ تفسير التابعين (٤٧٢/١ الى ٤٨٤).

## ٥- قوتابخانەی شام:

پاش ڕزگار کردنی شام یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان نامەیەکی بۆ عومەر(ﷺ) نوسی: خەڵکی شام زۆربوون و شارەکانیان پڕ کردووە و پێویستیان بە یەکێکە کە فێری قورئانیان بکات و شارەزایان بکات، ئەی ئەمیری باوەڕداران، پیاوانێك بنێرە کە فێریان بکەن، عومەر(ﷺ) بانگی موعازی کوڕی جەبەل و عوبادەی کوڕی صامت و ئەبو دەرداء(ﷺ) کرد و ناردنی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە گرنگە و پێی فەرموون: لە شاری حەمصەوە دەستی پێ بکەن چونکە ئێوە خەڵکانێکی بە ڕەگەز جیاوازی تێدا بەدی دەکەن، هەندێکیان خێرا فێردەبن، ئەگەر ئەوەتان بەدی کرد کۆمەڵێك خەڵك فێر بکەن و ئەگەر لێیان ڕازی بوون با کەسێکتان بەو کارە هەڵستێ و پاشان یەکێکتان بڕوا بۆ دیمەشق ئەوی تر بەرەو فەلەستین، هاتنە شاری حەمص تیایدا مانەوە هەتا لە خەڵکی ڕازی بوون بەوەی کە لە ئاستی زانستیدا پێی گەیشتوون و عوبادەیان لەوێ بەجێ هێشت و ئەبودەرداء بەرەو دیمەشق و موعازیش بەرەو فەلەستین بەڕێ کەوتن،[1] بەڕاستی ئەو قوتابخانە زانستیانەی کە عومەر تاکەکانی دادەمەزراندن لە وڵاتە ڕزگار کراوەکاندا هەڵدەستان بە فێرکردنی خەڵکی و پەروەردەکردنیان، قوتابخانەی شام لەسەر شانی موعاز و ئەبو دەرداء و عوبادەی کوڕی صامت( ڕەزای خوایان لێ بێت) و چەند کەسێکی تر لە یاران وەستا بوو، ئەبو دەرداء خولێکی لە مزگەوتی دیمەشق هەبوو کە(١٦٠٠) هەزار و شوش سەد کەس ئامادەی دەبوون و دەکەس دەکەس قورئانیان دەخوێند و پێشبڕکێیان لەسەر دەکرد و ئەبودەردائیش وەستا بوو کە لە پیتەکانی قورئاندا فەرمانی بە خەڵکی دەدا،[2] ئەبو دەرداء بە زۆرترینی ئەو هاوەڵانە دێتە هەژمار کە لە شام و دیمەشقدا کاریگەر بوون، زەهەبی دەفەرموێت: ئەبو دەرداء زانای خەڵکی شام بووە و قورئان خوێنی ئەهلی دیمەشق فەقێ و قازی یان بووە،[3] ئەو(ﷺ) لەو یارانە بووە کە قورئان خوێن بوون و بە پەنجەی دەست هاتوونەتە ژماردن،[4] هەروەها ئەبو دەرداء(ﷺ) هانی خەڵکی شامی دەدا لەسەر داواکردنی زانیاری و زانست و دەیفەرموو: بۆچی زاناکانتان دەبینم دەڕۆن و نەزانەکانتان دەبینم فێرنابن؟ فێر بن پێش ئەوەی کە زانیاری و زانست بەرز بێتەوە، دڵنیاش بن کە بەرز بوونەوەی زانست ڕۆیشتنی زانایانە،[5] لە جەخت کردنەوەکانی لەسەر داخوازی زانست دەیفەرموو: زانابە یان فێر خواز بە یان خۆشەویستی زانست، یان شوێنکەوتەی بە، پێنجەمیان مەبە چونکە تیادەچی. حسنی بەصری- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێت: پێنجەم داهێنەرە،[6] هەروەها دەفەرموێت: داوای زانیاری و زانست بکەن ئەگەر لێی دابڕان ئەوا خەڵکەکەیتان خۆش بوێ، ئەگەر نا

---

١ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٥٩).
٢ـ غايه النهاية في طبقات القاء لابن الجوزي (١/٦٠٧).
٣ـ التذكرة (١/٢٤).
٤ـ تفسير التابعين (١/٢٥٦).
٥ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٥٦).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

ڕقتان لێیان نەبێتەوە،[١] ئاگاداربن خەڵکی فێر بکەن و خۆشتان فێر بن چونکە زانا و فێرخواز لە پاداشتدا وەك یەکن و لە پاش ئەوەش لە نێو خەڵکدا باش نی یە،[٢] هەتا فێر خواز نەبێت نابێتە زانا، نابێتە فێر خواز هەتا کار بەوە نەکەیت کە دەیزانی،[٣] هەروەها دەیفەرموو: هەموو شارەزایی و تێگەیشتنەکان بەدەست ناهێنی تا چەند ڕوویەکی قورئان نەبینی،[٤] وتیان بە ئەبو دەرداء چیتە وا هۆنراوە نالێیت؟ پیاوێك لە ئەنصاری یەکان نەماوە کە کۆپلەیەکی نەبێت،ئەویش فەرمووی ئەوا منیش وتم گوێ بگرن:

يـــريد المرءُ أن يعطي مناه ويــــأبى الله إلا مـــا أرادا
يقول المرءُ فائدتي ومالي وتقوى الله أضفل إستفادا[٥]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە عومەر(ﷺ) کاتێ ئەبو دەرداء(ﷺ) کردە والی شام ئەم قایل نەبوو، بەڵام عومەر سووربوو لەسەری ئەبودەردائیش(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر قایل دەبیت کە بچم بۆ لایان هەتا فێری قورئان و سوننەتیان بکەم و ببمە پێش نوێژیان ئەوا دەچم، عومەر(ﷺ) بەمە قایل بوو، بەهۆی شارەزایی ئەبو دەرداء بەزۆری زانیاری و زانست ئەبو دەرداء زیاتر دڵی موسوڵمانانندا جێی بوویەوە، زۆرێك لە فێرخوازان لە دەوری کۆبوونەوە، لەوانە هەبوو پرسیاری دەربارەی فەرزەکان و هەبوو پرسیاری دەربارەی لێپرسینەوە و هەندێ فەرمووده و هەندێکی تر دەربارەی فیتەن و هەندێکی تر دەربارەی هۆنراوە دەکرد،[٦] لەبەرئەوە کاریگەری زانستی لە شامدا بەرفراوان بووە بەتایبەتی لە فێرکردنی قورئاندا و هەروەها لە ئامۆژگاریشدا بە هەمان شێوە ڕۆژێك لە نێو خەڵکی شام هەستا و پێی فەرموون: ئەی خەڵکی شام چیتانە وا کۆدەکەنەوە و لێی ناخۆن و کۆشك و تەلار بنیات دەنێن و دانانیشن، سەرنج دەدەن و هەستی پێ ناکەن، ئاگادار بن کە عاد و ثەمود نێوانی بوسرا و عەدەنیان پڕکرد لە ماڵ ومنداڵ وناز و نیعمەت، ئەوەی کەلێیان بەجێ ماوە کێ لە منی دەکڕێت بە دوو درهەم.[٧] بە وێنەی ئەم کەلتوریانە لەگەڵ سیاسەتی عومەریدا بەرجەستە دەبوون و بەڕێ دەکران بۆ سازدان و ئامادەکردنی ئومەت و درێژەدان بە شیاوی جیهادکردن ،[٨] بەڵام موعازی کوڕی جەبەلی خەزرەجی(ﷺ) خەڵکی یەمەن و شام سودیان لێ وەرگرت و عبداللە کوڕی مەسعودیش(ﷺ) بە باڵای موعازدا(ﷺ) هەڵدەدات و قسە بۆ هاوەڵەکانی دەکات و دەفەرمووێت: بەڕاستی موعاز: ﴿كَانَ

---

١ـ الطبقات (١/ ٤٣٠).
٢ ـ صفة الصفوة (٦٢٨/١).
٣ـ سير أعلام النبلاء (٣٤٧/٢).
٤ ـ الطبقات (١/ ٤٣٠).
٥ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٥٦).
٦ ـ أصحاب الرسول (ﷺ) (٢/ ٢٠٩).
٧ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٥٦).
٨ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٥٦).

أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ (النحل: ١٢٠).

وتیان: کام ئومەت؟ فەرمووی: ئەوەی کە خەڵکی فێری چاکە دەکات، پاشان فەرمووی: ئەی دەزانن فەرمانبەردار چی یە؟ وتیان: نەخێر فەرمووی: فەرمانبەردار ملکەچی خودایە،[1] موعازیش بەو شێوەیە بووە، إبن مسعود موعازی بە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیە السلام) لێك دەچواند بەوەی کە شکۆمەندی زانستی و شوێنەواری شارەزایی و ڕەفتاری تێدا بوو، لەبەر ئەوەش بوو کە موعاز(ﷺ) بە تێگەیشتنی قوڵ بۆ فیقهی ئیسلامی جیا دەکرایەوە توانایەکی پێ بەخشیبوو لە وەڵامدانەوەی ئەو دژواری یانەی کە لە لای موسوڵمانان شوێنی پەسەندی و سەرسوڕمان بوو،[2] عومەر(ﷺ) دەربارەی دەفەرمووێت: ژنان دەستەوسانن لەوەی کە کۆرپەی وێنەی موعازیان ببێت،[3] عومەر ئەگەر کارێك فشاری بۆ بهێنایە ئەوا ڕاوێژی بە دەستەی ڕاوێژ دەکرد کە لەگەڵ ئەنصاری یەکاندا موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابت[4] هەبوون بەوەی،کە لەشارەزایی و تەفسیری واقعی و کردەیی بۆ ڕوداوەکان چێژیان وەردەگرت، کاتێ کە شارەزاییان لەم بوارەدا هەبوو ئەو کاتە بوو، کە لەسەر سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیان دەردەکرد کە: بەجۆرێ عبدالله کوڕی عومەر(ﷺ) حەزی بە بیستنی قسەی موعاز و ئەبودەرداء بوو، بە خەڵکی دەفەرموو: باسی دوو ژیرەکەم بۆ بکەن، ئەوانیش دەیان وت: کێن ئەو دوو ژیرە؟ دەیفەرموو: ( موعاز و ئەبودەرداء) ی ئەنصاری،[5] کاتێ عومەر لەسەر ئەستێل و حەوزی ئاودانی وشترەکان وتاری دا فەرمووی: هەرکەس ئەیەوێ پرسیار بکات دەربارەی فیقە با بێت بۆ لای موعازی کوڕی جەبەل،[6] ڕای عومەر لە سەرەتای خەلافەتی ئەبوبکردا وا بوو کە بێ نیاز نابێ لە بوونی موعازی کوڕی جەبەل لە پایتەختەکەیدا و بەرهەڵستکاری چوونە دەرەوەی بوو لە مەدینە، عومەر پاش دەرچوونی موعاز بۆ شام فەرمووی: دەرچوونی لە نێو شاری مەدینە و خەڵکەکەیدا مەدینە بەتاڵ بوویەوە لە فیقهی ئیسلامی و ڕاوێژیا پێ نەدەکرد، من ئەبوبکرم دواند کە کۆت و بەندی بکات لە مەدینە لەبەر ئەوەی ،کە خەڵکی پێویستیان پێیەتی، بەڵام ئەبوبکر داواکەمی پەسەند نەکرد و فەرمووی: پیاوێك کە شەهیدی دەوێ من بەندی ناکەم، منیش وتم: سوێند بە خوا پیاو لە نێو جێگاکەیدا لە ماڵەکەیدا و لە شارەکەی خۆیدا ئەگەر بیەوێ خوای گەورە پلەی شەهیدی پێ دەبەخشێ،[7] بەڵام دیارە کە عومەر ڕای خۆی گۆڕیوە و ناردوویەتی بۆ فێرکردنی خەڵکی شام و بڕیاری داوە کە هەر لەوێدا بمێنێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا چوونی موعازی کوڕی جەبەل بۆ

---

١ـ الاكتفاء للكلاعي (٣/٣١١).
٢ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ١٢٠).
٣ـ سير أعلام النبلاء (١/٤٥٠).
٤ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٨٥).
٥ـ تهذيب الكمال (٢٨/١١٣) للمزي نقلا عن الانصار في العصر الراشدي.
٦ـ الطبقات (١/٤٢٦).
٧ـ الانصار في العصر الراشدي (ص:٢٨٥).

شام کاریگەری گەورەی هەبووە لەوەی کە لە دوای خۆی زانست و زانیاری و شارەزایی بەجێ هێشتووەو لەمەشدا لێهاتوویی خۆی سەلماندووە، ئەبوموسلمی خولانی دەفەرمووێت: چوومە نێو مزگەوتی شاری حمص و نزیکەی ٣٠ کەس لە هاوەڵە بە ساڵاچووەکانی پێغەمبەر(ﷺ)م بینی کە لاوێکی چاو ڕەشی ناوچاو پڕشنگدار و بێ دەنگیان تێدابوو ئەگەر خەڵکی لە شتێکدا نە شارەزا بوونایە و گرفتیان بهاتایە ڕێ پرسیاریان لێ دەکرد منیش بە هاوەڵەکەم وت: ئەوە کێ یە؟ وتی: موعازی کوڕی جەبەل،[1] موعاز هەمیشە هانی خەڵکی دەدا لەسەر گەران بە دوای زانیاریدا و دەیفەرموو: فێری زانیاری بن، بەڕاستی فێر بوونی لە پێناو خودا ملکەچی و داواکردنی پەرستشە.یادکردنەوەی ستایش کردنی خودا و گەران بەدوایدا جیهادە و فێر کردنی هەرکەسێکیش چاکەیە و بەخشینی بە خەڵکانی خۆیی نزیک بوونەوە و دۆستایەتی کردنە لەبەر ئەوەی کە هێما و نیشانەکانی حەرام و حەڵاڵ و ئاڵا و بەیداخی بەهەشتیان و بەختەوەرین لە دڵتەنگی و هاوڕێ و هاودەمن لە غوربەتدا و دوێنەر لە خەڵوەت و ڕێنیشاندەرن لە خۆشی و ناخۆشیدا و چەکن لە بەرامبەر دوژمن و ئاینن لە کاتی پەڕاگەندەدا و خوای گەورەش گەلانێکی پێ بەرز دەکردەوە و دەیکردنە چاکترینیان لە سەرکردایەتی و پێشەوایانێك کە شوێن پێیان هەڵبگیرێ و پابەند بن بە کردەکانیان و بگەڕێنەوە بۆ لای ڕاکانیان.[2] لەشامدا مایەوە و خەڵکی فێری ئاینەکەیان دەکرد تا لە عەمواس دووچاری نەخۆشی تاعون هات و هاوەڵەکانی بۆی گریان و فەرمووی: چی واتان لێ دەکات کە بگریەن؟ وتیان بۆ ئەو زانیاری و زانستە دەگرین کە بە مردنی تۆ لێمان دەبڕێ، فەرمووی: زانیاری و ئیمان لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە تا ڕۆژی دوایی، هەرکەس داوایان بکات لە قورئان و سوننەتی پیرۆزدا دەیان دۆزێتەوە هەموو قسەکان بخەنە ڕوو لەسەر قورئان و بە هیچ شتێك لەسەر قسە مەیخەنە ڕوو،[3] قورئان لای موعاز ئەو پێوەرە بوو کە هەموو شتەکانی پێ دەپێوا و بە هیچی تری نەدەپێوان، ئەمەش بەرنامەی موعاز بوو لە فێربوونیدا بۆ قورئان و بەمەش پابەند بوو هەتا دوایین چرکە لە ساتە وەختەکانی ژیانیدا، کاتێ لە سەرەمەرگدا بوو هەر کە چاوی دەکردەوە دەیفەرموو: خوای گەورە، هەناسەم لێبڕە،خوایە گیان تۆ دەزانی کە من گەشتن بە تۆم زۆ پێخۆشە ،[4] بەڵام عوبادەی کوڕی صامت (ﷺ)، عومەری فاروق دادوەرێکی ڕەوانەی شام کرد ،لە حومص نیشتەجێ بوو پاشان ڕووی کردە فەلەستین و لەوێ دادوەری کرد، هەر لەوێ بەم پلەوپایە سەقامگیر بوو، یەکەمین کەس بوو کە کاروباری قەزائی لە فەلەستین گرتە دەست و هەروەها خەڵکەکەشی فێری قورئان دەکرد و لەسەر ئەم ڕێچکەیە مایەوە تاوەکو لەوێ مرد،[5] هەروەها عوبادە بەشێکی گەورەی لەسیاسەتی زانستی و پەروەردەیی و جیهابینی عومەری فاروق (ﷺ)ی بردوەو لە خەڵکانی خواناس و

---

١ـ سير أعلام النبلاء (٤٥٢/١).
٢ـ الانصار في العصر الراشدي (ص:٢٨٥)، سير أعلام النبلاء (٢٨٥/١).
٣ ـ الانصار في العصر الراشدي (ص:٢٨٥).
٤ ـ صفة الصفوة (٥٠١/١).
٥ ـ عبادة بن الصامت صحابي كبير ومجاهد، د. وهبة الزحيلي، (ص: ٨٤).

ملکەچ بووە و کاتێك گەشتە شاری حمص بە خەڵکەکەی فەرموو: ئاگاداربن کە دونیا نمایشگەی ئێستاو ڕۆژی دوایش بەڵێنی ڕاست و دروستە... ئاگاداربن دونیا نەوەی خۆیی هەیە و قیامەتیش نەوەی خۆیی هەیە و ئێوەش لە نەوەی ڕۆژی دوایی بن و لە نەوەی ئەم دونیایە مەبن، هەموو دایکێك نەوەکانی شوێنکەوتەی دەبن[1] ،لەسەر ئەم بنەمایە بوە کە عومەر(ﷺ) سوور بووە لەسەر چەسپاندنی لە ناخی موسڵماناندا ،لە نێو یارانی ئازیزدا (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەوانەیانی هەڵدەبژارد کە خەڵکی دەتوانێت یادیان بکاتەوە و ئەم مانایانە لە ژیاننامەکەیدا بەرجەستە بکات، هەروەها عوبادە(ﷺ) فەرمانی بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکرد، لە پێناوی خواشدا لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا، عوبادە(ﷺ) کاتێك کە دادوەری فەلەستین بوو، نکۆڵی شتێکی کرد لە والی شام و فەرمووی: من لەم زەویەدا لەگەڵ تۆ نابم و پاشان ڕۆیشت بۆ مەدینە، عومەر پێی فەرموو: چی تۆی هێنا؟ ئەویش هەواڵەکەی پێدا، عومەر فەرمووی: بڕۆ بۆ شوێنی خۆت خوای گەورە هەموو خێرێك لەو زەویەدا دوور خاتەوە کە تۆ و هاوشێوەکانتی تێدا نیە هیچ کار و فەرمانێکی تۆی بە سەرەوە نیە،[2] بەم شێوەیە عوبادە وەك بانگخوازێك و مامۆستا و پێشەنگێك لە نێو کۆمەڵگەکەی گەرایەوە بۆ شام، هەروها عومەر(ﷺ) عبدالرحمن کوڕی غەنەمی ئەشعەری نارد بۆ شام تاوەکو خەڵکەکەی شارەزا بکات، موعاز و ئەبو دەرداء و عوبادە ئەو پایە سەرەکیانە بوون کە عومەر لە دامەزراندنی ئەو قوتابخانە شامیەدا پشتی پێ بەستن کە هەستا بە بانگەواز و فێرکردن و پەروەردە لەو مەڵبەندانەدا، ئەمانە کۆمەڵێك لە باشترین یارانی ئازیزیان لەگەڵدا بوو کە تابعینی شام لە سەردەمی ئەوان فێر بوون، ئەم یارە ئازیزانە کەسانێکی زۆر بوون، بەڵام بەناو بانگترینیان عائذالله کوڕی عبدالله ئەبو ئیدریسی ئەلخولانی و مکحول ئەبو عبدالله ئەلدیمەشقی و کەسانی تر بوون.[3]

## ٦- قوتابخانەی میسر:

لە سوپاکەی عەمری کوڕی عاص(ﷺ)دا کە میسری ڕزگار کرد زۆرێك لە هاوەڵان هەبوون، جگە لەوەش دەتوانین کە عەقبەی کوڕی عامر(ﷺ) بە زۆرترینی ئەو هاوەڵانە بهێنینە هەژمار کە لە میسردا لە لایەنی زانستیەوە کاریگەری خۆی هەبووە هەروەها خەڵکی میسر عوقبەیان زۆر خۆش ویستووە و شتیان لێ گێڕاوەتەوە و پەیوەست بوون پێوەی، سەعدی کوڕی ئیبراهیم دەفەرمووێت: هەرچۆن ئەهلی کوفە باسی عبدالله یان[4] دەکرد هەر بەو شێوەیەش خەڵکی میسر باسی عوقبەیان دەکرد و میسریەکانیش زانیاری و زانستیان لە یارانی ئازیزەوە وەردەگرت و لە بەناوبانگترین ئەو هاوەڵانەش ئەبو ئەلخەیر مورشید کوڕی عبدالله ئەلیەزنی کە لەسەر دەستی عوقبە بۆتە قوتابی و

---

١ ـ الاكتفاء للكلاعي (٣/٣١٠).
٢ـ سير اعلام النبلاء (٢/١٢٢) الانصار في العصر الراشدي، (ص: ١٢٤).
٣ـ تفسير التابعين، (١/٢٥٦ الى ٥٢٨).
٤ـ هەمان سەرچاوە (١/٥٤٠-٥٤١).

زانیاری و زانستی لێ وەرگرتووە، پاش مورشید عەمری کوڕی عاص[١] و عبدالله کوڕی عەمر(ﷺ) بوون، ئەمانە گرنگترین ئەو قوتابخانانە بوون کە بزاوتنی ڕزگاریخوازی کاریگەربوون و لە دامەزراندنی و عومەر(ﷺ) سەرپەرشتی ناوکۆکە یەکەمینەکانی کردووە، عومەر(ﷺ)ئەگەر سوپا لێی کۆبوونایەتەوە ئەوا پیاوێکی بۆ دەناردن کە کەسایەتیەکی زانا و تێگەیشتوو بێت هەتا سەربازەکان فێری کاروباری ئاینەکەیان و هەموو ئەو کاروبارانەیان بکات کە لە دەستوور و ڕێسای فیقهی و قورئانیەکان دێتە ڕێگەیان،[٢] کاتێك کە خاکە ڕزگارکراوەکانی ئیسلام بەرفراوان بوون پێویستیان بە چەند دەزگایەکی زانستی و پەروەردەیی بوو، شارە ئیسلامیەکانی وەك کوفە و بەسرە و قیستات بنیات نران و لەپاڵ ئەوەشدا چەندین پێگەی سەربازی و مەڵبەند کرانەوە بۆ کۆبوونەوەی سەربازان و خاوخێزانەکانیان، هەروەها ئەمە دەبوویە بارەگایەك بۆ کۆبوونەوەی زانایان و تێگەیشتوان و فێرکاران،[٣] عومەر بانگخوازان و مامۆستایانی دادەمەزراند و ڕەوانەی ناوچە ئازادکراوەکانی دەکردن، عومەری فاروق ئاشکرای کرد کە گرنگترین مەبەستی ڕەوانەکردنی والی و فەرمانبەرداران بۆ شارەکان ئەوەیە هەستن بە فێرکردنی خەڵکی، هەروەها فاروق (ﷺ) وتاری دەدا و دەیفەموو: خوای گەورە، من بەشاهێدت دەگرم لەسەرفەرمانبەردارانی شارەکان و من لەسەر خۆیان ڕەوانەم کردن، تا لە نێوانی خۆیاندا ڕاست و ڕێك بن و خەڵکی فێری دینەکەیان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان بکەن و دەسکەوتەکانیان لەنێودا بەش بکەن،[٤] عومەر ڕزق و ڕۆزی لە بەیتولمالی موسڵمانان بۆ مامۆستایان و موفتیان بریوەتەوە تا خۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆ بەجێهێنانی ئەرکی گرنگیان لە فێرکردن و فتوادان و تەنانەت ئەوانەش کە منداڵانیان فێر دەکرد عومەر زامنی ڕزق و ڕۆزی دەکردن، لە مەدینەدا تەنها سێ مامۆستا هەبوو، کە منداڵانیان فێر دەکرد، عومەر بۆ هەر مانگێگ ١٥ درهەمی بۆ بڕیبوونەوە،[٥] بڵاوبوونەوەی فێرکاری لە گرنگترین ئامانجەکانی عومەر بوو، کەسانێکی دەنارد بۆ نێو خەڵکی دەشتەکی و شارەکان کە ئەوان فێری ئاینەکەیان بکات، عومەر (ﷺ) هەر بە کۆششی والی شارەکانەوە نەدەوەستا بۆ بڵاوکردنەوەی فێرکردن بەڵکو بەو زانایانە هاوکاری کردوون کە لە مەدینە بۆی دەناردن، هەڵگری ڕاسپاردەکان بوون، عومەر ١٠ هاوەڵی ئایزی بۆ فێرکردنی خەڵکی بەسرە نارد کە تیایاندا عبدالله کوڕی مغفل ئەلموزنی بەدی دەکرا[٦] و هەروەها عیمران کوڕی حصین ئەلخوزاعی(ﷺ) ڕەوانەی بەسرە کرد تا خەڵکەکەی لە دین شارەزا بکات، عیمران یەکێك بوو لە هاوەڵە تێگەیشتووەکان.[٧]

---

١ـ حسن المحاضرة (١/٢٩٦).
٢ـ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٧١٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە. (٢/٧١٢).
٤ـ مسلم، رقم (٥٦٧).
٥ـ رواه البيهقي، (٦/١٢٤) السلطة التنفيذية (٢/٧٦٦).
٦ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٧٣).
٧ـ هەمان سەرچاوە (٢٧٣).

وا دیارە کە فێرخوازی لە شامدا زیاتر پێگەیی تر بووە لە شارەکانی تر، چونکە عومەر(ﷺ) کاتێك کە ناوچەکانی تر پاککرانەوە نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری، کە لە بەسرە بوو، فەرمانی پێدا کە مزگەوتێك بۆ نوێژی بە کۆمەڵ بکاتەوە و بۆ هەر هۆزێکیش مزگەوتێك بکاتەوە، هەر کە ڕۆژی هەینی هات بڕۆن بۆ مزگەوت و ئامادەی نوێژی هەینی بن، نامەیەکی نووسی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کە لە کوفە بوو، بە هەمان شێوە، نامەیەکی بۆ عەمری کوڕی عاص، نووسی کە لە میسر بوو، بە هەمان شێوە، نامەی بۆ ئەمیری سەربازانی شام نووسی: دەست پێشخەری مەکەن بۆ گوندەکان و لە شاران لێ بگەڕێن، لە هەر شارێکدا تەنها یەك مزگەوت دروست بکەن نەك بۆ هەر هۆز و تیرەیەك مزگەوتێك دیاری بکەن هەوەك ئەوەی کە بۆ خەڵکی کوفە و بەسرە و میسر کراوە،[1] فاروق بایەخی تەواوی دەدا بە کادیرە زانستیە پسپۆڕەکان و ڕەوانەی شارەکانی دەکردن، لەگەڵ بەرفراوانتر بوونی ناوچە ڕزگارکراوەکاندا ڕێنمایی سەرکردە و فەرمان بەردارانی دەکرد کە هەستن بە کردنەوەی مزگەوت لە هەرێمە پاکسازکراوەکاندا هەتا ببنە مەڵبەندێك بۆ ئاینی نوێ و مەڵبەند بن بۆ زانیاری و زانست و شارەزایی و پەخشکردنی شارستانیەتی ئیسلامی، بە ڕاستی مزگەوتەکان لە ئیسلامدا بریتین لە چەند دام و دەزگایەکی سەرەتایی زانستی و لە میانیدا زانایانی هاوەڵ جولاون بۆ فێرکردنی ئومەت بە پێی پلانێکی ستراتیژی کە عومەر لەسەری ڕۆیشتووە و لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دانراوە، ژمارەی ئەو مزگەوتانەی کە نوێژی هەینیان تێدا دەکرا لە دەوڵەتەکەی عومەر(ﷺ) گەیشتە ١٢ هەزار مینبەر،[2] کە هەڵدەستا بە ڕۆڵی خۆی لە فێرکردن و پەروەردەکردن و بەهێزکردنی ناخی خەڵکی، کاتێ کە موسڵمانان پێویستیان بە دابڕانی شوێنی فێرکردنی منداڵان بوو لە مزگەوتەکان، عومەر(ﷺ) فەرمانی دا بە دروستکردنی بینای قوتابخانەکان و دامەزراندنی پیاوان بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵان،[3] عومەر هانی منداڵانی دەدا بۆ فەراهەم هێنانی زانیاری و زانست و کارئاسانی بۆ دەکردن و خەڵاتی ماڵی پێ دەدان وەك هاندانێك بۆیان، عومەر نامەی بۆ کاربەدەستانی دەنووسی کە خەڵاتی پێشکەوتووان بکەن وەك هاندانێك بۆیان، ئەمەش لەو فەرمانەیدا دەرکەوت کە بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) نارد، تیایدا داوای لێ کردبوو کە چی پارەیەك لە بەیتولمال ماوەتەوە بداتە ئەو قوتابیانەی کە فێری قورئان دەبن،[4] ئەم هاندانەی فاروق بۆ ئەو ڕۆڵانەی ئومەت بوو کە ژیانی خۆیان تەرخان کردبوو بۆ فێربوونی قورئان و لەبەرکردنی، هیچ کۆمەکیەکیان نەبوو جگە لەو کۆمەکی و هاندانانە کە ئەمەش بە تاتیبەتی لەو هەرێمانەی کە تازە موسڵمان بووبوون، ئەمەش ئەو وزە شاراوەیەی کە لە ناخدا هەیانە دەیهەژێنی لە توانای ڕۆڵەکانیان لەسەر لەبەرکردن و تێگەیشتنی قورئان و سونەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، عومەر(ﷺ) ئەو دەمە بایەخی دەدا

١ـ عصر الخلافة الراشدة (٢٧٥).
٢ـ نظام الحكومة الاسلامية (٢/٢٦٢).
٣ـ السلطة التنفيذية (٢/٧٦٨).
٤ـ أشهر مشاهير الاسلام (٢/٥٤٠-٥٤١).

بە سەرجەم ئەو زانستانەی کە پەیوەنیان بە قورئان و سونەت و بە تایبەتیش بە زمانی عەرەبیەوە هەبوو، لە وتەکانی لەم بارەیەوە دەفەرموویت: فێری زمانی عەرەبی بن بەڕاستی ئەو فێربوونە عەقڵ دامەزراوەکات و لەپیاوەتی زۆرتر دەکات،[1] دەفەرموویت: فێری (نحو) بن هەروەك ئەو کە فێری سونەت و فەرزەکان دەبن،[2] دەفەرموویت: فێری شیکردنەوە (إعراب)ی قورئان بن هەروەك ئەوەی فێری لەبەرکردنی دەبن،[3] دەفەرموویت: خراپی نووسین درێژدادری بێبنەمایە و خراپی خوێندنەوە زۆر وتن و نایابی نووسینیش ڕونترینیانە،[4] ئەوەش بەدی دەکەین کە عومەر سەرزەنشتی ئەو کەسەی دەکرد کە هەڵەی لە عەرەبیدا دەکرد لە کاتێکدا ئەو لە شوێنێکی گرنگدایە و دەکرێت کە مەزنیەکی تێدا بێت، بەوەی کە پێی سپێردراوە و شانی داوەتە ژێری، ئەبو موسای ئەشعەری نامەیەکی بۆ عومەر(ﷺ) نووسیوە و عومەریش نامەیەکی بۆ دەنووسێت و دەفەرموویت: ئەو نووسەرەت کە ئاوازێکی بۆ نووسیوم قامچیەکی لێدە،[5] ئیبن جەوزی ڕیوایەتی کردووە کە: نووسەرەکەی عەمری کوڕی عاص نامەیەکی نووسیوە بۆ عومەر و کاتێك کە نووسیویەتی ((بسم الله)) پیتی (س)ەکەی لەبیر چووە، بەم هۆیەوە عومەر نامەیەکی بۆ عەمر نووسیووە کە : قامچیەك بدات لە نووسەرەکەی، عەمریش قامچیەکەی لێدا کاتێك کە لە نووسەرەکەیان پرسی: لەسەر چی لێیدایت؟ وتی: لەسەر پیتی (سین).[6]

بە ڕاستی عومەر سوور بوو لەسەر شارەزابوون لە هەموو شتێك، لەبەر ئەوە وازی لە هیچ کارێك لەو کارانە نەهێناوە کە پەیوەندی بە سیاسەت یان باری ئابووری یان سوپاکان یان فێربوون یان ئەدەب یان ئەو شتانەی تر کە پەیوەندیان هەیە بە ژیانی ئومەت و شکۆمەندی و سەرفرازی و هێزی شارستانیەتی، ئەگەرنا داهێنانی تێدا کردووە و بایەخی خۆی پێداوە، ئەمەش ڕێنمایمان دەکات لەسەر گشتگیری و سیاسەتی و باشی بەرپرسیارێتی بۆ ئومەت بە بەکارهێنانی توند و تیژی لەشوێنی خۆیداو نەرم و نیانی لە شوێنی خۆیدا، پارێزگاری کردن لەسەر ئەوەی کە دەبێت ئاستی نووسین لە نێوانی والیەکاندا لەسەر ئاستی زمان پاراوی لە ئومەت و دەستووری قورئان بێت کە بە زمانێکی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا دابەزیووە.[7]

بە ڕاستی لە پشتەوەی ئەو دام و دەزگا سەربازی یانەی کە هەستان بە پاکتاوکردنی هەر یەکەلە وڵاتانی عێراق و ئێران وشام و میسر و وڵاتی ڕۆژئاوای عەرەبی چەندین کادیری زانستی و فیقهی و بانگخوازی بەتوانا هەبون کە لەسەر دەستی پێغەمبەر(ρ)و لە مەدینە پەروەردە دەبوون، عومەر سودی لەم هێز و وزە و تواناییانە دەست کەوتووە و بە باشترین شێوە ئاراستەی کردوون و لەشوێنی

١ـ معجم الادبان (١٩/١).
٢ـ التبيان والتبين للجاحظ (٢١٩/٢).
٣ـ ألف بأ للبلوي (٤٢/١) ألولويات الفاروق (ص: ٤٥٨).
٤ـ تدريب الراوي للسيوطي (ص: ١٥٢).
٥ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ١٥١).
٦ـ هەمان سەرچاوە.
٧ـ أولويات الفاروق (ص: ٤٥٨).

خۆی داینាون، ئەم کادیرانە بزاڤێکی زانستی و فیقهیان دامەزراند، کە وێستگە بوون بۆ بزاوتی پاکتاوی، هەروەها زانایانی هاوەڵ کە خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ بانگەوازی خەڵك و پەروەردە کردنیان تا بتوانن چین و توێژێکی شارەزا لە ئاینی ئیسلامی لە ڕۆڵەی ناوچە ئازاد کراوەکان دروست بکەن، بەمەش توانیان زاڵ بن بەسەر گرفتی پەکخستنی بەربەستی زمانەوانی، بەڵکو زۆرێك لە خەڵکانی نا عەرەبیش فێری زمانی ئیسلام بوون و ئەم ژمارەیەش لە گەریدەکانی بزاوتی زانستی پاش سەردەمی هاوەڵان ڕووی لە زیادبوون کرد، خوێندنگە زانستی و فیقهیەکانیش لە ناوچە پاکتاوکراوەکاندا شوێن پێی خۆیان بەجێ هێشت، چین و توێژێکیان لە زانایان پێکهێنا کە زانیاری هاوەڵانیان گەیاندە ئومەتی ئیسلام و بوونە بەشێك لە چوار دیواری زنجیرەی ئەو تاپۆیانەی کە قورئان و سونەتی پێغەمبەر(ρ)یان گوێزاوەتەوە بۆ ئەم ئومەتە، ئەم کارزانیەش – پاش خودا – لە گواستنەوەی ئەوەی کە هاوەڵان لە زانیاری و زانست لە پێغەمبەر(ρ)ەوە پێیان گەیشتووە بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەری ئەو قوتابخانە و خوێندنگە زانستیانەی کە لە مەککە و مەدینە و بەسرە و کوفە و میسر و وڵاتەکانی تردا هەبوون.[١]

پێویستە ئەوەش بوترێت کە عومەر بایەخێکی زۆری داوە بەو زانا و شارەزایانە و بە شوێن و هەوڵ و کۆشش و بار و دۆخیاندا ملی ڕێگای گرتۆتە بەر، تاوەکو خوای گەورە پیرۆزی خستۆتە هەوڵەکانیان و بەرهەمەکانیانی بەروبوومدار کردوون و پێگەیشتوون.

## سێیەم: عومەرو هۆنراوە و هۆنەران:

لەو هەواڵانەی کە پێمان گەیشتوون بزاڤی هۆنراوە لە سەردەمی عومەرو لە مەدینەدا زۆر پێگەیشتوو بووە، بە جۆرێك کە هیچ کتێبێك لە مێژووی عەرەبیدا خاڵی نەبووە لە باسی عومەر، بەتایبەتی لە بابەتی ڕەخنەی ئەدەبیدا، بڵاوبوونەوەی ڕای ڕەخنەگران لە سەردەمی ئەودا بەڵگەبوون لەسەر بوونی گوێگری یان گێڕانەوە، زانراویشە کە کتێبە ئەدەبیەکان لەوانەی کە دراوەتە پاڵیان پشتیان بە بڕواپێکراوان نەبەستووە لە گێڕانەوەدا.

بەڵکو دەبێتە تاکە سەرچاوەیەك بۆ ئەو هەواڵە ئەدەبی و ڕەخنەئامێزانەی کە دەگاتە خەلیفەکانی ڕاشیدین و تەواوی هاوەڵان و تابعین و ئەوانەش کە بە باشی شوێنیان کەوتوون جگە لە هەندێ لەو هەڵبەستە کورتانە نەبێت کە لە سەدەمی پێغەمبەر(ρ)دا وتراونەتەوە و کتێبی فەرموودە پیرۆزەکان گێڕاویانەتەوە،[٢] بەرەو دێرە هۆنراوەکانی نابغەی جەعبینی[٣] و ئومەییەی کوڕی ئەبی صەڵت و حەسانی کوڕی ثابت[٤] هەنگاویان ناوە، ئەو سەرچاوانەی کە پەیوەست بوون بە هۆنراوە و هۆنەرانەوەلە سەردەمی عومەردا بریتی بوون لە کتێبەکانی ئەدەب و ئەدەبیات کە لەم بوارەدا زۆر دەوڵەمەند بووە.

---

١ـ الدور السياسي للصفوة (ص: ٤٦٢-٤٦٣).
٢ـ مجمع الزوائد (١٢٦/٨).
٣ـ المدينة النبوية فجر الاسلام (٩٨/٢).
٤ـ البيان للجاحظ (٢٤١/١) الادب في الاسلام، نايف معروف (ص: ١٦٩).

## ١- عومەر و شیعر:

عومـەر(ﷺ) زۆرترینـی ئـەو خەلیفانـەی ڕاشـدین بـووە کـە ئـارەزووی بـۆ گـوێگرتنی شـیعر و بەهێزکردنی هەبووە، هەروەك ئەوەی کە زۆرترینیان بووە کە خۆی پێوە سەرگەرم کردوە، هـەتا دەڵـێن: عومەرهەر کە کارێکی بۆ هاتۆتـە پـێش بـە سـەریدا تێنەپـەڕیوە مەگـەر دێڕێـك هـۆنراوەی بەسـەردا نەوتبێت،[1] دەگێڕنەوە ڕۆژێك جلێکی لەبەر بووە خەڵکی زۆر بە گـرژی سـەیریان کـردووە، لەبـەر ئـەوە ئەویش بەو هۆنراوەیە وەڵامی داونەتەوە:

لم تغن عن هرمزٍ يوماً خزائنه     والخلف قد حاولت عاد فما خلدوا
أيـن الملوك التي كانت نـوافلـها     مـن كل أدبٍ إليها راكب يـفد
حوض هنالك مورود بلا كـذبٍ     لابد من ورده يوماً كمـا وردوا[2]

شافعی – ڕەحمەتی خوای لی بێت – دەگێڕێتەوە کە عومەر لە پەرۆشیدا دەجولا و دەیفەرموو:

إليك تغدوا قلقاً وضينها     مخالفاً دين النصارى دينها[3]

دێڕە هۆنراوەکەش هی یەکێك لە گاورانی نەجرانە کە موسڵمان بـووە و چـووە فـەرزی حـەج بـەجێ بهێنێت.

بە ئافرەتێکی ژیری ئەوسیان وت بە ئامادەبوونی عومەر (ﷺ): چ دیمەنێك زۆر باشە؟

ئەویش وتی:

قصور بيض في حدائق خضر، عومەر(ﷺ) ئەم هۆنراوەیەی بۆ عودەی کوڕی زەید وت:

كدمى العاج في المحاريب     أو كالبيض في الروض زهرة[4] مستنير

ئیبن عەباس دەفەرمووێت: لەگەڵ عومەردا لە گەرانێکماندا چوینە دەرەوە، بە شەو ڕێمان دەکرد، من لێی نزیك بوومەوە، کە نوکە پێی دای لە تەختاییەکە و فەرمووی:

كذبتم وبيت الله يقتل أحمد     ونسلمه حتى نصرع حوله
ولما نطاعن دونه و نناضـل     ونذهل عن أبنائنا والحلائل

هەروەها فەرمووی:

وما حملت من نافة فوق رحلها     أبر وأوفى ذمة في محمـــد
وأكسى لبرد الخال قبل إبتذاله     وأعطى لرأس السابق المتجرد[5]

---

١ـ البيان للجاحظ (٢٤١/١) الادب في الاسلام، نايف معروف (ص: ١٦٩).
٢ـ الادب في الاسلام، نايف معروف (ص: ١٧٠).
٣ـ مسند الشافعي (ص: ١٢٢) نقلاً عن عمر بن الخطاب، د. أبو النصر (ص: ٢٠٩).
٤ـ هەمان سەرچاوە (ص٢٠٩)، أدب الإملاء للسمعاني (ص: ٧١).
٥ـ تاريخ الطبري (٢١٨/٥).

توێژەر سەرەنجی ئەوە دەدات کە لەبەرکراوی عومەر لە شیعر– کۆن و نوێ – ملکەچی بووە لەوەی، کە پێشهاتی دەکات لەو لەبەرکراوانەی کە هەڵێنجراوە لە خەزن کراوەکانیەوە و بۆی پۆلێن کراوە، بە جۆرێك ئەوەی کە لەسەر زاری ئەو بووە هەر ئەوە بووە کە شیاوی واقعی ئەو ڕۆژەی بووە لە ئاشکرایی و ئامادەیی و پارێزەری خێرادا، بەڵکو ئەو شیعری لەبەر کردووە لەوەی کە دەربارەی ڕق و کینە بۆ ئیسلام دەرچووە، عومەر ئەوەی کە هیندی کچی عوتبە لە دژی حەمزە و موسڵمانان[1] وتبووی دای بە گوێی حەسانی کوڕی ثابت، لەوەی کە حەسان بە جنێو وەڵامی هیندی دایەوە.

بەمەش دەتوانین بڵێین: عومەر خاوەن هەستێکی بڕندە و تیژ و کەسێکی خاوەن پەروا و نەست و بە سۆز بووە، چێژی لە شیعر وەرگرتووە و گێڕاویەتیەوە، ڕایەکی دروستی تێدا دەربڕیووە، لەگەڵ ئەوەی کە شاعریش نەبووە، هەروەك ئەوەی کە زۆربەی توێژەران بەدیان کردووە و ئەوەی کە وتراوە کە شاعیرێك بووە و بە هۆی ئەوەوە ڕەخنەگران و ئەدەبیاتی دادگەر سەلامەت نەبوون، ئەمە دوور بووە لە ڕاستیەوە لەبەر ئەوەی ئەو لەناو گەلەکەیدا وەك کتێبێکی کراوە ژیاوە، هیچ شتێکی لێ نەشاردوونەتەوە، عومەرو کەسانی ترش کۆڕ و کۆبوونەوەی تایبەتی خۆیان هەبووە، ئەگەر شیعرێکی هەبوایە لێیان دەگێڕایەوەو لە نێوانخۆیاندا بڵاویان دەکردەوە ، لە ڕێگەی گێڕدراوانەوە پێمان دەگەیشت هەروەك چۆن ژیانەکەیمان پێ گەیشتووە و هەروەها ڕەخنەگرانی یەکەمینیش باسی ئەوەیان نەکردووە کە عومەر شاعیر بێت، إبن سلام لە کتێبی (الطبقات)ەکەیدا، إبن قوتەیبە لە کتێبی (الشعر والشعراء)ەکەیدا باسی ئەوەیان نەکردووە کەعومەر شاعیر بێت، هەروەك ئەوەی، کە (جاحظ) لەو کتێبانەیدا باسی ڕەوانبێژی و ئەدەبی عومەری کردووە باسی ئەوەی نەکردووە کە عومەر شاعیر بێت.[2]

(البرد) لە هەواڵی عومەردا موتەمەمی کوڕی نویرە– لە لاواندنەوەی کۆتاییدا– مالکی کوڕی نویرە قسەی عومەرە بۆ موتەمەم کە دەفەرموێت: ئەگەر من شعرم بوتایە - هەروەك ئەوەی کە تۆ دەیلێیت– ئەوا بە براکەمدا هەڵمدەدا هەروەك چۆن تۆ بە براکەتدا هەڵتداوە،[3] عومەر لە شیعردا تەنها ئەوەی پێ خۆش بووە کە دەربڕین بووە لە کرۆکی ژیانی ئیسلامی، ئەوەی کە وێنەی بنەماکانی دەکێشێت، واتاکەی دژی واتا و ماناکانی ئاینی خۆی نەبێت، یان لە پلە و پایە و نرخ و بەهای ناگۆڕێت، هەروەها عومەر هانی موسڵمانانی داوە بۆ فێربوونی شیعری جوان و دەیفەرموو: فێری شیعر بن چونکە جوانی تێدا دەخوازێت، ناپەسەندی تێدا ڕێگری دەکرێت، ژیری دانایانە و بەڵگەیە لەسەر ڕیزداری و شکۆمەندی و خوڕەوشت،[4] نامەیەك دەنووسێت بۆ ئەبو موسای ئەشعەری و تیایدا دەفەرموێت: فەرمان بدە بەوانەی پێش خۆت بە فێربوونی شیعر، لەبەر ئەوەی کە شیعر بەڵگەیە بۆ

---

١ـ عمر بن الخطاب (ص: ٢٠٩) محمد أبو النصر.
٢ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢١٠).
٣ـ الكامل في الادب (٢/ ٣٠٠).
٤ـ أدب الإملاء للسمعاني (ص: ٧١).

بڵندی و شکۆداری ئـەخلاق، ڕای دروسـت، ناسـینی ڕەچـەڵەك،[1] عومـەر بەمـەوە ناوەسـتێ و ئـەوەی نیشان دەدات کە شیعر کلیلی دەرگای دڵان و بزوێنەرە بۆ هەستە چاکەکان لە مرۆڤدا، دەربارەی سوودو چاکی شیعر دەفەرمووێت: باشترین پیشەسازیەکانی پیاو چەند دێرێکە لە شیعر کە لە پێداویستیەکانی خۆیدا پێشکەشی دەکات، بە هۆیەوە دڵی بەخشندە دەسۆزێ و دڵی خراپیش ئارەزوومەند دەبێت،[2] بـۆ ئەوەی کە پەروەردەی نەوەکان تەواو بێت، باوکان ئامۆژگاری ڕۆڵەکانیان دەکەن تا باشیەکانی شیعر بە نەوەکانیان نیشان بدەن، عومەر دەفەرمووێت: منداڵەکانتان فێری تـیر ئەنـدازەیی بکـەن، ئـەوەی کـە جوانە لە شیعر بۆیـان بگێڕنـەوە،[3] بـە تەنگـەوە هـاتنی عومـەر لەسـەر شـیعری جـاهلی بـە تونـدی دەردەکەوت و لەوەی بۆ ئەمـە پەیوەندیـەکی هـەبوو بـە قورئانـەوە کاتێـك کـە دەیفـەرموو: پێویسـتە لەسەرتان کە لە دیوەخانەکەی خۆتـان لانـەدەن، ئەوانـەی کـە گوێیـان لـەم قسـە بـوو وتیـان: کامەیـە دیوەخانەکەمان؟ عومەر فەرمووی: شیعری جاهلی، چونکە لەو جۆرە شیعرەدا ڕاڤەی قورئانەکەتان و مانای قسەکانتانی تێدایە،[4] دیارە ئەمەش کۆکە لەگەڵ هەڵوێستی قوتابیەکەیدا عبداللە کوڕی عەباس کە وەرگێڕی قورئانە و دەفەرمووێت: ئەگەر شتێکتان لە قورئان خوێندەوە و ماناکەیتان نەزانی ئەوا لە شیعری شاعیرانی عەرەبیدا داوای بکەن، چونکە شیعر دیوەخانەی عەرەبە،[5] عومـەر وای بینیـوە کـە شاعر جاهیلەکان لای دروست ترین زانیاری و زانست بووە، دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: بەڕاستی شـیعر زانست و زانیاری گەل و هۆز بووە، هیچ زانیاریەکی لەمە دروست تریان نەبووە،پاشـان ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام هات و عەرەب بەهۆی سەر قاڵ بوون بە کاری جیهادو غـەزای ڕۆمـەکان لێـی دابـڕاو ڕقـی لـە شیعر و گێڕانەوەشی بویەوە،کاتێ کە ئیسلام پەرەی سەندو پاکسازیەکان هاتنە پێشێ و عەرەبەکان لە وڵاتاندا دڵنیا بوون،گەرانەوە بۆ گێڕانەوەی شیعرو نەپـەنایان بـردوە بـۆ دیـوە خـانێکی تۆمـار کـراو، نەکتێبێکی نوسراو، ئەمەیان داناوەو لە عەرەبدا ئەوەی کە بە مردن و کوشـتن تێـدا چـووە ڕۆیـشتوەو، کەمێك لەمانە پـارێزراون و زۆربـەی زۆریـان ڕۆیـشتون،[6] عومـەر(ﷺ) ئـەو جـۆرە شـیعرانەی خـۆش ویستووە کە دڵی پڕ دەکات لە نووری ئیمان، ویژدانی عومـەر بـە وێنـەی ئیـسلام بـەرز و بڵـند بـووە، خاوەن بەهایەکی شـکۆمەند بـووە، کـە هۆنراوەیـەك وەریگێـڕاوە کـە گەشـەی سـەندووە لـە خواناسـی دروستدا، کە ئەخلاقی باشی تێدا نەخشەکێشاوە، بە جۆرێـك جـەختی ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلام لەسـەر کردۆتەوە، داوای لە شوێنکەوتووەکانی کردووە بە دەست لە ملان بوونی، بەڵام جگە لەمە ئـەوەی کـە ئاراستەی پێچەوانە بووە لەگەڵ ئەم بنەمایـەدا و ئـەم پلـە و پایـەدا، ئـەوا عومـەر لەسـەری دواوە و بەرپەرچی داوەتەوە، لە بەرامبەر خاوەنەکانیدا هەڵوێستی توندی نواندووە، لەمەشدا هەست و نەستی تیژ و پڕندەیی و ئارەزووی بەرز و بڵندی پشتگیری کردووە کـە دابـەزیووە بـۆ نـاخی دەقـە ئەدەبیـەکان

١ـ العمدة لأبي رشيق (١/١٥).
٢ـ الادب في الاسلام، د، نايف معروف (ص: ١٧١).
٣ـ الكامل في الادب (١/٢٢٧).
٤ـ المعجم الكبير للطبراني (٧/١٢٩) الادب الاسلامي (ص: ١٧١).
٥ـ الادب في الاسلام (١٧١)، العمدة لأبي رشيق (١/١٧).
٦ـ طبقات الشعراء إبن سلام ( ١/٢٥)، أدب صدر الاسلام (ص: ٨٧).

ئەوەی کە تیایدایە لە بەهای پەروای هەڵماڵیوە کە لەگەڵ ئیسلامدا ڕێدەکات و بنەماکانی پەسەندی ناکات.[1]

## ٢- عومەر و حەتیئە و زەبرقان کوڕی بەدر:

دەگێڕنەوە کە حەتیئەی شاعیر- ئەبو مەلیکە - جەرولی کوڕی کە لە هۆزی قەتیعەی کوڕی عەبسە- بە هۆی بێ پێزیەوە لە دەست کەس و کاری هەڵاتووە و بەرەو عێراق کەوتووەتە ڕێ، بە مەبەستی بژێوی، لەوێ گەیشتووە بە زەبرقان کوڕی بەدر کوڕی ئیمروئول قەیس کوڕی خەلەفی ئەلتەمیمی سەعدی[2] کە لە ڕێگەیدا بووە بۆ لای عومەر و هەندێ لە صەدەقەی هۆزەکەی پێ بووە، لێرەدا زەبرقان حەتیئە دەناسێت و دەیدوێنێ و بە حاڵی دەزانێت، لەبەر ئەوە داوای لێ دەکات کە لای کەس و کارەکەی لابدات، و چاوەڕوانی کەناری خۆی بکات، حەتیئە لای ئەوان لایدا، بەڵام بەغیض کوڕی عامر کوڕی شەماس کوڕی لوئەی کوڕی جەعفەری (أنف الناقة)یە گرت، کێبڕکێ کاری زەبرقان بوو،دەیتوانی ئەم کارەی لێ تێك بدات و بۆ لای خۆی حەتیئە ڕابکێشێت و گومڕای بکات لەزەبرقان و بێتە هۆی پاڵنەری بە جنێودان پێی، دەست بکات بە پیاهەڵدانی هۆزەکەی شیعرە هەجوەکانی گەیشتە چەند دانەیەك و زەبرقان دانەیەکیانی برد بۆ عومەر کە حەتیئە تیایدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ماكان ذنب بغيض لا أبالكم | في بائس جاء يحد وآخر الفاس |
| لقد مريتم لو أنّ درتكم | يوماً يجيء بها مسمي وإبساسي[3] |
| فدع المكارم لاترحل لبغيضها | وأقعد فإنّك أنت الطاعم الكاسي |
| من يفعل الخير لايعدم جوازيه | لايذهب العرف بين الله والناس |
| ما كان ذنبي إن ملت معا ولكم | من آل لأبي صفاة أصلها راسي |
| قد ناضلوك فسلوا من كتانتهم | مجداً تليداً ونيلاً غير أنكاسي[4] |

باشتر زەبرقان کێشەکەی بەرزکردەوە بۆ لای عومەر و هات بۆ لای پێی وت: حەتیئە جنێوی پێ داوم، عومەر فەرمووی : چی پێ وتووی؟ زەبرقان وتی: ئەو پێی وتووم: (دع المكارم لاترحل لبغيضها....هتد) عومەر فەرمووی: من جنێو لەمەدا نابینم بەڵکو ئەمە سەرزەنشت کردنە، دواتر زەبرقان وتی: ئایا پیاوەتی من نەگەیشتۆتە ئەوە مەگەر هەر بخۆم و بپۆشم؟ پاشان عومەر فەرمووی: حەسانم بۆ بهێنن، حەسانیان هێنا و لێی پرسی، ئەویش فەرمووی: جنێوی پێ نەداوە، بەڵکو ڕیقنەی کردۆتە سەری، لەبەر ئەوە عومەر زیندانی کرد،[5] عومەر(ﷺ) شارەزاترین خەڵك بووە بە شیعر بەڵام لێرەدا و لەم پێگەی دادوەریەدا بانگی پسپۆڕان دەکات ئینجا پاش ئەوە فەرمانی خۆی دەردەکات،

---

١ـ عمر بن الخطاب، محمد أبو النصر (ص: ٢١٨).
٢ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢١٩).
٣ـ الإبساس: دعاء الناقة بقولهم، بس بس طلب لإدرارها.
٤ـ عمر بن الخطاب، محمد أبو النصر (ص: ٢٢٠).
٥ـ الادب في الاسلام (ص: ١٧٢).

عەقاد لەم کێشەیەدا دەربارەی عومەر دەڵێت: (.... ئەوەی لەبیر چوو کە خۆی ئەدەب دۆستێکی گێڕەوەیە، جگە لەوەی کە دادوەرە باسی هیچی تری نەکرد، کە سنوور دوور دەخاتەوە لە هاووێنەیی، فەرمان نادات بەوەی کە دەیزانێت لەگەڵ ئەوەی کە خاوەن پیشەکان دەیزانن،[1] کاتێك کە حەتیئە هەستی بە سەختی و دژواری ڕۆژانی ناو بەندیخانە کرد سۆزی عومەری جوڵاند بە چەند دێڕە شیعرێك بۆ ئەوەی کە دراوەتە پاڵی، ئەمەش لەسەر ڕێگەی نابغە لە پۆزشەکانی بۆ نوعمانی کوڕی مونزیر، کاتێك کە دەڵێت:

وأخذت أطراف الكلام فلم تدع شتماً يضر ولا مديحاً ينفع

وحميتني عرض اللئيم فلم يخف ذمي وأصبح آمن لايفزع

وا دیارە، کە حەتیئە قایل نەبووە لە بڕیارەکەیدا بەوەی وازهێنان لە جنێودان بە تەواوی لێ گەڕێ، بۆیە عومەر بانگی کرد و لە تەنیشت خۆی داینا، هەڕەشەی زمان بڕینی لێ کرد، حەتیئە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، سوێند بە خوا من جنێوم بە دایك و باوکم داوە، جنێوم بە ژنەکەم و خۆیشم داوە، لەبەر عومەر(ﷺ) پێکەنی و لێی خۆش بوو،[2] حەتیئە لە سەردەمی عومەردا وازی لە جنێودان هێنا، لێرەدا ڕووداوێکی هاوشێوە بەمە هەیە کە خاوەنی (زهر الآداب) باسی دەکات و دەڵێت: هۆزەکەی عەجلان شانازیان بەم ناوەوە دەکردو بەم جوانی و شان و شکۆمەندیەدا خۆیان بەگەورە دەزانی لەکاتێکدا کە عبداللە کوڕی کەعبی باپیریان ناوی عەجلانی لێناوە لەبەر ئەوەی کە زۆر بەپەلە بووە لە میوانداری کردن، ئەمە وەك شەرەفێك وا بووە بۆیان هەتا نەجاشی کە ناوی— قەیسی کوڕی عەمری کوڕی کەعبە— بە هۆنراوەیەك جنێوبارانی کردوون کە دەڵێت:

أولـــئك أخوال اللعين وأسرة الاهـجين ورهـط الــواهـن المتذلـل

وحاسمي العجلان وإلا لقوله خذ العقب وأحلب أيها العبد وأعجلُ

دەگێڕنەوە کە هۆزی عەجلان ئامادەبوون لەسەر نەجاشی بەهۆی ئەو شیعرەی کە وتبووی ئەمەیان گێڕایەوە بۆعومەر(ﷺ) ئەویش زیندانی کردو دەڵێن جەڵدی لێداوە،[3] عومەر سزای خەڵکی دەدا لەسەرشیعری هیجاو کێشەکەش تەنها بەوشێوەیە نەبوو، بەڵکو سزای خەڵکی دەدا لەسەر چەندین جۆری تری شیعر لەوانە: هەڵکوتانە سەرناموسی موسڵمانان، خروشانی ڕق و کینەی نێوان موسڵمانان، هەڵکوتانە سەرناموسی ئافرەتی موسڵمانان، دکتۆر(واضح الصمد) ئەمەی ڕوون کردۆتەوە.[4]

## ٣- شیعر دڵنیایی عومەری گۆڕی بۆ سۆزو بەزەیی:

ئومەییەی کوڕی ئەسکەری کەناغە کە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی هۆزەکەی، کوڕێکی هەبوو بە ناوی (کلاب) لەسەردەمی خەلافەتی عومەردا(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە و ماوەیەك تیایدا مایەوە،

---

١ـ عبقرية عمر (ص: ٢٤٦).
٢ـ الكامل في الادب (٢/٧٢٥).
٣ـ زهر الآداب للقيرواني (١/٥٤) الادب في الاسلام (ص: ٩٢).
٤ـ أدب صدر الاسلام، د. واضح الصمد (ص: ٩٢-٩٣).

پاشان ڕۆژێك گەیشتە طلحەی کوڕی عبیداللە و زوبێری کوڕی عەوام و لێی پرسین: چ کارێك لە ئیسلامدا زۆر باشە؟ پێیان وت: جیهاد، ئەویش داوای لە عومەر کرد و عومەر پڕ چەکی کرد و کردیە سەربازێکی جەنگاوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فارسەکان، بەم شێوەیە ئومەییە هەستایە سەر پێ و بە عومەری وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەمڕۆ لە ڕۆژگارەکانی منە، ئەگەر لە گەورەیی تەمەندا نەبوومایە، لەم کاتەدا کلابی کوڕی کە کەسێکی لە خواترس و دیندار بوو هەستایە سەرپێی و وتی: بەڵام من ئەی ئەمیری باوەڕداران، گیانی خۆم دەفرۆشم و دونیای خۆم دەفرۆشم بە دوارۆژم و باوکی خۆی پێدا هەڵواسی کە لە سێبەری خورمایەکدا دانیشتبوو و پێی وت: لەو دایك و باوکە پیر و لاوازەت دوور مەکەوە کە بە منداڵی پەروەردەیان کردووی تاوەکو ئەگەر پێویستیەکیان پێت بێت لێیان دوور دەکەویتەوە، ئەویش وتی: بەڵێ لێیان دوور دەکەومەوە چونکە چاکترە بۆم، پاش ئەوەی کە باوکی دواکەوت و وەك جەنگاوەرێك چوویە دەرەوە، باوکی لە سێبەری دار خورمایەکدا بوو، لەم کاتەدا کۆترێك بانگی بێچووەکانی دەکرد، کە پیرە بینی گریا و دایکیشی بە هەمان شێوە کە ئەم دیمەنەی بینی گریا و پاشان باوکی دەستی کردە دارشتنی ئەم چەند دێڕە و وتی:

لمن شيخان قد نشدا كلاباً    كتاب الله لو قبل الكتـــابا
أناديه فيعرض في إبـــــاء    فلا وأبي كلاب ما أصـــابا
لذا هتفت حمامة بطن وج[1]    على بيضاتها ذكراً كـــلابا
فأن مهاجرين تكنفـــــاه    ففارق لشيخه وخطئاً وخاباً
تركت أباك مرعشةً يـــداه    وأمك ماتسيغ له شـــرابا
تنفض مهده شفقاً عليـــه    وتجنبه أبا عرها الصعـــابا
فإنك قد تركت أباك شيخاً    يطارقه[2] أينقاً[3] شرباً[4] طرابا
إذا أرتعشن أرقالاً[5] سراعاً    أثرن بكل رابية ترابـــــا
طويلا شوقه يبكيك فـرداً    على حزنٍ ولايرجو الإيابـــا
فإنك والتماس الأجر بعدي    كباغي الماء يتبع السراب[6]

ئەو دەمە ئومەییە نابینا بوو چاوەکانی لە دەست دابوو بۆیە چاوساغەکەی دەستی گرت و بردیە ژوورەوە بۆ لای عومەر کە لە مزگەوتدا دانیشتبوو ئومەییە ئەم هۆنراوەیەی بۆ هۆنیەوە:

أعاذل قد عذلت بغير عـــلم    وما تدرين عاذل ما ألاقـــي
فأما كنت عاذلتي فـــردي    كلاباً إذ توجه للعرقـــــه

---

١ـ اسم واد بالطائف.
٢ـ يطارقه: يضرب.
٣ـ أنيقا: جمع الناقة.
٤ـ شربا: ضامرة.
٥ـ الارقال: السير السريع.
٦ـ عمر بن الخطاب، محمد أبو النصر (ص: ٢٢٦).

ولم أقض اللبانة من كــــلاب عذاة غد وآذن بالفـــــــــراق
فتى الفتيان في عسر ويـــــسر شديد الركن في يوم التـــلاقي
فلا وأبيك ما باليتت وجـدي ولا شفقي عليك ولا إشتياقي
و إيفادي عليك إذا شتوفـــا وضحك تحت نحري واعتناقي
فلو فلق الفؤاد الشديد الوجد لهم سواد قلبي بإنفـــــلاق
سأستعدي على الفاروق ربــاً له دفع الحجيج الى بســـاق[1]
وأدعوا الله متجهداً عليـــه ببطن الاخشبين[2] الى دقـــاق[3]
إن الفاروق لم يردد كــــلاباً على شيخين هامهـــا زواق[4]

بەم شێوەیە عومەر بە کوڵ گریا و نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری و فەرمانی پێدا بە بەرزکردنەوە و دیاریکردنی کلاب و ئەویش دەست بەجێ ناردی، کلاب هات و عومەر فەرمانیدا کە بیکەنە ژوورەوە و پاشان ناردیان بە دوای ئومەییەدا، عومەر ماوەی یەك کاتژمێر قسەی لەگەڵ کرد و لێی پرسی: خۆشترین شت لە ڕۆژگاری ئەودا چی بووە بۆی؟ ئومەییە وتی: کلاب خۆشترین شتە کە لەلامە و من بۆنی پێوە دەکەم، دواتر فەرمانیدا بە کلاب و هاتە دەرەوە بۆ لای، پیرە بازێکی دا و بۆنی بە کوڕەکەیەوە دەکرد و دەگریا، بەمەش عومەر(ﷺ) کەوتە گریان،[5] ئامادەبوانیش بە هەمان شێوە و بە کلابیان وت: داری دایك و باوکت ببە و هەوڵیان لەگەڵ بدە هەتا ماون، دواتر کاروباری خۆت لە دوای ئەوە بە دەستی خۆتە، عومەر فەرمانی دا کە شتێکی پێ بدەن، لەگەڵ باوکیدا بەڕێی کرد، بەم شێوەیە هەردوو سوارەکە بە شیعرێکی باوکی گۆرانیان دەوت کە دەڵێت:

لعمرك ماتركت أبا كــــلاب كبير السن مكتئباً مصابا
و أما لايزال لها حنـــــــين تنادي بعد رقدتها كـــلابا
لكسب المال أو طلب المعاني ولكني رجوت به الثـــوابا

کلاب لە باشترین موسڵمانان بووە و بەردەوام لای دایك و باوکی مایەوە هەتا مردن.[6]

لێرەدا ڕووداوێکی هاوێنە هەیە بە جۆرێك شیبان کوڕی ئەلموخەبەل ئەلسەعدی لە شاعیری ناسراو لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەرچوون بۆ جەنگی (الفرص)، باوکی (ئەلموخەبەل) بە توندی خۆی بۆ خواردەوە، چونکە باوکی بە ساڵاچوو و پەککەوتە بوو، ئارامی لێ بڕابوو، لێرەدا هۆنراوەیەکی وت کە تیایدا هاتووە:

أيهلكني شيبان في كل ليـــــلة لقلبي من خوف الفراق وجيــــب

---

١ـ جبل عرفات.
٢ـ جيلان بمكة.
٣ـ موضع.
٤ـ زواق: إشراف على الموت.
٥ـ الادب الاسلامي، د. نايف معروف (ص: ١٨٠).
٦ـ عمر بن الخطاب، محمد أبو النصر (ص: ٢٢٨).

فإني حنت ظهري خطوب ألا ترى  أرى الشخص كالشخصين وهو قريب
ويخبرني شيبان أن لن يعقبني  تقع إذا فارقتني وتحوب[1]
فلا تدخلنَّ الدهر قبرك حوبه  يقوم بها يوماً عليك حسيب[2]

کاتێك عومەر ئەمەی بیست دڵی بۆی نەرم بوو و دەستی کردە گریان، نامەیەکی نووسی بۆ سەعد تا شیبان بگێڕێتەوە، ئەویش گەراندیەوە بۆ لای باوکی،[3] ئەم ڕووداوە دواین ڕووداوی لەم چەشنە نەبووە بە جۆرێ عومەر بە شیعرکاریگەربێت بەڵکو چەندین ڕووداوی لەم شێوەیە باس دەکرێن کە بەسەر عومەردا هاتووە لەوانە:

خەڕاش کوڕی ئەبو خەڕاشی هەزلی لە ڕۆژانی دەسەلاتی عومەردا کۆچی کرد و لەگەڵ موسڵمانانندا بەشداری غەزاکانی دەکرد، لە زەوی دوژمندا تەوق درا پاشان ئەبو خەڕاش هاتە مەدینە، لەبەر دەم عومەر دانیشت و سکاڵای تاسەی خۆی بۆ کوڕەکەی دەربڕی کە پیاوێکە کەس و کاری تیاچوون و براکانی کوژراون، ئەو هیچ پشتیوانکار و کۆمەککارێکی نیە جگە لە خەڕاشی کوڕی، ئەویش چووە بۆ غەزا و بەجێی هێشتووە، ئەبو خەڕاش لە پارچە شیعرێکدا دەڵێت:

ألا من مبلغ عني حراشاً  وقد يأتيك بالنبأ البعيد
وقد يأتيك بالاخبار من لا  تجهز بالحذاء ولا تزيد
تناديه ليعقبه كليب  ولا يأتي لقد سفه الوليد
فرد أناءة لا شيء فيه  كأن دموع عينيه الفريد
وأصبح دون غابقةٍ وأمسى  جبال من جرار الشام سود
ألا فاعلم خراش بأن خير  المهاجر بعد هجرته زهيد
رأيتك وإبتغاء البرد دوني  كالمغضوب اللبان ولا يصيد[4]

عومەر زۆر بەمەکاریگەربوو، نامەیەکی بە گەرانەوەی خەڕاش بۆ لای باوکی نووسی، فەرمانی دا هەر کەس باوکی پیری هەیە بەشداری غەزا نەکات مەگەر پاش ئەوەی مۆڵەتی دەدەن.[5]

بەم شێوەیە وردبینی کاریگەری ئەمیری باوەڕداران بە شیعر دەکەین، لەبەر زۆری کاریگەری عومەر دەگری، لەگەڵ ئەوەی کە بەوە ناسراوە ڕەقە و توندە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەرهەستی بڕندەیی و نەستی مرۆیی، بە جۆرێك باوکانی پەککەوتە بە تاسە و پێویستیان بە کوڕەکانیانە، هەروەها هەموو مرۆڤێکی ستەم لێکراو یان دوڕاو لەسەر کاروباری خۆیان بەشداری دەکەن، ئەمەش هەر ئەوەیە کە لە هەست و نەستی مرۆڤ دێتە کایە و لەگەڵ ئێمەدا هەڵوێستی لە بەرامبەر شیعری هیجائیدا تێپەڕی.[6]

---

١ـ تحوب: تأثم.
٢ـ حوب: ذنب.
٣ـ أدب صدر الاسلام (ص: ٩٠).
٤ ـ عمر بن الخطاب، محمد أبو النصر (ص: ٢٣٠).
٥ـ الاغاني للأصفهاني (١٣/١٨٩).
٦ـ أدب صدر الاسلام (ص: ٩٠).

## ٤- ویستی ڕەخنەی ئەدەبی لای عومەر:

عومەر لەو کەسانە بوو کە زۆر کاریگەربووە بە پێغەمبەر(ρ) تەنانەت لە سەرنجدانیشدا بۆ ئەدەب، لە حوکمیدا بەسەر شیعر و شاعیراندا، هەر لە عومەرەوە چەندین ڕاوبۆچوون و حوکمی ڕەخنەگرانە بۆ چەند دەقێکی ئەدەبی هاتوە، زۆربەی ئەوانەی کە لێی گێڕاوەتەوە، - کە خەلیفە - بووە - واتا لە ١٠ساڵەی دوایینی تەمەنیدا — کە ئەمەش شوێنەواری پێش بینیەتی لە کۆمەکیدا لە ماوەی خرۆشانی ئەدەبی کاتێك کە بۆی تەواو دەبێت ( بیردۆزی تەواوکاری) ئەوەی کە عومەر دەیبینێت، ئەوەش بریتیە لەوەی کە لای ئەو بەرهەمێکی ڕۆشنبیری عومەری هەیە لەو قۆناغە پێگەیشتووەدا، لەبەر ئەوە دەکرێت کە گەمارۆ بدرێن بەو ڕووبارانەی کە هەستی ڕەخنەئامێزیان شەوقدار بوون، بیری ڕەخنە لای گەشەیان کردووە بە جۆرێك لە پەند وەرگرتنە لە ژیانی بە هەردوو بەشەکەیەوە واتا جاهیلی و ئیسلامی لەسەر ئەم شێوازە:

- عومەر لە سەردەمی جاهلیدا یەکێك بووە لەو بەرپرسانەی کە پارێزگاریان لە بەهای جاهیلی کردووە، لە ناو قورەیشدا پلە و پایەی خۆی هەبووە، قورەیشیش لەو کاتەدا بە عەرەب دەورە دراوە و لانکەی بە یەکگەیشتنی دڵەکانیان بووە، ئەو لە سایەی ئیسلام و لە سەردەمی خەلافەتیدا بە هەمان شێوە بووە.

- عومەر شارەزای شیعری عەرەبی بووە چ جاهیلی و چ ئیسلامیش، وەك وەرگرێك بۆ ئەوەی کە هاوبەش پەیداکەران و هەڵگەراوەکان و دوژمنانی ئیسلا لە شیعر دەیلێن لە دژی ئەم ئاینە بێگەردە.

- عومەر ئاگاداری بارودۆخی عەرەب بووە لە سەردەمی جاهیلی و ئیسلامیشدا لە ڕووی بیروباوەڕ و مێژوو و ڕەچەڵەك و ڕەفتار و زانستەوە، زانیاریەکەی بەم شتانە ڕێگای ڕەخنەی ئاخاوتنی بۆ ڕووناك کردەوە و ڕێگەی بۆ خۆش کرد کە ڕای خۆی تیا دەربڕێت .

-سووربوونی عومەر لەسەر ڕووپۆش کردنی کۆڕە ئەدەبیەکان هەر لەو دەمەی کە پێی گەیشتووە، خاڵی نەبووە لەوتنی شیعر و پێشنیازکردنی ئەدەب و چێژ وەرگرتنی لێی ڕا دەربڕینی تیایدا، تەنانەت عومەر موسڵمان بوو کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ئەو پیاوانە ئامادەیان دەکرد کە بەو شێوە باشە دەهاتنە ئاخاوتن کە بەروبوومی باشە، ئەمەش یەکێك بوو لەو سێ شتەی کە عومەر لە دونیا و لەپاش نوێژ و جیهاد لە ڕێگەی خودا خوازیاری بووە و ئارەزووی کردووە، هەروەها عومەر یەکێك بووە لە لەبانیەکانی پێغەمبەر(ρ)، کاتێك کە خەلیفە بوو لە تەنیشت مزگەوتەوە خێوەتێکی هەڵدا کە ناوی لێنابوو چەم ئەم خێوەتگەیە ئالوودە بوانی شیعر و قوتابیەکانی کاتیان تێدا بەسەر دەبرد.[١]

عومەری هاوەڵی پێغەمبەر(ρ) بریسکەی پایەبەرزی و سەرنجی کونکەرە و تروسکەدەری پڕ ئامانج و زیرەکی بڕندە هاوەڵ بە ئیلهام و ئاسکی پێشبینی هەبووە و ئەمەش وای لێکردووە کە مانای شتەکان بپێکێ و نزیك نەبێت لەوەی کە هەڵەی تێدا بکات، لەگەڵ ئەمەشدا هەستی تەواوی هەبووە

١ـ عمر بن الخطاب،د. محمد أبو النصر (ص: ٢٤٤).

بەرامبەری ئەوەی کە دەیخوێندەوە یان دەیبیست، ئارەزوویەکی زۆری هەبووە بۆ دەقی ئەدەبی و ئەو بەهاو جوانی و پاراوەییەی، ئەمەش بۆ تێپەڕاندنی هەستی پێی و هەست کردن بووە بە ڕاستیەکانی و مەبەستەکانی،[١] عومەر(ﷺ) واتا ئامانجدارەکانی بە کۆیەندی دڵی وەردەگرت، خۆی پێ قایل دەکرد، سەرسامی و ڕێزلێنانی خۆی دەربارەی ڕوون دەکردەوە، دەگێڕنەوە کە موتەممەمی کوڕی نویرە بە مالکی براکەیدا هەڵیاوە، کە لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا بە دەستی خالدی کوڕی وەلید تیاچووە، کاتێك کە موتەممەم دەگاتە ئەوەی کە دەڵێت:

لایمسك الفحشاء تحت ثیابه حلو شمائله عفیف المئزر

لەم کاتەدا عومەر هەستایە سەرپێ و فەرمووی: بەو شێوەیەی کە تۆ بە مالکی براتدا هەڵدەدەیت بریا منیش بە زەیدی کوڕی خەتابی برامدا هەڵمبدایە، پاشان موتەممەم پێی وت: ئەی ئەبو حەفص، سوێند بە خوا ئەگەر بمزانیایە کە براکەم وەك براکەی تۆ بووە ئەوا پیام هەڵنەدەدا، بۆیە عومەر فەرمووی: هیچ کەسێك وەك تۆ سەرەخۆشی لێ نەکردووم.[٢]

لەم ئاخاوتەدا لە تێگەیشتنی دەق و ڕێزلێگرتنی زیندوویەتیدان عومەر بە بەهای دەقی ئەدەبی پێگەیشت و بەرزبوویەوە و پێی ناوزەد دەکرا، تا جێگەیەك کە بەهای تەواوی زێڕ و زیوی دونیای پڕوپووچ نەیدەتوانی قەرەبووی بکاتەوە، لە عومەر(ﷺ) دەگێڕنەوە کە بە هەندێ لە کوڕانی هەڕەمی کوڕی سنانی فەرمووە: هەندێ لەو هۆنراوانەم بۆ بڵێ کە زوهێر بۆی وتوون، ئەویش هۆنراوەیەکی بۆ وت، عومەر فەرمووی: بە ڕاستی بە چاکی شتی تێدا وتوون ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئێمە شتمان پێ دەبەخشی و پاشان گەورە بووین، عومەر فەرمووی: ئەوەی کە ئێوە پێتان دا ڕۆیشت بەڵام ئەوەی کە ئەو پێێ داون هەر دەمێنێ،[٣] ئەمەیە ئەو ڕووبارانەی کە ئارەزوو و حەزی ڕەخنەگرانەی عومەری پاراو کردووە و مولکداری ڕەخنە ئامێزانەی ڕەونەقدار کردووە، وای لێ کردووە کە بچێتە سەر ئەم شوێنە ئەدەبیە لە سەردەمی ئیسلامدا.[٤]

هەروەها ئەو پێوەرانەی کە عومەر وەریگرتوون لە خۆنەویستیدا دەق بە دەق، یان پێشکەشکردنی بە شاعیرێکی تر و جگە لە خۆی، ئەوە پێوەری شێوزەیی بوون کە بریتین لە:

**- پاکی (ئێریاتی) عەرەبی:**

عومەر حەزی زۆر لەسەرلەسەر پاکی و دروستی زمان پاراوی بوو، لە ئاواز سکاڵای دەکرد، لێی هەڵدەهات، ئاوازیش لە دەربڕیندا بەس بوو بۆ ئەوەی کە دەق بخات و پەسەندی نەکات، بەڵکو سزای ئەو کەسەی دەدا کە ئاوازێکی لێ بکەوێتەوە.[٥]

---

١ـ عمر بن الخطاب،د. محمد أبو النصر (ص: ٢٤٦).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٤٧)، الکامل للبرد (٢/٣٠٠).
٣ـ المدینة النبویة فجر الاسلام والعصر الراشدي (١٠٦/٢).
٤ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٤٨).
٥ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٤٨).

## - خۆشی ئاخاوتن و دوورکەوتنەوە لە دژواری و ئاڵۆزی:

دەگێڕنەکە عومەر(ﷺ) لە زوهێر نزیك بوویەو شیعرەکانی پێ باش بوون، بیانووی بۆ ئەم باشیە ئەوەو لە نێو شیعرەکانیدا شتی خراب نەبوو شوێن خراپیەکانی نەدەکەوت، شتێك لە ناخی کەسێکدا نەبووایە پیای هەڵنەدەدا[1] و ناراستی و خرابی شیعریش لەوەدایە : کە ووشەکان ئاڵۆز بکرێن و هەندێکیان زاڵ بن بەسەر هەندێکی تریاندا هەتا دەستی تێ بدرێت و چاوپۆشی لێ بکرێت، قسەکان کەنار بخرێن: کەنارخراوە نامۆکانی.[2]

ئەم شوێنەوارەش بنەماکانی ئەو ڕووناکیە ڕوون دەکاتەوە کە ئیسلام پێی ڕازی: ئەویش بریتیە لە شیعرێکی مانا ڕوون، ووشە لێك نزیك، دووری لە پێوەنان و زیادە ڕەوی... لەبەر ئەوەی شیعر بانگەشە بۆ کێشەیەك دەکات و جەماوەر دەدوێنێت، دەشێ کە هەر واتادار بێت،[3] شایانی باسە زانایانی ڕەوانبێژی، ئەوانەی ئەم دواییە بنەماکانی ئەم زانیاریانەیان تۆمار کردووە، دەرنەچوون لە توێژینەوەکانیاندا لەسەر زمان پاراوی وشە و ڕەوانبێژی ئاخاوتن و پاراویدا، سەبارەت بەوەی کە عومەر لەم بوارەدا وتوویەتی، ئەگەرنا ئەوەی کە پۆلێن کردن لە بەرنامە و ڕێکخستن و بەش بەش کردن لای هەندێکیان ویستبێتی.[4]

## - ڕوونی و ئاشکراکردن:

عومەر(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ): ئەەەوەی بۆتەڕێگرم لە ناردنی ڕێنمونی بۆتان نەبوونی زانستی پێویستە لەسەر ناوچەکەتان،و زانیاری لەسەر دوژمنەکەتان، لەبەر ئەوە داواکارم باسێکی حاڵ و وەزعی موسڵمانان و ئەو شارو گوندانەی کەوتونەتە نێوان ئێوە و مەدائ باس کەی بە جورێك کە بە خوێندنەوەی وێنەو نەخشەیەکی ئەو شوێنەم بێتە بەر چاو،بزانم ئیوە چی دەکەن و خەریکی چ دبن..[5]

ئەم بەشەی کۆتایی (بزانم ئیوە چی دەکەن و خەریکی چ دبن) بە ڕوونی لێرەدا خۆنەویستی عومەر لە ڕوون و ئاشکرایی لە ئاخاوتندا دیارە، هەروەك ئەوەی کە خۆنەویستی ڕاستی و دروستی تێدایە و وێنەی کێشاوە ئەمەش پێوەرێکی ڕەخنەیی وردە هەروەك ئەوەی کە بۆ هەموو دادوەرەکانی نووسیووەو ئاگاداری کردوونەتەوە لە ڕوونی لە ڕا دەربڕین سەبارەت بە تێگەیشتنی گرفتە قەزائیەکان... تێگەیشتن لەوەی کە زمانی دەگێڕێت لە سینەتدا، سەبارەت بە کار و بارێك کە ویستی لەسەری بدوێت تیایدا هاتووە: من شتێکم دەگێڕایەوە کە سەرسامی کردم، بەم شێوەیە عومەر بەدی دەکات کە وشە هۆکاری تێگەیشتن و کەرەستەی هیدایەت و ڕوون کردنەوەیە، نەك ڕێگەیەك بێت بۆ نامۆیی و کوێرە کردن، پاشان نکۆڵی لە بەرەو کەنار چوون وگۆشەگیر بوون.[6]

---

١ـ المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي (١٠٢/٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥٠).
٥ـ مجموعة الوثائق السياسية (ص: ٤١٤).
٦ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥١).

### - پێویستە وشەکان بە ئەندازەی واتاکان بن:

لەو فەرمودانەی لێوەی گێڕدراوەتەوە: ئامان لە ئێوە و کۆت و بەند کردن،[١] دارەمی دەفەرموویت: واتا لە ئاخاوتن: زیادەڕۆیی تیایدا، کەواتە عومەر دوورکەوتنەوەی لە خۆهەڵقورتاندن دەوێ، لەبەر ئەوەی کە ئەمە ون بوون و لە دەست دانێکە بۆ ناوەڕۆکی بیرۆکەکە و ڕەوانەیە بۆی و خاڵی نیە لە دووبارە بوونەوەی نائومێدی و خراپەکارانە، بە دڵاچوونی دەقەکە ون دەکات و جوانیەکەی دەڕەوێتەوە،[٢] عومەر (ﷺ) دەفەرمووێت: یەك پەلی ئاخاوتن لە یەك پەلی زمانداپە و بەو شێوەیەی کە دەتوانن کەمی بکەنەوە.[٣]

### - جوانی وشە لە شوێنی خۆیدا:

عومەر(ﷺ) لەو وتانە هەڵدەهات کە لە شوێنی ناشیاوی خۆی دادەنرا، چونکە واتاکەی لەنگ دەکات و برسقە و بایەخی وشە دەبات، لەمەشدا ئەو پەیڤەی عومەر بۆ سەحیحی عەبد بەنی ئەلحەسماس هاتووە بە مەبەستی شوێن کەوتنی لەسەر دێرە هۆنراوەیەکی کە تیایدا دەڵێت:

عميرة ودع أن تجهزت غادياً     كفى الشيب والاسلام للمرء ناهياً

عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ئەگەر ئیسلام لە پیربوون بچوایەتە پێش ئەوا پاداشتی دەدایتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە عومەر هەستی بە حەز و ئارەزووی کردووە، کە ئیسلام ڕێزداری کردووە و پێی گەیاندووە، ئیسلام لە ناخی ئیمانداردا بەهێزترین بەربەستە لە پیر بوون ، شیاوی باسە کە لە دەقەکەدا شتێك پێشکەش بکات کە لەگەڵ بایەخ و کاریگەریدا لە ناخەوە ڕێ بکات، ئەمەش ئەوەیە کە ئەو پارچە هۆنراوەیە خۆی لێ بەدوور دەگرێت.[٤]

### - جوانی دابەشکردن:

هەروەها عومەر (ﷺ) سەری سوڕدەما لەو دێڕە هۆنراوەیەی کە باس لە جوانی هونەر و هەستەکانی چێژ وەرگرتن و ژیری لەسەر یەکسانی و ئەم سەرسوڕمانەی دەردەبڕێت لە دووبارە کردنەوەی دێڕە هۆنراوەکەدا، دووبارە کردنەوەیەك کە گەشە بە جوانی چێژ وەرگرتن و قووڵ کردنەوەی هەستەکان دەدات لەو جوانیەی کە لەو دەقەدا هاتووە... لەوەی بەڵگەیە لەسەر ئەوە گێڕدراوەتەوە کە عومەر هۆنراوەکەی عەبدە کوڕی ئەلتەییب دەڵێتەوە کە لە سەرەتاکەیدا هاتووە:

هل حبل خولة بعد الهجر موصول     أم أنت عنها بعيد الدار مشغول

کاتێك هۆنەر گەیشتە ئەوەی کە دەڵێت:

والمرء ساع لأمر ليس يدركه     والعيش مشع وإشفاقه وتأميل

---

١ـ سنن الدارمي (٩/١) نقلاً عن عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥٢).

٢ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥٢).

٣ـ شرح نهج البلاغة لإبن أبي الحديد (١١٢/٣).

٤ـ المدينة المنورة، شرّاب (١٠٢/٢)، عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥٣).

عومەر بە سەرسامیەوە فەرمووی: ژیان کورت بینی و میهرەبانی و بیرکردنەوەیە، سەرسام بوو لە جوانی ئەوەی کە دابەشی کردبوو ڕەوانی پێدابوو.[١]

کاتێك عومەر ئەو هۆنراوەیەی زوهێری کوڕی ئەبی سەلمانی دەوتەوە:

فإن الحق مقطعة ثلاث … يمين أو نفار أو جلاء

فذلكم مقاطع كل حق … ثلاث كلهن لكم شفاء[٢]

ئەوەی دەویست کە ماناکان بە یەکێك لەم سیانە ڕاست دەبێتەوە:

سوێند خواردن یان دادگایی کردن یان بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا، زوهێریش بەمە ناونرا دادوەری شاعیران، عومەر (ﷺ) سوور بووە لەسەر شارەزایی زوهێر بۆ چەند بڕیەکی هەقدا کە لەگەڵ ئەوەی ئەو لە سەردەمی جاهیلیدا بووە، پاشان ئیسلام هات و جەختی لەم چەند بڕگەیە کردەوە.[٣]

لێرەدا چەند پێوەرێك هەبوون، کە عومەر لە ناو کڕۆکی ئەدەبدا دەی خرۆشاندن و بە هۆیەوە ڕووکارێکی نوێی نیشانی ئەدەبیات دەدا، کە لە ئاین و ڕەفتارەوە سەرچاوە دەگرێت و دەکرێت بدرێتە پاڵ پێوەرە هونەریەکانی تر، تا بکرێتە پێشینەیەك بۆ پێوەرەکانی ڕەخنەی ئەدەبی لە سەردەمی عومەردا، هونەرمەند لە دەربڕین و گێڕاوەکانی تێدا دەدرێتە خوێنەر لەوانە: ڕاستی لە وەرگێڕان دەربارەی مەترسیەکان و پێشبینی کردنی هەست و سۆزی باش، کە ئەمەش لەو کارانە بوو کە عومەر بە چاکی دەزانی و سەرسامی فەراهەم دەهێنا، ئەم ڕەگەزی ڕاستگۆییە وای کردووە کە عومەر بە هۆنراوەکەی ئەلموخەبەلی ئەلسەعدی و ئومەییەی کوڕی ئەسکەری ئەلکەنانی سەرسام بووە، هەروەك ئەوەی کە عومەرکاریگەر دەبوو لە مانا بە جۆرێك نوێ و داهێنەر بێت و بگونجێت لەگەڵ ئاین و لەگوڵ ڕەفتار و کردەوەکانیدا هەنگاو هەڵبگرێت، ئەم مانایە دەکرێت بە شێوەیەکی پتەو دابڕێژرێتەوە، لە وێنە گرتنێکی جوان و ڕوونکردنەوەیەکی باشدا دەربڕینی بۆ بکرێت، هەروەها عومەر لە مانا سەرو ڕاستی و داهێنانیکاریگەرتردەبێت، پێویستە تەبا بێت بۆ پێوەرەکانی ئاین و ڕەفتار، بە جۆرێ کە شاعیر نەگلێ بە جنێوی خراپ و دەم پیسیەوە، یان تانەدان لە ناموس، یان پێناسەی مەی و وێنە گرتنی هونەری (مەی)یەکانی یان هەر شتێکی تر لەوانەی کە هەواڵ دەدەن سەبارەت بە لاوازی بیر و باوەڕ و ڕوفتار، پێشتر باسی هەڵوێستی عومەرمان کرد لە بەرامبەر حەتیئە و سەحیم، ئەو کەسانەی کە لە شاعیران لەسەر چەش و جۆرێ ئەوان بوون.[٤] لەو شتانەش کە پەیوەندی بەم ڕەخنەیەوە هەیە ئەوەیە ، دەگێڕنەوە کە نوعمانی کوڕی عودەی عومەر لەسەر میسان[٥] دادەمەزرێنێتوە ئەویش دەچێت بۆ ئەوێ، خێزانەکەی ڕێگری کرد لەوەی کە لەگەڵیدا بڕوات، ئەویش

---

١ـ البيان والتبين (١/٢٤٠) المدينة النبوية، شراب (٢/١٠٥).

٢ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥٤).

٣ـ أدب صدر الاسلام (ص: ٩٦).

٤ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٥٥-٢٦٢).

٥ـ شارێکە لە عێراق دەکەێتە نێوان بەسرە و واسط.

ویستی لە ناخیدا ئارەزووی هاوەڵی کردنی زیندوو بکاتەوە بەوەی ئیرەیی ژنان بزانیێت، بۆیە چەند دێڕێکی لە بۆ دەنووسێت، لا نابێتە هاوشێوەی ڕاستی لە کەمی یان زۆری کە بریتیە لە:

فمن مبلغ الحسناء أن حليلها — بميسان يسقي في زجاج وحنتم
إذا شئت غنتني دهاقين قرية — وصناجة تحدو على كل ميسم
إذا كنت ندماني فبالأكبر أسقني — ولا تسقني بالأصغر الملتثم
لعل أمير المؤمنين يسوؤه — تنادمنا في الجوشق المتهدم

کاتێك عومەر(ﷺ) ئەمەی بیست فەرموی: سوێند بە خوا خراپی پێ کردووم، پاشان لە کاری خست، چونکە نوعمان سەرداری هۆزەکەی و پێش نوێژیان بوو، پێشەنگیان بوو لە ژیاندا، ئەگەر ئەم شیعرەش نمایشی ژیانی پیاوێکی نەکردووە کە لە خەڵکانی خاوەن هیجرەی یەکەم بێت، بەڵکو ئەو لەگەڵ بەهای ئەم ئاینەدا ناتەبا بووە و سەرپێچی بنەماکانی کردووە، لەبەر ئەوە عومەر بەرپەرچی داوەتەوە و سەرزەنشتی بێژەرەکەی کردووە.[1]

ئەمە بریتیە لە دیارترین شێوەی ئەو ویستە ڕەخنە ئامێزەی کە ڕەخنەی عومەری پێ جیاکراوەتەوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕەسەنی ڕەخنەی ئەدەبی لە گەشەسەندووترین گەشەی یەکەمیدا، هەروەك ئەوەی کە ویستەکەی و ئاراستەکەی ڕوون بوویەوە، بە جۆرێك پەنای نەبردووە بۆ چێژ بە تەنها لە بەهێزکرنی ئەدەب و فەرماندان بە سەریدا، بەڵکو باڵی ڕاخستووە بۆ رەخنەی بابەتیانەی ورد لە ڕاڤەی دەقەکەدا، ئاشکراکردنی جوانی یان ناشرینی و بەهانە گرتن بۆ ئەوەی دەدۆزرێتەوە یان ون دەبێت لە نموونەکانی، ڕەخنەی عەرەبیش تا ماوە قەرزاری عومەر دەبێت لەوەی کە ژیا و لە دەقەکاندا پاکی و پاراوی و ئێریاتی زمانی عەرەبی لا مەبەست بوو، لەگەڵ ڕەوانی دەربڕینی و سەربەخۆیی مانا بە بەختی تەواوی لە دەربڕین و ڕاستی بوون و جوانی و ڕوونی وێنەکاریەکانی، ئەم پێوەرە ڕەخنەییە وردەش جیاواز نابێت لەگەڵ عومەرێکدا کە ڕەخنەگرێکی ڕەسەنی تێدایە،[2] ئاخاوتنەکانی درێژەیان پێ دەدەن بەوەی ئەگەر پەیامان خواست لە ڕوون کردنەوەی ڕۆشنبیری ئەم خەلیفە گەورەیە و توانای لەسەر چێژی شیعری و ڕەخنەیی و فەرماندان بەسەریدا، ئەوا ئەمە پێویستی بە چەند بەشێکی درێژ دەبێت، باشترین کتێبیش کە لەم بوارەدا ناخ قایل دەکات، کتێبی: عمر بن الخطاب – للدكتور محمد أبو النصر، و (الادب الاسلامي في عهد النبوة وخلافة الراشدين – للدكتور نايف معروف، و (أدب صدر الاسلام – للدكتور واضح الصمد) و (المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي – للاستاذ: محمد حسن شراب)ە.

١ـ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٦٣).
٢ عمر بن الخطاب، د. محمد أبو النصر (ص: ٢٦٥).

# دوانگەی پێنجەم

## گەشەسەندنی ئاوەدانی و بە ڕێوەبەردنی قەیرانەکان لە سەردەمی عومەردا

### یەکەم: گەشەسەندنی ئاوەدانی

عومەر(ﷺ) هەستا بە بەرفراوانکردنی مزگەوتی پێغەمبەر(ρ) ماڵەکەی عەباسی کوڕی (عبدالمطلب)ی خستە سەر و ئەم بەرفراوانیە ١٠ باڵی لە ڕووی ڕووگە و ٢٠ باڵی لە ڕووی ڕۆژئاوایی و ٧٠ باڵی لە ڕووی باکووریەوە چوویە سەر، بیناکەش بە خشت و پەلی دارخورما نۆژەن کرایەوە و کۆڵەکەکانی یان پایەکانی لە دار بوون، سەربانەکەشی بە پەلی دارخورما داپۆشرا هەتا خەڵکەکە لە باران بپارێزێت، عومەر ڕێگری ئەوەی کرد، کە نەخش و نیگارەکەی سورایی یان زەردایی بێت تا خەڵکەکە لە نوێژەکانیاندا ڕووبەڕووی خەراپە و فیتنە نەبنەوە،[1] ئەو مزگەتە گڵ بووە عومەر فەرش ڕێژی کرد بە بەرد و چەو تا پاکتر بێت بۆ نوێژکەران و ئاسان بێت لەسەر پیادە ڕوان،[2] عومەر(ﷺ) چەند چاکسازیەکی ئاسانی لە مزگەوتی بەرێز و پیرۆزی مەککە ئەنجامدا و مەقامی ئیبراهی (علیه السلام)ی گواستەوە بۆ ئەو جێگەیەی ئەمڕۆی، کە لێوەی دوورە چونکە مەقامی ئیبراهیم نووسابوو بە کەعبەوە، عومەر ئەم کارەی ئەنجامدا بۆ ئاسانی نوێژخوێنان و ئەوانەی تەواف دەکەن، بە پوختکراوی کاری لەسەر کرد،[3] چەند خانوویەکەی بە دەوری حەرەمی مەککەوە کڕی و ڕووخاندی و خستیە سەر مزگەوتەکە، هەندێ لەدراوسێ ماڵەکانی مزگەوت قایل نەبوون کە ماڵەکانیان بفرۆشن هەر بۆیە ماڵەکانیانی وێران کرد و پەردووەکانیانی بۆ دانان تا دوایی بردیان، عومەر دیوارێکی نزمی بۆ چوار دەوری مزگەوتەکە دروست کرد تاوەکو بکرێتە چراخان و چرا و ڕووناکی لەسەر دابنرێت[4] و دەور و بەری خۆی ڕووناك بکاتەوە، بەرگی کەعبە لە سەردەمی جاهیلیەتدا چەرم بووە و پێغەمبەر(ρ) پۆشاکی یەمانی کردبوو بە بەریدا و دوایی عومەر(ﷺ) پۆشاکی قیباتی[5] کرد بە بەریدا، کە پۆشاکێکی تەنك و سپی میسری بوو،[6] هەروەها مزگەوتەکانی ترش لە ناوچەکانی تر نۆژەن کرانەوە لە خەلافەتی عومەر(ﷺ)دا، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص مزگەوتی گەورەی لە کوفە و عوتبەی کوڕی

١ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢٧)، فتح الباري (٤/٩٨).
٢ـ أخبار عمر (ص: ١٢٦).
٣ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢٧)، فتح الباري (٨/١٦٩).
٤ـ أخبار عمر (ص: ١٢٦)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢٧).
٥ـ أخبار مكة للأزرق في (١/٢٥٣)، أخبار عمر (ص: ١٢٦).
٦ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢٨).

غەزدان مزگەوتی گەورەی شاری بەسرە و عەمری کوڕی عاص مزگەوتی گەورەی فستاتیان نوێ کردەوە، بە ڕاستی ئەم مزگەوتە گەورانەش شوێنی نوێژی موسڵمانان و یەکتر ناسینیان و خوێندنی زانیاری و دادوەری و پێگەیشتنی فەرمانی خەلیفە و والیەکان بووە.[١]

## بایەخدان بە ڕێگەوبان و هۆیەکانی گواستنەوەی وشکانی و ئاوی:

عومەر بەشێك لە داهاتی بەیتولمالی تەرخان کردبوو بۆ هاریکاری بە یەکەوە بەستنەوەی نێوان بەشەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، ژمارەیەکی گەورەی لە حوشترەوانەکان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرد، بەو سیفەتەی کە هۆکاری گەیاندنەکانی ئەو دەمە ڕێ پێدراوبوون بۆ کارئاسانی ئەو کەسانەی کە لە دورگەی عەرەبی و شام و عێراقدا هیچ پەنایەکیان نەبووە، هەروەك ئەوەی کە شوێنێکی دەست نیشان کرد و ناوی لێنا (یانەی وردبینی) کە جێگایەك بوو کە لاسك و خورما و مێوژ و پێداویستی تری ژیانی تێدا دەنرا، بەو بێ وێنەییە ڕێبواران دادەمەزران لەگەڵ مێوان و کەسانی غەریبو و دانانی لە ڕێگەی نێوان مەککەو مەدینە، ئەوەی پێویستی ڕێبواران دەسازێنێت لەوەی کە پێیەتی لە ئاوەوە بۆ ئاو، عومەر(ﷺ) نەخشەی ڕێنوونی قورئانی ڕێبەری دەکێشا تا ئەوەی کە ئاوەدانی پەیوەست بکات بە گەیاندنەوە، وە ئەوەی کە ئاسایش و سەقامگیری دابین دەکات و دەستەبەر دەکات و ڕێبوار و گەشتیار ناچار نابن بە هەڵگرتنی ئاو و نان و خواردن و خواردنەوە،[٢] ئامۆژگاریەکانی عومەر بۆ هۆزو سەرکردە و والیەکان لەم بوارەدا ئامانجی خۆی دەپێکا، کەثیر کوڕی عبداللە لەباوکی و لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ساڵی ١٧ی کۆچی کە لەگەڵ عومەردا لە عومرە بووین خەڵکانی خاوەن ئاو داوایان لێ کرد کە لەسەر ڕێگەی نێوان مەککە و مەدینە ماڵەکانیان بنیات بنێن، کە ئەمە پێشتر نەبووە، عومەر ڕێگەی پێدان، بەو مەرجەی کە ڕێبواران مافدارترن بەو ئاو و سێبەرە،[٣] ئێمە لێرەدا بایەخی عومەر بە چاکسازی ڕێگاوبان لە پەیماننامەکانی هەندێ لە والیەکانی بەدی دەکەین لەگەڵ ئەو ناوچانەی کە پاکتاوکردنیان تەواو بووە، کاتێك کە پاکتاوی نەهاوەند تەواو بوو خەڵکانی ماه بەهرزان، ماه دینار هاتن و داوایان لە حوزەیفەی کوڕی یەمان کرد لەبری ئەوەی، کە سەرانە دەدەن ئاسایشی ژیانیان بۆ دابین بکات، ئەویش پەیماننامەیەکی بۆ نووسین کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((بە ناوی خوای بەخشنە و میهرەبان: ئەمە ئەو بەڵێن و پەیمانەیە، کە ماه دینار دەیدەنە حوزەیفەی کوڕی یەمان و ئەویش ئاسایشی ژیانیان دەداتێ بە خۆیان و سامان و زەوی و زاریان و لەو ئاینە لا نادەن، هەواڵە لە نێوان خۆیان و دەستوواتیاندا نابێ و ئەوان پشتیوانیان لێ دەکرێت،[٤] هەموو ساڵێك سەرانەی خۆیان دەدەنە ئەو کەسەی کە لە موسوڵماناندا دەبێتە والیان، لەسەر هەموو کەسێکی نزیك

---

١ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢٨).
٢ـ الدور السياسي للصفوة (ص: ١٨٩-١٩٠).
٣ـ الأحكام السلطانية للماوردي (ص: ١٨٧-١٨٨).
٤ـ أشهر مشاهد الاسلام (٣٤٢/٢).

لە ماڵ و گیانی و بە پێی توانای، ئەوانەی کە ڕێنمایی ڕێبوارانیان کردووە بە لایاندا تێپەڕیون و شەوو ڕۆژ پەنایان بۆ بردوون، ئامۆژگاریان کردووە، ئەگەر ئەوان فرت و فێڵیان کرد و گۆڕان ئەوا ئێمە لە زامن کردنی ئەوان دەست بەردار دەبین، ئەم نامەیە لەمانگی موحەڕڕەمی ساڵی ١٩ی کۆچی نوسرا و قەعقاعی کوڕی عەمر و نەعیمی کوڕی موقرن لەم نوسینەدا بوونە شاهید،[1] ئەوەی کە لەم نامەیەدا هەڵدەهێنجرێ وەرگرتنی مافی والی یەکانی عومەرە بۆ بنەماکانی شارستانی و سیاسەتی موڵکداری، چونکە ئەوان پابەندی یەکانی ئاوەدان کردنەوەیان دەزانی، لەبەر ئەوە چاکسازی ئەو ڕێگا و بانانەی کە هۆی هاوکاری گەلانی بازرگانی و جەنگی بوون کردە ناچاری لەسەر دانیشتوانی ناوچە ئازاد کراوەکان، هیمەتی عومەری فاروق لە ساڵی ١٠ی کۆچی یەوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی شارەکان لە عێراق و دووکەرت کردنی ڕووبارەکان و چاکسازی پردەکان گەرایەوە[2] عەیاض لە سەردەمی دەسەڵاتی خۆیدا نامەیەکی بۆ دانیشتوانی دەوروبەری دەریاکان نوسیوە کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((بەناوی خوا، ئەمە نوسراوێکە لە عیاضي کوڕی غەنەم بۆ قەشەی دەریا نیشتەی (رها) ئێوە ئەگەر دەروازەی شارم بۆ ئاوەلا دەکەن لەسەر ئەوەی کە هەموو پیاوێکتان دینارێك و ئەندازەیەك لە گەنم بداتێ ئەوا ئێوە ژیانتان پارێزراوە لەسەر خۆتان و سامان و هەر کەسێکیش کە شوێنتان دەکەوێ ، پێویستە لەسەرتان ڕێنموونی ڕێلێونبو بکەن و چاکسازی پرد و ڕێگە و بانەکان و ئامۆژگاری موسوڵمانان بکەن، خوای گەورە دەگرم بە شاهید و هێندەش بەسە کە خوای گەورە شاهید بێت)).[3] کاتێ عومەر(ﷺ) زانی دورگەیەك بە نێوان نیل و نزیك قەڵای بابلیەکاندا تێدەپەڕێ بۆ دەریای سور، حیجاز دەبەستێتەوە بە میسرەوە، کاری بازرگانی و ئاڵوگۆڕ کردنی ئاسان دەکات، بەڵام ڕۆمەکان پشت گوێیان خستووە پڕ بۆتەوە. عومەر فەرمانی دا بە عەمری کوڕی عاصی کاربەدەستی بە دووکەرت کردنی ئەو دورگەیە و ئەویش جارێکی تر دوکەرتی کردەوە، چونکە ڕێگەی نێوان حیجاز و فستاتی پایتەختی میسری ئاسان کرد و بوویە دەماری بازرگانی کە لەوەێوە خۆشگوزەرانی ناوچەکانی نێوان بەحرێن بۆ جارێکی تر گەڕایەوە ، لەسەر ئەم کەنداوە و لە نێو شاری فستات چەندین سەیرانگا و پێشگیرە و شوێنی نیشتەجێبوون بنیات نران و عومەر ناوی لێنا: کەنداوی ئەمیری باوەڕداران،[4] والی میسر ئەوەی ویستی لە خواردن و خواردنەوە ناردی بۆ مەککە و مەدینە و بەمەش خوای گەورە خەڵکی هەردوو مزگەوتی بەڕێز و پیرۆزی سوودمەند کرد، پاشان بەردەوام نەبوون لە هەڵگرتنی خواردن تیایدا تا عومەر کوڕی عبدالعزیز لە پاش ئەو بەرپرسیاری کردن تیایدا دواتر والیەکان لە پاش ئەمە کە یادیان کرد. وازیان لێ هێنا و خاك و خۆڵ و لم پڕی کردەوە و ڕێگەکە بڕا و کۆتایی گەیشتە تاوان تیمساحێك

---

١ـ أشهر مشاهد الاسلام (٣٤٢/٢).
٢ـ أشهر مشاهد الاسلام (٣٤٢/٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ الفاروق عمر للشرقاوي (ص: ٢٥٤-٢٥٥).

لە لایەنی چۆمی قولزومەوە،[١] لە عێراقدا کەنداوێکی ئاوی هەڵکەند بە ڕووبەری سێ فەرسەخ و لە شاری خورەوە دەستی پێکرد تا شاری بەسرە بە مەبەستی گەیاندنی ئاوی ڕووباری دیجلە بە شاری بەسرە[٢]، ئەم پرۆژانە لە هەڵکەندنی ڕێچکەی ڕووبار و کەنداوەکان و چاکسازی ڕێگەوبان و بنیاتنانی پرد و بەربەستەکان بووە، لە سەردەمی عومەریشدا بۆ ئەم پرۆژە گەورانە پارە و پوولیان لە بودجەی دەوڵەت وەرگرتووە.[٣]

## - دامەزراندنی شارەکان وەك پێگەیەکی سەربازی و مەڵبەندی بڵاوبوونەوەی شارستانی:

لەگەڵ بەرفراوان بوونی بزووتنەوەی پاکسازی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەردا بایەخیدا بە بنیاتنانی شارەکان لەسەر کەندەڵانەکان و ئاسانکردنی ڕێگەکانی گەیاندن و چاکسازی زەوی و زار، هەروەها هاندانی کۆچکردن بۆ مەڵبەندەکانی کۆبوونەوەی جیهادی، و ڕاگوێزان بۆ ناوچە پاکتاوکراوەکان، بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و کۆمەکی کردنی تێکۆشەران و خەباتگێڕان بە پیاوانی نەبەرد و کەرەستە و پێداویستی، گرنگترین ئەو شارانەش کە دامەزراون[٤] شاری بەسرە، کوفە، موصڵ، فستات، جیزە، سرت.[٥] نەخشەکان دارێژران و لە نێوان سوپاکاندا بە پێی هۆزایەتی و پێشینەیانەوە دابەش کران بە سەریاندا و چەندین ناوەندی گشتی وەك مزگەوت و بازاڕەکانی تێدا دامەزرا و لە هەموو شارێکیش شوێنێکی تایبەت دروست کرا بۆحەوانەوەی ئەسپ وحوشتری موجاهیدان، هانی خەڵکی دا لەسەر هێنانی کەس و کار و بنەماڵەکانیان لە حیجاز و دەوروبەری دوورگەی عەرەبی بۆ نیشتەجێ بوون لەو شارانە، تا ببنە پێگەیەکی سەربازی و لەوێوە پێویستی و کۆمەکی بگاتە سوپاکان بە مەبەستی ڕۆچوون بەرەو زەوی دوژمن، و بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام تیایدا عومەر(ﷺ)فەرمانی دا بە سەرکردەی سوپاکان کە لە کاتی دروستکردنی ئەم شارانەدا، کە ڕێگەی نێوانیان و نێوان پایتەختی خەلافەت ئاسان بێت، لە نێوانیاندا گواستنەوەی ئاوی و دەریایی نەبێت، لەبەر ئەوەی کە ئەو دەمە عومەر(ﷺ) دەترسا لە نەفامی عەرەبی ئەو دەمە لە کاری دەریاوانیدا، بەڵام کاتێك کە هەستی بە توانای سوپای ئیسلامی کرد لە میسر و لەسەر قۆستنەوەی ڕێگە ئاویە ڕووباری و دەریاییەکان ڕێگەی بە عەمری کوڕی عاص دا کە هەستێ بە هەڵکەندنی نۆکەندێکی ئاوی کە ڕووباری نیل بگەیەنێت بە دەریای سوور، تا کۆمەکیەکان لە خواردن و خواردنەوە بگاتە حیجاز هەروەك ئەوەی کە باسکرا،[٦] عومەر(ﷺ) هەستا بە ئاوەدانکردنەوەی شارەکان و لەگەڵ بەرفراوانی پانتایی زەوی دەوڵەت و زۆری پاکسازیەکان هەستا بە سەربازگری سەربازان و پاش سەفەر

---

١ـ أخبار عمر (ص: ١٢٧).

٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٣٠).

٣ـ هەمان سەرچاوە.

٤ـ إقتصاديات الحرب في الاسلام، د. غازي بن سالم (ص: ٢٤٥).

٥ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل المصري (ص: ٣٣٣-٣٤٠).

٦ـ إقتصاديات الحرب في الاسلام، د. غازي بن سالم (ص: ٢٤٥).

دووری نێوان موسڵمانان، سەربازان پێویستیان بە شوێنێك هەبوو کە پشووی تیا بدەن لە ماندوو بوونی ڕێگا دەکرێت کە ماڵێکیان هەبێت بۆ ئەوەی زستان لە غەزاکانیان ئەگەڕانەوە پەنای بۆ بەرن، چەندین بنەما بۆ بنیاتنانی ئەم شارانە هاتنە کایە، لەبەر ئەوەی کە ئامانج لە پاکتاویەکان بریتیە لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی و گەیاندنی بە گەلان و نەتەوە و تاکەکان، پێویستە ژیانی ئیسلامی بەرپا ببێت و دەستی ئەو گەل و نەتەوانەی پێ بگات و تاکی کۆمەڵگا هەستی پێ بکات، شارە ئیسلامیەکان لەسەر شێوازی ئیسلامی دەرکەوتن کە تیایاندا ژیانی ئیسلامی تێدا دەچەسپا، وەك نموونەیەك بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامی، کوفە و بەسرە و فستات و موصڵ شارە ئیسلامیەکان بوون و هەر یەکەیان مزگەوتەکەی کەوتبوویە ناوەندیەوە و بە دەوریدا ماڵی سەربازان بڵاو بووبوویەوە، لەم کۆمەڵگە نموونەییانە فیکرەی ئیسلامی بەهێز و بنەماکانیەوە چەقی داکوتابوو، هێزی هاوچەشن لە تەواوی سوپادا بوو، فیکرەی هاوچەشنیش لە قورئاندا بووە، کۆمەڵگە تەواوەکان حوکم و دەستووراتی خوداییی لە هەموو کاروبارێکدا بەسەر خۆیدا دەچەسپێنێت و ئامادەی تەواوی تێدایە بۆ گیان فیدایی لە پێناوی خوادا، هەر لەم کۆمەڵگایانەدا ئیسلام ڕووناکی خۆی هەڵقولاند لەسەر ئەو وڵاتانەی کە پاکتاوی کرد، ئامۆژگاری ڕۆڵەکانی دەکرد و دادوەری لە یاساکانی دەچەسپاند، هەر کەس تیایدا موسڵمان بووایە پەسەند دەکرا، ئەمەش گەورەترین هۆکار بووە لە گەیاندنی بانگەواز و خستنەڕووی فیکرە لەسەر ئەوانەی کە ناشەراز بوون. لە شامدا شاری ئیسلامی دانەمەزراوە لەبەر ئەوەی کە پڕ لەو ماڵانەی کە ڕۆمەکان بەجێیان هێشتبوون لێی هەراس بوویوون، موسڵمانان دەستیان بەسەردا گرتبوو. بۆیان ببوویە کاڵایەك کە دەوڵەمەندیان بکات لە بنیاتنانی خانوو و ماڵی نوێدا، بۆ زۆری عەرەب لە شامدا، بە جۆرێك هەر هۆزێك دۆست و خزم و خوێشی خۆی لەوێ دەدۆزیەوە، سەرباز گرتن لە شام[1] دەرکەوت، شام لە گرنگترین ئەو ناوچانە بوو کە لەسەردەمی دەسەڵاتی عومەردا ئاوەدان کرایەوە.

## - شاری بەسرە:

مانای بەسرە لە زمانەوانیدا: خاکێکی روتەن و وشك کە بەردی تێدا بێت، دەڵێن: خاکێکی بەرد و چەوینە، دەڵێن: بەردی خاو و سپیە، بەسرە شارێکە دەکەوێتە ناوچەی بە یەکگەیشتنی هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات و بەو بە یەکگەیشتنەیان ڕووبارێك پێك بینی کە پێی دەڵێن (شەتولعەرەب)[2] لە ئاوەدانکردنەوەیدا بیرۆکەی عومەر شیاوتر بووە لە دامەزراندنی شارەکان لەگەڵ ڕەچاو کردنی سروشتی عەرەب، شوێنی بەسرە نزیك ئاو و مەزرایە لە ڕێگەی وشکانی بۆ لای گوندەکان، هۆی نیشتەجێ بوونی موسڵمانان تیایدا و لە سەردەمی ئەبو بەکردا بووە کە قوتبەی کوڕی قەتادەی زەهلی یان سوەیدی کوڕی قوتبە لەسەر ناکۆکی و جیاوازی لە گێڕانەوەکە وا هاتووە کۆمەڵێك لە هۆزەکەی لە

---

١ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل المصري (ص: ٣٣٣).
٢ـ الفاروق عمر بن الخطاب، محمد رشيد رضا (ص: ١٧٧).

ڕووی شاری بەسرەوەداویانە بەسەر فارسەکاندا ، لەبەر ئەوە خالدی کوڕی وەلید وەك والی و سەرکردەیەك لەو شارۆچکەیە هێشتیەوە، کاتێك کە خەلافەت کەوتە دەستی عومەر عوتبەی کوڕی غەزوان کەیەکێکە لە هاوەڵە پێشینە و سەرەتاییەکانی پێغەمبەر(ﷺ)لەو شارۆچکەیەدا دامەزراند و پێی فەرموو: لەوێ کەسانێك لە خەڵکانی ئەهواز و فارس و میسان لەسەر کۆمەکی براکانیان کار پێ بکە، فەرمانی دا بە قوتبە یان سوەید کە پەیوەندی پێوە بکەن، عوتبە بە خۆی و زیاتر لە (٣٠٠) سێ سەد پیاوەوە پەیوەندی پێوەکرد، قوتبەش کە بەکری کوڕی وائیل و تەمیمی لەگەڵ بوو پەیوەندیان پێوە کرد، لە مانگی ڕەبیعی یەکەم یان کۆتایی ساڵی ١٤ی کۆچی نیشتەجێی کرد،[١] عوتبە لە ئاوەدانکرنەوەی شاری بەسرە ڕاوێژی بە عومەرکرد، ئەویش فەرمانی پێدا کە لە جێگەیەکدا نیشتەجێ بێت کە نزیك ئاو و مەزرا بێت، هەڵبژاردنی عومەر کەوتە شوێنی بەسرە و عوتبە نامەیەکی نووسی بۆ عومەر(ﷺ)کە تیایدا هاتووە: من زەویەکم دۆزیوەتەوە لە لای وشکانی بەرەو گوندەکان و لەنزیکیەوە زۆنگاوی پڕقامیشی تێدایە، عومەریش لە وەڵامدا بۆی نووسی: تیایدا نیشتەجێ ببێت، عوتبە تیایدا نیشتەجێ بوو مزگەوتێکی لە قامیش دروست کرد و خانووی ئیمارەتەکەی لە تەنیشت مزگەوتەکەدا بنیات نا و خەڵکیش حەوت خەڵوەتگەیان لە نزیکی دروست کرد لە قامیش لەبەر زۆری قامیشەکە، ئەوا هەر کە غەزایەکیان بە دەستەوە بوایە ئەوا ئارەزووی ئەو قامیشە لانانەیان دەکرد و پاشان دەیانکردەوە بە چەپك و دایان دەنان هەتا لە غەزاکە دەگەڕانەوە، جارێکی تر بە هەمان شێوەی پێشووی دروستیان دەکردنەوە، ئەم قامیشانە دووچاری ئاگر کەوتنەوە بوون و ئاگریان تێبەربوو، بۆیە داوایان لە عومەرکرد کە ڕێگەیان بدات ئەو خانووانە لە خشتی سوورەوەکراوە دروست بکەن پاش ئەوەی کە لە ساڵی ١٧ی کۆچیدا عوتبە کۆچی دوایی کرد ، عومەر لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەبو موسای ئەشعەریدا ڕێگەی پێدان کە ئەو خانووانە دروست بکەن. ئەبو موساش بینای مزگەوتەکە و خانووی ئیمارەتەکەی بە خشت و قوڕ دروست کرد کە سەری بە گژوگیا گرت و پاشان ئەوانیش بە بەرد و گەج دروستیان کرد، ئەمەشیان کردە نەخشەیەك بۆ هۆزەکانی تر شەقامەکانیان فراوانتر کرد بازاڕەکەی(٦٠) شەست باڵ و شەقامەکانی(٢٠) بیست باڵ و پانی هەر گەرەکێکیش(٧) حەوت باڵ دەبوون و ناوەندی هەر نەخشەیەکیان کردە گۆڕەپانێکی بەرفراوان بۆ تەویلەی ئەسپەکانیان و گۆڕی مردووانیان کە لە نزیك ماڵەکانیانەوە بوو.[٢] عومەر فەرمانی دا بە ئەبو موسای ئەشعەری کە ڕێچکەی ڕووبارێك بۆ خەڵکی بەسرە هەڵبکەنێت، ئەویش ڕێچکەی ڕووباری (الأبلة)ی هەڵکەند و بە پانتایی سێ (٣) فەرسەخ[٣] بەرەو شاری بەسرە بەڕێی کرد، بەمەش موسڵمانان دەبنە پێشەنگی ئەوانەی کە نەخشەسازی شارەکانیان زانیوە، سەرمایەداری لە نیبشتەجێی شاری

---

١ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل المصري (ص: ٣٣٣).
٢ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل المصري (ص: ٣٣٤).
٣ـ هەمان سەرچاوە.

بەسرە لە موسڵمانان بە کرانەوەی (الأبلة) و (دوست) و (میسان) زیادی کرد.[١] بەم شێوەیە خەڵکی ئارەزووی ئەو ناوچەیەیان دەکرد و دەهاتن بۆی، دیارە ئەوانەش خوێندکارانی دەوڵەمەند بوون هەروەك چۆن لە سەرەتادا خوێندکارانی جیهادی بوون، پاشتریش رەوەندی تێکەڵی هۆز و تیرەکان و تەماعکارو بازرگانان ڕوویان لێ دەنا و ژمارەی دانیشتوانەکەی بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد.[٢]

لە میانی گێڕانەوە مێژووییەکاندا دەرکەوت کە لێکۆڵەران چەندین پشت پێبەستنی سەربازی و ئابووری وەهایان چنگ کەوت کە عومەر لە دامەزراندنی ئەو شارانەدا دایڕشتبوون، ئەو پشت پێبەستن و بایەخ پێدانانەش بریتی بوون لە:

- دامەزراندنی ئەو زەویانە لەسەر پانتایی زەوی و زاری عەرەب و عەجەمیش، تا ببنە قەڵای پۆڵایین و دوژمن نەتوانێت بە چاوی سنوور بەزاندنیانەوە لێیان بڕوانێت.
- بەرژەوەندی نیشتەجێبوونی عەرەب لەم شوێنانەدا، لەبەر ئەوەی کە ئەوان ئەو دەمە کەرەستەی جیهاد بوون لە پێناوی خوا و بەرژەوەندیان لە شوێنێکدا نەبوو کە مەزرای حوشترداری تێدا نەبێت، هەروەك ئەوەی کە عومەر (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە.
- لە هەڵبژاردنی شوێنی شارەکاندا شکۆداری لەبەر چاو گیراوە، لەسەر سنووری چاکە لە زەوی عەرەبدا، تاوەکو عەرەبەکان مەزرای پێویست بۆ مەڕ و ماڵاتەکانیان بدۆزنەوە، هەروەها لە لایەکی تروە ئەوە لەبەر چاو گیراوە کە پێویستە ئەو شوێنانە لە بەشی خوارەوەی گوندەکاندا بن لە زەوی عەجەم تاوەکو بەرووبوومی ئەم گوندانە هەر لە شیرەمەنی و خوری و دانەوێڵە و بەرووبوومەکانی تر بگەڕێتەوە بۆ ئەم شارانە، عومەر(ﷺ) کاتێك کە نامەکەی عوتبەی کوڕی غەزوانی خوێندەوە دەربارەی خاکی بەسرە: فەرمووی: ئەمە زەویەکی خۆشە و نزیکە لە کانیاو و مەزرا و شوێنی نەمام چاندن.[٣] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پاکی سیاسەتی جەنگی و وردی پلان دانانی ئاوەدانی تاوەکو بارودۆخی جەنگ و ئاشتی پێکەوە گونجاو بن. هەروەها ئەم پلانەش زامنی سەرچاوەکانی ئاوی دەکرد. نەخشە و پلانەکانی کۆمەکی و هاوکاری بە کەرەستە خۆراکیەکان نزیك دەکردەوە، کە سەرچاوەی وزەی پێویست بوون بۆ پێداویستی خەڵکی شار وەك دار و شتی ترش.
- جەختکردنەوە لەسەر نەبوونی کۆسپ وتەگەرەی سروشتی وەك دەریا و ڕووبارەکان بۆ نموونە کە ڕێگە لە گەیشتنی کۆمەکیەکان دەگرێت لە پێگەی خەلافەتەوە بۆ گۆڕەپانەکانی جەنگ.[٤]
- ئەو دەمە ڕێکخستنی شارەکان دەقاودەق لەگەڵ ڕێکخستنی هۆزایەتی بۆ سوپا تەواو دەبوو، چونکە هەر هۆز و تیرەیەك لە نێو چەند ماڵێکی نزیك لە یەکەوە دەژیان.[٥]

---

١ـ هەمان سەرچاوە.
٢ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل المصري (ص: ٣٣٤).
٣ـ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٣٤١).
٤ـ فتوح البلدان (ص: ٢٧٥).
٥ـ إقتصاديات الحرب في الاسلام (ص: ٢٤٧).

## شاری کوفە:

ڕاوبۆچوونی مێژوونووسان لەسەر ئەوە کۆکە، کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بە دامەزرێنەری یەکەمی ئەو شارە دادەنرێت و هەر خۆی شوێنەکەی دیاری کردووە و فەرمانی داوە بە نەخشەسازی بۆ دروستکردنی پاش لەو سەرکەوتنانەی کە موسڵمانان لە جەنگەکانیان دژ بە فارسەکان لە ناوچەی مەدائن بە دەستیان دەهێنا، هەروەك ئەوەی بە تەواوی ئەم حاڵ بووە لە هەڵبژاردنی و ئاوەدانکردنەوەی شاری بەسرە، چونکە هۆکارە سەربازیەکان ڕۆڵی سەرەکیان بینیوە لە هاندانی سەعد بۆ بیرکردنەوە لە وەرگرتنی شوێنێك یان خێوەتگەیەك بۆ موجاهیدان،[1] هەروەها هەستاوە بە ڕاپەڕاندنی ئەم کارە پاش ئەوەی، کە عومەر(ﷺ)فەرمانی پێ کردووە هەڵبژاردنی شوێنی کوفە لای سەعد بە پێی ئەو ئەندازەیە بووە کە فاروق دایناوە، عومەر لە ڕەوەندی قادسیە و مەدائین گۆڕانێکی لە ڕوویان بەدی کردووە و زانیوویەتی کە لەمەدا ناخۆشی وڵاتی تێدایە، لەبەر ئەوە نامەیەکی نووسیوە بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کە شوێنێکیان بۆ دەست نیشان بکات کە لەگەڵ ژیانیاندا بگونجێت، سەلمانی فارسی و حوزەیفەی کوڕی یەمانی نارد، ئەوانیش پەنگیان خواردەوە تا گەیشتنە کوفە لەبەر ئەوەی کە خاکەکەی لم و چەوە، هەموو لم و چەوێکیش بریتیە لە کوفە،[2] بەم شێوەیە سەعد لە مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٧ی کۆچی لە مەدائینەوە گواستیەوە بۆ کوفە و عومەریش ویستی کە موسڵمانان لە خێوەتگەکانی خۆیان نیشتەجێ بن، لەبەر ئەوە ئەمە یەکێك بووە لە جەنگەکانیان و باشترە بۆیان و سامدارترە لە چاوی دوژمنانیان بانگەشەی بۆ خوێن گرتنی کرد دەربارەی کارێك کە پێی گرنگە، کاتێك کە ئەهلی کوفە و بەسرە لە بنیاتنانی خانووە قەمیشەلانەکاندا داوای مۆڵەت و ڕێگەپێدانیان لێکرد پێی خۆش نەبوو کە سەرپێچیان بکات بەڵکو ڕێگەی پێدان، پاشان خەڵکەکە قامیشەلانەکانیان دروست کرد، پاشان ئەو ئاگرەی لە بەسرە و کوفە کەوتەوە داوایان لە عومەر کرد، کە ئەو خانووانە لە خشت دروست بکەن، ئەویش فەرمووی دروستی بکەن، هیچ کامتان لە سێ ژوور زیاتر دروست نەکات لە دروست کردنەکەشدا زیادەڕۆیی مەکەن، هەر بەم شێوەیە نامەیەکی نووسی بۆ عوتبە و خەڵکی بەسرە، لەسەر نیشتەجێ بوون و سەرپەرشتی کردنی کاری خانوو دروست کردنەکانی شاری بەسرە عاصم کوڕی دەڵفی ئەبو جەرداء و لەسەر نیشتەجێبوون و سەرپەرشتی کردنی کاری خانووەکانی خەڵکی کوفەش ئەبو هەیاجی کوڕی مالکی ئەلئەسەدی دانا، ئەبو هەیاج هەستا بە نەخشەسازی شاری کوفە بەو شێوەیەی کە عومەر فەرمانی پێدا بوو، بە بەرنامەکانی چل باڵ و پاشان سی باڵ لە نێوانیشیاندا بیست باڵ، لە کۆڵانەکانیشدا حەوت باڵ هیچی تری لەگەڵ نەبێت و لە کەرتەکانیشدا شەست باڵ و یەکەمین شتێکیش کە تیایدا نەخشە سازی بۆ دەکرێت مزگەوتەکەیەتی، لە ناوەندەکەیدا تیرئەندازێکی کێش توندی دادەنا کە بە ڕاست و چەپ و پێش و دوایدا تیری دەهاویشت، پاشان فەرمانی دا بە بنیاتنانی بینایەك لە دوای شوێنی تیرەکان، لە پێشەوەی

---

١ـ دراسة في تأريخ المدن العربية الاسلامية، د. عبدالجبار ناجي (ص: ١٨٣).

٢ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، (ص: ٣٣٥).

مزگەوتەکەدا کەپرێکی دروست کرد کە دووسەد باڵ دەبوو لەسەر چەند ستوونێکی (کۆڵەکە) مەڕمەڕ کە وەك کەپری کیسراکان وابوو سەقفەکەی وەك سەقفی مزگەوتی ڕۆمیەکان وابوو بۆ سەعدیش لە تەنیشتەوە خانووەیەکیان دروست کرد کە لە نێوانیاندا ڕێگەیەکی دوو سەد باڵی ڕاڕەو هەبوو، تیایدا چەندین بەیتولمالی دادەنارۆزبەی فارسیش[1] هەستا بە دروستکردنی ئەم بینایانە، پاش تەواوبوونیان موجاهیدانی موسڵمانان تیایدا نیشتەجێ بوون پاش ئەوانیش تیمێکی فارسی لە تیمەکانی ڕۆستەمی سەرکردە کە ژمارەیان چوار هەزار کەس بوو، ناسرابوون بە سەربازانی شاهنشاه، ئەوان دڵنیاکرانەوە کە بەو شێوەیەی پێیان خۆشە نیشتەجێ بن، هاوپەیمان بن لەگەڵ ئەو کەسانەی خۆشیان دەوێن و بەخشش و خەڵاتیان بۆ ببڕنەوە، پاشان سەعد ئەوەی کە ویستیان پێی دان، ئەوانیش ڕابەرێکیان هەبوو کە پێیان دەوت دیلم، دەربارەی ئەوان دەیان وت سوورە دیلم،[2] هەروەك ئەوەی کە کۆمەڵێك جوولەکەو گاوری نەجرانی تێیدا نیشتەجێ بوو، پاش ئەوەی عومەر لە ناوچەکانی نیوەدوورگەی دەری کردن گەرەکێکیان دروست کرد کە ناسرابوو بە گەرەکی نەجرانی لە شاری کوفە،[3] کاروباری بەسرە و کوفە پاش ئاوەدان کردنەوەیان بەرز بوویەوە و کاروباریان گەورە بوو، هەردووکیان لە سەرکردایەتی کردنی سوپا و هەڵگرتنی مەشخەڵی زانیاری و زانست و ئەدەبدا لە تەواوی جیهانی ئیسلامی ناوبانگیان دەکرد، بەڵکو لەحیجازیشەوە هێزی بۆ گوێزرایەوە، عەلیش (ﷺ) کوفەی کردە بارەگای خەلافەتەکەی پاش ئەوەی کە چەقی قورسایی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی گوێزرایەوە بۆ ناوچەکانی تر.[4]

عومەر (ﷺ) نەخشەسازی بەسرە و کوفەی لەسەر بنەمایەکی تۆکمە دانا کە ڕێگەکانی بەرفراوان کرد و لەسەر ڕژێمێکی جوان داینا کە ئەو شێوازە گشتیەی بوو کە بەڵگە بوو لەسەر بلیمەتی عومەر لە بواری ئاوەدانکردنەوەدا، شاری کوفە کۆدەبێتەوە لە نێوان دانیشتوانی شارەکان و ژینگەی دەشتەڵان و خاکەکەیدا و ئەمەش بانگەشە بۆ تەندروستی و جەستە و نایابی کەش و هەوا دەکات، چونکە بەنرخی ڕێگە بۆ وڵات لە بری سیەکانە بۆ جەستە، عومەر داوای لەو کەسانە کردووە کە هەر لە کوفە نیشتەجێ بوون لە خێوەتگاکانی خۆیاندا بن، لەبەر ئەوەی ئەمە خێراترە ئەگەر پێویست بوو ئامادەنو لەبەر چاوی دوژمنن هەتا کاروبارەکە بەم شێوەیە گەشەی کرد ئەویش پاش ئەوەی کە شارەکان لە خشت بنیات نران.[5]

### - ترسانی عومەر لەوەی کە موسڵمانان بچنە نێو ژیانی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیەوە:

عومەر(ﷺ) زۆر دەترسا لەوەی کە موسڵمانان بچنە نێو ژیانی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیەوە، ئەوەی کە ڕێك دەکەوێت لەسەر ئەو ئاکامە خراپەی کە لە دونیا و دوارۆژدا هەیە، کاتێك کە خەڵکی

---

١ـ تاريخ الطبري (١٧/٥).
٢ـ تاريخ الدعوة (ص: ٣٣٦).
٣ـ تاريخ الدعوة الاسلامية، (ص: ٣٣٦).
٤ـ تاريخ الدعوة الاسلامية، (ص: ٣٣٨).
٥ـ الخلفاء الراشدون (ص: ١٨٢).

کوفە نیشتەجێ بوون و بە خانوو خەڵکی بەسرەی سەقامگیر کرد، خەڵکەکە کە خۆیان ناسی و ئەوەی لە دەستیان دابوو گەڕایەوە بۆیان، پاشان خەڵکی کوفە ڕێگەیان پێدرا لە بنیاتنانی قامیشەڵان و بە هەمان شێوە خەڵکی بەسرەش ئەم مۆڵەتەیان پێدرا، عومەر فەرمووی: کۆبوونەوە یەکێتیە بۆ جەنگاوەرەکانتان و باشترە بۆتان من پێم خۆش نیە کە سەرپێچیتان بکەم، قامیش چیە؟ وتیان؟ عیکرش،[1] ئەگەر بە قامیش ڕیوایەت بکرایە ئەوا دەبێتە قامیش، ئەویش فەرمووی: ئەوە کاری خۆتانە، خەڵکی شارەکان بە قامیش خانووەکانیان بنیات دەنا.[2]

پاشان ئاگر بەربوویە بەسرە و کوفە و گەورەترین و سەختترینیان ئاگرەکەی بەسرە بوو، کە(٨٠) کەپری سوتاند، قامیشی جوالی تێدا نەمایەوە و بەردەوام خەڵکیش تا ئێستا باس لەو ئاگر کەوتنەوەیە دەکەن، پاشان سەعد چەند کەسێکی لێ ناردن تا مۆڵەت لە عومەر وەربگرن کە خانووەکانیان بە خشت درست بکەن هەواڵەکەیان بۆ هێنا سەبارەت بە ئاگر کەوتنەوەکە و ئەو زیانانەی لێیان کەتووە ئەوان داوای هیچ ناکەن و بۆ هیچ نەهاتوونەتە لای ئەوە نەبێت کە ڕاوێژی پێ بکەن، ئەویش فەرمووی: دروستی بکەن، هیچ کامتان لە سێ ژوور زیاتر دروست نەکات و زیادەڕەویش مەکەن، پابەند بن بە سوونەتەوە با دەوڵەت پابەند بێت پێتانەوە، پاشتر خەڵکەکە گەڕانەوە بۆ کوفە، عومەر بە هەمان شێوە نامەیەکی نووسی بۆ عوتبە تاوەکو خەڵکی بەسرە بە هەمان شێوە کارێکی وەها ئەنجام بدەن، عومەر بەڵێنی دا بە شاندەکە و داوای لێ کردن کە خانووەکانیان لە چارەنووسی خۆیان زیاتر بڵند نەکەنەوە، وتیان: چارەنووس چیە؟ فەرمووی: ئەوەی کە لە زیادەڕۆیی نزیکتان ناکاتەوە، لە بەدواداچوون دەرتان ناکات.[3]

لە خستنەڕووی ئەم هەواڵەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەو خەڵکە لە ڕووکاری دونیاییەوە خواپەرست بوون و خانە و لانەیەکیان مەبەست بووە کە لە گەرمای خۆر و سەرما و بارانی زستان بیان پارێزێت، بە لایانەوە گرنگ نیە کە چێژ لە کۆشك و تەلار و خانووی بەرز و بڵند وەریگرن، لەبەر ئەوە کەپر دروست کردنیان بە قامیش هەڵبژاردووە کە ئاسانترین شت بووە لای ئەوان تا ناچار بوون کە پەنا بۆ خشت و قوڕ بەرن، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە عومەر (ﷺ) دەبینین کە یەدەکی تەواوو پێویستیان بۆ دادەنێت بۆ ڕێگەگرتن لە کاری کێبڕکێ کەرانە و دەست درێژی لە بنیاتنان، ئەمەش هەست کردنێکی ماوە درێژە کە عومەر پێشبینی کردووە کە ئومەت لە دەوڵەمەندیدا بێتە سەری بە تایبەتی لە دوای جەنگە پاکسازیەکان ئەو لەم ئامۆژگاریە و هاوشێوەکانی سنوورێك دادەنێت لە پاڵنەری ئومەت بەرەو زیادەڕۆیی و ئاسوودەیی، لەسەر ژیانی بە دواداچوون و ڕاست بوونەوە هەڵیبگرێت، لە وتەکانی عومەر(ﷺ) بۆمان دەردەکەوێتکە مەبەست لەو بینایەی کە خێری تێدا نیە ئەوەیە کە لە زیادەڕۆیی و دەرچوون لە بەدواداچوون و ڕاست بوونەوە دەردەچێت، لە گەورەترین ڕووکارەکانی زیادەڕۆیی و دەست

---

١ـ نبات شوكى ينبت في نزور الارض.
٢ـ تأريخ الطبري (٥/١٥).
٣ـ تأريخ الطبري (٥/١٦).

درێژی کردنیش لە بنیاتناندایە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بینای خانوو سامانێکی زۆر و کاتێکی درێژە پیاو بە تیاچوون دەبات، ئەگەر مرۆڤ بە بایەخەوە خەرجی بۆ کرد ئەوا دەست دەگرێت بەسەر هزر و هۆشیدا و ئەمەش بە پەرۆشی و غەمی گەورە لای هەندێ کەس دەمێنێتەوە،[١] ئەوەی کە عومەر(ﷺ) لێی دەترسا کرانەوەی دونیایی بوو لە سەردەمەکەیدا و هەوڵی دەدا کە ئومەت دابڕێت لە ڕۆچوون تیایدا لە بواری بنیاتنانێك کە هەژمار نەکرێت بەوەی کە پێویستە خانووەکە لە ماوەیەکی کورت و کەمدا ئامادە بکرێت، چونکە ئامادەکردنی خانوو لەم سەردەمەی ئێمەدا پێویستی بە چەندین ساڵی تەمەن هەیە، پاش ئەوەش چەند قەرزێکی کەڵەکەبووی بەدوادا بینی کە شتێك دیلێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە چینە مامناوەندەکاندا لەو سەرمایەدارانەیە کە بە زۆرینەی خەڵکی دێتە هەژمار، لەبەر ئەوەی کە ئەو تەلارانەی کە خەڵکانێکی زۆری لەسەر دەناسرێت پێویستی بە چەندین جۆری گرانبەها هەیە لەو کەلوپەل و تەواوکاریانەی کە داواکەرەکەی سووك دەکات، وای لێ دەکات کە بەردەوام شوێنی هەناسەکانی بکەوێت بۆ ماوەی چەند ساڵێك بەڵکو بگاتە ئەوەی کە ناخی لە کێشە و گرفتی خەڵکی بۆ دێنێتە کایە لە ڕووکارەکانی ژیانی دونیایی، لە زەریای ئەم کێبڕکێ کاریەیدا هەندێك جار بڕێك لە داخوازیە زیندووەکانی ئیسلام لە دەست دەدات لەوانە: لەو پەرستشە داهاتیەی کە سەروەرەکەی زەکاتە، بەخشین بەسەر موجاهیداندا و لە پێناوی خوادا، سەرباری ئەوەی کە هەندێ جار هزر و هۆشی مرۆڤەکان سەرقاڵ دەکات لە دوورکەوتنەوە لە نوێژەکان و گەران بە دوای زانیاری و زانستدا.[٢]

### - وتەیەکی عومەر: ئەوەی لە زیادە ڕەویتان نزیك ناکاتەوەو دورتان ناخاتەوە لە میانەڕەوی:

واتا سنووری خانووی ڕێگە پێدراو ئەوەیە کە خانووەکەی لە زیادەڕۆیی نزیك نەکاتەوە کە بریتیە لە تێپەڕاندنی سنووری ڕێگە پێدراو دەری نەکات لە سنووری ڕاست بوونەوە، عومەر(ﷺ) دیاری کردنی ئەم سنوورەی واز لێهێنا بۆ خۆیان، لەبەر ئەوەی کە هەر شارێك کەلتووری تایبەتی خۆی هەیە کە زیادەڕۆیی و ڕاست بوونەوە و دەست گرتنەوەی پێ دیاری دەکرێت، کەواتە مەبەست ئەوەیە کە کەلتووری باو لە وڵاتدا دیاری دەکات لای ناوەندی خەڵکی لە خەڵکانی خۆڕاگر بە ڕاست بوونەوە لە کاروباری دونیایی.[٣]

### وتەیەکی تر: پابەند بن بە سوونەتەوە دەوڵەت پابەند دەبێت پێتانەوە:

واتا پابەند بوون بەو ڕێگە دروستەی کە پێغەمبەر (ρ) لەسەری ڕۆیشتووە و هۆکارە لە بەڵگە هێنانەوە لەسەرخەڵکی و دانیشتن لەسەر زەوی، هەروەك ئەوەی، کە لەقورئاندا هاتووە و

---

١ـ تأريخ الاسلام (١٩-٢٠/٢٢).
٢ـ تأريخ الاسلام (١٩-٢٠/٢٢).
٣ـ تأريخ الاسلام (١٩-٢٠/٢٢).

دەفەرمووێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ (النور: ٥٥).

ئەمەیە ئاینگەرایی لەعومەر(ﷺ) لە ڕووکاری دونیا لەگەڵ ئەوەی کە موسڵمانان ئەو کاتە کێبڕکێیان لەم خوا پەرستیەدا دەکرد. ئەی دەبێت ئەوانە چۆن بن کە بە دوای ئەواندا هاتوون و بە درێژایی ڕۆژگار کێبڕکێیان بووە لەسەر ڕووکارەکانی دونیا؟ ئەمە و ئەمیری باوەڕداران عومەر(ﷺ) سوور بووە لەسەر چارەسەری کاروباری کرانەوەی مادی کە لە سەردەمی خۆیدا بووە، بە جۆرێك کە وڵاتی فارس و چەند بەشێك لە وڵاتی ڕۆمەکانی پاکتاو کرد، خوای گەورە غەنیمەتی ئەو پاکسازیانەی ڕشت بەسەر موسڵمانانداو و وڵات و خەرجیەکانی کردە ساباتی داهاتێکی گەورە، ئەمیری باوەڕداران وتارێکی بەهێزی خوێندەوە و ئەو واقیعەی تێدا تایبەتمەند کرد و موسڵمانانی ڕێنمایی کرد بۆ ڕەفتارێکی نموونەیی.

هەروەها عومەر(ﷺ) فەرمووی: خوای پاك و بێگەرد سوپاس گوزاری لەسەر واجب کردوون و بەڵگەی لەسەر تەواو کردون لەوەی کە بۆی هێناون لە ڕێزداری دونیا و دوارۆژ، بەبێ داواکاری ئێوە لەو، کە ئارەزووی ئێوەی تێدا نیە بۆ لای ئەو، خوای گەورە و باڵادەست ئێوەی خولقاندووە دەیتوانی بتان کاتە بێرشێز ترین بەدیێنراو ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمو بەیهێنراوەکانی بۆ خزمەتی ئێوە بەدیهێناوە، هەموو شتێکی لەسەر زەوی و لە دەریادا بۆ فەراهەم هێناون، لە هەموو شتە باشەکان ڕزق و ڕۆزیداون، تا سوپاسی بکەن، پاشان چاو و گوێی داونەتێ، لەو ناز و نیعمەتانەی کە خوا ڕژاندوویەتی بەسەرتاندا نیعمەتێکە نەوەکانی ئادەمی پێ گرتۆتەوە، لەوانە نیعمەتێك کە خەڵکی دینەکەتانی پێ پسپۆڕ کردووە، پاشان ئەو نیعمەتانە لەدەوڵەت و زەمان و لە نێو چین و توێژی ئێوەدا بۆتە هۆکارێکی تایبەتی و گشتی، نیعمەتێك لەو نیعمەتانە نیە کە بە تایبەتی گەیشتبێتە دەستی کەسێك مەگەرنا بەشێك بووە لەوەی کە پێی گەیشتووە لە نێوان خەڵکیدا تەنها ئەوەیان سوپاسی خوای کردووە کە زۆر ماندوو بووە، مافی خۆی بە گرانی داوە، مەگەرنا بە هاوکاری خودا بێت لەگەڵ باوەڕهێنان بە خوا و پێغەمبەرکەی، ئێوە بە ڕاستی جێنشین کراون لەسەر زەوی، زاڵن بۆ خەڵکەکەی و خوای گەورە ئاینەکەتانی سەرخست و هیچ ئومەتێك سەرپێچکاری ئاینەکەتان نەبووە جگە لە دوو ئومەت نەبێت، ئومەتێك کە دووركەوتۆتەوە لە ئیسلام و خەڵکەکەی، پاداشتیان بۆ دیاری دەکەن و پوختی دەکەنەوە، بژێوی و تێکۆشان و ئارەق ڕشتنیان، لە سەریان دەبێتە ناوك و بۆ ئێوەش دەبێتە سوود و قازانج، ئومەتێك کە چاوەڕوانی ڕووداوانی خوا و تواناکانی دەکات لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا، بۆیە خوای گەورە دڵی پڕ کردووە لە ترس، هیچ پەناگەیەك شك نابەن کە پەنای بۆ بەرن، هیچ قاچاغیەك نیە کە

خۆیانی پێوە بپارێزن سەربازانی خوا گەمارۆی داون و دابەزیونەتە گۆڕەپانەکانیانەوە لەگەڵ فراوانی ژیان و بەهرە خواستنی سامان و بەدواداچوونی ناردەنیەکان و بەربەستی دەروازەکان بە یارمەتی خودا، لەگەڵ ئەو تەندروستیە گشتیەی کە ئەم ئومەتەی لەسەر باشتر لەوەی کە تیایەتی لەوەتی ئیسلام هاتووە، خوای گەورە سوپاسکراوە، ئەی ئەو خۆزگەیەی چیە کە لەگەڵ ئەم سوپاسی سوپاسگوزاران و یادی یادکەرەوان و هەوڵی هەوڵداران پێ بگات، لەگەڵ ئەم ناز و نیعمەتەی کە ناژمێردرێت و ئامار ناکرێت، ناتوانێت مافی خۆی پێ بدرێت ئەگەر بە هاوکاری خودا و سۆز و بەزەیی ئەو نەبێت، ئێمە داوا لەو خودایە دەکەین کە هیچ خوایەك نیە جگە لە خۆی کە (اللە)یە ، کە رزق و رۆزیمان بدات بە کاری وزەیی و پەلە کردن بۆ رەزامەندیەکانی، ئەی بەندەکانی خودا گرفتاری خوا لە لای خۆتان لە یاد مەکەن ناز و نیعمەتەکانی خوا بە تاك و بە کۆ لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانتاندا تەواو بکەن، خوای گەورە بە موسا پێغەمبەری فەرموو: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ......﴾ (ابراهیم: ٥).

هەر خوای گەورە بە پێغەمبەر (ρ) دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ.....﴾ (الانفال: ٢٦).

ئەگەر ئێوە لاوازکراو و ژێردەستە بوون و بێ بەش بوون لە داهاتی دونیا لەسەر بەشێك لە هەق، باوەڕی پێ دێنن و پشووی بۆ دەدەن، لەگەڵ شارەزابوون لە خودا و ئاینەکەی، تکای خێری لێ دەکەن لەوەی پاش مردن، ئەوە دەبوو، بەڵام ئێوە توندترین خەڵك بوون لە بژێویدا دامەزراوترینیان بوون لە نەفامیدا بە خودا، ئەگەر ئەمە ئەوەیە کە ئێوە پێی پەکتان کەوتووە ئەوا بەختەوەری لەگەڵدا نیە لە دونیای ئێوەدا جگە لەوەی کە ئەمە متمانەیەکە بۆ ئێوە لەو دواڕۆژەتاندا ئەگەر گەرانەوە و هەڵگەرانەوە تیایدا بۆ لای ئەوە، ئێوە لە هەوڵی بژێویدان لەسەر ئەوەی کە ئازادن لەسەری کە لەسەر بەشی خۆتان لێی بەرچاوتەنگی بکەن، لەسەر شتێکی تر دەریدەخەن، بەڵکو ئەو بە جۆرێك بێت کە باشی دونیا و دواڕۆژی بۆ کۆکردبنەوە، کێ لە ئێوە توانیویەتی ئەوەی بۆ کۆبکاتەوە، خوای گەورە کۆسپی نێوان دڵەکانتانی وەیاد هێناوەتەوە مەگەر ئەوە نەبێت کە زانیوتانە مافی خودایە و کارتان بۆ کردووە لەگەڵ بەختەوەری نیعمەتەکاندا ترس و بیمی ئەوتان لە ناخی خۆتان بۆ ڕاگوێزانەوەی کۆکردۆتەوە، وەلێی هەراس بوون لە ڕاگوێزانەوەی، بە ڕاستی هیچ شتێك نیە کە داپلۆسێنەر بێت بۆ نیعمەت و لێپرسینەوەی هەبێت بۆ زۆری، ئەمە بۆ خودایە و فەرمان پێکردنتان و ڕێگری کردنتان لەسەر من پێویستە.[1]

---

١ـ تأريخ الطبري (٢١٣/٥، ٢١٢، ٢١١).

## - شاری فستات (فسطاط):

ئەگەر سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) دامەزرێنەری شاری کوفە بێت، ئەوا عەمری کوڕی عاص بە یەکەمین دامەزرێنەری شاری فستات دێتە هەژمار، پاش لێبوونەوەی لە پاکتاوکردنی شاری ئەسکەندەریە عەمر ویستی سەقامگیری تێدا بەرپا بکات. لەم کاتەدا عومەر نامەیەکی بۆ نووسی: با لە نێوان من و ئێوەدا ئاو نەبێت هەتا دێمە لاتان، لەبەر ئەوە لە ئەسکەندەریەوە گۆڕرا بۆ فستات،[1] یەکەمین کارێ کە تێیدا کردی بریتی بوو لە دروست کردنی ئەو مزگەوتەی کە بە ناویەوە نووسرا، ئەویش بە کارزانی مزگەوتەکەی لە شاری ئەسکەندەریە پاشان خانوویەکی بۆ عومەر دروست کرد، ڕەنگە مەبەستی لێی خانوویەك بووبێت بۆ خەلافەت، بۆیە عومەر نامەیەکی بۆ نووسی و تیایدا فەرمانی پێکرد کە بیکاتە بازێڕێك بۆ موسڵمانان،[2] عەمری کوڕی عاص لە نزیك مزگەوت دوو خانووی دروست کرد بۆ خۆی هەروەك إبن عبدالحکم هەواڵمان پێ دەدات: عەمر خۆی نەخشەی ئەو خانووەی کێشا کە ئەمڕۆ لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەدایە و لە نێوانیاندا ڕێگەیەك هەیە و ئەوی تریان لکاوە بە تەنیشتی مزگەوتەکەوە،[3] ڕەنگە یەکێك لەو خانووانەی بۆ خۆی و ئەوی تریانی بۆ کاری ئەمیرایەتی دروست کردبێت ئەویش پاش ئەوەی کە عومەر فەرمانی پێکرد بە ڕووخانی ئەو خانووەی کە پێشتر باسکرا، عەمری کوڕی عاص کۆمەڵێك لە گەورە هاوەڵانی موسڵمانی ڕاسپارد کە نێوانی هۆزەکان لێك جیابکەنەوە، و ئەوانیش بۆ هەر تیرە و هۆزێك ڕووەیەکیان بۆ خانووەکانیان دانا کە بە نەخشەسازی دەناسرا، ئەمە هاوشێوەی ئەوە بوو کە ئەمڕۆ لەم سەردەمەی ئێمە پێی دەوترێ گەرەك، بەڵام بەم بەرفراوانیە نەبووە بەجۆرێك لەنێوان تیرەیەك و تیرەیەکی تردا چەندین شەقام هەبێت، ڕەنگە بە زاراوەی ئەم شەقامانەی ئەمڕۆ نەبووبێت بەڵکو چەند ڕاڕەوێك بوون لە نێوان کۆڵانێك و یەکێکی تردا، ئەو کۆمەڵە هاوەڵەش پێکهاتبوون لە: معاویەی کوڕی خەدیجی ئەلتەجیبی و شەریکی کوڕی سومی ئەلغەتیفی و عەمری کوڕی موحەڕەمی ئەلخولانی، حوەیلی کوڕی ناشبینی ئەلمەعافری، ئەمانە هەر ئەو کەسانە بوون کە خەڵکیان نیشتەجێ دەکرد، لە ساڵی ٢١ی کۆچیدا[4] هۆز و تیرەکانیان لێك جیاکردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بوار نیە بۆ باسکردنی هەموو نەخشە و پلانەکان لەم بوارەدا، بەڵام هەرچۆن بێت باسی هەندێکیان دەکەین لەوانە: پلانەکەی ئەسلەم، لیتون، بەنی معاذ، وبلی، بەنی بەحر، مهرە، لەخم، غافق، صدف، حەندەمەوت، تەجیب، خۆلان، مەزحەج و موراد، یافع و مەعافر، لەگەڵ ئەشعەریەکان،[5] لێکۆڵەر لێرەدا ئاماژە لەم ناوانەدا بە زۆری تیرە و هۆزە عەرەبیەکان و ئەوانی ترش دەکات کە بەشداریان کردووە لە کاری پاکسازی و پاشان ئاماژە بە زۆری گەرەکە دروست کراوەکانی ئەو هۆزانە و خۆنەویستیان دەکات لەوەی کە حەزیان بە سەربەخۆیی تایبەتی خۆیان

---

١ـ فتوح عمر لإبن عبدالحکم (ص: ٩١)، سمیت فسطاط لأنه أقام فسطاطة.

٢ـ عمرو بن عاص القائد السیاسي (ص: ١٣٥).

٣ـ فتوح مصر (ص: ٩٦-٩٧).

٤ـ عمرو بن عاص القائد السیاسي (ص: ١٣٦).

٥ـ فتوح مصر (ص: ١١٥-١٢٩).

کردووە، بۆ ئالۆگۆڕی کاروباریان و ئەوەی گرنگە لە نێو تاکەکانیدا، هەروەها ئاماژە بە وردی ئەو ڕێکخستنە دەکات کە عەمرلەم دابەشکردنی هۆزایەتیەدا لەسەری کۆك بووە،[1] ئەم هۆزانە لە ناوەندی شوێنەکانیان مزگەوتەکانی خۆیان بنیات دەنا و (إبن ظهیرة) لە کتێبەکەیدا: (الفضائل الباهره فی محاسن مصر والقاهره) بە گواستنەوە لە إبن زولاقەوە کە دەربارەی مزگەوتەکانی فستاتی باسکردووە هێناویەتی، لە سەرەتادا باسی مزگەوتەکەی عەمری کوڕی عاص و پاشتر ژمارەیەك لەو مزگەوتانە کردووە کە دراونەتە پاڵ تاکەکانی تر،[2] دوای ئەوە دەڵێت: لە میسردا مزگەوتی هاوەڵان هەبووە — جگە لەوەی کە باسمان کرد — مزگەوتانێك کە لە کاتی پاکسازیان دروست کراون و ژمارەیان دەگاتە ٢٣٣ مزگەوت، ڕیزبەندکردنی بە پێی شوێنکەوتەی هۆزایەتیەکانی هاتووە.[3]

ئەمە و عەمری کوڕی عاص هەستاوە بە دیاری کردنی شوێنەکەی، ئەگەر ئاسانکاری پەیوەندی بە ئامادەبوونی خەلافەت ئاسان بووایە، باشتر وابوو کە ئەم مزگەوتە لە ناوەند و لە نێوان بەشی باکوور و بەشی باشوور و نزیك لە ڕووباری نیل بوایە.[4]

### - شاری سەلت لە لیبیا:

پاش ئەوەی کە ناوچەی بەرقەی بەشی ڕۆژئاوای میسر بوویە پێگەیەك بۆ سوپای ئیسلامی، عەمری کوڕی عاص و سوپاکەی لەوێوە بەرەو تەرابلس کەوتنەڕێ، ئەو دەمە شاری سەلت کەوتە نێوان بەرقە و تەرابلس و عەمر دەستی گرت بەسەردا، موسڵمانان کردیانە پێگەیەك بۆ دەرچوون بەرەو ڕۆژئاوا لە ساڵی ٢٢ی کۆچیدا، بەم شێوەیە بەرقە بە پێگەیەك مایەوە بۆ هێزی موسڵمانان و بوویە مەڵبەندێك بۆ عەقبەی کوڕی نافع کە پەرۆشی خۆی خەرج کرد بۆ بڵاوبوونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە مێرگە نزیکەکانی فەزان و وەدان و زویلە و سودان.[5]

### - پارێزەرانی دەسەڵات لە شارە پاکتاوکراوەکاندا:

عومەر(ﷺ)ناوی سەربازگەی دەنا لە پارێزەرانی دەسەڵات لە شارە ئازادکراوەکاندا لە تەواوی لایەنەکان لە وڵاتی ئازادکراودا،بە تایبەتی لە وڵاتی شام، ئەو دەمە شام چەند سەربازگەیەکی تێدابوو بۆ نیشتەجێ بوونی سەربازەکان، لە هەموو سەربازگەکەیدا گەلەخانێك هەبوو بۆ وڵاتەکان کە لانی کەم بە تەواوی چوار هەزار ئەسپی بە کەرەستە و ئامادەسازیەکانەوە لە خۆی دەگرت کە هەموویان لە ئامادەباشیدا بوون[6] تەنانەت ئەگەر پێویستی بکردایە سەرکردە دەیتوانی لە ماوەیەکی کەم و کورتدا

---

١ـ عمرو بن عاص القائد السياسي (ص: ١٣٧).
٢ـ أهل الفسطاط، د. صالح أحمد العلی (ص: ٣٨).
٣ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٣٨).
٤ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، جميل المصري (ص: ٣٣٩).
٥ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٣٤٠).
٦ـ البداية والنهاية (١٣٨/٧)، تأريخ الدعوة (ص: ٣٤١).

زیاتر لە (٣٦) هەزار ئەسپ سوار تەنها بە یەك جار لە وڵاتی شامدا ڕەوانەی گۆڕەپانەکانی جەنگ بکات، چەندین مەزرای تایبەت بۆ ئەو ئەسپانە هەبوو لە هەر سەربازگەیەکدا،هەموو ئەسپێك داخێك دەدرا لە ڕانی کە لێی نووسرابوو: سوپایەك لە پێناو خودا، ئەویش وەك بەجێهێنانی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموویێت: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ....﴾(الانفال: ٦٠).

## - لەو پارێزەرانەی وڵاتی شام:

### سەربازگەی دیمەشق:

لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا ڕێزبەندکردنی درابوویە دەست سێ کەس کە: یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان، سوەیدی کوڕی کەلسوم، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوون.

### سەربازگەی حەمص:

کە ئەبو عوبەیدە عامر کوڕی جەڕاح، عوبادی کوڕی صامت و عەیاض کوڕی غەنەم و سەعدی کوڕی عامری کوڕی خەزیم و پاشان عومەیری کوڕی سەعد و عبداللە کوڕی فەرط بە ڕێوەیان دەبرد.

### سەربازگەی قەنسرین:

خالدی کوڕی وەلید و عومەیری کوڕی سەعد بە ڕێوەیان برد.

### سەربازگەی فەلەستین:

یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان و عەلقەمەی کوڕی مەجزەز بە ڕێوەیان دەبرد.

### سەربازگەی ئوردن:

مەڵبەندەکەی تەبەریە بوو، کە شەرحەبیلی کوڕی حەسنە و یەزید و مەعاویەی کوڕانی ئەبو سوفیان بە ڕێوەیان دەبرد، موعاویە سەربازگەی دیمەشق و ئوردنی پاش کۆچی دوایی یەزید بە نەخۆشە تاعونی عەمواس گرتە ئەستۆ،[1] ئەو ئارەزوومەندیەی کە پاڵی پێوە دەنان بەرەو جیهاد کردن تەنها خواستنی ڕەزامەندی خوا بوو کە زۆربەی یاران و هاوەڵان مەبەستیان بوو بەم هۆیەوە کۆچیان دەکرد بۆ ئەو شارانەی کە بە دەروازە و ئاوەدانی ناودەبران. ئەویش بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەواز و جیهاد لە پێناوی خودا و فێرکردنی خەڵکەکەی لە قورئان و سوونەت، هەر یەکە لە شارەکانی مەدینە و بەسرە و کوفە و دیمەشق و فستات، بوونە ناوچەی چڕوپڕی دانیشتوان و خەڵکی بە مەبەستی دەسکەوتنی زانیاری و زانست و جیهاد ڕوویان لێ دەنا، یان ئارەزوویان دەکرد لە تۆمارکردنی ناویان لە دیوانی

---

١ـ البداية والنهاية (١٣٨/٧)، تأريخ الدعوة (ص: ٣٤٨).

سەربازی و بە دەسکەوتنی بەخششەکان یان بە ئارەزووی بازرگانی و چەند پیشەیەکی تر، ئەمەش وای لەو شارانە کرد کە ببنە ئەو گومەزە شارستانیانەی کە زۆرێك لە زانست و زانیاری و شارەزاییەکان تیایدا گەشەی سەند و چەندین پیشە و پێشەسازی تیایدا گەشەی کرد.[١]

## دووەم: قەیرانی ئابووری (ساڵی برسێتی):

لە سەردەمی دەسەڵاتی عومەردا (ﷺ)دەوڵەتی ئیسلامی دووچاری نەهامەتی هات،ئەمەش بارودۆخێکەو بەسەر زۆر لە دەوڵەتانی دونیادا هاتوە، ئومەتی ئیسلامیش یەکێکەلەو ئومەتانە سونەتی خودایی دەیگرێتەوە چونکە سونەتی خوایی سونتێکی جێگیرو نەگۆڕە.،یەکێ لە گەورەترین سەختی و نارەحەتیەکانی سەردەمی عومەر ساڵی برسێتی و تاعوونی عەمواس بوو، لێدەگەرێین با لاپەڕەکان باسی هەڵسوکەوتی عومەرمان لەگەڵ ئەم قەیرانانەدا بکەن، چۆن لە ڕێی دەست گرتن بە یاسای هۆ هو هۆکارەو، نزاو پاڕانەوەو زەلیلیءنواندن بەرامبەر خوای گەورە بەرێی کردون وبەسەرکەوتوی لێیان هاتۆتە دەرەوە، لە ساڵی (١٨)ی کۆچیدا خەڵکی لە دورگەی عەرەب دوچاری برسیەتیەکی سەخت و وشکەساڵی و قات و قڕی هاتن و برسیەتی زۆری بۆ هێنا و تەنانەت دڕندەکان پەنایان بۆ ئادەمیزاد دەبرد، پیاو مەڕی سەردەبڕی لە بەر قێزەونی نەیدەخواردو فڕێی دەدا ، مەڕ و ماڵاتێکی زۆر لە برسان مردن و ئەو ساڵەش ناونرا بە ساڵی (سوتەك)، لەبەر ئەوەی کە با خاك و خۆڵی وەك خۆڵەمێشیءبە هەوادا دەدا، قات و قڕی زیادی کرد و پارو خۆشەویست بوو، خەڵکی لە قولایی بیابانەکانەوە ڕوویان کردە مەدینەو تێیدا نیشتەجێ بون، هاتن بۆ مەدینە تا ئەمیری بڕواداران ڕێگا چارەیەکیان بۆ بدۆزێتەوە، عومەری فاروقیش تەنها کەس بوو، کە هەستی بەم نەهامەتیە دەکردوخۆی بە بەپرس دەزانی لەبەرامبەر ئومەتەوە ،[٢] دەکرێت توێژەر تێبینی ئەو هەنگاوانە بکات کە عومەری کوڕی خەتاب لەسەری ڕۆیشت لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم قەیرانەدا.

**وەك:**

### ١- خۆی کردە نموونەو پێشەنگێك بۆ خەڵکی:

لە ساڵی برسێتیدا هەندێ نانە چەوریان هێنا بۆ عومەر ئەویش پیاوێکی دەشتەکی بانگ کرد هەتا لەگەڵی بخوات، بەم شێوەیە دەشتەکیەکە بە پارووەکەی چەوری لاتەنیشتیەکانی قاپەکەی دەماڵی و دەیخوارد، عومەر پێی فەرموو: لەوە دەچێت کە شوێنی چەروی کەوتبی، دەشتەکیەکە وتی: بەڵێ، من ڕۆن و زەیتم نەخواردووە و ماوەیەکی زۆریشە تا ئەمرۆ دەمم پێوە نەداوە، عومەر سوێندی خوارد کە: چێژی گۆشت و ڕۆن نەکات هەتا خەڵکی دێنەوەسەر خۆیان. گێڕەرەوەکان هەمویان یەك ڕان لەسەر ئەوەی کە عومەر وەفای بۆ ئەم سوێندەی هەبووە، لەمەدا دەردەکەوێت کاتێك ڕۆنی هێزە و

---

١ـ إقتصاديات الحرب في الاسلام (ص: ٢٥٠).
٢ـ فن الحكم، البداية والنهاية (٩٨/٧)، تأريخ الطبري (٧٥/٥).

شیری مەشکە هاتە بازاڕ خزمەتکارەکەی عومەر بە چل درهەم کڕی وهێنای بۆ عومەر وعەرزی کرد : ئەی ئەمیری باوەڕداران، خوای گەورە دەروی لە روو کردێتەوەو سوێندەکەت نەکەوت و پاداشتی چاکەتی دایەوە ، مەشکەیەك شیرو هیزەیەك ڕۆن هاتە بازاڕ و منیش کڕیم بە چل درهەم، عومەر فەرمووی: بە گرانت کڕیون، بڕۆ بیانکە بە خێر من پێم ناخۆشە کە زیادەڕۆیی لە خواردندا بکەم، پاشان فەرمووی: چۆن بتوانم هەست بە ئێشو ژانەکانی گەلەکەم نەکەم کاتێ منیش وەکو ئەوانم نەژیم،[1] ئەمە تەنها ڕستەیەکە لە چەند وشەیەکی پڕشنگدار، فاروق تیایدا یەکێك لە جوانترین بنەماگەورانەما بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەکرێت مرۆڤایەتی لە هونەری فەرمانڕەواییدا بیزانێت و کاری پێبکات، چۆن خەڵکەکەم لا مەبەست و گرنگ دەبێت ئەگەر ئەوەی بەوان گەیشتووە بە من نەگات،[2] عومەر لە ساڵی سوتەکدا هێندەکاریگەربوو بە جۆرێك کە ڕەنگی گۆڕا، عەیاضی کوڕی خەلیفە دەفەرمووێت: لە ساڵی سوتەکدا عومەرم بینی کە ڕەنگی گۆڕابوو، عەیاضی کوڕی خەلیفە دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ)م بینی کە ڕەنگی ڕەش هەڵئەگەرابوو لە ساڵی سووتەکدان ئەو پیاوێکی عەرەب بوو کە نان و شیری دەخوارد کاتێك کە خەڵکی ئەوەیان دەخواست عومەر لە خۆی یاساغ کرد، دەستی کردە خواردنی زەیت هەتا ڕەنگی گۆڕا و زیاتر برسی بوو،[3] ئەسلەم دەفەرمووێت: ئێمە دەمان وت: ئەگەر خوای گەورە ئەم وشکەساڵیەی هەڵنەگرتایە کە ساڵی سووتەك بوو ئەوا گومانمان دەبرد کە عومەر بە پەرۆشی کاروباری موسڵمانان کۆچی دوایی دەکرد،[4] عومەر(ﷺ) بە درێژایی ڕۆژگار بە ڕۆژوو دەبوو، دە ساڵی سوتەك ئەگەر ئێوارەی بکردایەتەوە ئەوا بە نان و ڕۆنە زەیت ئێوارەی دەکردەوە، هەتا ڕۆژێك چەند سەر ئاژەڵیان سەربڕی خەڵکی لێیان خوارد و گۆشتە باشەکەیان بۆ برژاند، هێنایان بۆی کە جگەربە پەراسوو بوو، عومەر فەرمووی: ئەمە چیە؟ وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران لەو ئاژەڵانەیە کە سەربڕوان ئەمڕۆ، عومەر فەرمووی: بخ بخ، چەند خراپە ئەو والیەی ئەگەر من بم و گۆشتە باشەکە بخۆم و خەڵکیش ئێسکانەکانی بخۆن،[5] ئەو دەفرە لابە، جگە لەوە خواردنێکی ترم بۆ بهێنن، پاشتر نان و ڕۆن زەیتیان بۆ هێنا و بە دەستە پیرۆزەکانی نانەکەی ورد کردو لەگەڵ ڕۆن زەیتەکەدا کردیە تریت، و دواتر فەرمووی: بەڵام لێدای ئەی یەرفەء،[6] ئەم مەنجەڵە گەورە هەڵبگرە هەتا دەیبەی بۆ ماڵێ کە دەیکەنە تێکەڵە،[7] چونکە من سێ ڕۆژە نەچووم بۆ لایان و بە نانە وشکە بەندم کردوون، پاشان بیخە بەر دەستیان.[8]

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/٧٨).
٢ـ فن الحكم (ص: ٧١).
٣ـ الطبقات (٣/٣١٤).
٤ـ الطبقات (٣/٣١٥)، محض الصواب (١/٣٦٣).
٥ـ محض الصواب (١/٣٦٢).
٦ـ حاجب عمر، ادرك الجاهلية، وحج مع عمر في خلافة أبي بكر.
٧ـ موضع مال لعمر وقفه بالمدينة.
٨ـ الطبقات (٣/٣١٢)، الشيخان من الرواية البلاذري (ص: ٢٩٤).

ئەمە عومەری فاروقە و ئەمەش هونەری فەرمانڕەوایە لە ئیسلامدا کە فەرمانڕەوا باری خەڵك دەدات بەسەر خۆیدا، خەڵکی باشتر دەخۆن لەوەی ئەو دەیخواتن ئەو تاکە کەسێکە کە چەند هێندەی ئەوان لە کۆسپ و تەنگەرەکانی ژیان دەگریتە ئەستۆی خۆی، لەو هێندەیەدا وەك ئەوان دەناڵێنێت، ئەو لەمەشدا تەنها کۆت و بەند لەسەر خۆی دانانێت بەڵکو لەسەری دەڕوات هەتا ماڵ و منداڵەکەشی کۆت و بەند دەکات، ئەوان پێویستە زیاتر لە خەڵکی گرفتار بن، ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ساڵی سوتەك عومەر شوتیەکی بینی بە دەست یەکێك لە منداڵەکانیەوە بۆیە دەست بەجێ پێی: بخ بخ ئەی کوڕی ئەمیری باوەڕداران، تۆ میوە دەخۆیت و ئومەتی محمد لاواز بن؟ منداڵەکەش بەگریانەوە هاتە دەرەوە و ڕایکرد، عومەر بێدەنگ نەبوو هەتا پرسیاری کرد و پاشان زانی کە کوڕەکەی بە چنگێك ناوك کڕیویەتی.[1]

بە ڕاستی هەست کردنی عومەر بە لێپرسراوێتی حوکم لەبەردەم خوا کەشەتاوی دەروونی دەبێتە مولکێك لەسەری، کە هۆکارێکی بەجێ نەهێشتووەلە دین و دونیا کە بە هۆیەوە ڕووبەڕووی وشکە ساڵی و دابڕانی باران مەگەر پەنای بۆ بەرێت، ئەو هەمیشە نوێژی دەکرد و هەمیشە داوای لێخۆش بوونی دەکرد و هەمیشە سوور بوو لەسەر بەدەست هێنانی خواردن و خواردنەوە بۆ موسڵمانان، و بیری لە خەڵکەکەی دەکردەوە، هەر کەسێکیان بەرەو شار بکشایە و هەر کامیان لە دەشت بمێنێتەوە، بە هەموو شێوەیەك ڕوبەڕووی ئەرکەکانی دەبوویەوە لە هاوچەشنی و هەبووندان پاشان دوای ئەمەش دڵڕەقە بەرامبەر خۆی و ئەو دڵڕەقیە چەند جوانە، هەتا کەسێك لە پێوەی پێچرا و لەم تەنگژەیەدا فەرمووی: ئەگەر خوای گەورە ئەم وشکە ساڵیەی ساڵی سوتەکی هەڵنەگرتایە ئەوا گومانمان دەبرد کە عومەر بە پەرۆشی کاروباری موسڵمان کۆچی دوایی دەکرد.[2]

## قەیرانی ئابوری ( ساڵی برسێتی ) :

ئەسڵەم دەفەرمووێت: کاتێك کە سەردەم ساڵی برسێتی بوو خەڵکی لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و ڕوویان دەکردە مەدینە، ئەو دەمە عومەر فەرمانی دا بەسەر چەند پیاوێکدا کە خەریکی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بوون، گوێم لێ بوو شەوێك دەیفەرموو: ئاماری ئەو کەسانە بکەن کە لای ئێمە نانی ئێوارە دەخۆن، لە بەرامبەردا ئاماریان دەکردن و بینیەیان ٧ هەزار پیاون، پیاوانی نەخۆش و پەککەوتە و منداڵانیان ئامارکرد و بینیەیان ٤٠ هەزار کەسن، پاشان و دوای چەند ڕۆژێك ژمارەی گەورە و بچووك گەیشتە ٦٠ هەزار کەس، ئەمە نەبڕایەوە و کۆتایی نەهات هەتا خوای گەورە ئاسمانێکی بە پیت و فەڕی نارد کاتێك کە باران باری عومەرم بینی کە خەڵکانێکی کردبوویە وەکیل هەتا هەر کەسێك ڕۆیشتە دەرەوە بۆ دەشت و دەر خواردن و خواردنەوەی بدرێتێ بۆ دەشت، چونکە ئەوان مردنیان تێکەوتوو دەبینم سێ یەکیان گیانیان لە دەست داوە، لێرەدا بێنیازی عومەر لەوەدا

---

١ـ الطبقات (٣/٣١٥)، محض الصواب (١/٣٦٣).

٢ـ فن الحكم (ص: ٧١)، الطبقات (٣/٣١٥).

بەدی دەکەین کە کۆمەڵە کاربەدەستێك لە بەرەبەیاندا پێی هەڵدەستان کە دەستاڕ و پێچانەوەیان کارپێ دەکرد و بەکاردەهێنا،[١] لێرەدا ئەوەش بەدی دەکەین کە عومەری فاروق (ﷺ) ئەرکی کارەکانی دابەش دەکرد بەسەر کاربنەگەرەکانیدا، دام و دەزگای پەنابەرانی دادەمەزراند بە جۆرێك کە هەموو کار بەدەستێك زانا بێت لەو کارەی کە پێی دەسپێردرێت بەبێ کەم تەرخەمی کردن تیایدا و زیادەڕۆیی نەکات بۆ کارێ کە سپێردراوە بە کەسێکی تر،[٢] عومەر چەند فەرماندەیەکی دانابوو لەسەر ناوچەکانی دەوروبەری مەدینە بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی بارودۆخی ئەو خەڵکانەی کە بۆ داخوازی زرق و ڕۆزیان و لەبەر سەختی ئەو بارودۆخەی کە تیایدان لەوێ کۆبوونەتەوە، ئەم فەرماندانە سەرپەرشتی دابەشکردنی خواردنەکە و بەردەوامیان لەسەرخەڵکی دەکرد ئەگەر پێویستیان بە شتێك بوایە ئەوا لای کۆ دەبوونەوە و هەواڵیان دەدایە بە هەموو ئەو شتانەی کە تیایەتی، ئەویش ئامۆژگاری دەکردن،[٣] عومەر خواردنی دەشتەکیەکانی لە خانەی وردە دەدا کە ئەویش لە دامەزراوە ئابووریەکانی ڕۆژانی عومەر بوو، کە خواردنەکەی دابەش دەکرا بەسەر ئەو ڕەوەندانەی کە دەهاتنە مەدینە، وردە، لاسك و خورماو مێوژ لە خەزن کراوەکانی ماڵ پێش ئەوەی کە کۆمەکیەکان لە میسر و شام و عێراق دەبێت و دواتر خانەی ئارد بەرفراوان بوو هەتا توانای هەبێت بەسەر خۆراك دانی دەیان هەزار کەس لەوانەی کە ماوەی ٩ مانگ بە ڕەوەندی هاتوونەتە مەدینە، پێش ئەوەی خەڵکی بە باران بە خۆیاندا بێنەوە،[٤] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەقڵیەتی عومەر لە پێشخستنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت ئەگەرچی داراییان شتی تر بێت، عومەر(ﷺ) خوبینی خۆی کاری لەو سەربازگانەدا دەکرد، ئەبو هورەیرە دەفەرمووێت: ڕەحمەتی خوا لە ئیبن حەنتەمە بێت، من بینیم لە ساڵی سوتەك کە بەسەر پشتیەوە دوو توێشەبەرەی هەڵگرتبوو هیزەیەك ڕۆنی بە دەستەوە بوو، لەگەڵ ئەسڵەمدا نۆبەتیان پێوە دەکرد کاتێك کە ئەسڵە منی بینی فەرمووی: لە کوێوە ئەی ئەبو هورەیرە؟ وتم: لەم نزیکانەوە، ئەو دەڵێت: من دەستم کردە یارمەتیدانی و توێشەبەرەکانم هەڵگرت هەتا گەیشتینە تارماییەك کە کۆمەڵێکی لێ بوو کە نزیکەی ٢٠ ماڵ لە چەکداران بوون، عومەر فەرمووی: چی ئێوەی هێناوە؟ وتیان: هەوڵ و کۆشش، ئەو وتی: ئەو وتی پیستەیەکی مردووی برژاویان بۆ دەرهێناین کە دەیانخوارد،لەگەڵ ڕزیوی چەند ئیسکێك کە تێك شکێنرابوون و ئەوان بە یەکیانەوە دەلکاند وتی: عومەرم بینی کە عەباکەی داخست و پاشان دانیشت خواردنی بۆ چاڵ کردن و خواردنی پێدان هەتا تێربوون، دواتر ئەسڵەمی نارد بۆ مەدینە و چەند حوشترێکی هێنا و سواری کردن هەتا لە (جبانە) دایگرتن و پاشان پۆشتەکەی کردنەوە و بەردەوام جیاواری ئەوان و کەسانی تری نەدەکرد هەتا خوای گەورە ئەو کۆسپەی هەڵگرت،[٥]

---

١ـ تأريخ الذهبي (ص: ٢٧٤).
٢ـ الكفاءة الادارية، د. عبدالله قادري (ص: ١٠٧).
٣ـ الكفاءة الادارية (ص: ١١٥).
٤ـ المدينة النبوية فجر الاسلام (٢/٣٧-٣٨).
٥ـ أخبار عمر (ص: ١١١) نقلا عن الرياض النضرة.

عومەر(ﷺ) نوێژی خەوتنانی بە خەڵکی دەکرد و پاشان دەگەرایەوە ماڵەوە و بەردەوام تا دوا ساتەکانی شەو نوێژی دەکرد ودواتر دەهاتە دەرەوە و ڕووبەنبینی دەهێنا و بە دەوریدا دەسووڕایەوە، عبدالله کوڕی عومەر باسی ئەوە دەکات و دەفەرمووێت: من شەو لە بەرەبەیاندا گوێم لێی بوو دەیفەرموو: خوای گەورەا تیاچوونی ئومەتی محمد با لەسەر دەستی من نەبێت دەیفەرموو: خوای گەورە، بەم ساڵانە لە ناومان مەبە و ئەم کۆسپەمان لەسەر هەڵگرە، ئەم دوعایانەی دووبارە دەکردەوە،[1] مالك کوڕی ئەوس (لە بەنی نضیر) دەفەرمووێت: ئەو دەمەی کە ساڵی برسێتی بوو هۆزەکەم کە سەد ماڵ بوون لە (جبانە) نیشتەجێ بوون، عومەر خواردنی ئەو کەسانەی دەدا کە دەهاتنە لای و ئەوانەش کە نەدەهاتن ئارد و خورما و ئازوقەی بۆ دەناردن بۆ ماڵەکانیان، عومەر مانگ بە مانگ ئەوەی بۆ هۆزەکەم دەنارد کە پێویستیان بوو، عومەر ناساغ و پەککەوتە و ئەوانەش کە لێیان دەمردن دەخستنە سەر خۆی، من مردنم بینی کە کەوتنە ناویان هەتا تلێپیان دەخوارد عومەر(ﷺ) خۆی دەهات و نوێژی لەسەر دەخوێندن من بینیم کە نوێژی لەسەر دە کەس کرد، کاتێك کە بوژانەوە فەرمووی: لەم گوندە بڕۆنە دەرەوە بۆ ئەو شوێنەی کە ئامادەتان کردووە لە دەشتەکان، بەم شێوەیە عومەر لاوازەکانیانی سوار دەکرد هەتا دەگەیشتنە ولات و شارەکانیان[2] حەزمی کوڕی هیشام لە باوکیەوە هێناویەتی دەفەرمووێت: ساڵی سووتەك عومەرم بینی کە بە لای ئافرەتێکدا تێپەڕی کە چێشتی ئارد و ڕۆنی ئامادە دەکرد، عومەر فەرمووی: نابێت ئاوا ئامادەی بکەیت، پاشان کەوچکەکەی لێ وەرگرت و فەرمووی: بەم شێوەیە و نیشانی دا، دەیفەرموو: لێمەگەرێن ئاردەکەی تێ بکرێت هەتا ئاوەکە گەرم دەبێت و پاشان کەم کەم ئاردەکەی تێدەکرێت و تێکەڵ دەکرێت، ئەم چوار دانەیە بۆ ئەو ئاگادارییە کە لێك جیا نەیفەرمووە (واتا کۆمەڵ بن و هەندێکتان بچنە سەر هەندێکی تر) وە هەندێ لە خێزانەکانی عومەر(ﷺ) دەفەرموون: عومەر لە هیچ ژنێك نزیك نەبۆتەوە لە سەردەمی سووتەکدا هەتا بە تەواوی بوژانەوە،[3] ئەنەس دەفەرمووێت: ورگی عومەر ساڵی سوتەکی قوڕەی دەهات، زەیتی دەخوارد، ڕۆنی لەسەر خۆی حەرام کردبوو، بە پەنجەکانی تۆڕەی لە ورگی هەڵدەستاند و دەیفەرموو: قوڕەت بابێت ئێمە لەمە زیاترمان بۆ تۆ نیە هەتا خەڵکی دەبووژێنەوە.[4]

## ٣- پشت بەستن بە خەڵکی میسر:

عومەر(ﷺ) پەلەی کرد، نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی لەسەر ولاتە دەوڵەمەندەکان و داوای فریاگوزاری لێ کردن، نامەیەکی نارد بۆ عەمری کوڕی عاصی کاربەدەستی میسر کە ئەمە دەقەکەیەتی: لە بەندەی خودا عومەری کوڕی خەتاب ئەمیری باوەڕداران عاصی کوڕی عاصی، سڵاوی

١ـ أخبار عمر (ص: ١١١) نقلا عن الرياض النضرة.
٢ـ أخبار عمر (ص: ١١٢)، إبن الجوزي (ص: ٦١).
٣ـ هەمان سەرچاوە(ص: ١١٦).
٤ـ الحلية (٤٨/١).

خوات لێ بێت لەپاشدا، دەمبینی خۆم و ئەوەی پشتم تیاچووین، تۆش و ئەو کەسەش کە لە پێشتەوە لە ناز و نیعمەتدان؟ ئای بۆ فریاد ڕەسێ، ئای بۆ فریاد ڕەسێ، دواتر عەمری کوڕی عاص نامەیەك دەنووسێت بۆ عومەر کە ئەمە دەقەکەیەتی: بۆ بەندەی خوا ئەمیری باوەڕداران لە عەمری کوڕی عاصەوە، سڵاوت لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە هیچ خوایەك نیە جگە لەو، بەڵام پاش ئەوە هاوکاریەکەت پێ گەیشت، کۆمەکی و کۆمەکی، من کاروانیەکت بۆ دەنێرم کە سەرەتاکەی لای تۆیە و کۆتاییەکەی لای من، لەگەڵ ئەوەدا من تەمەننا دەکەم کە ڕێگەیەك لە دەریا بدۆزمەوە،[1] عەمر لە ڕێگای وشکانیەوە هەزار باری حوشتر ئاردو لە ڕێگەی ئاویەوە ٢٠ پاپۆڕ ئارد و ڕۆن و ٥ هەزار پۆشاکی بۆ نارد.[2]

عومەر نامەی بۆ تەواوی کاربەدەستانی لە شام نووسی کە ئەمە دەقەکەیەتی: بۆمان ڕەوانە بکەن لەو خواردنەی کە پێشتر پێمان باش بووە، چونکە ئەوان تیاچوون، مەگەر خوا ڕەحمیان پێ بکات،[3] نامەی بۆ کاربەدەستانی لە عێراق و وڵاتی فارس بە هەمان شێوە نووسیوە و هەموویان کۆمەکیان بۆ ناردووە،[4] (طبري) دەفەرمووێت: یەکەمین کەس کە بە چوار هەزار بار لە خواردنەوە گەیشتە لای ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح بوو، کە عومەر کردیە سەرپەرشتیاری بارەکە و هەتا دابەشی بکات بەسەر خەڵکانی دەوروبەری مەدینەدا، کاتێك کە گەڕایەوە بۆ لای فەرمانی پێدا بەچوار هەزار درهەم کە بیدرێتێ و ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من پێویستم پێ نیە ، ئەو کارەم لە پێناوی خوادا کرد، دەستی دونیام بەسەردا تێکەڵ مەکە، عومەریش فەرمووی: بیگرە گرنگ نیە ئەگەر داوای نەکەیت، ئەویش پەسەندی نەکرد، پاشان عومەر فەرمووی: بیگرە منیش بەم شێوەیە کاری سەرپەرشتیاریم بۆ پێغەمبەر(ρ) کردووە، هەر ئەوەی پێ وتم کە من بە تۆی دەڵێم، منیش هەر ئەوەم پێ وت کە تۆ پێت وتم بەڵام ئەو هەر پێیدام، ئەبو عوبەیدەش وتی ئەوا پەسەندم کرد پاشان لەگەڵ کاربەدەستەکانی ڕۆیشت و خەڵکی بە دوایدا هاتن،[5] موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان باری سێ هەزار حوشتر خواردنی نارد و لە عێراقیشەوە باری هەزار حوشتر ئارد گەیشت،[6] عومەر یاسای دانا لە دابەشکردنی ئەم خواردنە بەسەر خەڵکی مەدینە و ئەوانەی کە لە دەشتەکیەکان کە لە دەوروبەردا بوون، ئەوانەش کە چووبوونە دەشت و دەر، فەرمانی دا بەسەر گەرەکە عەرەبەکاندا دابەش بکرێت، زوبێری کوڕی عەوام دەفەرمووێت: لە ساڵی سووتەکدا عومەر پێی وتم: کاروانیەك لە حوشتر بینی کە ئارد و پیو و زەیتی پێیە بۆ فریادڕەسی خەڵکی بیابانە: دەرهێنان لە سەرەتای ئەم کاروانیە خەڵکی نەجدی بۆ بانگ بکە، خاوەنی هەمووماڵێکم بۆ بهێنە هەتا ئەوەی کە بۆم هاتووە پێیان بدەم هەر

---

١ـ أخبار عمر (ص: ١١٥).
٢ـ أخبار عمر (ص: ١١٥).
٣ـ الفاروق عمر (ص: ٢٦٢).
٤ـ هەمان سەرچاوە(ص: ٢٦٣).
٥ـ تأريخ الطبري (٥/٨٠).
٦ـ الفاروق عمر (ص: ٢٦٢).

کەس نەیتوانی بەشەکەی خۆی هەڵبگرێت، فەرمان بدە کە هەر خاوەن ماڵێك حوشترێکی بدرێتێ بە بارەکەیەوە، فەرمانیان پێبدە کە دوو دەست جل هەڵبگرن، یەکێك بۆ زستان و یەکێك بۆ هاوین، با حوشترەکان سەربڕن و پیو و چەوریەکەی بپارێزن، گۆشتەکەی پارچە پارچە بکەن... دواتر هەندێ لە پیو و ئاردەکە ساز بکەن، بخۆن هەتا خوای گەورە ڕزق و ڕۆزیان دەدات،[1] عومەر مانگ بە مانگ کۆمەکی دەنارد بۆ خەڵکی، لەوەی کە لە ناوچەکانی ترەوە لە پۆشاك و خواردن پێی دەگەیشت، ئەم ڕێزلێنانە گەورەیەی عومەر بەردەوام بوو، کاربەدەستی کارا کاریان لەسەر دەکرد، لە دوای نوێژی بەیانیەوە دەستیان دەکرد بە کاری نان سازکردن، پاشان خواردنەکەیان دابەش دەکرد بەسەر خەڵکیدا، عومەر بانگەوازی ئەوەی دەکرد: ئەگەر خوای گەورە ئەم قات و قڕیە هەڵنەگرێت ئەوان من لەگەڵ خاوەنی هەموو ماڵەکاندا بە هەمان شێوە دەبم، ئەوە دەخۆین کە ئەوان دەیخۆم، ئەگەر لێمان بڕان، لەگەڵ هەموو خاوەن ماڵێك شتێك لەوەمان دادەنا کە هەیەتی، ئامادەکردنی بۆ ئەو کەسانەیە کە نیانە، هەتا خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت،[2] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کە دەفەرمووێت: ئەگەر ئەم برسێتیە درێژەی بکێشایە ئەوا هەر برسیەکم دەناردە ماڵێك لە ماڵەکانی موسڵمانانەوە خەڵکی لەسەر ڕاست پەروەری سکیان تیا ناچن.[3]

هەروەها عومری فاروق(رضي الله عنه) هەڵدەستا بە دابەشکردنی خواردن و توێشوو بەسەر زۆرێك لە هۆزەکانداو لە شوێنی خۆیان لە ڕێگەی چەند لێژنەیەکەوە کە پێکی هێنابوون، کاتێك کە کاروانیەکەی عەمری کوڕی عاص گەیشتە کەنارەکانی شام عومەر چەند کەسانێکی نارد بۆ لای هەتا لەگەڵ گەیشتنی ئەو قافڵەیە بۆ دورگەی عەرەب هەستن بە دابەشکردنی، پاشان بە لای ڕاست و چەپدا ڕێکیان دەکردنەوە و ئاژەڵەکانیان سەردەبڕین و ئاردیان دەکردە خواردن و پۆشاکیان دەکردە بەریان، عومەر ئەو خواردنەی کە عەمر لە میسرەوە و لە ڕێگەی دەریاییەوە ناردبووی بە پیاوێکدا ناردی بۆ خەڵکی (تهامة).[4]

## ٤- هاوار بردنە بەر خوا و نوێژە (بارانە):

سولەیمانی کوڕی یەسار دەفەرمووێت: عومەر لە سەردەمی ساڵی سووتەکدا وتاری بۆ خەڵکی دەدا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! لەناخی خۆتاندا لەخوا بترسن لەوەی، کە لەخەڵکی ون بووە لە کاروبارەکانتاندا، بەڕاستی من بە ئێوە تاقیکراومەتەوە و ئێوەش بە من تاقیکراونەتەوە، من نازانم بێزاری ئێوە لەسەر من چیە یان چ شتێك من و ئێوەشی شەوارە کردووە دەی خێراکەن داوا لە خوای گەورە بکەین کە دڵەکانمان چاك بکات و بەزەیی بێتەوە پێمانداو ئەم قات و قڕیەمان لەسەر

---

١ـ الفاروق عمر (ص: ٢٦٢).
٢ـ الفاروق عمر (ص: ٢٦٣).
٣ـ السياسة الشرعية ، د. إسماعيل البدوي (ص: ٤٠٣)، محض الصواب (٣٦٤/١).
٤ـ أخبار عمر (ص: ١١٠).

هەڵبگرێت، ئەو کاتە عومەریان بینی کە دەستەکانی بڵند کردەوە لە خوا دەپاڕایەوە و خەڵکەکەش لە خودا دەپاڕانەوە، عومەر تێر گریا و خەڵکەکەش بەکوڵ دەستیان کردە گریان و، پاشان عومەر لەسەرمینبەر هاتە خوارەوە،[1] ئەسلەم فەرمووی: گوێم لەعومەر بوو،کە دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! من دەترسم، کە بێزاریەك هەموومانی شەوارە کردبێت، لەڕووی خودا خۆتان سەرزەنشت بکەن و خۆتان دامالْن و لای خوای گەورە تەوبە بکەن و باسی چاکە بکەن،[2] عبداللە کوڕی ساعدە دەفەرمووێت: عومەرم بینی هەر نوێژی شێوانی دەکرد و هاواری دەکرد: ئەی خەڵکینە داوای لێخۆش بوون لای خودا بکەن و تەوبەی لە لا بکەن، داوای کارزانی و کارسازی و چاکی لێ بکەن بە شێوەیەکی بەخشندەوە داوای ئاوبەندی بکەن نەك بە شێوەی سزا، بەم شێوەیە وازی نەهێناهەتا خوای گەورە ئەو دەروەی لێ کردەوە،[3] شەعبی دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) هاتە دەرەوە لەسەر مینبەر وەستا و ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ۝ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا﴾ (نوح: ١٠-١١).

هەروەها ئەو ئایەتەی دەخوێند، کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ﴾(هود: ٣).

پاشان لە مینبەر هاتە خوارەوە و پێیان وت: چی ڕێگری لێ کردی کە داوای باران بارین بکەیت؟ ئەویش فەرمووی: داوای بارانم بە کاکۆڵەکانی ئەو ئاسمانە کرد کە بارانی پێ دەبارێنێ،[4] کاتێك عومەر خەڵکی کۆکردەوە بۆ ئەوەی داوای ئاوبەندی بکات، خەڵکی بردە دەرەوە، نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی کە لە ڕۆژێکی واهادا بڕۆنە دەرەوە، لای خوای گەورەیان بکڕوزێنەوە و داوا بکەن کە خوای گەورە ئەم قات و قڕیەیان لەسەر هەڵبگرێت، عومەر بۆ ئەو ڕۆژە چوویە دەرەوە و کراسە ملدارەکەی پێغەمبەر(ρ)ی لەبەر بوو، هەتا گەیشتە مزگەوت، پاشان وتاری بۆ خەڵکی دا و کڕوزایەوە و وای کرد لە ژنان کە دوعاکانیان بلاوێننەوە، زۆرترین دوعای تەنها داوای لێخۆشبوون بوو هەتا نزیك بوویەوە لەوەی کە لابدات، ئەو دەستی بەرزکردەوە و عەباکەی پێچایەوە، و لای ڕاستی دا بە لای چەپیدا، و پاشان لای چەپی دا بە لای ڕاستیدا پاشان دەستی درێژکرد و لە دوعاکانیدا لاواندنەوەی دەکرد، هێندە گریا هەتا تاڵی ڕیشی خوسا،[5] لە صحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئەنەس دەفەرمووێت: عومەر داوای ئاوبەندی لە عەباسی کوڕی عبدالمطلب کرد و فەرمووی: خوای گەورە! ئێمە بە پێغەمبەرمان(ρ) لێت دەپاڕاینەوە کە بارانمان بۆ ببارێنی ئێسە بە مامەی پێغەمبەرمان لێت

---

١ـ الطبقات (٣٢٢/٢)، الشيخان من رواية البلاذري (ص: ٣٢٣).
٢ـ الطبقات (٣٢٢/٢)، أخبار عمر (ص: ١١٦).
٣ـ الشيخان من رواية البلاذري (ص: ٣١٩).
٤ـ الشيخان من رواية البلاذري (ص: ٣٢٠).
٥ـ الطبقات (٣٢٠/٣-٣٢١)، تاريخ المدينة المنورة إبن شبة (٧٤٢/٢).

دەپاڕێینەوەکە بارانمان بۆ ببارێنی.[١]

دەگێڕنەوە کە عومەر ساڵی سوتەك کاتێك،کە داوای ئاوبەندی کردلەدواین دێڕی قسەکانیدا فەرمووی: خوای گەورەمن دابڕاوم و ئەوەش لای تۆیە زۆریەرفراوانە بۆیان پاشتردەستی عەباسی گرت و فەرمووی:خوای گەورە ئێمەبەمامی پێغەمبەرەکەت و تەواوی باوانیو گەورەپیاوانی لێت نزیك دەبینەوە،تۆبەپەیڤی ڕاست و دروستی خۆت دەبێژی،کە دەفەرموویت: ﴿وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَـٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَـٰلِحًا﴾(الكهف: ٨٢).

لە پێناو چاکی باوکی ئەو دوو منداڵەت پاراست،عەباس چاوەکانی فرمێسکیان دەڕشت فەرمووی: خوای گەورەا نەهامەتی نایەتە گۆڕ مەگەر لەبەر گوناهێك بێت بە تەوبە و پەشیمانی نەبێت دەرناکەوێت، ئەم خەڵکە لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەکەت(ρ)ەڕوویان لێناوم کە داوات لێ بکەم و لێت بپاڕمەوە ئەمەش دەستی ئێمەیە بۆ تۆ بە تاوانەوە ئاسان و فراوان بووە، ڕامان دەسپێری بە تەوبە و بارانی بە خوڕی خۆتمان بەسەردا ببارێنە و لە ڕیزی نائومێدانمان مەنێ ئەی بەخشندەی بەخشندەوەران، خوای گەورەا تۆ فەرمانبەردارمانی و گومڕایان کەم تەرخەم مەکە و لەماڵی لە دەست چوودا لە دڵ شکاوان مەگەرێ، بە ڕاستی بچووکەکان دەکرۆزێنەوە و گەورەکانیش پەرتەوازە بوون، سکاڵاکان بەرزبوونەتەوە، تۆ زانایت بەرامبەر نهێنی و شاراوەکان، خوای گەورەا بارانی بە خوڕ و پیتی خۆیتان بەسەردا ببارێنە پێش ئەوەی کە نائومێد بن چونکە تیادەچن، بەڕاستی هیچ کەسێك لە بەزەیی و میهرەبانی تۆ نائومێد نابێت مەگەر گەلانی کافر و بێبڕوا،[٢] چەند پەڵەیەك لە هەور لە ئاسمان دەرکەوتن، خەڵکی بینیان، پاشان هەورەکە بەرزبوویەوە و بای بە ناودا تێپەڕی و دواتر هێور بوویەوە و جموجۆڵی تێکەوت، سوێند بە خوا دوورنەکەوتنەوە هەتا لەگەڵ دیوارەکان دەست بە ملان بوون و مێزەرەکانیان پێچیەوە، دیسان خەڵکی خۆیان گەیاندەوە لای عەباس و وتیان مزگێنیتان لێ بێت ئەی ئاودەری هەردوو بەرز و پیرۆزەکە، ئێنجا فضل کوڕی عەباس کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی لەهەب وتی:

بعمي سقى الله الحجاز وأهـــله ... عشية يستسقي بشيبته عـــمر

توجه بالعباس في الجدب راغباً ... إليه فما رام حتى أتى المـــطرُ

ومنا رسول الله فينا ترانـــــه ... فهل فوقه هذا للمفاخر مفتخر

حەسانی کوڕی ثابت (ﷺ) فەرمووی:

سأل الامام وقد تتابع جدبنـــا ... فسقى الغمام بغرة العبـــاس

عم النبي وصنوه واله الـــذي ... ورث النبي بذاك دون النـــاس

أحيا الإله به البلاد فأصبحت ... مخضرة الأجناب بعد إلياس[٣]

١ـ البخاري، رقم (١٠١).
٢ـ الفاروق عمر بن الخطاب، محمد رشيد رضا (ص: ٢١٧).
٣ـ الفاروق عمر بن الخطاب (ص: ٢١٧).

لە ڕیوایە(صفه)دا هاتووە ئەوەی کە عەباس لەم بارودۆخەدا پێی پاڕاوەتەوە: خوای گەورە! نەهامەتی نایەتە گۆڕێ مەگەر لەبەر گوناهێك بێت، بە تەوبە و پەشیمانیەك نەبێت دەرناکەوێت، ئەم خەڵکە لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەکەت(ﷺ)ەڕوویان لێ ناوم کە داوات لێ بکەم و لێت بپاڕێمەوە، ئەمەش دەستی ئێمەیە کە تاوانباویە، ڕامان دەسپێری بە تەوبە، بارانی بە خوڕی خۆتمان بەسەردا ببارێنە، ئاسمان وەك چیاکان ئاوپرژێنیان کرد هەتا زەوی پاراو بوویەوە و خەڵکی بوژایەوە.[1]

## ٥- ڕاگیرانی ڕەساندنی سزا لە ساڵی برسێتیدا:

عومەر(رضي الله عنه) هەستا بە ڕاگیرانی سزای دزی کردن لە ساڵی سوتەك، ئەمەش هەڵوەشاندنەوەیەك نەبوو بۆ ئەو سنوورە، هەروەك ئەوەی کە هەندێك دەینووسن، لەبەر ئەوەی مەرجەکانی بەجێهێنانی ئەم سنوورە فەراهەم نەبووە لەبەر ئەوە ڕاپەڕاندنی سزای دزیکردن ڕاگیرا، لەبەر هەر شتێك کە دەخورێ بە هۆی سەختی و برسێتی و دابڕانی لە فەراهەم هێنان و دەستکەوتنی خواردنێك موڵکی کەسێکی تر نیە، ئەو دەمەو ئەو خۆراکە هەڵبژێردراو لابێت و مەبەست دزی نابێت، لەبەر ئەوە عومەر ئەو دەست ناسکانەی نەبڕی کە حوشترەکەیان برد و سەریان بڕی فەرمانی دا بە گەورەکەیان کە حاطب بوو پارەی حوشترەکە بدات،[2] عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: ((لە دەست کورتی وقات و قڕیدا نابڕێتەوە[3]))،[4] مەزهەبەکانی تر زۆر لە مەزهەبی فیقهی عومەرکاریگەربوون و لە کتێبی (المغنی)دا هاتوکە ئەحمەد دەفەرموێت: لە قات و قڕیدا دەست بڕین نیە، واتا ئەگەر نەدار شتێکی دزی بۆ خواردنی خۆی ئەوا دەستی نابڕدرێت، لەبەر ئەوە وەك کەسێکی ناچار وایە، جورجانی ڕیوایەتی کردووە کە عومەر دەفەرموێت: لە ساڵی قات و قڕیدا دەست بڕین نیە، دەفەرموێت لەم بارەیەوە پرسیارم لە ئەحمەد کرد فەرمووی: تۆش هەر وای پێ دەڵێت؟ ئەویش فەرمووی: واتە بە تەمەنم ئەو دەستە نابڕمەوە ئەگەر پێویستی وای لێ بکات و خەڵکی لە دژواری و قات و قڕیدابن،[5] ئەمەش تێگەیشتنێکی قووڵی عومەریە لە مەبەستەکانی شەریعەت، بە ڕاستی عومەر سەیری ناوکرۆکی بابەتەکەی کردووە و بە ڕووکارەنەوەستاوە، تێبینی هۆی پاڵنەری بۆ دزی کردووە و ئەوەی بەدی کردووە کە لە دوو حاڵەتدا برسێتی دادەنرێت بە بەشێك لەو پێویستیانەی کە یاساغکراوەکان موباح دەکات، هەروەها ئەمەش دەلالەت دەکاتە سەر ئەو پەیڤەی عومەر کە لەسەر گوزارشتەی لاوەکانی حاطبدا هاتووە کە دەفەرموێت: ((ئێوە بەکاریان دێنن و برسیان دەکەن هەتا ئەگەر یەکێکیان شتێکی وای خوارد کە لەسەری یاساغ کراوە بۆی موباح دەبێت)).[6]

---

١ـ الخلافة الراشدة والدولة الاموية، د. يحيى اليحيى (ص: ٣٠٢).
٢ـ الخلافة والخلفاء الراشدون، سالم البهنساوي (ص: ١٦٥).
٣ـ المصباح المنير (ص: ٢٩٢).
٤ـ منصف عبدالرزاق (١٠/٢٤٢).
٥ـ المغني لإبن قدامة (٢٧٨/٨).
٦ـ إعلام الموقعين (١١/٣) الاجتهاد في الفقه الاسلامي (ص: ١٣٦).

### ٦- دواخستنی بەجێهێنانی زەکات لە ساڵی سووتەکدا:

عومەر(ﷺ) پابەندبوونی خەڵکی بە بەجێهێنانی فەرزی زەکات لە ساڵی سووتەکدا ڕاگرت، کاتێك کە قات و قڕیەکە تەواو بوو زەوی بە پیت و فەڕ بوو ئەو کاتە زەکاتی ساڵی سووتەکی کۆکردەوە، واتا کردیە فەرزێك لەسەر ئەوانەی کە توانایان هەیە بیدەن تا بەربەستی پەککەوتەی لای هەژاران پێ بکات و لە بەیتولمال وەك ئامانجێك مایەوە هەتا هەمووی بەخشیەوە،[1] یەحیا کوڕی عبدالرحمن کوڕی حاطب دەگێڕێتەوە: عومەر(ﷺ) خێر و چاکەی ساڵی سوتەکی دواخست ڕۆزیەکانی نەنارد، کاتێك کە وەرگیرا و خوای گەورە قات و قڕی هەڵگرت، فەرمانی پێدان بێنە دەرەوە و خێر و چاکەی ساڵەکەیان وەرگرت، فەرمانی پێدان کە دابەشی بکەن و بە چاکەوە بێنەوە بۆ لای، واتا صەدەقەی ساڵێك.[2]

### سێیەم: تاعون (چاوەقوڵکە، پەتا و قڕان):

لەساڵی (١٨)ی کۆچیدا[3] کارەساتێکی زۆر گەورە و ناهەموار ڕوویدا، ئەم کارەساتە خەڵکی بە تاعونی عەمواس ناوی دەبەن، بە درانە پاڵ شارۆچکەیەکی بچووك کە پێی دەوترێت عەمواس، دەکەوێتە نێوان شاری قودس و ڕملەوە، لەبەر ئەوەی یەکەم شوێن بوو نەخۆشیەکە تێیدا سەری هەڵدا، پاشان لە شامدا بڵاوبۆتەوە و ناوی نەخۆشیەکەی درایە پاڵ،[4] باشترین کەسێك کە لە ڕووی زانستیەوە پێناسەی ئەم نەخۆشیەی کردووە إبن الحجر کە پاش ئەوەی چەند شتێك دەربارەی تاعون وتراوە دەفەرمووێت: ئێمە ئەمەمان لە خەڵکانی زمانەوانی و فەقیه و پزیشکانەوە پێگەیشتووە لە پێناسەکەیدا، ئەمەش کە لە ڕاستیدا دەستە بەر بووە ئەوەیە کە ئەم نەخۆشیە پەتایەکە خرۆشانی خوێن یان ڕژانی بۆ سەر ئەندامێك ڕوودەدات و خراپی دەکات، جگە لەمەش لە نێو نەخۆشیە گشتیە نوێیەکاندایە دەربارەی خراپکردنی هەوا و بە ڕێگەیەکی مەجازی پێی دەوترێت تاعون، بۆ هاوبەش بوونیان لە گشتگیری نەخۆش کەوتن پێی یان زۆری مردن،[5] مەبەست لەم جوداخوازیە لە نێوان پەتا و تاعونانەدا، بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر دروستی فەرمووده پیرۆزەکەی پێغەمبەر(ρ) کە هەواڵمان پێ دەدات کە تاعون ناڕواتە نێو شاری مەدینەی پڕشنگدار، بەڵام پەتای دەگاتێ و لەم سەردەمانەی، کە تێپەڕیوون پێی گەیشتووە.[6]

---

١ـ الخلافة والخلفاء الراشدون، سالم البهنساوي (ص: ١٦٦).
٢ـ الشيخان من رواية البلاذري (ص: ٣٢٤).
٣ـ تأريخ القضاعي (ص: ٢٩٤).
٤ـ خلاصة تأريخ إبن كثير، محمد كنعان (ص: ٢٣٦).
٥ـ الفتح (١٠/١٨٠).
٦ـ أبو عبيدة عامر بن الجراح، محمد شراب (ص: ٢٢٠).

بەڕاستی ڕوودانی تاعون لەو سەردەمەدا. پاش جەنگی جەرگ بڕی نێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکان وزۆری جەنگ و بۆگەن بوونی ژینگەو خراپ بوونی بەم حەستانە. کارێکی سروشتیە و خوای گەورە بۆ حیکمەتێك کە خۆی مەبەستی بووە دیاری کردووە.[١]

## ١- گەڕانەوەی عومەر لە سەرغی سەر سنووری حیجاز و شام:

دواتر لە ساڵی (١٧)ی کۆچی عومەر(ﷺ) نیازی کرد کە سەردانی ناوچەکانی حیجاز و شام بکات، خۆی بۆ ڕێك خست و ژمارەیەك لە موهاجرین و ئەنصاری لەگەڵدابوو، هەتا لە ناوچەی سەرغی سەر سنووری حیجاز و شام لایدا، لەم کاتەدا ژمارەیەك لە سەرکردەی سوپاکان چوونە لای و هەواڵیان پێدا کە ئەو ناوچەیە دەردەدارە و تاعون لە شامدایە، عومەر(ﷺ) ڕاوێژی کرد و بۆچوونی لەسەر گەڕانەوە بڕیاری لەسەر درا، درێژەدان سەبارەت بەم کارە لە کۆباسەکانی دەستەی ڕاوێژدا بە درێژی باسی لێوە دەکرێت.[٢]

پاش ڕۆیشتنی عومەر(ﷺ) تاعونی ناسراو بە تاعونی عەمواس ڕوویدا و سەختیەکەی لە شامدا بوو، خەڵکێکی زۆر بە هۆیەوە تیاچوون لەوانە: ئەبو عوبەیدەی جەڕاح، کە ئەمیری خەڵکی بوو، موعازی کوڕی جەبەل، یەزیدی کوڕی ئەبو سفیان، حارسی کوڕی هیشام، کە دەڵێن لە شەڕی یەرمووکدا شەهیدکراوە، سوهەیلی کوڕی عەمر، عوتبەی کوڕی سوهەیل، خەڵکانێکی گەورە و دیار، ئەم پەتایەیان لە کۆڵ نەبوویەوە هەتا دوای ئەوەی کە عەمری کوڕی عاص بوویە والیان، وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەم ئاراز و پەتایە لە هەر شوێنێك کەوتەوە وەکو ئاگر تاو دەستێنێت ئەوا لە چیاکاندا لێی دووربکەونەوە، خۆی چوویە دەرەوە و خەڵکەکەش چوونە دەرەوە وە پەرتەوازە بوون تاوەکو خوای گەورە لەسەری هەڵگرتن، ئەمەی کە عەمر ئەنجامی دا گەیشتە عومەر و ئەویش ڕقی لێ نەبوویەوە.[٣]

## ٢- کۆچی دوایی ئەبو عوبەیدە (ﷺ):

کاتێك کە پەتای تاعون بڵاوبوویەوە و هەواڵ گەیشتە عومەر نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو عوبەیدە هەتا لە نێو پەتاکەی دەربکات کە ئەمە دەقەکەیەتی: سڵاوت لێ بێت، پاشان من پێویستیەکم کەوتۆتە تۆ و تروسکەدارت دەکەم تیایدا، بۆیە داوام لێ کردووی هەر کە سەیری ئەم نامەیەمت کرد لە دەستت دایمەنێ هەتا پێم دەگەیت، ئەبو عوبەیدە زانی کە عومەر دەیەوێت لەم پەتایەی ڕزگار بکات و بەزەیی پێدا دێتەوە و چاو لە دوویەتی فەرمووی: خوای گەورە لە ئەمیری باوەڕداران ببورێت، پاشان نامەیەکی نووسی بۆ عومەر کە ئەمە دەقەکەیەتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من پێویستی تۆم بە خۆم زانی من سەربازێکم لە موسڵمانان لە خۆمدا شتێك بەدی ناکەم بۆ جیابوونەوە لێیان،

---

١ـ الخلفاء الراشدون، للنجار (ص: ٢٢٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٢٢-٢٢٣).

٣ـ الخلفاء الراشدون، للنجار (ص: ٢٢٥)، تأريخ الطبري (٣٦/٥).

نامەویت لێیان جیاببمەوە هەتا خوای گەورە فەرمانی خۆی بەسەر من و ئەوانیشدا دەچەسپێنیت، لەو داوایەی خۆشت عوزرم بۆ بهێنەرەوە ئەی ئەمیری باوەڕداران و لێم گەرێ با لە نێو سەربازەکاندا بم، کاتێك کە عومەر نامەیەکەی خوێندەوە دەستی کردە گریان، خەڵکی وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئایا ئەبو عوبەیدە مردووە؟ فەرمووی: هەروەك ئەوەی فەرموویێت... پاشان نامەیەکی بۆ نووسی: سلاوت لێ بێت، تۆ خەڵکیت لە جێگایەکی ترم نیشتەجێ کردووە لەبەر ئەوە بەرزیان بکەرەوە بۆ زەویەکی بەرز و خۆش، کاتێك کە ئەبو عوبەیدە نامەکەی گەیشتە دەست ئەبو موسای بانگ کرد و فەرمووی: ئەی ئەبو موسا نامەی ئەمیری باوەڕدارانم بەو شێوەیە پێ گەیشتووە کە دەیبینی، بڕۆ شوێنێك بۆ خەڵکی ساز بدە هەتا بە دوای تۆدا بیان هێنم، لەم کاتەدا ئەبو موسا گەرایەوە ماڵەکەی و بینی خێزانەکەی دووچار بووە گەرایەوە بۆ لای ئەبو عوبەیدە و هەواڵەکەی پێدا، دواتر فەرمانی دا بە حوشترەوانەکەی و ڕۆیشت کاتێك کە پێی نایە وشترە شێردارەکەی تەوسی کرد و فەرمووی: سوێند بە خوا دووچار بووم.[1]

عەمروە دەفەرموویێت: پەتای عەمواس ئەبو عوبەیدە و کەس و کارەکەی لێی چاك بووبوونەوە پاشان ئەبو عوبەیدە فەرمووی: خوای گەورە!، بەشت لە بنەماڵەکەی ئەبو عوبەیدە دیاری بکە، بۆیە زیپکەی لێ دەردەهات، سەیری دەکرد و دەیفەرموو: ئەمە هیچ نیە، دەیفەرموو: من دەخوازم کە خوای گەورە پیرۆزیان تێ بکات،[2] ئەبو عوبەیدە پێش ئەوەی دوچار ببێت وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەم پەتایە ڕەحمەتی خوای گەورەتان و نزای پێغەمبەرتان محمد(ρ)و مردنی پیاوچاکانە لە پێشتان، ئەبو عوبەیدە داوا لە خودا دەکات کە بەبەشی خۆی لەم نەخۆشیە بەختەوەری بکات،[3] کاتێك کە ئەو(ﷺ) تەوسی کرد موسڵمانانی بانگ کرد و ئەوانیش چوون بۆ لای، پاشان پێی فەرموون: من ئامۆژگاریەکتان دەکەم و کە پەسەندتان کرد، بەردەوام هەتا دەمێنن باش دەبن و پاش ئەوەش کە تیادەچن بە هەمان شێوە: نوێژەکانتان بەجێ بهێنن، زەکات بدەن، ڕۆژوو بگرن، و چاکە بکەن، فەرزی حەج و سونەتی عەمرە بەجێ بهێنن، پەیوەندی خزمایەتی درێژە پێ بدەن، یەکترتان خۆش بوێت، فەرماندەکانتان بە ڕاست بزانن، فێڵ و تەڵەکەیان لێ مەکەن، دونیا نەتان فەوتێنێت، ئەگەر پیاوێك هەزار ساڵ تەمەن بکات بەوەی کە هەیەتی هەر وەك من و بەم شێوەیەی کە دەیبینن ملی ڕێگا بگرێتەبەر، خوای گەورە مردنی لەسەر ئەوەی ئادەم نووسیووە، ئەوان مردوون، وەجاخ زادەکانیان ملکەچترە بۆ خوای گەورەی، ئەوەیان زیاتر کار بۆ خوا دەکات،لێبوردن و ڕەزامەندی خوای لەسەرە،[4] لەم کاتەدا موعاز لە نێو خەڵکەکەدا هەستایە سەر پێ و فەرمووی: ئەی خەڵکینە پەشیمان ببنەوە و تەوبەیەکی پاك و بێگەرد بکەن، ئەگەر بەندەیەك بە پەشیمانی لە تاوانەکانی بگاتە لای خودا ئەوا لەسەر خودا پێویستە لە خۆی و لە تاوانەکانی خۆش ببێت، هەر کەس قەرزێکی لایە با بیداتەوە،

---

١ـ تأريخ الطبري (٣٥/٥).
٢ـ تأريخ الذهبي (ص: ١٧٤).
٣ـ تأريخ الطبري (٣٦/٥).
٤ـ الاكتفاء (٣٠٦/٣).

چونکە بەندە بارمتەی قەرزەکانیەتی، هەر کەس لە ئێوە بۆتە هۆی شکاندنی موسڵمانێك کاتێ پێی گەیشت ئاشتی بکاتەوە، تەوقەی لەگەڵ بکات، بە ڕاستی ڕێگە پێدراو نیە موسڵمانێك لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگ لە برایەکی موسڵمانی وەربگرێت، تاوان لەمەدا زۆر گەورەیە لای خودا، ئێوە ئەی موسڵمانان بە پیاوێك کۆستتان کەوتووە، سوێند بە خوا من گەورەیی نانوێنم کە بەندەیەك لە بەندەکانی خوام بینیبێت کە لەم سینە پاکتر بێت لە شەڕ و خراپە و ئامۆژگارتر بێت بۆ هەمووان، بە سۆز و بە بەزەیی تر بێت لەسەرتان، ئێوەش بەزەییتان پێدا بێتەوە و ئامادەی نوێژکردن بن لەسەری، خوای گەورە لە تاوانی ئێستا و ڕابردووی خۆش بێت، سوێند بە خوا کەسێکی هاوشێوەی ئەو نابێتە والیتان، دواتر خەڵکی کۆبوونەوە، ئەبو عوبەیدەیان هێنایە دەرەوە و موعاز چوویە پێشێ و نوێژی لەسەر خوێند، هەتا بردیان بۆ لای گۆڕەکەی، موعاز و عەمری کوڕی عاص و زوحاکی کوڕی قەیس دابەزینە گۆڕەکەی کاتێك کە خۆڵەکەیان کرد بە سەریدا، موعاز فەرمووی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەبو عوبەیدە، سوێند بە خوا تۆ بۆ دوو شت بووی بەوەی کە من زانیم و لە خۆمەوە نایان ڵێم، من دەترسم کە لە خوداوە دوژمنایەتی کەسێکم پێ بگات، من سوێند بە خوا نەمزانیووە تۆ لەوانەی بە زۆری یادی خوا دەکەن، لەسەرخۆ بەسەر زەویدا دەڕۆن، ئەگەر نەفام و جاهیلان بیان دوێنن سڵاویان لێ دەکەن، لەوانەی کە بۆ خوای گەورەیان سوژدە و شەونوێژ بنیات دەنێن، لەوانەی کە ماڵیان دەبەخشی زیادەڕۆیی ناکەن و کۆڵیت ناکەن لە نێوان ئەمەدا خۆڕاگر دەبن، سوێند بە خوا من دەزانم کە تۆ لە خۆ بە کەم زانان و سادەیانی، لەوانەی کە بەزەییان بە هەتیو و هەژاراندا دێتەوە و ڕقیان لە دڵڕەقان و خۆ بەزل زانانە،[1] هیچ کەس لەموعاز بێ تاقەتتر نەبوو بۆ مردنی ئەبو عوبەیدە و دڵگرانی هیچ کەسێك لە دڵگرانی ئەو درێژخایەنتر نەبوو.[2]

موعاز بە هۆی کۆچی دوایی ئەبو عوبەیدەنامەیەکی بۆ عومەر(ﷺ) نووسی کە تیایدا هاتووە: لە پاشدا، بە پیاوێکی بێنە هەژمار کە بۆ خودا دەستپاك بوو، خودا لە ناخیدا زۆر گەورە و پیرۆز بوو، لای ئێمەش و لای تۆش ئەی ئەمیری باوەڕداران زۆر خۆشەویست و ئازیز بوو، ئەبو عوبەیدەی جەڕاح، خوای گەورە لە گوناهی یەکەم و کۆتایی خۆش بوو، ئێمە بۆ خوداین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە،ئەم نامەیەم بۆ نووسیت و مردن ڕێگەی پێ گرت، ئەمەش پەتای نێو خەڵکە، کەس بە هەڵە مەرگی بۆ نایات، ئەوەی کە نەمردووە هەر دەمرێت، خوای گەورە ئەوەی کە هەیبوو لە دونیا بۆی کردە چاکە، ئەگەر بمانهێڵێتەوە یان تیامان بەرێت ئەوا خوای گەورە سەبارەت بە موسڵمانان پاداشتی چاکەت بداتەوە لەسەر تایبەتەکانمان و گشتیەکانمان ڕەحمەت و لێبووردن و ڕەزامەندی خۆی ببارێنێ و بەهەشتیش بکاتە خەڵاتمان، سڵاوی ڕەحمەت و بەرەکەتی خودات لەسەر بێت،[3] کاتێك کە

---

١ـ الاکتفاء (٣/٣٠٧).
٢ـ الاکتفاء (٣/٣٠٧).
٣ـ الاکتفاء (٣/٣٠٩).

ئەم نامەیە گەیشتە دەستی عومەرخوێندیەوەو بە کوڵ گریاو سەرەخۆشی ئەبوعوبەیدەی لەهاونشینانی کرد،[١] خەڵکەکەش گریان و لەگەڵ ڕازی بوون بەقەزاو قەدەری خوا دڵتەنگ و دڵگران بوون.

## ٣- کۆچی دوایی موعازی کوڕی جەبەل:

پاش کۆچی دوایی ئەبو عوبەیدە(ﷺ) موعاز نوێژی بۆ خەڵك کرد و تاعونیش تاوی گرتبوو، مردن لە نێو خەڵکیدا زۆر بووبوو، موعاز وتارێکی دا و فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەم ئێش و ئازارە ڕەحمەتی خوای گەورەتان و نزای پێغەمبەرتان(ρ)و مردنی پیاوچاکانە لە پێشتانەوە، موعاز داوا لە خوا دەکات کە بنەماڵەکەی لێی بێ بەش نەبن، بۆیە عبدالرحمن کوڕی موعاز دووچار بوو،[٢] کاتێ کە بینی کوڕەکەی وتی: ڕاست ئەوەیە کە بۆت هاتووە لە خوای گەورەتەوە کەواتە لە گومانداران مەبە، ئەویش فەرمووی: کوڕەکەم: إنشاءالله لە ڕیزی خۆڕاگران دەمبینیەوە، کوڕەکەی زۆر نەمایەوە و کۆچی دوایی کرد– ڕەحمەتی خوای لێ بێت– موعاز نوێژی لەسەر خوێند و بە خاکی سپارد، کاتێك موعاز گەرایەوە ماڵەوە تەوسی کرد، ئازار زۆری بۆ هێنا و یارانی پەیتاپەیتا دەهاتن بۆ سەردانی هەر کاتێك کە دەهاتن پێشوازی لێ دەکردن و پێی دەفەرموون: ئەوەش بزانن کە ئێوە لە مۆڵەتی ژیان و لە پاشماوەی مەرگتانن لە پێو ئەوەی کارێکتان دەست بکەوێت خوازیاری ڕێگەگرتن بەری مەبن، چیتان هەیە بیبەخشن پێش ئەوەی تیابچن و ئەمەش بکەن میراتی بۆ ئەوانەی دوای خۆتان، ئەوەش بزانن کە ئەو سەروەت و سامان و ماڵەی هەتانە جگە لەوەی کە لێتان خواردووە و خواردۆتەوە و پۆشیوتانە و بەخشیوتانە ئەوی تری مافی ئێوەی پێوە نیە، ئەوەش بزانن کە ئەمە بۆ میراتگرانە، کاتێ ئازارەکە زۆری بۆ هێنا وای لێهات دەیفەرموو: خوای گەورەا هەناسەم لێ ببڕە،[٣] من شاهێدی دەدەم کە تۆ دەزانی من تۆم خۆش دەوێت،[٤] کاتێك کە مەرگ بەرەو پیری هات فەرمووی: سڵاو لە مردن، بەخێر بێت ئەو میوانەی کە لەسەر نەداری هاتووە من لە پەشیمانی خەم و خەفەت ڕزگارم نابێت، خوای گەورەا تۆ دەزانی کە من مانەوەم لە ژیان پێ خۆش نەبوو نە بۆ ڕۆینی ڕووبارەکان و نە بۆ چاندنی درەختەکان، بەڵام پێم خۆش بو بمێنمەوە بۆ سزا چەشتنی شەوگاری دوور و درێژ، درێژی ساتەوەختەکانی ڕۆژ و بۆ تینوویەتی کۆچەکان، لە گەرمای سەخت، بۆ سەرکەوتن لە ئەڵقەکانی زیکرو یادی خودا،[٥] موعاز کاتێك کە کۆچی دوایی کرد تەمەنی تەنها(٣٨)ساڵ بوو،[٦] پاش ئەو عەمری کوڕی عاص کرایە جێنشینی، عەمر نوێژی لەسەر خوێند، چوویە ناو گۆڕەکەی و لە شوێنی خۆی دانا، چەند کەسێکی تر لە موسڵمانان چوونە نێو گۆڕەکەی، کاتێك کە عەمر لە گۆڕەکەی هاتە دەرەوە،

---

١ـ الاكتفاء (٣/٣١٠).

٢ـ تأريخ الطبري (٥/٣٦).

٣ـ الاكتفاء (٣/٣٠٨)، والمقصود: أمتني

٤ـ الاكتفاء (٣/٣٠٨).

٥ـ حلية الاولياء (١/٢٢٨ الى ٢٤٤).

٦ـ هەمان سەرچاوە.

فەرمووی: ڕەحمەتی خودات لێ بێت ئەی موعاز، ئێمە فێرمان نەکردی کە موسڵمانانی ئامۆژگارکار و باشترینیان بیت، تۆ فەرهەنگکار بوویت بۆنەفامان و توند بووی لەسەر خراپکار و بەخشندە بووی بۆ باوەڕداران.[1]

پاش کۆچی دوایی ئەبو عوبەیدە(رضي الله عنه)و موعازی کوڕی جەبەل، عەمری کوڕی عاص سەرکردایەتی سوپایەکی گرتە دەست و وتارێکی بۆ خەڵکی داو فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەم پەتایە ئەگەر کەوتەوە ئەوا ئاگر هەڵدەگیرسێنێت لەبەر ئەوە بدەنە چیا و چیای لێ بگرن، پاشان خۆیشی و خەڵکی ڕوویان کردە چیا و بڵاوەیان لێ کرد هەتا خوای گەورە پەتاکەی لەسەر لابردن،[2] عەمری کوڕی عاص نامەیەکی نووسی بۆ عومەر(رضي الله عنه) کە ئەمە دەقەکەیەتی: سڵاوت لێ لێت، من سوپاسی ئەو خودایەت لێ دەکەم کە هیچ خوای گەورەیێك نیە جگە لەو، موعازی کوڕی جەبەل(رضي الله عنه) کۆچی دوایی کردووە مەرگ بە ناو موسڵماناندا بڵاوبۆتەوە، مۆڵەتیان پێدام لە خۆوەلانان بەرەو چاکە، من زانیم کە جێ نشینکردنی کاگوزار نزیکی ناکاتەوە لە مەرگی، هەڵهاتنی هەڵهاتووش دووری ناخاتەوە لە مەرگی، چارەنووسی خۆی پاڵی پێوە نانێ سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لەسەر بێت،[3] کاتێك کە نامەکەی عەمری کوڕی عاص کە تیایدا پرسەی موعازی تێدا بوو گەیشتە ئەمیری باوەڕداران، بە جۆرێك کە مردنی ئەبو عوبەیدە(رضي الله عنه) کاری کردبوویە سەر موعاز و لەسەری بە توندی دڵتەنگ بووبوو، عومەر و موسڵمانان بە کوڵ لەسەری گریان و زۆر دڵگران بوون، عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: خوای گەورە ڕەحمی بە موعاز کرد، سوێند بە خوا، خوا لەبەر ماندووبوونی بە دەست ئەم گەلە و زانیاری تێروتەسەلی بردیەوە، خۆش بەختی بۆ ئەو ڕاوێژە چاکەی کە لە وەوە وەرمان دەگرت، دیمان کە بوویە هۆی چاکە و بەرەکەتداری ، شادی و بەختەوەری بۆ ئەو زانیاریەی کە لە ئەوەسوودمان لێ بینی، ئەو چاکەیەی کە ڕێنموونی دەکردین بۆ سەری، خوای گەورە بە پاداشتی پیاوچاکان پاداشتی بداتەوە،[4] سێیەمیان ئەو سەرکردە بەناوبانگە بوو کە دووچاری تاعوون هات، باشترین نەوەی ئەبو سوفیان بوو کە پێیان دەوت یەزیدی چاك کە ئەویش یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، کە لەو سەرکردە بە ڕێزانە بوو کە بە تاعوونی عەمواس شەهید کرا شەرحەبیلی کوڕی حەسنە بوو.[5]

## ٤- دەرچوونی عومەر بۆ شام و ڕێکخستنی شارەکان:

عومەری فاروق زۆر دڵگران بوو بە کۆچی دوایی سەرکردە گەورە و سەربازە نەبەردەکانی بەهۆی نەخۆشی تاعوون لە شام، عومەر بەردەوام نامەی بۆ دەهات کە تیایدا پرسیاری لێ دەکراسەبارەت بەو میراتیەی کە بەجێ دەمێنێت لەوانەی کۆچی دوایی دەکەن، سەبارەت بە چەند کارێکی تر، لەبەر

١ـ الاكتفاء (٣/٣٠٩).
٢ـ البداية والنهاية (٧/٩٥).
٣ـ مجموعة الوثائق السياسية (ص: ٤٩٠).
٤ـ الاكتفاء (٣/٣١٠).
٥ـ الكامل في التأريخ (٢/١٧١-١٧٢) تأريخ الذهبي (ص: ١٨١).

ئەوە خەڵکی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێ کردن کە چی لـەم کارانـەدا هەیـە،دواتر بڕیـاری دا کـە سـەردانی موسڵمانان بکات لە شوێنەکانی خۆیاندا، تا کاروبارەکانیان بۆ ڕێك و پێك بکات، ڕای عومەر چەسپا پاش ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ دەستەی شورا بەوەی کە سەردانەکەی لـە شـامەوە دەسـت پـێ بکـات، پاشـان فەرمووی: میراتیەکانی خەڵکی شـام تیاچـوون لەبـەر ئـەوە منـیش لـە شـامەوە دەسـت پـێ دەکـەم و میراتیەکان بەش ئەوەی کە لـە ناخمدایـە بۆیـانی دەچەسـپێنم و پاشـان دەگەڕێمـەوە بـە وڵاتـانی تـردا دەسوڕێمەوە و کار و فەرمانی خۆمیان پێ دەگەیەنم، عومـەر لـە مەدینـە چـوویە دەرەوە و عـەلی لـە جێی خۆی دانا،[1] کاتێك گەیشتە شام ڕزق و ڕۆزیەکانی دابەش کرد و ئەو دەستە سـەربازیانەی دیـاری کرد کە بە زستاندا دەجەنگن، دواتر ئەو دەستە سەربازیانەی دیاری کرد، کـە بـە هـاوین دەجـەنگن و کون و کەلەبەر و دەروازەکانی توند و تۆڵ کردەوە، کاری والیەکانی دیاری کرد، عبداللە کوڕی قـەیسی لەسەر کەنارەکان لە هەموو هەرێمەکان دانا، موعاویەی خستە سەر ناوچەی دیمەشق، کاری سەربازگەو سەرکردەکانیشی ڕێك خست، میراتی مردوانی دایە زیندوان،[2] کاتێك کاتی نوێژ هات خەڵکەکـە پێیـان وت: ئەگەر فەرمانت بدایە بلال بانگی دەدا، ئەویش فەرمانی دا و بلال بانگی دا و کەسێك نەمایـەوە کە هەستدارتر بێت لە پێغەمبەر(ρ)و کە بلال بانگی دەدا هەمووان دەستیان کـردە گریـان و تەنانـەت بەڵکو ڕیشیان تەڕبوو عومەر لە هەموان بە کوڵتر دەگریا، کەسێکیش کە هەستی بـە گریانەکـەیان و وەبیرهاتنەوەیان بۆ پێغەمبەری(ρ) نەکردبێت،[3] پێش ئەوەی کە عومەر بگەڕێتەوە بۆ مەدینەلـە نێـو خەڵکەکەدا وتارێکی دا و فەرمووی: ئاگاداربن کە من بوومەتە والی بە سەرتانەوە ئەوەی، کە لەسەرم بوو بەجێم هێنا لەوەی کە خوای گەورە پێی سپاردووم، لە نێو خۆتاندا بـەش و مـاڵی خۆتـانم پێـدان و بەشـم کـرد، ئـەوەی کـە پێمـان بـوو پێمـان گەیانـدن ئێمـە چـەند کەسـێکمان بـۆ کردنـە سـەرباز و دەروازەکانمان بۆ سازدان، نیشتەجێمان کردن و ئەوەی کە پێمان گەیشتبوو لـە بەشـی ئێـوە و ئـەوەش لەسەری هاتنە ئاخاوتن لە شانتان و خواردن و خواردنەوەتانمان بۆ ناوزەدکردن، فەرمانماندا بەبەخشش و ڕزق و ڕۆزیتان و دەستکەوتەکانتان، هەر کەسێك لە ئێوە شتێك دەزانێت دەتـوانێ کـاری پـێ بکـات، فێرمان بکات ئێمەش کاری پێ بکەین و هیچ هێزێکیش نابێت ئەگەر بە پشت بەستن بە خوا نـەبێت،[4] ئەمە وتارەکەی عومەر بوو لە پێش نوێژی ناوبراو.

تاعونی عەمواس مەترسیەکی گەورە بوو لەسەر موسڵمانان و زیاتر لە(٢٠) هەزار کەسی لێ کردن بە قوربانی کە ئەم ژمارەیە نیوەی ژمارەی دانیشتوانی خەڵکی شام بوو وە ڕەنگە موسڵمانان ئەو ڕۆژە هەر لەمە ترسابن و هەستیان بە مەترسی کردبێت لێی لە پێش ئەوەی کە هەست بە مەترسی ڕۆمەکان

---

١ـ الفاروق عمر بن الخطاب، محمد رضا (ص: ٢٣٠).
٢ـ الخلفاء الراشدون للنجار (ص: ٣٢٥)، الفاروق، محمد رشید (ص: ٢٣٠).
٣ـ خلاصة تأریخ إبن کثیر، الخلافة الراشدة (ص: ٢٣٦).
٤ـ البدایة والنهایة (٧/٧٩).

بکەن، لە ڕاستیدا ئەگەر ڕۆمەکان بێدار بونایەتەوە بۆ ئەم کەم و کورتیەی کە ڕووی کردۆتە سوپای موسڵمانان لە شام ئەو دەمە هێرشیان دەکردە سەریان و زۆر ئەستەم و دژواریش بوو کە موسڵمانان بیان توانیایە بەرەو ڕوویان ببنەوە، بەڵام ڕەنگە بێزاری توانیبێتی زاڵ بێت بەسەر ڕۆمەکاندا و هزر و هۆشی ڕاگرتبن لە هێرش کردنە سەر موسڵمانان، بە تایبەتی ئەگەر خەڵکی قایل بن بە دەسەڵاتی موسڵمانان و بەختەوەر بن بە دەسەڵاتدارانی دادپەروەر و ژیانی باش و چاکیان، لەگەڵ پشت بەستنیان پێیان کە بۆ ڕۆمەکان ئاسان نیە هێرش بکەنە سەر شام و بە تایبەتی ئەگەر ئەوەمان بۆ نائومێدی ئەم گەلە لە جەنگان و نەمریان بۆ پشوویەك لە کۆشی بەرخودان بۆ گەلێك کە سەرکەوتن بۆتە هاوپەیمانیان لە هەموو جێگەیەکدا، ترسیان تێکەوتووە لە هەڵکوتانیان بۆ سەر دڵی هەر مرۆڤێك.[١]

## ٥- حوکمی چوونە ژوورەوەو دەرچوون لەو زەویەی، کە تاعون ڕووی لێ دەنێت:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ئەگەر بوونی ئەم پەتایەتان لە وڵاتێك بیست مەچنە ناویەوە، ئەگەر کەوتە وڵاتتانەوە ئەوا لێی دەرمەچن و لێی هەڵمەیەن))[٢] یاران ناکۆك بوون لە مانای ڕێگەگرتن لە چوونە دەر و هاتنە ژورەوە، هەندێکیان کاری بە ڕووکاری زاراوەکان دەکردو هەندێکی تریان بە شێوەیەکی تر، ئەوانەی بە شێوەیەکی تر دەیانگێڕایەوە بە ڕەوا و دروستیان دادەنا کە لەو زەویە بچنە دەرەوە کە تاعونی تێکەتووە، سووربوونی عومەریش هەر لەوەدا بوو کە داوای لە ئەبو عوبەیدە کرد کە لەو زەویە دەربچێت کە تاعونەکەی تێکەتووە بەڵام ئەبو عوبەیدە(ﷺ) بۆزشی بۆ هێنایەوە، هەروەك ئەوەی کە عومەر داوای لە ئەبو عوبەیدە کرد کە موسڵمان لەو زەویە قووڵە دەربچێت کە پڕیەتی لە ئاو و مێرگ و بەرەو زەویەکی پوخت و بەرز بڕوات، ئەبو عوبەیدەش ئەم کارەی کرد، ئەم نامەیەی عومەر بۆ ئەبو عوبەیدە لە کاتێکدا بوو کە لە سەرغ بەیەك گەیشتن، گوێیان لە فەرموودەیەکی عبدالرحمن کوڕی عەوف بوو بە ڕێگەگرتن لە دەرچوون و چوونە ژورەوە بۆ ئەو زەویەی کە ئەم پەتایەی تێدایە، بەمەش عومەر گەڕایەوە بۆ مەدینە، دەرکەوت کە پەتاکە هێشتا هەر لە سەرەتاکەیدایە و نەگەیشتۆتە ڕادەی پەتا فرۆشتن و هەڵگیرسانی سام و هەیبەتی خۆی، کاتێك عومەر گەیشتەوە مەدینە هەواڵی زۆری مردنی بەم تاعونە پێگەیشت، تێگەیشتنی عومەر(ﷺ) بە شیاوی دەرچوون لە زەوی دووچار بوو بە تاعون هەروەها لە هەندێ لەو هاوەڵانەوە گوێزراوەتەوە کە هاودەمی ئەبو عوبەیدە بوون لە شام و لەگەڵ مەدینەییەکانی ئەو دەمەدا ژیاون، وەك عەمری کوڕی عاص، ئەبو موسای ئەشعەری(ﷺ)، چەند دەنگی لە گرفتی دەرچوون لە زەوی دووچاربوو بە تاعون و نەچوونە ژورەوە بۆ ئەو زەویە بەردەوام بووە و هەندێکیان ئەو دەرچوونەیان بە شیاو زانیوە ئەگەر بێتوو ئەو دەرچوونە هەڵهاتن نەبێت لە چارەنووسێك کە خوا دیاری کردووە وە باوەڕبوون بەوەی کە هەڵهاتن

---

١- أشهر المشاهير (٢/٣٦١).

٢- مسلم، کتاب: السلام (رقم: ٢٢١٩).

دەپیارێزێت لە مردن، بەڵام هەر کەس بۆ پێویستیەکی خۆ پاککردنەوە چوویە دەرەوە ئەوا ڕێگەی پێدراوە، ئەگەر ئەو زەویە پەتاویەی بەجێ هێشت و کۆچی کرد بۆ زەویەکی پوخت وەك نوێنەرێك بۆی یان داوای لێ کرابێت، بەڵام لێکدانەوەی ئەبو عویەیدە(ﷺ)و مانەوەی تیایدا و پۆزش هێنانەوەی بۆ عومەری فاروق، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەرکردایەتی کە ئاین لە دەستووراتیدا ڕێکی دەخات وە بە نموونەیەکی بەرز دێتە هەژمار بۆ سەرکردەیەکی پاکی وەك ئەبو عویەیدە، کە بە دەستپاکی ئەم ئومەتە دێتە هەژمار، کاتێك کە هۆی دامەزراویەکەی بەرز دەکاتەوە دەفەرموویێت: من لە سەربازگەیەکی موسڵماناندام و هیچ ئارەزوویەك لە خۆم بەدی ناکەم کە لێیان جودا ببمەوە، هەندێ لە زانایانی لێدواو دووچار بوون کاتێك کە باسی حیکمەتی ڕێگەگرتن لە چوونە دەرەوە و هەڵهاتن لە تاعون کراوە: خەڵکی ئەگەر گەیشتنە ئەوەی کە سوور بن لەسەر ئەوا ئەوانەی کە ناتوانن بڕۆن — بەو پەتا ناوبراوە یان هەر دەردێکی تر پەکیان دەکەوێت — ئەمەش لەدەستدانی بەرژەوەندیە بۆ لە دەستدانی هەر کەسێك کە بە زیندوویی یان بە مردوویی لە ئەستۆی خۆی دەگرێت، ئەگەر چوونە دەرەوە شتێکی ڕێگەپێدراو بوایە ئەوا تەنها دەسەڵاتداران دەچوونە دەرەوە، ئەمەش دڵ شکانێکی تێدابوو بۆ بێ دەسەڵاتان وە وتوویانە: کە حیکمەتی ترساندن لە هەڵهاتن لە خشان بۆ ئەوەیە، کە دڵ شکانی کەسێکی تێدایە کە هەڵنایەت، لەگەڵ ئەوەی بە شەرمەزاربوونی دووچاری تۆقین دەبێت، بە کورتی: مانەوە سانابیە، دەرچوونیش بە هەمان شێوە، هەر کەس لە ناو پەتاکەدا بێت دووچار بێت ئەوا قازانج لە دەرچوونی نیە، بەم دەرچوونە نەخۆشیەکە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسانێك کە لەش ساغن، هەر کەس کە دووچار نەبووبێت ئەوا ڕێگەی بۆ ئاسان کراوە لە دەرچوون بە مەبەستی تیمارکردن و بە مەرجێك کە خەڵکی هەموویان پێکەوە دەرنەچن، پێویستە کە کەسانێك بمێننەوە کە چاودێری دووچاربوان بکەن.[1]

---

١ـ أبو عبيدة عامر بن الجراح، شراب (ص: ٢٣٢ الى ٢٣٧).

# بەشی چوارەم

## دام و دەزگای دارایی و قەزایی و پێشکەوتنی

## لە سەردەمی عومەردا (ﷺ)

# دوانگەی یەکەم

## دام و دەزگای دارایی

**یەکەم: سەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەت لە سەردەمی عومەردا (ﷺ):**

لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا موسڵمانان بە هەموو شێوەکانیەوە سەرنجیان دابوویە پەیداکردنی سامان بەوەی کە سامان و دارایی خودایە و مرۆڤ تیایدا جێنشینە، بەو مەرجەش کاردەکات کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆی داناوە و جەخت لەسەر ئەم ڕاستیە دەکاتەوە لە هەموو کاروبارێك کە پەیوەندی بە داهات و بەخشیەوە هەیە و دەفەرموویت: ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ﴾ (الحديد: ٧). ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم﴾ (البقرة: ٢٥٤).

هەروەها سەبارەت بەچاکە،کە کۆبوونەوەی خێرە دەفەرموویت:﴿...وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ...﴾(البقرة: ١٧٧).

بەخشینی ماڵ دان پیانانێکە لە موسڵمانانەوە – سەرەتایەکە – بەوەی کە ئەو سامانەی لە چنگیدایە ڕزقی خودایە بۆ ئەو: ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ﴾(الذاريات: ٢٢).

لەبەر ئەوەی دروستکراوی خۆیەتی، لەم دان پێدانانەدا بە ناز و نیعمەتی ڕزق و ڕۆزی چاکە بە بەندەی خوداوە هەڵدەقولێت،[1] لەسەر ئەم بنەما ئیمانیەوە عومەر سەیری ئەو سامانەی دەوڵەتی دەکرد کە کاڵاکانی لەسەردەمەکەیدا بەرفراوان بوون، بە جۆرێك کە دەوڵەت چەند ناوچەیەکی بەرفراوان

---

١ـ دراسة الحضارات الاسلامية، أحمد ابراهيم شريف (ص: ٢٥٣).

کردەوە، گەلانێکی زۆر ملکەچی دەستووراتی بوون، دەوڵەت پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم گەلانەدا ڕێکخست، هەندێکیان ئاشتیانە هاتنە ژێر سایەی دەستووراتی دەوڵەت، هەندێکیان بە فشارلێکردن ملکەچ بوون، بۆ بەدواداچوونی ئەم پاکسازیە چەند زەویەکی بە زۆر (واتا: هێزی چەك) بۆ دەستەبەر بوو، لەگەڵ چەند زەویەکدا کە خاوەنەکانیان باش بوون، زەوی و زارێکیش، کە خاوەنەکانیان وازیان لێ هێنابوو وە، یان موڵکی فەرمانڕەوایان و پیاوانی دەوڵەت بوون وە لە گەلانی ئەم ناوچانە خەڵکانی ئەهلی کتاب (وەك گاور و جولەکە) بوون و عومەر ڕێگەیەکی سازدا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیان بە پێی شەرعی خودایی، عومەر(ﷺ) هەستا بەپێشخستنی یاسای دارایی لە دەوڵەتەکەیدا چ لەداهات و دەسکەوتەکانیان یان خەرجیەکانیان یان ڕێکخستنی مافی خەڵك لە میانەی ڕێسای دیوانەکانەوە، داهات و دەسکەوتەکان لە سەردەمی عومەر(ﷺ)دا ڕووی لە زیاد بوون کرد، دەستووری دانا لە پێشخستنیدا، چەند کاربەدەستێکی بۆ تەرخان کرد تا سەرپەرشتی بکەن، دیارە کە گرنگترین سەرچاوەکانی داهات لە سەردەمی ئەودا: زەکات، غەنیمە، سەرانە، باج، خەرجی، دەیەکی بازرگانی، بوو، هەروەها عومەر کاری دەکرد لەسەر پێشخستنی ئەم سەرچاوانە و لەگەڵ چەند کێشە و گرفتێکدا هەوڵی خۆی دەدا بە پێی ئەو ئامانجە شەرعیانەی کە دانرابوو بۆ بەرژەوەندی بەندەکان، دەوڵەت چەند هەل و مەرجێك تیایدا سەریان هەڵدەدا کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا نەبوون،[1] عومەر(ﷺ) بەجێ هێنەر و ڕاپەڕێنەری قورئان و سونەت بوو بە شێوەیەکی بلیمەتانە، هیچ کارێکی بێ موسڵمانان ئەنجام نەدەدا و لە هیچ کاروبارێکدا ڕای خۆی پێش نەدەخست، ئەگەر کارێك ڕووی لێ بنایە ئەوا موسڵمانانی کۆدەکردەوە و ڕاوێژی پێ دەکردن و کاری بە ڕاکانیان دەکرد،[2] گرنگترین سەرچاوەکانی داهات لە سەردەمی فاروق ئەمانە بوون:

### ١- زەکات:

بریتیە لە پایەیەکی کۆمەڵایەتی دیاری پایەکانی ئیسلام، یەکەمین یاسادانانی ئاسمانی ئیسلامیە، فەرزێکە لە سەروەت و سامانی دەوڵەمەندە موسڵمانەکان، هەتا لێیان وەربگیرێت، بگەڕێنرێتەوە بۆ هەژاران بە پێی بەشە دیاری کراوەکەی لە کشتوکاڵ و داهاتدا، زێڕ و زیو و ماڵ و کاڵای بازرگانی و ئاژەڵداری، تا لێرەدا جۆرێك لە هاوکاری کردن و زامنکاری کۆمەڵایەتی هەبێت، خۆشەویستی و ئولفەتێك لە نێو دەوڵەمەندان و هەژاراندا بەرپابێت، زەکات سپاردەیەکە کە دەگاتە سامان، سامانیش هەروەك دەڵێن ژیانە، لە خەڵکیدا هەیە بەختەوەرە بە سامان و دارایی و هەیە بەدبەختە پێی، ئەمەش سونەتێکی خوداییە لە نێو دروستکراوەکانی، بۆ سونەتی خودایش هیچ گۆڕانێك نیە، بە سەرنجدان بەوەی کە هەی لە سامان و داراییدا لەکاریگەری لە ژیانی خەڵکی ئەوا دەبینین کە ئیسلام بایەخی پێداوە وە بایەخێکی دیار و بەرچاوی داوەتە زەکات و یاسا و ڕێسایەکی بە بەزەییانەی بۆ داناوە، کە

---

١ـ دراسة الحضارات الاسلامية، أحمد ابراهيم شريف (ص: ٢٥٤).
٢ـ مبادیء النظام الاقتصادي الاسلامي، د. سعاد ابراهيم صالح (ص: ٢١٣).

ئولفەت بە بنەمای دڵ دەدات،[١] لەبەر ئەوە بوو کە عومەر لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر(ρ)و ئەبو بەکر ڕۆیشتووە بەڕێوە، عومەر هەستا بە دانانی دام و دەزگای زەکات و پێشخستنی، لەبەر ئەوە باوەڕپێکراوانی نارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات لە تەواوی ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ئەویش پاش ئەوەی کە زۆرێك لە دانیشتوانی وڵاتە ڕزگارکراوەکان موسڵمان بوون، دادپەروەری لە باج کۆکردنەوەی داهاتدا سیفەتی خەلیفەکانی ڕاشیدین بووە، بەبێ خاڵی کردنەوەی بەیتولمال، فاروق لەسەر یەکێك لە کاربەدەستانی کرد کە مەڕێکی شیردار و گوان زلی وەرگرتبوو، فەرمووی: خاوەنەکەی ئەمە نادات بە تۆ ئەگەر ملکەچیش بن، خەڵکی فێری خراپە و فیتنەیی مەکەن،[٢] خەڵکانێکی دانیشتووی شام هاتن بۆ لای عومەر و وتیان: ئێمە سامان و داهات و ژمارەیەك بەندە و ئەسپ و گیانلەبەرمان هەیە پێمان خۆشە، کە زەکاتی لێ بدەین و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە مایەی خاوێنی بێت بۆمان، عومەر فەرمووی: ئەوەی، کە هاوەڵەکانم کردوویانە منیش دەیکەم، پاشان ڕاوێژی بە هەندێ لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) کرد، کە ( عەلی)یش یەکێك بوو لەوان، بۆیە عەلی فەرمووی: ئەوە کارێکی باشە، ئەگەر سەرانە و خەرجیەك نەبێت کە ئەوانەی دوای تۆ لێیان وەربگیرێت،[٣] دکتۆر ئەکرەم ضیاء ئەلعومەری باسی ئەمەی کردووە کە دەڵێت: یاران پێشنیاری ئەوەیان بۆ عومەر کرد کە زەکات لەسەر ئەسپ و مەڕ و ماڵات و بەندە فەرز بکات پاش ئەوەی کە مولکداری بەندە و ئەسپ لە نێو چنگی موسڵماناندا بەرفراوان بووە، پاشان عومەر بەندەکان و ئەسپەکانی لە داهاتی بازرگانەکان ژمارد و لەسەر هەر بەندەیەکی لاو و بەساڵاچوو دینارێکی وەك زەکات و لەسەر هەر ئەسپێکی عەرەبی دە درهەم و لەسەر هەر ئەسپێکی بیانیش پێنج درهەمی فەرز کرد، بەمەش ئێمە لەوە تێدەگەین کە زەکاتی لەسەر بەندەی خزمەتکار و ئەسپی ئامادە بۆ جیهاد فەرز نەکرد لەبەر ئەوانە لە خستنەڕووەکانی بازرگانی نین، بەڵکو ئەو لە قەرەبووی ئەمانەدا دایدەنا کە هەر کەس زەکاتیان دەدات هەر دوومانگ جارێك ٢٠٩ گم گەنم بدات، کە ئەمە زۆرترین بەها بووە لە زەکاتدا، ئەمەش لەسەر بنەمای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرمووێت: ((چاکەی ئەسپ و بەندە لەسەر موسڵمانە خاوەنەکەی فەرزکراوە))[٤] وە لە ماڵی شاراوە – ئەگەر دۆزرایەوە – پێنج یەك وەرگیراوە، هەروەها عومەر سووربووە لەسەر مامەڵەکردن بە سامان و گەڕخستنی هەتا زەکاتی نەکەوێت پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بە سەریدا،[٥] عومەر هەندێ پارەی هەتیوانی لە لابوو دایە دەستی حەکەمی کوڕی عاصی ئەسەقەفی هەتا بازرگانی پێوە بکات،[٦] لەبەر ئەوەی کە عومەر بە هۆی ئەوەی سەرگەرمی کاری خەلافەت بوو کاتێکی بە دەستەوە نەبوو بۆ بازرگانی کردن.

١ـ سياسة المال في الاسلام في عهد عمر بن الخطاب، عبدالله جمعان السعدي (ص: ٨).
٢ـ الموطأ (٢٥٦/١)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٤).
٣ـ الموسوعة الحديثية مسند أحمد (رقم: ٨٢)، إسناده صحيح.
٤ـ صحيح الترمذي (١٩٦/١) وقال الترمذي او العمل عليه عند أهل العلم.
٥ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٤-١٩٥).
٦ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٥)، الاموال لابن زنجوية (٩٩٠/٣) والاثر صحيح.

کاتێك کە قازانجەکە زیادی کرد لە دە هەزار درهەمەوە بۆ سەد هەزار درهەم عومەر گومانی لەو کەسابەتە پەیداکرد، کاتێك کە زانی بازرگانەکە پەیوەندی عومەری بە هەتیوەکانەوە تەواوی قازانجەکەی بە ناپەسەند لە قەڵەم دا و پارەکەی خۆی گەراندەوە و قازانجەکەی بە پۆخڵی لە قەڵەمدا،[1] عومەر کاری بە بنەمای فەرزی خۆی لەسەر والیەکان دەکرد کە بریتی بوو لە قۆستنەوەی شوێنی بەرپرسیارێتی لە دەوڵەتدا، هەر لێرەوە والیەکان سامانەکانی خۆیان دابەش دەکرد ئەگەر بە بازرگانی گەشەی بکردایە،[2] ڕوونکردنەوەی ئەمەش لە کاتی ئاخاوتنمان دەربارەی والیەکان بینی ، عومەر لە زەکاتی کشتوکاڵە ئاودراوەکانی باران و ئاوی ڕووبار دەیەکی وەردەگرت و بۆ ئەو کشتوکاڵانەش کە بە ئامێر ئاو دەدران بیست یەکی وەردەگرت،[3] کە ئەمەش کۆکە لەگەڵ سونەتدا، وەسیەتی نەرم نوانبینی بەخاوەن دارستانەکان دەکرد لە کاتی نرخ دانان بۆ بەروبوومی خورما،[4] زەکاتی دەیەکی لە هەنگوین وەردەگرت لە کاتێکدا دەوڵەت هەڵدەستا بە پاراستنی ئەو ناوچانەی کە هەنگوینی تێدایە،[5] هەروەها لە سەردەمی عومەردا گەنم زۆر بوو، لەبەر ئەوە ڕێگەی دا بە خەڵکی زەکاتی ڕۆژو شکاندن(فطر) لە گەنم بدەن بە نیوەی ئەو کێشەی کە پێش خەلافەتەکەی لە جۆ و خورما و مێوژ دەیاندا،[6] دیارە ئەمەش ئاسانکاریەکی تێدابوو لەسەر خەڵکی، پەسەندکردنی بۆ سامانی دەروونی لە زەکات ئەگەرچی ڕەگەزەکەش جیاواز بێت،[7] بەڵام سەبارەت بە پێوەری سامانی ئەو زەکاتەی کە هەموو ساڵێك کۆدەکرایەوە ئەمە کارێکی باش نەبوو، ئەو ئاماژانەی کە باسی هەندێ ژمارە دەکەن ئاماژەگەلێکی بەشی و نادروستن، سوودیان لێ نابینرێت لە بەخشینی نرخ دانانی هەمەگیدا، دەڵێن: عومەر پارێزگاری لە زەوی نەرمان کردووە بۆ صەدەقەکەی، لە پێناوی خوادا لەسەری هەڵدەگرت، ڕێژەی ئەوەی کە هەموو ساڵێك عومەر لەسەری هەڵدەگرت لە پێناوی خوادا (٤٠) هەزار بوو لە کۆمەکی،[8] ئەو فەرمانبەرانەی کە سەرپەرشتی ئەم دام و دەزگایانەیان دەکرد چەند سەرچاوەیەك ناوی هەندێکیانی لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا ئاشکرا کردووە لەوانە: ئەنەسی کوڕی مالك، سەعیدی کوڕی ئەبی ئەلزوباب لەسەر دەستەکان، حارسی کوڕی ئەلمەزرەبی ئەلعەبینی، عبداللە کوڕی ئەلساعیبینی، سەهل کوڕی ئەبو حەسمە، موسلمە کوڕی موخەلەبینی ئەلئەنساری، موعازی کوڕی جەبەل لەسەر تیرەی بەنی کیلاب، سەعد ئەلئەعرەج لەسەر یەمەن، سوفیانی کوڕی عبداللە ئەلسەقەفی کە والی تائیف بوو زەکاتەکەشی کۆدەکردەوە.[9]

---

١ـ الاموال أبو عبيدة (ص: ٤٤٥) الاثر صحيح نقلا عن عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٥).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٥).
٣ـ المصنف (٤/١٣٤-١٣٥) والاثر صحيح نقلاً عن عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٥).
٤ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٥) والاثر صحيح.
٥ ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ هەمان سەرچاوە. (ص:١٩٦) والاثر صحيح.
٧ـ فتح الباري (٣/٣١٣) نقلا عن عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٦).
٨ـ الحياة الاقتصادية في العصور الاسلامية الاولى، د. محمد بطاينة (ص: ١٠٤).
٩ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٩٦-١٩٧).

**٢- سەرانە:**

ئەو باجەیە کە فەرزکراوە بەسەر کەسانێکدا کە گاور یان جوولەکە بوون و هاتوونەتە ژێر سایەی زامنی موسڵمانان،[١] دەڵێن بریتیە لە باجێکی سەپێنراو بەسەر بێباوەڕاندا وەك بە کەساس و بچووك سەیرکردنیان،[٢] وەك ئەوەی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِینَ لَا یُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡیَوۡمِ ٱلۡـَٔاخِرِ وَلَا یُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا یَدِینُونَ دِینَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِینَ أُوتُوا۟ ٱلۡكِتَـٰبَ حَتَّىٰ یُعۡطُوا۟ ٱلۡجِزۡیَةَ عَن یَدࣲ وَهُمۡ صَـٰغِرُونَ﴾ (التوبة: ٢٩).

سەرانە لەئەهلی کیتاب وەردەگرێت، کە بریتین لە گاور و جوولەکە، ئەمەش یەك دەنگیە و ناکۆکی و ناتەبایی لەسەر نیە لەگەڵ ئەو کەسەی کە شێوە کتێبێکی هەیە: کە ئەوانیش مەجوسیەکانن، عومەر(ﷺ) لە سەرەتای کارەکە و لە کێشەکەیان شپرزەبوو، کە ئایا سەرانەیان لێ وەربگرێت؟ یان سەرانەیان لێ وەرنەگرێت؟ هەتا ئەو کاتەی کە عبدالرحمن کوڕی عەوف باسی ئەوەی بۆ کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) سەرانەی لە مەجووسە دوورەکانیش[٣] وەرگرتووە، إبن ئەبی شەیبە و کەسانی ترش دەگێڕنەوە کە عومەر لە نێوان گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)و مینبەر دابووە فەرموویەتی: نازانم چی بکەم، بە مەجووسیەکان، ئەوان ئەهلی کتاب نین، لێرەدا عبدالرحمن کوڕی عەوف فەرمووی: گوێم لێ بوو، کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((بە ڕێبازی ئەهلی کتابیان بەرن))[٤] وە لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتووە کە عومەر نەیویست کە سەرانە لە مەجووسیەکان وەربگرێت تا عبدالرحمن کوڕی عەوف شاهێدی دا لەسەر ئەوەی، کە پێغەمبەر(ﷺ) سەرانەی لە مەجووسیە دوورەکانیش وەرگرتووە،[٥] زانایان وەرگرتنی سەرانەیان لە مەجووسیەکان گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی کە لە بنەڕەتدا ئەوانیش ئەهلی کتاب بوون، بەڵام پاش ئەوە پەرستنی ئاگر داویەتی بە سەریاندا، ئەو کاتەش لە خەڵکی ڕەشۆکی وەرگرتووە،[٦] وە دواتر لە مەجووسیەکانی فارسی وەرگرتووە و نامەیەکی بۆ جزئی کوڕی موعاویە نووسیووە: سەیری مەجووسیەکانی پێش خۆت بکە و سەرانەیان لێ وەربگرە چونکە عبدالرحمن کوڕی عەوف هەواڵی پێداوم کە پێغەمبەر(ﷺ) سەرانەی لە مەجووسە دوورەکانیش وەرگرتووە،[٧] ئەم سەرانەیە پێویستە لەسەر پیاوانی ئازادی ژێر، لەسەر ئافرەتان و منداڵان و شێت و بەندە سەرانەیان لەسەر نیە ، هەروەها سەرانە لەو هەژارە وەرناگیرێت کەصەدەقەی پێ دەدرێت و لە پەککەوتەش ناسەندرێت، پەککەوتە و گرفتار ئەگەر ئاسانکاریان هەبوو ئەوا سەرانەیان لێ

١ـ السیاسة الشرعیة لإبن تیمیة (ص: ١١٣-١١٤) المعاهدات في الشریعة، د. الدیك (ص: ١١٣).
٢ ـ أهل الذمة في الحضارة الاسلامیة حسن الحي (ص: ٣٩).
٣ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٣٥).
٤ـ المصدر نفسه (ص: ٢٣٥)، نقلا عن مصنف إبن أبي شیبة (١/١٤١).
٥ـ البخاري، كتاب: الجزیة والموادعة (رقم: ٣١٣٦).
٦ـ سواد العراق.
٧ـ البخاري (رقم: ٣١٣٦).

وەردەگیرێت، هەروەها لە نابیناو ئەو خەڵوەتچیانەش وەردەگیرێت کە لە خەڵوەتگاکاندان، ئەگەر بێت و کارئاسانیەکیان هەبێت، بەڵام ئەگەر بێت و هەژار بن و خەڵکی خێریان پێ بکات لێیان وەرناگیرێت،[١] سەرانەش لەسەر مردوو نامێنێت و هەڵدەگیرێت، ئەگەر کەسێك مرد و سەرانەی لەسەر بوو ئەوا سەرانەی لەسەر هەڵدەگیرێت، لەبەر ئەوەی کە سەرانە واجبە لەسەر زیندوان، ئەگەر کەسەکە دووچاری مەرگ هات یان موسڵمان بوو، ئەگەر کەسێك سەرانەی لەسەر بوو موسڵمان بوو، ئەوا بە موسڵمان بوونی سەرانەی لەسەر نامێنێت،[٢] دوو پیاو لە تیرەی ئەلیس موسڵمان بوون، سەرانەیان لەسەر هەڵگیرا، رەقیلی بازرگانی دووڕووبار موسڵمان بوو وە عومەر دوو هەزار درهەمی فەرز کرد لەسەری و سەرانەی لەسەر دانا،[٣] شیاوی باسە سەرانە ئەو ساڵە لەسەر کەسێك دەکەوێت، کە موسڵمان بێت، ئیتر موسڵمان بوونەکەی لە سەرەتا یان لە ناوەند یان کۆتایی ئەو ساڵەدا بێت، عومەردەفەرمووێ: وەرگرتنی سەرانەی باج سێن بەدەستی خۆی دەبێت و، پاشان کە موسڵمان بوو خاوەنەکەی بۆی گێڕایەوە لەسەری،[٤] هەروەها سەرانەش بەهەژار کەوتن هەڵدەگیرێت، ئەگەر بێتو کەسێکی زامنکراو پاش دەوڵەمەندیەکەی هەژار کەوت و نەیتوانی سەرانە بدات ئەوا سەرانەی لەسەر هەڵدەگیرێت، عومەر سەرانە لەسەر بەساڵاچوویەکی نابینا هەڵگرت کاتێك کە بینی سواڵ دەکات،[٥] ئەوەشی بۆ فەرزکرد لە بەیتولمال کە کارەکانی بۆ ڕاپەڕێنێت، هەروەها هەر کە دەوڵەت دابڕا لە زامنکردنی زامنکراوان ئەوا سەرانە هەڵدەگیرێت، چونکە سەرانە هیچی تر نیە جگە لەو باجەی کە لەسەر ئەو کەسانەدا سەپێنراوە، کە جێنشین بێت لە هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، ئەم باجە دەدرێت لە بەرامبەر سوود گەیاندنیان بە خزمەتگوزاریە گشتیەکانی دەوڵەت. ئەمەش لەسەر ئەوەی کە دەوڵەت پارێزگاریان لێ دەکات و دەیانپارێزێت لە بری هەڵنەسانیان بە ئەرکی بەرگریکردن لە نیشتمان و هاونیشتیمانانی،[٦] لەو بەڵگانەی کە سەرانە لە بەرامبەر پاراستندایە، ئەوەیە کە ئەبو عوبەیدەی جەڕاح پێی هەستا، کە ڕۆمەکان خۆیان کردەوە لەسەر سنووری بەشی باکووری دەوڵەتی ئیسلامی، ئەبو عوبەیدە نامەیەکی نووسی بۆ ئەو والیانەی، کە لەپشتیەوە بوون لەو شارانەی،کە خەڵکەکانیان باش بوو، فەرمانی پێدان، کە ئەو سەرانە و خەرجیانەیان بۆ بگێڕنەوە، نامەیەکی بۆ نووسین کە پێی فەرموون: ئەوا ئێمە سامانەکانتانمان بۆ گێڕانەوە لەبەر ئەوەی کە هەواڵمان پێ گەیشتووە کە دوژمنان بۆمان کۆبوونەتەوە وە ئێوەش لە دانی سەرانە مەرجتان ئەوە بووە کە ئێمە بەرگریتان لێ بکەین، بەڵام ئێمە توانای ئەوەمان نیە، لەبەر ئەوە ئەوەی، کە لێمان وەرگرتبوون بۆمان گێڕانەوەن وە ئێمەش لەسەر مەرجی خۆمانین، ئەمەی کە نووسیومانە لە نێوان ئێمە و ئێوەدایە ئەگەر خوای گەورە سەرمان بخات

---

١ـ أهل الذمة في الحضارة الاسلامية (ص: ٤٢).

٢ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٣٨).

٣ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٣٨) نقلا عن المحلي (٣٤٥/٧).

٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٣٩) نقلا عن المغني (٥١١/٨).

٥ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٣٩).

٦ـ المعاهدات في الشريعة الاسلامية، د. الديك (ص: ٣١٤).

بە سەریاندا، کاتێك کە ئەمەیان وت پێیان و ئەو ماڵەیان بۆ گێڕانەوە کە وەك سەرانە لێیان وەرگرتبوون، وتیان: خوای گەورە بتان گێڕێتەوە سەرمان و سەرتان بخات بە سەریاندا (واتا ڕۆمەکان) چونکە ئەگەر ڕۆمەکان بوونایە ئەم سەرانەیان بۆ نەدەگێڕاینەوە، هەرچیەکمان هەبوو دەیان برد و لێنەدەگەڕان هیچی بۆ ئێمە بێت،[1] هەروەها سەرانە هەڵدەگیرێت ئەگەر بێتو ئەوان هەستان بە بەرگری کردن لە دەوڵەت و لەسەر دارایی وڵات هەروەك ئەوەی کە ڕوویدا لە سەردەمی سوراقەی کوڕی عەمر لەگەڵ خەڵکی تەبرستان پاش ئەوەی عومەر لەسەر ئەمە قایل بوو.[2]

هەروەها بەهای سەرانە دیاری نەکراو بووە لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر و بە پێی توانای خەڵکی و بارودۆخی ناوچەکە جیاواز بووە، لەسەر خەڵکی عێراق ٤٨ درهەم، ٢٤درهەمی دانا بە پێی حاڵی هەر یەکێك لە کۆمەککاران، ئەمەش هەموو ساڵێك لێیان وەردەگیرێت، ئەگەر بە هەر شێوەیەکی تر هاتنە پێشێ وەك دانی ئاژەڵ و کەل و پەل و هەر شتێکی تر بە نرخێکی دیاریکراو لێیان وەردەگیرێت،[3] عومەر لەسەر خەڵکی شام چوار دینار و ڕزق و ڕۆزی موسڵمانان لە گەنمی وامدار و سێ بەش لە زەیت بۆ هەر تاکێك، لەسەر ئەو کەسانەی کە زیویان هەبوو٤٠ درهەم و ١٥ پێوەری دانا بۆ هەر کەسێك، لەسەر خەڵکی میسر٢دیناری دانا لەسەر هەر تاکێکی باڵغ ئەگەر هەژار نەبێت،[4] بەلام خەڵکی یەمەن کە هەر لەسەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە موسڵمان بووبوون تەنها یەك دینار یان شتێك لە بەرامبەریدا دانرا، گێڕانەوە لاوازەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە سەرانە لەگەڵ گۆڕانی خەلافەتی عومەردا لەسەر خەڵکی یەمەن ماوەتەوە و هەرچەندە لاواز بووە بەلام لەگەڵ سیاسەتی عومەر تەبا بووە لەسەر مەزرا و حاڵی خەڵکیدا، لەگەڵ نەگۆڕانی لێپرسینەوەکانی پێغەمبەر(ﷺ)[5] سەرانە بەهۆی کۆمەککاری خەڵکی و بە پێی دەوڵەمەندی هەرێمەکانەوە جیاواز بووە ، سەرانە ملی کەچ دەکرد بۆ تەقەلادان بەوەی لە وزە و توانای خەڵکی زامنکراو بوو بەبێ بار بووبوون و زیان لێکەوتن لەسەری،[6] عومەر فەرمانی دەدایە باج کۆکەرەوان کە لە کاتی باج کۆکرنەوەدا خەڵکی لەگەڵدا بێت، کاتێك کە باج کۆکەرەوان بە داهاتێکی زۆرەوە هاتنەوە بۆ لای عومەر، عومەر فەرمووی: من وا دەزانم کە خەڵکیتان ماندوو کردووە، ئەوانیش وتیان: نا سوێند بەخوا، کە سمان نەبردووە جگە لە کەسانی باش و دڵسۆز، پاشان عومەر فەرمووی: بەبێ لێدان و هەڵواسین؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەش لەسەر دەستی من و لە دەسەلاتی مندا نەکردوە،[7] وە لە بەناوبانگترین فەرمانبەرانی ئەم دەزگایە: عوسمانی کوڕی حەنیف، سەعدی کوڕی حذیم، والی شارەکان وەك عەمری

---

١ـ فتوح البلدان (ص: ١٤٣)، الموارد المالية، د. يوسف عبدالمقصود (ص: ٢٢٨).

٢ـ تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل المصري (ص: ٣٢٧).

٣ـ دور الحجاز في حياة السياسة (ص: ٢٣٠).

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٧٣).

٦ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٣١)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٦٧).

٧ـ موسوعة فقه عمر (ص: ٢٤٣).

کوڕی عاص، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەوانی ترش.

سەرانە بە کۆمەڵێك یاساو دەستورات دانرا کە تێگەیشتوان و شارەزایانی شەرع لە دەقە قورئانیەکان و سونەت و کاری خەلیفەکانی ڕاشیدین وەریان گرتووە، ئەم یاسایانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دام و دەزگاکانی سەرانەلە سەرچاوەکانی دەوڵەتی ئیسلامین، هەروەك ئەوەی کە سیفەتێکی سیاسی هەیە، سەرانەدانی خەڵکانی زامنکراو بۆ دەوڵەت بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزیانبۆی و ملکەچیان بۆ دەستوور و یاساکانی و وەفایەکیش بەوەی کە بەڵێنیان لەسەر دراوە،[1] مامۆستا حسن ئەملەمی بۆ ئەوە دەچێت کە دام و دەزگاکانی سەرانەجۆرە سیاسەتێکی هەیە کە زیاترە لەو سیاسەتەی کە لە دام و دەزگای دارایدا هەیە،[2] ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە ئەم دام و دەزگایە لە نێوان هەردوو جۆرەکەدا کۆبۆتەوە، لە سەرچاوەکانی داهاتەلە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

## عومەر صەدەقەی چەندجارەی لە گاورانی تەغەلب وەرگرت:

هەندێ لە عەرەبەکانی گاوری دوورگە دانی سەرانەیان لا پەسەند نەبوو، لەبەر ئەوەی کە وایان دەبینی کە ئەمە سەرشۆڕی و کەم و کوڕی پێکردنە، لەبەر ئەوە وەلید سەران و زانایانی گاورانی نارد بۆ لای عومەر ئەویش پێی فەرموون: سەرانە بدەن، ئەوانیش بە عومەریان وت: ئایا ئێمە گەیشتووینەتە پەناگەی خۆمان، سوێند بە خوا ئەگەر سەرانەمان لێ بستێنی ئەوا دەڕۆین بۆ ناو خاکی ڕۆم ،سوێند بە خوا تۆ لە نێو عەرەبدا ناومان دەزڕێنی، عومەر فەرمووی: ئێوە خۆتان ناوی خۆتان دەزڕێنن، سەرپێچی ئومەتەکەتان دەکەن لەوەی کە سەرپێچیە و ناو زڕانە لای عەرەبی ناوچەکە و دەوروبەری، سوێند بە خوا ئەو سەرانەیە دەدەن، ئەگەر ڕابکەن بۆ ناو خاکی ڕۆم ئەوا لە سەرتان دەنووسم، پاشان دوورتان دەخەمەوە، دواتر وتیان: شتێکمان لێ وەربگرە و ناوی لێ مەنێ سەرانە، عومەر فەرمووی: ئێمە ناوی لێ دەنێین سەرانە و ئێوەش چ ناوێکی لێ دەنێن ئەوە ئارەزووی خۆتانە، لەم کاتەدا عەلی پێی فەرموو: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا سەعدی کوڕی مالك ئەم صەدەقەیەی لەسەر چەندقات نەکردوونەتەوە؟ عومەر فەرمووی: بەڵێ، گوێی لێ گرت و بە سەرانە لێیان قایل بوو، ئەوانیش لەسەر ئەمە پاشگەز بوونەوە،[3] و لەم هەواڵە ئێمە پەندێك وەردەگرین لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەوانەی لە دوژمنان خۆیان بە گەورە دەزانن و بە سەربەرزی و لوت بەرزیەوە لەگەڵ موسڵمانان دێنە ئاخاوتن و هەڕەشەی ئەوە دەکەن کە پەنا بۆ وڵاتی کوفر دەبەن، لێرەدا ئەوە بەدی دەکەین کە عومەر بە توند و تیژیەوە و بە ڕقەوە لەگەڵیان قسە دەکات و هەڕەشەی ئەوەیان لێ دەکات ئەگەر هەڵێن بۆ وڵاتانی کوفر ئەوا مامەڵەی ئەو کەسانەیان لەگەڵ دەکات کە لەگەڵیان دەجەنگێ لە دابڕینیان لە منداڵ و خێزانەکانیان، ئەمەش لەسەر ئەوان لە دانی سەرانەزۆر گرانتر و قورسترە، ئەم وەڵامە بەهێزە

---

١ـ أهل الذمة في الحضارة الاسلامية (ص: ٤٣).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ تأريخ الطبري (٥/٣٠) وقد ضعف الدكتور العمري هذه الرواية، أنظر عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٦٧).

هەر لەسەریانداية لە خۆ بەزل زانین و خۆ بە گەورە گرتن لەبەر ئەوە بەساویلکەیی گەڕانەوە بۆ لای ئەمیری باوەڕداران و داوایان لیّ کرد، کە ڕێککەویّ لەسەر وەرگرتنی هەر شتێك کە دەیەوێت بەلاّم ناوی لیّ نەنێت سەرانە، لێرەدا عەلی(ﷺ) دەست وەردەداتە کارەکە، ڕای عەلی لای عومەر شوێنی تایبەتی خۆی هەبووە لەبەر ئەوەی، کە شارەزا بووە لە بنەماکانی ئاین، عەلی ئاماژەی بەوە کرد، کە صەدەقەکەیان چەندقات بکاتەوە هەروەك ئەوەی کە سەعد بە هاوشێوەکانیانی کرد، عومەری ئەمیری باوەڕداران ئەمەی پەسەند کرد لێیان وەك ئولفەت گرتن بۆیان و ڕێگری کردنیان لە هەوڵی پەنا بردن بۆ دەوڵەتی کوفر، ئەم ڕایە پەسەند کرا کاتێك کە شوێنی خۆی گرت، ئەمەش پاش ئەوەی کە عومەر عزەت و خۆبەزل زانینی لیّ داماڵین،ئەگەر ئەمەیان لیّ پەسەند بکرایە لە سەرەتای داخوازیەکەوە ئەوا بە خۆ بەزل زانینی خۆیان دەگەڕانەوە پاش ئەمە پەنایان نابێت کە پەیمان بشکێنن و خراپە لەگەڵ موسڵماناندا بکەن.[1]

لە ڕیوایەتی سەرگوزشتەی هۆزی تەغلوبدا بەوەی کە بانگ کراون بۆ ناو ئیسلام و ئەوان سەرپێچیان کردووە، پاشان بانگ کراون بۆ سەرانە بەلاّم لێی دڵنیا نەبوون، ڕاین هاتۆتە سەر ئەوەی کە هەڵێن بەرەو خاکی ڕۆم، نوعمانی کوڕی زەرعە بە عومەر دەفەرمووێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، هۆزی تەغلوب تیرەیەکی عەرەبن، خۆیان لە سەرانە لادەدەن، ئەوان سامان و داراییان نیە، بەلاّم خاوەن مەزرا و مەڕ و ماڵاتن، ڕقیان لە دوژمنە وە تۆ بە هۆی ئەوانەوە دوژمنی خۆت ڕامەپەڕێنە ،وتی: عومەر لەگەڵیان ڕێککەوت، بەوەی کە صەدەقەی لەسەر چەندقات کردنەوە،[2] پێی فەرموون: ئەمە سەرانەیە و ئێوەش چی ناوی لیّ دەنێن ناوی لیّ بنێن،[3] سەرانی هۆزی تەغەلوب وتیان: ئەگەر وەك سەرانەکەی هۆزی ئەعلەج نەبێت ئەوا ئێمە پێی قایل دەبین و پارێزگاری لە ئاینی خۆمان دەکەین،[4] نهێنی لە پەسەندکرانی چاکەی هۆزی تەغلوب لە لایەن عومەرەوە کە ئایا بە صەدەقە بێتە هەژمار یان سەرانە؟ دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جیاوازی لە ناوهێنانی کارەکە ئاسانکاری تێکراوە و خەلیفە پێی قایل بووە مادەم ئەمە بەرژەوەندی گشتی تێدا بێت، ترسابوو لەوەی کە بەنی تەغلوب بدەنە پاڵ ڕۆمەکان و ئەوەش کە عومەر ئومێدی پێی بوو ئەوە بوو کە ئەوان ببنە هاوکارێك بۆ موسڵمانان لەسەر دوژمنانیان، چونکە ئەوان هۆزێك بوون لە عەرەب و عزەت و لوت بەرزی و پاراستنی ڕێز و کەرامەتی خۆیان هەبووە، ئەوەی کە دەگەڕێتەوە لە دارایی ئەوان بۆ بەیتولماڵ چاکەیەکە بۆ موسڵمانان کارێکی شیاوترە لەسەر خەزێنەی دەوڵەت و باشترە لە هەڵهاتنیان بۆ ناو ڕیزەکانی ڕۆم،[5] ئایا ئەوە

---

١ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٤١-١٤٢).

٢ـ الاموال (٣٧/١) نقلا عن سياسة المال في الاسلام عبدالله جمعان (ص: ٧٢).

٣ـ فتح القدير (٥١٤/١) سياسة المال في الاسلام (ص: ٧٢).

٤ـ فتوح البلدان (ص: ١٨٦) سياسة المال في الاسلام، يعتبركتاب سياسة المال في عهد عمر بن الخطاب للاستاذ عبدالله جمعان السعدى هو العمدة في مبحث المؤسسة المالية فقد تمت بتلحيصه وإضافة بعض الاشياء.

٥ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ٧٢).

خێره یان سەرانە؟ سەرانەیە، لە یەکێك لە پێویستیەکاندا سەرف دەکرێت، لەبەر ئەوەی، کە صەدەقە پێویست ناکرێت بەسەر موسڵمانانداا، لەبەر ئەوەی سەرانە لە ڕوانگەی پارێزگاری لێ کردنەوەیە و هۆزی تەغلوبیش لە ژێر سایەی پارێزگاری کردنی موسڵماناندا بوون، لە هەمان کاتدا دەتوانین بڵێین: ئەمە بە شێوەیەکی گشتی و کردەیی سەرانە نیە، لەبەر ئەوەی کە فەرزکرا بەسەر گاورەکانی هۆزی تەغلوبیدا لە داراییەکان هەر ئەوەیە کە فەرز دەکرێت بەسەر زەکاتدا، هەموو شتێك لەسەر موسڵمانان وەك کشتوکاڵ و بەروبووم و مەڕ و ماڵات و وشکە زەکاتی تێدایە... ئەمە لەسەریان چەندین جارەیە و لە ئافرەتان وەردەگیرێت هەر وەکو چۆن لە پیاوان وەردەگیرێت و لەسەر کەسەکان نیە، ئەمەش پێچەوانەی مانای سەرانەیە بە شێوەیەکی کەلتووری،[1] گرنگ ئەوەیە لە هەردوو حالەتەکەدا بەوەی کە صەدقەیە یان سەرانە بریتیە لە باج و لە ماوەی ملکەچ بوونیان بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی دەرکەوتووە،[2] بە ڕاستی لێرەدا چەند ماف و پابەندیەکی زۆر بۆ عەرەب لەسەر وڵاتە ڕزگارکراوەکان هەبووە جگە لە سەرانە، ئەم مافانەش چەند شێوازێکی لەخۆ گرتووە و لە سەردەمی عومەر دا(ﷺ) بەرەو پێش ڕۆیشتووە، لەم میوانداریەی فەرمانڕەوادا ئەگەر ڕەوەندێك یان پەیامهێن و باڵوێزان و ئەوانەش کە لە موسڵمانان دادەبارێن بەسەر خەڵکی وڵاتدا، ماوەی میوانداری لە سەردەمی خەلافەتی عومەر(ﷺ)دا بە سێ ڕۆژ دیاری کراوەلەوەی کە دەخۆن و دەخۆنەوە، و سپاردەی سەربڕینی مەڕ و مریشك و ئەو شتانەش ناکەن کە لە توانایاندا نیە بۆیان،[3] ئێمە لە ئاخاوتنمان دەربارەی پێشکەوتنی ئاوەدانی لە سەردەمی عومەردا باسی ئەوەمان کرد کە هەندێ لە ڕێککەوتنەکان لە سەردەمی عومەر(ﷺ)دا چاککردنی ڕێگە و بانیشی گرتەوە لەگەڵ بنیات نانی پردو دەستووری سەرانەش لە سەردەمی عومەر(ﷺ) بەرەو پێش چوو، عومەر ئاماری خەڵکی کرد و چین و توێژەکانی دەوڵەمەدان و هەژاران مامناوەندانی لێك جیاکردەوە و زۆرێك لەو مەرج و پابەندیانەی نوێکردەوە کە لە دەقی پەیماننامەکاندا هەبوون و پێشتر نەناسرابوون، ئەمەش بۆ بەرفراوان کردنی ئاوەدانی و پانتایی و دەسەڵاتی لەسەر میسر و شام و عێراق و تێکەڵ بوونی موسڵمانان بە خەڵکی وڵات و گەیشتنیان بە شارستانیەتی هەمیشەیی، لەوەی کە جێنشینی کردن لە سیاسەتی دەوڵەت و کاروباری ئاوەدانی و ئەوەی کە سروشتی پلەداری و گەشەکردن دەیەوێت لەبەر ئەوە ئەوەش کە لە چاکسازی ڕێگەوبان و ئاوەدانی و بنیاتنانی پردی تاقە و ئەو پردانەش کە کۆمەك و هاوکاری وڵاتە شارستانیەکان بوون، کە پێشتر نەبوون و دۆزراونەوە، لێرەدا کاروبارەکان ڕێکخران و وڵاتەکان بەرفراوان بوون و چەند ڕێسایەك لە دەستووری دارایی و چەند شتێکی تر ڕێکخران.[4]

---

١ـ سياسة المال في الاسلام (ص:٧٢)، النظام الاسلامي المقارن (ص: ٣٩).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص:٧٣).
٣ـ الاحكام السلطانية والولايات الدينية (ص: ١٦٤).
٤ـ سياسة المال في الاسلام في عهد عمر بن الخطاب (ص: ١٧٤).

### مەرجەکانی گرێ بەستی سەرانە و کاتی بەجێهێنانی:

شارەزایان لە میانی سەردەمەکانی خەلافەتی ڕاشیدیندا چەند مەرجێکیان هەڵێنجاوە لەوانە:

- باسی قورئان نەکەن بەوەی کە تەشەری تێدابێت و لادانی تێدا بکرێت.
- باسی پێغەمبەر(ρ) نەکەن بە بەدرۆخستنەوە.
- باسی ئاینی پیرۆزی ئیسلام نەکەن بە بەدگۆیی بۆی و بەوەی کە پلارگرتنی تێدابێت.
- ئافرەتێکی موسڵمان دوچار نەکەن بە داوێن پیسی ،بە ناوی هاوسەرگیریەوە نەبێت.
- هیچ موسڵمانێك لەسەر ئاینەکەی دوچاری فیتنەیی نەکەن، پەلاماری سامان و ئاینی نەدەن.
- خەڵکانی شەڕفرۆش دیاری نەکەن و دەوڵەمەندانیان خۆش نەوێت.[1]

بەڵام کاتی بەجێهێنانی، عومەر(ﷺ) کاتی بەجێهێنانی سەرانەی کۆتایی ساڵی دانا و مەبەستی ئێمەش پێی کۆتایی ساڵی کشتوکاڵیە، ئەم گۆڕانکاریەش لە کاتی بەجێهێنانی سەرانە لە سەردەمی عومەر(ﷺ)دا دەگەڕێتەوە بۆ حالەتی سەقامگیری، سەقامگیریش بانگەشە بۆ ڕێکخستن و دامەزراندنی ئەو کاتە گونجاوانە بینی بۆ دەوڵەت و پێ سپێردراوان بە دانی سەرانە، هەروەك ئەوەی کە بەرهەم هێنانی کاتی هاتنی دەغڵ و دانە —ئەمەش ئەوەیە کە مێژوونوسان بە کۆتایی ساڵی لە قەڵەم دەدەن، تێیدا پاڵ پێوەنانی دژواری تێدایە و ئاسانکاریەکە لەسەر پێ سپێردراوان و حەوانەوەیەکە بۆ ئەوانەی کە سەرانە دەدەن.[2]

### ٣- باج:

باج دوو واتای هەیە: مانا گشتیەکەی بریتیە لە هەموو ئەو داهاتانەی کە دەگاتە بیت المال جگە لە خێرات، ئەمەش دەڕواتە ناو مانای گشتی بۆ سابات و داهاتی سەرانە و دەیەك و چەند شتێکی تر، مانایەکی تایبەتی هەیە: کە بریتیە لە داهاتی ئەو زەویانەی کە موسڵمانان ڕزگاریان کردووە و پێشەوا ڕایگرتووە بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان .

هەر ئەوەی کە عومەر بە زەویە بە پیت و فەڕەکانی عێراق و شامی کرد،[3] باج هەروەك ئەوەی کە إبن ڕەجەبی حەنبەلی دەفەرمووێت: ناپێورێ نە بە کرێ و نە بە نرخ، بەڵکو بنەمایەکی چەسپاوە بە خۆی و بە شتێکی تر ناپێورێت.[4]

کاتێك کە هێز و توانای ئیسلام بە پاکسازیەکان گەورە بوو بە تایبەتی و پاش زاڵ بوون بەسەر هەردوو هێزە گەورەکەی ڕۆم و فارس، داهاتەکانی دارایی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا فرە بوو و خەرجیەکانی زیادی کرد، بۆ بازرگانی کردن لەسەر کیانی ئەم دەوڵەتانەی کە ڕزیوە و سەرفرازی و دەسەڵاتی بپارێزن، زامنی بەرژەوەندیە گشتیەکانە، بە تایبەتیش ئەوەیە کە لە سیاسەتی دارایی و

---

١ـ سياسة المال في عهد عمر (ص: ٧٦).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٦٧).
٣ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٤-٢٥)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢١٥).
٤ـ الاستخراج لأحكام الخراج (ص: ٤٠)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢١٥).

ژیرانە و دانایانە عومەر(ﷺ) بیری لێ کردبێتەوە، ئاگادار بە ئەمە بریتیە لە دۆزینەوەی داهاتی دارایی چەسپاو و هەمیشەیی بۆ هەستان بەم کارە گرنگە، ئەم داهاتەش بریتیە لە: باج و ڕزگاریخوازانیش ئەوەیان ویستووە کە غەنیمەتەکانیان لەو ماڵ و ئەو زەویانە دابەش بکرێت بەسەردا بەو شێوەیەی کە لە قورئانی پیرۆزدا و تایبەت بە غەنیمەت هاتووە کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾﴾ (الانفال: ٤١).

عومەر لە سەرەتای کارەکەدا نیازی دابەش کردنی زەویەکانی کرد بەسەر ڕزگاریخوازاندا، بەلام عەلی دابەش نەکردنی پێ باش بوو، موعازی کوڕی جەبەلیش هەمان ڕای عەلی هەبوو بۆیە عومەر هۆشیاری لەمە دا،[1] ئەبو عوبەیدە ڕیوایەتی کردووە و دەفەرموێت: چەند باج وەرگرێك هاتنە لای عومەر کە ویستی زەوی لە نێوان موسڵمانان دابەش بکات، موعاز فەرمووی: سوێند بە خوا ئەمە لەو کارە دەبێت کە قێزەونە، ئەگەر تۆ ئەم زەویانەت دابەش کرد ئەوا دەبێتە سوودێکی گەورە لە نێو چنگی ئەو کۆمەڵە و پاشان دەست پێشخەری دەکەن و ئەمەش بەرەو دروست بوونی پیاوێك یان ئافرەتێك هەنگاو هەڵدەگرێت و پاش ئەوانیش کۆمەڵێك دێن کە دەرگا لە ئیسلام دادەخەن، ئەوان هیچ شتێکیان نیە کارێکی وا بکە یەکەمین و کۆتایان بەختەوەر دەکات،[2] موعازی کوڕی جەبەل(ﷺ) عومەری(ﷺ)وەئاگا هێنایەوە بۆ کارێکی گەورە و گرنگ، وای لە عومەر کرد کە شوێن پێی ئایەتەکانی قورئان هەڵبگرێت، وای لێ بکات کە بیریار بێت لە بنەمای هەموو وشەیەك کە دەیخوێنێتەوە هەتا لە ئایەتەکانی دابەشکردنی دەسکەوتەکان و ساباتەکانی سورەتی (الحشر) وەستا وە بۆی دەرکەوت کە ئەمە ئاماژە بە دەسکەوتی موسڵمانان دەکات، لە ئێستادا، بۆ کەسێکیش لە دواترو لە دوای ئەوان دێ، عومەر سوور بوو لەسەر ڕاپەڕاندنی ڕاکەی موعاز(ﷺ)، ئەم هەواڵە بڵاوبوویەوە لە نێوان خەڵکیدا و ناکۆکیەك لە نێوان یاراندا (خوایان لێ ڕازی بێت) ڕوویدا، عومەر و لایەنگرانی بە باشیان نەدەزانی کە زەویە ڕزگارکراوەکان دابەش بکرێن، بەڵام هەندێ لە یاران کە بلال کوڕە ڕەباح و زوبێری کوڕی عەوامیان تێدا بوو دابەش کردنی زەویەکانیان بە باش دەزانی، هەر بەو شێوەیەی کە غەنیمەتی جەنگ دابەش دەکرێت، هەروەك ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) غەنیمەتەکانی خەیبەری دابەش کرد، بەڵام عومەر نکۆڵی لەم دابەش کردنە کرد و پێنج ئایەتی سورەتی (الحشر)ی بەسەردا خوێندن کە خوای گەورە تیایاندا دەفەرموێت:

﴿وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَـٰكِنَّ

---

١ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٠٣).

٢ـ الاموال لأبي عبيدة (ص: ٧٥)، سياسة المال (ص: ١٠٣).

ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ﴾ (الحشر: ٦-٨).

پاشان قایل نەبوو هەتا کەسانێکی تر تێکەڵیان بوو پاشان فەرمووی: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ (الانفال: ٩).

ئەمە تایبەت بووە بە ئەنصاریەکانەوە وە پاشان قایل نەبوون هەتا کەسانی تریان تێکەڵ بوو، عومەر فەرمووی: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَا تَجْعَلْ فِى قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (الحشر: ١٠).

ئەمەش هەمە لایەنە بوو بۆ ئەوانەی کە دوای ئەوان هاتن کەسێك نەمایەوە لە موسڵمانان کە لەو دەسکەوتە بەشی نەبێت، عومەر فەرمووی ئەگەر مایت ئاگاداری شوانێك لە صەنعا بکە کە لەم دەسکەوتە بەشی هەیە و خوێی لە ڕوویدایە،[١] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر تیایدا دەفەرمووێت: بە لای کەسانێکەوە لە موسڵمانان چۆنە کە ئەم زەویە دەبیین، خوانەناسی دابەش کراوەو لە باوباپیرانەوە بۆتە میرات و دەست کەوت، بە ڕای من ئەمە چی بێت، عبدالرحمن کوڕی عەوف وتی: ڕات چیە؟ نە زەوی و نە گوێدرێژی دەبێت جگە لەو دەست کەوتانەی کە خوای گەورە پێی داون، عومەر فەرمووی: هیچ شتێك نیە جگە لەوەی کە تۆ دەیڵێیت و من ئەوە بەدی ناکەم، سوێند بە خوا لە پاش من شارێك یان ولاتێك ئازاد ناکرێت کە گەورەیەکی بە ئاوات گەیشتووی تێدا بێت بەڵکو دەبێتە گێچەڵ بەسەر موسڵمانانەوە، ئەگەر زەوی عێراق بە گوێدرێژەکانیەوە دابەش بکرێت ، زەوی شامیش بە هەمان شێوە ئەوا ئەمە چ دەروازەیەکی پێ دەگیرێت؟ وە بۆ منداڵان و بێوەژنانی ئەم وڵاتەو

١ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٦٧)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢١٧).

ئەوانی ترش هیچ بەشێك لە زەوی عێراق و شامیان بۆ نابێت؟ زیادەڕەویان لەگەڵ عومەر کرد و وتیان: ئەو دەست کەوتانەمان ڕادەگری کە خوای گەورە بە هۆی شمشێرەکانمانەوە پێی داوین و دەدەیتە کەسانێك کە ئامادە نەبوون و ئەمەیان نەبینیووە، عومەر(ﷺ) تەنها ئەوەندەی فەرموو کە: ئەوە ڕای خۆمە، وتیان ڕاوێژ بکە، ئەو دەمە عومەرناردی بەدوای دە کەس لە سەرانی هۆزی ئەوس و خەزرەج و پیاو ماقولان لە ئەنصار و وتارێکی بۆ دان، پێی فەرموون: منیش یەکێکم وەك ئێوە، ئێوە ئەمڕۆ دان بە هەق و ڕاستی دادەنێن هەر کەس کە ناکۆك بوون لەگەڵم و کەسانێکیش لەگەڵ ڕای مندان، من نامەوێت ئێوە شوێنی ئەوە بکەون کە راو بۆچوونی تەنها منە ، پاشان فەرمووی: ئێوە گوێتان لە قسەکانی ئەو کەسانە بوو کە وا دەزانن من لە مافی خۆیان ستەمیان لێ دەکەم، بەڵام من بینیم کە لە پاش زەویەکانی کیسرا هیچ شتێك نەماوە کە ئازاد بکرێت، خوای گەورە غەنیمەتی ئێمەی داوە بە سەروەت و سامان زەوی و زار و گوێ درێژەکانیان، من ئەو غەنیمەتانەم دابەش کرد لە نێوان خاوەنەکەیدا، پێنج یەکم دەرکرد و ڕووم کردە ڕووی ئەو، بە باشم زانی کە زەوی بە گوێ درێژەکانیەوە بەند بکەم باجیان لەسەر دانێم و سەرانەش بخەمە گەردنیان ئەمەش دەبێتە دەست کەوتێك بۆ موسڵمانانی جەنگاوەر و منالانیش، بۆ ئەوانەش کە لە دوای ئەوان دێن، ئایا ئێوە ئەم دەروازەانەتان بینی دەی خۆ دەبێت کە پیاوانێك هەبن کە پابەند بن پێیانەوە ئەی ئەو شارە گەورانەتان بینی دەی خۆ دەبێت باربکرێت بە سوپا، خۆ دەبێت بەخشش دابەش بکرێت بە سەریاندا ئەی ئەگەر ئەو زەوی و گوێ درێژانە دابەش بکرێن لە کوێوە هاوکاری ئەوان بکرێت؟ هەمووان وتیان: ڕا و بۆچوونی تۆیە و باشترین شت ئەوەیە، کە تۆ وتوتە و دیوتە، ئەگەر ئەو دەروازەانە بار نەکرێن و ئەو شارانە پڕ نەکرێن لە پیاوی قارەمان و ئەوەش بە سەریاندا تێپەڕێت کە خۆیانی لێ دەپارێزن ئەوا خەڵکانی بێباوەڕ دەگەڕێنەوە بۆ شارەکانیان،[1] عومەر لەوەی کە فەرمووی: ئەگەر دابەشم بکردایە لە نێوانیاندا ئەوا دەوڵەت لە نێو چنگی دەوڵەمەندەکانتاندا دەبوو، بۆ ئەو موسڵمانانەی، کە لە دوای ئەوان دێن هیچ شتێك نەدەمایەوە، و خوای گەورەش ڕاستی و هەقی تێدا فەرمووە، کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ﴾ (الحشر: ١٠).

پاشان ئایەتەکە خەڵکی تا ڕۆژی دوایی پەندیان لێ وەرگرت، پاش ئەوە ڕای عومەر گەورە یاران (خوایان لێ ڕازی بێت) لەسەر دابەش نەکردنی ئەو زەویانە جێگیر بوو،[2] لە گفت و گۆی عومەر لەگەڵ یاراندا شێوازی عومەر لە گفت و گۆدا دەردەکەوێتن وە چۆن هێزی بەڵگەی تیادا کۆکردۆتەوە لەگەڵ جوانی وێنە و نیگاکان و دڵدانەوەی کێبڕکێ کارانی تێدایە، لە قسەکانیدا بۆ ئەنصاریەکان، لە کاتی تاوتوێ کردنی کێشەی زەویە بە پێت و فەرداراەکاندا، ئەگەر عومەر سەرکردەیەکی تازە پێگەیشتوو بوایە لە سیاسەتدا ئەوا چارەساز دەبوو بە شێوازەکانی وتاری پەرلەمانی ئەگەر

---

١ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٧٦)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢١٧).
٢ـ سياسة المال في الاسلام في عهد عمر بن الخطاب (ص: ١٠٥).

بیوبیستایە وتار بۆ نوێنەرەکانی بدات (هەتا هەڵوێستیان بە دەست بهێنێت) لەسەر پرۆژەیەك لەو پرۆژانەی، کە عومەر لەو دەروازەوە بە بێداری نەیهێناویەتی یان سەرسامتر بووە لەو شێوازە، عومەر لە سەروو ئەمەوە بەوە جیادەکرایەوە کە ڕاستگۆ بووە لەو شتانەی کە وتوویەتی، کەسێکی سیاسەت مەدار و تەڵەکەباز نەبووە و ئەمە لە شێوازێکی ڕووندا هێناویەتی کە ناوزەد دەکرێت بە لێکچوون و نموونە هێنانەوە.[1]

## ئایا عومەر دژ بە ڕای پێغەمبەر(ﷺ) بووە لە حوکمی زەویە باجدارەکان؟:

هەرکەس وتی: عومەر دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ)ی کردووە بە کردەیی خۆی لە دابەش نەکردنی ئەو زەویانەی باجیان لەسەر دانراوە، لە بەرئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ)زەویەکانی خەیبەری دابەش کردووە و، وتی: ئەگەر پێشەوا زەویەکی، ڕزگار کراوی بە زۆر بەندکرد ئەوا حوکمەکەی ناتەواوەو دژی سوننەتە، ئەم قسەیە هەڵەیە و بوێریەکە لەسەر خەلیفەکانی ڕاشیدین-کەر ئەم کارەیان کرد-وە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی لە خەیبەردا کردبێ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم کارە گونجاوە نەك پێویست، ئەگەر ئێمە بەڵگەیەکمان نەبێ بۆ پێویستی (واجب) ئەو کارە، ئەوا کردەی خەلیفەکانی ڕاشیدین عومەرو عوسمان و عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت) بەڵگەیە لەسەر ناپێویستی، ئەی چۆن سەلمێنراوە کە ڕزگارکردنی مەککە بە زۆر بووە هەروەك ئەوەی کە فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ورووژاندوویەتی بەڵکو ئەمە لای خەڵکی بە مەبەست و ڕۆیشتوو گرژ بووە؟ وا هاتە پێشی کاتێك قورەیش پەیمانی شکاند و دابەزیە ڕێڕەوی (الظهران) وە کەسێك نەهات کە لەگەڵیدا ڕێك بکەوێت و کەسێکی نەنارد هەتا لەگەڵیان ڕێك بکەوێت، بەڵکو ئەبو سوفیان بۆ سیخوڕی کردنی هەواڵەکان دەرچوو وە عەباس بینی و وەك دیلێك بردیە پێشەوە وە بە مەبەستی ئەوە بوو کە عەباس پارێزەری ژیانی بێت و ئەویش پاراستی، پاشان ئەبو سوفیان موسڵمان بوو وە بوویە یەکێك لە موسڵمانان، چۆن پێشبینی دەکرێت کە گرێبەستی ئاشتی لەگەڵ کافراندا بکرێت – پاش موسڵمان بوونی – بەبێ مۆڵەتێك لەوان، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) سەقامگیری بەند کرد بە چەند هۆکارێکەوە کە دەفەرموێت: ((هەر کەس بڕواتە ماڵی ئەبو سوفیان ژیانی پارێزراوە، هەر کەس بڕواتە مزگەوتەوە ژیانی پارێزراوە وە هەر کەس دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی داخات ژیانی پارێزراوە))،[2] پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ژیانی ئەو کەسەی پاراست کە لەگەڵی ناجەنگێت، ئەگەر ئەوان پەیماندەر بوونایە پێویستیان بەمە نەدەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) هاوکاری کردن بە ئازادی، لەبەر ئەوەی کە وەك سومامەی کوڕی ئسال و ئەوانی تریش لە دیلی ڕزگاری کردن، هەروەها ئەو مۆڵەتەی دا بە کوشتنی کۆمەڵێك لە ژنان و پیاوانیان، و هەروەها ئەمە لە (صحاح) دا هاتوە کە لە وتارەکەیدا دەفەرموویەتی: (بە ڕاستی مەککە بۆ کەسێکی پێش من شیاو نەبووە و شیاویش نابێت بۆ کەسێکی

---

١ـ أخبار عمر (ص: ٢١٠).
٢ـ مسلم (رقم: ١٧٨٠).

دوای من، بەڵکو بۆ من یەك سات شیاو بوو)،[1] پێغەمبەر(ﷺ) چوویە مەککە و لێبووردەیی بە سەریەوە بووە بە ئیحرامەوە نەچووە ناوی، ئەگەر لەگەڵی ڕێك بکەوتنایە ئەوا هیچ شتێکی بۆ شیاو و گونجاو نەبوو، هەروەك ئەوەی شارێك لە شارەکانی شیاو ڕێك کەوتووە و هیچ شتێك شیاو نەبووە ئەی چۆن شاری بەڕێز و پیرۆز و خەڵکە سەلامەتدارەکەی کە ڕێککەوتنێکیان هەیە لەگەڵیدا حەلاڵ دەبێت؟ هەورەها ئەوانی لەگەڵ خالید جەنگان و ژمارەیەك لە موسڵمانان و بێباوەڕان کوژران پێکەوە، کەوتە چارەسازی شوێنەوارە گوێزراوەکان ، لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەر(ﷺ) زەویەکانی دابەش نەکرد هەروەك ئەوەی پیاوەکانیشی نەکردە بەندە و کۆیلە، خەیبەری بەزۆر ڕزگار کرد و زەویەکانی دابەش کرد، مەکەی ئازاد کرد و دابەشی نەکرد، کەواتە هەردوو کارەکە ڕەوان ،[2] بەمەش عومەری فاروق دژ بە ڕێنماییەکانی پێغەمبەرایەتی نەبووە لە دابەش نەکردنی زەویە ڕزگارکراوەکان وە پاڵپشتی— لەوەی کە کردی— چەند کارێك بوو:

١- ئایەتی دەست کەوت لە سورەتی (الحشر).

٢- کاری پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك مەککەی بەزۆر ئازاد کرد و لێی گەڕا بۆخەڵکەکەی و باجی نەخستە سەر.

٣- بڕیاری دەستەی ڕاوێژ، کە عومەر بەستی بۆ ئەم گرفتە لە دوای گفت و گۆ و تاوتوێکردن، ئەمەش بوویە سونەتێکی شوێن پێ هەڵگیراو لە زەویەکدا، کە موسڵمانانی تێدا دەرکەوت و خەڵکەکەی بڕیاری لەسەر دەدەن، بەمەش دەردەکەوێت کە عومەر کاتێك جیاوازی بینی لە نێوان غەنیمەتە ڕاگواستراوەکان و لە نێوان زەویەکان ئەو لەمە پابەند بوو بە بەڵگەی دەقەکانەوە. وە نێوانیانی کۆکردەوە و هەر یەکەیانی لەو شوێنەیدا دانا کە سەرنجێکی کۆکراوەی پتەو ڕابەری بکات، لەگەڵ ئەمەشدا عومەر مەبەستی بوو کە داهاتەکان بۆ خەڵکی وڵات بهێنێتەوە و سەربازانی ئیسلام دوور بخاتەوە لە فیتنەی یەکتر داماڵین لەسەر زەوی و خانوبەرە، دووریان بخاتەوە لە فیتنەی وازهێنان و سەرقاڵ بوون بە دەوڵەمەندی و سامانداری و ماڵ و دارایی.[3]

عومەری فاروق(ﷺ) پەنای بۆ قورئانی پیرۆز دەبرد و چارەسەری شیاوی لێ دەست دەکەوت و لە نێو ئایەتەکانیا،وە قووڵ دەبوویەوە بە نێو مەنتیق و ماناکانیدا و هەندێکیانی کۆدەکردەوە و هەندێکیانی تایبەت دەکرد بە هەنیدێکی تریانەوە هەتا دەگەیشتە ئەنجامێك کە بەرژەوەندی خوازراوی تێدا دەستەبەر دەبوو، گیانی شەریعەتێکی ناوەستاوی لەگەڵ دیاردەی دەقەکان هەڵدەلوشی فریای دەخست لە بڕینی ئەم قۆناغانە و بە هەستی وریینی بۆ مەبەستەکانی شەریعەت بە پێکانی دەقەکان، کە ئەمەش کارێکی ئاوێتەو ئاڵۆزە و ڕۆچوون تیایدا باش نیە مەگەر لە دەستپێکردن لەسەر هەوڵدان و بەخشینی تێگەیشتنێکی پتەو و بوێرانە لەسەر بەرەوپێش چوون بە جۆرێك ئەو بۆ پێشەوە چوونە

---

١ـ النسائي في الكبرى في الحج (٣٨/٢) الفتاوى (٣١٢/٢٠).
٢ـ الفتاوى (٣١٢/٢٠-٣١٣).
٣ـ الاجتهاد في فقه الاسلامي (ص: ١٣١).

کارێکی باش بێت، تەنانەت بۆ هەندێك بۆتە ئەندێشە، کە عومەر هەندێ جار بە دەقەکان دەیدا لەسنورەکان، ئەمەش بە دوورە لەوەی کە عومەر(ﷺ) کارێکی وا بکات بەڵام ئەمە هەوڵدانێکی نایاب بوو هەستیارێکی یاساداناني لێ بەدەست هێنا کە بەرامبەر نابێت هەتا ڕادەیەك بەدی دەکات و قورئانیش لەسەر ڕای عومەر کۆك بووە، ئەو ئەنجامەش کە تیایدا دەری دەکەین لەم کێشەیەدا ئەوەیە کە قورئان هەر خۆی ڕاڤەی ئەوی تری دەکات، لە سونەتیشدا بە هەمان شێوەیە، لەسەر کۆششکارەکەش ئەوەیە بگەڕێت بە دووی حوکمێکی شەرعی وادا کە هەموو ئەو دەقانە بخاتە پێش چاو کە هاوکاری دەکات لەسەر چارەسەر کردن لەگەڵ کورت هێنان لەسەر هەندێکی تری، ئەگەرنا بە کەم تەرخەم لە هەوڵەکەیدا دێتە هەژمار، ئەوەش کە پێی دەگات بێ هودەیە.[١]

## - ڕاپەڕاندنی پڕۆژەی باج چۆن لەسەردەمی عومەردا تەواوکاری بۆ کرا :

کاتێك گەورە یاران و پیاوانی خاوەن ئەهلی حەلو عەقد گەیشتنە ئەوەی کە بڕیاردان ڕای خەلیفە عومەرە(ﷺ) بە بەندکردنی زەویەکان لەسەر خاوەنەکانیان وە دابەشکردنی سامانە گواستراوەکان لەسەر ئازادی خوازان بۆ ئەم کارە دوو کەسایەتی گەورەی کردە چاودێر ئەوانیش عوسمانی کوڕی حونەیف، حوزەیفەی کوڕی یەمان بوون ئەمەش بۆ ڕووپێوی زەویە بەپیتەکانی عێراق بوو، کاتێك عومەر ئەمانەی نارد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە گرنگە چەندین ئامۆژگاری ڕێنموونی کاریگەری پێدان، فەرمانی پێدان، کە تێبینی داهاتی تاکە کەس بکەن، ئاگایان لە بەپیتی و وشکی زەوی و جۆری ڕووەك و دارودرەخت و بەزەیی بێت بە خەڵکەکەدا، ئەوەی کە پێ سپێردراوان بەرگەی دەگرن زەوی هەڵی ناگرێت، بەڵکو ئەوەیان بۆ جێ دێڵێت کە بە نوێنەران و پێداویستیەکان فشار لەسەر بخرێن، بۆ ئەوەی کە بڕیاری عومەر لەسەر بنەمایەکی دروست دەربچێت، ئارەزووی ئەوەی کرد کە بارودۆخی خەڵکی عێراق لە پێش ڕزگارکردنیان بزانێت، داوای لە عوسمان و حوزەیفە کرد کە چەند گەورە پیاوێکی ئەو ناوچەیەی بۆ ڕەوانە بکەن، ئەوانیش چەند کەسێکیان لە سەرۆك هۆزەکان نارد، عومەر پرسیاری لێ کردن: ئێوە چەندتان دەدا بەعەجەمەکان لەسەر زەویەکەیان؟ وتیان: هەژدە درهەم، عومەر(ﷺ) فەرمووی: من بەوە قایل نابم لێتان،[٢] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕزگاریخوازی ئیسلامی لەسەر ئەو کەسانەی کە وڵاتەکەیان ئازاد کراوەن وە عومەر ئەوەی دەبینی کە سەپاندنی باج لەسەر ڕوپێوی زەوی باشترە بۆ خەڵکی باجدەر و چاکترین وەڵامدانەوە و زۆرە لە دەست کەوت بێ ئەوەی کە بارگرانیان بکات بە شتێك کە توانایان نەبێت لەسەری، پاشان عوسمانی کوڕی حونەیف و حوزەیفەی کوڕی یەمان هەستان بە ڕاپەڕاندنی ئەو کارەی کە پێیان سپێردرابوو بە باشترین شێوە و ڕووبەری ئەو زەویانەش گەیشتە (٣٦٠٠٠٠٠) سی و شەش ملیۆن،[٣] وە لەسەر باخداری ترێ دە درهەم و لەسەر باخدرای خورما هەشت درهەم و لەسەر باخداری قامیش و زەل شەش درهەم و لەسەر

---

١ـ الاجتهاد في فقه الاسلامي (ص: ١٣١-١٣٢).
٢ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٤٠-٤١).
٣ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٣٨).

کشتوکاڵی گەنم چوار درهەم و لەسەر جۆش دوو درهەمیان دانا،[١] نامەیەکیان بەم شێوەیە نووسی بۆ عومەرو ئەویش واژووی کرد، عومەر سوور بوو لەسەر باجدان بە چاودێری کردنی خاوەنی ئەو زەوی و وڵاتە، ئەوەی دادپەروەری فەراهەم دێنێ و دەستەبەری بکات لە ترسی ئەوەی کە عوسمان و حوزەیفە بارێکیان دابێت بەسەر شانی خەڵکی و ئەو زەویانەدا کە نەتوانن لە باج بەجێی بهێنن بۆیە لێی پرسین: چۆن باجتان لەسەر زەویەکان داناوە ڕەنگە ئەوەتان بە خاوەن کارەکانتان سپاردبێت، کە پێیان جێبەجێ نەکرێت؟ حوزەیفە فەرمووی: من لە کارساز گەراوم، عوسمانیش فەرمووی: من لە چینی لاواز گەراوم، ئەگەر بتەوێ لێیان وەردەگری عومەر(ﷺ) فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر بێوەژنانی خەڵکی عێراق مانەوە لێیان دەگەرێم کە هەژار نەکەون و لە دوای خۆم پێویستیان بە هاوکاری هیچ ئەمیرێکی تر نەبێت.[٢]

ئەم ڕێگەیەی، کە ڕاپەڕێنرا لە زەویە بەپیتەکانی عێراق هەر هەمان ڕێگە بوو، کە لەسەر زەوی و زارەکانی میسر بەجێ هێنرا، بەڵام ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی دەکرد عەمری کوڕی عاص بووە ئەو یەکەیە ڕوپێویەی کە باجی لەسەر پەیوەست کرا جووت بوو،[٣] هەروەها عومەر(ﷺ) ئەوەی کە بە زەوی عێراقی کرد بە زەوی شامیشی کرد وە مێژوو نووسان باسی زانیاریە ڕاشکاوە ڕوونەکانیان نەکردووە دەربارەی ڕووبەرو جۆری کشتوکاڵ و ئەو بەروبوومانەی کە باجی لەسەر دانراوە، کێ هەستاوە بەڕووپێوی زەویەکانی شام،[٤] هەروەها خەلیفە عومەر(ﷺ) بەم ئارەزووەیەوە هەستاوە بەکاری ئامارێکی ورد بۆ سامانی ولایەت و پێشی ئەوەی کە ولایەت بێ لەسەری، پاشان والیەکانی پابەند دەکرد کە لەکاتی وازهێنان لەکارەکانیان هەندێك لەو ماڵانەیان دەست بەسەردا بگیرێت، کە لە کاتی والیەتیدا بۆخۆیان کۆکردۆتەوە،[٥] ئەگەر دەرکەوت، کە بەخشینەکانیان ڕێگە نادات پێیان بەپاشەکەوت کردنی ئەم تایبەتمەندیەی بۆدەوڵەت، کە عومەر پاکی کردۆتەوە بۆبەیتولمال لەعێراق و شام و میسر، ئەم موڵکانەش ڕۆشنایی داهاتێکی گەورە و فەراهەم دەبێت لەسەر خەزێنەی دەوڵەت، بە تایبەتی لە میسر بۆ بەرفراوان کردنی ئەو زەویە کشتوکاڵیانەی کە موڵکی پادشاکان بوون لە چاخە کۆنەکاندا.[٦]

## - بەها و بەرژەوەندی ئەمنی چیە لە دابەش نەکردنی زەویە باجدارەکاندا:

کۆمەڵێك بەرژەوەندی ئەمنی هەیە کە عومەرو ئەوانەش کە لەسەر ڕا و بۆچوونەکەی بوون خۆیان داوەتە پاڵ — لە وەرگرتنی ئەم بڕیارەدا دەتوانم پۆلێنی بکەم بۆ دوو بەش:

یەکەمیان: بەرژەوەندی ناوەکی و گرینگترینیان داخستنی ڕێگە بوو لەسەر دووبەرەکی و جەنگی نێوان موسڵمانان و زامنی فەراهەم هێنانی سەرچاوە نەگۆڕەکان بۆ بژێوی وڵات و خەڵکی، فەراهەم

---

١ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٣٩)، سياسة المال في الاسلام (ص: ١٠٨).
٢ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٤٠)، سياسة المال في الاسلام (ص: ١٠٨).
٣ـ الدولة العباسية للخضيري (ص: ١٤٤)، سياسة المال (ص: ١٠٩).
٤ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١١١).
٥ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١١٤).
٦ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١١٨).

هێنانی پێویستیە مادیەکان بۆ نەوەی داهاتوو لە موسڵمانان.

دووەمیان: بەرژەوەندی دەرەکیە کە گرنگترینیان لە فەراهەم هێنانی ئەو شتانەدا خۆی دەبینێتەوە، کە دەروازەی نێوان موسڵمانان دادەخات، پێویستی خۆی لە پیاوان و کۆمەکیەکان دادەخات، بە توانا دەبێت لەسەر ئامادەکردنی سوپا بەوەی کە ئەمە پابەنبینی دەکات لە زامن کردنی موچەو بەخشینەکان و بێ سنوور کردنی خەرجکردن لەسەر کەرەستە و چەك و تەقەمەنی و لێگەران لەهەندێ لایەن بۆ بەرێکردنی کاری گرنگی بەرگری لەسنووری دەوڵەت و زەویەکانی بە پشت بەستن بەو باجەی، کە هەیەتی، ئەوەی کە پێویستە تێبینی بکرێت لەم بەرژەوەندیانەدا ئەوەیە کە خەلیفە بە نیاز بووە بەبڕیارەکانی چەند هۆکارێکی نەگۆڕ دابنێت بۆپاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگە کە تەنها بۆسەردەمەکەی خۆی نەبێت، بەڵکو بۆئەو سەردەم و چاخانەش بێت کە بە دوایدا دێ و ئەمەش هەندێك لە دەربڕینەکانیەتی وەك (ئەی چۆنە بەو کەسانەی کە لە موسڵمانان دێن)، ( پێم ناخۆش بوو کە موسڵمانان واز لێ بهێنرێن) کە بە دیدی داهاتووانەی خۆی ئیلهامێك بۆ ئەم سەقامگیریە هەمە لایەنە دەکات کە شاهێدی لەسەر ئەوە دەدات. وە پێشکەوتنی ڕووداوە سیاسیەکان لە سەردەمی خەلیفەی دووەمدا ڕاستی و دروستی ئەو بڕیارانەی سەلماندووە کە دەری کردوون.

هەروەها فرە پێشکەوتوویی وەرگرتنی بڕیاردان بە دابەش نەکردنی ئەو زەویانە جەخت لەسەر دوو کار دەکاتەوە.

یەکەمیان: هەندێ لەو بڕیارانەی کە گرنگن و لە بەرژەوەندیە ڕووکاریەکانی موسڵمانان دەدەن پێویستیان بە هەوڵێکی زۆر و کاتێکی زیاتر دەبێت، هەروەك ئەوەی کە پێویستی بە هێمنی دەبێت لە ئاڵوگۆڕکردنی بەڵگە و سەلماندنەکان، لەگەڵ ئەوەی کە ئەمە بوارێك دەکاتەوە بۆ ناکۆکی و قووڵ بوونەوەی ئارەزووی بەشەکان لە هەندێ جاردا وە یان دەرگایەك لە هەندێ بەرژەوەندی تایبەت بە ئاسایشی ئومەت لە ئێستا و داهاتوویدا دادەخات.

دووەمیان: هەندێ بڕیاری گرنگ کە دوای گفت و گۆ و لێدوانەکان دێنە دەرەوە، سەرەتا بۆی دژوارە، و ئەوە لەسەر فەرمانڕەوای شەرعی فەرز دەکات کە یەکەم موسڵمان و دواینیان بێت بە هەوڵدان لە پێناوی کۆششێك بۆ تەسك کردنەوەی ئارەزووەکانی خەلافەت نزیك خەرەوە بێت لە نێوان و ڕاو بۆچوونە دژ بەیەکەکان هەتا موسڵمانان بگەیەنێتە حوکمێکی شەرعی لەوەی کە ئەو ناکۆکە بە کاروباری.[1]

- بە ڕاستی ئاڵوگۆڕی ڕاوبۆچوون لە نێوان خەلیفە و ئەو یارانەی کە کۆك نەبوون لەسەر ڕاکەی و بە پاڵپشتی هەمووان لەمەدا بۆ چەند دەقێکی قورئانی لە هەوڵدان دەیسەلمێنێت کە فەرمانڕەوا لە دەست پێشخەری بۆچوونی لەو بڕیارە سیاسیە گشتیانەی کە لە بەرژەوەندی موسڵمانان دەدات بە شێوەیەکی تایبەتی و ڕاستەوخۆ، کە بریتیە لە هێنانی ڕا و بۆچوونە پاڵپشت کراوەکان بۆ دەقە دابەزیوەکان، یان دەکرێت لە چەند دەقێکی جودا بکاتەوە دەربارەی چەند سەرچاوەیەکی تر کە لە

---

١ـ الابعاد السياسية لمفهتم الأمن في الاسلام، مصطفى منجود (ص: ٣١٧-٣١٨).

حوکمەکانی سەبارەت بە پێکهاتە و بیانووەکانی دەرنەچێت.

- هەروەها پەنابردنی خەلیفە بۆ ڕاوێژکردن بە خەڵکی پێشینە لە گەورە یارانی زانا لە فیقهی حوکم و سەرچاوەکانی شەرع، و بە دڵسۆزی بە دەمەوەچوونیان ئامۆژگاریەکە بۆی، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە خەڵکانی خاوەن ڕاوێژ چەند تایبەتمەندیەکی تایبەتیان هەیە کە پێی جیادەکرێنەوە لە خەڵکانی تر، ئەوانەی کە ڕاوێژیان پێ دەکرێت هەر ئەوانەن کە خەڵکانی شارەزا و تێگەیشتوو لە خواترس و زانان، و لە ڕۆڵی خۆشیان تێگەیشتوون، ئەوانە بە دەستەواژەیەکی وردتر ئەو کەسانەن کە تەڵەکە لە ڕاکانیاندا نیە، لە داب و نەریتیاندا خۆ جێگیرکردن هەیە لەسەر قسەی ڕاست و دروست و بەکردەکردنی، بەبێ ترس لە لۆمەی لۆمەکارانی وەك فەرمانڕەوایەك یان هەر کەسێکی تر.

- ماوەتەوە بڵێین: ئەوەی کە ڕوویدا سەبارەت بە دابەش نەکردنی زەویەکان، وەك نموونەیەکی بەرز دەمێنێتەوە کە یاران چۆن مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەدا دەکەن بە پێی داب و نەریتی گفت و گۆ و ئەخلاقیاتی تاوتوێکردنی بابەتەکان و گرفتەکان، هەڵگەرانەوەی ڕووەجیاوازەکانی بە دەستپێکردنی بە قۆناغی بیرکردنەوە لە وەرگرتنی بڕیار بەبێ دابەشکردنی زەویەکان، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەو خەلیفەیە، کە لەم داب و نەریتەی دەرنەچووە ئەگەرچی دەوروبەرەکەی سەبارەت بە کاروبارەکەی ڕای جیاوازیان هەبووە.[١]

عومەری فاروق(ﷺ) نیشانی دا کە فەرمانڕەوا تەنها تاکێکە لە دەستەی ڕاوێژ، متمانەی لە نێو دانیشتگەی شورای ئومەت ئاشکرا کرد ، ئەگەرچی دژی بێت یان کۆك بێت لەگەڵیدا، گەرانەوە بۆ لای ئایەتەکانی قورئان، عومەر(ﷺ) فەرمووی: من یەکێکم لە ئێوە، ئەمڕۆ ئێوە بە ڕاستی بڕیار دەدەن، هەندێك دژ بە بڕیارەکەم دەبن، هەندێکیش کۆك دەبن، ئێوە لە خوداوە قورئانێکتان لەگەڵدایە کە بە هەق دێتە گۆ.[٢]

## - گرنگترین شوێنەوارە بانگەوازیەکانی ئەم بڕیارە:

لە گرنگترین ئەم شوێنەوارانە: زاڵ بوون بەسەر یاسای کەرتیدا، عومەر(ﷺ) هەموو ئەو هەڵ و مەرجە کەرتیە ستەمکارانەی هەڵوەشاندەوە کە زەویەکانی بۆ بەرژەوەندی خۆی قۆستەوە و بە خۆڕایی جوتیارانی کردۆتە بەندە، عومەر وازی لەزەویە بەپیتەکان هێنا کە لە دەست جوتیاراندا بمێنێتەوە و ئەوان بیکەنە کشتو کاڵ لەبەرامبەر باجێکی ڕێك و پێك کە ساڵانە دەیدەن، جوتیاران بەم بڕیارەی عومەر ئێرەییان دەبرد، کە زەویە کشتوکاڵیەکانی کردە موڵکی خۆیان تا کاری کشتوکاڵی تێدا بکەن بەرامبەر ئەو باجەی، کە دەتوانن بیدەن، ئەمەش بۆ یەکەمین جارە گە جوتیاران هەست بەوە دەکەن کە لە ژیانیاندا خاوەن زەوی کشتوکاڵین و ئەو زەویانە موڵکی خۆیانە نەك خاوەن کەرتە تایبەتەکان لە

---

١ـ الابعاد السياسية لمفهتم الأمن في الاسلام، مصطفى منجود (ص: ٣١٧-٣١٨).
٢ ـ الدور السياسي للصفوة (ص: ١٨٥).

چین و توێژی فەرمانڕەوا، جوتیاران پێشتر ئەو زەویانەیان بەبێ بەرامبەر دەکردە کشتو کاڵ، ماندوو بوون و کۆششیان دەچوویە گیرفانی خاوەن کەرتەکانەوە، چینی خاوەن زەویەکان جگە لە وردەواڵە هیچی تریان بۆ بەجێ نەدەهێشتن.[١]

## - ڕێگەبڕین لەسەر بانگکردنی سوپای ڕۆمەکان پاش دەرکردنیان:

ئەم سیاسەتەی عومەر(ﷺ) لەوەی کە جوتیارانی ناوچە ئازادکراوەکانی کردە خاوەنی زەویەکان بویە هۆی ئەوەی جوتیاران هەست بە ڕەزامەندیەکی تەواو بکەن وەك پێشتر هاتووە، ئەمەش وایان لێ دەکات بەتەواوی ڕقیان لە فەرمانڕەواکانی فارس و ڕۆم ببێتەوە و بە هیچ شێوەیەك هاوکاریان نەکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە هاوکاری پێشکەش بە موسڵمانان دەکەن لە دژی فارس و ڕۆمەکان، تەنانەت ڕۆستەمی سەرکردە خەڵکی حیرەی بانگ کرد و پێی وتن: ئەی دوژمنانی خوا بەرختەوەر بوون بە هاتنە ناوەوەی عەرەب بۆ سەر ئێمە و وڵاتەکەمان و ئێوەش ڕێ نیشاندەر بوون بۆیان و بە سامان و دارایی خۆتان بە هێزتان کردن.[٢]

## - پەلەکردنی خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکان بۆ هاتنە نێو ڕیزەکانی ئیسلام:

لەسەر ئەو ڕێکخستنەی کە پێشتر هاتووە لەوەی کە جوتیاران موڵکدار بکرێن ئەمە وایان لێ دەکات پەلە بکەن لە هاتنە نێو ڕیزی ئاینی پیرۆزی ئیسلام کە زۆر بە خێراییەکی بەرچاو لە نێوانیاندا بڵاوبوویەوە، کە پێشتر هاوشێوەی نەبووە، ئەو جوتیارانە ڕێیان کەوت لە دادپەروەری و هەق و ڕاستیان بۆ ڕوون بوویەوە، لە میانی مامەڵەکردنی موسڵمانان لەگەڵیان هەستیان بە ڕیزی مرۆڤیانەیان دەکرد.[٣]

## - چارەسازی سەروەت و سامان بۆ پاراستنی سنوورەکان:

دەوڵەتی ئیسلامی بەردی هەرچوار ئاراستەکانی باڵی خۆی ڕێکخست و ناوی سنوورەکان لە سەردەمی یەکەمیدا گوێزرایەوە بۆ دەرەوەی سنووری دەوڵەت، لە گرنگترین ئەو سنوورانە ئەوە بوو کە ناسرابوو بە سنووری فوراتی، کە درێژ دەبوویەوە بە درێژایی هێڵێکی ستراتیژی کە نێوانی دەوڵەتی ئیسلامی و ئیمپراتۆریەتی بیزەنتینی لێك جیادەکردەوە و بگرە چەندین سنووری ترش هەبوون، عومەر لە هەر ناوچەیەکدا بە پێی توانای خۆی ئەسپ سواری وەرگرتبوو، بە جۆرێ ژمارەی هێزی ئەسپ سوارە پەیوەندارەکان لەو ناوچانە دەگەیشتە ٣٠٠٠ سوارچاك، ئەمەش بە پێچەوانەی سوپای پیادە وە یان هەر هێزێکی تری وەك حوشتر سوار، ئەمەش عومەر وەك سوپایەکی ڕێك و پێك تایبەتی کرد بۆ پاراستنی سنوورەکانی موسڵمانان زامن کردنی ڕزق و ڕۆزیان و خەرج کردنیان لەسەر

---

١- الدعوة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب حسني غيطاس (ص: ١٣٠).
٢- الدعوة الاسلامية في عهد أمير المؤمنين عمر (ص: ١٣٠).
٣- هەمان سەرچاوە. (ص: ١٣٢).

هەر سەرقاڵ بوونێکەوە بە هەر شتێك جگە لە جیهاد و لە پێناوی بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی، خەرجیەکان لەو هۆکارانە بوون کە خوای گەورە ڕێبەری کردووە بۆ ئامادەکردنی ئەم هێزە و زامن کردنی ڕزق و ڕۆزی سەربازەکانی.[١]

عومەر(ﷺ) بنەماکانی یاسای باجی دانا بە لێکدانەوەی ئەوەی کە ئەمە داهاتێکە لە داهاتە گرنگەکانی دارایی بۆ خەزێنەی دەوڵەت، لە پشت ئەمەوە ئامانج دەکات بۆ ئەوەی بەیتولمال هەستێت بەوەی کە لە فەراهەم هێنانی بەرژەوەندیە گشتیەکانی ئومەت و پاراستنی سنوورەکان و دڵنیا بوون لە ڕێگەکانی کە پێویستە لەسەری، ئەمەش بە هیچ بەدی نایەت جگە لە خاوەن زەویەکان نەبێت کە موسڵمانان بوونەتە خاوەنی لە بەرامبەر ڕێژەیەکی کەمی دیاری کراو لەوەی کە زەویەکان دەستەبەری دەکەن، ئەم کارەش لە ئەرکی گرنگی ئەوەیە کە خرۆشانیان لە کار و ئارەزوویان لە قۆستنەوەی بەرهەمهێنان زیاد بکات ئەمەش لە چاو ئەوەی کە پێوەی ماندوو دەبن لە سەرانەکان لە ڕێگەی بەرپرسیارانیانەوە پێش هاتنی موسڵمانان.[٢]

**- دەیەك:**

ئەو سامانەیە دەست دەکەوێت لەسەر ئەو بازرگانیەی، کە تێدەپەڕێت بە سنووری دەوڵەتدا بۆ ناوخۆ، یان دەرەوەی دەوڵەت بێت، ئەمەش لێکچوونێکە بە گومرگ لەم سەردەمەی ئێمەدا، ئەم کارە فەرمانبەرێك هەڵدەستێ پێی، کە پێی دەوترێت دەهەم،[٣] یان ئەو کەسەی دەیەك وەردەگرێت، ئەم سەرانەیە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)نەبووە و لەگەڵ خەلیفەی یەکەمدا، کە ئەبو بەکری صدیق بووە، لەبەر ئەوەی ئەو مادەیە، مادەی بانگەواز بووە بۆ ئیسلام و جیهاد لەپێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی و بنیاتنانی دەوڵەتی ئیسلامی، کاتێك کە دەوڵەت لە سەردەمی عومەر(ﷺ)دا بەرفراوان بوو، سنووری گەیشتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئەو کاتە ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێی پێویست و ئارەزوومەندی بۆ بەرژەوەندی گشتی دەستی پێکرد، عومەر(ﷺ) پێی باش بوو، کە ئەم سەرانەیە فەرز بکات لەسەر ئەو شتانەی، کە دێنە وڵاتی ئیسلامەوە، هەروەها جەنگاوەران لەو بازرگانە موسڵمانانەیان وەردەگرت، کە ڕوویان دەکردە وڵاتەکەیان بە هەمان مامەڵە.

مێژوونووسان[٤] کۆکن لەسەر ئەوەی، کە یەکەمین کەس لە ئیسلامدا دەیەکی دانا عومەر بوو ئەمەش کاتێك خەڵکی مەنبەج لەودیوی دەریای عەدەنەوە نامەیەکیان بۆ نووسی و داوایان لێ کرد، کە بازرگانیەکانیان بهێننە زەوی عەرەبەوەو دەیەکی سوودەکەی بدەنە عومەر، ئەویش ڕاوێژی ئەم کارەی بە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) کرد و، ئەوانیش لەسەری کۆك بوون، بەمەش عومەر بوویە یەکەمین

---

١ـ الدعوة الاسلامية في عهد أمير المؤمنين عمر (ص: ١٣٥).
٢ـ أهل الذمة في الحضارة الاسلامية (ص: ٦٣).
٣ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٧١)، إقتصاديات الحرب (ص: ٢٢٣).
٤ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٢٨).

کەسێك، کە دەیەکی لیٚ وەرگرتن عومەر ویستی دڵنیا بێت لەو ڕێژەیەی، کە دەوڵەتانی تر لە موسڵمانانی وەردەگرن لە کاتی تێپەڕاندنی سنووریان، لەبەر ئەوە پرسیاری لیٚ کرد لە موسڵمانان، کە حەبەشیەکان چیتان پیٚ دەکەن لە کاتی چوونە نێو زەویەکانیان؟ ئەوانیش وتیان دەیەکی ئەوەمان لیٚ وەردەگرن کە پێمانە، بۆیە عومەر فەرمووی: بە هێندەی ئەوەی، کە لێتان وەردەگیرێت ئێوەش لەوانی وەربگرن،[1] هەروەها پرسیاری لە عوسمانی کوڕی حونەیف کرد، کە جەنگاوەران چەندتان لیٚ وەردەگرن کاتێك کە دەچنە نێو خاکیانەوە؟ عوسمان وتی: دەیەك، عومەریش فەرمووی: ئێوەش بەو شێوەیە لێیان وەربگرن،[2] دەگێڕنەوە کە ئەبو موسای ئەشعەری نامەیەکی نووسیووە بۆ عومەر(ﷺ) کە تیایدا فەرموویەتی: چەند بازرگانێکی موسڵمان لە ئێمە دەچنە نێو حەرب و دەیەکیان لیٚ وەردەگرن، عومەریش(ﷺ) وەڵامی نامەکەی بۆ نووسیەوە و فەرمووی: تۆ بە هەمان شێوە کە ئەوان لە بازرگانانی موسڵمانانی وەردەگرن لەوان وەربگرە و لە خەڵکی زامن کراویش نیوەی دەیەك وەربگرە و لە موسڵمانانیش لە هەر چل درهەمێك یەك درهەم وەربگرە، نەك لەوەی کە لەگەڵ(٢٠٠) درهەمدا شتی تێدایە، ئەگەر بڕە پارەکە(٢٠٠) درهەم بوو ئەوان پێنج درهەمی تێدا دەبێت، هەرچەند زیاتر بوو ئەوا بە هەژماری خۆی دەبێت،[3] ئەم یاسادانانە لە پەیوەندیە بازرگانیەکانی نێوان وڵاتان دەبێت. ئەم بازرگانیە ئیسلامیە چەندین دەست کەوتی گەورەیە لە جیهانی بازرگانیدا دەستەبەر کرد، بە جۆرێك کە دەروازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بۆ بازرگانی کرانەوە، هەندێکی زۆر لە کەل و پەل و کاڵاکانیان لە هەموو ناوچەکانی جیهانەوە ڕوویان کردە دەوڵەتی ئیسلامی و لەویٚ کۆبوونەوە، ئەمەش بەسروشتی بارودۆخەکە هانی بازرگانانی موسڵمان و بیانی دا لەسەر زۆرکردنی چالاکیەکانیان لە هەنارده و هاوردە لە تەواوی ناوچەکانی جیهان، بەمەش مەڵبەندەکانی بازرگانی لە نێو وڵاتانی ئیسلامی و بەدوورگەی عەرەبیشەوە چوست و چالاك بوونەوەو بزاوتی کاروانە بازرگانیەکان بە هاتوو و ڕۆیشتوویانەوە لەهەرێمەکانی دورگەوە بۆ هەرێمە ئیسلامیەکانی تر زیادی کرد، هەروەها گەنجینەکانی وڵاتی ئیسلامی پێشوازی لەو پاپۆڕە گەورانە کرد، کە لە وڵاتی هیندستان و چین و ڕۆژهەلاتی کیشوەری ڕەش بەبارەوە و بەگرانترین و بەرچاوترین کاڵا و کەل و پەل دەکرد، کە ڕوویان لیٚ دەنا، ئەمەش بە شێوەیەکی ئاشکرا لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدی و دەوڵەتی ئەمەویدا دەرکەوت.[4]

لە سەردەمی عومەردا وەرگرانی دەیەك زەکاتیان لە سامانی ئەو بازرگانانە وەردەگرت، کە بە لایاندا تێدەپەڕی و بە بەشە سامانی زەکات و پارەیان دادەنا، ئەنەس دەفەرمووێت: عومەر ناردمی بۆ کۆکردنەوەی باجی عێراق و فەرمووی: ئەگەر سامانی موسڵمان گەیشتە دووسەد درهەم ئەوا پێنج درهەمی لیٚ وەربگرە وە ئەگەر لە دووسەد درهەم پتر بوو، ئەوا لە چل درهەم درهەمێك[5] وەربگرە و

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٦٥١).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ١٤٦)، سياسة المال (ص: ١٢٨).

٤ـ التجارة وطرقها في الجزيرة العربية، د. محمد العمادي (ص: ٣٣٢).

٥ـ الحياة الاقتصادية في العصور الاسلامية الاولى (ص: ١٠١).

فەرمانی دا لە سامان و داهاتەکانیان ٤/١ی دەیەك وەربگرێت و لە خەڵکی زامن کراو ئەگەر بڵاوەیان بە داهاتەکەیان کردووە بۆ بازرگانی ٢/١ی دەیەك وەربگرێت، لە سامانی خەڵکی حەرب دەیەك وەربگرێت، عومەر خەرجی کۆکەرەوەی دەیەك یان بڕوا پێکراوی لەسەر ئەو سامانە دانا کە وەری دەگرێت.[١]

ئەوەی کە بیر لەم دیاری کردنەی، کە عومەر(ﷺ) نەخشەی بۆ کێشاوە دەگاتە ئەوەی کە عومەر دەیەکی لەسەر حەربییەکان فەرز کرد لەبەر ئەوەی، کە ئەوانیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵ موسڵماناندا کردووە، ئەمەش بنەمای مامەڵەیە، کە بە هەمان شێوە، عومەر ٢/١ی دەیەکی لەسەر خەڵکانی زامن کراو فەرز کرد تا لە موسڵمانان جیابکرێنەوە، بۆ چەسپاندنی ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد عومەر ئەم باجەی سەپاند بەسەر گاورانی هۆزی تەغلوب، ئەوانەی کە پێیان باش بوو کە سەرانەیان بە دوو هێندەی ئەوە لێ وەربگیرێت لە موسڵمانان وەك صەدەقە، ئەمەش کە بڕیاری لەسەر دا بەسەر موسڵماناندا لە بری زەکات بوو وە صەدەقەی بەشە سامانی زەکات بۆ خستنە ڕووی بازرگانییە، هەر ئەمەش وای کرد سنوورێك بۆ وەرگرتنی دابنێت و ڕێگری بکات لە دووبارە وەرگرتنەوەی لە موسڵمانان و خەڵکی زامن کراو، لەبەر ئەوەی کە سەرمایە نەگۆڕە و کاڵا هاوردەکانیش نرخیان زیاد ناکات پێی، ئەگەر هێنانەوەشی بۆ چەند جارێك دووبارە ببێتەوە مەگەر دوای بارەکان، و بەڕێکردن بێت بۆ بنەمای مامەڵە ، ئەمە و کاتێك کە خەڵکی حەرب ئەوەی کە وەری دەگرن لە سەرانە لە موسڵمانان ئەگەر هەڵیبگرن، ئەوا لەسەر موسڵمانانیش پێویستە لە لانەی ئیسلامەوە بە هەمان شێوە ئەو سەرانەیە بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەوان، ئەگەر ئەمە بە هەمان شێوە بێت لە هەڵگرتنی سەرانە بۆی، ئەوا لەسەر موسڵمانانیش پێویستە کە بە هەمان شێوە سەرانە هەڵبگرن لەسەریان، ئەمەش هەر ئەوەیە کە وڵاتە نوێیەکان لەسەری دەڕۆن، و ئەمەش بە بەرزکردنەوەی بەربەستی گومرگی ناوزەد دەکرێت،[٢] کاتێك کە موسڵمانان لە پێویستیدا بن بۆ هەندێ کاڵا و بەروبوومی هاتوو بۆ لایان ئەوا ئەوان دادەبەزن وە یان لە بازرگانان دەبوورن لە سەرانەکەی و هاندانێکە بۆ هێنانی و زیادەڕۆیی تیایدا، عومەر(ﷺ)یش هەر ئەمەی کرد، کاتێك کە فەرمانی دا بە کاربەدەستانی کە نیوەی دەیەك لە حەربییەکان وەربگرن لە چوونە حیجاز و بە زەیت و دانەوێڵە، و هەروەها هەندێ جار فەرمانی دەدا بە لێخۆش بوونیان، زوهری لە سالم و ئەویش لە باوکی و ئەویش لە عومەر(ﷺ) وە هێناویەتی کە عومەر لە شتە ئاشکراکراوەکان و کاڵا نەرمەکاندا دەیەك و لە گەنم و مێوژ نیوەی دەیەکی وەردەگرت هەتا باری زۆری لێ بێت بۆ مەدینە،[٣] ئەم ڕێکخستنە داراییانەش کە لە ڕۆژانی خەلافەتی عومەر(ﷺ) دەرکەوتن، سوودێکی گەورەیان هەبوو لە ئاسانکاری ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان موسڵمانان و وڵاتانی دراوسێیان، و هێنانی کەل و پەلی هەمەجۆر لە داخوازی خەڵکی و

١ـ شرح السير الكبير (٥/٢١٣٣-٢١٣٤)، الحياة الاقتصادية في العصور الاسلامية الاولى (ص: ١٠١).
٢ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٣٢).
٣ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٣٣).

پێویستیەکانیان بایەخی خۆی کەم نەکردۆتەوە لەسەر ڕێکخستنی کالاّ هاتووەکان بۆ بەیتولمال، بەلکو چەندین ڕێگە لەو ڕێگایانەی ڕێکخستووە کە بە هۆیەوە داهاتی بەیتولمال زیادی کردووە، ولاّت ڕازێنراوەتەوە بە سەقامگیری و خۆشگوزەرانی، لەمەشەوە بایەخی داوە بە بازرگانی دەرەکی، و پاشان کاربەدەستانی فەرمانڕەوایان شوێنی دەکەون، بەمەش نامەی بۆ دەنووسین و سوور بوو لەسەر دەستکەوتنی مافی دەولّەت بەبێ ستەم کردن لە باج وەرگران.[1]

## ٥- دەستکەوت و غەنیمەتەکان:

دەستکەوتەکان، بریتین لە هەموو سامانێك کە مولکی هاوبەش پەیداکرانە و بەبێ جەنگ دەگاتە دەستی موسلّمانان، ئەمەش نە بە تاودانی ئەسپەکان و نە بە ئەسپ سواری دەبێت وە پێنج یەکی ئەو دەستکەوتەش بەسەر پێنج چین[2] و توێژدا دابەش دەکرێت کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردوون کە دەفەرموویێت: ﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾(الحشر: ٧).

بەلاّم غەنیمەتەکان، ئەوەیە کە موسلّمانان لەرێی جەنگەوە دەستیان دەکەوێت.[3] خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الانفال: ٤١).

لە خەلافەتی عومەردا(ﷺ) غەنیمەتەکان زۆر گەورە بوون بۆ بەرفراوانی ناوچە ئازادکراوەکان کاتێك کە چێژی پێ وەردەگیرێت لە گەشەسەندنی ئابووری گەورە، هەروەها سەرانی ڕۆم و فارس دەردەچت بۆ گۆڕەپانی جەنگ بە تەواوی جوامێریەکیانەوە، تالاّنیەکانیان دەکەوێتە چنگی موسلّمانان، هەندێ جار دەگاتە(١٥٠٠٠) درهەم، یان (٣٠٠٠٠) درهەم،[4] چەندین شاری گەورەی وەك مەدائین و جەلەولا و هەمەدان و ڕەیی و ئەستەخەر و چەندینی تریش، موسلّمانان دەستیان گرت بەسەر چەند سامانێکی گەورەدا، وەك زەویەکانی کیسرا کە(٣٦٠٠) بالّی چوارگۆشە بوو، کە زەویەکەی بە زێڕ فەرش ڕێژ و بە پلە بەسەریدا دەڕۆیشتن کە چەندین نەخش و نیگاری بە خشلّ ڕازێنرابوونەوە و گەلاّکانی ئاوریشم بوون، چەندین ڕێڕەوی ئاوی تێدابوو کە بە دروست کرابوون، ئەمەش بە(٢٠٠٠٠)

---

١- سیاسة المال في الاسلام (ص: ١٣٣).
٢- تأريخ الدعوة الاسلامية، د. جميل عبدالله المصري (ص: ٣٢٢).
٣- الخراج لأبي يوسف (ص: ١٩)، نقلا عن عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٨٣).
٤- عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٨٨).

درهەم فرۆشران، موسڵمانان بڕێکی زۆر زێڕ و زیـو و خـشڵی گـەورەیان لـە غەنیمەتـەکانی جەلـەولا و نەهاوەند دەست کەوت، کە بە جۆرێك پێنج یەکی جەلەولا دەگەیشتە پێنج ملیۆن درهەم.[١]

گەورەترین غەنیمەتەکانیش ئەو زەویانە بوون، کە عومەر(ﷺ) دایە دەوڵەت، و زەویـەکانی خـری فرۆشان بوو، کە هەندێ لە خاوەنەکانیان کوژران و هەندێکی تریان لێی هـەڵاتن، موڵکـەکانی کیسراو خەڵکەکەی— کە بەجۆرێك دەغڵ و دانەکەی بۆ دەوڵەت بوو، بە بەڕێوەبردنی بۆ بەرژەوەنـدی بـەیتولمال بوو، دەڵێن کە دەغڵ و دانەکەی— دواتر— گەیشتە حـەوت ملیـۆن درهـەم، دیـارە ئـەم غەنیمەتانـەش ڕێژەیەکی زۆر بوون، موسڵمانانی وەك تـاك و دەوڵـەت دەوڵەمەنـدکرد و ئاسـتی بـژێوی بـەرزکردەوە و شوێنەواری زیاتر لە سەردەمی خەلافەتی عوسماندا(ﷺ) دەرکەوت.[٢]

ئەمەش گرنگترین سەرچاوەکانی دەوڵەت بوون لە سەردەمی عومەردا(ﷺ).

## دووەم: بەیتولمالی موسڵمانان و ڕێکخستنی دیوانەکان:

بەیتولمال: بریتیە لەو شوێنەی کە تەواوی داهاتەکانی دەوڵـەتی بـۆ دەگەڕێنرێتـەوە، هـەروەها ئـەو جێگایەیە کە تەواوی خەرجیەکانی لەموچەی خەلیفەو سوپاو دادوەر و کاربەدەستان و یاوەرە گـشتی و تایبەتیەکانی دەوڵەتی تێدا خەرج دەکرێت...[٣]

بەڵام دیوانەکان: کۆمەڵێك دەفتەر و تیانووسە، کە کاروبـاری دەوڵـەتی تیـا تۆمـار دەکرێـت، لای فارسـەکان دیـوان بـەو جێگەیـە دەوترێـت، کـە نووسـەران و فەرمانبـەرانی کارکـەر بـەو دەفتـەر و تیانووسانەی تێدا کۆدەبێتەوە.[٤]

لەسەرەتای دەوڵەتی ئیسلامیدا بەیتولمال نەبوو بەو مانایەی، کە پێی دەوترا، بەڕاستی سیاسیەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئـەوە بـوو، کـە دابـەش کردنـی سـامانەکان و خەرجیـەکان دوانەکـەوێت، ئـەبو بەکریش لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتووە بەڕێوە، عومەریش هەر لە سەرەتای خەلافەتیەوە ڕێگەی ئەو دوو هاوەڵەی گرتەبەر تا دەسەڵاتی ئیسلامی بە ئاراسـتەی ڕۆژئـاواو ڕۆژهـەڵات بـەرفراوان بوو، پاشان دەستی کـردە بیرکردنـەوە لـە ڕێگەیـەك کـە ئـەوەی تێدا چارەسـەر دەکـرا کـە لـە مـاڵ و دەسـتکەوتی غەنیمەتـەکانی ناوچـە ڕزگارکراوەکـان لای عومـەر کۆدەکرایـەوە، لەگـەڵ داهاتـەکانی سـەرانەو بـاج و خێـرات، سـوپا زیـادی کـرد و پێویـستی بـە ڕێکخـستنی پێداویـستیەکانی و نـاوی سەربازەکانی دەبوو نەبادا یەکێکیان بەبێ مووچەو بژێوی بێت لە بیر بچێت، یان دووجار مووچە بدرێتە کەسێك، هەروەها سەرپەرشتی هەڵمەتەکانی ڕزگاریخوازی و سەرکەوتنەکانی گرتە ئەستۆ و سامانەکان بە شێوەیەك زۆر بوون، کە لای موسڵمانان پێشتر نەزانرابوون، خەلیفە بینی، کە خۆی و فەرمانداەکانی ناتوانن ئەم کارە ڕێك بخەن، حیکمـەتی ئـابووری نیـە کـە بـەڕێوەبردنی کـارە داراییـەکان بـە دەسـتی

---

١ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٨٩).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ سیاسة المال في الاسلام (ص: ١٥٥).

٤ـ مقدمة إبن خلدون (٢٤٣)، سیاسة المال في الاسلام (ص: ١٥٥).

کاربەدەستان و والیەکان بێت بێ ئەوەی کە بە ژمارە ڕێکی بخات و بە ژماردن بیژمێرێت، ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەیە لێوان لێو بوو لە دانانی ڕێسایەکی نەگۆڕ بۆ ئەم سامانانە، لێرەوە دیوان پەرەی سەند.

عومەر(ﷺ) یەکەمین کەس بوو، کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا دیوانی دامەزراند،[١] چیرۆکی ئەمەش وەك ئەوەی، کە مێژوونووسان بۆیان گوێزاوینەتەوە ئەوەیە: ئەبو هورەیرە فەرمووی: لە وڵاتی بەحرێنەوە(٥٠٠٠٠٠)هەزار درهەمم هێنا و هاتم بۆ لای عومەر(ﷺ)و ئەویش پرسیاری خەڵکەکەی لێ کردم، منیش هەواڵم پێدا و پاشان فەرمووی: ئەوە چیە هێناوتە؟ منیش وتم:(٥٠٠٠٠٠) درهەمم هێناوە، ئەویش فەرمووی: بەڵام لێدای، تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟ وتم: بەڵێ، سەد هەزار و سەد هەزار و سەد هەزار و سەد هەزار و سەد هەزار ، ئەویش فەرمووی: خەواڵو دیاری ، بگەڕێوە بۆ لای کەس و کارت و بنو، ئەگەر ڕۆژت کردەوە وەرەوە بۆ لام، منیش کاتێك کە ڕۆژم کردەوە هاتم بۆ لای، فرمووی: ئەوە چیە هێناوتە؟ وتم: (٥٠٠٠٠٠) درهەمم هێناوە، فەرمووی: بەڵام لێدای! ئایا تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟ وتم: بەڵێ، سەد هەزار، هەتا پێنج جار بۆم ژمارد، ئەویش بە پێنج پەنجەکەی ژماردی، فەرمووی: ئایا ئەمە باشە؟ وتم: من جگەلەوە هیچ نازانم، فەرمووی: سەرکەوتە سەرمینبەرو سوپاس و ستایشی خوای لەسەر کرد و پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئێمە سەروەت و سامانێکی زۆرمان بۆ هاتووە ئەگەر بتانەوێ دەتانکەینە پێوانە و ئەگەر بتانەوێ بە ژماردن دەتان ژمێرین لەم کاتەدا پیاوێك هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، من عەجەمەکانم بینیوە، کە چەند دیوانێکیان بۆ خۆیان ڕێك خستووە،[٢] عومەر ئارەزووی ئەمەی کرد،[٣] پاشان عومەر ڕاوێژی بەموسڵمانان کرد بۆ دامەزراندنی ئەم دیوانانە، هەندێکیان ڕاوێژیان بەوەدا، کە ئەوەیان پێ باشەو وەلیدی کوڕی موغیرە فەرمووی: من لە شامەوە هاتووم و پادشاکانی ئەوانم بینیوە کە چەندین دیوانیان هەبووە و ناوی سەربازانیان تۆمار کردووە عومەریش چەند دیوانێکی داناو ناوی سەربازانی تۆمار کرد، لەهەندێ لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە خالدی کوڕی وەلید ئەمەی وتووە.[٤]

هەندێ لە مێژوو نووسان باس لەوە دەکەن، کە لە مەدینەدا هەندێ مەرزەبانی فارس هەبوون کاتێك کەسەرسامی عومەری بینیوە پێی وتووە: ئەی ئەمیری باوەڕداران، کیسراکان شتێکیان هەیە، کە ناوی لێ دەنێن دیوان و هەموو داهات و باجێکیان بە ڕێك و پێکی تێدا کۆدەکەنەوە و هیچ شتێکی بە تاکی لێ هەڵناکەوێت، خەڵکانی خاوەن مووچەش تیایدا تۆمار دەکەن و هیچ کەم و کورتیەکی تیا روو نادات، عومەر بێدار بوویەوە و فەرمووی: بۆم پێناسە بکە، بەم شێوەیە مەرزەبان بۆی پێناسە کرد و ئەویش چەند دیوانێکی دانا و بەخشینەکانی تێدا فەرز کرد،[٥] پاشان عوسمان حەزی بەم تۆمارکردنە کرد و بەڕای خۆی ئاماژەی دا و فەرمووی: من سامانێکی زۆر بەدی دەکەم کە

١ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٥٧).
٢ـ الطبقات لإبن سعد (٣/٣٠٠-٣٠١) خبر صحيح.
٣ـ مقدمة إبن خلدون (٢٤٤)، والخراج لأبي يوسف (ص: ٤٨-٤٩).
٤ـ الاحكام السلطانية(ص: ٢٢٦-٢٢٧)، وفتوح البلدان (ص: ٤٣٦).
٥ـ الاحكام السلطانية(ص: ٢٢٦)، تأريخ الاسلام السياسي(٤٥٦/١).

خەڵکی هەوڵی بۆ دەدەن وە ئەگەر بێت و هەژمار نەکرێت هەتا دەزانرێت کە کێ بەشی خۆی بردووەو کێ نەیبردووە، لە ترسی ئەوەی کە کارەکە بڵاو نەبێتەوە،[1] ئەمە هەندێ لەو گێڕانەوانەیە کە لەسەر بنەمای ڕاوێژی عومەر(ﷺ) ڕوویان داوە لە چەند جارێکی جیاوازدا بۆ ئەو کەسانەی کە لای ئامادە بوون، جیاوازیەکیش لە نێوان مێژوونووساندا هەیە سەبارەت بەو ساڵەی کە ڕێکخستنی دیوانەکانی تێدایە، هەندێك لەوانە وەك: طبری کە إبن ئەسیر و چەند کەسێکی تر لێیان وەرگرتووە، ئەو ساڵە بە ساڵی(١٥)ی کۆچی لە قەڵەم دەدەن، ئەوانی ترش وەك بلازەری و واقدی و ماوەردی و إبن خەلدون،[2] دەڵێن لە مانگی موحەڕەمی ساڵی(٢٠)ی کۆچیدا بووە، دروستترینیان ئەوەیە کە لە ساڵی(٢٠)ی کۆچیدا بووە، چونکە ساڵی (١٥)ی کۆچی جەنگی قادسیەی تێدابوو، ڕزگارکردنی میسر و عێراق و شام دولی ئەم جەنگە بوو،[3] لە دابەشکردنی سامانەکاندا عومەر بە پێچەوانەی ئەبو بەکرەوە کاری دەکرد، ئەبو بەکر بەیەکسانی ئەو سامانەی دابەش دەکرد، بەڵام عومەر بە پێی ڕابردوویان لەئیسلام و کارزانی لە جیهاد و لایەنگیری پێغەمبەری خوا(ﷺ) دابەشی دەکرد،[4] وە ئەمە هەر ڕای عومەر بووە لە سەردەمی ئەبو بەکردا و هەموو جارێك کە ئەم یەکسانیەی لە نێوان خەڵکیدا دەبینی پێی دەفەرموو: ئایا بە یەك شێوەیە یەکسانی دەکەیت لە نێوان کەسێك کە دووجار کۆچی کردووە و بۆ دوو قیبلە نوێژی خوێندووەو کەسێك، کە ساڵی فەتحی مەککە لە ترسی شمشێر موسڵمان بووە؟ ئەبو بەکر پێی فەرموو: بەڵام ئەوانە لە پێناوی خوا کاریان کردووە ئەجرو پاداشتیان لای خوایە، بە ڕاستی دونیا ماڵی ڕاگەیاندنە بۆ سوار، عومەر پێی فەرموو: من کەسێك لە دژی پێغەمبەری خوا جەنگابێت وەك ئەوەی نازانم کە لەگەڵ پێغەمبەر جەنگابێت،[5] هەر لەبەر ئەوەش بوو کە فاروق بەخششەکانی لەنێوان خەڵکیدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دابەش دەکرد:

- ئەو پێشینانەی بە هۆی ڕابردوویانەوە سامان دەست کەتووە.
- ئەو کەسانەی کە موسڵمانان دەوڵەمەند دەکەن لە هێنان و کۆکردنەوەی سوود بۆیان وەك کاربەدەستان و ئەو زانایانەی کە سوودی دین و دونیایان بۆ دێنن.
- ئەوانەی کە دەبنە قەڵغان و سپەر بۆ موسڵمانان وەك موجاهیدان لەڕێگەی خودا لەسەربازان و بەرچاو ڕۆشنان و ئامۆژگاری کاران بۆیان.
- ئەوانەی کە پێویستیان پێیەتی.[6]

ئەمەش سیاسەتی فاروق بووە لە دابەش کردندا، کە لە چوارچێوەی ئەو وتەیەیدا بوو، کە دەفەرمووێت: هیچ کەسێك مافدارتر نیە لە کەسێکی تر، بەڵام ئەوە پیاو پێشینەیی و پیاو و

---

١ـ الاحكام السلطانية(ص: ٢٢٦)، سياسة المال في الاسلام(ص: ١٥٨).
٢ـ مقدمة إبن خلدون(٢٤٤)، سياسة المال في الاسلام (ص: ١٥٩).
٣ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٥٩.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ الاحكام السلطانية للماوردي (ص: ٢٠١).
٦ـ السياسة الشرعية لإبن تيمية (ص: ٤٨)، وأولويات الفاروق (ص: ٣٥٨).

دەوڵەمەندی و پیاو تاقیکردنەوەیی و پیاو و پێداویستی،[١] پاشان عومەر(ﷺ) عەقیلی کوڕی ئەبی تالیب و مخرمەی کوڕی نەوفەل و جوبەیری کوڕی موتعەی بانگ کرد، کە لە لاوانی قورەیش بوون، پێی فەرموون: خەڵکی لەسەر ڕێ و جێیان بنوسن، سەرەتا بە بەنی هاشم دەستیان پێکرد و دواتر ئەبو بەکر و کەس و کارەکەی و پاشتر عومەر و کەس و کارەکەیان نووسی و دواتر هۆزەکانیان نووسی و لەسەر خەلافەت دایاننا و ئینجا بەرزیان کردەوە بۆ بەردەستی عومەر، کاتێك عومەر چاوێکی پیاخشاند فەرمووی: نەخێر، من پێم خۆش نەبووە بەم شێوەیە بێت، بەڵام بە دۆستانی پێغەمبەر(ﷺ) لە نزیکەوە بۆ نزیك دەست پێ بکەن، عومەر بەو شێوەیە دادەنێن کە خوای گەورە دایناوە، دواتر بەنی عەدەی هاتن بۆ لای عومەر(ﷺ) وتیان: تۆ خەلیفەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و خەلیفەی ئەبو بەکری(ﷺ)و ئەبو بەکریش خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) بووە، لەبەر ئەوە با هەر بەو شێوەیە بێت کە ئەوان نووسیویانە، ئەویش فەرمووی: بخ بخ ئەی هۆزی عەدی، دەتانەوێت لەسەر پشتی من نان بخۆن، چاکەکانم بۆ ئێوە هەروا بە با بڕوات نا، بەڵام هەتا بانگێشت بینی و دەفتەرەکەتیان بەسەردا دەسەپێنێ–واتا ئەگەر لە کۆتایی خەڵکەوە بنوسرێن– من دوو هاوەڵم هەیە، کە ڕێگەیەکیان گرتووە و ئەگەر دژایەتیان بکەم ئەوا دژایەتیم پێ کراوە، بەڵام سوێند بە خوا ئێمە هەست بە چاکی ناکەین لە دونیا و لای خوای گەورەیش لەسەر کارەکانمان بەمحمد(ﷺ) نەبێت داوای پاداشت ناکەین، چونکە ئەو بەڕێزمانە و ئەهلی بەیتەکەشی بەڕێزترینی عەرەب و پاشان لە نزیکەوە بۆ نزیك، سوێند بە خوا عەجەمەکان بەکارێك بێن و ئێمەش بە کارێکی تر بێین ئەوا ئەوان بە پێشترن بەمحمد(ﷺ) لە ئێمە لە ڕۆژی قیامەتدا، بە ڕاستی هەر کەس کارەکەی کەم تەرخەمی پێ بکات ئەوا ڕەچەڵەکی پەلەی پێ ناکات،[٢] پاشان عومەر(ﷺ) دەستی کردە تۆمارکردنی بە دیوانی تۆمارێك کە ناوی موچەدارەکان و ڕێژەی موچەکەیانی تێدابوو، ناوی لێنا دیوانی سەربازی لەسەر بنەمای ئەوەی کە تەواوی عەرەبە موسڵمانەکان سەربازن بۆ جیهاد و لە پێناوی خودا، تۆمارەکەی بۆ سوپا بە تیرەی بەنی هاشم و نزیکترو نزیکتر لە پێغەمبەر(ﷺ)و پاشان بە دوای ئەواندا چین لە دوای چین دەستی پێکردووە، بۆ هەر تاکێکی موسڵمان ڕێژەیەکی دیاری کراوی داناوە، موچەی فەرز کردووە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و خاوێن کەرەوەکانی، تەواوی موسڵمانان لە پیاو و ژن و منداڵ هەر لە دایك بوونیەوە و کۆیلە و بەندەکان بە ڕێژەی جیاواز،[٣] بە دەرکردنی ئەم دیوانە عومەر بایەخی خۆی بە کاری جیهاد لە پێناوی خودا دەرخست، بایەخی تەواوی دا بەموجاهیدان وەك پاراستنی مافیان، کاری ئەم تۆمارەی بە زمانی عەرەبی و لە مەدینەی پڕشنگداردا کرد لەسەر دەستی کەسانێك لە تێگەیشتوانی قورەیش و زانایانی، پاشان فەرمانی دا بەم دیوانانە لە هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، پاشتر بە زمانی وڵاتە ئازادکراوەکان تۆمار کرا، بەعەرەبی کردنی تەواو نەکرا تا لەسەردەمی عبدالملك کوڕی مەروان و

---

١ـ جامع الاصول (٧١/٢) وأخبار عمر (ص: ٩٤).
٢ـ فتوح البلدان (ص: ٤٣٦)، الاحكام السلطانية (ص: ٢٢٧).
٣ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٠٦).

وەلیدی کوڕی، دوای ڕێکخستنی دیوانەکان عومەر بە درێژایی ساڵ پارەی کۆدەکردەوە و دواتر لەنێوان خەڵکیدا دابەشی دەکرد، لەبەر ئەوەی کە پێی وابوو کە کۆکردنەوەی زۆر گەورەترە بۆ پیرۆزکردنی، کۆکردنەوەی دارایش پێویستی بەوە هەبوو کە چەند کەسێکی دەست پاکی هەبێت، زەیدی کوڕی ئەرقەم لەسەردەمی عومەردا لەسەر بەیتولمال بوو،[1] ئەبو عوبەیدە بە پاڵپشتی خۆی لە عبدالقاری تیرەی قارەوە هێناویەتی کە دەفەرمووێت: لەسەردەمی خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب(ﷺ)من لەسەر بەیتولمال بووم.[2]

## سێیەم: خەرجیەکانی دەوڵەت لە سەردەمی عومەر:

خەرجیەکانی بەیتولمال دابەش دەبێت بۆ سێ بەش کە بریتین لە: خەرجیەکانی زەکات و ئەوەی کە پەیوەندی پێوەیەتی، خەرجیەکانی سەرانە و باج و دەیەك و ئەوەی پەیوەندی پێوەیەتی، خەرجیەکانی دەستکەوتەکان و ئەوەی پەیوەندی پێوەیەتی، قورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەر(ρ)و کاری هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) خەرجیەکانی ئەم چەند بەشەیان ڕوون کردۆتەوە.[3]

### ١- خەرجیەکانی زەکات:

خوای گەورە ناوی هەشت چین خەڵکی بردووە کە زەکاتیان پێ دەشێت لە ئایەتێکدا کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ (التوبة: ٦٠).

هەژاران و بێ نەوایان لە سەردەمی عومەردا(ﷺ) لەم داراییانەیان پێ دەدرا و ئەمەش دووری دەخستنەوە لە هەژاری و نەداری، لە دەست کورتی و لێبڕاوی دەری دەکردن، نزیکی دەکردنەوە لە نزمترین پلەی دەوڵەمەندی،[4] عومەر(ﷺ) هەمیشە دەیفەرموو: ئەگەر پێیان بدەی ئەوا دەوڵەمەند دەبن،[5] ئەمەش سیاسەتی ژیرانەی عومەر بوو کە بریتیە لە بەخشینی ئەوەی بەشە و زیاتر بە ڕادەیەك بۆ دابڕانی کاتی، بەڵام دابڕانی درێژخایەن لە نەخۆش و هاوشێوەکانی ئەوا زەکات بۆ ئەوانە دەبێتە هاوکاری و کۆمەکێکی ڕێك و پێك هەتا بەدەوڵەمەندی هەژاری دەڕەوێتەوە و بە تواناش پەککەوتە لەناودەچێت و بەتاڵیش بە کەسابەت، ئەم سیاسەتەی عومەر هەژارانی گاور و جوولەکەشی گرتەوە و سەرانەشی لەسەر لابردن،[6] هەروەها لە خەرجیەکانی زەکات دەدرایە ئەو کەسانەی کە کاریان

---

١ـ صبح الاعشى في قوانين الانشاء للقلقشندي (٨٩/١).
٢ـ فقه الزكاة (٣١٨/١) هذا المصدر والذي فوقه من سياسة المال في الاسلام (ص: ١٠٦).
٣ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٦٩).
٤ـ النظام الاسيلامي المقارن (ص: ١١٢)، سياسة المال (ص: ١٧١).
٥ـ الاموال لأبي عبيدة (٦٧٦/٤)، سياسة المال (ص: ١٧١).
٦ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٧٢).

لەسەر دەکرد و ئەویش بۆیان دەبوویە پیشەکیەکی بڵاو، و کاری فرە لق، کە لە هەموویان پەیوەست بوو بە ڕێکخستنی زەکات و ئاماری ئەو کەسەی کە زەکات پێویست دەبێت لەسەری، و کێ پێویستە بیدات؟ وە ئەو ڕێژەیە چەند کە فەرز دەبێت، ناسینی ئەو کەسەی کە بێ پێویست دەبێت؟ وە ژمارەیان چەندە؟وە بڕی پێویستیەکەیان و ڕێژەی بەس بوونیان، چەندێکی تر لەو کاروبارانەی کە پێویستی بە دەزگای تەواو هەیە لە شارەزایان و پسپۆڕان و ئەوانەش، کە کۆمەکیان دەکەن،[1] بەڵام ئەوانەی کە دڵیان داهێنراوە (المؤلفة قلوبهم)، عومەر بەشەکەیانی بڕی، ئەمەش لەبەر ئەوەی، کە ئیسلام بەهێز بووە لە خەلافەتەکەیدا و پێویستی بە خەرج کردن نیە لە دارایی زەکات بەسەر ئەو پۆلەی کە لە نێو ئەو هەشت پۆلەدایە کە دەقی قورئانیان لەسەر هاتووە،[2] بەڵام لەم سەردەمەی ئێستاماندا هێشتا گێڕانەوە بە هەر شێوەیەك بێت هەر هەیە، کەسانێك هەن کە دڵ داهێنراوی بە سەریاندا دەچەسپێنێت،[3] وە هەندێك لە دوژمنانی ئیسلام و بانگخوازانی مردوو لە موسڵمانان ئەم هەڵەیان قۆستەوە کە عومەر بەشی دڵ داهێنراوانی لابردووە لە سەردەمی خۆیدا و دەربارەی ئەمە چیرۆکیان دەنووسی، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە عومەر(ﷺ) بەم کارەی یەکێك لە دەقە قورئانیەکانی ڕاگرتووە و ئەمەش بانگەشەیەکی ناڕاستە و لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێت.

لەڕاستیدا عومەر(ﷺ) بەشی دڵ داهێنراوانی لەبەر ژیریەك ڕاگرت، ئەوەیە ئیسلام لە سەردەمی یەکەمیدا لاواز بووە بەڵام ئێستا بەهێز و بەدەسەڵاتە، ئەو پێی وابوو کە پێویست بە دڵ داهێنرانی ئەوانە ناکات لە پاش سەربەرزی و سەرکەوتن و بەهێز و دەسەڵاتە.[4]

هەموویان هاودەنگ بوون لەم بڕیاری عومەر ئەم هاودەنگیەش بە ئاسانی دەستەبەر نەبوو بەڵکو لە ئەنجامی قایل کردنیان بوو بەو بیانووانەی کە پاڵی پێوەنا بۆ ڕاگرتنی بەخششی دڵ داهێنراوان بە جۆرێك کە ئیسلام چاوی لە بەهێز و نیشتەجێ بوون هەڵهێناوە ئەمەش وای لێ کردووە کە لە پیاهەڵداندا بێت دەربارەی ژمارەیەکی کەم کە هیچ کێشێکی بۆ نیە، پاش چوونە ناوەوەی گەلانێکی زۆر لە ئیسلام، هەروەك ئەوەی کە ئەمەش جۆرە ترسێك بوو لەو خەڵکانەی کە داوای دڵ داهێنراویان دەکرد، بەڵکو ترسەکەی سەریان ئەوەبوو کە لەسەر ویستی پشت پێ بەستوویی بێننەوە، پاشان مافی ئەمانەش مافێکی میراتگری نیە کە نەوە دوای نەوە بە میراتی وەری بگرن،[5] عومەر دەستەوەستان لەبەردەم ئەم دەقەدا نەوەستا لەوەی کە پەیوەندی بە دڵ داهێنراوانەوە هەیە، لەوە تێگەیشتبوو کە مەبەست لەم دەقە بریتیە لە سەرفرازکردنی ئیسلام، و دامەزراندنی ئەو کەسانەیان موسڵمان بوون، عومەر سەیری هۆی دەقەکەی دەکرد نەك ڕووکارەکەی، بە جۆرێك خوای گەورە ئیسلامی سەرفرازو خەڵکەکەی زۆر کردبوو ئەو دەمە بەخشین— لە ڕوانگەی عومەر کەنەفتی و ڕیسوایی بوو، ئەو هۆیەی

---

١ـ سیاسة المال في الاسلام (ص:١٧٣).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٠٢).
٣ـ سیاسة المال في الاسلام (ص: ١٧٥).
٤ـ سیاسة المال في الاسلام (ص: ١٧٧-١٧٨).
٥ـ الابعاد السیاسیة لمفهوم الأمن في الاسلام (ص: ٣٠٦).

کە لە پێناویدا بوو خوای گەورە لە داهاتی زەکات بەشێکی دیاری کردبوو بۆ دڵ داهێنراوان و لەسەر ئەم بنەمایەش عومەر ئەم بەشەی ڕاگرت و ئەو بەخششەی پێ نەدان، هەر لەسەر ئەم تێگەیشتنە دروستەش ناکرێت کە بڵێین: عومەر کارکردنی بە دەقێکی قورئانی پەیوەست بە بەخشینی دڵ داهێنراوانی بە بەشێك لە زەکات هەڵوەشاندەوە، لەبەر ئەوەی ئەمە قابیلی هەڵوەشانەوە بوو، هەڵوەشانەوەش ناکرێت مەگەر لە لایەنی خاوەنی شەرع و شەرع خۆییەوە بێت و لەسەری بێت و لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ)یش هەڵوەشاندنەوە نیە،[1] بەڕاستی عومەر چاودێری گۆڕانی بارودۆخی ئەو هۆکارانەی دەکرد کە دەقەکانی حوکمی لەسەر بنیات نرابوو، ئەمەش هەروەك پێشتر وتمان لەگەڵ ڕووکارەکانیدا نەوەستاوەتەوە،[2] هەروەك ئەوەی کە خەرجیەکان لە ڕێی ئازادکراوان و دەستەبەری بەڵێنەکان و ئەوانەی لە پێناوی خوادان و ڕێبوارن، قورئانی پیرۆز بایەخی داوە بەڕێبواران و چ بایەخێکیش، بەشێکی لە زەکات و دەستکەوت و پێنج یەکی لە غەنیمە بۆ داناوە، بایەخی ئیسلام بە ڕێبوارانی نامۆ و بێ هاوتایان بایەخێکی بێوێنەیە، نمونەی نیە لە هیچ ڕێکخراوێك یان دەستوورێك لە دەستوورەکانی تر، ئەم بایەخەش جەخت لەسەر ڕێنموونی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکردەکاتەوە، هەروەها عومەر(ﷺ) لەسەردەمی خۆیدا ماڵێکی تایبەتی گرتبوو کە ناوی لێنابوو لانەی ئارد، ئەمەش ئارد و قاووت و خورما و مێوژ و ئەو شتانەی تێدابوو کە پێویستی پێ بوو، میوانان و هەموو ئەو کەسانەی پێ جێگیر کردووە کە لای عومەر لایان داوە و عومەر لە ڕێگەی ڕێبواراندا لە نێوان مەککە و مەدینەدا ئەو شتانەی داناوە کە بۆ ڕێبوار گونجاو و شیاوە، لەئاوەوە بۆ ئاو هەڵدەگرێت،[3] ئەم دیاریکردنەی کە بۆ ئەم هەشت پۆلەیە پێویست دەکات لەسەر دەوڵەت چاوی لێیان بێت و بە دوای بارودۆخیاندا بپروات و پێویستە لە هەر وڵاتێکیشدا چەند تۆمارێك هەبێت، پاشان لە بارەگای سەرەکیدا بۆ دەوڵەت، هەروەها بۆ خێرو صەدەقەش دیوانێکی تایبەت هەبوو لە دارول خەلافەت، لە تەواوی ولایەتەکاندا لە سەردەمی عومەردا پاش ڕێکخستنی دیوانەکان،[4] لقی خۆی هەبووە، سەرنجدان بۆ ئەم هەشت پۆلەی کە ئایەتەکە ناوی بردوون تیایدا تێبینی ئەوە دەکەین کە بەرژەوەندیە ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی لە بانگەواز بۆ جیهاد لە پێناوی خودا گرتۆتەوە، لەگەڵ تەواوکاری سوپا، کارکردن لەسەر زاڵبوون بەسەر هەژاری و بنەبڕکردنی قەرزەکان و ڕاپەڕاندنی پێویستیەکانی ئەو کەسانەی کە خاوەن پێویستین، واتا ئەمە تەواوی داخوازیەکانی کۆمەڵگە و دۆزینەوەی ئاسایش و خۆشەویستی و دڵ داهێنران لە نێوان تاکەکان دەگێتەوە.[5]

---

١ـ الاجتهاد في الفقه الاسلامي (ص: ١٣٢-١٣٣).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٣٤).
٣ـ الطبقات (٢٨٣/٣).
٤ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٨٤).
٥ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٨٤).

### ٢- خەرجیەکانی سەرانە و باج و دەیەك:

عومەر (ﷺ) موچەی خەلیفەکان و کاربەدەستان و سەربازان و بنەماڵەی پێغەمبەر(ρ)و خێزانی موجاهیدان و کەسانی تری خێرخوازی دەستکاری دەکرد.

### موچەی خەلیفە:

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە پێنج، تا شەش هەزار درهەم بۆ خەلیفە عومەر فەرزکراوە.

### موچەی کاربەدەستان:

یان والی هەرێمەکان: لەسەردەمی دەسەڵاتی عومەردا(ﷺ) عومەر بۆ هەر ولایەتێك والیەکی لێبڕاوی ماف پەروەری دانا بۆ دەسەڵات و ئیدارەکەی، هاوکاریکردن بە ژمارەیەك لە هاوکاران و پشتیوانان و باج گران و دادپەروەران و نووسەران و کاربەدەستانی باج و خێر و... هتد، بۆ نوێژ و جەنگ کاربەدەستانێك هەبوو، کە -ئەمیر- بوو- وە بۆ فەراهەم هێنانی داهاتەکانیش کاربەدەستێکی تر هەبوو- وە بۆ ڕووپێوی زەویەکان و دیاریکردنی سەرانە و سەرژمێری چەندین کاربەدەستی زانا هەبوون ، عومەر موچەی بۆ دانابوون بەو شێوەیەی کە گونجاو بوو لەگەڵ پۆستی هەریەکەیان و ئەوەش کە کارەکانیان دەیخواست، بە پێی دوور و نزیکی لەمەدا ئاگای لە هەرێمەکان بوو، خێراتی فەراهەم دەهێنا بە هەرزانی و گرانی، بۆ خەرج کردنیشی کاتێکی نەگۆڕی دانەنابوو کە دوانەکەوێت،[١] ئاخاوتن سەبارەت بە کاربەدەستان بە دوور و درێژی بەیارمەتی خوا لەکاتی لێدوانمان بۆ دام و دەزگای دارایی بینی.

### موچەی سەرباز:

عومەر بایەخی دەدا بەکاروباری سەربازی لەبەر ئەوە دیوانی سەربازی ڕێکخست و لە دابەشکردنی ڕزق و ڕۆزیدا لەسەر بنەمای نزیکی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ەوە پێشینەی لە ئیسلام کاری دەکرد،[٢] بەمەش موچەی بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەنی هاشم بوو کەوتە سەرەتای موچەی یاران و عەباس وەری دەگرت و دابەشی دەکرد بە سەریاندا، پاشان خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ)هاتن کە موچەیەکی تایبەت بۆ هەر یەکێکیان بڕابوویەوە کە سەربەخۆ بوو لە بنەماڵە، بەڵام موسڵمانانی تر بەپێی بەشداربوونیان لە جیهاد لە پێناوی خوادا دابەش بوو بوون بۆ چەند پلەیەك، عومەر بە بەشداربووانی بەدر، پاشان ئەوانەی دوای بەدر لە حودەیبیە، دواتر ئەوانەی لە حودەیبیەوە بۆ دواجەنگی هەڵگەراوەکان، پاشتر ئەوانە دێن کە لەجەنگەکانی قادسیەو یەرمووك و ئەوانی تریان بینیوە، هەروەها بۆ خێزان و منداڵانی جەنگاوەریش مووچەیەکی بڕیەوە هەر لە لەدایك بوونیانەوە و لە منداڵان و دۆزراوان بێ ئاگا نەبوو بەڵکو موچەی ساڵانەی بۆ بڕینەوە، کە کەمترینیان(١٠٠) درهەم

---

١ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ١٩٨).

٢ـ الاحكام السلطانية (ص: ٢٢٧)، سياسة المال (ص: ١١٩).

بوو وە لەگەڵ پێگەیشتنیان زیادی دەکرد،[١] وە بۆ خزمەتکارانیش هەزار تا دووهەزار درهەمی بڕیەوە،[٢] چەندین ڕیوایەت هاتوون کە هاودەنگن لە ژمارەی زۆری بڕیار دراو کە عومەر بڕاری لەسەر داون بۆ موچەی سەربازان و هەندێ ناهاودەنگیش هەیە لەو ڕێژانەدا،[٣] ئەوەی بە ڕاستی هاتووە لە ڕێژەی ئەو موچانە، موچەی سالآنەی خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) (١٠٠٠٠) درهەم بووە جگە لە جویەیریە و صفیە و مەیمونە، کە موچەکەیان لەم ڕێژەیە کەمتر بووە، پاشان موچەکەیان زیادی کرد بۆ(١٢٠٠٠) درهەم جگە لە جویەیریە صفیە و مەیمونە کە موچەیان هەر(٦٠٠٠) درهەم بوو، عائیشە لێرەدا داوای یەکسانی لە نێوان دایکی باوەڕداراندا کرد، عومەر هاودەنگی لەسەر ئەم یەکسانیە دەربڕی، موچەی سالآنەی کۆچکەران و پشتیوانان (مهاجر وأنصار) (٤٠٠٠) درهەم بوو جگە لەوەی، کە عبداللە کوڕی عومەر(٣٥٠٠) درهەمی بۆ بڕایەوە لەبەر ئەوەی کە لە کاتی هیجرەتدا بچووك بووە، واتا وەك ئەو کەسە نەبووە کە خۆی کۆچی کردووە،[٤] عبداللە منداڵ بووە لە کاتی کۆچدا، پاشان هەزار درهەمی تری بۆ کۆچکەران زیادی کرد و بەمەش موچەی سالآنەی گەیشتە(٥٠٠٠) [٥] درهەم، دیارە کە ئەم موچەیەش تەنها بۆ بەشدار بووانی شەڕی بەدر بوو چ لە موهاجیرین و چ لە ئەنصایش،[٦] بەلآم ئەو کەسانەی کە بەشداری حودەیبیە بوون موچەی سالآنەیان تەنها(٣٠٠٠) درهەم بووە،[٧] عومەر(١٠٠) درهەمی بڕیەوە بۆ هەر لە دایك بوویەك، هەروەها موچەی بۆ منداڵانی شیرەخۆر و لە کۆرپە بڕیەوە هەر لە ڕۆژی لە دایك بوونیەوە نەوەك خێرا لە شیری بڕنەوە، بەلآم خزمەتکاران بۆ گەورەکانیان وەك هورمزان کاتێك، کە موسڵمان بوو(٢٠٠٠) درهەمی بۆ بڕیەوە لەگەڵ چەند موچەیەکی تردا، هاوکات لەگەڵ موچەی سالآنەدا عومەر(ﷺ) چەند خەلاتێکی جیاجیای دەبەخشیەوە،[٨] لەگەڵ ئەوەی کە تایبەت کرابوو بۆ هەر تاکێك لەوانەی کە باسکران و زیاتر لەسەر موچەی پێشووی عومەر مانگانە گەنمی دەدانێ،[٩] عومەر لە کۆتا ڕۆژانی خەلافەتیدا دەیفەرموو: ئەگەر دارایی زۆر بووایە ئەوا بۆ هەر کەسێك(٤٠٠٠) درهەمی دەبڕیەوە،(١٠٠٠) درهەم بۆ گەشتی،(١٠٠٠) درهەم بۆ چەك، هەزار درهەم بۆ ئەوەی جێی بێڵێت بۆ کەس و کاری و(١٠٠٠) درهەم بۆ ولآخەکەی،[١٠] عومەر(ﷺ) پێی وابوو کە هەر موسڵمانێك مافی خۆی لە بەیتولمالدا هەیە، لە ڕۆژی لە دایك بوونیەوە تا مردنی، ئەو ئەم بیروباوەڕەی خۆی ئاشکرا کرد لەو وتەیەیدا کە

---

١ـ الطبقات (٣٠١/٣).
٢ـ تأريخ اليعقوبي (١٥٣/٢-١٥٤).
٣ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ٢٠٠).
٤ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٤).
٥ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٤).
٦ـ هەمان سەرچاوە.
٧ـ هەمان سەرچاوە.
٨ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢١٥).
٩ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ٢٠٢).
١٠ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ٢٠٣)، طبقات الكبرى (٢٩٨/٣).

دەفەرموویت: (سیٚ جار) سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لەو، هیچ کەسێك نیە مەگەرنا مافی لەو داراییەدا هەیە کە پێی دەدەم یان ڕێگری لیٚ دەکەم، هیچ کەس لە کەسێکی تر پێی مافدارتر نیە مەگەر بەندەیەکی خزمەتکار، منیش جگە لەوەی کە وەك یەکێکم لە ئێوە هیچی تر نیم، بەلام ئێمە لەسەر شوێنەوارمان لە قورئان و بەشوێنکەوتن لە پێغەمبەری خوداوەیە(ρ)ە پیاو و تاقیکردنەوەی لە ئیسلامدا، پیاو و پێشینەی لە ئیسلام و پیاو و پیاهەڵدانی لە ئیسلام و پیاو و پێویستی و سوێند بە خوا ئەگەر مام ئەوا بۆ خەلکی بە چیای صەنعا لەو ماڵە لە بەختی خۆی دێنم کە ئەمە شوێنیەتی پێش ئەوەی ڕووی داپۆشێت،[1] گرنگ لەوەدایە کە لە ڕوانگەی عومەر(ﷺ) نایەکسانی لە بەشکردنی موچەی نێوان موسلمانان دەبینین، لەگەڵ هاوکاری ڕوونی بۆ نزیکی لە پێغەمبەر(ρ)و گەورە یارانی لە کۆچکەران و پشتیوانان و پشت بەستنی بە پێشینەی لە ئیسلام و تاقیکردنەوەی لە جیهاددا، گومانی تێدا نیە کە ئەو کۆمەڵەی کە داهاتێکی زۆری دەستکەوت لە سەردەمی خەلافەتەکەیدا هەر ئەوانە بوون کە قەلای دەولەتی ئیسلامی لەسەر شانیان وەستابوو، هەروەها ئەو کۆمەڵە زیاتر شارەزاتر و پابەندتر بوون بە دەستوور و مەرامەکانی ئیسلامەوە، زیاتر خوانـاس و گونجـاو بـوون لـە مامەڵـەکردن لەگـەڵ دارایـدا، کەنـەفتی بـۆ بـەدیهێنانی مەرامـە کۆمەڵایەتیەکان بوو لە ڕێگەی خەرج کردنەوە وە هاریکاری کردنی ئابووریانەی ئەم کۆمەڵەیە لە ژمارەی لایەنگرانی لە نێو کۆمەڵگەدا زیاتر دەکات، بە توانا تری دەکات لەسەر ڕاپەڕاندنی بە کاری چاکە و ڕێگە گرتن لە خراپە، تێبینی ئەوە دەکرێت، کە عومەر(ﷺ) سوور بووە لەسەر گۆڕینی سیاسەتی چارەسازی لە بەخشین بەرەو یەکسانی، ئەمەی لە کۆتایی خەلافەتەکەیدا ئاشکراکرد کە فەرمووی: ئەگەر مامەوە ، ئەوا دواین کەس دەگەیەنمە یەکەمیان و دەیان کەمە یەك،[2] واتا وەك یەك– بەلام سەبارەت بە سەرپەرشتیکردنی عومەر بۆ دارایی گشتی ئەوا عومەر بەم وتەیەی هەلوێستی خۆی دەربڕیووە کە دەفەرموویت: خوای گەورە منی کردۆتە خەزنەداری ئەم داراییە و بەشکەری، پاشان فەرمووی بەلام خوا دابەشی دەکات،[3] کاتێك ئەو هەموو داهاتەی بینی کە لە ڕزگارکردنی ناوچەی فارس بۆ بەیتولمال کۆکرایەوە دەستی کردە گریان، کاتێك کە عبدالرحمن کوڕی عەوف باسی ئەوەی کرد کە ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشی و شادی و سوپاسگوزاریە، عومەر فەرمووی: نەخێر ئەمە گەلێك نەیداوە مەگەر ڕق و کینە و دوبەرەکیان لە نێواندا بێت،[4] کاتێك عومەر(ﷺ) سەیری داهاتەکانی ڕزگارکردنی جەلەولای کرد، ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموویت: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ...﴾ (ال عمران: ١٤).

---

١ـ طبقات الكبرى (٢٩٩/٣)، الكتاب الخراج لأبي يوسف (ص: ٥٠).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٦)، الاموال إبن زنجوية (٥٧٦/٢).
٣ـ الاثر الصحيح، عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٦).
٤ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٧)، الاثر صحيح.

فەرمووی: خوای گەورە، هیچ شتێکمان پێ ناکرێت جگە لەوەی کە بەختەوەر بین بەوەی کە بۆت ڕازاندووینەتەوە، خوای گەورە وام لێ بکە کە لە مافی خۆیدا خەرجی بکەم و من پەنات پێ دەگرم لە خراپەکانی.[١]

### ٣- خەرجیەکانی غەنیمە:

سەبارەت بە دابەشکردنی غەنیمەتیش(دەستکەوت) خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی دابەشیان کردووە هەروەك لەو ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە کە دەفەرموویێت:

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ﴾(الانفال: ٤١).

بەڵام چوار بەشەکەی تری کە دەمێنێتەوە لە نێوان ئەوانەدا دابەش دەکرێت کە غەنیمەتەکەیان گرتووە، سوارچاك سێ بەشی هەیە کە دوو بەشی بۆ ئەسپەکەی و بەشێکی بۆ خۆی دەبێت و پیادەش یەك بەش وەردەگرێت،[٢] پێغەمبەر(ﷺ) لە ژیانیدا بەشێکی هەبووە کە دابەشی دەکرد بەسەر خۆی و خێزانەکانیدا، ئەوەی مایەوە لەو بەشانە دەیخستە بەرژەوەندی گشتی و دابەشی دەکرد بەسەر خەڵکانی نەدار و کەم دەستدا، خزمانی پێغەمبەر(ﷺ) لەم بەشەی دووەمیان هەبوو، کە هۆزی بەنی هاشم و عبدالمطلب و ئەوانە بوون کە ملکەچ بوون بۆ ئیسلام و بانگەوازەکەی گرتنیەوە، خەڵکی لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) چەند دەنگ بوون لەسەر ئەو دوو بەشە، کە بەشێکیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و بەشەکەی تر بۆ خزمانی بوو، کۆمەڵێك وتیان: بەشەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەمەودوا بۆ خەلیفە دەبێت و کۆمەڵێکی ترش وتیان: بەشی خزمانی بۆ خزمانی پێغەمبەر(ﷺ) دەمێنێتەوە، کۆمەڵێکی تر وتیان: با لە پاشی ئەو بەشی خزمانی ئەو بۆ خزمانی خەلیفە بێت، کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم دوو بەشە بخەنە نێو سەر و پێ و چەکەوە،[٣] وە بەمەش تایبەتمەندیەکانی ئەو دوو بەشە لە بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان خەرج کرا وەك ئامادەکاری سوپا، و بنەبڕکردنی دەروازە و کارکردن لەسەر بەهێزکردنی دەوڵەت و جێگیرکردنی، لەسەردەمی خەلیفەی دووەم عومەردا(ﷺ) بەڵام تایبەتمەندیەکانی هەژار و نەداران و ڕێبواران، هەروەك ڕۆژانی پێغەمبەر(ﷺ) مایەوە، لە سەردەمی عومەردا(ﷺ) هیچ گۆڕانکاری و چاکسازیەکی بەسەردا نەهات.[٤]

ئەمە هەندێ لە هێما دیارەکانی سەر دام و دەزگای دارایی بوو لە سەردەمی عومەردا کە چۆن کاری لەسەر پێشخستنی کردووە، عومەر(ﷺ) زۆر لە خواترس بووە لە بەرامبەر دارایی گشتی و ئەمەش لەو وتەیەیدا دەردەکەوێت کە دەفەرموویێت: من هەواڵتان دەدەمێ بەوەی کە شیاوە لە ماڵی

---

١ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٧)، الاثر الحسن.
٢ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٢).
٣ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٢).
٤ـ سياسة المال في الاسلام (ص: ٢٠٥-٢٠٦).

خوا، پۆشاکی زستان و سەختی گەرما و ئەوەی کە حەجی لەسەر دەکەم و عەمرەی لە پشت دەکەم، لەگەڵ خواردنی منداڵەکانم وەك پیاوێکی قوڕەیشی نە بە دەوڵەمەندترینیان و نە بە هەژارترینیان، من پیاوێکم لە موسڵمانان و ئەوەم پێ دەکرێت کە بەوانیش دەکرێت،[١] هەمیشە دەیفەرموو: خوای گەورە من هیچ ناخۆم جگە لە ژەمەکەی خۆم، هیچ ناپۆشم جگە لە پۆشاکی خۆم، جگە لە مافی خۆشم هیچی تر وەرناگرم،[٢] هەروەها دەیفەرموو: من سامانی خودام بەسەردا باریووە وەك شوێنەواری ماڵە هەتیوێك، هەر کەس کە دەوڵەمەندە با خۆی لە خواردنەوە بگرێتەوە و هەر کەسیش هەژار بوو با بە چاکی بخوات.[٣]

### ٤- ئەو کارانەی کە پەیوەستە بە پێشخستنی باری ئابووری لە دەوڵەتدا:

#### - دەرکردنی دراوی ئیسلامی:

دراو لە کانزا بە نرخەکانی وەك زێڕ و زیوە، ئەمەش هۆکارێکی پێویستە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی تایبەتی و گشتی، بە تایبەتی لە نێوان گەلان و دەوڵەتاندا، ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لەم بابەتە — ئەوەیە کە ئیسلام دەوڵەتێکی هەیە کە موسڵمانان و ناموسڵمانانیش تیایدا دەژین، دەوڵەتانێك بوونەتە هاوسێی کە خاوەن یاسا و شارستانیەتن، بەردەوام مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا دەکەن لە سەردەمی دەسەلاتی عومەر و خەلیفەکانی تر و ئەمیری موسڵمانان — کە ئەمەش لایەنی ڕێکخراوەیی ئیداریە کە عومەر سەبارەت بە دراو گرتیە بەر، چ جا لە نێو دەوڵەتی ئیسلامیدا بێت یان لە ڕۆڵی جەنگەکانی تردا،[٤] زانیاریە شەرعیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە: عومەر لەسەر مامەڵەکردن بەو دراوە مایەوە کە لە پێش ئیسلام و پاشان لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکردا مامەڵەی پێوە دەکرا بەوەی کە نەخش و نیگاری و هیرەمکی و مەسیحی و کیسرای پێوە بووە نیگاری ماڵی ئاگرینی لەسەر دروست کراوە، عومەر لەسەر پێوەرە فەرمیە ناسراوەکەی لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر وەك خۆی هێشتەوە، تەنها وشەی شیاوی بۆ زیاد کردن هەتا لە ڕازاندنەوە سەختەییەکان جیای بکاتەوە،[٥] ئەوەی کە بڕیاری پارەی پوول لێدراوی دا لە دەرەوە و دانی نا بە مامەڵەکردن پێی و بڕیاری درهەمی ڕێگە پێدراوی لە ئیسلامدا دا عومەر بوو(رضي الله عنه)ن ماوردی دەڵێت: عومەر ئەو کەسە بوو کە ڕێژەی درهەمی شەرعی دیاری کرد،[٦] مەقریزی دەڵێت: یەکەمین کەس، کە لە ئیسلامدا پارەی لێدا عومەر بوو کە لە ساڵی(١٨)ی کۆچی لەسەر نەخشی کیسرایی لێدا و ئەوەی تیایدا زیادی کرد بریتی بوو لە وشەی: (الحمد لله) و لە هەندێکیشیاندا وشەی(لا الـه الا الله)بوو، لە

---

١ـ تأريخ المدينة لأبن شبه (٦٩٨/٢) الاثر صحيح.
٢ـ هەمان سەرچاوە. (٦٩٨/٢)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٨).
٣ـ الطبقات (٣١٣/٣)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢١٨).
٤ـ الادارة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب (ص: ٣٦٤).
٥ـ المصدر نفسه (ص: ٣٦٦).
٦ـ الاحكام السلطانية (ص: ١٤٧)

هەندێکی تریاندا ناوی خەلیفە عومەر هاتبوو،[١] وە لە سەرو ئەمانەشەوە عومەر(ﷺ) ڕێکخستنێکی تایبەتی بۆ هۆکارێك لە هۆکارە پێویستیەکانی ژیانی موسڵمانان و ئەوانی ترش دانا لە سەردەمی دەسەڵاتیدا، خەلیفەکانی ڕاشیدین و ئەوانی ترش بە تایبەتی ئەوانەی لەم کارەیان لەگەڵ پێشکەوتنی شار و شارستانیەتدا پێش خستووە شوێنی کەوتوون.[٢]

## - بەخشین:

ئەبو بەکر(ﷺ) لەسەر چەسپاندنی سیاسەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام بوو لە دابەشکردنی زەوی بە خواستی چاکسازی کردنی، بۆیە زەویەکی بیابانی لە نێوان لاپاڵ و نۆکەتدا بەخشیبوویە زوبێری کوڕی عەوام[٣] و زەویەکی دابوویە مەجاعەی کوڕی مەرارەی ئەلحەنەفی و (کە گوندێك بوو لەیەمامە) بەنیاز بوو زەویەکی جار بداتە عویەینەی کوڕی حەسن ئەلفزاری و ئەقرەعی کوڕی حابسی ئەلتەمیمی بە مەبەستی چاککردنی و پاشان لەسەر ڕای عومەر(ﷺ) پاشگەز بوویەوە و لەبەر پێویست نەبوونی دڵ داهێنراویان لەسەر ئیسلام، عومەر(ﷺ) پێی فەرموون: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دەمە دڵی دادەهێنان لەبەر ئەوەی کە ئیسلام لاواز بوو، خوای گەورە ئیسلامی سەرفراز کرد، ئێوەش بڕۆن هەوڵی خۆتان بدەن،[٤] ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم پەڵپ گرتنەی عومەر لەسەر بنەمای بەخشین نەبوو بۆ چاکسازی زەویەکان بەڵکو لەسەر کەسەکان بوو چونکە بە چاوی خۆی دڵ داهێنرانی لەسەر ئیسلام نەدەدین، عومەر(ﷺ) بەرفراوانی دا بە بەخشینی زەویەکان بەمەبەستی چاکسازی یان بۆ درێژەدان بە سیاسەتی پێغەمبەر(ﷺ)،عومەر جاڕیدا و فەرمووری: ئەی خەڵکینە، هەر کەس زەویەکی مردووی زیندوو کردەوە ئەوا بۆ خۆیەتی،[٥] پشتگیری شوێنەوارە لاوازەکان بۆ ئەوەیە کە عومەر دڵنیا بێت لە هەڵکێشانی مولکایەتی زەوی پارچەپارچەکراو ئەگەر چاکسازی بۆ نەکرا، ڕیوایەتێکی لاواز بۆ ئەمە سێ ساڵ لە مێژووی بەخشینی دیاری دەکات، بەخشینی عومەر بە پارچە زەویەکی بیاباناوی بۆ خوتی کوڕی جوبەیرو،[٦] زەیەکی حەوتم بۆ زوبێری کوڕی عەوام و زەویەکی پاراو بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالیب، کە ئاوێکی زۆری تێدا هەڵدەقوڵا ئەمەی سەلماند و عەلی(ﷺ) هاودەنگی بوو لە چاکەکردن بەسەر هەژاراندا، چەندین نیشانەی لاواز هەن بۆ بەخشینی زەوی بە ژمارەیەکی تر لە یارانی.[٧]

---

١ـ شذور العقود في ذكر النقود (ص: ٣١-٣٣).
٢ـ الادارة العسكرية في عهد عمر (ص: ٣٦٧).
٣ـ الطبقات الكبرى (١٠٤/٣)، الاثر صحيح، عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢٠).
٤ـ البخاري، التأريخ الصغير (٨١/١)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢١).
٥ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ٢٢١)، الاثر صحيح.
٦ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٢١).
٧ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٢١).

# دوانگەی دووەم

## دام و دەزگای دادوەری

کاتێك کە ئاینی ئیسلام پەرەی سەند، سنووری دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەردا بەرفراوان بوو، موسڵمانان پەیوەست بوون بە کەسانی تروە و حاڵەتی شارستانیەتی نوێ بانگەشەی بۆ پێشخستنی دام و دەزگا دادوەریەکان کرد و سەرقاڵیەکانی خەلیفە زیادی کرد، کاری والیەکان لە شارەکاندا لقی فرەی لێ بوویەوە و دووبەرەکی و تێك هەڵگژان زیادی کرد، بۆیە عومەر(ﷺ) وای بە چاك زانی کە ولایەتەکان لە یەکتری جیابکاتەوە و دەسەڵاتی دادوەری بکاتە دەسەڵاتێکی سەربەخۆ، هەتا والی خۆی یەکلابکاتەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاری ولایەتەکەی، عومەر بۆ دام و دەزگا دادوەریەکان دادوەری سەربەخۆی دادەنا، لە ولایەتەکانی تر، وەك ولایەتی دەسەڵات و بەڕێوەبردن عومەر یەکەمین کەس بوو کە بۆ دادوەری ولایەتێکی تایبەتی دانا، چەندین دادوەری لە ناوچە ئیسلامیەکان دامەزراند، لە شاری کوفە و بەسرە و شام و میسر، دادوەری کردە دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆ، ئەگەرچی دامەزراندەکە لە خەلیفە دەبێت یان بەدەسەڵات پێدانی یەکێك لە والیەکان بێت بەمە و لە بری ئەو، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە سەرکردایەتی ئیسلامی لەکەسایەتی عومەر ڕەنگی دەدایەوە، عومەر دانەبڕابوو لە ڕێسا سەرەکیەکان، لە ڕێکخستنی دەوڵەت و ڕێککردنی کارەکانی ودیاری کردنی دەسەڵاتی، ئەگەر ئەوروپا بە شێوەیەکی تیۆری لە سەدەی هەژدەدا ئەمەی ئاشکرا کردبێت، بە ئازادیەکی نوێی دانابێت لە ڕێکخستنی دەوڵەتدا، لە چاودێری کردنی مافی هاوڵاتیان، ڕۆژێك، کە(مۆنتیسکۆ) لەکتێبەکە (روح الشرائع) دەربارەی ئەوە دوابێت، بەڵام بەجێ هێنانێکی کردەیی بۆ ئەم ڕێسایە نەنووسیووە مەگەر لە سەرەتاکانی سەدەی(١٩)د نەبێت، واتا دوای شۆڕشی فەرەنسی، ئیسلامیش پێش چواردە سەدە بڕیاری لەسەر داوە، بە بنەمایەك لە بنەماکانی یاساکەی داناوە و ئەم بنەمایەش هەر لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا بووە کاتێك موعازی نارد بۆ یەمەن پرسیاری لێ کرد: ((بە چی دادوەری دەکەیت؟)) موعاز وتی بە قورئان ، ئەگەر لە قورئاندا نەبوو ئەوا بە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەگەر لەوەشدا نەبو ئەوا بە ڕای خۆی و بەبێ ڕادە بەرزی ناکاتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئەمە دایمەزراند،[1] بەڵام عومەر، هەستا بە پێشخستنی دام و دەزگای دادوەری و ئەوانەی کە لە کارەکاندا پابەندە پێوەی، لە سەردەمی ئەودا بنەمای جیاکردنەوەی دادوەری لە دەسەڵاتەکانی تر لە ژیانی خەڵکیدا ڕوون و ئاشکرابوو، هەروەها سەربەخۆیی ولایەتی دادوەری بۆ عومەر(ﷺ) ڕێگری نەبوو لەوەی کە جیابکرێتەوە لە هەندێ کێشە، پێ دەچێت عومەر لە هەندێ والیەکانی گەرابێ

---

١ـ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي (٥٣/٢).

کەلەگەڵ دەسەڵاتی ڕاپەڕاندندا بە دوای کارەکاندا بڕۆن، لە کاروباری دادوەریدا نامەی بۆ دەناردن، پەیامی بۆ موغیرەی کوڕی شوعبە بە کاری دادوەری نارد و لە سەرەتا کردیە والی لە بەسرە و پاشان لە شاری کوفەی دانا، پاشان پەیامی بۆ موعاویە ناردووە لە کێشە دادوەریەکاندا کردیە والی لەسەر شام، دواتر پەیامی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری ناردووە لە هەندێ کێشەی دادوەریدا، عومەر دادوەریکی بۆ تەواوی ولایەتەکە دامەزراند، ئەگەرچی دامەزراندنی لە لایەن خەلیفە دەبێت یان لە لایەن والی ناوچەکە دەبێت بە فەرمانی خەلیفە، بارەگای دادوەر ئامادەی ولایەت دەسەڵاتی قەزائیش لە ولایەتەکەیدا دەگەڕایەوە بۆ خۆی،[1] وە بە زۆری دەسەڵاتە دادوەریەکان لە ولایەتە گەورەکان جیاکردنەوەی تەواوکرا، وەك کوفە و میسر، بۆ هەندێ لە والیەکانیشی پیشەی والیەکان و دادوەری کۆدەکردەوە ئەگەر کاری دادوەری ڕێگری کاری ولایەتەکەیان نەبوایە، لە کاروباری دادوەریدا بەم شێوەیە پەیامی بۆ دەناردن، هەندێ جار خۆی هەڵدەستا بە دادوەری لە هەندێ گرفتدا ئەگەر لەو شارەشدا دادوەر هەبوایە،[2] وە لەو دادوەرانەی کە عومەر لە خەلافەتەکەیدا تەنها بۆ کاری دادوەری دانابوون ئەمانە بوون:

- **عبدالله کوڕی مەسعود:** عومەر کاری دادوەری کوفەی پێ سپارد، قەتادە دەگێڕێتەوە، لە مەجلەزەوە کە عومەرعەماری کوڕی یاسری نارد بۆ نوێژخوێنی خەڵکی کوفە و عبدالله ی کوڕی مەسعودی نارد بۆ سەر بەیتولمال و کاری دادوەری.[3]
- **سەلمانی کوڕی ڕەبیعە:** عومەر کاری دادوەری شاری بەسرە و دواتر قادسیەی پێ سپارد.
- **قەیسی کوڕی ئەبولعاصی ئەلفورەشی:** عومەر کاری دادوەری لە میسر پێ سپارد.

وە لەوانەش کە کاری والی و دادوەریان پێ سپێردرابوو لەوانە:

- **نافع ئەلخوزاعی:** والی مەککە، إبن عبدالبر باسی ئەوە دەکات کە عومەر لەسەر مەککە بەکاری هێنا لە کاتێکدا کە چەندین گەورە پیاوی قورەیشیان تێدابوو، پاشان لە پۆستەکەی لایبردو خالدی کوڕی ئەلعاصی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی مەخزومی لە شوێنی کردە والی.[4]
- عەلی کوڕی ئومەییە بۆ والی سەنعا.
- سوفیانی کوڕی عبدالله ئەلسەقەفی بۆ والی تائیف.
- موغیرەی کوڕی شوعبە بۆ والی کوفە.
- موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان بۆ والی شام.
- ئەبو موسای ئەشعەری بۆ والی بەسرە.
- عومەیری کوڕی سەعد والی حەمس.

---

١ـ القضاء في الاسلام، عطية مصطفى (ص: ٧٧).
٢ـ النظام القضائي في العهد النبوي والخلافة الراشدة، القطان (ص: ٤٧).
٣ـ أخبار القضاء الوكيع (١٨٨/٢).
٤ـ النظام القضائي في العهد النبوي (ص: ٤٩).

لەنێو ئەمانەدا کەسانێك هەبوون کە عومەر لەگەڵ ولایەتدا لەسەر کاری دادوەری هێشتنیەوە، وەك ئەوەی کە لەگەڵ موعاویەدا کردی، بۆ هەندێکیان کاری دادوەری لە دەستەڵاتەکەی جیاکردەوە و تەنها کاری والیەتی پێ سپارد وەك ئەوەی کە لەگەڵ موغیرە و ئەبو موسای ئەشعەری کردی، لە دادوەرەکانی عومەر لە شاری مەدینەدا ئەمانە بوون:

- عەلی کوڕی ئەبو تالیب.
- زەیدی کوڕی ثابت(ﷺ) نافع دەگێڕێتەوە: کە عومەر زەیدی کوڕی ثابتی بۆ دادوەری مەدینە بەکارهێناوە و مووچەشی بۆ بڕیەوە.[1]
- سائب کوڕی ئەبو زەید.[2]

## یەکەم: لە گرنگترین نامەکانی عومەر بۆ دادوەران:

عومەر(ﷺ) دەستوورێکی تۆکمەی لە ڕێسا و یاسای دادوەری و دادکردندا دانا، زۆرێك لە ڕاگەیاندنە فیقهیە ئیسلامیەکان بایەخیان بە شیکاری ئەم دەستوورە داوە و لەسەری هاتوونەتە دوان، یاسای عومەر لە کاری دادوەریدا لە پەیامێکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری بەدی دەکەین، کە ئەمە دەقەکەیەتی: بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، لە بەندەی خوا عومەری کوڕی خەتاب ئەمیری باوەڕداران بۆ عبدالله کوڕی قەیس،[3] سڵاوت لێ بێت، پاشان، بەڕاستی کاری دادوەری فەرزێکی گەورەیە و سونەتێکی بەجێماوە، تێبگە ئەگەر گۆیەندم بۆ سازدای، بە ڕاستی قسەکردن سوودی نیە بە مافێك، کە پێکهاتنی نەبێت ڕێك ببە لە نێو خەڵکی لە ڕووتدا و لە دادپەروەری و لە کۆبوونەوەتدا، هەتا دەسەڵاتدار چاو نەبڕێتە ستەمت، بێ دەسەڵات بێدار نەبێت لە ماف پەروەریت، بەڵگە لەسەر ئەو کەسەیە کە دەوا چیە، سوێندیش لەسەر ئەو کەسەیە نکۆڵی دەکات، ئاشتەوایی شتێکی گونجاوە لە نێوان موسڵمانان مەگەر حەرامێك حەڵاڵ بکات، یان حەڵاڵێك حەرام بکات، دادوەری ڕێگریت لێ نەکات لە کێشەیەکی دوێنێدا، کە عەقڵت تیا بەکارهێناوە و ڕێنمایی کرابێت تیایدا بۆ ژیریت بە جۆرێك کە بگەڕێتەوە بۆ لای حەق، بە ڕاستی هەق کۆنە، پیاچوونەوەی هەقیش باشترە لە کشان بەناو پوچەڵیدا، تێگەیشتن تێگەیشتنە لەوەی کە ورتە ورتێکەو لە سنگدایە لەوەی کە لە قورئان و سوونەتدا نیە، پاشان لەیەك چووەکان و پەندەکان بناسە، لەمەدا کارەکان توند و تۆڵ بکە، خۆت داڵدە بدە بۆ نزیکترینیان لای خودا، لەو چووترینیان بۆ هەقە، بۆ ئەوە کەسەی کە بانگەشە دەکات مافێکی نادیار یان بەڵگەیەکی درێژخایەن دابنێ کە کۆتایی پێ دێنێ بۆی، ئەگەر بەڵگەکەی هێنا ئەوا مافەکەی بۆ وەردەگرێتەوە وە ئەگەرنا کێشەکەی لەسەر دەچەسپێنێ، بە ڕاستی ئەمە ڕێکترە بۆ گومان، و دەرچوونە لە نابینایی، موسڵمانان هەموویان وەك یەکن، هەندێکیان لەسەر هەندێکیان مەگەر

---

١ـ أخبار القضاء الوكيع (١/١٠٨).
٢ـ وقائع ندرة النظم الاسلامي في أبي طيي (١/٣٧٥).
٣ـ عبدالله بن قيس هو أبو موسى الاشعري.

ئەوانەیان کە لەسەر سنوور بەزاندن جلەویان لیٚ درابیٚت، یان شایەتیەکی درۆی لەسەر تاقی کرابیٚتەوە، یان ناکەس بیٚت لە دۆستایەتی دا، دووری خستنەوە لە ڕابەری و ئیمان، نەکەی کەم ئارام بیٚت، و سەخڵەتی و ئەزیەتت هەبیٚت بۆ بەرامبەرت وەنکوڵی کردن لای دژەکان، بە ڕاستی دادوەری لە هاولاٚتیانی هەق خوای گەورە پاداشتی پیٚ گەورە دەکات، زانراوی پیٚ چاك دەکات، هەر کەس نیازی دروست بیٚت و ڕوو بکاتە ناخی خۆی ئەوا خوای گەورە لەوەی نیٚوان خۆی و خەڵکیدایە ڕزگاری دەکات، هەر کەس شتیٚك بخولقیٚنیٚت بەوەی کە خوا دەیزانیٚت ئەوا لە ناخیدا هیچ شتیٚك نیە کە خوا ڕەخنەی ئاراستەی بکات، ئەی گومانت چیە بە پاداشتی خودایی لە زوو ناردنی ڕزقی موسڵمانانی ڕەحمەتی و سەلام،[1] ئەم پەیامە سەرسووڕهیٚنەرە داب و نەریتی دادەوری کۆکردەوە، لەگەڵ بنەماکانی دادگایی کردن، زانایان سەرقاڵ بوون بە ڕاڤەی و لیٚدوان لەسەری لە ماوەی ئەم چەند سەدە دوور و دریٚژەدا و بەردەوام و تا ئیٚستاش ئەم پەیامە شویٚنی سەمەرە و گەورە بوونە بۆ هەموو ئەوانەی کە چاوی پیا دەخشیٚنن، ئەگەر ئەمە هی عومەر نەبووایە، ئەوا لە گەورە بیریاران و خاوەن دەستووران پیٚی دەهاتنە هەژمار، ئەگەر سەرکردەی ولاٚتیٚك لەم ڕۆژانەدا بینووسیایە کە چەندین یاسا و ڕیٚسای دادگایی کردنی تیٚدا بلاٚوبۆتەوە، تویٚژینەوەش تیایدا هەر لەوەیە کە منداڵان لە قوتابخانەکاندا دەیخویٚنن، ئەوا ئەمە دەبوویە شتیٚکی گەورە لیٚی، ئەی چۆنە کە عومەر نزیکەی(١٤) سەدە لەمەوبەر نووسیویەتی و لە هیچ کتیٚبیٚکەوە وەری نەگرتووە و لە هیچ کەسەوە پیٚی نەگەیشتووە، بەڵکو لە هزرو هۆشی خۆیەوە هیٚناویەتی، ئەمەش یەکیٚکە لە هەزاران، چیٚنراوی پیرۆز کە پیٚغەمبەر(ﷺ) لە ناخیدا چاندوویەتی، کاتیٚك کە عومەر چوویە ژورەوە بۆ ماڵی ئەرقەم فەرمووی: شاهیٚدی دەدەم کە یەك پەروەردگا هەیە ئەویش خودایە و محمد پیٚغەمبەری(ﷺ) خودایە،[2] لە گرنگترین پەیامەکانی ئەم بوارە پەیامی عومەر بوو بۆ ئەبو عوبەیدە(ﷺ): دوای ئەوە من پەیامیٚکم بۆ ناردوویت کە خیٚرم بە تۆش و خۆشم نەبەخشیوە، پابەند بە بە پیٚنج سیفەتەوە کە دینت بۆ سەلامەت دەکات، بە باشترین بەختەوەریەوە خۆت دەگریت: ئەگەر دوو دژ هاتنە لات تۆ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا و هاوچەشنت لەسەرە، کە لیٚیان داوا بکەیت، لەگەڵ باوەڕی بڕندە، گویٚ بۆ کەسانی بیٚ دەسەلاٚت بگرە هەتا زمانیان دیٚتە گۆو دڵیان بویٚر دەبیٚت، دەستەبەری غەریبان ببە چونکە ئەگەر بەند بکریٚت ئەوا پیٚویستی خۆی لیٚ دەگەریٚت و دەڕوات بۆ لای کەس و کارەکەی، ئەوەی کە پووچی دەکاتەوە هەر کەسیٚکە کە سەری پیٚ بەرزدەکاتەوە، سووربە لەسەر ئاشتەوایی ئەگەر دادوەریەکە بۆ تۆ ڕوون نەبوو و سلاٚو،[3] عومەر(ﷺ) لە بارەی دادەوە نامەیەکی نوسی بۆ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان: من نامەیەکم بۆت نووسیووە لە کاری دادەوریدا کە خیٚرم بۆ تۆش و بۆ خۆم نەبەخشیووە، پابەند ببە بە پیٚنج سیفەتەوە هەتا ڕیٚڕەوی ئاینەکەت بۆ بگریٚت، تیایدا باشترین بەختەوەری بەدی دەکەیت، ئەگەر دوو دژ هاتنە

---

١ـ إعلام الموقعين لإبن القيم (١/٨٥).

٢ـ أخبار عمر (ص: ١٧٤)

٣ـ مجموعة الوثائق السياسية (ص: ٤٣٨).

لات پێویستە لەسەرت داوای بەڵگەی ڕوون و سوێند خواردنی بڕاوە بکەیت، گوێ بۆ بێ دەسەڵات بگرە هەتا دڵی گرژ دەبێت و زمانی پاراو دەبێت چونکە ئەگەر تۆ دەستەبەرداری نەبیت واز لە مافی خۆی دێنێت، دەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کاری، بە ڕاستی مافی خۆی لەدەست دەدات کەسێك کە بەزەیی پێدا نەیەتەوە، ڕێك بە لە نێوانیاندا لە سەرنج و لاکردنەوەتدا ئاشتەوایی بکە لەنێوان خەڵکیدا، ئەگەر هات و دادکردنەکەت لا ڕوون نەبوو،[1] نامەیەکی بۆ شریحی دادوەر لە بارەی ئیجتیهادەوە نووسی: ئەگەر کێشەیەکت هاتە بەر دەست ئەوا بەو شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵ بکە کە لە قورئاندا هاتووە، ئەگەر ئەو کێشەیە چارەسەری لە قورئاندا نەبوو ئەوا بە سوونەت چارەسەری بکە، ئەگەر کێشەکە چارەسەری لە قورئان و سونەتدا نەبوو وە کەس لەسەری نەدوابوو بە هەر شێوەیەك ویستت چارەسەری بکە، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ئەگەر توانیت بە ڕای خۆت هەوڵی چارەسەرکردنی بدەیت ئەوا لێی برۆ پێشەوە، ئەگەر ویستت دوای بخەیت ئەوا دوای بخە وە من دواخستن بە هیچ نابینم جگە لەوەی کە چاکەی تۆی تێدایە.[2]

توێژەر دەتوانێت لە میانی نامەکانی عومەر و ژیانی لە سەردەمی خەلافەتدا ئەوە دەربهێنێت کە پەیوەندی بە دام و دەزگای دادوەریەوە هەیە لە ڕزق و ڕۆزی و لە کار کەنار خستندا، لەگەڵ جۆرەکانی دادوەر و سیفەتەکانی و ئەوەی کە پێویستە لەسەریان، لەگەڵ هەندێ لە یاساکانیان و ملکەچی خەلیفە خۆی بۆ دادگا و چەندین کێشە و گرفتی تری پابەند بەم بابەتەوە.

## دووەم: دامەزراندنی دادوەران و ڕمووچەیان و پسپۆڕیەکانی دادوەریان:

### ١- دامەزراندنی دادوەران:

دامەزراندنی دادوەران ڕاستەوخۆ لەلایەن خەلیفە دەبوو، عومەر ڕاڤەکارێکی لە کوفە دامەزراند، یان دامەزراندنی لای والیەوە دەبێت بە سەرپشك کرانی لە خەلیفەوە، هەروەها عەمری کوڕی عاصی کردە والی میسر و عوسمانی کوڕی قەیسی کوڕی ئەبی عاصی تیا کردە دادوەر، مافی دامەزراندنی دادوەر بۆ خەلیفە بوو، ئەگەر بیویستایە خۆی دایدەمەزراند، وەئەگەرنا دەیسپارد بە والیەکەی و دامەزراندنی دادوەرانیش ڕێگر نەبوو لەبەردەم ئەوەی کە خەلیفە خۆی ئەو کارە بگرێتە دەست، لەبەر ئەوەی کە دادوەری بەشێك بوو لە دەسەڵاتەکانی، هەر دەبوو، کە بە داد دەست بەرداری کەسانی تر دەبوو وە مافی یەکەم لە دادوەریدا بۆ خۆی گەڕاوەتەوە و دادوەر سیفەتی دادوەری بەدەست ناهێنێت مەگەر خەلیفە خۆی دایمەزرێنێت، یان والیەکەی،[3] بۆ خەلیفە هەیە، کە دادوەر لەکاری بخات بە هۆی کارێکەوە، کە پێویست بەوە بکات، تەنانەت ئەگەر کەسایەتی دادوەر ڕەویەوە و دەسەڵاتی حوکمی لەدەست دا وە، یان ئەوەی لەسەر چەسپا، کە بە ئەرکی دادوەری هەڵناسێت، ئەگەر هۆکارێکی

---

١ـ البيان والتبين (٢/١٥٠).

٢ـ جامع بيان العلم وفضله (٢/٧٠).

٣ـ النظام القضائي، مناع القطان (ص: ٧٢-٧٣).

نەدیتەوە بۆ لەکار خستنی ئەوا باش وایە لەسەر کارەکەی لای نەبات، لەبەر ئەوەی کە دادوەر بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان دامەزێنراوە، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە بەرژەوەندیەکە دەستەبەر بووە،[١] عومەر هەندێ لە دادوەرانی لابردو لە بری ئەوان کەسایەتی تری دانا لە شوێنیان،[٢] هەروەك ئەوەی کە ئەبو مەریەمی حەنەفی لە کار خست، چونکە لاوازی تێدا بەدی کرد و لەسەر کارەکەی لای برد.

## ٢- مووچەی دادوەران:

عومەر(ﷺ) ئامۆژگاری والیەکانی دەکرد کە کەسانی باش هەڵبژێرن بۆ کاری دادوەری، بە پێدانی ئەو موچانەی کە بەشیان دەکات،[٣] عومەر نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو عوبەیدە و موعاز: سەیری پیاوانی باش بکەن و بەکاریان بهێنن لەسەر کاری دادوەری ومووچەیان بدەن،[٤] دکتۆر عومەری موچەی هەندێ لە دادوەرانی سەردەمی عومەر داناوە بەم شێوەیە: سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی ئەلباهلی(بەسرە) ٥٠٠ درهەم بۆ هەر مانگێك، شورەیحی دادوەر (کوفە) ١٠٠ درهەم بۆ هەر مانگێك، عبداللە کوڕی مەسعود ئەلهەزلی(کوفە) ١٠٠ درهەم و ١\٤ی مەڕێك بۆ هەر ڕۆژێك، عوسمانی کوڕی قەیس کوڕی ئەبی عاص(میسر) ٢٠٠ دینار، قەیس کوڕی ئەبی عاص ئەلسەهمی(میسر) ٢٠٠دینار بۆ میوانخانەکەی.[٥]

## ٣- پسپۆڕی دادوەری:

دادوەر لە سەردەمی خەلافەتی ڕاشیدیندا لە هەموو کێشەکان دا قسەی دەکرد ئیتر هەر جۆرێك بوایە، لە بەرهەڵستی دارایی، لە کاروباری خێزان، تۆڵە سەندنەوە، لە هەموو ئەو کارانەی کە گرفت و کێشەی تێدابوو، ئەمڕۆ شتێك نیە کە ئاماژە بەوە بکات کە ناسراوە بە پسپۆڕی دادوەری جگە لەوەی کە لە دۆستایەتی کردنی سائب کوڕی یەزید کوڕی أخت ئەلنەمر لە وتەیەکی عومەردا هاتووە بۆ ئەو کە دەفەرموویت: خەڵکی لەسەر درهەمێك و دوو درهەم بگەڕێنەوە سەرم،[٦] دەکرێت خەلیفە دەستبەرداری دادوەر بێت کە لە کێشەیەکدا دادوەری خۆی بە کات بە دیاریکردنی و کۆتایی بە پسپۆڕیەکەی هێنابێت لە سەرنجدان تیایدا، دادوەران لە مافی شارستانی و باری کەسێتیدا دادوەری خۆیان دەکەن، بەڵام تۆڵە سەندن ئەوا حوکم و فەرمانداری تیایدا بۆ خەلیفەیە، لەگەڵ فەرماندەی شارەکاندا، دەکرێت کە هاودەنگ بن لەسەر فەرمانەکە، پاشان هاودەنگیەکە لەسەر بەجێهێنانی سنووردانان بە کوشتن تەنها لە لایەن خەلیفەوە دەبێت، مافی پشت ڕاست کردنەوە لەسەر حوکمی تۆڵە سەندنەوە بێت کوشتن بۆ والیەکان دەمێنێتەوە، دادوەر شوێنێکی نەبووە، بەڵکو دادوەر کاری خۆی لە

---

١ـ مغني المحتاج (٣٨٢/٤)، النظام القضائي (ص: ٧٧).
٢ـ النظام القضائي (ص: ٨٧٧).
٣ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٣).
٤ـ النظام القضائي (ص: ٧٦).
٥ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٥٩).
٦ـ النظام القضائي (ص: ٧٤)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٤).

ماڵ یان لە مزگەوت ڕادەپەڕاند، دانیشتنیان لە مزگەوتدا باو بووە،[1] وە کێشە و گرفتەکانیش تۆمار نەدەکران بۆ کوشتنی یان ئاسانی پاراستنی، دادوەر بۆی هەیە کە تاوانبار بەند بکات بە مەبەستی چاو دادانەوە و داواکردنی تەواوی مافەکان، هەریەکە لە عومەر و عوسمان و عەلی ئەمەیان کردووە، دەوڵەت بەندیخانەی لە مەڵبەندی شارەکان ئامادەکردووە، تۆڵە سەندنەوەش لە دەرەوەی مزگەوتەکان بەجێ هێنراوە.[2]

## سێیەم: سیفەتەکانی دادوەر:

### سیفەتەکانی دادوەر:

لە میانی ژیانی عومەر(ﷺ)دا زانایان گرنگترین سیفەتەکانی دادوەر و مەبەستەکانی دامەزراندنیان هەڵێنجاوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- بە ئاگابوون لەحوکمە شەرعیەکان: لەبەر ئەوەی دەیچەسپێنێ بەسەر ڕووداوەکاندا، ئەستەمە کە بتوانێت کاری پێ بکات و لێی بێ ئاگا بێت.

٢- لە خواترسان: عومەر نامەی نووسی بۆ موعازی کوڕی جەبەل و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، کە سەیری پیاوچاکانی پێش خۆیان بکەن و بەکاریان بهێنێت لەسەر کاری دادوەری.[3]

٣- گەورە بوون لەوەی کە لە چنگی خەڵکدایە: عومەر(ﷺ) دەفەرموویێت: فەرمانی خودا ڕاناپەڕێت مەگەر کەسێك کە کار نەسازێنێ وە یان لاوازی نەکات و شوێنی چاوتێبڕین نەکەوێ.[4]

٤- هۆشیاری و زیرەکی: مەرجە کە دادوەر هۆشیار و زیرەك بێت و بە وردی ئاگای لە کارەکان بێت، شەعبی دەگێڕێتەوە کە کەعبی کوڕی سوار لای عومەر دانیشتبوو لەم کاتەدا ئافرەتێك هاتە لای و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، هەرگیز پیاوێکم نەدیووە کە باشتر بێت لە هاوسەرەکەم، سوێند بەخوا شەوانە بەردەوام خەریکی نوێژە و بە ڕۆژی گەرماش بەردەوام بەڕۆژووە ڕۆژو ناشکێنێت، عومەر داوای لێ خۆشبوونی بۆ کرد و ستایشی لەسەر کرد و فەرمووی: بە وێنەی تۆ ستایشی بە چاکە لەسەرە، کەعب وتی: ئافرەتەکە شەرم گرتی و هەستا گەرایەوە، پاشان کەعب وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئایا ئافرەتەکەت لەسەر هاوسەرەکەی کردە نەیار!! عومەر فەرمووی: سکاڵای چی کرد؟ کەعب وتی: سکاڵای لەدەست هاوسەرەکەی کرد، عومەر فەرمووی: ئایا ئەوەی ویست؟ کەعب وتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: ئەو ئافرەتەم بۆ بگێڕنەوە، عومەر فەرمووی: گرنگ نیە ئەگەر هەق بڵێیت، ئەم پیاوە وادەزانێت تۆ سکاڵای هاوسەرەکەت دەکەیت کە لەسەر جێگەکەت نزیك نابێتەوە، ئافرەتەکە وتی: بەڵێ، من ئافرەتێکی گەنجم وە من داوای ئەوە دەکەم کە ئافرەتان مەبەستیانە، عومەرناردی بە

---

١ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٥).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٣)، المغني (٣٧/٩).

٤ـ نظام الحكم في الشريعة والتأريخ الاسلامي (١٠٢/٢).

دوای هاوسەرەکەیدا کاتێك کە هات، عومەر بە کەعبی فەرموو دادی نێوانیان بکە، کەعب وتی: ئەمیری باوەڕداران مافدارترە، عومەر فەرمووی: داوام لێ کردی کە دادی نێوانیان بکەیت چونکە تۆ وا لە کێشەکەیان تێگەیشتی کە من تێنەگەم، کەعب وتی: من وای دەبینم کە ئەم سێ ئافرەتی تری بە سەرەوەیە و ئەم چوارەمینیانە، فەرمانی پێ بدە بە سێ ڕۆژ بە شەوەکانیانەوە کە لە ناویانەوە پەرستش بکات، ئەمیش شەو و ڕۆژێکی هەیە، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ڕای یەکەمت زۆر لە ڕای دووەمت سەرسامتر بوون دەی بڕۆ ئەوە لە ئێستاوە ببە دادوەری شاری بەسرە.[١]

٥- گرژی لە نادژواریدا و نەرمی لە نالاوازیدا، عومەر دەفەرموویت: ناکرێت کە ئەم کارە لە پیاوێکدا بێتەدی مەگەر چوار سیفەتی تیابێت کە ئەمانەن: نەرمی لە لاوازیدا، ڕقو تورەیی لە جێی خۆیدا ، خۆگرتنەوە لە ناڕژدیدا، لێبووردەیی لە نازیادەڕۆییدا[٢] هەروەها عومەر فەرمووی: کەس ناتوانێت فەرمانی خودا ڕاپەڕێنی مەگەر کە بە زمانی خۆی وشەیەك بدرکێنێت کە ڕۆژئاوای کەم و کورتی بهێنێت و لە شوێنی خۆیدا چاو نەبڕێتە هەق.[٣]

٦- هێزی کەسیەتی: عومەر دەفەرموێت: ئەبو مەریەم لە کار دەخەم و پیاوێك دەکەمە والی ئەگەر خراپەکار بینی لێی جیابێتەوە، عومەر ئەوی لە کاری دادوەری کەنار خست و لە شوێنەکەی کەعبی کوڕی سواری کردە والی[٤] بەسرە.

٧- پێویستە کە دەوڵەمەند و بێنیاز بێت: عومەر نامەی بۆ هەندێ لە کاربەدەستانی نووسی کە کەسێك نەکەنە دادوەر مەگەر دەوڵەمەند و خاوەن ڕەچەڵەك بێت، چونکە دەوڵەمەند ئارەزووی بەدەستکەوتنی سامانی خەڵکی ناکات و خاوەن ڕەچەڵەکیش لە دواڕۆژی ڕەشی نێو خەڵکی دەترسێت.[٥]

## - ئەوەی کە لەسەر دادوەر پێویستە:

چەند کارێکی گرنگ هەیە، کە عومەر(ﷺ) ئاشکرای کرد کە پێویستە دادوەر بۆ بەرز ڕاگرتنی بنەماکانی دادپەروەری لەوانە:

١- دڵسۆزی لە کار و لە پێناوی خوادا: عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نوسی: دادکردن لەنێو هاوەڵانی خاوەن مافدا خوای گەورە پاداشت بۆ دادوەرەکەی پێویست دەکات و پاشەڕۆژی پێ باش دەکات، هەر کەس نیازی خۆی لە هەق پوخت کردەوە- ئەگەرچی لەسەر خۆیشی بێت- خوای گەورە ڕزگاری دەکات لەو زەرەر و زیانانەی کە لە نێوانی و نێوان خەڵکدایە، هەر کەس

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٣).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٧٢٤).
٣ـ هەمان سەرچاوە.(ص: ٧٢٤).
٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٧٢٤).
٥ـ هەمان سەرچاوە.(ص: ٧٢٤).

خۆی برازێنێتەوە بەوەی کە لە دڵیدا نیە خوای گەورە ڕەخنەی لێ دەگرێت، خوای گەورە هەر کارێك بە پوختی بۆ خۆی نەبێت وەر ناگرێت لە بەندەکانی وە گومانت چیە بە پاداشتێك کە لە خواوە نەبێت لەگەڵ پەلەکردن لە ڕزقی و کۆکردنەوەی ڕەحمەتیدا.[١]

٢- بە وردی تێگەیشتن لە گرفتەکان: وە بە دواداچوونی بە شێوەیەکی تێگەیشتوانە پێش ئاخاوتن لەسەری ، گونجاو نیە قسە لەسەر هیچ شتێك بکرێت لە پێش دەرکەوتنی هەق و ڕاستی بۆی، عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی کە: تێبگە ئەگەر شتێك هاتە لات، ئەبو موسا جارێك فەرمووی: دادوەر ناتوانێت دادی هیچ کارێك بکات هەتا هەق و ڕاستی بۆ روون دەبێتەوە وە هەروەك ئەوەی کە شەو لە ڕۆژ جیادەکاتەوە، ئەمە گەیشتە عومەرو عومەر فەرمووی: ئەبو موسا ڕاستی کرد.[٢]

٣- فەرمانڕەوایی بە شەریعەتی ئیسلامی: خاوەن کێشەکان موسڵمان بن یان نا، زەیدی کوڕی ئەسلەم دەفەرمووێت: ئافرەتێکی جوولەکە هاتە لای عومەر و پێی وت: کوڕەکەم تیاچوو، جوولەکە پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە لە میراتدا بەشی نیە، عومەر بانگی کردن و فەرمووی: ئایا مافی ئەم ئافرەتە نادەن؟ ئەوانیش وتیان: لە کتێبی ئێمەدا هیچ مافێکی نیە، عومەر فەرمووی: لە تەوراتدا؟ وتیان: بەڵکو لە مشناتدا هاتووە، عومەر فەرمووی: مشنات چیە؟ وتیان: کتێبێکە کە کەسانێکی زانا و ژیر نووسیویانە، عومەر سەرزەنشتی کردن و فەرمووی: بڕۆن مافی خۆی بدەنێ.[٣]

٤- ڕاوێژکردن لەو کارانەی کە گرفتی تێدایە: عومەر نامەی بۆ یەکێك لە دادوەران نوسی: لە ئاینەکەتدا ڕاوێژی کەسانێك بکە کە لە خوا دەترسن،[٤] نامەیەکی نوسی بۆ شورەیح: ئەگەر ویستت پیلانم لەسەر بگێڕیت و من پیلانەکەت نەبینم بۆ خۆم مەگەر ملکەچت بم،[٥] عومەر ڕاوێژی زۆری دەکرد تەنانەت شەعبی دەفەرمووێت: لە پەنهانیەکانی ئەوەبوو کە بە بەڵگەوە شت لە دادوەر بگرێت تا بە دادی عومەر وەری بگرێت چونکە ئەو ڕاوێژی دەکرد.[٦]

٥- یەکسانی لە نێوان ناکۆککاراندا: عومەر نامەیەکی نوسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری: ڕووت لە کۆڕ و کۆبوونەوە و ماف پەروەریتدا لە نێوان خەڵکیدا یەکسان بە، هەتا دەسەڵاتدار چاو نەبڕێتە ستەمت، بێ دەسەلات نائومێد نەبێت لە داد پەروەریت، هەروەها نووسی وابکەن لە خەڵکانی لای خۆتان کە لە ماف یەکسان بن وە نزیکیان وەك دووریان وابێت، دووریان وەك نزیکیان وابێت، کاتێك

---

١ـ إعلام الموقعين لإبن القيم (١/٨٥).
٢ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٥).
٣ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٥).
٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٧٢٥)، سنن البيهقي (١٠/١١٢).
٥ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٧٢٥)، سنن البيهقي (١٠/١١٠).
٦ـ هەمان سەرچاوە.(ص: ٧٢٥)، سنن البيهقي (١٠/١٠٩).

کە ئوبەی کوڕی کەعب لە پەرژینەکەدا سکالای لە عومەر کرد — عومەر نەناسی وە زەیدی کوڕی ثابتیان کردە دادوەری نێوانیان و چوون بۆ لای لە ماڵەکەیدا و عومەر پێی فەرموو هاتووین هەتا دادی نێوانمان بکەیت— وە لە ماڵەکەیدا نابژیوانی بۆ بینی— عومەر دەفەرمووێت زەید لەسەر فەرشەکە هەستا و لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە زەید ڕاخەرێکی دەرهێنا و بۆی ڕاخستووە و فەرموویەتی: وەرە ئێرە ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر پێی فەرموو: لە سەرەتای دادەکەتەوە پرکێشیت کرد ئەی زەید، بەڵام لەگەڵ دژەکەم ڕامگرە و دامنیشێنە، بۆیە لە بەردەمیدا دانیشتن.[١]

٦- هاندانی بێ دەسەلات: هەتا ترس لێی بڕەوێتەوە و بوێر بێت لەسەر قسەکردن عومەر نامەیەکی بۆ موعاویە نووسی کە دەفەرمووێت: خۆت شۆڕ بکەوە بۆ بێ دەسەلاتان هەتا دڵی بوێر بێت و زمانی پاك و پاراو بێتەوە.[٢]

٧- خێرایی سەرپەرشتی کردن لە سکالای نغەریبان و دەستەبەرکردنی بە چاودێری خەرجی، عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو عوبەیدە نووسی: چاوت لە غەریبان بێت چونکە ئەگەر بەندیەکەی درێژە بکێشێت ئەوا لە مافی خۆی دەگەڕێت و بەرەو کەس و کاری دەڕوات، بەڵکو مافی پوچەڵ دەکرێتەوە.[٣]

٨- سینە فراوانی: عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو موسا نووسی: نەکەی زویر بیت، دووربە لەپەستی و دڵە ڕاوکێ و ئازار کێشان بە خەڵکی لەکاتی ناکۆکیدا، ئەگەر دادوەر لە ناخی خۆیدا شتێکی لەم شێوەیەی بینی، ئەوا بۆی شیاو نیە بە هیچ حوکمێك بێتە گۆ هەتا ئەمەی لێ دەرەوێتەوە، هەتا ئەو حالەتە نەفسیە دیاری کراوە نەبێتە پاڵنەرێك بۆ دەرکردنی حوکمێك، عومەر بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی: لە کاتێکدا کە تورەی حوکم مەدە،[٤] شورەیحیش دەفەرمووێت: عومەر کاتێك کردیە دادوەر مەرجی ئەوە بوو کاتێك کە تورەم دادوەری نەکەم،[٥] لەوەی، کە دەبێتە هۆی تەنگەلانی سینە و هەندێ جار دەبێتە هۆی پەلەکردنی زیانبەخش لە سەرپەرشتی کردن لە هەندێ گرفتی برسیەتی و تینوویەتی و چەند شتێکی تر، هەر لەبەر ئەوەشە عومەر دەفەرمووێت: دادوەر کاری دادوەری ناکات مەگەر تێروتەسەل بێت.[٦]

٩- دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو کاروبارانەی کاریگەری لەسەر دادوەر هەیە وەك: بەرتیل، ئاسانکاری بازرگانی لەگەڵیدا لە کڕین و فرۆشتن و دیاری کردنی چەند شتێکی تر، لەبەر ئەوە عومەر ڕێگەی نەدا کە کاری بازرگانی بکەن، سەرقاڵی مامەڵەی بازاڕ بێت و دیاری و بەرتیل وەربگرن، بۆیە

---

١ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ٢٥٩).
٢ـ مجموعة الوثائق السياسية (ص: ٤٣٨).
٣ـ مجموعة الوثائق السياسية (ص: ٤٣٨).
٤ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٦).
٥ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٦)، المغني (٩/٧٩).
٦ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٦)، سنن البيهقي (١٠/١٠٦).

نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی کە ئەمە دەقەکەیەتی: کاری کڕین و فرۆشتن ناکەن و لێك نادەن و بەرتیل وەرناگرن لە فەرمانڕەواییدا، شورەیح دەفەرمووێت: عومەر کاتێك کردمیە دادوەر مەرجی لەسەرم ئەوەبوو کە کاری کڕین و فرۆشتن نەکات و بەرتیل وەرنەگرێت، عومەر فەرمووی: نەکەن بەرتیل وەربگرن و بە ئارەزووی خۆتان فەرمان وەربگرن.[1]

١٠- کارکردن بە بەڵگەی ڕوون: بەبێ گەران بە دوای نیازەکاندا، عومەر وتارێکی بۆخەڵکی دا و لە وتارەکەیدا فەرمووی: ئێمە ئێوەمان دەناسی و پێغەمبەر(ﷺ)مان تیابووە، نیگا دەهاتە خوارەوە و هەواڵی ئێوەی پێ دەداین، بەڵام ئێمە ئەمڕۆ ئێوە بە قسەکانتان دەناسینەوە، هەر کەس بانگەوازی خێرێك بکات بۆمان گومانی خێری پێ دەبەین و لەسەر ئەو کارەی خۆشمان دەوێت وە هەر کەس بانگەوازی خراپەیەکمان بۆ بکات گومانی خراپەی پێ دەبەین وە لەسەر ئەوە ڕقمان لێی دەبێتەوە.[2]

١١- سووربوونی لەسەر ئاشتەوایی دژەکان: عومەر دەفەرمووێت: دژەکان بگێڕنەوە هەتا ئاشتەوایی دەکەن، بە ڕاستی لێك ترازانی دادوەری ڕق و کینە لە نێو خەڵکیدا دەکاتە میرات، ئەگەر بە ئاشتیەوە گەرانەوە ئەوا هاودەنگ دەبێت لەگەڵ شەرعی خودا و دادوەر وازۆی دەکات، ئەگەر ئاشتەواییەکەیان هاودەنگ نەبوو لەگەڵ شەرعی خودا ئەوا دادوەر هەڵیدەوەشێنێتەوە، عومەر فەرمووی: هەموو ئاشتیەك لە نێو موسڵمانانندا گونجاوە جگە لە ئاشتەواییەك کە حەڵاڵێك حەرام بکات یان ئاشتەواییەك حەرامێك حەڵاڵ بکات،[3] لەسەر دادوەر پێویستە سوور بێت لەسەر ئاشتەوایییەکی تایبەت لە نێوان دژەکاندا ئەگەر ڕاستیەکەی بۆ دەرنەکەوت، عومەر نامەیەکی بۆ موعاویە نووسی کە تیایدا هاتووە: سوور بە لەسەر ئاشتەوایی لە نێوان خەڵکیدا مادەم کاری دادوەریەکەت بۆ ڕوون نەبۆتەوە، یان هەوڵی نزیك بوونەوە لە نێوانیان بدە، بە ڕاستی لێك ترازانی دادوەری کینە و دوژمنایەتی دەکاتە میرات.[4]

١٢- گەرانەوە بۆ لای ڕاستی: ئەگەر دادوەر لە یەکێك لە گرفتەکانی فەرمانێکی دا و پاشان ڕای خۆی گۆڕی لەو حوکمەی کە بۆ ئەو کێشەیەی ڕاگەیاندووە، ئەوا شیاو نیە کە لە بڕیارە نوێیەکەیدا شوێنەوارێك بۆ پاشگەزبوونەوە بهێڵێتەوەن چونکە بەم حوکمەی دەری دەکات بڕیاری پێش هەوڵەکەی یەکەم جاری هەڵدەوەشێنێتەوە، هەروەك ئەوەی کە شیاو نیە بۆ هیچ دادوەرێك لە دوای ئەو بڕیارە دەرچووە هەڵبوەشێنێتەوە، سالم کوڕی ئەبی جەعد دەفەرمووێت: ئەگەر من سەرزەنشت کارێکم لەسەر بوایە لەسەر عومەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوا عومەر ئەو سەرزەنشتەی ئەو ڕۆژە لەسەر دەبوو کە خەڵکی نەجران هاتنە لای، عەلی نوسراوێکی لە نێوان پێغەمبەر(ﷺ)و لە نێوان خەڵکی نەجراندا نووسی

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٧)، سنن البيهقي (١٠/١٠٦).
٢ـ البخاري رقم (٢٦٤١)، سنن البيهقي (١٠/١٢٥، ١٥٠).
٣ـ تأريخ المدينة (٢/٧٦٩)، موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٧).
٤ـ اعلام الموقعين (١/١٠٨).

لەسەردەمی عومەردا زۆر بوون هەتا لەسەر خەڵکی ترساندنی و ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، هاتنە لای عومەرو داوای ئاڵوگۆڕیان لێ کرد و ئەویش بۆی گۆڕین، پاشان پەشیمان بوونەوە، شتێك کەوتە نێوانیانەوە جارێکی تر هاتن بۆ لای عومەر و لە کاریان خست، کاتێك کە عەلی دانا هاتنە لای و وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران، پاڕانەوەکەت بە زمانی خۆت و بەختت بە سوێندتەوەیە، پاشان عەلی فەرمووی: بەڵام لێدان عومەر زۆر تێگەیشتوو بوو لە کارەکەیدا،[١] عومەر(ﷺ) بەرپەرچی هەڵوەشاندنەوەی یەکەم دادی دایەوە کە دادی کردبوو تیایاندا، پاشان عەلیش- لە دوای عومەر- بەرپەرچی هەڵوەشاندنەوەی ئەو دادەی دایەوە کە عومەر دادی کردبوو تیایاندا،[٢] وە زۆرێك گۆڕانکاری لە هەوڵەکانی عومەر و لە چەند گرفتێکدا ڕوویداوە، لەوانە حوکمی باپیر لەگەڵ برایان وە هاوبەشی برایان بۆ باوك و دایك لەگەڵ برایان، دایك لە سێ یەکی بەشەکانی هەیەکاتێك، کە هیچ بۆ برایان و باوك و دایك لە میراتی نامێنێتەوە، ئەوە نەگوێزراوەتەوە بۆ ئەوەی کە گەراوەتەوە بۆ دادگاییەکەی یەکەم و پاشان هەڵی بوەشێنێتەوە بەڵام ئەو بە هەوڵ و کۆششی نوێی لە گرفتە داهاتووییەکاندا دەدا و حوکمە کۆنەکەش لە شوێنکەوتنی هەق ڕێگری لێ نەکرد ئەگەر نکۆڵی لێ بکردایە، عومەر نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری: دادێك کە ئەمڕۆ کارت پێ کردووە ڕێگریت لێ نەکات، من ئەمڕۆ بە ڕاکەی تۆدا چوومەوە و بە ژیری تۆ ڕێنموونی بووم بەوەی کە تیایدا بگەڕێیتەوە بۆ لای هەق و ڕاستی، لەبەر ئەوەی کە هەق کۆنە، و هیچ شتێك پوچەڵی ناکاتەوە، پیاچوونەوەی هەق باشترە لە کشانی بە ناو ناڕەواییدا،[٣] هەر لەسەر ئەم بنەمایەش عومەر لە بەشی باپیرەدا بەچەند شێوەیەکی جیاواز دادی کردووە، دادی لە کاری ئافرەتێکدا کردووە کە مردووە و ئەوەی هەیبووە بەجێی هێشتووە بۆ مێردەکەی و دایکی و براکانی و باوکی براکانی بۆ دایکی، عومەر بەشی براکانی و دایك و باوکی پێکەوە دانا و بەشی براکەی تری لەگەڵ دایکیدا دانا بە سێیەکی بەشەکان و لەم کاتەدا پیاوێك پێی وت: چەند ساڵێك لەمەوبەر تۆ بەم شێوەیە هاوبەشیت لە نێواندا نەکردن، عومەر فەرمووی: ئەو ساڵە بەو شێوەیە دادمان دەکرد کە ئەو ڕۆژە لەسەری بووین و ئەمڕۆش بەوە داد دەکەین کە ئێستا لە سەرین.[٤]

١٣- دیاری کردنی چارەنووس پاکی بۆ تاوانبار هەتا تاوانەکەی دەچەسپێت: عبدالله کوڕی عامر دەفەرمووێت: لە سواریەکدا دەرچووین زەمبیلەیەکیان لێ دزیم، ئێمە پیاوێکی ئەوانمان لەگەڵدا بوو، یەکێك لە یاران پێی فەرموو: ئەی فلان کەس زەمبیلەکەی بۆ بگێڕەوە، ئەویش وتی: من نەمبردووە، پاشان گەرامەوە بۆ لای عومەرو هەواڵەکەم پێدا، ئەویش فەرمووی: ئێوە کێن؟ پاشان ژماردنم،

---

١ـ سنن البيهقي (١٢٠/١٠)، موسوعة فقه عمر (ص: ٧٢٨).
٢ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٨).
٣ـ اعلام الموقعين (٨٥/١).
٤ـ اعلام الموقعين (١١١/١)، موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٩)..

پاشان وتی: گومان دەکەم ئەو هاوەڵەی بێت — کە تاوانبار کراوە — منیش وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر دەتەوێت بە کۆت و بەندکراوی بیهێنن، عومەریش فەرمووی: بەبێ هیچ بەڵگەیەك بە کۆت و بەند کراوی بیهێنم؟.[1]

١٤- کۆشش و هەوڵ لە سەرچاوەی دەقەکاندا نیە: عومەر دەفەرمووێت: پاشان لە ناو کرۆکی بابەتەکە تێ بکە لەوەی،کە دێتە بەر دەستت لەوەی،کەبۆتە سەرچاوە لەسەرت و بەوەی،کە لەقورئان و سونەتدا نیە،پاشان گرفتەکان بپێوە،[2]ئەمە گرنگترین شتە،کە دادوەر پێویستە پابەند بێت پێوەی.

١٥- ملکەچی ئەمیر بۆ فەرمانی دادوەران: عومەر(ﷺ) یەکەمین کەس بوو کە کاتێك لە لوتکەی خەلافەتدا بوو ملکەچ دەبوو بۆ دادگا بە شێوەیەکی وا بە فەرمانەکانی قایل دەبوو، کە ئەو قایل بوونەی لە دڵیەوە بوو، بە سەرسامیەکی ئاشکراوە ڕووی لێ دەنا ئەگەر بیپێکایە، ستایشێکی ڕاست و دروستی دادوەرەکەی دەکرد ئەگەر فەرمانەکەش لە دژی بوایە،[3] نموونەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە عومەر سەودای ئەسپێکی کرد لە عەرەبێکی دەشتەکی، پاشان سوار بوو هەتا تاقی بکاتەوە، بەڵام ئەسپەکە لاقێکی شکا، عومەر بە کابرای وت: ئەسپەکەت بگرە، پیاوەکە وتی: نامەوێتەوە، عومەر فەرمووی: ناوبژیوانێك لە نێوان من و خۆتدا دابنێ، پیاوەکە وتی: شورەیح، ئەوانیش چوونە لای و کاتێك کە شورەیح گوێی لێ گرتن فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەوەی کە کڕیوتە وەری بگرە، یان بیگێڕەوە وەك ئەوەی کە وەرت گرتووە، عومەر فەرمووی:ئایا داد جگە لەمە باشتر دەبێت، لەبەر ئەوە شورەیحی نارد بۆ کوفە.[4]

## چوارەم: سەرچاوەی حوکمە دادوەریەکان:

دادوەران لە سەردەمی عومەردا پشتیان بە هەمان ئەو سەرچاوانە دەبەست کە پێغەمبەر(ﷺ)و دادوەرانی پشتیان پێ دەبەست، کە ئەویش قورئان و سونەت و هەوڵ و کۆششەکان بەڵام لە سەردەمی ڕاشیدیندا دوو گرفتی تر دەرکەوتن لەوانە:

- پێشکەوتنی مانای کۆشش و کارکردن پێی، ئەوەی کە فەراهەم دەهات لێی لە پێشەکی و هۆکارەکان، مەبەستەکان، پاشان ڕاوێژکردن و ڕاوێژ دەرکەوت، لەگەڵ پرسکردن و ڕاو پێوەر.
- دەرکەوتنی چەند سەرچاوەیەکی نوێ کە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا نەبووە، ئەمەش بریتیە لەپێشینەیەکی دادوەری کە لە یارانەوە دەرچووە لە سەردەمی خەلیفەیەك لە خەلیفەکانی تر، لەسەردەمی ڕاشیدیندا سەرچاوە قەزاییەکان بریتی بوون لە: قورئان، سونەت، هەوڵ و کۆشش، بەرهەڤبوون، پێوەر، پێشینە قەزاییەکان، هەموو ئەمانە ڕاوێژ و ڕاوێژکردن لە کێشە و گرفت و

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٢٩)، المحلي (١٣٢/١١).
٢ـ اعلام الموقعين (٨٥/١)، مجلة البحوث العلمية ٢٨٧/٧().
٣ـ شهيد المحراب (ص: ٢٢١).
٤ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٧)، شهيد المحراب (ص: ٢٢١).

حوکمەکاندا سایەداری دەکرد و بۆ ئەمەش چەندین دەقی زۆر هاتوون، چەند گێڕانەوەیەك هەیە، کە جەخت لەسەرئەم سەرچاوانە دەکەنەوەو ئێمەش لایەنێکی لێ دەخەینە ڕوو:[1]

١- شەعبی لە شورەیحەوە دەگێڕێتەوە: عومەر پێی فەرمووم: بەوە دادوەری خەڵکی بکەن کە لە قورئاندا هاتووە، ئەگەر هەموو قورئانت نەزانی بەوە دادوەری خەڵکی بکەن کە لە سونەتی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە، ئەگەر سونەتەکانی پێغەمبەرت(ﷺ) نەزانی ئەوا بەوە دادوەری بکە لە پێشەوای ڕێنیشاندەرەوە هاتووە، ئەگەر هەموو ئەو شتانەت نەزانی کە ئەو پێشەوایانە دادیان پێ کردووە ئەوا ڕای خۆت بەکار بهێنە و ڕاوێژ بە کەسانی زانا و چاکساز بکە.[2]

٢- إبن شهابی زەهری دەگێڕێتەوە، کە عومەر(ﷺ) لەسەر مینبەر فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ڕای پێغەمبەری خوا(ﷺ)دروستە، خوای گەورە ڕای نیشان دەدا، بەڵام ئەمڕۆ کۆشین و ئیجتهادە،[3] لە عومەرەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەمە ڕای عومەرە ئەگەر ڕاست و دروست بێت ئەوا لە خوداوەیە ئەگەر هەڵەش بێت ئەوا لە عومەرەوەیە.[4]

٣- إبن القیم دەفەرمووێت: کاتێك عومەر بوویە خەلیفە فەرمووی: من شەرم لە خودا دەکەم ئەگەر بەرپەرچی شتێك بدەم کە ئەبو بەکر وتوویەتی،[5] عومەر دووبارە جەختی لەسەر ئەمە کردۆتەوە لە نامەیەکی تردا بۆ شورەیح کە تیایدا دەفەرمووێت: عومەر داوای لێ کردم کە بە قورئان دادوەری لەنێوخەڵکدا بکەم، ئەگەر لە قورئاندا نەبوو ئەوا بە سونەتی پێغەمبەری خودا و ئەگەر لە سونەتیشدا نەبوو بەوە دادوەری بکەم کە پیاوچاکان دادیان پێ کردووە.[6]

٤- بەڵام بەرهەڤ بوون، یان کۆمەك گرتن (إجماع): ئەگەر دادوەر دەقێکی لە قورئان و سونەتدا دەست نەکەوت، با بگەڕێتەوە بۆ لای زانایان و ڕاوێژ بە یاران و شارەزایان بکات، گرفتێکی خستە بەر دەستیان و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرد و هەوڵیان تیایدا، ئەگەر هەوڵەکەیان گەیشتە یەك ڕا کە بریتیە لە هاودەنگی وئیجماع، کە بریتیە لە هاودەنگی زانایان لە ئومەتی محمد(ﷺ) لەسەر کارێکی شەرعی کە ئەمەش سەرچاوەی سێیەمە لە سەرچاوەکانی یاسادانانی ئیسلامی بە هاودەنگی زانایان و ئەمەش بۆ یەکەمین جار لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا دەرکەوت، چەندین دەقی زۆر و بابەتی زۆری لە کتێبی شارەزایان و ئوصولی فیقه، و مێژووی یاسادananدا تێدا هاتووە، بەلام گرفت و کێشەکان ئەوانەن کە کۆمەك گرتنی کەمیان تێدا دەستەبەر بووە، و توانای گەمارۆ دراویشی لە شاری مەدینەی پرشنگداری پایتەختی خەلافەتدا بووە، لەگەڵ کۆمەڵگەی یاران و زانایان و شارەزایان و ئەمەش زۆر

---

١ـ تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١١٨).
٢ـ اعلام الموقعين (١/٢٢٤)، تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١١٩)..
٣ـ تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٠)، اعلام الموقعين (١/٥٧).
٤ـ اعلام الموقعين (١/٥٨)، تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٠).
٥ـ اعلام الموقعين (١/٢٢٤).
٦ـ تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٠).

دەگمەن بووە لە ناوچەکانی تر،[1] لەمەوە دەگێڕنەوە کە إبن عباس بە عوسمانی(رضي الله عنه) فەرمووە: ئایا برایان لە زمانی گەل و نەتەوەی ئێوەدا مەبەست پێی دۆستایەتی و برایەتی نیە، ئەی بۆ دایك پێیان ڕووپۆش نەبووە؟! وە لە سێیەکەوە بۆ شەش یەکە لە ئایەتەکەدا کە دەفەرمووێت: ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ﴾ (النساء: ١١).

پاشان فەرمووی: ناتوانم هەڵی بوەشێنمەوە ئەمە لە پێش من نەبووە لە وڵاتان و خەڵکانیش بەو شێوەیە نەبوونەتە میراتگر، ئەمەش مانای وایە کە کۆمەك گرتن کە پێشتر تەواوکاری بۆ کراوە بە پێچەوانەی ڕاکەی إبن عباس، بە سەرپێچیەکەی دەست درێژی ناکات، بەرهەڤبوون و کۆمەك گرتنیش سێ سەرچاوەی سەرەکی دەگرێتەوە لەوانە: ڕاوێژکردن، هەوڵ و کۆشش کردن، هاودەنگی، ئەگەر بێتو یەکێك لەو سەرچاوانە ون بوون ئەوا دادوەر پەنا بۆ سەرچاوەیەکی تر دەبات.

٥- پێشینە دادیەکان: ئەوانەن کە خەلیفەو گەورە یاران (خوایان لێ ڕازی بێت) دادیان پێ کردووە، ئەمەش هەر ئەوەیە، کە عومەر(رضي الله عنه) لە پێشینەی ئەبو بەکردا بە ڕاشکاوی لەسەری دواوە، وەهەروەها دادوەرانی و والیەکانی هەروەك پێشتر وتمان دادیان پێ کردووە،[2] ئەمەش ئەوەیە کە إبن القیم بە ڕاشکاوی لە بابەتێکدا بە ناونیشانی (رأي الصحابة خير من رأينا لأنفسنا) ڕوونی کردۆتەوە و فەرموویەتی: ئەوەی کە لە ڕای ئەواندایە لەم شوێنەدا ئەوەیە کە پێویستە ڕای ئەوان بۆ ئێمە باشتر بێت لە ڕای خۆمان بۆ خۆمان، ئەی چۆن نا؟ کە بریتیە لەو ڕایەی لە دڵێکەوە دەردەچێت پڕە لە نووری ئیمان و زانیاری و زانست، و شارەزایی و تێگەیشتن لە خوا و پێغەمبەرەکەی، و ئامۆژگاری بۆ میللەت و گەل و نەتەوە، دڵیان لەسەر دڵی پێغەمبەرەکەیانە، هیچ هۆ و بۆنەیەك لە نێوان ئەوان و ئەودا نیە، ئەوان زانیاری و باوەڕ لە چرای پێغەمبەرایەتیەوە بە چاوپۆشی لە نوێگەریەوە دەیان گواستەوە کە هیچ لە گرفت و ناکۆکی نەدەچوو، هیچ کۆسپێك ڕێی لێ هەڵە نەدەکرد، پێوەری ڕای ئەوانی تر بە ڕاکانیان لە خراپترین پێوەرەکان بووە.[3]

٦- پێوەر: بەڵام پێشینە دادوەریەکان کەمن، ئەگەر دادوەر دەقێك یان یان کۆمەك گرتنێك یان پێشینەیەکی دادوەری نەدۆزێتەوە ئەوا پشت بە هەوڵ و کۆشش دەبەستێت هەروەك لە فەرموودەکەی سەبارەت بە موعاز هاتووە: وە لە پێشەکی هەوڵەکاندا پێوانەی کێشەیەك، کە دەقێکی لە بارەوە نەهاتبێت بە کێشەیەك کە دەقێکی لە بارەوە هاتبێت، و ئەمەش بریتەیە لە سەرچاوەی چوارەم بۆ یاسادانان و فیقھ و حوکمەکان، هەر ئەمەیە لە پەیامەکەی عومەر(رضي الله عنه)دا کە بۆ ئەبو موسای ئەشعەری هاتووە دەفەرموێت: لە پاشدا گرفتەکان لەمەدا بپێوە و نموونەکان بزانە، پاشان پشت ببەستە

---

١ـ تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٢٢-٢٢٣).
٣ـ اعلام الموقعين (٨٧/١)، تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٣).

بەوەی کە دەیبینی کە خۆشەویسترینیانە لای خودا، بە هەق بیچوێنە.[١]

٧- ڕاو بۆچوون: ئەگەر بۆ گرفت و کێشە بنەمایەك نەبوو لە دەقەکاندا کە پێوەری لەسەر بکرێت، ئەوا پشت ببەستە بە دادوەر لەسەرهەڵدان بە ڕای ئەوەی کە تیایدایە و نزیکترە بۆ لای ماف و ماف پەروەری و ڕاستی و پێگەکانی شەرح و بنەما شەرعیەکان و ئەمەش هەر ئەوەیە کە لە ڕاگوێزراوە پێشینەییەکاندا هەیە، لە نامەی عومەر بۆ شورەیح و ئەوانی تریش،[٢] هەروەها ڕاوێژکردن لە گرنگترین ئەو هۆکارانەیە کە دادوەری پێ دەست نیشان دەکرێت، هەروەك ئەوەی کە لە ڕیوایەت و کتێب و پەیامەکاندا هاتووە، ئەمەش هەر ئەوەیە کە عومەر(ﷺ) بە کردار و گوفتار جەختی لەسەر کردەوە بۆ زۆری خۆشەویستی بۆ ڕاوێژ لەگەڵ تێگەیشتندا، زۆر بە کەمی لە گرفتێك دەچوویە پێشێ مەگەر دوای ڕاوێژی گەورە یاران و تێگەیشتوانیان،[٣] شەعبی دەفەرموویت: کێشەکان بەرزکرانەوە بۆ لای عومەر(ﷺ)، ئەویش ماوەی یەك مانگ تاوتوێی دەکرد و ڕاوێژی بە یارانی دەکرد لەسەری.[٤]

## پێنجەم: ئەو بەڵگانەی کە دادوەر پشتی پێ دەبەستێ:

ئەو بەڵگانەی کە لە کاتی دەرکردنی سزاداندا پشتی پێ دەبەستیێ ئەمانەن:

١- **دان پیانان**، نووسینیش بە جۆرێك لە دان پیانان دادەنرێت.

٢- **شایەتی**: پێویستە دادوەر بکۆڵێتەوە لە دەسەڵاتی شایەت بۆ وەرگرتنی شایەتی، ئەگەر ئەو نەیانناسێت، ئەوا داوای ئەوەیان لێ دەکات کە کەسێك بهێنن کە ئەو بیان ناسێت، پیاوێك لای عومەر شایەتیەکی داو عومەر فەرمووی: من ناتناسم، ئەمە زیانت پێ ناگەیەنێت ئەگەر من نەتناسم، کەسێکم بۆ بهێنە کە بتناسێت لەم کاتەدا پیاوێك لەناو هۆزەکە وتی: من دەیناسم، عومەر فەرمووی: بەچی دەیناسیت؟ پیاوەکە وتی: بە ماف پەروەری و چاکی، عومەر فەرمووی: ئەمە دراوسێیەکەی خوارەوەتەوە کە شەو و ڕۆژ چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەی دەزانی؟ پیاوەکە وتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: ئایا مامەڵەی لەگەڵ کردووی بەو دینار و درهەمەی کە بە هۆیانەوە بەڵگەی چوونە سەر خواناسیە؟ پیاوەکە وتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: کەواتە هاوەڵی ئەو گەشتەتە کە ڕێگەی ڕەوشت بەرزیت پێ نیشان دەدات؟ پیاوەکە وتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: کەواتە تۆ نایناسی،[٥] وە شایەدی پێشووتر لەسەر سوێند خواردن وەك یەکە ئەگەرچی خاوەنەکەی بەجێی بهێنێت لە پێش سوێند خواردنی دژەکەی یان دوای ئەوەی کە سوێند دەخوات، ئەگەر دادخواز سوێندی لەسەر دەعواکەی خوارد بەسەر داد لە دەست کراودا، ئەوا دادوەر لەسەر ئەمە سوێندی دەدات، دواتر

---

١ـ تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٤).

٢ـ اعلام الموقعين (١/ ٧٠) فما بعدها.

٣ـ تأريخ القضاء في الاسلام، د. محمد الزحيلي (ص: ١٢٥).

٤ـ هەمان سەرچاوە.

٥ـ سنن البيهقي (١٠/ ١٢٥)، موسوعة فقه عمر (ص: ٧٣١).

دادخواز پاش ئەوە لەسەر سکالاکەی بەڵگە دێنێت، ئەوا بەڵگەکەی لێ وەردەگیرێت و سوێندەکە دەدرێتە دواوە، عومەر فەرمووی: سوێندی خراپ مافدارترە بگەڕێنرێتە دواوە نەك سوێندی ڕاست و دروست،[1] وە خواستراو بە شاهێدی بریتیە لە دادخواز، عومەر نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری کە تیایدا هاتووە: سوێند لەسەر دادخوازنیە و سوێند لەسەر ئەو کەسەیە کە نکۆڵی لێ دەکات،[2] ئەگەر لە لایەن دادخوازەوە جگە لە شایەتێك هیچی تر دەستەبەر نەبوو ئەوا باوەڕ بە شایەدیەکەی دەکرێت و دادخواز سوێندی لەگەڵدا دەخوات، عومەر دادی لە سامان و داراییدا بە سوێند خواردن و یەك شایەد دەکرد.[3]

**٣- سوێند بەجێ هێنان:** دادوەر پەنا بۆ بەجێ هێنانی سوێند نابات جگە لە کاتێکدا نەبێت کە دادخواز ناتوانێت بەڵگە بهێنێتەوە ، ئەگەر دادخواز سوێندی بەجێ هێنا ئەوا کار بەسوێندەکەی دەکرێت، عومەریش بە سوێند خواردن دادوەری لەسەر وادعە کرد و ئەوانیش سوێندیان خوارد،لە خوێنەکە پاکەی بۆ کردن، عومەر و ئوبەی کوڕی کەعب کێشەیەکی خۆیان کە لەسەر دارخورمایەك بوو بردە لای زەیدی کوڕی ثابت، ئوبەی دەیوت هی منە، سوێند کەوتە سەر عومەر و زەید فەرمووی: لە ئەمیری باوەڕداران خۆشبە، عومەر فەرمووی: بۆچی لە ئەمیری باوەڕداران خۆشبێت؟ ئەگەر شتێکت زانی بە سوێندەکەم لێی بکۆڵەوە، ئەگەرنا لێی گەڕێ، سوێند بەو خوایەی کە بێجگە لە و هیچ خوایەکی تر نیە ئەو دارخورمایە دارخورمای منەو هیچ مافێکی ئوبەی تێدا نیە، خەڵکی پێیان وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا پێش سوێندەکەش هەر وا نەبوو؟ عومەر فەرمووی: ترسام کە سوێند نەخۆم خەڵکیش لەسەر مافەکانیان سوێند نەخۆن و ئەمە ببێتە سونەتێك لە دوای من،[4] شیاو نیە کەسێك سوێندی لەسەر بێت و لەبەر لە خوا ترسان خۆی لێ لابدات، ئێمە لەوەی پێشوودا ئەوەمان بینی کە چۆن عومەر سوێندی بەجێهێنا و کاتێك بوویە خاوەنی مافەکەی وازی لێ هێنا.

عومەر(ﷺ) باوەڕی دژوار دەکرد لەسەر هەندێ لە دژەکان بە سوێند خواردنیان بۆی لە جێگەیەکدا کە ترس دەکەوتە ناخیانەوە و نەیان دەوێرا درۆی تێدا بکەن، جارێك کۆمەڵێکی لەسەر بەردێك سوێند دا وە کەسێکی تری لە نێوان گۆشەیەك و پایەیەکدا سوێند دا.[5]

**٤- سیما لە چەسپاندنی ڕەچەڵەکدا:** بریتیە لە یەکێك لەو نزیکە بەهێزانەی کە کار بە پێویستیەکان دەکات، بەڵگەش لەسەر ئەمە سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)و کاری خەلیفەکانی ڕاشیدین و یارانی ئازیزە، حوکم بە قیافەلەلایەن عومەرو إبن عەباس و ئەوانی تریش چەسپاوە.[6]

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٣١).

٢ـ سنن البيهقي (١٥٠/١٠،١٥٣).

٣ـ المغني (١٥١/٩)، موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٣٢).

٤ـ تأريخ المدينة المنورة (٧٥٥/٢)، موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٣٢).

٥ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٣٢).

٦ـ النظام القضائي، مناع القطان (ص: ٨١-٨٢).

**٥- نزیك، هاوەڵ، هاوتا، هاودەم:** هاوتـا بـوارێکی بەرفراوانـە کـە دادوەران لـە هەڵێنجانیـدا کاری هونەری خۆیان دەکەن، یەکێك لەو هاوتا بەهێزە، نیشانەی سـکپڕیە بـۆ ئـەو ئافرەتانـەی پێـشتر کاری هاوسەریان نەکردووە بە بەڵگەیەك لە داوێن پیسی دادەنرێت، نموونـە بـۆ ئەمـە کـاری لـە دایـك بوونە بۆ ماوەیەك کە کەمتر بێت لە ماوەی سك پڕی، لەوانـەش بـوونی دوو مـردووە کـە یـەکێکیان لەسەری ئەوی تریان بێت، ئەم هەڵومەرجە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی کە یەکـەم جـار مـردووە ئـەوەی ژێرەوەیانـە، و ئـەوەش کـە دواتـر مـردووە ئـەوەی سـەرەوەیانە، لەبەرئـەوە عومـەر لـەتاعونی عەمواسدا ئەگەر دەستی یان پێی یەکێك لە مردووەکان لەسـەر ئـەوی تـر بوایـە ئـەوا خـوێنی ئـەوەی سەرەوەی لەوەی خوارەوە وەردەگرت خـوێنی ئـەوەی خـوارەوەی لـەوەی سـەرەوە نـەدەگرت، لـە بەڵگـە نزیکەکان لەسەر خواردنی مەی بوونی مەیە کە بووە لە شوشەکەدا یان لـە پێکەکـەدا، عومـەر داری حەدی مەی خواردنەوەی لەسەر بوونی مەییەکە لە پێکەکەدا بەجێ هێناوە.[1]

**٦- زانیاری دادوەر:** زانیاری دادوەر لە سزای ئاینی بە بەڵگەیەك دانانرێت کە سەرپـشکی بکـات لە دەرکردنی حوکم لەسەر تاوانبار، عومەر نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری کـە پێـشەوا بە زانیاری و زانستی و گومانی و لێکچوونی وەرنەگرێت،[2] وە عـبدالرحمن کوڕی عـەوف دەفـەرمووێت- ئەگـەر پیـاوێکم بینـی کـە کەسـێکی دەکوشـت یـان دزی دەکـرد یـان داوێـن پیـسی دەکـرد، وتـی: شایەدیەکەت بە شایەدی پیاوێك لە موسڵمانان دەبینم، عومەر فەرمووی: پێکات،[3] بـەڵام ئەگـەر لـە سزای ئاینیدا نەبێت، ڕیوایەتەکە لە عومەرەوە ناهاودەنگی تێکەوتووە لە دانانی زانیاری دادوەر، کە بەڵگەیەکە و دادوەر سەرپشك دەکات بە پشت بەستن پێی لە حوکمدا ئەگەر جگە لەو بەڵگەیە هیـچی تر دەستەبەر نەبوو،[4] عومەر(ﷺ) سوور بووە لەسەر هان نەدانی خەڵکی بە دان نـان بـە هەڵـەکانیان، بەڵکو پەردەپۆشی و تەوبـەی لێ داوا دەکـردن لـەوەی کـە لـە نێوانیـان و نێـوان خودایـە، کاتێـك کـە شەرحەبیلی کوڕی صـەمتی کەندی کە سەرپەرشتی چەکدارانی مەدائنی دەکرد وتارێکی دا، وتی: ئـەی خەڵکینە ئێوە لە زەویەك دان کە مەی تێدا بڵاوە و ئافرەتی تێدا زۆرە، هەر کـەس لـە ئێـوە دووچـاری سزای ئاینی هات، با بێتە لامان و سزاکەی لەسەر پـچەسپێنین، چـونکە ئـەو سـزایە پاککەرەوەیـەتی، ئەمە گەیشتە عومەر و ئەویش نامەیەکی بۆ نووسی: ((شیاو نیە بۆت کە فەرمان بە خەڵکی بـدەیت کە ئەو پەنهانیەی خوا بۆی پۆشیون ئاشکرا بکەن،[5] بەڵام ئەگەر خەڵکی خۆیان کێـشەکەیان هێنـا بـۆ دادوەر، ئەوا دەوڵەت لەگەڵ پەشیمان کردنەوەی سزاکەی بەسەردا دەسەپێنێت،[6] عومەر هەر کات، کە

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٣٥).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٧٣٥)، منصف عبدالرزاق (٣٤٢/٨).
٣ـ سنن البيهقي (٤٤/١٠)، موسوعة فقه عمر (ص: ٧٣٥).
٤ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٧٣٥).
٥ـ القضاء في خلافة عمر، ناصر الطريفي (٨٦٢/٢).
٦ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٦).

دەیویست کار لە نێوان دوو دژدا بکات ئەم دوعایەی دەخوێند کە دەفەرمووێت: خوای گەورە! ئەگەر تۆ دەزانی من باکم دەبێت کاتێك کە دوو دژەکە دانیشتن لەسەر ئەوەی کە کێ مافی لەسەرە لە نزیك یان لە دوور ئەوا بۆ چاوتروکانێکیش بێ مۆڵەتم مەدە.[١]

## شەشەم: حوکم و سزای عومەر لە هەندێ تاوان و کەتندا:

### ١- ساختەکردن لە مۆری فەرمی دەوڵەتدا:

لەسەردەمی عومەر(ﷺ)دا گرفتێکی گرنگ هاتە پێش کە لەوەوبەر ڕووی نەدابوو، ئەوەش ئەوە بوو، کە معن کوڕی زائدە توانی مۆری دەوڵەت بەهەمان نەخشی خۆی ساختەپێ بکات و بەهۆیەوە ماڵێکی زۆری لەبەیتولمالی موسڵمانان وەرگرت، ئەم کێشەیە بەرزکرایەوە بۆ عومەر و ئەویش(١٠٠) داری حەدی لێدا و بەندی کرد، کاتێك کە لەسەری هاتە گۆ عومەر(١٠٠) داری لێدا، بۆ جاری سێیەم کە لەسەری هاتەوە گۆ عومەر(١٠٠) داری سزای لێدا و پاشان لە شوێنی خۆی دووری خستەوە.[٢]

### ٢- پیاوێك دزی لە بەیتولمالی کوفە کرد:

هەر کەس دزی لە بەیتولمال کردبێت عومەر دەستی نەبڕیوەتەوە، پرسیاریان کرد لە إبن مسعود دەربارەی ئەو کەسەی کە دزی لە بەیتولمال کرد، ئەویش فەرمووی: ڕەوانەی لای عومەری بکەن چونکە هیچ کەسێك نیە کە لەو داهاتە بەشی خۆی نەبێت،[٣] پاشان عومەر وەك تەمێ کردنێك لێیدا.[٤]

### ٣- دزین لە ساڵی سوتەکدا:

چەند خزمەتکارێکی حاتەمی کوڕی ئەبو بەلتەعە لە ساڵی سوتەکدا حوشترێکی دزی بۆ پیاوێکی موزنی و پاشان سەریان بڕی خواردیان، ئەم کارە گەیشتە عومەر، عومەر بانگی منداڵەکانی کرد و ئەوانیش دانیان بەوەدا نا کە لە قەڵا دزیویانە، ئەوانەش کە دزیبوویان ژیر و باڵق بوون وە پێویستی وای لێ نەکردبوون کە پەنا بۆ دزی کردن بەرن، کە سیری کوڕی سەڵت فەرمانی دا، کە دەستیان ببڕن - بەڵام ئەو- بینی کە خەڵکی لەساڵی سوتەکدا دەژی و بارودۆخی چۆنە بیانوویەکی بۆ هێنانەوە و وتی بە گەورەکەیان: من وا دەزانم کە تۆ برسیان دەکەیت بەمە وازی هێنا و دەست بڕینەکەی ڕاگرت و فەرمانی دا بە پیاوە موزنیەکە کە نرخی حوشترەکەی بە چەند هێندە دیاری بکات[٥] (٨٠٠) درهەم، پاشان لەبەر پێویستی سزا ئاینیەکەیان لەسەر لابرا.[٦]

---

١ـ الحلية (٦/١٤٠)، الطبقات (٣/٢٩٠) إسناده صحيح.
٢ـ أولويات الفاروق (ص: ٤٥٣).
٣ـ المغني (١٢/٣٨٦) في الإرواء (٢٣٢٢) إسناده ضعيف.
٤ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٨).
٥ـ المنتق شرح الموطأ للبارحي (٦/٦٣).
٦ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٨).

### ٤- ئافرەتێکی شێت داوێن پیسی کرد:

ئافرەتێکی شێتیان هێنا بۆ لای عومەر کە داوێن پیسی کردبوو، ئەویش ڕاوێژی کرد کە بەرد باران بکرێت، عەلی کوڕی ئەبی تالیب دای بە لایدا و فەرمووی: ئەو ئافرەتە بگێڕنەوە، پاشان هات بۆ لای عومەر و فەرمووی: ئایا نازانی کە قەڵەمی لەسەر هەڵگیراوە، فەرموودەکەی وت و لە کۆتاییدا فەرمووی: بەڵێ، عەلی فەرمووی: ئەمە چ باکیەتی کە بەرد باران بکرێت؟ پاشان ڕەوانەی کرد،[١] عومەر الله أکبری کرد.[٢]

### ٥- بەڵێن پێدراوێك زۆری لە ئافرەتێکی موسڵمان کرد بۆ داوێن پیسی:

ئەمە لە سەردەمی خەلافەتی عومەر (ﷺ)دا ڕوویداو عومەر لەخاچی دا، لەبەر ئەوەی لەمەرجەکانی ڕێکەوتن لایدابوو.[٣]

### ٦- زۆرلێکردنی ژنان لەسەر داوێن پیسی:

کەنیزەکێك لە کەنیزەکەکانی ئەمارەتیان هێنا کە چەند خزمەتکارێك زۆریان لێ کردبوو بۆ ئەنجامدانی کاری داوێن پیسی، عومەر لە خزمەتکارەکانی داو لەکەنیزەکەکەی نەدا،[٤] ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عومەر، کە داوێن پیسی پێکرابوو وتی: من نوستبووم وە هەڵنەستابووم،[٥] هەتا پیاوێکم بینی لەسەرم بوو پاشان عومەر بەڕێی کرد و لێی نەدا بەڕاستی ئەمە گومانە و سزای ئاینیش بە گومانەکان دوور دەکەوێتەوە و جیاوازیش نیە لە نێوان زۆرلێکردن بە پەنا بۆ بردن کە ئەو زاڵی بکات بەسەر خۆیدا و لە نێوان زۆرلێکردن بە هەڕەشەی کوشتنن وە لە سەردەمی عومەردا ڕووداوێك ڕوویدا ئەویش ئەوە بوو کە ئافرەتێك کە ئاوبەندی بە شوانێك دەکرد ئەویش قایل نەبوو کە ئاوی پێ بدات هەتا لەگەڵیدا نەسازێ و ئەویش کارەکەی کرد، ئەم ڕووداوە گەیەنرایە عومەر و ئەویش بە عەلی فەرمو: چی تیا دەبینی؟ ئەویش فەرمووی: ناچار بووم، پاشان عومەر شتێکی پێداو لێی نەگەرا.

### ٧- حوکم لە نەزانی قەدەغە کرانی داوێن پیسی:

سەعیدی کوڕی موسەیب دەفەرموێت: کار بەدەستێکی عومەر نامەیەکی بۆ عومەر نوسی بوو کە تیایدا هەواڵی دابوو، کە پیاوێك دانی ناوە بە داوێن پیسی، عومەر نامەیەکی نوسی بۆ ئەو کار بە دەستەو نوسی بووی، کە لەو پیاوە بپرسێ: کە ئایا ئەزانێ، کە داوێن پیسی یاساغ و قەدەغەکراوە، ئەگەر وتی: بەڵێ، ئەوا سزای بەسەر دا بسەپێنە، ئەگەر ووتی: نەخێر، ئاگاداری بکە کە ئەو کارە یاساغە، ئەگەر گەرایەوە سەری ئەوا سزای بدە.[٦]

---

١ـ الخلافة الراشدة، د. يحيى اليحيى (ص: ٣٥١)، عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٨).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٨).
٣ـ الموطأ (٨٢٧/٢)، المغني (٢١٧/١٢)، البخاري رقم (٢٥٤٨).
٤ـ السنن الكبرى للبيهقي (٣٥/٨)، المغني (٢١٧/٢).
٥ـ السنن الكبرى للبيهقي (٢٣٦/٨)، المغني (٢١٨/١٢).
٦ـ المحلي (١٠٧/١٢) رقم (٢١٩٨).

### ٨- ئافرەتێك لەعیدەدا هاوسەری کردو خۆی و هاوسەری نەیانزانی، کە ئەم کارە یاساغە:

ئافرەتێك لەماوەی عیدەکەیدا هاوسەری کردو ئەم هەواڵە گەیەنرایەعومەرو ئەویش لێیدا بێ سزاو لێکی جیاکردنەوە،[١] وە وەك تەمێ کردنیش لە پیاوەکەیدا.[٢]

### ٩- ئافرەتێك کە مێردی هەبوو بەنهێنی مێردێکی تری کردەوە:

عومەر بەرد بارانی کرد،(١٠٠) قامچی دا لە مێردەکەی، لەبەر نەزانینی بەکارەکەو بەردبارانی نەکرد.[٣]

### ١٠- تۆمەتبارکردنی موغیرەی کوڕی شوعبە بە داوێن پیسی:

سێ کەس شایەدیان لەسەردا و چوارەم پاشگەز بوویەوە عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە شەیتانی بەیارانی محمد(ﷺ) دڵخۆش نەکرد،[٤] عومەر سزای هەڵوەشانەوەی لەسەر ئەو شاهێدیە لەو سێ کەسەدا لەبەر ئەوەی کە شایەدیەکە بەو سیانە تەواو نەبووە.[٥]

### ١١- حوکمی ئەو کەسەی کە شادی بە خزمەتکارەکەی دەکات:

ئافرەتێك مێردی بە بەندەکەی کرد، کاتێك کە پێیان وت، وتی: ئەی ئەوە نیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ (النساء: ٣٦).

ئەمەش بۆتە موڵکی من پاشان کێشەکە بۆ عومەر (ﷺ) بەرزکرایەوە، عومەر پێی وت: ئەمەی بۆ تۆ بۆتە موڵك بۆ تۆ گونجاو نیە،[٦] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە: لێکی جیاکردنەوە و سەد جەڵدی وەك تەمێ کردن نەك وەك سزای ئاینی دا لە ئافرەتەکە وە سزای ئاینی لەسەر هەڵگرت لەبەر نەزانی بە قەدەغەی ئەو کارە.[٧]

### ١٢- ئافرەتێك هاوسەرەکەی بە کەنیزەکەکەی تۆمەتبار کرد:

ئافرەتێك هاوسەرەکەی بەکەنیزەکەکەی تۆمەتبار کردو، پاشان دانی نابەوەدا، کە پێی بەخشیوە، عومەر(ﷺ)فەرمانی سزای ئاینی بەهەڵوەشانەوەدا بەسەریداو هەشتا جەڵدی لێدا.[٨]

---

١ـ المحلى (١٩٢/١٢) رقم (٢٢١٥).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٩).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ المغني (٢٤٥/١٢).
٥ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٤٩).
٦ـ المحلى (١٩٤/١٢) رقم (٢٢١٦).
٧ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٢٠٣).
٨ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٥٠).

## ١٣- بەجێ هێنانی سزای هەڵوەشانەوە بە پلارتێگرتن:

لە سەردەمی عومەردا ئەوە ڕوویدا کە یەکێك پلاری گرتە کەسێکی تر و ئەویش پێی وت: نە باوکم داوێن پیسە و نە دایکم، عومەر لەم کارەدا ڕاوێژی کرد و کەسێك وتی: بە چاکی باسی دایك و باوکی کردووە و ئەوانی تریش وتیان: ئەو بۆ باوك و دایکی جێگایەکی تری داناوە ئێمە باشە کە سزای جەڵدی لێبدەیت، پاشان عومەر(٨٠) جەڵدی لێدا،[1] عومەر (ﷺ) سزای جەڵدی لێدا بە پلار تێگرتن لەبەر ئەوەی کە بەڵگەکە زۆر ڕوون بوو، چونکە پیاوەکە پلاری گرتبوویە هاوڕێیەکەی لەبەر ئەوەی بارودۆخەکە ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئەو پیاوە ئەمەی نەدرکاندووە تا دوای دژایەتی و ئاژاوەیەك، کاری عومەریش(ﷺ) دادەنرێت بە سیاسەتێك کە بە نیاز بووە کە تەمێی نەفامانی پێ بکات و نامووسی بێتاوانان بپارێزێت کە سیاسەتێکی ژیرانەیە و پێچەوانەی هیچ دەقێك لە قورئان و سونەت نیە، بەڵکو ئەو کاری بە گیانی شەریعەتێکی ئارەزوومەندانە کار دەکات.[2]

## ١٤- بە فیڕۆچوونی خوێنی جوولەکەیەك لەسەر نامووس:

لە سەردەمی عومەردا(ﷺ) دوو لاوی هاونیشتمانی کە زۆر باش بوون یەکێیکان ئارەزووی کرد و براکەی ڕاسپارد کە بڕوات بۆ لای کەس و کاری، ئەویش شەوێك هاتە دەرەوە هەتا بڕوات بۆ ماڵی براکەی کە بەڵێنی پێدابوون، کاتێك کە نزیك بوویەوە بینی چرایەك پرشنگ دەدات، جوولەکەیەك لە گەڵ خێزانی براکەی بوو دەیوات:

| | |
|---|---|
| وأشعث غرة الاسلام مني | خلوت بعرسه ليل التمام |
| أبيت على ترائبها ويمسي | على جرداء لاحقه الحزام |
| كأن مجامع البلات منهـا | فئام ينهضون الى فئـام |

لاوەکە گەڕایەوە بۆ لای کەس و کارەکەی و دەستی دایە شمشێرێك، هەتا چوویە ماڵی براکەی، جوولەکەکەی کوشت و پاشان ڕایکێشا و لەسەر ڕێگەیەك فڕێی دا، دواتر جوولەکەکە و هاوڕێکەیان کە کوژرابوو نەیاندەزانی کە کێ کوشتوویەتی، بۆیە هاتنە لای عومەر، چوونە ژوورەوە بۆ لای، ئەم ڕووداوەیان بۆ باس کرد، عومەر بانگی بۆ نوێژی بە کۆمەڵ دا و کاتێك کە خەڵکەکە کۆبوونەوە عومەر چوویە سەر مینبەر، سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: خوای گەورە پیاوێکی هێناوەتە پیاهەڵدان و دەزانێت ئەم کوژراوە کێیە بە جۆرێك هەتا هەواڵم پێ دەدات بەو کارە، لاوەکە هەستایە سەرپێ و عومەر شیعرێکی وت و هەواڵی پێدا و پاشان عومەر فەرمووی: خوای گەورە دەستت نەبڕێت، خوێنی بە فیڕۆدا.[3]

---

١ـ السنن الكبرى للبيهقي (٨/٢٥٢).

٢ـ أوليات الفاروق (ص: ٤٣٩-٤٤٠).

٣ـ أوليات الفاروق (ص: ٤١٤).

## ١٥- کوژراوی خودا هەرگیز خوێن بایی نادرێت:

عبدالرزاق لە(مصنف)ەکەی و بەیهەقی لە(سن)ەکەی دەگێڕنەوە کە پیاوێك میوانداری چەند کەسێکی تیرەی هەزیلی کردووە کەنیزەکێکی خۆی نارد هەتا داریان بۆ بهێنێت، میوانێکیان پێی سەرسام بوو وە شوێنی کەوت، نیازی لێ کرد بۆ خۆی، بەڵام کەنیزەکەکە ڕێگری لێ کردن وە ماوەی یەك کاتژمێر لەگەڵیدا بە جەنگ هات و لە دەستی دەرچوو، پاشان بەردێکی لێدا و جەرگی بڕی و مرد، کچەکە گەڕایەوە بۆ لای کەس و کاری و هەواڵی پێدان، دواتر کەس و کارەکەی چوون بۆ لای عومەر و هەواڵیان پێدا، عومەر شوێنەوارەکەی بینی و فەرمووی: کوژراوی خوا هەرگیز خوێن بایی نادرێت وە ئەو(ﷺ) خوێنی ئەو پەلاماردەرەی بە فیڕۆدا فەرمووی: تۆڵە سەندنەوە و خوێن بایی و گەردن ئازادانەی نیە.

## ١٦- ئەگەر خەڵکی صەنعا بەشداریان تێدا بکردایە دەمکوشتنەوە:

إبن عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: لاوێك ژنێکی قەڵەوی کوشت و عومەر فەرمووی: ئەگەر خەڵکی صەنعا بەشداریان تێدا بکردایە دەمکوشتنەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کە چوار کەس منداڵێکیان کوشت و عومەر فەرمووی: ئەگەر خەڵکی صەنعا بەشداریان تێدا بکردایە دەمکوشتنەوە،[١] ئەم سزایە هیچ دەقێکی قورئانی یان سونەت یان شوێنەوارێکی ئەبو بەکری لەسەر نەبوو وە ئەو هەر وەك خۆی دادی کرد، بەڵکو سزاکەی لەسەر تێگەیشتنی خۆی بۆ بنەما شەرعیەکان بنیات نا کە بۆ پاراستنی ئاسایشی ژیانی کۆمەڵگە و سەقامگیرکردنی هاتووە، بەجۆرێك کە خوێن ڕشتن هەروا کارێکی ئاسان نیە، لەبەر ئەوەش پێویستە ماف پەروەری و بەرژەوەندی ئومەت و بنەما شەرعیەکانی تۆڵە سەندنەوە دادی پێ بکرێت ئەگەر سەلمێنرا، کە هەمووان ڕێککەوتوون لەسەر کوشتنی، هەر ئەمەیە کە جەماوەری زانایان لەچوار پێشەواکەو سەعیدی کوڕی موسەیب و حەسەن و ئەبی سەلەمەو عطاو قەتادەو سەوری و ئەوزاعی و ئەوانی تر بۆی چوون،[٢] ئەم ڕایە زۆر دروست و ئەولاترە بە شوێنکەوتن وە ئەمەش بۆبەهێزی بەڵگە هێنانەوەیە لەکاری عومەرو بەرهەڤبوونی یاران و ئەوەی تێیدایە لە ژێری لە دابین کردن و سزای خەڵکی و پاراستنی کەسەکان لە کۆمەڵگەدا.[٣]

## ١٧- سزای جادووگەر کوشتنە:

عومەر(ﷺ) نامەی نووسی بۆ کاربەدەستانی کە هەموو جادووگەرێکی ژن یان پیاو بکوژن،[٤] ئەم سزایە بەجێ هێنرا و بڕیارێکی بەرهەڤبو بوو لە یارانەوە.[٥]

---

١ـ البخاري، ك: الديات رقم (٦٨٩٦).
٢ـ المغني لإبن قدامة (٣٨٧/١١)
٣ـ أوليات الفاروق السياسية (ص: ٤٠٩).
٤ـ أوليات الفاروق السياسية (ص: ٤٤٧).
٥ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٤٤٧).

## ١٨- کێ منداڵەکەی بە ئەنقەست کوشتووە؟ سزای ئەو موسڵمانە چیە کە زامن کراوێك دەکوژێت؟

عومەر(ﷺ) فەرمانی دا کە هەر کەس کوڕەکەی خۆی بکوژێت پێویستە خوێن بایی بدات،[١] ئەو موسڵمانەی کە کەسێکی زامن کراو دەکوژێت سزای تۆڵە سەندنەوەیە بە کوشتنی ،ئەمە ڕوویدا لە سەردەمی عومەردا کاتێك، کە موسڵمانێك کەسێکی زامن کراوی کوشت و پاشان لە تۆڵەیدا کوژرایەوە.[٢]

## ١٩- کۆبوونەوە لە نێوان خوێن بایی و سوێندخۆراندا:

سوێند خۆر: بریتی یە لە سوێند خواردنی دوبارە لە سکاڵای کوشتن لە خاوەن کوژراوان ئەوانەی کە داوایان لەسەرە،[٣] عبدالرزاق و إبن ئەبی شیبة و بەیهەقی لە شەرعی یەوە هێناویانە کە کوژراوێك لە نێوان هەردوو ناوچەی وادعە و شاکر دۆزرایەوە،[٤] عومەر فەرمانی پێ دان کە نێوانی هەردوشارەکە لە مردوەکە یان کوژراوەکە کاتێ کە بینیان لە وادعەوە نزیکتر بوو لەبەرئەوە عومەر(٥٠) سوێندی دان، هەموو پیاوێك بڵێت کە ئەو نەیکوشتوەوە و نازانێ کە کێ کوشتویەتی، پاشان خوێنەکەشی پێ بژاردن، دواتر وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران نە سوێند خواردنەکانمان هانیدان بۆ سامانەکانمان و نە سامانەکانمان هانیدان بۆ سوێند خواردنەکانمان: عومەر فەرمووی: هەروا ڕاستە،[٥]

## ٢٠- خوای گەورەا من ئەم کارەم نەبینیوە فەرمانیشم نەداوە، قایل نەبوم و دڵخۆش نەبوم کە پێم گەیشت:

کاتێ کە عومەر هەواڵی ئازاد کردنی(تەستەر)ی پێگەشت، فەرمووی: ئایا هیچ هەیە؟ وتیان: بەڵێ، پیاوێك لەئیسلام پاشگەز بۆتەوە و هەڵگەراوەتەوە، عومەر فەرمووی: چیتان لێ کرد؟ وتیان: کوشتمان،عومەر فەرموی: ئایا کردتانە ژووری یان دەرگاتان لەسەر داخست وە یان نانتان داو هەموو ڕۆژێ نانێکتان دایە و تەوبەتان پێ کرد، ئەگەر تەوبەی بکردایە ئەگەر نا بتان کوشتایە، فەرمانیشم پێ نەداوە، پێی قایل نەبوم و دڵخۆشیش نەبووم کە پێم گەیشت.[٦]

## ٢١- عومەر سزای ئاینی مەی نۆشینی کردە هەشتا جەڵدە:

کاتێك کە عومەر دەسەڵاتی خەلافەتی گرتە دەست جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلام زۆر بوون و بارودۆخی خەڵکی ڕووی لە باشی کرد، خەڵکێکی زۆر هاتنە ڕێزی ئیسلامەوە کە پەروەردەیەکی

---

١ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٥٣)، المغني (١١/٥/٤٠٥).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٥٣)، المغني (١١/٥/٤٠٥).
٣ـ أوليات الفاروق (ص: ٢٦٤).
٤ـ أوليات الفاروق (ص: ٢٦٦)، قبيلتان باليمن.
٥ـ السنن الكبرى للبيهقي (٨/١٢٣-١٢٤)، أوليات الفاروق (ص: ٤٦٦).
٦ـ محض الصواب (١/٣٧٢).

ئیسلامی تەواو و تێگەیشتنیان لە ئاین بە تەواوی وەرنەگرتبوو وەك ئەوانەی کە پێشتر موسڵمان بووبوون، لە نێو خەڵکیدا خواردنی مەی زۆر بووبوو ئەمەش بویە کۆسپێك لەبەردەم عومەر، لەبەر ئەوە گەورە یارانی کۆکردەوە و ڕاوێژی پێ کردن لەم کارە، ئەوانیش ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە سزای ئاینی هەشتا جەڵد بێت کە ئەمەش کەمترین سزا بوو، عومەر کاری بەمە کرد و هیچ کام لە یاران لە سەردەمی ئەودا دوو را نەبوون.[1]

إبن القيم دەفەرموێت: خالدی کوڕی وەلید وەبرەی سەلیتی نارد بۆ شام بۆ لای عومەر فەرمووی: کاتێك چوومە لای طلحة و زوبێری کوڕی عەوام و عبدالرحمن کوڕی عەوفی لە لا بوو کە لە مزگەوت پاڵیان دابوویەوە منیش پێم وت: خالدی کوڕی وەلید سلاوت لێ دەکات و پێت دەڵێت: خەڵکی دەستیان داوەتە مەی خواردنەوە و سزاکەی بە کەم دەزانن ئیتر نازانم تۆ دەڵێی چی؟ عومەر فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن لای تۆ و فەرمووی: ئەوەی ئەمانە وتیان بیگەیەنە بە هاوڕێیەکەت، خالید هەشتا جەڵدی وەشاند و عومەریش هەشتا جەڵدی وەشاند.[2]

## ٢٢- سوتاندنی مەیخانە:

یەحیا کوڕی سەعید کوڕی عبداللە لە نافع و ئەویش لەإبن عومەر(ﷺ) دەفەرموێت: عومەر لە ماڵی پیاوێکی سەقیف مەی دۆزیەوە فەرمانی پێدا و پیاوەکە سەرکەشی کرد، ئەم پیاوە پێیان دەوت تێگەیشتوو بەلام عومەر فەرمووی: تۆ پیاوخراپی،[3] إبن الجوزی دەفەرموێت: سوتاندنی واتا عومەر ماڵی ئەو پیاوەی سوتاند، کە مەیخانە بوو، إبن القيم دەفەرموێت: عومەر(ﷺ) مەیخانەکەی سوتاندە بەوەی کە تیایدابوون وە گوندێکیشی سوتاند کە مەی تیا دەفرۆشرا.[4]

## ٢٣- وەك ئافرەتێکی موسڵمانی ڕووسوور مارەی ببڕە:

پیاوێك هاتە لای عومەر(ﷺ) وتی: کچێکم لە سەردەمی نەفامیدا زیندەبەچاڵ کرد بەلام پێش ئەوەی بمرێت دەرمان هێنایەوە، ئەو هەستی بە مانا و چێژی ئیسلام کرد و موسڵمان بوو پاشان دووچاری سزایەك لە سزاکان بوویەوە، تیغێکی هەڵگرت هەتا خۆی سەربڕێت، کاتێك پێمان زانی هەندێك لە دەمارەکانی گەردنی خۆی بڕیووە منیش تیمارم کرد تا چاك بوویەوە و پاش تەوبەیەك باشی کرد لێی هاتنە پێشێ، تا مارەی ببڕن بۆ کەسێك، ئایا هەواڵیان پێ بدەم بەوەی کە بووە؟ عومەر(ﷺ) فەرمووی ئایا دەتەوێت پەردە لەسەر شتێك هەڵماڵی کە خوای گەورە پۆشیویەتی، سوێند بە خوا ئەگەر ڕابردووی ئەو کچە بۆ هەر کەس باس بکەیت ئەوا دەتکەمە بەزم بۆخەڵکی ناوچەکان، ئەو کیژە وەك ئافرەتێکی ڕووسووری موسڵمان مارە ببڕە.[5]

---

١ـ إعلام الموقعين (٢١١/١).
٢ـ إعلام الموقعين (٢١١/١).
٣ـ الاموال لأبي عبيدة (ص: ١٢٥)، رقم (٢٦٧)، أوليات فاروق (ص: ٤٥٣).
٤ـ الطريق الحكيمة (ص: ١٥-١٦).
٥ـ محض الصواب (٧٠٩/٢) إسناده صحيح الى الشعبي ولكن منقطع بين شعبي و عمر.

## ٢٤- هەر کەسێك خێزانی تەڵاق دا لە میرات بێ بەشی دەکات:

سالم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە غیلانی سەقەفی موسڵمان بوو لە سەردەمی پێغەمبەر(ρ) دەخێزانی هەبوو، پێغەمبەری خۆشەویست(ρ) پێی فەرموو: ((چواریان هەڵبژێرە))، کاتێك کە کەوتە سەردەمی عومەر خێزانەکانی تەڵاق دا و ماڵەکەی دابەش کرد بەسەر منداڵەکانیدا ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر(ﷺ) ئەویش ناردی بە دوایدا غیلان هات بۆ لای، عومەر فەرمووی: من وای نیشان دەدەم کە شەیتان لەوەی گوێ دەگرێت گوێی لە مردنی تۆ بووە و داویەتی لە دڵت کە دەمری لەبەر ئەوە ئەو دەست پێشخەریەی خستوویە ئەستۆ کە ئەنجامت داوە،سێند بە خوا وا گومانت بۆ دەبەم کە لەم جێگایەم هەڵناستی هەتا دەمری، سوێند بە خوا ئەگەر مردی پێش گەڕانەوەی خێزانەکانت و ماڵەکەت ئەو ماڵەت دەکەمە میراتی ژنەکانت پاشان گۆڕەکەت بەردباران دەکەم هەتا لە سەری ئەوە دادەنێم کە ئێستا لەسەر گۆڕی ئەبی ڕەغالە، غیلان ژنەکانی هێنایەوە، تەڵاقی نەدان وە ئەو ماڵەی لە نێوان منداڵەکانی بەش کردبوون وەری گرتەوە پاشان زۆر نەمایەوە تا مرد.[1]

## ٢٥- کەمترین و زۆرترین ماوەی سك پڕی:

ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عومەر، کە لە شەش مانگیدا منداڵی بووبوو، عومەر ویستی بەردبارانی بکات، خوشکی ژنە هات بۆ لای عەلی و وتی: عومەر نیازی بەردبارانی خوشکەکەمی کردووە سوێندت دەدەم بەخودا، کە بیانوویەکی بۆ دەزانی، بەڵکو پێمی بڵێی عەلی فەرمووی: ئەو بیانووی هەیە، ژنە الله اکبرێکی کرد، کە عومەرو هەموو ئەوانەش کە لای بوون بیستیان، پاشان ئافرەتەکە چوو بۆ لای عومەر و وتی: عەلی وای نیشان دەدات، کە خوشکەکەم بەهانەی هەیە، عومەرناردی بەدوای عەلیدا و پێی فەرموو: کامەیە بەهانەی؟ عەلی فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ﴾ (البقرة: ٢٣٣).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾ (الاحقاف: ١٥).

دووگیان بوون و لەشیر بڕینەوەشی(٢٤) مانگە لەبەرئەوە عومەر وازی لێ هێنا، دووگیان لە سکی دایکیدا زیاتر لە نۆ مانگ مایەوە، ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عومەر، کە دوو ساڵ دەبوو هاوسەرەکەی بەجێی هێشتبوو، کە هاوسەرەکەی هاتەوە ئەو سکی هەبوو، عومەر بیری لەوە کردەوە، کە بەرد بارانی بکات، موعازی کوڕی جەبەل پێی فەرموو: ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەگەر تۆ ڕێگەچارەیەکت هەیە بۆ ئەو، بەڵام ڕێگەچارەت بۆ ئەو کەسە نیە، کە لە سکیدایە، لەبەر ئەوە عومەر وازی لە ئافرەتەکە هێنا، هەتا منداڵێکی بوو وە بڕۆکی چاند، پاشان هاوسەرەکەی زانی، کە شێوەی منداڵەکە لە خۆی دەکات، عومەر فەرمووی: ئافرەتان لەوە کەوتوون لە وێنەی موعازیان ببێت، ئەگەر موعاز نەبوایە عومەر تیا دەچوو،[2] بەمەدا دەرکەوت، کە عومەر بینی، کە زۆرترین ماوەی سك پڕی

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٤٧).
٢ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٣٧١).

چوار ساڵە، لەبەر ئەوەی کە لە ژنێکی بێ سەرو شوێندا ڕویدا کە چوار ساڵ چاوەڕوانی دەکات، پاشان ماوەی مردنی دەژمێرێت، إبن قودامە مەزهەبی عومەر لەمەدا دەگێڕێتەوە، کە دەفەرموێت: وون بوون چوار ساڵ خێزانەکەی چاوەڕوانی دەکات پاشانی ماوەی مردنی دەژمێرێت و دەگونجێ، کە شو بکاتەوە.[1]

## حەوتەم: دانانی کۆت و بەند لەسەر موڵکایەتی هەتا لەبەکارهێنانی ناڕەوا نەکەوێتەوە:

لەو هەوڵدانانەی عومەر، کە سەردەمەکەی پێ پێشکەوت و دەلالەت دەکاتە سەر سەرکەوتنی بەرژەوەندی گشتی بەسەر بەرژەوەندی تایبەتی داو کۆت و بەند لەسەر بەندایەتی دادەنێ هەتا لە بەکارهێنانی جەورو ستەم و ناڕەوایی نەکەوێتەوە ئەوەیە، کە مالك لە(الموطأ) ریوایەتی کردووە کە: عەمر کوڕی یەحیای مازنی لە باوکیەوە هێناویەتی کە زوحاکی کوڕی خەلیفە ئاو درێکی خۆی بە پانتایی یەکدا بردوو بە نیاز بوو بەزەوی یەکەی محمد کوڕی موسلمە دا بیبات، بەڵام محمد قایل نەبوو، زوحاك پێی وت: بۆ ڕێگەی ئەم کارەم لێ دەگریت لەکاتێکدا، کە بۆ تۆش سود مەندە و هەموو نەمامەکانت تێر ئاو دەبن و زیانت پێ ناگەیەنێ بەڵام محمد هەرقایل نەدەبوو، زوحاك چوو بۆ لای عومەر و کێشەکەی بۆ باس کرد، عومەر زوحاکی بانگ کرد، فەرمانی بەسەرادا کە ڕێگەی ئەو ئاوە بەر بدات بەڵام محمدی کوڕی موسلیم هەر قایل نە دەبوو، عومەر فەرمووی: بۆ ڕێگری ئەم کارە لە برات دەکەیت لە کاتێکدا هەموو نەمامەکانت تێر ئاو دەبن و زیانی تێدا ناکەیت؟ محمد ووتی: سوێند بە خوا نایەڵم، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ئەو ئاوە دەڕوات ئەگەر بەسەر سینەشتدا بێت، عومەر فەرمانی دەرکرد بە تێپەڕ بونی ئاوەکە، زوحاك ئەم کارەی کرد،[2] ئەم کارەی عومەر لەسەر پێوەری ئەو فەرمودەیە بوو کە ئەبو هریرە هێناویەتی و تێیدا دەفەرموێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ((هیچ کامتان ڕێگری لە هاوسێکەی ناکات لە پارچە تەختەیەك لە دیوارەکەیدا دایچەقێنێت))، پاشان ئەبو هریرە فەرمووی: نازانم بۆچی دەتانبینم کە لەسەر ئەم کارە ناکۆکن سوێند بەخوا ئەو کارە دەخەمە گەردنی خۆتان.[3]

لەوەی کە عومەر کردی بۆمان دەردەخات کە ئەم پێوەری یەکەمە، لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری هاوسێکەی کردووە لەوەی کە ڕێگە بگرێت لە هاوسێکەی لە چاندنی دارێك، ئەم کارەش ئەگەر زیان بە هاوسێکەی نەگەیەنێت ئەوا لە هەمان کاتدا سوود بەو هاوسێیە ناگەیەنێت، لەو کاتەدا تێپەڕبوونی ئەم ئاوە کە دوو کێشەی پێکەوە لەسەر کۆبۆتەوە، سوود بەو هاوسێیە دەگەیەنێت و زیانیشی بۆ نابێت، ئەمەش پێوەری یەکەمە، ئەگەر أحمد إبراهیم ئەوە بەدی بکات کە عومەر لەم کارەساتەدا دادوەری کردووە بەوەی کە ئەمڕۆ دەیزانێت بە بنەماکانی دادپەروەری،[4] ئەوا عبدالسلام

---

١ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ٣٧١).
٢ـ راجع الموطأ وكتاب: إسعاف المبطأ برجان الموطأ (ص: ٦٣٨-٦٣٩)، الموطأ (٧٤٦/٢).
٣ـ سبل السلام شرح بلوغ المرام (٦٠/٣).
٤ـ علم أصول فقه وتأريخ التشريع (ص: ٣٩).

سلێمانی ئەوە بەدی دەکات کە ئەم گرفتە دەڕواتە ناو بابەتێکەوە کە ئەمڕۆ ناسراوە بە تێگەشتنی ڕۆژئاوایی بە بیردۆزەی ناڕەوایی لە بەکارهێنانی ماف لەم پیرۆزیەی کە موسڵمانان پاش چەندین سەدە هەنگاویان بۆ ئەو تێگەیشتنە ڕۆژئاواییە ناوە، لە فەرموودەکەی ئەبو هرەیرەدا کە پێشتر باسکرا ئەوە دەردەکەوێت ئەوەی عومەر گشتاندنی بۆ کرد لە هەموو ئەوانەی کە لە دراوسێ پێویستیەتی بۆ سوود گەیاندن پێی لە ماڵی هاوسێکەی و زەویەکەی و ئەوانی تریش وا بۆی چوون کە ئەم کارە بەبێ مۆڵەتی ئەو هاوسێیە بەڕێوەناچێت و تەواو نابێت.[1]

## لەسەر ئەم گرفتە چەندین کێشە بەدی دەکرێت لەوانە:

١- ئەم گرفتە دەڕواتە نێو هەوڵدانێکی دادپەروەری بۆ عومەر، لەبەر ئەوەی کە ئەو لەسەر بنەمای سکاڵایەك کاری لەسەر کرد زوحاك لای عومەر تۆماری کردبوو پاش ئەوەی موحەممەدی کوڕی موسلیم بە نەرێ چووبوویە دەمیەوە لەوەی لێی داوا کردبوو بە سیفەتێکی دۆستانە، پاش ئەوەی کە لەم دواییانەدا عومەر بانگی کرد تا لە دانیشتنەکەی ئامادەبێت.

٢- عومەر لەم گرفتەدا بێهودە فەرمانی خۆی ڕانەگەیاند بەڵکو لەم کارەدا ئەوەی سەلماند و بە ئاگابوو لە تێکەڵ بوونی کێشە و جەختی کردەوە لەسەرسوور بوونی دژ لەسەر هەڵوێستێکی بەرپەرچدەر بۆ تێپەڕبوونی ئەو ئاوە بە زەویەکەیدا، کە ئەمەش هەڵوێستێکی بێ بەهانەیە بۆی، لەبەر ئەوەی تێپەڕبوونی ئەو ئاوە هیچ زیانێك دروست ناکات لەسەر داد لە دەست کراو بەڵکو بە پێچەوانەی ئەمەوە بە سوودێکی پوخت دەگەڕێتەوە بۆی و بەرژەوەندیەکی هاوبەش بۆ هەردوولا دەستەبەر دەکات، لەبەر ئەوەی کە کارەکە بەم شێوەیە ئەوا ڕێگری کردن لێی بێ باریەك لەبەردەم فەراهەم هێنانی بەرژەوەندیەکی گشتی دەستەبەر دەکات و دەڕواتە چوارچێوەی زۆرداری لە بەکارهێنانی ماف، عومەر سوکایەتی نەدەکرد لە بەدەست هێنانی چاکسازی گشتی بۆ هەر تاکێکی ئەم ئومەتە.

٣- عومەر زۆرنەرم و نیان بوو لەگەڵ محمدی کوڕی مەسلەمە، بە جۆرێ دەیدواند کە برایەتی ئیسلامی وەیاد دەهێنایەوە و هەوڵی دەدا قایلی بکات بە پاشگەز بونەوە بۆ بینینەوەی ڕاستی، کاتێك محەمەد بە ناپەسندانەوە هات بەرەو ڕووی ئەم نەرم و نیانیە و سوێندی لەسەر بەجێ دەهێنا کە ئەمەش هەڵوێستێکە کە لادەرە لە مەبەست و ئەو ئەستورەی کە خەلیفە مەبەستیەتی ڕێگەگری لە فەرمانی دەکات، ئەو دەمە کاردانەوەی عومەر زۆر بە توندی دەستەبەر بوو لە ئاستی بەرپرسیارێتیەکەی ئاگادارکردنەوەی بۆ سام و هەیبەتی ئەو خەلافەتەی کە بەکاری ناهێنێت ئەگەر بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گشتی نەبێت بۆ کۆمەڵانی موسڵمان و چاودێری کردنی مافەکانیان.[2]

---

١ـ الاجتهاد في الفقه الاسلامي (ص: ١٤٠-١٤١).

٢ـ الاجتهاد في الفقه الاسلامي (ص: ١٤١-١٤٢).

## ٨- جێبەجێکردنی سێ تەڵاق بە یەك وتن:

إبن عباس دەفەرموێت: تەڵاق لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر و دووساڵ لە خیلافەتی عومەردا سێ تەڵاق بە یەك تەڵاق دانراوە وعومەر فەرمووی: خەڵکی پەلەیان کردووە لە کارێکدا کە بۆیان ماوەی تێدابوو و ئەگەر بەسەریاندا سەپاندوئیبن عباس دەفەرموێ جێبەجێیکرد،[1] ئەبی سەهبا بە إبن عباسی فەرموو: ئایا تۆ دەزانی کە ئەو سێ تەڵاقە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و لە ڕۆژانی خەلافەتی ئەبو بەکر و دوو ساڵی ئەمیرایەتی عومەر هەر یەك تەڵاق بوون إبن عباس فەرمووی: بەڵێ.[2]

لەم دوو شوێنەوارەدا عومەر(ﷺ) دابینی کردووە بە دەربڕینی سێ تەڵاق بە سێ جار، لەسەر پێچەوانەی ئەوەی کە لەسەری بووە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکردا کە سێ تەڵاق بەیەك وتن یان یەك دانیشتن بووە و تەڵاقەکە بە یەك جار کەوتووە، تێڕوانینی عومەر لە دەربڕینی ئەم سزایە و تەمێ کردندا ئەوەیە کە خەڵکی زۆر ڕۆچوون لە ڕوودانی سێ تەڵاق و ئەویش بە نیاز بووە کە بیانگێڕێتەوە بۆ ئەو تەڵاقە سونەتیەی، کە خوای گەورە ڕێگەی پێداوە، کە بریتیە لە دەربڕینی تەڵاقێك و لێگەرانی هەتا عیدەکەی تەاو دەبێت، ئەگەر ئافرەتەکە ئارەزووی گەرانەوەی کرد لە پێش ئەو ماوەیە ئەوا هاوسەرەکەی دەیگێڕێتەوە – بەم شێوەیە هەتا ژمارەی سێ تەڵاقەکە کۆتایی دێ،[3] عومەر بەم شێوەیە هەڵسوکەوتی کردووە و هەندێ کەس بە پێچەوانەیان داناوە بۆ دەقەکانی قورئان لەوانە دکتۆر عەتیە مستەفای سەرپەرشتیار کە دەڵێت: عومەر زۆر بوێر بووە لە کارکردن بە ڕای خۆی ئەگەرچی بەم کارەی سەرپێچی هەندێ دەق و ئەو ڕێسایانەی کردبێت کە لای خەڵکی نووسراو و کارپێکردن بووبوون لە پێشتردا، هەتا ئەم حوکمە شیاو بێت بۆ حاڵی کۆمەڵی ئیسلامی نوێ،[4] لەو نموونانەی کە هێناویەتی باس لەوە دەکات کە دەربڕینی سێ تەڵاق بە سێ جار دەوترێت،[5] لە ڕاستیشدا عومەر بەم هەڵسوکەوتەی سەرپێچی دەقێکی نەکردووە بەڵکو هەوڵی داوە کە لە مانای دەقە قورئانیەکان بگات، کە چەندی پاڵپشتی بۆ ئەمە هەیە لەوانە:

١- مالیکی کوڕی ئەشحەب لە قاسمی کوڕی عبدالله دەگێڕێتەوە کە یەحیای کوڕی سەعید باسی ئەوەی بۆ کردووە کە إبن شهاب بۆی باس کردووە کە إبن ئەلموسەیب باس لەوە دەکات کە: پیاوێك کە موسڵمان بوو لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)دا سێ تەڵاقی خێزانەکەی دابوو، هەندێ لە یاران پێیان وت: کە پێویستە بیگێڕێتەوە، ژنەکەش بە پەلە ڕۆیشت هەتا لە ڕێگەی پێغەمبەر(ﷺ) وەستا و فەرمووی: هاوسەرەکەم سێ تەڵاقی داوم بە یەك وشە، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ((تۆ لەوت بنیات ناوە و

---

١ـ مسلم، کتاب: الطلاق، رقم (١٤٧٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ القضاء في عهد عمر بن الخطاب، د. ناصر الطريف (٧٣٣/٢).
٤ـ القضاء في الاسلام (ص: ٩٨).
٥ـ هەمان سەرچاوە.

میراتی لە نێوانتاندا نیە))،[١] پێغەمبەریش(ﷺ) لەم ڕووداوەدا سێ تەڵاقی بە یەك وتە جێبەجێکرد.

٢- نەسائی بە سەنەدی خۆی هێناویەتی کە: پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی دا دەربارەی پیاوێك کە سێ تەڵاقی خێزانەکەی دابوو لە کاتێکدا کە تووڕە بوو پاشان پێغەمبەر(ﷺ)یش فەرموی ((ئەو یاری بە قورئان دەکات لە کاتێکدا کە من لە نێوانتاندام)) هەتا پیاوێك هەستایە سەر پێ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ)ئەو پیاوە نەکوژم،[٢] لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر(ﷺ) تووڕەیە لەو کەسەی کە خێزانەکەی بە یەك جار سێ تەڵاق دەدات و نکۆڵی لێ دەکات ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی ، ئەگەر سێ تەڵاقەکە بە یەك وتن نەکەوتبێت ئەوا پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، لەبەر ئەوەی کە دواکەوتنی ڕوون کردەوە لەکاتی پێویستدا لەگەڵ بونیدا نەشیاوە.[٣]

٣- نافع کوڕی عومەیر کوڕی عبدیەزیدی کوڕی ڕکانە دەگێڕێتەوە کە: ڕکانە کوڕی عبد یەزیدی سوهیمە خێزانی تەڵاق دا ئەم هەواڵەی دایە پێغەمبەر(ﷺ) وتی: سوێند بە خوا تەنها مەبەستم یەك تەڵاق بووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((سوێند بە خوا تەنها یەك دانەت مەبەست بوو))؟ ڕکانە وتی: سوێند بە خوا تەنها یەك تەڵاقم مەبەست بووە، پێغەمبەر(ﷺ) خێزانەکەی بۆ گێڕایەوە و جاری دووەم لە سەردەمی عومەر و جاری سێیەمیش لە سەردەمی عوسمان تەڵاقی دا.[٤]

لەم فەرموودەیەدا کە ڕکانە خێزانەکەی تەڵاق داوە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە تەنها یەك تەڵاقی مەبەست بووە، پێغەمبەر(ﷺ) سوێندی دەدات لەسەر ئەوەی کە تەنها جگە لە یەکێکیان هیچی تری مەبەست نەبووە، ڕکانە سوێندی خوارد و پێغەمبەریش(ﷺ) بۆی گێڕایەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕکانە مەبەستی لە تەڵاقدانی هەرسێ تەڵاق بووایە ئەوا دەکەوتن ، مەگەرنا سوێندەکەی هیچ مانایەکی نەدەبوو، پاش ئەوەی ئەم بەسەرهاتە پێشی دەردەکەوێت، کە عومەرئەمیری باوەڕداران پشت بەست بەو بەڵگەی لە سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)دا هاتووە، کە سێ تەڵاقە بە یەك دەربڕین نابێتە سێ تەڵاق مادەم مەبەستی ئەو تیایدا تەنها یەك تەڵاق بووە، هەروەك ئەوەی زۆرێك لە یاران هاودەنگ بوون لەوەی، کە عومەر بۆی چووە، وەك عوسمان و عەلی و عبداللە کوڕی عەباس و عبداللە کوڕی مەسعود، کە زۆرێك لە ڕیوایەتەکانیان هەیە، لەگەڵ عیمران کوڕی حەصین، لە سەروو ئەمەوە گرفتی دەربڕینی سێ تەڵاق بە یەك وشە، یان چەند وشەیەك وەك ئەوەی کە دەڵێت: تۆ سێ تەڵاقت کەوتووە، یان تۆ تەڵاقت کەوت و تەڵاقت کەوت و تەڵاقت کەوت یان تۆ تەڵاقت کەوت پاشان

---

١ـ المدونة الكبرى ك: الطلاق، باب الطلاق السنة (٦٢/٢) وهو مرسل، ولكن مراسل سعيد بن مسيب كلها صحاح.

٢ـ سنن النسائي، ك: الطلاق الثلاث المجموعة (١٤٢/٢) قال إبن حجر عن هذا الحديث أخرجه النسائي ورجاله ثقات فتح الباري (٦٣٢/٩) وقال إبن القيم: وإسناده على شرط المسلم زاد المعاد (٢٤١/٥).

٣ـ القضاء في عهد عمر بن الخطاب (٧٣٦/٢).

٤ـ سنن أبي داود، كتاب: الطلاق، باب في البتة (٥١١/١) قال أبو داود وهذا أصح من حديث جريج إن ركانه طلعه إمراة ثلاثا لأنهم أهل بيته وهم أعلم به، وقال نووي وأما الراواية التي رواها المخالفون أن ركانه طلعه ثلاثا جعلها واحدة فرواية ضعيفة عن قوم مجهولين وإنما الصحيح فيها ما قدمناه أنه طلقها البتة ولفظ البتة محتمل لواحدة والثلاثة، شرح النووي (٧١/١٠).

تەلاقت کەوت پاشان تەلاقت کەوت یان بڵێت: تۆ سێ تەلاقەت یان دە تەلاقەت یان سەد تەلاقەت، یان هەزار تەلاقەت کەوت و شتی لەو بابەتانە لە دەربڕینی کێشەی هەوڵدانەکان بۆ حاکم بە پێی ئەوەی کە بەدی دەکات لە بەرژەوەندیدا لە شوێن و کاتێك کە هەسێ تەلاقەکە یان یەکێکیان دەخات گێڕاوەیە،[1] إبن القیم – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرموێت: کۆکەك گرەکان لە بە پێشەوە چوونی عومەر ناکۆك نەبوون، بەڵکو پابەندبوونی خۆی بە سێ تەلاق و سزایان بۆ دەبینێت، کاتێك کە زانیان ئەمە کارێکی یاساغ و قەدەغەکراوە و بە دواداچوونی تێدایە، گومانی تێدا نیە کە ئەمە شتێکی شیاوە بۆ پێشەوایان کە خەڵکی پابەند بکەن بەوەی، کە ئەستەمیان کردووە لەسەر خۆیان، تیایدا دەستووری خودایی و ئاسانکاریان تێدا پەسند کردووە.[2]

## نۆیەم: قەدەغەکردنی سیغە( زەواجی کاتی ، موتعە ):

دەگێڕنەوە، کە عومەر(ﷺ) دەستی هەبووە لە قەدەغەکردنی زەواجی کاتی (سیغە)و زۆرپێداگری لەسەر کردۆتەوە، بە کاری داوێن پیسی داناوە بۆ ئەو کەسەی کە دەیکاتە قەڵایەك بۆ خۆی، هەندێ کەس وا دەزانن کە عومەر قەدەغەکاری زەواجی کاتی بووە بەبێ پێغەمبەر(ρ)، ئەبی(نضرة) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: إبن عەباس فەرمانی دەدا بە زەواجی کاتی و إبن زوبێر ڕێگری لێ دەکرد، ئەمەیان باس کرد بۆ جابری کوڕی عبداللە ئەویش فەرمووی: من فەرموودەیەکم لە دەستدایە لە پێغەمبەری خواداوە(ﷺ)، کاتێك عومەر هەستایە سەر پێ فەرمووی: خوای گەورە ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا گونجاندووە کە خۆی ویستوویەتی بەوەی کە ویستوویەتی، قورئانیش لە شوێنی خۆی دابەزیووە و هاتۆتە خوارەوە، ئێوە کاری فەرزی حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن و بەجێی بهێنن هەر بەو شێوەیەی کە فەرمانی پێ کردوون وە دەست لە زەواجی کاتی بهێنن هەر پیاوێك بۆ زەواجی کاتی بێتە لام ئەوا بەردبارانی دەکەم،[3] ئەم شوێنەوارە سوودی بۆ زەواجی کاتی هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەر(ρ)و لە سەردەمی ئەبو بەکریشدا بەڵکو ئەوەی زەواجی کاتی پاش حەڵاڵ کرانی یاساغ کرد، عومەر ئەمیری باوەڕداران بوو وە ئەمەش لە پوختەی موسلیم و (منصف)ەکەی عبدالرزاقدا باسی هاتووە، لە ڕاستیشدا ئەوەی کە زەواجی کاتی قەدەغە کرد پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، ئەوانەی کە ئەم کارەیان لە یارانەوە گواستۆتەوە وایان بینیوە کە زەواجی کاتی کارێکی شیاوە، ڕێگری تەواوی پێغەمبەر(ρ)یان پێ نەگەیشتووە، هەروەها لە دانەپاڵی قەدەغەکرانی زەواجی کاتی بۆ پاڵ عومەر بەبێ ئەوەی کە پاڵپشتێکی هەبێت لە دەقە شەرعیەکان لە دواکەوتووانە، وەك ئەبو هیلالی عەسکەری،[4] رفیق العظیم،[1] بەڵگەی ئەمەش لە سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەزانراوە کە پاڵپشتێك بووە

---

١ـ فقهاء في عهد عمر بن الخطاب (٢/٧٣٦-٧٣٩).
٢ـ زاد المعاد (٢/٢٧٠).
٣ـ مسلم، كتاب: الحج، رقم (١٢١٧).
٤ـ الاوائل (١/٢٣٨-٢٣٩).

بۆ عومەری فاروق لە قەدەغەکردی زەواجی کاتی و ئەمەش هەندێ لەو فەرموودانەی پێغەمبەر(ﷺ)ە، کە سوودی لێ دەبینرێت بۆ ئەوەی کە زەواجی کاتی حەرام و قەدەغەکراو و یاساغە و لەوانەش:

١- موسلیم بە سەنەدی خۆی لە سەلەمەوە ڕیوایەتی کردووە کە دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ساڵی ئەوتاس[2] سێ جار مۆڵەتی بە زەواجی کاتی دا و پاشان ڕێگری لێ کرد.[3]

٢- موسلیم بە سەنەدی خۆی لە سیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی پێدان بە زەواجی کاتی ، من و پیاوێکی تر چووین بۆ لای ئافرەتێکی هۆزی بەنی عامر، کە وەك کچێکی نازداری گەردن بەرز وابوو،[4] هەردووکمان خۆمان نیشان دا، ئەویش وتی: چی دەدەن؟ من وتم عەباکەم، هاوڕێیەکەشم وتی: عەباکەم، عەبای هاوڕێیەکەم زۆر باشتر بوو لەوەی من، من زۆر منداڵتر بووم لەو، کاتێك کە ئافرەتەکە سەیری عەبای هاوڕێکەمی کرد پێی سەرسام بوو، کاتێك کە سەیری منی کرد پێم سەرسام بوو، پاشان وتی: تۆ و عەباکەتم بەسە، منیش ماوەی سێ ڕۆژ لە لای مامەوە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەر کەسێك لەو جۆرە ئافرەتانەی لایە و لەگەڵی ڕادەبوێرێت با ڕێگەی بەردات و لێی گەڕێ)).

٣- موسلیم بە سەنەدی خۆی لە سیرەی ئەلجوهەنیەوە ڕیوایەتی کردووە و دەفەرمووێت: سیرە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ)دا بوو کە پێغەمبەری خۆشەویست فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە من مۆڵەتم پێدان کە لەگەڵ ئافرەتانا ڕابوێرن، خوای گەورە ئەم کارەی، تا ڕۆژی پەسڵان قەدەغە و یاساغ کرد، هەر کەس شتێکی لەو جۆرە ئافرەتانەی لە لایە با ئازادی بکات و وە لەوەی کە بۆتان هێناون هیچیان لێ وەرمەگرن)).[5]

٤- موسلیم بە سەنەدی خۆی لە عەلیەوە هێناویەتی کە گوێی لە ئیبن عەباس بوو کە ئارەزووی زەواجی کاتی کرد، وتی: پەلە مەکە ئەی إبن عەباس، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژی غەزای خەیبەر ڕێگری لەو کارە و خواردنی گۆشتی گوێدرێژیماڵی کردووە.[6]

عومەر(ﷺ) داهێنانی لە قەدەغەکرانی زەواجی کاتی لە خۆوە نەبوە، بەڵکو ئەمە شوێن پێی هەڵگریەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە لە ساڵی فەتح کە ساڵی شەشەمی کۆچی لە خەیبەر قەدەغەی

---

١ـ أشهر المشاهير الاسلام (٢/٤٣٢)، القضاء في عهد عمر بن الخطاب (٢/٧٥٦).
٢ـ أوطاس: وادٍ في الطائف ويوم أوطاس و يوم فتح مكة في عام واحد، وهو سنة ووو من الهجرة شرح النووي لصحيح مسلم (٩/١٨٤).
٣ـ مسلم، كتاب: النكاح المتعة وبيان أنه أبيح ثم نسخ، ثم أبيح ثم نسخ، وأستقر تحريم الى يوم القيامة (٢/١٠٣٣).
٤ـ شرح النووي لمسلم (٩/١٨٤-١٨٥).
٥ـ مسلم كتاب النكاح رقم (١٤٠٦).
٦ـ مسلم كتاب النكاح (٢/١٠٢٧) رقم (١٤٠٧).

کرد، پاشان لە سالی فەتحدا حەلالی کرد و خەلکی لای ئەو ئافرەتانە دەمانەوە بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ و ڕایان دەبوارد، پاشان پێغەمبەر(ρ) یاساغی کرد تا ڕۆژی دوایی.[1]

## دەیەم: لە هەلبژاردنە فیقهیەکانی عومەر (ﷺ):

عومەر(ﷺ) بە هەولدانەکانی خۆی لە بواری تۆلە سەندنەوە و سزا ئاینیەکان و تەمێ کردنداکاریگەری خۆی هەبوو لە دام و دەزگا دادوەریەکاندا، هەروەها عومەر(ﷺ) بەشداری لە پێشخستنی قوتابخانە فیقهیە ئیسلامیەکان کرد بە هەولدانەکانی خۆی کە بەلگەیە لەسەر گونجان و بە ئاگابوونی و لێوان لێو بوونی زانیاریەکەی و قوولی تێگەیشتنەکەی و هەلێنجانی بنەما و شیعارە شەرعیە ئارەزوومەندەکان و چەندین کێشەی زۆری هەیە لە بواری فیقهی ئیسلامی، کە هەلی بژاردووەو ئەمەش هەندێ لەو هەلبژاردنانە:

١- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەلبژارد کە پێستەی مردوو بە خۆشکردنی پێستەکە دەبێتەوە لە کاتێکدا ئەو گیاندارە لە ژیاندا بوویێت.

٢- عومەر(ﷺ) ناقایلی نوێژی لەسەر پێستی ڕێوی هەلبژارد.

٣- عومەر(ﷺ)سیواك کردنی بۆڕۆژوەوان پێ باش بوو لەدوای خۆرئاوابوون و پێی خۆش بوو.

٤- عومەر(ﷺ)مەسحی لەسەر پێلاوو هاوشێوەکانی کاتی بەڕۆژو شەوێ بۆ نیشتەجێ و شێ ڕۆژو سێ شەوی بۆ ڕێبواران هەلبژارد.

٥- عومەر(ﷺ) هەلبژاردنی ماوەی مەسحی لە دوای با لێکەوتنەوە هەلبژاردبوو.

٦- کاتی نوێژی هەینی دوای زەوال دەبێت.

٧- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەلبژاردووە کە دەست بەرکەوتنی عەورەتی نێرینان دەست نوێژ هەلدەوەشێنێتەوە.

٨- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەلبژارد، کە الله أکبر کردن لە جەژن لە بەرەبەیانی ڕۆژی عەرەفەوە بۆ عەسر دەبێت لە دواین ڕۆژی خۆرهەلاتن.

٩- ئەبو بەکرو عومەر ئەوەیان هەلبژارد، کە ڕۆیشتن لە پێشی مردووەوە باشترە.

١٠- عومەر(ﷺ) پێویست بوونی زەکاتی لەسەر منداڵ و شێت هەلبژارد.

١١- عومەر(ﷺ) وتەی بەسەلماندنی هەلبژاردنی هەلوەشانەوەی هەلبژارد، بۆ هەر کەس هەلبژاردنێك هەیە لەبەر ئەوەی لە نێو کۆڕەکەدایە.

١٢- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەلبژارد، کە کڕین و فرۆشتن لە ئاژەلدا دروست نیە.

١٣- ئەوەی هەلبژارد، کە ئەگەر مەرج وابوو کەی ماف هەلوەشایەوەو بە وەفا نەبوو ئەوابارمتە کە بەقەرز دەدرێتەوە،لەبەرئەوەی،کە بەقەرز فرۆشراوە ئەوەی لەسەر تۆیە بریتیە لەمەرجێکی خراپ.

---

١ـ القضاء في عهد عمر بن الخطاب (٢/٧٥٦).

١٤- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد ئەگەر قەرزدار سەرچاوەی ماڵەکەی لای نەدارێك دیتەوە ئەوا ئەو مافدارترە پێی.

١٥- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد، کە کەنیزەك ماڵەکەی خۆی نادرێتەوە لەگەڵ باڵغ بوونی هەتا شوودەکات و منداڵی دەبێت وە یان ماوەی ساڵێك لە ماڵی هاوسەرەکەی دەمێنێتەوە.

١٦- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد، کە چەشمەی گیاندار بەچواریەکی نرخەکەی لە خۆ دەگیرێت.

١٧- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد، کە تکا کردن لە پەخش نەکراوی بەش نەکراودا نەبێت نابێت، بەڵام تکاکردنی بۆ نیە.

١٨- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە ئاودران لە هەموو کاتێکدا شیاوە.

١٩- عومەرو ئەبوبەکر ئەوەیان هەڵبژارد،کە دەکرێت کرێکار بەجل و بەرگ بۆکردنی بەکرێ بگیرێت.

٢٠- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە بەخشش بەوەرگرتن نەبێت پێویست نابێت.

٢١- عومەر ئەوەی هەڵبژارد کە بەخشش بۆ کەسێك نەبێت دەگێردرێتەوە ئەگەر بازی نەدا بە سەریدا، هەر کەس شتێکی بەخشیە دۆستێکی بۆی نیە بیگێڕێتەوە.

٢٢- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە ماوەی ناسینی دۆزراوە یەك ساڵە.

٢٣- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە وەرگرتنی ئاسانکاری لە دۆزراوە کارێکی شیاوە و سوود پێ گەیاندنی لە نەزانراوەکانە.

٢٤- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە دۆزراوە لەو ماوە باوەڕپێکراوەدا ناسراوە، خاوەنەکەی نەناسیەوە، ئەوا وەك تەواوی سامانەکەی دەبێت ئەگەر دەوڵەمەند بێت یان هەژار.

٢٥- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە دۆزراوەی حەڵاڵ و حەرام وەك یەك وان.

٢٦- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە دۆزراوە بە دەستی ئەو کەسە سەقامگیر دەبێت کە دەدۆزینەوە ئەگەربێت و ئەو کەسە دەست پاك بێت.

٢٧- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە: پیاو دەتوانێت لە وەسێتنامەی پاشگەز بێتەوە وە فەرمووی: پیاو هەر چۆن بیەوێت لە وەسیەت نامەکەی دەگۆڕێت.

٢٨- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد، کە(کلالە) ناوێکە بۆ ئەو مردووەی، کە نە منداڵی هەیە و نە دایك و باوك.

٢٩- عومەر(ﷺ) ئەوەی هەڵبژارد کە خوشکان لەگەڵ کچاندا عەسەبەن و ئەوەی مایەوە بۆ هەموانە.

٣٠- ئەگەر مێردو دایك هەبوون، چەند برایەك لە دایکەکە و چەند برایەك لە باوکەکە هەبوون ئەوا ئەم کێشەیە لە زانستی میراتدایە و زانایانی کۆن و نوێ تیایدا چەند دەنگ بوون، دەگێڕنەوە لەعومەرو عوسمان و زەیدی کوڕی ثابت (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەوان میراتیان لەنێوان منداڵی دایك و باوکەکە و کوڕێکی دایکەکە لە سێیەکدا هاوبەش کردووە و پاشان بە یەکسانی میراتیەکان لە نێوان

بەش کردوون بە کە کوڕێك دوو بەشی کچی وەرگرتووە، دەگێڕنەوە کە عومەر منداڵی دایك و باوکەکەی بێ بەش کردووە وە هەندێکیان دەڵێن: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ببەخشە ئێمە باوکمان گوێدرێژ بووە ئایا دایکمان هەر یەکێك نیە، ئەویش هاوبەشی کرد لە نێوانیان و ئەم گرفتەش بە هاوبەشی کردن ناودەبرێت هەروەك پێشتر هاتووە.

٣١- عومەر ئەوەی هەڵبژاردووە ئەگەرچی زۆریش بێت بەشی باوان شەش یەکە و ئەمەش وتەی ئەبوبەکرە.

٣٢- عومەر ئەوەی هەڵبژارد کە خوشك نیو بەشی میراتی، دایك سێیەکی ئەوەی کە دەمێنێتەوەو هەر چیەکیش مایەوە ئەوا بۆ باپیرە.

٣٣- عومەر ئەوەی هەڵبژاردووە ئەگەر میراتگران هاوسەر و دایك و باوك بوون، ئەوا هاوسەرەکە نیوەی بەشەکە و سێیەکی ئەوەی کە مایەوە بۆ دایك و ئەوی تر بۆ باوك دەبێت، ئەگەرخێزان و دایك و باوك بوون ئەوا خێزان چواریەکی میراتیەکە دەبات و سێیەکی ئەوەی مایەوە بۆ دایك و ئەوی ترش کە دەمێنێتەوە بۆ باوك دەبێت، ئەم دوو مەسئەلەیە بە ڕێگە چارە عومەریەکان ناوزەد دەکرێن لەبەر ئەوەی کە عومەر بەمە دابینی تێدا کردوون.

٣٤- عومەر ئەوەی هەڵبژارد، کە خزمان ئەگەر کەسانی وەرگرو عەسەبە نەبن دەبنە میراتگر.[1]

ئەمە هەندێ لەهەڵبژاردە عومەریەکان بوون لە بواری تێگەیشتن، کە شیاوی توێژینەوەو گەیاندنەو من لە بواری ئاماژە پێکردندا باسم لێوە کرد.

---

١ـ محض الصواب (٣/٧٥٤-٧٥٥).

# بەشی پێنجەم

# تێگەیشتنی عومەر(ﷺ) لە مامەڵەکردن لەگەڵ والیەکان

کاتێك، کە پانتایی دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی عومەردا فراوانتر بوو دەوڵەت دابەش کرا بۆ چەند بەڕێوەبەرایەتیەکی گەورە تا فەرمانداری و سەرپەرشتی کردنی داهاتەکانی ئاسان بێت، جەنگە ڕزگاریخوازەکان هۆکارێکی سەرەکی بوون، لە پێشکەوتنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت لە لایەن عومەرەوە بە تایبەتی دام و دەزگای والیەکان.

## دوانگەی یەکەم

## هەرێمەکانی دەوڵەت

دابەش کردنی ولایەتەکان لە سەردەمی عومەردا لە هەندێ لایەنیەوە هەر درێژەدەری ئەو پلانە بوو ئەبو بەکر بە هەرێمایەتی ناوی بردبوو، سەبارەت بە بوونی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە پۆستە سەرۆکایەتیەکاندا دەکرا بۆ ئەم ولایەتانە لە زۆر ڕووەوە و ئەمەش پوختەیەکی کورتە سەبارەت بەو ولایەتانە:

### یەکەم: مەککەی پیرۆز:

لە سەردەمی عومەردا(ﷺ) موحرزی کوڕی حارثەی کوڕیڕەبیعەی کوڕی عبدشمس، پاش ئەو قونقوذ کوڕی عومەیری بەنی جەدعانی ئەلتەمیمی لە سەردەمی عومەردا کرایە والی مەککە، کاروباری ئەم پیاوە هەمان کاروباری ئەو کەسەی پێشی خۆی بوو وە هیچ هەواڵێك دەربارەی ماوەی ولایەتی بۆ مەککە و نۆژەن کاریەکانی باس نەکراوە.

پاشان و هەر لە سەردەمی عومەردا نافعی کوڕی حارسی خوراعی بوویە والی مەککەو پاشان عومەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، کاتێك کە ئەو لەسەر مەککە بوو سەرچاوەکانی هەندێ نۆژەن کاری و ڕووداو دەگێڕنەوە سەبارەت بە ولایەتەکەی لەوانە ماڵێکی سەفوانی کوڕی ئومەییە کڕی و کردیە

بەندیخانەیەك لەوەی کە بوخاری ڕیوایەتی کردووە،[١] وا هاتووە کە لە ناوچەی (عسفان) گەیشتۆتە عومەر لە کاتی هاتنی بۆ حەج و عومەر پێی فەرمووە: کێت لەسەر ئەم شیوە بەکارهێناوە؟- واتا مەککە- نافع وتی: إبن ئەبزی، عومەر فەرمووی: إبن ئەبزی کێیە؟ نافع وتی: بەندەیەکە لە بەندەکانمان، عومەر فەرمووی: بەندەیەکت لەسەر بەکارهێناون؟ نافع وتی: ئەو قورئان خوێن و زانایە بەفەرزەکان، عومەر فەرمووی: بەڵام پێغەمبەرەکەتان فەرموویەتی: خوای گەورە بەم قورئانە هەندێ کەس بەرزدەکاتەوە و هەنێکیشی پێ دەخات،[٢] لە سەردەمی عومەریشدا دیارترین کاری ولایەتی مەککە بریتی بوو لە گەورەکردنی مزگەوتی مەککە و بە جۆرێك کە عومەر هەستا بە کڕینی هەندێ لە ماڵی دەوروبەری مزگەوت و فەرمانی ڕووخانیانی دا و خستیە سەر مزگەوت و بە دەوریدا دیوارێکی کورتی بنیات نا، مەککە شوێنی بە یەکگەیشتنی والی و ئەمیرەکان بوو لە هەموو کەنارەکانەوە بە عومەر(ﷺ) لە وەرزی حەج و پاشان مەککە ڕۆڵێکی سەرەکی خۆی هەبووە وەك یەکێك لە ولایەتە سەرەکیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەردا(ﷺ).

### دووەم: مەدینەی پێغەمبەر(ﷺ):

خەلیفە بە والی یەکەمی مەدینە دادەنرێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەمەش بەسەرنجدان بەوەی کە تیایدا نیشتەجێیە و پاشان کاروبارەکانی دەگرێتە دەست و بەشێوەیەکی سیاسیانە کارەکانی بەڕێ دەکات، لە میانی نادیاری خەلیفە عومەر لە مەدینە ئەو کەسە سەرپەرشتی دەکات کە شوێنی دەگرێتەوە لە بەڕێوەبردنی کاروبارە جیاوازەکانی مەدینە، عومەر هەندێ جار لە کاتی هەندێ لە گەشتەکانیدا یان لە کاتی بەجێ هێنانی سەفەری حەجدا زەیدی کوڕی ثابتی لە جێی خۆی دادەنا،[٣] هەروەها عەلی بۆ چەند جارێك لە کاتی نادیاری خۆیدا کردۆتە والی بەسەر مەدینەوە،[٤] بەم شێوەیە عومەر لەسەر سیاسەتی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر لە جێنشینی لەسەر مەدینە لە کاتی نادیاریدا ڕۆشتووە بەڕێوە، مەدینەی پیرۆز و پرشنگدار بایەخێکی سیاسی دیاری هەبووە لە نێو ولایەتەکانی تر لەم ڕۆژانەدا بۆ هەندێ هۆکاری تر لە سەرووی هەموویانەوە ئەوەیە کە مەدینە بارەگای خەلیفە عومەر بووە، سەرچاوەی تەواوی فەرمانەکان بووە بۆ هەرێمە جۆربەجۆرە ئیسلامیەکان و هەر لەوێشەوە سوپای تێکۆشەر و خەباتگێڕ دەرچووە بەملاو بەولادا، لەسەرو ئەمەشەوە مەدینە بارەگای نیشتەجێ بوونی زۆرێك لە یاران بووە(خوایان لێ ڕازی بێت)و ئەوانەش کە عومەر ڕێگری لێ کردوون لە ناوچەکانی تر نیشتەجێ بن،[٥] ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ڕەوەندێکی زۆر لە فێرخوازانی زانستی

---

١ـ البخاري، ك: الخصومات (٣/٢٥) باب الربط والحبس مسند أحمد رقم (٢٣٢) موسوعة الحديثية إسناده صحيح.
٢ـ الولاية على البلدان عبدالعزيز العمري (١/٦٧) وهذا أهم مرجع في الفصل وقد قمت بتخليص هذا الكتاب.
٣ـ الولاية على البلدان (١/٦٨).
٤ـ تأريخ اليعقوبي (٢/١٤٧).
٥ـ تأريخ اليعقوبي (٢/١٥٧).

ڕوویان تێدەکات کە دەیانەوێ وەرگری قورئان و سونەت و تێگەیشتنیان بن لە زاری یارانی ئازیزەوە (خوایان لێ ڕازی بێت).[1]

## سێیەم: تائیف:

تائیف لە سەردەمی عومەردا یەکێك بووە لە گرنگترین شارە ئیسلامیەکان، هاوکاری بزاڤی جیهادی دەدا بە جەنگاوەرانی بەتوانا لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)عوسمانی کوڕی ئەبی عاص بووە و پاشان لە شوێنی خۆی دانایەوە و کاری والی بوونی لەسەر تائیف بۆ ماوەی دوو ساڵی خەلافەتی عومەریش بەردەوام بوو، عوسمانی کوڕی ئەبی عاص ئارەزووی بەشداری کردنی جیهادی کرد و نامەیەکی نووسی بۆ عومەر هەتا مۆڵەتی بەشداری کردنی پێ بدات، عومەر فەرمووی: بەڵام من لە کار کەنارت ناخەم بەڵام خۆت کەسێك دابنێ لە شوێنی خۆت، عوسمان پیاوێکی خەڵکی تائیفی لە شوێنی خۆی دانا، عومەر(ﷺ)عوسمانی کردە والی عومان و بەحرێن،[2] دەگێڕنەوە کە والی تائیف لە کاتی کۆچی دوایی عومەردا سوفیانی کوڕی عبداللە ی سەقەفی بووە،[3] لە نێوان ئەو و عومەردا چەند نامە گۆڕینەوەیەك هەبووە کە پەیوەندی بە وەرگرتنی زەکاتی سەوزە و میوە و هەنگوینەوە هەبووە،[4] هەموو ئەمەش دەلالەت دەکاتە سەر زۆری مەزراو بەدەست کەوتنی بەروبوومی کشتوکاڵی لەتائیف و لەڕۆژانی خەلافەتی عومەردا(ﷺ)، شاری تائیف و ناوچەکانی دەوروبەری لە سەردەمی عومەر(ﷺ) سەقامگیری باڵی بەسەردا کێشابوو، خەڵکە مەککە شوێنی حەوانەوەیان لەوێ هەبوو کە هاوینانە ڕوویان تێ دەکرد،[5] وە تائیف لە سەردەمی عومەردا بە یەکێك لە شارە سەرەکیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دەهاتە هەژمار.[6]

## چوارەم: یەمەن:

کاتێك کە عومەر دەسەڵاتی خەلافەتی گرتە دەست ئارامی و ئاسایش باڵی بەسەر یەمەندا کێشابوو، کار و فەرمانەکانی لە ڕێگەی والیەکانی مەوزعەین لە تەواوی ناوچەکانی یەمەن ڕێك و پێك کراو، عومەر بڕیاری مانەوەی کاربەدەستانی سەردەمی ئەبو بەکری لەسەر یەمەن درێژە پێدا،[7] یەعلی کوڕی ئومەییە یەکێك بووە لە والیەکانی ئەبو بەکر لەسەر یەمەن، لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا ناوی یە عەلی پڕشنگی دەدایەوە، مێژوونووسان وایان باس کردووە کە پاش ئەمەش ئەو

---

١ـ الولاية على البلدان (٦٨/١).
٢ـ تأريخ خليفة بن خياط (ص: ١٣٤).
٣ـ تاريخ الطبري (٢٣٩/٥).
٤ـ الطائف في العصر الجاهلي وصدر الاسلام، نادية حسين صقر (ص: ١٩).
٥ـ الطائف في العصر الجاهلي وصدر الاسلام، نادية حسين صقر (ص: ١٩).
٦ـ الولاية على البلدان (٦٩/١).
٧ـ غاية الاماني في أخبار القطر اليماني، يحيى بن الحسين (٨٣/١).

والی عومەر بووە لەسەر یەمەن و هەتا عومەریش(ﷺ) وەفاتی کرد،[١] ژمارەیەك لە سەرچاوەکان باس لەو ڕووداوانە دەکەن کە ڕووی لە یەعەلی کوڕی ئومەییە کردووە لەگەڵ هەندێ لە خەڵکانی یەمەن، لە سەرووی ئەمەشەوە بۆ هەندێ لێدوانی سەبارەت بە هەندێ لەو گرفتانەی کە لە لایەن خاوەنەکانیانەوە سکالاً پێشکەش دەکران دژ بە یەعەلی لەبەردەم عومەردا،[٢] هەر ئەمەش بوو وای لە عومەر کرد کە یە عەلی بانگ بکات بۆ مەدینە بە چەند جارێك و عومەریش لە میانی ئەم بانگ کردنەدا لەو گرفتانەی کۆڵیوەتەوە،[٣] لەکاتی نادیاری یەعلیدا عومەر هەندێ جار هەڵدەستا بە دانانی کەسێك کە کارەکانی بەڕێوە بردووە، لە نێوان عومەر و یەعلادا چەند نامە گۆڕینەوەیەك سەبارەت بە گرفتەکانی زەکات هەبووە، هەروەك ئەوەی کە یەعەلی خۆی باسی دەکات ئەو یەکێك بووە لەو والیانەی کە عومەر لە کۆتایی خەلافەتەکەیدا سامانەکەی دابەش کرد،[٤] لەو والیانەی سەردەمی عومەر کە ناوی هاتووە عبداللە کوڕی ڕەبیعەی مەخزومی و ڕەنگە لەسەر ناوچەیەکی دیاری کراو بوبێت لە یەمەن کە ئەویش بریتیە لە (الجند)، هەروەك ئەوەی کە (طبري) بە ڕاشکاوی ئەمەی باس کردووە لە ئەوەی کە ئەو لە کاتی مردنیدا والی عومەر بووە لەسەر(جند)و لە پاڵ ئەوەشدا باسی یەعەلی کردووە وەك والیەك لەسەر یەمەن،[٥] خەڵکی یەمەن لە سەردەمی عومەردا ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە لە گێڕانی جەنگە ئازادیخوازەکان، بەشدار بوون لە ڕزگارکردنی شام و عێراق و میسر،[٦] کاتێك کە نەخشەسازی بۆ ناوچە ئیسلامیە نوێیەکان کرا لە عێراق وەك ناوچەکانی بەسرە و کوفە زۆرێك لە خەڵکانی دانیشتووی یەمەن ڕوویان لەو ناوچەیە کرد لە سەرووی هەمووشیانەوە هۆزی کندە کە لە کوفە نیشتەجێ بوون،[٧] هەروەك ئەوەی کە ژمارەیەکی تر لە هۆزە یەمەنیەکان لە شام نیشتەجێ بوون، ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە لە ڕزگارکردنیان، هەروەها کۆمەڵێکی تریان لە میسر نیشتەجێ بوون ئەویش لە پاش دامەزراندنی فستات،[٨] گومانی تێدا نیە کە ئەم کۆچە ڕێك و پێکانەی هۆزە یەمەنیەکان عومەر نەخشەی بۆ داناون، فەرماندەی ئەم وڵاتانەی سەر یەمەن ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە نەخشەسازی و کاری دابەش کردنی هۆزەکان بەسەر ناوچەکاندا، لێرەوە دەتوانین بڵێین کە یەمەن لە گرنگترین ولایەتە ئیسلامیەکانی سەردەمی عومەر بوو، ڕۆڵ وکاریگەری ڕوونی بە نیسبەت ولایەتەکانی تروە هەبووە.[٩]

---

١ـ تأريخ الطبري (١٥٧/٥).
٢ـ غاية الاماني (٨٣/١).
٣ـ الاموال للقاسم بن سلام (ص: ٤٣٦).
٤ـ تأريخ اليعقوبي (١٥٧/٢).
٥ـ تأريخ الطبري (٢٣٩/٥).
٦ـ الولاية على البلدان (٧١/١).
٧ـ اليمن في ظل الاسلام، د. عصام الدين (ص: ٤٩).
٨ـ فتوح مصر وأخبارها لإبن عبدالحكم (ص: ١١٩-١٢٣).
٩ـ الولاية على البلدان (٧١/١).

## پێنجەم: بەحرەین:

کاتێك عومەر(ﷺ) دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانانی گرتە دەست عەلاشی کوڕی خەزرەمی والی بوو لەسەر بەحرەین، عومەر لە سەرەتای خەلافەتیدا لەسەر ئەو کارە داینا و بەردەوام بوو تیایدا تا ساڵی چواردەی کۆچی بە پێی دروستترین وتەکان،[1] عەلاء بەشداری لە جیهادە سەرەتاییەکان کرد لە ناوچەکانی وڵاتی فارس، ڕۆڵی سەرەکی هەبوو تیایدا وە لە کۆتاییەکانی ماوەی ولایەتی عەلاء لەسەر بەحرەین عومەر(ﷺ) بڕیارێکی بە لەکار خستنی عەلاء دەرکرد لەسەر ولایەتەکەی، ڕای گوێزایەوە بۆ ولایەتی بەسرە، عەلاء ڕقی لەمە بوویەوە و پێش ئەوەی بگاتە شاری بەسرە کۆچی دوایی کردو لە بەحرەین بە خاك سپێردرا، دەگێڕنەوە کە هۆی لە کارخرانی ئەوە بووە کە بەبێ مۆڵەتی عومەر لە ڕووی بەحرەینەوە ڕووبەڕووی فارسەکان بۆتەوە و عومەر پێی خۆش نەبووە، کە عەلاء موسڵمانان بدات لە ڕێگەی ئاوی، پاش کۆچی دوایی عەلاء عوسمانی کوڕی ئەبی عاص کرایە والی بەحرەین، دەستی کردە جیهاد کردنی ئەوەی ماوەتەوە لە ناوچەکانی وڵاتی فارس، تا لە هەندێ لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی گەیشتە ناوچەی سند، عومەر(ﷺ) فەرمانی دا بە عوسمانی کوڕی ئەلی عاص کە لە جەنگە ئازادیخوازەکەیدا لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری هاوکاری بکات هەتا سوپاکەیان کردە یەك و لە ڕێگەی بەسرەوە هاوکاری عومەریان کرد.[2]

عوسمانی کوڕی ئەبی عاص بەوە بە ناوبانگ بووە کە پیاوێکی لە خوا ترس بووە و دوور بووە لە ئەنجامدانی کاری قەدەغە و یاساغکراو،[3] عوسمان دووجار بۆ عومەر کاروباری ولایەتی بەحرەینی گرتۆتە دەست بە لای کەمەوە جاری یەکەم لە ساڵی(١٥)ی کۆچی و پاشان عومەر پێویستی پێ بوو بۆ سەرکردایەتی کردنی هەندێ لە سوپاکانی ناوچەی بەسرە، هەتا بەشداری لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی بکات، پاش عوسمانی کوڕی ئەبی عاص، عەیاشی کوڕی ئەبی سەور بوویە والی بەحرەین،[4] دیارە ماوەکەی زۆری نەخایاندووە، پاشان عومەر(ﷺ) قودامەی کوڕی مظعونی کردۆتە والی کە ئەبو هورەیرە بۆتە هاوەڵی و کارە دادگاییەکانی لە بەحرەین بۆ بەڕێوە بردووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کاری تری گرنگی بۆ ڕاپەڕاندووە، لە ماوەی ولایەتەکەیدا خەڵکی زۆر بە باشی باسیان کردووە، جگە لەوەی کە لە کۆتایی ماوەی ولایەتەکەیدا خەڵکی بە خواردنەوەی مەی تاوانباریان کرد، عومەر سزای ئاینی بەسەردا سەپاند، هەروەها قودامەی کوڕی مظعون خاڵۆی منداڵەکانی عومەر، عبداللە و حەفصەی دایکی باوەڕداران،[5] قودامە لە عومەر پەست بوو بەڵام عومەر لەسەر ڕەزامەندی خۆی بوو وە هەمیشە دەیفەرموو: من لە خەونمدا کەسێکم بینی هات بۆ لام و پێی وتم: لەگەڵ قودامە ئاشت بەوە

---

١ـ الولاية على البلدان (٧١/١).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ سير أعلام النبلاء (٣٧٤/٢).
٤ـ الولاية على البلدان (٧٣/١).
٥ـ الطبقات (٥٦/٥) تأريخ المدينة (٨٤٣/٣)، الولاية على البلدان (٧٤/١).

چونکە ئەو براتە و دۆستتە،[١] دەڵێن لە کار خرانی قودامە لە ساڵی بیستی کۆچیدا بووە،[٢] پاش قودامە یارێکی بەڕێز و ناسراو بویە والی کە ئەویش ئەبو هورەیرە بوو، شیاوی باسە ئەبو هورەیرە لە سەردەمی ولایەتی قودامەدا چەند بەرپرسیارێتیەکی بەحرەینی لە دەستدا بوو وە یەکێك بوو لەوانەی کە شایەدی دا لەسەر ئەوەی کە قودامە مەی خواردۆتەوە، پاش لابردنی قودامە عومەر فەرمانی بە والی بوونی ئەبو هورەیرەی لەسەر بەحرەین ڕاگەیاند[٣] تا دوایین جار عوسمانی کوڕی ئەبی عاصی سەقەفی کاروباری ولایەتی بەحرەینی گرتە دەست هەتا عومەر کۆچی دوایی کرد،[٤] لە زۆربەی دەقەکاندا هاتووە کە عوسمان لەگەڵ ئەوەی کە والی بەحرەین بووە لە هەمان کاتدا والی عەمانیش بووە، هەندێ گێڕانەوەکان وایان هێناوە کە عوسمان لە هەمان کاتدا والی بەحرێن و یەمامە بووە،[٥] ئەم گێڕانەوانەش بەڵگەیەکی بە هێزمان دەداتێ لەسەر مەودای پەیوەندی و پێکەوە گرێدرانی بەحرێن بە عەمان و یەمامەوە، ڕەنگە ئەم دوو بەشە بە بەشێك لە ولایەتی بەحرێن دانرابن لە ماوەی خەلافەتی عومەردا(ﷺ)، ماوەی پێکەوە گرێدرانی ئەم دوو بەشە لە ڕووی جوگرافی و مرۆییەوە لە نێوان ئەم دوو بەشە و بەحرێندا ناشاردرێتەوە وە ئەم دەربڕینە کەڵك و سوودی ئەمەی هەیە بۆ بەحرەین کە ئەوەی مێژوونووسان دووبارەی دەکەنەوە ئەوەیە کە بوونی هاوپشتیەك هەبێت بۆ بەحرێن کە ڕەنگە مەبەست لێی عومان و یەمامە بێت، ئەو دەمە بەحرێن سەرچاوەیەکی سەرەکی بووە بۆ باج و سەرانە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی ئەم ولایەتە لەو ڕۆژانەدا، هۆزە موسڵمانەکانی بەحرێن و سەرکردەکانیان بەشداریان کردووە لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی وڵاتی فارس و ڕۆژهەڵات و ڕۆڵی گەورەشیان هەبووە لەم جەنگە ڕزگاریخوازانەدا.[٦]

## شەشەم: میسر:

عەمری کوڕی عاص ئەو کەسە بوو کە کاری ڕزگارکردنی پێ سپێردرا و ئێمە بەدرێژی و بە یارمەتی خوای گەورە لە کاتی ئاخاوتنمان سەبارەت بە جەنگە ڕزگاریخوازەکان باسی ئەوە دەکەین، پاشان عومەر کردیە والی لەوێ، عەمر لەم کارەدا بەردەوام بوو هەتا عومەر مرد ئەگەرچی هەندێ جار لەگەڵ عومەردا ناکۆك بووە ئەمەش وای دەکرد لە عومەر هەڕەشەی تەمێ کردنی لێ بکات، عەمر والی میسرو سەرۆکی بوو، ئەمەش لەوەی کە دووپاتی بوونی هەندێ والی تری بچووك دەکاتەوە وەك ئەوەی کە دەربارەی عبداللە کوڕی ئەبی سەرح هاتووە کە والی ناوچەی سەعید بووە لە کاتی کۆچی دوایی عومەر،[٧] ئەوەی جێگەی تێبینی کرانە لە ماوەی والیەتی عەمری کوڕی عاصدا لە

---

١ـ الولاية على البلدان (١/٧٤).
٢ـ البداية والنهاية (٧/١٠١).
٣ـ الولاية على البلدان (١/٧٥).
٤ـ المرجع نفسه (١/٧٥).
٥ـ تأريخ الطبري (٥/٢٣٩).
٦ـ الولاية على البلدان (١/٧٦).
٧ـ فتوح مصر (ص: ١٧٣).

میانی خەلافەتی عومەردا دەست تێوەردانی خەلیفە عومەر بووە لە کاروبارە جیاوازەکانی ولایەتەکاندا.[١]

عەمری کوڕی عاص سوودی لە شارەزایی قیبتیەکان وەرگرت لە گرفتەکانی باج وسەرانەو لەم کارەدا بەکاری دەهێنان،[٢] عەمر ناوبانگی بەوە دەرکردبوو، کە ڕێگەی لە سەربازانی دەگرت، کە کاری کشتوکاڵی بکەن و پێوەی سەرقاڵ بن وە لەسەر بنەمای فەرمانی عومەر سزای هەر سەربازێکی دەدا کە هەستێ بە ئەنجامدانی ئەو کارە،[٣] ئەمەش بە دڵنیاییەوە بۆ خۆیەکلایی کردنەوەی سەربازان بووە بۆ کاری جیهاد، باوەڕ پێ نەکردن بۆ پشوو، یان پەیوەست بوونیان بە کاری زەوی و زارەوە، سەربازەکان ئەو بەشە ڕۆزیەیان هەبوو کە لە بەیتولمال پێیان دەدراو بەمەش هەژار نەدەکەوتن، عەمری کوڕی عاص بە شوێن پێ هەڵگرتنی خەلیفە عومەر لە چارەسەرکردنی کارەکانیدا لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا توانی شوێنی خۆی دیاری بکات وەك ولایەتێکی گەورەی نێو ولایەتەکانی دەوڵەت، لەو چەند ساڵەدا چەندین شت ڕوویاندا کە بەڵگە بوون لەسەر ئارامش و سەقامگیری دۆخی ولایەتەکە، لەگەڵ هەموو ئەو مەترسیانەی کە ڕووی تێ دەکردن لە هەوڵی بەردەوامی ڕۆمەکان و گەرانەوەی لە ڕێگەی جەنگی ئەسکەندەریەوە و لە ڕێگەی ئاویەوە... ئەم ولایەتە زەویەکی بە پیت بوو بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام تیایدا و لە سەردەمی عومەر وەك سەرنجدانێك بەوەی کە تیایدا دەرکەوت لە ماف پەروەری نێوان خەڵکی و بەخشندەیدا، خەڵکی میسر پێشتر بەڵێنیان پێ نەدابوون سەرباری قایل بوونیان بە ڕاستیەکانی ئیسلام، کارە کارگێڕیەکان لە میسردا بە شێوەیەکی سادە دەچوون بەڕێوە بە جۆرێ کە عەمر کە والی بوو بەرپرسیش بوو لە کاری کۆکردنەوەی باج ئەم کارەش ڕێگری عەمری نەدەکرد لە پشتیوانی کردنی هەندێ لە والیەکانی سەر ناوچەکانی تر و پەیوەست پێوەی هەروەك ئەوەی کە تێپەڕیووە، بەڵام والی سەرکردە و بەرپرس لە بەردەم خەلیفەدا عەمری کوڕی عاص بووە بە درێژایی ماوەی فەرمانڕەوایی عومەر، عەمر سوودی لە هەندێ خەڵکی ناوچەکە وەرگرت لە ڕێکخستنی کاری باج و ڕێکخستنی کاروباری داراییەکەی.[٤]

## حەوتەم: ولایەتەکانی شام:

کاتێك کە ئەبو بەکر(ﷺ) کۆچی دوایی کردخالدی کوڕی وەلید(ﷺ) سەرکردەی سوپا بوو لەشام و کاتێك کە عومەر(ﷺ) بوویە خەلیفە فەرمانی لە کار خرانی خالدی کوڕی وەلدی دەرکرد و لە شوێنی ئەودا ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی وەك ئەمیری ئەمیرەکانی شام لە شوێنی دانا، کردیە بەرپرسی ڕاستەوخۆیان و والی لەسەر کۆمەڵێك لە ناویاندا،[٥] کاتێك کە ئەبو عوبەیدە بوویە والی کارەکانی خۆی

---

١ـ الولاية على البلدان (٧٩/١).
٢ـ فتوح مصر وأخباها (ص: ١٢٥).
٣ـ الولاية على البلدان (٨٢/١).
٤ـ الولاية على البلدان (٨٣/١).
٥ـ تهذيب تأريخ دمشق (١٥٢/١).

ڕێکخست، فەرماندەکان لە لایەن ئەوە لـە ناوچـە جیاجیاکـان دادەنرێن، ئـەبو عوبەیـدە جارێکی تـر کاروبارەکان ڕێك دەخاتەوە بە جۆرێ لەسەر هەندێ لە ولایەتەکان هەمان ئەو فەرمانداندەی دادەنایـەوە کە ئەبو عوبەیدە دایناببوون و هەندێکیشیانی کەنارگیر کردبوو، خەلیفەی کوڕی خـەبات دەڵێـت: ئـەبو عوبەیدە کاتێك کە پاکسازی شامی کرد یەزیدی کوڕی ئـەبو سـوفیان لەسـەر فەلەسـتین و ناوچـەکانی دەوروبەری کردەوالی، شەرحەبیل کوڕی حەسنەی لەسەر ئوردن و خالدی کوڕی وەلیدی لەسەر دیمەشق و حەبیب کوڕی موسلیمەی کردە والی حەمس و پاشان حەبیبی لـە کـار خـست، عبـداللە کـوڕی قـیرت ئەلسەمالی کـردە والی،[1] پاشـان لـە کـاری خـست، دواتـر عوبـادەی کـوڕی سـامتی کـردە والی و لـە پۆستەکەی لایبردو دواین جار عبداللە کوڕی قیرتی گەڕاندەوە سەر کارەکەی،[2] ئەبو عوبەیدە جار جـارە هەندێ لە یارانی دەنار بۆ سەرپەرشتی کردنی ناوچـەکانی شـام بـۆ چـەند ماوەیـەکی دیـاریکراو، هـەر لەبەر ئەمە بوو کە موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ سەر ئوردن،[3] لەمەشەوە چەند کەسێکی لە شـوێنی خۆی دادەنا کاتێك کە دەچوو بۆ جیهاد، کاتێك کە ئەبو عوبەیدە چوو بۆ قودس سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عومەری کوڕی نەفیلی لەسەر دیمەشق و لە شوێنی خۆی دانا،[4] ئەبو عوبەیدە(ﷺ) بـە درێـژایی ئەو ماوەیەی کە والی بووە لە شام نموونـەی پیـاوێکی چـاك و لـە خـوا تـرس بـووە بـە جـۆرێ تـەواوی فەرماندەکان و تەواوی خەڵکیش پابەند بوون پێوەی، هەروەك ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد ئەبو عوبەیدە لە ڕووداوی تاعوونی عەمواس شەهید بوو و پاشـان موعـاز شـوێنی گرتـەوە، پـاش چـەند ڕۆژێکـیش موعـاز کۆچی دوایی کرد کاتێك عومەر بەم دوو کۆچە یەك بە دوای یەکەی زانی یەزیـدی کـوڕی ئـەبو سوفیانی وەك فەرماندەی ئەو سوپایە دانـا و بـڵاوەی بـە فەرمانـدەکانی تـر لەسـەر شـام کـرد، یەزیـد خاوەنی شارەزاییەکی تەواوبوو لە ئەمیرایەتی کردنی سەربازگەکاندا، بە جۆرێ کە سـەرکردەی یـەکێك لەو سوپایانە بوو کە ئەبو بەکر(ﷺ)ناردی بۆ ئازادکردنی شام ، ئەبو عوبەیدەش چەند جارێك لـەکاتی بەشدار بوونی لە غەزاکاندا دەیکردە والی دیمەشق،[5] مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کە عومـەر کاتێـك یەزیدی لەسەر سەربازگەکانی شام دانا فەرماندەکانی تری دیاری کرد و دابەش کردن بەسەر ناوچەکانی تردا و یەزیدی تایبەت کرد بە سەرپەرشتی کردنی ناوچەکانی فەلەسـتین و ئـوردن،[6] وە مـاوەی بـوونی یەزید لەسەر شام بە ماوەیەکی زۆر کەم دادەنرێت لەبەر ئەوەیە کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا زۆر بـە کەمی باسی هاتووە. یەزید لە ساڵی (١٨)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد و لە پێش مردنی بە ماوەیەکی کەم معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی لەسەر ئەو کارانە کردە جێ نشینی خۆی کە گرتبوونیە دەست و بەم هۆیـەوە نامەیـەکی بـۆ عومـەر نووسـی وە مـاوەی ولایـەتی یەزیـد نزیـك دەبوویـەوە لـە سـاڵێك،[7]

---

١ـ الازدي لە صحبة دمشق ورواية اشترك في فتوح الشام.
٢ـ تأريخ خليفة (ص: ١٥٥).
٣ـ فتوح الشام (ص: ٢٤٨).
٤ـ الفتوح، لإبن أعثم الكوفي (ص: ٢٨٩)، الولاية على البلدان (١/ ٩٠).
٥ـ فتوح البلدان (ص: ١٣٧).
٦ـ فتوح البلدان (ص: ١٤٥-١٤٦).
٧ـ الوثائق السياسية للعصر النبوي والخلافة الراشدة (ص: ٤٩٣).

عومەر(ﷺ)بڕیاری بە والی کردنی معاویە دا و چەند چاکسازیەکی لە بەڕێوەبەرایەتی شام لە دوای کۆچی یەزید ئەنجام دا، عومەر سەربازگەی دیمەشق و خەرجیەکانی بۆ معاویە دیاری کرد، کاری داد و نوێژدا دەسەلاتی معاویەی دیاری کردو بەم هۆیەوە دوو کەس لە یارانی پێغەمبەر(ρ)ی نارد بۆئەوێ و کردنیە بەرپرسی دادگا و نوێژی ناوچەکە،[1] ئەمەش سنوور دیاری کردنێك بوو بۆ دەسەلاتەکانی معاویە بە تایبەتی کە بەڕێکردنی نوێژەکانی دایە کەسێکی تر، ئەمیر لە عادەتدا خۆی ئەمیری نوێژ بووە، ڕەنگە لێرەشدا چەند هۆکارێك هەبووبن کە پاڵیان بە عومەرەوە نابێت بۆ ئەم سیاسەتە نوێیەی کە لە هەرێمەکانی تردا دەرکەوت وە بە هەمان ئەو شێوازەی کە لەگەڵ معاویە گرتیە بەر، معاویە بە لەسەرخۆیی و هەوڵدان ناوبانگی دەرکردبوو لەوەی کە کۆمەڵە خەڵکێکی فەراهەم هێنابوو کە لە عێراق و چەند ناوچەیەکی تروە خۆیانی پێ بگەیەنن،[2] عومەر هەستا بە دامەزراندنی ژمارەیەك لە فەرماندەکانی شام، کاری ولایەتەی دایە دەست معاویە و لە میانی ئەم ولایەتەیدا معاویە کە لەسەر شام بوو جار جارە هەڵدەستا بە بەرپاکردنی جەنگ لە دژی ڕۆمەکان لە بەشی باکووری شام و ئەم جەنگانەش هەر ئەوانە بوون کە ناسرابوون بە (الصواعق)[3] معاویە لە والیەتی شام مایەوە لە سەردەمی عومەردا هەتا عومەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ چەند فەرماندەیەکی تر لە ناوچە دیاری کراوەکانی شام و هەر هەمووشیان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە خەلیفەوە هەبوو لە شاری مەدینەی نوریندا. جگە لەوەش معاویە بە بەناوبانگترینیان دەهاتە هەژمار، لە کاتێکدا کە والی بوو لەسەر ناوچەکانی بەلقا و ئوردن و فەلەستین و ئەنتاکیە و قلقیلیە و موعرە و میسریە و ناوچەکانی تری شام،[4] هەندێ لە مێژوونووسان بە والی ناویان بردووە و هەندێکی تریان کە باسی معاویەیان کردووە وایان هێناوەتە ناوان کە (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لەسەر هەندێ لە ناوچەکانی شام والی بوو) بەڵام هەندێکیان باس لەوە دەکەن کە عومەر پێش مردنی هەموو شامی کۆکردۆتەوە بۆ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان،[5] دەکرێت لەوەش وریان بین کە ئەو ولایەتانە هەمیشە گۆڕانکاری بەردەوامی تێدابووە بە هۆی بارودۆخی سەربازی و بارودۆخی گشتی دەوڵەت لەو ڕۆژانەدا، ئوردن هەندێ جار سەربەخۆ بووە و هەندێ جار چەند هەرێمێکی چۆتە سەر و لێی جیابۆتەوە و چۆتە سەر شام یان فەلەستین و چەند شتێکی تری لەو بارە کە لێرەدا شوێنی باسکردنی نابێت.[6]

## هەشتەم: ولایەتەکانی عێراق و فارس:

جەنگە ڕزگاریخوازەکان لە عێراقدا لە سەردەمی ئەبو بەکر دەستی پێکرد و سەرەتاش لە ژێر ئەمارەتی موسنای کوڕی حارسەی شەیبانیدا بوو هەتا خالدی کوڕی وەلید گەیشتە عێراق، و کاری

١ـ الولاية على البلدان (١/٩٢).
٢ـ تأريخ الطبري (٥/٢٣٩).
٣ـ الولاية على البلدان (١/٩٢).
٤ـ الولاية على البلدان (١/٩٣).
٥ـ تأريخ خليفة بن الخياط ١٥٥، سير أعلام النبلاء (٤/٨٨) الولاية على البلدان (١/١٠٢).
٦ـ الولاية على البلدان (١/١٠٢).

والی عێراقی پێ سپێردرا، کاتێك کە فەرمان درا بە خالید بڕوات بۆ شام جارێکی تر کاری عێراق درایەوە دەست موسەنای کوڕی حارسە، کاتێك کە عومەر بوویە خەلیفەی موسڵمانان موسەنای لابردو ئەبو عوبەیدەی کوڕی مەسعودی ئەلسەقەفی لە شوێن دانا، پێویستە ئەوەش بوترێت کەلابردنی موسەنا هاوکات بوو لەگەڵ لابردنی خالدی کوڕی وەلید و ئەمەش بوویە مایەی خرۆشانی هزر و هۆشی خەڵکی و لێرەدا عومەر فەرمووی: من لەبەر ئەوە لایان نابەم کە گومانم لێیان هەبێت بەڵکو خەڵکی گەورەیان کردوون دەترسم پشتیان پێ ببەستن،[1] لەگەڵ لابردنی موسەنا وەك سەربازێکی دڵسۆز بەشداری لەگەڵ ئەبو عوبەیدە کرد و لە زۆربەی جەنگەکانیدا[2] بە شێوەیەکی دیار و لەبەر چاوو باش، پاش وەفاتی ئەبو عوبەیدە جارێکی تر موسەنا گەڕایەوە بۆ سەرپەشتی کردنی سوپا و دواتر سەرپەرشتی کردنی سوپای عێراق سپێردرا بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص،[3] موسەنا بە هۆی ئەو برینەی، کە لە جەنگی ڕۆژانی (الجسر) دووچاری بووبوو زیاتر ڕووبەڕووی مەرگ بوویەوەو پێش ئەوەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بگاتە عێراق موسەنا گیانی سپارد، پاشان شاری بەسرە پێش جەنگی قادسیە وەك ولایەتێك لەسەر تەختی ڕووداوەکان دەستی کرد بەدەرکەوتن، ئەوە نەبێ، کە سەرکەوتن لەجەنگی قادسیە و کۆنترۆڵی شاری مەدائن لە لایەن موسڵمانانەوە بە سەرەتای قوناغێکی نوێ و بەهێز دادەنرێت لە عێراق، کە تیایدا ڕێکخستنی ولایەتەکان بە شێوەیەکی دیاری کراو و لەبەر چاو دەستی پێکرد بە جۆرێك کە ڕووخساری تێدا بەدی دەکرد چ لە ولایەتی بەسرە یان لە ولایەتی کوفە، ئەمەش دووچاریان بوو لەو شار و گوندانەی کە هەر یەکەیان سەر بە هەرێمەکانی فارس و عێراق بوون، و ئەوانەش کە لە هەردوو ولایەتەکەدا وڵاتی فارس جودا بوونەتەوە.[4]

### ولایەتی بەسرە:

پێش دامەزراندنی عومەرشورەیحی کوڕی عامری ڕەوانەی ولایەتی بەسرە کرد، کە یەکێك بوو لە نەوەکانی سەعدی کوڕی بەکر و پشتیوانێك بوو بۆ قوتبەی کوڕی قەتادە و پاشان عومەر کردیە والی شاری بەسرە، لە یەکێك لە جەنگەکانی ئەو ناوچەیە شەهید کرا،[5] پاشتر عومەر هەستا بە ڕەوانەکردنی عوتبەی کوڕی غەزوان بۆ شاری بەسرە لەگەڵ چەند سەربازێك هەر لەوێ کردیە والی، ئەمەش هەروەك ئەوەی کە صالح أحمد عەلی باسی لێوە دەکات لە ساڵی چواردەدا بوو نەك پانزە، صالح دەڵێت: هەندێ لە مێژوونووسان ئەوە نیشان دەدەن کە عوتبە پاش جەنگی قادسیە یان جەلەولا ڕەوانەی بەسرە کراوە بەڵام زۆربەی مێژوونووسان جەخت لەوە دەکەنەوە کە عوتبە ساڵی (١٤)ی کۆچی

---

١ـ الولاية على البلدان (١٠٨/١).
٢ـ البداية والنهاية (٢٨/٧).
٣ـ الولاية على البلدان (١١١/١).
٤ـ الولاية على البلدان (١١٣/١).
٥ـ تأريخ خليفة بن الخياط (ص: ١٥٥).

ڕەوانەی بەسرە کراوە و ئەمەش وامان لێ دەکات کە ڕیوایەتەکانیان بە دروست بزانین،[١] قۆناغی ولایەتی عوتبە لەسەر شاری بەسرە قۆناغێکی دامەزراوەی گرنگ بوو لە ژیانی ئەم ولایەتە، هەڵگری ژمارەیەك لە کاری سەرفرازانە بوو، لەوانە هەندێ لە جەنگە ئازادیخوازەکانی وڵاتی فارس کە لەسەر هەردوو کەناری ڕووباری دیجلە و فوراتەوە لێی نزیك بوو،[٢] عوتبە داوای لاچونی لە ویلایەتی بەسرە لای عومەر کرد، بەڵام عومەر قایل نەبوو عومەر هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە عوتبە بگەڕێتەوە بۆ سەر کارەکەی بەڵام لە ڕێی گەرانەوەیدا بۆ ولایەتی بەسرە عوتبە کۆچی دوایی کرد، کاتێك کە ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر فەرمووی: من کوشتم، ئەگەرچی ئەمە مەرگێکی ئاشکرابوو، پاشان ستایشی لەسەر کرد و ئەم کۆچی دواییەش لە ساڵی(١٧)دا بوو،[٣] پاش عوتبە موغیرەی کوڕی شوعبە کرایە والی بەسرە و یەکەمین کەس بوو کە دیوانی بەسرەی دامەزراند و لە کاری والی چیەتی بەردەوام بوو هەتا ئەو کاتەی کە عومەر لە ساڵی(١٧)ی کۆچی لایبرد ئەویش بە هۆی ئەوەی کە موغیرە تۆمەتی داوێن پیسی درابوویە پاڵ، پاشان عومەر هەستا بە لێکۆڵینەوە لەم کارە و دوای ئەوەی کە پاکی موغیرە دەرکەوت سێ شایەتەکەی دارکاری کرد و موغیرەشی لابرد، کە ئەمەش لە بابی بەرژەوەندیەکانە، پاشان عومەر کردیە والی چەند ناوچەیەکی تر،[٤] پاش لابردنی موغیرە عومەر ئەبو موسای ئەشعەری کردە والی بەسرە، بە ڕاستی ئەبو موسای ئەشعەری دادەنرێت بە ناودارترین والیەکانی شاری بەسرەی سەردەمی عومەر، لە ڕۆژانی ئەودا زۆرێك لە ناوچەکانی وڵاتی فارس ئازاد کران، ئەبو موسا خۆی جیهادی دەکرد و سەرکردەکانی ڕەوانەی ناوچە جۆربەجۆرەکانی شاری بەسرە دەکرد، هەر لە ڕۆژانی ئەودا خەڵکی شاری بەسرە توانیان ناوچەکانی ئەهواز و دەوروبەری و ژمارەیەك لە شوێنە گرنگەکانی تر ئازاد بکەن شیاوی باسە ماوەی ولایەتی ئەبو موسا پڕبوو لە کاری جیهادی، ئەبو موسا هاوکاری والیەکانی دراوسێی دەکرد لە زۆرێك لە جەنگە ئازادیخوازەکاندا، هەوڵێکی زۆریدا بۆ ڕێکخستنی ناوچە ئازادکراوەکان دامەزراندنی کاربەدەستان لەسەری و بیمە بۆ دانانی و ڕێك و پێك کردنی کارە جۆربەجۆرەکانی، چەندین نامە ئاڵوگۆڕ کران لە نێوان ئەبو موسا و عومەر لە چەند کاروبارێکدا، لەوانە ئامۆژگاری عومەر بۆ ئەبو موسا لە چۆنیەتی پێشوازی کردنی خەڵکی لە کۆڕی ئەمارەتدا، یان ئامۆژگاری کردنی ئەبو موسا بە لە خوا ترسان و بەختەوەرکردنی خەڵکی، کە ئەمەش بەهایەکە و عومەر تیایدا دەفەرمووێت: بە ڕاستی بەختەوەرترین کەس ئەوەیە کە ژێردەستەکانی پێی بەختەوەر بن، خراپترین کەس ئەوەیە، کە ژێردەستەکانی پێیان خراپ بێت، نەکەی فێری بخۆری بیت چونکە کاربەدەستەکانیشت فێر دەبن، وێنەی تۆ لەمەدا وێنەی ئەو گیاندارەیە کە سەیری شینایییەك دەکات لە زەویەك کە لێی لەوەڕاوە و تیایدا داوای قەڵەوی دەکات و بە ڕاستیش

---

١ـ التنظيمات الاجتماعية والإقتصادية في البصرة (ص: ٣٦).
٢ـ تأريخ خليفة بن الخياط (ص: ١٢٧-١٢٨).
٣ـ الولاية على البلدان (١/١١٥).
٤ـ الولاية على البلدان (١/١١٧).

قەڵەوی قۆستوویەتیەوە،[1] چەندین نامەی تر لەنێوان عومەرو ئەبو موسادا هەن کە بەڵگەن لەسەر چەند لایەنێکی جیاوازی کارگێڕی و ڕاپەڕاندن کە تیایدا عومەر هەستاوە بە ئامۆژگاری کردنی ئەبو موسای ئەشعەری، محمدی حمیداللە تەواوی ئەم نامە گۆڕینەوانەی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (الوثائق السیاسیة)دا[2] کۆکردۆتەوە، ماوەی ولایەتی ئەبو موسا لەسەر شاری بەسرە بە باشترین کات و ساتەکان دێتە هەژمار، تەنانەت یەکێك لە نەوەکانی شاری بەسرە لە پاش وی پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرتووە، کە ئەویش شێخ حەسەنی بەسری بوو — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — کە دەفەرموویێت: ئەوەی کە ئەبو موسا لەو سوارچاکیەی بۆ خەڵکی پێشکەش کرد،[3] ئەوە بوو کە ئەبو موسا — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — لەگەڵ ئەوەی کە سەرقاڵی کاری ئەمارەتەکەی بوو لەگەڵ ئەوەشدا باشترین مامۆستا بوو بۆ خەڵکەکەی، بە جۆرێك کە فێری قورئان و چەندین کاروباری تری ئاینەکەی کردن.[4]

لە سەردەمی عومەردا زۆرێك لە شارەکانی فارس و ئەوانەی کە لە سەردەمی ئەودا ڕزگارکران سەربە شاری بەسرە بوون و لە لایەن والی بەسرەوە بەڕێوەدەچوون کە کاربەدەستانیشی لە لایەن ئەوەوە دیاری دەکران، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پابەند بوون پێوەی و بەم شێوەیە ئەبو موسا بە یەکێك لە گەورەترین والیەکانی سەردەمی عومەر دێتە هەژمار و نامە گۆڕینەوەکانی عومەریش لەگەڵ ئەبوموسا دادەنرێت بە گەورەترین ئەو سەرچاوانەی کە ژیانی عومەر لەگەڵ والیەکانی ئاشکرا دەکات، ڕوخساری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری عومەر لە مامەڵەکردن لەگەڵیان ئاشکرا دەکات و ڕوونی دەکاتەوە.[5]

## ولایەتی کوفە:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بە یەکەمین والی کوفە دێتە هەژمار پاش دامەزراندنی، یەکەمین کەس بوو کە بە فەرمانی عومەر ئەو ولایەتەی دامەزراند، سەعد پێش دروست کرانی شاری کوفە والی بوو بەسەر ئەو ناوچەیە و ناوچەکانی تری دەوروبەری، سەعد وەك والیەك لەسەر کوفە درێژەی بە کارەکەی خۆی دا بە جوانترین شێوە هەڵدەستا بە ڕۆڵ بینینی خۆی، پاش سەقامگیرکردنی ناوچەکانی کوفە سەعد هەستا بە ئەنجامدانی چەند جەنگێکی ئازادیخواز لە ڕووی وڵاتی فارسەوە،[6] هەروەها چەندین کاری چاکسازی بۆ جوتیارەکانی لە ولایەتەکەیدا دەستەبەر کردووە، لەوانە کۆمەڵێك لە میراوەکان داوایان لێ کردووە، کە بۆ بەرژەوەندی جوتیاران ڕووبارێکیان بۆ هەڵبەستێ ئەویش نامەیەك دەنووسێت بۆ کاربەدەستانی لە ناوچەکە و فەرمانیان پێ دەدات کە ڕووبارێکیان بۆ هەڵبەستن پاشان

---

١ـ مناقب عمر لإبن الجوزي (ص: ١٣٠).
٢ـ الوثائق السیاسیة للعهد النبوي والخلافة الراشدة.
٣ـ سیر أعلام النبلاء (٢/٣٨٩)
٤ـ الولایة علی البلدان (١/١٢٠).
٥ـ الولایة علی البلدان (١/١٢٠).
٦ـ فتوح البلدان (ص: ١٣٩)، تأریخ الیعقوبي (٢/١٥١).

کاربەدەستانی کۆدەکاتەوە و ئەو ڕووبارەیان پێ چاك دەکات، سەعد تەواوی کاروبارەکانی ئەو ناوچەیە ڕێك دەخات کە سەر بە شاری کوفەیە و لە لایەن خۆیەوە و پاش ڕاوێژکردنی لەگەڵ عومەر والیان بۆ دادەنێت، پیاوانی ژیر و خاوەن هۆشی کوفە زۆر سەرسام بوون بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و پیایدا هەڵیان داوە، کاتێك، کە عومەر(ﷺ) پرسیاری سەعدی لە یەکێك لە بەناوبانگەکانی کوفە کرد ئەویش لە وەڵامدا وتی: سادە و ساکارە لە وزیفەتیدا، عەرەبیە لە ژمارەیدا، شێرە لە فەرمانڕەواییدا و ماف پەروەرە لە چارەسەری گرفتەکاندا و بە یەکسانی کارەکان دابەش دەکات، دوورە لە پەنهانی، بە سۆزە لەسەری وەك سۆزی چاکەخوازان وە بە پەنهانی وەك گەردیلە شتەکانمان لەسەر دەگوێزێتەوە[1]

کاتێك عومەر پرسیاری سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی لە جوبەیری کوڕی عبداللە کرد سەبارەت بە خۆی و ولایەتەکەی جوبەیر فەرمووی: لە ولایەتەکەیدا وەك پیاوێکی بەڕێز و بە توانا و بە شێوەی کەمترین دڵڕەق بۆم بەجێی هێشتن ، سەعد بۆ ئەوان وەك دایکێکی چاك وایە کە شتەکان بۆ ئەوان کۆ دەکاتەوە هەروەك ئەوەی کە گەردیلەکان توند و تیژترین خەڵك لە کاتی ناڕەحەتیدا کۆدەکاتەوە و سەعدیش خۆشەویستترین قورەیشیە لای ئەو خەڵکە،[2] لەگەڵ ئەوەی کە باشترین و ژیرترین خەڵکانی کوفە بە سەعد قایل بوون بەلام لە لایەن زۆرێك لە خەڵکانی ناحاڵیەوە هەندێ سکاڵای لە دژ بەرزکرایەوە و پاشان سەعد لابرا و دواتر ئەم باسە لە بابەتەکانی سکاڵاکردن لە دژی والیەکان ڕوون دەکەینەوە، پاش لە لابردنی سەعد عومەر بڕیاری دەرکردو عەماری کوڕی یاسری وەك نوێژخوێنی کوفە دامەزراند، سەرنجی ئەوەش بدە، کە عەمار(ﷺ) یەکێك بوو لەو سەرکردانەی کە پێشتر لە ناوچەکەدا بوون و سەعد لە کاتی بەڕێکردنی کاروباری ولایەتەکەیدا پشتی پێ بەستوون هەر لەبەر ئەمەش بوو کە عەمار پێش ئەوەی ببێتە والی کوفە شارەزاییەکی پێشینەی نیمچە تەواوی لەو کارەدا هەبوو، ئەم ولایەتەی عەمار لەگەڵ ولایەتەکەی سەعددا جیاواز بووە بە جۆرێك کە عومەر چەند کەسێکی تری کردە هاوەڵ و هاوبەشی و لەگەڵیدا بەپرسیاریتی و کارە گرنگەکانیان بەش دەکرد، عەمار نوێژخوێن و إبن مەسعود لەسەر بەیتولمال و عوسمانی کوڕی حەنیف لەسەر ڕووپێوی زەوی و زارەکان بوو، لەبەر ئەوە تا ڕادەیەك بارودۆخ لەم ولایەتەدا و لەم قۆناغەدا لەگەڵ ڕۆژانی ولایەتی سەعد جیاوازیەکی هەبوو، ناکرێت کە ئەم دابەش کردنە نوێیە بۆ بەرپرسیارێتیەکان لەم ولایەتەدا لەبەرچاو بخەین، چونکە هەر یەکێك لەوانە هەڵدەستا بەوەی کە پێی سپێردرابوو لە جەنگە ڕزگاریخوازەکان، لە ڕۆژانی عەماردا خەڵکی کوفە هەستان بە ئەنجامدانی کۆمەڵە جەنگێك لە دژی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم لە کاتێکدا سوپایەکی زۆریان لە دژی موسڵمانان کۆکردبوویەوە، عەمار کاری ولایەتەکەی خۆی لە خواستنی ئەو بارودۆخە جەنگیانە و بە پێی ئامۆژگاریەکانی عومەر بەڕێ دەکرد، عەمار لەگەڵ إبن مەسعود بەردەوام بوو لە بەڕێکردنی کاری گرنگی خۆی لە ولایەتەکەی سەرباری ڕاپەڕاندنی کاروباری دارایی و لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی فێری قورئانی پیرۆز و چەندین کاروباری تری

١ـ الولاية على البلدان (١/١٢٣).
٢ـ هەمان سەرچاوە.

ئاینی دەکرد،[١] عەمار نزیکەی ساڵێك و نۆ مانگ والی شاری کوفە بوو، عومەر بە هۆی سکاڵای زۆری هەندێ کەس لەو ولایەتەدا عەماری لابردو عومەر بە عەماری فەرموو: ئایەم لابردنەت خراپی پێ کردی؟ عەماریش وتی: من بەختەوەرم کە منت کردە کاربەدەست و کاتێکیش لابرام پێم باش بوو، دەڵێن عەمار فەرموویەتی: کاتێك کە منت کردە والی خۆشحاڵ نەبووم و کاتێکیش لاتبردم دڵگیر نەبووم،[٢] هەروەك ئەوەی کە باسی لێوە کراوە عومەر کاتێك کە هەستی بە بێزاری خەڵکی کوفە کردووە لە عەمار ، پاشان عومەر لە پۆستەکەی لایبردو لێی بوورا،[٣] پاشان عومەر جوبەیری کوڕی موتعمی کردە والی کوفە و دواتر پێش ئەوەی جوبەیر ڕوو لە کوفە بکات لایبرد، چونکە عومەر فەرمانی پێدا کە هەواڵی ئەو دامەزراندنەی بشارێتەوە بەڵام هەواڵەکە لە نێو خەڵکدا بڵاو بوویەوە و بەمەش عومەر پەست بوو وە جوبەیری لابرد موغیەری کوڕی شوعبەی کردە والی کوفە و بەم شێوەیە موغیرە کاری خۆی بەجێ دەهێنا تا عومەر کۆچی دوایی کرد.[٤]

## مەدائن:

مەدائن پایتەختی دەوڵەتەکەی کیسرا بوو، کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ئازادی کرد، ماوەیەك تیایدا سەقامگیر بووپاش ئەوەی کە کوفە بە تەواوی ئاوەدان بوویەوە سەعد ڕووی کردە کوفە، سەلمانی فارسی پەیوەندی کرد بەسوپاکەی سەعدەوە(ﷺ)و لە ژمارەیەك ڕووبەڕووبوونەوەی دژ بە فارسەکان بەشداری کرد، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەبانگ کردنیان بەرەو ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەپێش جەنگانیان، عومەر کردیە والی شاری کوفەو لەنێو خەڵکەکەیدا بەچاکی کارەکانیان ئەنجام دەدا، بە ڕاستی سەلمان نموونەیەکی زیندووی چەسپاوی بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، وا باسی لێوە دەکەن ئەگەر عومەر ناچاری نەکردایە ئەوا سەلمان بەوە قایل نەدەبوو،کە ببێتە والی، سەلمان چەندین جار نامەی دەنووسی بۆعومەر هەتا لێی ببوورێ لەئەنجامدانی ئەو کارە، بەڵام عومەر قایل نەدەبوو، سەلمان(ﷺ) بەوە بەناوبانگ بوو، کە پیاوێکی خواناس، جلوبەرگی خوری لەبەر دەکرد، سواری گوێدرێژ دەبوو بەبێ کورتان و نانی جۆی دەخواردو سەلمان پیاوێکی زۆر لەخوا ترس بوو،[٥] سەلمان بەردەوام لەشاری مەدائن دەژیا هەتا بەپێی زۆری ڕاکان ساڵی(٣٢)ی کۆچی لەسەردەمی خەلافەتی عوسماندا(ﷺ) کۆچی دوایی کردووە، وا دەردەکەوێت، کە سەلمان لە دوا ڕۆژانی ژیانی عومەردا(ﷺ)والی شاری مەدائن نەبووە، بەجۆرێك کە عومەر حوزەیفەی کوڕی یەمانی کردۆتە والی مەدائن، بەڵام مێژوونووسان باسی لابردنی سەلمانیان نەکردووە، ڕەنگ بێت کەسەلمان داوای لێبوردنی ئەم کارەی لە عومەر کردبێت پاش ئەوەی ڕێگری لێ دەکرد و دوای ئەویش حوزەیفەی کوڕی یەمانی کردە والی، زۆرێك لە هەواڵەکان لەسەر

---

١ـ الطبقات (٣/١٥٧).
٢ـ الفتوح إبن اعثم (٢/٨٢).
٣ـ نهاية الأرب (١٩/٣٦٨).
٤ـ تأريخ خليفة (ص: ١٥٥)، تأريخ الطبري (٥/٢٣٩).
٥ـ مروج الذهب (٢/٣٠٦)، الولاية على البلدان (١/١٣١).

ولایەتی حوزەیفە لەسەر مەدائن هاتوون لەوانە نوسراوی عومەر بۆ خەڵکی مەدائن بەدامەزراندنی حوزەیفە وەك والیەك بۆیان، عومەر فەرمانی دا بەخەڵکی مەدائن، کە گوێڕایەڵ و ملکەچی حوزەیفە بن، حوزەیفە بەدرێژایی ڕۆژانی خەلافەتی عومەرو عوسمان وەك والیەك لەمەدائن مایەوەو درێژەی بەکارەکەی خۆیدا.[١]

## ئازربایجان:

حوزەیفەی کوڕی یەمان یەکەمین والی ئازربایجان بوو پاش ئەوەی عوتبەی کوڕی فەرقەدی ئەسەلمی گوێزرایەوە بۆ شاری مەدائن، لە کاتی فەرمانڕەوایی ولایەتەکەیدا نامە گۆڕینەوەیەکی زۆر لە نێوانی و نێوان عومەردا ڕوویدا، لەوانە کاتێك کە عوتبە هات بۆ ئازربایجان بینی کە خەڵکی ئەوێ جۆرە شیرنیەکیان هەیە کە پێی دەڵێن: ((الخبیص)) حوزەیفە بیری لەوە کردەوە کە هەندێکی لێ دروست بکات بۆ عومەر، حوزەیفە هەندێکی لێ دانا و پێچایەوە بەوەی کە پارێزگاری لێ دەکات بە پێستەوناردی بۆ عومەر لە مەدینە، کاتێك کە عومەر وەریگرت و چەشتی زۆر پێی سەرسام بوو، پاشان فەرمووی: ئایا هەموو کۆچکەران ناردوویانە و لێی تێر بوون؟ پەیامنێرەکە وتی: نەخێر، بەڵکو ئەوە شتێکە کە تایبەتی تۆیە، عومەر فەرمانی بە گەڕانەوەی شیرنیەکەدا بۆ عوتبە لە ئازربایجان، و نامەیەکی بۆ نووسی و فەرمووبووی ئەی عوتبە ئەمە لە هەوڵ و ماندووبوونی تۆ و باوکت نیە، موسڵمانان بەوەی لە هەگبەتدایە لە هەگبەیان تێر بکە، نەکەی لە خۆشگوزەرانیدا بیت و وەك هاوبەش پەیداکەران پۆشاکی ئاوریشم لەبەر بکەیت چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگری لە پۆشینی و لەبەرکردنی ئاوریشم کردووە،[٢] ئەم ڕووداوە بە چەند شێوەیەکی جیاواز دەگێڕدرێتەوە و هەر یەکەیان جەخت لەوی تریان دەکاتەوە، عوتبە بە درێژایی ماوەی خەلافەتی عومەر(ﷺ)و بەشێکی ماوەی خەلافەتی عوسمان وەك والی ئازربایجان مایەوە، زۆرێك لە والیەکان لە سەردەمی عومەردا لەناوچە جۆربەجۆرەکانی عێراق و وڵاتی فارس دۆزرانەوە، هەیان بوو کە سەربەخۆ بوو بە ولایەتەکەیەوە و هەیان بوو ولایەتەکەی پەیوەست بوو بە یەکێك لە دوو ولایەتە گەورەکەی عێراق کە هەردووکیان فاکتەری بەڕێوەبردن بوون، سەرکردایەتیش بۆ وڵاتی عێراق و فارس و کوفە یان بەسرە، لەو وڵاتانە بوون کە تایبەت بوون بە ولایەتەکانی موصل و حەلوان و کەسکەر.[٣]

---

١ـ سیر أعلام النبلاء (٣٦٤/٢).
٢ـ الولایة علی البلدان (١٣٣/١).
٣ الولایة علی البلدان (١٣٤/١، ١٣٣، ١٣٥).

# دوانگەی دووەم

## دامەزراندنی والی لە سەردەمی عومەردا

عومەری فاروق(ﷺ) لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشت لە دامەزراندنی والیەکاندا، جگە لە لێهاتوان و دەست پاکان و چاکسازان کەسی تری نەدەکردە والی، دەگەڕا بە دوای هەڵبژاردنی زمان پاراویدا کە مەبەست و لوتکەی هەوڵ و تێکۆشان بوو، هەر کەس داوای والیەتی بکردایە عومەر بۆ ئەو کارەی بەکار نەدەهێنا، ئەو وای دەبینی کە هەڵبژاردنی والی لە بابی گەیاندنی ئەمانەتەکان بوو، بە جۆرێ پێویست بوو لەسەری کە لەسەر هەموو کارێك ئەوەیان دەست نیشان بکات کە بە لایەوە باشتر بووە، ئەگەر لە باشترینیان لایدا بۆ یەکێکی تر لەگەڵ نەبوونی ئەوەی کە دەبێتە بەهانە بۆ ئەمە، ئەوا ساختەی لە خودا و پێغەمبەرکەی و باوەڕداران کردووە،[1] لە وتەکانیشی لەم بوارەوە ئەوەیە کە دەفەرمووێت: من بەرپرسم لە ئەمانەتەکەم و ئەوەش کە تیایدام، بە ئاگام لەسەر ئەوەی کە بە دەروونی خۆم ئامادەم دەکات إنشاء الله، نایسپێرم بە هیچ کەسێك، نازانم لێی دووربکەومەوە مەگەر بە سپاردنی بە دەست پاکان و ئامۆژگاری کاران بێت لە ئێوە بۆ خەڵکی بە گشتی، ئەمانەتی خۆم جگە لەوان بە کەسی تر نادەم،[2] هەروەها عومەر(ﷺ) دەفەرمووێت: هەر کەس دوای کەسێك بکەوێت لە نێو کۆمەڵێکدا و ئەوەش بزانێت لە نێو ئەو کۆمەڵەدا کەسێکی تر هەیە کە زیاتر بۆ ڕەزامەندی خودا کاردەکات ئەوە ساختەی لە خودا و پێغەمبەرەکەی و هەموو باوەڕداران کردووە،[3] هەروەها دەفەرمووێت: هەر کەس بۆ کاروباری موسڵمانان لەبەر هەست و سۆز و خزمایەتی نێوان خۆی و ئەو کەسێك بکاتە والی، ئەوا ساختەی لە خوا و پێغەمبەرەکەی و تەواوی باوەڕداران کردووە.[4]

### یەکەم: گرنگترین ڕێساکانی عومەر لە دانانی والی و مەرجەکانی:

#### ١- بەهێزی و دەست پاکی:

عومەر(ﷺ)ئەم ڕێسایەی چەسپاند، لە نێو پیاواندا بەهێزترینی پەسەند دەکرد بەسەر بەهێزدا، عومەر شەرحەبیلی کوڕی حەسنەی لابرد و معاویەی لە شوێنەکەی دانا، شەرحەبیل پێی وت: ئایا لێم بێزار بوویت وا لاتبردم ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عومەر فەرمووی: نەخێر من هەردووکتانم خۆش

---

١ـ الوقائع ندوة النظم الاسلامية (١/٢٩٥، ٢٩٦).
٢ـ دور الحجاز في حياة السياسية (ص: ٢٥٥).
٣ـ الفتاوى (٢٨/٤٢).
٤ـ الفتاوى (٢٨/١٣٨).

دەوێت بەڵام پیاوی بەهێزترم دەوێت لە بەهێز،[١] لە جوانترین ئەو شتانەی کە عومەری لەم واتایە ئەو وتەیەی بوو کە دەفەرمووێت: خوای گەورە، مـن سکاڵای خۆم لای تۆ لـە پیستەیەکی خراپەکار و نەبوونی متمانە دەکەم.[٢]

## ٢- زەمینەی زانست لە بەوالی کردندا:

عومەری فاروق(ﷺ) لەسەر سونەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەڕۆیشت بەڕێوە لەسەر سپاردنی کاری سوپا تایبەتەکان بە سەرکردەکان، طبری دەفەرمووێت: ئەمیری بـاوەڕداران، ئەگـەر سـوپایەك لـە بـاوەڕداران لێی کۆببونایەتەوە ئەوا کەسێکی لەسەر دەکردنە فەرمانڕەوا کە خاوەن تێگەیشتن و زانیاری و زانـست بوایە.[٣]

## ٣- دیدی بە کارەکان:

عومەر کەسانێکی کار پێ دەکرد لە ناو هۆز و نەتەوەکەیدا و لە چاکەکانیان دەگەڕا تا چاویان لـە کارەکان بێت،[٤] کارزانیش لێرەدا لەوەدایە کە مانای ئەوەیە کە ئەو کەسـانەی عومـەر لێیـان گـەراوە، زیاتر دیندارو لە خواترس و بەڕێزتر بوون لە ڕووی خوڕەوشتەوە، بەڵام شارەزاییان لە بواری بـەڕێکردنی کارەکاندا لەوانی تر کەمتر بووە و زۆر پێویستیش نیە کە دوو کاروبار پێکەوە لە کەسێکدا کۆببنـەوە، ئەمەش هەمان ڕێسایە کە عومەر دایناوە تا ئەمڕۆش کاری پێ دەکرێت، لە پێشکەوتووترین وڵاتـدا، بەوەی کە ئیمانداری لە خوا ترس و بە ڕەوشت، ئەگەر دیدی نەبێت، لە کاروباری فەرمانڕەوایدا، ئـەوا دەبێتە نمایشێك بۆ هەڵخەڵەتاندنی کەسانی هەوادار و سەرگەردان، بەڵام کەسی لەبار و تاقیکراوە، لـە دیدێکی خێراوە مانای دەربڕیەکان دەناسـێتەوە، ئـەوەی لەپـشت مانـای دەربڕینەکانەوەیـە، هـەر ئـەم هۆکارەش بوو کە دووبارە وا لە عومەر بکـات کـە هەسـتێت بـە دوورخـستنەوەی کەسـێك کـە خراپـە نەناسێت، عومـەر پرسیاری دەربارەی پیاوێك کرد کە بە نیاز بوو کـارێکی پـێ بـسپێرێت لـە وەڵامـدا پێیان وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەو خراپە ناناسێت، عومـەریش بـە دوێنەرەکـەی فـەرموو: بـەڵام لێدای ئەوە سوکترینیانە ئەگەر تێی بکەوێت،[٥] ئەمەش مانای ئەوە نیـە کـە کاربەدەسـت پێناسـەکراو نەبێت بە بەهێزی و دەست پاکی و زانیاری و زانست و لێهاتوویی و چەند شتێکی تـر لـەو سیفەتانەی کە مەنتقی ئیدارە و حوکم پێویستی پێیەتی، بەڵکو کارزانی دەکەوێتە ناو ئەم سیفەتانەوە و ڕاسـت و دروستیش ئەوەیە کە عومەر ناوی لێناوە دیدی کارەکان.[٦]

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/٣٩).
٢ـ الفتاوى (٢٨/٤٢).
٣ـ نظام الحكم في الشريعة الاسلامي (١/٤٧٩).
٤ـ المدينة النبوية في فجر الاسلام (٢/٥٦).
٥ـ نظام الحكم في الشريعة الاسلامي (١/٤٨٢).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

## ٤- دانیشتوانی دەشتەکی و دانیشتوانی شارستانی:

لە کاتی دامەزراندنی یەکێك لە کاربەدەستانیدا، عومەر سەرنجی دەدایە هەندێ تایبەتمەندی و داب و نەریت و هەڵسوکەوتەکان، وا ناسراوە کە عومەر ڕێگری دامەزراندنی کەسێکی دەشتەکی کردووە لەسەر دانیشتوانی شار،[1] دەشتەکیەکان ئەوانەن کە لە نێو خێوەتگە و ڕەشماڵاندا دەژین و شارستانیەکانیش ئەوانەن کە لە شاردا دەژین ، ئەمەش سەرنجدانێکی کۆمەڵایەتی و ڕەفتاریە لە یەك کاتدا، لە هەڵبژاردنی فەرمانبەراندا، هەر یەکە لە خەڵکی دەشتەکی و شارستانی سروشت و تایبەتمەندی و ڕەفتار و هەڵسوکەوت و خونەریتی جیاوازتری هەیە، زۆر سروشتیە کە والی شارەزای باری دەرونی ژێردەستەکانی بێت، بە هیچ شێوەیەکیش ڕەوا نیە کە کەسێك ئەم کارە بگرێتە دەست کە بێئاگا بێت لێی، هەڵسوکەوتەکان بلیمەتی دەناسێت و سروشتیش نامۆیی دەناسێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەوەی، کە کۆمەڵگە لە ئامانجەکان بۆ بەدەستهێنانی هەوڵی خۆی بۆدەدات و نیازی دەکات.[2]

## ٥- لێبوردەیی و بەزەیی هاتنەوە بە خەڵکیدا:

عومەر(ﷺ) داوای لە والیەکانی کرد کە لێبوردە بن و بەزەییان بە خەڵکیدا بێتەوە، چەند جار فەرمانی داوە بە سەرکردەکانی سوپا کە لە کاتی جیهاددا دەستی موسڵمانان نەبڕن و نەیان خەنە شوێنی تیاچوونەوە، عومەر نامەی بۆ پیاوێکی هۆزی بەنی ئەسلەم نووسی تا بیکاتە کاربەدەست، پیاوەکە چوویە ژورێ بۆ لای عومەر بینی هەندێك لە منداڵەکانی عومەر لە ژوورەکەی باوکیان یارییان پێ دەکات، پیاوەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمەش دەکەیت؟ سوێند بە خوا من هەرگیز منداڵی خۆم ماچ نەکردووە، پاشان عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا لێبووردەت بەرامبەر بە خەڵکی زۆر کەمە، هیچ کارێکم بۆ مەکە، دواتر عومەر گەراندیەوە و کارەکەی پێ نەسپارد،[3] هەندێ لە سوپا کە عومەر بە مەبەستی غەزا بەرەو وڵاتی فارس بەڕێ کەوتن هەتا گەیشتنە ئاوێ کە پرد و شوێنی پەڕینەوەی نەبوو دواتر فەرماندەی سوپاکە فەرمانی دا بەسەر یەکێك لە سەربازەکانیدا کە ئەو ڕۆژە زۆر سارد بوو ڕێچکەیەك بدۆزێتەوە تا سوپاکەی لێی بپەڕنەوە، بەڵام پیاوەکە وتی: من دەترسم کە بچمە نێو ئاوەکەوە و بمرم، بۆیە فەرماندەکەی زۆری لێکرد لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە، پیاوەکە چوویە ناو ئاوەکە و هاواری کرد: وا عومەرا، وا عومەرا، پاشان زۆر نەمایەوە و تیاچوو، ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر کاتێك کە لە نێو بازاڕی مەدینەدا بوو ئەویش هاواری کرد، وا لەبەیکا، وا لەبەیکا، کەسێکی نارد بۆ لای سەرکردەی ئەو سوپایە و کارەکەی لێ سەندەوە و فەرمووی: ئەگەر ئەمە نەبوایەتە سوونەت دوولەتم دەکردی، ئیتر هەرگیزاوهەرگیز کارێکم بۆ ئەنجام مەدە،[4] عومەر وتارێکی بۆ

١- نظام الحكم في الشريعة الاسلامي (٢٨٢/١).
٢- هەمان سەرچاوە. (٢٨٣/١).
٣- محض الصواب (٥١٩/٢).
٤- مناقب أمير المؤمنين لابن الجوزي (ص: ١٥٠).

والیەكانی دا و فەرمووی: ئەوەش بزانن كە هیچ دڵنەرمیەكا لە لای خودا خۆشەوستتر و گشتگیرتر نیەلە دڵنەرمی و بەزەیی پێشەوایان، هیچ لە لای خودا كیناوی تر و گشتگیرتر نیە لە نەزانی و كەم هۆشی پێشەوا، ئەوەش بزانن هەركەس لەوانەی نێوان (ظهرانیة)دان بە دروستی وەری بگرێت ئەوا لەوانەی دەوروبەری بە سەلامەتی رزق و رۆزی دەدرێت.[١]

## ٦- هیچ كام لە دۆستانی نەدەكردە والی:

عومەر سوور بوو لەسەر ئەوەی كە هیچ كام لە خزمانی نەكاتە والی لەگەڵ ئەوەی هەندێكیان تەنها ئەوەندە بەس بوو كە زووتر موسڵمان بوبوون وەك سەعدی كوڕی زەیدی ئامۆزای و عبداالله كوڕی خۆی، پیاوێك لە هاوەڵانی گوێی لێ بوو كە عومەر سكاڵای دەماری خەڵكی كوفەی دەكرد لە كاروباری والیەكانیان، عومەر فەرمووی: بریا من پیاوێكی بەهێز و دەست پاك و موسڵمانم ببینیبایەوە و بمكردایە كار بەدەست بە سەریانەوە، پیاوەكەش وتی: سوێند بە خوا من ئەو كەسەت نیشان دەدەم، ئەو كەسە عبدالله كوری عومەرە، عومەر فەرمووی: خوا بتكوژێت، سوێند بە خوا من مەبەستم ئەوە نەبوو،[٢] عومەر فەرمووی : هەر كەسێك پیاوێك لەبەر سۆزداری یان دۆستایەتی بەكاربهێنێت و لەبەر ئەوە نەبێت كاری پێوەی نەبێت ئەوا ساختەی لە خوا و پێغەمبەرەكەی كردووە.[٣]

## ٧- هەر كەس داوای كارێكی بكردایە عومەر نەیدەدایە:

عومەر (ﷺ) كارێكی نەدەسپاردە كەسێك كە داوای بكردایە، لەم بارەیەوە دەیفەرموو: هەر كەس داوای كارێك بكات لەسەری دانامەزرێت وە لەسەر ئەم كارەی پەیوەست بە سوننەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەرۆیشت بەرێوە.

## ٨- رێگری كردنی كاربەدەستان لە بازرگانی كردن:

عومەر رێگەی لە كاربەدەستانی و والیەكانی دەگرت كە بچنە نێو مامەڵە گشتیەكانەوە چ وەك فرۆشیار بێت یان كرِیار،[٤] دەگێرنەوە كە كاربەدەستێكی عومەر كە ناوی حارسی كوڕی كەعبی كوڕی وەهەب بووە، سەرمایەیەكی زۆری لێ دەركەوتووە، عومەر پرسیاری سەرچاوەی ئەم سەرمایەیەی لێ كردووە ئەویش لە وڵامدا وتوویەتی بە سامانێكەوە دەرچووم و بازرگانیم پێوە كردووە، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ئێمە تۆمان نەناردووە تا بازرگانی بكەیت وە هەرچیەك كە قازانجی لێوە دەست كەوتبوو عومەر لێی سەند.[٥]

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر خلفاء الراشدون (ص: ٣٣٤).
٢ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ١٠٨)، الولاية على البلدان (١/١٢٨).
٣ـ الفتاوى (١٣٨/٢٨).
٤ـ الادارة الاسلامية في عصر عمر بن الخطاب (ص: ٢١٣).
٥ـ هەمان سەرچاوە.

### ٩- ئاماری سەرمایەی کاربەدەستان لە کاتی دامەزراندنیان:

عومەر(ﷺ) هەژماری سەرمایەی کاربەدەستان و والیەکانی پێش دەست بەکاربوونیان دەکرد تا ئەگەر دوای بە والی بوونیان ئەو سەرمایەیە زۆرتر بوو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، بە جۆرێک کە ئەو زیادکردنە لە سەرمایەیاندا ئەقڵ نەیبرێت، هەر کەس لەوانە کە دەستی بدایەتە بازرگانی ئەوا سکاڵای نەیدەخوارد، عومەر هەمیشە پێی دەفەرموون: ئێمە ئێوەمان ناردووە کە ببنە والی نەك ببنە بازرگان.[1]

### ١٠- مەرجەکانی عومەر لەسەر کاربەدەستانی:

عومەر هەر کەسێکی بخستایەتە سەر هەر کارێك نوسراوێکی پێ دەنووسی، کۆمەڵێك لە خەڵکی ئەنصاری لەسەر دەکردە شاهێد: ئەو کەسە سواری بارگیر نەبێت،لەخواردندا زیادە ڕەوی نەکات و پۆشاکی نەرم و نیان لەبەر نەکات، لەروی موسڵمانان دەرگای دانەخات و پاشان دەیفەرموو: خوای گەورە، تۆم شایەدی.[2]

ئەم مەرجانەش مانای پابەند بوون بوو بە ژیانی لە خواترسان و سادەیی بۆ خەڵکی، کە ئەمەش هەنگاوی یەکەمە لە چاکسازی ئەم ئومەت بەبەرپرسیاکردنی لەسەر ناوەندبوونی لەبژێویدا،لە پۆشاك و سواریدا، بەم ژیانەی کە لەسەر مامناوەندی و کارەکانی دەوەستێتەوە، کە ئەمەش پلانێکی ژیرانەیە، عومەر ناتوانێت تەواوی تاکەکانی ئومەت پەیوەست بکات بەکارێکەوە، کە لە ئاینی ئیسلامدا بە واجب دانانرێت، بەڵام دەتوانێت بەمە والیەکان و سەرکردەکان ناچار بکات، ئەگەر ئەوان پابەندبوون ئەوا پێشەنگی یەکەمن لە کۆمەڵگەدا، ئەمەش نەخشە و پلانێکی سەرکەوتووە لە چاکسازی کۆمەڵگە و پاراستنی لە هۆیەکانی داڕووخان.[3]

### ١١- ڕاوێژکردن لە هەڵبژاردنی والی:

بە ڕاستی هەڵبژاردنی والی پاش ڕاوێژی خەلیفە بۆ گەورە یارانی تەواو دەبوو،[4] عومەر(ﷺ) ڕۆژێك بە هاوەڵەکانی فەرموو: پیاوێکم نیشان بدەن ئەگەر لە ناو گەل و نەتەوەدا ئەمیر بێت کەس هەستی پێ نەکات کە ئەمیرە، کاتێك کە ئەمیر نیە خەڵکی وابزانن کە ئەمیرە،[5] ئەوانیش ئاماژەیاندا بە ڕەبیعی کوڕی زیاد،[6] عومەر ڕاوێژی بە یارانی کرد لەسەر ئەوەی کە کێ بکاتە والی لەسەر خەڵکی کوفە و پێی فەرموون: لە خەڵکی کوفە کێ دەمبووری و کێ لەسەر فەرماندەکانیان دەیانپارێزێت،

---

١ـ الادارة الاسلامية في عصر عمر بن الخطاب(ص: ٢١٥).
٢ـ محض الصواب (٢/٥١٠).
٣ـ تاريخ الاسلامي (١٩، ٢٠/٢٦٨).
٤ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١١٤).
٥ـ فرائد الكلام (ص: ١٦٥).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

ئەگەر کەسێکی بە ڕەوشتیان لەسەر دابنێم ئەوا لاوازی دەکەن، و ئەگەر کەسێکی بەهێزیان لەسەر دابنێم تاوانباری دەکەن بە خراپەکاری، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەوەی ئێوە دەڵێن سەبارەت بە پیاوێکی لاواز کە موسڵمانێکی لە خواترسە و ئەوەی ترش پیاوێکی بەهێز و توندڕەوە کامیان بۆ ئەمیرایەتی باشترە؟ موغیرەی کوڕی شوعبە فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لاواز ئیسلامیەتەکەی بۆ خۆیەتی و لاوازیەکەی ماڵە لەسەر تۆ و موسڵمانان، بەهێز و توندڕەو توندیەکەی لەسەر خۆیەتی و هێزەکەی بۆ تۆ و بۆ موسڵمانانە و ئەمەش لە ڕای خۆتدا کار پێ بکە، عومەر فەرمووی: ڕاستت وت موغیرە، پاشان عومەر کردیە والی کوفە و پێی فەرموون: سەیرکە با تۆ لەوانە بیت کە چاکەخوازان بە دەست چاکی دەزانن و خراپەکاران لێی دەتۆقن، موغیرەش وتی: هەروا دەکەم ئەی ئەمیری باوەڕداران.[1]

## ١٢- تاقیکردنەوەی کاربەدەستان پێش بە والی کردنیان:

عومەر(ﷺ) کار بەدەستانی تاقی دەکردەوە پێش ئەوەی بیانکاتە والی، هەروەك ئەحنەفی کوڕی قەیس باسی لێوە دەکات ماوەیەکی درێژی دەخایاند، ئەحنەف دەفەرمووێت: چووم بۆ لای عومەر(ﷺ) لە لای خۆی ساڵێك هێشتمیەوە، پاشان فەرمووی: ئەی ئەحنەف تاقیم کردێتەوە و بینیم کە ئاشکرا و دەرو روخسارت باشە و من تکا دەکەم کە پەنهانیەکەیشت وەك ئاشکرا و دەرو روخسارت وابێت، ئێمە باسی ئەوەمان دەکرد کە ئەم ئومەتە بە دوڕوویەکی زانا تیادەچێت، دواتر عومەر پێی فەرموو: ئایا دەزانی کە بۆچی بەندم کردی؟ بۆی ڕوون کردەوە کە ویستوویەتی تاقیبکاتەوە پاشان بیکاتە والی،[2] عومەر چەند ئامۆژگاریەکی ئەحنەفی کرد و فەرمووی: ئەی ئەحنەف هەر کەسێك زۆر پێبکەنێت سام و هەیبەتی نامێنێت، هەر کەس گاڵتە بکات پێی سووك دەبێت، هەر کەس لە شتێکدا زۆر ڕۆبچێت بەوە دەناسرێت، هەر کەس زۆر بڵێ بێت خراپەی زۆر دەبێت، هەر کەس خراپەی زۆر بێت شەرمی کەم دەبێت و هەر کەسیش شەرمی کەم بێت لە خواترسانی کەم بێت و هەر کەسی لە خواترسانی کەم بێت[3] دڵی دەمرێت.

## ١٣- عومەر والی لە نێو نەتەوەکان هەڵدەبژارد:

جێگەی سەرنجە کە عومەر(ﷺ) زۆرجار هەندێ کەسی دەکردە والی نەتەوەکەی خۆی ئەگەر لەو کارەدا بەرژەوەندی بەدی بکردایە وە ئەو کەسەی بە شیاوی هەستان بە ئەرکی والی بزانیایە، لەوانەش بە والی کردنی جابری کوڕی عبداللە ی بەجلی کە کردیە والی ناوچەی بەجیلە،[4] کاتێك کە ڕەوانەی عێراقی کردن، هەروەها سەلمانی فارسی لەسەر ناوچەی مەدائن کردە والی، و نافعی کوڕی حارسی

---

١ـ الولاية على البلدان (٢٨/١).
٢ـ الولاية على البلدان (١٤٢/١)، مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ١١٧).
٣ـ صفة الصفوة (٢٨٧/١).
٤ـ الولاية على البلدان (١٤٢/١).

کردە والی مەککە، عوسمانی کوڕی عاسی کردە والی تائیف، ڕەنگە هۆکار لە پشتەوەی ئەم کارە چەند ئامانجێکی دیاربێت کە ئەو کەسە زیاتر لە خەڵکانی تر دەستەبەرکردنی لە لا مەبەست بێت.[١]

## ١٤- دەستووری خەلیفەیی:

عومەر(ﷺ) بەوە بەناوبانگ بووە کە کاتێك لە هەڵبژاردنی والیەك لێ بۆتەوە و پاش ئەوەی کە ڕاوێژی بە ڕاوێژکارانی کردووە پەیامێکی بۆ والی نووسیووە کە ناوی لێناوە پەیمانی دامەزراندن یان وەکارخستن لای زۆرێك لە مێژوونووسان و ئێمەش بە شێوەیەکی خوازراو دەتوانین ناوی لێ بنێین ((دەستووری خەلیفەیی لە دامەزراندنی کاربەدەست یان ئەمیر)) وە زۆرێك لە دەقەکانی دامەزراندنی عومەر بۆ کاربەدەستانی هاتوون،[٢] بەلام مێژوونووسان دەیانەوێت لەوە بگەن لە عومەر ئەگەر کاربەدەستێکی بەکار بهێنایە نامەیەکی بۆ دەنووسی و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی کۆچکەری و پشتگیریکاران لەسەر بە شاهێد دەگرت و هەر لەو نووسراوەدا چەند مەرجێکی لەسەر دادەنا،[٣] ئەگەر ئەو کەسە هەڵبژێردراوە لە ڕوونەبوایە، عومەر بەڵێننامەیەکی بۆ دەنووسی و فەرمانی پێ دەدا کە بڕوات بۆ ئەو ناوچەیەی کە ئەوی لەسەر کراوەتە والی، نموونەی ئەمەش پەیامەکەی بوو بۆ عەلائی کوڕی حەزرەمی کە کاربەدەستی بەحرێن بوو ،عومەر فەرمانی پێدا کە وەك والی بەسرە ڕووبکاتە ئەو ناچەیە و ئەمەش لە دوای عوتبەی کوڕی غەزوان بوو، هەروەها عومەر لە کاتی لابردنی ئەمیرێك و دانانی کەسێکی تر لە شوێنەکەی والیە تازەکە وتارێکی دەدا و تیایدا ئاماژەی بە دامەزراندنی خۆی و لابردنی والیەکەی پێش خۆی دەکرد، ئەمەش نموونەی پەیامی عومەرە بۆ ئەبو موسای ئەشعەری کاتێك عومەرموغیرەی کوڕی شوعبەی لە والی بەسرە کەنارگیر کردو ئەبو موسای لەشوێنەکەی دانا.[٤]

## ١٥- لە کاروباری موسڵماناندا پشت بە گاور نابەستریٚ:

لە شامەوە هەواڵی ئازادکردن هات بۆ عومەر و ئەویش فەرمووی بە ئەبو موسا: نووسەرەکەت بانگ بکە تا لە مزگەوت بخوێنێتەوە بۆ خەڵکی، ئەبو موسا وتی: ئەو نایەتە ناو مزگەوتەوە، عومەر فەرمووی: بۆچی؟ ئایا لەشی گرانە؟ ئەبو موسا وتی: نەخێر گاورە، عومەر فەرمووی: لێیان نزیك مەبنەوە لە کاتێکدا کە خوای گەورە پارچە پارچەی کردوون، ڕێزیان مەگرن کاتێك کە پەروەردگار سووکایەتی پێ کردوون، لێیان دڵنیا مەبن کاتێك کە خوا ناپاکی کردوون، من ڕێگریم لێ کردوون کە گاور و جوولەکە لە کارەکانتاندا بەکاربهێنن، لەبەر ئەوەی ئەوان بەرتیل وەرگرتن ،[٥] ئوسق دەڵێت:[٦] من بەندەیەکی گاور بووم لەبەر دەستی عومەر، عومەر پێی فەرمووم: موسڵمان ببە هەتا لە

١- الولاية على البلدان (١٤٢/١).
٢- الوثائق السياسية في للعهد النبوي والخلافة الراشدة (ص: ٤٠٧).
٣- الولاية على البلدان (١٤٤/١).
٤- الولاية على البلدان (٤٩/٢).
٥- بدائع السلك (٢٧/٢).
٦- ذكره إبن حجر في الاصابة.

بەڕێکردنی هەندێ لە کاروباری موسڵمانان پشتت پێ ببەستین، لەبەر ئەوەی کە شیاو نیە بۆ ئێمە کە پشت بە کاروبارەکانی ئەوان ببەستین لە کاتێکدا کە لەوان نین وە کاتێك کە ئامادەی سەرەمەرگی بووم ئازادی کردم و فەرمووی: بڕۆ بەو شێوەیەی کە خۆت پێت خۆشە.[1]

## دووەم: گرنگترین سیفەتەکانی والی لای عومەر:

لە گرنگترین سیفەتەکانی والی لای عومەر، پاکی بیروڕاو زانستی شەرعی و متمانەبوون بە خودا و پێشەنگ و ڕاستگۆیی و بە توانایی و مەردایەتی و جوامێری و خۆشەویستی و قوربانیدان و گیانفیدایی و سادەیی و ئامۆژگاری وەرگرتن و لەسەرخۆیی و ئارامی و ئیرادەی بەهێز و دادپەروەری، بە توانای لەسەر چارەسەرکردنی گرفتەکان، و چەندین سیفەتی تر کە گرنگترینیان ئەمانەن:

### ١- ئاینگەرێتی:

لە گرنگترین ئەو والیانەی عومەر کە بە خواناسیان بە ناوبانگ بوون، سەعیدی کوڕی عامری کوڕی حەزیم و عومەیری کوڕی سەعد و سەلمانی فارسی و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و ئەبو موسای ئەشعەری (خوایان لێ ڕازی بێت)، خێزانی هەندێ لە والیەکان دەهاتنە لای عومەر و سکاڵای خواناسی هاوسەرەکانیان دەکرد، خێزانی موعاز(ﷺ) سکاڵای کرد وتی: عومەر(ﷺ) موعازی وەك پۆستەچیەك نارد بۆ سەر چەند هۆزێك کە شتەکانی بەسەردا دابەش کردن تا هیچی بە دەستەوە نەما، هەتا هاتە ئەو کۆڕەی کە لەسەر گەردنی پێی دەرچوو، خێزانەکەشی وتی: کوا ئەو شتەی کە پێی هاتی لەوەی کە کاربەدەستان پێی دێن لە نیازمەندی کەس و کارەکانیان؟ موعاز فەرمووی: من چاودێرێکم لەگەڵ بوو، خێزانەکەی وتی: تۆ لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکریشدا دەست پاك بوویت، ئایا عومەر چاودێرێکی لەگەڵدا نادریت؟ بەمە خێزانەکانی هەستا و سکاڵای عومەری کرد، ئەمە گەشتە عومەر و عومەریش موعازی بانگ کرد، پاشان فەرمووی من چاودێرێکم لەگەڵ ناردووی، موعاز فەرمووی: هیچم نەدی کە پۆزشی پێ بهێنن وە بۆی جگە لەمە، پاشان وتی: عومەر پێکەنی و شتێکی پێدا و فەرمووی پێی قایل بکە.[2]

### ٢- خۆ بە کەم زانین:

والیەکانی سەردەمی عومەر بە خۆ بەکەم زانین بەناوبانگ بوون هەتا ئەوانەی کە هاتوونەتە ولاتەکانیانەوە جیاوازی نێوان ئەوان و خەڵکی تریان نەکردووە، چونکە ئەوان لە ماڵیان و جل و بەرگیان و سواریان وەك خەڵکی تر وابوون و خۆیان بە هیچ شتێك جیانەکردۆتەوە، لە نموونەی ئەمەش چیرۆك و بەسەرهاتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح(ﷺ) هەیە، کە ڕۆمەکان پیاوێکی دەنێرێتە لا هەتا دانووستانی لەگەڵ بکات، ئەو پیاوە هات تا گەیشتە ئەبو عوبەیدە، کاتێك کە لە موسڵمانان نزیك

---

١ـ محض الصواب (٢/٥١٤)، الطبقات (٦/١٥٨).
٢ـ الولاية على البلدان (٢/٥٣).

بوویەوە ئەبا عوبەیدە لە نێو هاوەڵانی نەیناسیەوە، نەیزانی کە ئەوان ئایا ئەبو عوبەیدەیان تێدایە یان نا وە شوێنی ئەبو عوبەیدەی ئەمیریش نەیترساند، ئەو پیاوە بە موسڵمانانی وت: ئەی هۆزی عەرەب، کوا ئەمیرەکەتان؟ ئەوانیش وتیان: ئەوەتانێ، پیاوەکە بینی کە ئەبو عوبەیدە لەسەر زەوی دانیشتووە و کەوانەکەی پاڵداوەتەوە و چەند تیرێکی بە دەستەوەیە کە ئەم دیو و ئەو دیوی پێدەکات، پەیامبەرەکە بە ئەبو عوبەیدەی وت: ئایا تۆ ئەمیری ئەمانەیت؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، پیاوەکە وتی: چی وای لێ کردوویت، کە لەسەر زەوی دابنیشیت؟ سەیرکە ئەگەر تۆ لەسەر فەرشێك دابنیشیت یان ئەمە باروذۆخت بێت لای خوا چی ڕێگریت دەکات لە چاکە؟ ئەبو عوبەیدە فەرمووی: خوای گەورە شەرم لە هەق ناکات وە من بە ڕاستت دەزانم لەوەی کە وتت ، من جگە لە ئەسپەکەم و چەکەکەم و شمشێرەکەم نە دینارێك و نە درهەمێکم نیە، دوێنی ئێوارەم پێویستم بە خەرجی هەبوو بەڵام نەمبوو لەبەر ئەوە ئەو خەرجیەم لە براکەم قەرزکرد واتا موعاز، ئەگەر ڕاخەرێك یان فەرشێکم هەبووایە ئەوا بێ براکانم و هاوەڵەکانم لەسەری دانەدەنیشتم وە ئەو برا موسڵمانەم دادەنیشتاند کە نازانم ڕەنگە لەسەر زەوی لای خودا لە من چاکتر بێت، ئێمە بەندەی خوداین و بەسەر زەویدا دەڕۆین، لەسەر زەوی دادەنیشین، و لەسەر زەوی دەخۆین و لەسەر زەویش ڕادەکێشین، ئەمەش لای خودا هیچمان لێ کەم ناکاتەوە، بەڵکو خوای گەورە پاداشتمان بە گەورەتر و پیرۆزتر دەکات، و پلەمان بەرز دەکاتەوە، ئێمەش بەم کارە خۆمان بە کەم دەزانین بۆ خوای گەورەمان.[1]

### ٣- خواپەرستی:

زۆرێك لە والیەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی ببەخشرێن لەو کارانەی کە تیایدا کراونەتە وەکیل و دراوە بە سەریاندا، عوتبەی کوڕی غەزوان داوای بەخشرانی لە والی بەسرە لە عومەر کرد بەڵام عومەر نەیبەخشی،[2] هەروەها نعمان کوڕی موقرن کە لە کەسکەر والی بوو داوای لە عومەر کرد کە لەو کارە بیبەخشێت و ڕێگەی پێ بدات کە بەشداری لە جیهاد بکات چونکە ئارەزووی شەهیدی دەکرد،[3] هەر بەم شێوەیەش هەندێ لە هاوەڵانی ولایەتەکان کاتێك کە عومەر داوای ئەوەی لێ کردوون کە وەك والیەك کار بکەن ئەو داوایەیان پەسند نەکردووە، زوبێری کوڕی عەوام لە ولایەتی میسردا بوو کاتێك کە عومەر ئەو داوایەی خستە بەردەمی و پێی فەرموو: ئەی ئەبو عبداللە ئایا بتکەمە والی میسر؟ زوبێر فەرمووی: من پێویستیم بەو کارە نیە بەڵام وەك موجاهیدێك دەردەچم و هاوکاری موسڵمانان دەکەم،[4] هەروەك ئەوەی کە إبن عباس پەسەندی نەکرد کە ببێتە والی میسر کاتێك کە عومەر پاش کۆچی دوایی ئەمیری ئەو شارە داوای لێ کرد ئەو کارە بگرێتە دەست.[5]

---

١ـ فتوح الشام للأزدي (ص: ١٢٢-١٢٣).
٢ـ الولاية على البلدان (٢/٥٤).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ فتوح الشام للأزدي (ص: ٢١٤).
٥ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٢٢-٢٣).

## ٤- ڕێزگرتنی والی بۆ والی پێش خۆی:

والی سەر تەواوی ناوچەکان بەوە لە یەکتری جیاکراونەتەوە کە ڕێزی والیەکانی پێش خۆیانیان گرتووە و ئەمەش لە زۆربەی والیەکانی سەردەمی ڕاشیدیدا بەدی کراوە بە جۆرێك وەك نمونە کاتێك کە خالدی کوڕی وەلید وەك سەرکردەیەك ڕەوانەکرا بۆ شام لەسەر ئەبو عوبەیدەی جەڕاح و ئەوانی تر خالید بەرپەرچی ئەوەی دایەوە، کە لە نوێژەکاندا پێش ئەبو عوبەیدە بکەوێت، کاتێك کە عومەر هەستا بە لەکار خستنی خالدی کوڕی وەلید لە ئەمیری سەربازانی شام و دامەزراندنی ئەبو عوبەیدە لە شوێنەکەی ئەبو عوبەیدە ئەم هەواڵەی لە خالید شاردەوە و هەواڵی پێ نەدا تا نووسراوێکی تر لە عومەرەوە هات، پاشان خالید بە هەواڵەکەی زانی و سەرزەنشتی ئەبو عوبەیدەی کرد لەسەر ئاگادارنەکردنی،[1] دکتۆر عبدالعزیز عومەری دەڵێت: شتێکم نەبینیوە لە میانی ئەم توێژینەوەیەدا کە باس لەوە بکات یەکێك لە والیەکان کاری کردبێت لەسەر زەلیل کردنی یان تۆڵەسەندنەوەی والیەکەی پێش خۆی، بەڵکو ئەوان بە زۆری و هەر لە یەکەم وتاریانەوە کاریان لەسەر وەسفی ئەوان کردووە و ستایشی کردوون.[2]

### سێیەم: مافی والی:

گومانی تێدا نیە کە والی سەر ولایەتەکان کۆمەڵێك مافی جیاوازیان هەبووە کە هەندێکیان پەیوەندی بە خەڵکی و هەندەکەی ترشیان پەیوەندی بە خەلیفەوە هەبووە، سەرباری ئەوەی کە چەند مافێکی تر هەبوون پەیوەندیان بە بەیتولماڵەوە هەبووە، ئەم مافە ئەدەبی و مادیانە بە پلەی یەکەم ئامانج تیایدا هاریکاری والی بووە بۆ هەستان بە ئەنجامدانی کارەکەی و خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ئەمەش گرنگترین ئەو مافانەیە:

## ١- ملکەچی لە سەرپێچی نەکردندا:

ملکەچی لە خەڵکەوە بۆ سەرکردە و والیەکان پێویستیەکە کە شەرع بڕیاری لەسەر داوە و خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ (النساء: ٥٩).

دەقی ئەم ئایەتە داڕێژەری دەقێکە لەسەر واجبی ملکەچ بوون بۆ بەرپرسان و لەوانەش ئەو بەرپرسانەی کە کار و فەرمانی خوای پاك و بێگەرد ڕادەپەڕێنن،[3] گومانی تێدا نیە کە ملکەچی

---

١ـ تأريخ اليعقوبي (١٣٩/٢، ١٤٠).
٢ـ الولاية على البلدان (٥٥/٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە. (٥٦/٢).

فەرماندە و خەلیفەکان پەیوەستە بە ملکەچی خوای گەورە و ئەوان هەر کات سەرپێچی کار و فەرمانی خودایان کرد ئەوا ملکەچیان ناکرێت.[١]

## ٢- خەڵاتی ئامۆژگاری بۆ والی:

پیاوێك هات بۆ لای عومەرو پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران لەبەر خودا باکم نیە لە لۆمەی لۆمەکاران ئەگەرچی چاك بێت بۆم یان لە خۆم بڕۆمە پێشێ؟ عومەر فەرمووی: هەر کەس لە کاروباری موسڵمانان شتێکی گرتە دەست ئەوا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت لەبەر خودا، هەر کەس خاڵی بوو لەمە با لە خۆی بڕواتە پێشێ و ئامۆژگاری بەرپرسەکەی بکات.[٢]

## ٣- گەیاندنی هەواڵ بە والی:

پێویستە لەسەر خەڵکی کە هەواڵی ڕاست و دروست بگەیننە والی و لەمەدا ڕاستگۆبن، ئەگەرچی ئەو هەواڵە تایبەت بێت بە بارودۆخی خەڵکی بە گشتی یان تایبەت بێت بە هەواڵی دوژمنان وە یان پەیوەست بێت کاربەدەستانی والی و فەرمانبەرانی و پەلەکردن لەمەشدا بەپێی توانا پێویستە بە تایبەتی ئەگەر ئەو کارە پێویست بێت بە کاری جەنگی و هەواڵی دوژمنان و ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە ساختەکاری کاربەدەستانی شتانی تر لە مەنتقی هاوبەشی بوون لە بەرپرسیارێتی لەگەڵ والی لە چاودێری کردنی بەرژەوەندی گشتی بۆ ئومەت.[٣]

## ٤- هاریکاری والی لە هەڵوێستیدا:

ئەگەر هەڵوێستی والی بۆ بەرژەوەندی گشتی بوو ئەوا پێویستە بە پلەی یەکەم لە لایەن خەلیفەوە هاریکاری بکرێت، عومەر(ﷺ) بە هەموو شێوەیەك سوور بووە لەسەر ئەم واتایە و بایەخی تەواوی داوە بە ڕێزگرتنی خەڵکی بۆ والی و ستایش کردنیان وە لەمەدا بە هەموو هۆکارێك خەلافەتی کردوون عومەر زۆر توند بووە لەسەر ئەوەی لەسەری بووە بە تایبەتی ئەگەر هەستی بە دوژمنایەتیەك یان نیمچە دوژمنایەتیەك کردبێت کە لەسەر یەکێکیان کەوتبێت لێرەدا توند و تیژی لەسەر ئەو کەسانە نواندووە کە پەلامار دراوە لەم بارەوە هەتا سام و هەیبەتێك بۆ کاربەدەستان بهێنێتەوە و شوێنی خۆی لە ناخ و سینەی خەڵکیدا بکاتەوەو سامێکی پێ بنوێنێت لای تایبەتمەندان و خەڵکیش بە گشتی.[٤]

## ٥- مافی سەرکردە لە هەوڵداندا:

مافی سەرکردەیە، کە هەوڵدان بە ڕای خۆی بکات لەو کارانەی کە بواری کراوەیان تێدایە بە تایبەتی لەو کارانەی، کە شەرع بە وردی دیاری نەکردوون و هەروەها لەو کارانەش کە سپاردەی

---

١ـ الولاية على البلدان (٢/٥٥).

٢ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ١٥)، الولاية على البلدان (٢/٥٧).

٣ـ الولاية على البلدان (٢/٥٧).

٤ـ هەمان سەرچاوە. (١/١٥٢).

خەلیفەی تێدا نەهاتووە بۆ کارپێکردنی لە سنوورێکی دیاریکراودا، یەکێك لە والیەکانی عومەر لە شام هەولّی خۆی دا بۆ دابەشکردنی بەشەکان لە نێوان پیادە و ئەسپ سواراندا، عومەر هەولّەکەی بە شیاو نرخاند، إبن مسعود وا بەناوبانگە کە یەکێك بووە لە والیەکانی عومەر لەسەر مەسئەلەی هەولّداندا پێچەوانەی ڕای عومەر بووە.[١]

## ٦- ڕێزگرتنیان پاش لە کار لابردنیان:

یەکێك لە مافەکانی والی ڕێز گرتنیەتی پاش لەکار لابردنی، کاتێك عومەر(ﷺ) شەرحەبیلی کوڕی حەسنەی لە والی ئوردن لە کار لابرد، هۆی ئەم لە کار لابردنەی بۆ خەلّکی ڕوون کردەوە، کاتێ کە شەرحەبیل پرسیاری کرد: ئایا لە بێزاریت بوو لە کار لاتبردم ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ عومەر فەرمووی: من هەردووکتانم خۆش دەوێ بەلاّم پیاوێکی بەهێزترم لە پیاوێکی بەهێز خۆشتر دەوێ.[٢] هەروەها عومەر سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی لە کار لابرد لە ولایەتی کوفە، ڕەنگە عومەر ئەوەی بەدی کردبێ کە ڕێزی ئەو فەرمانی دابێ بە دوور خستنەوەی لە کەسانێك کە بەعەیبداریان زانی بێ لە نوێژەکانیدا، لەگەلّ ئەوەشدا سعد(ﷺ) لێکچوو ترین کەس بووە بە نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) بەهۆی زانستی و شارەزایی تەواوی بە سیفەتەکانی نوێژی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە، عومەر لە کاری لابرد وەك ڕێزێك بۆی تا نەبێتە تانە بەسەر زاری کەسانی نەفامەوە.[٣]

## ٧- مافی ماددی:

هەروەها لە لایەنی مادی یەوە والی مافی تایبەتی خۆی هەبوو لەسەروی هەمووشیانەوە ئەو موچەیان بووە کە پێی ژیاون، گومانی تێدا نی یە کە هاوەلاّن (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەسەروی هەموشیانەوە خەلیفەکانی ڕاشیدی هەستیان بە بایەخداری و گرنگی ڕزق و ڕۆزی کردووە بۆ کاربەدەستان وە ئەمەیان بە یەکێك لە مافەکانیان داناوە سەرباری بێ نیازیان پێی لە خەلّکی و پاشان نەبوونی کاریگەری لەسەریان یان هەولّی بەرتیل پێدانیان،[٤] عومەر سوور بووە لەسەر پاکی کار بەدەستانی و خاوێنی و بێگەردیان لە مالّی خەلّکی، بە مالّی خۆیان بێ نیازی کردوون لە مالّی کەسانی تر، ڕەنگە عومەر(ﷺ) هەستی بەم گرفتە سامناکە کردبێ، هەستی بەوە کردبێ کە بۆ ئەوەی زانی پاکی و بێگەردی کار بەدەستانی بکات ئەوا پێویستە بێ نیازیان بکات لە پێویستیان بۆ مالّی خەلّکی، گفتوگۆ و مشتومڕێك لە نێوانی و نێوان ئەبو عوبەیدەدا پەیدا بووە کە ئەبو عوبەیدە بە عومەری فەرمووە: هاوەلاّنی پێغەمبەر(ﷺ)ت پۆخلّە کردووە- واتە کردوتنە کاربەدەست- عومەریش لە وەلاّمدا فەرمووی: ئەی ئەبو عوبەیدە ئەگەر من بۆ پاك ڕاگرتنی ئاینەکەم پشت بە خەلّکی دیندار نەبەستم ئەی پشت بە کێ ببەستم؟ ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: ئەگەر ئەمەت کرد بێ

١ـ اعلام الموقعين (٢/٢١٨).
٢ـ تأريخ الطبري (٥/٣٩).
٣ـ الولاية على البلدان (٢/٥٩).
٤ـ الولاية على البلدان (٢/٦٠).

نیازیان بکە بە کاربەدەستی لە خیانەت،[1] واتە ئەگەر لە شتێکدا بە کارت هێنان ئەوا لە بەخشین و ڕزق و ڕۆزیان تێریان بکە، تا پێویستیان بە ساختە کاری یان خەڵکی نەبێت، عومەر بە هاوشێوەی کارەکانیان( لەسەر ڕێژەی ئەوەی کە شیاو بوو بۆیان لە خواردن و ئەوەی کە لە کارەکانیان پێی هەڵدەستن) بۆ فەرماندەی سوپا و گوندەکان و تەواوی کاربەدەستان هێندەی بەخشش دەدانێ کە بە باشی بەشیان بکات،[2] عومەر سوور بوو لەسەر پاك و بێگەردی کاربەدەستانی لەوەی کە لە ماڵی خەڵکیان لە دەستدایە و هەمیشە بەو کاربەدەستانەی دەفەرموو: مـن ئێوە و خۆشم لەم ماڵە بە ڕاسپاردەی هەتیو داناوە هەر کەس ( لە سەرپەرشتیاری هەتیوان) دەوڵەمەند بوو با خۆی بگرێتەوە لە خواردنی ماڵیان وە هەرکەس لەوان هەژار بوو با (لێی) بخوات بە ئەندازەی پێویست،[3] عومەر تا ڕادەیەك هێندە موچەی دیاریکراوی بۆ تەواوی کاربەدەستانی بڕیبوویەوە ئیتر ئەو موچەیە ڕۆژانە یان مانگانە یان ساڵانە بوایە، لە هەندێ لە سەرچاوە مێژوویی یەکان وا هاتووە کە هەندێکیان خواردن و هەندێکی تریان موچەیەکی دیاریکراویان وەرگرتووە،[4] هاتووە، کە عومەر(ﷺ) عبداللە ی کوڕی مەسعودی لەسەر دام و دەزگاکانی دادوەری و بەیتولماڵ کردۆتە کاربەدەست، عوسمانی کوڕی حەنیفی لەسەر ئاودێری فوڕات، و عەماری کوڕی یاسری لەسەر نوێژ و سەربازگە نوێژ ،چوار یەکی داناوە بۆ عبداللە ی کوڕی مەسعود و چوار یەکەکەی تری داناوە بۆ عوسمانی کوڕی حەنیف، هەروەها عومەری کوڕی خەتاب٢٠٠دیناری بۆ عەمری کوڕی عاص بڕیوەتەوە لە کاتێکدا کە والی میسر بووە،[5] سەلمانی فارسی کە بەرپرسی٣٠ هەزار کەس بووە لە شاری مەدائن کە بەخششەکەی ٥٠٠٠ درهەم بووە، سەلمان لەبەر خوا ناسی خۆی کاری کردووە و بەبەرهەمی شانی خۆی ژیاوە و ئەوەی کە پێی بەخشراوە کردوویەتی بە چاکە،[6] وە چەندین ڕیوایەتی تری جیاواز هەیە سەبارەت بە ڕزقدانی عومەر بۆ والی یەکانی، گومانی تێدا نی یە کە ئەم جیاوازی یانە لە موچەدا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی بارودۆخەکان و گۆڕانی لە سەردەمی عومەردا، ئەقڵ نایبڕێت کە ڕزق و ڕۆزی و موچەکان هەر لە سەرەتای خەلافەتی عومەرەوە هەتا کۆتایی یەکەی بەهەمان شێوە بمێننەوە، کە ئەمەش سەرنجدانێك بووە بۆ گۆڕانی هەل و مەرج و بارودۆخ و جیاوازی نرخ و پێشکەوتنی پێویستی یەکان بەهۆی بەرفراوان بوونی ناوچە ئازاد کراوەکان و زۆری داهات لە بەیتولمالدا،[7] عومەرساڵانە ١٠ هەزار دیناری داوەتە معاویە لەسەر کارەکەی لە شام، باس لەوە دەکرێت کە عومەر لەنێوان بڕی ٩ هەزار و ٨ هەزارو ٧ هەزاری بۆ فەرماندەی سوپاو گوندەکان بڕیوەتەوە بە پێی ئەوەی لە خواردن پێیان

---

١ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ١٢٢).
٢ـ الولاية على البلدان (١٤٩/١).
٣ـ تأريخ المدينة (٦٩٤/٢)، الولاية على البلدان (١٤٩/١).
٤ـ الولاية على البلدان (١٥٠/١).
٥ـ طبقات الكبرى (٢٦١/٤).
٦ـ سير أعلام النبلاء (٥٤٧/١).
٧ـ الولاية على البلدان (٦٣/٢).

گەیشتووەو هەستاون بە ئەنجامدانی کارەکانیان.[١]

هەندێ لە کاربەدەستانی پێیان خۆش نەبووە کە بەهۆی ئەنجامدانی کاری فەرمانداریی و والی موسوڵمانانەوە ڕزق و ڕۆزی وەربگرن بەڵام عومەر ئامۆژگاری کردوون بە وەرگرتنی، عومەر(رضي الله عنه) بە یەکێك لە والی یەکانی فەرموو: من پێم نەوتی کە کارێك لە کاروباری موسوڵمانان دەگریتە دەست و ئەگەر من شتێکم پێ بەخشیت پێت ناخۆش دەبێت؟

ئەویش وتی: بەڵێ، عومەر فەرمووی: بۆچی ئەوەت ناوێ؟ پیاوەکە وتی: من چەندئەسپ و بەندەیەکم هەیە خۆشم سەلامەتم و زۆر باشم دەمەوێت کرێی کاربەدەستیەکەم بکرێتە خێر بۆ موسڵمانان، عومەر فەرمووی: وا مەکە منیش ئەوەم دەویست کە تۆ دەتەوێت، پێغەمبەر(ﷺ) بەخششی پێ دەدام و منیش دەموت بیدە بە یەکێك لە من هەژارتر بێت بۆی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((وەری بگرە و زۆری بکە و خێری پێ بکە، هەرچیەکت بۆ هات بەبێ گرفت و چاوتێبڕین وەری بگرە، ئەمە ماڵێکە، کە خۆتت پێ نەفرۆشتووە))،[٢] هەرچۆن بێت بەڕاستی بنەمای بەخششی ڕزق و ڕۆزی بە کاربەدەستان و بێ نیازیان لە خەڵکی بنەمایەکی ئیسلامیە و پێغەمبەر(ﷺ) فەرزی کردووە و خەلیفەکانی ڕاشیدین و ئەوانەی دوای ئەوانیش لەسەری ڕۆیشتوون، هەتا کاربەدەستان بێ نیاز بن لە ماڵ و دارایی خەڵك، یەکلاییان بکەنەوە بۆ کار و بەرژەوەندی دەوڵەتی ئیسلامی.[٣]

## ٨- چارەسەری کاربەدەستان لە کاتی نەخۆشیدا:

موعەیقیب نەخۆش کەوت، کە خەزنەداری عومەر بوو لەسەر بەیتولمال عومەر داوای چارەسەری بۆ دەکرد لە هەر کەسێك کە باسی چارەسەرکردنی لێوە بیستبێت، هەتا دوو کەس لە خەڵکی یەمەن هاتنە لای و ئەویش پرسی: ئایا هیچ چارەسەرێکتان لە لایە بۆ ئەم پیاوە باشە چونکە ئەم ئازارە زۆر بە خێرایی تەشەنە لە گیانی دەکات؟ وتیان: شتێك کە نەخۆشیەکەی بڕەوێنێتەوە ئەوە ئێمە لە تواناماندا نیە بەڵام ئێمە بە دەرمانێك تیماری دەکەین کە ئازارەکەی ڕابگرێت و زیاد نەکات، عومەر فەرمووی: ئەمە سەلامەتیەکی گەورەیە ئەگەر ئازارەکە بوەستێت و زیاد نەکات، ئەوانیش وتیان: ئایا لە زەوی تۆدا گوژاڵکە هەیە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، وتیان: هەندێکمان بۆ بێنە، عومەریش فەرمانی دا و خەڵکیش دوو تۆپەڵی گەورەیان بۆ کۆکردەوە، پاشان هەستان و هەر گوژاڵکەیەکیان کرد بە دوو کەرتەوە دواتر موعەیقیبیان پاڵخست و هەر یەکەیان پێیەکی گرت و ژێر پێیان بەو گوژاڵکەیە هەنود، هەتا ئەگەر خراپ ببوایە یەکێکی تریان دەگرت بە دەستەوە، پاشان ناردیان عومەر فەرمووی: ئەم ئازارەی هەرگیز زیاد ناکات، گێڕەرەوەکە وتی: سوێند بە خوا موعەیقیب پاش ئەوە خۆڕاگر بوو وە تا مردیش ئەو ئازارەی زیادی نەکرد.[٤]

---

١ـ الخراج لأبي يوسف (ص:٥٠)، الولاية على البلدان (٦٣/٢).
٢ـ الولاية على البلدان (٦٤/٢)، الادارة الاسلامية محمد كرد (ص: ٤٨).
٣ الولاية على البلدان (٦٤/٢).
٤ـ أخبار عمر طنطاوي (ص: ٣٤١).

## چوارەم: ئەرکەکانی والی:

والیەکان هەر بەو شێوەیەی کە خوای گەورە ئەو شوێنەی پێ بەخشیبوون، بە هەمان شێوەش بارێکی گران و ئەرکێکی بەرجەستەیی دابوو بەسەر شانیاندا، عومەربە هەندێکیان کاریگەربوو لەوانە:

### ١- گەیاندنی کاروباری ئاینی:

وەك بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە ناو خەڵکی، ڕەساندنی نوێژ و پاراستنی ئاین و بنەماکانی، دروست کردنی مزگەوت و ئاسانکردنی کاروباری حەج و ڕەساندنی سزا شەرعیەکان.

### * بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام:

ئەگەرچی ئەو سەردەمە تایبەتمەند کرابوو بە جەنگە ئازادیخوازە گەورەکانەوە بەڵام هەندێ لە والیە کردەکان فەرمانیان دا بە بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لە وڵاتە ڕزگارکراوەکان بە پشتیوانی ئەو بڕە هاوەڵەی کە لەگەڵیاندایە،[1] وە لە سەردەمی عومەریشدا یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان کە والی شام بوو نامەیەکی بۆ عومەر نووسی: خەڵکی شام زۆر بوون و مەدائینیان قەرەباڵغ کردووە و پێویستیان بە یەکێکە کە قورئانیان فێر بکات و تێیان بگەیەنێت و من مەبەستم پیاوانێکە کە فێریان بکات، بۆیە عومەر پێنج کەس لە هاوەڵە تێگەیشتووە شارەزاکانی بۆ نارد،[2] عومەر بەوە بەناوبانگە کە هەمیشە ئەوەی دووپات دەکردەوە کە دەیفەرموو: ئاگادار بن سوێند بە خوا من کاربەدەستەکانم نانێرمە لای ئێوە کە لێتان بدەن و ماڵ و سامانتان ببەن، بەڵام دەیان نێرم تا کاروباری ئاینەکەتان و سونەتی پێغەمبەرەکەتان پێ فێر بکەن،[3] عومەر بە والیەکانی دەفەرموو: ئێمە ئێوە ناکەینە والی نە لەسەر پێگەیاندنی موسڵمانان و نە لەسەر خۆشی و بەختەوەری یان بەڵکو دەتانکەینە والی تا نوێژیان بۆ بخوێنن و قورئانیان فێر

بکەن،[4] هەروەك ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد عومەر کۆمەڵێك لە مامۆستایانی نارد بۆ ناوچە ئیسلامیەکان بە جۆرێ کە چەندین قوتابخانەی ئیسلامیان دامەزراند.

### * نوێژکردن:

عومەر(ﷺ) پەیامی بۆ والیەکان دەنووسی بەم شێوەیە: گرنگترین کاروباری ئێوە بە لامەوە نوێژەکانە هەر کەس پاراستی و پارێزگاری لێکرد ئەوا ئاینەکەی پاراستووە و هەر کەسیش لە دەستیدا، ئەوا بۆ ئەو هیچ شتێك نیە لەوە گرنگتر بێت ونی بکات،[5] هەروەها عومەر گرنگترین

---

١ـ أعلام الموقعين (٢/٢٤٧).
٢ـ سير أعلام النبلاء (٢/٢٤٧).
٣ـ السياسة الشرعية (ص: ١٥٠).
٤ـ نصيحة الملوك للماوردي (ص: ٧٢)، الولاية على البلدان (٢/٦٥).
٥ـ الطريقة الحكمية (ص: ٢٤٠)، الولاية على البلدان (٢/٦٧).

ڕەساندنی نوێژی لە نێو خەڵکدا بۆ والیەکان دووپات دەکردەوە و دەیفەرموو: بە ڕاستی ئێمە دەتانکەینە والی هەتا نوێژ بە خەڵکی بخوێنن و قورئانیان پێ فێر بکەن،[١] وە عومەر لە بڕیارەکانیدا بە دەق دەینووسی کەوا فلانکەس فەرماندەی نوێژ و جەنگە هەروەك ئەو بڕیارەی کە تیایدا عەماری کوڕی یاسر لەسەر نوێژ خوێنی و جەنگ و عبداللە کوڕی مەسعودی لەسەر دادوەری و بەیتولمال دانا،[٢] ئەو کەسەش تێگەیشتوانەی کە دەربارەی سیاسەتی شەرعی و لە بارەی بایەخی نوێژەوە سەبارەت بە ئەمیر و ئەو شتانەش کە ئەم کارە دەگرێتەوە کە شتیان نووسیووە ئاماژەیان بەوە کردووە کە ئەم کارە چەندین مانای دونیایی و دوارۆژی لەخۆگرتووە.[٣]

## * پاراستنی ئاین و بنەماکانی:

عومەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر پاراستنی ئاین و بنەماکانی بەو شێوە دروستەی کە داباریبوو بەسەر پێغەمبەر(ﷺ)دا، بەردەوام هەوڵی دەدا و تێدەکۆشا بۆ زیدنووکردنەوەی سونەتی پێغەمبەر(ﷺ)و کۆنترۆڵ کردنی بیدعە و کارکردن لەسەر ڕێزگرتنی ئاینی خودا و زێندووکردنەوەی سونەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، عومەر فەرمانی دا بە دەرکردن و نامۆکردنی پیاوێك بە هۆی زۆر بڵێی و چەند بابەتێکی لێکچوو لە قورئان،[٤] هەروەك پێشتر باسمان لێوە کرد، فەرمانی ئەنجامدانی شەو نوێژی لە مانگی ڕەمەزاندا دا و ئەم بڕیارەی بەناو تەواوی ناوچەکاندا بڵاوکردەوە،[٥] نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی: هەواڵم پێ گەیشتووە کە کەسانێك پێش تۆ بانگەشەیان بۆ جاهیلیەت کردووە ئەی نەوەی شمشێر، ئەگەر ئەم پەیامەی منت پێ گەیشت ڕیسوایان بکە بە سزادانی ماڵی و جەستەیی تا بڵاوەی لێ دەکەن ئەگەر تێنەگەیشتن.[٦]

## * نەخشەسازی بینای مزگەوت:

هەندێك لە ئامارەکان بەوە دەکەن کە لە سەردەمی عومەردا ٤٠٠٠ مزگەوت لە وڵاتی عەرەبدا بە تەنها دروست کراوە، والیەکان بە پەرەپێدانی مزگەوت و دامەزراندنیان لە تەواوی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان ناوبانگیان دەرکردووە وەك عەیازی کوڕی غەنم کە کۆمەڵێك لە مزکەوتەکانی ناوچە جیاوازەکانی دورگەی عەرەبی دروست کرد.[٧]

١ـ نصيحة الملوك (ص: ٧٢).
٢ـ الاحكام السلطانية (ص: ٣٣).
٣ـ الولاية على البلدان (٢/٦٧).
٤ـ الولاية على البلدان (٢/٦٨).
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ١٣٣).
٧ـ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ١٨٢)، الولاية على البلدان (٢/٦٩).

### * ئاسانکاری کاروباری حەج:

والیەکان لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا بەرپرس بوون لە ئاسان کردنی کاروباری حەج و زامن کردنی سەلامەتی حاجیانیان لە ولایەتەکانیاندا، هەروەها والیەکان سەرقافڵەی حاجیانیان دەست نیشان دەکرد، و کاتەکانی بەڕێکەوتنیان بۆ دیاری دەکردن بە جۆرێ کە حاجیان بە بەرپرسی والی نەبوایە بۆیان نەبوو شوێنی خۆیان بەجێ بهێڵن، پاش ئەمە شارەزایان و تێگەیشتوان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە ئاسانکاری کاروباری حاجیان لە کارە گرنگەکانی والیە لە ناوچەکەیدا، ماوردی دەڵێت: ئاسانکاری کاری حاجیان لە کاری والیە و لە نێو فەرمانی ئەمارەتەکەیدایە لەبەر ئەوەی کە لە کۆمەڵەی ئەو هاریکاریانەیە کە دەدرێتە پاڵی.[1]

### * ڕەساندنی سزا شەرعیەکان:

عەمری کوڕی عاص لە میسر سزای ئاینی ڕەساند بەسەر یەکێك لە کوڕانی عومەر و پاشان عومەر خۆی چەند قامچی لێدا، دەڵێن پاشان ئەو کوڕە بە گاریگەری ئەو قامچیە مرد،[2] والیەکان هەڵدەستان بە تۆڵەسەندنەوەی کوشتن بەبێ مۆڵەتی خەلیفە هەتا عومەر نامەیەکی بۆ نووسین: بە مۆڵەتی من نەبێت کەس مەکوژن،[3] دواتر والیەکان وایان لێهات کە پێش ڕاپەڕاندنەی کوشتنێك پرسیان بە عومەر(ﷺ) دەکرد، ڕەساندنی سزاکانیش لەو کارە ئاینی و دونیاییانەیە کە خەلیفە و والیەکانیشیان بە چاوێکی جۆش و خرۆشەوە سەیریان کردووە و بایەخیان پێداوە هەرچۆن کە بایەخیان بە بنەما جۆربەجۆرە ئاینیەکان داوە.[4]

### ٢- ئارامی خەڵکی لە وڵاتەکانیان:

بە ڕاستی پارێزگاری کردن لە ئاسایشی ژیان لە ولایەتەکاندا لە گرنگترین ئەو کارانەیە کە سپێردراوە بە والی، لە پێناوی بەدیهێنانی ئەمەدا والی هەڵدەستێ بە زۆرێك لەو کارانەی کە گرنگترینیان ڕەساندنی سزایە لەسەر سەرپێچی کاران و خراپەکاران، لەوەی کە بەدی دەکرێت لەو تاوانانەی کە هەڕەشە لە ژیانی خەڵکی و مولکەکانیان دەکات،[5] عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی: خراپەکاران بترسێنن و دەست بە دەست و پێ بە پێیان پێ بکەن،[6] هەروەها ڕەساندنی فەرزی جیهاد دژی دوژمنان ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لە ئارامی وڵاتە ئیسلامیەکان و ناوچەکانیان.[7]

---

١ـ الاحکام السلطانیة (ص: ٣٣).
٢ـ مناقب عمر بن الخطاب لإبن الجوزي (ص: ٢٤٠-٢٤٢).
٣ـ الوثائق السیاسیة للعهد النبوي والخلافة الراشدة (ص: ٥٢١).
٤ـ الولایة علی البلدان (١/٧٠).
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ عیون الاخبار (١/١١).
٧ـ الولایة علی البلدان (١/٧١).

## ٣- جیهاد لە پێناوی خودا:

ئەگەر هەر لە سەردەمی ئەبو بەکرەوە، تا سەردەمی عومەر ناوی فەرماندەکان بخەینە ڕوو ئەوا باڵێکی درێژیان لە مێژووی جەنگە ڕزگاریخوازەکان بۆ دەدۆزینەوە، بەڵکو ئەوان فەرماندەکانیان ناردووە بۆ ئەو ناوچانەی کە ئازاد نەکراون و کاریان لەسەر ئازادکردنی و پاشان ڕێکخستنی کردووە وەك فەرماندەکانی شام کە: ئەبو عوبەیدە و عەمری کوڕی عاص، و یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان و شەرحەبیلی کوڕی حەسنە و فەرماندەکانی عێراقیش: موسەنای کوڕی حارسە و خالدی کوڕی وەلید و عەیازی کوڕی غەنەم و ئەوانی تر بوون،[1] والیەکان لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا لەگەڵ ئەوەی وڵاتەکانیان بەڕێوە بردووە بەرامبەر دوژمنانیش موجاهیدێکی گیان لەسەر دەست بوون، ئەمەش ڕێگری لێ نەکردوون لەو کارانەی کە پێیان سپێردراوە، سەرچاوە مێژووییەکان باس لە گرنگترین کارەکانی والی دەکەن لە پشتیوانی کردنی بزاڤی جیهادی لەوانە:

- ناردنی خۆبەخشان بۆ گۆڕەپانی جیهاد.
- بەرگری کردن لە ولایەت لە دژی دوژمنان.

- قەڵابەدی وڵات و دروست کردنی شورە بۆ شارەکان: عومەر فەرمانی دا بە دروست کردنی قەڵا بۆ ئەو کەسانەی کە شاری جیزەی میسر نیشتەجێ دەبن لە تیرەکانی ئازاد، لە ترسی ئەوەی نەوەك لە ناکاو پەلامار بدرێن.[2]

- شوێن پێ هەڵگرتنی هەواڵی دوژمنان: ئەبو عوبەیدە بەوە بە ناوبانگ بووە کە چاودێری وردی کۆبوونەوەی ڕۆمەکانی کردووە لە وڵاتی شام، ئەبو عوبەیدە(ﷺ) لەسەر بنەمای ئەم هەواڵانە هەڵدەستا بە هەندێ کاری پاشەکشەی ڕووکەشی.[3]

- هاریکاری کردنی ناوچەکان بە ئەسپ: عومەر(ﷺ) سیاسەتێکی گشتی لە دەوڵەتدا دانا بۆ بەدەست هێنانی ئەسپی پێویست بۆ جیهاد لە ناوچە ئیسلامیەکان بەپێی پێویستی ئەو ناوچەیە، عومەر چەند کەسێکی لە بەسرە تەرخان کرد بۆ ئەوەی کە لە زەوی و زارەکانیان هەستن بە بەخێو کردنی ئەسپ ،[4] هەروەها لە شاری دیمەشق چەند پارچە زەویەکی دا بە خەڵکانێك بۆ پەروەردەکردنی ئەسپ بەڵا م ئەوان کردیانە کشتوکاڵ و ئەویش و لێی سەندنەوەو سزای دان بەوەی کە سەرپێچی ئامانجیان کردووە لە پێدانی زەوی کە بریتی بوو لە هاوکاری لە بەخێو کردنی ئەسپ، عومەر لە کوفە چوار هەزار ئەسپی هەبووە کە لە نێو چەند کەسێکی ئەهلی کوفە سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی باهلی لەسەر بەهادار کردبوو کە هەموو ساڵێك پێشبەندەکانی بۆ دروست دەکرد و ڕایدەکێشا، لە شاری بەسرەش نزیکی ئەو ژمارەیە و هەروەها لە هەر ناوچەیەك لە هەشت ناوچەکە ژمارەیەکی نزیك لە

---

١ـ الولاية على البلدان (١/٧١).
٢ـ الولاية على البلدان (١/٧٧).
٣ـ فتوح إبن أعثم (ص: ٢١٥).
٤ـ الولاية على البلدان (٢/٧٤).

ژمارەکەی پێشوو[1] ئەسپ هەبوون و تەواوی ئەم ئەسپانە ئامادەبوون بۆ بەرگری کردنی دەست بەجێ لە دەوڵەتی ئیسلامی.[2]

- ڕاهێنانی لاوان و ئامادەکردنیان بۆ جیهاد: عومەر(ﷺ)نامەی دەنووسی بۆ خەڵکی شارەکان و فەرمانی پێ دەدان کە منداڵەکانیان ڕابهێنن لەسەر سوارچاکی و مەلەوانی و تیرئەندازیی، شام لە کاتی ڕاهێناندا لاوێك تیرێکی بەرکەوت و پاشان مرد، ئەم هەواڵەیان نووسی بۆ عومەر بەڵام ئەو نەوەستا لە ڕاهێنانی منداڵان.[3]

- هاوکاری کردنی دیوانی سەربازی: عومەر(ﷺ) بایەخێکی زۆری داوە بە دیوانی سەربازی شارەکان چونکە بڕوای وابوو کە خەڵکی شارەکان لارن بۆ ڕێککردنی بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە نزیکن لە دوژمنەوە و ئەو ناوچانەش کە بەردەوام پێویستیان بە سەرباز هەیە،[4] بە ڕاستی والی سەر ناوچەکان بەرپرسی ڕاستەوخۆن لەو دیوانە سەربازیانە ئەگەرچی هەندێ فەرمانبەری تر هەن کە ئەرکی گرنگی ئەو دەزگایە بەڕێوە دەبەن، بەڵام بەوەی کە ئەو والیانە خۆیان فەرماندە و سەرکردەی جەنگن ئەوا بەرپرسیارێتیان بەرامبەر بە دیوانی وڵاتەکانیان وەك بەرپرسیارێتی خەلیفە وایە بە سیفەتی ئەوەی کە ئەوان نوێنەری خەلیفەن.[5]

- ڕاپەڕاندنی پەیماننامەکان: هەندێ بەڵێن و پەیماننامە لە نێوان ئەبو عوبەیدە و چەند ناوچەیەکی شامدا بەڕێکران، هەروەها ئەمە حاڵی هەندێ لە سەرکردەکانی عێراق بوو وەك سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبو موسای ئەشعەری و چەند والیەکی تر، والیەکان سەرباری ئەمەش سوور بوون لەسەر پاراستنی مافی زامن کراوان و پەیماننامە کەسایەتی و گشتیەکان، ئەو پەیماننامانەیان بەجێ دەهێنا لە ڕوانگەی چەند فەرمانێکی شەرعیەوە و بە چاودێری پەیمانەکە،[6] عومەر وەسیەتی بۆ بەڵێن دەکرد و دەیفەرموو: وەسێتتنان بۆ دەکەم بە چاکی بەڵێن پێدانی خودا و پێغەمبەرەکەی کە بجەنگن لە دژی ئەوانەی کە لە پشتیانەوەن و لە سەروو توانای خۆیانەوە تەکلیفیان لێ نەکرێت.[7]

## ٤- هەوڵدان لە پێناو دابین کردنی ڕزق و ڕۆزی خەڵکی:

عومەر دەفەرموێت: ئەگەر خوای گەورە سەلامەتم بکات ڕێگە نادەم کە بێوەژنانی عێراق لە دوای من پێویستیان بە هیچ کەسێکی تر بێت، ئێمە هەڵوێستی عومەرمان لە ساڵی سوتەك لەبیر ناچێت، کە هەموو توانایەکانی دەوڵەتی تەرخان کرد بۆ چارەسەری گرفتەکە و تێرکردنی سکە برسیەکان، بەیهەقی لە کتێبی (سنن)ەکەیدا ڕیوایەتی کردووە کە عومەر خەرجی دایە خەڵکی ساڵی سوتەك هەتا

١ـ الولاية على البلدان (٢/٧٤).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة (ص: ٤٨٦).
٤ـ النظم الاسلامية، صبحي صالح (ص: ٤٨٨-٤٩١).
٥ـ الولاية على البلدان (٢/٧٧).
٦ـ الولاية على البلدان (٢/٧٧).
٧ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ١٣٣).

باران باری، پاشان ئەوان ڕۆیشتن، عومەر بە سواری دەرچوو بۆ لایان، بینی ئەوان بە کەژاوەکانیانەوە کۆچ دەکەن، چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسك، پیاوێك کە لە هۆزی مەحاریبی کوڕی خەسقە بوو وتی: من شایەتی دەدەم کە ئەو حەسرەتی تۆی کردووە وە من ڕۆڵەی ئومەتێك نیم کە مەدحی عومەر بکات، عومەریش پێی فەرموو: هاوار بۆ تۆ ئەوەیە ئەگەر تۆ لە سامان و دارایی عومەر یان خەتاب خەرجی بکەیت ئەوا لە ماڵی خودات خەرج کردووە،[1] هەروەها عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: ئەوەی بۆ ئێوە لەسەر من پێویستە ئەوەیە کە هیچ شتێك لەو باجەی ئێوە و ئەو شتانەش کۆ نەکەمەوە کە خوای گەورە وەك دەستکەوت پێی داون مەگەر لە پێناوی ئەودا بێت، ئەوەی بۆ ئێوە لەسەر من پێویستە ئەوەیە ئەگەر شتێکم چنگ کەوت بە هەقی خۆی نەبێت لە دەستم دەرنەچێت هەروەها پێویستە لەسەرم کە إنشاءالله بەخشش و ڕزق و ڕۆزیتان زۆرتر بکەم،[2] دابەشکردنی بەخششەکان لە سەردەمی عومەردا خولگەیەکی ڕێك و پێکی لەخۆ گرتبوو، ئەم کارەش تەنها تایبەت نەبوو بە خەڵکی شارەکانەوە، بەڵکو ئەم کارە هۆز و تیرەکانی دەشتەکیشی دەگرتەوە، عومەر خۆی بە نێو هۆزە نزیکەکانی مەدینەدا دەسورایەوە و خۆی کاڵاکانی پێ دەدان و پەیامی بۆ هەندێ لە والیەکانی دەنوسی کە بەخشش و ڕزق و ڕۆزی ئەو خەڵکە بدەن،عومەر لە پەیامەکەیدا دەینوسی ئەوە ئەو دەستکەوتەیە کە خوای گەورە بەوانی داوە، ئەو دەستکەوتانە موڵکی عومەر و بنەماڵەی عومەر نیە لەبەر ئەوە دابەشی بکە بەسەریاندا،[3] عومەر هەر بە دابین کردنی سامان و داهات بۆ خەڵکی دانەدەکەوت بەڵکو خواردنیشی بۆ دابین دەکردن، لە یەکێك لە سەردانەکانیدا بۆ شام بلالی کوڕی ڕەباح هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران فەرماندەی سوپاکانت لە شام سوێند بە خوا جگە لە کوشتنی باڵندە و نانی پوخت هیچی تر ناخۆن و تەواوی موسڵمانانیش ئەوەیان دەست ناکەوێت، عومەر(رضي الله عنه) پێی فەرموون: ئەوە بلال دەڵێت؟ یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران نرخ و بەهای کاڵا لە وڵاتەکەماندا هەرزانە و منیش بەشێکی ئەوەم کە بلال باسی لێکرد لێرەدا بە وێنەی ئەوەیە کە ئێمە لە حیجاز دەماندایە منداڵەکانی عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: سوێند بە خوا من لێرە ناڕۆم هەتا هەموو مانگێك ڕزق و ڕۆزی موسڵمانانم بۆ زامن نەکەن، پاشان فەرمووی: سەیریکەن چەندی بەسە بۆ تێرکردنی پیاوێك؟ وتیان: دوو گاوانی لەگەڵ دوو هێندە زەیت و دۆشاوەی کە لە سەرەتای هەموو مانگێکدایە ئەوەی بۆ دابین بکەن، پاشان فەرمووی: ئەی موسڵمانینە ئەمە بۆ ئێوەیە جگە لە بەخششەکانتان، ئەگەر سەرکردەکانتان ئەوەی بۆم بڕیونەتەوە وایان پێتان ئەوا هەموو مانگێك وەری دەگرن، ئەمەش کارێکی باشە، ئەگەر ئەم کارەیان بۆ ئەنجام نەدان ئەوا ئاگادارم بکەنەوە هەتا لە کاریان بخەم و کەسانی تر لە شوێنیان بکەمە بەرپرس،[4] عومەر سوور بوو لەسەر فەراهەم هێنانی خۆراك لە وڵاتان و چاودێری بازاڕی دەکرد و ڕێگەی لە کاڵا و کەل و

---

١ـ سنن البيهقي (٣٥٧/٦)، موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ١٣٥).
٢ـ موسوعة فقه عمر بن الخطاب (ص: ١٣٧).
٣ ـ الولاية على البلدان (٧٧/٢).
٤ـ فتوح الشام للأزدي (ص: ٢٥٧)، الولاية على البلدان (٧٨/٢).

پەل شاردنەوە دەگرت، هەروەها والیەکانی عومەر هەڵدەستان بە ئەنجامدانی کاری گرنگی خۆیان لە چاودێری کردنی بازاڕەکان، هەروەها فەرمانی دەدا بەسەر بازرگانەکاندا کە بە نێو کەلوەکاندا بگەڕێنو شمەك بۆ موسڵمانان بهێنن و بێ نیاز بن لە باژێرەکانیان،[١] عومەر و والیەکانی هەر بە دابینکردنی خۆراك و چاودێری کردنی باژێرەوە نەدەوەستان، بەڵکو شوێنی نیشتەجێ بوون و دابەشکردنی لە کاری گرنگی ئەو کەسانە بوو کە وەکالەت درابوویە پاڵ کارەکانیان لە سەرکردایەتی کردنی وڵاتاندا، لە کاتی دامەزراندنی شارەکان و نەخشەسازیاندا عومەر زەوی دابەش دەکرد بەسەر خەڵکانی دانیشتوی هەردوو شاری بەسرە و کوفە[٢] و فستاتدا هەروەها ئەو فەرماندانە سەرپەرشتی دابەش کردنی ماڵەکانی شارە ئازادکراوەکانیان دەکرد، حەمص و دیمەشق و ئەسکەندەریە و ئەوانی ترش.[٣]

## ٥- دامەزراندنی کاربەدەستان و فەرمانبەران:

بە ڕاستی دامەزراندنی کاربەدەستان و فەرمانبەران لەو کارانە بوو کە دەدرایە پاڵ والی و لە زۆربەی کاتەکاندا کاری گرنگی والی بوو بە جۆرێك ولایەت لە زۆربەی حالەتەکاندا لە ناوچەیەکی سەرەکی و چەند ناوچە و هەرێمێکی تر سەر بەو ولایەتە پێك بینی، کە پێویستی بە ڕێکخستنی کارەکانی هەیە وە والیەکان لە شێوەی خۆیان چەندین کاربەدەست و فەرمانبەریان لەو ناوچانەدا دامەزراندا، ئەگەرچی لە ئاستی سەرکردەکاندا یان کاربەدەستانی باج وەرگر بن، زۆرجار ئەم دامەزرانە بە هاودەنگی نێوان خەلیفە و والی تەواو دەبێت.[٤]

## ٦- سایەداری بەڵێن پێدراوان:

سایەداری بەڵێن پێدراوان و ڕێزگرتنی پەیمانەکانیان و هەستان بە ڕاپەڕندنی مافە شەرعیەکانیان و داخوازیەکانیان بەوەی لەسەریانە بۆ موسڵمانان لە ئەرك و بە دواداچوونی بارودۆخیان، وەرگرتنی ماف لەو کەسەی کە ستەمیان لێ دەکات بە سەرچاوەگرتن لە فەرمانە شەرعیەکان لەم بوارەدا لە ئەرکەکانی والیە، زۆرجار خەلیفەکان پێش ئەوەی کە ئاشتەوایی لەگەڵ بەڵێن پێدراواندا ئەنجام بدەن چەند مەرجێکیان لەسەر دادەنان، پاشتر تەواوی مافەکانیان بۆ دەستەبەر دەکردن و ئەوانیش لەسەریان بوو کە پابەند بن بەو مەرجانەوە.[٥]

## ٧- ڕاوێژی خاوەن ڕاکان لە ولایەتەکەیدا و ڕێگرتنی ئارەزوەکانی خەڵکی:

عومەر(ﷺ) جەختی لە والیەکانی دەکردەوە کە ڕاوێژ بە خاوەن ڕای وڵاتەکەیان بکەن، والیەکانیش ئەم کارەیان بەجێ دەهێنا و چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەیان دەبەست بۆ وەرگرتنی ڕاکانیان،

---

١ـ تأريخ المدينة (٧٤٩/٢).
٢ـ الولاية على البلدان (٧٩/٢).
٣ـ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ١٤٣، ٢٢٤).
٤ـ الولاية على البلدان (٨٠/٢).
٥ـ هەمان سەرچاوە.

هەروەها عومەر فەرمانی دەدایە والیەکانی کە بەردەوام بن لەسەر ڕاوێژکردن بە خاوەن ڕایەکان،[1] داوای لێ دەکردن کە خەڵکی لە شوێنی خۆیاندا دابنێن، عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی: هەواڵم پێ گەیشتووە بانگ بۆ خەڵکێکی زۆر و فرە دەدەیت، ئەگەر ئەم پەیامەی منت پێ گەیشت بانگ بە خەڵکی بەڕێز و قورئان خوێن و لە خواترس و دیندار بدە، عومەر وشێنی خۆیان گرت ئەوا بانگ بۆ تەواوی خەڵکی بدە، هەروەها نامەیەکی تری بۆ نووسی: تا ئێستا خەڵکی ئارەزوویەکیان نیە و پێویستیەکانی خەڵکی بەرز دەکەنەوە، ڕێزی ئارەزووەکانی خەڵکی بگرن، ئەوا بە پێی موسڵمانی لاوازە ئەگەر دادبکرێن لە سزا و دابەش کردندا.[2]

## ٨- تێڕوانین بۆ پێویستیەکانی ولایەتی ئاوەدانی:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هەستا بە هەڵکەندنی جۆگەیەك لە ولایەتەکەیدا لەسەر بنەمای داخوازی هەندێ لە گەورە فارسەکان بۆ بەرژەوەندی کشتیاران لەو ناوچەیەدا،[3] هەروەها عومەر نامەییەکی نووسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری و تیایدا فەرمانی پێدا بە هەڵکەندنی جۆگەلە ئاوێك بۆ خەڵکی بەسرە، ئەبو موساش هەستا بە هەڵکەندنی جۆگەلەکە بە درێژایی چوار فەرسەخ هەتا بتوانێت ئاو بۆ دانیشتوانی بەسرە ئامادە بکات،[4] هەروەها والیەکانی عومەر(ﷺ) لە کاتی دامەزراندنی شارە بە ناوبانگەکانی کوفە و بەسرە و فستات بە نەخشەسازی ڕێگەوبانەکان و دابەشکردنی زەوی و زار و دروست کردنی مزگەوت و دابین کردنی ئاو، جگە لەمەش لە بەرژەوەندی گشتی بۆ ئەم شارانە، هەروەها والیەکان بایەخیان دەدا بە نیشتەجێ کردنی دانیشتوانان لەو ناوچانەی کە ئارەزوویان تیایدا نەبووە بۆ نزیکی لە دوژمن یان هەر هۆیەکی تر بێت و والیەکان ئەو شتانەیان پێشکەش دەکردن کە پێی لەخۆیایی دەبوون و زەوی و زاریان دەدانێ وەك هاندانێك بۆ مانەوەیان تیایدا، عومەر و عوسمان لە ئەنتاکیە و هەندێ وڵاتی جەزیرەدا ئەم کارەیان کرد.

## ٩- لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی دانیشتوانی ولایەتەکان:

هەر شاند و ڕەوەندێك بهاتایە بۆ لای عومەر (ﷺ) ئەویش پرسیاری والی لێدەکردن، دەیفەرموو: ئایا سەردانی نەخۆشەکانتان دەکات؟ ئەوانیش دەیان وت: بەڵێ، عومەر دەیفەرموو: ئایا سەردانی کۆیلە دەکات؟ دەیان وت: بەڵێ، پاشان عومەر دەیفەرموو: لەگەڵ بێ دەسەڵاتاندا چۆنە؟ ئایا لەبەر دەرگای دادەنیشن؟ ئەگەر بۆ سیفەتێکی بیان وتایە نەخێر ئەوا لە کار لای دەبرد،[1] عومەر کاربەدەستێکی لە کار لادەبرد ئەگەر هەواڵی پێ بگەیشتایە کە سەردانی نەخۆش ناکات و کەسانی بێ دەسەڵات ناچنە لای،[2] هەروەها عومەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە کاربەدەستانی بە ڕووکارێکی

---

١ـ نصيحة الملوك للماوردي(ص: ٢٠٧)، موسوعة فقه عمر (ص: ١٣٤).
٢ـ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٢٧٣)، الولاية على البلدان (٨٧٢).
٣ـ فتوح البلدان للبلاذري (ص: ٣٥١-٣٥٢).
٤ـ الولاية على البلدان (٨٢/٢).

سادەوە لە نێو خەڵکیدا بن تا هەست بەوە بکەن کە والیەکەیان لە خۆیانە و خۆیان لە خەڵکی جیاناکەنەوە، عومەر لەسەر کاربەدەستانی دەکردە مەرج کە سواری و جل و بەرگیان هاوشێوەی سواری و جل و بەرگی خەڵکی بێت، هەروەها عومەر ڕێگری لێ دەکردن لە ڕوپۆشی و دەرگا گرتن.[٣]

## ١٠- جیاوازی نەکردن لە نێوان عەرەب و کەسانی تر:

لەسەر والیەکان پێویست بوو هەستن بە بەرپاکردنی یەکسانی لە نێوان خەڵکی و جیاوازی لە نێوان کەسێکی عەرەب و کەسێکی تردا نەکەن لە موسڵمانان، گەل و نەتەوەیەك هاتن بۆ لای یەکێك لە والیەکانی عومەر، ئەویش خەڵاتی عەرەبەکانی کرد و لەوانی تر ئەگەرا، عومەر لەم بارەیەوە نامەیەکی بۆ نووسی: ئەوە لە کارە خراپەکانە کە موسڵمان برای خۆی بە کەم بزانێت وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، کە عومەر(ﷺ) بۆی نووسیووە: ئایا یەکسان بوویت لە نێوانیاندا،هەروەها چەندین ئەرکی ئەخلاقیانەی تر هەن کە ئیسلام فەرمانی بە پابەند بوونیان داوە وەك پەیمان پارێزی و دڵسۆزی مرۆڤ لە کارەکەی و بە چاودێر دانانی خوای گەورە لە هەموو ئەو کارانەی کە پێی هەڵدەستێ، ئامادە باشی بۆ هاریکاری کردن لەگەڵ تەواوی گروپەکاندا لە کاری چاکە و لە خوا ترسان، و پێویست بوونی ئامۆژگاریەکان بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و ئومەتی موسڵمانان و بە گشتیش، دیارە ئەمە بێگومان دەبێتە هۆی چاکسازی گروپەکان،[٤] هەروەها لە سەرووی ئەمەوە پێویستە والی ئەمانە لە ولایەتەکەیدا لە نێوان خەڵکیدا بڵاو بکاتەوە لە میانی وتارەکانی و پەرتووك و ئامۆژگاری و هەڵسوکەوتەکانیدا، والیەکان لە سەردەمی ڕاشیدیندا — بە سیفەتی کۆیان — نموونەیەکی باش بوون بۆ ئەم ئەخلاقیات و ئەرکانە ئەگەرچی لە کەسایەتیان یان تایبەتمەندیەکانیان وە یان ڕەفتاری گشتیان بێت لەگەڵ خەڵکیدا.[٥]

## پێنجەم: وەرگێڕان لە ولایەتەکاندا، کاتەکانی کار لای والی:

### ١. وەرگێڕان لە ولایەت:

کاری وەرگێڕی دادەنرێت بە یەکێك لە پیشە هاوکارەکان بۆ والی شارەکان لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیدا و پێویستەیەکی تەواو ڕوون و لەبەر چاو بوو بۆیان، لە زۆربەی کاتەکاندا، عومەر داوای لە والیەکانی کرد لە عێراق کە لە شاردا چەند کەسانێکی فارس بنێرن هەتا سەبارەت بە گرفتەکانی باج لەگەڵیان ڕێك بکەوێ ئەوانیش ئەو کەسانە و وەرگێڕێکیان لەگەڵدا ناردن،[٦] موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە، کە خۆی شتێکی لە زمانی فارسی زانیووە و لە مەدینە بۆتە وەرگێڕی

---

١ـ الولاية على البلدان (٢/٨٢).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة (ص: ٥٢٣).
٤ـ النظريات السياسية الاسلامية، محمد ضياء الريس (ص: ٣٠٧-٣٠٨).
٥ـ الولاية على البلدان (٢/٨٥).
٦ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ٤٠-٤١)، الولاية على البلدان (٢/١٠٥).

نێوان عومەر و هورمزان.[١]

بەڕاستی کاری وەرگێڕان شتێکی دیار و لەبەرچاو بووە لە دەوڵەتی ئیسلامی بە گشتی و لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین، ئەگەر زانیمان کە دیوانەکانی باج بە زمانی عەرەبی نەبوون، ئەوا ئێمە مەودای پێویستیمان بۆ بوونی چەند وەرگێڕێك لە ولایەتەکاندا دەزانین کە کاری وەرگێڕی لە گرفتەکانی باج و چەند شتێکی تردا دەگرنە دەست بە تایبەتی کە کاربەدەستە سەرەکیەکانی سەر باج بەپلەی یەکەم عەرەب نەبوون، هەروەها بڵاو بوونەوەی ئاوارە و ئەوانەی کە تازە هاتبوونە نێو ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە وڵاتە جیاجیاکانی ئیسلامدا کارێکی وای کردبوو کە پێویست بوونی کاری وەرگێڕان گرنگیەکی زۆر گەورە بوو لە زۆرێك لەو کارانەی کە پەیوەست بوون بە کاری دادوەری و کارەکانی تر، هەروەها دانووستانەکانی نێوان سەرکردە ڕزگاریخوازەکان کە ئەوان بە زۆری لە والیەکان و نێوان خەڵکی ناوچە ڕزگارکراوەکان بوون پێویستی بە بوونی وەرگێڕ هەبوو.[٢]

## ٢. کاتەکانی کاری والی:

لە سەردەمی عومەردا کار بەکات نەبوە ، چ خەلیفە و چ والیەکانیش هەموو کاتێك کاریان کردووە، هیچ پشویەکیان نەبوو، تەنانەت هەندێکیان بە شەو ئەگەراون بە نێو کۆڵانەکانی شاردا و پێشەنگیشیان لەم کارەدا عومەری کوڕی خەتاب بووە لە شەو ئەگەران و بەسەرکردنەوەی شار وە خەڵکی لە کاتە جۆراوجۆر و جیاوازەکاندا بۆ ڕاپەڕاندنی کاری پێویستی خۆیان دەچوون لای والیەکان و کەسێك نەبوو لەم بوارەدا ڕێگریان لێ بکات لەوەی کە بچنە ژورەوە بۆ لای والی بە بیانووی ئەوەی کە ئەمە کاتی کارکردن نیە، هەروەها والیەکان بەناوبانگ بوون بە سووربوونیان لەسەر فەراهەم هێنانی یەك بە یەکی کارەکان و دوانەخستنی، عومەری کوڕی خەتاب لەم بوارەدا نامەیەکی بۆ ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) نووسی کە تیایدا فەرمووی: کاری ئەمڕۆ دوا مەخە بۆ سبەی چونکە کارەکان بە سەرتا دەکەون، تۆش تیا دەچیت، بۆ خەڵکیش کەسانێك هەن لە دەسەڵاتیاندا پەنا بە خودا ئەگەر هەست بە منیش و ئێوەش بکات کە ناڵە و هاواریان هەڵگیراوە و دونیا کاری تێکردوون ئارەزووەکانیان شوێن پێ هەڵگیراوە.[٣]

---

١ـ هەمان سەرچاوە.

٢ـ الولاية على البلدان (٢/١٠٤).

٣ـ مناقب أمير المؤمنين لأبن الجوزي (ص: ١٢٩).

# دوانگەی سێیەم

## یەکەم: بە دواداچوونی کاری والیەکان و لێپرسینەوەی عومەر بۆیان

### ١- بە دواداچوونی کاری والی:

عومەر(ﷺ) قایل نەبوو بەوەی کە بایەخ بە هەڵبژاردنی باشترین کاربەدەستانی بدات بەڵکو تەواوی هەوڵی خۆی دەخستە گەڕ بۆ بەدواداچوونی کارەکانیان پاش ئەوەی ئەو کارانەیان پێ دەسپێردرا تا دڵنیا بێت لە باشی ژیانیان و ترسان لەوەی کە نەفسیان زاڵ لبێت بەسەریانداو لایان بدات ، هەموو مەبەستێکی عومەر ئەوە بوو دەیفەرموو: باشتر وایە کە من هەموو ڕۆژێك والیەك لە کار لابەم بخەم نەك ستەمکارێك ماوەی یەك کاتژمێرلەپۆستەکەی بهێڵمەوە،[1] هەروەها دەیفەرموو: هەر کاربەدەستێکم ستەمێك بکات و کەسێك ستەمەکەیم پێ بگەیەنێت ئەوا دەیگۆڕم بە کەسێکی تر، من ستەمم لێ کردووە،[2] ڕۆژێك بەوانەی دەوروپشتی خۆی فەرموو: ئایا دیوتانە ئەگەر من کەسێکم لەسەر ئێوە کردە کاربەدەست و باشتر بوو لەوەی کە من دەیزانم پاشان فەرمانم پێداوە بە ماف پەروەری، ئایا من ئەوەی کە لەسەرمە بەجێم هێناوە؟ وتیان: بەڵێ، عومەر فەرمووی: نەخێر هەتا سەیری کارەکەی دەکەم، ئایا کاری بەوە کردووە کە فەرمانم پێ کردووە یا نا؟[3]، عومەر(ﷺ) زۆر بە وریایی چاودێری کاربەدەستانی و ئەوانەی دەوروبەری دەکرد، شێوازی عومەر لە بەڕێوەبردندا پێدانی سەربەخۆیی بووە بۆ کاربەدەستانی لە کاروبارە ناوخۆییەکانی و پابەند بوونی لە گرفتە گشتیەکاندا و چاودێری کردنی لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا، عومەر دەزگای نهێنی هەبوو بۆ چاودێری کردنی بارودۆخی والی و خەڵکەکەی، ئەوەی کە سەرچاوە مێژووییەکان بۆمانی روون دەکەنەوە ئەو کارە لە شێوەی (هەواڵگری) ئەمڕۆ بووە کە لای عومەر هەبووە وە زانیاری بە عومەر گەیاندوە، وەك ئەوەی هەمیشە ئیمام عومەر لەوێ بوبێت ، عومەر لە هیچ وڵاتێك کاربەدەستێك یان فەرماندەی سوپایەکی دانەناوە کە چاودێری نەکردبێت، هەموو هەواڵەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا سپێدە و ئێواران لە لای بوون، ئەمەش لە پەیامەکانیدا بۆ کاربەدەستانی بەدی دەکرێت هەتا کاربەدەستەکانیان بایەخی

---

١ـ النظم الاسلامية، صبحي الصالح (ص: ٨٩)، الادارة الاسلامية (٢١٥).
٢ـ مناقب أمير المؤمنين لأبن الجوزي (ص: ٥٦)، الادارة الاسلامية (٢١٥).
٣ـ الادارة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب (٢١٥).

دەدایە نزیکترین و تایبەتی ترینیان،[1] هۆکارەکانی عومەر بۆ بە دواداچوونی کاربەدەستانی زۆر بوون لەوانە:

### ١- داوای لە والیەکان دەکرد کە بە ڕۆژ بێنە نێو مەدینەوە:

عومەر(ﷺ) داوای لەو والیانە دەکرد کە دێن بۆ مەدینە بە ڕۆژ بێنە ناو شارەوە، بە شەو نەیەن، هەتا ئەو سامان و دەستکەوتانەیان دەربکەوێت کە پێی هاتوون و ئەمەش پرسیار و لێپرسینەوە ئاسان دەکات.[2]

### ٢- داواکردنی شاندەکان لە والی:

عومەر(ﷺ) داوای لە والیەکان دەکرد کە شاند و ڕەوەندی وڵاتەکەیانی بۆ بنێرن تا دەربارەی وڵاتەکەیان پرسیاریان لێ بکات، لەگەڵ ئەو باجەی کە لێیان وەردەگیرێت تا دڵنیا بێت لەوەی کە ستەمیان لێ ناکرێت، هەروەها داوای شایەتی لێ دەکردن و لەگەڵ باج کۆکەرەوەی کوفەش (١٠) کەسی لە کەس و کارەکەی چوونە دەرەوە، لەگەڵ باج کۆکەرەوەی بەسرەش بە هەمان شێوە، ئەگەر لەبەر دەمیدا ئامادە بوونایە ، خودایان دەکردە شاهێد کە ئەوە ماڵێکی حەڵاڵە، ناهەقی و ستەمی موسڵمانانی تێدا نیە،[3] وە ئەم ڕایکردنەش زامنکار بووەو ڕێگری لە والیەکان کردوە لەوەی ستەم لە خەڵکی بکەن ، ئەگەر ئەمە ڕووی بدایە ئەوا ئەو شاندانەی کە دەهاتن بۆ لای ئەمیری باوەڕداران هەواڵیان پێ دەدا، عومەر بە زۆری هەڵدەستا بە ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ ئەو شاندانە و پرسیاری لێ دەکردن دەربارەی وڵاتەکانیان و والیەکانیان و ڕەفتاری والیەکان لەگەڵیاندا.[4]

### ٣- نامەکانی پۆستە:

عومەر(ﷺ) نامەی پۆست دەکرد بۆ والیەکان لە ناوچەکاندا و فەرمانی دەدا بە پۆستەچی کە لە کاتی گەڕانەوەیدا جاڕ بدات کێ نامەی هەیە بۆ ئەمیری باوەڕداران؟ تا بۆی بگەیەنێت بەبێ هیچ دەست تێوەردانێکی والی وڵات، تەنانەت پۆستەچیش هیچ شتێکی لە ناوەڕۆکی ئەو پەیامانە نەدەزانی، پاشانیش بوار ئاوەڵا بوو لە بەردەم خەڵکیدا بۆ بەرزکردنەوەی هەر سکاڵا و ستەمێك بۆ خوێنی عومەر بەبێ ئاگاداری والی ، کاتێك کە پۆستەچی دەگەیشتە لای عومەر هەموو ئەو نووسراوانەی کە پێی بوو بڵاوی دەکردنەوە و عومەر دەیخوێندنەوە هەتا بزانێ چیان تێدایە.[5]

---

١ـ التاج في أخلاق الملوك (ص: ١٦٨).
٢ـ فن الحكم (ص: ١٧٤).
٣ـ الخراج لأبي يوسف (ص: ١٢٤)، الولاية على البلدان (١٥٧/٢).
٤ـ الولاية على البلدان (١٥٧/٢).
٥ـ تأريخ الطبري (٧٦١/٢).

## ٤- لێکۆڵەری گشتی – محمد کوڕی مەسلمە -:

محمدی کوڕی مەسلمەی ئەنصاری ئەو کەسە بوو عومەر پشتی پێ دەبەست لە بە دواداچوونی کاری والیەکان و لێپرسینەوەیان و دڵنیا بوون لەو سکالاّیانەی لە دژیان بینی، شوێنی محمد کوڕی موسلمە لە دەوڵەتی خەلافەتدا وەك لێکۆڵەرێکی گشتی بوو، پشکنینی بۆ ڕاستی بەجێ هێنانی کاری والیەکان دەکرد و لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەوەیاندا دەکرد کە کەمتەرخەمە، عومەر چەندین جار ناردوویتی بۆ بەدواداچوونی کاری والیە گەورەکان و لێپرسینەوەیان،[1] لێکۆڵینەوە لە سکالاّکان و بینینی خەڵکی و گوێگرتن لێیان و گواستنەوەی ڕاو بۆچوونەکانیان ڕاستەوخۆ لە والیەکانەوە بۆ عومەر، محمدی کوڕی موسلمە چەند کەسێکی وەك هاوکار لەگەڵدا بوو.

## ٥- وەرزی حەجکردن:

وەرزی حەجکردن هەلێکی باش بوو بۆ ئەوەی عومەر بە هۆیەوە هەواڵی خەڵکەکەی لێوە دەست بکەوێت، عومەر ئەم وەرزەی تەرخان دەکرد بۆ پێداچوونەوە و بە ئاگابوونی تەواوی ناوچەکان، سکالاّچیان کۆدەبوونەوە، تەواوی ئەو کەسانەش دەهاتن کە عومەر لەم پەڕ و لەوپەڕی دەوڵەتەکەیدا دایدەنان بۆ چاودێری کردنی کاری والی و کاربەدەستانی، کاربەدەستانیش بە خۆیان دەهاتن بۆ ئاشکرا کردنی هەژمار لە کارەکانیاندا، وەرزی حەجکردن کۆمەڵ بوونێکی گشتی بوو وەك دیارترین ئەو کۆمەڵگە گشتیانەی کە لە یەکێك لە سەردەمەکاندا[2] دەردەکەون، عومەر لە وەرزی حەجکردندا پوختەی کاری کاربەدەستانی لەبەردەم خەڵکیدا دەخستە ڕوو پاشان دەیفەرموو: هەر کەس جگە لەمە کارێکی پێ کراوە با هەستێتە سەر پێ، لە خەڵکانی ئەو وەرزە تا ئەو دەمە کەسێك هەڵنەستابووە سەرپێ جگە لە پیاوێك ـ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر داد پەروەری ئەو والیانە و ڕازی بوونی خەڵکی لێیان ـ ئەو پیاوەش وتی: فڵانە کاربەدەست سەد قامچی لێداوم، عومەر پرسیاری لە کاربەدەستەکەی کرد بەلاّم وەلاّمی پێ نەبوو، لەبەر ئەوە بە پیاوەکەی وت: هەستە تۆڵەی لێ بکەرەوە، لەم کاتەدا عەمری کوڕی عاص هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر تۆ ئەمە بکەیت دەبێتە سونەتێك کە ئەوانەی دوای تۆ کاری پێ دەکەن، عومەر فەرمووی: من خۆم کۆت ناکەم ـ واتا تۆڵە دەکەمەوە ـ ئایا تۆ پێغەمبەرت(ﷺ)بینیووە کە خۆی کۆت بکات؟ لەم کاتەدا عەمر فەرمووی لێمان گەڕێ با ڕازی بکەین، عومەر فەرمووی: ڕازی بکەن، پاشان (٢٠٠) دینار لە کاربەدەستەکە وەرگیرا بۆ ئەو پیاوە، واتا هەر قامچیەك کەوتە دوو دینار.[3]

## ٦- گەشتێکی پشکنەری بەسەر هەرێمەکاندا:

عومەر پێش شەهید بوونی بیرۆکەی ئەوەی هەبوو خۆی بەسەر ولایەتەکاندا بگەرێت بۆ چاودێری کردنی کاربەدەستەکانی و بەسەرکردنەوەی حاڵی خەڵکی، دڵنیا بوون لە کاروباری هەرێمەکان، عومەر

---

١ـ الانصار في العهد الراشدي (ص: ١٢٣-١٢٦).
٢ـ عبقرية عمر للعقاد (ص: ٨٢)، الدولة الاسلامية، د. حمدي شاهين (ص: ١٣٨).
٣ـ الطبقاتا لإبن سعد (٢٢٢/٣).

فەرمووی: ئەگەر نەمردم (إنشاء الله) یەك سووڕ دەگەڕێم بە نێو خەڵکیدا، چونکە من دەزانم کەسانێك پێویستیان بەمن هەیە ، کاربەدەستانیشیان ڕەوانەی لای منیان ناکەن وە یان خۆیان دەستیان نامگاتێ، دەڕۆم بۆ دورگەی عەرەب و دوو مانگ تیایدا دەمێنمەوە، پاشان دەڕۆم بۆ کوفە و دوو مانگ تیایدا دەمێنمەوە و دواتر دەچمە بەسرە و دوو مانگ تیایدا دەمێنمەوە، ئەمە باشترین گەشتە بۆ من،[1] عومەر شتێك لەم کارەی ڕاپەڕاند بە تایبەتی لە شامدا کە چەندین جار ڕۆیشت بۆشام و باروودۆخی ناوچەکەی بەسەردەکردەوە و دەچوویە ماڵی والی و سەرکردەکانی،[2] هەتا بە چڕی لە باروودۆخیان ئاگادار بێت، عومەر چوویە ماڵی ئەبوعوبەیدە و حاڵی ئەبو عوبەیدە و دەست گرتنەوەی بە دونیا بە چاوی خۆی بینی و لە نێوان عومەر و خێزانی ئەبو عوبەیدەدا گفتوگۆیەك ڕوویدا و خێزانی ئەبو عوبەیدە لۆمەی عومەری کرد بە هۆی ئەو ژیانە نارەحەت و سەختەی کە تیایدا دەژین، هەروەها عومەر سەردانی ماڵی خالدی کوڕی وەلیبینی کرد و هیچی لە لای ئەو بەرچاو نەکەوت جگە لەو چەکەی کە خالید سەرقاڵی چاککردنی بوو، عومەر لە کاتی ئەم سەردانانەیدا بە شێوەیەکی کت و پڕ دەچوویە ژوورەوە ئەوە نەبێت کە پیاوێکی لەگەڵ بوو دەیدا لە دەرگا و داوای مۆڵەتی لە والی دەکرد بۆ خۆی و هاوەڵەکەی بەبێ ئەوەی والی بزانێت ئەم هاوەڵە عومەرە، کاتێك عومەر دەچوویە ژوورەوە بۆ ئەو ماڵە دەست بەجێ هەڵدەستا بە بەسەرکردنەوەی کاڵاکانی ناوی و بە ئاگا بوون لەوەی کە لەو ماڵەدایە لە کەلوپەل و شمەك،[3] عومەر گوێی لێ بوو کە یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان هەموو شتێك لە خواردنیدا هەیە، عومەر(ﷺ) چاوەڕوانی کرد تا کاتی نانی شێوان هات، داوای مۆڵەتی لە یەزید کرد، کاتێك کە خواردنەکەی بینی ڕێگری لێ کرد لە زیادەخۆری،[4] عومەر هەر بەوەوە نەدەوەستا کە لە ڕێگەی ئەم جۆرە سەردانانەوە چاودێری بکات، بەڵکو چەندین ڕێگەی تری بەکاردەهێنا، لەوانە ناردنی بڕێك لە سامان و دارایی بۆ والیەکان و ناردنی کەسێك بۆ چاودێری کردنیان تا بزانێت چۆن هەڵسوکەوتی تێدا دەکەن. عومەر(٥٠٠) دیناری نارد بۆ ئەبو عوبەیدە ئەویش هەموی دابەش کرد، لەم کاتەدا خێزانەکەی ئەبو عوبەیدە وتی: سوێند بە خوا هاتنی ئەم دینارانە زیانەکەی لەسەر ئێمە لە سوودەکەی زۆرترە، پاشان ئەبو عوبەیدە پەنای برد بۆ دروست کردنی پۆشاکێك کە ئێمە نوێژمان تیا دەکرد ئەو درزی تێ دەکرد، پاشان ئارامی لەسەر دەگرت لەو دینارە زێڕانەوە دەینارد بۆ هەژاران، دابەشی دەکرد بە سەریاندا هەتا تەواو دەبوو،[5] عومەر لە کاتی سەردانەکەی بۆ شام هەمان کاری بە والیەکان کرد، بەڵام عومەر هەر بەوە نەوەستا کە لە سەفەرەکەیدا چاودێریان بکات، بەڵکو بانگی دەکردن بۆ مەدینە و پاشان کەسێکی دەکردە چاودێر لەسەر خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگیان، هەروەها ئەمەشی لەگەڵ خوبینی خۆی دەکرد.[6]

---

١ـ تأريخ الطبري (١٨/٥)، الولاية على البلدان (١٦١/١).
٢ـ الولاية على البلدان (١٦١/١).
٣ـ تأريخ المدينة (٨٣٧/٣).
٤ـ الولاية على البلدان (١٦٢/١).
٥ـ تأريخ المدينة (٨٣٧/٣).
٦ـ الولاية على البلدان (١٦٢/١).

### ٧- دۆسیە تایبەتیەکان بە کاری خیلافەتەوە:

عومەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر پاراستنی ئەو نوسراوانەی کە تایبەت بوون بە ولایەت و کاروباری خەلافەتەوە بە گشتی، زیاتر سوور بوو لەسەر پاراستنی ئەو بەیاننامە و ڕێککەوتنانەی کە والیەکان لەگەڵ خەڵکی ناوچە ئازادکراوەکان بۆ بەرگرتن لە جەور و ستەم گرێیان دەدا، وا هاتووە عومەر داراسێکی هەبووە کە هەموو ئەو ڕێککەوتنانەی تێدابووە کە لە نێوان خۆی و بەرامبەرەکانیدا مۆرکرابێت، لێرەدا دەتوانین ناوی ئەو داراسە بە (دۆسیە) یان خولاوی تایبەت بە کاری خەلافەت ناوزەد بکەین، ڕەنگە والیەکانیش نووسراو و نامەکانی خۆیان ئەگەرانەوە بۆ لای لە کاتی پێویستدا پاراستبێت تا کارەکان لەسەریان نەشاردرێتەوە.[١]

### دووەم: سکاڵای خەڵکی لە دژی والی:

عومەر(ﷺ) خۆی لە سکاڵای خەڵکی لە دژی والیەکانیان دەکۆڵیەوە و سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو سکاڵایە بگەیەنێتە ئاکام ولومەشدا ڕاوێژی بەهاوەڵان و ئەوانی کە لە دەوروبەری بوون دەکرد ، پاشان عومەر هەڵوێستی وەردەگرت بەرامبەر شکات لێکراوان بە پاداشت و سزا بەسەر ئەو کەسەی کە شایستەیە ئیتر ئەو کەسە کاربەدەست بوایە یان خەڵکی تر،[٢] ئەمەش هەندێ سکاڵایە لە دژی والیەکان و چۆنیەتی هەڵوێست وەرگرتنی عومەر(ﷺ):

### ١- سکاڵای خەڵکی کوفە لە دژی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ):

کۆمەڵێك لە خەڵکی کوفە بە سەرپەرشتی جەڕاحی کوڕی سنانی ئەسەبینی کۆبوونەوە بۆ سکاڵا تۆمارکردن لە دژی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە لای عومەر ئەمیری باوەڕداران، ئەم کارەش لە کاتی کۆبوونەوەی مەجووسەکان بوو لە نەهاوەند بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانان، ئەم کۆمەڵەیە چاویان لەوە نەبوو کە موسڵمانان لە چ هەلو مەرجێکدان ، سەعد پیاوێکی داد پەروەر و بەخشندە بوو بەرامبەر خەڵکی ، بەهێز و توانا بوو لە بەرامبەر کەسانی نارەوا و گێرەشێوێندا، بەسۆز بووە بەرامبەر کەسانی ڕەوا و راسترەودا ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کۆمەڵە لێ ی بەدەنگ هاتن ، دەیان ویست شتێك لە ئارەزووەکانیان بەدی بهێنن، بۆ سکاڵاکەشیان کاتێکیان دیاری کرد کە بینیان باشترین کاتە بۆ ئەوەی کە ئەمیری باوەڕداران گوێیان لێ بگرێت بە جۆرێ موسڵمانان بە دەم جەنگێکی چارەنووس سازەوە دەڕۆیشتن کە پێویستی بە هاودەنگی وتەی موسڵمانان و هاریکاریان بوو ، بە جۆرێکیش ئەوان کاریان دەکردە سەر بایەخی گەورەی عومەر بە کۆکردنەوەی دەنگی هەمیشەیی موسڵمانان، بە تایبەتی لەم جۆرە هەل و مەرجەدا، ئەم دەستە و تاقمە ئومێدەوار بون ئەمە مایەی سەرکەوتن و تێر کردنی ئارەزووەکانیان بێت ، عومەر لەگەڵ ئەوەی کە زانی ئەمانە خەڵکانی خراپ و هەل پەرستن چوو

---

١ـ الولاية على البلدان (١/١٦٣).
٢ـ الادارة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب (٢٢٣).

بە دەم سکاڵاکەیانەوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر کرد، عومەر باوەڕی خۆی دەربارەیان لێ نەشاردنەوە بەڵکو بە ڕاشکاوی بەوە ئاگاداری کردنەوە، بۆشی ڕوون کردنەوە کە باوەڕی وایە ئەم سکاڵانەیان ستەمە لە والی و بەهەڵدا چون ، ڕێنمایی کردن لەسەر خراپی مەبەست و خراپی کاتەکەیان بە جۆرێ پێی فەرموون: چاکترین بەڵگە لەسەر ناراستی دەعواکەتان دیاری کردنی ئەم کاتە ناسکەیە، کە دوژمنی ئامادە کردوە هێرش بکات، سوێند بە خوا ئەمەش نابێتە بەربەست لەبەردەم وەڵامدانەوەی سکاڵاکەتان،[1] پاشان عومەر(ﷺ) محمدی کوڕی مەسلمەی نارد و خەڵکی لە خۆ ئامادەکردندا بوون بۆ عەجەمەکان و ئەوانیش لە خۆکۆکردنەوەدا بوون، محمدی کوڕی مەسلمە هاوەڵی ئەو کاربەدەستە بوو کە شوێن پێی ئەو کەسەی هەڵدەگرت کە لە سەردەمی عومەردا شکایەتی لێ دەکرا، محمد ڕۆیشت بۆ لای سەعد، تا بەنێو خەڵکی کوفەدا بیگێڕێت، شاندەکانیش لە خەڵکی شارەکان بۆ نەهاوەند دەیاندا بەسەریاندا، سەعد محمدی بەسەر مزگەوتەکانی کوفەدا گێڕا، بەدزی دوو بە دووی بۆی نەدەپرسی بلکو بەئاشکراو لەناو مزگەوتەکاندا پرسیاری بۆ دەکرد ، چونکە ئەو دەمە پەنامەکی و کار کردن و بۆ پرسین بە دزیەوە باوی نەبوو.[2]

ئەم ڕوداوەش ڕونکەرەوەی پەیڕەوی هاوەڵانە لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ ژێر دەستان و فبقهی خیلاف لەسەر بابەت و مەسەلەکان ، لێکۆڵینەوە بە ئاشکرایی دەکرێت، ئەمەش بە ئامادەبوونی بەرپرسان و ئەوانەی کە لێیان بەرپرسە، محمد لەسەر هیچ مزگەوتێك ناوەستێ و پرسیار لە خەڵکەکە دەکات هیچ ناڵێن جگە لەوەی کە دەڵێن: ئێمە جگە لە چاکە هیچمان نەبینیوە و ئارەزووی گۆڕینی ناکەین، نە لەسەری شتمان هەیە نەشتوانین پشتگیری بین، تەنانەت ئەوەش کە جەڕاحی کوڕی سینان و هاوڕێکانی پڕ کردبوو هەر ئەوەش بوو کە بێدەنگی کردبوون و وای لێ کردبوون کە هیچ خراپەیەك نەڵێن و بۆشیان نەلوێت، پەنایان برد بۆ وازهێنان لە پیاهەڵدان، هەتا گەیشتە هۆزی بەنی عەبس، محمد فەرمووی: سوێندتان دەدەم بە خوا ڕاستیم پێ بڵێن لەبتارەی ئەم والیەتانەوە ، لەم کاتەدا ئوسامەی کوڕی قەتادە وتی:مادام سویندت بەخوای گەورە دا ڕاستیەکانت پێ دەڵێم، سەعد شتەکان بە یەکسانی دابەش ناکات ،لە نێوان خەڵکیدا دادوەر نیە، لەگەڵ دەستە سەربازیەکاندا ناچێتە دەرەوە بۆ جەنگ، سەعد فەرمووی: خوای گەورە ئەگەر ئەوەی ئوسامە وتی درۆ و بوختانە چاوی کوێر بکەیت، منداڵی زۆری بدەیتێ ،دووچاری نارەحەتی و گەمە پێکردنی خەڵکی بکەیت، ئوسامە کوێر بوو وە بوویە خاوەنی دە کچ، دەیوت : ئەمە نزا و پاڕانەوەی سەعدە کە پیاوێکی پیرۆزە، پاشان سەعد بەردەوام بوو لەسەر دوعاکەی لەو کۆمەڵە و فەرمووی: خوای گەورە ئەگەر ئەوان بۆ خراپە و درۆزنی دەرچوون، بەڵای قورسیان بەسەردا بێنی، دواتر چەندین بەڵای قورسیان بەسەردا هات، حەسەنی کوڕی عەلی ئەو دەمەی لە سابات شۆڕشی بەرپا کرد جەڕاح بە شمشێر پارچە پارچە کرا ، و قەبیس بە بەرد سەری پانکرایەوە، ئەربەتیش لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا مرد ـ لێدان بە ناڵبەنبینی شمشێر ـ،ئەمەش

١ـ تأريخ الطبري (١٠٣/٥).
٢ـ تأريخ الطبري (١٠٣/٥).

نمونەی لەگەڵ خوا بونە بۆ دۆستانیخۆی ، ئەوەتا نزاو پاڕانەوەکانی سەعد وەرگیران ، لەم بە دەمەوە هاتنەی خوای گەورە بۆدوعای سەعدو هاوشێوەکانی جۆرێك لە بایەخدانی خودایی تێدایە بە دۆستانی خۆی، نارەوایان چەنبینی تۆقیون لەو چەکە پەنهانەی کە بە هەموو هۆکارە ماددیەکانیانەوە توانای بەرگری لە خۆکردنیان نیە و ناتوانن لێی دەرباز بن، کۆتایی هاتنی ئەو کەسانەی کە بە شێوەیەکی خراپ کۆتاییان پێ هات بە هۆی دوعای سەعدەوە بەڵگەیە لەسەر جێنشین بوونی ئارەزووەکان و خراپەکاریەکان لە ناخیاندا بە جۆرێ کە بەم چارەنووسە خراپەی گەیاندن، سەعد بەرگری لە خۆی کرد و فەرمووی: من یەکەمین کەسێکم کەموشریکم لەبەر خاتری خوای گەورە کوشتوە ، پێغەمبەر(ﷺ) دایك و بابی بۆ من کۆکردەوە، پێش من بۆ هیچ کەسی تری کۆنەکردۆتەوە ـ لە جەنگی ئوحود پێی فەرموەم: ((بهاوێژە دایك و بابم بە قوربانت بن))ـ ، من پێنجەم کەس بووم موسڵمان بووم ، بەنی ئەسەدیش پروپاگەندەی ئەوە دەکەن کە باش نوێژ ناکەم وە شکاریش بێئاگام دەکات لە کاروباری وڵات ؟! محمدی کوڕی موسلمە سەعد و ئەوانیشی برد بۆ لای عومەر هەتا چوونە لای و دواتر محمد هەواڵەکەی پێدا، عومەر فەرمووی: بەڵام لێدای ئەی سەعد تۆ چۆن نوێژ دەخوێنی؟ سەعد فەرمووی: دوو ڕکاتی یەکەم درێژ دەکەمەوە و دوو ڕکاتی تر لەوان کورتتر، عومەر فەرمووی: گومانم هەر ئەوە بوو بەرامبەرت، پاشان عومەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر خۆپاریزی نە بوایە دەمزانی چیان لەگەڵ بکەم، پاشان فەرمووی: کێ جێنشینە لە کوفە ئەی سەعد؟ سەعد فەرمووی: عبدالله کوڕی عوتبان، عومەر(ﷺ) لە شوێنی خۆی هێشتیەوە و کردیە کاربەدەست.[1]

ئەو وتەیەی عومەر(ﷺ)، کە دەفەرمووێت: ئەگەر خۆپارێزی نە بوایە دەمزانی چیان لەگەڵ بکەم، ئەوانە ستەمکار و نەفامن ، پاکی سەعد دەرکەوت لەو تاوانانەی کە درابوویە پاڵی، بەڵام خۆپارێزی بۆ کاری ئومەت شەپۆلی فیتنەدەوەستێنێ و دەیمرێنێ بەر لەوەی کە لە لانکەکەیدا بێتە دەرەوە و ببێتە مایەی لێك ترازان و دووبەرەکی، ڕەنگە بگاتە جەنگیش ، ئەگەر بەرپرس کە داواکەی لەسەر تۆمار کراوە پاك بێت ، ئەوا بە هیچ شێوەیەك زیانی پێ ناگەیەنێت، سەعدپاك بوو لەو تاوانەی درابوویە پاڵی وە ئەوان ولایەت و دەسەڵاتیان بەئەرك و مەسئولیەت دادەنا نەك بە شێوەی دەستکەوت، داوایان لە خوای گەورە دەکرد ئەم ئەرکە بەچاکی ئەدا بکەن و نەبنە مایەی فیتنە، ئەگەر هاتوو ئەم کارە گۆڕا بۆ فیتنەیەك ، دانایی لەوەدایە کە بەردەوام نەبێت لەسەری، هەروەك ئەوەی کە لەم ڕووداوەدا بینیمان، بۆ هەر ڕووداوێکیش وتەیەك هەیە، ئەمەش هەر ئەوە بوو عومەر لێی چوویە پێشێ کاتێك کە سەعدی لە کارەکەی بەخشی و بەو جێگرەی سپارد کە شوێنی متمانەی سەعد بوو.[2]

بەم شێوەیە عومەر سەعدی(ﷺ) لە مەدینە هێشتەوە و بڕیاریدا بە دانانی ئەو کەسەی کە سەعد لە کوفە لە شوێنی خۆی دانابوو، سەعد بوویە یەکێك لە ڕاوێژکارانی عومەر لە مەدینە،[3] پاشان عومەر کردیە یەکێك لەو شەش کەسەی کە پاڵێورابوون بۆ بەدەست هێنانی خەلافەت کاتێك کە

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/١٠٤).
٢ـ تأريخ الاسلامي للحميدي (١١/٢٢٢).
٣ـ دور الحجاز في الحياة السياسية (ص: ٢٥٧).

بریندداربوو، پاشان وەسیەتی بۆ خەلیفەکەی دوای خۆی کرد کە سەعد بکاتە کار بەدەستێك و فەرمووی: ((من سەعدم لەبەر خراپی لە کار کەنار نەخست، ترسام لەمەوە دووچاری گرفتێك بێت)).[1]

## ٢- سکاڵا لە دژی عەمری کوڕی عاصی والی میسر:

بە ڕاستی چاودێری کردنی عومەر(رضي الله عنه) بۆ عەمری کوڕی عاص چاودێریەکی توند و تیژ بووە، خەلیفە هەمیشە چاودێربووە بەسەر هەرێم و ویلایەتەکانەوە ، تەنانەت کاتێك عەمری کوڕی عاص مینبەرێکی بۆ خۆی دروست کرد عومەر نامەیەکی بۆ نووسی: لە پاشدا، هەواڵم پێ گەیشتووە کە مینبەرێکت دروست کردووە و بەرزی بەسەر موسڵمانانەوە ، هێندەت بەسە کە تۆ بە پێوە بیت و موسڵمانان لە بەردەمتا دانیشن ، بۆیە من بڕیاری خۆمم لەسەر داوی کە ئەو مینبەرە بشکێنی،[2] عەمر زۆر لە چاودێری عومەر دەترساو دەیزانی کە چەنبینی سوورە لەسەر ڕەساندنی دادپەروەری لە نێوان خەڵکیدا و لەسەر ڕەساندنی سزا شەرعیەکان ، ئەو هەوڵی تەواوی دەدا هەتا هیچ هەواڵێکی نەگاتە عومەر جگە لەو هەواڵانە نەبێت کە دڵخۆشی دەکات، عبدالرحمن کوڕی عومەر و پیاوێکی تر شەراب دەخۆنەوە بێ ئەوەی بزانن سەرخۆشیان دەکات و پاشان سەرخۆش دەبن، هەردووکیان دێن بۆ لای عەمری کوڕی عاص و داوای لێ دەکەن کە سزایان بەسەردا بسەپێنێت بەڵام عەمر دەریان دەکات، عبدالرحمن دەڵێت ئەگەر ئەم کارە نەکەیت ئەوا هەواڵ دەدەمە باوکم، عەمر دەفەرموویت: زانیم ئەگەر سزاکەیان بەسەردا نەسەپێنم عومەر لێم توورە دەبێت و لە کار لام دەبات پاشان عەمر لەبەر چاوی خەڵکی سزای دان و لە ماڵەکەی خۆی سەری تاشین، لە ڕاستیدا پێویستە سزای سەرتاشین لە هەمان کاتدا لەگەڵ قامچی لێدانەکەدا بێت و لەبەر چاوی خەڵك بێت، لەم کاتەدا پەیامێکی عومەر هات و هەڕەشەی لە عەمر دەکرد لەبەر ئەوەی کە لەبەر چاوی خەڵك سەری عبدالرحمنی نەتاشیووە، لە نامەکەدا هاتووە: لە ماڵەکەی خۆتدا لە عبدالرحمن دەدەیت و هەر لە ماڵەکەتدا سەری دەتاشی و دەشزانی کە ئەمە سەرپێچی کردنی منە، ئەوەش بزانە عبدالرحمن پیاوێکە لە پیاوانی ژێر دەستت و ئەوەی بە خەڵکی تری موسڵمانی دەکەیت دەبێ بە عبدالرحمن یشی بکەیت، بەڵام تۆ وتووتە ئەمە کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە و زانیوتە کە لە لای من نەرم و نیانی بۆ هیچ کەسێك نیە لە مافێکدا کە خوای گەورە پێویستی کردبێت لەسەری.[3]

عەمری کوڕی عاص لە کاتی ولایەتەکەیدا هەندێ سکاڵا ڕووی تێ کرد کە هەندێکیان لە لایەن سەربازانی موسڵمان و هەندەکەی تریشیان لە لایەن قیبتیەکانی ئەو وڵاتەوە بوو، ئەمەش وای لە عومەر(رضي الله عنه) کرد، کە چەند جارێك بانگی عەمری کوڕی عاص بکات بۆ سەرزەنشت کردنی یا بۆ سزادانی لەسەر ئەوەی کە لێی دەرکەوتووە،لەوانە پیاوێکی میسری سکاڵا لەسەر کوڕێکی عەمری کوڕی عاص تۆمار دەکات کە بە قامچی داویەتی لە کوڕی ئەو پیاوە، ئەمەش وادەکات لە عومەرکە

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/٢٢٥).
٢ـ فتوح مصر وأخبارها (ص: ٩٢).
٣ـ تأريخ المدينة (٣/٨٤١).

عەمر و پاشان کوڕەکەی بانگ بکات و فەرمانی دا بە پیاوە میسریەکە تۆڵە لە کوڕی عەمر بکاتەوە، پێی دەڵێت: ئەگەر عەمر لە باوکی ئەو کوڕەی بدایە ئەوا کارمان نەدەگەیشتە ئەمە، لەم کاتەدا عومەر لای کردەوە بۆ عەمری کوڕی عاص و ئەو وتە بە ناوبانگەی پێ وت کە دەفەرموێت: ((تا کەی خەڵکی دەکەنە کۆیلە لە کاتێکدا کە بە ئازادی لە دایك بوون))،[1] جارێکیان سەربازێك خۆی دەکات بە ژووردا بۆ لای خەلیفە کە عەمری کوڕی عاص تاوانباری کردووە بە دووڕووی، عومەر نامەیەکی بۆ دەنووسێت و ڕەوانەی لای عەمری دەکاتەوە و فەرمان دەداتە عەمر کە لەبەردەم خەڵکیدا دابنیشێت و ئەگەر ئەم ڕاستیە سەلمێنرا ئەوا سزای دەدات و ئەمەش وای لێکرد بانگی چەند شایەتێك بکات، پاشان دەرکەوت عەمر تاوانبارە، دواتر هەندێ کەس ویستیان بەر لە پیاوەکە بگرن لە لێدانی عەمر و بەرتیلی بدەنێ لە بری لێدانەکە بەڵام پیاوەکە ڕازی نەبوو ، کاتێك کە پیاوەکە هەستایە سەر عەمر کە لێی بدات لێی پرسی: ئایا کەسێك هەیە بەرم پێ بگرێت لە لێدانت؟ عەمر وتی: نەخێر ئەوەی کە فەرمانت پێکراوە ئەنجامی بدە، پیاوەکە وتی: ئەوا من تۆم بەخشی.[2]

### ٣- سکاڵا لە دژی ئەبو موسای ئەشعەری والی بەسرە:

جورەیری کوڕی عبداللە بەجلی دەفەرمووێت پیاوێکی دەنگ زل وجەربەزە لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەریدا بوو، کاتێك کە دەستەکەوتێکیان دەست کەوت ئەبو موسا هەندێ لە بەشەکەی خۆی پێدا بەڵام ئەو پیاوە داوای هەموو بەشەکەی کرد، لەبەر ئەوە ئەبو موسا (٢٠) قامچی لێدا و سەری تاشی، پیاوەکە مووەکانی سەری کۆکردەوە و ڕۆیشت بۆ لای عومەر، جورەیر دەفەرمووێت من نزیکترین کەسی عومەر بووم، پیاوەکە دەستی کرد بە گیرفانیدا و پاشان مووەکانی دەرهێنا و دای بە سنگی عومەردا و وتی: سوێند بە خودا ئەگەر ئاگر نەدەبوو، عومەر فەرمووی: ڕاست دەکات ئەگەر ئاگر نەبوایە دواتر پیاوەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من پیاوێکی دەنگ زل وجەربەزەو لێهاتوم ، چیرۆکەکەی بۆ بەیان کرد، وتی: ئەبو موسا(٢٠) قامچی لێداوم و سەری تاشیوم، پێی وایە کە تۆڵەی لێ ناکرێتەوە، عومەر(ﷺ) فەرمووی: هەم کەس ئاوا نەترسانە سکاڵا بێنن لام، پێم خۆشترە لە هەموو ئەو دەستکەوتانەی کە خوای گەورە دەماندات، دواتر عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو موسا نووسی: سڵاوت لێ بێت، فلان کەس هەواڵی پێداوم بە چەند شتێك ئەگەر تۆ ئەو کارەت لە نێو قەرەباڵغی خەڵکدا کردووە ئەوا بڕیارم لەسەر داوی کە لە نێو قەرەباڵغی خەڵکدا دانیشی، تا تۆڵەت لێ بکاتەوە، ئەگەر تۆ ئەم کارەت لە چۆڵیدا کردووە ئەوا بڕیارم لەسەر داوی کە لە چۆڵیدا دانیشی، تا تۆڵەت لێ بکاتەوە، پیاوەکە هاتە پێشێ و خەڵکی پێیان وت: بیبەخشە، پیاوەکە وتی: نا سوێند بە خوا لێی ناگەڕێم و نایبەخشم، کاتێك کە ئەبو موسا دانیشت بۆ ئەوەی پیاوەکە تۆڵەی لێ بکاتەوە، پیاوەکە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: خوای گەورە وا بەخشیم لەبەر خاتری تۆ.[3]

---

١ـ الولاية على البلدان (١/٨١).
٢ـ تأريخ المدينة (٣/٨٠٧-٨٠٨)، في إسناده إنقطاع.
٣ـ محض الصواب (٢/٤٦٧) إسناده حسن.

عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ) دەفەرموێت: ئێمە لەگەڵ عومەردا بووین لە ڕێگەیەکدا پیاوێکی بینی بە خێرایی هات بۆ لای، عومەر فەرمووی: ئەو پیاوە ئێمەی دەوێ، کەمێك وەستا و پاشان ڕۆیشت بۆ کارەکەی، پیاوەکە هات و دەستی کردە گریان و عومەریش(ﷺ) گریا و فەرمووی: کێشەت چیە؟پیاوەکە وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ئارەقم خواردۆتەوە،ئەبوموسا لێی داوم و ڕووی ڕەش کردم و بە نێو خەڵکیدا گێڕامی و بەری لە خەڵك گرت کە لەگەڵم دابنیشن، منیش بیرم لەوە کردەوە کە بە شمشێرەکەم لە ئەبو موسا بدەم، یان بێمە لات هەتا ڕەوانەی وڵاتێکم بکەیت کە کەس نەمناسێت تیایدا، بۆ ئەوەی پەنا نەبەمە بەر کافران، عومەر(ﷺ) دەستی کردە گریان و فەرمووی: ئەوەی بەختەوەری کردووم ئەوەیە کە تۆ نە چوی بۆ لای کافران ،منیش ئەوە و ئەوەم هەیە، پاشان فەرمووی: ئەگەر تۆ ئارەقت خواردبێتەوە ئاسایە، چونکە لە سەردەمی جاهیلیدا ئارەق بە ئاسایی خۆراوەتەوە ، نامەیەکی نووسی بۆ ئەبو موسا: کە فلان کەس هاتە لام و باسی ئەوە و ئەوەی کرد، ئەگەر ئەم پەیامەت پێ گەیشت فەرمان بە خەڵکی بدە کە لەگەڵی هەڵسوکەوت بکەن و تێکەڵی بکەن، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا شایەتیەکەی وەربگرە، عومەر پۆشتەی کردەوە و فەرمانی پێدانی دووسەد درهەمی دایە، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە: فلانی کوڕی فلانی تەمیمی هەواڵی پێدام بە ئەوە و ئەوە، سوێند بە خوا گەرامەوە ڕووت ڕەش دەکەم و با ئەویش بە ناو خەڵکیدا بتگێڕێت، ئەگەر ویستت ئەوە بزانی کە ئەوەی من دەیڵێم ڕاست و دروستە ئەوا فەرمان بە خەڵکی بدە کە نان و ئاوی لەگەڵ بخۆن ، هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا شایەدیەکەی وەربگرن، عومەر پۆشتەی کردەوە و سواری وڵاخەکەی کرد و (٢٠٠) درهەمی پێدا،[١] ئەم یەرگوزشتەیەش سووربوونی عومەری فاروقی تێدایە لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێك لە کاربەدەستەکانی ناتوانن لە کاتی سزادانی سەرپێچی کەراندا لە سنوور لابدەن.[٢]

## ٤- سکاڵای خەڵکی حەمص لە دژی سەعیدی کوڕی عامر:

خالدی کوڕی معدان دەفەرموێت: عومەر(ﷺ) لەشاری حەمص سەعیدی کوڕی عامری ئەلجومجی کردە والی کاتێك کە عومەر هات بۆ حەمص فەرمووی: ئەی خەڵکی حەمص، کاربەدەستەکەتان چۆنە؟ ئەوانیش شکاتیان کرد، بەحمص وتراوە کوفەی دوهەم لەبەر زۆر شکات کردن و ئاژاوە دروستکردن، ئەوانیش وتیان: چوار سکاڵامان هەیە، سەعید نایەتە ناومان هەتا خۆر بەرز دەبێتەوە، عومەر فەرمووی: چی تر؟ وتیان: بە شەو وەڵامی کەس ناداتەوە، فەرمووی: چی تر؟ وتیان: هەموو مانگێك ڕۆژێکی هەیە کە تیایدا نایەتە دەرەوە بۆ ناومان، عومەر فەرمووی: چی تر؟ وتیان: چەند ڕۆژ جارێك دەبوورێتەوە (واتا لەهۆش خۆی دەچێت و ئاگای لە خۆی نامێنێت) ، عومەر سەعید و هەموو خەڵکەکەی کۆکردەوە و فەرمووی: خوای گەورە،ئەمڕۆ ئەو گومتانە چاکەی من بە سەعید هەمە بەراستی دەرکەوێت ، عومەر دادگاییەکی کردەوە و لەبەردەمی سەعیددا فەرمووی: لە چی

---

١ـ محض الصواب (٥٥٢/٢) إسناده حسن.
٢ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ١٣٤) إسناده حسن.

سکالای لێ دەکەن؟ وتیان: تا خۆر بەرز نەبێتەوە نایەتە ناومان؟ عومەر فەرمووی: تۆ چی دەڵێیت؟ سەعید فەرمووی: سوێند بە خوا پێم ناخۆشە باسی بکەم، خێزانەکەم خزمەتکاری نیە، هەر خۆم هەویر دەشێلم و دایدەنێم تا هەڵبێنێ و پاشتر دەیکەمە نان و دواتر دەست نوێژ دەشۆرم و دێمە ناویان، عومەر فەرمووی: لە چی تر سکالا دەکەن؟ وتیان: شەو وەڵامی کەس ناداتەوە، عومەر فەرمووی: تۆ چی دەڵێیت؟ سەعید وتی: زۆر پێم ناخۆشە کە ئەمەش بدرکێنم، من ڕۆژم داناوە بۆ ئەوان و شەویشم داناوە بۆ خۆمو خودا، عومەر فەرمووی: لە چی تر سکالاتان هەیە؟ وتیان ئەو لە مانگێکدا ڕۆژێکی هەیە کە نایەتە دەرەوە بۆ لامان، عومەر فەرمووی: تۆ چی دەڵێیت؟ سەعید فەرمووی: خزمەتکارم نیە جلەکانم بۆ بشوات و جلی ترشم نیە کە بیگۆڕم، دادەنیشم هەتا جلەکانم وشك دەبێتەوە و پاشان لەبەری دەکەم و دواتر لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا دێمە دەرەوە بۆ ناویان، دواتر عومەر فەرمووی: سکالای چی تری لێ دەکەن؟ وتیان: چەند ڕۆژ جارێك دەبورێتەوە، عومەر فەرمووی: ئەی تۆ چی دەڵێیت؟ سەعید وتی: جەستەی خوبەیبی ئەنصاریم بینی لە مەککە کە قورەیش گۆشتەکەیان پارچەپارچە کرد پاشان هەڵیان واسی بە قەبینی دارێکدا و وتیان: ئایا پێت خۆشە محمد لە شوێنی تۆدا بێت؟ ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا پێم خۆش نیە من لە نێو ماڵ و منداڵەکەمدا بم و محمد(ﷺ)دڕکێك بچێت بە لەشیدا و پاشان هاواری کرد ئەی محمد، من هەر ڕۆژێك یادی ئەو ساتە دەکەمەوە کە نەمتوانیووە لەو حاڵەتەدا بشتیوانی لێ بکەم و موشریك بووم و باوەڕم بە خوای گەورە نەبووە تەنانەت گومان وایە کە خوای گەورە بەو تاوانە لێم نابوورێت هەرگیز لەبەر ئەوە دووچاری ئەو بوورانەوەیە دەبم، لێرەدا عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەو گومانەی هەمبوو هەر وابوو، پاشان عومەر هەزار دیناری بۆ نارد و پێی فەرموو: کارەکانتی پێ تەواو بکە، دواتر لێی جیابوویەوە.[١]

## ٥- لەکارخستنی هەر کەسێك کە گاڵتە بە خەڵکی بکات:

قەیسی کوڕی ئەبی حازم - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) پیاوێکی ئەنصاری کردە کاربەدەست و ئەویش لای عەمری کوڕی حەیانی کوڕی بەقیلەی گەورەی هۆزی حیرەدا لایدا، ئەویش خواردن و خواردنەوە و هەرچیەکی ویست خستیە بەر دەستی، پاشان دەستی کردە گاڵتەجاڕی،[٢] پیاوەکەی بانگ کردو و دەستی بە ڕیشیدا سڕی، پیاوەکەش سواری ولاخێك دەبێت و دەڕوات بۆ لای عومەر(ﷺ)و پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران من خزمەتی کیسرام کردووە بەڵام ڕۆژگارم بەمە نەگەیشتووە کە ئێستا ئەم والیەی تۆ بە منی دەکات، عومەر فەرمووی: چی ڕوویداوە؟ پیاوەکە وتی: فلان کەسی والیت لای من لایدا و خواردن و خواردنەوەم خستۆتە بەردەستی، پاشان بانگی کردووم و سوکایەتی پێ کردووم و دەستی بە ڕیشما سڕیووە، عومەر (ﷺ)ناردیبە دوایدا و پێی فەرموو: ها!! هەرچیەکت لە خواردن و خواردنەوە ویستووە خراوەتە بەردەستت، پاشان دەستت

---

١ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ١٣٤) إسناده حسن.
٢ـ حلية الاولياء (١/٢٤٥)، أخبار عمر (ص: ١٥٢).

سڕیووە بە ڕیشیدا؟ سوێند بە خوا ئەگەر ئەم کارە نەبووایەتە سونەت ئەوا ڕیشم دادەماڵیت و هێز و وزەم لێ دەبڕیت، بەڵام سوێند بە خوا ئیتر هەرگیز لە خەلافەتی مندا نابیتە کاربەدەست.[١]

## سێیەم: ئەو سزایانەی لە سەردەمی عومەردا (ﷺ) ڕووبەڕووی والی بۆتەوە:

بە هۆی چاودێری عومەر بۆ والیەکان عومەر هەندێ لەو هاوەڵانەی بینیوە کە والیەکانی تێکەوتوون، لەبەر ئەوە هەستاوە بە تەمێ کردن و سزادانیان لەسەر ئەو هەڵانەی کە تێی کەوتوون، شێوازی تەمێ کردنیش بە پێی جیاوازی ڕووداوەکان و ئەوەی کە خەلیفە بینیویەتی جۆراوجۆر بوون، لە گرنگترین شێوازەکانی تەمێ کردنی والیەکان ئەمانە بوون:

### ١- حەق لێکردنەوە و تۆڵەسەندن لێیان ئەگەر هەڵەیان کردبێت:

عومەر(ﷺ) هەمیشە دەیفەرموو: ئاگادار بن من کاربەدەستانم نەناردووە، تا لێدتان بدەن و سەروەت و سامانەکانتان ببەن، بەڵکو من ئەوانم ناردووە تا شارەزاتان بکەن لە ئاینەکەتان و سونەتی پێغەمبەرەکەتان، هەر کەس بەدەر لەمەی پێکرا با سکاڵاکەیم بۆ بەرز بکاتەوە، سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە ئەو دەمە تۆڵەی بۆدەکەمەوە،[٢] عومەر هەر بەوەوە نەوەستاوە کە ئەو دەستووره فەرمیانە دەربکات کە هەڕەشە لە والیەکان دەکات و بەریان پێ دەگرێت لە هێرش کردنەسەر خەڵکی ، بەڵکو ئەم کارەی بە شێوەیەکی کردەیی بەجێ هێناوە، هەروەك ئەوەی تێمان پەڕاند لەوەی کە سکاڵا لە دژی ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص کرابوو (ﷺ).[٣]

### ٢- لەکار خستنی والی بە هۆی هەڵە کردنەوە:

عومەر(ﷺ) هەستاوە بە لەکارخستن و لابردنی چەند والیەك بە هۆی ئەوەی کە کەوتوونەتە ناو هەڵەیەکەوە کە شیاوی ئەوە نەبوو کە عومەر لێی بێدەنگ بێت، عومەر(ﷺ) یەکێك لە فەرماندەکانی لەکار لابرد بەهۆی ئەوەی کە دەستی وەردابوویە کاری سەربازەکانی کەناردبووی بۆ سەر سوپایەك وە کاتێك کە چووبوویە نێو سوپاکە پێی وتبوون: وەرن هەواڵم پێ بدەن بە هەر تاوانێك کە ئەنجامتان داوە ئەوانیش هەستابوون بە دان نان بە تاوانەکانیان پاشان ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر، ئەویش فەرمووی: ئەوە چیەتی دایکی لەبارىبچێت سوڕێك هەڵدەماڵێت کە خودا داپۆشیووە؟ سوێند بەخوا چی بینی کار بۆمن ناکات،[٤] عومەر تورە دەبێت لەیەکێك لەوالیەکانی کاتێك کەهەندێ هۆنراوەی ئەو والیەی پێ دەگات، کە تیایدا خۆی بەمەی نۆشینەوە دەنوێنێت و پاشتر لەکار لای دەبات.[٥]

---

١ـ تأريخ المدينة (٨١٣/٣) خبر صحيح، الفاروق الحاكم العادل (ص: ١١).
٢ـ الولاية على البلدان (١٧٢/٢)، الاموال لإبي عبيد القاسم بن سلام (ص: ٦٣-٦٤).
٣ـ الولاية على البلدان (١٢٦/٢-١٢٧).
٤ـ تأريخ المدينة (٨١٨/٣).
٥ـ السياسة الشرعية لإبن تيمية (ص: ١٠٥).

## ٣- لەناوبردنی شتێك لە ماڵی والی:

ئەمە بریتیە لەوەی کە سەرپێچی تێدایە، عومەر(ﷺ) هەمیشە سوور بووە لەسەر ئەوەی کە ماڵی والی بێ دەرگا و بێ پەردە بێت، کاتێك هەواڵی پێ گەیشت کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) دەرگای داناوە بۆ ماڵەکەی، محمدی کوڕی موسلمەی بۆ نارد و فەرمانی سوتاندنی ئەو دەرگایەی پێدا،[١] لە ڕاستیدا هۆی بوونی ئەم دەرگایە ئەوەبوو کە ماڵی سەعد لە بازێڕەوە نزیك بووە وە قاڵەقاڵی خەڵکی بازاڕ ئەزیەتی سەعدیان داوە، لەبەر ئەوە سەعد دەرگایەکی داناوە تا لەو دەنگەدەنگەی خەڵکی بازاڕ دابڕێت ، هەواڵی ئەم دەرگایە و ماڵی سەعد گەیشتە عومەر، کە خەڵکی ناویان لێناوە کۆشکەکەی سەعد، لەبەر ئەوە عومەر محمدی کوڕی موسلمەی بانگ کرد ونارديبۆ کوفە، پێی فەرموو: بڕۆبۆ ئەو کۆشکە دەرگاکەی بسوتێنە، پاشان دارەکەت بگێڕەوە سەر سەرەتات محمد بەرەو کوفە بەڕێکەوت، هەندێ داری کڕی و هێنای بۆ کۆشکەکە، و دواتر دەرگاکەی سوتاند،[٢] إبن شیبە ڕیوایەتی کردووە کە: عومەر(ﷺ) مەجاشعی کوڕی مەسعودی کردە کاربەدەست لەسەر کارێك و هەواڵی پێگەیشت، کە خێزانی مەجاشع ماڵەکەی نوێ دەکاتەوە، عومەر نامەیەکی بۆ نووسی: لە بەندەی خودا ئەمیری باوەڕداران بۆ مەجاشعی کوڕی مەسعود سڵاوت لێ بێت، لە پاشدا ئەوەی من هەواڵم پێ گەیشتووە کە (خوزەیراء) ماڵەکەی نوێ دەکاتەوە، ئەم نامەیەی منت بەدەست گەیشت فەرمانم پێداوی کە لە دەستت نەیخەیت هەتا دیوارەکە تێك دەدەیت، إبن شیبە دەفەرمووێت: کاتێك کە مەجاشع نامەکەی بۆ هات چەند کەسێك لە لای دانیشتبوون ئەویش سەیری نامەکەی کردو خەڵکەکە زانیان کە شتێکی بۆ هاتووە و بێزاری دەکات، نامەکەی بە دەستیەوە گرت و پاشان فەرمووی بە خەڵکەکە: هەستنە سەرپێ، ئەوانیش هەستان و نەیانزانی کە بۆچی هەڵیان دەستێنێ، لەگەڵ خۆی خەڵکەکەی برد تا گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی چوویە ژورەوە و ڕووبەڕووی خێزانەکەی بوویەوە، خێزانەکەی هەستی بە گرژی نێوچەوانی کردو پێی وت: ئەوە چیتە؟ ئەویش فەرمووی: ئەمە لە تۆوەیە بۆ من و پەستت کردووم و ئازارت داوم،[٣] پاشان خێزانەکەی ڕۆیشت و بە خەڵکەکەی وت: وەرنە ژورەوە، ئەوانیش هاتنە ژورەوە، مەجاشع فەرمووی: هەر یەکێکتان ئالێرە دەستێك بداتە بەر خۆی و تێکی بدات، فەرمووی: هەموویان تێکدا هەتا گەیشتە سەر زەوی و پەیامەکەش هێشتا لە دەستی مەجاشع بوو دای نەنابوو، لەکاتی سەردانی عومەر بۆ شام، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان بانگی دەکات بۆ سەر خوان ، کاتێك عومەر دەچێتە ژورەوە هەندێ پەردەی تێدا بەدی دەکات، عومەر یەکە یەکە دەیانگرێت و پارچەپارچەیان دەکات و دەفەرمووێت: بەڵام لێدای ئایا ئەمانە دەپۆشی، ئەگەر خەڵکانێك ئەمە لەبەر بکەن لە گەرما و سەرما دەیان پارێزێت.[٤]

---

١ـ فتوح البلدان (ص: ٧٧)، نهاية الارب (٨/١٨).
٢ـ الادارة الاسلامية مجدلاوي (ص: ٢١٦).
٣ـ لسان العرب (١٦١/٧).
٤ـ تأريخ المدينة (٨٣٢/٣)، الولاية على البلدان (١٢٨/٢).

## ٤- تەمێ کردن بە لێدان:

عومەر(ﷺ) بەوە بەناوبانگ بووە، کە هەڵگری قامچی بووە و بەکاری هێناوە و دارکاری پێکردووە و هەر بەو قامچییەش لە هەندێ والی داوە، بە هۆی هەڵەگەلێکەوە کە ئەنجامیان داوە، عومەر لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ شام چوویە لای هەندێ والی و بڕێ کاڵای زیادی لا بەدی کردن، لەبەر ئەوە عومەر بێتاقەت بوو و بە قامچیەکەی لێیدان،[1] لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ شام گەیشتە هەندێ فەرماندە، یەکەمین کەس پێی گەیشت یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان، و ئەبو عوبەیدە و پاشان خالدی کوڕی وەلید بوو لەسەر ئەسپەکانیان، کە هەندێ جل و بەرگی نایابیان لەبەردابوو کە بۆ موجاهیدان نەدەبوو، لەبەر ئەوە عومەر دابەزی و چەند بەردێکی هەڵگرت و بەردبارانی کردن و فەرمووی: چی وای لێ کردن خێرا لە ڕای خۆتان پاشگەز ببنەوە، نەکەن بەو جل و بەرگانەوە پێشوازیم لێ بکەن، یان لە ماوەی ئەم دوو ساڵەدا تێربوون، سوێند بە خوا ئەگەر لەسەری دوودەوە ئەم کارە بکەن ئەوا دەتانگۆڕم بە کەسانی تر، ئەوانیش وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەمە تەنها سپیە و ئێمەش چەکمان پێیە، ئەویش فەرمووی: کەواتە شتێکی باشە.[2]

## ٥- دابەزاندنی دەسەڵات لە والیەوە بۆ شوان:

عومەر(ﷺ) ئەمەی لەگەڵ والیەك کردووە، إبن شیبە دەگێڕێتەوە: عومەر(ﷺ) عەیازی کوڕی غەنەمی کردە کاربەدەستی شام و هەواڵی پێ گەیشت کە عەیاز سەرقاڵی کۆتربازی و شەوڕابوێریە، عومەر پەیامێکی بۆ نارد هەتا بێت بۆ لای، ئەویش هات و عومەر سێ ڕۆژ لای خۆی هێشتیەوە، پاشان بانگی کردو بە عەبایەکی خوری بۆ هێنا ، فەرموی: ئەمە لەبەر بکە، دواتر کۆشەبەرەیەك و سێ سەد سەر مەڕی دایە و فەرمووی: دوایان کەوە،، ئەویش دوایان کەوت کاتێك کە هەنگاوێکی تێپەڕاند فەرمووی: وەرە، ئەویش هاتە خزمەتی پێی فەرموو ئەوە وئەوە بکە و بڕۆ، ئەویش ڕۆشت، تا دوور کەوتەوە دوبارە بانگی کردەوە، هاتەوە، فەرموی بڕۆ ڕۆت ، جارێکی تر بانگی کردەوە ، هێندەی هێناو برد تا تەواو ماندوی کرد و ناوچاوی پڕ بوو لە عارەق،، دواجار فەرمووی: بڕۆ بیبە لە ڕۆژێکی ئاوا و ئاوا بۆم بهێنەرەوە، ئەویش بربینی و لەو ڕۆژەدا هێنایەوە، عومەر(ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە و فەرمووی: ئاویان بۆ بێنە ، ئاوەکەی بەردایەوە هەتا پەنگاوەکە پڕبوو پاشان ڕانەکەی ئاودا و دواتر فەرمووی: بڕۆ بیبەوە، کاتێك کە ئەو ڕۆژە هات بیهێنەرەوە ، ئەم کارە دوو تا سێ مانگی خایاند، پاشان عومەر بانگی کرد و فەرمووی: ها، شەو ڕادەبوێری و کۆتربازی دەکەیت ئایا دەگەڕێیتەوە سەر ئەم کارە؟ عەیاز وتی: نەخێر، عومەر فەرمووی: بگەڕێوە سەر کارەکەی خۆت،[3] وە ئاکامی ئەم سزای تەمێ کردنە ئەوە بوو کە عەیاز پاش ئەمە بوویە باشترین کاربەدەستی عومەر(ﷺ).[4]

---

١ـ تأريخ المدينة (٣/٨٣٤).
٢ـ الولاية على البلدان (٢/١٢٩).
٣ـ تأريخ المدينة (٣/٨١٧-٨١٨)، الولاية على البلدان (٢/١٠٣).
٤ـ الولاية على البلدان (٢/١٣٠).

## ٦- دابەشکردنی ماڵی والی:

بە ڕاستی چەسپاندنی ئەم یاسایە کارێکی خۆپارێزی بوو لە حەرام، کە عومەر(ﷺ)پێی هەڵدەسا بە جۆرێك کە عومەر هەستی کرد بە زۆربونی ماڵی هەندێ لە والیەکان و ترسا لەوەی کە ئەوان هەندێ لەو ماڵەیان بە هۆی کاری ویلایەتەوە دەست کەوتبێ،[1] إبن تیمیە لەسەر ئەم کارەی عومەر دەفەرمووێت : یارمەتی و لاگری کردنی والیەکان لە سەودا کردن، بە کرێدان و لێکدان، ئاودێری و دامەزراندنەوە بووە، ئەمەش جۆرێکە لە دیاری، هەر لەبەر ئەوە بووە کە عومەر لە کاربەدەستانی لەوانەی کە باش بوون و خواناس بوون وریا بووە و تۆمەتبار نەکراوە بە ناپاکی و بەڵکو وریای کردوونەتەوە بەوەی کە پێیان سپێردراوە لە پێناو ولایەت و یارمەتی و لاگری و چەندین شتی تریش، کارەکەی بەمە کۆتایی دەهات، لەبەر ئەوەی عومەر پێشەوایەکی دادروەر بووە و بە یەکسانی شتەکانی دابەش کردووە،[2] عومەر(ﷺ) هەستاوە بە دابەشکردنی ماڵی کاربەدەستانی بە دوو کەرتەوە، لەوانە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبو هورەیرە و عەمری کوڕی عاص (خوایان لێ ڕازی بێت)، عومەر کاتێك کاربەدەستەکانی کردە والی کالاّ و شمەکەکەیانی لای خۆی دەنووسی و پاشان ئەگەر زیادی بکردایە ئەوا دابەشی دەکرد یان لێی وەردەگرتن،[3] هەروەها عومەر هەڵدەستا بە دابەشکردنی ماڵی هەندێ لە خزمانی والی ئەگەر بەهانەیەکی بۆ ئەم کارەی هەبووایە، عومەر نیوەی ماڵەکەی لە ئەبی بەکرە وەرگرت، ئەبی بەکرەش ڕەخنەی لەم کارە گرت و وتی: من چ کارێکم بۆ تۆ گرتۆتە دەست؟ عومەر پێی فەرموو: بەڵام براکەت لەسەر بەیتولمال و دەیەکی حوشترەکان بووە پارەی داویتێ بە قەرز و تۆش بازرگانیت پێوە کردووە.[4]

## ٧- سەرزەنشتکردنی زارەکی و نووسراوەیی:

عومەر(ﷺ) لە کاتی کۆبوونەوەی بە فەرماندەکانی هەستاوە بە سەرزەنشت کردنیان لەسەر هەڵسوکەوتەکانیان، بە جۆرێك چەندجار سەرزەنشتی عەمری کوڕی عاصی کردووە، هەروەها سەرزەنشتی عەیازی کوڕی غەنەم و خالدی کوڕی وەلید و ئەبو موسای ئەشعەری و چەندین فەرماندەی تری کردووە،[5] بەڵام سەرزەنشتی پەیامی لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا زۆر بوون لەوانە: عومەر نامەی نووسیووە بۆ یەکێك لە والیەکانی کە لە کاتی میوانداریدا بە عەرەبەکان خەڵاتی داوە و لەوانی تر گەراوە، ئەمەش دەقی نامەکەیە: لە پاشدا،بەسە بۆ موسڵمان شەڕو تاوان بری موسڵمان بەچاوی سوك سەیر بکات، والسلام.[6]

---

١ـ الولاية على البلدان (٢/ ١٣٠).
٢ـ الفتاوى (١٥٧/٢٨).
٣ـ فتوح البلدان (ص: ٢٢٠-٢٢١)، الولاية على البلدان (١٣١/٢).
٤ـ شهيد المحراب (ص: ٢٥٠).
٥ـ الولاية على البلدان (١٣١/٢).
٦ـ فتوح البلدان (ص: ٤٤٣).

لە هەموو ئەمانەوە ئەوە بەدی دەکەین کە والیەکان دوور نەبوون لە لێپرسینەوە و تەمیٚ کردن بە شێوە جیاوازەکانیەوە، مۆرڤایەتی کەسێکی هاوشێوەی لەدادپەروەری و بوێریدا بە خۆیەوە نەبینیوە، هەر ئەمەش بووە وای لە سەردەمی ڕاشیبینی کردووە کە ڕاستی نموونەیەکی بەرز و بڵندی شارستانیەتی ئیسلامی بێت لە دوای سەردەمی پێغەمبەر درووود و سەلام لەسەر خاوەنەکەی بێت،[1] بەم شێوەیە ئازادی ڕا دەربڕین و لێکۆڵینەوە لە گرفتەکان لە نێوان خەلیفە و والیە ئەرك پیٚ سپێردراوەکاندا گەیشتۆتە ئەوپەڕی ڕادەی پێشبینی کردن لە ڕادەربڕین و گفت و گۆکردندا، والی دەسەڵاتی خەلیفەی نەدەتۆقاند، ئەمەش نموونەیەکە لەسەر ئەوە: کاتێك عومەر هات بۆ شام موعاویە لە نێو کاروانێکی گەورەدا بوو، کاتێك موعاویە عومەری بینی هەر کەس لەسەر پشتی ئەسپەکەی و ولاخەکەی بوو دابەزی و خێرا چوو بۆ لای و تی: سڵاوت لیٚ بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر تێپەڕی و ڕۆیشت، وەڵامی سەلامەکەی نەدایەوە، موعاویە خێرا دوای حوشترەکەی کەوت، موعاویە لەبەر ئەوەی پیاوێکی قەڵەو بوو، هەناسەی سوار بوو، عبدالرحمن کوڕی عەوف فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەو پیاوەت ماندوو کرد، ئەگەر قسەت لەگەڵ بکردایە باشتر بوو، عومەر ئاوڕێکی دایەوە و فەرمووی: ئەی موعاویە، ئایا ئەو کەژاوەیە بۆ تۆیە؟ ئەویش وتی: بەڵیٚ ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: لەگەڵ ئەو دەرگاوانانەی بونەتە بەربەستی سکاڵای هەژاران وەستانی هەژاران؟ موعاویە وتی: بەڵیٚ ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: بۆچی بەڵام لێدای، موعاویە وتی: لەبەر ئەوەی کە ئێمە لە وڵاتێکداین کە سیخوڕی دوژمنانی زۆر تێدایە، ئەگەر بە چەك و تفاقەوە خۆمان ئامادە نەکەین، ئەوا لە نێومان دەبەن و هێرشمان دەکەنە سەر! بەڵام بۆ دەرگاوانەکانیش بوێری خەڵکی دەترسین، پاشان من کاربەدەستی تۆم، ئەگەر بنهێڵیتەوە لەسەر کار ئیشی خۆم دەکەم ئەگەر لاشم بەریت لادەچم،ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: پرسیارم لە هەر شتێك لیٚ کردبیٚ خۆت لیٚ دەرباز کردوە، ئەگەر تۆ ڕاستگۆ بیت ئەوا ئەمە ڕای ژیرانەیە و ئەگەر تۆ درۆزن بیت ئەوا ئەمە فێڵێکی لاوازە، من نە فەرمانت پیٚ دەدەم و نە بەرت لیٚ دەگرم، دواتر عومەر بەجێی هێشت.[2]

لەگەڵ توند و تیژی عومەر لەسەر والیەکانی و وریینی لە لێپرسینەوەیان و سووربوونی لەسەر لەکارخستن و لابردنی، یان هەر کەسێکیان کە گومانێکی لەسەر دروست ببوایە یان سکاڵایەکی کاریگەر لە هەقیدا کلپەی بکردایە، پەیوەندیەکی پتەو لە خۆشەویستی و دۆستایەتی عومەری بەستبوویەوە بە والیەکانی کە متمانەیەکی لەڕادە بەدەریان بە دڵسۆزی خەلیفەکەیان و بێگەربینی مەبەست و سیاسەتی و تەنیایی ودادپەروەری هەبووە، عومەر هەر کات لە هەواڵی هەندیٚ لە سەرکردەکانی دابڕایە لە گۆڕەپانی جیهاد وەخت بوو دڵەڕاوکیٚ بیکوژێت و ترس دایدەگرت و بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە، عومەر لە هەندیٚ جەنگی گەورەدا خۆی دەچوویە دەرەوە و هەواڵەکانی بەدەست دەهێنا، لە حاڵەتەکانی تردا پێیان دەگەیشت و بەمەش میرنشینیەکانی خۆشەویستیەکی قووڵ لە نێوانیاندا بەدی دەکرا، کاتێك عومەر ڕۆشت بۆ ئازادکردنی قودس و گەیشتە ئەستیلکان چاوی کەوت

١ـ الولاية على البلدان (١٣٣/٢).
٢ـ الفاروق عمر بن الخطاب للشرقاوي (ص: ٢٨٧).

بە سەرکردەکانی کە عەمری کوڕی عاص و شەرحەبیلی کوڕی حەسنە بوون، ئەوانیش هەر بە سواری عومەریان ڕاگرت ئانیشکیان ماچ کرد، و پاشان عومەر باوەشی سۆزی بۆ هەردووکیان کردەوە.[١]

## چوارەم: چیرۆکی لە کار خستن و لابردنی خالدی کوڕی وەلید (ﷺ):

دوژمنانی ئیسلام لە توانای ئەندێشەی خۆیان و ڕق ئەستووریان بوارێکی بەرفراوانیان بینیوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو ڕیوایەتانەی کە لە ڕووکارێکی ناوزڕێندا یارانی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەخات، ئەمە ئەگەر شتێکیان بۆ شیفای دەروونی خۆیان نەدۆزیایەتەوە، ئەوا ئەوەی کە خۆیان گومانیان پێ دەبرد لەسەر ئەقڵی خوێنەران دەیان خولقاند، هەتا ببێتە بنەمایەکی نەگۆڕ بۆ ئەوەی کە گێرەرەوەکان دەیگوێزنەوە و دانەری پەرتوك و نامیلکەکان لاپەڕەکانی پێ ڕەش دەکەنەوە، بەم شێوەیە هەر یەکە لە عومەری کوڕی خەتاب و خالدی کوڕی وەلید (خوایان لێ ڕازی بێت) دووچاری بوهتانی ئەو دوژمنانەی ئیسلام بوونەوە کە هەوڵیاندا لاپەڕە زێڕینەکانی مێژوویان بشێوێنن، زۆریش وەستان لەسەر هۆیەکانی لە کارخستنو لابردنی خالدی کوڕی وەلید لە لایەن عومەرەوە(ﷺ)، چەندین تۆمەتی پڕوپووچیان دایە پاڵ ئەم دوو پیاوە گەورەیە و چەندین ڕیوایەتیان هێنا کە لەسەر بنەمای گفت و گۆ نارەسێت وە لەسەر هیچ بەڵگەیەکێك لەبەردەم لێکۆڵینەوە زانستیە بێگەردەکان خۆ ناگرێت،[٢] ئەمەش بەسەرهات و سەرگوزشتەی لە کارخستنو لابردنی خالدی کوڕی وەلیدە ئەمەش بە دوو قۆناغدا تێپەڕی کەهۆکاری بابەتی هەبون:

### ١- لەکارخستنو لابردنی یەکەم:

عومەر(ﷺ) لە جاری یەکەمدا خالدی کوڕی وەلیبینی لە سەرکردایەتی گشتی و فەرماندەی فەرماندەکان لە شام لە کارخستنو لایبرد ، ئەم جارەیان لە ساڵی (١٣)ی کۆچی و لە سەرەتای گرتنە دەستی خەلافەتی عومەر و پاش کۆچی دوایی ئەبو بەکر بوو، هۆی ئەم لەکارخستنەش جیاوازی بەرنامەی ئەبو بەکر بوو لە عومەر لە هەڵسوکەوت لەگەڵ فەرمانڕەوا و والیەکاندا، سونەتی ئەبو بەکر لەگەڵ کاربەدەست و فەرمانڕەواکاندا وا هاتبوو کە لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاریاندا بە تەواوی و لە سنووری یاسای گشتی بۆ دەوڵەتدا سەرپشك و ئازادی دەکردن بە مەرجێك ئەو ئازادیە بۆ بەدەستهێنانی دادپەروەری تەواو بێت لە نێوان تاك و کۆمەڵانی خەڵکدا، پاشان بە لایەوە گرنگ نەبوو کە ئاڵای دادپەروەری نووسراوێك بێت بە دەستی خۆیەوە یان کاربەدەست و والیەکانیەوە، لێرەدا والی مافی دەست درێژی کردنی لە دەسەڵاتی خەلیفەوە هەبوو بۆ چارەسەرکرانی گرفتی ولایەتەکەی بێ گەرانەوە بۆ فەرمانی خەلیفە ، ئەبو بەکر پێی وابوو کە ناکرێت لە دەسەڵاتی والیەکان لە دارایی و شتانی تر کەم بکاتەوە مادەم دادپەروەری لە نێو خەڵکەکەیدا بەدی دەکرێت،[٣] عومەر ئاماژەی بە

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ١٥١).
٢ـ أباطيل يجب أن تمحى من التأريخ، ابراهيم شعوط (ص: ٢٣).
٣ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٢١-٣٣١).

ئەبو بەکردا کە نامەیەك بنووسێت بۆ خالید(ﷺ)کە: بە فەرمانی ئەو نەبێت نە مەڕومالآت و نە حوشتر بە هیچ کەسێك نەدات، ئەبو بەکر نامەیەکی لەو شێوەیە بۆ خالید نووسی، خالیدیش لە وەلآمدا بۆی نووسیبوو: یان ئەوەتا لێم دەگەڕێی کە کاری خۆم بکەم وە یان ئەوە خۆت و کاروبارەکەت، عومەر ئاماژەی لەکارخستن و لابردنی خالدی دایە ئەبو بەکر،[١] بەلآم ئەبو بەکر خالدی هەر لەسەر کارەکەی هێشتەوە.[٢]

کاتێك فاروق دەسەلآتی خەلافەتی گرتە دەست پێی وابوو کە لەسەر خەلیفە پێویستە ڕێگایەك بۆ سەرکردە و والیەکان دیاری بکات لە فەرمانبەرداری ولایەتەکانیان و ئەوەیان لەسەر دابنێ کە هەر شتێك ڕوویدا بیگێڕنەوە بۆ لای هەتا چاوی پێدا بخشێنێت و پاشان بە فەرمانی خۆی فەرمانیان پێ بکات و ئەوانیش فەرمانەکە جێبەجێ بکەن، چون ئەو وای دەبینی،کە خەلیفە بەرپرسە لەکاری خۆی و والیەکانیش لە بەرامبەر خەلکەکەی بە جۆرێك کە لێی داناماڵرێت وە هەر ئەوە کە هەولێ داوەلە هەلبژاردنی والیدا، عومەر کاتێك خەلافەتی گرتە دەست وتارێکی بۆ خەلکی دا و فەرمووی: خوای گەورە ئێوەی بە من تاقی کردۆتەوە، منی بە ئێوە تاقی کردۆتەوە، لە دوای هاوڕێیەکەم منی هێشتۆتەوە،سوێند بە خوا لەکار و فەرمانی ئێوە شتێکم بۆ ئامادە نابێت پاشی ئەو کارە کەسێ تری بەبێ من بە دوادا بینی، هیچ شتێکم لێ ون نابێت کە ئێوە لە بەش و ئەمانەتدا لێی ببەخشن، ئەگەر والیەکان چاکیان کرد ئەوا چاکیان لەگەڵ دەکەین،بەلآم ئەگەر بە خراپ جولآنەوە ئەوا سزایان دەدەین و تەمێیان دەکەین،[٣] هەروەها فەرمووی: سەیر بکەن ئەگەر من باشترین کەسێك کە دەیزانم کردمە کاربەدەستی ئێوە و پاشان فەرمانم پێکرد بە دادپەروەری ئایا ئەوەی کە لەسەر منە بەجێم هێناوە؟ وتیان: بەڵێ، عومەر فەرمووی: نەخێر، هەتا سەیری کارەکەی دەکەم، ئایا بەوە کاری کردووە کە من فەرمانم پێکردووە یان نا؟[٤] عومەر کاتێك بوویە خەلیفە ویستی چاکسازیەك بە والیەکانی ئەبو بەکر(ﷺ) بکات بۆ بەرنامە و ڕەوتی خۆی لەبەر ئەوە هەندێکیان قایل بوون و هەندێکیان بەم کارە قایل نەبوون وە لە ڕیزی ئەوانەی کە بەم کارە قایل نەبوو خالدی کوڕی وەلید بوو،[٥] ئەنەسی کوڕی مالك دەفەرموێت: عومەر کاتێك بوویە خەلیفە نامەیەکی بۆ خالید نووسی کە بەبێ فەرمانی خۆی نە مەڕومالآت و نە حوشتر نەداتە هیچ کەسێك خالیدیش لە وەلآمدا بۆی نووسی: یان لێم ئەگەڕێن کە کاروباری خۆم بکەم گەرنا ئەوە کاروبارەکەت، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا چاکت نەکرد کە بەم شێوەیە ئاماژەت دا بە ئەبو بەکر وە من بەمە رازی نابم، پاشان لە کاریخست،[٦] دواتر عومەر بانگی

---

١ـ البداية والنهاية (٧/١١٥).

٢ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٤٦).

٣ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٣١).

٤ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٣٣٢).

٥ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٣١).

٦ـ البداية والنهاية (٧/١١٥).

کرد بۆ کارێکی تر بەڵام خالید بە گوێی نەکرد جگە لەمەش ویستی لێی بگەڕێ بۆ هەر کارێکی تر کە دەیەوێت خالید هەر پەسەندی نەکرد.[١]

عومەر خالدی لە ڕوانگەی سیاسەتی حوکم و مافی فەرمانبەرداری لە بەڕێکردنی کاروباری دەوڵەت و ئەوەی لێی بەرپرسیارە ئەنجامدا، زۆر سروشتیە کە ڕۆژانە وێنەی ئەم بەسەرهاتە ڕوویدات، ئەم کارەش هیچ شتێکی نامۆی تێدانیە،کە پێویستی بەڕوونکردنەوەی هۆیەکانی ڕاکێشانی ڕیوایەت و ڕاوبۆچوونەکان بێت، ئارەزوو و هەوەسکاری و خواستی تێدا بێت، عومەر خەلیفەی موسڵمانان لە سەردەمێکدا بووە، کە خەڵکی هێشتا بەگیانی پێغەمبەرایەتی شاد بوون، لە مافە یەکەمیەکانی ئەویش بوو، کە چەند والی و سەرکردەیەك هەڵبژێرێت کە لەگەڵ سیاسەت و ڕێڕەوەکەیدا لە فەرماندا تێکەڵ ببن هەتا لە نێو دەسەڵاتەکەیدا کاربکات ئەگەرچی ئومەتی ئیسلامی بە قایل بوونە دروستەکان دەوڵەمەندە، بۆ هیچ کاربەدەست و سەرکردەیەك نیە بەردەوام لە پۆستەکەیدا بمێنێتەوە، بە تایبەتی لە کاتێکدا ئەگەر پەیڕەوە سیاسیەکان لە نێو فەرمانڕەوا و والیەکاندا جیاواز بن، لێرەشدا کەسێك هەیە کە گۆڕانی خۆی بڵێ و پاداتشتی لەسەر وەربگرێ، واقعی مێژووش سەلمانبینی کە عومەر(ﷺ) بە تەواوی بەختەوەر بوو وە لەم سیاسەتەیدا بە شێوەیەکی بێ هاوتا سەرکەوتوو بوو، هەندێ کەسی لە کارخست و هەندێکی تری کردە کاربەدەست، ئەوانەی کردنیە کاربەدەست کەمتر قایل نەبوون لەوانەی کە لە کاریخستن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ گیانی ئەو پەروەردە ئیسلامیەی کە لەسەر ڕەساوە و هەمیشە بۆ ئومەت ئامانجێکی خەزنکراو لە پاڵەوانیەتی و قایل بوون و سیاسەتی بەرز و بەڕێز و پیرۆز زامن بکات،[٢] خالدی کوڕی وەلید بە سینەیەکی فراوانەوە پێشوازی لەم فرمانەکرد و لە ژێر دەسەڵاتی ئەبو عوبەیدەدامایەوە بەبێ هیچ ڕەخنە گرتنێك، کە (قەنسرین) ئازاد کرا ئەبو عوبەیدە لەوێ کردیە والی و کاروباری ئەوێی پێ سپارد، ئەبو عوبەیدە نامەیەکی بۆ ئەمیری باوەڕداران نووسی و تیایدا باسی لەو ئازادکردنە و ڕۆڵی خالدی تێدا کردبوو ، عومەر ئەو وتە بەناوبانگەی خۆی لێرەدا وت کە دەفەرمووێت: خالید فەرمانی بە خۆی دا، خوای گەورە بەزەیی بە ئەبو بەکردا بێتەوە، ئەو زیاتر لە من پیاوانی دەناسی،[٣] واتا عومەر بەم پەیڤەی خۆی دەری خست کە خالید لەگەڵ خۆیدا هونەری جوامێری و نموونەی ئازایەتی هێناوە و خۆی خستۆتە ئەو شوێنەی کە ئومەت ئولفەتی پێوە گرتووە لە شوێنە ترسناکەکاندا بۆ چوونە پێشەوە و قوربانیدان بە خود، هەروەك ئەوەی کە عومەر بەمە مەبەستی ئەوە بوویێت کە جڵەوگیری ئەبو بەکر بە خالید و ناهاوەدەنگی لەسەر لە کارخستنی لەگەڵ ئەوەی کە نکۆڵی لێ دەکرد مانای ئەوەیە ئەبو بەکر بێ گومانی تەواوی لەو توانا و بلیمەتیە سەربازیەی خالید هەبووە کە کەس ناتوانێت ئەسپی خۆی تیا تاوبدات جگە لە تاك تاکە و پاڵەوانەکانی ئومەت نەبێت.[٤]

---

١ـ خالد بن الولید، صادق عرجون (ص: ٣٣٢).
٢ـ خالد بن الولید، صادق عرجون (ص: ٣٣٢-٣٣٣).
٣ـ خالد بن الولید، صادق عرجون (ص: ٣٢١).
٤ـ هەمان سەرچاوە.

بەم شێوەیە خالید بۆ ماوەی چوار ساڵ لە سایەی فەرماندەی ئەبو عوبەیدەدا کاری کرد و تەنانەت بۆ جارێکیش سەرپێچی نەکرد، چاکەی ئەبو عوبەیدە و ڕەوشت بەرزی و ڕاوێژکردنی لە هەررووداوێك بە خالید نکۆڵی لێ ناکرێت، میهرەبانی وتواناو هێز و پەیوەست بوونی هاوەڵێتی و وەرگرتنی ڕاوێژی و بە پیرۆز سەیرکردنی بۆچوونەکانی نمونەی پاراستنی یەکریزی و برایەتی پێوە دیارە، ئەمەش شوێنەوارێکی باشی لە دڵیدا بەجێ هێشت بە جۆرێ وای لێ کرد کە چەندین کاری جوامێرانەی سەربازی دەگمەن و کردەیی خۆی لە ئازادکردنی دیمەشق و قەنسرین و فەحل تۆمار بکات کە ئەمەش شایەدێکی ڕاستەقینەیە لەسەر ئەو گیانە بەناوبانگەی کە پێی ڕووبەڕووی ڕووداوی لە کارخستن بوویەوە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا خالدی کوڕی وەلید شمشێری خودا بووە،[1] مێژووش ئەو وتەیەی ئەبو عوبەیدەی بۆ ئێمە پاراستووە کە لەکاتی لە کارخرانی خالیدا ئەو دڵنەوایی خالدی دەکرد... ئەبو عوبەیدە فەرمووی: من نە دەسەڵاتی دونیام دەوێ و نە بۆ دونیاش کار دەکەم، ئەوەی کە تۆش دەیبینی هەر بەرەو و ڕەوینەوە و دابڕان ملی ڕێگا دەگرێتەبەر، هەروەها ئێمە دوو برا و بە فەرمانی خوداش جوان و لەگەڵ یەك ڕاستین، ئەوەی بۆ پیاویش مایەی زیانە ئەوەیە کە براکەی لە کاری دینی و دونیاشید بێتە کاربەدەست بەسەریەوە،بەڵکو والی دەزانێ،کە خەریکە خواروەکەیان بەرەو خراپەیەك و سەروەکەشیان ڕوو لە هەڵەیەك دەڕوات لەوەی کە ڕووبەڕووی بونەتەوە تیاچوونە مەگەر ئەوان لە پارێزەرانی ئاینی خودا بن و ئەوانەش ژمارەیان زۆر کەمە،[2] کاتێك ئەبو عوبەیدە داوای لە خالید کرد کە کاری گرنگی جەنگی خۆی لە ژێر فەرمانی ئەودا درێژە پێ بدات، خالید وەڵامی دایەوە و فەرمووی: إنشاء الله من هەر بۆ ئەوم و من چاوەڕێی هیچ نیم جگە لە فەرمانی تۆ، ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: من شەرمت لێ دەکەم ئەی ئەبو سولەیمان، دواتر خالید فەرمووی: سوێند بە خوا ئەگەر منداڵێکی بچووك فەرمانم بەسەردا بدات ملکەچی دەکەم، من چۆن سەرپێچی تۆ دەکەم لە کاتێکدا تۆ لە باوەڕهێنان و موسڵمان بوونەوە لە پێش منەوە بوی، تۆ لەگەڵ پێشینەکان بە ئیسلامت پێش کەوتی و لەگەڵ پێشبڕکێ کارانیشدا بە باوەڕەکەت پەلەت کرد، پێغەمبەری خوا ناوی لێناوی دەست پاك، من چۆن بە تۆ دەگەم و ئەو پلەیەی تۆ بە دەست دێنم، ئێستاش دەتکەمە شاهێد کە من خۆم کردۆتە کۆیلەیەك لە پێناوی خودا و هەرگیز سەرپێچیت ناکەم، پاش ئەمەش کاری فەرمانداری هەرگیز ناگرمە دەست، خالید هەر بەمەوە نەوەستا بەڵکو بە شێوەیەکی کردەییانە بە شوێن قسەکانیدا ڕۆیشت و ئەوەی کە داوای لێ کرابوو بەجێی هێنا،[3] لەم کردار و گوفتارەی خالیددا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە بەربەستی ئاینی و ئەخلاقی چاودێر بووە بەسەر هەڵسوکەوتەکانی خالید و ئەبو عوبەیدەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) بەم شێوەیە خالید وەك پارێزگارێك لەسەر بنەمای گوێڕایەڵی خەلیفە و والی مایەوە لەگەڵ ئەوەی، کە بارودۆخی کەسێتی لە فەرمانڕەواوە دەگۆڕا بۆ فەرمان

١ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٤٦).
٢ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٢٣).
٣ـ نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين (ص: ٨٤).

بەسەرداکراو بە هۆی لە کار خستنی لە سەرکردایەتی سوپا.[١]

بەڕاستی لە کار خستنی خالید لەم جارەدا (جاری یەکەم) نە بە هۆی گومانی خەلیفە و نە بە هۆی گومانی ڕق و کینەی جاهیلیەوە بووە و نە تاوانبار کراوە بە پێشێلکاری پیرۆزیەکانی شریعەت و نە بە هۆی تانەدان بووە لە خواپەرستی و داد پەروەری خالید، بەڵکو لێرەدا بەرنامەی دوو پیاوی گەورە، دوو کەسی بەهێز هەبوون کە هەریەکەیان بە پێویستی زانیوە کە بەرنامەکەی خۆی بچەسپێنێ، پێویستە لەسەر یەکێکیان کەنار بگرێت، پێویستە سەرکردەی سوپا بۆ ئەمیری باوەڕداران کەنار بگرێت بەبێ بەرهەڵستی و ڕق و کینە .[٢]

یەکێك لە سەرکەوتنە گەورەکانی عومەر دانانی ئەبو عوبەیدە بوو لەسەر سوپای شام، ئەم گۆڕەپانە پاش جەنگی یەرمووك پێویستی بە ئاشتیخوازی و بنەبڕکردنی ڕق و کینەکان و تیمارکردنی برینەکانی و لێك نزیك کردنەوەی دڵەکان دەبێت و ئەبو عوبەیدەش خێرا بە دەم ئاشتەواییەوە دەڕوات ئەگەر دەرگاکانی ئاوەڵا کرد ، ئەگەر پێویست بکات لە جەنگ کەمتەرخەمی ناکات ، ئەگەر ئاشتیخوازی کەڵکی هەبوو باشە ئەگەرنا خۆئامادەکردن بۆ جەنگ لە خەڵاتەکانی ئەو بوون، هەروەها ئەو دەمە نەوەی ناوچە شامیەکان دڵ نەرمی و میهرەبانی ئەبو عوبەیدەیان بیستبوو وە بەوە قایل دەبوون کە خۆیانی بە دەستەوە بدەن و وتارەکانی خۆیان بۆ ئەوە دەوەستان لەسەر کەسانی تر، ولایەتی ئەبو عوبەیدە سونەتێکی عومەری بوو وە والیەتی ئەو بۆ شام لەو قۆناغەدا چاکترین ئیش بوە کە عومەر پێی هەستاوە.[٣]

## ٢- لەکارخستن و لابردنی دووەم:

دووەمین لەکارخستن و لابردنی خالید لە قەنسرین بوو، ئەمەش لە ساڵی (١٧)ی کۆچی بوو،[٤] هەواڵی ئەوە گەیشتە ئەمیری باوەڕداران کە خالید و عەیازی کوڕی غەنەم ڕێگای وڵاتی ڕۆمیان گرتۆتە بەر و لەم کارەیاندا سنووریان بەزاندووە و دەستکەوتێکی گەورەیان هێناوە، چەند پیاوێك لە خەڵکی دەم کەل چوونە لای خالید لەبەر چاکی خالید، لەوانە ئەشعەری کوڕی قەیسی کنبینی کە خالید لە پای دۆستی دە هەزار درهەمی پێدا، عومەر هیچ کام لە کارەکانی لا شاراوە نەبوو،[٥] لەبەر ئەوە نامەیەکی بۆ سەرکردەی گشتی سوپاکەی ئەبو عوبەیدە نووسی و فەرمانی پێدا کە لێکۆڵینەوە لەگەڵ خالید بکات لە سەرچاوەی ئەو پارەیەی کە ئەشعەری وەك پادۆستی لێی وەری گرتووە، هەروەها عومەر بە هەموو شێوەیەك و دەست بەجێ لە کاری سەربازی لە پۆستەکەی لایبردو بانگی کرد بۆ مەدینە، دواتر لێپرسینەوەی خالید تەواو بوو، لێپرسینەوەی خالید بە ئامادەبوونی ئەبو عوبەیدە دەستی پێکرد و لە پۆستەچی خەلافەت بویە بەرپرسی ئەو لێکۆڵینەوەیە ، پاشان لێگەرا،

---

١ـ نظام الحكم في عهد الخلفاء الراشدين (ص: ٨٤).
٢ـ أباطيل يجب أن تمحى من التأريخ (ص: ١٣٢).
٣ـ عبقرية خالد للعقاد (ص: ١٥٤، ١٥٥، ١٥٦).
٤ـ تأريخ الاطبري (٤١/٥).
٥ـ هەمان سەرچاوە. (٤١/٥).

کە ئەبو بەکر هەستێ بە جێبجێکردنی کارەکان، کێشەکە کۆتایی هات بەوەی خالید بەریەو تەنها تۆمەتێکەو دورە لەراستی، کاتێك خالید زانی لە کارلابراوە ماڵئاوایی لە خەڵکی شام کرد، گەورەترین ئەو شتەی کە ناخی ڕێگەی پێدا لە دەرخستنی ئەوە بوو نیگەرانی خۆی بۆ ئەم لە کار خستنە دەرخست کە دەبێتە هۆی لێك ترازانی نێوان سەرکردە و سەربازانی و پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو: ئەمیری باوەڕداران منی کردە کاربەدەست هەتا گەنمی شام هەنگوینیش بێت ، لەم کاتەدا پیاوێك هەستایە سەرپێ و وتی: ئارام بە ئەی ئەمیر، بە ڕاستی ئەمە کاری فیتنەیە، بەڵام خالید فەرموو: هەتا کوڕی خەتاب زیدوو بێت فیتنە نابێت،[1] ئەمە جۆرێکە لە باوەڕی سەرکەتووی زاڵ، جگە پاکان لە شارەزایانی یارانی محمد(ﷺ)کەس ئەمەی پێنەدراوە، ئەمە چ هێزێکی ڕووحیە کە زاڵ بووە بەسەر دەمارگیری خالید کە ئەم ولامەدانەوە هێمنەو ژیرانەی پێیە.[2]

خەڵکی کاتێك کە ئەم قسانەی خالیدیان بەرگوێ کەوت لە توند و تۆڵی بنەماکانی خەلافەتی عومەری بێدەنگ و ئارام بوون، زانیان ئەم سەرکردە لەکار خراوەیان لەو جۆرە کەسانە نیە،کە کۆشك و تەلاری گەورەی خۆیان لەسەر بنەمای گەوجیەکانی خراپە و شوڕشە ڕووخاوەکان بنیات بنێن ، بەڵکو ئەم لەم جۆرە پیاوانەیە کە بۆ بنیاتنان و توند و تۆڵی خولقاون، ئەگەر ژیان ئەمانی بوێت لەسەر ڕووخاندنی ئەوەی کە بنیتیان ناوە ئەوا ئاواتی مەرگ بۆ خۆیان دەخوازن نەوەك لەخۆبایی بوونێکی خراپەکارانە کەساسیان بکات .[3]

خالید بەرەو مەدینە بەڕێکەوت و ڕۆیشت تا گەشتە ئەمیری باوەڕداران، عومەریش زۆر بە لێك چوانەوە فەرمووی:

صنعتَ فلم يصنع كصنعك صانعٌ وما يضع الأقوام فالله يضع[4]

پاشان خالید فەرمووی: لای موسڵمانان سکاڵام کردی، سوێند بە خوا تۆ لە کاروباری مندا کۆتا نیت ئەی عومەر، عومەریش فەرمووی: ئەم هەموو سامان و داراییەت لە کوێ هێناوە؟ ئەویش فەرمووی: لە دەستکەوت و بەهرەداری خۆم، لە (٦٠) هەزار هەرچیم زیاتر بو بۆ تۆ، پاشان خستیە بەیتولمالەوە، دواتر فەرمووی: ئەی خالیدن سوێند بە خوا تۆ بۆ من مایەی ڕێزی، تۆ بۆ من خۆشەویستی، لەمڕۆ بە دواوە لەسەر هیچ شتێك سەرزەنشتم[5] ناکەیت، عومەر نامەیەکی بۆ تەواوی ناوچەکان نووسی: من خالیدم لەبەر بێزاری و خیانەت لە کار نەبردوە ، بەڵکو خەڵکی فیتنەییان لەدژ کرد، منیش ترسام کە پشتی پێ ببەستن و بەڵای بۆ ساز بدەن، پێم خۆش بوو کە بزانن خوای گەورە خۆی کارسازە، ئەوانیش نەبنە مایەی خراپەکاری.[6]

---

١ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٢٤).
٢ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٤٧)، الكامل في التأريخ (١٥٦/٢).
٣ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٤٧)، الكامل في التأريخ (١٥٦/٢).
٤ـ تأريخ الاطبري (٤٣/٥).
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ هەمان سەرچاوە.

## ٣- پوختەی هۆکارەکانی لە کارخستن و هەندێ لە سوودەکانی:

لە میانی چاوگێڕان بە نێو لاپەڕەکانی ژیانی عومەری فاروق دەتوانین پوختەی هۆکاری لابردنی خالید (ﷺ) لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

### - پاراستنی یەکتاپەرستی:

لە وتەی عومەردا(ﷺ)، کە دەفەرموێت: بەلام خەڵکی فیتنەییان لەدژکرد و منیش ترسام کە پشتی پێ ببەستن و بەلاّیەکی بۆ ساز بدەن، دەردەکەوێت عومەر دەترسێت لەو خراپەی کە خەڵکی بەرامبەر خالید و گومانیان بەوەی کە سەرکەوتن لە ژێر ڕکێفی خالید دایە و دڵنیا بوونیش بەوەی کە سەرکەوتن لای خوداوەیە لاواز دەبێت ئیتر چ جای ئەوەی کە خالید سەرکردەی سوپا بێت یان نا ، ئەم بەربەستەش لەگەڵ سووربوونی عومەر لەسەر شێوازی ویستی دەوڵەت بۆ بیروباوەڕە پوختەکان هاودەنگە بە تایبەتی ئەو لەگەڵ دوژمنانیدا جەنگێکی جەرگ بڕانە و درێژخایەن بەناوی بیروباوەڕ و هێزەکەیەوە بەرپا دەکات، بەدگومانی بەرامبەر سەرکردەیەکی گەورەی وەك خالید لادەدات چونکە خەڵکی خەریکە لە بۆچوندا بیریان لە دەبێت چونکە خالید بلیمەتی جەنگ و بەخشەری ماڵ و سامانە، ئەمەش لەسەر خۆی و دەوڵەت کارێکی دۆڕاوانە کەمەن کێش دەکات، بە جۆرێ ئەگەر بێت و ئەگەرێکی دوور بێت لە سایەی پەیوەندی خەڵکی و سەرسام بوونیان بە خەلیفەکەیان کە عومەرە، هەروەها لە سایەی ڕێکخستنی سەربازی و لەخواترسانیدا، کە ڕۆژێك لە دوای عومەر ڕوودەدات، لەگەڵ سەرکردەیەکی وەك خالید، ئەمەش بانگەشەی بنەچە داکوتانی بۆ دەکات لەو سەردەمەدا لەگەڵ نموونەی ئەو جۆرە پیاوانەدا،[١] ترسانیش لەم کارە لە سەرکردەیەکی بە توانا و لێهاتوو زۆر گەورەتر و پیرۆزترە لە ترسان لە سەرکردەیەکی بچووك کە بە باشترین شێوە کارەکانی بەڕێ نەکردبێت و هەواڵەکانیش لە ناوهێنانی بەردەوام نەبن.[٢]

شاعیری نیل حافظ ابراهیم – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – سەبارەت بە ترسی عومەر لە دیوانەکەیدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| وقيـل خالفت يا فاروق صاحبنا | فيه قد كان أعطى القوس باريها |
| فـقال خفت إفتتان المسلمين به | وفتنة النفس أميت من يداويها[٣] |

### - جیاوازی تێڕامان لە خەرجکردنی ساماندا:

عومەر(ﷺ) پێی وابوو کە دڵدانەوەی خەڵکی لە ڕێی پێدانی پارەو ڕاگرتنی دڵیان و هێشتنەوەیان لەسەنگەری ئیسلامدا کۆتایی هاتوە،ئیسلام هیچ پێویستیەکی بەو جۆرە کەسانە نیە ، پێویستە

---

١ـ الدولة الاسلامية في عهد الخلفاء الراشدين، حمدي شاهين (ص: ١٤٩).
٢ـ عبقرية عمر (ص: ١٥٨).
٣ـ حروب الاسلام في الشام، باشميل (ص: ٥٦٦).

خەڵکی بکرێنە نوێنەر بۆ باوەڕ و ویژدانی خۆیان، هەتا پەروەردەی ئیسلامی پەیامی خۆی بکاتە هۆی دەرکردنی نمونەگەلێکی تەواو، بۆ مەودای پیاچوونەوەی باوەڕ لە دڵەکاندا، بەڵام خالید وای دەبینی لە ناو ئەوانەی کە لەگەڵیدان کەسانێکی هەژار و خەباتگێڕ لە گۆڕەپانەکەیدا هەن دەبێت مامەڵەی ئالۆ وێریان لەگەڵ بکرێت، ئەم جۆرە کەسانەش پێویستیان بەوە هەیە کە نیاز و توانایان بەهێز بکرێت، بەم سامانەش بخرۆشێنرێن بۆ پارێزگاری کردن لە دین،[1] هەروەها عومەر وای دەبینی کە کۆچکەرە هەژارەکان لە پێشترن بە پێدانی ئەم ماڵە تا کەسانی تر، کاتێك عومەر لە جابیە بەوە یانوی لەکار لابدنی خلدی هێنایەوە: من فەرمانم پێکردوە ئەو پارەیە بەهەژارانی کۆچکەر بدات،ئەو داویەتی بەکەسانی بەتوانا،[2] گومانی تێدا نیە کە عومەر و خالید لەوەی کە بۆی چوون هەردووکیان هەوڵیان داوە بەڵام ئەوەی عومەر هەستی پێ دەکات خالید (رضي الله عنه) هەستی پێ نەکردووە.[3]

## - جیاوازی بەرنامەی عومەر لە بەرنامەی خالید لە سیاسەتی گشتیدا:

عومەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە والیەکان لە هەموو کارێکی گەورە و بچووکدا مۆڵەتی لێ وەربگرن، لە کاتێکدا بە لای خالیدەوە وابوو کە مافی خۆیەتی سەربەستی تەواوی هەبێت، بەبێ پرس کردن بەکەس لە گۆڕەپانی جیهادداو و دەستی ڕەها بێت لە هەموو هەڵسوکەوتێکدا بە بڕوابوون بەوەی ئەوەی لە واقعەکەدایەو بە چاو شتەکان دەبینێ زۆر جیاوازتروە لەوەی کە دەیبیسێ.[4]

ڕەنگە یەکێك لە هۆکارەکانی تر کردنەوەی بوار بێت لە بەردەم کۆمەڵێك لاوی نوێ لە سەرکردەکان، تا لە نێوان موسڵماناندا چەندین نمونەی گەورە لە وێنەی خالید و موسەنا و عەمری کوڕی عاص دەستەبەر بێت و خەڵکیش هەست بەوە بکەن کە سەرکەوتن نەبەخشراوە تەنها بە پیاوێك،[5] ئیتر ئەو پیاوە هەرچیەك بێت.

## هەڵوێستی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە بڕیاری لابردنی خالید:

کۆمەڵگەی ئیسلامی بڕیاری لابردنی خالدیان وەك مافێکی خەلیفە وەرگرت لە دانان و لابردنی والیەکاندا، هیچ کەسیش نەوە سەرپێی لە ئەمرو فەرمانی خەلیفە بکات لەم بوارەدا، دەگێڕنەوە عومەر لە تاریکایی شەودا هاتە دەرەوەو گەشت بە عەلقەمەی کوڕی عولاسەی ئەلکیلابی، عومەر زۆرلە خالید دەچوو، عەلقەمە بە چاوی خالیدەوە لە عومەری دەڕوانی و وتی: ئەی خالید ئەو پیاوە لایبربینی، بەراستی تەنها بەخیلیەك وو هیچی تر،من و ئامۆزایەکم هاتین بۆ لای هیچمان داوا نەکرد، وتمان ئەگەر خالبینی لابردبێت ئەوە هیچی لێداوا ناکەین، عومەر ویستی شتی زیاتری

---

١ـ أباطيل يجب أن تمحى من التأريخ (ص: ١٣٤).
٢ـ البداية والنهاية (١١٥/٧).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١٤٧/١).
٤ـ الخلافة والخلفاء الراشدون، سالم البهنساوي (ص: ١٩٦).
٥ـ أباطيل يجب أن تمحى من التأريخ (ص: ١٣٤).

لێوەربگرێت بۆیە لێی پرسی: ئادەی چی ترت پێیە؟ ئەویش وتی: ئەوانە گەلێکن مافیان لە سەرمانە و پێویستە مافیان بدەینەوە، و پاداشتی ئێمەش لەسەر خودایە، کاتێك ڕۆژبویەوە عومەر بە دیار چاوی عەلقەمەوە بە خالدی فەرموو: عەلقەمە ئەمشەو چی پێ وتی؟ خالید فەرمووی: سوێند بە خوا هیچی نەوت، عومەر فەرمووی: سوێندیش دەخۆی؟ پرسی بە عەلقەمەکرد ، ئەمیش گومانی وابوو کە دوێنی جگە لە خالید قسەی لەگەڵ کەس نەکردووە، ئەویش بەردەوام دەیفەرموو: واز بێنە ئەی خالید، پاشان عومەر مۆڵەتی عەلقەمەی دا و داواکاریەکانی جێبەجێ کرد ،فەرمووی: بۆ ئەوەی لە دوای من لەسەر هەمانرا و مەبەست بن ـ واتا سوور بن لەسەر ملکەچی بۆ ئەمیرەکانتان ئەگەر چی بەدڵی ئێوەش نەبوو ـ پێم خۆشترە لەوە و لەوە.[1]

ڕەخنەیەك و دەنگێکی نارەزایی لەسەر لابردنی خالد لە ئەبو عەمری کوڕی حەفسی کوڕی موغیرەی ئامۆزای خالدی لە جابیە بەرز بویەوە، کاتێك عومەر(ﷺ) بە خەلکی فەرموو: من لەبەر خالدی کوڕی وەلید داوای لێبووردنتان لێ دەکەم، من فەرمانم پێداکە ئەو سامان و داراییە هەلگرێت و بیداتەهەژارو دەست کورتە کۆچکەرەکان، بەڵام ئەو داویەتی بە کەسانی تر، کەسانی دەسەڵاتدار، و زمان پاراو بۆیە لەسەر کار لام برد و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحم لە شوێنی دانا ،پاشان ئەبو عەمری کوڕی حەفص کوڕی موغیرە وتی: سوێند بە خوائەمە پۆزش هێنانەوەنیە ئەی عومەر، تۆ پیاوێکت لابردوە کە پێغەمبەر(ﷺ) داینا بوو، وە شیرێکت لەکالان نایەوە،ئالایەك کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرزی کردبویەوە تۆ نەویت کرد، سیلەی ڕەحمت پچڕاند و ئێرەییت بە ئامۆزاکەم برد ، عومەر فەرمووی: تۆ خزمی نزیکی خالبینی، تازە پێگەیشتووی، و لەبەر ئامۆزاکەت داگیراوی،[2] بەم شێوەیە سینەی عومەر بۆ ئامۆزاکەی خالدی کوڕی وەلید کرایەوە، کە بەرگری لە خالید دەکرد هەتا بەرگریەکەی گەیشتە بانگەشەی تۆمەتبارکردنی فاروق بە ئێرەیی، لەگەڵ ئەوەشدا عومەری فاروق بە هێمنی و ئارامی و لەسەرخۆیی مایەوە.[3]

## ٤- کۆچی دوایی خالیدو ئەوەی لە کاتی گیان کێشانیدا بەعومەری فەرموو:

ئەبو دەرداء لە کاتی سەرەمەرگی خالیددا چووە لای، خالید فەرمووی: ئەی ئەبو دەرداء، ئەگەر عومەر بمرێت، تۆ چەند کاروبارێك دەبینی کە نکوڵی لێ دەکەیت، ئەبو دەردائیش فەرمووی: هەروای دەبینم، پاشان خالید فەرمووی: لە ناخی خۆمدا هەندێ بێتاقەت بووم لەو کارانەی عومەر، لەم نەخۆشیەمدا بیرم لێکردەوە زانیم کە عومەر هەر کارێك دەکات تەنها لەبەر خودا دەیکات، کاتێك کە کەسێکی نارد بۆ دابەش کردنی ماڵەکەم بینیم کە ئەو تاکە نەعلێك دەبات و منیش تاکەکەی تر، بەڵام ئەمەی لەگەڵ کەسانی تری پێشینانیشدا کردووە، لەوانەی کە بەشداری جەنگی بەدر بوون، زۆر توند بوو لەگەڵمدا ،بەهەمان شێوەش لەگەڵ کەسانی تریشدا وابوو، من خزمایەتیەکم لەگەڵی هەبوو،

١ الدولة الاسلامية في عهد الخلفاء الراشدين (ص: ١٥١).
٢ النسائي (٨٢٨٣) خبر صحيح في سننه الكبرى، محض الصواب (٤٩٢/٢) إسناده صحيح.
٣ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ٢١٩).

بەڵام ئەوئەوەی نەدەخوێندەوە ە حەقداو لە پێاو خوای گەورەشدا لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا، هەر ئەمەش وای لیّ کردم ئەگەر بۆچوونێکی خراپم لە بارەیەوە هەبێت بڕەوێتەوە، زۆری بەسەرمەوە هەیە ، ئەمەش جگە لەسەر تێڕامان هیچی تر نیە: من لەبەرەکانی جەنگدا ئامادە بوم بەڵام ئەو لەوێ نەبوو، من لەسەر ئەمە دەمبەخشی بەڵام ئەو رای وا نەبوو،[1] کاتێك کە مەرگ لێی نزیك بوویەوە و ئەمەی درکاند، دەستی کردە گریان و فەرمووی: لە لای من هیچ کارێك لە (لا الە إلا اللە) تکا کارتر نیە، لە شەوێکی زۆر بەستەڵەك لە نێو دەستەیەکی کۆچەراندا، لە درەنگانی ئەو شەوەدا و من لە سەنگەردا بووم و ئاسمان بە خوڕ بارانی دەباراند بە سەرمدا، چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کە ڕۆژ بێتەوە هەتا پەلاماری بێباوەڕان بدەم، ئێوە جیهادتان لەسەرە، من بە چەندین مەیدانی نەبەردیم بینیوە، لە جەستەمدا شوێنی بستێك نیە کە شمشێرێك لێی نەدرابێت ئاسەواری تیر یان جێگەی ڕمێکی پێوە نەبێت ، ئێستاش ئەوەتا من لەسەر جێگە دەمرم و لووت و کەپووم تیا دەچێت وەك ئەوەی کە حوشترێك دەمرێت، چاوی تۆقیوان هەرگیز نانوێت من داوای شەهید بونم لە خوا دەکرد بەڵام چارەنووسم هەر ئەوەندە بوو لەسەر جێگەکەم بمرم،[2] خالید وەسیەتی کرد کە عومەر لەسەر ئەو وەسیەتەی کاربکات کە تیایدا دەفەرموێت: عومەر وەسیەتەکەم بەجێبێنیّ و ئەو ماڵەی هەمە ئەو دابەشی بکات، عومەر(ﷺ) دەستی کردە گریان و تەڵحەی کوڕی عبیداللە فەرمووی تۆ و خالد وەك شیعری ئەو شاعیرە وان کە دەڵێت:

لا ألفينك بعد الموت تندبني　　　　وفي حياتي مازودتني زادي[3]

عومەری فاروق زۆر بە کۆچی دوایی خالید دڵگران بوو، کچانی مامی بە کوڵ گریان، و خەڵکی بە عومەریان وت کە بەر لە گریانەکەیان بگرێت، ئەویش فەرمووی: لێیان گەڕێن با بگرین بۆ ئەبو سولەیمان لەبەر ئەوەی کە دەنگە دەنگە و قاو و قیژیان نیە، لەسەر هاوشێوەکانی ئەبو سولەیمان گرینۆکەکان دەگریەن.[4]

هەروەها عومەر دەربارەی خالید فەرمووی: دەروازەێکی کردە ئیسلامەوە کە هەرگیز کۆتایی پیّ نایەت، بریا بمایەتەوە تا ئەو دەمەی بەرد گەرمایی تێدایە، سوێند بە خوا بەربەستی بەتینی سوپای دوژمن بوو ، کەسێکی دەروون پاك و بەختەوەر بوو،[5] کاتێك هیشام کوڕی ئەلبەختەری چوو بۆ لای عومەرلەگەڵ کۆمەڵی ج لە خزمانی لە هۆزی بەنی مەخزووم ، هیشام شاعیر بوو، عومەر فەرمووی: ئەوەیوتوتە بۆ خالید بۆم بڵیّ، کاتێك هیشام هۆنراوەکەی وت، عومەر فەرمووی: کەمتەرخەمیت لە پیاهەڵدانی ئەبو سولەیمان ـ ڕەحمەتی خوای لیّ بێت ـ دا کردووە، پێی خۆش بوو هاوبەش پەیداکەران کەساس بن، ئەگەر بەد بوویێت پێی ئەوا ڕووبەڕووی ڕق و کینەی خودایی دەبوویەوە پاشان ئەو پارچە

---

١ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٤٩)، الخلافة والخلفاء الراشدون (ص: ١٩٨).
٢ـ سير أعلام النبلاء (٣٨٢/١)، الطريق الى المدائن (ص: ٣٦٧).
٣ـ الفاروق عمر (ص: ٢٨٧).
٤ـ الطريق الى المدائن (ص: ٣٦٦).
٥ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٨٤).

هۆنراوەیەی خوێندەوە:

فقل للذي يبغي خلاف الذي مضـــى تهيأ لأخرى مثلها فكأن قـــــدِ
فما عيش من قد عاش بعدي بنافعي ولا موت من قد مات بعدي بمخلدي

پاشان فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبو سولەیمان بێت لای خوای گەورە یەچاکترە بۆ خالید ، خالید وەك سەربازێکی ون مرد و بە شایانی پێاهەڵدانەوە ژیا،[1] وە دونیا لێنەگەراوە کەسێك تیایدا نەمر بێت،[2] بەم شێوەیە خالید لە شاری حەمصی سەر بە ولاتی شام و لە ساڵی (٢١)ی کۆچی [3] کۆچی دوایی کرد و بە خاك سپێردرا ناویش بەنەمری دەمێنێتەوە .

١ـ تهذيب تأريخ دمشق (٢/١١٦).
٢ـ خالد بن الوليد، صادق عرجون (ص: ٣٨٤).
٣ـ تأريخ الطبري (٥/١٣٠)، القيادة العسكرية (ص: ٥٨٩).

# بەشی شەشەم

# ئازادکردنی عێراق و ڕۆژهەلاّت لە سەردەمی عومەردا (ﷺ)

## دوانگەی یەکەم

## قۆناغی دووەم لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی عێراق و ڕۆژهەلاّت

قۆناغی یەکەم لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی عێراق لـە سـەردەمی عومـەردا (ﷺ) هـەروەك ئـەوەی ئاماژەم پێکردووە لە کتێبەکەمدا (ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) کەسایەتی و سەردەمی) بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید بوو، لـە سـەردەمی عومـەردا (ﷺ) ئـەو پلانـە لەسـەر بنـەمای چەند قۆناغێـك تەواوکاری بۆ کرا :

### یەکەم: بە فەرماندەکردنی ئەبو عوبەیدەی سەقەفی لەسەر جەنگی عێراق:

لە شەوی سێ شەممە(٢٢)ی مانگی جەمابینی دووەمی ساڵی(١٣)ی کۆچی ئەبو بەکر کۆچی دوایی کرد و بە خاك سپێردرا، عومەر بەیانیەکەی هاوەڵانی ئامـادە کـردو هـانی دان بـۆ خـۆ ئامـادەکردنبۆ ئازادی عیراق وباسی ئەجرو پاداشتی جیهادو چوونە دەرەوەی بۆ کردن، کەسێك نەبوو ڕاپەڕێت چـونکە خەلکی ڕقیان لە جەنگی فارس بوو لەبەر ئەوەی پێیان وابـوو پێـان نـاوێرن، فارسـیش خـاوەنی شـان و شـەوکەوت بـوو، پاشـان ڕۆژی دووەم و سـێیەمیش هـانی خەلکەکـەی داو کەسـێك ڕانەپـەڕی، دواتـر موسەنای کوڕی حارسە هەستایەوەو باسی ئەوەی بۆ هاوەڵان کرد،کە خوای گەورە لەسەر دەستی خالید بەشێکی زۆری زەویەکانی عێراقی ڕزگارکردووە و ئەوانیش برێـك سـامان و داهـات و موڵـك و مـاڵ و کەلوپەل و خۆراکیان هەیە، لە ڕۆژی سێیەمدا کەسێك ڕانەپەڕی و ڕۆژی چوارەم یەکەم کەسێك کـە لـە ڕیزی موسڵمانان بوویە نوێنەر ئەبو عوبەیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو دواتر وردە وردە خـەلکی هاتنە دەرەوە ئامادەیی خۆیانیـان ڕاگەیانـد،[1] پـاش ئـەو سـەلیطی کـوڕی قەیـسی ئەنـصاری بـەدەم داواکەی عومەرەوە هات و فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوەی تـا ئـەمڕۆ لەسـەر فـارس هـاتوە بۆمان تەنها چـاو ترسـانێکی شـەیتانە بـۆ ئـەوەی لێیـان را نەپـەڕین ، ئاگادارب مـن و هـەموو ئـەو

---

١ـ البداية والنهاية (٧/٢٦).

کەسانەش، کە لەگەڵمدان لە ئامۆزا و خەڵکی تر خۆمان بەخشیوەتە خودا،[١] ئەم قسانەی سەلیط کاریگەری بەهێزی هەبوو لە هاندانی خەڵکی و بەرزکردنەوەی ورە و وزەیان و ئارەزوویان لە جیهابینی فارسەکان، داوایان لە خەلیفە کرد پیاوێکیان لە ئەنصاریەکان یان موهاجیرەکان بۆ بکاتە سەرکردە، عومەریش فەرمووی: سوێند بە خوا بۆ ئەم کارە کەس بە مافدارتر لەو کەسانە نازانم کە یەکەمجار خۆی کردە نوێنەر ، ئەگەر بێت و سەلیط بزێو نەبووایە لە جەنگدا ئەوا دەمکردە فەرماندەتان، بەڵام ئەبو عوبەیدە فەرماندە و سەلیطیش وەزیریەتی، خەڵکەکەش وتیان: ئێمە گوێڕایەڵ و ملکەچین،[٢] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ئەبو عوبەیدەی کردۆتە فەرماندە بەسەر هەمووانەوە لە کاتێکدا کە ئەوسەحابە نەبووە، بۆیە بە عومەریان وت: بۆ سەحابەیەکت نەکردە فەرماندە بەسەریانەوە، عومەریش فەرمووی: من ئەو کەسە دەکەمە فەرماندە کە یەکەمجار هات بە دەممەوە، ئێوە بە ڕاستی پێشی خەڵکیتان داوەتەوە بە پشتیوانی کردن لەم ئاینە، ئەویش ئەو کەسە بوو کە لە بەدەممەوە هاتندا پێش ئێوە کەوت، پاشان عومەر بانگی کرد و ئامۆژگاری کرد بە لە خواترسان، و چاکەکردن لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی لەگەڵیدایە، فەرمانی پێدا کە ڕاوێژ بە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)و سەلیطی کوڕی قەیس بکات، چونکە پیاوێکە ڕاستەوخۆ لە جەنگدا دەست بەکار بووە،[٣] هەروەها لە وەسیەتەکانی عومەر(ﷺ) بۆ ئەبو عوبەیدەی سەقەفی هاتووە: (گوێ لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) بگرە و هاوبەشیان بکە لە کارەکەدا، بە خێرایی هەوڵ مەدە و کۆشش مەکە، بەڵکو هێمن بەو هەر کارەی لە کاتو ساتی خۆیدا ئەنجام بدە، بە ڕاستی ئەو جەنگە کەسێکی لەسەر خۆو سالاری دەوێت تا ئیدارەی بکات، ئەو کەسەی هەلەکان دەقۆزێتەوە ، ڕێگر نیم لەوەی ئەم کارە بە سەلیط بسپێرم بەڵام ئەو پەلەیە لە جەنگدا، پەلەکردنیش بۆ جەنگ تیاچوونە ، سوێند بە خوا ئەگەر پەلەی نەکردایە ئەوا دەمکردە فەرماندە،[٤] پاشان عومەر فەرمووی: تۆ بەرەو زەوی فێڵ و هەڵخەڵەتان و خیانەت و ستەمکاری دەڕۆیت بەرەو گەلێکی بوێر کە خراپەیان زانیووە و فێری بوون، چاکەیان لە یاد کردووە و لێی بێئاگا بوون، سەیری خۆت بکە چۆن دەبیت؟ زمانت بپارێزە و نهێنیەکانت ئاشکرا مەکە، کەسی نهێنی پارێز زەفەر پێبردنی ئاستەمە و کەمتر توشی شتێ دەبێت کە ناڕەحەتی بکات، بەڵام نەپاراستنی نهێنی تیا چوونی بەدواوەیە.))[٥] پاشان فەرمانی دا موسەنای کوڕی حارسە پێش کەوێت تا سوپاکەی پێدەکات دواتر فەرمانی دەست بەکار بونی دەرکرد، خێرا ڕۆیشت تا گەیشتە حیرە، عومەر(ﷺ) خۆی چاودێری بەرەکانی عێراق و فارس و شامی دەکرد، یارمەتی و هاریکاری سوپاکانی دەکرد و زانیاری و فەرمانی بۆ دەناردن، هەروەها نەخشە و پلانی بۆ جەنگەکان دادەنا خۆی سەرپەرشتی ڕاپەڕاندنی دەکرد.

---

١ـ الفتوح، إبن أعثم (١/١٦٤) الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢١٦).
٢ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢١٦).
٣ـ البداية والنهاية (٧/٢٦).
٤ـ إتمام الوفاء في سيرة الخلفاء (ص: ٦٥)، الجبرية التكبر.
٥ـ إتمام الوفاء في سيرة الخلفاء (ص: ٦٥).

موسڵمانان بەرەو خاکی عێراق بەڕێ کەوتن، کە ژمارەیان (٧) هەزار کەس بوو، عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو عوبەیدە نووسی کە هەر کەس لە عێراقە ڕەوانەی بکات لەوانەی کە لەگەڵ خالید بەڕێ کەوتوون و ژمارەیان (١٠) هەزار کەسە و هیشامی کوڕی عوتبە لە سەرووی هەموویانەوەیە، عومەر (ﷺ) جورەیری کوڕی عبدالله ی بەجلی بە چوار هەزار کەسەوە نارد بۆ عێراق بەرەو ناوچەی کوفە، کاتێك کە خەڵکەکە گەیشتنە عێراق بینیان فارسەکان شڵەژاون نا تەباییەکیان پێوە دیارە، دوایین کەس بویە پاشایان بۆرانی کچی کیسرا بوو دوای ئەوەی ئەرزمیدخت پادشایان کوژرا، بۆران بۆ ماوەی (١٠)ساڵ پادشایی دایە دەست پیاوێك کە پێیان دەوت: ڕۆستەمی کوڕی فەرخزاد بەو مەرجەی کە کاروباری جەنگی ڕاپەڕێنێت دواتریش پادشایی بکەوێتەدەستی بنەماڵەی کیسرا ئەویش ئەمە پەسەند دەکات، ئەم ڕۆستەمە پێشتر ئەستێرەناس بووە و زانیاری باشی لەو بوارەدا هەبووە، پێیان وت: چی وای لێ کردی ئەم کارە بگریتە ئەستۆ؟ مەبەستیان ئەوە بوو کە تۆ ئەم کارەت پێ تەواو ناکرێت ئەویش وتی: تەماع و خۆشەویستی شەرەف.[1]

## دووەم: ڕووداوی ئەلنەمارق، جەنگی ئەلسقاطیة لە کەسکەر و جەنگی بارۆسما:

### ١- ڕووداوی ئەلنەمارق (١٣)ی کۆچی:

ئەم جەنگە پاش گەیشتنی ئەبو عوبەیدە بۆ عێراق و گرتنە دەستی سەرکردایەتی سوپا لە عێراقدا دەستی پێکرد، هەروەك ئەوەی کە بیەوێ فارسەکان لە ئەبو عوبەیدە بترسن، چونکە ئەو یەکەمین کەس بوو کە خۆی کردە نوێنەر، هەتا لە ناخیدا ئیرادەی سەرکەوتن و ئارەزووی پشتیوانی دامرکێننەوە، بۆیە هێزی ناوەکیان بۆ ئامادەکرد و سەربازگەکانیان عەبا کرد و لە پێش و پشتەوە موسڵمانانیان تێکرد و نامەیان بۆ بارزگانانی ڕەشۆکی نووسی کە شۆڕش بە موسڵمانان بگێڕن، و لە هەموو گوندێکدا پیاوێکیان دانا هەتا شۆڕش بە خەڵکەکەی بگێڕێت، بەم شێوەیە جاوانیان نارد بۆ بەبهەقیازی خواروو وە نەرسیان نارد بۆ کەسکەر، و چەند سەربازێکیش هەتا ڕووداوی موسەنا بەرپا بکەن، ئەمە گەیشتە موسەنا، چەکدارەکان خۆیان دایە پاڵی و وریاییان گرت، بازرگانەکان دەرچوون و دەست بەکاربوون لەسەر دەرچوون، خەڵکی گوندەکان ڕاپەڕین و بەردەوام بوون لە بە دواداچوونی شۆڕش، ئەبو عوبەیدە و موسەنا لە خەفان و تەعبا دابەزین و پاشان ڕووبەڕوو بوونەوەکە لە ناوچەی ئەلنەمارق دەستی پێکرد و ... شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا و خوای گەورە فارسی تێکشکاند و جاوان و مەردان شا و سەرکردەکەی یەخسیر کران، کە لەسەر پێشەنگی سوپاکە بووە، هەر ئەوان بوون کە کاری ئەم شۆڕشەیان گرتە ئەستۆ،[2] وە ئەو کەسەی کە جاوانی یەخسیر کرد مەطری کوڕی فضتی ئەلتەمیمی بوو کە جاوانی نەدەناسی، پاشان جاوان هەڵی خەڵەتاند و شتێکی پێدا و دواتر لە دەستی دەرباز بوو، ئینجا موسڵمانان گرتیان و هێنایان بۆ لای ئەبو عوبەیدە و هەواڵیان پێدا کە ئەمە سەرکردەی

---

١ـ البداية والنهاية (٧/٢٧).

٢ـ حركة الفتح الاسلام، شكري فيصل (ص: ٧٢).

فارسەکانە و ئاماژەیان پێدا کە بیکوژێت ئەویش فەرمووی: من لە خودا دەترسم کە بیکوژم چونکە پیاوێکی موسڵمان پاراستوویەتی و موسڵمانانیش لە خۆشەویستی و لایەنگری کردنی یەکتردا وەك یەك جەستەن بەمەش هەندێکیان بێدەنگ بوون و ئەویش هەمووانی بێدەنگ کرد و پاشان وتیان: ئەو پادشایە وەتا سەرکردەیە ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: ئەگەر واش بێت، من فێڵ و تەڵەکە ناکەم و دواتر ئازادی کرد.[1]

ئەم هەڵوێستەش، کە لە ئەبو عوبەیدە بەدی کرا دادەنرێت بە نمونەیەك لەلێبووردەیی موسڵمانان و وەفایان بە پەیمان و بەڵێن پاراستن ئەگەرچی هەندێکیان پێی قایل نەبوون، گومانی تێدا نیە کە ئەم ڕەوشتە بەرزەکاریگەریگەورە هەیە لە دڵ ڕاکێشانی خەڵکی بۆ هاتنە نێو ڕیزەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کاتێك کە خەڵکی گوێ بیستی ئەوە دەبن کە موسڵمانان یەکێك لە سەرکردەکانی فارسیان ئازاد کردووە، کە خێراترین کەس بووە لە دژایەتی کردنیان و تەنها لەبەر بەڵێنێکی بچووکی لەگەڵ یەکێك لە موسڵمانان لەسەر گیان بەخشی، ئەوا ئەوان خۆیان دەکێشن بەرەو ئەو ئاینەی کە ئەم جۆرە پیاوانەی بەرهەم هێناوە.

هەروەها پێویستە ئێمە ئەو هەڵوێستە جوان و ڕوونەی موسەنای کوڕی حارسەمان لە یاد نەچێت کە پێش ئەبو عوبەیدە گەیشتە عێراق بۆ یەکەمین جار و فەرماندەییەکەی سپارد بە ئەو پیاوە، لەبەر ئەوەی کە ئەمیری باوەڕداران بەوە فەرمانی پێ کردبوو، بە ڕاستی موسەنا باشترین سەرکردە و باشترین سەرباز بوو، ئەمەش لە خوڕەوشتی بەرزی موسەنا بوو چونکە پێش ئەمەش کارێکی تری وای لەگەڵ خالدی کوڕی وەلید کرد و بەخشینی بۆ ئیسلام چ لە حالەتی سەرکردایەتی و چ لە حالەتی سەربازیشدا جیاواز نەبوو، پێویستە ئەوەش بوترێ کە گەورە پیاوان بەم شێوەیە دەبن.[2]

### - جەنگی ئەلسەقاتیە لە کەسکەر:

پاشان ئەبو عوبەیدە بەسواری شوێن پێی ئەو فارسانەی هەڵگرت کە تێك شکابوون و بەرەو کەسکەر[3] هەڵهاتبوون، کە ئەویش سەر بە خاڵۆزای کیسرا بوو، کە ناوی نەرسی بوو، ئەم نەرسیە هانی سوپاکەی دا بۆ کوشتنی ئەبو عوبەیدە، ئەبو عوبەیدەش لە ناوچەی ئەلسەقاتیە[4] ڕووبەڕوویان بوویەوەو دای بە سەریانداو بڕێك کاڵاو کەلوپەل و خواردنی زۆری بەغەنیمەت لێ گرتن،[5] بەم شێوەیە نەرسی هەڵهات و موسڵمانان سەرکەوتن بەسەر سوپاکەی و زەوی و زارەکەیدا، لەخەزنەکەیدا شتێکی گەورەیان دۆزیەوە، کە هیچ شتێك هێندەی ئەوداری نەرسیانە دڵخۆشی نەکردن، چونکە نەرسی دەیپاراست و بەم شێوەیە پادشاکانیانی لێ بێزار دەکردن، موسڵمانانیش دابەشیان کردو جوتیارانیان

---

١ـ الكامل في التأريخ (٢/٨٧).
٢ـ التأريخ الاسلام (١٠/٣٣٤).
٣ـ ناوچەیەکە لە نێوان کوفە و بەسرە.
٤ـ السقاطية: ناحية كسكرين أرض واسط.
٥ـ تأريخ الطبري (٤/٢٧٢).

لێ تێرکردو پێنج یەکیان نارد بۆعومەر، نامەیەکیان بۆنووسی: خوای گەورە خواردن و ڕۆزیەکی پێ داوین، کە کیسراکان دەیان پاراست ئێمەش پێمان خۆش بوو،کە ئێوە ببیینن هەتا یادی نیعمەت و چاکەکانی خودا بکەنەوە.[1]

لەم هەواڵەشدا ئاماژە کردن بە جۆرێك لە ڕەوشت بەرزی لای موسڵمانان دەردەکەوێت بە جۆرێ لە بارگرانی جوتیارە بێ بەشەکانیان بەرز کردەوە و لەو خۆراکانەی میرەکانیان دا پێیان کە لێیان یاساغ کردبوون، هەروەك ئەوەی بەمە پێیان بڵێن: وەرن بۆ ناو ئەم ئاینە پیرۆزەی کە لە مەینەتیەکانی ئێوەی بەرز کردۆتەوە و ڕێزی مرۆڤایەتی بۆ ئەگەڕاندوونەتەوە.[2]

پاشان ئەبو عوبەیدە لە کەسکەر مایەوە و هێزێکی نارد بۆ ڕاوەدوونانی فارسەکان و تەمێ کردنی گوند نشینیەکانی دەوروبەری کە هەستابوون بە پەیمان شکێنی و لایەنگیری کردنی سوپای فارس، بەم شێوەیە لێهاتوویی موسڵمانان لە ناوچەکە دەرکەوت، پاش ئەو سەرکەوتنەش هەندێ لە والیەکانی ناوچەکە هاتن و داوای ڕێککەوتنیان کرد، دوو لەو والیانە خواردنێکی تایبەتیان هێنا بۆ ئەبو عوبەیدە وتیان: ئەمە ڕێزێکە، کە ئێمە بە تۆمان بەخشیوە و ئەمە میوانداریە بۆ تۆ، ئەبو عوبەیدە فەرمووی: ئایا بە هەمان شێوە ڕێزی سەربازانتان گرتووە و میوانداریتان کردوون؟ ئەوانیش وتیان: ئەمە ئاسان نیە کە ئێمە کردوومانە، ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: لەبەر ئەوەی کە سەربازانی نەگرتۆتەوە ئێمە پێویستیمان بە بەمە نیە، ئەوانیش خواردنەکەیان بەخشی و لە خۆیان ترسان، ئەبو عوبەیدە دیسان فەرمووی: ئایا فێرم نەکردن کە من لێی ناخۆم مەگەر هەموو ئەوانە بگرێتەوە کە لەگەڵمدان و ئێوەش داوتانە بە ناویاندا، وتیان: کەسێك نەماوە کە لەمە تێر نەبووبێ و لەمە باشتر لە هەگبەکەیدا نەبێت، کاتێك کە ئەبو عوبەیدە بەمەی زانی خواردنەکەی لێ وەرگرتن، پاشان دەستی کردە خواردن و هەندێکیشی نارد بۆ ئەو کەسانەی کە میوان بوون لە لای و بانگی کردبوون بۆ نان خواردن — ئەوان لە ژێر دەسەڵاتی فارسدا دوچار بووبوون، ئەوەیان بە خۆیانەوە نەدیبوو کە بە شتێکەوە بێن بۆ لای ئەبو عوبەیدە و گومانیان وابوو کە ئەوان بە هەمان ئەو شێوەیەی کە پێشتر بانگ کراون ئەم جارەش بانگ دەکرێن بۆ توندی ژیانی ئەبو عوبەیدە، بێزار بوون لە بەجێ هێشتنی ئەوەی کە هێناویانە لەمە، وتیان: بڵێ بە ئەمیرەکەت: ئێمە ئارەزووی خواردنی شتێك ناکەین لەگەڵ شتێکدا کە بازرگانەکان هێناویانە، ئەویشناردیبە دوایاندا و پێی وتن: ئەمە خواردنێکە لە خواردنی عەجەمیەکان، باسەیری ئەوەش بکەن کە ئەوان چیان هێناوە.[3]

ئەمە بوو خواردنی ئەو ئەمیرە بێ فیزە — پاش ئەوەی کە دووجار خۆراکی عەجەمیەکانی گێڕاوەتەوە — کاتێك کە زانی لە جاری سێیەمدا ئەوان خۆراکی تەواوی سەربازەکانیان داوە بەو شێوەیەی کە بە باشترین شێوە خواردنیان داوەتێ، لەگەڵ ئەوەشدا قایل نەبوو کە بە تەنها لەو خواردنە

---

١ـ تاريخ الطبري (٤/٢٧٢).
٢ـ التأريخ الاسلام (١٠/٣٣٥).
٣ـ تاريخ الطبري (٤/٢٧٢، ٢٧٣).

بخوات هەتا میوانەکانی بانگ کرد و نکۆڵی لەسەر کردن، هەتا دوای ئەوەش کە زانی دووچار بوون لە خۆراکی فارس و لە پۆلینەکانی ئەم خواردنەیان بۆ ژماردن هەتا ئارەزووی بەشداربوونیان بکەن، ئەمەش جۆرێکە لە ڕێزی گەورە و بەرز و ڕێزگرتنیش لە گرنگترین هۆیەکانی سەرکردایەتبە، و ئەم هەڵوێستانەش ڕێنموونیمان دەکات بۆ ئەو ڕێزەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و یارانی پێی گەیشتوون بە چاکەخوازی لە ڕەوشت بەرزی و پێشکەوتنی شارستانی.[1]

## ٢- جەنگی بارۆسمانی ساڵی (١٣)ی کۆچی:

پاشان لە شوێنێك لە نێوان کەسکەر و ئەلسەقاطیة بەیەك گەیشتن کە پێیان دەوت بارۆسما، لەسەر خۆشی و ڕەوانی کوڕانی خاڵی، کە بەندەوەیهی و بیروەیهی بوون ڕۆستەم سوپایەکی لەگەڵ جالتیۆش ئامادە کرد وە کاتێك کە ئەم هەواڵە گەیشتە ئەبو عوبەیدە پەلەی لە جەنگی نەرسی کرد پێش گەیشتنی ئەوان و بەم شێوەیە جەنگێکی ئەگەرم و گەورە ڕوویدا و فارسەکانتێکشکان و نەرسی هەلآت، دواتر ئەبو عوبەیدە موسەنای کوڕی حارسە و چەند دەستەیەکی تری نارد بۆ ئەو ناوچانەی وەك ڕووباری جور و دەوروبەری و ئەوانیش بە ئاشتی و بەزاندن ناوچەکەیان ئازاد کرد و سەرانە و باجیان لێ سەندن و سوپاس بۆ خودا ماڵاتێکی زۆریان دەستکەوت وە ئەو جالنیۆسەیان تێکشکاند کە هاتبوو بۆ سەرخستنی جاوان و سوپاکەو ماڵاتەکەیان بە دەستکەوت گرت و پاشان بە سەرشۆڕی و کەنەفتی هەڵهاتن بۆ ناو هێزەکەی.[2]

بەم شێوەیە توانرا لە ناوچەکانی مەدە و جیزە کۆتنرۆڵی سێ سوپای فارسەکان بکرێت کە ئەگەر بێتو یەکیانبگرتایە ئەوا دەیانتوانی گەمارۆی سوپای ئیسلامی بدەن و لە پێش و دوا و ڕاست و چەپەوە پەلاماریان بدەن، لەبەر زۆری ژمارەیان، بەڵام خوای گەورە لەبەر زۆری ترسانیان لە موسڵمانان کوێری کردن کە هەموو سەرکردەیەك دەخوازێ کە دوایین کاری گرنگی ڕووبەڕووبوونەوە و لاوازکردنی موسڵمانان بێت هەتا لە دوای ئەوە زاڵ و سەرکەوتوو بێت بەسەریاندا، موسڵمانان بە تەواوی سوود و کەڵکیان لەم بزاڤەیان و لە هێوری بزاوتی سوپای دوژمنان وەرگرت.[3]

### سێیەم: ڕووداوی پردی ئەبو عوبەیدەی(١٣) کۆچی:

کاتێك کە جالنیۆس بە هەڵهاتن لەوەی ڕووبەڕووی بۆتەوە لە لایەن موسڵمانانەوە کە ئەگەڕایەوە فارسەکان دڵێری نێوان خۆیانیان نواند و لەسەر ڕۆستەم کۆبوونەوە و ئەویش سوپایەکی چڕ و پڕی بۆ ئامادەکردن کە پەردەوا بوون بەبەهمەنی جازەویەو ئاڵاکەی کیسرای دا بەدەستەوە، کە ناو دەبرا بە دیرەفشی کابیان (ئاڵا گەورەکە) کە فارسەکان پێوەی مردبوون، ئەم ئالایە لە پێستەی پڵنگ دروست کرابوو، کە پانیەکەی ٨ پێ و درێژیەکەی ١٢پێ دەبوو، ئەوان گەیشتنە بەردەم موسڵمانان ئەوە نەبێت

---

١ـ التأريخ الاسلام (١٠/٣٣٦).
٢ـ ترتيب وتهذيب، البداية والنهاية، د. محمد صامل السلمى (ص: ٨٩).
٣ـ التأريخ الاسلام (١٠/٣٣٧).

کە ڕووبارێك لە نێوانیاندا بوو کە پردێکی بە سەرەوە بوو، پاشان بێباوەڕان پەیامێکیان نارد و پێیان وتن: یان وەرنە ئەمبەر بۆ لامان یان دێینە ئەوبەر بۆ لاتان، موسڵمانانیش بە ئەبو عوبەیدەی ئەمیری خۆیان وت: فەرمانیان پێ بدە کە بێنە ئەمبەر بۆ لامان، ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: ئەوان لە ئێمە بوێرتر نین بۆ بە پیرەوە چوونی مردن پاشان تێیان خزا و لە شوێنێکی تەنگەڵاندا کۆبوونەوە و شەڕێکی خوێناوی بێ وێنەیان ئەنجامدا، موسڵمانان لەم جەنگەدا نزیکەی(١٠) هەزار موجاهید دەبوون و فارسەکانیش بە کۆمەڵێکی گەورە فیلەوە کە چەندین زرزڕە و هۆڕی گەورەیان پێوە کردبوو بۆ تۆقاندنی ئەسپی موسڵمانان و کارێکی وایان کرد هەرکاتێك کە ڕوویان لە موسڵمانێك دەکرد ئەسپەکانیان هەڵدەهاتن لە دەستی فیلەکان بەهۆی ئەوەی کە گوێیان لەو زرەزرانە بوو کە پێیانەوە بوو بڕێکی زۆری ئەسپەکان هەڵدەهاتن و هەندێکی تریان لە ناچاریدا مانەوە، ئەگەر موسڵمانان هەڵیان بکوتایەتە سەر بێباوەڕان ئەوا ئەسپەکانیان لە فیلەکان دەچوونە پێشێ، بەم شێوەیە فارسەکان موسڵمانانیان قیر باران دەکرد و تۆڵەیەکی گەورەیان لێ کردنەوە، لەگەڵ ئەمەشدا موسڵمانان(٦) هەزار کەسیان لە سەربازانی فارس کوشت،[1] وە ئەسپی موسڵمانەکان بەهۆی دەنگی زەنگی فیلەکانەوە کە پێوەیان هەڵواسرابوو وەلا دەکەوتن، و بەم شێوەیەش موسڵمانان دەستیان نەدەگەیشتە بێباوەڕان و فیلەکانیش بە دەوری ئەسپەکاندا دەگەڕان، پاشان ئەبو عوبەیدە لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە و خەلکیش بە پیادە شوێنی کەوتن، بە شمشێر لەگەڵیاندا تێك هەڵگژان، دواتر موسڵمانان ئەسپەکانیان لێ ون بوو و بوونە پیادە و بەرەنگاری چەکی فیلەکان و سوارچاکان و پیادەکانی فارس بوونەوە لەگەڵ ئەو ڕم هاوێژانەی کە زیانێکی گیانیان بە موسڵمانان گەیاند و بە جۆرێ ئەسپەکانیان بە ڕووی موسڵماناندا دەردەکرد هەتا موسڵمانان بە خێرایی نەیەن بەرەو ڕوویان ئەمە هەڵوێستێکی سەخت و دژوار بوو کە تیایدا موسڵمانان ئەوپەڕی جوامێری و گیانفیداییان تێدا نیشان دا بە جۆرێ کە ناکرێ هاوشێوەی لە مێژوودا هەبێت، و خۆڕاگربوون لە بەرامبەر فارسەکان ئەگەرچی فارس بە هەموو جۆرە تفاقێکی جەنگیەوە لە پێش ئەوانەوە بوون، چونکە فیلەکان سەختترین چەك بوون کە ڕووبەڕووی موسڵمانان بونەوە و ڕیزەکانیان لاواز بوو، ئینجا ئەبو عوبەیدە داوای لە موسڵمانان کرد کە لە دەوری فیلەکان کۆببنەوە و قایش بەندەکانیان بقرتێنن و ئەوەی بەسەر فیلەکانەوە بیان خەنە خوارەوە، هەر بەم شێوەیە ئەبو عوبەیدە خۆی هەڵواسی بە فیلە سپیەکەدا و قایش بەندەکەی قرتاند و ئەوانەی بە سەریەوە بوون کەوتنە خوارەوە، و موسڵمانانیش ئەم کارەیان ئەنجامدا، لە هیچ فیلێك نەئەگەران هەتا بارەکەیان خست و خاوەنەکانیان کوشت بەڵام فیلەکان لەبەر ئەوەی کە ڕاهێنرابوون هەر بەردەوام بوون لە هێرش کردن، ئەبو عوبەیدە بیری لەوە کردەوە کە لە دەستی ئەم فیلانە ڕزگاری بێت، بۆیە پرسیاری ئەم کارەی لە جەنگاوەرەکانی کرد و ئەوانیش وتیان ئەگەر شفرەکانیان ببڕیت ئەوا دەمردن، جارێکی تر ئەبو عوبەیدە پەلاماری فیلە سپیەکەی دا و لوتی فیلەکەی بە شمشێرەکەی جوڵاند و فیلەکەش بە دەستەکانی پاراستنی ئەبو عوبەیدەی خست و دواتر بە پێیەکانی شێلای، حەکەمی کوڕی مەسعودی برای ئاڵاکەی گرت بە دەستیەوە و هەوڵیدا کە ئەبو عوبەیدە ڕزگار بکات بەڵام فیلەکە پەلاماری

---

[1] ـ ترتيب وتهذيب، البداية والنهاية (ص: ٩٠).

ئەویشی دا و بە هەمان چارەنووسی برد، دواتر حەکەم ویستی فیلەکە بکوژێ بەڵام فیلەکە بە دەستی دای لە حەکەم و بە پێیەکانی شێلای، پاش ئەوە ئاڵای موسڵمانان گوێزرایەوە بۆ دەستی ئەوانەی کە ئەبو عوبەیدە بەشداری کرد بوون، لەوانە سێ کوڕەکەی، کە وەهەب و مالك و جەبر بوون، هەتا هەموویان کوژران و لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا ئاڵاکە گەیشتە دەستی موسەنای کوڕی حارسە، هەندێ لە موسڵمانان بەسەر پردەکەدا پاشەکشەیان کرد، پاشەکشەکردن لە گۆڕەپانی جەنگدا بەردەوام بوو، کاتێك کە عبداللە ی کوڕی مەرسەبینی سەقەفی ئەمەی بینی لە پردەکە چوویە پێشێ و پەردەکەی قورتاند و فەرمووی: بجەنگن لەسەر ئەوەی کە فەرماندەکانتانی لەسەر کوژراوە یان هاوکاریان بکەن، هەوڵیدا بەر لە خەڵکی بگرێت لە پەڕینەوە بۆیە کە عبداللە یان هێنا بۆ لای موسەنا لە پەستیدا و لەبەر ئەو کارەی کە کردبووی لێیدا و فەرمووی: چی وای لێ کردی کە ئەك کارە بکەیت؟ عبداللە فەرمووی: با بجەنگن، ئەم هەوڵەی عبداللە لە شوێنی خۆیدا نەبوو لەبەر ئەوەی پچڕاندنی پردەکە بوویە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەك لە موسڵمانان کەوتنە ئاوەکە و خنکان بە هۆی فشاری فارسەکان لەسەریان، مانەوەی موسڵمانان لەسەر ئەوەی پارێزگاری لەم پاشەکشەیەیان بکەن هەتا دەتوانن بیرۆکەیەکی باش بوو، ئەمەش هەر ئەو کارە بوو کە موسەنا پێی هەستا و بە جۆرێ فەرمانی دا پردەکە هەڵبەستنەوە و خۆی و چەند کەسێك لە پاڵەوانانی ئیسلام وەستان و مانەوە بۆ بەرگری کردن لە بەشی پشتەوەی موسڵمانان هەتا پەڕینەوە و هاواری کرد: ئەی خەڵکینە ئێمە لە دواتانەوەین لەسەرخۆتان بپەڕنەوە، سەرتان لێ نەشێوێ ئێمە دانابەزین هەتا لەوبەر نەتان بینین وە خۆتان ژێر ئاو مەخەن، هەروەها موسەنا چەند کەسێك لە قارەمانانی لەگەڵ بووە وەك عاسم کوڕی عەمر و کەلجمی زەیمی کە دواین کەس بوون پەڕینەوە، بەهەمەنی جازەوەیهی هەوڵیدا کە هەڵ بکوتێتە سەر ئەو موسڵمانانەی کە مابوونەوە بەڵام نەیتوانی و ئەم هەلەی لە دەست چوو کاتێك کە موسەنا سەرکردایەتی سوپاکەی گرتە دەست و ئەم پاشەکشە ڕێك و پێکەی کرد، گومانی تێدا نیە کە ئەو قارەمانانەی کە پشتی موسڵمانانیان پاراست هەتا پاشەکشەیان کردهەوڵێکی زۆر گەورە و خۆڕاگرانەیان دا لەبەردەم دوژمندا، بەم شێوەیە (٥) هەزار کەس لە موسڵمانان پاشەکشەیان کرد و چوار هەزاریش شەهید بوون کە لە نێوانیاندا ژمارەیەکی زۆر لە گەورە یارانی پێغەمبەر (ﷺ)بەدی دەکران بە تایبەتی ئەوانەی کە بە دەوری ئەبو عوبەیدەوە بوون و لە شاری مەدینەدا هاوەڵیان دەکرد، دوو هەزار لەو موسڵمانانە پاشەکشەیان کردەوە بۆ مەدینە و ناوچەکانی تر و ئەوەی کە لەگەڵ موسەنادا مایەوە تەنها سێ هەزار کەس دەبوون بەڵام فارسەکان لەگەڵ ئەو بارودۆخە خراپەی کە موسڵمانانی تێدابوو(٦) عەزار کەسیان لێ کوژرا کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جوامێری و ئەگەری هێزی موسڵمانان.[1]

١ـ تاریخ الطبري (٢٧٩/٤)، التاریخ الاسلام (٣٤٨/١٠).

## گرنگترین ئەو وانە و پەند و کەڵکانەی کە لە جەنگی پربینی ئەبو عوبەیدەدا بینران ئەمانە بوون:

### أ- پێشبینی ڕاستگۆیانە:

دەومەی خێزانی ئەبو عوبەیدە خەوێکی بینیبوو کە پیاوێك لە ئاسمان بە دەفرێکەوە هاتبوویە خوارەوە ،ئاوی تێدا بووە ، ئەبو عوبەیدە و جەبری کوڕی لە نێو کۆمەڵە خەڵکێکدا لێیان خواردۆتەوە کاتێك کە خێزانەکەی ئەم هەواڵەی دایە ئەبو عوبەیدە ئەویش فەرمووی: ئەو شەهیدیە وە ئەبو عوبەیدە بەناو سوپاکەیدا گەڕاو وتی : ئەگەر کوژرام ئەوا ئەمیرتان فلان و فلان دەبن تا حەوت کەس لە متمانە پێکراوانی خزمی خۆی ، ئەوانەی خێزانەکەی لەخەوەکەیدا بینیبوونی و باسی بۆ کردبوو، دوای ئەوانیش ئەمیری سوپا موسەنای کوڕی حارسەدەبێت .[1]

### ب- دوو هەڵە بوونە هۆی شکستی:

- ئەبو عوبەیدە سەرپێچی سەرکردەکانی سوپا و ئەوانەی کرد لەگەڵیدا بوون، ئەوان بەریان لێ گرت کە لە پردەکە نەپەڕێتەوە بەڵام ڕای خۆی پەسەند کرد و بەدلێرانە و خۆشەویستی بە دەستهێنانی پلەی شەهیدیەوە پەڕیەوە ئەمبەری پردەکە، بەبێ ئەوی بەرنامە بۆ جەنگەکەی هەبێت ، هەروەها لێکۆڵینەوەی لەبارەی زەمینەی جەنگەکە بە شێوەیەکی تەواو نەکرد،[2] ئەمەش بویە هۆی لەدەست دانی هۆکاری ئەمنی و نەمانی پاڵپشت بۆ سوپای و بەتەنگ هاتنی لە شوێنێکی تەنگە بەردا، وەك ئەوەی خرابێتە ناو تەڵەوە، هەرئەمەش بویە هۆی ەمانی هاریکاری نێوان چەکە جۆراو جۆرەکاندا بەهۆی لەدەست دانی ئەسپ سوارەکان،ئەمش وای کرد کە سوپاکەی بە پیادەروبەڕووی سوپای پیادەو ئەسپ سوارو فیلەکانی فارسەکان بێتەوە،دەرئەنجامەکەشی شەهید بوونی حەوت سەرکردە بو، تا موسەنا سەرکردایەتی سوپای گرتە دەست، بە هۆی تەنگەڵانی شوێنەکە نە توانرا سوپاکە کۆ بکرێتەوە و سوود لە ئامادەکردنی سەربازان وەرگرێت چونکە تۆپۆگرافیای ناوچەکەو شوێنەکەیان ەبار نیەو و فریای ناکەوێت، جگە لەمەش باشترین هەڵبژاردنی ئامانج و خۆ یەکلایی کردنەوەی لە هەڵبژاردنی زەمینەی لەبارو ڕێگەی گەیشتن پێی لە دەستدا لەگەڵ ئەوەی کە گەیاندیە ئەم شوێنە، ئەبو عوبەیدە هەموو ئەمانەی لە دەستدا، بەڵکو ڕێگەی بۆ دوژمنانیشی خۆش کرد کە زاڵ بن بەسەریدا.[3]

- ئەوەی کە لە هەڵەی ئەبو عوبەیدەی قورس و گرانتر کرد هەڵەیەك بوو کە کاریگەری خەسارەتمەنبینی و مەینەتی هەڵەی یەکەمی زیاتر کرد ئەویش ئەوەبوو کە عبداللە ی کوڕی مەرسەبینی سەقەفی پردەکەی روخاند، تا هیچ کام لە موسڵمانان هەڵنەگەڕێتەوە ، ئەگەر یارمەتی

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٢٧٧).
٢ـ عوامل النصر والهزيمة (ص: ٥٥).
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤١٤).

خودا و پاشان لێزانی و لێهاتویی موسەننای کوڕی حارسە و ئەوانەی لەگەڵی بوون نەبوایە دوایەکی موسڵمانان تیادەچوون.[١]

### ت- بەهای سەرکردایەتی مەیدانی:

جەنگی ئەم پردە بەهای سەرکردایەتی مەیدانی لە شێوەکانی موسەننا و سەرکردەکانی سوپاکەی ئەوانەی کە لەگەڵیدابوون سەلماند، کاتێك کە مەینەتی ڕوو لە سوپا دەکات، ئەو سەرکردانەی کە دەتوانن بە سوپاکەیانەوە لەو مەینەتیە دەردەچن،[٢] بۆیە موسەننا لەگەڵ هاوکارە پاڵەوانەکانیدا ئەرکی پاراستنی سوپای ئیسلامیان گرتە ئەستۆ، ئەوان کەسانێك بوون کە دواین جار لە پردەکە پەڕینەوە، دیارە ئەمەش جۆرێکی بەرز و بڵندە لە جۆرەکانی گیان فیدایی و قوربانیدان.[٣]

### ث- موسەننا هەڵدەستێ بە بەرزکردنەوەی ورەی سوپاکەی:

موسەننا لەکۆی(١٠) هەزار کەس پاشەکشەی بە چوار هەزار کەس کرد، پاشان دوو سەرکردەی فارس بە نێوەکانی جاوان و مەردان شاە بەرەو ناوچەی ئەلیس (سەماوە) دوای کەوتن و موسەنناش بە دوای خۆیدا ڕایکێشان تا ڕۆچوون و نەیانتوانی دژە هێرش بکەن ، کاتێك کە موسەننا گەیشتە ناوچەی سەماوە بە هۆی ئەو ئەسپ سوارانەوە کە خۆی سەرکردایەتی دەکردن هێرشێکی ئەنجام دا و فارسەکانی دووچاری شکستێکی سەرسام کردەوە، ڕەنگە سامی ئەو کارە کت و پڕیە و پێشبینیان لەوەی کە مرۆڤێك زۆربەی سوپاکەی دەست پێشخەر کردن تیایدا، ڕەنگە نموونەی ئەم لێبڕانەی بووبێ کە بووبێتە مایەی ئەوەی ئەو ئاستە لەبەر گرژی و فەرامۆشی دابڕانی فارسەکان دووچاری شکستی گەورە بێتەوە بە جۆرێك کە موسەننا توانی هەردوو سەرکردە جاوان و مردان شاە بە دیل بگرێت و لە سێدارەیان بدات، ئەم سەرکەوتنەش کاریگەری گەورەی هەبوو لە بەهێزکردنی ورەی ئەو سوپایەی، کە مابوویەوەو ڕێزی موسەننا لای سەربازانی و هۆزەکانی دەوروبەری بەرزبوویەوە.[٤]

### ج- هەر کاتێك کە موسڵمانان کەوتبێنە گێژاوێکەوە خوای گەورە ئەو هۆکارانەی بۆ بەجێ هێناون کە لەو گێژاوە دەربازیان بکات:

موسەننا لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی موجاهیدان لە عێراقدا مایەوە ئەو ژمارەیە بەس نەبوو بۆپاراستنی ئەو ناوچانەی کە موسڵمانان دەسەڵاتی خۆیان گەیاندبوو پێی، فارسەکان لە توانایاندا بوو پاشماوەی سوپای ئیسلامی لە عێراق وەدەرنێن، لە نێو ئەوانەی کە ماونەتەوە کەسانێك دەدۆزنەوە، کە لە نێو عەرەبدا دۆستیان بوون، تا بتوانێت لەو دەشتاییەدا دوای موسڵمانان بکەوێت و دەریان پەڕێنێ،

---

١- عوامل النصر والهزیمة (ص: ٥٥).
٢- الطریق الی المدائن (ص: ٤١٤).
٣- التأریخ الاسلام (١٠/٣٤٣).
٤- الحرب النفسیة، د. أحمد نوفل (١٦٧/٢).

بەڵام خوای گەورە لەگەڵ ئەم دەستە و تاقمە و تەواوی موسڵمانانە لە هەموو جێگەیەکدا، هەر کاتێك کە موسڵمانانی ڕاست و دروست دەکەونە نێو گێژاوێکەوە خوای گەورە هۆکاری دەرچوونیان لەو گێژاوە بۆ ئاسان دەکات، بەم شێوەیە خوای گەورە کارێکی وای کرد کە بەری بێباوەڕانی لە موسڵمانان گرت بە جۆرێ کە دابەش بوون بۆ دوو بەش: بەشێکیان لەگەڵ ڕۆستەم مایەوە و بەشەکەی تریان لەگەڵ فیرزان بوو، ئەم هەواڵە گەیشتە بەهمەنی جازەوەیهی سەرکردەی فارسەکان و ئەویش خێرا گەڕایەوە بۆ مەدائن و ئەمیش لەوانە بوو کە لە سیاسەتی کارەکانیدا گوێی بۆ دەگیرا، بەم شێوەیە خوای گەورە جەنگی لەسەر باوەڕداران کۆتایی پێهێنا و ڕزگاری کردن لەم گێژاوە و موسڵمانان هەلی تەواویان وەرگرت بۆ ئەوەی سوپایەکی کۆمەککاریان لە لایەن خەلافەتەوە پێ بگات هەتا بەهێزبن بەم شێوەیە موسڵمانان بونە خاوەن سوپایەکی گەورە.[1]

## ح- هەڵوێستی عومەر (ﷺ) کاتێك کە هەواڵی تێکشکانی پێدەگات:

موسەننای کوڕی حارسە لەگەڵ عبداللە ی کوڕی زەیدی ئەنصاری هەواڵی ئەم جەنگەی گەیاندە عومەر(ﷺ) خەلیفەی باوەڕداران، عبداللە کاتێك کە لە عومەر چوویە پێشەوە عومەر لەسەر مینبەر بوو وە فەرمووی: ئەی عبداللە کوڕی زەید چیت پێیە؟ عبداللە وتی: هەواڵم هێناوە ئەی ئەمیری باوەڕداران، کاتێك عومەر لە وتارەکەی بوویەوە عبداللە هەواڵەکەی بە نهێنی پێگەیاند،[2] هیچ کەسیش نەبوە کە هێندەی ئەم لای عومەر جێی متمانە باوەڕ پێکراو بوبێت لەناو خەڵکیدا،[3] عومەرو ئەوانەی لە هاوەڵانی بە دەوریەوە بوون کاریگەر بوون بەم هەواڵەو فەرمووی: خوای گەورە هەموو موسڵمانێك لە لای منەوە گەردنی ئازاد بێت، منیش یارمەتی دەری هەر موسڵمانێکم، هەر کەس ڕووبەڕووی دوژمن بێتەوە و پاشان تێکشکا من یارمەتی دەری دەبم، ڕەحمەتی خوا لە ئەبو عوبەیدە بێت ئەگەر بهاتایە داوای یارمەتی لێبکردمایە بەهانایەوە دەچوم.[4]

ئەم هەڵوێستەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عومەر ئەو پیاوە بەهێزە و توند و تیژە بووە کە نەرم دەبێت و دەستی هاوکاری درێژ دەکات.[5]

### چوارەم: ڕووداوی بوەیب (١٣)ی کۆچی:

عومەر هەستا بە کۆکردنەوەی خەڵکی و ڕاپەڕاندنیان ، بەمەش کۆمەکی نارد بۆ سوپای ئیسلامی لەعێراق، لەنێو ئەوانیشدا جورەیری کوڕی عبداللە بەجەلی لەگەڵ هۆزەکەی و حەنزەلەی کوڕی ڕەبیع و هیلالی کوڕی عەلقەمەی لەگەڵ هۆزی ڕەباب و کۆمەڵێك لە تیرەکانی خەسعەم بە سەرکردایەتی

---

١ـ التأريخ الاسلام (١٠/٣٤٥، ٣٤٦).
٢ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢١٧).
٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢١٨).
٤ـ تأريخ الطبري (٤/٢٧٩).
٥ـ التأريخ الاسلام (١٠/٣٤٧).

عبدالله کوڕی ذي السهمين نارد و ڕەوانەی عێراقی کردن بۆ هاوکاری سوپای ئیسلامی، هەروەها هەریەکە لە عومەری کوڕی ڕەبیعی کوڕی حەنزەلە لە هۆزەکەی ، ڕەبعی کوڕی عامری کوڕی خالید هاتن بۆ لای خەلیفەو داوایان لێ کرد، کە ڕەوانەی عێراقیان بکات بۆ هاوکاری سوپای ئیسلام، بەم شێوەیە کۆمەکی و هاریکاری بە کۆمەڵ بەرەو عێراق و بەبێ دابڕان کەوتەڕێ ، لەهەمان کاتدا موسەننای کوڕی حارسەی شەیبانی پەیامی نارد بۆئەو کەسانەی فەرماندەیی موسڵمانان لەعێراق دەکەن و هانی دەدان، کە هاوکاری بکەن، ئەوانیش کۆمەکیان بۆنارد، تا ژمارەی سوپاکەی زۆر زۆر بوو.[1]

کاتێك کە سەرکردایەتی فارس بە کۆبوونەوەی ئەم سوپا گەورەیەیان زانی لای موسەننا، مەهرانی هەمەدانیان بە سوپایەکی فارسەوە نارد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپاکەی موسەننا، کاتێك موسەننا بەمەی زانی نامەیەکی نووسی بۆ ئەوانەی کە کۆمەکی بۆ دەنێرن لە بوەیب تا پێی بگەن کە ئەمیرەکەیان جورەیری کوڕی عبدالله بوو ، موسەننا نامەیەکی بۆ دەنووسێت کە تیایدا دەفەرمووێت: ئێمە گرفتێکمان هاتۆتەڕێ و توانای ڕووبەڕووبوونەوەمان نیە ، خێرا پێمان بگەن و شوێنی بەیەك گەیشتنیشمان بوەیبە، دواتر ئەم سوپایە لە ناوچەی بوەیب کۆبوویەوە و لە نێوان ئەم سوپایە و سوپای فارسدا تەنها یەك ڕووبار هەبوو، موسەننا لەوێ سوپاکەی دابەزاند، میهران نامەیەکی بۆ نووسی: یان بپەڕنەوە بۆ لامان یان دەپەڕینەوە بۆ لاتان، موسەننا فەرمووی: بپەڕنەوە، پاشان میهران بە سوپاکەیەوە پەڕیەوە و ئەمەش لە مانگی ڕەمەزانی ساڵ (١٣)ی کۆچیدا بوو، دواتر موسەننا وتارێکی بۆ موسڵمانان دا و فەرمووی: ئێوە بەڕۆژوون و ڕۆژووش خوێن بەست و لەهێزخەرە، من ڕام وایە، کە ڕۆژووەکەتان بشکێنن، تا بەهێز بن بۆ جەنگی دوژمنەکەتان، وتیان: بەڵێ و ڕۆژووەکەیان شکاند، پاشان موسەننا سوپاکەی کۆکردەوە و هانیدان لەسەر جەنگەکە، بە ئاڵا بە دەستەکانی فەرموو: من تکام وایە کە عەرەب لە پشتی ئێوەوە نەیەن، سوێند بە خوا ئەوەی بۆ خۆمم پێخۆشە بۆ ئێوەش بەهەمان شێوە پێم خۆشە، گێڕەرەوەکان دەڵێن موسەننا عاقڵترینیان موسەنا بوو کە توانی سوپاکەی بەشێوەیەکی وەها تێکەڵ بکات کەیەك ریزیەکی بەهێزی یەکگرتوی پێوە جیار بێت و عیچکامیش نەتوانن ڕەخنەی لێبگرن،[2] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەهێزی سەرکردایەتی و تواناو ژیریەتی، هەتا تاکەکانی سوپا لە بارەی خۆشەویستی و قایل بوونەوە گوێڕایەڵی بوون، کاتێك موسەننا دڵنیا بوویە ئامادەباشی سوپاکەی فەرمووی: من سێ الله أكبر دەکەم و لەگەڵ چوارەم الله أكبردا خۆتان ئامادە بکەن و ڕق لە دوژمن هەڵگرن، کاتێك کە موسەننا یەکەمین الله أكبری کرد فارسەکان پەلەیان لێ کردن و ئەوانیش کەوتنە پەلەکردن لە خۆیان و لەگەڵ سوپای فارسەکان تێکەڵ بوون هەر لەگەڵ ئەم یەکەم الله أكبردا وە لە باو خووی فارسەکان نەبووە کە ئەم جۆرە هەڵپەسانە بکەن ، بەڵام ڕەنگە ئەوەی لە جەنگی پرد فارسەکان بە دەستیان هێنا لە دووچارکردنی موسڵمانان ئەو ترس و سامەی

---

١ـ العمليات التعرضية الدفاعية، نهاد عباس (ص: ١١٥).
٢ـ تأريخ الطبري (٢٨٧/٤).

موسلمانانی لە ناخیاندا کەم کردبێتەوە، بەم شێوەیە فارسەکان دەستیان کردە هێرش کردن و موسلمانان لە بەرامبەریان خۆیان ڕاگرت و لە تێکگۆانێکی سەختدا لەڕوویان وەستانەوە، موسەننا لەگەڵ بەشداری کردنی لە جەنگەکەدا بە وریبینی چاودێری سوپاکەی دەکرد و هەندێ کەم و کورتی لە ژمارەیەك لە ڕیزەکانی سوپاکەیدا دەبینی و پیاوێکی نارد بۆ ناویان وتی: ئەمیری موسلمانان سڵاوتان لێ دەکات و فەرمووی: ئەمڕۆ موسلمانان ڕیسوا نەکەن، ئەوانیش وتیان: بەڵێ، پاشان ڕیزەکانی خۆیان ڕێك کردەوە،[1] کاتێك جەنگەکە درێژەی کێشا و جەنگەکە گەرم بوو موسەننا بە ئەنەسی کوڕی هیلالی فەرموو: ئەی ئەنەس ئەگەر تۆ منت بینی کە هەڵدەکوتمە سەر میهران لەگەڵم هەڵکوتە سەری،هەمان شتیشی بە ئیبول مەری فەهری وت ئەویش بە ئەرێ وەڵامی دایەوە ، دواتر موسەننا هەڵیکوتایە سەر میهران، ڕایماڵی هەتا خزاندیە نێو ڕاستە ڕێگایەو موسەننا فشاری خستە سەر دوژمنەکەی و تێك ئاڵان، هەردوو دڵەکە تێکەڵ بوون و تەپ و تۆز بەرز بوویەوە و پێشەنگەکانیش کەوتنە جەنگ، کە ناتوانن خۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆسەرخستنی فەرماندەکەیان نە بێباوەڕان و نە موسلمانانیش، مەسعودی کوڕی حارسەی سەرکردەی پیادەی موسلمانان بە سەربازەکانی فەرموو: ئەگەر ئێوە ئێمەتان بینی وا خەریکە تیا دەچین واز لەوە مەهێنن کە تیایدان، چونکە سوپا شکست دێنێت و تیا دەچێت ئێوە شوێنی جەنگی خۆتان پتەو بکەن[2] بەوانەی دوای خۆتان هەڵبدەن، پاشان مەسعود و چەند سەرکردەیەکی موسلمانان بریندار بوون و مەسعود بینی بە هۆی بریندار بوونیەوە ئەوانەی کە لەگەڵیدان لاواز بوون و خۆشی سستە و برینەکەی قورس بووە فەرمووی: ئەی سەربازەکانی بەکری کوڕی وائل ئاڵاکانتان بەرز بکەنەوە خوای گەورە سەربەرزتان بکات، با چارەنووسی من نەتان تۆقێنێ، موسەننا چارەنووسی براکەی زانی و بە خەڵکەکەی فەرموو: ئەی نەتەوەی موسلمان با چارەنووسی براکەم نەتان ترسێنێ بە ڕاستی چارەنووسی پیاوچاکەکانی ئێوە هەر بەم شێوەیە دەبێت، ئەنەسی کوڕی هیلالی نومەیری جەنگا هەتا بریندار بوو، موسەننا ئەنەس و مەسعودی بۆ هەڵگرت و گرتنیە کۆشی، جەنگیش درێژایی بەرەکە گەرمەو بەردەوامە، بەلام دڵەکان لە دژی بەرژەوەندیەکانی فارس دەستی کردەلێدان و وەرەی بەرزو توانای موسلمانان دڵی مەجوسەکانی هەژان و هێنایە لەرزین، موسەننا ڕەگی خۆی لەم جەنگەدا داکوتا، لەوانەی کە لە دڵی سوپاکەدا بون و پێشنگ بون جورەیری کوڕی عبداللە، ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون بەجیر و إبن ئەلو و مونزیری کوڕی حەسان بوون ولای چەپیش قورتی کوڕی جماشی عەبینی جەنگا تا لە نێو دەستیدا شمشێرەکەی و ڕمەکەشی تێك شکا، شەهریرازی بازرگانی فارس و سەرکردەی ئەسپ سوارەکانی لە جەنگەکەدا کوشت، جەنگ بەردەوام بوو تا موسلمانانورەو توانای بێبڕوایانیان لەناوبرد و تیایدا ڕۆچوون،[3] موسەننا لە بەرزاییەکەوە وەستا تا تەپ و تۆزەکە ڕەویەوە، دڵی بێباوەڕان تیاچوو وە مەهرانی سەرکردەیان کوژرا و پێشەنگەکانیش یەکتریان هەژاند،کاتێك موسلمانان بینیان ورە روخاوەو خەڵکەکەی تیاچوون و پێشەنگەکانیش لەسەر

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٢٨٧).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٢٨٨).
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٣٣، ٤٣٤)، تأريخ الطبري (٤/٢٨٩).

هاوبەش پەیداکەران بەهێز بوون، عەجەمەکانیان لەسەر پشت تێهەڵکردنیان گێڕانەوە، موسەنا و موسڵمانانیش لە دڵەوە دوعای سەرکەوتنیان بۆ کردن، کەسێکی نارده لایان،کە پێی دەوتن: عادات و ڕەفتارو خوڕەوشتتان لە نموونەکانتاندایە، دین و ئاینی خوای گەورە سەربخەن خوای گەورە سەرکەوتووتان دەکات، هەتا ئەو گەل و نەتەوەیەیان تێکشکاند، موسەنناش پێشیان کەوت بۆ سەر پردەکە و پێشی لێ گرتن، و عەجەمەکانی گرت، ئەوانیش بە کەناری ڕووباری فوڕاتدا بڵاوەیان لێکرد، ئەسپی موسڵمانان کردنیانە بنەما هەتا کوشتنیان و دواتر لەبەر زۆریان کردنیانە تەپۆلکە، تەنانەت هەندێ لە گێڕەرەوان باس لەوە دەکەن کە ژمارەی کوژراوی بێباوەڕان گەیشتۆتە سەد هەزار کەس.[1]

## ١- کۆنگرەی دوای جەنگەکە:

شەڕ و پێکدادان دوایی هات و موسەننا و موسڵمانان دیقەتی ئەوەیان دا کە دەیان هەزار جەستە بە خوێن و لاشەیان زەویان داپۆشیووە، موسەننا لەگەڵ سوپاکەیدا دانیشت بۆ ڕا و سەرنج گۆڕینەوە و پرسیاری لێ کردن سەبارەت بەوەی کە ئەنجامیان داوە، هەر کە پیاوێك دەهات موسەننا پێی دەفەرموو: هەواڵم پێ بدە دەربارەی خۆت و ئەوانیش کۆمەڵە شتێکیان بۆ دەگێڕایەوە کە دیمەنێك بوو لە جەنگەکە ، موسەننا فەرمووی: لە سەردەمی جاهیلیەت و ئیسلامیشدا لە دژی عەرەب و عەجەم جەنگام، سوێند بە خوا سەد کەس لە عەجەم لە سەردەمی جاهیلیەتدا زۆر توند و تیژتر بوون لە هەزار کەسی عەرەب لە سەرم، سەد کەسی ئەمڕۆ زۆر توند و تیژتر بوون لە سەرم لە هەزار کەسی عەجەم، خوای گەورە ڕاستگۆییانی ڕەواندوە و فرت و فێڵی کپ کردنەوە، با جوانیان نەتان تۆقێنێ ـ واتا ڕووخساریان ـ هەروەها ڕەشۆکیان ـ واتا زۆریان ـ نە قەشەیەکی ناحاڵی ـ واتا ژێی دامەزراوە ـ وە ئەگەر پەلەیان لێ کرد یان ونیان کرد وەك ئاژەڵ و گیاندار با درێژایی بە دەست نەهێنێ وە ڕووتان کردنە هەرکوێ ڕووی تێدەکەن.[2]

ئەم پەیڤە لەم کاتە شیاوەدا زۆرگونجاو بوو، بە جۆرێك موسەننا شارەزایی باشی لە جەنگەکەیدا لەگەڵ فارسدا خستەڕوو لە کاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆر گەورەی موسڵمانان چوونەتە نێو جەنگی عێراقەوە و بۆ یەکەمجار لە دژی فارسەکان بەشداری دەکەن، بەمەش مەسەنناش بەمە دوو بارودۆخی بۆ کۆکردنەوە لە نێوان بینینی جەنگێك لە جەنگەکان و لە نێوان پێناسەی ئەزموونەکانیدا کە لە هەموو جەنگێکدا و لە پێش ئەمە لەگەڵیان قۆستوویەتیەوە.[3]

## ٢- خەم و خەفەتی موسەننا لە بڕینی هێڵی پاشەکشە لەسەر فارسەکان:

موسەننا زۆر خەم و خەفەتی لەسەر بڕینی هێڵی پاشەکشەی سەر فارسەکانی دەخوارد و لەسەر پردەکە پشتی لێ گرتن و فەرمووی: بە ڕاستی دابڕینێك دام بڕین و خوای گەورە خراپەی ئەم کارەی لێ

---

١ التأريخ الاسلام (٣٤٩/١٠)، تأريخ الطبري (٢٨٩/٤).
٢ـ تأريخ الطبري (٢٩٠/٤).
٣ـ التأريخ الاسلام (٣٥٢/١٠).

لادام پاش ئەوەی کە پێش فارسەکان کەوتم بۆ سەر پردەکە، وای بڕی هەتا شەرمەزاریان بکەم و منیش گەراوەم، بەڵام ئێوە ئەی خەڵکینە مەگەڕێنەوە و پابەند مەبن بە منەوە، ئەوە لە منەوە بوو هەڵخلیسکانێ بوو، ناکرێت هیچ کەسێك شەرمەزار بکرێت مەگەر توانای بەرگرتنی نەبێت،[1] موسەننا لە دوایین وتەکانیدا هەڵەی ئەم وتارەی خستەڕوو بە جۆرێ بە دید ڕوونی جەنگی تێبینی کرد کە بەرگرتنی دوژمنان لە هەڵهاتن پەنای پێ گردن بۆ کپ کردنەوەی جەنگەکە وەك بەرگری کردنێك لەخۆیان و ئەمەش مانای وایە کە مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە کوژراوە هەموو هەوڵێکی خۆی لە پێناو بەرگری لە خۆکردن بەکاردێنێ، بەم شێوەیەش سوپای بەرامبەر هەوڵێکی زۆر دەخاتە گەر بۆ هەوڵی کۆنترۆڵ کردنی بەڵام خوای گەورە موسڵمانان دەپارێزێت لە خراپەی ئەم پلانە هەروەکو ئەوەی کە موسەنا باسی دەکات بە جۆرێ کە موسڵمانان چەسپان هێز و تواناییان زۆر بەرزتر بوو لە ئەگەری دوژمن و تواناکانیان و خوای گەورەش ترسی موسڵمانانی خستە دڵی دوژمنەوە تا[2] تەواوی توانا و هێزەکانی خۆیان لە دەست دا لەسەر بەرگری لەخۆکردن لە دان پێدانانی موسەننا بەم هەڵەیە، کە پیاوێکە گەیشتۆتە ئەوەی ئەم جەنگە گەیشتۆتە لوتکەی سەرکەوتن و ناوبانگ دەرکردن کە بەڵگەیە لەسەر بەهێزی باوەڕەکەی، و تەنهایی لە چانسی دەروون و وورووژانی بەرژەوەندی کۆمەڵ و بەم شێوەیە گەورە پیاوان وا دەبن.[3]

## ٣- دەروونزانی سەربازی لای موسەننا:

لەگەڵ ئەو هەموو بلیمەتیەی کە لە ناخی موسەننا بۆمان دەرکەوت بلیمەتیەکانی ئەو پیاوە لایەنێکی قووڵی تریشی گرتۆتەوە کە پەیوەست بوو بە باری جەنگیەوە ئەویش دەروونزانی سەربازی و مامەڵەکردن بوو لە گەڵ موجاهیداندا ، ئێمە لێرەدا گیانێکی پڕ لە خۆشەویستی بە پیت بەدی دەکەین کە موسەننا گڕێ دەدات بەوانەی، کە لەگەڵیدان لەگەڵ لایەنێکی سۆزداری بەرامبەریان ، ئەمەش لە ئاخاوتنەکانی لەگەڵیان و قسەکردنی بۆیان دەردەکەوێت، ئەمەش لە میانی سووڕانەوەی بە گرتنە پڕشنگدارەکەی کە لەسەر بایەخدانی ئەوانەوە بەیداخی هەبوو، ئەمەش دڵی گەرم دەکرن و ئامۆژگاریەکانی پێ دەبەخشین و بە جوانترین شێوە هەستی دەبزواندن و پێی دەفەرموون: سوێند بە خوا ئەمڕۆ هیچ شتێك کامەرانم ناکات جگە لەوەی کە ئێوە بەختەوەر دەکات،[4] لەبەر ئەوە ئەوانیش بە هەمان شێوە خۆشیان دەویست، چیرۆك خوانان دەڵێن: کەسێك نەیتوانیووە کە لە کردار و گوفتاریدا عەیبەیەك بگرێت،[5] کاتێ ڕیزەکانی عەجەمی بینی کە خەریکی بەرزکردنەوەی دەنگیان بوون هێرشی خۆی ئەنجام دا و دەیزانی کە ئەمە هیچ کاریگەریەکی نیە لە جەنگی بەیەك گەیشتنەوە، بە تایبەتی و

---

١ـ تأريخ الطبري (٢٩١/٤).
٢ـ التأريخ الاسلام (٣٥٠/١٠).
٣ـ هەمان سەرچاوە.(٣٥٥/١٠).
٤ـ تأريخ الطبري (٢٨٧/٤).
٥ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٤٦).

یادەوەری جەنگی پردی ئەبو عوبەیدە کە نموونەیەك بوو لە هەزر و هۆشەکاندا کە وشەیەکی هێور و هێمنی فەرمووو کە هاوکار بوو لەسەر دامەزراوی و دەچوویە نێو ناخەوە هەتاکاریگەری ئەو دەنگە تۆقێنەرە پوچەڵ بکاتەوە، موسەننا لە ئارامشێکدا بانگەشە بۆ سەرسامی دەکات و دەفەرمووێت: ئەوەی کە دەیبیستن سەرنەکەوتن و ئێوەش ئارام بن و ئێوەش بە ئەسپایی ڕاوێژی خۆتان بکەن،[1] کاتێك کە مەسعودی برای بە توندی و سەختی پێکرا موسەننا ئەو وتەیەی خۆی درکاند کە پێویستە بە ئاوی زێڕ بنووسرێتەوە و پیتەکانی پڕشنگدار بن فەرمووی: ئەی گەلی موسڵمانینە، لە ناوچوونی براکەم نەتان ترسێنێت، بە ڕاستی چارەنووسی پیاوچاکەکانتان هەر بەم شێوەیە دەبێت هەروەها وتەی براکەشی هیچی لەمە کەمتر نەبوو کە هەناسەکانی روویان لە کۆتایی دەکرد و مزگێنی شەهیدیان دەهێنا دەیفەرموو: بەیداخەکانتان بڵند بکەنەوە با خوای گەورە سەربەرزی و سەرفرازتان بکات، چارەنووسی من نەتان تۆقێنێ، کاتێك کە موسەننا نوێژی لەسەر براکەی خوێند لەگەڵ هەندێ شەهیدانی تر فەرمووی: سوێند بە خوا ئەوە لە خەم و خەفەتی من کەم دەکاتەوە کە ئەمانە بوەیبیان بینی و بە ئارام بوون و هاتنە پێشێ و بە ئارام نەبوون و پەنگیان نەخواردەوە، بەڕاستی لە شەهیدیشدا گەردن ئازادانەیەك هەیە کە گوناهەکان دەوەرێنێ،[2] هەروەها موسەننا خۆشەویست بوو بۆ سەربازەکانی و بە سۆز بووە بۆیان و تەواوی بارودۆخەکانی بەسەر دەکردنەوە لە هەمان کاتیشدا دڵگەرم و دلێر بوو بەو شێوەیە بوو کە کەسانی سەربازی نوێ بە (ڕێکخەر و پەیوەستی) ناوزەد دەکەن،[3] ئەو کاتێك کە پیاوێکی بینی لە ڕیزەکەیدا خۆی تەیار دەکرد و دەچوویە پێشێ لە ڕیزەکەیدا موسەننا فەرمووی: ئەوە چیەتی؟ وتیان: ئەو پیاوە ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی جەنگی پرینی هەڵهات، ئێستا دەیەوێ بکوژرێت، موسەننا بە ڕمەکەی هەژاندی، فەرمووی: من باکت ناگرم، شوێنی خۆت بگرە ئەگەر نۆبەت هات نیازی لێ بگرە لە هاوڕێکەت و داوای کوشتنی لێ مەکە، ئەویش وتی: من بەمە سوپاسگوزارم، پاشان هێمن بوویەوە و پابەند بوو بە ڕیزەکەیەوە،[4] هەروەها موسەننا بەسۆز بوو لەگەڵ سوپاکەی و بە ڕاستی و بە تەواوی هەست و نەستی ئاڵوگۆڕی هەبوو، ئێمەش ئەمە بە ڕوون و ئاشکرایی لە هۆنراوەی ئەو جەنگەدا بەدی دەکەین کە بە سەر زاری سەربازانیەوە دەهاتن و دەچوون ئەمەش ئەعوەری ئەلشەنیە کە دەفەرمووێت:

| | |
|---|---|
| هاجت لأعور دار الحي أحزانـــاً | واستبدلت بعد عبد القيس حفـــاناً |
| وقد أرانا بها والشمل مجتمـــع | إذ بالنخيلة قتلى جند مهـــرانـا |
| أزمان سار المثنى بالخيول لهـــم | فقتل الزحف من فرس وجيـــلانـاً[5] |
| سما لمهران والجيش الذي معــــه | حتى أبادهم مثنى و وحدانـــــا |

---

١ـ هەمان سەرچاوە.
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٢٩١).
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٤٧).
٤ـ تأريخ الطبري (٤/٢٨٣).
٥ـ جيلان: إسم لبلاد كثيرة وراء طبرستان.

ما إن رأينا أميراً بالعراق مضى مثل المثنى الذي من آل شيبانـا
إن المثنى الامير القرم لا كـذب في الحرب أشجع من ليث بخفانا[١]

خاوەنی ئەم دێرە هۆنراوەیە فەزڵی موسەننا دەدات بەسەر ڕاشکاوی خالـدی کـوڕی وەلیـد و ئـەبو عوبەیدەی ئەلسەقەفیدا، هەروەها ئەعوەر پیاوێکی هۆزی عبد قیس بووە نەك هۆزی بـەنی شـەیبان و بەکری کوڕی وائل تاوەك ڕەگەز پەرستی ئەم چەند ڕێزە هۆنراوەیەی وتبێت.[٢]
بە ڕاستی موسەننای کوڕی حارسە سەرکردەیەکی دووربین بـووە لـە دەروون زانـی سـەربازیدا پـێش ئەوەی هەر مامۆستایەکی پسپۆڕی پیشەیی لەم زانستەدا بە چەند سەدەیەك نەخشەسازی بۆ بکات.[٣]

## ٤- هەڵوێستی خێزانی موجاهیدان:

لـەو هەڵوێـستانەی کـە دەکرێـت ئامـاژەی پـیّ بکرێـت لـە ئافرەتـانی موسـڵمانەوە و کاتێـك کـە سەرکردەی موسڵمانان هەندێ لەو خۆراکەیان بۆ ناردن کە پێیان گەیشتبوو، کە لەگەڵ عـەمری کـوڕی عبدالمسیحی کوڕی بوقەیلە و چەند پیاوێکدا لە هۆزی ئەنصار ڕەوانەیان کرد، کاتێك کە ژنـان بـەدیان کردن بە پەلاماریکیان لە قەڵەم دا و لەگەڵ منداڵان هەستان بـە بـەردباران کردنیـان ، عـەمری کـوڕی عبدالمسیح فەرمووی: ژنان و ئافرەتانی ئەم سوپایە دەبێت بەم شێوەیە بن ، ئێوە مزگێنیان پیّ بدەن بە ئازادیخوازی.[٤]
ئەم هەڵوێستە بەڵگەیە لەسەر باشـی پـەروەردەی ئیـسلامی و دەرکـەوتنی کەسـایەتی موسـڵمانان تەنانەت لای ئافرەتانیش، چونکە ئەوان ڕاهاتوون لەسەر پاراستنی ئەم هەڵوێستە لەوەی کە لە پیـاوان تەنیا ببنەوە، ئەم سەرکەوتنە چارەنووس سازەش لەسەر دەستی موسڵمانان و لە نێوان ئەو دوو ڕووبارە بەدی کرا و موسەننا سەرکردەکانی ڕەوانە کرد هەتا بڕۆنە نێو ئەو وڵاتانەوە بۆ دەسەڵاتی موسڵمانان و خۆیان بەهێز بکەن بەو دەستکەوتەی کە خوای گەورە لە جیهادی دوژمنان پێی بەخشیبوون.[٥]

## ٥- ڕاوەدوونانی گروهی دۆڕاوان:

لە خۆیایی بوونی سەرکەوتن ڕێگەی لە موسەننا نەگرت کۆڵ بە مەبەستەکەی بـدات، خـەڵکی بـە هۆی کاریگەری ئەم جەنگـە و بـە دوای سـوپای سـەر شـۆڕ و دۆڕاودا بـۆی گریـان و ئـەویش داوای لیّ کردن، کە دوای بکەون بۆ ناوچەی ئەلسەیب و موسڵمانان بە دوای گروە و کۆمەڵی دۆڕاواندادەرچوون و لە نێو ئەوانیشدا لە ئامادەبوانی جەنگی پردی ئەبو عوبەیدە هەبوون، موسڵمانان غەنیمەتێکی زۆریان دەسـت کـەوت بێباوەڕانیـان ڕاونـا، تـا گەیـشتنە (سـابات)و پاشـان بـە لێهـاتوویی گەڕانـەوە بـۆ لای

---

١ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٤٠)، وبعضها تأريخ الطبري (٢٣٩/٤).
٢ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٤٧).
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٤٨).
٤ـ التأريخ الاسلامي (٣٥٢/١٠)، تأريخ الطبري (٢٩٢/٤).
٥ـ التأريخ الاسلامي (٣٥٢/١٠).

موسەننا، ڕەنگە بەهای جەنگی بوەیب، لە چاکسازی ئەو کاریگەریە دەروونیە نەبوویێت کە پاش جەنگی پرد بە تەنها سەری هەڵدا، بەڵکو موسڵمانان دەریان خست کە بە توانان بۆ زاڵ بوون بەسەر تەواوی عێراقدا، ئەوان سەرەتا لە ناوچە گەلێکدا دەجەنگان کە لە ڕووباری فورات تێپەڕی نەدەکرد پاشان لە نێوان ناوچەکانی نێوان دیجلە و فورات جەنگان، بەڵام پاش بوەیب لە هەموو ئەو ناوچانە نیشتەجێ بوون کە بە کەناری ڕووباری دیجلە و فوراتدا درێژ دەبێتەوە: ئەوەیان بۆ خۆیان کردەماڵ و لانکە و نەدەترسان لە فێڵی دوژمنان وە تیایدا ڕووبەڕووی هیچ ڕێگریەك نەدەبوونەوە،[1] هەروەها غەزای بوەیب هاوشێوەی غەزای یەرمووك بوو لە شام.[2]

## پێنجەم: کردە جەنگیەکانی بازێڕەکان:

پاش جەنگی بوەیب ڕووداوەکە بۆ موسڵمانان هێور بوویەوە، خەڵکی ڕەشۆکی لێیان ڕامابوون و موسەنناش دەستی کردە گەڕان بەملاو بەولادا، و سەرکردەکانی دابەش کرد و چەکدارەکانی وریا کردەوە، پەلاماری کۆبوونەوەی فارس و عەرەبەکانیدا لەو پەلامارانەش پەلاماردانی بوو بۆ سەر (خنافس) ، کە بازێڕێك بوو خەڵکی بە کۆمەڵ ڕوویان لێ دەنا، تیایدا ڕەبیعە و موضیر کۆدەبوونەوە و پاسەوانیان پێ دەگرتن، موسەننا پەلاماری ئەو بازاڕەی دا و وێرانی کرد هەرچی زەویەکی[3] تێدابوو دەستی بەسەردا گرت، پاشان بە پەلە ڕۆیشت هەتا ڕێگەی بە بازرگانەکانی ئەنبار گرت هەر لە سەرەتای هەمان ڕۆژدا کە دەیفەرموو:

| | |
|---|---|
| صبحنا بالخنافس جمع بكرٍ | وحيا من قضاعة غير ميلِ |
| بفتيان الوغى من كل حيٍّ | تبارى في الحوادث كل جيل |
| أبحنا دارهم والخيل تــروي | بكل سميدع سامي التليــل |
| نسقنا سوقهم والخيــل رودٌ | من التطوف والشر البخيل[4] |

پاشان پشتی بە بازرگانەکانی ئەنبار بەست و پەیمانی لێ وەرگرتن و پلانێکی ڕێك خست بۆ پەکخستنی بازاڕی بەغداد، بە دیجلەدا پەڕییەوە و لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەمین ئاسۆی بەرەبەیاندا گەیشتە شاری بەغد و بازاڕەکەی، شمشێرەکەی لەسەر گەردنی خەڵکەکەی داناو هەندێکی لێ کوشتن و هاوەڵەکانی هەرچیەکیان ویست بردیان، موسەننا فەرمانی پێدان کە جگە لە زێڕ و زیو هیچی تر نەبەن، شتێك نەبەن کە وڵاخەکانیان توانای هەڵگرتنی نەبێت،[5] بەم شێوەیە بازاڕیەکان هەڵاتن و موسڵمانانیش دەست و مەچەکیان پڕکرد لە زێڕ و زیو و ئازاد بوون لە هەموو شتێك پاشان

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٢٩٣).
٢ـ ترتيب وتهذيب البداية والنهاية، خلافة عمر (ص: ٩٣).
٣ـ تأريخ الطبري (٤/٢٩٦).
٤ـ المراد من البيت أنهم شنوا الغارة على مهل.
٥ـ تأريخ الطبري (٤/٢٩٦).

پەلاماریانداو گەرانەوە تا گەیشتنە ڕووباری سبلحین،[1] کە دەکەوێتە (٣٥)کم شاری بەغدا و لەوێ دابەزی و فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئارەزووەکانتان بەجێ بهێنن و خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕۆیشتن و سوپاسی خودا بکەن و داوای لەش ساغی و تەندروستی لێ بکەن و پاشان خۆی ئامادە کرد، ئەوانیش بەو شێوەیەیان کرد، نزیکەی (٦٠)کم بەسەر پشتی ئەسپەکانیاندا بڕی کە چەند پەلامارێکی بە دوادا هات، هەموو ئەوانە لە یەك قۆناغدا بوون پاش ئەوەی کە لە دوایین سات‌ەکانی شەودا لە شاری بەغداد ڕەشانەوە هەتا گەرانەوە، موسەننا ئەوەی بەدی کرد کە خۆیان و ئەسپەکانیشیان بە حەوانەوە و موسڵمانان هەست بە دووربینی ئەو ڕۆچوونە دەکەن و لە کاتێکدا کە نێوانیاندا تێدەپەڕێ و گوێ بیستی چرپەچرپ دەبێت، یەکێکیان دەڵێت: ئەم نەتەوە چەند پەلەیان لە داخوازیماندا کرد، موسەننا فەرمووی: بە چاکە و خواناسی ڕاز و نیازی خۆتان بکەن، و بە خراپە و دوژمنکاری ڕاز و نیازی خۆتان مەکەن، سەیری کارەکان بکەن و هەڵی بسەنگێنن و پاشان قسەی خۆتان بکەن... نەیان توانی چارەسازی شارەکەیان بکەن پاش ئەوەی کە بۆ حاڵی تۆقاندنی نێوانی و نێوانیانی گەیاندە خواستەکانیان، بە ڕاستی پەلامارەکان ترس و سامێکیان لەسەرە لە ڕۆژەوە بۆ شەو، ئەگەر پارێزەران لە ڕووی بینابییەوە داوایان کردن ئەوا هەستیان پێ ناکەن و ئێوەش لەسەر ئەسپی نامۆیین (ئەسپی ڕەسەن) کە لەسەر نالەباران بوون، ئارام بن تا دەگەنە سەربازانتان و گروهەکانتان، ئەگەر هەستتان پێ بکەن ئەوا بۆ دوو هۆکار لەگەڵیان بە جەنگ دێن، کە بەیەك گەیشتنی پاداشت و تکای سەرکەوتنە، متمانەتان بە خودا ببێ و گومانی باشەی پێ بەرن، چونکە خوای گەورە لە چەند جێگەیەکی تردا سەرکەوتنی پێ بەخشیوون و هەر ئەویش لە ئێوە لە(کەسانێکی زۆری) لێ ئامادە کردوون وە هەواڵتان پێ دەدەم بە خۆم و بە چوونە پاڵ یەکم، کە من ئەوەم دەوێ، ئەبو بەکر(ﷺ) وەسیەتمان بۆ دەکات کە لە بەرزبوونەوە (ڕەساندن) کەم بکەینەوە و پەلامار لە هێرشەکانماندا خێراتر کەم بکەینەوە، پەلەش لە ئەم گەرانەوەیەدا نەکەین.[2]

هەر بەم شێوەیە موسەننا لە شەڕ و جەنگ گەیشتبوو، لەسەر حسابی هەژمار کراوان و پلان و نەخشەسازی دەستووری باوەڕێکی قووڵ و پتەو کاری دەکرد، هەموو جەنگێك دانایی و ئەزموون و زانیاری و زانستێکی دەدرایە پاڵ، کە لە بلیمەتی جەنگی ئەبوبەکر ی صدیقی بۆمان ڕوون دەکردەوە کە موسەننا لەسەری بووبوویە فێرخوازێك و لەگەڵ ئەوەی کەسێك لەو شارەزاییەی پێ گەیشتبوو بەلام سوودی لێ وەرگرتبوو،[3] موسەننا ڕاپەڕی و فەرمانی پێدان بە ئەسپ سواری، پێشوازی لێ کردن ئەوانیش منالەکانیان لەگەڵ بوو کە دەشت و چۆڵ و ڕووبار و ئاوەکانی پێ بڕین تا گەیشتنە ناوچەی ئەنبار، ئەو دەمە بازرگانان بەرێزەوە پێشوازیان لێکردن و خۆشحاڵ بوون بە لەش ساغی و سەلامەتی

---

١ـ قال أحمد كمال:- أعتقد أنه نهر صرصر، الطريق الى المدائن (ص: ٢٥٥).

٢ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٥٧).

٣ـ حركة فتح الاسلامي، شكري فيصل (ص: ٧٨)، تأريخ الطبري (٢٩٩/٤).

موسەننا وە موسەننا بەڵێنی پێ دابوون کە چاك ببێت بۆیان ئەگەر لە کاروبارەکانی بەو شێوەی کە پێیان خۆشە بۆ سەقامگیرکردن بە جۆرێك کە یەکێکیان وتی:

وللمثنى بالغال معركـــةٌ     شاهدها من قبيلة بشـــرٌ
كتيبة أفزعت بوفعتهـــا     كسرى وكاد الايوان ينفـطر
وشجع المسلمون إذ حذروا     وفي حروب التجارب العـبر
سهل نهج الليل فأقتفروا     آثار والامور تقـــــتفر[1]

پاشان موسەننا هێرشەکانی لەسەر باکووری عێراق بەرفراوان کرد لەم پەڕی باکوور تا ئەوپەڕی باشووری گرتەوە، پاشان هێرشەکانی ڕەوانەی (الکباث) کە تەواوی دانیشتوانەکەی لە بەنی تەغـەلوب بوون، ئەوانیش ناوچەکەیان چۆڵکردو هاتنەکەی موسەننایان پەسەند نەکرد، دواتر موسڵمانان شوێنیان کەوتن و شوێن پێیان هەڵگرتن، بەدواییینیان زانی و زۆربەیان کوشتن، پاشان موسەننا بەدوو پۆل هێرشەکانی ڕەوانەی سەر ناوچەکانی تەغەلوب و نەمر کرد.[2]

موسەننا لە دوای بوەیب سەرکردەی هەموو ئەم هێرشانە بوو، کە لە پێشیانەوە حوزەیفەی کوڕی محضی غەلفانی و لەسەر پێشنگەکەیەوە نوعمانی کوڕی عەوفی کوڕی نوعمان و مطری شەیبانی هەبوون، هەروەها ئەوەش ڕوویدا کە لە یەکێك لە هێرشەکانی موسەننا سوپاکەی هەستی بە بوونی چەند کۆمەڵێکی دوژمن کرد لە تکریت کە لەگەڵ ئاودێری تێکەڵ بووبوون و هەرچیەکیان لە مەڕومالآت بویستایە چنگیان کەوتبوو، هەتا پیاوێك پێنج ئاژەڵ و پێنج ئاوماڵ و پێنج ماڵی دەست کەوتبوو، لەگەڵ خۆی هێنابوونی تا لە نێو خەڵکی ئەنبار نیشتەجێیان بکات، پاشان موسەننا گەڕایەوە بۆ ئەنبار و فوراتی کوڕی حەیان و عوتەیبەی کوڕی نەهاسی نارد بۆ صەفین تا هێرش بکەنە سەر گەرەکە عەرەبەکانی هۆزی تەغەلوب و نەمر—پاش ئەوەی کە ئەنباری کردە پێگەیەکی پێشکەوتوو— عەمری کوڕی سەلمای هەجیمی لەسەر کردە خەلیفە و شوێن پێی هەڵگرتن، کاتێك کە لە صەفین نزیك بوونەوە موسەننا لە فورات و عوتەیبە جیابوونەوە خەڵکی صەفین هەڵهاتن و لە فورات پەڕینەوە بۆ ناوچەکانی دورگەی عەرەبی تیایدا جێگیر بوون، دیارە ئەوانیش لە هۆزەکانی تەغەلوب و نەمر کۆمەکی کرابوون، پاشان فورات و عوتەیبەدوویا کەوتن هەتا هەندێکیان لێ خستنە ئاوەکەوە، بانگیان دەکرد (خنکا خنکان) و عوتەیبە و فورات هانی خەڵکی دەدا و پێکەوە دەیان وت (ژێرئاوکەوتن بە سوتان) ئەوان ئەو ڕۆژانەی سەردەمی جاهیلیەتیان وەیاد دەهێنانەوە کە تیایدا هۆزێکیان لە تیرەی بەکری کوڕی وائل لە یەکێك لە جەنگەڵەکاندا سوتاند، پاشان گەڕانەوە بۆ لای موسەننا پاش ئەوەی ئەوانیان لە فوراتدا ژێرئاو کرد، ئەم هەواڵە لە شاری مەدینەی پیرۆز گەیشتە عومەر، ئەو لە هەر سوپایەکدا چاوێکی هەبوو کە پەیامی بۆ دەنووسی، عومەر داوای فوراتی کوڕی

---

١ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٥٧).
٢ـ حركة فتح الاسلامي، شكري فيصل (ص: ٧٨)، تأريخ الطبري (٤/٢٩٩).

حەبیان و عوتەیبەی کرد و لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کردن، ئەوانیش هەواڵیان پێدا کە ئەوان بە شێوەی پەندێك ئەوەیان وتووەو کاریان پێ نەکردووە لەسەر شێوەی تۆڵەی جاهیلیەت، عومەر سوێندی دان، ئەوانیش سوێندیان خوارد کە جگە وەك پەند و سەرفرازیەکی ئیسلام هیچ نیازێکیان لەمەدا نەبووە، عومەر ڕاستیەکەیانی بۆ دەرکەوت و گێڕانیەوە بۆ عێراق و ئەوانیش لەگەڵ هەڵمەتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص گەڕانەوە بۆ لای،[1] هەروەها عومەری فاروق سور بوو لەسەر چاوەدێری ئەخلاق و دوربینی خەڵکی لە تەشەنەکردنی خراپە .[2]

موسەننا سەرکەوتنە گەورەکەی چوارەمی ڕۆژی بوەیبی قۆستەوە و چەند هێرشێکی ڕێك و پێکی کردە سەر بازاڕەکانی باکووری عێراق ، پاشان موسەننا دوای سازندنی خوای گەورە و پاش ئەوەش کە خوای گەورە لە سیفەتەکانی سەرکردەی سەربازی پێ بەخشی توانی ئەو بنەمایە لە قولایەکدا بەجێ بهێنێ کە نزیکەی (٤٠٠) کم و زیاتر بە ڕووی باکووردابوو، بە پێچەوانەی ئەوەی کە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باشوور لەسەری درێژ بونەوە بەم هێڵەدا پێیان بەخشی،[3] هەروەها لەو کردە جەنگیانەیدا چەندین کاری ستراتیژی و تەکنیکیان چەسپاند، گومانی تێدا نیە کە ئەم کردانە ڕووی لە دەسەلاتی فەرمانڕەوایی فارس کرد و لەبەردەم گەلەکەیدا گەورەترین سوکایەتی پێکرد، متمانەی لە توانای هەستانی بە بەرگری کردن دژ بە هێرشەکانی نەتەوەیەك لاواز کرد کە فارسەکان تا ئەو دەمەش بە چاوێکی وا سەیریان دەکردن کە پڕ بوو لە سوکایەتی پێکردن.[4]

## شەشەم: کاردانەوەی فارس:

ڕووداوەکان وەك ئەوە نەبوون، کە بە ئاسانی تێپەڕن و لە لایەن فارسەکانەوە کاردانەوەیان لە خولگەکانی دەسەلاتدا نەبێت بۆیە گەورە پیاوانیان کۆبوونەوە و بە ڕۆستەم و فیرزانیان وت: ناکۆکی و دووبەرەکی بەرەو کوێتان دەبات هەتا خەڵکی فارستان تۆقاندووە و دوژمنانتان لێ تێرکردووە، سوێند بە خوا جگە لە ئێوە کەس ئەم ترسەی بەسەردا نەباراندین ، ئێوە جیاوازیتان خستە نێوان فارس و دواتان خستن لە دوژمنەکانیان، لە مەترسی ئێوەش نەگەیشتۆتە ئەوەی کە فارس لەسەر ئەم ڕایە سەقامگیرتان بکات و دووچاری تیاچوونی بکات، سوێند بە خوا ئێوە سەیری هیچ ناکەن جگە لەوەی کە بەلایەك دابباریێت بەسەرماندا و تیا بچین، لە دوای بەغداد و ساباط و تکریت و تەنانەت مەدائینیش سوێند بە خوا دەبنە یەك یان ئێمە دەست دەکەین بە لێدانی ئێوە پێش ئەوەی کە چاوتێبڕێك چاومان تێ ببڕێت، سوێند بە خوا ئەگەر لە جەنگی ئێوە تیاچوونی خۆمانی تێدا نەبوایە

١ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٥٨)، تأريخ الطبري (٤/ ٣٠٠).
٢ـ الخلفاء الراشدون للنجار (ص: ١٣٢).
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٦١).
٤ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٦٧).

ئەوا هەر ئێستا دەمان کوشتن وە ئەگەر کۆتایی بەم دووبەرەکیە نەهێنن ئەوا لە ناوتان دەبەین و پاشان خۆمان لەناو دەچین و لە ئێوەش ساغ و خۆش دەبینەوە.[1]

هەر پاش ئەمە ڕۆستەم و فیرزان چوون بۆ لای بۆران و پێیان وت: نامەیەك بنووسە بۆ خێزانی کیسرا و دڵسۆزانی و ژنانی بنەماڵەی کیسرا و دڵسۆزانی، ئەویش ئەم کارەی بۆ ئەنجامدان و ئەمەی لە پەیامێکدا بۆ دەرهێنان، پاشان ناردیان بە دوایاندا و هەموویانیان هێنا و ئەوانیان دایە دەست چەند پیاوێك کە ئەشکەنجەیان دەدان و ڕێنموونیان دەکردن لەسەر ناوهێنانی نەوەکانی کیسرا، بەڵام لای ئەوان کەسێك بەدی نەکراو نەبوو، بەڵام یەکێکیان باسی ئەوەی کرد کە جگە لە منداڵێك کە ناوی یەزدجەردە کەسی تریان نەماوە ئەو منداڵەش لە کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرایە و دایکی خەڵکی دوریایە، ئەوانیش چەند پیاوێکیان نارد بۆ لای و لێیان داواکرد، کاتێك کە شیرەوەیهی مامی لە کۆشکی سپی کۆی کردنەوە نێرینەکانی بنەماڵەی کیسرا و(١٧) براکەی کوشتن هەتا کەس لەسەر کورسی دەسەڵاتی فارس ململانێی لەگەڵدا نەکات، ئەویش ئەو منداڵەی فڕاند و لای خاڵۆزاکانی لە ئیستەخەر شاردیەوە، شیرەوەیهی لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کوژرا و هەروەها براکەی شەهریار کوڕی کیسرا پەروێز بوو کوژرا کە لە خێزانە باشەکەی بوو کە ناوی شیرین بوو وە ئەم شیرەوەیهیە باوکی یەزدجەرد بوو، پاشان زۆریان کرد لە دایکی یەزجەردو ئەویش نیشانی دان، پاشان چەندپیاوێك چوون و هێنایان بە بڕوای ئەوەی کە تاکە کوڕی ماوەی بنەماڵەی ساسانیەکانە، ئەم کوڕە لە تەمەنی(٢١) ساڵیدا کرایە پادشا، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوە و هەموو فارس لەمە دڵنیا بوون، پاشان لەنێو کۆمەکی و ملکەچی ئەودا پێشبڕکیان دەکرد، پێشیان وابوو کە لەم کارەیاندا دەروویەك دەبێت بۆ دەرچوونیان لەم تەنگەلانیە،[2] دواتر یەزدجەردی سێیەم دەستی کردە دوورخستنەوەی دەسەڵاتەکەی بە هاوکاری ڕۆستەم و فیرزان، تەواوی کون و کەلەبەرەکانی کیسرای گرتەوە و خەڵکی پڕچەك کرد و بۆ هەر بنکەیەکی چەکداریش چەند سەربازێکی تەرخان کرد و ناوی لێنان سەربازانی حیرە و ئەنبار و سەربازانی ئەبلە.[3]

## حەوتەم: ئامۆژگاریەکانی عومەر بۆ موسەننا:

موسەننا هەواڵی بزافی یەزدجەردی سێیەمی پێگەیشت و بەردەوام بە دوور و درێژی چەند کەسانێك هەواڵیان بۆ دەهێنا، موسەننا ئەم هەواڵە و هەواڵی پێشبینی خۆی لە دژەهێرشێکی بەهێز بە نامەیەکدا نووسی بۆ عومەر، ئەم هەڵسەنگاندنەی موسەننا ڕاست دەرچوو، هێشتا نامەکەی

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٠٠).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣٠١)، الطريق الى المدائن (ص: ٤٦٧).
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٦٨).

نەگەیشتبووە دەستی عومەر هەتا خەڵکی عێراق بێباوەڕ بوونەوە و پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە و خۆیان لە موسڵمانان هەڵەکرد، ئەم کارە ئەو کەسانە کردیان کە هەندێکیان بەڵێنیان بە موسڵمانان دابوو وە هەندێکیان بە پێچەوانەوە، فارسەکان پەلەیان لێ کردن، لەگەڵ شۆڕشی بەڵێن پێدراواندا کەمەندکێشیان کردن، کاتێك کە موسەننا ئەمەی بینی هەستی بەوە کرد کە پێشکەوتن و ماڵینێکی زیاتر لەوەی ئەنجام داوە کە هێزەکەی دەتوانێت پارێزگاری لێ بکات، لە کاروباری ئەمەش ئەوەیە، کە بەردەوام نەبێت لە پارێزگاری لێ کردنی دەرچوو هەتا لە ناوچەی ذیقاردابەزی و خەڵکەکەی، کە لەگەڵی بوون لە بارودۆخێکدا و لە یەك سەربازگە دانیشتەجێ کرد، عومەر(ﷺ) زۆر وریایی دەدا و لەم کاتەدا نامەیەکی گەیشت: پاش ئەوەی لە نێو فەرامۆشکراوەکانی عەجەمەکان دەربچن و خۆتان بگەیەننە وشکاوەکی و لە نێو ئەو ئاوانەدا بڵاوەی لێ بکەن دەکەوێتە پشتی عەجەمەکان لەسەر سنووری نێوان زەویەکانی ئێوە و ئەواندا، لە هیچ مێرگێکدا لە کەس مەگەڕێن، نە زیان بەخش و نە هیچ کەسێك لە خەڵکی هاوپەیمانیان، نە سوارچاکێك مەگەر گێچەڵتان پێ گێڕابێ، ئەگەر ئەویش بە ملکەچی هاتبێت مەگەر جەنجاڵتان کردبێ، عەرەب ببەنەوە سەر باپیرانیان ئەگەر باپیر عەجەم بوو، ئەوا باپیریان بگەیەننە باپیری خۆتان و لەگەڵیان دۆستایەتی بسازێنە لەسەرسنووری زەویەکانی خۆت و ئەوان هەتا فەرمانت لە منەوە بۆ دێ،[1] بەم شێوەیە موسەننا لە ذیقار نیشتەجێ بوو، موسڵمانانی بە جول و شەواندا دابەش کرد تا (غوضتی)[2] بڵاوەی لە هێزەکانی کرد لە نێو ئاوەکاندا لەم پەڕی دەشتاییەکانەوە بۆ ئەوپەڕی، لە (غوضتی)ەوە بۆ (قصقطانة) چەکدارەکان هەندێکیان سەیری ئەوانی تریان دەکرد و هەندێکی تریان فریای هەندێکی تریان دەکەوت ئەگەر شتێك ڕوویدات، لە حاڵەتی چاودێری و چاوەڕوانی بۆ کۆبوونەوەیەکی نوێ، لە کاتێکدا چەکدارەکانی کیسرا گەڕاونەتەوە و دەروازەکانی سەقامگیربوونەتەوە وە لە کاتێکدا کە فارس فەرمانی پێداون ئەوان جێگەی بەزەیین و ترساون و موسڵمانانیش لە نێو دڕندەییدا وەك شێرێك چۆن بەربەرکانی نێچیرەکەی دەکات و پاشان پەلاماری دووبارە دەکاتەوە هەڵچوون و فەرماندەکانیان کارەکانیان قەتیس دەدەن بە ئومێدی گەیشتنی پەیام و هاریکاری عومەر و ئەمەش لە کۆتاییەکانی مانگی ذي القعدةی (١٣)ی کۆچی و کانوونی دووەمی (٦٣٥)ز دابوو[3] وە عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا بە پادشایانی عەرەب لە پادشاکانی عەجەم دەدەم، یەکەم کارێ کە کردی نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستانی لە گوند و نێو هۆزەکان، کە ئەمەش لە مانگی (ذي الحجة)دا بوو لەگەڵ دەرچوونی حاجیان بۆ بەجێهێنانی فەرزی حەج، بە جۆرە پێشەنگی ئەو هۆزانە هاتنە لای کە ڕێگەیان لەسەر هەردوو شاری مەککە و مەدینە و ئەوانەی سەر ڕێگەی عێراق بوون و لە مەدینەوە زۆر نزیك بوون، ئەوان بە لێشاو هاتن بۆ لای لە

---

١ـ تأريخ الطبري (٣٠١/٤).
٢ـ جبال تجاه البصرة.
٣ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٧٠).

مەدینە و لەگەڵ گەرانەوەی حەج و هەواڵیان پێدا کەچی لە پشتیانەوەیە و ئەوان شوێن پێکانیان دەدۆزنەوە، بەلام ئەوانەی کە لە عێراقەوە زۆر نزیکن خۆیان گەیاندە موسەننا، عومەر لێ نەگەرا نە سەرکردەیەك و نە خاوەن ڕاوبۆچوونێك و نە سەرمایەدارێك و نە دەسەڵاتدارێك و ن شاعیرێك و نە وتاربێژێك بێنێتەوە بەلکو هەموویانی هەڵدایە عێراق و ڕەوانەی ئەوێی کردن، ئەو هەڵیدان بە ڕووی خەڵکیدا و لەخۆبایی کردن.[1]

١ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٧١).

# دوانگەی دووەم

## جەنگی قادسیە

کاتێك کە عومەری هەستی بەوە کرد فارسەکان خۆیان ئامادە کردووە و کۆبوونەتەوە بۆ بنەبڕکردنی ئەو هێزە کەمەی کە لە موسڵمانان لە عێراق ماونەتەوە، فەرمانی بە سەربازگرتنی زۆرەملێ دا لەبەر ئەوەی بارودۆخەکە ئەمەی هەڵدەگرت، هەر لەبەر ئەوەش موسەننا فەرمانی دا بە دانیشتوانی هۆزەکانی دەوروبەری کە هەر کەس توانای بەشدارکردنی هەیە لە جەنگ بە ئارەزووی خۆی بێت یان نابێت بە دەمیەوە و ئەمەش ئەو سەربازی گرتنە زۆرە ملێیە بوو کە عومەر دەیبینی و یەکەمین کەسیش بوو کە کاری پێکرد، بەمەش ئەوە هەڵدەوەشێتەوە کە محمد فەرەج لە کتێبەکەیدا بە ناوی ((سەربازی ئیسلامی))یەوە کە دەڵێت: بە سەربازگرتنی زۆرەملێ لە دەوڵەتی ئەمەویدا کەوتووە، بەڵێ ئەوە عومەرە (ﷺ) فەرمانی پێدا و کاری پێ کردووە هەر کە پەیامەکەی ئەمیری باوەڕداران گەیشتە موسەننا دەست بەجێ دەستی کرد بە ڕاپەڕاندنی ئەوەی کە لە پەیامەکەدا بوو وە ئەو پلانەی چەسپاند، کە لە بزوتنەوەکانیدا نەخشەی بۆ کێشابوو، عومەر نامەی نارد بۆ کاربەدەستانی کە لە یەکێك نەگەڕێن کە چەك یان ئەسپ یان فریادڕەس یان هەر ڕایەکی تری هەیە هەتا بۆی ڕەوانە دەکەن، هەروەها فەرمانی پێدان بە بەسەرباز گرتنی زۆرەملێ و داوای لێ کردن کە سەربازە نوێیەکانی بۆ بنێرن تا ڕەوانەی عێراقیان بکات،[1] بە ڕاستی لەگەڵ هاتنی یەزدجەرد بۆ فەرمانڕەوایەتی هەڵوێست لە وڵاتی فارسدا ڕووی لە گۆڕان کرد و هەڵوێستی فارسیش بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

- سەقامگیری ناوخۆیی بۆیە نوێنەر لەدامەزراندنی یەزدجەرد و کۆبوونەوەیان لەدەوری، فارسەکان بەمە دڵنیا بوون و متمانەی پێکردو سەرکردەکانیش لە ملکەچی و هاوکاری کردنی چوونەپێشی.
- بە سەربازگرتنی گشتی کە هەموو ئەو کەسانەی گرتەوە کە توانای سەربازیان هەبوو، دەیانکردنە سەرباز، دابەشکردنی دەستە و تیمەکان لە تەواوی ئەو زەوی و زارانەی کە موسڵمانان ئازادیان کردبوون.
- لە کۆتاییشدا خرۆشانی خەڵکی و هاندانیان لەسەر موسڵمانان، هەتا بەڵێن و پەیمانەکانیان شکاند و بێباوەڕ بوونەوە بەو بەڵێنانەی پێیان دراوە و تۆڵەیان پێ کردنەوە.[2]

---

١ـ إتمام الوفاء (ص: ٧٠).

٢ـ حركة فتح الاسلامي (ص: ٨٠).

گۆڕانی هەڵوێستی موسڵمانانیش بەم شێوەیە بوو:

- پاشەکشێ: دەرچوونی موسەننا - چەند کەسێکی تر لە پارێزراوانیان لەو زەویەی کە ڕزگاریان کردووە — لە نێوان فەرامۆش کراوەکانی عەجەم.
- گەڕانەوە: و بڵاوبوونەوە لەو ئاوانەی کە لە پشتەوەی عەجەمەکانن لەسەر سنووری زەویەکانی عەرەب و فارس، موسەننا لە ذیقار نیشتەجێ بوو، خەڵکیش لە تەنیشتەوە نیشتەجێ بوون، لە عێراقدا چەند بنکەیەکی چەکداریان پێك هێنا و هەندێکیان چاوی لەوی تریان بوو وە هەندێکی تریان لە کاتی پێویستدا فریای ئەوی تریان دەکەوت.
- ڕووبەڕووبوونەوەی بە سەربازی کردنی زۆرەملێ لای فارس بە بەسەربازی کردنی زۆرە ملێ لای موسڵمانان.[1]

## یەکەم: بە فەرماندە کردنی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە عێراق:

ئەمە قۆناغی سێیەمی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی عێراق کە بە فەرماندەکردنی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) لەسەر جیهاد لە عێراق کە لە ساڵی (١٤) کۆچیدا دەست پێدەکات، ساڵی(١٤)ی کۆچی بە خۆداڕیانی دەکرد و عومەریش(ﷺ) هانی خەڵکی دەدا لەسەر جیهاد لە دژی فارس، عومەر(ﷺ) لە ڕۆژی یەکی مانگی موحەڕەمی ئەو ساڵەدا لەگەڵ سوپایەکدا خۆی گەیاندە سەر ئاوێك کە پێیان دەوت (صرار)،[2] لەوێ لێبڕاوانە خۆی ئامادە کرد بۆ غەزای عێراق و لە مەدینەشدا عەلی لە شوێنی خۆی دانا، عوسمان و گەورە یارانی لەگەڵ خۆی برد، پاشان کۆڕێکی گرت بۆ ڕاوێژی یاران لەوەی کە سوورە لەسەری و دواتر نوێژی بە کۆمەڵی خوێند وناردی بە دوای عەلیدا و ئەویش لە مەدینەوە هات، پاشان ڕاوێژی پێ کردن.و هەمووان هاودەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە بڕۆن بۆ عێراق جگە لە عبدالرحمن کوڕی عەوف کە بە عومەری فەرموو: من دەترسم هێرشەکەمان تێك بشکێت و موسڵمانان لە تەواوی پارچەکانی سەر زەوی لاواز بن، من وام پێ باشە کە پیاوێك بنێرین بۆ عێراق و تۆ بگەڕێیتەوە بۆ مەدینە، پاشان عومەریش و خەڵکەکەش ئەم ڕایەی (عبدالرحمن)یان بە ڕاست زانی، عومەر فەرمووی: دەی کێ بنێرین بۆ عێراق؟ ئەویش فەرمووی: شێرێکە لە نێو چنگانەکەیدا، سەعدی کوڕی مالك زەهری، ئەم وتەیەی عومەر زۆر چاپوك و چالاك بوو بۆیە سەعدی نارد بۆ عێراق و کردیە فەرماندە بەسەر عێراقەوە.[3]

### ١- وەسیەتی عومەر بۆ سەعد (خوایان لێ ڕازی بێت):

کاتێك کە سەعد(ﷺ) هات بۆ مەدینە عومەر(ﷺ) کردیە فەرماندەی جەنگی عێراق و پێی فەرموو: ئەی سەعد ئەوە لەخۆباییت نەکات کە پێت بڵێن خاڵی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵیەتی چونکە

---

١ـ حركة فتح الاسلامي (ص: ٨٠).

٢ـ صرار: موضع على ثلاثة أميال عن المدينة، معجم البلدان (٣٨٨/٣).

٣ـ ترتيب وتهذيب البداية والنهاية (ص: ٩٦).

خوای گەورە بە خراپە خراپە ناشورێتەوە بەڵکو خراپە بە چاکە دەشورێتەوە، خوای گەورە لە نێوانی و نێوان هیچ کەسێکدا ڕەچەڵەکی نیە جگە لە ملکەچی کردنی، خەڵکی دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات لای خودا وەك یەکن، الله خوای گەورەیانە، ئەوان بەندەی ئەون بە نیەت چاکی لێك جیادەکرێنەوە، دەزانن کە بە ملکەچی چی لە لایە، سەیری ئەو کارە بکە، کە پێغەمبەر(ﷺ)ت بینیوە، لە هاتنیەوە تا ئەو دەمەی بەجێی هێشتین، پابەند بە شێوەی بە ڕاستی ئەوە کارەکەیە، ئەمە ئامۆژگاری منە نەکەی لێی بگەڕێیت وە ئەگەر وازت لێ هێنا ئەوا تۆ لە دۆڕاوانی.[1]

بە ڕاستی ئەمە ئامۆژگاریەکی ڕەوانبێژانە بوو لە خەلیفەیەکی تێگەیشتووی گەورەوە چونکە عومەر هەستی بەلایەنی هێزو لاوازیە کرد، کە ڕەنگە ڕوو لە سەعد بکات لە پێش خۆی کە بریتیە لەوەی هەواڵی نزیکی خۆی لە پێغەمبەر(ﷺ) بدرکێنێ و ئەمەش ڕووبەڕووی شتێکی بکات لە خۆهەڵبرین بەسەر موسڵماناندا، بەو بنەما گشتیە ئیسلامیەی کە بە پێوەرێك دادەنرێت بۆ کەرامەتی موسڵمان لەم ژیانەدا بە جۆرێ کە دەفەرمووێت: الله خوای گەورەیانە، ئەوان بەندەی ئەون بە نیەت چاکی لێك جیادەکرێنەوە ، هەست دەکەن بەوەی کە لە توانا و هێز و وزە لە لایەتی، پێیان وت: بە تەندروستی چاك لێك جودا دەکرێنەوە، واتا بە چاك بوونەوە لە نەخۆشیە دەروونیەکان هەروەك ئەوەی کە دەفەرمووێت: دووربینی جیادەکەنەوە لە سەرپێچی کردن و بە دەمەوە چوون لەسەر ملکەچی خوای باڵادەست و ئەمەش لە وووو کە خوای گەورە کردوویەتیە تەرازوویەك بۆ ڕێزداری کە دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات: ١٣).

کە تەرازوویەکی ماف پەروەر و بەخشندەیە و هەموو موسڵمانێك دەتوانێ پێی بگات ئەگەر هەوڵ بدات بۆ بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و بەختەوەری ڕۆژی دوایی پاشان عومەر لەکۆتایی ئامۆژگاریەکەیدا ئەوەی وەیاد هێنایەوە کە پێویستە پابەند بێت بەو کارەی کە پێغەمبەر(ﷺ)ی لەسەر بووە وە ئەمەش پابەند بوون بە تەواوی ئاینەوە دەگرێتەوە کە چەسپاندنی لەسەر تەواوی خەڵکی پێویستە.[2]

## ٢- وەسیەتێکی تر:

پاشان عومەر(ﷺ)جارێکی تر وەسیەتی بۆ سەعد کرد، کە ویستی ڕەوانەی عێراقی بکات و فەرمووی: من لەسەر جەنگی عێراق تۆم کردە والی بۆیە داوات لێ دەکەم کە پارێزگاری لە وەسیەتەکەم بکەیت چونکە تۆ لە کارێکی سەخت و دژوار دەچیتە پێشێ و بە هەق و ڕاستی نەبێت ڕزگار نابێت لێی، لەبەر ئەوە خۆت و ئەو کەسانەش کە لەگەڵتن لەسەر چاکە ڕابهێنە، ئەوەش بزانە کە هەر خویەك کەرەستەیەکە و کەرەستەی چاکەش ئارامیە، کەواتە ئارام بە لەسەر ئەوەی کە ڕووی

---

١ـ تاريخ الطبري (٣٠٦/٤).
٢ـ التاريخ الاسلامي (٣٦٢/١٠).

لێناوی ، ئەوەش بزانە کە لەخوا ترسان لەدوو کاروباردا کۆدەبێتەوە کە ئەوانیش: لە ملکەچی کردنی و دوورکەوتنەوەیەتی لە سەرپێچی کردن، بە ڕاستی ملکەچی کردن لە ڕق لێبوونەوە لە دونیا و خۆشەویستی دوارۆژە، سەرپێچی کردنی سەرپێچیە بە خۆشەویستی دونیا و ڕق لێبوونەوە لە دوارۆژ، بۆ دڵەکانیش چەند ڕاستیەك هەیە کە خوای گەورە دایدەرەوەژێت، لەوانە بەدەرکەوتنی دانایی لەسەر زمانی، خۆشەویستی خەڵکی، لە خۆشویستندا ئاینگەرایی مەکە چونکە پێغەمبەران داوای خۆشەویستی خۆیان کردووە، خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆشویستبێ خەڵکیش خۆشیان ویستوە وە ئەگەر ڕقی لە بەندەیەك بووبێ ڕقاوی کردووە، تۆ شوێنی خۆت لای خوای گەورەت دیاری بکە بە شوێن دیاری کردنت لای خەڵکی، بە تایبەتی ئەوانەی کە لەگەڵتدان ،[1] لەم دەقەشدا پەندگەلێکی بەسوود هەن لەوانە:

- پابەند بوون بە هەق و ڕاستیەوە موسڵمان دەپارێزێ لە گرژی و هەر کەسیش پابەند بێت بە هەقەوە لەگەڵ خودایە و هەر کەس لەگەڵ خودا بێت ئەوا خوای گەورە بە سەرکەوتن و پشتیوانی کردنی لەگەڵی دەبێت، ئەم هەستەش چەند نۆبەیەکی پێ دەبەخشێت وەك زۆربوونی کاروبار و ڕووبەڕووبوونەوەی دژواری و گرفتەکان، سەرباری ئەو دڵنیاییە دەروونیەی کە بە هۆیەوە بە کردار و گوفتار چێژ لە پابەند بوون بە هەقەوە وەردەگرێت، بە پێچەوانەوە لە سنوور بەزاندن لە ڕێگەی ڕاستی چونکە ئەو هەست بە نائارامی و چەند ئێش و ئازارێك دەکات لەوانە سەرزەنشت کردنی ویژدان و ترسان لە لێپرسینەوەی خەڵکی و چوونە نێو هەرێمە نەزانراوەکانی ئەو داهاتووەی کە لادانەکان ڕێك دەخرێت.

- عومەر(ﷺ) باسی ئەوەی کرد کە خوی چاکە ئارامیە، ئەم ڕێگەی چاکەیەش فەرشڕێژ نەکراوە بە قەیفە، بەڵکو ئەوە ڕێگەیەکی سەخت و دڕکایە، پەڕینەوە لێی پێویستی بە جیهادێکی دوورو درێژ هەیە، پێویستە کە ڕێگرەکەی بە ئارامی لە خۆ ئامادەکردندا بێت ئەگەرنا لە میانی ڕێگەکەدا دەبچڕێت.

- عومەر باسی ئەوەی کرد کە ترسان لە خوا لە ملکەچی کردنی و دوورکەتنەوەیە لە سەرپێچیەکانی پاشان ئەو پاڵنەرە گەورەیەی ڕوون کردەوە کە پاڵی پێوەدەنێ بۆ ملکەچی کردنی خوای گەورە کە ئەویش بریتیە لە ڕق لێبوونەوە لە دونیا و خۆشەویستی دوارۆژ، ئەو پاڵنەرە گەورەیە کە پاڵی پێوە دەنێ بۆ سەرپێچی کردنی خوای گەورە، بریتیە لە خۆشەویستی دونیا و ڕق لێبوونەوە لە دوارۆژ.

- پاشان باسی ئەوەی کرد کە دڵەکان چەند مافێکیان هەیە لەوانە بە ئاشکرا وەك ئەوەی کە هەیەتی لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی بە ڕاستی لە هەردوو حالەتی پەستی و قایلی، مرۆڤ ناکرێت ئەو ستایشی خەڵکە بکات بە بار کە بە سەریەوەیەتی لەسەر خولگەکانی لە نێو بتەوی لە چەسپاندنی هەق، بەدگۆییان نەکات بەبار و لەسەر ستەمیان و دوورکەوتنەوەیە لە هەق و ڕاستی لەگەڵیان.

---

[1] ـ تأريخ الطبري (٣٠٦/٤، ٣٠٧).

- عومەر باسی مافە نهێنییەکانی دڵی کرد، نیشانەکەی کردە دەرکەوتنی دانایی لەسەر زمانی، پێویستە ئەو کەسە خۆشەویست بێت لە نێوان برا موسڵمانەکانی، چونکە خۆشەویستی خوای گەورە بۆ بەندەی خۆی هەڵچنراوە لەسەر خۆشەویستی موسڵمانان بۆی، لەبەر ئەوەی خوای گەورە بەندەیەکی خۆش بوێت دەیکاتە خۆشەویستی بەندەکانی،[1] ئەگەر سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص شاهیدی بۆ درابێ بە بەهەشت بە پێویستی بۆ ئەم وەسیەتە ئەی چۆنە کە ئێمە و هاوشێوەکانمان کە لە تێگەیشتنی ئیسلام و چەسپاندنیمان کەمە.[2]

## ٣- وتاری عومەر (رضي الله عنه):

سەعد بە چوار هەزار موجاهیدەوە بەرەو عێراق کەوتەڕێ، هەندێك دەڵێن کە ئەو ژمارەیە شەش هەزار موجاهید بوون، عومەر صرارەوە بەشی کردن بۆ ئەعوەس،[3] پاشان هەستا وتارێکی بۆ خەڵکی دا و فەرمووی: خوای گەورە چەندین نموونەی بۆ هێناونەتەوە، وتەکانی بۆ ڕوون کردوونەتەوە تا دڵەکانی پێ زیندوو بکاتەوە چونکە دڵە مردووەکان لە سینەکانیدایە تا خوای گەورە لە زانیاری و زانست شتێك زیندوو بکاتەوە و سوودی پێ بگەیەنێ، ماف پەروەریش چەندین ئەمارەت و مزگێنی دەری هەیە، بەڵام ئەمارەتەکان تەنها شەرم و میهرەبانی و ئارامی و نەرم و نیانین، بەڵام مزگێنی دەرەوەن ڕەحمەتن، خوای گەورەش بۆ هەر کارێك دەروویەکی داناوە، بۆ هەر دەرگایەکیش کلیلێکی ئاسان کردووە، دەرگای دادپەروەری باوەڕپێکردن و کلیلەکەشی خواپەرستیە، باوەڕپێ کردنیش یادی مردنە بە یادکردنەوەی مردوان، خۆ ئامادەکردن بۆی بە پێشکەش کردنی کارەکان، و ئاینگەرێتی وەرگرتنی ماف لە هەر کەسێك کە لە پشتەوەی هەقدایە، و گەیاندنی ماف بۆ هەر کەسێك کە مافی هەیە، هیچ کەسێك لەمەدا مەسازێنە وە بەو هێندەیە ڕازیبە کە لە بژێویەکدا بەشت دەکلت، هەر کەسێك کە بژێویەك بەشی نەکات ئەوا هیچ شتێك دەوڵەمەندی ناکات، من لە نێوانی ئێوە و نێوانی خودام، لە نێوانی من و نێوانی ئەودا کەسێکی تر نیە، خوای گەورە پابەندی کردووم بە پاڵنانی دوعا لێی، ئێوەش کۆتایی بە سکاڵاکانتان بهێنن بۆ لامان، هەر نەیتوانی ئەوا لە کێمان بە ئاگا بێنێتەوە بەبێ لاڵە پەتەیی مافەکەی بۆ وەردەگرینەوە.[4]

## ٤- گەیشتنی سەعد بۆ عێراق و کۆچی دوایی موسەننا:

سەعد بە خۆی و بە سوپاکەیەوە بەڕێکەوت هەتا لە شوێنێك لایدا کە پێیان دەوت زەرود،[5] لە وڵاتی نەجدە و ئەمیری باوەڕدارانیش بە چوار هەزار موجاهیدەوە پشتیوانی کرد، سەعد توانی کە حەوت هەزار موجاهدی تر لە نەجد کۆبکاتەوە، و موسەننای کوڕی حارسەی شەیبانیش بە دوانزە

١ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٣٦٤).
٢ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٣٦٥).
٣ـ الاعوص:- على طريق العراق وهو واد يصب في مصدرها قناة من الشمال وفيه مطار المدينة اليوم.
٤ـ تأريخ الطبري (٤/٣٠٨).
٥ـ زرود:- رمال بين الثعلبية والخزيمية بطريق الحاج من العراق.

هەزار موجاهیدەوە لە عێراق چاوەڕوانی سەعد بوو، سەعد لە ناوچەی زەرود ئامادەباشیەکی سازدا بۆ جەنگێکی جیاکەرەوە لەگەڵ فارسەکان و چاوەڕوانی فەرمانی ئەمیری باوەڕداران بوو(خوایان لێ ڕازی بێت)، عومەر ئەو دەمە بایەخێکی گەورەی دابوو بەم جەنگە و لێنەگەڕابوو کە سەرکردەیەك یان گەورە پیاوێك وەیان دەسەڵاتدارێك وەیان وتاربێژێك وەیان شاعیرێك بهێنێتەوە و هەموویانی پێچابوو پێیەوە، هەڵیدابوونەوە بەردەم خەڵکی و لەخۆبایی بوونیان،[1] کاتێك سەعد بە سوپاکەیەوە لە ناوچەی زەرود بوو موسەننا دووچاری نەخۆشیەکی سامناك هات،گێڕەرەوان دەڵێن: کە ئەو برینەی لە جەنگی ڕۆژی پرددا دووچاری بوو زاڵ بوو بەسەریدا، هەستی بە نزیك بوونەوەی مەرگی کرد و ئازارەکەی زۆری بۆ هێنا و لە شوێنی خۆی لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون بەشیری کوڕی ئەلخەصاصیەی دانا، موسەننا داوای لە مەعنی برای کرد و وەسیەتەکەی پێ سپارد و فەرمانی بە پەلە بیگەیەنێتە لای سەعد، پاش ئەوە موسەننا گیانی سپارد و ئەو چرا پڕشنگدارەش خامۆش و ئەو ڕۆژە ڕووناکەش کە عێراقی پڕ کردبوو لە ئازادیخوازی و نورێکی گەرم پێچی خواردەوە،[2] لە وەسێتەکەی موسەننادا بۆ سەعد هاتووە: کە لەگەڵ دوژمنانی و دوژمنەکانی خۆیدا بە جەنگ نەیەت، واتا موسڵمانان — ئەگەر کارەکان کۆبوویەوە و لە نێوماڵەکەیاندا لێوان لێوان کردن، لەسەر زەوی خۆیان و لەسەر نزیکترین گۆشەی زەوی عەرەب و لە نزیکترین هەڵگەڕاوەی زەوی عەجەم لەگەڵیان بجەنگن، ئەگەر خوای گەورە موسڵمانانی سەرخست بەسەریاندا ئەوا هەرچیەك لە دوژمنان بەجێما بۆ موسڵمانان دەبێت، ئەگەر بە شێوەیەکی تر بوو ئەوا خۆیان بدەنە پاڵ دەستەیەکی تر، پاشان بە ڕێگەی خۆیان زیتر شارەزا دەبن، لەسەر زەویان بوێربە هەتا خوای گەورە ئەو نەهامەتی و سەختیە دەگێڕێتەوە بە سەریاندا،[3] ئەم دیمەنە کۆتاییانەی ژیانی موسەننا هاوشێوەی ساتەوەختەکانی کۆتایی ژیانی خەلیفە ئەبو بەکر(ﷺ) بوو، هەردووکیان دونیایان بەجێ هێشت و بیریان لە موسڵمانان دەکردەوە لەم ئازادیخوازیەدا وەسیەتیان تیا دەکرد، ئەبو بەکر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و وەسیەتی بۆ عومەر(ﷺ) کرد لەسەر هاندانی خەڵکی و ناردنیان بۆ ڕزگارکردنی عێراق، موسەنناش کۆچی دوایی کردو سەرکردەیەکی نوێ بۆ جەنگی عێراق و ئەزموونە جەنگیەکانی دژی فارسەکان کردە میراتگر کە ئەویش سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بوو، ئەو بە ناخی خۆی هەوڵی دەدا و بیری دەکردەوە و چارەسازی دەکرد و وەسیەتی بۆ سەعد دەکرد،[4] کاتێك کە ڕای موسەننا و وەسیەتەکەی گەیشتە دەستی سەعد، سەعد بەزەیی پێدا هاتەوە و فەرمانی دا بە مەعنی کوڕی حارسە لەسەر کارەکەی بهێنێتەوە، وەسیەتی چاکەی بۆ بنەماڵەکەی کرد،[5] ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوەیە کە موسەننا وەسیەتی بۆ سەلمای کچی خەسفە ئەلتەمیمیەی خێزانی کردبوو کە لە دوای خۆی ببێتە خێزانی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، و مەعنا لەگەڵ خۆی سەلمای هەڵگرتبوو، پاش

---

١ـ تاريخ الطبري (٤/٣١٠).
٢ـ القادسية: أحمد عادل كمال (ص: ٢٩).
٣ـ تاريخ الطبري (٤/٣١٣).
٤ـ القادسية: أحمد عادل كمال (ص: ٣٠).
٥ـ تاريخ الطبري (٤/٣١٣).

تەواوبوونی عیددەی سەعد سەلمای مارە کرد، ئایا موسەننا لە پاش کۆچی خۆی بە نیاز بووە پیاوەتی بە خێزانەکەی بکات و بیداتە دەست یەکێك لەو پاڵەوانە گەورانەی ئیسلام، کە پێغەمبەر(ﷺ) شاهێدی چوونە بەهەشتی بۆ داوە،؟ دیارە ئەمەش جۆرێکە لە وەفایەکی هاوشێوە دەگمەن، یان ئەو ئافرەتە وریا و ژیرە و شارەزایی لە نەخشە و پلانی ئەو جەنگانەدا هەیە کە هاوسەرەکەی ئەنجامی داون، بە نیاز بووە کە موسڵمانان پێی سوودمەند بوون،؟ هەموو ئەمانە چاوەڕوان کراوبوون، ئەمەش کەمێکە لەو لێشاوەی کە نەوەکی تێگەیشتوو چێژی لە چاکەکاری و گەورەیی کارەکان پێ وەرگرتووە،[1] وە لەوەی کە دەکرێت بانگی پێ بکرێت و ئاماژەی بۆ بکرێت، هەڵوێستێك کە مەعنا پێش گەیاندنی وەسیەتەکە پێی هەستا، ئەویش ئەوە بوو کە مەعنا دەیزانی یەکێك لە فەرماندەکانی فارس بە ناوی ئازاذمەر قابووسی کوڕی قابووسی کوڕی مونزیری ناردووە بۆ جەنگی قادسیە و پێی وتووە: عەرەب بانگ بکە چونکە تۆ لەسەر ئەوەی کە بە دەمتەوە دێن، هەر لەسەر ئەو بۆچوونەیە کە باپیرانتی لەسەر بوون– واتا ڕامکاری بۆ ئەوانەی کە دۆستانی فارسن – ئەویش دابەزیە قادسیە و بەکری کوڕی وائلی بە هەمان شێوەی نوعمان کردە نووسەریان وەك نزیکیەك لێی ، کاتێك ئەم هەواڵەی گەیشتە موعنا، مەعنا لە ذیقاڕەوە ماڵەکەی شادی بەخشی و هەرچیش لەگەڵیدا بوو خەواندی و پاشان گەڕایەوە بۆ ذیقاڕ.[2]

## ٥– ڕۆیشتنی سەعد بۆ عێراق و وەسیەتی عومەر (ﷺ):

فەرمان لە ئەمیری باوەڕدارانەوە گەیشتە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) بە بەڕێکەوتن لە زەروودەوە بۆ عێراق و خۆئامادەکردن بۆ جەنگێکی جیاخواز لەگەڵ فارسەکان و بەم شێوەیەش وەسیەتی بۆ کرد: پاش ئەوە من فەرمان بە تۆ و هاوەڵانت لە سەربازەکان دەدەم بە پارێزگاری کردن لە ئاینی خودا لەسەر هەموو دۆخەکاندا بە ڕاستی تەقواو لە خوا ترسان باشترین کەرەستەیە لەسەر دوژمن وە بەهێزترین کەرەستەیە لە جەنگدا ،من فەرمان بە تۆ و هەموو ئەوانەش دەدەم کە لەگەڵتدان بە سەختی خۆتان بپارێزن لە خۆتان و لە دوژمنانتان، چونکە گوناه و تاوانی سوپا زۆر لە دوژمنەکەیان مەترسیداترە لەسەریان، بەڵکو موسڵمانان بە سەرپێچی کردنی دوژمنانیان بۆ خودا سوردەکەون، ئەگەر ئەمە نەبووایە بۆ ئێمە ئەوا ئەوان هەندێکیان پێ دەبوو لەبەر ئەوەی کە ژمارەی ئێمە وەك ژمارەی ئەوان نیە، کەرەستە و پێداویستیەکانمان وەك کەرەستەکانی ئەوان نیە، ئەگەر لە سەرپێچی کردندا لەگەڵیان یەکسان بووین ئەوا لە هێزدا ئەوان بەسەرمانەوە هەیانە، ئەگەر ئێمە بە چاکیمان سەرنەکەوین بەسەریاندا ئەوا بە هێزمان سەرناکەوین بەسەریاندا، ئەوەش بزانن کە پێویستە لەسەرتان کە لە ڕۆیشتنتاندا خوا ترس بن ئەوەی دەیزانن بەجێی بهێنن، شەرمیان لێ بکەن، کار بە سەرپێچی خودا مەکەن لە کاتێکدا کە ئێوە لە ڕێگەی خوادان، مەڵێن کە دوژمنمان لە ئێمە خراپترە و

---

١ـ التاريخ الاسلامي (١٠/٣٧٠، ٣٧١).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣١٣).

ئەگەر خراپەش بکەین سەرناکەون بەسەرماندا، ڕەنگە گەل و نەتەوەیەك خراپە زاڵ بێت بەسەریاندا هەروەك ئەوەی کە زاڵ بوو بەسەر بەنی ئیسرائیلدا کاتێك کە بێباوەڕانی مەجووس بە بێزاری خۆیان زانی، ئینجا ئەوان دەگەڕێن بە ناو وڵاتەکاندا، ئەوە بەڵێنێکی بەدیهێنراو بوو، هەروەك ئەوەی کە داوای سەرکەوتن بەسەر دوژمنانتاندا لە خودا دەخوازن ئومێدی پشتیوانیشی لەسەر خۆتان لێ بکەن، من داوای ئەمە لە خوا بۆ ئێوەش و بۆ خۆشم دەکەم، عومەر لەم ڕێ ڕۆیشتنەدا هاوەڵی موسڵمانانی دەکرد و شوێنیان دەکەوت و لە هیچ جێگەیەکدا درێغی پێ نەدەکردن و هاوەڵی دەکردن تا دەگەیشتە دوژمنانیان و ئەم گەشتەش هیچ لە توانا و هێزی کەم نەدەکردنەوە، ئەوان بەرەو دوژمنێکی نیشتەجێکراو دەڕۆیشتن، ژمارەی خەڵکی و ئەسپەکانیش زۆر بوون، هەموو شەو و ڕۆژێکی هەینی لەگەڵیان دانیشە هەتا ئەمە دەبێتە مایەی حەوانەوە بۆیان، خۆیانی تێدا کۆدەکەنەوە، چەك و تفاقەکانیان فڕێ دەدەن، ماڵەکانیان لە گوندەکانی خاوەن ئاشتی و ڕێککەوتن و بەڵێن پێدراوان لابە، ڕێگە نەدەی، کە هاوەڵانی تێبڕوات مەگەر متمانەت بە ئاینەکەی هەبێت، بە هیچ جۆرێك سوکایەتی و گاڵتە بە خەڵکەکەی مەکەن چونکە ئەوان ڕێز و بەڵێنیان هەیە و ئەوەش بە وەفاداری بەو دوانە تاقی کراونەتەوە، هەروەك ئەوەی بە ئارامیگری لەسەری تاقی کراونەتەوە، هەرچۆن ئەوان بۆ ئێوە بە ئارامن و ئێوەش بە هەمان شێوە بۆیان بە وەفا بن، بە ستەمی خەڵکی ئاشتەوا سەرمەکەون بەسەر دوژمندا، ئەگەر نزمترین پارچە زەوی دوژمن بۆت سانا بوو ئەوا چاوەکانت لە نێوان خۆت و ئەواندا بێدار و وریا بکەرەوە، کاری خۆتیان لە لا سووك مەکە وە لە خەڵکی عەرەب کەسانێکت بە دەوروبەرەوە بن کە گوێ بۆ ئامۆژگاری و چاکەیان دەگریت، چونکە بە ڕاستی درۆزن ئەگەر نیوەی هەواڵەکەشی دروست بێت سوودی لێ نابینیت، فێڵبازیش چاوی لەسەرتە نەك چاوی لێت بێت، با لە خۆت و لە خوارتەوە و لە زەوی دوژمن پێشەنگەکان زیاد بکە، و دەستە چەکداریەکان لە نێوان خۆت و ئەواندا پەخش بکە، چونکە ئەو دەستانە کۆمەکی و هاوکاریان بنەبڕ دەکەن، و شوێنی عەیبەکانیان دەکەون، هەروەها ئەو پێشەنگانە لە خاوەن ڕای هاوەڵت هەڵبژێرە، پێشینەی ئەسپەکانیان بۆ دەست نیشان بکە وە ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە ئەوا یەکەمین شتێك کە ڕووبەڕووی دەبنەوە هێزەکەیە لە ڕاوبۆچوونی تۆ، کاروباری ئەو دەستەیە بدەرە شارەزایانی بواری جیهاد، بە ئارام بە لەسەر لێدەر و دار وەشێنەکان، ڕەنگە (هیچ کەسێك بە ئارەزوو تایبەتمەند نەبێت) لە ڕایەکەت لەناو بچێت و کارەکەشت زۆر لەوانە بێت کە خەڵکانی تایبەتمەندت پێ خۆش ویستبێت، هیچ پێشڕەو و دەستەیەك مەنێرە بە لایەکدا کە دەترسی بەزاندن و تیاچوونی تیدابێت، ئەگەر دوژمنت دەست نیشان کرد ئەوا دوورترین کەسانت و دەستە و پێشڕەوەکانت بگرە کۆشت و بیان هێنەرەوە بۆ لای خۆت، هەرچی هێز و فێڵی خۆت هەیە کۆی بکەرەوە، پاشان ئەگەر جەنگ زۆری بۆ نەهێنای بە بەرەنگاربوونەوە چارەسەری گرفتەکانیان مەکە، هەتا عەیب و کەم و کورتی دوژمنت جەنگاوەرانی بە چاوی خۆت دەبینی، تەواوی زەویەکە وەك دانیشتوانەکەی بناسە، ئەوا دوژمنت چیت پێ بکات تۆش بە هەمان شێوەی پێ دەکەیتەوە و پاشان پاسەوانانی سەربازگەکەت وریا و توند و تۆڵ بکەرەوە، پارێزگاری لە شەوخوونی هەوڵت بکە،

هەر دیلێك پەیمان و بەڵێنی لەگەڵت نەبوو لە گەردنی بدە و بەمەش دوژمنی تۆ و دوژمنەکانی خوداش دەتۆقن، خوای گەورە بکەرە بەرپرسی کارەکانی خۆت و ئەوانیش کە لەگەڵت دان و بیکەرە بەرپرسی سەرکەوتنت بۆ خۆتان لەسەر دوژمنەکانتان و خوای گەورەش پشتیوانە.[1]

ئەمە لێدوان و وتارێکی گەورەیە و ئامۆژگاریە بەسوودەکان دەگرێتەوە، و لایەنێکی گرنگمان لە گەورەیی عومەر (رضي الله عنه) بۆ ڕوون دەکاتەوە کە بریتییە لە شارەزایی بەرزی لە نەخشەسازی و پلانی جەنگی، لەسەرکەوتنی خوای گەورە لە تەواوی ئامۆژگاری و ڕاسپاردەکانیدا بە ڕوونی دیارە،[2] ئێمەش دەتوانین هەندێ لەو بنەمایانەی کە ئەو وەسیەتە دەیانگرێتەوە کورت بکەینەوە لەم چەند خاڵانەی خوارەوە:

- فەرمانی دا بەسەر سوپا بە ملکەچی خودا و تەقوا لە هەموو بارودۆخێکدا، بە بڕوای ئەوەی کە ئەمە چەکی یەکەمینە، و وریاکەرەوەی ئەوەیە کە یەکەمین دوژمن بریتییە لەتاوان و گوناه، پاشان جەنگاوەرانی بێباوەڕ، ئاوڕی بۆ ئەوە دەدایەوە کە چاودێری کردنەکان پێویستە ورد و هەمیشەیی بن لەسەر تاکەکانی سوپای ئیسلامی، و ئاماژەکردن بە پێویست بوونی شەرم لە تاوان، ئەگەر عەقڵ نەیبڕێ کە مرۆڤ تاوان بکات و لە گۆڕەپانی جیهاد و تێکۆشان بێت لە پێناوی خودا و جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە ئەو لە سەرچاوەی دڵڕەقی و پەستیەکانە بۆ ڕاستی و دروستی، وەرگرتنی ڕەفتەکانی دوژمن و پێوەرێکە بۆ بەهانە هێنانەوەی ڕەفتارەکانی سوپای ئیسلامی و ئامادەکاری پێویستی هەمیشەیی بۆ هاریکاری و پشتیوانی خوای گەورە.
- بنەمای دووەم کە جەخت لەسەر ئەم پەیامەی عومەر دەکاتەوە بۆ سەعد بریتییە لەوەی: کە چاودێری کردنی لایەنی یەکەم لە پەیوەندی شوێنی لێکۆڵینەوەیە لە دژی هەر مەترسیەك، و جەخت کردنەوەیە لە ڕێزگرتنی خەڵکی گوند و ئاشتیخواز و بەرکەوتنی هۆیەکانی دڵنیایی و دڵنیایی شێوەی ئیسلامیە لە هەر شوێنەوارێکی پێچەوانەیی کە کار دەکاتە سەر سەرکەوتنی کاری پەیوەندی لە نێوان موسڵمانان و نا موسڵماناندا، لە میانی ڕەفتارە نادروستەکاندا لە لایەنی هەندێ بنەمای ئیسلامیەوە، هەوڵی دەستەبەرکردنی داخوازیەکانی ئەم بنەمایەی داوە، عومەر فەرمانی دا بە ئەمیرەکەی کە چاودێری هۆیەکانی پارێزگاری لە سوپا بکات، و بیگەیەنێتە زەوی دەژمن، لە کاتێکدا کە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هەیە، عومەر فەرمووی: هاوەڵی موسڵمانان دەکەیت لە ڕێ و ڕۆیشتنیاندا... هەتا فەرمووی: ئەمە دەبێتە مایەی پشوویەك کە خۆیانی پێ کۆبکەنەوە، و چەك و تفاقی خۆیان پێ کۆبکەنەوە، پاش دڵنیابوون لەسەر هۆکارەکانی چاکسازی و پاکی کەرەسەکان و کەل و پەلی جەنگی ئیسلامی، عومەر وریایی دا کە خۆپاراستن باشترە لە چارەسەرکردن، عومەر فەرمانی دا — وەك بەشە یەدەکیەکان — بە دوورخستنەوەی سوپا لە گوندە ئاشتیخوازەکان وەك وریایی دان بۆ توانای ڕوودانی هەر جۆرە زیادەڕۆییەك، کە بە خراپ دەشکێتەوە بە سەریاندا، لەسەر پەیوەندی بە مەبەست و

---

١ـ الفاروق عمر بن الخطاب، احمد رشيد رضا (ص: ١١٩، ١٢٠).
٢ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٣٧٤).

ڕەساندنی، و ڕێگە نەدان بە چوونە نێو گوندەکان جگە بە خەڵکانی متمانەپێکراو نەبێت، و جەخت کردنە لەسەر ڕێزگرتنی خەڵکانی ئاشتیخواز و پابەند بوون بە وەفاداری بۆیان.

- هەروەها نامەکەی عومەر لەسەر بنەمای سێیەم چەسپابوو کە: هەمەڕەنگی بوو لە مامەڵەکردن بە پێی جۆری هاوبەشی ڕۆڵ بینین، و بەزەیی هاتنەوە بە خەڵکی ئاشتیخواز و بارنەکردنیان لەسەر توانای خۆیانەوە، عومەر داوای لە ئەمیرەکەی کرد کە ستەم لە کەسانی ئاشتیخواز نەکات بە مەبەستی سەرکەوتن بەسەر شەڕخوازاندا، پشت ببەستێ بەوانەی کە لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی دەوروبەریدا متمانەیان پێ دەکات، بە جۆرێ کە ئەو متمانە ڕەهایە بە مانای: پارێزگاری کردن نەبێت تیایدا هەتا لە پێش ڕۆچوونەوە نەبێت لە گومانی باشدا.

- بنەمای چوارەم: کە بریتیە لە کۆکردنەوەی زانیاری تەواو دەربارەی دوژمن، عومەر وریایی دا بۆ پێویست بوونی پاڵپشتی کار و فەرمانی کۆکردنەوەی زانیاری بۆ پێشەنگەکانی دەرچوون لە باشترین بنەماکانی سوپا، لەگەڵ چەکدارکردنی بە باشترین شێوە و ئەوەی لە چەك و تەقەمەنی لە چنگی سوپادایە بەمەش سوپا هەندێکیانی ئاشکرا دەکات و ڕقی لێ دەبێتەوە لە چوونە ناو جەنگ، هەروەها پێویستە لە بەهێزەکان بیت کە ئەمەش خروشانی دەرونی خوازراو لە ناخی دوژمن نوێ دەکاتەوە بە هەست کردنی بە هێزی سوپا و بەگرتنەبەری هۆیەکانی توانایی لە بەکارهێنانی هێزەکە.

- بنەمای پێنجەم و کۆتایی: لە پەیامەکەی عومەردا بریتیە: لە دانانی پیاوی شیاو لە شوێنی شیاو و بە بڕوای ئەوەی کە مەبەست لە کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە دوژمن مەبەست لە توانای بەگژاچوونەوەی نیە بە ڕێژەی کە لە زۆرلێکردنی لایەنی دووەم بە دەستی دێنێ بۆ موسڵمانان لەسەر جەنگ، لەبەر ئەوە لەسەر موسڵمانان پێویستە کە پاش وەرگرتنی هۆیەکانی بە توانا بن، ئامادەبوونی ئەوەی کە دۆزیویانەتەوە بۆ ئەم ڕێگەیە لەگەڵ وەرگرتنی دووربینی و وریایی دان و پێگەیشتوان.[1]

## ٦- کۆمەکخوازی بەو هەڵگەراوانەی کە تەوبەیان کردووە:

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) نە لە جەنگی هەڵگەراوەکان و نە لە جەنگی ئازادیخوازەکانیشدا پشتی بە هەڵگەراوەکان نەبەستووە، بەڵام عومەر(ﷺ) پاش ئەوەی کە تەوبەیان کرد ڕاپیەڕاندن و بارودۆخی باش کردن و دادپەروەریەکیان لە پەروەردەی ئیسلامی وەرگرت بەڵام عومەر کەسیانی نەکردە کاربەدەست،[2] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر دەربارەی طلیحة کوڕی خویلەدی الاسدی عەمری کوڕی مەعدی کەربی ئەلزوبەیدی پەیامێکی دایە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کە: کۆمەکیان لێ بخوازە بەڵام مەیان کە بە بەرپرس بەسەر سەد کەسەوە،[3] ئێمە سوود لە سوونەتی هەردوو خەلیفە ئەبو بەکر و عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) وەردەگرین،[4] کەواتە هەر کەس لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام

١ـ الدور السياسي للصفوة في صدر الاسلام (ص: ٤٢٩).
٢ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٣٧٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ سنن الترمذي المناقب باب ٥٢ حديث رقم (٣٧٤٢).

پاشگەزبوویەوە و پاشان تەوبەی کردەوە و گەرایەوە بۆ ناو ئاینی ئیسلام ئەوا تەوبەکەی لێ وەردەگیرێت و خوێن و ماڵی پارێزراو دەبێت، ئەوەی مافی موسڵمانانە مافی ئەویشە و ئەوەش لەسەر موسڵمانانە لەسەر ئەویشە بەڵام هێندەی تیایە کە لە هیچ شتێکدا ناکرێتە کاربەدەست لە کاروباری موسڵمانان و بە تایبەت لە کاری سەرکردەییدا، ئەویش لەبەر ئەوەی کە ڕەنگە تەوبەکەی دوودڵی و نیفاقی تێدا بێت، ئەگەر هاتو ئەم کەسە بەم شێوەیە بوو وە کاری گرنگی سەرکردایەتی کردنی موسڵمانان و بە تایبەتی کاری سەرکردایەتی پێدرا ئەوا کارەکان لەسەر زەوی دەشێوێنێ و هاوسەنگیەکانی ژیان هەڵدەگێڕێتەوە و لە هاوشێوە دووڕووەکانی نزیك دەبێتەوە و لە باوەڕدارانی ڕاستەقینە دووردەکەوێتەوە و کۆمەڵگای ئیسلامی دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵگایەك کە دیاردەی جاهیلی باڵی بەسەردا بکێشێت، ئەمە ئەو سوونەتە تێگەیشتوانەیە بوو لە دوو خەلیفەکەی ڕاشیدی بۆ پاراستنی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەرکەوتنی خراپەکاران بۆ سەرکردایەتی کردنی و ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردنی، ڕەنگە سزای ئەم سونەتەش هەروەها تێبینی سزای هەڵگەراوان دەستەبەرکردنی دەسەڵات و پلەداری، ئەگەر تەوبەی خۆیان ئاشکرا کرد، وگەرانەوە بۆ ئیسلام کە لە هێڵی ئیسلامی دەربچن بە دوای دەسەڵاتدا دەگەڕێن و لە ڕەفتار و کرداری ئیسلام و دەبنە دۆستی دوژمنان...[1]

## ٧- پەیامی ئەمیری باوەڕداران بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص:

پەیامێکی ئەمیری باوەڕداران گەیشتە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، کە لە سەرافی سەر سنووری عێراق نیشتەجێ بووبوو تیایدا فەرمانی پێدا کە بەرەو ناوچەی فارسەکان بڕوات وە لەم پەیامەدا هاتووە کە دەفەرمووێت: پاش ئەوە لە شەرافەوە بەرەو ناوچەی فارس بڕۆ، بەو موسڵمانانەشەوە کە لەگەڵتدان، پشت بە خوا ببەستە و لەسەر هەموو کارەکانت کۆمەکی لێ بخوازە، ئەوەش بزانە کە لەوەی لە لاتە کە تۆ پێشڕەوی دەکەیت لەسەر ئومەتێك کە ژمارەیان زۆرە و کەل و پەلیشیان زۆر باشە، و ڕەبەنیان توندڕەون، و لەسەر وڵاتێکی نەبەزن — وە ئەگەر ئاسانیش بێت — وەك چەوت و خواریەکان بۆ ئاو و ڕووبارەکانی و لافاوی بۆشایی و ئەوانەی کە بەرفراوان بوون لە شێوەکان، مەگەر هاودەنگ بن بۆ کەمێك لە لافاوێك، ئەگەر ئێوە گەیشتنە گەلێك یان نەتەوەیەك یان کەسێکیان ئەوا دەست بکەن بە ئامادەکردن و لێدانیان، نەکەن بەربەرەکێ و دووبەرەکی ساز بکەن — بۆ کۆکردنەوەیان — واتا چاوەڕوانی دوای ڕووبەڕووبوونەوە —بەئاگا بن کە نەتان خەڵەتێنن چونکە خەڵەتاندن فڕوفێڵە، کاری ئەوان کاری ئێوە نیە، مەگەر بیان هێننە جۆش و خرۆش — واتا بە ڕاستی بیان گرن — وە هەرکە گەیشتیە قادسیە،[2] ئەوا چەکدارەکانت لەسەر ڕێگاکانی خۆیان دەبن و خەڵکیش لە نێوان دەشتایی و گوندە ئاوەدانکراوەکاندا دەبن، لەسەر کەناری دەشتایی و کەناری گوندە ئاوەدانەکان و زەویە لیتاوەکانی نێوانیان دەبن، پاشان بە شوێنی خۆتەوە پابەند ببە و لێی مەگەرێ چونکە ئەوان ئەگەر پێت بزانن ئەوا دەیان بزوێنێت و بە کۆبوونەوەیان بەرد بارانت دەکەن، بە تایبەتی ئەوانەیان کە

---

١ـ التاريخ الاسلامي (٣٧٦/١٠).

٢ـ القادسية:- باب فارس في الجاهلية.

بەسەر ئەسپەکان و پێی خۆیان بینی بە تەنهایی و توڕەیی و پەستیان، ئەگەر ئێوە ئارامتان گرت بۆ دوژمنانتان، نرختان بۆ جەنگی دانا و ئەمانەتەکەتان ویست ئەوا من تکای سەرکەوتنتان بە سەریاندا بۆ دەکەم، پاشان بە هاوشێوەی ئەوان هەرگیز بۆتان کۆ نابنەوە، ئەگەر کۆش بنەوە ئەوا دڵیان لەگەڵتاندا نیە، ئەگەر بە شێوەیەکی تر بوو ئەوا چۆڵی و دەشتایی لەسەر پشتی ئێوە دەبێت، ئەوا ئێوە دەرتان کردوون لە نزمترین باپشکێوی زەویەکەیان بۆ نزمترین بیابانێك لە زەویەکەتان، پاشان ئێوە لەسەر ئەمە بوێرتر و شارەزاترن پێی، ئەوان لێ ترسنۆك و لاوازن، ئەمەش وەسیەتێکە لە دەست نیشان کردنی شوێنەکەیە کە سوپا تیایدا سەقامگیر دەبێت و هاوشێوەی وەسیەتەکەی موسەننایە بۆ سەعد بە جۆرێ ڕای عومەر و موسەننا لە هەڵبژاردنی شوێنەکەدا هاودەنگ بوون، ئەم وەسیەتەش لە موسەنناوە لە ئاکامی شارەزایی و پسپۆڕی زیاتر لە سێ ساڵی بوو لە جەنگی فارسدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر لێهاتوویی عومەر (ﷺ) لە پلان و نەخشەسازی جەنگی لەگەڵ ئەوەی کە پێیەکانی نەگەیشتبووە خاك و زەوی عێراق، ئەم وەسیەتەش مانەوەی سوپا لە دووری قەباڵەکانی دوژمن دەهێڵێتەوە، پاشان بۆردومان کردنیان بەو دەستانەی گە زیانیان لەسەر دەبزوێ شوێنکەوتووانی لەسەر دەخرۆشێت هەتا موسڵمانان ناچار بن لەو شوێنەی کە دەیانەوێت ڕووبەڕوویان ببنەوە.[1]

## ٨- لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ورە بەرزی ڕای عومەردا (ﷺ):

عومەر (ﷺ)نامەیەکی نووسی بۆ سەعد و هۆکارەکانی سەرکەوتنی ورەبەرزی وەیادهێنایەوە کە بریتیە لەو هۆکارانەی کە بە شوێنەواری یەکەمدا دێن لەو پەیامەدا هاتووە کە: پاش ئەوە پەیمان و بەڵێن بە دڵت بدە وە سەربازەکانت بدوێنە بە ئامۆژگاری و نیازی باش وە هەر بێئاگا بوو با بیان دوێنن ئارام بگرن و بە ئارام بن، چونکە بە ڕاستی کۆمەکی و هاوکاری بە ڕێژەی نیاز و پاداشت و ڕێژەی چاکە لە خوداوە بینی، وریابە لەوەی کە تۆ لە سەریتی و لەڕێگەی دایت و داوای تەندروستی و لەش ساغیش لە خوای گەورە بکە، بە زۆری وشەی (لاحول ولا قوة إلّا بالله)دووپات بکەنەوە و بە هەر کوێ گەیشتن بە نامەیەك ئاگادارم بکەرەوە، لەو سەرانەی کە بە دوای ڕووبەڕووبوونەوەتان دێن، چونکە ئەوە ڕێگری کردم لە هەندێ لەو شتانەی کە دەمویست بیان نوسم بە هۆی کەمی شارەزایی بەوەی کە هێرشتان کردۆتە سەر و ئەوەش کە کاروباری دوژمنەکانتانی لەسەر جێگیر بووە، تۆ وەسفی شوێنی موسڵمانانم بۆ بکە، لەگەڵ ئەو شارەی کە لە نێوان ئێوە و مەدائن دایە و با وەسفەکەش بەو شێوەیە بێت کە من بۆی دەڕوانم، من لە کاروبارتاندا لەسەر هۆزەکەوە دابنێ و لە خودا بترسە و تکای لێ بکە، بە هیچ شتێکدا مەنازە ، ئەوەش بزانە کە خوای گەورە بەڵێنی پێ داون، بۆ ئەم کارەش پشت ببەستە بەوەی کە ناتەواوی نیە، وریا بە لەوەی کە لە خۆتی دوور بخەیتەوە، چونکە خوای گەورە دەتانگۆڕێت بە کەسانێکی تر،[2] بە ڕاستی لەم پەیامەدا عومەر وەسیەت دەکات بە پەیماندانی دڵ،

---

١ـ التأريخ الاسلامي (٣٧٩/١٠).
٢ـ تأريخ الطبري (٣١٥/٤).

چونکە دڵ بریتیە لە فاکتەرێك بۆ هەموو ئەندامانی جەستەو فەرمانداره بەسەریاندا و ئەگەر دڵ باش بوو ئەوا تەواوی جەستە باش دەبێت، پاشان عومەر وەسیەتی بۆ دەکات بە ئامۆژگاری کردنی سەربازەکانی و وەیاد هێنانەوەیان بە دڵسۆزی بۆ خوای گەورەی مەزن و هەژماری پاداشتەکان لە لای ، ڕوونیشی دەکاتەوە کە سەرکەوتنی خودایی لەسەر ئەمە ڕێکخراوە، هەروەها وریای دەکاتەوە لە لادان لەو بەرپرسیارێتیەی کە بەسەر شانیەوەیەتی و ئەوەش لە ئازادیخوازی بە دەمیەوە دەچێت، هەروەها عومەر ئەوەیان وەیاد دەهێنێتەوە کە پەیوەست بن بە خوای گەورەوە و هێز و دەسەلاتیان لە هێز و دەسەلاتی ئەودایە، وەسیەت بۆ سەرکردەی موسڵمانان دەکات کە پێویستە لە نێوان شوێنەکانی ترسان لە خودا بێت و تکاش هەر لای ئەوە: کە بریتیە لە پلە و پایەیەکی گرنگ لە پلە و پایەکانی یەکتاپەرستی و هەروەها ڕێگری دەکات لە نازکردن بەسەر خودا لە شتێك لە کارەکەی یان ستایشی خەڵکی، ئەو بەڵێنەی وەیاد دێنێتەوە کە پێشتر خوای گەورە بەڵێنی سەرکەوتنی ئیسلام و ڕەوێنەوەی میرنشینەکانی کوفری داوە، پاشان وریای دەکاتەوە لە سوکایەتی کردن لە بەدی هێنانی شتێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن، چونکە سەرکەوتن لێیان جیادەبێتەوە هەتا لەسەر دەستی کەسانێکی تر تەواو دەبێت کە خوای گەورە دەست نیشانیان دەکات و هەڵیان دەبژێرێت.[1]

## ٩- سەعد(ﷺ) وەسفی شوێنی قادسیە بۆ عومەر(ﷺ) دەکات و ئەویش وەڵامی دەداتەوە:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ عومەر(ﷺ)و تیایدا وەسفی ئەو وڵاتانەی بۆ کرد کە پێشبینی دەکرێت ببێتە گۆڕەپانێك بۆ جەنگ، تا گەشتە ئەوەی فەرمووبووی: هەموو شتەکان لە بەرژەوەندی موسڵمانانن لە خەڵکی ڕەشۆکی و لە پێشمەوە قولانجێك هەیە بۆ خەڵکی فارس کە ملکەچ بوون و بۆیان و ئامادەن بۆ ئێمە، ئەوەی کە ئامادەیان کردووە بۆ بەرەنگاربوونەوەمان ڕۆستەمە ، ئەوان هەوڵی ئەوە دەدەن کە بمان هەژێنن و تێمان بدەن بەسەر یەکدا، ئێمەش هەوڵی جوڵان و دەرکەوتنی ئەوان دەدەین، کار و فەرمانی خوداش پاش تێپەڕ بوونیەتی، بەجێهێنانی دراوەتە دەست ئەوقەدەرەی، کە بۆ ئێمەیە و لەسەرمانە، بۆیە ئێمە داوای فەرمانی باش و چارەنووسی چاك لە تەندروستیدا لە خوای گەورە داواکارین،[2] عومەریش نامەیەك بۆسەعد دەنووسێت: من نامەو پەیامەکەتم پێگەیشت و لێی تێگەیشتم لە شوێنی خۆت لە سەقامگیر ببە تا خوای گەورە دوژمنەکەتت بۆدەجوڵێنێت، ئەمەش بزانە، کە ئەمە شتی تری لەپشتەوەیە، ئەگەر خوای گەورە پشت هەڵکردنی ئەوانی پێ بەخشیت ئەوا ئەم هەڵە لە دەست مەدەو هەتا مەدائینیان بەسەردا تێك دەدەیت، چونکە ئەوە - إنشاء الله - شێواندنیەتی،[3] لەمیانی ئەم پەیامەی عومەردا بۆمان

---

١- التأريخ الاسلامي (٣٧٩/١٠).
٢- البداية والنهاية (٣٨/٧).
٣- البداية والنهاية (٣٨/٧).

دەردەکەوێت، کە عومەر(ﷺ) چەند بڕیارێکی شیاوی گرتۆتەبەر لەوانە:
- سەعد لە شوێنی خۆی جێگیر بێت و بەجێی نەهێڵێت.
- دەست پێشخەر نەبێت لەجەنگی دوژمن بەڵکو ئەو دەست پێشخەریە لێگەڕێ بۆ دوژمن.
- ئارەزووی بەری ئەو سەرکەوتنە بکات و دوژمن ڕاو بنێت تا شاری مەدائن، ئەو کاتە خوای گەورە لەسەر دەستی ئازادی دەکات،[1] وە لەگەڵ گرتنی ئەو هۆکارە مادیانەی کە دەکرێت بە هۆیەوە سەرکەوتن دەستەبەر بێت بەڵام عومەر لە لایەنی مەعنەوی و هێرشی دەروونی بۆ سەر دوژمنان لە نێو ماڵەکانی خۆیاندا لێنەگەڕا، لەگەڵ سەرفرازی پادشاکەیان و هێزی دەسەڵاتیان، بۆیە نامەیەکی نارد بۆ سەعد کە نووسیبووی: من لە بەدڵاچوونی خۆمدا ئەوەم پێ دەکات: ئەگەر ئێوە ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە سەردەکەون بەسەریاندا، کەی یەکێك لە ئێوە یاری بە کەسێك لە عەجەم کردووە بە دڵنیایی و ئاماژەپێکردن یان بە زمان و ئەوان ئارامی و دڵنیاییان لەلا بێت، دەی ئێوەش پاداشتی ئەوە بدەنەوە بە ڕێڕەوی دڵنیایی و پارێزگاری لێ کردن، بە ڕاستی هەڵەکردن بە وەفا مانەوەیە و هەڵەکردنبە فێڵیش تیاچوونە، ترسانی ئێوە و هێزی دوژمنانتان تێدایە.[2]

عومەر(ﷺ) بەڕاستی بە هەموو هەست و نەستەکانیەوە لەگەڵ سوپای ئیسلامیدا دەژیا، چونکە پەرۆشی و پەریشانیەکانی لەسەری چڕبوونەوە تا ئارامی بە ژیانی خۆی نەدەدا و بە هیچ شێوەیەك ئۆقرەی نەدەگرت تا گوێ بیستی هەواڵیان دەبوو، لە نموونەی ئەم ئیلهامە لە خوای گەورەوەیە و بار سووك کردنێکە لەم بارە گەورەیەی کە عومەر ناویەتیە سەر شانی خۆی و دامەزراویەکە بۆ موسڵمانان ورە و وزەیەکە بۆ دڵەکانیان، ئێمە لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە عومەر(ﷺ) شتێکی لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ورەبەرزی وەیادی موسڵمانان هێنایەوە بە جۆرێك هانیدان لەسەر پابەندبوون بە شەرەفی وشە و ڕاستگۆیی لە گوفتار و پارێزگاریکردن لە بەڵێنەکان، ئەگەر یەکێك لە تاکەکانی موسڵمانان پابەند بوو بەم کارەوە، یان ئەوەتا هەڵەیەك لە تێگەیشتنیدا ڕوودەدات کە موسڵمان مەبەستی دڵنیایی و تێگەیشتنی دڵنیایی نابێت لە دوژمن.[3]

## دووەم: عومەر(ﷺ)داوای لەسەعد کردکە شاندێك ڕەوانەی پاشای فارس بکات بۆ گفتوگۆ:

عومەر لە پەیامەکانیدا بە سەعدی فەرموو: با ئەوەی، کە دەربارەی ئەوان یان لەوانەوە بۆت دێ و پێت دەگات دووچاری ماتەمینیت نەکات و کۆمەك لە خودا بخوازە و پشتی پێ ببەستە و پیاوانێکی خاوەن ڕاوبۆچوون و ئارامگران بنێرە بۆ لای هەتا بانگی بکەن بۆ سەر ڕێبازی خودایی، چونکە خوای گەورە خولقێنەری بانگکردن و لاوازکردنیانە و گۆت و ئیفلیج کەرە لەسەریان وە عومەر داوای لە سەعد کرد کە هەموو ڕۆژێك نامەیەکی بۆ بنووسێت،[4] وە ڕێگەی پێدا لە کۆکردنەوەی پیاوانی خاوەن

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٥٣).
٢ـ إتمام الوفاء في سيرة الخلفاء (ص: ٧٣).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٣٨١).
٤ـ أنظر: البداية والنهاية (٣٨/٧).

ڕا و بۆچوون، ئەو کەسانەی کە لە خەڵکانی خاوەن هەوڵ و تێکۆشان و ڕاوبۆچوونەکان دەست نیشانیان کەوتە سەر ئەمانە بوون:

١- نوعمانی کوڕی موقرنی ئەلموزنی.

٢- بوسری کوڕی ئەبی ڕەهمی ئەلجوهنی.

٣- حەملەی کوڕی جوەیهی ئەلکەنانی.

٤- حەنزەلەی کوڕی ڕەبیعی ئەلتەمیمی.

٥- فوراتی کوڕی حەیانی ئەلعەجلی.

٦- عودەی کوڕی سوهەیل.

٧- موغیرەی کوڕی زرارەی کوڕی ئەلنەباشی کوڕی حەبیب.[1]

سەعد چەند کەسێکی لەسەر دەست نیشان کردن وەك سامێك بۆیان و دیمەنێك بۆ جەستەیان و چەندین ڕای بەجێ هێنەریان هەبوو لەو کەسانە:

١- عەتارەبینی کوڕی حاجب ئەلتەمیمی.

٢- ئەشعەسی کوڕی قەیسی ئەلکەندی.

٣- حارسی کوڕی حەسانی ئەلزهلی.

٤- عاصم کوڕی عەمری ئەلتەمیمی.

٥- عەمری کوڕی مەعدیەکروب ئەلزوبەیبینی.

٦- موغیرەی کوڕی شوعبەی ئەلسەقەفی.

٧- مەعنای کوڕی حارسەی ئەلشەیبانی.[2]

ئەمانە چواردە بانگخواز بوون کە سەعد ناردنی بۆ لای پادشای فارسەکان بە فەرمانی عومەر(ﷺ) کە ئەمانە لە گەورەی هۆزەکان بوون هەر بەو شێوەیەی کە عومەر(ﷺ) خواستبووی، هەتا بتوانن بە دانایی و ژیری و ئامۆژگاری باش و گفت و گۆی باش یەزدجەرد بانگ بکەن، ڕەنگە خوای گەورە هیدایەتی خۆی و سەربازەکانی بدات بۆ باوەڕهێنان و نەڕژانی خوێنی هەردوولا، بە ڕاستی ئەم شاندە پوختە لە پیاوانی پلەبەرزی خاوەن توانا و لێهاتوویی بوون بۆ ئەوەی، کە بۆی ڕەوانە کرابوون، لەگەڵ ئەوەی، کە خاوەن هێزو دەسەڵات و سام و ڕای باش بوون، هەروەها شارەزایی پێش وەختیان بە فارسەوە هەبوو، لە نێوان ئەمانەدا کەسانێك هەبوون کە لەگەڵ فارس بە جەنگ هاتوون و فارس لەگەڵیان جەنگاوەو لەگەڵیانداو لەهەڵمەتەکانی پێشوویاندا بەدواداچوونی جەنگیان هەبووە، هەشیانە لە سەردەمی جاهیلیەتدا بۆتە وەفد و ڕەوانەی لای پادشای فارس کراوە و هەشیانە کە شارەزایی زمانی فارسیە، سەعد پاش ئەوەی کە دەرخستەیەکی هونەری لە ڕووی توانا و ڕاوبۆچوونی باشیانەوە بۆدەرکەوت هەڵیبژاردن بۆ ئەم کارە ، سەرباری ئەوەش دەرخستەیەکی پزیشکی بۆ کردن

---

١ـ أنظر: الدعوة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب لحسني محمد ابراهيم.

٢ـ أنظر: الكامل في التأريخ (٢/١٠١).

لەڕووی هێزو لاوازی و دامەزراویەوە لەڕووی چالاکی و جەستەییەوە،[1] هەروەها ئەم شاندەخاوەنی دوو سیفەتی خوازراوو سامناك بوو، کە لە جەستەو سام و ئارامگری و زیرەکی بوون.[2]

ئەم شاندە پیرۆزە بە سەرکردایەتی نوعمانی کوڕی موقرن بەڕێکەوت، پاش ئەوەی کە گەیشتنە مەدائن چوونە لای یەزدجەردی پادشای فارس، و بە هۆی وەرگێڕەکەیەوە پرسیاری لێ کردن: ئێوە چی وای لێ کردوون کە بێن بۆ جەنگ لەگەڵمان ؟ ئایا لە پێناوی مندایە کە سەرقاڵمان دەکەن بە خۆتانەوەو پێمان وێراون؟

پاشان نوعمانی کوڕی موقرن دەربارەی ئەوان دوا و فەرمووی: خوای گەورە بەزەیی بە ئێمەدا هاتۆتەوە، پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین کە فەرمانمان دەکات بە چاکە و بەرمان دەگرێت لە خراپە وە بەڵێنی پێ داوین لەسەر بە دەمەوەچوونی چاکەی دونیا و دوارۆژ لێنەگەڕاوەکە هۆزێك دەستەیەکی لێ نزیك بێتەوە و دەستەیەکی لێ دووربکەوێتەوە، پاشان فەرمانی داوە کە دەستپێشخەری لەو عەرەبانە بکەین کە هاودەنگی نین، ئێمەش دەستپێشخەریمان پێ کردن، ئەوانیش بە دوو شێوە لەگەڵیدا هاتنە ژورەوە کۆمەڵێکیان بەزۆرداری و پاشان ئێرەیی بەونازو نیعمەتە برد،کۆمەڵەکەی تریان ملکەچ بوون و پاشان ژمارەیان زیادی کرد، بەم شێوەیە ئێمە هەموومان چاکی ئەو بەرنامەیەمان زانی کە ئەو هێناویەتی لەچاو ئەوەی کە ئێمە لەسەری بووین، کە هەر دوژمنایەتی و تەنگەڵانی و گرژی و ئاڵۆزی بوو، پاشتر فەرمانی پێداین کە دەستپێشخەری بکەین لەسەر ئەو گەلانەی کە بە دەوروپشتمانەوەن، ئێمەش بانگیان دەکەین بۆ دادپەروەری و ڕاست پەروەری، ئێمە ئێوە بانگ دەکەین بۆ سەر ئایین و ڕێبازەکەمان، کە ئاینێکە هەموو چاکەیەکی بە چاك و هەموو خراپەیەکی بە خراپ داناوە، ئەگەر بەرپەرچتان دایەوە فەرمان بدە لە خراپەیەك کە هێورتر بێت لە خراپەیەك تیایدا کە: سەرانەیە، ئەگەر بەرپەرچی ئەو دەستکەوتەتان دایەوە، ئەگەر هاتن بە دەم ئاینەکەتانەوە ئەوا قورئانتان لە نێو بەجێ دێڵن، لەسەرتان دەڕەسێنین کە کار بە فەرمانەکانی بکەن، کار و فەرمان و وڵاتەکەتان لێ دەگێڕینەوە، ئەگەر پێش ئێمە هەوڵی پاداشتتان لە خۆتان دایەوە و ڕێگریمان لێ کردن وە ئەگەرنا لەگەڵتان دەجەنگین).

یەزدجەردی پادشای فارسیش وتی: من گەلێك لەسەر زەوی ناناسم، کە درندەتر کەم ژمارەتر و خراپتر بێت لەوەی کە لە نێوانتاندایە، ئێمە پێشتر گوندەکانی دەوروبەرمان دەسپارد بە ئێوە و کار و فەرمانی ئێمەتان بەس بوو، تەماع نەتان گرێ کە بەڕووی فارسدا هەڵبگڕێن، ئەگەر لەخۆباییبووتان پێتان گەیشتووە ئەو لە ئێمەدا لە خۆ بایی نەبن، ئەگەرچی تەنگەڵان و توند و تیژ بن، ئێمە هێزێکمان لەسەرزەوی بەپیتی ئێوە سەپاندووە، ڕێزمان لێ گرتوون، جل و بەرگمان کردوون بە بەردا و پادشایەکمان لەسەر داناون کە بەزەیی دێتەوە پێتاندا.

---

١ـ أنظر: القادسية لأحمد عادل كمال بتصرف (ص: ٧٠).
٢ـ أنظر: الدعوة الاسلامية في عهد عمر بن الخطاب (ص: ٢٤١).

بەم شێوەیە موغیرەی کوڕی زرارە هەستایە سەرپێ و فەرمووی: ئەوەی باست کرد لە خراپی بارودۆخەکە و هەر بەو شێوەیەی کە باست کرد و زیاتریش، باسی خراپی ژیانی عەرەبی کرد کە پاشان خوای گەورە بە میهری خۆی پێغەمبەر(ﷺ)ی بۆ ناردوون... هەروەك قسەکانی نوعمان... پاشان فەرمووی: ((هەڵبژێرە یان سەرانە لە دەستێك و تۆش ڕیسوایت، یان شەڕ، یان خۆت بە ئیسلام و موسڵمان بوون ڕزگار بکە)).

پاشان یەزدجەرد وتی: ئەگەر پەیامبەران بکوژرایەن ئەوا منیش ئێوەم دەکوشت، بڕۆن من هیچم بۆ ئێوە پێ نیە، پاشان پەستیەکە وە داوای هەندێ خۆڵی کرد، و بە باردەستەکانی وت: هەڵی بگرن و بیدەنە دەست بەڕێزترینی ئەم کەسانە، پاشان بەڕێی بکەن هەتا دەرگای مەدائن دەچێتە دەرەوە، دواتر عاصمی کوڕی عەمر هەستایە سەرپێ و فەرمووی: من بەڕێزترینیانم پاشتر خۆڵەکەی وەرگرت و بردی بۆ لای ئەسپەکەی و سوار بوو، کاتێك گەیشتەوە لای سەعد پێی فەرموو: ((مزگێنی بێت، سوێند بە خوا خوای گەورە کلیلی دەروازە و پادشاکەیانی پێ بەخشین))[١].

لە دوای ئەمە ڕۆستەم بە سوپا گەورەکەیەوە لە سابات چوویە دەرەوە، کە سوپاکەی زیاتر لە سەد هەزار کەس دەبوون، کاتێك کە دای بە لای کوشدا، کە گوندێکی نێوان کوفە و بابلە پیاوێکی عەرەبی پێگەیشت – ڕۆستەم وتی: چی ئێوەی هێناوەتە ئێرە؟ چیتان لە ئێمە دەوێ؟ پیاوەکە وتی: هاتووین داوای ژوانی خودا دەکەین بە پادشای زەویەکەتان و نەوەکانتان ئەگەر بەرپەرچی ئەوەتان دایەوە کە خۆتان بە دەستەوە بدەن، ڕۆستەم وتی: کەواتە ئێمە کەوتووینەتە ژێر چنگی ئێوەوە، عەرەبەکەش وتی: کار و کردارەکانتان ئەوەیان خستە چنگمانەوە، خوای گەورە ئێوەی بە ئەوەوە بە دەستەوەدا، ئەوەی کە بە دەورو پشتەوەیە لە خۆت بایت نەکات، چونکە تۆ بەربەرەکانی لەگەڵ مرۆڤدا ناکەیت بەڵکو بەربەرەکانی لەگەڵ چارەنووسدا دەکەیت.

پاشان ڕۆستەم لەم کابرایە پەست بوو وە کوشتی، کاتێك بە سوپاکەیەوە بە لای (بورس)دا تێپەڕی– کەوتۆتە نێوان کوفەو حلە– بە زۆر دەستیان برد بۆ دانیشتوانەکەی و ماڵ و سامانەکانیان، دەستیان کردە مەی نۆشین، و دەست درێژکردن بۆ ئافرەتان، کاتێك کە خەڵکی بورس هاتن بۆ لای ڕۆستەم بۆ سکاڵای ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتوون ڕۆستەم بە قەومەکەی وت: سوێند بە خوا ئەو پیاوە عەرەبە ڕاستی وت! چونکە لە کارەکانمان هیچ شتێك نەماندات بە دەستەوە! وە سوێند بە خوا عەرەب لەگەڵ ئەمانەدان و ئەمانەش جەنگ و باشترین ژیانیان لەئێوە هەیە.[٢]

کاتێك سەعدی فەرماندەی سوپای موسڵمانان بەم هەواڵەی ڕۆستەمی زانی، عەمری کوڕی مەعدیەکربی زوبەدی و طلیحة کوڕی خوەیلەدی ئەلئەسەدی و دە پیاوی تری لەگەڵ ناردن بۆ ئەوەی ئەم هەواڵەی سوپا، ئەم چەند کەسە ماوەیەکی کورت ڕۆیشتن هەتا ئەسپەکانی دژومنیان بینی کە لەسەر کەنارەکانی ئەو ناوچەیەدا پەرش و بڵاو بووبوونەوە، گەڕانەوە بۆ لای طلیحة و ئەویش ڕێگەی

١ـ البداية والنهاية (٤٣/٧).
٢ـ إتمام الوفاء في سيرة الخلفاء (ص: ٥٧).

بڕی هەتا چوویە نێو سوپای دوژمن و بۆی دەرکەوت کە چی تێدایە، پاشان گەرایەوە بۆ لای سەعد و هەواڵەکەی پێداوە ئەم طلیحة یەکێك بوولە سەرکردەی هەڵگەراوەکان وە عومەر ڕێگەی دابوو بە هەڵگەراوەکانی عەرەب کە دوای تەوبە کردنیان بەشداری لە جیهاد بکەن بەڵام ئەبو بەکر(ﷺ) بەری بەم کارە دەگرت، عومەر بەری دەگرت لە چوونە دەری سەرانی هەڵگەراوەکان بۆ جیهاد کە پاش تەوبە کردنیان بەرپرسیارێتی بگرنە ئەستۆ و هیچ کام لەوانەشی نەکردە کاربەدەست، عومەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەمانە لەسەر واتای باوەڕ و خۆپارێزی پەروەردە بن و هەلێکی زێڕینی خستە بەر دەستیان تا لەم هەلەدا ڕاستگۆیی و باوەڕەکەیانو لە خوا ترسانەکەیان بخەنەڕوو بە ڕاستیش طلیحةی ئەلئەسەدی و عەمری ئەلزوبەدی ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە جەنگەکانی عێراق و ناوچەی فارسدا.

## سێیەم: سەعد شاندێك دەنێرێت بۆ بانگهێشتی ڕۆستەم:

ڕۆستەم بە سوپاکەیەوە لە حیرەوە ڕۆیشت تا لە ناوچەی قادسیە لەسەر عەتیق – پردی قادسیە – نیشتەجێ بوو لەبەردەم سوپای موسڵمانانن تەنها لە نێوانی ئەم دوو سوپایەدا ئاوێك هەبوو، فارسەکان سی و سێ فیلیان پێ بوو، کاتێك کە سەقامگیر بوو نوێنەری نارد بۆ لای سەعد کە پیاوێکی بۆ بنێرێت هەتا قسەی لەگەڵ بکات و بیدوێنێت، سەعد پیاوێکی بە ناوی ڕەبعی کوڕی عامری نارد بۆ لای، ڕۆستەم ڕاخەری زێڕی دانا و ڕاخەر و فەرشەکانی هەموو بە زێڕ چنرابوون! ڕەبعی بە ئەسپەکەیەوە هاتە پێشێ و شمشێرەکەی لە نێو جلە شڕەکانیدا بوو، ڕمەکەی پێچابوو بە دەستەسڕەکەیەوە، کاتێك کە گەیشتە ڕاخەرەکان، ئەسپەکەی هێور کردەوە، پاشان دابەزی و بەستیەوە بە دوو ڕاخەرەوە کە کەرتی کردن، پەتەکەی خستە نێوانیانەوە پاشان جلی حوشترەکەی گرت بە دەستیەوە و بلاوی کردەوە، پیاوەکانی ڕۆستەم ئاماژەیان پێدا کە چەکەکەی دابنێت، ئەویش وتی: بە ڕۆستەم: ئەگەر خۆم بهاتما ئەوەم دەکرد بە فەرمانی ئێوە بەلام ئێوە داوەتتان کردووم، پاشان خۆی دەدا بەسەر ڕمەکەیدا و بە هەنگاوەکانی دەچوویە پێشێ هەتا ئەوەی کە بە سەریدا ڕۆیشت لە ڕاخەرەکان خراپی کردن و شێواندنی، دواتر لە ڕۆستەم نزیك بوویەوە و لەسەر زەوی دانیشت، و ڕمەکەی لەسەر ڕاخەرەکە چەقاند، فەرمووی: ئێمە لەسەر جوانکاریەکانی ئێوە دانانیشین، ڕۆستەم پێی وت: چی ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە؟ ڕەبع فەرمووی: خوای گەورە ئێمەی هێناوە، ئەو ئێمەی ناردووە هەتا هەر کەس دەیەوێ لە بەندایەتی بەندە ڕزگاری بکەین بۆ بەندایەتی خودا وە لە تەنگەلانی دونیا بۆ چاك و بەرینی قیامەت، و لە ستەمی ئاینەکان بۆ دادپەروەری ئیسلام، ئەو خودایە پێغەمبەرەکەی بە ئاینەکەیەوە ناردووە بۆ بەدبهێنراوەکانی هەر کەس ئەم ئاینە پەسەند بکات ئەوا پەسەندی دەکەین و لێی دەگەڕێینەوە و لە خۆی و زەویەکەشی دەگەرێین، هەر کەس بەرپەرچی بداتەوە لەگەڵی دەجەنگین تا دەگەینە بەهەشت یان سەردەکەوین.[1]

---

١ـ الكامل في التأريخ (٢/١٠٦).

ڕۆستەم وتی: قسەکانتان بیست، ئایا دەکرێت ئێوە ئەم کارە دوا بخەن هەتا چاوێکی پێدا دەگێڕین؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی کردووین بە سوونەت ئەوەیە کە زیاتر لە سێ ڕۆژ مۆڵەت نەدەینە دوژمنان، ئێمە سێ داوامان هەیە و بۆتانی دووبارە دەکەینەوە، تۆش سەیری کاروباری خۆت بکە و پاش دیاری کردنی چارەنووسێك یەکێك لەم سیانە هەڵبژێرە: ئەگەر موسڵمان بوویت لە خۆت و زەویەکەت دەگەڕێین، ئەگەر پێویستیت بە نەرمترینیان هەبوو ئەوا پشتیوانیت دەکەین، یان دەست بەردارت دەبین لە ڕۆژی چوارەمدا هەتا دەستپێشخەریمان پێ دەکەیت، من دەستەبەری هاوڕێکانمم.

ڕۆستەم وتی: ئایا تۆ گەورەیانی؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، بەلام موسڵمانان هەموویان وەك یەك جەستە وان لە نێو یەکتریدا، نزمترینیان خەڵات و پاداشتی بەرزترینیان دەکات.

پاشان لێیدا و ڕۆیشت، لە ڕۆستەم و هاوڕێکانی گەرا ڕۆستەم وتی: ئایا هەرگیز قسەیەکتان وەك قسەکانی ئەم پیاوە بەرگوێ کەوتووە؟ ئەوانیش بینیان کە سووکایەتی بەکارەکانیان دەکات، دواتر ڕۆستەم وتی: بەڵام لێدان من سەیری ڕاوبۆچوون و قسە و مێژوو دەکەم، عەرەبەکان جلەکانیان دەشاردەوە و ڕەسەنایەتیان دەپارێزن.

لە ڕۆژی دووەیدا، ڕۆستەم کەسانێکی نارد بۆ لای سەعد و داوای لێ کردن کە هەمان پیاوی بۆ بنێرنەوە، سەعدیش حوزەیفەی کوڕی میحسەنی غەلەفانی بۆ نارد کە لە کار و کردار و بە دەمەوەچوون و وەڵام دانەوە و شانیدا هیچ جیاوازیەکی لە ڕەبع نەبوو، ئەوان هەردووکیان لە یەك دەفر پاراو بووبوون، کە ئەویش ئاینی ئیسلامە.

ڕۆستەم پێی وت: بۆچی ئەمە دوێنێ لەگەڵمان نەبوو؟ حوزەیفە فەرمووی: ئەمیرەکەمان لەخۆشی و ناخۆشیدا یەکسان دەبێت لە نێوانماندا، ئەمەش نۆبەی منە، ڕۆستەم وتی: بەڵێن و پەیمانەکەمان هەتا کەیە؟ ئەویش فەرمووی: هەتا سێ ڕۆژە، لە ڕۆژی ڕابردووەوە.

لە ڕۆژی سێیەمدا ڕۆستەم کەسێکی تری ناردەوە بۆ لای سەعد و داوای لێ کرد کە پیاوێکی تری بۆ بنێرێت، ئەویش موغیرەی کوڕی شوعبەی بۆ نارد، کاتێك کە موغیرە چوویە لای لەسەر کورسیەکەی دانیشت و لایەنگرانی لێی هاتنە پێشێ و بە لای خۆیاندا ڕایانکێشا! ئەویش پێی وتن: ئێمە هەواڵی خەونەکانی ئێوەمان پێ دەگەیشت، گەل و نەتەوەیەك بابیم کە پەشیمانی لە ئێوە بێت، ئێمە کە گەل و هۆزی عەرەبین کەسمان لە کەسمان وەدوورناکەوێتەوە مەگەر کەسێك کە بە گژی هاوەڵەکەیدا بچێتەوە، گومانم وابوو کە ئێوەش وەك ئێمە هاوکاری و یارمەتی نەتەوەکەتان دەدەن، ئەمە باشترە لەوەی کە هەواڵم پێ بدەن کە: هەندێکتان خاوەنی هەندێکی ترتانن، ئەم کارەش لە نێوانتاندا ڕەوا نابێت وە هیچ دەوڵەتێك لەسەر ئەم بارو دۆخ و ئەم ئەقڵانە نارەسێت.

مێینەیەك وتی: سوێند بە خوا ئەو پیاوە عەرەبیە ڕاستی وت، بەرپرسێکی بازرگانەکانیش وتی: بە ڕاستی بە قسەگەلێك بۆ ڕوومانی کردین کە هێشتا کۆیلەکانمان خۆیانی بۆ دادەماڵن، خوای گەورە پێشینەکانمان بکوژێت کە کاروباری ئەم ئومەتەیان بچووك کردەوە.

پاشان ڕۆستەم قسەگەلێکی کرد کە کاری عەرەبی تێدا بچووك کردەوە، و کاری فارسەکانی گەورە ڕاگرت، باسی ئەو بارودۆخەی کرد کە پێشتر ئەوانی تێدا بووە لە خراپی بارودۆخ و تەنگەلانی ژیان.[1]

موغیرەش فەرمووی: ئەوەی کە تۆ بۆ ئێمە باسی دەکەیت لە خراپی بارودۆخ و ناهەمواری و جیاوازی، ئەوە ئێمە دەیزانین و نکۆڵی لێ ناکەین، دونیاش خاك و وڵات و کیشوەرە، نارەحەتیش بە خۆشگوزەرانی کۆتایی دێ، ئەگەرچی سوپاسی خواتان کردووە لەسەر ئەوەی کە خوا بۆی ڕەوانە کردوون بەڵام بە کەمی سوپاستان کردووە لەسەر ئەوەی کە بۆتان ڕەوانە کراوە وە لاوازی سوپاسەکەشتان داونیە بە دەستەوە بۆ گۆڕانی دۆخەکە و خوای گەورەش لە نێو ئێمەدا پێغەمبەرێکی ناردووە، پاشان باسی ئەوەی کرد کە پێشتر هاتووە، وتەکانی کۆتایی هێنا بە هەڵبژاردن لە نێوان موسڵمان بوون یان سەرانە وە یان دەست بەردار بوون.[2]

دواتر ڕۆستەم لە نێو فارسەکان مایەوە، وتی: کوان ئەوانەی کە لە ئێوە بوون؟ ئایا ئەو دوانەی یەکەم نەهاتنەوە بۆ لاتان پاشان هانیان دان، هەڵیان ئێنجان، پاشان ئەمەیان هات و هیچ جیاوازیەکیان نەبوو، ئەوان یەك ڕێگەیان گرتبوو، پایەند بوون بە یەك کار و فەرمانەوە، ئەوانە سوێند بە خوا ئەگەر پیاوانی ڕاستگۆ بن یان درۆزن سوێند بە خوا ئەگەر لە ئەدەب و پارێزراویان بگاتە شوێنی خۆی ئەوا بەختەوەریان دەکات کە ناکۆك نەبن وە هیچ گەلێك نیە کە تێگەیشتووتر بێت لەوەی کە ئەوان دەیانەوێت ئەگەر بێتو ڕاستگۆ بن ئەوا هیچ شتێك بۆ ئەو گەلە نارەسێت، پاشان دەنگیان تێکەڵ بە یەك دەبێت.

## چوارەم: خۆسازدان بۆ جەنگەکە:

فارسەکان سوودمەند نەبوون لە داوای شاندەکان، لە مەبەستەکانیاندا ڕۆچووبوون، تا خوای گەورەش کارێك بەدی بێنێت، کە هەر بەدی دێنێت، فارسەکان خۆیان کۆکردەوە بۆ جەنگ و موسڵمانانیش خۆیان بۆ ئەم کارە ئامادە کرد و دواتر فارسەکان بە ڕووباری عەتیقدا پەڕینەوەو ڕۆستەم سوپا بەهێزەکەی بەم شێوەیەی لای خوارەوە دامەزراند:

- لە ناوجەرگەدا: پەردەواکانی دانا کە (١٨ فیلیان) پێ بوو کە سندوق و پیاوانیان بەسەرەوە بوو.
- لە بەشی لای ڕاستەوە: کە بە دوای ناوجەرگەدا دێ: جالینۆس.
- لەبەشی لای ڕاستەوە: هورمزان،کە(٧ یان ٨ فیلی) لەگەڵ بوو، کە سندوق و پیاوانی لەسەر بوو.
- لە بەشی لای چەپەوە: کە بە دوای ناوجەرگەدا دێ: بیرزانی لێبوو.
- هەر لە بەشی لای چەپەوە: میهران (٧ یان ٨ فیلی) لەگەڵ بوو کە سندوق و پیاوانی بە سەرەوە بوو، پاشان ڕۆستەم دەستەیەکی ئەسپ سواری ڕەوانەی ناوچەی ئەلقەنتەرە کرد هەتا بەر لە موسڵمانان بگرن بە پەڕینەوە بە ڕووی سوپایەکدا و بەم شێوەیەش قەنتەرە بویە نێوبەندێك لە نێوان ئەسپ

---

١ـ الكامل في التأريخ (١٠٨/٢).
٢ـ الكامل في التأريخ (١٠٨/٢).

سوارانی موسڵمانان و بێباوەڕان وە ڕێك کردنی ڕیزبەندیەکانیش بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

-ئەسپ سوارەکان لە ڕیزەکانی پێشەوە و فیلەکانیش بە دوایاندا، پاشان پیادەکان، ڕۆستەمیش ساباتێکی گەورەی بۆ هەڵدرابوو، کە تیایدا دەمایەوە و لەسەر تەختەکەی دادەنیشت و چاودێری بەڕێوەچوونی جەنگەکەی دەکرد،[1] موسڵمانانیش لە ئامادەباشی و خۆسازدانێکی چاکدا بوون و باشترین کەرەستەی جەنگیان ئامادە کردبوو، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هەر زوو ئەرکی دابوو بەسەر سوپاکەیدا، و فەرمانی دابوویە ئەمیرەکانی سوپا، لەسەر هەر دە کەسێك شوێن هەڵگرێکی دانابوو، هەروەها لەسەر مەشخەڵ و ئاڵاکانیش پیاوێکی دانابوو کە لەو بوارەدا پێشینەیان هەبوو وە پێشەوەو پشتەوەو پێشەنگ و پێشڕەوەکانی ڕێك و پێك کردبوو وە لەسەر وێستگەکانی گەیشتە قادسیە، سوپاکەی بەم شێوەیە ئەرکدار کرد:

١- لە پێشەوە: زوهرەی کوڕی ئەلحویە.

٢- لە لای ڕاستەوە: عبداللە ی کوڕی ئەلموعەتەم.

٣- لە لای چەپەوە: شەرحەبیلی کوڕی ئەلسەمتی ئەلکندی، جێ نشینەکەی خالدی کوڕی عورفطة.

٤- لە پشتەوە: عاصم کوڕی عەمر.

٥- لەسەر پێشڕەوەکان: سوادی کوڕی مالك.

٦- لەسەر ڕەبەنەکان: سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی ئەلباهلی.

٧- لەسەر پیادەکان: حەممالی کوڕی مالکی ئەلئەسەدی.

٨- لەسەر سوارەکان: عبداللە ی کوڕی ذوئەلسەهمەینی ئەلحەنەفی.

٩- لەسەر دادوەرانی نێوانیان: عبدالرحمن کوڕی ڕەبیعەی ئەلباهلی.

١٠- دە نووسەری سوپا: زیادی کوڕی ئەبو سوفیان.

١١- گەرۆکی و بانگخوازی: سەلمانی فارسی و هەموو ئەمانەش بە فەرمانێکەوە بوو لە عومەر،[2] بەم شێوەیە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و بە دوایدا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ (الانبياء: ١٠٥).

فەرمانی دا بە قورئان خوێنان کە لە سورەی ئەنفال یاسا دانێن، کاتێك کە سورەتەکە خوێنرایەوە و لێبوونەوە، دڵ و دەروون و چاوەکان پڕبوون لە خەندە و ئارامیەك دڵەکانی گرتەوە و خەڵکی نوێژی نیوەڕۆیان خوێند و سەعد فەرمانی دا بە سوپاکەی کە پاش الله أکبری چوارەم بکێشن و بڵێن (لا حول

---

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٥٥).

٢ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٥٥).

دراوەو ئامادەی جوولە و ڕاپەڕینن بۆتان شارەزاکەش وتی: ئەم بزاوت و ڕاپەڕینەیان بۆ نوێژە، ئەو بە فارسی وتی و ئەمەش وەرگێڕراوەکەیەتی بۆ زمانی کوردی: لە کاتی بەرەبەیاندا دەنگێك هاتە بەر گوێم، دیارە ئەمە ئەو عومەرەیە کە قسە لەگەڵ سەگەکاندا دەکات و فێری ژیریان دەکات،[1] کاتێك کە پەڕینەوە وەستان و بانگ بێژەکەی سەعد بانگی بۆ نوێژ دا واتە نوێژی نیوەڕۆ سەعد نوێژی خوێند و ڕۆستەم وتی: عومەر جەرگی خواردم.[2]

## - بەرزکردنەوەی گیانی ورەبەرزی لە نێو تاکەکانی سوپای ئیسلامی:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) گەورە موسڵمانان و سەرکردەکانیانی لەسەرەتای ڕۆژی یەکەمی جەنگەکە کۆ کردەوەو پێی فەرموو: دەربچن و لەنێو خەڵکیدا ئەو برەسێنن کە لەسەرتانە و بۆ ئێوەیە لەشوێنی نارەحەتیدا، ئێوە بەو جێگەیەی کە تیایدا لە نەتەوەی عەرەبن، ئێوە شاعیران و وتار بێژانی عەرەبن، لە خاوەن ڕاو بۆچون و بە هێزان و گەورە پیاوانی عەرەبن، بەنێو خەڵکیدا بڕۆن ویادیان بهێننەوە و هانیان بدەن لەسەر جەنگ، ئەوانیش بە نێویاندا ڕۆیشتن.[3]

- بەم شێوەیە قەیسی کوڕی هوبەیرەی ئەسەدی فەرمووی: ئەی خەڵکینە سوپاس و ستایشی خوا بکەن لەسەر ئەوەی، کە ڕێنمونی کردون بۆی و ئارامیتان لەسەری ڕێژەتان زیاتر دەکات، یادی بەخشش و خەڵاتی خودا بکەنەوە وە لە خوو ڕەفتارەکاندا ئارەزوی بەرەو لای ئەو بکەن، بەڕاستی بەهەشت یان سەرکەوتنتان لە بەردەمتاندایە و لە پشتی ئەم کۆشکەش جگە لەڕوو زەردی هیچی تری لێ نی یە، زەویش بیابانێکی وشکە، وەی پێکەوە لکاوەکانیش ڕەق و زبرن ودەشتەکانیش ئەوانەن کە بەڵگەکان دایان نابڕێت.

- غالبی کوڕی عەبداللە ی لەیسی فەرمووی: ئەی خەڵکینە سوپاس و ستایشی خوا بکەن لەسەر ئەوەی ئارامی پێ بەخشیون وەداوای لێ بکەن زیادی بکات، بانگی بکەن دەتان هەژێنێ، ئەی گەلی معد، دەردی ئێوە چی یە لە کاتێکدا کە ئێوە لەنێو قەڵاکانی خۆتاندان واتە: ئەسپتان پێیە و کەسێکتان لەگەڵە کە سەرپێچیتان ناکات واتە شمشێرەکانتان و، سبەینێ یادی قسەکانی خەڵکی بکەنەوە، ئەوا سبەینێ بەئێوەیەو لای ئێوە دەست پێ دەکات وە ئەوەی پاش ئێوەش ستایش دەکات .

- ئیبن ئەلهەذیلی ئەسەدی فەرمووی: ئەی نەوەی مەعد، قەڵاکانتان بکەنە شمشێرەکان، لەسەریان وەك شێری بێشە، وەهەروەکو بۆیان جێگیربون و تۆز و گەردیان ڕاپێچ کرد، متمانەیان بەو پتەوتر بوو، چاویان شۆڕکردەوە، ئەگەر شمشێرەکان کول بوون یان سوان ئەوا فەرمان پیا دراون و تاشە بەردەکانیان پێدا بنێرن چونکە ئەو مۆڵەتی داوە و مۆڵەتی نەداوە بە ئاسن تیایدا.

---

١ـ تاريخ الطبري (٣٥٨/٤).
٢ـ تاريخ الطبري (٣٥٨/٤).
٣ـ تاريخ الطبري (٣٥٩/٤).

-بەسر کوڕی ئەبی ڕەهم جوهی فەرمووی: سوپاسی خودا بکەن و بەکردار قسەکانتان ڕاست بکەنەوە، ئێوە سوپاسی خوداتان کردووە بۆ ئەوەی کە ڕێنمایی کردوون بۆ ئەوەی کە لە سەرینی، ئێوە یەکتا پەرستیتان کردووە و سەلماندووتانە کە جگە لە خودا هیچ خودایەکی تر نیە، هیچ شتێکی تر نیە کە لەم سەر زەویەدا لە ئێوە نەرم و نیان و لەسەرخۆتر بێ، ئەمەش بەوە دەبێ کە کەسێك ئاسانی بکات، بە هیچ شێوەیەك ئارەزووی ئەم دونیایە مەکەن چونکە هەڵدێ لە دەستتان هەتا بە لای خۆیدا دەتان باتەوە، ئێوە ئاینی خوا سەربخەن خوای گەورە سەرکەوتووتان دەکات.

-عاصمی کوڕی عەمر فەرمووی: ئەی گەل و تەنەوەی عەرەب ئێوە نەوەی عەرەبن و خۆتان بۆ نەوەی عەجەم و ڕووبەڕوویان بوونەتەوە، بەڵکو خولیان بە بەهەشت و ئەوان خولیان بە دونیا، لەسەر دونیایان پارێزراوتر نابن لە قیامەتی ئێوە، ئەمڕۆ لەسەر هیچ کارێك مەدوێن چونکە سبەینێ دەبنە شتێك بەسەر عەرەبەوە.

-ڕەبیع کوڕی بلادی سەعدی فەرمووی: ئەی گەل و تەنەوەی عەرەب بۆ دین و دونیاتان بجەنگن: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ (ال عمران: ١٣٣).

ئەگەر شەیتان کارەکەی لەسەر گەورە کردن ئەوا یادی هاوەڵەکانی خۆتان بکەنەوە بە دەرزەکان مادەم هاوەڵەکان کەسانی خۆیان هەیە.[١]

ڕەبیعی کوڕی عامر فەرمووی: خوای گەورە بە ئاینی ئیسلام ڕێنمایی کردن وە لەسەری کۆی کردونەوە، زۆری نیشان دان، لە ئارامشدا پشوو، دەروونتان ڕابهێنن لەسەر ئارامی ، ڕای مەهێنن لەسەر پەشۆکاوی چونکە ڕادێ لەسەری و خوی پێوە دەگرێ، لەم وتەیەشدا، خەڵکی متمانەیان پەیدا کرد و بەڵێنیان دا، هەژان و بزوان بۆ هەموو ئەو شتانەی کە دەکرێت بۆ ئەوان بێت.[٢]

## ١- ڕۆژی ئەرماس (ارماث):

ڕۆژی ئەرماس بەیەکەمین ڕۆژ لەڕۆژەکانی جەنگی قادسیە دەوترێت، کە مەعد(رضي الله عنه) تیایدا پەیامەکەی ڕووکردە سوپاکەی و فەرمووی: لە شوێنی خۆتان دامەزراو بن و بە هیچ شێوەیەك مەجووڵێن هەتا نوێژی نیوەڕۆ دەخوێنین، هەر کە نوێژی نیوەڕۆتان خوێند من (الله أکبر)ێك دەکەم و ئێوەش بیڵێنەوە و خۆتان ئامادە بکەن، ئەوەش بزانن کە ئەم (الله أکبر) هیچ کەس لە پێش ئێوە پێی نەبەخشیوە، بزانن کە ئێوە وەك پشتیوانیەك لە خۆتان پێتان بەخشیوە وە ئەگەر گوێتان لە (الله أکبر)ی دووەم بوو ئەوا ئێوەش (الله أکبر)ەکە دووپات بکەنەوە هەتا خۆسازدانتان ڕێگەی خۆی دەگرێتە بەر پاشان ئەگەر (الله أکبر)ی سێیەمم کرد با سوار چاکەکانتان خەڵکی چالاك بکەنەوە و دەربکەون و

---

١- تأريخ الطبري (٤/٣٥٩).
٢- هەمان سەرچاوە (٤/٣٦٠).

بکەونە ڕاوەدوونان، هەرکە (ألله أکبر)ی چوارەمم کرد هەمووان پێکەوە وەکشێن هەتا تێکەڵ بە دوژمنانتان دەبن و تێکڕا بڵێن (لا حول ولا قوة إلا بالله)).[١]

کاتێك کە سەعد نوێژی نیوەڕۆی خوێند فەرمانی دا بەو لاوەی کە عومەر لای دانابوو کە سورەی جیهاد (واتا الانفال) بخوێنێت، ئەویش لەسەر دەستەیەك کە سورەی ئەنفال ڕەنگینی کردبوو سەرەتاکەی خوێند، ئەم لاوە لەسەر هەموو دەستەکان قورئانی خوێند بەو شێوەیە دڵ و دەروون و چاوی خەڵکی گوشاد بوون و لەگەڵ خوێندنەکەیدا ئارامی و سوکناییان ناسی،[٢] کاتێك کە قورئان خوێنەکە لێ بوویەوە سەعد (الله أکبر)ی کرد و ئەوانەی دەوروپشتیشی (الله أکبر) یان کرد، هەندێ کەس بە (الله أکبر)ی هەندێکی تر (الله أکبر)یان کرد بەم شێوەیە خەڵکی جوڵان و پاش ستایش کردن خەڵکی جارێکی تر چالاك بوونەوە پاشان سێ یەکی حەڵکانی بەهێز دەرکەوتن و جەنگەکەیان دامەزراند، لە خەڵکانی فارسیش هاوشێوەکانیان دەرکەوتن و دەستیان کردە لێدان و تانە دان،[٣] قارەمانەکانی موسوڵمانان لە هاوشێوەی غالبی کوڕی عبدالله ی ئەسەدی و عصام کوڕی عەمری تەمیمی و عەمری کوڕی مەعدیە زوبەیدی و طلحیتي کوڕی خوەیلەدی ئەسەدی بوون کە کاریگەریەکی ئاشکرایان لە دوو نیازی بە دوژمن هەبوو بە جۆرێ ژمارەیەك لە پاڵەوانانی بێ باوەڕانیان کوشت و بەدەست لە کاتی زۆرانبازی یەکەدا باس کراوە هیچ لە موسوڵمانان نەکوژراوەن وە زۆرانبازی هونەرێکی سەخت و دژوارە لە هونەرە جەنگی یەکان و جگە لە جوامێران و نەبەردان هیچ کەسێکی تر ناتوانێ بیقۆزێتەوە، ئەمەش لە ورەی سەرکەوتوان بەرز و بڵند دەکاتەوە و دڵگەرمی و خرۆشانیان زیاد دەکات. لە ورە و وزەی دۆڕاوان و سەرنەکەوتوان دێنێتە خوارەوە دووچاری ڕووخانیان دەکات، موسوڵمانە یەکەمییەکان هەمیشە سەرکەوتوو بوون بەسەر بەرامبەرەکانیاندا، لەبەرئەوە سودیان لە زۆرانبازی بینیوە،[٤] کاتێ خەڵکی چاوەڕوانی (الله أکبر)ی چوارەم بوون یەکێك لە پیاوانی پیادەی هۆزی نەهد کە قەیسی کوڕی حوزەیمی کوڕی جەرسومە بوو وتی: ئەی هۆزی نەهد ڕاپەڕن بۆیە ناونران (بڵندی) هەتا بیکەنە کردەوە، خالیدی کوڕی عورفطتش هات و فەرمووی سوێند بەخوا بێ دەنگ دەبیت یان کارەکەت دەسپێرمە کەسێکی تر، ئەویش بەم شێوەیە بێ دەنگ بوو.[٥]

### - ڕۆستەم فەرمان بە هێرش کردن دەداتە لایەك لە سوپاکەی:

کاتێ کە ڕۆستەم سەرکەوتنی موسوڵمانانی بینی لە لایەنی زۆرانبازی و ڕاوەدونانەوە ڕێگەی نەدان کە پلانی سەرکردەکەیان لەوە زیاتر لە جەنگی ڕاوەدونان و زۆرانبازی بەجێ بهێنن لەبەر ئەوە فەرمانی هێرش کردنی دایە لایەك لە سوپاکەی کە هێرشێکی هەمەلایەنە بکەنە سەر سوپای موسوڵمانان

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٦١).
٢ـ هەمان سەرچاوە (٤/٣٦٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە (٤/٣٦٢).
٤ـ التأريخ الاسلامي (١٥/٤٤٥).
٥ـ تأريخ الطبري (٤/٣٦٣).

بەتایبەتی ئەو لایەی کە هۆزی بەجیلەی تێدایە و ئەوانەش کە پێچراون و ئالاّون پێیانەوە. ئەمەش زۆر جێگەی سەرنج و تێڕامان بوو چونکە فارسەکان نزیکەی نیوەی سوپاکەیان ڕووکردە ئەو کەرتەی کە ڕێژەیەکی کەمی سوپای ئیسلامی تێدا بوو، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەو هەواڵەیان کە ناوزەد دەکرێت بە دابڕانی جەنگی زۆرانبازی و ڕاوەدونان کە بیّ بڕوایان تیایدا دۆڕان، بەم شێوەیە فارسەکان هێرشیان کردە سەر لایەکی سوپای ئیسلامی بە ١٣ فیلەوە کە هەر فیلێك بەپێی ڕێکخستنی سوپا چوار هەزار کەسی پیادە و سواری لەگەڵ بوو، پاشان فیلەکان لە نێوان دەستەی موسوڵمانان بلاّو بونەوە و هێرشەکە تەرکیز کرابوو لەسەر هۆزی بەجیلە و ئەوانەی دەورویشتیان و پیادەکان لە خەڵکانی خاوەن هەڵوێست خۆیان دامەزران بۆ هێرشی فارسەکان.

### أ/ سەعد فەرمانی دا بە ئەسەد کە بەرگری لە بەجیلە بکات:

سەعد(ﷺ) ئەو هەڵوێستەی بەرچاو کەوت کە هۆزی بەجیلەی تێکەوتبوو لەبەر ئەوە کەسێکی نارد بۆ لای هۆزی بەنی ئەسەد و پێی فەرموون: بەرگری لە هۆزی بەجیلە و ئەو کەسانە بکەن کە پێوەیان ئالاّون، بەم شێوەیە طلحیتي کوڕی خوەیلەد و حەممالی کوڕی مالك و غالب کوڕی عبداللە و ڕەبیلی کوڕی عەمر لە کەتیبەکانیان هاتنە دەرەوە وە مەعروری کوڕی سوەید و شەقیمە دەڵێن: توند و تۆڵ ببنەوە ئەوان خوایان بەسەرەوەیە بەردەوام هێرشیان دەکردە سەریان و لێیان دەدان هەتا فیلەکانمان لیّ کۆت و بەند کردن، من دواکەوتم و یەکێکی بەهێز لەوان هاتە دەرەوە بۆ طلحیة و زۆرانی لەگەڵ گرت بەلاّم طلحیة زۆر لەگەڵیدا نەمایەوە و کوشتی، کاتیّ کە فارسەکان بینیان کە فیلەکانیان لە نێو هۆزی بەنی ئەسەد چیان بەسەر هاتووە و تیرەکانیان بۆردوومانیان کردن، موسوڵمانان توند و تیژی پەردەواکان و جالینۆسیان لەسەر دەرکەوت کە دوو لە سەرکردەکانی فارس بوون، پاشان موسوڵمانان تێکرا چاوەڕوانی (الله أكبر)ی چوارەم بوون لە سەعدەوە بەم شێوەیە هێزی فارس لەسەر بەنی ئەسەد کۆ بویەوە کە لەگەڵ ئەوەشدا چەند فیلێکیان لەگەڵ بوو، ئەوان خۆیان بۆ دامەزراندن و سەعد (الله أكبر)ی چوارەمی کرد، ئینجا موسوڵمانان بە ڕووی فارسەکاندا کشان و جەنگەکەش بە دەوری هۆزی بەنی ئەسەددا دەسوڕێتەوە و ساتەوەختەکانی خۆی بەڕیّ دەکات. لە ڕێی ڕاست و چەپەوە فیلی فارسەکان سەرکەوتن بەسەر ئەسپی موسوڵماناندا، ئەسپەکانیش خۆیان لیّ کەرخ دەکردەوە و یەکیان دەگرت، بەم شێوەیە سوارەکان خۆیان دەکردە پیادە و پاڵیان دەنا بە ئەسپەکانەوە هەتا لە فیلەکان بچنە پێشیّ.

### ب/ سەعد داوای لە هۆزی تەمیم کرد فێلێك بۆ فیلەکان بدۆزنەوە:

سەعد کەسێکی نارد بە دوای عاصمی کوڕی عەمری تەمیمی و پێی فەرموو: ئەی هۆزی تەمیم ئایا ئێوە کەسانی خاوەن حوشتر و ئەسپ نین؟ ئایا فێڵکتان پیّ نی یە بۆ ئەم فیلانە؟ ئەوانیش وتیان: بەڵیّ سوێند بە خوا، پاشان بانگی چەند پیاوێکی تیرهاوێژی هۆزەکەی کرد لەگەڵ کەسانێك کە ڕۆشنبیر بوون واتە جووڵە و سەلیقەیان هەبوو پێی فەرموون: ئەی هۆزی تیر هاوێژان ئەی خەڵکانی

خاوەن جوولە و سەلیقە چاری فیلەکان بکەن و کەمەر بەندەکانیان بپچڕن هەتا ئەو سندوقانەیان بکەوێت کە جەنگاوەرەکانیان هەلگرتووە وە خۆی هاتە دەرەوە پارێزگاری لێکردن جەنگیش لەنێو هۆزی بەنی ئەسەد دا هەر بەرێ دەکرا، ئەگەران بە دوای لای ڕاست و چەپدا زۆر دوور نەبوو، هاوڕێکانی عاصم لە فیلەکان چوونە پێشێ و کلکی فیلەکانیان گرت لەگەڵ کەژاوەکانیان بەم شێوەیە کەمەر بەندەکانیان قرتاند و لورەی فیلەکان بەرز بویەوە، ئەو ڕۆژە هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لە لورەی فیلەکان، خاوەنەکانیان کوژران، خەڵکەکە ڕووبەڕوو بوونەوە و بە هۆزی بەنی ئەسەد پشویان بەخشی، فارسەکانیان لێ گێڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان و جەنگ بەردەوام بوو تا ڕۆژ ئاوا بوو، پاشان تا هێوری لە شەوگار ڕەوی یەوە، پاشان هەموو ئەو خەڵکانە گەرانەوە ئەو ئێوارەیە ٥٠٠ کەس لە هۆزی بەنی ئەسەد شەهید کران کەن سپەر بوون بۆ خەڵکی، عاصم واتە هۆزی تەمیم دەست درێژ و پارێزەرانی خەڵك بوون وە ئەمەش یەکەمین ڕۆژی بوو کە ڕۆژی ئەرماس (أرماث) بوو.[١]

## ج/ هەڵوێستێکی قارەمانانەی طلحیەی کوڕی خوەیلەد:

ئەو فەرمانەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضي الله عنه)کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر هۆزی بەنی ئەسەد، ئەو ڕۆژە طلیحەی کوڕی خوەیلەد فەرمووی: ئەی عەشیرەتەکەم بەڕاستی ناوبردن بە ناوی خۆی متمانە پێکراوە، ئەم پیاوە ئەگەر بیزانیایە کە کەسێکی تر مافدارترە بۆ فریاکەوتنی ئەو خەڵکە ئەوا فریایان دەکەوت، بەهێز و بتەوی دەستیان پێ بکەن، بە شێوەی شێری جەنگەڵ لێیان بڕۆنە پێشێ، بە ڕاستی ئێوە ناوی شێرتان لێ نراوە هەتا بە کارەکانی هەستن لەبەر ئەوە خۆتان پتەو و بە هێز بکەنەوە و لە ڕوویاندا بوەستنەوە، هەڵمەت بەرن و هەڵمەیەن، خۆشی دەربڕینی ڕەبیعە هەر بۆ خودایە و ئەمە چ هەڵاتنێکە ئێوە هەڵدێن، چ سەردەمێکە کە پیایدا هەڵدەدەن، ئەمە دەگاتە شوێنی ئەوان و ئێوەش بە شوێنەکانی خۆتاندا هەڵبدەن با خوای گەورە پێتاندا هەڵبدات، بە ناوی خوای گەورەوە بە بەهێزی بدەن بەسەریاندا،[٢] ئەم قسانەش کاردانەوەیەکی سەرسووڕهێنەری لە دەروونی گەلەکەیدا ڕوواند بە جۆرێك کە گۆڕان بۆ چەند وزەیەکی کاریگەر، هەر خۆیان بە تەنها بەرگەی باری جەنگەکەیان گرت تا هۆزی تەمیم هاوکاریان کردن هەر لەو ڕۆژەدا (٥٠٠) شەهیدیان پێشکەش کرد،[٣] هەروەها هۆزەکانی تر بەم پاڵەوانیەتیەی هۆزی بەنی ئەسەدکاریگەربوون و ئەشعەسی کوڕی قەیسی ئەلکندی فەرمووی: ئەی هۆزی کندە خۆشی دەربڕینی هۆزی ئەسەد بۆ خودایە و ئەمە چ هەڵاتنێکە ئێوە هەڵدێن، چ قسەیەکە کە لەسەر شوێنەکانیان قسەیان لەگەڵ دەکەن، بەم شێوەیە هەڵوێستی کندە لە باری بەرگری لەخۆکردنەوە گۆڕا بۆ هێرش کردن هەرچیەك لە مەجووسیان لەبەردەمدا بوو ڕایان ماڵین و گەراندنیانەوە بۆ داوە.[٤]

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٦٥).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣٦٤).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٤٤٩).
٤ـ القادسية، أحمد عادل كمال (ص: ١٣٩)، تأريخ الطبري (٤/٣٦٤).

### د- ئەو پارچە شیعرەی لەو ڕۆژەدا وتراوە:

لقد علمت بنو أسد بأنـــا أولوالاحلام إذ ذكروا الحلوما
وأنا النازلون بكل ثـــغر ولو لم نلفه إل هشيمـــــــا
ترى فينا الجياد مسومات مع الابطال يعلكس الشكيما
ترى فينا الجياد مجلجـات تنهنه عن نوارسها الخصومـا
بجمع مثل سلك مكفـــهر تشبههم إذا إجتمعوا قرومـا
بمثلهم تلا في يوم هيـــج إذا لاقيت بأساً أو خصومـا
نفينا فارساً عمـا أرادت وكانت لا تحاول أن تريـــا

### هـ- بیمارستانی جەنگەکە:

بیمارستانی جەنگەکە لە ناوچەی عوزەیب بوو بە جۆرێك خێزانی موجاهیدانی ئارامگر و دڵسۆزی تێدابوو، کە برینـدارانی جەنگەکـەیان دەهاتـە بەردەست و سەرپەرشتی چارەسـەرکردنیان دەکـردن و تیماریان دەکردن تا کـار و فـەرمانی خودایـان تێدا تـەواو دەبـوون لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەوان ئـەرکێکی گەورەیان هەبوو لەوەی کە منـداڵان هاوکاریـان دەکـردن لـە هەڵکەنـدنی گـۆڕی شـەهیدان، ئەگەرچـی پەرستیاری و کاری پزیشکی بریندارەکان لە ئەرکە نزیك و بەدەست هاتووەکانی ئافرەتان بـوو، چـونکە هەڵکەندی زەوی لە ئەرکە سەختەکانە، بەڵام پیاوان لێرەدا سـەرقاڵی جیهـادن، لەبـەر ئـەوە لـە کـاتی پێویستدا دەبێت ئافرەتان هەڵسن بە بەجێهێنانی ئەو ئەرکەیان، ئەوان شـیاوی ئەمـەن لـەوەی کـە بـە ئیمانداری و خۆڕاگری وەسف کراون،[1] پاشان شەهیدان گوێزرانەوە بۆ شیوێك کـە دەڕوانێـت بـە نێـوان هەردوو ناوچەی عوزەیب و عین شەمس لەهەموو لاکانیەوە،[2] ئەم بەریەست بوونەی نێوان موسڵمانان و دوژمنەکانیان لەو شەوەدا هەلێك بوو بۆ ئەوەی کە هەندێ لـە موجاهیـدان سـەردانی کـەس و کاریـان بکەن لە ناوچەی عوزەیب.[3]

### و- خەنسای کچی عەمر لەشەوی هەمەجۆردا کوڕەکانی هان دەدات بۆجەنگ:

لە نموونە هێنانەی ئافرەتانی موسڵمانان لە عوزەیب خەنسائی کچی عـەمری ژنـە شـاعیری هـۆزی بەنی سەلیم کە کوڕەکانی چوار کەڵە پیاو بوون ئامۆژگاری دەکردن و هانی دەدان بۆ بەشداری کردن لە جەنگ و فەرمووی: ئێوە بەویستی خۆتان موسڵمان بوون و کۆچتان کردووە بۆ ئەم کارە هەڵبژێردراون و ئێوەش دەزانن کە خوای گەورە لە جەنگی دژ بە بێباوەڕان پاداشتی گەورە بۆ موسڵمانان ئامادەکردووە ئەوەش دەزانن کە ماڵی ئەو کـە نەبڕاوەیە باشـترە لـەم مـاڵی ئـەم دونیایـە کـە کۆتـایی دێ و خـوای گـــەورەش دەفـــەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾(ال عمران: ٢٠٠).

---

١ـ التاريخ الاسلامي (٤٥١/١٠).
٢ـ التاريخ الاسلامي (٤٥٢/١٠).
٣ـ هەمان سەرچاوە.

سبەينێ (إنشاء الله) بە سلامەتی ڕۆژتان کردەوە ئەوا بە چاوکراوەی بڕۆن بۆجەنگی دوژمن و لەسەرکەوتن بەسەر دوژمندا پشت بە خودا ببەستن، ئەگەر جەنگەکەتان بينی کە بە خێرايی بە لای ساقەکەيدا تێپەڕی و ئاگر لەسەر ساقەکانی بڵێسەی هەڵساند و ئەو ئاگرە لەسەر ئەملا و ئەلاکەی تەقيەوە ئەوا ئارەزووی هەڵگيرسانی و پەلاماردانی بکەن و لە کاتی تێکرژانی سوپاکەيدا بچن بۆ سەرۆکەکەيان بە دەستکەوت و ڕێزداری سەربکەون لە ماڵی نەمری وميوانخانەی خوداييدا، کوڕەکانيشی ئامۆژگاريەکەيان وەرگرت و لەسەر بڕياری قسەکەی خەنسای دايکيان هەر کە ڕۆژ بوويەوە بەرەو بنکەکانی خۆيان بەڕێکەوتن.[1]

## ز- ئافرەتێك لە نەخع هانی کوڕەکانی دەدات لەسەر جەنگ:

ئافرەتێك لە نەخع کە چوار کوڕی هەبوو ئەو ڕۆژە ئامادەی ئەو جەنگە بوون، کاتێك کە ڕۆژ بوويەوە و شەبەقی دا بە کوڕەکانی وت: ئێوە موسڵمان بوون و نەگۆڕاون، کۆچتان کردوە وکۆچەکەتان بۆ يەسريب نەبووە، وڵات قسەی بە ئێوە نەکردووە کە برسيەتی و بێ بارانی تێکتان بدات، پاشان ئەم دايکە پير و گەورەيەتان هێناو خستتانە نێو چنگی فارسەکان، سوێند بە خوا ئێوە کوڕی يەك پياون هەروەك ئەوەی کە کوڕی يەك دايکن، نە باوکتان خيانەتی کردووە و نە دايکتان خراپەيەکی کردووە، دەی ڕابن سەرەتا و کۆتايی جەنگەکە ببينن، ئەوانيش خێرا بەجێيان هێشت و گوڕ و تينيان دايە خۆيان، کاتێ کوڕەکانی لەبەر چاوی وون بوون دايکە دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و دەيووت: خوای گەورەرا بەلاّ لە کوڕەکانم دور بخەيتەوە، پاشان کوڕەکانی گەرانەوە بۆ لای و شەڕێکی باشيان کردبوو هيچ کاميان بريندار نەبووبوون.[2]

## ٢- ڕۆژی ئەغواس (اغواث)

ڕۆژی ئەغواس ڕۆژی دووەمی ڕۆژانی جەنگی قادسيە بوو، لە شەوی ئەم ڕۆژەدا پێشڕەوی سوپای شام کە قەعقاعی کوڕی عەمری لتەميمی سەرکردايەتی دەکردن هاتنە پێشێ و عومەری ئەميری باوەڕداران فەرمانی بە ئەبا عوبەيدەی ئەميری شام دا کە سوپاکەی خالدی کوڕی وەليد بگێڕێتەوە بۆ عێراق بەمەبەستی هاريکاری کردنی موسوڵمانان لە قادسيە، ئەويش سوپاکەی گەراندەوە و خالدی بۆ پێويستی خۆی لای خۆی هێشتەوە، هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاص برازای سەعدی کردە سەرپەرشتياری ئەو سوپايە، ئەم سوپايە کاتێ بە سەرکردايەتی خالدی کوڕی وەليد لە عێراقەوە هات بۆ شام بۆ هەزار کەس بوون، تەنها شەش هەزاريان گەرايەوە بۆ عێراق، هاشمی کوڕی عوتبەی قەعقاعی کوڕی عەمرلە پێشەوەی ئەو سوپايەوە بوو کە ژمارەيان هەزار موجاهيد بوو.[3]

---

١- الاستيعاب رقم (٢٨٧) نساء، القادسية (ص: ١٤٦، ١٤٧).
٢- تأريخ الطبري (٣٦٦/٤).
٣- تأريخ الطبري (٣٦٧/٤)، التاريخ الاسلامي (٣٦٧/١٠).

## ا- هەڵوێستە نەبەردەكانی قەعقاعی كوڕی عەمر:

قەعقاع خێرایی بە پێشڕەوی خۆی دا تا سوپاكەی خستە پێش سوپای قادسیە لە بەرەبەیانی ڕۆژی ئەغواس، لە كاتی ئەم پێشكەوتنەی بیری لە كارێك دەكردەوە كە ورەی موسڵمانان بەرز بكاتەوە، بۆیە سوپاكەی دابەش كرد بۆ سەد پارچە و دەستە و هەر دەستەیەكیش لە(١٠) كەس پێكهاتبوو، فەرمانی پێدان هەر، كە ١٠ كەسی یەكەم لە مەودای هەستی بینینی چاو ون بوون دە كەسی تر شوێن پێیان هەڵبگرێت و بە دوایاندا بڕوات، قەعقاع لەگەڵ دەیەكی یەكەمدا ڕۆیشت و پێشكەوتن وە هەر كاتێك كە قەعقاع چاوی هەڵدەبڕی لەو ئاسۆیەدا كۆمەڵێكی لێ دەبینین كە (الله أكبر)یان دەكرد و موسڵمانانیش ئەو (الله أكبر)ەیان دووبارە دەكردەوە، ئەوان لە جەنگی دوژمنانیان بێدار بوونەوە، ئەمەش پلانێكی سەركەوتووی جەنگی بوو بۆ بەرزكردنەوەی ورەی جەنگاوەران، بە ڕاستی گەیشتنی هەزار سەرباز مانای كۆمەكی گەورە نیە بۆ سوپایەك كە ژمارەیان سێ هەزار كەس دەبێت، بەڵام ئەم داهێنانەی كە خوای گەورە ڕێنمایی قەعقاعی پێكرد قەرەبووی كەم و كورتی ئەو كۆمەكیەی كردەوە بەوەی كە گوڕ و تینی موسڵمانانی پێ بەهێز كرد، قەعقاع مزگێنی پێدان بە هاتنی سەربازگەلێك بە وتەكەی: ئەی خەڵكینە من لە گەلێكەوە هاتووم بۆ لاتان سوێند بە خوا ئەگەر لە شوێنی ئێوەبان پاشان هەستیان پێ بكردنایە بەختی ئەوان ئێرەیی پێ دەبردن و هەوڵیان دەدا كە بەبێ ئێوە بیفڕێنن، ئێوەش هەر ئەو كارە بكەن كە من دەیكەم، پاشان چوویە پێشێ و فەرمووی: كێ زۆرانم لەگەڵ دەگرێت؟ ئەوانیش سەبارەت بە قەعقاع هەر ئەو وتەیەی ئەبو بەكریان دەوتەوە كە فەرموویەتی: هەر سوپایەك بە وێنەی ئەم پیاوەی تێدا بێت هەرگیز نابەزێت، پاشان لە لای سەقامگیر بوون، كەسێك بۆی هاتە دەرەوە،[1] قەعقاع پێی وت: تۆ كێی؟[2] ئەویش وتی من بەهمەنی جازەوەیهم، لێرەدا قەعقاع نەهامەتی گەورە موسڵمانانی ڕۆژی پردی بە دەستی ئەم سەركردەیە هاتەوە یاد پەرۆشی ئیسلامی گرتی و هاواری كرد و فەرمووی: ئەی تۆڵەسێنەرانی ئەبو عوبەیدە و سولەیط و یارانی پرد، هەرچەندە ئەم سەركردە فارسیە بە ئازایەتی بەناوبانگ بووە بەڵام دەكرێت لە دڵی بەم هاوارەی قەعقاع هەڵكەنرابێت، ئەبو بەكر(رضي الله عنه) دەربارەی قەعقاع فەرموویەتی: بەڕاستی دەنگی قەعقاع لەنێو ڕیزی سوپادا لە بوونی هەزار پیاو باشترە،[3] دەی كەواتە چۆن پیاوێك خۆی بۆ ڕادەگیرێت لەبەر دەمیدا ئەگەرچی لە ئازایەتی و دڵ دامەزراویدا بێت؟ لەبەر ئەوە قەعقاع مۆڵەتی پێ نەدا و لەبەردەم سەربازەكانیدا دای بە زەویدا و كوشتی ئەم كوشتنەی بەهمەن كاریگەری گەورەی لە هەژاندنی فارسەكانو بەرزكردنەوەی ورەی موسڵمانان هەبوو لەبەر ئەوەی بەهمەنی جازەوەیهی سەركردەی(٢٠)

---

١ـ قائد كبير من قادة الفرس وأبطالهم وهو الذي أصاب المسلمين يوم الجسر.
٢ـ سأل القعقاع جاذوية: لأنه كان لايعرفه لأن القعقاع يوم الجسر كان في الشام.
٣ـ التاريخ الاسلامي (٤٥٥/١٠).

ئەمیشیان جەنگا تا شەهید کرا،[1] کاتێك خەنساء هەواڵی چوار کوڕەکەی پێ گەیشت فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بەرێزی کردم بە کوژرانیان، لە خودا داواکارم کە لە ئارامگری پڕ میهری خۆی لەگەڵیاندا کۆم بکاتەوە.[2]

## هـ- فێڵێکی کاریگەری قەعقاعی بۆ سەر فارسەکان:

لەم ڕۆژەدا — ڕۆژی ئەغواس — قەعقاعی کوڕی عەمر و کوڕانی مامی لە هۆزی تەمیم هەستان بە فێڵێکی کاریگەری قەعقاعی بۆ سەر فارسەکان ئەمەش بۆ ئەوەی کە زانی بەوەی کە فیڵەکان لە ڕۆژی یەکەمدا کردیان بە ئەسپ سواری موسڵمانان لەبەر ئەوە خۆی و هۆزەکەی — بە یارمەتی خوای گەورە — هەستان بە ئامادەکردنی چەند حوشتر تا بە شێوەیەکی ترسناك نیشانی بدەن کە ئەسپەکان لێی هەڵبێن، ئەوان پۆشاك و جلێکیان کردە بەری حوشترەکان و چەندین پەچەیان لە ڕوویدا دانا، خەڵکانی پیادەیان خستە سەر و بە ئەسپ دەوریان دا بۆ پارێزگاری لێ کردنیان، هێرشیان پێ کردنە سەر ئەسپی فارسەکان، ئەوان ئەم کارەیان بە فارسەکان کرد لە ڕۆژی ئەغواسدا هەروەك چۆن ئەوان لە ڕۆژی ئەرماسدا بە موسڵمانیان کرد، ئەم حوشترانە کارێکی وایان کرد کە نە بۆ ماوەیەکی کەم یان زۆر نەدەمانەوە خۆیان پێ ڕانەگیرا مەگەر کۆمەڵێك لە سوار و ئەسپەکانیان پێ ترساندبن و ئەسپی موسڵمانان سەرکەوتبێت بەسەریاندا کاتێك خەڵکی ئەمەیان بینی پۆشاکیان پێدان، ئەو زیانەی کە لە ڕۆژی ئەغواس بە هۆی ئەم حوشترانەوە لە فارسەکان کەوت زۆر گەورەتر بوو لەو زیانەی کە لە ڕۆژی ئەرماس بە هۆی فیلەکانی فارسەوە لە موسڵمانان کەوت،[3] بەم شێوەیە موسڵمانە یەکەمینەکان دەبینینەوە کە سەرکەوتوون بەسەر دوژمنانیاندا لە داهێنانی جەنگیدا، فارسەکان لە ڕۆژی یەکەمدا بە هۆی فیلەکانیانەوە سەرکەوتن بەسەر موسڵماناندا، لەبەر ئەوەی کە موسڵمانان فیلیان نیە پێویستە بەو حوشترانەی کە هەیانە داهێنانێك ساز بدەن کە بە هۆیەوە فێڵ لە دوژمنەکانیان بکەن، ئەم فێڵە جەنگیە نایابە بوو کە ئەسپی دوژمنانی تۆقاند و وە ئەوانەی بەسەریانە بوون لە سوارەکان هەڵاتن، بەم شێوەیە پێویستە موسڵمانان سەرکەوتوو بن لە بواری خۆسازدانی مادی پاش سەرکەوتنیان و پێشکەوتنیان لە بواری خۆسازدانی ڕۆحیدا.

## و- ئەبو موحجەنی سەقەفی لە نێو جەرگەی شەڕەکەدا:

لە ڕۆژی ئەغواسدا شەڕ و پێکدادان تا نیوەشەو بەردەوام بوو، ئەم شەوە ناوزەدکرا بە شەوی تاریکی، پاشان دوای ئەوەی هەردوو تیمەکە ناوبڕە بوون شەڕەکە وەستا و ئەمەش سوودێکی گەورەی بۆ موسڵمانان هەبوو، بە جۆرێك شەهیدانی خۆیانیان گواستەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە ئەسپەردەیان دەکردن لە شیوی شوێن نوێژدا، هەروەها بریندارەکانیان دەگواستەوە بۆ ناوچەی عوزەیب کە لەوێ

١ـ القادسية، أحمد عادل كمال (ص: ١٥٤).
٢ـ الخنساء أم الشهداء، عبدالمنعم الهاشمي (ص: ٩٨).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٤٦٠).

ئافرەتان هەڵدەستان بە تیمارکردنیان، ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار موحجەنی سەقەفی لەو جەنگەدا بەشداری کرد[١]، ئەبو موحجەن پێشتر کۆت و بەند کرابوو، لە نێو کۆشکەکەدا کاتێك ئێوارەی بەسەردا هات چوویە لای سەعد، تا لێی بووریٚ و ئازادی بکات، بەڵام سەعد زەبرێکی لێدا و گەڕاندیەوە، ئەویش دابەزیە خوارەوە هاتو بۆ لای سەلمای کچی خضفة، پاشان وتی: ئەی سەلما ئەی کچی نەوەی خفضة، ئایا دەتوانی چاکەیەکم لەگەڵ بکەیت؟ ئەویش وتی: ئەو چاکەیە چیە؟ ئەبو میحجەن وتی: ئەم کۆتو بەندەم لیٚ دەکەیتەوە و ئەم بەڵەکەم پیٚ دەدەیت، بۆ خودا لەسەرمە و ئەگەر خودا سەلامەتی کردم دەگەڕێمەوە تا ئەم کۆت و بەندە بکەمەوە پێیەکانم، سەلما وتی: دەی من بەم کارە چی! ئەو گەڕایەوە بە کۆت و بەندەکەیەوە دەتلایەوە و دەیوت:

كفى حزناً أن تلتقي الخيل بالقنا وأترك مشدوداً عليّ وقافيـــا
إذا قمت عناني الحديد وأغلقت مصارع دوني قد تصم المفاديا
وقد كنت ذا مال كثير وإخــــوة فقد تركوني واحداً لا أخالــيا
ولله عهد لا أخيس بعهــــــده لئن فرجت الّا أزور الحوانيـــا

سەلماش وتی: من داوای خێرم لە خوا کردووە بە پەیمانەکەت قایل بووم، پاشان ئازادی کردو وتی: بەڵام ئەسپەکەمت نادەمیٚ، دواتر سەلما گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی و بەرێوەی بردن لە دەرگای کۆشکەکەی دەری کرد کە دەکەوتە دوای خەندەقەکەوە و پاشتر سواری بوو، ئێنجا بە سنگە خشکە سوار بوو، تا ئەگەر لە بەرامبەر لای ڕاستەوە بوو الله أکبر بکات، دوای ئەوە کەوتە سەر ڕەوتی خەڵکەکە و لە نێوان هەردوو ڕیزەکەدا یاری بە ڕمو شمشێرەکەی دەکرد، وتیان بە زینەکەیەتی، وتی من بەختەوەرم و بەشکەریش بیٚ کەم و کورتیە، پاشانیش لە پشتەوەی موسڵمانانەوە گەڕایەوە بۆ نێو ڕەوەکە و الله أکبرێکی کرد و کەوتە سەر لای ڕاستی خەڵکەکە و بە ڕمو شمشێرەکەی یاری لە نێوانیاندا دەکرد پاشان لە پشت موسڵمانانەوە گەڕایەوە بۆ ناو جەرگەی خەڵکەکە و لەبەردەم خەڵکەکەدا هاتوو چۆی دەکرد، دەکەوتەوە نێو خەڵکەکە و دیسانەوە یاری بە ڕمو شمشێرەکەی دەکرد وە بۆردومانی خەڵکی دەکرد هەتا پەنا بۆ بۆردومانێکی دان پیانەنراو بەرن خەڵکی زۆر پێی سەرسام بوون بەڵام لەبەر ئەوەی کە بە ڕۆژ نەیان دیبوو نەیاندەناسیەوە، هەندێك دەیان وت ئەمە یان هیشام خۆیەتی یان لە هاوەڵە پێشینەکانیەتی، سەعد کە لەسەر کۆشکەکە پاڵ کەوتبوو سەرپەرشتی خەڵکەکەی دەکرد دەیفەرموو: سوێند بە خوا ئەگەر ئەبو محجن کۆت و بەند نەبوایە ئەوا دەموت: ئەوە ئەبو محجنە و ئەوەش ئەسپە بەڵەکەیە، قسەکان فرە زۆر بوون و کاتێك کە نیوەشەو داهات فارسەکان ناوبڕ بوون، موسڵمانان گەڕانەوە، ئەبو محجن پێش کەوت تا لە کوێوە هاتبووە دەرەوە چوویەوە ژوورەوە، دەست و پێیەکانی خستەوە ناو کۆت و بەندەکە و وتی:

لقد علمت ثقيف غير فخر بأنا نحن اكرمهم سيوفـــاً
وأكثرهم دروعاً سابغـــات وأحبرهم إذا كرهوا الوقوفا

---

١ـ التأريخ الاسلامي (٤٦٢/١٠).

وأنا وفدهم في كل يــــوم فإن عميوا فسل بهم عريفاً
وليلة قادس لم يشعروا بـي ولم أشعر بمرض الزحوفـــا
فأن أحبس فذلكم بلائــــي وإن أترك أذيقهم الحتوفـــا

دواتر سەلما پێی وت: ئەی ئەبو موحجەن، ئەم پیاوە بۆچی کۆت و بەندی کردی؟ ئەویش وتی: سوێند بەخوا لەبەر ئەوە بەندی نەکردووم، کە حەرامم خواردبێت، بەڵام لەسەردەمی جاهیلیدا مەی خۆر بووم، مـن پیاوێکی شاعیر بووم و شیعر دێ بەزمانمدا، هەندێ جار دەینێرمە سەر لێوانم، بۆئەمەش ستایشم خراپ دەبێت، ئەوپیاوە لەبەرئەوە بەندی کردم، کە وتم:

إذا مت قادفني الى أصل كرمةٍ تروي عظامي بعد موتي عروقها
ولا تدفنني بالفلاة فإننــــــي أخاف إذا مامت ألا أذوقهــــا
وتروي بخمر الحص لحدي فإننــي أسير لها من بعدما قد أسوقهــا

هەر کە ڕۆژ بوویەوە سەلما هەواڵی خۆی و ئەبو موحجەنی دایە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، ئەویش بانگی کرد و ئازادی کرد، پێی وت: تاوان نیە کە بە دەمی زمانمەوە نەچم بۆ سیفەتێکی خراپ هەرگیز.[1]

## ز- پلانێکی قەعقاع لە نیوەی شەوی تاردا:

یەکێك لە دیارترین ئەو شتانەی کە لە نیوەی کۆتایی شەوی تاردا ڕوویدا ئەوە بوو قەعقاعی کوڕی عەمر هەڵێکی قوستەوە بۆ نەخشەداڕشتنی پیلانێك هەتا لە ڕۆژی داهاتوودا وورەی موسڵمانانی پێ بەرز بکاتەوە، قەعقاع فەرمانی دا بە شوێنکەوتووانی کە بە پەنهانی دزە بکەنە نێو ڕیزی دوژمنان و پاشان لە ڕۆژدا بێن بە چەند دەستەیەکەوە و هەر دەستەیەك سەد جەنگاوەر بێت، پێی وتن: ئەگەر ڕۆژتان لێ بوویەوە و خۆرتان لێ هەڵهات سەد سەد وەرنە پێشێ، هەر کاتێك کە سەد کەستان لە چاو ون بوو با سەد کەسی ترتان بە دوادا بێت، ئەگەر هاشم هات ئەوە ئەوە، ئەگەرنا بۆ خەڵکی تکا و کۆششتان بۆ خەڵکی نوێ کردۆتەوە، کاتێك کە تیشکی خۆر دەرکەوت قەعقاع تێبینی ئەسپەکانی دەکرد و کاتێك کە پێشەنگیان دەرکەوت قەعقاع الله أکبرێکی کرد و خەڵکیش دەستیان کرد بە الله أکبر و وتیان: هاوکاری و کۆمەکی هات، عاصمی کوڕی عەمری برای زۆر پێی سەرسام بوو ئەویش فەرمانی دایە گەڵەکەی لە ڕووی ناوچەی خەفانەوە کارێکی وا بکەن، دواپین کەس لە یارانی قەعقاع دەرنەکەوت هەتا هاشمی کوڕی عوتبە بە حەوت سەد کەس لە سوپای شامەوە دەرکەوت، خەڵکەکە ئەم هەواڵە و ئەوەی قەعقاع لەو ڕۆژەدا کردبووی دایانە هاشم، ئەویش هاوڕێکانی خۆی حەفتا حەفتا بەش کرد و کاتێك کە دواین هاوڕێی قەعقاع دەرکەوت هاشمی کوڕی عوتبە بە حەوت سەد کەسەوە هاتە دەرەوە،[2] لێرەدا توێژەر تێبینی خۆ بەکەم زانینی هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاص دەکات کە

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٧٤).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣٧٥).

قایل بوو بە وەرگرتنی هاوڕایی لە پلانی جەنگیدا و دەستی کردە بەش بەش کردنی سوپاکەی بە هەمان شێوەی قەعقاعی کوڕی عەمر، پلەداری و باوەڕ بەخۆبوون بەری پێ نەگرت کە ڕای یەکێك لە سەرکردەکانی تر وەربگرێت بەڵکو پیاوێك بوو لەو پیاوانەی کە لە قوتابخانەی پەروەردەیی پێغەمبەری دەرچووبوون، ئەوان وایان لێهاتبوو لە پێناو بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان بە گشتی بەرژەوەندی خود و تایبەتی خۆیان وەلانابوو، ئەمەش لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنیان بوو لە ڕەساندنی دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی و سەرکەوتن بەسەر تەواوی هێزەکانی جیهاندا لەو دەمەدا.[1]

## ٣- ڕۆژی عیماس:

ئەمە سێیەمین ڕۆژ بوو، ڕۆژی عیماس فارسەکان تیایدا بە نەخشەیەکی نوێوە لێی هاتنە پێشێ هەتا بە کلپەی ئەو پلانەیان موسڵمانان دوچاری ئەو لێدانە بکەنەوە کە لە ڕۆژی یەکەمدا دووچاری بوون، تا موتابیان بقرتێنن، فارسەکان لەگەڵ هەر فیلێك چەند پیاوێکیان دانا بۆ پارێزگاری لێ کردنیان و بۆ پارێزگاری ئەو پیاوانەش چەند ئەسپ سوارێکیان دانا، ئەمەش وای کرد لە موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە پەلاماری فیلەکان بدەن، لەمەش دووچاری تەنگەلانیەکی دژوار بوونەوە، کاتێك کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) بینی موسڵمانان دووچاری گورزێکی کوشتندە بوونەتەوەناردی بەدوای ئەو موسڵمانە فارسانەی کە لەگەڵ سوپای ئیسلامیدا بوون و پرسیاری لێ کردن ئایا ئەو فیلانە شتێکیان هەیە پێی بجەنگن؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ شفرە و چاویان هەیە و پاش ئەوە سوودیان لێ وەرناگیرێت، سەعد ناردی بەدوای قەعقاع و عاصمی کوڕی عەمر و پێی وتن: کاری ئەو فیلە سپیەم بۆ تەواو بکەن چونکە تەواوی فیلەکان ئولفەتیان بەوەوە گرتووە و ئەویش بە بەرامبەر ئەو فیلەوە بوو، پاشان ناردی بەدوای حەممالی کوڕی مالك و ڕەبیلی کوڕی عەمری ئەسەدی و فەرمووی: کاری ئەو فیلە گەورەم بۆ تەواو بکەن کە هەموویان هۆگری بوون و ئەوانیش بە بەرامبەری ئەو فیلەوە بوون، بەم شێوەیە قەعقاع و عاصم ڕمەکانیان هەڵگرت و خۆیان بەرەو فیلەکە کشان بەنێو دەستەیەك لەپیاوان و ئەسپ سوارواندا و بە هاوڕێکانی خۆیان وت: فیلەکە لە ئامێز بگرن با شپرزەی بکەن ئەمەش وای کرد لە فیلەکە کە سەیری ئەملا و ئەولای و ڕاست و چەپی خۆی بکات و بەوەی ئەوەتا بە دەورەیەوە شپرزە ببێت، دوای ئەمە قەعقاع و عەمر لە فیلەکە نزیك بوونەوە لە کاتێکدا ئەو سەرقاڵی کەسانی دەور و پشتی خۆی بوو ئەوانیش پێکەوە ڕمەکانیان کرد بە چاوی فیلە سپیەکەدا، پاشان فیلەکە سەری خۆی جولاند و سەرکارەکەی خۆی فڕێدا، شفرەکانی شۆڕ کردەوە، قەعقاعیش بەری پێ گرت و فڕێیدا، کەوت بە لادا و هەرچیەکی بەسەرەوە بوو کوژران، لە لایەکی ترەوە حەممالی کوڕی مالك فەرمووی بە ڕەبیل: هەڵبژێرە یان تۆ لە شیفرەکان دەدەیت و من لە چاوی وە یان تۆ پەلاماری چاوی دەدەیت و من لە شیفرەکانی دەدەم ڕەبیل ئەوەی هەڵبژارد کە لە شیفرەکانی بدات، بەم شێوەیە حەممال هەڵمەتی بۆ فیلەکە برد لە کاتێکدا فیلەکە سەرقاڵی ئەو کەسانە بوو کە شپرزەیان کردبوو، موسڵمانان لەسەر

---

١ـ التأريخ الاسلامي (٤٦٦/١٠).

ناوپۆشەکەشی لەسەرکارەکەی نەدەترسان لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی یەکەمدا کەمەربەندەکەیان قرتاندبوو وە ئەوان تاك و تەنهایان دەکردەوە، پاشان حەممال دای لە چاوی و هەڵتروسکا بۆ پاشەوەی پاشان ڕاوەستا و ڕەبیلی کوڕی عەمر بەری پێ گرت و شیفرەکانی تانگ کرد، سەرکارەکەی چاوی پێ هەڵهێنا بە ئاسنێك کە لەگەڵیدا بوو دای لە ڕوومەت و لووتی و بەمەش ڕەبیل و حەممال کەوتنە خوارەوە، فیلەکانیش وەك بەراز کەوتنە هاوار، فیلەکانی تریش سەر بەم دوو فیلە بوون کاتێك گەڕانەوە بە ڕووی فارسەکاندا فیلەکانی تریش بە دوای ئەواندا گەڕانەوە و سوپای فارسیش شۆڕ بوویەوە هەتا ڕووباری عەتیقی بڕی و بەرەو مەدائن گەڕایەوە و هەرچی لەگەڵیاندا بوو شەکەت و ماندوو بوون،[1] کاتێك گۆڕەپانی جەنگ لە فیلەکان خاڵی بوویەوە خەڵکەکە بە ڕووی یەکدا کشان و شەڕ و جەنگ لە نێوانیاندا گەرم بوو فارسەکان سوپایەکی یەدەکیان هەبوو لە خەڵکانی خاوەن هێز و لاو وە هەر کاتێك کە کەم و کورتیەك ڕووی لە سوپاکەیان بکردایە هەواڵیان دەدایە یەزدجەرد و ئەویش لەم سوپایە کۆمەکی و هاریکاری بۆ دەناردن، ئەم ڕۆژە موسڵمانان و دوژمنانیان تیایدا وەك یەك بوون.[2]

### أ- پاڵەوانیەتی عەمری کوڕی مەعدیەکرب:

عەمری کوڕی مەعدیەکرب دەفەرمووێت: من و ئەوانەی کە بەرامبەری فیلەکانەوە بووین هەڵمان کوتایە سەر فیلەکە و وتم لێم مەگەڕێن کە زیاتر بە ڕیشاڵەوە هەڵمپاچن (واتا بەرەو حوشترەکان) ئەگەر بێتو لێم دوا بکەون ئەوا شێرێك لە دەست دەدەن چونکە من بۆ ئێوە وەك شێرێك وام، ئەگەر هەستتان پێ کردم و بینیتان کە شمشێرەکەم لە دەستمدایە، پاشان هەڵمەتی برد و ئاوڕی نەدایەوە تا لێیدان، پاشان تەپ و تۆزی شەڕەکە شاردیەوە، هاوڕێکانی وتیان: سەیری چی دەکەن؟ ئەگەر لە دەستی بدەن ئەوا موسڵمانان سوار چاکەکەیان لە دەست دەدەن، بەم شێوەیە موسڵمانان هێرش و هەڵمەتێکیان بەرپاکرد و بێباوەڕانەیان لێ دوور خستەوە پاش ئەوەی کە زۆرانیان لەگەڵ گرتبوو وە لە چەند لایەکەوە لێیان دابوو، شمشێرەکەی لە دەستیدا بوو دەیوەشاند و ئەسپەکەشی لە چەند لایەکەوە لێی درابوو، کاتێك کە عەمر هاوڕێکانی بینی، فارسەکان لێی جیابوونەوە و ئەویش پەلی سوارێکی فارسی گرت و فارسەکەش هەژاندی و پاشان ئەو سوارە تەنگ و چەڵەمەی دووچار هات و ئاوڕی دایەوە بۆ لای عەمر، زۆر بەپەرۆشیەوە بوو، کە لێی بدات لەم کاتەدا موسڵمانان بینیان و فێڵیان لێ کردو فارسەکە لێی دوور کەوتەوە، ئەویش ئامادە بوو- واتا بە پەلە چوو بۆ لای هاوڕێکانی- پاشان فەرمووی: لە لغاوەکەی جێگیرم بکەن، ئەوانیش جێگیریان کرد و دواتر سواری بوو.[3]

---

١ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٤٦٨).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣٧٦).
٣ـ تأريخ الطبري (٤/٣٧٨).

## ب- طلیحەی کوڕی خووەیلدی ئەسەدی:

لە ڕۆژی سێیەمدا شەڕ هەتا شەو بەردەوام بوو، پاشان دەنگی طلیحەی کوڕی خووەیلدی ئەسەدی بوویە ناوبڕی نێوان هەردوو گروپەکە، ئەو بە دوای سوپای فارسەکاندا ئاوڕی دەدایەوە، فارسەکان لەمە ترسابوون و موسڵمانان زۆر پێی سەرسام بوون، لەسەرنجدان لەم کارەوە هەندێکیان وازیان لە هەندەکەی تریان هێنا، سەعد طلیحة و چەند کەسێکی نارد بۆ پاسەوانی جێگایەك کە ڕەنگە مەترسی بۆ سەر موسڵمانان تێدا دەربکەوێت پاشان ئەرکەکەی خۆی ڕاپەڕاند، لە پشتی سوپای فارسەوە سوڕایەوە و سێ جار (ألله أكبر)ی کرد،[1] ئەم بزاڤەی زۆر سوودمەند بوو بە جۆرێك شەڕەکە ڕاگیرا، لێرەشدا هەلێکی تر دەستەبەر بوو بۆ سازکردنەوەی ڕیزەکان و ڕێك و پێك کردنیان و خۆئامادەکردن بۆ شەڕ و پێکدادانی شەوانە.

## ج- قەیسی کوڕی ئەلمەکشوح:

ئەی گەلی عەرەب، خوای گەورە بە ئاینی ئیسلام خەڵاتی کردوون وە بە ناردنی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێزداری کردوون و بە نازونیعمەتی خوداش کردوونیە برا، و بانگەوازیشتان هەر یەکە، پاش ئەوەی کە ئێوە هەندێکتان وەك شێر و دوژمنی سەر هەندەکەی ترتان بوون، هەندێکی ترتان وەك ڕفاندنی گورگ و هەوڵی ڕفاندنی هەندەکەی ترتان داوە، ئێوە ئاینی خودا سەربخەن با سەرکەوتووتان بکات، لە خوداوە ئازادکردنی ناوچەی فارس دەستەبەر دەکەن، بەڕاستی براکانتان لە شامیەکان خوای گەورە شامی بۆ ئازاد کردن و کۆشك و تەلار و قەڵا سوورەکانی بۆ ڕامالین.[2]

## د- ئەو شیعرانەی کە لەو ڕۆژەدا وتراون:

قەعقاعی کوڕی عەمر وتوویەتی:

حضض قومي مضر حي بن يعمر ... فلله قومي حين هزوا العواليـا

وما خام عنها يوم سارت جموعنا ... لأعل قديس يمنعون المواليـــا

فإن كنّ قاتلت العدو فللتـــــه ... فإني لألقي في الحروب الدواهيا

فيولاً أراها كالبيوت مغيــــرة ... أسمل أعيانا لها ومآقيـــــــا[3]

یەکێکی تر فەرمووی:

أنا ابن حرب ومعي مخزاقـــــي ... أخبرهم بصارم رقـــــراق

إذا كره الموت أبو إسحـــــاق ... وجاشت النفس على الترتقي

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٨٢).

٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣٧٨).

٣ـ هەمان سەرچاوە (٤/٣٨١).

## هـ- شەوی ئەلهورەیر (مڕەمڕ):

شەڕ و جەنگی شەوی ئەلهورەیر شەوی چوارەم دەستی پێکرد، فارسەکان لەم شەوەدا ڕێگەی جەنگی خۆیان گۆڕی، ڕۆستەم هەستی بەوە کرد کە ئاستی سوپاکەی لە ڕاوەدووناندا ناگاتە ئاستی سوپای موسڵمانان و بەڵکو لێشی نزیك نابێتەوە، بۆیە سوور لەسەر ئەوەی کە هەموو سوپاکەی بکشێنێتە گۆڕەپانەوە تا قوربانی بدات بەو شکست هێنانە پێشوانەی کە بوونە مایەی ڕووخانی ورەی سوپاکەی، چونکە پاش ئەوەی کە نەبەردانی ئیسلام هاتنە ڕوو کەسێك لە فارسەکان نەهاتە دەرەوە بۆ زۆران بازی و ڕاوەدوونان، بەم شێوەیە ڕۆستەم سوپاکەی کرد بە سیانزە ڕیزەوە لە ناوجەرگە و پێشەنگەکان و قەعقاعی کوڕی عەمریش دەستی کردە جەنگی خەڵکانی بەهێز و جوامێر وە دوای کەوتن پێش ئەوەی نەڕەی (الله أكبر)ی لێ بەرزبێتەوە، ئەو ڕێگەی پێدان و لای خوای گەورە داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن، کاتێك کە سەعد سێ جار (الله أكبر)ی کرد تەواوی سەرکردەکان و سوپاکە بە ڕووی فارسەکاندا کشان، کە لە سێ ڕیز پێکهاتبوون، ڕیزێك تیرهاوێژ و ڕیزێك ئەسپ سوار و ڕیزەکەی تریش پیادەڕەو، شەڕ و جەنگ لەم شەوەدا زۆر جەرگ بڕ بوو، هەر لە سەرەتای شەوەوە پێکدادان تا بەرەبەیان بەردەوام بوو کەس قسەی نەدەکرد و دەمیان نەدەکردەوە، قسەکانیان مڕەمڕ بوو لەبەر ئەوە ئەو شەوە ناونرا شەوی ئەلهورەیر، موسڵمانان ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد بە خستنە ئەگەری هەوڵی تەواویان لەسەر جەنگ بۆ ئەوەی لەم کێبڕکێ کوشندەیەدا پێشبینی دەکەن، ئەوەش کە لەو بارەیەوە دەگێڕدرێتەوە،[1] وە ئەوەش کە هەرکەیە لەم بەڕێانە فەرموویانە.

- دورەیدی کوڕی کەعبی نەجعی بە هۆزەکەی فەرموو: موسڵمانان خۆیان سازداوە بۆ سنگە خشکە، ئەمشەو بۆ سەرخستنی ئاینی خودا و جیهاد لە پێناویدا پێشی موسڵمانان بکەون، بە ڕاستی ئەم شەو هیچ کەسێك پێش ناکەوێت مەگەر پاداشتەکەی هێندەی پێشکەوتنەکەی بێت، سەبارەت بە بەدەست هێنانی پلەی شەهیدی ئیرەییان پێ بەرن و دڵتان بە مردن خۆش بکەن، بە ڕاستی ئەمە لە مردن فریادڕەسترە ئەگەر ئێوە ژیانتان دەوێ، مەگەرنا ئێوە دواڕۆژتان ناوێ.

- ئەشعەسی کوڕی قەیس فەرمووی: ئەی نەوەی عەرەب: ناکرێت کە لە گەل و نەتەوە بوێرتر بن لەسەر مردن و ناکرێت جوامێرتر بن لە دونیا ئیرەیی بە خێزان و منداڵەکانتان بەرن، لە شەڕ و جەنگ مەترسن چونکە ئەو هەوا و ئارەزووی ڕێزداری و ئاوات و ئامانجی شەهیدانە.[2]

- حوزەیفەی کوڕی نعمانی بارقی دەفەرمووێت: شەوی ئەلهورەیر لە بەرامبەر هۆزی جوعفی دەستەیەك لە دەستەکانی عەجەم هەبوون کە چەك و جبەخانەیان بێ کەم و کورتی بوو، موسڵمانەکان پەلاماریان دان و بە شمشێر لێیان دان، بەڵام بینیان کە شمشێرەکانیان کار لەگەڵ ئاسنەکانی ئەوان ناکاتەوە لەبەر ئەوە دامرکانەوە، لەم کاتەدا حوزەیفەی کوڕی نعمانی بارقی فەرمووی: ئەوە چیتانە؟

---

١ـ تأريخ الطبري (٣٧٢/٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٣٨٤/٤).

ئەوانیش وتیان: شمشێر لە ناویاندا کار ناکا، ئەویش فەرمووی هەروەك خۆتان بمێننەوە هەتا کاریێکتان پیّ نیشان دەدەم، ئەو هەڵیکوتایە سەر پیاوێکی فارسی و بە دەور و پشتیدا سوڕایەوە و بە ڕمەکەی لە پشتیدا و پاشان ئاوڕێکی دایەوە بۆ لای هاوڕێکانی فەرمووی: من نایان بینم مەگەر بیّ ئێوە بمرن، ئەوانیش هەڵیان کوتایە سەریان و ڕایانماڵین بۆ نێو ڕیزەکانی خۆیان.[1]

هەروەها لە بەرامبەر هۆزی کیندە، تورکی تەبەری (یەکێك لە سەرکردەکانی فارس) هەبوو ئەشعەسی کوڕی قەیسی کندی فەرمووی: ئەی گەل و نەتەوەکەم بۆیان وەکشێن، ئەوانیش بە حەوت سەد کەسەوە ڕوویان لێنان و ڕایان ماڵین و تورکی سەرکردەیان کوشتن، شەڕ و جەنگ لەو شەوەدا زۆر بەردەوام بوو، سەرەك هۆزەکان هانی هۆز و تیرەکانیان دەدا لەسەر خۆڕاگری و ئارامگرتن، کە ئەمەش زەبری جەنگ لەو شەوەدا دەردەخات، هەر ئەوەی کە طبری لە ئەنەسی کوڕی حلیسەوە هێناویەتی دەفەرمووێت: من شەوی ئەهورەیرم بینی، بە ڕاستی زرنگانەوەی ئاسن تیایدا وەك دەنگی ئاسنگەری وابوو لەو شەوەیاندا هەتا بەری بەیان، سەبر و ئارامی لە خەڵکەکە بڕا و سەعد ئەو شەوە بە جۆرێك مایەوە کە هەرگیز وا نەبووبوو، عەرەب و عەجەمەکانیش کاریێکیان بینیبوو کە هەرگیز شتی لەو شێوەیە نەبووە، هەواڵەکان لە ڕۆستەم و سەعد دابڕان، سەعد دەستی کردە نزا و پاڕانەوە تا نێوەی ئەو شەوە تێنەپەڕی بووکە گوێی لە دەنگی سەعد بوو دەیفەرموو:

نحن قتلنا معشراً وزائـــدا      أربعة وخمسة و واحــــــداً

نحسب فوق اللبد الأوسادا[2]      حتى إذغ ماتوا دعوت جاهداً

الله ربي وأحترست عامداً[3]

هەر بەم دێڕە هۆنراوەیە سەعد ڕێنمایی کرا بۆ ئازادیخوازی و ڕزگاربوون، هەر بەم شێوەیە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) ئەو شەوە مایەوە لە خودا دەپاڕایەوە و داوای سەرکەوتن و پشتیوانی لیّ دەکرد، ئەمەش دەکرێت کە ئاماژەیەك بێت بۆ بەدەمەوە هاتن و گیرابوونی دوعاکانی سەعد.[4]

### ٤- ڕۆژی ئەلقادسیە:

لە ڕۆژی چوارەمدا و ئەمجارەیان موسڵمانان دەستیان دایە جەنگ، لەم کاتە قەعقاعی کوڕی عەمر بە نێو خەڵکەکەدا تێدەپەڕی و دەیفەرموو: پاش سەعاتێك پشت تیّ هەڵکردن بۆ ئەو نەتەوە دەست پێدەکات کە دەستیان پێکردووە ئێوەش یەك کاتژمێر ئارامتان بێت و پاشان پەلامار بدەن، بە ڕاستی سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە،ئەوانیش خۆڕاگریان دا بەسەر نائارامیدا، بەم شێوەیە کۆمەڵێك لە سەرکردەکان لە دەوری کۆبوونەوە، خۆیان بۆ ڕۆستەم گرت هەتا لەگەڵی بەرەبەیاندا تێکەڵ بە پیاوەکانی بوون، کاتێك کە تیرە و هۆزەکان ئەمەیان بینی چەند پیاوێك تێیاندا ڕاست بوونەوە، هەر

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٨٦).
٢ـ اللبد سرج الفرس، والاوساد الحيات.
٣ـ تأريخ الطبري (٤/٣٨٦).
٤ـ التأريخ الاسلامي (٩/٤٧٤).

یەکە لە قەیسی کوڕی عەبد یەغوس و ئەشعەسی کوڕی قەیس و عەمری کوڕی مەعدیەکروب و ابن ذی سەهەینی خوسعەمی و ابن ذی البوردەینی هیلالی هەستانە سەر پێ و فەرموویان: ناکرێت ئەوانە (واتا فارسەکان) لە ئێمە بوێرتر بن بۆ مردن و ناکرێت لە ئێمە بەخشندەتر بن لە دونیا، لە هۆزی ڕەبیعەش چەند پیاوێك هەستان و وتیان: ئێوە شارەزاترین کەسن بە فارسەکان و بوێرترین کەس بوون بەسەریاندا لەوەی کە تێپەڕیووە، ئەی ئەمڕۆ چی بەرتان پێ دەگرێت کە بوێرتر بن لەوەی کە ئێوەی لەسەر بووە،[1] بەم شێوەیە قەعقاعی کوڕی عەمر جۆش و خرۆشێکی نوێ دەداتە پاڵ خرۆشانە زۆرەکانی تری و خوای گەورە لە نێو قارەمانیەتیەکی بێ وێنە و دەگمەن و ڕای پتەوو هێزی ئیمان و باوەڕدا بۆی کۆدەکاتەوە، هەموو ئەمانە بۆ سەرکەوتنی ئیسلام و موسڵمانان دەستەبەر دەبێت، بە ڕاستی پێشکەوتنی قەعقاع لەم جەنگەدا ڕزگاریەك بوو بۆ موسڵمانان، قەعقاع هەستی کرد بەوەی کە دوژمنایەتی لە شەڕ و جەنگێکی بەردەوامی شەو و ڕۆژیدا ئارامیان لێ بڕاوە و پێش ئەمەش بۆ ماوەی دوو ڕۆژ پشوویەکی کەمیان داوە، بە بیرتیژی خۆی و ئەزموون درێژی — پاش سەرکەوتنی خوایی بۆی — کە کۆتایی شەڕەکە لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە پاش ئەم هەوڵ و ماندووبوونە دوور و درێژە ئارام دەگرن، بۆیە قەعقاع و ئەو پاڵەوانانەی کە لەگەڵیدا بوون توانیان دەروازەیێکی قووڵ بکەنە جەرگی سوپای فارسیەوە، بەمەش گەردەلولێك هەڵی کرد کە بای خۆرنشین یان وڕە بوو، پاشان فرۆکەکەی ڕۆستەم لەسەر جێ خەوەکەی نیشتەوە، فڕێی دایە ڕووباری عەتیقەوە، تەپ و تۆزی ئەم کارە دای بەسەر فارسەکاندا و لە بەرگری کردنی خستن.[2]

## أ- کوژرانی ڕۆستەم، سەرکردەی فارسەکان:

قەعقاع و ئەوانی کە لەگەڵیدا بوون پێشڕەویان کرد تا مەنزڵەکەی ڕۆستەمیان دۆزیەوە بەڵام لەبەر تەپ و تۆزی ئەو ناوە ڕۆستەمیان نەبینی، بەڵام ڕۆستەم مەنزڵەکەی جێ هێشتبو بەسەر ئەسپەکەیەوە، قەعقاع دای بەسەر ڕۆستەمدا و ئەویش هەستی پێ نەکرد وە لە پشتی بڕبڕەیەکی داماڵی، لەم کاتەدا ڕۆستەم بەرەو ڕووباری عەتیق ڕای کرد تا خۆی دەرباز بکات بەڵام هلال قاچی گرت و ڕایکێشا و پاشان کوشتی، دواتر چوویە سەر مەنزڵەکەی و هاواری کرد: ڕۆستەمم کوشت، بە خوای گەورەی کەعبە، بۆ لای من وەرن، ئەوانیش چوون و سووڕانەوە بە دەورەیداو مەنزڵەکەی بینی و الله اکبریان دەکرد و هاواریان دەکرد و بانگیان دەکردن بەم شێوەیە دڵ و جەرگی فارسەکان تێك شکا، بەڵام تەواوی سەرکردەی موسڵمانان و پێشکەوتن بەرووی ئەوانەی، کە ڕووبەڕوویان دەبوونەوە و فارسەکانیش لەبەردەمیان کشانەوە و هاتنە دواوە، کاتێك کە جالینۆس بە کوشتنی ڕۆستەمی زانی لەسەر چڵ و پۆ شوێن جێگیرکراوەکەی سەر ڕووبارەکەی هەستا و هاواری کرد بۆ فارسەکان کە بپەڕنەوە و لە دەستی مردن هەڵبێن، بەڵام ئەوانەی کە لە مەی و بادەی سووکەوە نزیك بوون و

---

١ـ تأريخ الطبري (٣٧٨/٤).
٢ـ التأريخ الاسلامي (٤٧٦/١٠).

ژمارەیان (٣٠) هەزار کەس بوو ئەوانە کەوتنە ئاوی عەتیقەوە و موسڵمانان بە ڕمەکانیان تێوەیان دەژەندن و تەنها کەسێکیان ڕزگاری نەبوو.[١]

## ب- کۆتایی جەنگەکە:

بەیارمەتی خوای گەورە جەنگەکە کۆتایی پێهات، پاشان بە هەڵ و تێکۆشانی پاڵەوانانی ئیسلام و ژیری و لێهاتوویی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی سەرکردەیان، بە ڕاستی ئەم جەنگە شەڕێکی جەرگبڕی دژوار بوو کە دوژمنانی موسڵمانان سێ ڕۆژ خۆیان تێداگرت و تا خوای گەورە لە ڕۆژی چوارەمدا تێکی شکاندن، ئەگەرچی زۆرجار موسڵمانان لە ڕۆژێکدا چەندجار دوژمنانیان تێك دەشکاند، هۆی ئەم دامەزراویەش ئەوە بوو فارس ئەم جەنگەیان بە جەنگێکی چارەنووس ساز لە قەڵەم دەدا، ئەویش ئەوەیە کە یان دەوڵەتەکەیان لەگەڵ سەرکەوتن و سەرفرازیدا دەمێنێتەوە، یان ئەوەیە کە دەوڵەتەکەیان لەگەڵ تێکشکان و بەزیندا دەڕەوێتەوە و بۆیان نارەسێتەوە، هەروەها ڕۆستەمی سەرکردەشیان هۆیەکی تری ئەم دامەزراویەیان بوو لە سەرووی سەرکردایەتیەوە و سەرباری ئەوەش فارسەکانی ڕووی چەندی و چۆنیەتیەوە پێشی خستبوو، بە جۆرێك ژمارەی سوپای فارسەکان (١٢٠) هەزار کەس بوو جگە لە شوێنکەوتوان، لەگەڵ ئەوەی کە یەزدجەرد وەك کۆمەکی هەموو ڕۆژێ ڕەوانەی دەکردن، لە کاتێکدا ژمارەی موسڵمانان سێ و شتێك هەزار کەس دەبوو،[٢] لەگەڵ هەموو ئەمانەدا موسڵمانان لەگەڵ ئەوەی کە (٨٥٠٠) شەهیدیان دا سەرکەوتن بەسەر فارسەکاندا،[٣] ئەم ژمارە شەهیدانەش گەورەترین ژمارە بوو کە موسڵمانان لە جەنگ ئازادیخوازەکانی یەکەمیاندا پێشکەشیان کرد، پێشکەشکردنی ئەم ژمارە شەهیدەش بەڵگە بوو لەسەر دژواری شەڕەکە و نەبەردی موسڵمانان و ڕووبەڕوو بوونەوەیان بۆ شەهیدی (خوا لە هەموویان ڕازی بێت).[٤]

## ج- ڕاوەدوونانی دوژمن و دۆڕاوان:

سەعد(ﷺ) فەرمانی دا بە ڕاوەدوونانی دوژمنانی دۆڕاو، بۆ ئەم کارەش قەعقاعی کوڕی عەمر و شەرحەبیلی کوڕی ئەلسەمط کندی دانا بۆ ڕاوەدونانی دۆڕاوان لە لای ڕاست و چەپی ڕووباری عەتیقەوە، هەروەها فەرمانی دا بە زوهرەی کوڕی لەحویە بە ڕاوەدونانی ئەوانەی لەگەڵ سەرکردەکەیان لە ڕووبارەکە بەڕیونەتەوە، فارسەکان بەستی ڕووبارەکەیان دووکەرت کردبوو تا موسڵمانان وەدوویان کەون، بەڵام زوهرە توانی بە سێ سەد سوارەوە بە ئەسپەکانیان بەربەستەکە تێپەڕێنن و فەرمانی دا بەوانەی کە توانایان نەماوە لە ڕێگەی ئەلقەنتەرە لابدەن، کە کەمێك دوور بوو، پاشان فارسەکانیان دیتەوە و جالینۆس کە یەکێك لە سەرکردە گەورەکانیان بوو بە نێو قەرەباڵغی خەڵکەکەدا ڕێی دەکرد و ئەوانیش دەیان پاراست،لەم کاتەدا زوهرە بینی و لەگەڵی بەشەڕهات و هەردوو لێدانەکە ناکۆك بوون و

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٣٨٨).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٣٨٨).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ التأريخ الاسلامي (١٠/٤٧٩).

دواتر زوهرە کوشتی و دەستکەوتەکانی برد و دواتر موسڵمانان کەوتنە ڕاوەدونانی فارسەکان و ژمارەیەکیان لێ کوشتن و پاشان لەگەڵ موسڵمانان لە قادسیە ئێوارەیان کردەوە.[1]

## د- مزگێنیەکانی سەرکەوتن دەگاتە عومەر (ﷺ):

سەعد (ﷺ) نامەیەکی بۆ عومەر(ﷺ) نووسی و هەواڵی ئەم ڕزگاریخوازانەی بە نامەکەدا لەگەڵ سەعدی کوڕی عومەیلەی فەزازیدا نارد کە لە نامەکەدا هاتووە: پاش ئەوە خوای گەورە سەرکەوتووی کردین بەسەر فارسەکاندا، ئەو سونەتەی پێ بەخشین کە پێشتر بە شوێنکەوتووانی ئاینەکەیان بەخشیووە، ئەویش پاش جەنگێکی درێژخایەن و هەژانێکی سەخت و دژوار، کە بە کەل و پەلێکی جەنگی واوە ڕووبەڕووی موسڵمانان بووبوونەوە کە گێڕەرەوان وەك ئەم وشەداریەیان نەگێڕاوەتەوە (واتا ڕێژەکەی) خوای گەورە بەمە سوودمەندی نەکردن بەڵکو لێی ستاندنەوە و لێی گواستنەوە بۆ موسڵمانان و موسڵمانان لەسەر ڕووبار و کەناری دارستانە چڕەکاندا دوایان دەکەوتن، لە فیجاجدا، لە موسڵمانان سەعدی کوڕی عوبەید و فلان و فلان و فلان کەسی قورئان خوێن و چەند پیاوێکیش لە موسڵمانان کە نایان ناسین شەهید بوون خوای گەورەش پێیان زانایە، ئەگەر شەو دەهات بەسەریاندا بە قورئان دەنگیان دەدایەوە وەك هەنگ، بە ڕاستی ئەوانە مرۆڤی شێر و نەبەرد بوون و شێرێك لە هاوشێوەیان نیە، ئەوەی کە لێیان ماوەتەوە لەوانە کارزانتر نیە بە کارزانی شەهادەت نەبێت جگە لەوەی کە لە چارەیان نەنووسراوە،[2] لەم نامەیەشدا چەندین پەند و وانە هەن لەوانە:

- ئەوەی وەری گرتبوو لە چێژی یەکتاپەرستی و گەورەیی خوا و پاکی لە گۆڕانی کەسەکان و تین و هێزی، پاشان سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا کە لە ویستی خوای تاك و تەنها بوو نەك لە هێزی موسڵمانانەوە، لەگەڵ ئەو هەوڵەی دایان لە جهادی پارێزەر و قوربانیدانی بەرز و بڵند.
- هێزی دوژمنان زۆر گەورە بوو: مانەوەیان دەستکەوتی بۆ مرۆڤ نەبوو، بەڵکو هەموو ئەمانە بۆخودا بوو، هەر ئەو خودایەوە، کە ڕێگەی بەدوژمنان نەدا سوود لەهێزەکەیان وەربگرن، هەر ئەو خودایە بوو سەرکەوتنی بەخشیە موسڵمانان، بەڵکو مرۆڤ تەنها هۆکارێکەو خوای گەورە لەسەر دەستی ئەوان سوود و زیانەکان بەڕێ دەکات، تەنها ئەوخودای پاك و بێگەردەیە، کە دەتوانێت پاڵ بە زیانەکانەوە بنێت و سوودەکان کۆبکاتەوە، بەم شێوەیە سەعد(ﷺ) لە مانای یەکتاپەرستی تێگەیشتبوو، لە ژیانێدا لەگەڵ سەربازەکانی وەدی هێنابوو.
- ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین کە سەعد لە پەیامەکەیدا وەسفی هاوەڵانی (خوایان لێ ڕازی بێت) دەکات لەگەڵ ئەوانەش لەگەڵیدان لە تابعین و پێشکەوتن لە پەرستش و نەبەردیدا، ئەوان بەندەگەلێکن شەو دەنگێکی تایبەتیان بە قورئان هەیە وەك دەنگ و گیزەی هەنگ نەماندوو دەبن، لە ڕۆژیشدا سوار چاکن شێری ڕاو و لە پێشڕەوی و دامەزراویدا ناگاتە ئاستی ئەوان،[3] عومەر(ﷺ)

---

١ـ تأريخ الطبري (٣٨٩/٤).
٢ـ تأريخ الطبري (٤٠٨/٤).
٣ـ التأريخ الاسلامي (٤٨١/١٥).

سوارەکان لە خەڵکی قادسیە ئاگادار دەکاتەوە لەو دەمەی کە ڕۆژیان لێ دەبێتەوەتا نیوەشەو، پاشان دەگەڕێتەوە نێو ماڵ و کەسەکانی، کاتێك دەگاتە مزگێنی گەیەنەرەکە لێی دەپرسێت: لە کوێوە؟ ئەویش هەواڵی پێ دەدات، ئەویش دەفەرمووێت: ئەی بەندەی خودا قسەم بۆ بکە ئەویش دەڵێت: خوای گەورە دوژمنانی سەر شۆڕ کرد، عومەر بە پەلە لەگەڵی دەڕوات و هەواڵی لێ وەر دەگرێت، ئەوی ترش ئەوەتا بەسەر حوشترەکەیەوە عومەر ناناسێت تا دەڕواتە مەدینە ئەو کاتە خەڵکی بە ئەمیری باوەڕداران سەلامی لێ دەکەن و دواتر سەعدی کوڕی عومەیل فەرمووی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت تۆ هەواڵت پێ نەدام کە ئەمیری باوەڕدارانی، ئەویش لێرەدا دەفەرمووێت: گوێ مەدە براکەم.[1]

لەم هەواڵەشدا چەندین پەند و ئامۆژگاری هەن لەوانە:

- بایەخی گەورەی بەم شەڕە ئەمەش وای لێدەکات ڕۆژانە بڕواتە دەرەوەی شار بەڵکو ئەو سوارانە ببینێت کە لە عێراقەوە دێن هەتا هەواڵی موسڵمانانیان لێ پرسیار بکات لەگەڵ دوژمنانیان، عومەر دەیتوانی کە جگە لە خۆی کەسێکی تر بۆ ئەم کارە دەست نیشان بکات و هەواڵەکەی بۆ بهێنێت، بەڵام ئەو غەم و پەژارە گەورەی کە ئەو بۆ موسڵمانانی هەڵگرتبوو بواری پێ نەدەدا کە ئەو کارە بکات، لێرەشدا لوتکەی میهرەبانی و هەست کردن بە بەرپرسیارێتی دەردەکەوێت.
- خۆ بە کەم زانینێکی زۆر لە عومەرەوە عومەر (ﷺ)بەردەوام بە پیادە لەگەڵ سوارەکەدا ڕێ دەکات و داوای هەواڵی شەڕەکەی لێ دەکات، پەیام هێنەرەکە نایەوێ بە دوور و درێژی هەواڵی پێ بدات هەتا دەگاتە لای ئەمیری باوەڕداران، نازانێ کە ئەو لەگەڵیدا دەڕوات و لەگەڵی دەدوێت، هەتا ئەمە لە خەڵکی مەدینەوە زانی، ئەمەش ڕەوشت و ڕەفتارێکی بەرزە کە مافی موسڵمانان خۆیانە کە جیهان لە مێژووی دوور و درێژیان شانازیان پێوە بکات، بەڵگەهێنانەوەی پێ بکەن لەسەر گەورەیی ئەو ئاینەی کە کۆمەڵێك لە پیاوانی وەك عومەری لە دادپەروەری و بەخشندەیی و بە جەرگ و خۆ بەکەم زانی بەرهەم هێناوە.[2]

## پێنجەم: پەند و سوود و ئامۆژگاریەکان:

### ١- مێژووی شەڕەکە و شوێنەواری لە بزاڤی ئازادیخوازیدا:

مێژوونووسان هاودەنگ نین لە دیاری کردنی مێژووی شەڕەکە، مامۆستا أحمد عادل کمال بە دواداچوونێکی باشی بۆ هەیە کە تیایدا گەیشتۆتە ئەوەی کە ئەم شەڕە لە مانگی شەعبانی ساڵی (١٥)ی کۆچیدا بووە،[3] ئەم وتەیەش من بە لایدا بادەخۆمەوە، گومانی تێدا نیە کە قادسیە ترۆپکی جەنگە یەکلایی کەرەوەکان لە مێژووی جیهاندا، ئەمەش چەند جۆرێك لە جێنشینکاریەکانی ئیمانداری ڕاستەقینە لە لایەن خوای گەورەوە ڕوون دەکاتەوە — کە لەسەرکاریگەری ئەوە دەروازەکانی

---

١ـ تأريخ الطبري (٤٠٨/٤).
٢ـ التاريخ الاسلامي (٤٨٨/١٠).
٣ـ القادسية (٢٦٦)، التاريخ الاسلامي (٤٨٨/١٠).

عێراق ئاوەڵا بوو وە لە پاش عێراقیش تەواوی ناوچەی فارس، ئەمەش هەر ئەوە بوو کە سەرکەوتنی موسڵمانان لێیەوە هێنایەوە، لەگەڵ خۆیشیدا لە هەردوو لایەنی سیاسی و جەنگیەوە شکستی ساسانیەکانی هێنا و شکستی مەجووسیەکانی لە هەردوو لایەنی ئاین و بیروباوەڕەوە بە هەمان شێوە هێنایە گۆڕێ ، لێرەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلام تێکەڵ بە وڵاتی فارس و ناوچەکانی دەوروبەری بوو، هەر لە جەنگی قادسیەدا موسڵمانان شانو شکۆی مەجووسیەکانیان بە جۆرێك شکاند کە هەرگیزا و هەرگیز نەگیرسێتەوە، بەمەش قادسیە مافی خۆی بوو کە شوێنی خۆی لە لوتکەی جەنگە یەکلایی کەرەوەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دابنێ.[1]

## ٢- وتارێکی عومەری پاش ڕزگارکردنی قادسیە:

کاتێك عومەر(ﷺ) هەواڵی ئەم ڕزگاریەی پێ گەشت وتارێکی بۆ خەڵکی دا و هەواڵی ئەم ئازادکردنەی بۆ خوێندنەوە و فەرمووی: من سوورم لەسەر ئەوەی کە لە پێویستیەك نەگەڕێم تا بەجێی دێنم من هەندێکمان بە هەندێکی ترم بەرفراوان ناکەم، ئەگەر ئەمە لێمان دابڕا نیگەران بووین لە ژیانماندا هەتا لە توانا و لێهاتنندا یەکسان بووینەتەوە. خۆزگەم خواستووە کە ئێوە لە دەروونی من ئاگادار بن بە وێنەی ئەوەی بۆ ئێوە دووچار بووە وە من لەو شتەدا بە کار و کردار نەبێت، سوێند بە خوا پادشایەك نیم کە ئێوەم کردبێتە کۆیلە، بەندەیەکی خودام و ئەم ئەمانەتەم خراوەتەسەرشان، ئەگەر سەرپێچیم کرد (واتا خۆم بە پاکی گرت لە داهات و ماڵی خەڵکی)و گەراندمەوە بۆتان و شوێنتان کەوتم هەتا تێر دەبن لە ماڵەکانی خۆتان و بینیان من بەختەوەر بووم، ئەگەر من چوومە ژێر باری و کەوتمە شوێنی بۆ ماڵی خۆم ئەوا بەد بەخت بووم، من کەمێك بەختەوەر و زۆرێك دڵگیر بووم، ماومەتەوە نە قسە دەکەم و نە وەڵام دەدەمەوە چونکە سەرزەنشت دەکرێم.[2]

## ٣- وەفا لای موسڵمانان، و دادپەروەریش دەرفەتی تێدا نیە:

سەعد(ﷺ) نامەیەکی تری نوسی بۆ ئەمیری باوەڕداران(ﷺ)، سەعد لەم نامەیەدا داوای فەرمانی کرد سەبارەت بە بەڵێن پێدراوانی عەرەبی عێراق ئەوانەیان کە لە حاڵەتی لاوازی دەسەڵاتی موسڵمانان بەڵێن و پەیمانیان تێك شکاندووە، لەبەر ئەوە عومەر(ﷺ) وتارێکی بۆ خەڵکی دا و فەرمووی: بە ڕاستی هەر کەس کار بە ئارەزووی خۆی و تاوان بکات ئەو بەدبەخت دەبێت و جگە لە خۆی کەسی تر زەرەرمەند نابێت، هەرکەس دوای سوونەت بکەوێت و خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ دەستوورات و پابەند بێت بە ڕێگەی ڕاست و دروست بگرێتەبەر داواکردنی ئەو شتانەی لای خودایە بۆکەسانی ملکەچ ئەوا کارەکەی خۆی پێکاوە و بەختەوەر بووە، ئەمەش بەوەی کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ (الكهف: ٤٩).

ئەوانەی کە خاوەنی ڕۆژگار و پیرۆزیەکان بوو بەوەی، کە پێیان سپێردرابوو سەرکەوتن،

١ـ الطريق الى المدائن (ص: ٤٧٣، ٤٧٤).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٠٩).

خەڵکەکانیشی سەربەرز بوون، بەدەمی ئەو کەسانەوە چوو کە لەسەر پەیمانی خۆیان مابوونەوە، ڕای ئێوە چیە سەبارەت بە یەکێکی تریش دەروازەگەراوە و ترسێکی نەڕەساندوە، سەبارەت بە کەسێك، کە ڕەساندوویەتی و لە هیچ شتێك نەگەراوەتەوە و نەترساوە، سەبارەت بەوانەی کە خۆیان بە دەستەوە داوە؟ ئەوانیش کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە وەفا بۆ ئەو کەسەیە کە ڕەساندوویەتی و وەستاوە و زاڵبوونی زۆری نەکردووە بە چاکە نەبێت، هەرکەس کە بانگەوازی کردبێت ڕاستی کردووە یان وەفادار بووە و شوێنیان دیار بووە، ئەگەر درۆش بکات ئەوا بۆیان فەرامۆش کردوون و ڕێککەوتنەکەی خۆیان دووبارە کردۆتەوە، کاری ئەو کەسانە دروست بێت کە گەورەییان لەگەڵ نواندوون چونکە ئەگەر بیانەوێ بانگیان بکەن وە ئەوان زامنیان هەیە، ئەگەر ویستیان تەواو دەبن لەسەر بەرگرتنیان لە زەوی و زارەکانیان وە جگە لە جەنگ هیچی تریان مەدەنێ، هەڵیان بژێرن کە کامیان کارەکەی خۆیان ڕەساندووە و پاداشتی داوە بە دەستەوە هەتا جەنگ، هەڵیان بژێرن کە کامیان کارەکەی خۆی ڕەساندووە و پاداشتی داوە بە دەستەوە یان سەر بەرزی و هەروەها جوتیارانیش.[١]

## پەند و ئامۆژگاریەکانی ئەم وتارە:

-عومەر(ﷺ) کاری بە بنەمای ڕاوێژ دەکرد و لە هەموو کارە گرنگەکانیدا ڕاوێژی بە خەڵکانی خاوەن ڕا و بۆچوون دەکرد، لەگەڵ ئەوەی کە عومەر بەوە ناسرابوو کە خاوەن زانیاری و زانستی بە پیت و ڕای پتەو بووە، ئەم ڕەفتارە بەرزەشی لە هۆکارە گەورەکانی سەرکەوتن بووە لە بەڕێکردنی سیاسەتی ئومەتدا.

-سوود وەرگرتن لەم پێشەکیەی کە عومەر(ﷺ) لە نێو دەستی ڕاوێژکارانیدا پێشکەشی کرد بۆ جۆرێك باسی یاران (خوایان لێ ڕازی بێت) دەکات بەکە یازو دڵەکانیان تەنها بۆ خوایە، بەردەوام دەژین بەو بەرنامە بەهێزەی کە پێغەمبەر(ﷺ) کردوویتی بە سوننەت، هەر کەس ئەم کارەی کرد خۆی پاراستووە لە کەساسی لە فەرمان و ڕاستی پێکاوە و سەرکەوتووە لە بەدەست هێنانی پاداشتی خوداییدا،[٢] عومەر ئەم ڕاوێژەی بە وتارێك کورت کردەوە و ڕووی کردە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) وفەرموی :لە پاشدا، خوای گەورە لە هەموو شتێکدا دەرفەتێکی داناوە تەنها لە دوو کاردا نەبێت: دادپەروەری و سیرە و لە یادکردنەوەدا، دیارە یادکردنەوە دەرفەتی تێدا نیە، بە زۆری نەبێت لێی قایل نەبووە، بەڵام دادپەروەری هیچ دەرفەتێکی تێدا نیە چ لە دوور و نزیك، چ لە خۆشی و ناخۆشیدا، دادپەروەری —ڕای من نەرمە— بەهێزتر و خامۆشترە بۆ ستەم، بێدەنگترە بۆ ناڕەوایی لە ستەم، ڕای من توند و ڕەوانەیە و فەوتێنەری بیرە، هەر کەس تەواو بوو لەسەر پەیمانی خۆی لە عەرەبی عێراق و هیچی نەکردە مەبەست لەسەرتان ئەوا دەبێت زامنیان بۆ بکرێت و سەرانەیان لێ وەگرن بەڵام هەرکەس پڕوپاگەندەی ئەوەی کرد کە زۆری لێ کراوە لەوانەی کە سەرپێچیان نەکردووە ئەوا بە

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٤١٠).
٢ـ التأريخ الاسلامي (٤٨٥/١٠).

ڕاستیان مەزانن مەگەر خۆتان بتانەوێت، ئەگەر نەتان ویست ئەوا فەرامۆشیان بکەن و بیان گەیەننە شوێنی ئارامشیان،[١] لەمەشدا کاردانەوە و پەند و ئامۆژگاری هەیە لەوانە: دادپەروەری لە حوکمدا بریتییە لە پایەیەکی گەورە بۆ مانەوەی حوکمی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئارامی و ئاسایش و خۆشگوزەرانی لە وڵاتی موسڵماناندا، ئەمە لە دونیا و لە دوارۆژیشدا هیچ هەڵهاتنێك لە سزا بۆ ستەم کاران نیە، لەبەر ئەوەی کە مافی خودایی خوای گەورە بۆ بەندەکەی لێی دەیەوێت و تێیدەپەڕێنێت، مافی خەڵکیش ئەوا خوای گەورە ستەمکار و ستەم لێکراو ڕادەگرێت و تۆڵەی هەندێکیان لە هەندەکەی تریان دەکاتەوە، بەڵام یادی خودا پێویستە کە ژیانی مرۆڤی موسڵمان بگرێتەوە لە دڵ و زمان وئەندامەکانی لاشەیدا، ئەو کاتە بیرکردنەوەی پوخت بۆ خودا دەبێت، مەنتیقیشی لەوەی کە کارەکانی لە پێناو خودا قایلی دەکات، غەمی گەورەی ئەو دەمە ڕەساندنی یادی خوای گەورە و باڵادەست دەبێت بە شێوەی کردار و گوفتار و بیروباوەڕ لەسەر زەویدا، ئەگەر بێت و مرۆڤ بەم شێوەیە بێت ئەوا خوای گەورە لە شوێنی گومان و ئارەزووەکان دیپارێزێت هەر بۆیە سەعد و ئەوانش لە موسڵمانان کە لەگەڵیدا بوون ئەم ئامۆژگاریانەی عومەریان بە هەند وەرگرت و ئەوەیان خستە بەردەم ئەوانەی کە بە دەوریانەوەن و گەورە بوون کە بگەڕێتەوە و لەبەردەماندا مشتێك لەخەروارێك ڕەحمەت و ئولفەی دڵەکان بەدی دەکەین، کەکاریگەری هەبووە لەسەر ئەم مامەڵە بەڕێزە و ئیسلام و موسڵمانانی لای ئەو خەڵکە پەیمان شکێنانە خۆشەویست کردووە و پاش ئەمە بە چەند قۆناغێك هاتوونەتە ژێر سایەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بوونەتە شوێنکەوتووە دڵسۆزەکانی.[٢]

## ٤- پێنج یەك لەقادسیەدا عومەر گێڕایەوە سەر جەنگاوەران و خەڵاتی باشی دایە:

عومەر(رضي الله عنه) لە قادسیەدا پێنج یەکی گێڕایەوە بۆ جەنگاوەران، سەعدیش فەرمانی خەلیفەی بەجێ هێنا، هەوڵدانی عومەر لێرەدا هەوڵدانێکی زۆر لێهاتووانە بووە وەك لێهاتوویی هەوڵدانەکەی لە جێ هێشتنی زەویە کشتوکاڵیەکان بۆ خاوەنەکانیان، عومەر پێی وابوو کە ئەم کارە بەڕێ کردنێکە لەگەڵ بەرژەوەندی باڵای دەوڵەت کە ئەو پێنج یەکە دابەش بکرێت بەسەر موجاهیداندا، وەك هاندەرێك بۆیان و گوشادیەك لەسەریان و دان نان بە هەوڵ و کۆششیان.[٣] عومەر چوار شمشێر و چوار ئەسپی نارد بۆ سەعد، هەتا وەك خەڵاتێك بیداتە ئەو کەسانەی کە لە جەنگی عێراقدا دووچاری نەهامەتی بوونەتەوە، پاشان شمشێرەکان درانە چوار کەس، کە سیانیان لە تیرەی بەنی ئەسەد بوون کە : جمالی کوڕی ملك و ڕەبیلی کوڕی عەمری کوڕی ڕەبیعەی والین، و طلیحەی کوڕی خوەیلەد و چوارەمیش بۆ عاصمی کوڕی عەمری تەمیمی بوو، ئەسپەکانیشی بەخشیەوە و یەکێکیانی دایە قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی و سیانەکەی ترشی دایە یەربووعیەکان وەك خەڵاتێك بۆیان لەسەر

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/ ٤١٠).

٢ـ التأريخ الاسلامي (٤٨٧/١٠).

٣ـ أمير المؤمنين عمر بن الخطاب الخليفة المجتهد للعمراني (ص: ١٦٣).

ڕووداوی شەوی ئەغواس،[1] ئەمەش لەکارە گەورەرە عومەریەکان بوو بۆبەهێز کردنی وزەی موجاهیدان و هاندانی ورەی موسڵمانان بەرەو سەرکەوتن و ئامانجە بەرز و مەبەستە تایبەتەکان.

## ٥- عومەر بایەخی بۆ زوهرەی کوڕی ئەلحویە گێڕایەوە:

زوهرە لە ڕاوەدونانی فارس گەڕایەوە پاش ئەوەی، کە جالینۆسی کوشت کەیەکێك بوو لە سەرکردەکانی فارس ، پاشان زوهرە دەستەکەوتەکانی جالینۆسی برد و بەو شێوەیەش پۆشی کە ئەو دەیپۆشی لەبەر ئەوە ئەو دیلانەی کە لای سەعد بوون ناسیانەوە و وتیان ئەوە دەستکەوتەکانی جالینۆسن سەعدیش فەرمووی: ئایا لەسەر ئەم کارەت کەسێك هاوکاری کردی؟ ئەویش وتی: بەڵێ، سەعد فەرمووی: کێ؟ زوهرە وتی: خوای گەورە (الله) زوهرە ئەو دەمە لاوێك بوو توانایەکی تایبەتی خۆی هەبوو لە جاهیلیەتدا ڕیسوا بووبوو وە لە ئیسلامیشدا چارەنووسێکی باشی هەبوو، سەعد لەوەی کە زوهرە پەلەی کردووە لە پۆشینی جلەکانی جالینۆس زۆری پێکرد و لێی داماڵی و پێی فەرموو: ئایا نەدەبوو کە چاوەڕوانی مۆڵەتم بکەیت؟[2] ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر، ئەویش پیاوێکی نارد بۆ لای سەعد و پێی فەرموو: ڕوو بکەرە زوهرە ئەو خوازیاری چاکەی بوو بەو شێوەیەی کە خوازیاری پێی نەبووبوو، لەسەر تۆ و لە جەنگەکەتدا هەر ئەوەیە کە ماوەتەوە — تۆ گەورەیی ئەو پیاوەو دڵی دەشکێنی ، دەستکەوتەکانی بۆ بگێڕەوە، لە کاتی بەخششەکاندا فەزڵی بدە بەسەر یارانیەوە بە(٥٠٠) درهەم، سوێندم خواردووە کە هەر کەس بێباوەڕێك بکوژێت کە دەستکەوتەکانی ببات بۆ خۆی، سەعدیش دەستکەوتەکەی بۆ گێڕاوەتەوە و زوهرە فرۆشتی بە (٧٠) هەزار درهەم،[3] بەم شێوەیەش عومەر بایەخ و باوەڕپێکرانی گێڕایەوە بۆ زوهرە.[4]

## ٦- شەهدیبوونی بانگ بێژ و کێ بەرکێ کردنی موسڵمانان لەسەر بانگدان:

لە کۆتایی ڕۆژانی جەنگی قادسیە کارێکی سەرسوڕهێنەر ڕوویدا کە بەڵگە بوو لەسەر بایەخی موسڵمانە پێشینەکان بە کاری ئاینیان و ئەوەی کە لە خودا نزیکیان دەکاتەوە، بانگ بێژی موسڵمانان لەو ڕۆژەدا کوژرا و کاتی نوێژ هاتە پێشێ، موسڵمانان لەسەر بانگدان بوو بە کێ بەرکێیان تا گەیشتە ئەوەی کە بە شمشێر یەکتری بکوژن، بۆیە سەعد تیر و پشکی لە نێواندا کردن، پاشان تیری پیاوێك دەرچوو کە دواتر بانگی خوێند،[5] دیارە کێ بڕکێش لەسەر ئەم کارە باشە بەڵگەیە لەسەر هێزی باوەڕ، چونکە بانگدان لە پشتیەوە هیچ دەستکەوتێکی دونیایی و وەجاغزادەیی و شۆرەت نیە بەڵکو ئەوەی کە هانیان دەدات بۆ بانگدان ئەوەیە کە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا پاداشتێکی گەورەی ئامادەکردووە بۆ بانگ بێژ، هەر نەتەوەیەك کێ بەرکێیان لەسەر بانگدان کرد ئەوا لەسەر ڕێگەی

---

١- خلافة الصديق والفاروق للثعلبي (ص: ٢٥٣).
٢- تأريخ الطبري (٣٩١/٤).
٣- هەمان سەرچاوە.
٤- القادسية (ص: ٢٠٤).
٥- تأريخ الطبري (٣٩٠/٤).

یەکەمیش کێ بڕکێ دەکەن و دەبێت چی لەوە گەورەتر بێت ،ئەمەش لە هۆیەکانی سەرکەوتنیانە لە جیهاد لە پێناو خوای گەورە و بانگەواز بۆ ئیسلام.[١]

## ٧- پیلانی سەربازی ئیسلامی لە شەڕەکەدا:

بە ڕاستی جەنگی قادسیە نموونەیەکی دیار بوو لە نموونەکانی تەکنیکی سەربازی ئیسلامی بە جۆرێك موسڵمانان تیایدا لێهاتوو بوون بە دڵسۆزی ئەو مانۆڕە تاکنیکیەی کە لەگەڵ هەموو حاڵەتێکی جەنگیدا دەگونجا لە جەنگەکاندا، بەڕاستی لەسەر تەختی شانۆی ڕووداوەکان توانای عومەر لەسەر کۆکردنەوەی گشتیان بە سەربازگرتنی زۆرەملێ و کۆکردنەوەی بەرزترین هۆکارەکان، بە جۆرێك کە خەلیفە بۆ ئەم جەنگە زۆرترین ژمارەی جەنگاوەری کۆکردەوە، هەروەها بۆ ئەم جەنگە گروە و دەستەیەکی هەڵبژێراوی لە جەنگاوەرانی موسڵمان کۆکردەوە، عومەر نامەیەکی بۆ سەعد نووسی و داوای لێکرد، کە خاوەن ئەسپ و وڵاخ و چەك و تفاق و ڕا و بۆچوون و هێز و دەسەڵاتەکان هەڵبژێرێت، سەعد لەم جەنگەدا حەفتا و هەندێك لەو جەنگاوەرانەی کۆکردەوە کە ئامادە و بەشداری جەنگی بەدر بوون، لەگەڵ سێ سەد و چەند کەسێك لەوانەی کە پاش بەیعەتی ڕزوان هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ)یان کردووە و سێ سەد کەسیش لەوانەی ئامادەی فەتحی مەککە و حەوت سەد کەسیش لە بنەماڵەی یاران، پاشان ئەو لە هیچ سەرکردە و خاوەن ڕا بۆچوون و دەسەڵاتدار و وتاربێژ و شاعیرێك نەگەڕا و هاویشتنیە نێو شەڕەکە، فڕێیدان بە ڕووی خەڵکەکەدا و لە خۆیایی کردن، ئەمەش ئەو کۆبوونەوە بەرزە بوو بۆ هۆکارە مادی و مەعنەویەکانی جەنگەکە، لە کۆبوونەوەی ئەم هۆکارانەش بۆ جەنگەکە ئەوە بەدی دەکەین، کە نوێ بوونەوەیەك هەیە کە ئێمە پێشتر لای موسڵمانان نەمان بینیوە، بە جۆرێك سەعد لە(صرار) چاوەڕوانی نەکرد هەتا سوپاکەی تەواوکاری بۆ بکات پاشان بەرەو عێراق ملی ڕێگای پێ بگرێتەبەر، بەڵکو بە چوار هەزار سەربازەوە گەیشتە شوێنی جەنگەکە لە قادسیە لە کۆی حەڤدە هەزار، ئەمەش ڕێگەیەکی داهێنراوە لە کۆکردنەوەی سوپایەك کە موسڵمانان پێش عومەر کۆیان نەکردۆتەوە، عومەر لە نامەکانیدا شوێنی جەنگی چارەنووس ساز و یەکلاییکەرەوەی بۆ هەریەکە لە موسەننا و سەعد دیاری کرد، کە جەنگی قادسیە بوو، عومەر یەکەم سەرکردەی موسڵمانان بوو کە (پەیامی نەخشەداری) لە بەدواداچوون و پەخشکردنی بۆ زەوی جەنگەکە کۆکردەوە، بە جۆرێك داوای لە سەعد کرد کە لە نامەیەکی دوور و درێژدا وەسفی شوێنی موسڵمانان -یان پێگەکانیان- بۆ بکات بە جۆرێك کە عومەر بە چاوی خۆی سەیری دەکات، لە کاری ئەوان- واتا موسڵمانان- لەسەر ئاشکرایی دابنێت، سەعد نامەیەکی بۆ عومەر نوسی و تیایدا- بەدوور و درێژی- باسی جوغرافیەی قادسیەی کرد (لە نێوان خەندەق و عەتیق)دا و ئەوەش دەکەوێتە لای ڕاست و چەپی پاشان بارودۆخی ئەو ژینگەیەی بۆ باسکرد کە دەوری زەوی جەنگەکەی داوە و ئاگاداری کردەوە لەوەی کە خەڵکەکەی دوژمنانی موسڵمانانن، خەلیفەش لەسەر بنەمای ئەم زانیاریانە بڕیاری

---

١ـ التاريخ الاسلامي (٤٨٠/١٠).

تاکتیکی ستراتیژی خۆی دەرکرد،[١] موسڵمانانیش ڕەفتاری پەلاماردانی هاوکاری پووچەڵ کردنەوەی دوژمن لە سەرەتای گەیشتنیانەوە بۆ زەوی دوژمن و بنکە دانایان تیایدا، ئەم پەلامارە هاوکاریانەش سوودی لە بەربەستی پێویستیەکانی سوپا کردوە لە هاریکاری کردندا، ئەمەش لە ڕۆژی ئەباقر و ڕۆژی حیتان و چەند ڕۆژێکی تر و پەلامارەکان بووە ،سەرباری ئەم ڕووە هاریکاریەی ئەم پەلامارانە ڕوویەکی تری گرنگی گرتوە، کە بریتیە لە پووچەڵ کردنەوەی وزەی دوژمنان و توانای خەڵکی لەسەر بارهەڵگری شوێنەواری جەنگی و یارمەتی دانەکانی، موسڵمانان شێوازی پارتیزانیان لەپەلاماردانەکانیان لەگەڵ فارس پێش قادسیە بەکاردەهێنا، لەپووچەڵ کردنەوەی توانای دوژمن و مەعنەویاتەکانی، بەکیری کوڕی عبداللە ی لەیثی بە دەستەیەك لە ئەسپ سوارانی موسڵمانانەوە لەگەڵ کۆمەڵێك ئەسپ دانا و لەسەر ڕێگەش بۆ ناوچەی (صەنین) واتا بۆ کاروانیەك کە خوشکێکی ئازادمەردی کوڕی ئازادبەی مرزبانی حیرەی لەخۆگرتبوو، کە باڵی دەکردەوە بۆ خاوەنی ئەلصەنین لە دەسەڵاتدارانی عەجەم، کاروانیەکە نەدەگەیشتە شوێنی پەنهان هەتا موسڵمانان بەجێیان دەهێشت، بەکیر پتەوی (شێرزادی کوڕی ئازادبەی) برازاوای شکاندن وە لەسەر ئەو ئەسپەکەی کە لە پێشی کاروانیەکەوە بوون وە ئەسپەکە هەڵهات و هەر کەسێکی بەسەر پشتیەوە بوو فڕێیدا، موسڵمانانیش باری کاروانیەکە و کچەکەی ئازادبە و سی لە ئافرەتانی بازرگان و سەد کەس لە شوێنکەوتەکان و ئەوەش کە لەگەڵیدا بوون و نرخەکەی نازانم گرت،[٢] موسڵمانان لەم جەنگەدا شێوازی تاکتیکی گۆڕاویان وەك هاودەنگیەك بۆ هەموو حاڵەتێك لە حاڵەتەکانی جەنگ دانا، بەوەی لە ڕۆژی یەکەمی جەنگەکەدا بەدیان دەکەین کە پەلاماری فیلەکان دەدەن و پاش ئەوەی کە بە ڕمەکانیان تیربارانیان دەکردن ناوپۆشەکانیان دەقرتاندن بەم شێوەیە فیلەکان لە گۆڕەپانی جەنگەکە هەڵدەهاتن تا موسڵمانان هاریکاریان لە شامەوە پێدەگات، پاشان پەنا بۆ فێڵێکی تاکتیکی لێهاتووی تر دەبەن بەوەی کە حوشترەکانیان بە شێوەیەك دەرازاندەوە کە لە فیل و پاشان بەڕەڵایان دەکردنە نێو ڕیزەکانی دوژمن و ئەسپەکانیان ڕادەچڵەکێن و هەڵدەهاتن و لەسەر هیچ شتێك نەدەگەڕانەوە، لە ڕۆژی سێیەم موسڵمانان کۆبوونەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فیلە پارێزراوەکانی فارس بە ئەسپەکانیان و پیادەکانیان، بەوەی کە هێرش بەرنە سەر فیلە گەورە و قەبەکەیان و چاوی کوێر بکەن و شفرەکانیان بقرتێنن، بەم شێوەیە فیلەکان هەڵدێن، هەردوو سوپای فارس و موسڵمانان لە گۆڕەپانی جەنگدا یەکسان دەبن، پاش ئەوەی کە فارسەکان فیلەکانیان لەدەست دەدەن — واتا زرێ پۆشەکانیان—کاتێك کە موسڵمانان بینیان کە ماوەی جەنگەکە دەکرێت درێژە بکێشێت بڕیاری هێرشێکی گشتیان دا ڕیزەکانیان ئامادە کرد و بەیەکەوە پەلاماریاندا، لە ڕیزەکانی دوژمن نەگەران هەتا دڵی ئەو ڕیزەیان ئاشکرا کرد کە ڕۆستەمی سەرکردەی سوپاکە ئامانجیان بوو، هەرکە زاڵ بوون بەسەر ڕۆستەمدا سوپای فارس بە شێوەیەکی خراپ تێك شکان، بەم

---

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٧١، ٢٧٢).
٢ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٧٣).

شێوەیە ئەو شێوازە بەدی دەکەین کە موسڵمانان لەم جەنگەدا دوی کەوتن و پابەند نەبوون بە شێوازە کۆنەکانەوە کە لە جەنگدا پەیڕەوی کرابوو بەڵکو هەر حاڵەتێك بەرگی تایبەتی خۆی دەپۆشی، لە شێوازە تایبەتەکانیشدا (زۆرانبازی) گوێزراوەتەوە بۆ چەند فێڵێکی تاکنیکی (حوشتری ڕازێنراوە و بڕینی ناوپۆشی فیلەکان و کوێرکردنی چاو و بڕینی شیفرەکانیان) بۆ جەنگی کلاسیکی فۆلکلۆری (هێرشی گشتی و بە ئامانج گرتنی سەرکردە) ئەم جەنگەش جیادەکرایەوە بە کۆکردنەوەی خاوەن سروشتە هۆزایەتیەکان، جیاوازی ئەم شێوازەش لەوەدایە کە لە نێوان هۆزەکاندا کێ بەرکێیەکی نایاب لە دڵنەگەرمی و پەلەکردن لە جەنگدا هەیە، و ئەمەش هەندێ لەو شێوازە سەربازیە ئیسلامیانەیە کە موجاهیدان لە شەڕی قادسیەدا گرتوویانەتەبەر.[1]

## ٨- ئەو شیعرانەی لە قادسیە وتران:

لەوانەی قەیسی کوڕی مەکشوم وتوویەتی باس لە سوارچاکی خۆی دەکات بە شانازیەوە لەوەی کە خۆی و موجاهیدانی تری تێدا بووە لە هەستان لە دژی سەرکردەکانی فارس و دەفەرمووێت:

جلبت الخيل من صنعاء تردي — بكل مدجج كالليث سامي[2]
الى وادي القرى فديار كلب — الى اليرموك فالبلد الشآمي
وجئنا القادسية بعد شهر — موسوعة دوابرها دوامي
فناهضنا هنالك جمع كسرى — وأبناء المرازبة الكرام[3]
فلما وإن رأيت الخيل جالت — قصدت لموقف املك الهمام
فأضرب رأسه فهو صريعا — بسيف لا أفل ولا كهام[4]
وقد أبلي الإله هناك خيراً — وفعل الخير عند الله فامي[5]

هەروەها بەشیری کوڕی ڕەبیعی خثعمی سەبارەت بە قادسیە دەفەرمووێت:

تذكر — هداك الله — وقع سيوفنا — بباب قديس المكر عسيرُ
عشية ود القوم لو أن بعضهم — يعار جناحي طائر فيطير
اذا ما فرغنا من قراع كتيبة — دلفنا لأخرى كالجبال تسير
ترى القوم فيها واجمين كأنهم — جمال بأجمال لهن زفير[6]

---

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٧٥).
٢ـ تردي الخيل: ترجم الاراضي بحوافزها.
٣ـ المرازبة: رؤساء الفرس.
٤ـ أفل:- مثلم، كهام! كليل لا يقطع.
٥ـ الادب الاسلامي، د. نايف معروف (ص: ٢٢٢، ٢٢٣).
٦ـ واجم:- من الوجوم وهو السكوت مع كظم الغيظ، الادب الاسلامي (ص: ٢١٥).

هەندێ لە شاعیرانیش دەڵێن:

وحيتك عني عصبة نخعيـــة — حسان الوجوه آمنوا بمحمـــــد
أقاموا لكسرى يضربون جنوده — بكل رفيق الشفرتين مهنـــــد
اذا ثوب الراعي أناخوا بكلكل — من الموت مسود الغياطيل[1] أجرد

هەندێ لە شاعیرانی تر دەڵێن:

وجدنا الاكرمين بني تميـــم — غداة الروع اكثرهم رجالاً
هموا ساروا بأرعن مكفهـــر[2] — كأسد الغاب تحبسهم جبالاً
الى لجي يرونهم رعـــــالاً — وبالخيفين أياماً طـــوالا
بحور للأكاسر من رجـــالٍ — برد حيث قابلت رجـــالاً[3]

ئەوەی کە نابغەی ئەلجەعبینی فەرموویەتی ئەوەیە کە بە شیعرەکەی تابلۆی ئەو مشت و مڕە دەکێشێت کە لە نێوان خۆی و خێزانەکەیدا ڕوویداوە، کە ئارامی نەگرتووە بە هۆی چوونی بۆ جەنگە ڕزگاریخوازەکانی فارس و دەفەرموویێت:

باتت تذكرني بالله قاعدة — والدمع ينهل من شأنيها سبلاً
بابنت عمي كتاب الله أخرجـني — كرها وهل أمنعن الله ما بـــذلاً
فإن رجعت فرب الناس أرجعـــني — وإن لحقت بربي فأبتغي بـــدلاً
ما كنت أعرج أو أعمى فيعذرني — أوضارعاً من ضني لم يستطع حولاً

## شەشەم: ئازادکردنی مەدائن:

سەعد ماوەی دوو مانگ لە قادسیە مایەوە چاوەڕوانی فەرمانی عومەر بوو، تا فەرمانی بە ڕووکردنە مەدائن بۆ هات، لەگەڵ بەجێهێشتنی ماڵ و منداڵان لە عەتیق لەگەڵ سەربازگەلێکی زۆر کە دەوریان بدەن، و سەعد بەڵێنی پێدان کە هاوبەشیان بکات لە هەموو دەستکەوتێك بە هۆی ئەوەی کە دەمێننەوە و ئاگایان لە ماڵ و منداڵی موسڵمانان دەبێت، سەعد ئەم کارەی ئەنجام دا و بە ڕۆژانی ماوەی مانگی شەوال ڕێگەی بە سوپاکەی دەبڕی، گروپ وتاقمی دۆڕاوان خۆی گەیاندە بابل، کە ژمارەیەك لە سەرکردە نەخشەسازەکانی سەر زریێ پۆشەکانیان لەگەڵ بوو، شار و گوندەکانی فارس یەك لە دوای یەك ئازاد دەکران و موسڵمانان ناوچەکانی ئەلبورس و پاشان بابلیان ئازاد کرد پاش ئەوەی لە ڕووباری فورات پەڕینەوە، دوای ئەوە چوونە نێو ناوچەکانی کوت و سابات و هەندێکیان بە زۆر هەندێکیشیان بە ئاشتی گرت، ئەم هەڵمەتە ڕێك و پێکەی موسڵمانان بەردەوام بوو تا گەیشتنە شاری

---

١ـ الغيطل:- النسور.
٢ـ ارعن مكفهر:- ظلمة الليل الشديدة.
٣ـ البداية والنهاية (٤٨/٧).

مەدائن، لەم کاتەدا عومەر فەرمانی دا بە سەعد کە مامەڵەی باش لەگەڵ جوتیارانی ناوچەکەدا بکات و پارێزگاری لە بەڵێن و پەیمانەکانیان بکات، بەم شێوەیەش ژمارەیەکی زۆر لە جوتیاران هاتنە ژێر سایەی بەڵێن پێدراوی موسڵمانانەوە، ئەم جوتیارانە بە ڕەوشت و دادپەروەری و یەکسانی هەڵقوڵاوی موسڵمانان لەو ئاینە پیرۆزەیان کاریگەربوون، چونکە ئەوان ئەمیرەکەیان لەبەرامبەر هەق و ڕاستی گەورەدا وەك بچووکترین خەڵك وایە، جەور و ستەم و خراپە کاری لەسەر زەوی نیە ئەمەش ئەو پایەماڵکردن و بەندایەتیەی کە ناویان دەبرد لە سەری سووك کردن و بوونە بەندەی خوای تاك و تەنها، دواتر سەعد بە فەرمانی ئەمیری باوەڕداران بەرەو مەدائن کەوتە ڕێ، سەرەتا سوپاکەی بە سەرکردایەتی زوهرەی کوڕی حدویە نارد، پاشان عبداللە کوڕی موعتەمی بە کۆمەڵێك لە سوپاکە و دوای ئەوە شەرحەبیلی کوڕی سەمطی لەگەڵ دەستەیەکی تردا نارد و دواتر هاشمی کوڕی عوتبەی ئەبی وەقاصی کردە جێنشینی خۆی لە بری خالدی کوڕی عورفطة،[1] زوهرەی سەرکردەی سەرەتای سوپاکەی ڕووی کردە شاری مەدائن، و مەدائینیش پایتەختی دەوڵەتی فارس بوو، دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەوە ئەو بەشەی دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاواوە ناسراوە بە (بەهورسیر) ئەو بەشەی دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتیەوە ناسراوە بە (ئەسبانیر) و (طیسفون)، زوهرە گەیشتە بەهورسیر و سەرەتا شارەکە گەمارۆ دا ، پاشان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بە سوپای ئیسلامیەوە کە هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاصی برازای لەگەڵ بوو بەرەو مەدائینی ڕۆژئاوا (بەهورسیر) کەوتەڕێ کە یەزدجەردی پادشای فارسەکانی لێ بوو، سەعد بۆ ماوەی دوو مانگ گەمارۆی دا، فارسەکان هەندێ جار بۆ جەنگی موسڵمانان لە شارەکە دەهاتنە دەرەوە بەڵام بۆیان جێگیر نەدەبوون لەم کاتەدا زوهرەی کوڕی حەویە بە تیرێك بریندار بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی کە بەرگێکی درز تێبووی لەبەر کردبوو، پێیان وت: ئەگەر کارت بەو درزە بکرادیە دەگیرایەوە (هەتا کونێکی وای تێدا نەبووایە کە تیری پێدا بڕوات) ئەویش وتی: بۆچی؟ وتیان: بۆ ئەوەی، کە بەمەوە لێت دەترسین، ئەویش وتی: من جوانمەردیم لەسەر ئەگەر تیری سواری فارسم بە تەواوی لەسەر جێ بهێڵێت، و پاشان لەم درزەوە هات بۆم بە جۆرێك لە جەستەمدا دابمەزرێت و بوەستێت، بەڵێ زوهرە هەر بەو شێوەیەی کە خوازیار بوو لەسەر خوداش جوانمەرد بوو، یەکەمین کەس بوو لە موسڵمانان کە ئەو ڕۆژە بە تیرێك بریندارر بوو، ئەم درزە تیایدا چەسپا و هەندێکیان وتیان: لێی دامالن ئەویش وتی: لێم گەڕێن دەروونی من هێشتا لەگەڵمدایە بەهۆی ئەوەی هەر لە جەستەمدایە ڕەنگە من لەوانەوە ڕووبەڕووی تانەیەك یان لێدانێك یان پلانێك ببمەوە، پاشان بەرەو دوژمن ڕۆیشت و بە شمشێرەکەی دای لە شەهریای (ئەزتەخەر) و کوشتی،[2] موسڵمانان ماوەی دوو مانگ لە گەمارۆی بەهورسیر مانەوە، لەم ماوەیەدا ژمارەیەك مەنجەنیقیان بەکارهێنا، ئەو فارسانەی کە هاوپەیمانیان بوون بری (٢٠) مەنجەنیقیان بۆ دروست کردن کە لەو ماوەیەدا فارسەکانیان پێوە سەرقاڵ کردبوو وە دەیان تۆقاندن،[3] لەمەشدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوەی

---

١ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٥٥).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥٤).
٣ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥٣).

کە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) دەستەبەرکردنی هۆکارەکانی سەرکەوتنی ماددیان پشت گوێ نەدەخست ئەگەر دەسەڵاتیان هەبووایە بەسەریدا، ئەوان لەسەر یادکردنەوەی تەواوی ئەو ئایەتە بوون کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾ (الانفال: ٦٠).

لەگەڵ لایەنی پێشکەوتنیان لە هۆکارەکانی سەرکەوتن واتە بە گرنگترینیان و دەرکەوتووترینیان تاك بوونەتەوە کە بریتیە لە پشت بەستن بە یاد و نزا و پاڕانەوەی خوا.[١]

## ١. خوای گەورە بە سەرکەوتن و پشتیوانی لەگەڵ دۆستانیەتی:

ئەنەسی کوڕی حەلیس دەفەرمووێت: کاتێك کە ئێمە لە بەهورسیر پاش کشانەوە و شکستیان گەمارۆ درابووین پیاوێك هات بۆ لامان و وتی: پادشاکەیان پێتان دەڵێت: ئایا دەتانەوێت رێك بکەون لەسەر ئەوەی کە ئەوەی لە نێوان دیجلە و چیاکەماندایە بۆ ئێمە بێت و ئەوەش کە لە نێوان چیاکەتان و دیجلەدایە بۆ ئێوە بێت؟ ئێوە ئەگەر تێر نەبووبن خوای گەورە سکتان تێر ناکات، خەڵکەکە داوایان لە ئەبو موفەرز ئەسوودی کوڕی قوتبە کرد کە لێی بڕواتە پێشێ و خوای گەورەش بە چەند وشەیەك هێنایە گۆ نە ئەویش و نە ئێمەش نەمانزانی چی بوو، پیاوەکە گەڕایەوە و ئێوەش ئەوانمان بینی کە ڕێگەی مەدائینیان گرتەبەر، واتە بە ڕووبارەکەدا بەرەو بەشی ڕۆژهەڵاتی مەدائن پەڕینەوە — ئێمەش وتمان: ئەی ئەبو موفەرز چیت پێ وت؟ ئەویش وتی: سوێند بەو کەسەی کە محمدی بە ڕاست ناردووە نازانم ئەوە چی بوو ئەوە نەبێت کە ئارام بوومەتەوە، من تکام وایە کە قسەی باشم کردبێت، خەڵکی هەر بەردەوام پرسیاران لێ دەکرد هەتا سەعد ئەمەی بیست و هات بۆ لامان و فەرمووی: ئەی ئەبو موفەرز چیت وت؟ سوێند بەخوا ئەوانە هەڵاتوو بوون، ئەویش هەر بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ کردکە لەگەڵ ئێمەی کردبوو، سەعد خەڵکەکەی بانگ کرد و پاشان کۆی کردنەوە، بەڕاستی مەنجەنیقەکانمان بوونەتە مایەی مەترسی بۆ سەریان، ئەو شارە کەسی تێدا نیە و کەسێك بۆمان نەهاتە دەرەوە جگە لە پیاوێك نەبێت کە داوای پارێزراوی لێ کردین و ئێمەش ژیانمان پاراست، پاشان وتی: ئەگەر کەسێکیشی تێدا مابێت چی بەرتان پێ دەگرێت؟ واتا کەسی تێدا نەماوە، پیاوان ڕاوێژیان پێکرد و ئێمەش ئازادمان کرد و هیچ شمەکێك و کەسێکمان نەبینی، جگە لە چەند دیلێك کە لە دەری ئەو شارە بەدیلمان کردن، پرسیاری ئەو پیاوەمان لێ کردن: کە بۆچی هەڵهاتن؟ وتیان: پادشامان کەسێکی نارد بۆ لاتان و ڕێککەوتنێکی خستە بەر دەمتان بەڵام ئێوە وەڵامتان دابوویەوە کە هیچ ڕێککەوتنێك لە نێوان ئێمە و ئێوەدا نیە هەتا هەنگوینی ئەفریزین بە ئوتروجی کونی نەخۆن، پاشان وتی: هاوار بەماڵم ئاگادار بن فریشتەکان بە زمانی ئەوان دێنە گۆ، بەرپەرچی ئێمە دەداتەوە و بە دەمی عەرەبەوە

---

١ـ التأريخ الاسلامي (١٦٣/١١).

دەچێت، سوێند بە خوا ئەگەر وا نەبێت ئەمە هیچێك نیە جگە لە شتێك کە خراوەتە سەر زاری ئەو پیاوە هەتا کۆتاییمان پێ بێت، بەم شێوەیە دوور کەوتنەوە بۆ شارێکی دوور و پەراگەندە بون.[1]

## ٢ـ ئەو ئایەتانەی کە سەعد لەکاتی نیشتەجێ بوونی لەنوتەکی سابات خوێندی:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) لە (نوتەکی سابات) نیشتەجێ بوو پاش ئەوەی کە هاشم لەگەڵیدا بەرەو بەهورسیر بەڕێکەوت کە بەشی ڕۆژئاوای شاری مەدائنە، کاتێك سەعد لەو شوێنە نیشتەجێ بوو ئەو ئایەتەی خوێند کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾ (إبراهيم: ٤٤).

سەعد دوای ئەم ئایەتە کەوت لەبەر ئەوەی لەمەدا شوێنێك هەبوو کە یەکێك لە نووسەرەکانی کیسرای تێدابوو کە پێیان دەوت بووان، ئەوان هەموو ڕۆژێك سوێندیان دەخوارد، کە پادشای فارس نەڕۆیشتایە ئێمە نەدەژیاین،[2] زوهرەی کوڕی ئەلحەویە پێش شەهیدبوونی بەزاندی و بلاوەی پێ کردن.[3]

کاتێك موسڵمانان چوونە نێو بەهورسیرەوە– تروسکاییەکی سپیان لێ دەرکەوت کە کۆشکەکەی کیسرا بوو – ضراری کوڕی خەتاب فەرمووی: الله أكبر ئەوە کۆشکی سپی کیسرایە، هەر ئەمەیە کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بەڵێنیان پێداوە وە بەردەوام بوون لە الله أكبر کردن تا ڕۆژیان کردەوە.[4]

## ٣– ڕاوێژی سەعد و سەربازانی لەسەر پەڕینەوە لە ڕووبارەکە:

کاتێك سەعد زانی کیسرا بەکەشتیەکانی پەڕیوەتەوە بۆ مەدائنی ڕۆژهەڵات و هەموو کەشتیەکانی داوەتە پاڵ خۆی سەعد لەم کارەیدا کەوتە پەرێشانیەوە، چونکە دوژمن لەبەر دەمیاندایە و هیچ لە نێوان ئەوان و دوژمناندا نیە جگە لەو ڕووبارە و بە هۆی نەبوونی کەشتیەوە هیچ ڕێگەیەکیش بۆ پەڕینەوە دەستەبەر نابێت، دەترسا لەوەی، کە دوژمنەکانی بڕۆن و پاشان زاڵ بوون بەسەریاندا دژوار بێت، لەم کاتەدا هەندێ خەڵکی فارس هاتنە لای سەعدو ڕێنموونیان کرد بە تەنگاوێك کە دەتوانن بە مەترسیەوە تێی پەڕینن، سەعد بەرپەرچی دایەوە و دوو دڵ بوو لەسەر ئەم کارە، پاشان ڕووبارەکە بە هەڵکشانێکی گەورە بە ڕوویدا هات تا ئاوی ڕووبارەکە ڕەش داگەرا و بە هۆی خێرایی ڕەوتیەوە بە کەفەکەی پەلی دەهاویشت، لەم کاتەدا سەعد خەوێکی باشی بینی کە کورتیەکەی ئەوە بوو ئەسپی

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥٥).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥١)، التأريخ الاسلامي (١١/١٦٠).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٦٠).
٤ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥١).

موسڵمانان لەو ڕووبارە پەڕیبوونەوە، سەعد بۆ گێڕانەوەی ئەو خەونە سوور بوو لەسەر پەڕینەوە لە ڕووبارەکە، لەبەر ئەوە خەڵکی کۆکردەوە و سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: بە ڕاستی دوژمنانتان لەبەر ئێوە دەستیان گرت بەم ڕووبارەوە ئێوەش لەگەڵیدا ئازاد نابن بۆی و ئەوان ئەگەر بیانەوێت ڕزگاریان لێتان دی چونکە بە کەشتیەکانیان پەلامارتان دەدەن و ئێوەش هیچتان لە پشتەوە نیە، کە بترسن لەوەی لێوەی بێن بۆتان، موجاهیدانی پێش ئێوەکۆتاییان پێ هێناون و دەروازەکانیان پەك خستوون و ئەوەی کە بەرگری لێ دەکەن لە ناویان بردوون، من لە ڕای خۆمدا وام بینیوە کە دەست پێشخەری لە جیهادی دوژمنانتاندا بکەن بە نیازی خۆتان پێش ئەوەی کە دونیا گەمارۆتان بدات، ئاگادار بن کە من سوورم لەسەر بڕینی ئەو ئاوە بۆیان، ئەوانیش هەموو بە یەك دەنگ وتیان: خوای گەورە ئارام و دان بەخۆداگرتنی بە ئێمەش و تۆش داوە لەسەر ژیری و تێگەیشتوویی بەوەش کاری خۆت بکە،[1] و لەم هەواڵەشدا چەندین پەند و ئامۆژگاری و وانە وەرگرتن هەیە لەوانە:

- وەیادهێنانەوەی ئەوەی کە خوای گەورە لەگەڵ دۆستە ئیمانداراکانیەتی، بە سەرخستن و پشتیوانی لێکردنیان، ئەمە ئەو خەونە ڕاستەقینەیە بوو کە سەعد(ﷺ) بینیبووی لە خوای گەورە و باڵادەستەوە، تا دڵی چەسپاو و جێگیر بێت و لەم کارە دوارۆژ نادیارە بڕواتە پێشێ.

- خوای گەورە کارەکان لە بەرژەوەندی باوەڕداران بەڕێدەکات، ئاوی ڕووبارەکە کتوپڕ بە خێرایی وا خۆی نیشاندا کە ئەمە لە بەرژەوەندی فارسەکانە بەجۆرێك کە بەر لە هەر هەوڵێکی پەڕینەوەی موسڵمانان دەگرێت، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان بوون بە جۆرێك ئەم کارە ئەوەی بەخشیە بێباوەڕەکان کە دڵنیا بن و ئامادە نەبن بۆ پێشڕەوی موسڵمانان کە لە پڕ دێن بۆیان، نەیانتوانی هەموو ئەو شتانە لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن کە لە کاتی هەڵهاتنندا دەیانەوێت.

- هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) گەشبینی باشیان بەم خەونەوە لەپیاوێکی باش هەبوو، بەڕاست و دروستیان دەزانی بۆ چوونە پێشێ لەو کارە و ئەوان (خوایان لێ ڕازی بێت) گومانی باشیان بە خوای گەورە دەبرد و باوەڕیان وابوو کە خەونی چاك جێگیری پشتیوانیە لە خوای باڵادەستەوە.

- بەڕاستی سەرکردەی موسڵمانان لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا زۆر جار بە بەجەرگی و لێهاتوویی و قۆستنەوەی هەلەکان و وروژێنەری وزەی سەربازان وەسف دەکران لە کاتێکدا کە ئەوان لەوپەڕی دڵگەرمی و هێزی باوەڕیاندا بوون، ئەوە سەعدە کە فەرمان دەداتە سوپاکەی بە پەڕینەوە بۆ لای دوژمنان بە چەکی ئیخلاس و لە خوا ترسانەوە، دڵنیا بوو لە ئاستی باوەڕداری سوپاکەی و پێشڕەوی کرد لەسەر ئەوەی کە پێشتر کردبووی لەم کارەیدا پشتی یەکەم بە خودا و دووەم بەو ئاستە بەرزەی بەست.

- وەسفکردنی یاران و ئەوانەش لەگەڵیان بوون لە تابعین بە ملکەچی تەواو بۆ سەرکردەکانیان، ئەوان ئەم ملکەچیەیان بە ئەرکێکی شەرعی و کارێکی باش دادەنا کە پێی نزیك ببنەوە بۆ لای خوای گەورە.

---

[1] ـ التاريخ الاسلامي (١١/١٦٥).

## ٤- پەڕینەوە لە ڕووبارەکە و ئازادکردنی مەدائن:

سەعد هانی خەلکی دا بۆ پەڕینەوە و فەرمووی: کێ دەست پێ دەکات و کەنارەکانی ڕووباری ڕۆژهەلاتمان بۆ دەپارێزێت تا خەلکی پێی دەگەن بۆ ئەوەی بەر لە هاتنەدەری دوژمنان بگرێت؟ لەم کاتەدا عاصمی کوڕی عەمری تەمیمی کە یەکێك بوو لە یارانی خاوەن هێز و توانا خۆی بۆ ئەم کارە سازدا و پاشان حەوت سەد کەس لە خەلکانی بەهێز بە دوایدا خۆیان ئامادەکرد، بەم شێوەیە سەعد(ﷺ) عاصمی کردە فەرماندەیان و ئەوانیش ڕۆیشتن تا عاصم لەکەناری ڕووباری دیجلەدا ڕایگرتن و فەرمووی: کێ لەگەلم دەبێتە نوێنەر تا کەنارەکان لە دوژمنانتان بپارێزین و بتان پارێزین تا دەپەڕنەوە؟ بەم شێوەیە(٦٠) کەس لە یارانی خاوەن هێز و توانا هاتنە پێشێ، پاشان ڕووباری دیجلەیان بڕی، پاشان ماوەی ئەو شەش سەد کەسەی تریش شوێن پێیان هەلگرتن، بەم شێوەیە لە سوپای موسلمانان دەستەیەکی گیان بەخش کە ژمارەیان شەش سەد کەس بوو پێکهات و ناوی لێ نرا کەتیبەی ئەهوال، عاصم(٦٠) کەسیانی لێ ئازاد کردن تا لە ژێر فەرماندەی سەرکردایەتیەکەیدا بن و لە پێشەنگی ئەم دەستەیە بن، ئەمەش پلانێکی تۆکمە و پتەو بوو سەرەتا لە سەعد و پاشان لە عاصمەوە کە ڕووبەڕووبوونەوەی ترس و جەربەزەیی کە بە زۆر و بۆری نابێت، بەلکو بە خاوەن هێزە گەورە و توانا جەنگیەکان دەبێت ئەگەرچی کەمیش بن ئەمەش بەوەی کە کەسانێك پەیوەندی بکەن بەم دەستەیەوە کە کەم لێهاتوو و جوامێر بن پاشان لە کاتی هێرشکردنە سەر دوژمن هەلدەگەڕێنەوە و دەبنە هۆی تێك شکانی تەواوی دەستە و تاقمەکە.[1]

عاصمی کوڕی عەمر بە شەست کەسی ئەسپ سوارەوە ڕووبارەکەی تێپەڕاند، باسی ئەوە کراوە کە لە پێشەنگی ئەمانە کەسانێك هەبوو کە پێشتر بەرەو کەنارێکی تر ڕۆیشتوون لەوانەش ئەصەمی کوڕی وەلادەی تەمیمی، ئەکەلەج ، ئەبو موفەرزی ئەسوەدی کوڕی قوتبە، شەرحەبیلی کوڕی ئەسەمطی ئەلکەندی، حەجەلی عجلی، مالك کوڕی کەعب هەمەدانی، و لاوێکی هۆزی ئەلحارسەی کوڕی کەعب وە کاتێك کە عەجەمەکان بینی یان ژمارەیەك سوارچاکیان بۆ ئامادە کردن کە لە ڕووبارەکە و لە نزیك کەناری ڕۆژهەلاتەوە پێیان گەیشتن، عاصم فەرمووی: ڕمەکانتانن ڕمەکانتان، کاری پێ بکەن و کانیاوەکانیان بکەنە جێ نیاز، پاشان بە یەك گەیشتن و موسلمانان لێیان دان و موسلمانان کانیاوەکانیان کردە نیاز، بەرەو کەنارەکە ڕۆیشتن و موسلمانەکانیش بە ڕمەکانیان دەچەقاند بە ئەسپەکانیاندا هەتا لە ڕاکردندا خێرا بن بەم شێوەیە ئەسپەکان خێرا دەبوون و خاوەنەکانیان بەریان پێ نەدەگرتن، بەم شێوەیە موسلمانان گەیشتنەوە پێیاندا ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و هەرکەس دەرباز بوو دەرباز بوون هەیان بوو یەك کەلە چاو بوون پاشان شەش سەد کەسەکەی تریش گەیشتنە براکانیان و دەستیان گرت بەسەر کەناری ڕۆژهەلاتدا.[2]

---

١ـ التاريخ الاسلامي (١١/١٦٨).

٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥٦، ٤٥٧).

## ٥- موسڵمانان دەخزێنە ڕووبارەکەوە:

کاتێك کە سەعد عاصمی بینی لەسەر کەنارەکانی ڕۆژهەڵات بەری لێ گرت بە مۆڵەتدانی خەڵکی لە تێڕژانە نێو ڕووبارەکەوە و فەرمووی: بڵێن: کۆمەکی لەخوا دەخوازین و پشت بەو دەبەستن هەر خوامان بەسەچەند پشت پێ بەستراوێکی چاکەو هەر هەوڵ و هێزێك لەخودای گەورەو بالاّ دەست نەبێت دەستەبەر نابێت، بەم شێوەیە زۆربەی سەربازەکان بە دوای یەکدا هاتن و سواری ئاوە زۆرەکە بوون، دیجلەش کەفی فڕێ دەدا و ئەمەش ڕەشاییەك بوو، خەڵکیش باسیان لەڕێ و ڕۆیشتنیان لەسەر زەوی دەکرد،[١] ئەوەی کە ئاوەکەدا ڕێی بە سەعد دەکرد سەلمانی فارسی بوو کە ئەسپ شێواندیان بەسەر یەکدا، سەعدیش هەر دەیفەرموو: هەر خوامان بەسە چەند پشت پێ بەستراوێکی چاکە، سوێند بە خوا خوای گەورە دۆستانی خۆی سەرکەوتوو دەکات و ئەوانیش ئاینەکەی سەردەخەن، خوای گەورە دوژمنانی دەبەزێنێت ئەگەر لە سوپاکەدا داوێن پیس یان تاوانبار نەبێت چاکەکان سەرکەوتوو دەبن،[٢] سەلمانیش پێی فەرموو: ئیسلام نوێیە سوێند بە خوا خوای گەورە ڕووبار و دەریاکانی بۆ کەنەفت کردوون هەروەك ئەوەی کە وشکاوەکی بۆ ڕام کردوون بەلام سوێند بەو کەسەی کە ژیانی سەلمانی بە دەستە خەڵکانێك بە دەستە و تاقم لێی دێنە دەرەوە هەروەك چۆن بە دەستە و تاقم دەڕۆنە ژێر سایەیەوە،[٣] ئەم وشەیەی سەلمان(رضي الله عنه): ئیسلام نوێیە، مانای ئەوەیە هێشتا هەر زیندووە و شوێنکەوتەکانی باوەڕیان پتەوە و شانازی پێوە دەکەن، کردوویانە بەو گرفتەیان کە لەپێناویدا دەژین و لەپێناویدا دەمرن، بانگەوازی بۆدەکەن و بەرگری لێ دەکەن، بەلاّم کاتێك، کە بەڵێن و پەیمان پێشڕەوی دەکات ئەو کاتە چین و توێژێك ئەم ئاینە بە میرات وەردەگرن نەك هەڵیبژێرن مەیکە بەو گرفتەی کە هەست و بایەخی لە تاکەکانی وەردەگرێت، بەڵکو ئەوان غەم و پەژارەی گەورەیان دەکەنە سەرفرازی لە دونیا و چێژ لە خۆشیەکانی وەربگرن و ئاین بکەنە ئامرازی دووەمیان لە فەرهەنگی ژیانیاندا ئا لەم کاتەدا بە کۆمەڵ لێی دەردەچن هەروەك چۆن بە کۆمەڵی دەچنە ژێر سایەیەوە.[٤]

هەر بەم شێوەیە هەموو موسڵمانان بەسەلامەتی پەڕینەوە و هیچ کامێکیان دووچاری ئازار نەهات، جگە لەوەی کە لە ناوچەی بارق پیاوێکی تێکەوت کە ناوی (غەرقەدە) بوو کە بەسەر پشتی ئەسپێکی سووریاو بوو، پاشان قەعقاعی کوڕی عەمر لغاوی ئەسپەکەی بۆ چەماندەوە و دەستی گرت هەتا پەڕیەوە، پاشان پیاوە بارقیەکە – یەکێك لە پیاوە بەهێزەکان بوو – وتی: ئەو خوشکانە گۆشەگیر بوون کە منداڵی وەکو تۆیان بێت ئەی قەعقاع، لە نێو ئەم سوپایە خاڵوانی قەعقاع ئامادە بوون،[٥] فارسەکان لەم پەڕینەوەی موسڵمانان زۆرسەرسام بوون و یەزدجەرد هەڵهات بۆناوچەی حەلوان و موسڵمانان لە شوێنێکی نابەرهەڵستکارانەوە چوونە ناوی و سەعد لە کۆشکە سپیەکەدا دابەزی و

---

١ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٦٩).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥٩).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٧٠).
٥ـ تأريخ الطبري (٤/٤٥٩).

مزگەوتێکی تێدا دروست کرد و ئەم چەند ئایەتەی خوێند کە دەفەرمووێت: ﴿كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾ (الدخان: ٢٥-٢٨).

هەشت ڕکات نوێژی ڕزگاری خوێند و یەکەمین کەتیبەش کە چوویە مەدائن کەتیبەی ئەهوال و پاشان کەتیبەی خەرساء بوو،[١] عاصمی کوڕی عەمر تەمیمی سەرپەرشتی کەتیبەی ئەهوال و قەعقاعی کوڕی عەمریش سەرکردایەتی کەتیبەی خەرسائی دەکرد.[٢]

## ٦- هەڵوێست گەلێك لەسەر ڕاستی موسڵمانان:

### أ- سوپاسی خوا دەکەم و بە پاداشتی قایل دەبم:

کاتێك موسڵمانان لە مەدائن جێگیر بوون و دەستکەوتەکانیان کۆکردەوە، پیاوێك کە پێڵاوێکی پێبوو هاتە پێشێ، دایە دەستی خاوەن دەستکەوتەکان، ئەوەش کە لەگەڵێدا بوو وتی: هەرگیز شتی وامان نەبینیوە، ئەوەی کە ئێمە هەمانە لە بەرامبەری ناوەستێتەوە و لێی نزیك نابێتەوە، ئەوانیش وتیان: ئایا هیچت لێ بردووە؟ ئەویش وتی: نا سوێند بە خوا ئەگەر لەبەر خودا نەبووایە بۆم نەدەهێنان، پاشان زانیان کە ئەم پیاوە ئابڕووی هەیە، وتیان: تۆ کێی؟ وتی: نا سوێند بە خوا هەواڵتان پێ نادەم تا سوپاسم بکەن، نەوەك کەسانی تریش قەرزم پێ بدەن، بەڵام من سوپاسی خوا دەکەم و بە پاداشتی قایل دەبم، پاشان پیاوێکیان شوێنی خست تا گەڕایەوە لای هاوەڵانی پرسیاری دەربارەی کردو بۆی دەرکەوت کە عامری کوڕی عەبدقەیسە.[٣]

### ب- عصمەتی کوڕی حارسی چبی دەفەرمووێت:

لەگەڵ چەند کەسێك دەرچووم ڕۆیشتن و داخوازیان هەبوو من ڕێگەیەکم گرتەبەر کە خاوەن گوێ درێژێکی لەسەر بوو، کاتێك منی بینی پاڵی پێوە نا و گەیشتە بەردەمی، ئەوانیش لایان دا و پاڵیان بە گوێ درێژەکانیانەوە نا، گەیشتنە لای جۆگەیەك کە پردەکەی ڕووخابوو ئەوان وەستان تا من گەیشتمە لایان، پاشان لێك جیابوونەوە و پاڵێکیان پێوەنام منیش پێوەی نوسام (واتا شوێنی کەوتم) و پاشان کوشتم و ئەوی تریان هەڵهات و لە دەستم دەرچوو، گەڕامەوە بۆ لای دوو گوێ درێژەکە، هێنامن بۆ لای هەڵگری دەستکەوتەکان ئەویش سەیری یەکێك لەو شتانەی کرد بەسەر پشتی یەکێکیانەوە بوو کە دوو دەفری تێدا بوو یەکێکی ترشیان ئەسپێکی زێڕی تێدا بوو، کە ڕووکەش کرابوو بەڕووکەشێك لەزیو لەسەر دەروازەیێك، کرۆکەکەی یاقوت و زومرودی ڕێکخرابوو لەسەر زیوەکەو

---

١ـ البداية والنهاية (٦٧/٧).
٢ـ إتمام الوفاء (ص: ٨٥).
٣ـ تأريخ الطبري (٤٦٨/٤).

هەروەها لغاوەکەی، سوارێکیش لەزیو کە بە خشڵ هەڵچنرابوو، لە کۆتاییەکەشیدا حوشترێك بوو کە مۆخی مورەگەی لەسەربوو لە زێڕ و قەیاسە لەزێڕو چەندی جلەوی لەزێڕ هەبوون وە هەموو ئەمانە بەیاقووت ڕێکخرابوون، پیاوێکی لەسەربوو، کە لەزێڕ بووەوە بەخشڵ هەڵچنرابوون، کە کیسرا دەیخستە سەر ستوونەکانی مێژوو.[١]

## ج- هەواڵی قەعقاعی کوڕی عەمر:

قەعقاع گەشتە فارسێك خەڵکی داخ دەکرد و پاشان کوشتی، ئەم پیاوە دوو زەرف و دووشتی تری پێبوون، یەکێك لە زەرفەکان پێنج شمشێر و ئەوی ترشیان شەش شمشێری تێدابوون، کە لە شمشێری پادشایانە دەچوو کە لە نێوانیان و نێوان فارسەکاندا شەڕ و جەنگ ڕوویدابوو وە شمشێرەکەی کیسرا و هەرقلیش لە نێوی ئەم شمشێرانەدا بوون، دوو شتەکەی تریش قەلغان و زرێی پادشایان بوون و قەلغان و زرێیەکەی کیسرا و هەرقلیشی تێدا بوو، هێنانی بۆ لای سەعد، پێی وت: یەکێك لەم شمشێرانە هەڵبژێرە، ئەویش شمشێرەکەی هەرقلی هەڵبژارد و پیاوەکەش قەلغان و زرێیەکەی بەهرامی پێ بەخشی، بەڵام ئەوی تریان کەتیبەی خەرساء کە قەعقاع سەرکردایەتی دەکرد وەك دەستکەوت و خەڵات بردیان، جگە لە شمشێرەکەی کیسرا و نعمان، سەعد پێی باش بوو کە بیان نێرێت بۆ ئەمیری باوەڕداران هەتا عەرەب بە شارەزاییانەوە گوێ بیست بن.[٢]

## د- ستایشی هاوەڵان لەسەر تاکەکانی ئەم سوپایە:

تەواوی گەورە هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) ستایشی خودایان کرد لەسەر بوونی ئەم سوپایە لێرەدا ئەو پەیڤەی سەعد دێتە پێشێ کە دەفەرمووێت: سوێند بە خوا ئەم سوپایە زۆر سەر ڕاستە، ئەمە پێشتر بۆ بەدریەکان نەبوایە ئەوا لە سەرووی بەدریەکانەوە ئەمەم دەوت،[٣] جابری کوڕی عبداللە دەفەرمووێت: سوێند بەو خوایەی کە جگە لەو خوایەکی تر نیە کەسێکمان لە بەشداربووانی قادسیە نەبینی کە پێکەوە دونیا و دوارۆژیان ویستبێت ، ئێمە سێ کەسمان تاوانبار کرد وە هیچمان نەبینی وەك ئەوەی کە هێرشمان کردنە سەر لەسەر ڕاستی خودا پەرستیان: طلیحةی کوڕی خوەیلەدو عەمری کوڕی مەعدیەکروب و قەیسی کوڕی مەکشوح بوون، گەورەتریش لەمە ئەوە بوو کاتێك کە عومەر پێنجیەکی ئەو غەنیمەتانەی بینی، کە شمشێرەکەی کیسراو هەرەمەکەی و زوبەرجەدەکەی تێدایە فەرمووی: گەلێك کە ئەمەیان بەجێ هێنابێت خاوەنی سەر ڕاستین وە عەلیش(ﷺ) فەرمووی: تۆ ئەگەر دەستت پاك بێت خەڵکیش دەست پاك دەبن و ئەگەریش بە ئاسوودەیی ژیایت ئەوا خەڵکیش بە ئاسوودەیی دەژین.[٤]

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٤٦٨).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٦٨).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١١/١٨١)، تأريخ الطبري (٤/٤٦٨).
٤ـ تأريخ الطبري (٤/٤٦٨).

### ه- هەڵوێستی عومەر لە غەنیمەتە گرانبەهاکان :

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە ڕۆژانی جەنگی قادسیە شمشێر و هەرەم و بازن و شەرواڵ و کراس و تاج و پێڵاوەکانی کیسرای نارد بۆ عومەر کە وەك زێڕ و گەوهەر و ئاوریشم بە نرخ بوون عومەریش سەیرێکی خەڵکەکەی کرد، بینی کە شان و شەوکەتترین و بە بەژن و بالاترینیان سوراقەی کوڕی مالکی کوڕی جەعسەمە، بۆیە فەرمووی: ئەی سوراقە هەستە ئەمانە لەبەر بکە، سوراقە دەفەرمووێت: منیش چاوم تێبڕین و هەستام لەبەرم کردن عومەر فەرمووی: بسووڕێوە منیش خۆم سوڕاند، دواتر فەرمووی: وەرە پێشێ و منیش چوومە پێشێ، پاشتر فەرمووی: بخ بخ عەرەبێکی دەشتەکی لە هۆزی مەدلەج کەوا و شەرواڵ و کراس و شمشێر و هەرەم و تاج و پێڵاوەکانی کیسرای لەبەردایە، ڕەنگە ڕۆژێك ئەی سوراقەی کوڕ مالك تۆ شتێکی وات هەبووایە لە تام و چێژی کیسرا و بنەماڵەی کیسرا ئەوا دەبوویە شەرەفێك بۆ خۆت و بنەماڵەکەت، ئینجا فەرمووی: شتەکان دابکەنەرەوە و منیش لەبەرم داکەندن و دواتر فەرمووی: خوای گەورەا تۆ بەری ئەمەت لە پێغەمبەرەکەت گرت کە بۆ تۆ لەمن زۆر خۆشەویستتر و ڕێزدارتر بوون هەروەها بەرت پێگرت لە ئەبو بەکر کە بۆتۆ زۆر لە من خۆشەویستتر و ڕێزدارتر بوو، بەخشیوتە بە من پەنات پێ دەگرم کە پێت دابم کە قیامەتم نەبێ، دوای ئەوە هێندە گریا هەتاهەمووان بەزەیان پێدا هاتەوە، فەرمووی بەعبدالرحمانی کوڕی عەوف سوێندت دەدەم کە بیان فرۆشی و پێش ئەوەی ئێوارە دابێت پارەکەی دابەش بکەیت.[١]

### حەوتەم: جەنگی جەلەولا:

فارسەکان لە جەلەولا لەسەر دووڕیانێکی مەدائن کۆبوونەوە و ڕاوێژی خۆیان کرد و وتیان: ئەگەر بڵاوەی لێ بکەن هەرگیز کۆنابنەوە، ئەم شوێنەش بڵاوەمان پێ دەکات، کەمێك بوەستن با خۆمان بۆ عەرەبەکان کۆ بکەینەوە و لەگەڵیان بە جەنگ بێین ئەگەر سەرکەوتن بۆ ئێمە بوو ئەوا ئێمەش هەر ئەوەمان دەوێت وە ئەگەرنا ئەوا ئێمە ئەوەی لەسەرمانە بەجێمان هێناوە و بەهانەمان بە دەستەوەیە، ئەوان بە سەرکردایەتی مهران ڕازی کۆبوونەوە و خەندەقێکیان بە دەوری شارەکە لێدا و بە دڕك و دار و تەختە چواردەوری هەموویان گرت جگە لەو ڕێگایانەی کە خۆیان پێدا دەپەڕنەوە، لەم کاتەدا سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص نامەیەکی بۆ عومەر نووسی و ئەم هەواڵەیان پێدا، عومەریش نامەیەکی بۆ سەعد نووسی و فەرمانی پێکرد کە هاشمی کوڕی عوتبەی ئەبی وەقاص بە(١٢) هەزار سەربازەوە ڕەوانەی جەلەولا بکات و لە پێشیەوە قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی و لە لای ڕاستیەوە موسعەری کوڕی مالك و لە لای چەپیەوە عەمری کوڕی مالك و لە ساقەکەیدا عەمڕی کوڕی کوڕەی جوهەنی دابنێ بەم شێوەیە هاشم ڕووی لێنان و گەمارۆی دان و فارسەکانیش دوایان خستن و بە ویستی خۆیان نەبێت بۆیان دەرنەدەپەڕین، پاشان موسڵمانان پاشەکشەیان پێ کردن، هەموو ئەمانەش سەرکەوتن بوو کە

١ـ تاريخ الطبري (٤/٤٧٢)، البداية والنهاية (٧/٦٨).

خـوای گـەورە دەیبەخـشیە موسـڵمانان، هاویـەش پەیداکـەران سـەرکەوتن بەسـەر ئـەو دڕك و چقڵ و تەختانەی کە دایاننابوو بۆ پەکخستنی موسڵمانان، دواتر دوژمنان دڕکی ئاسـنینیان هێنـا و هـاشمیش لە نێو خەڵکەکە هەستایە سەرپێ و فەرمووی: ئەم جێگەیە شـوێنێکە کـە شـوێنی تـری بـە دواوەیـە، سەعدیش بە سوارچاکەکانی هاوکـاری دەکـرد، تـا کارەکـە درێـژەی کێـشا و دوژمنـان لـە ئـارامگری بێباوەڕان تەنگەڵان بوون و بایەخیان پێدان و دەرپەڕین بـۆ شـەڕ و جـەنگیان پاشـان هاشـم فـەرمووی: خوای گەورە ئەزموونی باشی پێداون تا هەمووی لەسەرتان بـە پاداشـت و غـەنیمـەتی چـاك کۆتـایی و تەواو بێت و ئێوەش کار بۆ خودا بکەن پێیان بگەن و بیانکوژن، ئینجـا خـوای گـەورە بایـەکی تونـدی لەسەریان هەڵکرد و ناوچەکە تاریك و تونەك بوو جگە لە بەرهەڵستی کردن توانای هیچی تریان نەبوو، دواتر سوارەکانیان لە خەنەقەکەدا دەستیان کردە هاوار هاوار و هیچ ناچاریەکیان نەدێتەوە لـەوەی کـە خەنەقەکە پڕ بکەنەوە لەوەی کە بە دەوریانەوە بوو تا ئەسپەکانیان لێـوەی سـەربکەوێت وە قـەڵاکانیان شێواند،[1] کاتێك هەواڵی ئەوە گەیشتە موسڵمانان کە دوژمنـان هەسـتاون بـە پڕکردنـەوەی خەنەقەکـە وتیان: جارێکی تر پەلاماریان دەدەین و دەچینە سـەریان یـان لـەو پێنـاوەدا سـەر دەنێینـەوە، کاتێـك موسڵمانان ڕاپەڕین بۆ جەنگ ئەوان هاتنە دەرەوە و ئەو شتانەی کە بە دەوری خەنەقەکە بوو هەڵیانـدا بە دوای موسڵماناندا بە دڕکی ئاسنین تا ئەسپەکانیان نەیەتە پێشێ و بەسەریاندا بدات، لە شوێنێکیان بەجێ هێشت کە لێوەی دەهاتنە دەرەوە بۆ سەر موسڵمانان پاشان شەڕێکی خوێناوی سەختیان کرد کە ئەو شەوە تەنها لە شەوی ئەهورەیرەی یەکێك لە شەوەکانی قادسیەدا کرابێت جگە لەوەش ئـەم شـەڕە زۆر کورتتر و خێراتر بوو، دواتر قەعقاعی کوڕی عـەمر لەو ڕووەوە کە خـۆی کـێش کـرد گەیـشتە بـەر دەرگای خەنەقەکەیان و داوای لە جارچی کرد بڵێت: ئەی موسڵمانینە ئەوە ئەمیرەکەتانە کە چۆتە نێـو خەنەقی دوژمنەکەتانەوە و گرتوویەتی ئێوەش بەرەو پیریەوە بێن، هیچ کەسێك لە نێوان ئێوە و ئـەودا ڕێگریتان ناکات لە هاتنە ژوورەوە، بەڵام ئەوە فەرمانی بـەوە دا هـەتا موسـڵمانانی پـێ بـەهێز بێـت، موسڵمانانیش هەڵمەتیان بـرد و گومانیـان نـەبوو لـەوەی کـە هـاشمی تێدایـە و هـیچ شـتێك لـە ڕێـی هەڵمەتەکەیان نەوەستایەوە تا گەیشتنە دەرگای خەنەقەکە و قەعقاعی کوڕی عەمریان لەوێ بینی کە گرتبووی هاوبەش پەیداکـەرانی لـە شکـستی ڕاسـت و چـەپی و لـەو بـوارەدا گرتبـوو کـە بەرامبـەری خەنەقەکەیان بوو، ئەوان لەوەی کە ئامادەیان کردبوو بۆ دوژمنان تیاچوون و ئاژەڵەکان و وڵاخـەکانیان بریندار بوون، - بە هۆی ئەو دڕکە ئاسنینەی کە دایاننابوو بۆ مـوسڵمانان — وە بە پیـادە گەڕانـەوە — موسڵمانان شوێنیان کەوتن، کەسێك لە دەستیان دەرنەچوو مەگەر یـەکێك کـە ڕای کردبێـت وە خـوای گەورە ئەو ڕۆژە سەد هەزار کەسی لێ کوشتن وە کوژراوەکان بوارەکەیان لەبەر دەسـت و لـە پـشتەوەی گەورە کرد، بەم شێوەیە جەلەولا بـەوەی لـە گـەورەیی ژمـارەی کـوژراوان نـاوزەد کـرا کـە بریتیـە لـە جەلەولای کارەسات و ڕووداو.[2]

---

١ـ تاريخ الطبري (٤/٤٧٥).
٢ـ تاريخ الطبري (٤/٤٧٥).

## أ- سەربازانمان بە کردەوە زمانیان ڕەها کردین:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص زیادی کوڕی ئەبیهەی بە کۆمەڵێك حیساباتی داراییەوە نارد بۆ لای ئەمیری باوەڕداران، زیاد ئەو کەسە بوو کە بۆ خەڵکی دەنووسی و تۆماری دەکردن کاتێك کە هاتە لای عومەر باسی ئەوەی بۆ کرد کە بۆچی هاتووە و پێناسەیەکی بارودۆخەکەی بۆ کرد، عومەر فەرمووی: ئایا دەتوانی بەو شێوەیەی کە بۆ من قسەت کرد بۆ خەڵکیش باس بکەیت؟ هیچ کەسێکی تر لەم کارەدا لە تۆ بەهێزتر نیە! ئەویش هەستا و هەرچیەك دوچاریان بووبووەوە و ئەنجامیان دابوو باسی کرد بۆ خەڵکەکە، بەوەی کە مۆڵەتی تێدا وەردەگرن لەگەران لە وڵاتدا، پاشان عومەر فەرمووی: ئەمە وتاربێژێکی دەنگ گەورەیە، زیادیش فەرمووی: سەربازانمان بە کردەوە زمانیان ڕەها کردووین.[1]

## ب- هەڵوێستی عومەر سەبارەت بە غەنیمەتەکانی جەلەولا:

جەنگی جەلەولا بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی پێهات، ئەوان تیایدا کۆمەڵێك غەنیمەتی باشیان گرتبوو، کە پێنج یەکیان نارد بۆ عومەر(ﷺ) ئەویش کاتێك کە بینی فەرمووی: سوێند بە خوا نایەتە نێوماڵی منەوە تا دابەشی نەکەم، بەم شێوەیە عبدالرحمانی کوڕی عەوف و عبداللە ی کوڕی ئەرقەم لە حەوشی مزگەوتدا پاسەوانیان دەکرد، کاتێك کە ڕۆژ بوویەوە لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکدا هات و ئەو پەردەیەی کە بە سەریەوە بوو لایبرد و کاتێك کە سەیری یاقووت و زوبەرجەد و گەوهەرەکەی کرد گریا و عبدالرحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: چی دەتگرێنێت ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ سوێند بە خوا ئەمە شوێنی سوپاسگوزاریە! عومەریش فەرمووی: سوێند بە خوا ئەوە نامگرێنێ، سوێند بە خوا خوای گەورە ئەمەی داوەتە گەل و هۆزێك مەگەر ئیرەیی پێ بەرن و ڕقیان لەیەك بێتەوە، ئیرەیی بە یەك مەبەن و ئەگەر چەند بەشێك لە نێوانیانم پێ بگات،[2] ئەمەش جۆرێکە لە حەساسیەتی باوەڕپرندە، بە جۆرێك کە موسڵمان و ئیمانداری چەسپاو و جێگیر هەستیارە لە ئەنجامی کردە داهاتووییەکانی لەوەی کە پوختی پەیوەندیە ئیمانیەکەیان لێڵ بکات بە پیریەك لەو پیریانەی دونیا کە دڵەکان لێك دوور دەخاتەوە، ئەمەش بەرپرسیاری دەکات لەسەر ئەو کاریگەریە قووڵەی دەیگەیەنێتە ڕادەی فرمێسك ڕشتنی لەبەردەم خەڵیدا و ئەمەش مایەی سەرسامیە کە فرمێسك لە چاوانی پیاوێك جۆگە هەڵبەستێت کە لە بەهێزیدا گەیشتۆتە ڕادەیەك کە تەواوی خەڵکی جەمسەرەکانی سەر زەوی بە موسڵمان و بێباوەڕ و دوروویانەوە لێی دەترسن، بەڵام ئەمە ئەو بەزەییەیە کە خوای گەورە دڵی باوەڕدارانی پێ تەنیووە، ئەوان بەو شێوەیە بوون کە خوای گەورە پێناسەیان دەکات بە ئایەتێك کە تیایدا دەفەرمووێت:

﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا

---

١- تأريخ الطبري (٤/٤٧٩).
٢- تأريخ الطبري (٥/٤٨٠).

سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا﴾(الفتح: ٢٩).

### هەشتەم: ئازادکردنی ڕامهورمز:

فارسەکان بە هاندانێك لە یەزدەجورد پادشایانەوە جارێکی تر کۆبوونەوە، ئەمجارەیان بە سەرکردایەتی هورمزان لە ناوچەی ڕامهورمز کۆبوونەوە، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هەواڵی ئەم کۆبوونەوەیەیانی دایە عومەر ئەویش فەرمانی دا بەسەعد، کە سوپایەکیان لە خەڵکی کوفە بە سەرکردایەتی نوعمانی کوڕی موقرن بۆ ئامادە بکات، هەروەها فەرمانی دا بە ئەبو موسای ئەشعەری لە بەسرە سوپایەکیان بە سەرکردایەتی سەهلی کوڕی عودەی ئەگەر ئەم دوو سوپایە کۆبوونەوە ئەوا پێویستە لە سەریان پەیوەندی بکەن بە ئەبو سوبرەی کوڕی ئەبو ڕوهم ، هەر کەس کە هات بۆ لای ئەوا هاوکاریەکە بۆی بەم شێوەیە نوعمانی کوڕی موقرن بە خەڵکی کوفەوە هاتە دەرەوە، پاشان بەرەو هورمزان بەڕێکەوت، ئەو دەمە هورمزان بە ڕامهورمز ناسرابوو، کاتێك کە هورمزان هەواڵی ئەم بەڕێکەوتنەی نوعمانی بیست گرژی گرتی و تکای کرد کە پارچەپارچەی بکات، هەروەها هورمزان چاوی بڕیە سەرکەوتن و پشتیوانی فارسەکان، و ئەوانیش هاتن بە دەمیەوە، پاشان سەرەتای هاوکاریەکانیان بڵاوبوویەوە، نوعمان و هورمزان لە ئەربك بە یەك گەیشتن و شەڕێکی خوێناویان ئەنجامدا، دواتر خوای گەورە هورمزانی بە نوعمانی تێك شکاند، هورمزان ناوچەکەی بەجێ هێشت و خۆی گەیاندە تەستر، بەڵام سەهلی کوڕی عەدەی خەڵکی بەسرەی بەڕێ کردبە مەبەستی گەیشتنە ڕامهورمز و دواتر لە بازاڕی شاری ئاواز شەڕەکە ڕووبەڕوویان بوویەوەن وە هەواڵیان پێ گەیشت کە ڕامهورمز خۆی گەیاندۆتە تەستەر، ئەوان بەرەو تەستەر بەڕێکەوتن، نوعمانیش بەرەو ئەوێ لایدایەوە.[1]

### ٩- ئازادکردنی تەستەر:

هەردوو سوپاکەی نوعکانی کوڕی موقرن و سەهلی کوڕی عودەی گەیشتنە تەستەر، لە ژێر باڵی سەرکردایەتی سوبرەی کوڕی ئەبو ڕوهم کۆبوونەوە، ئەبو سوبرە داوای کۆمەکی لە ئەمیری باوەڕداران کرد و ئەویش بە ئەبو موسای ئەشعەری هاوکاری کردن و بەمەش بوویە سەرکردەی سوپای بەسرە و ئەبو سوبرەش لە سەرکردایەتی تەواوی سوپاکە مانەوە و موسڵمانان بۆ ماوەی چەند مانگێك لە

---

١ـ تأريخ الطبري (٦١/٥، ٦٢).

گەمارۆی شاری تەستەر مانەوە و تیایدا لە(٨٠) شەڕدا ڕووبەڕووی سەپای دوژمن بوونەوە و جوامێری پاڵەوانان بە زۆرانبازی دەرکەوت و ژمارەیەکیان بە کوشتنی هەزار زۆرانباز ناوبانگیان دەرکرد جگە لەوانەی کە لە نێو شەڕەکەدا کوژرابوون، لەقارەمانان و پاڵەوانانی خەڵکی بەسرە:بەرائی کوڕی مالك و مەجزەئەی کوڕی سەورە و کەعبی کوڕی سوور و ئەبو تەمیمە و پاڵەوانانی شاری کوفەش کە بەو شێوەیە باسیان لێوە کراوە حەبیبی کوڕی قورە و ڕبعی کوڕی عامر و عامری کوڕی عبداللەی ئەسوەد دەرکەوتن.[1]

کاتێك کە دواین ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان موسڵمانان و دوژمنان دەستی پێکرد و شەڕ و جەنگ کڵپەی سەند موسڵمانان بانگی بەرائی کوڕی مالکیان کرد و وتیان: ئەی بەراء، سوێند لەسەر خوای گەورەت بەجێ بهێنە کە ئەمانەمان بۆ ببەزێنی، ئەویش فەرمووی: خوای گەورە! ئەمەمان بۆ ببەزێنیت، منیش شەهیدیم دەوێ، پاشان موسڵمانان چوونە ناو جەنگ و شەڕەکەوە تا دوژمنانیان تێك شکاند و چوونە نێو خەندەقەکانیانەوە و ڕووخاندنیان بەسەریاندا،کاتێك کە تەنگژەکە کەوتە سەرفارسەکان و گەمارۆیان لەسەر دژوار بوو دوو کەسیان لە دوو ڕووی جیاوازەوە هاتن بۆ لای موسڵمانان و هەواڵیان پێدان کە ئازادکردنی شارەکە لە ڕێگەی شوێنی دەرچوونی ئاوەکەوە دەبێت، ئەم هەواڵە گەیشتە نوعمانی کوڕی موقرن، ئەویش هاوڕێکانی هاندا، پاشان پاڵەوانانی خەڵکی کوفە و بەسرەش شەو لە جێگەیەکدا بەیەك گەیشتن وە بە مەلەوانی لەو ڕێگەیە دەچوونە نێو شارەکە و (الله أکبر)یان کرد و ئەوانەش کە لە دەرەوە وەستابوون (الله أکبر)یان کرد، دواتر دەرگاکانیان کردەوە، لە دوای کەمێك بەرگری کردن[2] هەر کەس بە دەوری دەرگاکانەوە بوو لە ناویان بردن، لەم شەڕەدا هەریەکە لە بەرائی کوڕی مالك و مەجزەئەی کوڕی سەور شەهید بوون بە هۆی ئەوەی کە هورمزان تیربارانی کردن، ئەم شەهید بوونەشیان لە پاش سەرکەوتنی موسڵمانان بوو، هورمزان سەرکردەی فارس خۆی گەیاندە قەڵاکەو ئەو موسڵمانانەی، کە لە ڕێگەی دەروازەی ئاوەکەوە چووبوونە ژورەوە دەوریان داو کاتێك بینیان و لێی چوونە پێشێ پێی وتن: ناتوانن، ئەوا ئێوە ئەم تەنگەڵانیە دەبینن، کە منی تێدام وە لە جبەخانەکەمدا (١٠٠) تیرم پێیە، سوێند بە خوا هەر لەبەر ئەوەش بێت دەستتان پێم ناگات، من هیچ تیرێکم لێ بەر نابێتەوە، دەی کەواتە سوودی بەند کردنم چیە، کە من(١٠٠) کەسم لە ئێوە کردە قوربانی و بریندارم کردن، ئەوانیش وتیان: ئەی تۆ چیت دەوێ؟ وتی: لەسەر فەرمانی عومەر دەست دەخەمە نێو دەستتانەوە ئەو چی ویست با بیکات ئەوانیش وتیان: بەڵێنی ئەوەت پێ دەدەین ئەویش تیر و کەوانەکەی فڕێدا و خۆی دا بە دەستەوە و ئەوانیش بەستیانەوە و چاودێریان کرد تا ڕەوانەی لای عومەر(ﷺ) بکەن، پاشان هەرچی لەو شارەدا بوو لە ماڵ و سامان و داهات گرتیانە

١ـ التأريخ الاسلامي (٢٠٢/١١).
٢ـ التأريخ الاسلامي (٢٠٢/١١).

دەستیان و لە پێنج بەش چوار بەشیان دابەش کرد، بەم شێوەیە هەر سوارچاکێك سێ هەزار درهەم و هەر پیادەیەکیش هەزار درهەمی بەرکەوت،[1] لە غەزا و جەنگی تەستەردا چەند ئامۆژگاری و چەند وانەیەك هەن لەوانە:

## * هەموو دونیا و ئەوەشی کە تیایدایە بەم نوێژە بەختەوەرم ناکات:

ئەنەسی کوڕی مالکی برای بەڕاء دەفەرمووێت: دژە وەستانەوەکانی قەڵای تەستەرم لە کاتی ڕووناکی بەرەبەیان بینی و کڵپەی ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند و نەمانتوانی لە کاتی خۆیدا نوێژی بەیانی بکەین تا تیشکی هەتاو بەرز بوویەوە و پاشان ئێمە لەگەڵ ئەبو موسای ئەشعەری نوێژمان خوێند و خوای گەورە قەڵاکەی بۆ ئاوەڵا کردین، ئەنەسی کوڕی مالکی ئەنصاری دەفەرمووێت: هەموو دونیا و ئەوەشی تێیدایە بەم نوێژە بەختەوەرم ناکات.[2]

## * تاجەگوڵینکەیەك لە تاجەگوڵینکەکانی شەرەف بەڕائی کوڕی مالك بە دەستی دێنێت:

پێغەمبەر(ﷺ) تاجەگوڵینکەیەکی گەورە لە تاجەگوڵینکەکانی شەرەف هەڵدەواسێت بە سینەی بەڕائی کوڕی مالکدا ئەویش بە ڕۆشنایی ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرمووێت: ((هەندێ لە ئەشعەسیەکان تۆزاوی و هەڵبەزن و سەرپێچیان ناکرێت، ئەگەر کەسێك لەوانە سوێند لەسەر خوا بخوات ئەوا سوێندەکەی گیرا دەبێت، لەوانەش بەڕائی کوڕی مالکە))،[3] بەڕاستی بەڕاء دوعای گیرا بوو، خەڵکی بە هۆی ئەم فەرموودەیەوە ئەوەیان لە بەڕائدا زانی هەر لەبەر ئەوە لەم شەڕەدا داوایان لێ کرد کە لە خودا بپاڕێتەوە کە دوژمنەکەیان بۆ تێك بشکێنێت، لەگەڵ ئەم پیاهەڵدانەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بەڕاء ئەو نە لەخۆبایی دەبوو نە بە لووت بەرزیش خۆی دەنواند، بەڵکو وەك ئەو پیاوە خۆبەکەم زانە مایەوە کە ئەهوالی تێك شکاند و بە گەورەترین ئەنجامەوە هاتەوە بێ ئەوەی کە فەرماندە یان سەرکردە بێت، ئەگەر داوای سەرکەوتنی موسڵمانانی کردبێت تەنها لەبەر سەرفرازی ئەوان و ئاینی ئیسلام بووە. ئەو بێئاگا نەبووە لەوەی کە داوای بەرێزترین شتێك لە خودا بکات کە باوەڕدارانی باوەڕ پتەو و خوازیاری دەکەن، بە جۆرێك کە داوای شەهیدی لە خوای گەورە دەکات، بەم شێوەیە خوای گەورە بە دەم دوعاکەیەوە دێ و دوژمنانی ئیسلام تێك دەشکێنێت و هەر لەو ڕۆژەشدا بەڕاء بە پلەی شەهیدی دەگەیەنێت.[4]

---

١ـ تاريخ الطبري (٥/٦٣، ٦٤).
٢ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٢٣).
٣ـ سنن الترمذي، ك: المناقب (٥/٦٥٠) رقم (٣٨٥٤).
٤ـ التأريخ الاسلامي (١١/٢٠٤).

## * هەواڵی عومەری ئەمیری باوەڕداران لەگەڵ هورمزاندا :

ئەبو سویرەی کوڕی ئەبو ڕوهمی سەرکردەی موسڵمانان لەو جەنگە شاندێکی نارد بۆ لای عومەر(ﷺ)و هورمزانی لەگەڵ ناردن، تا ئەگەر چوونە نێو مەدینە، هورمزان لە نێو جل و بەرگەکەی خۆیدا ئامادە بکەن و جلە ئاوریشمەکانی کە زێڕی تێدابوو پێیان لەبەرکرد تاجەکەیان لەسەر کرد کە ناوی (ئەذین) بوو وە بە یاقووت چنرابوو وە خشڵی بە سەرەوە بوو، تا عومەر لەو جل و بەرگەیدا بیبینێت، پاشان بردیانە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکە بە دوای عومەردا دەگەڕان و چوونە ماڵەکەی لەوێ نەبوو، کە پرسیاری عومەریان کرد خەڵکی پێیان وتن: لە مزگەوت دانیشتووە چونکە شاندێك لە کوفەوە هاتوون بۆ لای، بۆیە ئەوانیش بەرەو مزگەوت ڕۆیشتن بەڵام نەیان دیتەوە، کاتێك ئەوێیان بەجێ هێشت بە لای چەند منداڵێکی خەڵکی مەدینەدا تێپەڕین و پێیان وتن کە: چی سەرسامی کردوون؟[1] ئایا ئێوە ئەمیری باوەڕدارانتان دەوێ؟ ئەو لە لای ڕاستی مزگەوتەوە نوستووە، عەمامەکەی ڕاخستووە، عومەر کاتێك کە لەگەڵ شاندەکەی خەڵکی کوفە دانیشتبوو عەمامەکەی لەژێردا بوو، کاتێك کە ئەوان لە قسەکانیان لێبوونەوە و لەسەری هەستان عومەر عەمامەکەی تەکاند و ڕای خستەوە و لەسەری نووست — ئەوان بۆی دەرچوون و تەماشاکەرانیان هەر لەگەڵدا بوو تا ئەگەر بینیان لە دەوری دانیشتن بەڵام مزگەوت جگە لە عومەر نە کەسێکی نوستوو نە کەسێکی بێداری لێ نەبوو، عومەر قامچیەکەی لە دەستیدا هەڵواسرابوو هورمزان وتی: کوانێ عومەر؟ ئەوانیش وتیان: ئەوەتانێ، هورمزان گوێی بۆ شاندەکە گرت و وتی: کوا پاسەوانەکانی و کوا دەرگاوانەکانی؟ ئەوانیش وتیان: نە پاسەوان و نە دەرگەوان و نە نووسەر و نە دیوەخانی هەیە، هورمزان وتی: دەی کەواتە پێویستە پێغەمبەرێکی هەبێت، ئەوانیش وتیان: بەڵکو بە کار و کردەوەی پێغەمبەران کار دەکات، خەڵکی زۆربڵێیی خۆیان کرد و عومەریش بە دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی ئەوان بێدار بوویەوە و دانیشت و فەرمووی: هورمزان؟ وتیان: بەڵێ، عومەر چاوی تێبڕی و چاوی بریە ئەوەی کە لەسەری بوو فەرمووی: پەنا بە خوا دەگرم لە ئاگری دۆزەخ؟ کۆمەکی لەخودا خواست، فەرمووی: سوپاس بۆئەو خوایەی، کە بەئیسلام ئەم پیاوە و شوێنکەوتووانی زەلیل کردووە، ئەی نەتەوە و گەلی موسڵمان پابەند بن بەم ئاینەوە، بە ڕێنموونی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) هیدایەت وەربگرن، با دونیا لەخۆباییتان نەکات چونکە دونیا فێڵبازە، شاندەکە وتیان: ئەوە پادشای ئەهوازە قسەی لەگەڵ بکە، ئەویش فەرمووی: نا هەتا دەبێت هیچێك لەو شتانەی لەبەردا بێت ئەوانیش شمەکەکانیان لەبەر لابرد جگە لە پارچە قوماشێك کە خۆی پێ داپۆشیبوو، دواتر جلێکی سادەیان لەبەر کرد، ئینجا عومەر فەرمووی: ئەی هورمزان؟ چۆن بینی بیرکردنەوە لە غەدر و دەرەنجامی کاری خودا؟ هورمزان وتی: ئەی عومەر ئێمەش و ئێوەش لە نەفامیدا بووین و خوای گەورە دەروازەی خستە نێوانمانەوە، ئەگەر لەگەڵ ئێمەش و ئێوەش نەبوایە ئەوا سەردەکەوتین بە سەرتاندا، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئێوە بوو سەرکەوتن بە سەرماندا، عومەر فەرمووی: بەڵام ئێوە لە سەردەمی نەفامیدا بەهۆی یەکپارچەیی خۆتان و پەرش و بڵاوی ئێمە

---

١ـ واتا بۆچی بە لای ڕاست و چەپدا ئاوڕ دەدەنەوە.

سەرکەوتن بەسەرماندا، پاشان عومەر فەرمووی: بەهانە و بەڵگەت لە کولانەوەتدا چی بووە جار لەدوای جار؟ ئەویش وتی: ئەترسم پیێش ئەوەی هەواڵت پێ بدەم بمکوژی، عومەریش فەرمووی: لەوە مەترسە، داوای ئاوی کرد، ئاوەکەیان لە پەرداخێکی ئەستووردا بۆ هێنا، وتی: ئەگەر لە تینوا بمرم ناتوانم لەم پەرداخەدا ئاو بخۆمەوە، پاشان ئاوەکەیان لە پەرداخێکی تردا بۆ هێنا کە پێی قایل بوو، بەڵام دەستەکانی هەڵدەلەرزین، وتی: من ئەترسم لەکاتی ئاو خواردنەوەکەمدا بکوژرێم، عومەریش فەرمووی: بێ باك بە هەتا ئاوەکەت دەخۆیتەوە، ئەویش تێیڕا بوو عومەریش فەرمووی: بگەڕێنە دواوە لەسەری و کوژران و تینویەتی لەسەر کۆ مەکەنەوە، دواتر هورمز وتی: پێویستم بە ئاو نیە، بەڵکو ویستم ئارامی خۆمی پێ دابین بکەم. عومەریش فەرمووی: من بکوژی تۆم، هورمزیش وتی: ئاسایشی ژیانت پێدام عومەر فەرمووی: درۆ دەکەیت، ئەنەس فەرمووی: ئەو ڕاست دەکات ئەی ئەمیری باوەڕداران عومەر فەرمووی: بەڵام لێدای ئەی ئەنەس من ژیانی بکوژی مەجزەئە و بەراء بپارێزم، سوێند بە خوا یان خۆت دەرباز دەکەیت یان سزا دەدەم، ئەنەسیش فەرمووی: تۆ پێت فەرموو: بێخەم بە هەتا هەواڵم پێ دەدەیت، فەرمووت: بێخەم بە هەتا ئاوەکەت دەخۆیتەوە، ئەوانەش کە بە دەوریەوە بوون هەمان شتیان پێ وت، بەم شێوەیە عومەر لە هورمزان چوویە پێشێ و فەرمووی: فێڵت لێ کردم، سوێند بە خودا من بۆ موسڵمان نەبێت بۆ کەسی تر ناخەڵەتێم، پاشان هورمزان موسڵمان بوو، عومەر مانگانە دوو هەزار درهەمی بۆ بڕیەوە و لە شاری مەدینە نیشتەجێی کرد.[١]

## نۆیەم: ئازادکردنی شاری جوندەی سابوور:

کاتێك کە ئەبو سوبرەی کوڕی ئەبو ڕوهم لە ئازادکردنی شاری سوس بوویەوە لەگەڵ سەربازەکانی چوویە دەرەوە هەتا لە ناوچەی (جوندەی سابوور) نیشتەجێ بوو، زوری کوڕی عبداللە ی کوڕی کولەیب گەمارۆدراویان بوو، لە سەری وەستان و شلەپەتیان پێ دەکردن و نۆرەیان پێ دەکردن بۆ جەنگ، ئەوان بەردەوام لەسەریان نیشتەجێ بوون تا لە موسڵمانانەوە بە ژیان پارێزی تیرباران کران، بە ڕاستی ئازادکردنی ئەم شارە و شاری نەهاوەندیش لە ماوەی دوو مانگدا بوو، موسڵمانان کت و پڕیان نەبوو جگە لەوەی کە ڕوویان لە هەر جێیەك دەکرد دەست بەجێ دەروازەی ئەو شارەیان بۆ ئاوەڵا دەکرا، پاشان ماڵاتەکان دەهاتنە دەرەوە، خەڵکانی بازاڕیش دەهاتنە دەرەوە، خەڵکەکەی پەرش و بڵاو دەبوونەوە و موسڵمانان کەسێکیان بۆ ناردن و وتیان چیتان دەوێ؟ وتیان: ژیان پارێزیتان بارانە بە سەرماندا و ئێمەش لێمان وەرگرتن، بڕیارمان لەسەرتان دا بە پاداشت لەسەر ئەوەی کە بەرمان لێ بگرن، ئەوانیش وتیان: ئێمە کاری وامان نەکردووە، ئەوانیش وتیان: ئێمە درۆمان نەکردووە و موسڵمانان لە نێوان خۆیاندا پرسیاریان لە یەکتری دەکرد، پاشان دەرکەوت کە بەندەیەکە و پێی دەڵێن یارمەتی دراو و بە ڕەچەڵەك لەوە، هەر ئەوە بوو کە نامەکەی بۆ نووسیبوون، ئەوانیش وتیان: بەڵا م ئەو تەنها بەندەیەکە، ئەوانیش وتیان: ئێمە ئازاد و سەربەستان لە بەندەکانتان ناناسین، بەڕاستی

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/٦٦).

ئارامی و هێمنی هاتووە ئێمە لە سەرینی و وەرمان گرتووە، نایشی گۆڕین ئەگەر ئێوە دەتانەوێت ئەوا بڕۆن، ئەوانیش پابەند بوون پێوەی و نامەیەکیان بۆ عومەر نوسی، ئەویش نامەیەکی بۆ نووسینەوە: خوای گەورە وەفای بە پیرۆز ڕاگرتووە وە ئێوەش بە وەفا نابن هەتا وەفاتان نەبێت، بە هۆی ئەوەی کە ئێوە لە گوماندان بیان سازێنن و وەفاتان هەبێت بۆیان، ئەوانیش بە وەفا بوون بۆیان و پاشان ڕۆیشتن،[1] ئەمەش نموونەیەکە کە بەڵگەیە لەسەر پێشکەوتنی بەرفراوان و دیاری موسڵمانان لە بواری ڕەوشت بەرزیدا ، گومانی تێدا نیە کە ئەم ڕەوشت بەرزیە لە هۆکارە سەرەکیەکانی هاتنە ژێر سایەی ئیسلامە بۆ بێباوەڕان بەم چڕوپڕی و خێراییە سەرقاڵکەرە.[2]

**١- نوعمانی کوڕی موقرن و شاری کەسکەر:**

نوعمانی کوڕی موقرن والی شاری کەسکەر بوون نامەیەکی نووسی بۆ عومەر (ﷺ): وێنەی من و شاری کەسکەر وەك لاوێك وایە کە سۆزانیەك لە تەنیشتیەوە بێت و خۆی بۆ بڕازێنێتەوە و بۆنی خۆش لە خۆی بدات، سوێندت دەدەم بە خودا کە لەسەر شاری کەسکەر لام بەریت، بمنێریت بۆ نێو سوپایەك لە سوپاکان، عومەریش نامەیەکی بۆ نووسی و فەرمووی: ئەگەر خەڵکانێك لە شاری نەهاوەندەوە هاتن، ئەوا ببە بە فەرماندەیان.[3]

---

١ـ هەمان سەرچاوە (٥/٧٢).
٢ـ التأريخ الاسلامي (١١/٢١٧).
٣ـ تأريخ الطبري (٥/١٠٩).

# دوانگەی سێیەم

## شەڕی نەهاوەند ( لوتکەی ئازادیەکان ) قۆناغی چوارەم ٢١ی کۆچی

موسڵمانان لە چەند شەڕی یەك لە دوای یەکدا سەرکەوتن بەسەر سوپای فارسدا، گیانی خۆیان بەخشی لە پێناو ڕاوەدوونانی ئەو سوپایە بەبێ ئەوەی هەلێکیان بۆ بەجێ بهێلن تا هەناسەك بدەن، هەر لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە گەورەیەیاندا لە جەنگی قادسیەی عێراقەوە تا جەنگی یەکلایی کەرەوەی نەهاوەند، چوار ساڵ تێپەڕی و موسڵمانان هەنگاویان لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تر هەڵدەگرت. ئەم سوپایانەش پێشڕەوی دەدا بە هەنگاوەکانی بەلکو دەست بگرێت و زاڵ بێت بەسەر سوپای پەککەوتەی ئیمپراتۆریەتی ساسانیدا، ئەگەر فەرمانی عومەر(ﷺ) نەبووایە ئەوا ئەو سوپایە کارەکانی خۆی لەبەردەم چیای زاگرۆس ڕادەگرت، تێی نەدەپەڕاند، ئەمەش لە پێناو دووبارە ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی ئەو سوپا ماندووە لە جەنگی بەردەوام، لەگەڵ ڕێکخستنی کاری بەڕێوەبردنی هەرێمە ئازادکراوەکان،[1] ئەم گورزەگرچك بڕە یەك لە دوای یەکانەی کە سوپای ئیسلامی گەیاندیە فارسەکان – بە تایبەتی لە پاش جەنگی قادسیە – لە خەشم و کوتانیان ڕەنگ بێ بەش نەبووبێت بۆ ئەوەی کە موسڵمانان زاڵ بن بەسەر بەرگری فارسەکاندا، چونکە سەرکردە و فەرمانندەکانیان نامەیان دەنارد بۆ یەزدەجوردی پادشایان و سەر لەنوێ هانیان دەدان بۆ جەنگی موسڵمانان، ئەویش سوور بوو لەسەر ئەم داوایە، پاشان دەستی کردە خۆ ئامادەکردن و خۆ سازدان بۆ جەنگی موسڵمانان لەوەی کە لە وڵاتەکەیدا هەندێ لە قەلاّ و پەناگەی مابوویەوە، یەزدجەرد نامەیەکی بۆ خەڵکی ناوچە چیانشینەکان لە دەروازەی سجستانی خۆراسان نووسی و داوای لێ کردن کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان بکەونە ڕێ و شاری نەهاوەندی کردە شوێنی بەیەك گەیشتنیان، یەزدجەرد واژووی لەسەر ئەوە کرد کە ئەوێ بکاتە مەڵبەندێك بۆ دوایین شوێنی بەرگری کردن و گۆڕەپانێك بۆ جەنگێکی چارەساز و یەکلایی کەرەوە بە جۆرێك نەهاوەند شارێکی نەبەزە و لە هەموو لایەکەوە بە چیا دەوری گیراوە و هیچ کەسێك لە ڕێگەی مەکۆ سەختەکانەوە ناتوانێت خۆی پێ بگەیەنێت، فارسەکان لەو شارەدا کۆبوونەوە بۆ یەزدجەرد و ژمارەیان دەگەیشتە (١٥٠) هەزار کەس (٣٠) هەزاریان لە دەروازەی حەلوان (٦٠) هەزاریان لە خۆراسانەوە بۆ حەلوان و (٦٠) هەزاری ترشیان لە سجستانەوە بۆ حەلوان هاتبوون، و یەزدجەرد فیرزانی کردە سەرکردەیان.[2]

---

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٨٤).
٢ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٨٥).

کاتێك سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لە شاری کوفە هەواڵی ئەم خۆ کۆکردنەوەیەی فارسەکانی بیست، نامەیەکی نووسی بۆ عومەرو بە ئاگای هێنایەوە بەمە و چاوەڕوانی فەرمانی لێکرد و بارودۆخەکەی بە هەموو لایەنەکانیەوە بۆ باس کرد، ئینجا عومەر لە شاری مەدینە خاوەن ڕا و ڕاوێژەکانی لە مەدینە کۆکردەوە لەم گرفتەدا ڕاوێژی پێ کردن، پاشان سوپایەکی نارد بۆ جەنگی فارس لە شاری نەهاوەند کە دوایین بنکە و بارەگایانی تێدابوو، ئەو ڕۆژە نوعمانی کوڕی موقرن کاربەدەستی سەر کەسکەر بوو، نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە و تیایدا فەرمووبووی: (نموونەی من و نموونەی کەسکەر وەك کەسێکی لاو وایە کە لە تەنیشتیەوە کچە سۆزانیەك هەبێت و خۆی بۆ بڕازێنێتەوە و خۆی بۆ بۆن خۆش بکات، بۆیە داوات لێ دەکەم کە لەو کارە کەنارم بخەیت لە کەسکەر و ڕەوانەی نێو یەکێك لە سوپاکانم بکەیت).[1]

عومەر ڕاوێژی بە دەستەی ڕاوێژەکەی کرد و بڕیاریدا کە لە شاری نەهاوەند نوعمانی کوڕی موقرن بکاتە سەرکردەی سوپای موسوڵمانان، خەلیفە بە مەبەستی کۆکردنەوەی سوپای موسوڵمانان پلانێکی دارِشت بەم شێوەیەی خوارەوە:

- نوعمانی کوڕی موقرنی موزنی (والی کەسکەر) دەبێتە فەرماندەی گشتی سوپاکە.
- حوزەیفەی کوڕی یەمان دەبێتە فەرماندەی ئەو دەستەیەی کە خەڵکی کوفە کۆکراوەتەوە.
- عبداللە کوڕی عومەر دەبێتە فەرماندەی ئەو دەستەیەی کە لە ئەنصار و موهاجرەکان کۆکراوەتەوە.
- سەلمانی کوڕی قیس، حەرمەلەی کوڕی مەدیتە، ڕزی کوڕی کولەیب، ئەسوەدی کوڕی ڕەبیعە و کەسانی تر لە فەرماندەی موسلمانان لە ئەهواز و تەواوی وڵاتی فارس: یەدەك و سەرقاڵکەری سوپای دوژمنان دەبن.

دواتر عومەر نامەی ئامۆژگاری و فەرمانەکانی خۆی نوسی بۆ والی و فەرماندەکان، عومەر توانی سوپایەکی ٣٠ هەزار سەربازی کۆ بکاتەوە،[2] سوپای ئیسلامی بە سەرکردایەتی نوعمانی کوڕی موقرن بەرەو شاری نەهاوەند کەوتە جوڵە.

نوعمان بینی کە شاری نەهاوەند وەك قەڵایەکی قایم تەنراوە و بەدەوریدا خەندەقێکی قوڵ لێدراوەو بەردەم خەندەقەکەش بەتەلی دڕکاوی چوارگۆشە تەنراوە، کە سەرێکی لەزەوی دابوە و سەرەکانی تری هەڵواسراون، تا ببنە کۆسپ لەبەردەم پێشڕەوی هێرش بەران یان زیان گەیاندن بە ئەسپ سوارەکان بەهۆی بریدار بوونی پەل و پۆی ئەسپەکانیان ئەمەش ڕێگریان لێ دەکات لە ڕێ کردن، بەڵام سوپای فارس لە نێو چوار دیواری شاردان و لەو کەسانە کە پێك هاتوون کە لە نەهاوەند بوون( بەشداری شەڕی قادسیەیان نەکردووە) فیرزان تیر هاوێژەکانی بە ئاراستەی ڕوگەکانی پێشڕەوی پێشبینی کراوی موسوڵمانان دانا تا سەربازانی ئەوان تیرەکانی خۆیان بەسەریاندا ببارێنن ئەگەر هەوڵی پێشڕەوییاندا.[3]

---

١ـ تأريخ الطبري (١٠٩/٥).
٢ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٨٦).
٣ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٨٨).

ئەسپی موسوڵمانان خۆی دا بە تەلە دڕکاوییەکان و پاشان بە خەندەقەکەدا و پاشتر نەییان توانی تێپەڕێنن، لە کاتێکدا کە تیرهاوێژە فارسەکان تیر بارانی ئەو سەربازە موسوڵمانانەیان دەکرد کە توانیان لە شوراکەیان نزیك ببنەوە، ئەم کارە ماوەی دوو ڕۆژی خایاند و نوعمان پێی باش بوو کە سەرکردەکانی سوپای ئیسلامی کۆ بکاتەوە بۆ تاووتوێکردنی بارودۆخەکە ، ئاکامی کۆبوونەوەکەیان بەم ئەنجامە گەیشت، کە خاوەنی پیلانەکە طلحیةی کوڕی خوەیلەدی ئەسەدی بوو:

١- ئەسپ سواری موسوڵمانان دەردەپەڕێ بۆ هەڵگیرساندنی شەڕ و جەنگ لەگەڵ فارس، تا دەریان دەپەڕێنن لە شورەکەیان.

٢- ئەگەر ئەوان لە شورەکەیان هاتنە دەرەوە ئەسپ سوارانی موسوڵمان لەبەر دەمیاندا دەکشێنەوە و ئەوانیش هەست بە پاشەکشە و لاوازیان دەکەن و چاودەبڕنە سەرکەوتن و خۆیانی پێ دەگەیەنن ئەوانیش لەپێشیانەوە ڕێ دەکەن.

٣- ئەسپی موسوڵمانان تێپەڕ دەبێت و- خۆی بە شکست خواردوو نیشان دەدات- و فارسەکان کەمەن کێش دەکات بۆ دەرەوەی شورە و قەڵاکانیان.

٤- لە پڕێکدا ئەو موسوڵمانانەی کە- بۆسە لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراو دادەنێن بۆ فارسەکان لەپشت ئەسپی موسوڵمانانەوە- گەمارۆیان دەدەن لە کاتێکدا ئەوان لە مەڵبەند و خەندەق و شورەکانیان دورن،[1] نوعمان ڕێگەی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم پلانە خۆش کرد و سوپاکەی بەسەر چەند دەستەیەکدا دابەش کرد بەم شێوەیەی خوارەوە:

- **لەشکری یەکەم:** ئەسپ سوارەکان بوون بە سەرکردایەتی قەعقاعی کوڕی عەمر و کاری گرنگ و ئەرکی ڕاپەڕاندنی کاری بە هەڵە بردنە بە هاودەنگی بۆ پلانی دەستور پێ دراو، تێکشکاندنی شورەی دوژمن و تێك هەڵگژان لەگەڵیدا.

- **لەشکری دووەم:** پیادە بە سەرکردایەتی ئەو، کاری گرنگی و ئەرکی مانەوەیە لە شوێنە چەسپاو جێگیرەکان بە چاوەڕوانی گەیشتنی فارسەکان بۆ ئەو جێگەیە بە جۆرێ جەنگ لە جەنگێکی بەرەیدا لەگەڵیدا بەرپا دەبێت.

- **لەشکری سێیەم:** ئەسپ سوارەکان، هێزێکی لێدەرن لە سوپا، ئەرکی مانەوەیە لە شوێنە جێگیرەکاندا پاشان هێرش کردنە سەر هێزی دوژمن لە دولاوە.

-پاشان نوعمان فەرمانی دا بەو موسوڵمانانەی کە لە بۆ سەدان (کە خۆیان لە زەوی گیر بکەن و نەجەنگن تا مۆڵەتیان پێ دەدرێت)[2] موسوڵمانان پابەند بوون بەو فەرمانەوە و چاوەڕوانی ئاماژەیەکی نوعمانیان دەکرد بۆ هێرش کردن، قەعقاعیش ڕێگەی بە ڕاپەڕاندنی ئەو پلانە داو سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا، بەڕاستی ئەم کاری لەناکاوەی فارسەکان زۆر کارێکی سەرسوڕهێنەر بوو

---

١ـ تاريخ الطبري (٥/١١٣).

٢ـ هەمان سەرچاوە (٥/١١٤).

کاتێك کە خۆیان بەو شێوەیە دیتەوە، کە لە دوایین وێستگەدا گەمارۆ دراون لە نێوان ئەو سوپا ئیسلامیەی کە شمشێرەکانیان ڕێگە پێدراو بوون بۆ درونێنە کردنی گەردنی بێباوەڕان و هاوبەش پەیدا کەران و ناچارکردنی هاوبەش پەیدا کەران بە هەڵهاتن تا خەندەقەکانیان بکەنە قەڵایەك بۆ خۆیان ئەوە نەبێ کە کەوتنە نێو خەندەق و تەڵە دڕکاویەکانیانەوە، موسوڵمانانیش بەردەوام بوون لە ڕاوەدونانیان شمشێرەکانیان لە پشت و پێشەوەی فارسەکان خستە کار تا هەزارانیان لێ کوشتن لە خەندەقەکان و قەعقاع توانی فیرزان ڕاو بنێ و پاشان گرتی و کوشتی، موسوڵمان پاش ئەم شەڕە چونە نێو شاری نەهاوەند و دواتر شاری هەمەدان، پاش ئەوە بەڕێ کەوتن پاکتاوی ئەو ناوچانەی کە لە ولاتی فارس مابونەوە تەواویان کرد بەبێ هیچ بەرهەڵستی یەك کە شیاوی باس کردن بێت، پاش نەهاوەندیش بە هیچ شێوەیەك سوپای فارس نەیانتوانی خۆیان ڕێکبخەنەوە، موسوڵمانان بوونەخاوەنی ولاتەکەیان و لەبەر ئەوە جەنگی نەهاوەند ناونرا بە(( ترۆپکی ئازادییەکان)).[١]

## تێگەیشتوی عومەر لە جەنگی نەهاوەند دا لەچەند کارێکدا بوو لەوانە:

١- تێکرژان و بەرگرتنی دوژمن لە کۆبوونەوە بە جۆرێ عومەر(ﷺ) هەر بەوەوە نەوەستا و فەرمانی دایە کاربەدەستانی لە کوفە و بەسرە و موسوڵمانان لە ناوچەکانی دورگەی عەرەب کە کۆ ببنەوە بۆ جەنگی فارس بەڵکو عومەر فەرمانی دا بە سەرکردەکانی لە ناوچەی ئەهواز و تەواوی ناوچەکانی ولاتی فارس کە بەر لە کۆبوونەوەی دوژمنان بگرن و ئەم کارەی سپارد بە سەلمی کوڕی ئەلقین و حەرمەلەی کوڕی مەرتیە و ڕزی کوڕی کولەیب و ئەسوەدی کوڕی ڕەبیعە و ئەوانی تر کە سنورێك لە نێوان فارس و ئەهواز بڕەسێنن و بەر لە فارس بگرن لە پەیوەندی کردن بە سوپای تێکرژاوی نەهاوەندەوە، بەم شێوەیە ئەو سەرکردانە لە ناوچەی(( تەخوم)) ی ئەسفەهان و فارس خۆیان جێگیر کرد و هاوکاری و کۆمەکیان لە سوپای نەهاوەند بڕی.[٢]

٢- دامەزراندن و دیاریکردنی سەرکردەیەك ئەگەر سەرکردەی سوپا کۆچی دوایی کرد- هەروەك ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە جەنگی موئتە ٨ ی کۆچی بەرامبەر ٦٢٩ ی زاینی ئەنجامی دا کاتێك کە زەییدی کوڕی حارسەی کردە فەرماندەی موسوڵمانان و ئەگەر شەهید کرا ئەوا جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب شوێنی دەگرێتەوە و ئەویش شەهید بوو ئەوا عبداللە کوڕی ڕەواحە دەبێتە فەرماندە، عومەری فاروقیش، کە ڕۆژی جەنگی نەهاوەند نوعمانی کردە فەرماندەی موسوڵمانان، ئەگەر نوعمان دووچاری شتێك بویەوە ئەوا حوزەیفەی کوڕی یەمان شوێنی دەگرێتەوە و ئەگەر حوزەیفەش دوچاری شتێك هات ئەوا نەعیمی کوڕی موقرن شوێنی دەگرێتەوە، نوعمانیش بە سەرکردایەتی بلند و بەرزی

---

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٩٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

ناسرابوو، کە ئەمەش لە چەند کارێکدا دەرکەوت لەوانە:

## ا/ پەیبردن پێش چوون بۆ جەنگ:

نوعمان پێش بەرێکردنی سوپاکەی بەرەو نەهاوەند کە ( بیست و شتێك فەرسەخ) لە نەهاوەندەوە دوور بوو ئەرکی ئەم سوپایەی سپارد بە طلحیتی کوڕی خوەیلەدی ئەسەدی و عەمری کورشی ئەبی سەلمانی عنزی و عەمری کوڕی مەعدیە کردیی زوبەیدی و پەیبردنی ڕێگە گە یشتووەکە پێی و ناسینی ئەوە کە لە نێوان ئەوو دوژمندایە، ئەم سێ سەرکردەیە شەوو ڕۆژێك ڕێگەیان بڕی و پاشان گەرانەوە تا فەرماندەی گشتی ئاگادار بکەنەوە کە هیچ شت و کەسێك لە نێوان ئەوان و نەهاوەند دا نیە، دیارە ئەم شاندەش هاوشێوەی ئەوە بوو کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بە (لەشکری پێشەنگ) ناسراوە کە دەکەوێتە پێش هەر سوپایەك بۆ پەیبردن بە ڕێگا پێش پێشڕەوی کردن تیایدا، لەگەڵ ئەمەش نوعمان هەموو کارێکی یەدەکی پێویستی خۆی وەرگرتبوو لەکاتی هەر جوڵەیەك بە سوپاکەی ئەو لەسەر ئەو کۆ کردنەوەیەی بەڕێ کرد بەو شێوەیەی کە دەبوو بڕوات.

## ب/ کردەی بە هەڵە بردن:

ئەو کردەی بە هەڵە بردنەی موسوڵمانان لە شاری نەهاوەند ڕایان پەڕاند یەکێکە لە جوانترین ئەو مانۆڕە سەربازیانە کە دەکرێت سوپایەك لە مێژووی کۆن و نوێدا ڕاییەڕاندبێ، کاتێك موسوڵمانان کەم توانا بوون لە تێکشکاندنی شورەی شارە پتەو و پارێزراوەکە بە خەندەقێك کە چوار دەوری گیرا بوو بە تەلی دڕکاوی و تیر هاوێژی شارەزا و لێهاتووەوە دایان نابوو کە ئەو گەمارۆیە بەبێ مشت و مڕ ماوەیەکی زۆر و دوور و درێژ بخایەنێ و فارسە گەمارۆ دراوەکانی نێو شورەی شارەکەش ئەو خۆراك و هاوکاریەی کە پێیانە بەشی ئەو ماوە دوور و درێژەیان ناکات، بۆیە وایان بە باش زانی کە هەوڵی دۆزینەوەی فێڵێك بدەن بۆ تێپەڕاندنی دوژمن و هێنانە دەرەوە لە شارەکەدا، تا لە دەرەوەی ئەو شورەیاندا بەرەنگاریان ببنەوە و بەم شێوەیەش گۆڕەپانی جەنگەیان بەسەردا دەسەپێنن کە خۆیان هەڵیان بژاردووە و موسوڵمانان دیارییان کردووە، بەم شێوەیە دوژمنان دەرپەڕێنران بۆ جێگەیەك کە موسوڵمانان دیارییان کردبوو وە بۆسەیان بۆ دانابوون ، پاشان لەو شوێنەدا ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە لەو جێگە بەرەبییانەدا و لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دان دوژمن ئەمەی بە کارێکی کتو پڕی زانی و تۆقی، پاشان سەرکەوتن لە دەستی بەربوویەوە و دوچاری تێکشکان هات و لێرەشدا هیچ فرۆفێڵێك نیە کە دوژمن پەنای بۆ بەرێت بۆ دەرپەڕاندنی دوژمنەکەی و سەرکەوتن بەسەریدا کە باشتر بێت لەم فێڵە.[1]

---

١ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٢٩٥، ٢٩٦).

## ج/ هەڵبژاردنی کاتی هێرش کردن:

کتێبەکانی مێژوو زۆرێك دەربارەی خۆگری نوعمانی کوڕی موقرنی خۆگر دواون و لە هەڵبژاردنی کاتی ئەو هێرشەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی خۆرئاوا بووندا و لە کاتی گەرانەوەی سێبەر و هەڵکردنی بای توندا پێی خۆش بووە، لەم شەڕە چارەنوس ساز و یەکلایی کەرەوەیەدا نوعمانی کوڕی موقرن بە پلەی شەهیدی گەشت و کاتێك کە هەواڵەکە گەشتە عومەر فەرمووی(( ئێمە هەر هی خوداین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە)) پاشان عومەر بە کوڵ گریا و فرمێسکی وەك جۆگە هەڵبەست و زۆر دڵتەنگ بوو ،پرسیاری ژمارەی شەهیدانی کرد ،ئەوانیش ناوی چەند شەهیدێکیان هەڵدا بەڵام عومەر هیچ کامیانی نەدەناسین هەر بۆیە فەرمووی :خوای گەورە بە شەهیدی ڕێزی لێنان، چونکە دەم و چاو و ڕەچەڵەکیان دەناسێت وە ئەمانە نە ناسراون عومەر ئایا چ کارێك دەکەن؟[١]

ئەوەی شیاوی باسکردنە ئەوەیە موسڵمانان لە نێو غەنیمەتەکانی نەهاوەندا دوو دەفری داریانیان دۆزیەوە کە پڕ بوو لە خشڵی پوخت لە کەل و پەلەکانی کیسرا و حوزەیفەی فەرماندەی سوپاکە لەگەڵ سائبی کوڕی ئەقرەع ناردنی بۆ عومەر، کاتێك گەشتنە دەستی عومەر فەرمووی: بیان خەرە بەیتولمالەوە، خۆت بگەیەنە بە سەربازەکانت، سائب سواری وڵاخەکەی بوو و گەرایەوە عومەریش کەسێکی بە دوایدا نارد کە لە کاتی ڕۆیشتندا خۆی لێ پەنا بدات تا گەشتە کوفە گێڕایەوە،[٢] کاتێك کە عومەر بینی فەرمووی: ئەوەی کە بۆ من و سائبە هیچێك نیە جگە لەوەی کە من تەنها ئەو شەوە نووستووم کە تیایدا دەرچووم، ئایا فریشتەکانیش ڕامدەکێشن بۆ لای ئەو دوو دەفرەی کە ئاگرێك هەڵدەستێنێت؟ بە لێنم پێ دەدات بە سووتان ئەگەر دابەشیان نەکەم وەرە بیانبە و بیان فرۆشە بۆ ڕزق و ڕۆزی موسڵمانان، پاشان ئەو دوو دەفرە لە بازاڕی کوفە فرۆشران.

خوای گەورە لێت ڕازی بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران بەڕاستی بە شوێن هەنگاوەکانی پێغەمبەرەکەتدا ڕێت کرد سەرفراز بوویت و ئیسلام و موسڵمانانت سەرفراز کرد، خوای گەورە نیگا و سروشی شوێنکەوتەیتمان پێ ببەخشیت و بە دوورمان بگریت لە خراپەی داهێنان.[٣]

پاش جەنگی نەهاوەند سەرکردەکانی فارس لە هەمەدان و توبرستان و ئەسپەهانەوە کەوتنە هەڵپەهەڵپی ئاشتی و ڕێککەوتن و ئەمەش لەسەر بە دوای یەکداهاتندا تەواو کاری بۆ کرا.[٤]

---

١ـ البداية والنهاية (١١٣/٧).
٢ـ البداية والنهاية (١١٤/٧).
٣ إتمام الوفاء (ص: ٩٨).
٤ إتمام الوفاء (ص: ٩٩- ١٠١).

# دوانگەی چوارەم

## گەشت و گوزار لە وڵاتی عەجەم (قۆناغی چوارەم):

پاش سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی نەهاوەند فارسەکان هیچ کارێکیان بۆ نەڕەسا ،موسڵمانانیش دەستیان دایە گەشت و گوزار لە وڵاتی عەجەم و عومەر (ﷺ) ڕێگەی ئەم کارەی پێدان و لە پاش نەهاوەندیش موسڵمانان شاری جە یان – کە شاری ئەسپەهانە[1]- ئازاد کردن لە پاش جەنگێکی زۆر و چەندین گرفتی درێژخایەن ڕێکەوتنیان لەگەڵ موسڵمانان گرێبەست و عبداللە ی کوڕی عبداللە پەیامی ئاشتی بۆ نووسین و پاشان (٣٠) کەسیان هەڵهاتن بۆ شاری کرمان ڕێککەوتن لەگەڵ موسڵمانان، لە ساڵی (٢١)ی کۆچیدا ئەبو موسای ئەشعەری شاری قوم و کاشانی[2] ڕزگار کرد و سوهەیلی کوڕی عومەریش شاری کرمانی ئازاد کرد.

### یەکەم: دووەمین ڕزگارکردنی هەمەدان (٢٢)ی کۆچی:

پاش ئەوەی موسڵمانان لە ڕزگارکردنی شاری نەهاوەند بوونەوە شاری حەلوان و هەمەدانیان ئازاد کرد و دواتر خەڵکی شاری هەمەدان ئەو پەیمانی ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ قەعقاعی کوڕی عەمر گرێیان دابوو هەڵیان وەشاندەوە، بەم شێوەیە عومەر (ﷺ) نامەیەکی بۆ نەعیمی کوڕی موقرن نووسی کە بەرەو هەمەدان بەڕێ بکەوێت ئەویش ڕۆیشت تا لە (ثنیة العسل) لایدا، هاتە خوارەوە بۆ سەر هەمەدان، شارەکەی گەمارۆی دا دواتر داوای ڕێککەوتنیان لێ کرد و ئەویش لەگەڵیان ڕێککەوت و چوویە شارەکەوە وە لە کاتێکدا کە نەعیم بە دوانزە هەزار سەربازی موسڵمانەوە لە شارەکە بوو خەڵکان و دانیشتوانی ناوچەکانی دەیلەم و ڕەیی و دانیشتوانی ئازربایجان نامەیان بۆ یەکتری نووسی و لە کۆمەڵێکی زۆردا ڕێککەوتن تا جەنگ لە دژی نەعیمی کوڕی حەرب بەرپا بکەن، ئەویش بە هەموو ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵی بوون بۆیان دەرپەڕی و لە ناوچەیەك کە پێی دەوترێت (داج الروذ)[3] بەیەك گەیشتن و جەنگێکی سەخت و دژواریان لە دژی یەکتری سازدا ،ئەم شەڕە جەنگێکی هاوشێوەی جەنگی نەهامەند بوو وە لەو کەمتر نەبوو موسڵمانان ژمارەیەکی زۆر پاسەوانی بێباوەڕان و هاوبەش پەیداکەرانیان کوشت، دواتر میری ناوچەی دەیلەم کوژرا و گروپ و تاقمەکەیان پەرتەوازە

---

١ـ یەکێکە لە شارە گەورەکانی وڵاتی فارس کە ئێستا پێی دەوترێت ئەسفەهان.

٢ـ دوو شارن لە شارەکانی ئێران.

٣ـ شوێنێکە لە نێوان هەمەدان و قەزوێن.

بوون، کۆبوونەوەکەیان شکستی خوارد، پاش ئەوەی هەندێکیان لە شەڕەکە کوژران، نەعیمی کوڕی موقرن یەکەمین کەس بوو کە لە ڕیزی موسڵمانان جەنگی لە دژی دەیلەمیەکان بەرپاکرد،[١] نەعیمی کوڕی موقرن نامەیەکی بۆ عومەر نووسی و لەو بارەیەوە تێی گەیاندو هەندێ غەنیمەتی بۆ نارد، جگە لە پۆستەکە هیچ شتێکی تر بۆ عومەر سەیرو کتوپڕ نەبوو، عومەر فەرمووی: ئایا مزگێنی دەرە؟ ئەویش وتی: بەڵکو عەروەیە، کاتێك کە ستایشی لەسەر کرد، ئایا مزگێنی دەرە؟ ئەویش گیزەگیزی لێوە هات و فەرمووی: مزگێنی دەرە، عومەر فەرمووی: پەیامبەرێکی خۆش و ئاوازو سەماکی کوڕی عوبەید؟ ئەویش وتی: پەیامهێنێکی خۆش ئاواز، عومەر فەرمووی: هەواڵەکەت؟ ئەویش وتی: مزگێنی بە پاکسازی و سەرکەوتن و هەواڵەکەی پێدا، عومەر سوپاسی خوای گەورەی کرد و فەرمانی دا کە قورئانێك بهێنن و پاشان خوێندیان بەسەر خەڵیدا و سوپاسی خودایان کرد سماکی کوڕی موخرقە و سماکی کوڕی عوبەید و سماکی کوڕی خورشە وەك شانێکی شاری کوفە پێنج یەکی غەنیمەتەکانیان هێنا بۆ عومەر، عومەر هەواڵی ڕەچەڵەکی پرسیار کردن و ئەوانیش ناو و ڕەچەڵەکی خۆیان بۆ خوێندەوە کە (سماك و سماك و سماك)ن عومەر فەرمووی: خوای گەورە بەرەکەتتان تێ بخات، خوای گەورەا ئاینی ئیسلامیان پێ ڕابگرە، پشتیوانیان لێ بکە بە ئاینی ئیسلام.[٢]

## دووەم: ڕزگارکردنی (ڕیی) ساڵی (٢٢) ی کۆچی:

نەعیمی کوڕی موقرن کرایە ئەمیر بەسەر یەزیدی کوڕی قەیسی هەمەدانیەوە، بە خۆی و سوپاکەیەوە ڕۆیشت تا گەشتە ناوچەی (ڕیی)،[٣] هەر لەوێدا گەیشتە کۆمەڵێکی زۆری بێباوەڕان و هاوبەش پەیداکەران، لە بناری چیای ڕی دەستیان کردە شەڕ و پێکدادان، موسڵمانان بە تەواوی ئارامیان گرت و بێباوەڕان تێکشکان و نەعیمی کوڕی موقرن هەر لەوێ ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن، هەروەها غەنیمەتێکی گەورەی وەهایان لێ گرتن کە نزیك بوو لەو غەنیمەتەی کە موسڵمانان لە شاری مەدائن گرتیان، هەروەها لەگەڵ ئەبو فەرخانی ناسراو بە زەینەبی ڕێککەوت لەسەر ناوچەی ڕەی و لەسەر ئەمەش پەیمانی بۆ نووسی، پاشان نەعیم نامەیەکی بۆ عومەر نووسی و هەواڵی ڕزگارکردنی ناوچەکە و ناردنی پێنج یەکی غەنیمەتەکانی پێدا و سوپاس و ستایشی خوای گەورەیشی لەسەر ئەم کارە کرد.[٤]

## سێیەم: ڕزگارکردنی قۆمیس و گورگان ساڵی (٢٢)ی کۆچی:

کاتێك کە مزگێنی دەر هەواڵی ڕزگارکردنی شاری ڕی هێنا عومەر نامەیەکی نووسی بۆ نەعیمی کوڕی موقرن کە سوەیدی کوڕی موقرنی برای ڕەوانەی قۆمیس[٥] بکات ،سوەید ڕووی لێنا، هیچ شتێك

---

١ـ ترتيب وتهذيب البداية والنهاية.
٢ـ تأريخ الطبري (٥/١٣٤).
٣ـ ری: شارێکی بە ناوبانگە کە ٢٧ فەرسەخ لە قەزوینەوە دوورە.
٤ـ تأريخ الطبري (٥/١٣٦، ١٣٧).
٥ـ قۆمیس: دەکەوێتە ناوچەی کۆتایی چیاکانی تویرستانی نێوان ری و نیسابوور.

ڕووبەڕووی نەبوویەوە و تەنانەت بە ئاشتی چوویە ناوی و سەربازگەیەکی لەوێ دامەزراند و نامەیەکی ئاشتی بۆ خەڵکەکەی نووسی و کاتێك کە سوەید سەربازگەکەی لەقۆمیس دامەزراند، هەر یەکە لە دانیشتوانی ناوچەکانی گورگان،[١] تویرستان،[٢] چەند ناوچەیەکی تریش هاتنە لای و داوای ڕێککەوتنیان بە سەرانە لێکرد، ئەویش لەگەڵ هەموویان ڕێککەوت وە پەیام و نامەی ئاشتی بۆ هەر یەك لە ناوچەکان نووسی.[٣]

## چوارەم: ڕزگارکردنی ئازربایجان ساڵی (٢٢)ی کۆچی:

پاش ئەوەی نەعیمی کوڕی موقرن جاری دووەم شاری هەمەدانی ڕزگارکردەوە، ئەو کاتە و لە ژێر فەرمانی خۆیدا بوکەیری کوڕی عبدالله ی لە هەمەدانەوە ڕەوانەی ئازربایجان کرد،[٤] بە فەرمانی عومەر ئەبی دووجانە[٥] سماکی کوڕی خورشە دواکەوت، پاشان ئەسفەندیار گەشت بە بوکەیر و هاوڕێکانی پێش ئەوەی کە سماك پێی بگات بەم شێوەیە شەڕ و جەنگ لە نێوانیاندا ڕوویدا و خوای گەورە هاوبەش پەیداکەرانی دووچاری شکستێکی گەورە کرد و بوکەیر ئەسفەندیاری بە دیل گرت و پێی فەرموو: ئایا ئاشتێتی پێ خۆشە یان جەنگ؟ ئەویش وتی: ئاشتی، بوکەیریش فەرمووی: بمگرە لای خۆت ئەویش گرتی و دواتر شارەکانی تری یەك لە دوای یەك ئازادی کرد،عوتبەی کوڕی فەرقەدیش لە بەرامبەریدا و لە لایەنکی تر لە ئازربایجان یەك لە دوای یەك شارەکانی ئازاد دەکرد، دواتر نامەیەکی عومەر هات کە تیایدا ئاماژە بەوە دەکات کە سماك لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوەو بوکەیر بڕوات بۆ ناوچەکانی باب و سماك ببێتە جێگری عوتبەی کوڕی فەرقەدو پاشان عومەر تەواوی ئازربایجانی بۆ عوتبە کردەوەو بوکەیریش ئەسفەندیازی دا بە دەستەوە، بەهرامی کوڕی فەرخزاد هاتەڕێگەی عوتبەی کوڕی فەرقەد و عوتبە بەهرامی بەزاند و پاشان بەهرام هەڵهات، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە ئەسفەندیاز وتی ئێستا ئاگری شەڕ کوژاوەتەوە و ڕێککەوتنەکەمان تەواوە، دواتر لەگەڵیدا ڕێککەوت و ئاشتی گەرایەوە بۆ ئازربایجان، عوتبە و بوکەیر بەمە نامەیەکیان نووسی بۆ عومەر ،پێنج یەکی غەنیمەتەکانیان بۆ نارد، عوتبەی کاتێك گەشتە لای فەرمانبەرداری ئازربایجان نامەیەکی ئاشتی بۆ خەڵکەکەی نووسی.[٦]

## پێنجەم: ڕزگارکردنی باب ساڵی (٢٢)ی کۆچی:

عومەر نووسراوێکی بۆ ئەم جەنگە نووسیبوو سوراقەی کوڕی عەمری ناسراو بەذي النور— کردە فەرماندەی سوپاو ئەم فەرماندەی عومەر لە کاتێکدا بوو، کە سوراقە سەرقاڵی کۆکردنەوەکانی بوو ،

---

١ـ گورگان:- شارێکی گەورەی نێوان تویرستان و خۆراسانە.

٢ـ تویرستان:- شارێکی بەرفراوانە چیایەکی زۆر باڵی بەسەردا کێشاوە بە زانایان و ئەدیبان بە ناوبانگە.

٣ـ تهذيب البداية والنهاية (ص: ١٦١).

٤ـ ئازربایجان: هەرێمێکی بەرفراوانە چیایەکی زۆر باڵی کێشاوە بەسەردا ناوچەی دەیلەمی لەڕوو دەوەستێتەوە.

٥ـ هاوەڵێکی بە ناوبانگە.

٦ـ تأريخ الطبري (١٤١/٥، ١٤٢).

کاتێك گەیشتە پێشەنگی سەربازەکان کە عبدالرحمان کوڕی ڕەبیعە بوو بۆ ئەو پادشایەی کە لە باب بوو،[1] ئەویش شەهربەراز بوو، میری ئەرمینیاش هەر ئەو کەسە بوو لە ماڵی میر بەنی ئیسرائیلی کوشتووە لە سەردەمانی کۆنیشدا شامی گرتووە، بەم شێوەیە شەهربەراز نامەیەك دەنووسێت بۆ عبدالرحمان و داوای پارێزراوی لێ دەکات و عبدالرحمان کوڕی ڕەبیعەش ئەوەی پێ دەبەخشێت و میر لێی دێتە پێشەوە، ئەم کارەش بە لادانەوەی بۆ لای موسڵمانان کۆتایی هات و واش نیشان درا کە ئەو ئامۆژگاری کاری موسڵمانانە و عبدالرحمان پێی فەرموو: لە سەرووی منەوە پیاوێك هەیە پێویستە تۆ بچیتە لای ئەو، بۆیە عبدالرحمان ناردی بۆ لای سوراقەی کوڕی عەمری فەرماندەی سوپا، پاشان شەهربەراز داوای پارێزراوی لەسوراقە کردو ئەویش نووسراوێکی لەم بارەیەوە بۆ نووسی و پاشان سوراقە بوکەیری کوڕی عبداللە ی لەیسی و حەبیبی کوڕی موسلمە و حوزەیفەی کوڕی ئوسەید و سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی نارد بۆ نێو ئەو چیانشینانەی کە لەو دەوروبەرەدان لە ئەرمینیە کە چیای ئالانە و نفلیس و موقانە، دواتر بوکەیر موقانی ئازاد کرد و نووسراێکی ژیان پارێزی بۆ نووسی لەم ماوەیەدا سوراقەی کوڕی عەمری فەرماندەی موسڵمانان شەهید بوو لە پاش ئەو عبدالرحمان کوڕی ڕەبیعە شوێنی گرتەوە، کاتێك ئەم هەواڵە گەشتە عومەر لە شوێنی خۆی دانا و فەرمانی پێدا بە ڕزگارکردنی ناوچەی ئەلتورك.[2]

## شەشەم: یەکەمین جەنگی ناوچەی تورك:

کاتێك نووسراوی عومەر گەشتە عبدالرحمان کوڕی ڕەبیعە تیایدا فەرمانی پێکرد کە ناوچەی تورك ڕزگار بکات، عبدالرحمان بەڕێکەوت تا بابی تێپەڕاند بەو شێوەیەی کە عومەر فەرمانی پێدابوو، لەم کاتەدا شەهربەراز پێی وت: چیت دەوێ؟ ئەویش فەرمووی: بەلنجەری پادشای تورکم دەوێت، شەهربەرازیش وتی: ئێمە بە پەیمان لێ وەرگرتن لێیان قایل دەبین، ئێمە لە پشتەوەی بابین، عبدالرحمان فەرمووی: خوای گەورە پەیام هێنێکی بۆ ئێمە ناردووە کە لەسەر زاری خۆی بەڵێنی سەرکەوتن و دەسەڵاتداری پێداوین و ئێمەش تا ئێستا هەر سەرکەوتووین، دواتر عبدالرحمان لەگەڵ تورکەکان جەنگا لە وڵاتی بەلنجەر و (٢٠٠) فەرسەخ چوویە نێو وڵاتەکەیان و چەند جارێك تیایدا جەنگا، لەسەردەمی عوسمانیشدا (ﷺ) چەند ڕووداوێکی سامناك تیایدا ڕوویدا.[3]

## حەوتەم: جەنگی خۆراسانی ساڵی (٢٢)ی کۆچی:

ئەحنەفی کوڕی قەیس ئاماژەی دا بە عومەرکە ڕزگارکردنەکانی وڵاتی عەجەم بەرفراوان بکات و تەنگەڵانی بخاتە سەر کیسرای یەزدجەرد، چونکە ئەوە فارسەکان و سەربازانی هان دەدات بۆ جەنگی

---

١ـ باب: شارێکی گەورەیە لەسەر دەریای توبرستان کە دەریای خەزەرە.
٢ـ تاریخ الطبري (١٤٥/٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە (١٤٢/٥ بۆ ١٤٧).

موسڵمانان، عومەر لەم کارەدا ڕێگەی بە ڕایەکەی ئەحنەف دا و فەرمانی پێدا کە ولاتی خۆراسان ڕزگار بکات، ئەحنەفیش سوپایەکی گەورە و چڕوپڕی ڕێکخست و بەمەبەستی جەنگان لەدژی یەزدجەرد کەوتەڕێ، پاشان ئەحنەف چوویە نێو خۆراسان و هوراتی بە زۆر ئازادکرد، سوحاری کوڕی فولانی عەبدی تێدا کردە ئەمیر و پاشان بەرەو ناوچەی مەرو ئەلشاهجان[1] کەوتەڕێ کە یەزدەجوردی تێدابوو، ئەحنەف لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتیدا موترەفی کوڕی عبداللە ی کوڕی ئەلشوخیری نارد بۆ نیساپور[2] و حارسی کوڕی حەسانی نارد بۆ سەرخەس،[3] کاتێك کە ئەحنەف لە مەرو ئەلشاهجان نزیك بوویەوەن یەزدجەرد بەجێی هێشت و ڕووی کردە مەرو ئەلروذ،[4] دواتر ئەحنەف مەرو ئەلشاهجانی ئازاد کرد و تیایدا نیتەجێ بوو ،یەزدجەرد کاتێك کە لە مەرو ئەلروذ نیشتەجێ بوو پەیامێکی نارد بۆ خاقانی پادشای تورك و داوای یارمەتی لێکرد، نامەیەکی نووسی بۆ پادشای سەغد و داوای یارمەتی لێکرد وە پەیامێکی نارد بۆ پادشای چین و کۆمەکی پێ خواست ،ئەحنەفی کوڕی قەیس کەوتە شوێنی بۆ مەرو ئەلروذ و حارسەی کوڕی نوعمانی کردە فەرماندەی مەرو ئەلشاهجان وە لە لایەن خەڵکی کوفەوە لەگەڵ چوار فەرماندەدا بڕێك کۆمەکی گەشتە ئەحنەف و کاتێك ئەم هەواڵە گەشتە یەزدجەرد ڕووی کردە بەلخ،[5] ئەحنەف لەوێ ڕووبەڕووی بوویەوە و خوای گەورە یەزدەجورد بەزاند و پاشان لەگەڵ سوپایەکدا هەڵهات و بە ڕووباردا پەڕیەوە، مولکی خۆراسان لەسەر دەستی ئەحنەفی کوڕی قەیس تۆکمە و پتەو بوو، پاشان ئەحنەف لە هەر ناوچەیەك ئەمیرێکی جێ نشین کرد و ئەحنەف گەڕایەوە و لە مەرو ئەلروذ نیشتەجێ بوو و پەیامێکی نووسی بۆ عومەر بەوەی کە خوای گەورە هەموو وڵاتی خۆراسانی بە تەواوی لەسەر دەستی ڕزگارکرد و عومەریش نووسراوێکی بۆ نووسی و تیایدا بەری لێ گرت بە پەڕینەوە بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە و پێی فەرموو: ئەو بەشەی خۆراسان کە بە دەستەوەیە پارێزگاری لێ بکە، کاتێك نێردراوی یەزدجەرد گەیشتە ئەو دوانەی کە داوای هاوکاری لێ کردبوون بەڵام ئەوان بە گوێیان نەکرد، کاتێك یەزدجەرد لە ڕووبارەکە پەڕیەوە و چوویە وڵاتیانەوە فریادڕەسی خۆی لە دەستووری پادشایان لە سەریان دیاری کرد، پاشان خاقان لەگەڵیدا گەیشتە بەلخ و تەنانەت لەسەر شوێنی ئەحنەف لە ناوچەی مەرو ئەلروذ نیشتەجێ بوون و ئەحنەف بەو خەڵکەی بەسرە و کوفە کە لەگەڵیدا بوون و ژمارەیان(٢٠) هەزار کەس بوون و لەگەڵ یەزدجەرد تێك هەڵگژان و ئەحنەف گوێی لە پیاوێك بوو کە بە کەسێکی تری دەوت: ئەگەر ئەم ئەمیرە لە کەسانی خاوەن ڕاو بۆچوون بێت ئەوا لە خواری ئەم چیایە دەوەستێت و دەیخاتە پشتی خۆیەوە، ئەم ڕووبارەش وەك خەندەقێك لە دەوروبەری دەمێنێتەوە و دوژمن لە یەك ڕووەوە نەبێت ناتوانێت پەلاماری بدات،

---

١ـ بریتیە لە شاری مەروی گەورە کە گونێکی خۆراسانە.
٢ـ نیساپور: شارێکی بە ناوبانگی ئەو هەرێمەیە.
٣ـ شارێکە لە نێوان نیساپور و مەرو لە ناوەندی ڕێگەکە.
٤ـ دەکەوێتە سەر ڕووبارێکی گەورە بەڵام لە مەرووی تر بچووکترە.
٥ـ یەکێکە لە بچووکترین شارەکانی خۆراسان و نزیك بە ڕووباری جیمونە.

کاتێك ئەحنەف ڕۆژی کردەوە فەرمانی دا بە موسڵمانان کە بەو چاوەوە لەو جێگەیە نەوەستن، فەرمانداری ئەو کاتەش پشتیوانی و تێگەیشتوویی بوو، فارسەکان و تورکەکان بە کۆمەڵێکی گەورەی ترسناك و هەراسانکەر هاتن، لەم کاتەدا ئەحنەف هەستایە سەرپێ و لە نێو خەلکەکەدا وتارێکی خوێند و فەرمووی: ئێوە کەمن و دوژمنانتان ژمارەیان زۆرە وریابن کە نەتان ترسێنن: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ (البقرة: ٢٤٩).

تورکەکان بە ڕۆژ دەجەنگان و ئەحنەف نەیدەزانی کە شەو بۆ کوێ دەچن، شەوێك لە پێشڕەوی کردندا بوو لەگەڵ هەندێ لە یارانی بەرەو خاقان ،کاتێك کە بەرەبەیان نزیك بوویەوە سوارێك لە نێو تورکەکان هاتە دەرەوە و ملوانکەیەکی پێ بوو دەیدا لە تەپڵەکەی ئەحنەف لێی چوویە پێشێ و هەردووك بوویە ناکۆکیان و بەربوونە گیانی یەکتری و دواتر ئەحنەف کوشتی و ئەم هۆنراوەیەی هۆندەوە:

| | |
|---|---|
| إن على كل رئيس حقاً | أن يخصب الصعدة أوتندقـــاً |
| إن لها شيخاً بها ملقى | سيف أبي حفص الذي تبقى |

پاشان ئەحنەف ملوانکەی تورکەکەی برد و لە شوێنەکەی وەستا و یەکێکی تر بۆی دەرپەڕی کە ملوانکەیەکی لە مل و تەپڵێکی بە دەستەوە بوو، لە تەپڵەکەی دەدا، ئەحنەف لێی هاتە پێشێ و کوشتی و ملوانکەکەی بردو لە شوێنەکەی ئەویش وەستا، سێیەم کەسیش بۆی دەرپەڕی و ئەحنەف کوشتی و ملوانکەکەی برد، پاشان ئەحنەف گەرایەوە بۆ لای سوپاکەی و هیچ کەسێك لە سوپای تورك بە تەواوی بەم کارە نازانێ، خووی تورکەکان وابوو کە کەس لەپیرێتی خۆی نایەتە دەرەوەتا سێ کەس دێنە دەرەوەو یەکەم دەدات لە تەپەڵەکەی و پاشان دووەم و دواتر سێیەم، کاتێك کە تورکەکان هاتنە دەرەوە بینیان سوارەکانیان کوژراون، بۆیە میر خاقان بەرچاوی ڕەش بوو و باڵی لێ پەیدا بوو، بە سەربازەکانی وت: شوێنەکەمان لەوە درێژتر بوو ئەو دۆستانەمان لە شوێنێکدا کوژراون کە ئێمە وەك ئەوان نەکوژراوین لە کوژرانی ئەم چەند کەسە چەتەیەك بۆ ئێمە دەستەبەر بووە و ئەوان لە ئێمە گەراون و گەراونەتەوە بۆ وڵاتەکەیان،[1] موسڵمانان بە ئەحنەفیان وت: چی دەفەرمووی لە شوێنکەوتنیان؟ ئەویش فەرمووی: لە شوێنی خۆتان بمێننەوە و لێیان گەرێن، ئەحنەف لەمەدا پێکاویەتی و لە فەرموودەشدا هاتووە کە دەفەرموێت: ((لە تورکب گەرێن کە لێتان گەراون))،[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾ (الاحزاب: ٢٥).

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/١٥٩).

٢ـ الطبراني الكبير قال الالباني:- موضوع، سلسلة الاحاديث الضعيفة (١٧٤٧).

کیسرا بە مامەڵەیەکی دۆڕاوەوە گەرایەوە، و خەشم و قین دادی نەدا و نەبوویە تکاکاری، هیچ چاکەیەکی دەست نەکەوت و سەرنەکەوت هەروەك ئەوەی کە لە سەردەمی دەسەڵاتیدا بوو، بەڵکو هەر کەس چاوەڕوانی سەرکەوتنی لێ دەکرد لێی گەرا و لاتەنیشتی لێ گرت و پاکانەی خۆی دەربڕی لەوەی کە خۆی بۆ پەنا دابوو، کیسرا بە دوو دڵ و ڕاڕایی مایەوە بە لای ئەمانداو بە لای ئەواندا (هەر کەس کە خوا گومڕای بکات ئەوا هەرگیز ناتوانێت ڕێگای ڕاستی بۆ بدۆزێتەوە).

کیسرا لەم بارودۆخەی سەرسام بوو کە چی بکات؟ بۆ کوێ بڕوات؟ پاشان چەند کەسێکی نارد بۆ لای میری چین و داوای لێ کرد فریای بکەوێت و بە دەمیەوە بێت، دواتر میری چین پرسیاری چۆنیەتی ئەم کۆمەڵەی لە پەیامنێرەکەی کیسرا کرد کە وڵاتەکەیان ڕزگار کردوون و گەردنی بەندەکانیان کەچ کردووە، ئەویش هەواڵی چۆنیەتیانی پێدان کە چۆن سواری حوشتر و ئەسپ دەبن و چی دەکەن؟ چۆن نوێژ دەخوێنن؟ دواتر میری چین نامەیەکی بۆ یەزدجەرد نووسی کە تیایدا هاتووە: بە لامەوە گرنگ نیە کە سوپایەکت بۆ بنێرم کە سەرەتای لە مەرو و کۆتاکەی لە چین بێت، ئەوەی لەسەر منە تەنها نەفامی و نەزانیە، بەلام ئەو گەلەی کە نێردراوەکەت بۆی وەسف کردووم هەوڵ نادەن کە چیاکان بۆ ڕێنموونی خۆیان بن ئەگەر من بێم بۆ هاوکاریت ئەوا ڕام دەماڵن تا لەسەر ئەو وەسفە بن کە نێردراوەکەت بۆی باس کردووم بۆیە داوات لێ دەکەم،کە ئاشتی و تەبایی لەگەڵیاندا بەرجەستە بکەیت و بە تەبایی لێیان قایل بیت، کیسرا و بنەماڵەی کیسرا لە هەندێ وڵاتی دامرکاو خۆیان ڕەساند و ئەمەش کۆڵنەدانی یەزدەجورد دانەمرکاندەوە تا لە سەردەمی خەلافەتی عوسماندا(ﷺ) کوژرا،[1] کاتێك کە ئەحنەف پەیامی ڕزگارکردنەکە و ئەو دەستکەتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوون گەیاندە عومەر کە ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتوون و شەڕێکی جەرگ بڕانەیان لەگەڵ ئەنجام داون، پاشان خوای گەورە بە ڕق و مەراقی خۆیان گەراندنیەوە و چاکەیان بە دەست نەهێناوە، عومەر چوویە سەر مینبەر و پەیامەکەی نێو دەستی خوێندەوە و پاشان عومەر فەرمووی: خوای گەورە موحەمەدی بە ڕێنماییەوە ناردووە وە بەڵێنی داوەتە شوێنکەوتووانی کە پەلە لە پاداشتیان دەکات و چاکەی دونیاو دوارۆژیش دوا دەخات، فەرمووی: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾ (التوبة: ٣٣).

پاشان سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بەڵێنی خۆی هێنایە دی، سەربازەکانی سەرکەوتوو کرد، ئاگادار بن کە خوای گەورە مولکی مەجووسیەکانی لەناو برد و کۆبوونەوەکەیانی بڵاوە پێکرد لە وڵاتی خۆشیاندا بستێك زەویان نیە کە زیان بە موسڵمانان بگەیەنن، ئاگادار بن کە خوای گەورە زەوی‌و زار و خانە و ماڵ و داهات و نەوەی ئەوانی بۆ ئێوە کردۆتە میراتی تا سەیر بکات ئێوە چۆن هەڵسوکەوتی خۆتان دەکەن، دەی ئێوەش بە ترسەوە کارەکانی ڕاپەڕێنن ئەویش پەیمان پارێزیتان بۆ دەکات و

١ـ تأريخ الطبري (٥/١٦٠).

بەڵێنەکانتان بۆ بەدی دەهێنێت، ئێوە لە خۆتان مەگۆڕێن چونکە دەتانگۆڕێت و گەلانێکی تر شوێنتان دەگرێتەوە، من لەم ئومەتە ناترسم کە ئومەتێکی تر بدات بەسەریدا مەگەر ئەوانەی پێش خۆتان.[١]

## هەشتەم: ڕزگارکردنی ئەستەخەر ساڵی (٢٣)ی کۆچی:

موسڵمانان بۆ جاری دووەم ناوچەی ئەستەخەریان لە ساڵی (٢٣)ی کۆچی ڕزگارکرد و پاش ئەوەی کە سەربازانی عەلائی کوڕی خەزرەمی لە زەوی بەحرەین لە ئاوی ڕوواردا پەڕینەوە و ڕزگاریان کرد خەڵکەکەی ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ موسڵمانان گرێیان دابوو شکاندیان، پاشان لەگەڵ فارسەکاندا لە ناوچەیەکدا بەیەك گەیشتن کە پێی دەوترێت تاوس، پاشان هیرندە لە سەر دانی سەرانە لەگەڵیان ڕێك کەوت، لە بەرامبەر ئەوەی ژیانیان زامن بکات و دواتر شەهرەك پەیمانەکەی شکاند و ژیان پارێزی هەڵوەشاندەوە، فارسەکانی وریا کردەوە و ئەوانیش پەیمانی خۆیان هەڵوەشاندەوە، دوابەدوای ئەمە عوسمانی کوڕی ئەبی عاص کوڕەکەی و حەکەمی برای بۆ ناردن، و لەگەڵ فارسەکاندا جەنگێکی خوێناویان بەرپاکرد و خوای گەورە سوپای بێباوەڕانی تێك شکاند، حەکەمی کوڕی ئەبی عاص شەهرەکی کوشت.[٢]

## نۆیەم: ڕزگارکردنی فەسا و داربەجرەد ساڵی (٢٣)ی کۆچی:

ساریەی کوڕی زونەیم بە مەبەستی ڕزگارکردنی فەسا و داری بەجرەد ڕووی کردە ئەو ناوچەیە هێزێکی گەورەی فارس و کوردەکان بۆی کۆبوونەوە و موسڵمانانیش بە شێوەیەکی کتوپڕ گەورەیان کردن، عومەر لەو شەوەدا ئەوەی بینی کە نوستوویەك جەنگەکەیان و ژمارەیان لە کاتی ڕۆژدا بەدی دەکات، لە کاتێکدا ئەوان لە بیابان دان، لەو شوێنەشدا چیایەك هەیە ئەگەر ئەوان خۆیانی بدەنە پاڵ ئەوا تەنها لە ڕوویەکەوە نەبێت ناتوانن پەلاماریان بدەن، پاشان بانگی نوێژی بەیانی درا و نوێژی بە کۆمەڵ کرا و تەنانەت ئەو ساتەشی بینی کە تیایدا کۆبووبوونەوە— پاشان خەڵکەکە هاتنە دەرەوە و عومەر چوویە سەر مینبەر—وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و هەواڵی چۆنیەتی ئەوەی پێدان کە بینی بووی پاشان فەرمووی: ئەی سواری چیاکە— ئینجا لێیان چوویە پێشێ و فەرمووی: خوای گەورە سەربازی هەیە و ڕەنگە هەندێکیان پێیان بگەن، وتی ئەو کارە بکەن کە عومەر دەفەرموێت — خوای گەورە سەری خستن بەسەر دوژمنانیاندا ناوچەکەیان ڕزگار کرد.[٣]

---

١ـ تأريخ الطبري (١٦٢/٥، ١٦٣).
٢ـ تأريخ الطبري (١٦٦/٥).
٣ـ تأريخ الطبري (١٦٨/٥، ١٦٩) وأخراجها اللالكائي في شرح أصول إعتقاد أهل السنة رقم (٢٥٣٧) و حسن الشيخ الألباني إسنادها في حاشيته على مشكاة المصابيح (١٦٧٨/٣)رقم (٥٩٥٤) أنظر تهذيب البداية والنهاية(ص: ١٧٠).

## دەیەم: ڕزگارکردنی کرمان و سجستان ساڵی (٢٣)ی کۆچی:

سوهەیلی کوڕی عودەی ساڵی (٢٣) ی کۆچی هەستا بە ڕزگارکردنی شاری کرمان،[١] بەڵام هەندێ کەس دەڵێن کە ئەم شارە لەسەر دەستی عبدالله ی کوڕی بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی ڕزگارکراوە،[٢] هەندێ لە مێژوونووسان باس لەوە دەکەن کە سجستان لەسەر دەستی عاصم کوڕی عەمر و پاش شەڕ و جەنگێکی زۆر ڕزگارکراوە، دەروازەکانی ئەم شارە زۆر بەرفراوان و ناوچەکانی چەپەك کراو بوون لە نێوان بەربەستەوە بۆ ڕووباری بەلخ، ئەوان لە دەروازە و دەروازەکانیەوە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی قەندەهار و تورك تێك هەڵدەگژان.[٣]

## یازدەیەم: ڕزگارکردنی موکران ساڵی (٢٣)ی کۆچی:

ساڵی(٢٣)ی کۆچی شاری موکران لەسەر دەستی حەکەمی کوڕی عەمر ڕزگارکرا و شەهابی کوڕی ئەلمەخارق هاوکاری کرد و سوهەیلی کوڕی عودەی خۆی گەیاندی لەگەڵ عبدالله کوڕی عبدالله کوڕی عوتبان و پاشان میری سەندیان کوشت و خوای گەورە سوپای سەندی تێك شکاند و موسڵمانان غەنیمەتێکی زۆریان لێوە دەست کەوت، حەکەمی کوڕی عەمر نووسراوێکی بە مزگێنی ئەو ڕزگارکردنە و پێنج یەکی غەنیمەتەکان بە سوحاری ئەلعەبدی نارد بۆ عومەر و کاتێك کە سوحار گەیشتە جێ عومەر پرسیاری زەوی موکران و کەش و هەوای لێ کرد و ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران موکران زەوی پێ دەشتی چیایە و ئاوی کەم و خراپترین خورمای هەیە، دوژمنانی پاڵەوان و چاکەی کەم و خراپەی درێژخایەن و زۆری تێدا کەم و کەمی تێدا ون بووە، ئەوەی لە دوای ئەمەوەیە لەم خراپترە، عومەریش فەرمووی - ئایا تۆ سەوابێژی یان پەیامنێر؟ ئەویش وتی: نەخێر، بەڵکو من پەیامنێرم، دواتر عومەر نامەیەکی بۆ حەکەمی کوڕی عەمر نووسی، کە لە موکران تێ نەپەڕن، با لە خواری ڕوبارەکەوە ڕێگەی خۆتان کورت بکەنەوە.[٤]

## دوانزەیەم: پەلاماری کوردەکان:

إبن جورەیر بە سەنەدی خۆی لە سەیف و شێخەکانیەوە باسی ئەو کاتە دەکات کە: کۆمەڵێك لە کوردەکان کە ژمارەیەك خەڵکی فارسیان پێوە پێچرابوو، کۆبوونەوە و ئەبو موسا لە جێگەیەك لە زەویەکانی بیرۆزی نزیك ڕووباری تەیرا[٥] پێیان گەشت، پاشان ئەبو موسا بە لایاندا تێپەڕی بۆ ناوچەی ئەسپەهان و پاش کوژرانی موهاجری کوڕی زیاد ڕەبیعی کوڕی زیادی دانا بۆ ڕوویەڕووبوونەوە و لەگەڵ

---

١ـ تهذیب البدایة والنهایة (ص: ١٧١).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ ترتیب و تهذیب البدایة والنهایة (ص: ١٧١).
٤ـ تأریخ الطبري (٥/١٧٢-١٧٤).
٥ـ بیرۆز و ڕووباری تەیرا دوو شارۆچکەن لە شارۆچکەکانی ئاواز.

جەنگانیان کە ئەویش شەڕەکەی وەرگرت و هەناسەی لێ بڕین، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و هەروەك خۆی بەردەوامی و سونەتی سەقامگیرکراوی خوای گەورە، لە بەندە ئیماندارەکانی، خوای گەورە دوژمنانی تێك شکاند هێزە ڕزگاریخوازەکەی کە لە شوێن کەواتووانی سەرداری پەیامبەرانە سەرکەوتن پێ بەخشی و دواتر ڕەبیع مزگێنی سەرکەوتن و پێنج یەکی غەنیمەتەکانی نارد بۆعومەر(ﷺ).

بەم شێوەیە عێراق و ولاتی ئێران لە سەردەمی عومەردا (ﷺ) ڕزگارکرا و موسلمانان چەندین پێگەی سەربازیان لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی دامەزراند بە چاوەڕوانی پەیمان شکێنی فارسەکان لەو ناوچەیەدا — بە ڕاستی ڕزگارکردنی ڕۆژهەلات زۆر سەخت و دژوار بوو ، موسلمانان بە هۆی جیاوازی خوێنەوە قوربایەکی بەرجەستەیان دابوو، چونکە دانیشتوانی فارسی ئێران نە زمان و نە ڕەگەز و نە ڕۆشنبیری نایان بەستێتەوە بە عەرەبەوە، هەستی مێژوویش لای ئێرانیەکان مێژوویەکی دوور و درێژ و ڕۆشنبیریەکی پێکەوە گرێ دراو بەهێزی دەکات، سەرباری ئەمەش شەڕ و پێکدادانەکە لە ناوجەرگەی ولاتی ئێراندا بووە و پیاوانی ئاینی و مەجووسیش هاوبەش بوون لە هاندانی خەلکی لەسەر بەرگری لە خۆکردن و سەرباری دووری ئەم ناوچانەش لە مەلبەندەکانی سوپای بەسرە و کوفەوە، سروشتی ئەو زەویە چیاییەی کە دانیشتوانەکەی توانیویانە لە بەرگریدا بن، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو مەلبەندانە پەیمانی خۆیان هەلوەشاندەوە و جارێکی تر لە سەردەمی فاروق یان خەلافەتی عوسماندا ڕزگار کرانەوە.[1]

---

١ـ عصر الخلافة الراشيدة ص ٣٣٩، ٣٤٠.

# دوانگەی پێنجەم

## گرنگترین وانە و پەند و سوودێك لە ڕزگارکردنی عێراق و ڕۆژهەلاتدا

### یەکەم: کاریگەری ئایات و فەرموودە پیرۆزەکان لەناخی موجاهیداندا:

ئەو ئایەت و فەرموودە پیرۆزانەی کە باس لە فەزڵی جیهاد دەکەن کاریسنەگەری و شوێنەواری خۆیان هەیە لە ناخی موجاهیداندا، بەڵێ خوای گەورە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کەهەنگاوو جوڵەو هاتن و چونی موجاهیدان هەمووی پاداشت بۆیان دەنوسرێت بە جۆرێك کە دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾(التوبة: ١٢٠-٢١).

هەروەها موسڵمانە یەکەمینەکان دڵنیا بوون لەوەی کە جیهاد بازرگانیـەکی سـوودمەندە و خـوای گەورەش دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَـٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَمَسَـٰكِنَ طَيِّبَةً فِى جَنَّـٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾(الصف: ١٠-١٣).

ئەو موسڵمانانە دەیانزانی، کە جیهاد لە ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت و ئاودانی حاجیانی ماڵی خوا پیرۆزترە و خوای گەورەش لەو بارەیەوە دەفەرموویت: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ﴾ (التوبە: ١٩-٢١).

بڕواشیان وابوو کە جیهاد لە هەموو حالەتێکدا هەر سەرکەوتنە و خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ﴾ (التوبة: ٥٢).

شەهیدیش ژیانی کۆتایی پێ نایەت بەڵکو ئەو زیندووە و خوای گەورەش دەفەرموویت:﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ (ال عمران: ١٦٩-١٧١).

ئەوان هەستیان بە بەرزی ئەو ئامانجەیان دەکرد کە لە پێناویدا دەجەنگان خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْآخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ (النساء: ٧٤-٧٦).

پێغەمبەریش(ﷺ) فەزڵی جیهابینی بۆ موسڵمانان ڕوون کردۆتەوە و ئەو فەرموودانەش زیاتر ورەی پێبەخشیون و بەتە هاندەرەوەك بۆ بەردەوام بوون ەم ێیازە، لەو فەرموودانە ، ئەبو سەعیدی خدری(ﷺ)دەفەرمووێت: وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نێو خەڵکیدا کێ زۆر باشە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ((ئیمانداریك کە بە ماڵ و گیانی تێدەکۆشێت))[1] هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) پلەی موجاهیدانی ڕوون کردۆتەوە و دەفەرمووێت: ((لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ موجاهیدانێك لە پێناوی خودا نێوانی دوو پلەش وەك نێوانی ئەرز و ئاسمان وایە ئەگەر داواتان لە خودا کرد ئەوا داوای فیردەوسی لێ بکەن بە ڕاستی ئەو جێگەیە ناوەنبینی بەهەشت و بەرزترینی بەهەشتە))[2].

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەزڵی شەهیدان و ڕێزی ئەوانی ڕوون کردۆتەوە کە دەفەرمووێت:(( ئەوەی دەڕوات بۆ جیهادو تێکۆشان لە پێناو خوای گەورەدا خوا بۆ خۆی دەبێتە دەستە بەرو دەفەرمێت: خۆم دەبم بە دەستە بەری کە یەکێ لەم دوانەی پێ ببەخشم یا بیبەمەوە نێو بەهەشت ، یان بیگەڕێنمەوە شوێن و جێگەی خۆی لە گەڵ پاداشتی فراوان و غەنیمەتێکی زۆردا ، بە مەرجێ مەبەستی تەنها ڕەزامەنبینی خودا بێ و ئیمانی بە من و پێغەمبەرانی من هەبێت، ئەگەر گران نەبوایە لەسەر ئومەتم ئەوا لە پشت هیچ لەشکرێکەوە دانەدەنیشتم وە خۆزگەم دەخواست کە لە پێناوی خوادا بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە پاشان بکوژرێم و زیندوو بکرێمەوە پاشان بکوژرێم و زیندوو بکرێمەوە))[3].

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ) دەفەرمووێت: (( کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە و پێی خۆش بێت کە بگەرێتەوە بۆ دونیا و ژیانی سەر زەوی جگە لە شەهید کە خوازیارە بگەرێتەوە بۆ دونیا و دە جار بکوژرێتەوە بۆ ئەوپاداشتەی کە بینیویەتی لە ڕێزداریی))[4] وە کۆمەڵێکی تری تریش لە فەرمووده هەن، موسوڵمانە یەکەمینەکان و ئەوانەش کە لەسەر بەرنامەی ئەوان ڕۆیشتوون زۆر کاریگەر بوون بەم ئایەت و فەرموودانە، گەورە هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لەسەر بێت) دەجەنگان و پیر بوون و خەڵکی بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە ئامۆژگاریان دەکردن بە دانیشتن لەبەر ئەوەی بەهانەیان هەیە، ئەوانیش وەڵامیان دەدانەوە کە سورەی تەوبە ڕێگەی دانیشتنیان لێ دەگرێت و ئەوانیش لە خۆیان دەترسن لە دوروویی ئەگەر لە جەنگێك دواکەون.[5]

## ١/ لە بەروبومەکانی جیهاد لە پێناوی خوادا:

هاوەڵان و ئەوانەش بە چاکە دوایان کەوتبوون لە سەردەمی ڕاشیدیدا وایان دەبینی کە جیهاد لە پێناوی خوادا یەکێکە لە هۆکارە پێویستەکانی مانەوەی ئومەتی ئیسلام،بۆیە لە ئازاد کردنی عێراق و وڵاتانی ڕۆژهەڵات و شام و میسر و باکوری ئەفریقیا هەستان بە زیندووکردنەوەی ئەم فەرزە،

---

١ـ البخاري رقم (٢٧٨٦).
٢ـ البخاري رقم (٢٧٩٠).
٣ـ مسلم (١٤٩٧/٣).
٤ـ البخاري رقم (٢٨١٧).
٥ـ الجهاد في سبيل الله، للقادري (١٤٥/١).

هەستانیشیان بەم کارە چەندین بەروبومی زۆر بە پیزی لەگەڵ خۆدا هێنا ، لەوانە: ئامادەکردنی ئومەتی ئیسلامی بۆ سەرکردایەتی کردنی مرۆڤایەتی، زاڵ بوون بەسەر درك و داڵی بیّ باوەڕان و زەلیل کردنیان، دروستکردنی ترس لە دڵیان، دەرخستنی ڕاستی بانگەواز بۆ مرۆڤایەتی، ئەمەش وای لەو خەڵکە کرد دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ بچنە ڕیزی ئاینی خوداوە بەمەش موسوڵمانان سەرفرازی بۆخۆیان و کەنەفتی بۆکافران زیاد دەکەن.ڕیزی موسوڵمانان یەکیان گرت دژی دوژمنانیان و خەڵکیان بە نوری ئیسلام و دادپەروەری و بەزەیی بەختەوەر و شادوومان کرد.[1]

## دووەم/ لە سوننەتەکانی خوا لە ڕزگارکردنی عێراق و وڵاتانی ڕۆژهەڵات:

توێژەر لە بەدواداچونەکەیدا بۆ ڕزگاری عێراق و وڵاتانی ڕۆژهەڵات سەرنجی هەندیّ لە سوننەتەکانی خوای گەورەی داوە لە نێو کۆمەڵگەکان و گەلان و دەوڵەتاندا وە لەو سوننەتانەش ئەمانەن:

### ١- سوننەتی بەهەندگرتنی هۆکارەکان:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ (الانفال: ٦٠)

هەروەها عومەری فاروق(ﷺ) لەسەردەمی خۆیدا ئەم ئایەتەی چەسپاند و هۆکارە مادی و مەعنەوییەکانی بەهەند گرت هەروەك ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد.

### ٢-سوننەتی بەر بەرەکانێتی یەکتر کردن:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (البقرة: ٢٥١)

ئەم سوننەتە بەگشتی لە بزاڤە ڕزگاریخوازەکان دەرکەوت، سوننەتی بە کۆدا چوونەوە لە گرینگترین سوننەتەکانی خوای گەورەیە لە گەردوون و دروستکراوەکانیدا ، وە لە گرنگترین سوننەتە پەیوەستەکانە بە نیشتەجێ کردن بۆ ئومەتی ئیسلامی، موسڵمانە یەکەمینەکان ئەم سوننەتەیان هەڵێنجاوە و کاریان پێ کردووە و زانیویانە کە هەق و ڕاستی پێویستی بە عەزیمەتێك هەیە کە پێی ڕاپەڕێت و پێویستی بە چەند یارمەتی دەرەوەك هەیە کە پێی بەردەوام بێت و دڵانێکیش بەسۆز بێت لەسەری و دەمارگیریەك کە پەیوەست بێت پێوەی ـ بە ڕاستی ئەوە پێویستی بە هەوڵ و ماندووبوونی ئادەمیزابینی هەیە لەبەر ئەوەی ئەم سوننەتی خوداییە لە ژیانی دونیادایە و بەردەوامیشە.[2]

---

١ـ الجهاد في سبيل الله، للقادري (٤١١/٢ بۆ ٤٨٢).
٢ـ لقاء المؤمنين، عدنان النحوي(١١٧/٢).

### ٣- سونەتی تاقیکردنەوە:

خـوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾ (البقرة: ٢١٤).

بەڕاستی تاقیکردنەوە لەجەنگە ڕزگاریخوازەکانی عێراق لەجەنگی(جسر)بەسەرکردایەتی ئەبو عوبەید، بەجۆرێك هەزاران کەس لەموسڵمانان شەهید بوون و سوپاکەیان تێکشکاو پاشان ڕیزەکانی خۆیان پێك نایەوەو چەندین سەرکەوتنی گەورەیان بەسەرفارسەکاندا تۆمار کرد،خوای گەورەش دەفەرموویێت: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾(ال عمران: ١٨٦).

لەو چەند ئایەتە پیرۆزەوە چەند سەرنجێك تۆمار دەکەین، لەوانە دەرخستنی سوننەتی تاقی کردنەوە لەسەر ئومەتی ئیسلامی لە بەهێزترین شێوەی بڕیاردان و دڵنیابوونەوە هات،[1] ئەمەش سوننەتی خودایە لە بیروباوەڕ و بانگەوازەکان ، دەکرێت تاقی کردنەوەی تێدابێت ، دەکرێت کە ئازار و ئەشکەنجەی لە ماڵ و گیانەکان تێدابێت، دەکرێت کە ئارامی و بەرخودان و خواست و نیازگرتنی تێدابێت.[2]

### ٤- سوننەتی خوای گەورە لە ستەم و ستەمکاران:

خوای گەورەدەفەرموویێت: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ۝ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ۝ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ (هود: ١٠٠-١٠٢).

سوننەتی خوای گەورەیش بەجێیە لەوەی ئومەتە ستەم کارەکان لەناو دەچن ، دەوڵەتی فارسیش دەوڵەتێکی ستەمکار بوو، خەڵکی ژێردەستەی دەچەو ساندەوە، لە بەرنامەی خودا لایدابوو، خوای گەورە موسوڵمانانی زاڵ کرد بەسەرانداو لەناویان بردن .[3]

### ٥- سوننەتی خوای گەورە لە وانەیدا دەوڵەمەند و خرابەکارن :

خـوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا﴾ (الاسراء: ١٦).

---

١ـ التمكين للامة الاسلامية في ضوء القرآن الكريم (ص: ٢٣٧).
٢ـ تبصير المؤمنين بفقه النص التمكين للصلابي (ص: ٤٥٦).
٣ـ السنن الالهية في الامم والجماعات والافراد (ص: ١١٩ بۆ ١٢١).

لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا هاتووە: (ئەگەر کاتی لەناوچوونی نزیك بوویەوە فەرمان دەدەین بە گوێڕایەڵی و کردەوەی چاك، بە وانەی سەرمایەدارو دەوڵەمەندن – واتا بەوانەیان خاوەنی ژیانکی خۆشن و میرەکانی کەچی ئەوان یاخی دەبن و لە فەرمان دەردەچن جا بڕیاری سزادان پێویست دەبێت بۆئەو شارانەو ئێمەش لە ناویان دەبەین، خوای گەورە دەوڵەمەندە خراپەکار و زۆردارەکانی تایبەتمەند کردووە بە یادی خوای گەورە و ڕووکردنە فەرمانی خوا بە ملکەچی بۆ هەمووان لەبەر ئەوەی ئەوان خەڵکانی خراپەکار و سەرکردەی بە هەڵەداچوون و ئەو شتانەش لە کەسانی تر نەوەشاوەتەوە، بەڵکو ئەمە بە شوێنکەوتنیان و گومڕاکردنیان ڕوویداوە، ئاڕاستەکرانی فەرمانەکە بۆ ئەوان شتێکە جەختی لەسەر کراوەتەوە،[1] وە ئەم سوننەتە لە نێو سەرکردەکانی فارس و پێشەواکانیان بەردەوام بوو.

## ٦- سوننەتی خوای گەورە لە ستەم و ستەمکاران:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ﴾ (الفجر: ١٤).

ئەم ئایەتە هەڕەشەیەکی توندە بۆ سەرپێچی کەران ، وتراوە: هەڕەشەیە بۆ بێباوەڕان، وتراویشە: هەڕەشەیە بۆ سەرپێچی کەران و هەڕەشەیە بۆ کەسانی تر.[2]

لە تەفسیری قورتوبیدا هاتووە: واتا هەموو مرۆڤێك بخرێتە کەمینەوە هەتا پێیدا تێپەڕ ببێت.[3]

راو بۆچونی ڕاڤەکارانی قورئانیشدا ڕوونە لەو ئایەتانەی کە لەو بەشەی پێشوودا باسمان کرد کە سوننەتی خوای گەورە لە ستەمکاران دابەزینی سزایە بۆیان لە دونیا، کە بریتیە لە سوننەتێکی بەردەوام کەسزا لەسەر ستەمکاران دوا ناخات لە هیچ زەمان و سەردەمێکدا، هیچ کامێکیان لە دەستی سزای خوا لە دونیا ڕزگاریان نابێت ، لە سزای دواڕۆژیش دەرباز نابن.[4]

سوننەتی خوای گەورەیش لە ستەمکاران و ئەوەی خوای گەورە بۆیان دادەبەزێنێت لە سزا لە دونیادا ئەوە کەسێك گرنگی پێدەدا کە لە خوای گەورە و سزاکانی دەترسێت و دەزانێت کە سوننەتی خوای گەورە یاسایەکی چەسپاوە و لایەنگیری هیچ کەسێك ناکات ،خوای گەورە لە پەیامی باوەڕپێکراوان لە سوننەتەکەی لە ستەمکاران و پاش ئەو سزا خراپەی کە بەسەر فیرعەونیدا هێناوە دەفەرمووێت: ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ٢٥ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ٢٦﴾ (النازعات: ٢٥-٢٦).

ئەوستەمکارانە لەگەورەپیاوانی فارس بون،کە سوننەتی خوای گەورەبەسەریاندا جاری بوو.

## ٧- سوننەتی یەك لە دوای یەك:

ڕزگارکردنی عێراق و وڵاتانی ڕۆژهەڵات لەسەر ئەم سونەتەو بوو ـ قۆناغی یەکەم لە سەردەمی ئەبو بەکری صدیقدا بوو کە شاری حیرە بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید ڕزگار کرا، بەڵام قۆناغی

---

١ـ تفسير الآلوسي (١٥/٤٢).
٢ـ السنن الالهية (ص: ١٩٣).
٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٩٣) نقلا عن القرطبي في تفسيره.
٤ـ السنن الالهية (ص: ١٩٤).

دووەم کاتێك دەستی پێکرد کە ئەبو عوبەیدەی ئەلسەقەفی سەرکردایەتی سوپای عێراقی کرد،بەردەوام بوو تا جەنگی ئەلبوەیب-قۆناغی سێیەم لەو کاتەوە دەست پێدەکات،کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەکرێتە فەرماندەی عێراق بۆفەتحی ئەو ناوچەیە،تا پێش جەنگی نەهاوەند، قۆناغی چوارەمیش لەجەنگی نەهاوەندو قۆناغی پێنجەمیش بریتیە لە قۆناغی گەشت و گوزار لەولآتانی عەجەم.

لە بزاڤی ڕزگاریخوازی وفتوحاتی ئیسلامی مندالآنی موسڵمانەوە فێر دەبن کە بایەخ بە ڕەچاو کردنی سوننەتی یەك بە دوای یەك بکەن بۆ چەسپاندنی ئاینی خوا، سەرچاوەی ئەم سوننەتەش ئەوەیە ڕێگەکە دوور و درێژە لەبەر ئەوە پێویستە لە تێگەیشتن و وەرگرتنی ئەم سوننەتە بە نسبەت کاربەدەستان لە بواری بانگەوازی ئیسلامی بگەینن ، پاشان جێ نشین کردن بۆ ئاینی خوا لە عێراق و ولآتانی ڕۆژهەلآت لە نێوان ئێوارە و بەیانیدا بەدی نەهاتووە بەلکو بە ویستی خودا ملی بۆ ئەم سوننەتە داوە.

## ٨- سوننەتی گۆڕانی دەروونەکان:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾ (الرعد: ١١).

یارانی بەڕێز لە ڕزگارکردنی عێراق و ولآتانی ڕۆژهەلآت هەستان بە کارکردن بەم سوننەتە ڕەبانیە لەگەڵ ئەو میللەتانەی ئازادیان کردبوون هاتبونەژێر سایەی ئاینی خوداوە کرد، دەستیان کردە پەروەردەکردنی خەلکی لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) — وە لە ناخیاندا بیر و باوەڕی ڕاست و بۆچونی دروست و خوڕەوشتی بەرزیان چاند.

## ٩- سوننەتی خوای گەورە لە گوناه و تاوانەکان:

خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَـٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴾(الانعام: ٦).

خوای گەورە گەلی فارسی بەهۆی ئەو گوناه و تاوانەیانەوە لەناو برد کە ئەنجامیان دابوو ، گرینگترینیان بێباوەڕی و هاوبەش پەیدا کردن بوو بۆ خوا، لەم ئایەتەدا ڕاستیەکی چەسپاو و سوننەتێکی دیارو بەرچاو هەیە کە ئەمەیە: تاوانەکان خاوەنەکەی لەناو دەبات و خوای گەورەش خودی خۆی تاوانباران بە گوناه و تاوانەکانیان لەناو دەبات،[١] وە خوای گەورە ئومەتی ئیسلامی زاڵ کرد بەسەر فارسەکاندا کاتێك کە مەرجەکانی جێنشین کردن هاتەدی و کاری بە سوننەتەکانی کرد و هۆکارەکەی بە هەند گرت.

---

١ـ السنن الالهية (ص: ٢١٠).

## سێ یەم: ئەحنەفی کوڕی قەیس ڕێڕەوی مێژوو دەگۆڕێت:

عومەر (ﷺ) پابەند بوو بە ڕای خۆی لە کورت بڕیدا لەسەر ئەوەی کە لە ولاتی فارس ئازاد کراوەو بەری بە سوپاکەی کرد لە چونە نێو ڕۆژهەلات و بەتایبەتی پاش ئەوەی کە هورمزان شکستی هێنا و موسولمانان شاری ئەهوازیان ڕزگار کرد.

عومەر فەرمووی: سەوابینی ەسرەو ئەهواز بەسن ب ژیاندنی خەلکی بەسرە ، پێم خۆش بوو کە لە نێوان ئێمە و فارسدا چیایەکی ئاگرین هەبوایە نە دەستی ئێمە بگەیشتایە ئەوان و نە دەستی ئەوانیش بگەیشتایە ئێمە، عومەر(ﷺ) بە خەلکی کوفەی فەرموو: پێم خۆش بوو لە نێوان ئێمە و ئەو چیایەدا چیایەکی ئاگری هەبوایە کە نە ئێمە بەوان بگەیشتینایە و نە ئەوان بە ئێمە بگەیشتنایە.

عومەر بۆ ئەم کارە دانوستانی لەگەڵ شاندەکەدا کرد و ئەحنەف پێی فەرموو: ئەی ئەمیری باوەڕداران، هەواڵت پێ دەدەم کە تۆ بەرت پێ گرتین لە گەشت و گەران بە نێو ولات و فەرمانت پێ داین بە کورتبڕی لەسەر ئەوەی کە لە چنگماندایە و پادشای فارسیش زیندوە لەنێو خەلکی خۆیدا و ئەوانیش تا ئێستا کەنارمان لێ دەگرن بەهۆی ئەوەی کە پادشاکەیان تێیاندایە و ئەو دوو پادشایەك بە یەك نەگەیشتن و ڕێککەوتن هەتا یەکێکیان ئەوی تریان ڕزگار بکات- من وا دەبینم کە ئێمە هیچێکمان بە هەند وەرنەگرتووە جگە بە ناردنی ئەوان نەبێت پادشاکەشیان هەر ئەو کەسەیە کە دەیان نێرێت و تا ئێستاش ئەوەش کۆلنەدانی ئەوانەهەتا مۆڵەتمان پێ بدەیت کە بە ولاتانی ئەواندا بگەرێین، تا لەفارس دایبڕین و لە میرنشینەکەی و تاوانەکەی دەریپەڕێنین، لێرەدا تکای خەلکی فارس دەپچڕێنرێ و بە شێواوی لێیان دەدرێ.[1]

پاشان عومەر بە ئەحنەفی فەرموو: سوێند بەخوا ڕاستت لەگەڵ کردم وە کارەکەت وەك خۆی بۆ شی کردمەوە.

دواتر عومەر مۆڵەتی گەرانی لە ولاتی فارسدا و لەمەدا بەڕای ئەحنەف کۆتایی هات و چاکی و ڕاستگۆیی یان ناسی و لەو ولاتانەدا گەران و ئالای خۆراسان درایە ئەحنەف، و تەواوی ئالاو بەیداخەکانی تر درایە پالەوانان لە سەرکردە موجاهیدەکان، پاشتر پلانی جەنگ و پێشڕەوی بۆکێشان و لە دوای ئەوەش هاوکاری کردن بە سوپا گەلێك لە دوایانەوە.[2]

---

١ـ البداية والنهاية (١٣٠/٧).

٢ـ مع الرعيل الاول، محب الدين الخطيب (ص: ١٤٦).

# بەشی حەوتەم

## دوانگەی یەکەم

## ڕزگار کردنەکانی شام

یەکەمین پەیامێك، کە لە عومەرەوە(ﷺ) گەیشتە شام هەواڵی کۆچی دوایی خەلیفە ئەبو بەکر و بە والی کردنی ئەبو عوبەیدە بوو لە شام و لەو پەیامەشدا هاتووە: لەپاشدا، ئەبو بەکری صدیق خەلیفەی پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و ئێمەش هەر هی خوداین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە وە ڕەحمەت و بەرەکەتی خودا لەسەر ئەبو بەکری صدیق بێت کە دادگەری پیشە بوو ، نەرمو نیان لە کاردا ، لەسەر خۆی پۆشەری ڕاسپاردە پارێز، شیرین بێژوو دانا، لەم موسیبەتەی بەسەرمان هاتوە چاوەڕێی پاداشت لای خوا دەکەین ، لە خوای گەورە خوازیارم لە گوناه بمان پارێزێ ، یارمەتیمان بدات لەسەر گوێدێری و کار کردن بەشەریعەت تا لە ژیانداین، مردنیشمان بەرەوە بەهەشت بمان بات ، بە ڕاستی خوای گەورە بەدەسەلات و بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، هەواڵی گەمارۆی ئێوەمان بۆ دیمەشق پێگەیشتووە، من تۆم کردەئەمیری ئەو سوپایەی لەوێیە ، تۆش لەشکرەکەت بە ناوچەکانی حەمص و دیمەشق و ناوچەکانی تری وڵاتی شام بڵاو بکەرەوە، بە ڕای خۆت و ئەو هاوەڵانەی لەگەڵتن کارەکان بەڕێوە بەرە، ئەم ڕاو بۆچونەی من نەبێتە بارێك بەسەرتەوە بە جۆرێك کە سوپاکەت بەهەلاکەتا بەری، چونکە دوژمن چاوت تێدەبڕێت، ئەوەی لێی بێنیاز بوویت بەڕێی بکەرەوە ، پێویستیت بەهەر کەسێکیان بوو لای خۆت گلی بدەرەوە، با لە ڕیزی ئەوانەی کە لای خۆت دەیهێڵێتەوە خالدی کوڕی وەلید بێت لەبەر ئەوەی کە ناتوانیت لەو بێنیاز بیت ،[1] لە کاتی گەیشتنی پەیامەکەدا ئەبو عوبەیدە بانگی موعازی کوڕی جەبەلی کرد و نامەکەی بۆ خوێندەوە، هەڵگری پەیامەکەش وتی: ئەی ئەبو عوبەیدە عومەر داوات لێ دەکات سەبارەت بە ژیانی خەڵکی هەواڵی پێ بدەیت، هەواڵم پێ بدەیت خالدی کوڕی وەلید چ پیاوێکە؟ وە هەواڵم سەبارەت بە زەیدی کوڕی ئەبو سوفیان و عەمری کوڕی عاص پێ بدە، کە ئەوان لە بارودۆخ و خۆسازدانیان چۆنن و ئامۆژگاریان بۆ موسڵمانان چییە، دواتر ئەبو عوبەیدە وەڵامی نێردراوەکەی عومەری دایەوە، و ئەبو عوبەیدە و موعازی کوڕی جەبەل نامەیەکیان بۆ عومەر نووسی کە تیایدا هاتووە.... لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و موعازی کوڕی جەبەل بۆ عومەر، سڵاوی خوات لێ بێت، ئێمەش سوپاسی ئەو خودایە دەکەین کە هیچ خوای گەورەێك جگە لەو نیە، لە پاشدا وا ئێمە بەیعەتمان پێدایت ،، ئەی عومەر،

---

١ـ تاریخ دیمشق (١٢٥/٢).

بوویە کارەدەست و کاری ئومەتی محمد بە تۆ سپێردرا، لە سوور و ڕەشی ، دوژمن و ڕاستگۆ لە بەردەستی تۆدان، ڕێزدار و ڕیسوا و دەسەڵاتدار و بێدەسەلات، هەر یەکە لەمانە مافیان لەسەر تۆیە و مافیان لە دادپەروەریدا هەیە تۆش سەرنج بدە کە چۆن دەبیت ئەی عومەر، ئێمە ڕۆژێکت وەیاد دێنینەوە کە هەرچی نهێنیە تیایدا ئاشکرا دەکرێت وە هەرچی عەیبە تیایدا هەڵدەماڵرێت، شاراوەکان تیایدا دەردەکەون، تیایدا ڕوەکان ناچار دەکرێن لەبەردەم خوای بەدەسەڵاتا سەر داخەن، هەمو خەڵکی زەلیل و مل کەچن، لە سزای دەترسن، تکای ڕەحمەت و بەخشندەیی دەکەن، هەواڵمان پێ گەیشتووە کە لەم ئومەتە پیاوانێك هەن کە بە ئاشکرا بران و لە پەنهانیدا دوژمنی یەکترین، ئێمە پەنا بە خودا لەمە دەگرین، نووسراوەی ئێمە لە دڵی تۆدا شوێنێك ناگرێت جگە لەو شوێنەی کە ئێمە لە ناخی خۆماندا دامان ناوە، سڵاوو ڕەحمەتی خوای گەورەت لەسەر بێت.[1]

### * وتوویژی نێوان خالید و ئەبو عوبەیدە (ﷺ):

کاتێك، کە خالید بە فەرمانی لەکارخستنەکەی خۆی زانی پەسەندی کردو ڕۆیشت بۆلای ئەبوعوبەیدەو فەرمووی: خوالێت خۆش بێت، نووسراوی ئەمیری باوەڕدارانت بۆهاتووە،کە بویتە ئەمیری سوپاو ئاگادارم ناکەیتەوەو نوێژ لە پشتمەوە دەکەیت وە دەسەڵاتیش دەسەڵاتی خۆتە؟ ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: تۆش خوالێت خۆش بێت من نەمدەویست لەمە ئاگادارت بکەمەوە هەتا لەکەسێکی تروە هەواڵەکەت پێ بگات، نەمدەویست ئەوجەنگەت بەسەردا بشکێنمەوە، تا کۆتایی بێت پاشان من ئاگادارت دەکەمەوەو-إنشاءالله- من دەسەڵاتی دونیام ناوێ، کار بۆدونیا ناکەم، ئەمەی، کە تۆ دەیبینی بەرەو نەمان وکۆتایی دەڕوات و ئێمەش دوو براو هاوسەنگەرین، پیاو زیان ناکات لەوەی کە براکەی ببێتە ئەمیر بەسەریەوە لەدین و دونیایدا، بەڵکو ئەمیروا دەزانێت کە خەریکە خواروەکەیان بەرەو فیتنەیەك دەڕوات و دەیان خاتە نێو هەڵەیەکەوە لەوەی کە تیاچوونێکی نیشان دەدات، مەگەر کەسێك کەڕوو لەخودا بێت،ئەوانەش زۆر کەمن و دواتر ئەبوعوبەیدە پەیامەکەی عومەری گەیاندە خالید.[2]

### * عومەر (ﷺ) وەڵامی نامەکەی ئەبو عوبەیدە و موعاز دەداتەوە:

کاتێ پەیامەکەی ئەبو عوبەیدە و موعاز بەهۆی شەدادی کوڕی ئەوسی کوڕی ثابتی برازای حەسانی کوڕی ثابتی ئەنصاری گەیشتە عومەر، ئەو(ﷺ) وەڵامی نامەکەی دانەوە: من سوپای ئەو خوایە لەسەر ئێوە دەکەم، کە هیچ خوای گەورەیێك جگە لەو نیە، لەپاشدا ، من وەسیەتتان بۆ دەکەم بە خوا پەرستی، بەڕاستی ڕەزامەندی خوای گەورە لەمەدایە، زاخاوی دەرون و پاککردنەوەش بەوە دەبێت ، وە پاشەکەوتکراوی عاقڵانە بۆ ڕۆژی تەنگانەو دەستە پاچەیی، من پەیامەکەی ئێوەم پێ

---

١ـ فتوح الشام (ص: ٩٩-١٠٢)، التأريخ الاسلامي (٢٧٤/٩).
٢ـ تأريخ دیمشق (١٢٦/٢).

گەیشت کە تیایدا وەیادم دێنێنتەوە کە ئێوەبەیعەتتان پێکردوم ، ئەوە تەزکیەیە لە ئێوەوە بۆ من، باسی ئەوەتان کردووە کە من کاری ئەم ئومەتەم گرتۆتە دەست، لە ژێر دەسەلاتی مندا ڕێزدار و ریسوا، دوژمن و ڕاستگۆ، بەهێز و بێ دەسەلات هەیە، هەریەکەیان بەشی خۆی لە دادپەروەریدا هەیە، لێم دەپرسن کە من لەم کارەدا چۆنم، بەڕاستی جگە لە پشت بەستن بە خودا هیچ هەوڵ و تەقەلایەك نی یە، نوسیوتانە و دەمترسێنن بە ڕۆژێك کە لەبەردەمماندایە، ئەمەش بە جیاوازی شەو و ڕۆژ، ئەوان هەموو شتێکی نوێ ئاشکرا دەکەن، دورەکان نزیك دەخەنەوە، هەموو بەڵێن پێ دراوێکیش دێنن، هەتا ڕۆژی قیامەتیش دێن، ڕۆژێکە پەنهانی یەکانی تێدا ئاشکرا دەبێت، عەیبەکان هەڵدەماڵرێت، دەم و چاوەکان تیایدا لەبەردەم خوای بەدەسەلاتدا لاوازو زەبونن، هەموان مل کەچ و بێدەسەلاتن، لە سزای دەترسن ، چاوەڕوانی فەرمانی دەکەن ، تکای بەزەیی و ڕەحمەتی ئەو خوایەن، باسی ئەوەتان کردووە کە هەواڵتان پێ گەیشتووە کە لەم ئومەتەدا پیاوانێك هەن کە بە ئاشکرا بران و لە پەنهانیدا دوژمنن ، بەڵام ئەمە سەردەمێك نی یە بۆ ئەوە، چونکە ئەوە لە کۆتایی ئەم سەردەمەدا دەبێت ئەگەر بێت و هەڵنان و ترسان لە ئارادا نەبێت، هەڵنان و هاندانی خەڵك و ترساندنیان، هەندێکیان بۆ هەندێکیان، سوێند بە خوا ئەم کارەی ئێوە مایەی دڵسۆزیە بۆ من، من لە خوای گەورەم داوا دەکەم، کە دامەزراو بکات لەسەری و ئاگادارم بکاتەوە لێی هەروەك ئەوەی، کە کەسانی تری لێ ئاگادار دەکاتەوە، من کەسێکی موسوڵمان و بەندەیەکی لاوازم مەگەر خوا یارمەتیم بدات، ئەوەی کە من لە خەلافەتی ئێوەدا گرتومە دەست ـ إن شاء الله ـ هیچ شتێك لە خوڕەوشتم ناگۆڕێت، بەڵکو ئەمە گەورەیی یە بۆ خوای گەورە، هیچی بۆ بەندەکان تێدا نی یە، هیچ کەسێك لە ئێوە نەڵێت عومەر لەو کاتەوە بۆتە فەرمانڕەوا گۆڕاوە، من ماف لەخۆم دەگرم و دەچمە پێشێ، کاری خۆمتان بۆ ڕوون دەکەمەوە، کامێك لە ئێوە پێویستیەکی هەیە، یان ستەمێکی لێ کراوە، لەنێوان من و هیچ موسوڵمانێکدا نەرم و نیانی نی یە، من چاکسازی ئێوەم بۆخۆم پێ خۆشە و سەرزەنشتی ئێوە لەلام ئازیزە، پاش ئەمە ناتوانم متمانە بەکەس بکەم جگە لە سەر ڕاستان، و خەڵکی ئامۆژگار کار لە ئێوە بۆ خەڵکی، ئەمانەتەکەم نادەمە یەکێك جگە لە وان، إن شاء الله، دونیا و دەسەلات و فەرمانڕوازاییش، ئێوە دەیبینن کۆتایی دێت ، هەر چۆن بێت ئێمە برای یەکترین، هەر کامێکمان یا براکەی، یان ئەمیرێکی بەسەرەوەیە ئەمە زیانی پێ ناگەیەنێ لە دین و لە دونیای، بەڵکو ڕەنگە هەنگاوێ نزیکیان بکاتەوە لە فیتنەیەك و بیان خاتە نێو تاوانێکەوە مەگەر لە ڕوتێکردنی خودا بێت، ئەوانەش زۆر کەمن.[1]

### یەکەم: ڕزگار کردنی دیمەشق:

فتوحاتی شام لە سەردەمی عومەردا بە قۆناغی دووەم دێتە ئەژمار، لە فتوحاتی ئەم بەرەیە پاش فتوحاتەکانی سەردەمی ئەبوبکر، پاش ئەوەی، کە جەنگی یەرموك کۆتایی پێ هات و، ڕۆمەکان شکان و ئەبو عوبەیدەی کوڕی ئەلجەرڕاح بەشیری کوڕی کەعبی ئەلعومەیری کردە ئەمیری یەرموك،

---

١ـ فتوح الشام (ص: ٩٩-١٠٢).

هەواڵی بۆ هات کە دۆڕاوانی ڕۆم لە (فحل) کۆبونەتەوە، هاوکاری و یارمەتیشیان لە حمص ەوە بۆ دێت ، ئەبو عوبەیدە نەیزانی لە دیمەشقەوە دەست پێ بکات یان لە فەحلوە لەووڵاتی ئوردن، بۆیە ئەبو عوبەیدە کوڕی جەڕڕاحی سەرکردە نامەیەکی نوسی بۆ خەلیفە عومەر (ﷺ) دوای فەرمانێکی لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوە: لە پاش دا، لە دیمەشقەوە دەست پێ بکەن و بیکەن و بەچاکی خۆتانی بۆ ئامادە بکەن ، ئەوێ قەڵای شام و ماڵی میر نشینەکانە، خەڵکی فەحل سەرقاڵ بکەن بەناردنی هەندێ سوار ، لە بەرامبەریان بێت هەروەها فەلەستین و حمصیش، ئەگەر خوای گەورە پێش دیمەشق ئازادی کرد ئەوا ئێمەش ئەوەمان پێ خۆشە، ئەگەر ئازادکردنی دوا کەوت ئەوا لێی گەڕێن تا خوای گەورە دیمەشق ئازاد دەکات، با هەرکەس دەیەوێت لە دیمەشق دابنیشێت و لێی گەڕێن، خۆت و تەواوی فەرماندەکان بەڕێ کەون تا فەحلیش ئازد دەکەن ، ئەگەر بە تەواوی ئازاد کرا، ئەوا تۆو خالید بەرەو حمص بکەونە ڕێ لەگەڵ ئەمیری هەر ناوچەیەك و سەربازەکانیدا هاوەڵی بکەن هەتا لە ئەمارەتەکەی دەچنە دەرەوە.

لە میانی ئەم فەرمانانەی عومەر تێبینی ئەوە دەکەین کە: بەرپرسیارێتی سەرکردایەتی هێرشە جەنگی یەکانی دیاری کردوە، بەو هۆیەوە بنەمای هەوڵدان و کا کردن بەپێی توانای پیادەکرد ، وێڕای میانڕەو بوون لە هەڵس و کەوت بەرامبەر بە ئامانجە خوازراوەکان،هەروەك ئەوەی کە لەم فەرمانانەدا بەدی دەکرێت، ئامانجی سەرەکی یەکەم بریتی یە لەدیمەشق لەگەڵ ئاڕاستەکردنی هێزێکی بچوك بۆ فەحل، ئامانجی سەرەکی دووەم بریتی یە لە فەحل ، پاشان بەڕێکردنی تەواوی سوپاکە بۆ ڕزگارکردنی ئامانجی سێیەم کەحمصە،وە پاڵپشت بەم ئامۆژگاری یانە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح چەند یەکەیەکی گورچکبڕی نارد بۆ فەحل بەسەرکردەی ئەبو ئەلئەعوەری ئەسلمی عامری کوڕی حەتمە، و عەمری کوڕی کولەیب، و عبد عمری کوڕی یەزید کوڕی عامر، و عەمارەی کوڕی ئەلصەعقی کوڕی کەعب، سەفی کوڕی عەلیەی کوڕی شامل، و عومەری کوڕی ئەلحەبیبی کوڕی عومەر، لویدەی کوڕی عامر، بەشیری کوڕی عصمە، عەمارەی کوڕی موخشن، کە سەرکردەی ئەم یەکانە بوو، بەرەو فحل بەڕێ کەوت،[1] هەروەها ئەبو عوبەیدەش بەرەو دیمەشق بەڕێ کەوت، ڕوو بەڕوی هیچ بەرگری یەك نەبویەوە کە شیاوی باسکردن بێت، بەڵام ڕۆمەکان پشتیان بەست بەخەڵکی ئەو وڵاتە بەست پێش دیمەشق تا بەر بە پێشڕەوی هێزی موسڵمانان بگرن،بەڵام ئەوانە ئامادەی بەرگری کردن نەبوون، دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خراپی مامەڵەی ڕۆمەکان لەگەڵیان و بەتایبەتی بۆ گوند نشینە بچوکەکان،[2]پاشان هێزی موسڵمانان گەیشتە (غوتەی دیمەشق) کە کۆشك و تەلار و ماڵی ڕۆمەکانی تێدا بوو، بەڵام بینییان کە کەسی تێدا نەماوە و چۆڵ بوون، لەبەر ئەوەی کە خەڵکەکەی بەجێیان هێشت بوو چووبون بۆ دیمەشق، هیرەقل هێزێکی لە حمصەوە نارد بۆ کۆمەکی دیمەشق، کە بە (٥٠٠)

---

١ـ العمليات التعرضية الدفاعية عند المسلمين (ص: ١٨٢).

٢ـ الهندسة العسكرية في الفتوحات الاسلامية، د. قصي عبدالرؤوف (ص: ١٨٨).

سەرباز مەزەندە دەکران،[١] وە ئەمەش هێزێك بوو لەچاو ئەوەی کە هەڵوێستەکە دەیخواست، جگە لەوەش ئەو هێزە ئیسلامی یەی کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح لە باکوری دیمەشق بە سەرکردایەتی (ذی ئەلکلاع) داینا ڕوبەڕوی بویەوە، شەڕێکی خوێناوی لە نێوان هەردوولادا ڕویدا، کە ڕۆمەکان تیایدا شکان،[٢] خەڵکی دیمەشق داوای ڕزگاربونیان لە هیرەقل کرد، ئەویش نوسراوێکی بۆ ناردن و داوای خۆگری لێ کردن و هانی دەدان لەسەر بەرگری لە خۆ کردن، بەڵێنی هاوکاری پێ دان، ئەمەش وەرەی بەرز رەرزکردنەوە و وای لێ کردن کە بەرگری گەمارۆی سوپای ئیسلامی بگرن.[٣]

## ١- هێزی هەردولا:

### * سوپای ڕۆمەکان:

- سەرکردایەتی گشتی، هیرەقل
- ئەمیری دیمەشق، نستاس کوڕی نستورس
- سەرکردەی هێزی دیمەشق، با هان ئەو کەسەی بەشداری لەیەرموك کرد و لێی هەڵهات و ناوی وەردیان بوو.
- ژمارەی هێزە ڕۆمیەکان لە دیمەشق (٦٠٠٠٠) شەست هەزار سەرباز بوون، لەگەڵ ئەگەری گەیشتنی هێزی زیاتر لە حمصەوە کە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار سەرباز بۆ هێڵی بەرگری و (٤٠٠٠٠) چل هەزار سەربازیش بۆ ڕووبەڕوبونەوە، ڕۆمەکان بۆ سود وەرگرتن لە بینایە و قەڵاو شورەکانی دیمەشق مانەوە و ڕەنگە چاوەڕوانی هاوکاری و کۆمەکیشیان کردبێ بۆ ڕوبەڕو بونەوە.
- هێزی ڕۆمیش لە فەحل، لە پارێزەرانی و پاشەڵەی سوپای شکست خوادوی یەرموك کە ئەمەش بویەهۆی روخانی ورەی سوپاو هەڵهاتنیان لە فەحل .

### * سوپای موسڵمانان:

- سەرکردایەتی گشتی سوپای ، عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ).
- سەرکردەی گۆڕەپانی جەنگ لە شام، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح .
- ئەبو عوبەیدە (١٠) کەس لە سەرکردەکانی نارد کە لە پێشیانەوە ئەبو ئەلئەعوەری ئەسلمی بوو لەگەڵ هێزێکی بەتوانا لەسوپای ئیسلام، هیچ سەرچاوەیەك ژمارەی ئەو هێزەی باس نەکردووە بۆ کۆنترۆلکردنی ڕێگەی دیمەشق و هەتا بیسان کە شوێنەکەی ئەمرۆ ناسراوە بە قوڵایی فەصل.[٤]

---

١ـ البداية والنهاية (٧/٢٠)، الهندسة العسكرية (ص: ١٨٨).
٢ـ البداية والنهاية (٧/٢٠)، الهندسة العسكرية (ص: ١٨٨).
٣ـ الهندسة العسكرية (ص: ١٨٨).
٤ـ هەمان سەرچاوە (ص: ١٨٩).

- ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح سوپایەکی بەسەرکردایەتی (عەلقەمەی کوڕی حەکیم و مەسروقە) نارد کە هەریەکەیان بە شوێنێکی تر و بەرەو فەلەستین کەوتنە ڕێ، کە کۆنترۆڵ ڕۆژ ئاوا و باشوریان کردبو خستبویانە ژێر چاودێریەکی توند تۆڵەوە.[1]

ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح هێزێکی بەسەر کردایەتی (ذی ئەلکلاع) بەرەو بەشی باکوری دیمەشق نارد هەتا لەسەر ئەو ڕێگەیە بمێنێتەوە کە دەیبەستێتەوە بە شاری حمصە وە بۆ پارێزگاری کردن لەو ڕێیەو و بەرگرتن لە گەیشتنی کۆمەکیە ڕۆمیەکان بۆ دیمەشق.[2]

- ژمارەی هێزە ئیسلامیەکان لە جەنگی یەرموك نزیکەی (٤٠٠٠٠) چل هەزار سەرباز بوون، ئەم هێزە ڕێکخستنیان پتەو بوو، بەگیانی پڕ لە مەعنەویەتی بەرز پاش سەرکەوتن لە جەنگی یەرموك دەناسران.[3]

- ژمارەی ئەو هێزە ئیسلامیەی گەمارۆی سەر شاری دیمەشق نزیکەی (٢٠٠٠٠) بۆ دامەزراندنی بەرەیەك لەوێ و بەپێی توانا لەکاتی پێویستدا پاشەکشەی پێ دەکرێت لە فەحل هەتا هێزی گەمارۆکە بتەو بکات.[4]

## ٢- ناساندنێکی شاری دیمەشق:

دیمەشق شارێکی گەورەیە و بەناوی بنیات نەرەکەی (دمشاقی کوڕی کەنعان)ەوە ناو نراوە، و ملی بۆ فەرمان ڕەوای میسر داوە لەسەر دەمی خێزانی هەژدەیەم، کۆنترین شارە لە مێژوودا و مەڵبەنبینی پەرستشتی بتەکان بووە، کاتێ مەسیحی یەکان چونە نێویەوە لە پەرستگای بت پەرستیەکەدا کەنیسەیەکیان دروست کرد کە جگە لە کەنیسەی ئەنتاکیە هیچ کەنیسەیەکی تر نەبوو لە جوانی و گەورەیدا هاوشانی بێت.

زەوی یەکانی ناوچەی بەلقاء دەکەوێتە بەشی باشور و جۆلانیش دەکەوێتە بەشی باکوری دیمەشقەوە، زەوی ئەم شارە زۆر بە پیت و فەرە ، زەوی یەکانی تێکرا شینایی و سەرچاوەی ئاوین، مەڵبەندێکی بازرگانی گرنگە ، عەرەبەکان تیایدا نیشتە جێن، مسڵمانان دەیاننناسی لەبەر ئەوەی کە بازرگانی یان لەگەڵ دەکرد. شاری دیمەشق بە شوورە دەورە درابوو ، بەبەرگری لە خۆ کردن جیا دەکرایەوە، شۆرەیەك هەبوو کە بە خانویەکی بەردین دەورە درا و بەرزی یەکەی (٦) مەتربوو، چەند دەروازەیەکی گەورەی تێدا بوو وە پانی ئەو بینایەی پشت شورەکە (٣) مەترە، هیرەقل پاش داگیرکاری فارسی بۆی نۆژەنی کردەوە بەهێزتری کرد، چەند دەرگایەکی بۆ دانا کە داخستنی زۆر تۆکمە و پتەو بوون، شۆرەکەشی بە خەندەقێك دەورەی درابوو کە پانیەکەی (٣) مەتربوو وە ڕوباری بەردینیش

---

١ـ الهندسة العسكرية (ص:١٨٩).

٢ـ تأريخ الطبري (٤/٢٥٨)، الهندسة العسكرية (ص: ١٨٩).

٣ـ اليرموك وتحرير ديار الشام، شاكر محمود رامز (ص: ١٠٣).

٤ـ الهندسة العسكرية (ص: ١٨٩).

دروست کردبوو  بە ئاوە زۆرەکەی کاری دەکردە سەر خەنەقەکە بەم شێوەیە دیمەشق بویە قەڵایەکی پتەو کە سنور بەزاندنی کارێکی ئاسان نەبوو،[1] وە بەمەش بەرگری بەهێزی ڕۆمەکانمان بۆ دەردەکەوێت، بۆ پاراستنی شاری دیمەشق، بەجۆرێ کە ئەم پتەو کردنانە هەندێك بەڵگەمان دەداتێ لەوانە:

- دەست بەجێ بەرگری یە مەیدانیەکان بە دەوری دیمەشقدا دانەمەزران، چونکە ئەوانە کۆمەڵێ بەرگری کردنی ئامادەکراو بوون بە دوور لە ماوەیەکی کورت و کەم، بەجۆرێ کە دیمەشق بایەخێکی ستراتیژی هەبوو، ڕۆمەکان دەترسان لە دەستی بدەن و فارسەکانیش هەوڵی کۆنترۆڵ کردنیان دەدا، ئەمەش مانای وایە کە هەوڵی ئەندازەیی مەیدانی ڕۆم کاری لە ڕێك و پێك کردنی ئەم بەرگری کردنانە کردووە بە سەربەستی یەکی ڕەهاو بە هۆکار و کەرەستەی ئەندازەیی شیاو و ناخوازراو بە ڕویەکی تردا، لەگەڵ چاکی ئاسانکاری توانا ئەندازەیی یەکان لای سوپای ڕۆم لەم بوارەدا.

- چەندین داهێنراوی ئەندازەیی ڕۆم لە میانی بەربەستەکانی دەورو بەری شاری دیمەشق دەرکەوتن، بەجۆرێ کە بنەما ئەندازەیی یە سەربازی یەکان سودیان لە سروشتی زەوی یەکە وەرگرت بۆ دامەزراندنی ئەم دام و دەزگایانە، بەتایبەتی بەگەر خستنی ڕوباری بەردین  بەوەی کە خزمەتی پڕکردنی ئەو خەنەقە دەکات کە بە دەوری شارەکەوەیە، جگە لەوەش سوبینی تری لێ دەبینرێ بەوەی کە دەکرێتە بەربەستێکی سروشتی کە تزانای سوپای  هێرش بەر لەسەر شارەکە پەك دەخات لەئاراستەی باکور و باکوری ڕۆژ هەڵاتیەوە.

- هەر ئەو دەمە متمانەی سەرکردەکانی ڕۆم بە پتەوی و قایمی  شورەکانی شارەکە زۆر گەورە بوو هەر ئەمەش وای لێکرد کە سوپاکەی لەوێ کۆبکاتەوە و هێزێکی بەرگری کاتی تێدا پێك بهێنێ بەڵکو هێزی حمص لە ڕۆم بتوانێ تەواوی هێزەکانی خۆی کۆ بکاتەوە بۆ ڕووبەڕوبونەوەی سوپای موسڵمانان، ئەمەش مانای وایە کە بەرگری کردنە ئەندازەی یە مەیدانیەکان دەڕواتە نێو ناچارکردنی سەرکردەکانی ڕۆم لە بەهەند وەرگرتنی ئەم هەڵوێستە بەرگری کارانەیە، ئەمەش بویە هۆکاری ڕاستەوخۆ لەو بڕیاردانە، ئەمەش زۆر گرنگە لەسەر ناسینی مەودای بایەخی ئەندازەیی سەربازی لە گۆڕەپانی جەنگدا.

- پێچەوانەی ئەمەوە بەرگرییە ئەندازەییە مەیدانی یەکان، سوپای موسڵمانانی ناچارکرد بە ڕوبەڕوبونەوەی شاری دیمەشق و سنور بەزاندنی،بەجۆرێ کە دەزگای بەربەستە ڕۆمیەکان وەك کۆسپێك لە ڕوی سوپای ئیسلامیدا وەستایەوەو پلانی سوپای ئیسلامیش فەرزی گەمارۆ خستنە سەرشارەکەی قۆستەوە.

سەرچاوە مێژویەکان دەڵێن، کە گەمارۆی شاری دیمەشق(٧٠) شەو بەردەوام بووەو ئەو گەمارۆیە زۆر سەخت و دژوار بووە و تیایدا چەکی قورس بەکار هاتووە، وەك مەنجەنیق و زرێ پۆش.[2]

---

١ـ الهندسة العسكرية (ص: ١٩٠).

٢ـ هەمان سەرچاوە(ص: ١٩٠-١٩١).

## ٣- ڕەوتی جەنگەکە:

ئەبو عوبەیدە بە مەبەستی فەتحی دیمەشق کەوتە ڕێ و ئەم پێکهاتەی خوارەوەی بە هەند گرت:

- دڵی سوپا: خالدی کوڕی وەلید.
- پێشڕەوەکان: عەمری کوڕی عاص و ئەبو عوبەیدە.
- سوارەکان: عیازی کوڕی غەنەم.
- پیادەکان: شەرحەبیلی کوڕی حەسنە.

لەبەر ئەوەی، کە شورەی دیمەشق دەرگای هەبوو بەهۆی ئەوەوە نەبێت ناکرێت بڕۆنە ژووری بۆ ناو شارەکە و لێی بێنە دەرەوە، لەبەر ئەوە موسڵمانان هێزی گەمارۆکەیان بەم شێوەیە ڕێك خست:

- دەروازەی ڕۆژهەڵات بەسەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید.
- ك دەروازەی جابیە بەسەرکردایەتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح.
- دەروازەی تۆما بەسەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص.
- دەوازەی فرادلیس بەسەرکردایەتی شەرحەبیلی کوڕی حەسنە.
- دەروازەی بچوك بەسەرکردایەتی یەزیدی کوڕی ئەبو سفیان.

ڕۆمەکان گومانیان وابوو کە موسڵمانان ناتوانن لە بەردەم درێژی ئەم گەمارۆیە بوەستن بەتایبەتی لە ڕۆژانی زستان، جگە لەوەی کە موسڵمانان کەسانی خاوەن بیر و باوەڕ دامزراوو بۆ خوا بون ، خۆیان لەبەردەم گۆڕانەکانی کەشدا گرت، سەرکردەی موسڵمانان کاریان کرد لەسەر وەگەرخستنی کەنیسە وازلێهێنراوەکان بەزەلکاو و خانوە چۆڵەکان هەتا موجاهیدان تیایدا بحەوێنەوە، لەسەر هاودەنگی شێوازی هەفتەمیش هێزەکانی پێشەوە کە لە دەروازەکاندان ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێت لەگەڵ هێزەکانی دواوە بەم ڕێکخستنەش گەمارۆ بەردەوام دەبێت ئەگەر چی ماوەکەشی درێژ بکرێتەوە.[١]

موسڵمانان لەم سنورەدا نەوەستان، پەیبردنە مەیدانیە ئەندازیەکان بەردەوام بوون بۆ دەزگاکانی دژە بەربەست، هەروەها خالدی کوڕی وەلید سەرکەوتوو بوو لە هەڵبژاردنی ناوچەی شیاوی پەڕینەوە لەم دەرگایانەدا، کە دەکرێت لە میانی ئەم کارەوە سنوری شاری دیمەشق ببەزێنرێ، هەڵبژاردنەکە کەوتە سەر باشترین شوێنێك کە دەوری بە دیمەشق گرتبوو کە بەشی زۆری ئاوو دەروازەی سەخت و دژوار بوو،[٢] هەروەها چەند پەیژەیەکی ئامادە کرد تا بخرێنە سەر دیوارەکان و سوپا سەرکەون بەسەر شۆرەکانا، خالدی کوڕی وەلید زانی کەپێشەوای ڕۆمەکان بۆتە خاوەنی کوڕێك و خەڵکی لە میوانداری یەکدا کۆکردۆتەوە ڕۆمیەکانی سەرقاڵ کردووە بە خواردن و خواردنەوە وە ئەرکەکانی خۆیان پشت گوێ خستووە و چاودێری کردنی دەروازەکان پشت گێ خراوە، کاتێ ڕۆژە ئاوا بوو خالدی کوڕی وەلید و ئەو سەربازانەی کە لەگەڵیدا بوون و لێیان چویە پێشەوە ڕاپەڕی و لەگەڵ قەعقاعی کوڕی عەمر و

---

١ـ الهندسة العسكرية (ص: ١٩٢).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٢٥٩).

مەزعوری کوڕی عودەی پێشیان کەوتن و فەرمویان: ئەگەر گوێتان لە الله أکبر بوو ، لەسەر شورەکان بەرز بنەوە بۆ لامان و دەرگاکان بکەنە شوێنی مەبەست و نیازتان.[١]

خالید و گروپی یەکەم خەندەقە ئاوی یەکەیان بەسەر دوو مەلەوانەوە لەو نزیکانە پەڕینەوە، گەیشتە شورەکە و ئەو پەتانەی کە وەك پەیژە ئامادەکرا بونهەڵیانە سەر شورەکە وەکاتێ پەیژەکان جێگیر بوون،[٢] پاشان هەریەکە لە قەعقاع و مەزعور پیایدا سەرکەوتن، پاشان لە پەیژەکان نەگەران تا دایان مەزراندن ، دواتر گروپی یەکەم بەشۆرەکەدا شۆڕبونەوە و دابەزینە نزیك دەرگاکە و ئەو کەسانەی کە لەگەڵ خالیددا بوون ژمارەیان زیادی کرد و یەکەمین الله أکبری لەسەر بەرزایی شورەکە کرد، پاشان گروپی دووەم سەرکەوتن بەسەر شورەکەدا و بەڕوی دەرگاکەدا چونە پێشێ و بە شمشێرەکانیان دەرگاکەیان تێك شکاند و بەم شێوەیە و لەسەر ئەم شێوازە هێزی موسڵمانان چویە نێو شاری دیمەشقەوە.[٣]

## * گرنگترین وانە و پەند و سودەکان:

### - ئایا ڕزگار کردن ڕێکەوتنە یان ناچار کردن:

زانایان هاودەنگ نەبون کە ئایا دیمەشق بە ئاشتی و ڕێکەوتن ڕزگار کراوە یان بەهێزو چەك ؟ زۆربەی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن ئەم شارە بە ڕێکەوتن و ئاشتەوایی فەتح کراوە لەبەر ئەوەی بە گومان بوون لەسەر پێشڕەوی بەسەر ئەوی تردا، کە ئایا بەزەبری چەك ڕزگار کراوە و دواتر ڕۆمەکان ملیان داوە بۆ ئاشتی و ڕێکەوتن؟ وەیان هەر بەئاشتی ڕزگار کراوە؟ یان فتوحاتی شوێنەکانی تر یان بینیوە و ترساون و بە ناچاری خۆیان بەدەستەوە داوە ؟ کاتێ گومانیان لەمەدا هەبوو ئەم کارەیان بە ڕێکەوتنێکی یەدەکی دانا، دەڵێن بەڵکو نیوەی بە ڕێکەوتن بووە، نیوەی بە بەزەبری چەك بووە، ئەم وتەیەش لەکار و کردەوەی یاران لەو کەنیسەیەی کە گەورەترین پەرستگایان بوو کاتێ، کە نیوەیان گرت و لە نیوەکەی بینی گەران،[٤] خواش باشتر ئاگادارە.

### مێژووی ئازادکردنی

إبن کثیر دەفەرموێت: سەیفی کوڕی عومەر دەڵێت پێدەچێت ئازاد کردنی دیمەشق لەساڵی ١٣ کۆچیدا بوبێ، بەڵام سەیفی کوڕی عومەر لە مێژوی ئازادکردنی دیمەشقدا هەمان ڕای جمهوری هەیە، ئەم ڕوداوە لە نیوەی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٤ ڕویداوە،[٥] هەروەها خەلیفەی کوڕی خەیات باسی ئەوە

---

١ـ الهندسة العسكرية (ص: ١٩٢)، البداية والنهاية (٧/ ٢٠).
٢ـ الهندسة العسكرية (ص: ١٩٢، ١٩٣).
٣- الهندسة العسكرية (ص: ١٩٢).
٤- ترتيب وتذهيب البداية والنهاية (ص:٥٦).
٥- هەمان سەرچاوە.(ص:٥٥).

دەکات کە ئەبو عوبەیدە لەمانگی ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزان و شەوال گەمارۆی ڕۆمەکانی لە دیمەشق داوە و ڕێکەوتنیش لە مانگی ذی القعدە تەواو بووە،[1] وە گرنگ ئەویە کە ئازادکردنی لە پاش جەنگی یەرموك بووە.[2]

## - پراکتیزە بوونی هەندێ بنەمای جەنگی:

ڕزگار کردنی دیمەشق خاڵی نەبووە لە پراکتیزەکردنی هەندێ بنەمای جەنگی لای موسڵمانان، بەڵکو گشت گیر بووە لەسەر کاری لەناکاوی و دەست پێشخەری، هەڵقۆستنەوە و داهێنانی سەرکردە مەیدانیەکان، ئێمە ئەوەمان بینی کە خالدی کوڕی وەلید پێی هەست لە پێشڕەوی و لە هەڵبژاردنی ناوچەی شیاوی پەڕینەوە، کە چۆن هەڵوێستەکە گۆڕا، و لەکردەی گەمارۆوە گۆڕا بۆکردەی وێرانکاری و سنور بەزاندن، ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەوەی کە خالدی کوڕی وەلید پێی هەستاوە لە بەکارهێنانی پەست لەسەر شێوەی پلیکانە و سودلێ وەرگرتنی بەسەرکەوتنی بەسەر شورای دیمەشق، و لەنێوان ئەوەی کە سوپای میسری لەجەنگی تشرینی ساڵی (١٩٧٣)ز لەسەر بەرەی میسری ئەنجامیدا لەکاتی پەڕینەوەی لە هێڵی بارلیفی جولەکە و بەکارهێنانی پەتکاری لەسەر شێوەی پلیکانە و هەروەها گەیشتن بۆ چەند ناوچەیەکی دژە بەرگری، ئەوا دەبینین ئەم کارە بەگوێ بۆ شل کردن وشێواز و هەمان ئامراز بەجێ هێنراوە.بەجۆرێ بلیمەتی موسڵمانان بۆ روون دەکاتەوە لە میانی ئەو ئازادیخوازە ئیسلامیانە، ئەم جەنگە نوێیانەی ئێستامان درێژەدانە بەو داهێنان و بلیمەتی یە.[3]

## - هەندێك لەو شیعرانەی کە لە ئازادکردنی دیمەشقدا وتراوون:

قەعقاعی کوڕی عەمر دەفەرموێت:

أقمنا على داري سليمان أشهـداً — نجالد روماً قد حملنا بصـارم[4]
قصصنا الى الباب الشرقى عنوة — فدان لنا مستسلماً كل قائـم[5]
أقول وقد دارت رجانا بدارهـم — أقيموا لهم صرالورى بالغلاصم[6]
فلما زأدنا في دمشق نحورهـم — وتدمر عضوا امنهابالأباهـم

---

١- تأريخ خليفة (ص:١٢٦).
٢- الهندسة العسكرية (ص:١٩٣).
٣- الهندسة العسكرية (ص:١٩٥).
٤- داري سليمان: نتمر ودمشق — دومالی سلیمانی کوری داود بوون.
٥- رومان کردە باس الشرق کە لێوەی دەڕۆی بۆ عێراق و بە تۆبزی ڕزگارمان کرد.
٦- الحديث موجة الى نساء العدو: أقيموا لهم الوارى بالغلامم إجعلوا الرجالكم المدارى به برأس حلوقم الجنبهم أرخوفهم من الحرب.

## * ڕێخۆشکردن بۆ فتوحاتی پاش دیمەشق:

پاش ڕزگار کردنی دیمەشق ئەبو عوبەیدە خالدی کوڕی وەلیبینی نارد بۆ ناوچەی البیقاع،[١] و بەزەبری چەك ئازاد کرد، لەشکرێکی نارد لەناوچەی عەین مەیسنون لەگەڵ سوپای ڕۆم بەیەك گەیشتن، ڕۆمەکانیش لە ژێر فەرمانڕەوایی پیاوێکدا بوون کە پێیان دەوت (سنان) کە لە بەرزایی یەکانی بە یروت بۆ موسڵمانان هاتە خوارەوە، لەوکاتەداموسڵمانان ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید کراو ناوی عەین مەیسنونیان کرد بەناوی عین الشهداء، ئەبو عوبەیدە یەزیدی کوڕی ئەبوسفیانی کردە فەرمانڕەوایی دیمەشق و دحیە کوڕی خەلیفەی نارد بۆ تەدمور هەتا درێژە بەکارەکانیان بدەن، دواتریش ئەبو زەهرای قشێری نارد بۆ سەنیەو حوران و لەگەڵ خەڵکەکەیدا ڕێککەوت، هەروەها شەرحەبیلی کوڕی حەسنە ئوردنی ڕزگار کرد بەزەبری چەك،وازی لە تەبەریە نەهێنا تا خەڵکەکەی لەگەڵیدا ڕێك نەکەوتن، خالید دەستی گرت بەسەر زەوی یەکانی ناوچەی بیقاع و پاشان خەڵکی بەعلەبەك لەگەڵیدا ڕێککەوتن و ئەویش نامەیەکی بۆ نوسین.

### دووەم: ڕووداوی فحل

ئەو سوپایەی کە کاری ڕزگاری کردنی فیحلی پێ سپێردرابوو بەرەو ناوچەکانی باشور کەوتنە ڕێ ، کاتێ گەیشتنە کەنارەکانی ئەو دەمە هێزی ڕۆمەکان نزیکەی سەد هەزار کەس دەبوون، زۆربەیان لە حمصەو هاتبوون دانیشتوانی ئەو گوندانەش دابویانە پاڵیان کە لە جەنگەکانی پێشودا تێك شکا بوون، کاتێ ئەو سوپایەی گەمارۆی فیحلی پێ سپێردرابوو لە سوپای موسڵمانان بە سەرۆکایەتی عەماری کوڕی مەخشن گەیشتە جێ ،سوپای ڕۆم لە دورپیانی تەرع لە دەریاچەی تەبەریە بەرەنگاری بونەوە و ئاوی دەریاچەکەیان کرد بەسەر ئەو خاکە قوڕینەی کە لە دەور و بەری فیحلی دابوو، بەمەبەستی پەکخستنی سوپای ئیسلام بەتایبەتی ئەسپ سوارەکان ، ئەمەش ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت دژی زرێ پۆشەکان ، بەمەش بزاوتی سوار چاکانی موسڵمانانیان پەکخست، ڕۆمەکان لەم هەلو مەرجانەدا چەند پیلانێکی بەرگریکارانەی نەبەزیان دانا لەفیحل لەگەڵ ئەوەی کە دەکەوێتە ناوچەیەکی بیاباناوی وشك، ئەگەر چی ئەو بیابانە ووشکە شتێکی باش بوو بۆئەوەی موسڵمانان بتوانن شارەکە ئازاد بکەن چونکە ئەوان بەتوانا ترین کەسانێك بوون لەجەنگی بیاباندا، پاشان عەمارەی کوڕی مەحنش وەستاو هێزەکانی دابەشکرد بۆ گەمارۆی فیحل ، بەڵام نەیتوانی بیبەزێنێ ئەمەش بۆ بونی ئەو جیاوازی یە گەورەیەی لەڕوی ژمارەوە هەبوو لە هێزدا و بۆ گرانی پێشڕەویونەبونی تونا لە تێپەڕاندنی ئەم بەر بەستە ئاوی یەی، کە ڕۆمانەکان کردبویان، موسڵمانان گەمارۆی سەر شاری فیحلیان کورت کردەوە، ڕۆمەکان دەستیان پێوە گرتبوو تا ئەو کاتەی ئەبو عوبەیدە لە ڕزگارکردنی دیمەشق پایتەخت بویەوە و سوپاکەی دایە پاڵ سوپاکەی ئەبو ئەعوەری ئەسلمی و دواتر ئەبو عوبەیدە سوپاکەی بەم شێوەیە ڕێك

---

١- ترتيب وتذهيب البداية والنهاية (ص:٥٨)، العمليات التحرضية والدفاعية عندالمسلمين (ص:١٥٨).

خستەوە:

- بەشی پێشەوە بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید.
- لای ڕاست بەسەر کردایەتی ئەبو عوبەیدە کوڕی جەڕڕاح.
- لای چەپ بەسەر کردایەتی عەمری کوڕی عاص.
- ئەسپ سوارەکان بەسەرکردایەتی ضرار کوڕی ئەزدەر.
- پیادەکان بەسەرکردایەتی عەیازی کوڕی غەنەم.
- سەرکردایەتی گشتی بۆ شەرحەبیلی کوڕی حەسنە ئەویش لەبەر ئەوەی شەڕەکە لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە، شەرحەبیلی کوڕی حەسنە سەرکردایەتی سوپاکەی گرتە دەست و پاشان ڕەساندنی هێزەکە و کۆمەکی یەکانی ڕێکخست و پلانێکی دانا بۆ ڕاپەڕاندنی هێزێك ومانەوەی هێزێکی ئامادە بەبەردەوامی بۆ ڕوبەروبونەوەی کت وپڕی ، شەرحەبیل بەردەوام خەریکی ڕێکخستنی سوپاکە بوو.[1]

ئەم گەمارۆیەش، کە بۆ شاری فیحل دانرابوو درێژەی کێشا و ڕۆمەکان گومانیان وابوو کە لەتوانایاندایە کاری کت و پڕی ئەنجام بدەن و هەستن بە هێرشی شەوانەی یەکلایی کەرەوە، ڕۆمەکان لەلایەن سەقلابی کوڕی مخراقەوە سەرپەرشتی دەکرا، ڕۆمەکان هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان لەیەك کاتدا لەبەر ئەوەی ئەوان لە هەلومەرجی ئامادە باشی یەکی هەمیشە دابوون، جەنگەکە لە تەواوی ئەو شەوە و تاهەڵهاتنی هەتاو بەردەوام بوو، کاتێ شەو داهات ڕۆمەکان هەڵاتن و سەرکردەکەیان کوژرا، ئەم شکستەیان دانی بەدەست ئەو قوڕاوە بەربەستەی کە ئامادەیان کردبوو بۆ موسڵمانان وە لەئاکامی ئەو بەجێ هێنانە ئەمنی و ئامادەکاری یانەی کە شەرحەبیل پێی هەستا لەسەر هێزەکانی، ئاژاوەیەك لەنێو ڕیزەکانی سوپای ڕۆمانی هێرشبەر و خۆیەکلایی کردنەوەی موسڵمانان بۆ ئەو دژە هێرشەی ئەنجامیاندا ر بویە بەهۆی شکستیان وکەوتنە نێو ئەو بەربەستە ئاوی یانەی کە بە دەستی خۆیان بە دەوری فیحلدا دروستیان کردبوو بۆ موسڵمانان، پاشان موسڵمانان بە ئەسپەکانیان لێیان دان، جگە لە ون بووان کەسیان ڕزگاریان نەبوو، پاشتر فیحل لە هێزی ڕۆم بەتەواوی پاککرایەوە، لەم کاتەدا موسڵمانان بەرەو ئەنجامدانی ئامانجەکانیان کەوتنە ڕێ بۆ بەدواداچوونی پلانی کردەییە سەربازیەکان ئەمك دوانە :

- شەرحەبیلی کوڕی حەسنە بەڕێکرا بۆ ئوردن.
- عەمری کوڕی عاص بەڕێکرا بۆ فەلەستین.

هەروەها ئەبو عوبەیدە و خالدی کوڕی وەلید بەرەو حەمص کەوتنەڕێ و لە کاتی گەیشتنیان بە مێرگی ڕۆمەکان شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا و لاشەی کوژراوان ئەو ناوەی داپوشی، لەم جەنگەدا موسڵمانان توانیان بنەمایەکی گرنگ لە بنەماکانی جەنگ و کردە جەنگیە ڕووبەڕووبونەوەکانیان بەجێ بێنن بە جۆرێك سەرەتای سوپای ڕۆمەکان خۆی کێشا بە سەرەتای سوپای موسڵمانان، کاتێك کە (توزرا) هەستی بەپێکدادانی سوپاکەی بە سوپای موسڵمانان کرد هەستا بە جوڵەیەکی خولگەیی

---

١ـ العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (ص:١٨٨).

بە رەو دیمەشق بەڕێکەوت، موسڵمانان بەم کارەیان زانی و هەل و مەرجەکەیان تاوتوێ کرد و ئەبو عوبەیدە بڕیاریدا کە هێزێك بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی وەلید بنێرێتە ئەو ناوچەیە بە مەبەستی ڕاوەدوونانی (توزرا)و دەست گرتن بەسەریدا و ئەبو عوبەیدەش بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و سەرقاڵکردنی سوپای ڕۆم دەمێنێتەوە، لە هەمان کاتدا بەشی هەواڵگری موسڵمانان بە بزاڤ و ئاراستەی پێشڕەوی توزرای زانی و هێزەکەی یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێشڕەوی کرد و لەگەڵیدا تێك هەڵگژان ،ڕووبەڕووبوونەوە و پێکدادان لە نێوان توزرا و سوپای یەزیددا تەواو نەبوو کە خالدی کوڕی وەلید لە پشتەوە لە ڕۆمەکانی دا سوپای توزرا بە شێوەیەکی نیمچە تەواو کۆتایی پێهات.[1]

سەبارەت بە جەنگی ڕۆژی فیحل قەعقاعی کوڕی عەمر دەفەرمووێت:

| | |
|---|---|
| وغداة فحل قد رأوني معلماً | والخيل تنحط والبلا أطوار |
| ما زالت الخيل العراب تدوسهم | في يوم فحل والقنا مــوار |
| حتى رمين سراتهم عن أسرهم | في ردة مابعدها إستمــرار |
| يوم الرداغ معند فحل ساعة | خر الرماح عليهم مــدار؟ |
| ولقد أبدنا في الرداغ جموعهم | طراً ونحوي تبسم الابصــار |

هەروەها دەفەرمووێت:

| | |
|---|---|
| وغداة فحل قد شهدنا مأقطاً | ينسي الكمي سلاحة في الدار |
| ما زلت أريهم بقرحة كامــلٍ | كر المبيع ريانه الأبســـار |
| حتى فضضا جمعهم بتــردس | ينفى العدو إذا سما جــرار |
| نحن الاولى جسوا العراق بتروس | والشام جسا في ذري الاسفــار |

## سێیەم: ڕزگارکردنی بیسان و تەبەریە:

هەریەکە لە ئەبو عوبەیدە و خالید بەو سوپایەوە کە لەگەڵیان بوون بەرەو شاری حەمص بەڕێ کەوتن وەك ئەوەی کە عومەر ئەمیری باوەڕداران فەرمانی پێ کردبوون، بەم شێوەیە ئەبو عوبەیدە شەرحەبیلی کوڕی حەسنەی لە ئوردن وەك فەرمانڕەوایەك دانا، شەرحەبیل لەگەڵ عەمری کوڕی عاص بەڕێکەوت هەتا گەمارۆی بیسانی دا و دوژمنانی ئیسلام بۆی دەرپەڕین و دوای جەنگێکە گەورە ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتنن پاشان وەك ڕێککەوتنەکەی دیمەشق لەگەڵیاندا ڕێك کەوت، ئەویش سەرانەی لەسەر دانان و باجی خستە سەر زەویەکانیان وە ئەبو عوبەیدەش هەمان کردەی کرد بە دانیشتوانی تەبەریە.[2]

---

١ـ العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (ص:١٨٩).

٢ـ ترتيب وتهذيب البداية والنهاية (ص:٦١).

## چوارەم: جەنگی حەمص ساڵی (١٥)ی کۆچی:

ئەبو عوبەیدە درێژەی دا بەشراوونانی ڕۆمە دۆڕاوەکان بەرەو شاری حەمص، لەدەوروبەری دانیشت و گەمارۆی دا، خالدی کوڕی وەلیدیش خۆی گەیاندە ئەوێ، گەمارۆیەکی توندیا خستە سەر حەمص، ئەمەش لە کاتێکی زۆر ساردا بوو وە خەڵکی شارەکە ئارامیان گرت بەو هیوایەی موسڵمانەکان لەبەر سەما خۆیان پێنەگیرێت و بگەڕێنەوە ،سەرماکەش هێندە زۆر بووە ڕۆمەکان کە پێلاویان لوپێدا بوە قاچیان سەرما بردویەتی ، هاوەڵانیش جگە لە نەعلێك هیچی تریان لە پێ نەبووە و هەستیان بەو سەرمایە نەکردوە، گەمارۆکە بەردەام بوە تا وەرزی سزتان تەواو بووە، هەندێ لە گەورە کەسانی خەڵکی حەمص ئاماژەی ڕێك کەوتنیان بۆ کردوون لەو کاتەدا ئەوانیش پەسەندیان نەکردووە و فەرموویانە: ئایا ئێمە چۆن ڕێك بکەوین لە کاتێکدا کە میرەکەیان لێمانەوە نزیکە؟ دەگێڕنەوە هاوەڵان بەیانیەکان (ألله أکبر) یان کردووە بە جۆرێك کە شارەکە ی هەژاندوەو زەمین هەژینێك ڕوویداوە کە تیایدا هەندێ دیوار درزی بردووە و پاشان بە (ألله أکبر)ێکی تر هەندێ خانوو ڕووخاون، خەڵکەکە هاتوون بۆ لای سەرکردەکانیان و پێیان وتوون: ئایا نابین کە چیمان پێ هاتووە ئەمە چ بارودۆخێکە کە ئێمەی تێدایە؟ ئایا ڕێك ناکەون لەگەڵ ئەم میللەتە؟ ئەویش وتی: ڕێك کەون لەسەر ئەوەی کە خەڵکی دیمەشق لەسەری ڕێك کەوتوون لەسەر نیوەی ماڵەکان، دانی باجی زەوی و زارەکان، لەگەڵ وەرگرتنی سەرانە لەسەر کەسەکان بە پێی هەژاری و دەوڵەمەنبینی، ئەبو عوبەیدەش پێنج یەکی غەنیمەتەکان و مزگێنی لەگەڵ عبدالله ی کوڕی مەسعود نارد بۆ عومەر، ئەبو عوبەیدەش سوپایەکی بەهێزی لەگەڵ ژمارەیەك لە فەرماندەکانی وەك بلال و مقداد لە حەمص دانا، نامەیەکی نووسی بۆ عومەر و هەواڵی پێدا کە هیرەقل ئاوەکەی بڕیووە لە دورگەکە،[1] وە هەندێ جار دەردەکەوێت و هەندێ جاریش ون دەبێت، بۆیە عومەر نامەیەکی بۆ نارد و فەرمانی پێدا لە ناوچەکەی خۆیدا بمێنێتەوە.[2]

## پێنجەم: جەنگی قنسرین ساڵی (١٥)ی کۆچی:

ئەبو عوبەیدە خالدی کوڕی وەلیبینی نارد بۆ قنسرین،[3] کاتێك گەیشتە ئەوێ خەڵکەکەی و ئەو لایەنگرە عەرەبانەشی کە لەوێ بوون هەژان ، خالید جەنگێکی گەورەی لەگەڵ کردنو خەڵکێکی زۆریان لێ کوژرا، ئەو ڕۆمانەی کە لەوێ بوون میناسی ئەمیریان لەناوی بردن، بەلام عەرەبەکان پۆزشیان بۆ هێنایەوە بەوەی کە شەڕکردن ڕای ئێمەی لەسەر نەبوە، خالید ئەمەی لێ وەرگرتن و دەستی لێ هەڵگرتن، خالید پێی فەرموون: ئێوە ئەگەر لە هەوریش بوونایە ئەوا خوای گەورە ئێمەی دەگەیاندە لای ئێوە ،یان ئێوە دادەبەزاندە خوارەوە ، خالید لەوان نەگەرا تا خوای گەورە شارەکەی لەسەر دەست ڕزگارکرد، کاتێك ئەم هەواڵە گەشتە عومەر کە خالید لەم شارەدا کردوویەتی فەرمووی:

---

١ـ واتە لە ڕووباری فوراتەوە بۆ دوورگەکە.

٢ـ ترتیب وتذهیب البدایة والنهایة (ص:٦٢).

٣ـ تأریخ الطبري (٤/٤٢٧).

خوای گەورە ئەبو بەکر ببەخشێت، ئەو لە من باشتر پیاوی ناسیووە، سوێند بە خوا من بە هیچ گومانێك لە کارم نەخستووە بەڵام ترسام لەوەی کە خەڵکی تەنها پشت بەو ببەستن و تەوەکولیان بەخوا کەم بێەوە.[١]

## شەشەم: جەنگی قیساریە ساڵی (١٥)ی کۆچی

هەر لەم ساڵەدا عومەر فەرمانی دا بە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بڕوات بۆ قیساریە،[٢] عومەر نامەیەکی نووسی: لەپاشدا، من قیساریەم بە تۆ سپارد بڕۆ بۆی و ئاینی خوای گەورە سەربخە بە سەریاندا، بە زۆری ((لا حول ولا قوة إلا بالله العليّ والعظيم، الله أكبر، خوای گەورە و متمانە و تکاکار و گەورەمانە ئەو باشترین گەورەو باشترین پشتیوانمانە)) ،موعاویەش بەرێکەوت و گەمارۆیدا، خەڵکەکەی چەند جارێك بۆی کشان، دوایین جەنگیش جەنگێکی گەورەیان ئەنجامدا، موعاویە خۆی چویە پێشیێ لێیان، لەجەنگدا هەوڵی خۆی دا هەتا خوای گەورە ناوچەکەی لەسەر دەست ڕزگار کرد و هێشتا لەم هەلومەرجە دانەبڕابوون نزیکەی(٨٠) هەزاری لێ کوشتن، سەد هەزارەکەی لەوانە تەواو کردبوو کە لە شەڕەکە دۆڕابوون و معاویە هەواڵی ئازادکردن و پێنج یەکی نارد بۆ عومەری ئەمیری باوەڕداران(ﷺ)،[٣] دکتۆر عبدالرحمان ئەشەجاع وا دەبینێت کە شارەکانی شام لە ژێر لێدانەکانی موجاهیدان یەك لە دوای یەك ڕزگار کران، لەبەر ئەوەی ڕۆمەکان لە شکستیدا بوون لە جێگەیەك و ئەمەش وای لێ نەکردن کە بیر لە بەرگری بکەنەوە هەر بۆیە هەر یەکە لە شارەکانی بەیروت، صەیدا، نابلس، ئەللەد، حەلەب، ئەنطاکیە دووچاری شکست بونەوە و شاری قیساریەش دوایین شارەکانی شام بوو کە لە دوای ڕزگارکردنی قودس لەسەر دەستی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕزگارکرا.[٤]

## حەوتەم: ڕزگارکردنی قودس ساڵی (١٦)ی کۆچی

سەرکردەیەکی ڕۆمانی لە فەلەستین بوو ناوی (ئەلئەرتەبوون) کەسی دوهەم لە دوای ئیمپراتۆر ، ئەم سەرکردەیە عاقڵ تین سەرکردەو لەسەر خۆ ترین و چاکترینیان بوو ، لە ڕملە و ئیلیاء ژمارەیەکی زۆر سەربازی دانا،[٥] عەمری کوڕی عاصیش(ﷺ) نامەیەکی بۆ عومەر(ﷺ) نووسی و ئەم هەواڵەی پێ گەیاند، ڕاوێژی پێ کرد و فەرمانی لێ خواست، عومەریش ئەو وتە بە ناوبانگەی فەرموو: ئێمە ئەرتەبوونی ڕۆمان بە ئەرتەبوونی عەرەب تیرباران کردووە، سەرنج بدە کە.چی دەردەچێت،[٦] مەبەستی لەمەدا ئەوە بوو کە هەر یەك لەو دوو سەرکردەیە وریاترین پیاوانی نێو میللەتەکەیانن، هەروەها

---

١ـ ترتيب وتذهيب البداية والنهاية (ص:٦٣).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣١).
٣ـ ترتيب وتذهيب البداية والنهاية (ص:٦٣، ٦٤).
٤ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٣٥٥).
٥ـ حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٣٥).
٦ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣١).

جەنگی ئەجنادینی دووەم(١٥)ی کۆچی کە عەمر تیایدا سەرکەوت بە سەر ڕۆمەکاندا ڕێگەی خۆش کرد بۆ گەیشتنە فەلەستین،[١] جەنگی قودس بە شێوەیەکی کردەیی دەستی پێکرد، پێش جەنگی ئەجنادینی دووەم ساڵی(١٥)ی کۆچی ئەرتەبوونی ڕۆم سوپایەکی گەورەی لە هەر یەکە لە ئیلیا و ڕملە دانابوو هەروەك ئەوەی کە پێشتر باسمان کرد، نێوانی ڕملە و ئیلیا یان قودس(١٨) میل بوو ئەمەش وەك کارێکی پێش وەختی بۆ هەر هێرشێکی موسڵمانان، بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص، لەسەر ئەو دوو شارەی کە گرنگترین شاری فەلەستینن، ئەگەر ڕملەش شار بێت، ئیلیا گەورەترین شاری بووە،[٢] لە شاری ئیلیاش هەر ئەو ئەرتەبوون فەرمانڕەوای دەکرد کە خۆی و سوپاکەی پاش شکست خواردنیان لە جەنگیٚ ئەجنادین پەنایان بۆ بردبوو، لە ڕملەش قەزاروتیان بەسەرەوە بوو کە فەرمانڕەوایی دەکردن،[٣] ئەمەش گرنگترین ئەو قۆناغانە بوون کە موسڵمانان لە کاتی ڕزگار کردنی قودسدا پێیدا تێپەڕین.

## ١- سەرقاڵکردن:

ئەو دەمە پلانی عومەر(ﷺ) وابوو کە عەمر لە فەلەستین ڕۆمەکان سەرقاڵ بکات بەڵکو سەرکەوتن بەسەر گروهەکەیاندا لە ئەجنادین بە تەواوی دەستە بەربێت تا موسڵمانان لە دوای ئەمە بە تەواوی خۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆ ئازادکردنی قودس و ئەوەی ماوەتەوە لە وڵاتی شام، لەبەر ئەوە فەرمانی دا بە معاویە کە بە سوارچاکەکانیەوە ڕوو بکاتە قیساریە تا سوپای ئەویٚ سەرقاڵ بکات و عەمر بێخەم بێت لێی، عەمری سەرگەرمی بەجێهێنانی ئەو پلانەیە کە خەلیفە عومەر بۆی دەست نیشان کردوە، بۆیە هەر یەکە لە عەلقەمەی کوڕی ئەلحەکیمی ئەفراسی و مەسروقی کوڕی فەلانی مەکی بە سەرکردایەتی هێزێك نارد بۆ سەرقاڵکردنی سوپای ڕۆم لە شاری ئیلیا، ئەوانیش هاوتای خەڵك و دانیشتوانی ئیلیا دەبوون، کە سەرقاڵیان کردن بە عەمرەوە،[٤] پاشان ئەبو ئەیوبی مالکی بە سەرکردایەتی هێزێك نارد بۆ سەرقاڵکردنی ڕۆمەکان لە شاری ڕملە، هێشتا کۆمەکیەکان نەگەیشتبوونە عەمر کە موحەممەدبینی کوڕی عەمر لەگەڵ هێزێکدا بۆ هاریکاری هێزە پەیوەستەکەی لە ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ئیلیا ڕەوانەی ئەو ناوچەیە کرا، هەروەها عەمارەی کوڕی عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری لەگەڵ هێزێکدا نارد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای ڕملە، بەڵام خۆی لە ئەجنادین مایەوە بە مەبەستی چاوەڕوانی کردنی جەنگێکی یەکلایی کەرەوە لەگەڵ ئەرتەبوون، لەم کاتەدا سوپای ئیلیا لە شورەکانەوە بەرەنگاری موسڵمانان دەبوویەوە، جەنگیش بە دەوری ئەو شارە پیرۆزەدا تاوی گرتبوو لە کاتێکدا کە موسڵمانان و ڕۆمەکان کۆبووبوونەوە بۆجەنگ لە ئەجنادەین کەجەنگێکی خوێناوی بوو،[٥] بە جۆرێك کە (طبري) تیایدا دەفەرمووێت: لە یەکتریان دەکوشت — واتا موسڵمانان و

---

١- حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٣٥).
٢- هەمان سەرچاوە (ص:٣٥، ٣٦).
٣- تأريخ الطبري (٤/٤٣١، ٤٣٢).
٤- حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٣٦).
٥- حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٣٦).

ڕۆمەکان – جەنگێکی چڕوپڕی وەك جەنگەکەی یەرمووك، تا ژمارەی کوژراوان لە نێوانیان زۆر بوو،[١] بەم شێوەیە ئەرتەبوونی عەرەب بەرەنگاری ئەرتەبوونی ڕۆمەکان بوویەوە لە ئەجنادین و بەزانبینی، ئەرتەبوونی ڕۆم و سەربازانی هەڵگەرانەوە تا بە شورەی شارە پیرۆزەکە خۆیان بپارێزن ، لەم کاتەدا موسڵمانان بۆیان هاتنە دەرە و تا کردنیان بە نێو شارەکەدا،[٢] (طبري) باس لەوە دەکات کە هەریەکە لە عەلقەمە و مەتروس و محمدی کوڕی عەمر و ئەبو ئەیوب گەشتن بە عەمر لە ئەجنادین، عەمر بە تەواوی سوپاکەی بەرەو ئیلیا و بە مەبەستی گەمارۆدانی کەوتەڕێ.[٣]

موسڵمانان بە سەرکردایەتی عەمری کوڕی عاص لە دەوری ئیلیا کۆبوونەوە ، گەمارۆیەکی سەختی سەپاند بەسەر شارەکەدا و ئەو شارەش قەڵایەکی نەبەزی هەبوو، واقبینی وەسفی شورەی ئەو شارە دەکات بەوەی کە تۆکمە بوون بە مەنجەنیق و کوتەر و شمشێر و سپەر و کراسی ئاسنین و زرێی نایاب بەهێز کرابوو، باس لەوە دەکرێت جەنگەکە پاش سێ ڕۆژ لە گەمارۆکە دەستی پێکردووە، موسڵمانان بەرەو شارەکە پێشڕەویان کردو و پارێزەرانی شارەکە وەك بارانی بە خوڕ و لێزمە تیربارانیان کردوون موسڵمانان بە کراسە ئاسنینەکانیانەوە ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، شەڕەکە لە بەیانیەوە تا خۆرئاوابوونی خایاند ، بەم شێوەیە چەند ڕۆژێك بەردەوام بوو، تا ڕۆژی یازدەیەم ئەبو عوبەیدە لەگەڵ خالید و عبدالرحمانی کوڕی ئەبو بەکر کە ژمارەیەك سوارچاك و پاڵەوانی یەکگرتوویان[٤] لەگەڵ بوو هاتن بە دەمی موسڵمانانەوە و ئەمەش ترسی لە دڵی خەڵکی ئیلیا چاند و گەمارۆکەش ماوەی چوار مانگی خایاند، ڕۆژ نەبوو جەنگێکی خوێناوی تێدا نەبێت (موسڵمانان خۆگر بوون لەبەردەم سەرما و سۆڵە و بەفر و باران)[٥]، تا ڕۆمەکان بێزار دەبوون لە بەرخودانی گەمارۆی موسڵمانان بۆ شارەکەیان، لەبەر ئەوە پێشەوای ڕۆمەکان (پێشەوا سەفەر ونیۆس) بڕیاریدا هەڵسێت بە هەوڵێکی تر، نامەیەکی نارد بۆ عەمری کوڕی عاص، سەرکردەی سوپای موسڵمانان ، پەیام و نامەکە تیایدا هەڵیخەڵەتێنێت بە هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆکە وەك سەرنجدانێك بە شیاوی داگیرکردنی شارەکە.[٦]

## ٣- خۆبەدەستەوەدان:

ئەرتەبوونی ڕۆم نامەیەك دەنووسێت بۆ عەمری کوڕی عاص و تیایدا دەڵێت: تۆ هاوەڵ و هاوپۆستی منی، تۆ لە نێو میللەتەکەتدا وەك منی لە نێو میللەتەکەمدا، سوێند بە خوا دوای ئەجنادین هیچ شتێك لە فەلەستین ئازاد ناکرێت، بگەڕێوە و هەڵمەخەڵەتێ چونکە وەك ئەوانەی پێش خۆت دووچاری شکست دەبیتەوە،[٧] عەمریش نامەیەکی بۆ نووسی و تیایدا فەرمووبووی: خۆی (ئەو

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣٣).
٢ـ حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٣٨).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٣٧).
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ هەمان سەرچاوە.
٧ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣٣).

خاوەنی ئازادکردنی ئەم وڵاتەیە) وە نامەکەی بە نێردراوێکدا نارد و فەرمانی پێدا وەڵامی ئەرتەبوونی بۆ بهێنێتەوە، کاتێك ئەرتەبوون نامەکەی عەمری خوێندەوە پێکەنی و وتی: خاوەنی ئازادکردنی قودس پیاوێکە کە ناوی عومەرە، نێردراوەکەش ئەوەی کە لە ئەرتەبوونەوە بیستی هێنای بۆ عەمر، ئەویش زانی کە ئەرتەبوون مەبەستی خەلیفە عومەرە،[1] پاشان نامەیەکی بۆ خەلیفە نووسی و هەواڵی دایە بەوەی کە لەسەر زمانی ئەرتەبوونەوە هاتووە کە شارەکە بەو نەبێت بە کەس ئازاد ناکرێت، ئەویش داوای کۆمەکی و ڕاوێژی لێ کرد و فەرمووی: من چارەسەری شەڕێکی سەخت و خۆڕاگرانە و وڵاتێکت بۆ دەکەم کە بۆت پاشەکەوت کراوە، ڕای تۆ چیە؟[2] خەلیفەش پاش پرس و ڕاوێژ لەگەڵ سوپایەکی کۆمەکخواز بەرەو شام کەوتەڕێ پاش ئەوەی کە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی لە مەدینە لە شوێنەکەی خۆی دانا، و لە جابیە جێگیر بوو، دانیشتوانی ئیلیا هاتن بۆ لای (لەسەر سەرانە لەگەڵی ڕێك کەوتن و دەرگای شارەکەیان بۆ ئاوەڵا کرد).[3]

## ١- جیاوازی گێڕانەوەکان لەسەر ئەوەی، کە گەمارۆی قودسی داوەو توێژینەوە تیایدا:

(طبري) چەندین گێڕانەوەی هەیە سەبارەت بە گەمارۆدانی شاری قودس و باس لەوەش دەکات ئەو کەسەی گەمارۆی داوە عەمری کوڕی عاص بووە، لە ڕیوایەتێکی تردا هێناویەتی کە: ئەبو عوبەیدە ئامادەی قودس بووە و دانیشتوانەکەی داوایان لێ کردووە کە وەك ڕێك کەوتنەکانی شارەکانی شام لەگەڵیان ڕێك بکەوێت، بەرپرسی ئەم پەیمان و گرێبەستە عومەری کوڕی خەتاب بێت، ئەویش بەمە پەیامێکی بۆ دەنێرێت، ئەویش پاش ئەوەی کە عەلی لە مەدینەدا دەکاتە جێنشین لە مەدینەوە دەکەوێتەڕێ، وەك (یارمەتی دەرەوەك) واتا بۆ سەربازانی شام بێنە دەرەوە ، دەگێڕنەوە کە ئیبنول ئەسیر لە دوو ڕیوایەتی هاوشێوەی ڕیوایەتەکانی (طبري) هێناویەتی،[4] واقدیش گەمارۆی شاری قودس و ئەوەی کە ڕوویداوە تیایدا لە ڕاوێژی لەگەڵ خەلیفە عومەر(ﷺ) لە دانووستانی لەگەڵ پارێزەرانی ڕۆمەکاندا دەداتە پاڵ ئەبو عوبەیدە، باس لەوە دەکات ئەبو عوبەیدە (٣٥) هەزار سەربازی بە سەرکردایەتی حەوت سەرکردە ڕەوانەی قودس کردووە، لەگەڵ هەر سەرکردەیەکدا پێنج هەزار سەرباز هەبوون ئەوانیش: خالدی کوڕی وەلید، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان، شەرحەبیلی کوڕی حەسنە، مەرقاڵی کوڕی هاشمی کوڕی ئەبی وەقاص، موسەیبی کوڕی نەجیەی ئەلفەزاری، قەیسی کوڕی هوبیرەی ئەلمورابینی، عەروەی کوڕی ئەلموهەللەلی کوڕی یەزید، ئەبو عوبەیدە بە حەوت ڕۆژ بەڕێی کردن، واتا هەر سەرکردەیەك بە ڕۆژێك، پاشان و لە دوای شەڕ چەند ڕۆژەی نێوانیان[5] ئەبو عوبەیدە

---

١ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣٣).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ حروب القدس في التأريخ الاسلامي والعرب، د. ياسين سويد (ص: ٤٠).
٥ـ فتوح الشام (١/٢١٣-٢١٦).

خۆی پێ گەیاندن، هەروەها واقبینی قسەش لەسەر ئەوە دەکات و دەفەرموویت: دانیشتوانی ئیلیا هاتن بۆ لای ئەبو عوبەیدە و داوایان لێکرد کە بە ڕێك کەوتن بچێتە نێو شارەکەیانەوە هەتا ڕێك کەوتنەکە لەسەر دەستی خەلیفە عومەر تەواوکاری بۆ بکرێت، پاشان گێڕانەوەیەکی هاوشێوە بۆ ئەم گێڕانەوەیە هێناوە کە هەریەکە لە (طبري و أبن الاثير) ڕیوایەتیان کردووە کە ئەبو عوبەیدە نامەیەکی نووسیووە بۆ خەلیفە عومەر و هەواڵی ڕووداوەکەی پێداوە، خەلیفە بەرەو شاری قودس کەوتەڕێ و لە شورای شارەکە دابەزی، لەم کاتەدا پێشەوای ڕۆمەکان هاتە دەرەوە و خۆی پێ ناساند و وتی: سوێند بە خوا ئەمەیە کە ئێمە وەسف و باسکردنی لە پەرتووکەکەی خۆماندا بەدی دەکەین، هەر ئەمەیە کە وڵاتەکەمان لەسەر دەستی ڕزگار دەکرێت،[١] پاشان گەڕایەوە بۆ لای گەلەکەی و هەواڵی پێدان ئەوانیش بە پەلە هاتنە دەرەوە بە جۆرێك کە بە هۆی گەمارۆکەوە تەنگەلان بووبوون، پاشان دەرگاکەیان ئاوەڵا کرد و هاتنە دەرەوە بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب و داوای پەیمان و بەڵێنداریان لێکرد و بڕیاریاندا کە سەرانە بدەن،[٢] گێڕانەوەکەی واقبینی وەر ناگرین ، لە کاتێکدا عەمری کوڕی عاص گەمارۆی شاری قودس دەدات، هاوڕێکانی لە سەرکردەی موسڵمانان پاش شەڕی یەرموك و دیمەشق و فیحل بە تەواوی بە غەنیمەت و سەرکەوتنەوە دەگەڕێنەوە، ئەبو عوبەیدەش کە خالدی کوڕی وەلیبینی لەگەڵدایە هەریەکە لە حەمص و حەما و قنسرین و حەلەب ڕزگار دەکەن و پاشان ڕێگەی کەنارەکانی شامی باشوور دەگرێتەبەر و ئەنتاکیە و لازقیە و عرقە کۆنترۆڵ دەکات، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیانیش کەناری باشوور شارەکانی بەیروت و سەیدا ڕزگار دەکات لەگەڵ باکووری عەسقەلان هەتا صور،[٣] بەڵام (بلاذري) لە ڕیوایەتێکدا باس لەوە دەکات ، عەمری کوڕی عاص ئەو کەسە بوو کە گەمارۆی شاری قودسی دا، پاش ئەوەی کە شاری ڕەمحی ئازاد کرد، ئەبو عوبەیدەش (هات بۆ لای..... پاش ئەوەی کە قنسرین و ناچەکانی دەوروبەری لە ساڵی(١٦)ی کۆچی ڕزگارکرد، هەر خۆیشی گەمارۆی شاری ئیلیایدا، ئیلیاش شاری قودسە)،[٤] خەڵك و دانیشتوانی شاری ئیلیا لە ئەبو عوبەیدە (داوای سەرڕاستی و ڕێك کەوتنیان لێکرد بە وێنەی ئەو ڕێك کەوتنەی کە خەڵك و دانیشتوانی شارەکانی شام لەسەری ڕێك کەوتبوون) لەسەر ئەوەی کە عومەری کوڕی خەتاب خوبینی خۆی سەرپەرشتی ڕێککەوتنەکە بکات، ئەبو عوبەیدە نامەیەکی لەو شێوەیەی نووسی بۆ خەلیفە ، عومەر پێشڕەوی کرد و لە جابیە لە دیمەشق دابەزی و پاشان ڕۆشت بۆ شاری ئیلیا، ڕێککەوتنی لەگەڵ دانیشتوانەکەی واژۆ کرد و پەیمان نامەیەکی بۆ نووسین ، ئازاد کردنی ئیلیا لە ساڵی (١٧)ی کۆچیدا بوو، هەروەها (بلاذري) ئەوەش بۆ سەر باسەکەی زیاد دەکات پاش ئەوە: کە ئازادکردنی شاری ئیلیا شێوازێکی تری هەیە،[٥] لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ئەو گێڕانەوەیەی یەکەم بە ڕاست دەزانین کە (طبري)

---

١ـ فتوح الشام (١/٢٢٥).
٢ـ حروب القدس (ص: ٤٠).
٣ـ حروب القدس (ص: ٤١).
٤ـ فتوح البلدان (١/١٨٨-١٨٩).
٥ـ فتوح البلدان (١/١٨٩).

گێڕاویەتیەوە کە گەمارۆکەی شاری قودس لەسەر دەستی عەمری کوڕی عاص تەواو بووە، نەك لەسەر دەستی ئەبو عوبەیدە ئەوەش بەدی دەکەین کە دوور نیە ئەبو عوبەیدە خۆی بگەیەنێتە خەلیفە عومەر لە جابیە بۆ ڕاوێژکردن لەگەڵیدا لەسەر کارەکانی ڕزگاریخوازی بە پشت بەستن بەوەی کە سەرکردەی گشتی سوپایە لە شام، بە تایبەتی کاتێك ئەوە دەزانین ئەبو عوبەیدە دووەمین کەسە لە دوای خەلیفە دەگاتە یەزید لە کاتی گەیشتنی بە جابیە و بە دەمەوە هاتنی بۆ تەواوی فەرماندە سەربازیەکان لە شام[1] بۆ ڕاوێژکردن، ئەبو عوبەیدەش لەگەڵ یەزید و شەرحەبیل و گەورە سەرکردەکانی موسڵمانان ئامادەی گرێبەستەکە بوون ،[2] جگە لەوەش شاهێدی لەسەر ئەم بەڵێنە نەدا هەروەك ئەوەی کە هەریەك لە عەمری کوڕی عاص و عبدالرحمانی کوڕی عەوف و معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و خالدی کوڕی وەلید شاهێدیان لەسەر دا هەروەك ئەوەی کە ڕێنمایی دەکات لە دەقی هەمان ڕێککەوتندا، ئێمە هیچ شێکردنەوەیەکمان بۆ ئەمە نیە جگە لەوەی ئەبو عوبەیدە سەرکردەی ئەو سوپایە نەبوو کە گەمارۆی ئەو شارە خۆبەدەستەوەدراوەی دا، بەڵکو ئەو سەرکردەیە عەمر بوو.[3]

## ٢- دەقی ڕێککەوتنەکە:

ئەوەی کە (طبري) هێناویەتی ئەمە دەقی ڕێککەوتنەکەیە: بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەمە ئەوەیە بەندەی خوا عومەری کوڕی خەتاب ئەمیری باوەڕداران دەیبەخشێتە دانیشتوانی ئیلیا لە پارێزراوی، ماڵو گیانیان پارێزراوە ، لەگەڵ کەنیسە و پەرستگاکانیشیان، لە کەنیسەکانیانداگیر ناکرێن و بەدەستی خۆیانەوە دەمێننەوە ، بەبێ هیچ دەستکاری کردن و دەست تێوەردانێك، ناچر ناکرێن بۆ ئەوە دستبەرداری ئاینەکەیان بن ، وە دووچاری هیچ زیان و زەرەرێکیش نابنەوە، لە ئیلیاش جولەکە لەگەڵیان نیشتەجێ نابێت، وە لەسەر خەڵکی ئیلیا پێویستە سەرانە بدەن ، وەك ئەوەی کە خەڵکی مەدائن دەیدەن،دەبێت سوپاو لەشکری ڕۆمەکانی تێدا نەمێنێ ، ئەوانەش لەشار دەچنە دەرەوەلە گەڵ ڕۆمەکان ماڵو گیانیان لەلایەن ئێمەوە پارێزراو دەبێت تا دەگاتە جێ، هەرکەس هەر زەویەکی بەدەستوە بێت هەر بەدەستیەوە دەمێنێتەوە کەس بۆی نیە لێی بسێنێتەوە، وەك دانیشتوانی ئیلیا ئەویش پێویستە سەرانە بدات، هەر کەس بیەوێت لەگەڵ ڕۆمەکان دەڕوات، هەر کەس بیەوێت کە هەڵهاتبێت بۆی هەیە بگەڕێتەوە نێو کەس و کاری، هیچ کەسیش هیچی لێ وەرناگیرێت هەتا بەروبومەکانی دەدورێتەوە، ئەوەی لەم نوسراوەدا هاتووە پەیمانی خودا بەڵێنی پێغەمبەرەکەی و خەلیفەکەی و باوەڕدارانە، ئەگەر ئەو سەرانەی کە لەسەریانە بیدەن و بەجێی بهێنن، هەر یەکە لە خالدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص و عبدالرحمانی کوڕی عەوف و معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان شاهێدیان لەسەر ئەم ڕێککەوتنەدا، کە ساڵی (١٥)ی کۆچی نوسرا و ئامادە بوو.[4]

---

١- تأريخ الطبري (٤/٤٣١-٤٣٦).
٢- حروب القدس (ص: ٤١).
٣- حروب القدس (ص: ٤٢).
٤- تأريخ الطبري (٤/٤٣٦).

## * گرنگترین وانە و پەند و سوودەکان:

### أ- هەڵوێستێکی گیان بەخشانەی (واثلة)ی کوڕی ئەلئەسقەع:

(واثلة) دەفەرمووێت: ... گوێم لە جیڕەی دەرگای جابیەیە، کە دەرگایەکە لە دەرگاکانی شاری دیمەشق، بە ئەسپێکی باشەوە مامەوە و ڕێگەم پێدا، کە دەرگاکەی کردەوە هەڵم کوتایە سەریان و (ألله أكبر)م کرد ،گومانیان وابوو کە دەوریان دەدەم، پاشان بەرەو شارەکە هەڵهاتن، گەورەکەیان دا بە دەستەوە ـ واتا سەرکردەکەیان ـ منیش بە ڕمەکەم بە ڕەو ڕوی ڕۆشتم ، لەسەر ئەسپەکەی بوو دەستم پێ گەیاند و بە دەستم دام لە ملی ئەسپەکەی ، ئاوڕیان دایەوە ، کاتێك منیان بینی تەنهام شوێنم کەوتن بۆیە ڕمەکەم دا بەسەر سوارێکیاندا و کوشتم، دواتر یەکێکی تریان لێم نزیك بوویەوە و ئەویشم کوشت، پاشتر هاتم بۆ لای خالدی کوڕی وەلید و ئەم هەواڵەم پێدا لە کاتێکدا کە گەورەیەکی ڕۆمەکانی لە لا بوو کە پارێزراوی بۆ دانیشتوانی بۆ خەڵکی دیمەشق وەردەگرت.[1]

### ب- باڵوێزی موعازی کوڕی جەبەل بۆ ڕۆم پێش (جەنگی فیحل):

پاش پەلامارەکانی موسڵمانان و ڕۆمەکان، لەپێش جەنگی فیحل ، ڕۆمەکان هەواڵیان نارد بۆ موسڵمانان کە پیاوێکمان بۆ بنێرن، هەتا لێی بپرسین چیتان دەوێت و داوای چی دەکەن و بانگەشە بۆ چی دەکەن ، ئێمەش قسەی خۆمان دەکەین کە چیمان دەوێ، ئەبو عوبەیدەش موعازی کوڕی جەبەلی ئەنصاری وەك باڵوێزێکی موسڵمانان نارد بۆ لایان، ڕۆمەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی لێ کردنی، جوانترین شتێك کە لە ڕەونەقی دونیا و لە چەکێك کە هەیان بوو نومایشیان کرد لەبەردەمیدا ، زەویەکەیان بە گرانترین ڕاخەر و فەرش، فەرش ڕێژکرد کە چاوەکانی ئەبلەق دەرد بوو ، هەتا سەر لە موعاز بشێوێنن کە بۆچی هاتووە یان بیترسێنن ، ئەویشوەك هەر بڕوادارێك هەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراوی ـ چاوەڕوان ەکراو لای ڕۆمەکان ـ نواند، زۆر خۆ بەکەمزانی و لە خواترسی، ئەم هەلەی قۆستەوە بە بەکارهێنانی چەکێك لە دژی ڕۆمەکان، بۆیە لغاوی ئەسپەکەی گرت ونەی دایە دەست هیچ کەس لە ڕۆمیەکان، لەسەر ئەو شوێنەش دانەنیشت کەبۆیان ، پێی فەرموون: من دانانیشم لەسەر ئەم ڕاخەرانە کە ئێوە بە هۆیەوە بونەتە حاکم بەسەر بێ دەسەڵاتەکانتانەوە... لەسەر زەوی دانیشت... فەرمووی: من بەندەیەکم لە بەندەکانی خوا و لەسەر فەرش و ڕاخەری خوا دادەنیشم ،[2] گفت و گۆیەك لە نێوانیاندا ڕوویدا و لێیان پرسی سەبارەت بە ئیسلام و ئەویش وەڵامی دانەوە ، پرسیاریان لێ کرد سەبارەت بە ر عیساپێغەمبەر (علیه السلام) ئەویش ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندنەوە: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ اللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ (ال عمران: ٥٩).

---

١ـ سير أعلام النبلاء (٣/٣٨٦-٣٨٧)، التأريخ الاسلامي (١٠/٣١٩).
٢ـ الإكتفاء للكلاعي (٣/١٩٤).

بۆی ڕوون کردنەوە کە موسڵمانان چییان لێیان دەوێت و ئەم ئایەتەی بۆ خوێندن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ (التوبة: ١٢٣).

ئەوان پێیان وت هۆی سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر فارسەکاندا مردنی پادشاکەیان بوو، پادشای ڕۆم زیندوە و سەربازەکانی لە ژمارە نایەن، ئەویش فەرمووی پادشای ئێوە هیرەقلە، پادشای ئێمە خودایە و ئەمیرەکەمان پیاوێکە لە خۆمان و ئەگەر لە نێوانماندا بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەمان کاری کرد ئەوا گوێڕایەڵی دەبین و بە گوێی دەکەین، ئەگەر گۆڕا ئەوا لە سەر کار لایدەبەین، پەنامان لێ ناگرێت و خۆی بە گەورە نازانێت و ناوروژێت بە سەرماندا،[1] بەڵام سەبارەت بە زۆریتان ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندن : ﴿كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (البقرة: ٢٤٩).

کاتێك ڕۆمەکان سەرنەکەوتن لەم فێڵەیاندا ، ڕێککەوتنێکیان پێشنیار کرد بەوەی بەلقا و ناوچەکانی سەر بەو هەرێمە بدەنە موسڵمانان ، موعازیش ئاگاداری کردنەوە کە ئەوان سەر پشکن لەسەر هەڵبژاردنی یەکێ لەم سیانە ، قایل بوون بە ئیسلام، سەرانە ، شەڕ، ئەوانیش بەم هەڵوێستە بێتاقەت بوون، وتیان بڕۆ بۆ لای هاوەڵەکانت، و ئیعلانی شەڕیان لەگەڵ کردن.

موعازیش فەرمووی: سوێند بە خوای گەورە دوا کەسمان دەکوژن یان لەم خاکە بە سەرشۆڕی دەرتان دەکەین و هەر ئێوەش ڕیسوان، پاشان ڕۆیشت،[2] بەم شێوە موعازی باڵوێز توانی لێهاتوی موسڵمانان نومایش بکات وەك کەسایەتیەکی سیاسی و سەربازی سەرکەوتوو، وەك بانگخوازێکیش توانی ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام بگەیێنێ، ڕەخنەی توندیان ئاڕاستە دەکات و کەم و کورتیەکانیان و ستەمەکانیان بەرامبەر ژێردەستەکانیان نیشان دەدات و ئاشکرای دەکات، هەروەها باسی بنەماکانی ئاینەکەیان بۆ دەکات و بانگیان دەکات بۆ موسڵمان بوون، بەلام سەبارەت بە جەنگی دەروونیان واقیعانە وەڵامیان دەداتەوە ،پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو سەرکردایەتیەی کە چەسپاوە لەسەر هەموو ئەوانەی کە پێی هەستاوە و بە ڕۆمی وتووە،[3] موسڵمانان پێش جەنگ بەرامبەرەکانیان بانگیان دەکەن بۆ موسڵمانان بوون.

## ج- هەڵوێستی عوبادەی کوڕی سامت لە ڕزگارکردنی قیساریە:

عوبادەی کوڕی سامت لە بەشی لای ڕاستەوەی سوپای موسڵمانانەوە بوو لە گەمارۆی سەر ناوچەی قیساریە، عوبادە(رضي الله عنه) هەستا بە ئامۆژگاری کردنی سەربازەکانی و هانی دان لەسەر خۆ پاراستن لە

---

١ـ الإكتفاء للكلاعي (١٩٤/٣).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٠٧).

سەرپێچیەکانی خوای گەورە، دواتر هێرشیان کردە سەر ڕۆمەکان و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن، بەڵام نەیتوانی ئامانجەکەی دەستەبەر بکات، بۆیە گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی دەرچووبوو، پاشان هاوڕێکانی هاندا بۆ بەشداری کردن لە جەنگەکە، سەرسام بوو لەوەی کە نەیتوانیبوە لەو هێرشەدا ئامانجەکانی خۆی بپێکێت و فەرمووی: ئەی موسڵمانینە من لاوترین ئەمیری جەنگیم ، دوورترینیانم لە مەرگدا خوای گەورە بە زاهر ئەمری لەسەر ئەوەیە کە تەمەن درێژم بکات تا لەگەڵ ئێوە لەگەڵ ئەم دوژمنە بجەنگم... سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هەرگیز لە نێو کۆمەڵێك لە باوەڕداران هەڵم نەکوتاوەتە سەر کۆمەڵێك لەهاوبەش پەیداکەران مەگەر لەگۆڕەپانەکە گەرابن بۆمان و خوای گەورە سەرکەوتنی بە سەریاندا پێمان بەخشیبێت ، ئەی پێتان چۆنە ئەگەر هەڵتان کوتایە سەر ئەو کۆمەڵە و نەتان توانی ڕایان ماڵن؟[1] پاشان بۆی ڕوون کردنەوە کە لە چی دەترسێت و فەرمووی: من سوێند بە خوا لە دوو سیفەت لێتان دەترسم: یان ئەوەتا خەشم و قین گرتبنی، یان ئامۆژگاری خوداتان وەرنەگرتبێت لەم پەلامارەتان بۆ سەریان،[2] هەروەها هانی هاوەڵانی دا بۆ جیهاد و باسی پلەی شەهیدی بۆ کردن ، ئاگاداری کردنەوە کە خۆی لە پێشی هەموویانەوە دەبێت و ناگەڕێتە دواوە، تا خوای گەورە ناوچەکە لەسەر دەستی ڕزگار دەکات یان شەهیدی پێ دەبەخشێت،[3] کاتێك موسڵمانان و ڕۆمەکان بە یەك گەیشتن عویادە لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوە، بە پیادە ڕۆیشت کاتێك کە عومەیری کوڕی سەعدی ئەنصاری بەم شێوەیە بینی بانگی موسڵمانانی کرد و ئاگاداری کردنەوە لەوەی کە ئەمیرەکەیان چی کردووە وە بانگی کردن بۆ چاو لێکردنی پاشتر لەگەڵ ڕۆمەکان بە شەڕهاتن و(قەڵاکانیان بەرد باران کردن).[4]

د- ئوم حەکیم کچی ئەلحارسی کوڕی هیشام لە جەنگی مرج الصفر:

ئوم حەکیم کچی ئەلحارسی کوڕی هیشام خێزانی عەکرمەی کوڕی ئەبو جەهل بوو کە لە جەنگەکانی شامدا شەهید بوو،[5] ئەم ئافرەتە چوار مانگ و دە ڕۆژی ئەو ماوەیەی تەواوکرد کە ئافرەت پاش جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی بەسەری دەبات، یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان ویستی داوای بکات، خالدی کوڕی سەعدی نارد بۆ داخوازی، ئەویش داخوازیەکەی خالدی کوڕی سەعیدی پەسەند کرد و بوویە خێزانی یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان ، کاتێك کە موسڵمانان لە مێرگەسوفر لایاندا، خالید هەر یەکە لە شەڕەکانی ئەجنادەین و فیحل و مێرگەسوفری بینی بوو ، بەنیاز بوو ئوم حەکیم بخوازێت ، ئوم حەکیمیش پێی وت: ئەم داوایەت دوا بخە تا خوای گەورە دەسەڵات دەداتە ئەم کۆمەڵە بڕواداره، خالیدیش وتی: دەروونم وام دەدوێنێت کە من لە نێو ئەم جەنگەیەدا شەهید دەبم، ئوم حەکیم وتی: لە

---

١ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢٠٧).
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ ئەڵێن لە جەنگی یەرموك یان ئەجنادەین یان ڕۆژی فحل شەهید کراوە.

پاشی تۆ بۆ کەسی تر نابم، دواتر لە پردە تاقەی کە لە سوفردا بوو خالد ئوم حەکیمی گواستەوە، ئەو پردەش ناونرا پردەکەی ئوم حەکیم، خەڵکەکە لەسەری کۆبوونەوە، خالیدیش هاوەڵای بانگ کرد بۆ نان خواردن، ئەمان هێشتا لە نان خواردنەکەیان لێ نەبووبوونەوە ڕۆمەکان ڕیزەکانی خۆیان ڕێك خستەوە و خالدی کوڕی سەعید دەرکەوت و لەگەڵیان جەنگا تا شەهید بوو پاشان ئوم حەکیم بە جلەکانی خۆیەوە پێچای، پاشان لەسەر ڕووبارەکە شەڕێکی خوێناویان رویدا، هەردوو تیمەکە ئارامیان گرت، شمشێرەکان لە رووی یەکدا وەستانەوە ئەو ڕۆژە ئوم حەکیم لە پایەکانی فستاط کە لەوێ گوازرابویەوە حەوت کەسی لە ڕۆمەکان کوشت.[1]

## هـ- قەیسەری میری ڕۆم ماڵئاوایی لە شام دەکات:

لە ساڵی(١٥)ی کۆچیدا هیرەقل بە سەربازەکانیەوە کشایەوە و وڵاتی شامی بەجێ هێشت و بەرەو وڵاتی ڕۆم کەوتەڕێ،[2] دەڵێن ئەمە لە ساڵی(١٦)ی کۆچیدا بووە،[3] هیرەقل هەر کات لە قودسدەرچوە وتوویەتی سڵاوت لێ بێت ئەی سووریا، بە دەستەوەدانێکی ماڵئاوایی کەرە کە خواستێك لێت ڕانەپەڕیوە کە گەرایەوە، کاتێك شامی بەجێ هێشت و گەیشتە ڕەها،[4] داوای لە خەڵکەکەی کرد هاوەڵی بکەن بۆ وڵاتی ڕۆم ئەوانیش وتیان: مانەوەمان لێرە بۆ تۆ بەسوودترە لە بەجێ هێشتن وهاتن لەگەڵت، ئەویش وازی لێ هێنان، کاتێ گەیشتە شمشاط،[5] چوە سەر بەرزاییەك و ئاوڕی دایەوە بۆ شاری قودس و وتی: ئەی سووریە سڵاوات لێ بێت ، کۆبوونەوەی لە پاش نەبێت،[6] پاشان هیرەقل ڕۆیشت تا لە قوستەنتینیە لایدا و پادشاکەی لەوێ سەقامگیر بوو، پرسیاری لە یەکێك لە شوێنکەوتووانی کرد، کە لای موسڵمانان بە دیل گیرابوو وتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئەو میللەتە، ئەویش وتی وات بۆ باس دەکەم وەك ئەوەی کە سەیریان بکەیت و بیان بینیت ، ئەوان بە ڕۆژ سوارچاك و بەشەو پیاوی خودان، لە بەڵێن و پەیمانی خۆیان پاشگەز نین، بەسڵاوەوە نەبێت ناچنە ژورەوە، هەرکەس بجەنگێت لەگەڵیاندا زاڵ دەبن بەسەریاندا ، هیرەقلیش وتی: ئەگەر تۆ ڕاستت لەگەڵ کردبم شوێنی ئەم پێیانەم دەبێتە موڵکە ئەوان.[7]

## و- خوای گەورە بە ئیسلام سەرفرازی کردوون:

کاتێك عومەر (ﷺ) هات بۆ شام بە سواری گوێدرێژەکەی ، ئەبو عوبەیدە فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێستا گەورە پیاوان پێت دەگەن، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە بەئیسلام سەرفرازی

١ـ الاستعاب (٤٨٦/٤) دور اللمرأ السياسي، أسماء محمد (ص: ٣١٣).
٢ـ تأريخ الطبري (٤٢٨/٤).
٣ـ ترتيب وتذهيب البداية والنهاية (ص:٦٦).
٤ـ ڕەها:- شارێکە لە دورگە و لە نێوان موصل و شامدایە.
٥ـ شارێکە لەسەر ڕووباری فورات لە لایەنی ئەرمینیە و لە نێوان و نێوانی شامدایە.
٦ـ تأريخ الطبري (٤٢٩/٤).
٧ـ هەمان سەرچاوە.

کردون، هەرکاتێك داوای سەرفرازیتان لەکەسێکی تر کردبێت ئەوا سەرشۆڕو ڕیسوای کردوون.[١]

## ز- لە وتارەکانی عومەر لە جابیە کاتێ گەیشتە شام:

عومەر لە( جابیە) هەستاو وتاری داو فەرمووی من لەو شوێنەدا وەستاوم، کە پێغەمبەر(ﷺ) تێدا وەستا بو پێی فەرموین: وەسیەتتان بۆ ئەکەم ئاگاتان لە هاوەڵانم بێت، جا ئەوانەی بەدوایان دێن،پاشان ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن،پاش ئەوە درۆ بڵاو دەبێتەوە تاوای لێ دێت پیاو بەبێ ئەوەی داوای سوێند خواردنی لێ بکرێت سوێند ئەخوات، بەبێ ئەوەی داوای شایەتی دانی لێ بکرێت شایەتی ئەدات، بێدار بن هەرکات پیاو وئافرەتێك بەجوتە لەچۆڵاییدا مانەوە سێهەمیان شەیتانە ، ئامان ! لەگەڵ کۆمەڵدا بن، وریابن تاق مەکەونەوە، شەیتان لەگەڵ تاق دایەو لە دووانەوە دورە ،هەرکەس ناوەڕاستی بەهەشتی دەوێت با لەگەڵ کۆمەڵدا بێت، هەرکەس دڵی بەچاکەی خۆش بوو،بەخرابەشی دلگران بو ئەوە موئمینە).[٢]

## ح- دونیا هەموومانی گۆڕیووە جگە لە تۆ ئەی ئەبو عوبەیدە:

کاتێك عومەر چوو بۆ شام بە ئەبو عوبەیدە(رضي الله عنه)ی فەرموو: بمان بە بۆ ماڵەکەی خۆت ئەی ئەبو عوبەیدە، ئەویش فەرمووی: چی دەکەیت لای من؟ هیچت ناوێ لە من مەگەر چاوتم لەسەر بگوشی، دەفەرمووێت: چوویە ژوورەوەو هیچی نەبینی، پرسی: کوا شتەکانت؟ من هیچ نابینم جگە لە لبادێك و دەوریەك و مەشکەیەك ، تۆ ئەمیری ئایا خواردنت لایە؟ ئەبو عوبەیدە هەستا بۆ لای سەبەتەکەی، هەندێ پارچە نانی لێ دەرهێنا، عومەر دەستی کردە گریان و ئەبو عوبەیدەش پێی فەرموو: پێم گوتی مەگەر چاوتم لەسەر بگوشی، ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر فەرمووی: دونیا هەموومانی گۆڕیوە جگە لە تۆ ئەی ئەبو عوبەیدە،[٣] ذەهەبیش لەسەر ئەم ڕووداوە دەفەرمووێت: وسێند بە خوا ئەمە لە خواترسانی پاك و پوختە وە هەر کەسێك هەژارێکی تیا چوویێت لە خواترس نیە،[٤] لە ڕیوایەتێکدا هیشامی کوڕی عەروە لە باوکیەوە هێناویەتی کە: عومەر(رضي الله عنه) کاتێك هات بۆ شام، فەرماندەی سوپاو گەورە پیاوانی هاتن بە دەمیەوە، عومەر فەرمووی: کوا براکەم؟ وتیان: کێ؟ فەرمووی: ئەبو عوبەیدە، وتیان ئێستا دێت، پاشان ئەبو عوبەیدە لەسەر حوشترێك، هات و سڵاوی کرد لە عومەر(رضي الله عنه)، عومەر پرسیاری لێ کرد و پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو: لێمانگەڕێن لەگەڵیدا هەتا چوویە ماڵەکەی، لەوێ لایدا، جگە لە شمشێرەکەی و قەلغانەکەی و وڵاخەکەی هیچی تری لە ماڵەکەیدا نەبینی.[٥]

---

١ـ محض الصواب (٢/٥٩٠) إسناده صحيح.
٢ـ مسند أحمد الموسوعة الحديثية رقم (١٧٧) حديث صحيح .
٣ـ سير أعلام النبلاء (١/١٧).
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ محض الصواب (٢/٥٨٩-٥٩٠) إسناده صحيح الى عروة.

## ط- هەڵوێستەیەك لەسەر دەقی ڕێککەوتنەکەی دانیشتوانی قودس:

ئەو نووسراوی ڕێککەوتنەی، کە عومەر(ﷺ) بەدەستی هێنا شاهێدی ڕاست و دروستی ئەوە دەدات کە ئاینی ئیسلام ئاینی لێبوردەیی و چاوپۆشیە و ئاینی زۆرلێکردن نیە، شایەبینی دادپەروەریە بەوەی کە موسڵمانان مامەڵەیان لەگەڵ گاروەکانی قودسدا کردووە ، عومەر کە خۆی ئازادکەری ئەو شارە بووە دەیتوانی هەرچیەك بیەوێت پێیان بکات، ناچاریان بکات لەسەر ئەوەی کە مەبەستیەتی، بەڵام ئەوەی نەکرد لەبەر ئەوەی کە نوێنەری ئیسلام بوو، ئیسلامیش زۆر لە کەس ناکات بە هاتنە ناویەوە و باوەڕ لە هیچ کەس وەرناگرێت مەگەر بە ئارەزوومەنبینی خۆی و ڕەزامەندی خۆی بێت، ئیمانیش شتێك نیە کەسێکی لەسەر ناچار بکرێت چونکە ئەوە عەمەلی دڵە، دڵەکانیش کەس بە پەنهانیەکانی نازانێت خوای گەورەو مەزن نەبێت، ئادەمیزاد خۆیت نیشان دەدات بەوەی، کە ئیماندارەو بەو شێوەیەش نیە، زیان بەخش تردەبێت بۆ باوەڕداران لەو کەسانەی کە بێباوەڕی و کافری خۆیان ئاشکرا دەکەن، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە موسڵمانان ئازادی پەرستشیان دایە دەستی خەڵکی خۆی، دڵنیایان دەکردن لەسەر هەموو ئازیزێکیان هەتا لە ژێر سایەی ئیسلامدا بژین، سەرانە بدەن لە بری پاراستنیان و بەرگری لێیان، لە ژێر سایەیدا ژیانێکی ئارامو گەرەنتی کراویان دەبێت ، لە ژێر باڵی موسڵمانان و دادپەروەریان ناموسڵمانان بەدی دەکات لە نزیك جوانی ئیسلام و لێبووردەیی و ویژدان و دادپەروەری ، چەند ڕاستیەکی تیا بەدی دەکەن کە لەبەر دووریان چاویان ئەو ڕاستیانەی نەدیووە، ئا لەو کاتەدا بە ڕیز دێنە ناو ئاینی ئیسلام هەروەك ئەوەی لە هەموو ئەو وڵاتانە ڕوویداوە کە ئیسلام ڕزگاری کردوون، بە وێنەی ئەم پارێزراویەیان داوەتە دانیشتوانەکەی.[1]

## ی- عومەر (ﷺ) نوێژ لە مزگەوتی قودس دەکات:

ئەبو سەلە دەفەرمووێت ئەبو سنان لە عوبەیبینی کوڕی ئادەمەوە بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: گوێم لە عومەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو بە کەعب: تۆ بزانی لە کوێ نوێژ بکەم؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر بە گوێم دەکەیت لە پشتی ئەو بەردەوە چونکە قودس هەمووی لەبەر دەستت دایە، عومەریش فەرمووی: شانت دا لە شانی جولەکە، نەخێر لەو شوێنەدا نوێژ دەکەم کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی تێدا خوێندووە، پاشان چوویە پێشێ و نوێژەکەی لەو جێیەی خوێند کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی خوێند بوو، پاشان هات و عەباکەی ڕاخست و پاکی کردەوە دواتر خەڵکیش شوێنی خۆیان پاك کردەوە،[2] إبن تەیمیە دەفەرمووێت: مزگەوتی ئەقصا ناوێکە بۆ تەواوی مزگەوتەکە، بەڵام هەندێ کەس ئەقصا بەو شوێنە نوێژە دەڵێن کە عومەر لە پێشی مزگەوتەکە بنیاتی نا وە نوێژ لەو ڕووگەیەی عومەر بنیادی نا بۆ موسڵمانان باشترە لە نوێژکردن لە تەواوی مزگەوتەکەدا... ئەو دەمەی کە عومەر قودسی ڕزگار کرد، خاشاکێکی زۆر لەسەر بەردەکە بوو، چونکە گاوران مەبەستیان سوکایەتی پێکردن بوو، عومەر

---

١ـ جولة في عصر الخلفاء الراشدين، محمد سيد الوكيل (ص: ٢٠٠-٢٠١).

٢ـ البداية والنهاية (٥٧/٧) هذا إسناد جيد.

فەرمانی دا ئەو خاشاکە لە بەردەکە دوور بخرێتەوە، کەعب فەرمووی: تۆ پێت باشە لەکوێ نوێژگەیەك بۆ موسوڵمانان دروست بکەین، عومەریش فەرمووی لە پشت بەردەکەوە ، عومەر فەرمووی: ئەی نەوەی جولەکە، تێکەڵی جولەکە بوویت بەڵکو لە پێشی بەردەکەوە دروستی بکە چونکە سینەی مزگەوتەکان بۆ ئێمەن.[1]

ئەمەش هەڵوێستێکی تری بەرێز و پیرۆزە لەو هەڵوێستانەی ئەمیری باوەڕداران کە نایەنە ئەژمار، بەجۆرێ سەلماندی ئیسلام رێز لە هەموو ئاینە ئاسمانیەکان دەگرێت و هەموو پیرۆزیەکان بە چاوی رێزەوە سەیر دەکات و هیچی لێ بە کەم نازانێ، ئەو بەردەش کە عومەر خۆڵ و خاشاکەکەی بە دەستە پیرۆزەکانی خۆی ڕامالّی بە عەباکەی خۆی هەڵیگرت هەتا بەری لێبگرێت ئەو ڕوگەی جولەکەیە و ئەو بەردە زۆر لایان پیرۆزە و هەمان ئەو بەردەکە یەعقوب پێغەمبەر(علیه السلام) لەسەری وەستا بوو کاتێك کە خوای گەورە دواندی، وەك ئەوەی ئەمە بیر و باوەڕی ئەوانە، هەروەك ئەوەی کە هەڵوێستی عومەر لەگەڵ گاوراندا زۆر جوان و بەرێز بوو کاتێك کە ئازادی بیروڕای پێدان و دڵنیایی و پارێزراوی پێدان لەسەر کەنیسە و دێرەکانیان ،کەچی جولەکەکان لەگەڵ هەموو ئەو تاوانانەی کە دەرهەق بە موسوڵمانان ئەنجامیان دابوو هەڵوێستی عومەر بەرامبەریان کەمتر نەبوو لە هەڵوێستی بەرامبەر گاوران، بەجۆرێ خاشاك و خۆڵی سەر بەردەکەی ڕامالّی، بایەخی خۆی بۆ دەرخست و سور بوو لەسەر ڕێز لێنانی.[2]

## - هەوڵی ڕۆمان بۆ سەرلەنوێ داگیرکردنەوەی شاری حمص:

هەواڵگرانی ئەبو عوبەیدە هاتن بۆ لای و هەواڵی کۆبوونەوەی ڕۆم و خەتاب و هیرەقلیان پێدان کە بەرەو ڕوویان دێن، ئەبو عوبەیدەش پێی باش بوو ئەم هەواڵە لە سەربازانی نەشارێتەوە، لەبەر ئەوە سەرکردە و خاوەن دەستە و دەسەڵاتەکانی تیا کۆکردنەوە تا ڕاوێژیان پێ بکات لەم بارەیەوە و گوێ لە ڕاکانیان بگرێت،[3] لەم کاتەدا ڕای موعازی کوڕی جەبەلی ئەنصاری وابوو کە پاشەکشە نەکەن و فەرمووی: ئایا ڕۆمەکان دەیانەوێ لە دوژمنانیان ڕوبەڕوی گرفتێك ببنەوە کە زیان بەخشتر بێت لەوەی کە ئێوە بۆ خۆتانتان دەوێ بەوەی کە زەویەکیان بۆ چۆڵ بکەن کە خوای گەورە بۆی ئازاد کردوون وە لە نێویدا چەندین خوێن گەرم و سەربازیان لێ کوشتوون، بەڵام سوێند بە خوا ئەگەر بتانەوێ پاش دەرچوون لێی جارێکی تر بێنەوە ناوی زۆر گران لەسەرتان دەکەوێت، ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: سوێند بە خوا ڕاستت لەگەڵ کردم و چاکت کرد[4] ، بەڵام ڕووداوەکان بە ئاراستەیەکی تردا تێپەڕین، موسوڵمانان ئەو باجەی لە دانیشتوانی حمص یان وەرگرتبوو گێڕایانەوە بۆیان ، ئەبو عوبەیدە فەرمانی دا بە حەبیبی کوڕی موسلمە و پێی فەرموو: باجی ئەو کەسانە لە دانیشتوانی ئەم شارە بگێڕەوە بۆیان

---

١ـ مجموعة الرسائل الكبرى (٢/٥٧،٥٨).
٢ـ جولة في عصر الخلفاء الراشدي (ص:٢٠٤،٢٠٣).
٣ـ الطريق الى دمشق (ص:٤٠٩،٤٠٨).
٤ـ الانصار في عصر الراشدي(ص: ٢٠٧).

کە لەگەڵیان ڕێککەوتبوین، ئێمە دەبوو هیچیان لێ وەرنەگرین، بەڕاستی ئەوە شیاو نی یە بۆ ئێمە ئەگەر بەرگریان لێ نەکەین و شتیان لێ وەربگرین، پێیان بڵێ ئێمە هەر لەسەر ئەوەین کە لە ڕێککەوتنەکەدا لە نێوانماندایە و لێی پاشگەز نابینەوە مەگەر ئێوە لێی پاشگەز ببنەوە، بەڵکو ئێمە کە ماڵیاتەکانی ئێوەمان گێڕایەوە بۆتان تەنها لەبەر ئەوە بوو پێمان ناخۆش بوو لە کاتێکدا کە ناتوانین بەرگریتان لێ بکەین ماڵیاتەکانتان بخۆین، بەڵام ئێمە خۆمان لە هەندێك لە زەوی و زارەکان لادەدەین و دەینێرین بۆ هاوەڵەکانمان ئەوانیش دێن بە دەممانەوە و پاشتر ڕووبەڕوی دوژمن دەبینەوە و لەگەڵیان بە جەنگ دێین، ئەگەر خوای گەورە سەری خستین بەسەریاندا ئەوا ئێمە بەڵێن و پەیمانێکمان لای ئێوەیە مەگەر خۆتان داوای ئەوە بکەن، دواتر ڕۆژ بویەوە و ئەبو عوبەیدە فەرمانی دا بە سوپای موسوڵمانان کە بەرەو دیمەشق بکەوێتە ڕێ، حەبیبی کوڕی موسلمە و ئەو چەند کەسەی بانگ کرد کە سەرانەیان وەرگرتبوو کە ماڵیاتەکەیان بۆ بگێڕنەوە و ئەم قسانەی ئەبو عوبەیدەیان وەك هەواڵێك پێ بگەیەنن، خەڵی شاری حمص ئەمەیان بە هەند وەرگرت و وتیان: خوای گەورە ئێوەمان بۆ بگێڕێتەوە و نەفرەتی خودا لەو ڕۆمانە بێت کە ئێمەیان کردبوو بە ژێر دەستە، بەڵام سوێن بە خوا ئەگەر هەر ئەوان خوای گەورە نەیانگێڕێتەوە سەرمان چونکە ئەوان هەرچەند توانیویانە ماڵیاتیان بردوین وە ویلایەت و دادپەروەری ئێوە بۆ ئێمە زۆر خۆشەویستترە لەو جەوروستەمەی کە ئێمەی تێدا بووە.[1]

ئەبو عوبەیدە هەر ئەو شەوە سوفیانی کوڕی عەوفی لە دیمەشقەوە نارد بۆ لای عومەر لە شاری حمص، پێی فەرموو: بچۆرە لای ئەمیری باوەڕداران و سڵاوی منی پێ بگەیەنە، و هەواڵ ئەوەی پێبدە کە دیوتە و هەواڵت پێ گەیشتووە لە سەرچاوەکانەوە، نامەیەکی نوسی و لەگەڵیدا ناردی: لەپاشدا ، سەرچاوەکانم لە زەوی دوژمنەوە هاتون بۆ لام، لەو گوندەوە کە پادشای ڕۆمی لێیە، قسەیان بۆ کردووم کە ڕۆمەکان خەڵکێکی زۆریان بۆ کۆکردوینەتەوە بەرەو ئێمە دێن ، ئەوەش کۆیان کردۆتەوە هێندە زۆرە کە هەرگیز بۆ هیچ ئومەتێکی پێش ئێمەیان جەم نەکردووە، منیش بانگی موسوڵمانانم کردوە و هەواڵم پێ داون و ڕاوێژم پێ کردوون، ڕای ئەوان وایە کە خۆیان پەنا بگرن هەتا ڕای تۆمان پێ دەگات، ئێمە پیاوێکمان ناردوە بۆ لات ئەو زانیاریانەی پێیە کە لەلامانە پرسیاری لێ بکە چونکە بە ئاگایە لە هەموو شتێ ، کەسێکی سەر ڕاستە وە ئێمە کۆمەکی لە خوای بەخشندە و زانا دەخوازین هەر ئەوە حسابمان بۆ دەکات و باشترین وەکیلە.[2]

## - پلانێکی جەنگی کە عومەر (ﷺ) بۆ فریاکەوتنی ئەبو عوبەیدەی (ﷺ) داڕشت:

کاتێك ئەم هەواڵە گەشتە عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) نووسی: کە خەڵکەکە لەگەڵ قەعقاعی کوڕی عەمری بۆ بنێرێت، هەر ئەو ڕۆژەی ئەم نامەیەی بەدەست گەشت سوپاکە بەڕێ بکات بێت ، چونکە بەڕاستی ئەبو عوبەیدە گەمارۆ دراوە، هەروەها عومەر چەند ئەسپ سوارێکی یەدەکی لە هەموو ناوچەکان ئامادەکرد بە مەبەستی خۆ سازدان بۆ جەنگە کتوپڕیەکان،

---

١ـ الطريق الى الشام (ص: ٤١٠،٤١١).
٢ـ الطريق الى الشام (ص:٤١١)، تأريخ الطبري (٢٥،٢٣/٣).

تەنها لە شاری کوفە چوار هەزار ئەسپ سواری لێ بوو، سەعد ئەو سوپایەی لێ ئامادەکرد کە ناردی بۆ شام، هەروەها عومەر نامەیەکی بۆ سەعد نوسی کە سوهەیلی کوڕی عودەی لەگەڵ سوپاکەیدا بنێرێت بۆ ناوچەکانی دورگە، با بێتە (الرَّقَّة)، بەڕاستی خەڵکی جەزیرە هەر ئەو کەسانە بوون کە راوێژیان بە ڕۆمەکان کردووەبۆ هەڵکوتانە سەر خەڵکی حمص، خەڵکی (قترقبسیاء) بۆیان بونەتە پێشڕەو وە عبداللە ی کوڕی عبداللە ی کوڕی عوتبانی نارد بۆ (نەسیبەین) چونکە خەڵکی قترقبسیاء بۆیان بونەتە پێشڕەو و پاشان ناوچەکەیان لە دوژمن و جەردەکان پاك کردۆتەوە، هەروەها وەلیدی کوڕی عەقبەی لەسەر عەرەبی جەزیرەی لە ڕەبیعە و تنوخ، و عەیازی نارد بۆ ئەوێ، ئەمیری ئەمانەی هەموو دایە دەست عەیازی کوڕی غەنەم، قەعقاعیش بە چوار هەزار سەربازەوە ئەو ڕۆژەی پەیامەکەی پێ گەشت بەرەو حمص کەوتە ڕێ، عەیازی کوڕی غەنەمیش لەگەڵ فەرماندەکانی جەزیرە ڕێگەی خۆیان گرتە بەر بەرەو ئامانجی مەبەست ، عومەر ئەمیری باوەڕداران بە مەبەستی فریاکەوتنی ئەبوعوبەیدە لە مەدینە هاتە دەرەوە بەرەو حمص کەوتە ڕێ تا لە جابیە لایدا، ئەو خەڵکانەی جەزیرە کە لەگەڵ ڕۆمەکان هاتبوونە دەرەوە و بەشداریان کردبوو لە گەمارۆی حمص بە دەرچوونی سوپاکانیان لە عێراقە زانی بەڵام نازانن مەبەستیان ڕوکردنە حمصە یان ولاتەکەیانە لە جەزیرە لەبەر ئەوە بلاوەیان لێ کرد و گەڕانەوە ولاتەکانی خۆیان و وازیان لە ڕۆمەکان هێنا بە تەنها بۆ خۆیان بجەنگن، کاتێك کە ئەبو عوبەیدە بینی لایەنگرانی ڕۆم لە خەڵکی جەزیرە لێیان جیا بوونەوە، ڕاوێژی بە خالید کرد کە بۆیان دەرپەڕێ و خالیدیش ئەم ڕاویەی پەسەند کرد، پاشان بۆیان دەرچون و لەگەڵیان بە جەنگ هاتن و خوای گەورە ئەو ناوچەیەشی بۆ ئازاد کردن و دەرگای سۆز و بەزەیی خۆی بۆ دانیشتوانی ئاوەلا کرد، قەعقاعی کوڕی عەمریش لەگەڵ ئەو سوپایەی کە لە دانیشتوانی کوفە بوون پاش سێ ڕۆژ لە جەنگەکە گەیشتنە جێ و عومەریش گەیشتە جابیە، ئەوانیش نامەیەکیان بە موژدەی سەرکەتن و گەیشتنی کۆمەکیەکان بۆ نوسی پاش سێ ڕۆژ لە فەتحی ئەو ناوچانە، ئەویش نامەیەکی بۆ نوسین کە هکە ئەو سوپا نوێیەش دەبێت پشکی هەبێت لە دەسکەوتەکان چونکە ۆ یارمەتی ئەوان هاتون.[1]

هەروەها فەرمووی: خوای گەورە پاداشتی خەڵکی کوفە بە چاکە بداتەوە کە دەست بەرداری ناوچەی خۆیان دەبن و هاوکاری خەڵکانی تر دەکەن.[2]

کاتێك کە سەرنجی ئەم پلانە جەنگی یە داهێنراوە دەدەین، کە عومەر(ﷺ) نەخشەی کێشا بۆ شڵەژاندنی دوژمن و بلاوە پێ کردنیان ، بلیمەتی سەربازی فاروق بەدی دەکەین تیایدا، عومەر فەرمانی دا بە ڕەوانەکردنی سوپایەکی خێرا لە کوفەوە بۆ حمص بۆ رزگار کردنی ، سوپایەکیشی لە مەدینە بەڕێ کرد، ئەوەی جێی سەرنج دانە ئەمەیە کە عومەر هەستا بە ڕەوانە کردنی سوپاکان بۆ ولاتی شەڕ فرۆشان هەتا ناچاریان بکەن بە بەجێهێشتنی گۆڕەپانی جەنگ و بلاوەکردن بۆ ولاتەکانیان

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/٢٤،٢٥).
٢ـ تأريخ الطبري (٥/٢٥).

بە مەبەستی پارێزگاری لێ کردنی، ئەم پلانە سەرکەوتنی خۆی بەدەست هێنا بەجۆرێ کە ئەوان بڵاوەیان لێ کرد و ئەمەش بویە هاندەرێك بۆ موسوڵمانان کە سەرکەون بەسەر ڕۆمەکاندا.[1]

## ڕزگارکردنی جەزیرە ساڵی (١٧)ی کۆچی:

پێشتر باسی ئەوەمان کرد ڕۆمەکان و دانیشتوانی جەزیرە هەڵیان کوتایە سەر شاری حمص و گەمارۆیان دا کە ئەبو عوبەیدە(ﷺ)و ژمارەیەك لە موسڵمانانی تێدا بوو، عومەر(ﷺ) سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی نارد و فەرمانی پێدا بە هاوکاریکردنی خەڵکی حمص بە سوپایەکەوە کە لە کوفەوە و بەرەو حمص بکەوێتە ڕێ، چەند سوپایەکی نارد بۆ ناوچەکانی جەزیرە هەر هەموویان عەیازی کوڕی غەنەم(ﷺ) سەرکردایەتی دەکردن، ئەم سوپایانە بەرەو جەزیرە بەڕێ کەوتن و سوهەیلی کوڕی عودەیی و سەربازانی ڕێگەی (الفراض)یان گرتە بەر تا گەیشتنە (الرَّقّة)و گەمارۆیان دا ئەوانیش کاتێك کە خۆیان بینیەوە لە نێوان دوو هێزی موسڵمانانی عێراق و شامدان لەگەڵیان ڕێککەوتن، هەروەها عبداللە کوڕی عوتبان ڕێگەی دیجلەی گرتەبەرتا گەیشتە نەسیبەین و خەڵکەکەی هەروەك خەڵکی(الرَّقّة) داوای ڕێککەوتنیان لێکرد.کاتێك کە دانیشتوانی(الرَّقّة)و نەسیبەین ملکەچیان نواند هەر یەکە لە سوهەیل و عبداللە هاتنە پاڵی عەیاز و ئەویش خەڵکەکەی بەرەو حەران بەڕێ کرد و لەگەڵیان کەوتەڕێ، کاتێك کە گەیشتە لایان خۆیان لێ پاراست و بە سەرانە وەڵامیان دایەوە و ئەویش لێی وەرگرتن، پاشان سوهەیل و عبداللە ی نارد بۆ ڕەها و ئەوانیش بە سەرانەوە هاتن بە دەمیانەوە، بەم شێوەیە ناوچەی جەزیرە بە تەواوی ئازاد کرا، کاری ئازادکردنی بە سوکترین کاری ئازادکردنی ناوچەکان هاتە هەژمار.[2]

---

١ـ التاريخ الاسلامي (١١/١٣٧).

٢ـ عصر الخلافة الراشدة للعمري (ص: ٣٤٨).

# دوانگەی دووەم

## ڕزگارکردنی میسر و لیبیا

ئەو دەمە پاڵنەرەکانی ڕزگارکردنی میسر لای موسڵمانان کارێکی بەهێز بوو، لێرەدا ئەو بیروباوەڕە هەیە، کە جێنشین کردنیان بۆ دەوێت لەسەر هەموو جێگایەك، وڵاتی میسر دەگاتەوە بە فەلەستین زۆریش ئاساییە کە موسڵمانان لە پاش ڕزگارکردنی فەلەستین ڕوو لە وڵاتی میسر بکەن، بەم شێوەیە موسڵمانان ئیمپراتۆریەتی بێزەنتینیان دابەش کرد بە دوو کەرتەوە کە جگە لە دەریایەك هیچ شتێکی تر پێکەوەیان گرێ نادات ئەمەش بە دەست گرتنیان بە سەر شامدا، لە میسر و بەشی باکووری کیشوەری ڕەشدا بنکە و بارگای ڕۆمەکان و سوپایەکی زۆری ئەوانی لێیە، بێزەنتینیەکانیش کەشتی بەهێزیان لە دەریادایە لەبەر ئەوە موسڵمانان لە شام پارێزراو نابن لە کاتێکدا کە میسر لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمدا بێت، میسر وڵاتێکی دەوڵەمەند و سەرمایەدارە، سەرچاوەیەکە بۆ هاریکاری کردنی قوستەنتینیە و ئەگەر موسڵمانان ئازادیان کرد ئەوا لایەنگرانی بێزەنتینی زۆر لاواز دەبێت و موسڵمانان لە شام و حیجاز پارێزراو دەبن بە جۆرێك کە بۆ ڕۆمەکان ئاسان دەبێت کە لە ڕێگەی میسرەوە بگەنە حیجاز،[1] هەروەها لە هۆکارەکانی تریش ئەوەیە کە (قیبتیەکان) خۆیان بە دەست چەوسانەوەی ڕۆمەکانەوە دەناڵێنن ، ئەمانەش بە هاوکاری پاراستنێکی سەربازیەوە نەبێت ناتوانن لەوێ بژین، ئەی بۆچی ئەو هەلە لە دەست دەدەن بە تایبەتی موسڵمانان ئەگەر ڕاست بوونەوە دەکرێت کە پێشیان بکەون بۆ میسر،[2] بەڵام پارێزەر خۆی ترس و تۆقێن[3] دەکرێت کە موڵکی بێت کاتێك کە هیرەقلی پاشای دەبینێت کە واز لە وڵاتی شام دێنێت هەتا ببێتە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی هەموو ئەمانە بە ڕاستی عەمری کوڕی عاص دەستی پێ دەکات و پوخت دەبێتەوە بۆ ئاکامێك ئەمەیە: ڕۆمەکان لە میسر پەکیان کەوتووە لە وەستان لە ڕووی موسڵمانان لە کاتێکدا کە بەبێ ئازادکردن وازیان لە میسر هێنا، ئەمەش دەبێتە سەرچاوەی هەڕەشەکانیان بۆیان، ئەمەش هەر ئەوە بوو کە عەمری کوڕی عاص بە ڕاشکاوی درکاندی[4] وە لەگەڵ فرەیی گێڕانەوەکان سەبارەت بە یەکەم کەس کە بیری لە ڕزگارکردنی میسر کردەوە کێ بووە: عەمری کوڕی عاص یان خودی خەلیفە بەبێ دەست

---

١ـ تأريخ الطبري (٥/٢٦-٣٠).

٢ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٣٥٧).

٣ـ فتوح الشام للبلاذري (ص: ١١٨).

٤ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٣٥٧).

تێوەردانی عەمر، یان خەلیفە لە ژێر نکۆڵی عەمر هاودەنگ بووە،[١] لەگەڵ هەموو ئەم ناکۆکیانەدا هەموو هۆکارەکانی پێشتر بەر لەوە دەگرن کە پلانی ڕزگارکردنی میسر تەنها بیرۆکەیەك بێت لە عەمرەوە و خەلیفە لەوەدا قایل نەبوویێت، یان ئەوان پێشبینی تەواویان سەبارەت بە میسر و زەویەکەی و قەبارەی هێزی دوژمن نەبووبێ و تیایدا وە ڕیوایەتە مێژووییەکان لایەنگری ئەوە دەکەن کە بۆی چوون وە إبن عبدالحکیم ڕوونی کردۆتەوە کە: عومەر نامەیەکی بۆ عەمری کوڕی عاص لە دوای ڕزگار کردنی شام نووسیووە کە نوێنەرایەتی خەڵکی بکات بەرەو میسر لەگەڵ خۆی بەڕێیان بخات، هەرکەس ناسەنگین بوو ئەوا بەڕێی بکە،[٢] لە (طبری)دا هاتووە ،کە عومەر پاش ئەوەی لەگەڵ خەڵکی ئیلیا ڕێك کەوت و چەند ڕۆژێك تیایدا مایەوە، عەمری کوڕی عاصی نارد بۆ وڵاتی میسر، پێی ڕاگەیاند ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستی ئەویّ ئازادی بکات دەیکاتە فەرماندەی میسر، زوبێری کوڕی عەوامی وەك کۆمەکیەك نارد و دووپاتی کردەوە بۆی کە ئەوە ئەو کۆمەکیانەیە کە عومەر ڕەوانەی میسری کردوون و ژمارەیان دەگاتە (١٢) هەزار کەس هەروەها فەرمانی پێدا بە ڕزگار کردنی ئەسکەندەریە بەبێ هیچ ناتەباییەك لەوەدا،[٣] کەواتە ئایا دەکرێت کە عەمر بەبێ ڕەزامەندی خەلیفە؟ وە ئێمە وەك سەرکردە و سەرباز دەناسین کە ئەوان لەوپەڕی پلەی ملکەچی و گوێڕایەڵی و پابەندیدا بوون، پاشان دووپاتی دەکەینەوە کە ئازاد کردنی میسر جگە لە بە دەمەوەچوونی پلانێکی نەخشە بۆ داڕێژراوی پێش وەخت لە لای خەلیفە هیچ شتێکی تر نەبووە، بە دەمەوەچوونێك نەبووە بۆ ئارەزووی.[٤]

## یەکەم: ڕێبازی ڕزگاریخوازی ئیسلامی بۆ میسر

ڕزگارکردنی میسر بە قۆناغی سێیەم لە جەنگە ڕزگاریخوازەکان دادەنرێت بە نیسبەت هەرێمی دەوڵەتی بیزەنتیەوە، بە ڕاستی چوونی عەمر لە فەلەستینەوە بۆ میسر لە هەمبەرگرتنی دەریا و لە ڕەفحەوە چوو بۆ عەریش و لەوەێوە بۆ فەرما و ڕزگاریخوازیەکان بەردەوام بوو بۆ قاهیرە و پاشان بۆ ئەسکەندەریە و ئەمەش ڕێنماییمان دەکات لەسەر لێهاتوویی سەربازی عەمر بە جۆرێك بەم هێڵەدا ڕۆیی کە ڕەنگە ئەوەش بۆ ڕۆمەکان بارستەیەکی سەربازی لەم هێڵەدا نەبوویێت هەروەك ئەوەی کە ئەمە لە وڵاتی شامیشدا بە هەمان شێوە بووە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە ئەو ڕێبازە ناسراو بێت لای عەمری کوڕی عاص، بە ڕاستی زنجیرەی ڕزگاریەکان هەروەك بەو شێوەیەی ڕێکخراوە کە دواتر لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ڕووەکانی جیاوازی و ناتەبایی هەروەك ئەوەی کە لە ڕزگارکردنی وڵاتی شامدا ڕوویدا.[٥]

١ـ النجوم الزاهرة (١/٤-٧).
٢ـ فتوح مصر (ص: ٥٧).
٣ـ تأريخ الطبري (٥/٨٤-٩٣).
٤ـ دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص: ٣٧٥-٣٧٨).
٥ـ عمرو بن عاص القائد والسياسي، د. عبدالرحيم محمد (ص: ٧٩).

## ١- ڕزگارکردنی فەرما:

عەمر بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشت و جگە لە فەرما بە هیچ سوپایەکی ڕۆم نەگەیشت بەڵام پێش ئەوە میسریەکان بە هەڵەلە هاتن بە دەمیەوە، یەکەمین شوێنێك کە جەنگ تیایدا کرا فەرما بوو، ڕۆمەکان لەو شارەدا خۆیان تۆکمە کردبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان ، متمانەیان بە توانای خۆیان هەبوو بەسەر بەرگری لێکردنیان، موسڵمانان پاش ئەوە کە زانیان کە ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵ عەمر هاتوون لە ڕووی ژمارە و پێداویستیەوە کەمن و کالاًیان پێ نیە بۆ گەمارۆکە گەرانەوە دواوە، عەمر ژمارەی ڕۆمەکان و ئامادەباشیان زانی بە جۆرێك کە چەند هێندە لە سەربازەکانی ئەوان زیاترن، لەبەر ئەوە پلانەکەی لە دەست گرتن بەسەر فەرما بریتی بوو لە هەڵکوتانە سەری و کردنەوەی دەروازەکان یان ئارام گرتن لەسەری هەتا برسیەتی دانیشتوانەکەی ناچار دەکات کە دابەزن بۆیان، گەمارۆی موسڵمانان بۆ شارەکە توند و بەرگری ڕۆمەکانیش توندتر دەبوو بۆیە گەمارۆکە چەند مانگێکی خایاند، هەندێ لە هێزە ڕۆمیەکان لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر دادەبەزین بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە و جەنگی موسڵمانان و موسڵمانانیش خۆیان بۆ ئامادە دەکردن، عەمر بە وشە بەهێزەکانی کۆمەکی موسڵمانانی توند و تۆڵ دەکردەوە لە وتەکانی عەمر بۆیان ئەمەیە: ئەی موسڵمانان و باوەڕداران، ئەی هەڵگرانی قورئان و یارانی محمد(ﷺ) وەك مەرد بە ئارام بن و دامەزراو بن و ڕیزەکانتان مەڕەوێننەوە، ڕمەکانتان بخەنە کار و خۆتان بە قەلغان بپۆشن، بێدەنگی بپارێزن جگە لە یادکردنی خوا، هیچ شتێك مەسازێنن تا فەرمانتان پێ دەدەم،[1] وە ڕۆژێك دەستەیەك لە ڕۆمەکان لە گونتروە بۆ موسڵمانان دەرپەڕین هەتا لەگەڵیان بجەنگن و لەم کاتەدا زاڵ بوون بۆ موسڵمانان بوو ڕۆمەکانیش شکان ، هەر بۆیە هەڵهاتن بۆ ئەو گوندەی کە لێوەی هاتبوون، پاشان موسڵمانان دوایان کەوتن و لەوان خێراتر بوون، دەستیان گرت بەسەر دەرگاکەدا لە پێش ئەوەی کە ڕۆمەکان بیبەزێنن، یەکەمین کەس لە موسڵمانان کە سنووری شارەکەی بەزاند (ئەسمەیقەع) بوو وە ڕزگارکردنەکەش دیار و ڕوون بوو، ئەوەی کە شیاوی باس کردنە ئەوەیە قیبتیەکانی میسر لە گوندەکان بوون و هاریکاری موسڵمانانیان کرد،وە ڕێنماییان کردبوون بۆ سەر ناوچە لاوازەکان و بە خۆشحاڵیەوە چووبوون بە دەم موسڵمانانەوە لە ناوچەی (ئەتمیدە) ، پاش ئازادکردنی فەرما موسڵمانان هەستان بە ڕووخانی شورەکانی و قەڵاکانی تا جارێکی تر ڕۆمەکان سووی لێ نەبینن ئەگەر گەرانەوە بۆی — خوانەخواستە — پاشان عەمر وتارێکی بۆ سوپاکەی دا و فەرمووی: ئەی خەڵکینە، سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە سەرکەوتن و سەرفرازی بەخشیە سوپای موسڵمانان، خوای گەورە بە ئاینی ئیسلام پشتمان دەپارێزێت، بە ئیسلامیش ڕێگەی گەرانەوەمان دەسپێرێت، نەکەن گومانتان وابێت هەموو ئەوانەی ئێمە ئارەزووی دەکەین هاتوونەتە دی، بەم سەرکەوتنە بخەڵەتێن، ڕێگەمان سەخت و دژوارە ئەو ئەرکەی کە ئەمیری باوەڕداران بە ئێمەی سپاردووە هێشتا بەدەستهێنانی دوورە، پێویستە لە سەرتان بە ئارام و ملکەچ بن بۆ گەورەکانتان،

---

[1] ـ فتوح مصر، صبحي ندا (ص: ١٩-٢٠).

گەلانی تر دەزانن کە ئێمە لێرە سەربازی ئاشتین، خراپەمان لەسەر زەویدا ناوێت بەڵکو چاکسازی تێدا دەکەین وە ئێوە باشترین پێشەنگ بن بۆ پێغەمبەر (ﷺ).[1]

عەمر دڵنیا بوو لەوەی کە شارەکە بەسوود نیە بۆ پارێزگاری کردن لە هەر سوپایەك کە بیەوێت خۆی بداتە پاڵ، عەمر تاکەکانی سوپاکەی بەسەر کردەوە بە جۆرێك کە لە کاتی شەڕەکەدا بەو شێوەیە نەبوو، عەمر زۆر نیگەران بوو بە لەدەستدانی پیاوانێك کە سوور بوون لەسەر ڕزگار کردنی میسر بەڵام چارەنووس پەلەی پێ کردن، ترسا لەوەی کە شەڕەکان بەم شێوەیە بەردەوام بێت لەگەڵ ڕوودانی چەند زیانێك لە سوپایەکی کەمدا بە جۆرێك کە نەتوانێت درێژە بە لەشکر کێشیەکەی بدات، نەتوانێت بگاتە مەبەست بەڵام خوای گەورە قەرەبووی تیاچوونی سەربازەکانی دەکاتەوە بەوەی کە سوپاکەی ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی تیرە و هۆزە عەرەبەکان لە ڕاشدە و لەخمە پەیوەندی پێوە دەکەن لە کێوی حەلاڵ نیشتەجێ دەبن،[2] عەمر بە سوپاکەیەوە بەرێکەوت و ڕووبەڕووی هیچ جۆرە بەرەنگار بوونەوەیەك نەهات و بەرەو ڕۆژئاوا ڕێگەی گرتەبەر تا گەشتە ناوچەی ئەلقەواسر (ئەلقەساسین) لەوێوە بەرەو باشوور کەوتەڕێ تا شیوی ئەلتەمیلان لە نزیك گردێکی گەورە ڕۆژی کردەوە و پاشتر ڕێگەی باشوری بڕی تا لە بلبیس لایدا، خاوەنی کتێبی (النجوم الزاهرة) دەڵێت: عەمر چوویە پێشێ کەس لەروی نەوەستا تا گەیشتە بلبیس.[3]

## ٢- ئازادکردنی بلبیس:

لە بلبیس ڕۆمەکان بە هێزێکی گەورەوە دەرکەوتن بۆ بەرەنگاربوونەوەی عەمر لە ڕووکردنە قەڵاکانی بابلیۆن و نیازیان ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان بوو، عومەر (ﷺ) پێی فەرموون: پەلەمان پێ مەکەن هەتا پۆزشتان بۆ دێنینەوە وە با باوکی مەریەم و مەریام بۆ دەربکەوێت، ئەو کاتە لە جەنگ دەست بەردار بوون، بەم شێوەیە دوو پیاو بۆی هاتنە دەرەوە، ئەویش بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون یان سەرانە، عەمر هەواڵی پێدان بە وەسیەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە خەڵکی، بە هۆی هاجەری دایکی و ئیسماعیل: کە موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((ئێوە میسر ڕزگار دەکەن، کە زەویە قیراتی تێدا ناونراوە،[4] ئەگەر ئازادتان کرد لەگەڵ خەڵکەکەی باش بن، چونکە ئەوان بەڵێن پێدراو و بەخشندەییان هەیە))، یان فەرموویەتی: ((بەڵێن پێدراوی و دۆستایەتیان هەیە))،[5] ئەوانیش وتیان: دۆستیەتیکی دوور کە جگە لە پێغەمبەران کەسێك بە وێنەی بەجێی ناهێنێت، بمانپارێزە، تا بگەڕێینەوە بۆ لات، عەمریش فەرمووی: کەسێکی وەك من ناخەڵەتێت بەڵام من سێ ڕۆژ مۆڵەتتان دەدەم تا بیر بکەنەوە ، ئەوانیش وتیان: بۆمان زیاتر بکە،

---

١ـ فتوح مصر، صبحي ندا (ص: ٢٠).

٢ـ جولة في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢١٤).

٣ـ النجوم الزاهرة (١/٧-٨).

٤ـ قیراط: سەنگیکە لە پێوانە و کێشانەدا، بەپێی ڕۆژگار کێشەکە گۆڕاوە.

٥ـ مسلم، ك: فضائل الصحابة رقم (٢٥٤٣).

ئەویش ڕۆژێکی تری بۆ زیاد کردن، ئەوانیش گەرانەوە بۆ لای مەقۆقسی گەورەی قیبت، [١] ئەرتەبوونی والی ڕۆمەکان، هەواڵی موسڵمانانیان پێدان ئەرتەبوون بەمە قایل نەبوو وە سوور بوو لەسەر شەڕ کردن، موسڵمانانیش خۆیان ڕێك خست، خۆی و سوپاکەیان تێك شکاند و بەرەو ئەسکەندەریە دەریان نان، [٢] ئەوەی شیاوی باسە، وە بەڵگەیە لەسەر جوامێری موسڵمانان و مەردایەتیان ئەوەیە موسڵمانان کاتێك بلبیسیان ڕزگار کرد تیایدا کچەکەی مەقۆقسیان تێدا دیتەوە کە ناوی ئەرمانۆسە و ئەو زۆر نزیك لە بابی بوو، لە سەردانێکی شاری بلبیس بوو لەگەڵ بریارەی خزمەتکارەکەی بوو کە لە دەستی هاوسەرەکەی هەڵهاتبوو کە ناوی قوستەنتیس و کوڕی هیرەقل بوو (کە دواتر بوویە باوکی قنستەتز)ی خاوەن جەنگی ذات ئەلصواری کە ئەو کچە بە ئارەزووی خۆی بە مێرد نەدراوە، کاتێك کە دەستەیەك لە سوپای ئیسلامی توانیان ئەرمانووس بە دیل بگرن عەمری کوڕی عاص هاوەڵانی کۆکردەوە و ئەوەی بە یاد هێنانەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَـٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَـٰنُ﴾(الرحمن: ٦٠).

پاشان فەرمووی: مەقوقس دیاریەکی نارد بۆ پێغەمبەرەکەمان وە منیش وای بە باش دەبینم کە کچەکەی و تەواوی کەنیزەك و شوێنکەواتووانی و دیلەکانی و ئەوەی لەماڵیاتیان گرتوومانە با بۆیانی ڕەوانە بکەینەوە، ئەوانیش ڕاکەیان بە ڕاست زانی، [٣] پاشان عەمر ئەرمانووسەی بە شێویەکی سەرفرازی و بەڕێزانە لەگەڵ هەموو خشڵ و زێڕ و کەنیزەك و کۆیلەکانیدا ناردەوە بۆ باوکی، بەریارەی خزمەتکاری لە کاتی ئەم گەشتەدا پێی وت: من پارێزراوم لەسەر دەروون و شەرەفی خۆم لە نێو خێوەتگەی عەرەب، من پارێزراو نیم لە نێو کۆشك و تەلاری باوکم، [٤] کاتێك گەشتەوە لای باوکی زۆر بەختەوەر بوو بە بینینەوەی و ئەو کارەی کە موسڵمانان لەگەڵیدا کردبوویان. [٥]

## ١- جەنگی ئوم دەنین:

إبن عبدالحکم لە ڕیوایەتەکەیدا باس لەوە دەکات کە عەمر بە سوپاکەیەوە کەوتەڕێ تا ئازادکردنی بلبیس پاش شەڕ و جەنگێك کە نزیکەی یەك مانگی خایاند پاشان ڕۆشت تا گەشتە ئوم دەنین و ناودەبرێت بە مەقسس کە شەڕێکە لەسەر ڕووباری نیل ڕوویدا، موسڵمانان لە دەوریدا شەڕێکی سەختیان ئەنجامدا و عەمر کەسێکی نارد بۆ لای عومەرو داوای هاوکاری و کۆمەکی لە ئەمیری باوەڕداران کرد بە چوار هەزار کەس و هەر هەزار کەسێکیان کەسێك هەبوو کە شوێنی هەزار کەس دەگرێتەوە کە ئەوانەش زوبێری کوڕی عەوام و مقدادی کوڕی ئەسوەد و عوبادەی کوڕی صامت و

---

١ـ البداية والنهاية (٧/ ١٠٠).
٢ـ فتح مصر (ص: ٢٤).
٣ـ الدور السياسي للصفوة في صدر الاسلام (ص: ٤٣١).
٤ـ فتح مصر، صبحي ندا (ص: ٢٤).
٥ـ هەمان سەرچاوە.

موسلمەی کوڕی موخلەد، دەڵێن کە چوارەمیان خارجەی کوڕی خوزافە بوو، عومەر لە پەیامەکەیدا نووسیویەتی: بزانە کە تۆ ١٢ هەزار کەست لەگەڵدایە، ١٢ هەزار کەس لە کەمیدا نابەزێت،[1] ڕۆمەکان لەگەڵ قیبتیەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانان هاتوونەتە دەرەوە، لە نێوانیاندا شەڕێکی گەورە ڕوویدا کە عەمری کوڕی عاص تیایدا دانایی و ژیری خۆی تێدا بەکارهێنا هەروەك ئەوەی کە خالدی کوڕی وەلید لە شەڕەکانی عێراقدا بەکاری هێنا، ئەویش بەوەی سوپاکەی کرد بە سێ بەشەوە بە جۆرێك کە بۆسەیەکی بۆ دوژمنان دانا لە جەبەل ئەلئەحمەر، و بۆسەیەکی تری لەسەر ڕووباری نیل و لە نزیك ئوم دەنین دانا و بەوەش مایەوە لە سوپاکەی ڕووبەڕووی ڕۆمەکان بوویەوە، کاتێك جەنگ لە نێوان هەردوو لادا ڕوویدا ئەو بۆسەیەی، کە لە جەبەل ئەلئەحمەر بوو هاتە دەرەوە و داباری بەسەر ڕۆمەکاندا و تێکیان شکاندن و بەرەو ئوم دەنین وە دەریایان نان و ئەو بۆسەیەی کە لە نزیکیەوە بوون ڕووبەڕوویان بوونەوە و ئەوانیش کەوتنە نێوان هەرسێ سوپای موسڵمانان و تێك شکان و سوپاکەیان بڵاوەی لێ کرد و هەندێکیان پەنای برد قەڵای بابلیۆنەکانی ئەلحصین،[2] بەم شێوەیە موسڵمانان ئەو شەڕەیان قۆستەوە و خوای گەورە لە خراپە و شەڕی دوژمنانیان پاراستنی ئەویش بە هۆی سەرکەوتوویی سەرکردە ژیرەکەیانەوە بۆ ئەو پلانە تۆکمەیەی کە هێزی دوژمنانی پێ پەرش و بڵاوکرد.[3]

## ٤- جەنگی قەڵای بابلیۆن:

عەمر بە سوپایەکەوە بەرەو قەڵای بابلیۆن پێشڕەوی کرد و گەمارۆی دان کە ماوەی حەوت مانگی خایاند، لەم کاتەدا مەقۆقس نێردراوی خۆی نارد بۆ لای عەمری کوڕی عاص بۆ ئاشتەوای و عەمری کوڕی عاسیش لەسەر چەند مەرجێك بە دەم داواکەیەوە ڕۆیشت کە بریتی بوون لە: موسڵمان بوون یان سەرانە یان جەنگ و مەقۆقس سەرانەی هەڵبژارد، مەقۆقس نامەیەکی نووسی بۆ هیرەقل و لەم کارەدا داوای مۆڵەتی لێکرد، بەڵام هیرەقل ئەمەی لێ پەسەند نەکرد بەڵکو بێزاری لە بەرامبەر دەربڕی و زۆر بە توندی سەرزەنشتی کرد و بانگی کرد بۆ قوستەنتینیە و پاشان دووری خستەوە، کاتێك کە ڕزگارکردنی قەڵای بابلیۆن دواکەوت زوبێری کوڕی عەوام فەرمووی: من خۆم دەبەخشمە خوای گەورە و تکام وایە کە خوای گەورە بەمە ڕزگاری شارەکە بداتە دەست موسڵمانان،[4] وە عەمری کوڕی عاص درێژەی دایە گەمارۆی قەڵای بابلیۆن و پاشان بە دەوری قەڵاکەدا و لە شەودا سەرکەوتن بەسەریدا و لەگەڵ سەربازانی دوژمندا تێك هەڵگژان وە یەکەمین کەس کە بە قەڵاکەدا سەرکەوت زوبێری کوڕی عەوام بوو کە پەیژەیەکی لە ڕووی بازێڕی گەرماوەکەوە دانا و پاشان سەرکەوت پیایدا و فەرمانی دایە موسڵمانان ئەگەر گوێیان لە (ألله أكبر)ی بوو سنووری قەڵاکە ببەزێنن، ئەوان زۆر هەستیان بە مانەوە

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢١٨).
٢ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢١٩).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ الفتوحات الاسلامية، د. عبدالعزيز الشنادي (ص: ٩١).

نەکرد هەتا زوبێر چوویە سەر لوتکەی قەڵاکە و الله أکبری کرد و شمشێرەکەی بە دەستەوە بوو، زوبێر (الله أکبر)ێکی کرد و موسڵمانان لە دەرەوەی قەڵاکە وەڵامیان دایەوە، دانیشتوانی قەڵاکە گومانیان برد کە تەواوی موسڵمانان سنووری قەلاکەیان بەزاندووە هەڵهاتن، هاودەمەکەی پێغەمبەری خوا بە ئەنقەست بەرەو لای دەرگای قەڵای بابلیۆن هاوڕێکانی بەڕێکرد و ئەوانیش دەرگاکەیان کردەوە، موسڵمانان قەلاکەیان وێران کرد و بە زۆرەملێ دەرگاکەیان کردەوە بەڵام عەمری کوڕی عاص مایەوە لەسەر ئەوەی کە سەربازانی ڕۆم بێنە دەرەوە بۆ ئەوەی خۆراکی چەند ڕۆژی خۆیان بە دەست بهێنن، بەڵام قەڵای بابلیۆن و ئەو زەخیرە و ئامرازانەی جەنگیەی کە تیایدایە وەك غەنیمەتێك بۆ موسڵمانان دەمێنێتەوە، پاشان ئەبو عویەیدالله کۆشك و شورەکانی قەڵاکەی تێکدا.

## دووەم: ڕزگرکردنی ئەسکەندەریە:

عەمری کوڕی عاص وسەربازەکانی ماوەی چەند مانگێك لە قەڵای بابلیۆن مانەوەتا سەربازان کۆببنەوەو لە عومەرەوە فەرمانی بۆ بێت بە بەڕێکەوتن بۆ ڕزگارکردنی ئەسکەندەریە، کاتێك کە ئەمە دەستەبەر بوو عەمر چەند چەکدارێکی بەهێزی لە موسڵمانان لە قەڵاکە بەجێهێشت، لە مانگی مایۆی ساڵی (٦٤١)ز، هاوکات بە مانگی جەمادی دووەمی ساڵی (٢١)ی کۆچی بە سەربازەکانیەوە لە قەڵای بابلیۆن جیابوویەوە و لەگەڵیدا ژمارەیەك لەو گەورە پیاوانەی قیبتی هاتنە دەرەوە کە دڵنیا بوون لەوەی کە بەرژەوەندیەکانیان لە ژێر سایەی هاریکاری کردنی هێزی سەرکەوتووی ئیسلامدایە، ڕێگەکانیان بۆ چاك کردن، چەندین پرد و بازێڕیان بۆ دروست کردن، بەم شێویە قبت بوویە کۆمەك و پشتیوانێك لەسەر ئەوەی کە خوازیاری جەنگی ڕۆمەکان بوون،[1] دواتر عومەر ڕێگەی بەشی لای چەپی ڕووباری نیلی گرتەبەر بە جۆرێك کە پارێزگای بوحەیرە دەکەوێتە سەر ڕێگەکەی وتا بیابانیش بوارێکی بەرفراوان بداتە بزاوتی ئەسپسوار و سەربازەکانی، تا دوور بێت لەوەی کە ڕووبەڕووی دەروازەی زۆر ببێتەوە ئەگەر بە دەشتایی نیلدا تێپەڕی، عەمر جگە لە جەنگێکی سوکی مەرقوت یان تەرانە هەروەك ئەوەی کە مێژوونووسانی عەرەب[2] ناوی دەبەن ڕووبەڕووی هیچی تر نەبوویەوە، پاشان پەڕیەوە بۆ ڕووکاری کەناری ڕۆژهەڵات بە جۆرێك کە شاری نقیوسی[3] تۆکمە دەکەوێتە سەری، ئەم شارە چەندین قەڵای نەبەزی هەبوو عەمر ترسا لەوەی کە لە لاتەنیشتەوە وازی لێ بهێنن و بەسەریدا بڕوات، بەڵام ڕۆمەکان لە بری ئەوەی خۆیان قایم بکەن لە موسڵمانان تۆکمەیان کردن و سواری کەشتیەکانیان بوون هەتا لەگەڵ موسڵمانان بجەنگن و بەریان لێ بگرن لە نزیك بوونەوە لە شارەکەیان، دواتر موسڵمانان بە تیر و ڕمەکانیان تیربارانیان کردن و لە ئاوەکەدا بە دوایان دا چوونن پاشتر ڕۆمەکان پشتیان هەڵکرد و بەرەو ئەسکەندەریە بە کەشتیەکانیان بەڕێکەوتن، دواتر هەر بە خێرایی ئەوانەیان لە

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٢٥).

قەڵاکەدا مابوونەوە خۆیان دا بە دەستەوە و موسڵمانانیش بە سەرکەوتوویی چوونە نێو قەڵاکەوە و چەند ڕۆژێك مانەوە و بە دەوری قەڵاکەدا دوژمنانی خۆیان پاك کردەوە،[١] عەمر شەریکی کوڕی سومەییەی نارد تا چاودێری ڕۆمە هەڵاتووەکان بکات، ئەویش پێیان گەیشت بێ ئەوەی هیچ هێزێکی هەژماری لەگەڵدا بێت، بۆیە ڕۆمەکان چاویان تێبڕی و دەوریان دا و ئەویش خۆی دایە پاڵ گردێك کە دوایی بە تەپۆلکەی شەریك ناسرا، پاش ئەمە کەسێکی نارد بۆ لای عەمر و داوای هاریکاری لێکرد، هەر کە ڕۆمەکان زانیان هاریکاری بەڕێوەیە بۆ لای ئەم کۆمەڵە موسڵمانە دەستیان کرد بە هەڵهاتن،[٢] وە لە سولتەیس کە شەش میل لە خواری دەمەنهورەوەیە ڕووبەڕووبوونەوە دواتر لە نێوان عەمر و ڕۆمەکان ڕوویدا، شەڕ و جەنگێکی سەخت ڕوویدا و ڕۆمەکان تیایدا شکان و پشتیان کردە شەڕەکە،[٣] ئەوەی کە جێگەی نیگەرانیە ئەوەیە کە ئەم شەڕانەی کە موسڵمانان بون هێزە سنووردارانەیانەوە کە دژی سوپاگەلێك ئەنجامیان داوە کە چەند هێندەیان بوون لە ژمارەی جەنگاوەر و کەلوپەلی جەنگیدا، کە هەندێکیان چەند ڕۆژێکیان خایاندووە و مێژوونووسانی موسڵمانان بە چەند دێڕێکی کەم یان چەند وشەیەکی ژمێردراو نەبێت باسیان لێوە نەکردووە، لە کاتێکدا نەبێت کە ژمارەیەکیان دەیان لاپەڕەی لەسەر شەڕەکانی قادسیە و یەرمووك و نەهاوەند نووسیووە،[٤] وە لەو جەنگە گەورانەش کە سەرچاوە عەرەبیە پڕ لە خەشم و قینەکانمان پێی چاك نابنەوە جەنگی کریونە کە دوایین جەنگی زنجیرە شەڕەکانی ئەو قەڵایانەیە کە بە نێوان بابلیۆن و ئەسکەندەریەدا درێژ دەبێتەوە و تیۆدۆری سەرکردەی سوپای ڕۆم خۆی تیا قایم کرد و جەنگێکی سەخت تیایدا ڕوویدا کە دە ڕۆژ زیاتری خایاند، لەگەڵ ئەوەشدا إبن عبدالحکم جگە لە چەند وشەیەك هیچی لەم بارەیەوە نەنووسیووە کە ئەمە وشەکانیەتی: پاشان لە کریۆن بەیەك گەیشتن، ماوەی زیاتر لە دە ڕۆژ لەگەڵ یەکدا جەنگان، عبداللە ی کوڕی عومەر لە پێشەوەی سوپاکە بوو، ئەو ڕۆژە هەڵگری ئاڵای موسڵمانان وەردانی کاکی عەمر بوو، ئەو ڕۆژە عەمر نوێژی (صلاة الخوف)ی کرد، پاشان خوای گەورە ناوچەکەی بۆ موسڵمانان ئازاد و ئاوەڵا کرد و موسڵمانان ژمارەیەکی زۆریان لە ڕۆمەکان کوشت و شوێنیان کەوتن تا ئەسکەندەریە، لە میانی ئەمەشدا چیرۆکێك سەبارەت بە قارەمانیەتی عبداللە ی کوڕی عەمر و مەردانی مامی هاتووە،[٥] ئەسکەندەریە لە کاتی ڕزگارکردنیدا لە لایەن موسڵمانانەوە پایتەختێکی هەبوو وە دووەمین بەرهەڤەکانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتینیەکان هەستیان بە مەترسی دەست بە سەراگرتنی موسڵمانان دەکرد بە سەریدا و بە پەرۆشی ئەوەوە بوون، تەنانەت هیرەقل دەڵێت: ئەگەر عەرەب لە ئەسکەندەریە دەرکەوتن ئەوا لەمەدا دابڕانی پادشای ڕۆم و تیاچوونیانە[٦] بچێتە دەرەوە و پەیوەندی بکات بە جەنگی

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٥).
٢ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٥).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ هەمان سەرچاوە.
٥ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢١٦).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

موسـڵمانانەوە، کاتێـك کـە لـە خـۆ ئامادەکردنەکـەی بوویـەوە خـوای گـەورە گیـانی لێ سـتاند و بـە چارەنووسی خۆیی گەیاند ، خـوای گـەورە بـارانی پـڕ لـە کۆمـەکی و هاریکـاری خـۆی بارانـد بەسـەر موسڵماناندا،[1] لە پاش مردنی هیرەقل کاروباری دەوڵەتی بیزەنتینی دووچاری تـەنگ و چـەڵەمە هـات بە جۆرێـك کـە قوسـتەنتین و هیرەمکـی دووەم (هیرقلیـانووس) بـەڕێوەبردنی دەوڵـەتیان گرتـە دەسـت ئیمپراتۆریەتی مارتینە دایکی هیرقلیانووس بەشداری لەگەڵ کردن بەڵام قوستەنتین بە خێرایـی و پـاش سەد ڕۆژ لە مردنی باوکی مەرگ ڕێگەی پێگرت و ئەمەش وای کرد کە پەنجەی تاوان بخرێتە سەر ئـەو ئیمپراتۆرەیەی کە ئارەزوومەندی ئەوە بوو کە کوڕەکەی بە تەنها فەرمانڕەوایی بکـات و ئەمـەش وای کرد کە کڵپی شۆڕش لە دژی تاو بگرێت، فیتنـەی زیـان بـەخش لـە وڵاتـدا مـاوەی چـەند مـانگێکی خایاند، هەتا کۆنستانس کوڕی قوستەنتین بە هاوبەشـی لەگـەڵ هیرقلیانووسـی مـامی فـەرمانڕەواییان گرتە دەست.[2]

ئەسکەندەریە سـەرباری پتـەوی شـوورەکانی و گـەورەیی زۆری پـارێزەرانی بـە شـوێنی جوگرافیـای بەرگری خوازانە جیادەکرێتەوە کە لە باکوورەوە دەریا دەیپارێزێت، بە جۆرێك ئەو دەمـە دەسـەڵات بـۆ ڕۆمەکان بووە هەروەها دەریاچەی مەریوط لە بەشی باشووریەوە بـۆی بۆتـە قەڵایـەك و پارێزگـاری لێ دەکات، سنوور بەزاندن و تێپەڕاندنی کارێکی زۆر سەخت و دژوار بووە، یەکێك لە لقەکانی نیلی کـۆن کە ناوی (ترعة الثعبان)ە لە ڕووی ڕۆژئاوایەوە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە، بەمـەش جگە لە ڕێگەیەك لـە ڕووی ڕۆژهەڵاتیەوە نەبێت هیچ ڕێگەیەك نامێنێتـەوە بـۆ گەیـشتن پێـی، کـە ئـەو ڕێگەیـەش ڕێگـەی گەیەنەرە لە نێوانی و نێوان کریۆندا.[3]

گەمارۆکە چەند مانگێکی خایاند و لای عەمر مەترسی ئەوەی دروست کرد کە سەربازانی هەسـت بەنائومێدی یان پەك کەوتن لەبەردەم دوژمنانیان بکەن، بۆیە بڕیاریدا کە کەتیبەکانی بڵاوە پێ بکـات هـەتا بـە نێـو ناوچـەکانی دەلتـا و گونـدەکانی صـەعیددا بگـەڕێن ، جگـە لەمـەش درێـژی مـاوەی گەمارۆکەی ئەسکەندەریە توڕەیی عومەری هەژاند، لە ئاخیدا چەندین بیرکردنەوە و گومانی دەربارەی ئامادەباشی سەربازەکانی بۆ گیان فیدایی و دەستپێشخەری وروژاند، پێشبینی ئەوەشی کرد کە ئەمـە هیچ نیە جگە لەوەی کە بۆیان نوێ بۆتەوە،[4] ئەمەی لە نامەکەیدا بۆ عەمری کوڕی عاص شـیکردەوە کە تیایدا دەفەرمووێت: (لەپاشدا، من سەرم سووڕ دەمێنێت لە دواکەوتنتان لـە ڕزگـارکردنی میـسر، ئێوە نزیکەی دوو ساڵە لەگەڵیان دەجەنگن ئەمە هـیچ نیـە جگـە لـەوەی کـە ئێـوە نوێگـەریتان تێـدا کردووە، لە دونیادا ئەوەتان پێ خۆش بووە کـە دوژمنەکـەتان پێـی خۆشـە، خـوای گـەورە نەتەوەیـەك سەرناخات مەگەر بە ڕاستی نیازیان بۆ ئەو سەرکەوتنە، من چوار کەسـم بـۆ نـاردووی (واتـا زوبێـر و

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٦) نقلا عن إبن عبدالحكم.
٢ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٢٧).
٣ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٢٥).
٤ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٢٢٧).

هاوەڵانی) وە ئاگادارم کردیتەوە کە هەریەکێکیان لە جێی هەزار پیاوە وەك ئەوەی من بیزانم، مەگەر ئەوەی کە کەسانی تر ئەمەیان گۆڕیبێت، ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەشت، وتارێك بۆ خەڵکی بدەو هانیان بدە لەسەر جەنگی دوژمنانیان، ئارەزوومەند و نیازمەندیان بکە لە ئارامی و نیەت و نیازیاندا، ئەو چوار کەسە بخەرە پێش خەڵکەکەوەو فەرمان بدە بەو خەڵکە کە کۆسپ و تەگەرەیەکیان هەبێت وەك کۆسپی یەك پیاو وابێت وە ئەمەش با لە کاتی ئاوابوونی ڕۆژی هەینیدا بێت، چونکە ئەوە کاتێکە کە میهرەبانی خوای گەورەی تێدا دەبارێت و نزا و پاڕانەوەکان تیایدا گیرا دەبێت، با خەڵکەکە هاواریان بۆ لای خوای گەورەیان ببەن و داوای سەرکەوتنیان لێ بکەن بەسەر دوژمنایاندا، کاتێك کە عەمر نامەکەی عومەری پێ گەشت خەڵکەکەی کۆکردەوە و نامەکەی بۆ خوێندنەوە پاشان چوار کەسەکەی بانگ کرد و خستنیە پێش خەڵکەکەوە و فەرمانی دا بە خەڵکەکە کە خۆیان پاك بکەنەوە و دوو ڕکات نوێژ بخوێنن، پاشان ڕوو بکەنە خوای گەورە و داوای سەرکەوتنی لێ بکەن، ئەوانیش تەواوی کارەکانیان ئەنجامدا و خوای گەورەش ناوچەکەی بۆ ئازاد کردن،[1] دەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی عاص ڕاوێژی بە موسلمەی کوڕی موخەلەدی ئەنصاری کردووە و پێی فەرمووە: کەسێکم بۆ دەست نیشان بکە بۆ جەنگی ئەم ڕۆمانە، موسلمەش فەرموویەتی: من پێم وایە کە تۆ سەیری پیاوێك بکەیت کە شارەزای و ئەزموونی لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ)ەوە وەرگرتووە و تۆش لە سەرووی ئەو خەڵکەوە بەڵێنی پێ بدەیت، تەنها ئەوە کە ڕاستەوخۆ دەچێتە ناو جەنگەکەوە و کۆتایی پێ دێنێت، عەمریش فەرمووی: ئەوە کێیە؟ ئەویش فەرمووی: عوبادەی کوڕی صامتە، عەمر بانگی کرد، کاتێك کە عوبادە لێی نزیك بوویەوە ویستی لەسەر ئەسپەکەی دابەزێت، عەمر پێی فەرموو: بڕیارم داوە کە دانەبەزیت، بێنە سەرەتیرەی ڕمەکەتم نیشان بدە، ئەویش سەری ڕمەکەی نیشان دا و عەمر عەمامەکەی لەسەری لابرد و بەڵێنی پێدا و جەنگی ڕۆمەکان پێ سپارد، هەر لەو ڕۆژانەدا خوای گەورە شاری ئەسکەندەریەی لەسەر دەستی عوبادە ڕزگار کرد،[2] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرموێت: من بیرم لەم کارە کردۆتەوە کە کۆتاییەکەی چارەسەر ناکرێت بە یەکێك کە سەرەتاکەی چارەسەر نەکردبێت و ئەم کارەش کەسێکی ئەنصاری دەوێت، دواتر عوبادەی کوڕی صامتی بانگ کردو بەڵێن و پەیمانی پێدا و خوای گەورەش لەسەر دەستی ئەو ناوچەکەی ڕزگار کرد،[3] إبن عبدالحکم دەگێڕێتەوە، کە گەمارۆی شاری ئەسکەندەریە ماوەی(٩) مانگی خایاند و لە سەرەتای مانگی موحەڕەمی ساڵی(٢٠)ی کۆچی ئازاد کرا،[4] کە ئەم بەروارەش هاوکاتە لەگەڵ ڕۆژی (٢١)ی کانوونی یەکەمی ساڵی(٦٤٠)ی زاینی، لە کاتێکدا کە بتلەر لە بەدواداچوونەکەیدا سەبارەت بە ئازادکردنی میسر، کە گەمارۆی شارەکە لە کۆتاییەکانی مانگی یۆنیۆی ساڵی (٦٤٠)ی زاینی دەستی پێکرد و

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٥) نقلا عن إبن عبدالحكم.
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٢٢٧).
٣ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٨).
٤ـ هەمان سەرچاوە.

لە نۆڤەمبەری ساڵی(٦٤١)ی زاینی کە هاوکاتە لەگەڵ(٧)ی مانگی (ذي الحجة)ی ساڵی(٢١)ی کۆچی شارەکە خۆی دا بەدەستەوە وە ئەم وتەیەش لە نامەکەی عومەری فاروق بۆ عەمری کوڕی عاص پشت ڕاست دەکرێتەوە کە دەنووسێت: ئێوە ماوەی دوو ساڵە لەگەڵیان دەجەنگن وە ماوەی گەیشتە عەریشی عەمر لە کانوونی یەکەمی ساڵی(٦٣٩)ی زاینی و خۆ بەدەستەوەدانی ئەسکەندەریە لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی(٦٤١)ی زاینی یەکسانە بە دوو ساڵی مانگی کە عەمری خەڵکی شاری ئەسکەندەریەی هێشتەوە و نەی کوشتن و سووکایەتی پێ نەکردن و کردنیە خەڵکانی بەڵێن پێدراو، وەك دانیشتوانی بابلیۆن..پاشان عەمر لەئەسکەندەریە هێزێکی پاراستنی لەهێزەکانی بەجێهێشت پاش ئەوەی کە لێی دڵنیا بوو وە تەواوی کەتیبەکانی بڵاو کردەوە بۆ ئازادکردنی تەواوی قەڵاو شارەکانی ڕۆم،دواتر ڕزگارکردنی کەنارەکانی دەریای ناوەڕاستو شارە گەورەکانی وەك ڕەشیدو دمیاط و شارەکانی تر تەواوکاری بۆکرا،پاشان دەستی زاڵبوونی خۆی گەیاندە دەڵتاو صەعیبینی میسر.[1]

## سێیەم: ڕزگارکردنی بەرقە و تەرابلس

عەمر پاش ئەوەی میسری ڕزگارکرد ڕێگەی گرتەبەر تا ڕزگارکردنەکانی لە بەشی ڕۆژئاواوە پارێزراو بکات، ئەگەر بێت و ڕۆمەکان هێزێکیان لە شارەکانی بەرلاقە و تەرابلس هەبێت و خۆی لەوێ قایم بکات، ڕەنگە هەلێکی بۆ دەستەبەر بووبێت و لەخۆبایی بوون وای لێ کردبێت کە هێرش بکاتە سەر موسڵمانان لە میسر، بۆیە عەمر ساڵی(٢٢)ی کۆچی بە هێزێکەوە ڕووی کردە بەرقە و ڕێگەی نێوانی و نێوان ئەسکەندەریە ئەو دەمە کشتوکاڵ و ئاوەدانی بوو، لە ڕێگەیدا بە هیچ شێوەیەك فێڵ و تەڵەکەی نەهاتەڕێ، کاتێك کە گەیشتە ئەوێ دوانیشتوانەکەی بە دانی سەرانە لەگەڵی ڕێك کەوتن، ئەو دەمە خەڵکە بەرقە پاش ڕزگاربوونی باجەکانیان دەنارد بۆ والی میسر بێ ئەوەی هیچ بزوێنەر یان بزواویەکیان بۆ بێت، ڕەنگە بەرقە باشترین میللەتی ڕۆژئاوای عەرەب بوون کە فیتنە نەیتوایووە بچێتە نێوانیانەوەن پاشان عەمر لەگەڵ ئەمەشدا بەرەو تەرابلسی خاوەن قەڵا نەبەزەکان کەوتەڕێ کە ئەو دەمە سوپایەکی گەورەی ڕۆمەکانی تێدا بوو، دەرگاکانی داخست و ئارامی لەسەر ئەو گەمارۆیە گرت کە مانگێك بەردەوام بوو کە موسڵمانان تیایدا نەیاندەتوانی هیچ شتێك بکەن و دەریاکەش لە ڕووی پشتیەوە نووساوە بە ماڵەکانی شارەکەوە، لە نێوان شارەکە و دەریاکەشدا هیچ شوورەیەك نیە، پاشان کۆمەڵێك لە موسڵمانان کارەکەیان قۆستەوە و سەرکەوتن بۆ شارەکە لە ڕووی دەریاوە، و دەستیان کردە (الله أكبر) کردن، ڕۆمەکان هیچ سامێکیان نەبوو جگە لە کەشتیەکانیان، بە جۆرێك کە عەمر بە هێزەکەیەوە هێرشی بۆ بردن جگە لەوانەی کە بەهۆی بەلەمەکانیانەوە خۆیان حەشار دابوو کەسیان دەرباز نەبوون، موسڵمانان هەرچیەك لە شارەکەدا بوو بە غەنیمەت بردیان، عەمر هێزێکی بەو دەوروبەرەدا بڵاوە پێکرد و نیازی کرد کە لە ڕووی ڕۆژئاواوە تەواوکاری بۆ ڕزگار کردنەکانی بدات و

---

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٢٩).

بەرەو تونس و زەویەکانی کیشوەری ڕەش بەڕێ بکەوێت و ئازادیان بکات، هەر بەمەش نامەیەکی نووسی بۆ عومەر، جگە لەمە عومەر دەترسا لە کاری گەشتیاری سوپای موسڵمانان لە بەرەیەکی نوێدا وە پاشان دڵنیا نەبوو لەوەی کە ڕزگار کراوە بە لەشکرکێشیەکی خێرا لە شامەوە بۆ تەرابلس، بۆیە لە شاری تەرابلس فەرمانی دا بە وەستانی سوپای ئیسلامی و بەمەش دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەردا پەرەی سەند تا ڕووبەرێکی بەرفراوانی زەوی بگرێتەوە کە سنوورەکەی لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕووباری جەیحون و سەنەدو لەڕۆژئاواوە وڵاتانی کیشوەری ڕەش و بیابان و دەشتاییەکانی و لەباکووریەوە چیای ئاسیای بچووك و زەویەکانی ئەرمینیا و لە باشووری زەریای ئارام و وڵاتی نۆبەیە لەدەوڵەتە جیهانی و فرەڕەگەزەکان و ئایینیەکان و لاوازی و ڕەفتارەکان، و دانیشتوانەکەی لە سایەی دادپەروەری و بەزەی ئیسلامدا ژیاون، ئەو ئاینەی کە بە مافی لە ژیانێکی بەڕێزدا پاراستنی و ئەگەر ناتەبا بووبن لە بیروباوەڕیاندا، و لەگەڵ دانیشتوانەکەی لە عورف و عادەتیاندا بووە.[1]

١ـ الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين (ص: ٢٣١).

# دوانگەی سێیەم

## گرنگترین وانە و سوود و پەندەکانی ڕزگارکردنی میسر

### یەکەم: باڵوێزی عوبادەی کوڕی صامتی ئەنصاری بۆ مەقۆقس:

عەمری کوڕی عاص قەڵای بابلیۆنی گەمارۆدا و مەقۆقس نامەیەکی نارد بۆ عەمر کە ئەمە دەقەکەیەتی: بە ڕاستی ئێوە چوونە نێو وڵاتی ئێمە، سوور بوون لەسەر جەنگمان، مانەوەتان لە زەوی زارماندا درێژی کێشا، بەڵام ئێوە گروهێکی ئاسانن و ڕۆمەکان لە خشتەیان بردن و خۆیان بۆ ئێوە ئامادە کرد و چەك و جبەخانەیان لەگەڵدایە، ئەم دەستکەوتە دەوری ئێوەی دا، ئێمە کۆمەڵە دیلێکن لە نێو دەستی ئێمەدا، لەبەر ئەوە چەند پیاوێکی خۆتانمان بۆ بنێرن تا گوێ لە قسەکانیان بگرین بەڵکو ئەو گرفتەی لە نێوان ئێمە و ئێوەدایە بەو شێوەیە چارە سەر بکرێت کە هەردوو لامان پێمان خۆشە، ئەم جەنگە لە ئێمەش و لە ئێوەش دا ببڕێت پێش ئەوەی کە ڕۆمەکان داتان پۆشێ قسەکردن هیچ سوودی بۆ هیچ لایەکمان نەبێت، توانای نەبێت بەسەریدا، ڕەنگە ئێوە پەشیمان ببنەوە ئەگەر کارەکە ناتەبا بە داخوازی و تکای ئێوە بوو، بۆیە داواتان لێ دەکەین کە پیاوێك لە خۆتانمان بۆ بنێرن، ئێمە بە شێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین کە شوێنی ڕەزامەندی ئێمە و ئێوەش بێت و ئەوان بەمە لە شتێکدا دەبن، کاتێك کە نێردراوەکەی مەقۆقس هات بۆ لای عەمری کوڕی عاص بۆ ماوەی دوو ڕۆژو دوو شەو لای خۆی بەندی کرد، هەتا مەقۆقس لە سەلامەتی ژیانیان ترسا، بە هاوڕێکانی وت: بینیتان، کە موسڵمانان نێردراوەکانمان دەکوژن و بەندیان دەکەن، ئەمەش لە ئاینەکەی خۆیان بە شیاو دەزانن؟! بەڵکو عەمر بەمە ویستی حاڵی موسڵمانان بخاتە ڕوو، پاشان عەمر لەگەڵ نێردراوەکەیاندا وەڵامی دانەوە کە نێوانی من و تۆ جگە لە یەکێك لەم سێ حاڵەتە هیچی تر نیە: یان موسڵمان دەبن، ئەوا دەبنە برامان و ئەوەی بۆ ئێمەیە بۆ ئێوەش بە هەمان شێوە دەبێت وە ئەگەر بەمە قایل نەبوون ئەوا سەرانە دەدەن وە ئەگەرنا جەنگ، تا خوای گەورە دادی نێوانمان دەکات و ئەو باشترینی دادوەرانە،[1] کاتێك نێردراوەکەی مەقۆقس گەیشتە لای، مەقۆقس وتی: ئەوانتان چۆن بینی؟ ئەوانیش وتیان- میللەتێکمان بینی کە لای ئەوان مردن لە ژیان خۆشترە، خۆ بەکەمزانی لای ئەوان لە پلەداری خۆشەویستترە، هیچ کامیان لە دونیادا نیازێك و حەزێکی نیە، بەڵکو دانیشتنیان لەسەر خاك و خواردنیان لەسەر ئەژنۆیانە، ئەمیرەکەیان وەك یەکێك لەوان وایەن پایەدارەکەیان لە دەسەڵاتدارەکەیان جیاناکرێتەوە، گەورەیان لە بەندەیان جیاناکرێتەوە، هەر کە کاتی نوێژ دێ کەسێك لەوان دوا ناکەوێت،

---

١ـ عبادة بن الصامت صحابي كبير وفاتح مجاهد (ص: ٩١).

پەل و پۆیان بە ئاو دەشۆن و لە نوێژەکانیاندا ملکەچ دەبن، مەقۆقس لەمەدا وتی: سوێند بەو کەسەی کە سوێندی پێ دەخورێت، ئەو کەسانە ئەگەر بچن بۆ کێو ڕای دەماڵن، هیچ کەسێك توانای جەنگی ئەم میللەتەی نیە، ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە ڕێککەوتنی ئەوان دەستەبەر نەکەین لە کاتێکدا لەم دەستکەوتە گەمارۆ دراون، لەمڕۆ بە دواوە ئەگەر زەوی بیانگرێتە خۆی وەڵامیان نادەنەوە، خۆتان بپارێزن لە دەرچوون لە شوێنەکانیان، دواتر مەقۆقس نێردراوی خۆی ناردەوە بۆ لایان و وتی: نێردراوی خۆتانمان بۆ بنێرن تا مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین ئێمەش و ئێوەیش بانگەشەی کاری خۆمان بکەین بەڵکو ڕێکەوتنی بۆ ئێمەش و بۆ ئێوەش تێدا بێت، عەمری کوڕی عاصیش دە کەسی نارد بۆ لایان کە عوبادەی کوڕی صامت یەکێکیان بوو وە بەرزی باڵای بست بوو، عەمر فەرمانی پێدا کە وتەبێژیان بکات، ئەگەر داوایان لێکرد بە یەکێك لەو سێ حاڵەتەی پێشوو نەبێت وەڵامیان نەداتەوە، چونکە ئەمیری باوەڕداران بەمە لە من هاتۆتە پێشێ، فەرمانی پێداوم کە جگە لە یەکێك لەم سێ حاڵەتانە هیچی تر پەسەند نەکەم، عوبادەی کوڕی صامت پیاوێکی ڕەش پێست بوو وە کاتێك کە سواری کەشتیەکان بوون بۆ لای مەقوقس، و چوونە لای، عوبادە پێش کەوت، و لەبەر ڕەشیەکەی مەقۆقس لێی ترسا، پاشان وتی: ئەم ڕەش پێستەم لێ لابدەن، کەسێکی تر بێنن کە قسەم لەگەڵ بکات، ئەوانیش وتیان: ئەم ڕەش پێستە باشترینمانە لە ڕا و بۆچوون و زانیاری و زانستدا ، کراوەتە پێشڕەومان وە ئێمە هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ لای ڕا و پەیڤی ئەو، ئەمیرەکەشمان فەرمانی پێکردووە لەگەڵ ئێمەدا بەوەی کە فەرمانی پێکردووە، فەرمانی پێ کردووین کە لەگەڵ قسە و ڕاکانیدا ناکۆك و ناتەبا نەبین، دواتر مەقۆقس بە وەفدەکەی وت: چۆن قایل بوون کە ئەم ڕەش پێستە باشترینتان بێت، دەبوو ئەو لە خواری هەمووتانەوە بێت؟ ئەوانیش وتیان: نەخێر هەروەك دەبینی ئەگەرچی ئەو ڕەش پێستە، بەلام ئەو لە باشترین کەسمانە لە شوێن و پێشینەی و لە ژیری و ڕا و بۆچووندا، ڕەش پێستەکان لەنێو ئێمەدا نەناسراو نابێت دواتر مەقۆقس بە عوبادەی وت:وەرە پێشێ ئەی ڕەش پێست و بە هێوری لەگەڵم بدوێ چونکە من لە ڕەشیەکەت دەترسم، ئەگەر قسەکانت لەسەرم توند بن ئەوا لە سامی خۆت زیاد دەکەیت، پاشان عوبادە لێی چوویە پێشێ و فەرمووی: گوێم لە قسەکانت گرت، لەو هاوەڵانەی کە لە دوای خۆم بەجێم هێشتوون هەزار پیاوی ڕەشیان تێدایە کە هەموویان وەك منن و زۆر لە من ڕەشتر و ڕووخسار ناشرینترن، ئەگەر بێت و بیان بینی ئەوا لە من زیاتر لێیان دەترسیت وە من ئەم کارەم پێ سپێردراوە و گەنجی خۆم بەڕێ دەکەم، من لەگەڵ ئەمەشدا سوپاس بۆ خودا لە سەد پیاوی دوژمنی خۆم ناترسم ئەگەر هەموویان پێکەوە بێن بۆم، هەروەها ئەم هاوەڵانەش بە هەمان شێوەن، بەڵکو ئارەزوو و خواستی ئێمە جیهاد کردنە لە پێناوی خوادا، وشێن کەوتنی ڕەزامەندی خودایە... وە جەنگانمان لە دژی دوژمنانمان لەو شێوازانە نیە کە کەسانێك لە پێناو بەدەست هێنانی دونیا بۆ خودا دەجەنگن، ئەمەش داخوازیەك نیە بۆ زۆر بوون لە ئێمە، بەڵکو خوای گەورە ئەمەی بۆ ساز داوین، کارێکی وای کردووە کە هەرچیەکمان لەوەوە دەست بکەوێت حەڵاڵە، ئەوەی کەسمان باکمان لێی نیە ئەوەیە: کە وەزنێك زێڕی دەست دەکەوێت، یان جگە لە درهەمێك هیچی تری نەبێت، بەڵکو مەبەستی هەر یەکێکمان لە دونیا خواردنێکە کە بیخوات، تا برسێتیەکەی پێ بڕەوێتەوە لەگەڵ

کاڵایەك کە خۆی پێ بپۆشێت، ئەگەر هەر یەکێکمان تەنها ئەمەی هەبێت ئەوا بەسیەتی، ئەگەر کێشانەیەك زێڕی دەست کەوێت ئەوا لە پێناو ملکەچی خودادا دەیبەخشێت، کورت بڕی دەکات بەسەر ئەوەوە کە لە چنگیدایەن لەبەر ئەوەی کە ناز و نیعمەتی دونیا هیچ نیعمەتێکە وە خۆشگوزەرانی دونیا هیچ خۆشگوزەرانیەکە، بەڵکو ناز و نیعمەت و خۆشگوزەرانی ڕاستەقینە لە ڕۆژی دوایی دایە، خوای گەورەش بەمە فەرمانی پێ داوین و پێغەمبەرەکەشمان بەمە فەرمانی پێ داوین، پەیمانی لێ وەرگرتووین کە هەوڵی دونیامان جگە لە ڕەوانەوەی برسیەتی و پۆشینمان هیچی تر نەبێت، هیمەت و سەرقاڵی ئەویش لە ڕەزامەندی خوای گەورەی، و جیهادی دوژمن دایە کاتێك کە مەقۆقس ئەمانەی لێ بیست، بەوانەی دەوروبەری وت: ئایا هەرگیز لەم جۆرە قسانەتان بیستووە، من لە ڕووخساری ترسام، بەڵام قسەکانی لای من زۆر لە ڕووخسار مەترسیدارترە، ئەم پیاوە و هاوەڵەکانیشی خوای گەورە دەری هێناون بۆ تێکدانی سەر زەوی، ئەوەی کە من گومانی بۆ دەبەم پاشاکەیان کۆنترۆڵی تەواوی سەر زەوی دەکات، پاشان مەقۆقس لە عوبادە هاتە پێشێ و پێی وت: ئەی مەرد، گوێم لە وتەکانت بوو، ئەوەی کە من دەربارەی تۆ و هاوڕێکانت باسم کرد لە هەموو تەمەنمدا پێتان نەگەیشتووم مەگەر بەوەی کە باسم کرد، دەرنەکەوتوون بەسەر ئەوەی کە سەرکەوتوون بەسەریدا مەگەر بە خۆشەویستی و ئارەزوومەندیان بۆ دونیا بێت، ڕۆم کە لە هەژمار نایەن ڕوویان لە ئێمە ناوە بۆ جەنگی ئێوە، ئەوان میللەتێکن ناسراون بە جوامێری و بەهێزی لەوانەی کە باکیان نیە بە کەسێك یان بە بکوژێك، ئێمە دەزانین کە ئێوە سەر ناکەون بەسەریاندا، بە هۆی لاوازیتان و کەمیتان ناتوانن گەمارۆیان بدەن، ئێوە لەنێو چنگی ئێمە مانگێك ماونەتەوە، ئێوە لە ڕووی باری بژێوی و بارودۆختاندا لە تەنگەلانی و خراپیدان، ئێمە سەرکەوتووین بەسەرتاندا لەبەر کەمی و لاوازیتان و کەمی ئەوەی کە لە دەستتاندایە، ئێمە خۆمان بە چاك دەزانین ئەگەر لەگەڵتان ڕێك بکەوین و بەسەر ئێوەدا یەکی دوو دینار و بەسەر ئەمیرەکەتاندا دووسەد دینار و بەسەر خەلیفەکەشتاندا هەزار دینار فەرز بکەین، پاشان ئێوە ئەو پارەیەمان پێ دەدەن و دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان پێش ئەوەی کە سوپایەك کە هێزتان بەسەریدا نیە ڕاتان بماڵێت، پاش ئەوە عوبادەی کوڕی صامت(ﷺ) فەرمووی: ئەی کابرا، خۆت و یارانت بایی مەکە بەسەرماندا، بەڵام سەبارەت بە ڕۆم و ژمارە و زۆرییان کە ئێمەی پێ دەتۆقێنی، من خۆمان بەهێز ناکەم بەسەریاندا، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەمە شتێك نیە کە تۆ ئێمەی پێ دەترسێنی، شتێك نیە کە ئێمەی پێ بشکێنی لەوەی کە تیایدایین، ئەوەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن ئەگەر ڕاست بێت ئەوا من سوێند بە خوا زیاتر ئارەزووی جەنگیان دەکەم، توندترم بۆ سەرکەوتنم بەسەریاندا، لەبەر ئەوەی ئەمە بۆ ئێمە بە بەهانە ترە لای خوای گەورەمان ئەگەر لێی چووینە پێشەوە، ئەگەر کوژراین لە دواییمان ئەوە بۆ ئێمە جێ نشینترە لە ڕەزامەدنی و بەدەست هێنانی بەهەشتەکەی، نەك لە شتێك کە سەقامگیرتر بێت بۆ چاوانمان و لەوە بۆ ئێمە خۆشەویستتر نیە وە ئێمە لە ئێوە ئەو دەمە داوای یەکێك لەم دوو چاکەیە دەکەین، یان بەم غەنیمەتی دونیامان بۆ گەورە دەکەن ئەگەر سەرکەوتین بەسەرتاندا، یان غەنیمەتی دواڕۆژمان بۆ گەورە دەکەن ئەگەر سەرکەوتن بەسەرماندا، ئەمە خۆشەویسترین ئەو دوو سیفەتەیە بۆ ئێمە پاش

هەوڵدان لە ئێمەوە، خوای گەورە لە قورئاندا پێمانی فەرمووە: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ (البقرە: ٢٤٩).

پیاوێك لە نێو ئێمەدا نیە کە شەو و ڕۆژ لە خوا نەپاڕێتەوە کە شەهیدی پێ ببەخشێت و نەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی، و نەگەڕێتەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵەکەی، کەسێك نیە لە ئێمە کە پەرۆشی ئەوەی پاش خۆی بێت، هەر یەکێك لە ئێمە ماڵ و منداڵی سپاردۆتە خوای گەورەو پەرۆشی ئێمە ئەوەیە کە لە پێشمانەوەیە، سەبارەت بە وتەکەی تۆش: ئێمە لە ناڕەحەتی و تەنگەلانی بژێوی و هەلومەرجمان داین بەڵکو ئێمە لە باشترین خۆشی و بەختەوەری ژیان داین، ئەگەر دونیا هەمووی بۆ ئێمە بێت ئەوا لەوەی ئێستا ئێمەی تێدایە داوای زیاترمان نەدەکرد تۆش سەرنجی ئەوە بدە کە دەتەوێ، بۆمانی ڕوون بکەرەوە، لە نێوان ئێمە و ئێوەدا سیفەتێك نیە کە لە ئێوەی وەربگرین، بە یەکێك لەم سێ سیفەتە نەبێت وەلامتان نادەینەوە، کامیانت دەوێ هەڵی بژێرە، چاوی خۆت مەبڕە نارەزایی، ئەمیرەکەم بەمە فەرمانی پێ کردووم، ئەمە بەڵێنیێکی پێغەمبەر(ﷺ) بووە لە پێشتردا بۆ ئێمە: یان دێنە ژێر سایەی ئاینی ئیسلام کە خوای گەورە جگە لەو هیچ ئاینێکی تر پەسەند ناکات، کە ئەمەش ئاینی پێغەمبەران و نێردراوانیەتی، خوای گەورە فەرمانی پێداوین کە بجەنگین لە دژی هەر کەسێك کە سەرپێچی دەکات، دەست بەرداری بین هەتا دێتە ژێر سایەیەوە، ئەگەر ئەمەی کرد ئەوا ئەویش وەك ئێمە مافی هەیە و هەرچیەکمان لەسەر بوو لەسەر ئەویشە و ئەو دەمە دەبێتە برامان لە ئاینی خوداوە، ئەگەر تۆ و هاوڕێکانت ئەمە پەسەند بکەن، ئەوا بەختەوەری دونیا و دوارۆژ دەبن، ئێمە لە جەنگتان دەگەڕێینەوە وە ئەزیەت و ڕووبەڕووبوونەوەتان بە شیاو نازانین، ئەگەر ئەمەتان پێ پەسەند نەبوو دەبێ سەرانە بدەن، ئەوا بە دەستی خۆتان سەرانەمان پێ بدەن ، مامەڵەتان لەگەڵ دەکەین لەسەر شتێك کە ئێمە پێی قایل بین و ئەمە هەموو ساڵێك دووبارە دەبێتەوە هەتا ئێمەش و ئێوەش بمێنن، لەگەڵتان دەجەنگین دژی هەر کەسێك سەرپێچی بکات وە شتێك لە زەوی ماڵ و خوێنتان لەکەدار بکات، ئێمە لە بری ئێوە هەڵدەستین بەو کارە، ئەگەر ئێوە لە لایەنی ئێمەوە بەڵێنیتان پێ درا، بەمەش ئێوە پەیمانێکی خوداییتان لەسەرمانە، ئەگەر بەمە قایل نەبوون و سەرپێچیتان کرد ئەوا لە نێوان ئێمە و ئێوەدا جگە لە دارێك کە بە شمشێر بکرێت هەتا دواینمان دەمرێت یان ئەو بەشەی دەمانەوێت لێتان و دەیبەین و هیچی تر نیە لە نێوانماندا، ئەمە ئەو ئاینەی ئێمەیە کە پێی قەرزدرای خوداین، ئەوەی لە نێوانی ئێمە و ئێوەدایە بە هیچ شتێکی تر شایستە نابێت پاشان سەیری خۆتان بکەن، مەقۆقس وتی: ئەمە لەوەیە کە هەرگیز ناکرێت و نابێت، ئێوە هیچتان ناوێت جگە لەوەی، کە بمانکەنە بەندەی خۆتان و دونیاش وا نەبووە، دواتر عوبادە پێی فەرموو: چیت پێ باشە هەڵیبژێرە، مەقۆقس وتی: جگە لەم سێ سیفەتە بە هیچی تر وەلاممان نادەنەوە؟ عوبادەش دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی: نەخێر، سوێند بە خوای گەورەی ئاسمان و زەوی خوای هەموو شتێك، ئێوە هیچ سیفەتێکی ترتان لای ئێمە نیە لەبەر ئەوە شتێك هەڵبژێرن بۆ خۆتان، مەقۆقس لێرەدا لای

کردەوە بۆ هاوڕێکانی وتی: چی دەڵێن؟ ئەوانیش وتیان: ئایا کەس بەم سەرشۆڕییە قایل دەبێت؟ ئەوان دەیانەوێت بڕۆینە نێو ئاینەکەیانەوە، ئەمە هەرگیز نابێت، بە جۆرێـك ئێمـە واز لـە ئـاینی مەسیحی کوڕی مەریـەم بهێـنین و بڕۆینـە نێـو ئاینێکـەوە کـە بنـەماکانی شـارەزا نـین، لـەوەی کـە دەیانـەوێت سووکایەتیمان پێ بکەن هەتا هەتایە بمانکەنە بەندەی خۆیان، ئەوا مردن لەمە ئاسانترە، ئەگـەر قایـل بن بەوەی کە چەندین جار پێمان داون ئەوا بۆ ئێمە هێورترە، مەقۆقس بـە عوبـادەی وت: میللەتەکـەم قایل نابن و سەرپێچی داخوازیەکان دەکەن، تۆ پێت چۆنە؟ بگەڕێوە بۆ لای هاوڕێکەت لەسـەر ئـەوەی کە ئەمجارە چیتان بوێت دەتاندەینێ و دەڕۆن و لێمان دەگەڕێنن عوبادە و هاوڕێکانی هەستانە سەرپێ و مـەقۆقس بەوانەی دەوروبەری وت: لە گوێم بکەن و بە یەکێك لەو سیفەتە خوازراوەیـان وەڵام بدەنـەوە، سوێند بە خوا ئێوە وزە و توانای ئەوانتان لە دەستدا نیە، ئەگەر بە ملکەچیەوە وەڵامیـان نەدەینـەوە ئەوا بە جۆرێك وەڵامیان دەدەینەوە کە زۆر گەورەتر بێت زەبر و فشار، ئـەوانیش وتیـان: وەڵامـی کـام سیفەتەیان بدەینەوە؟ ئەویش وتی: کەواتە هەلتان پـێ دەدەم ئـەوەی کـە موسـڵمان بـن مـن فـەرمانی ئەمەتان پێ ناکەم، یان جەنگ وە من دەزانم کە ئێوە ناتوانن سەرکەون بەسەریاندا، بـە وێنـەی ئـەوان ئارامتان نابێت، بەڵام دەکرێت کە سێیەمیان پەسەند بکەن، ئەوانیش وتیان: یانی ئێمە ببینـە بەنـدەی ئەوان؟ مەقۆقس وتی: بەڵێ، ئێوە دەبنە بەندەیەکی دەسـەڵاتدار لـە وڵاتـی خۆتانـدا و پـارێزەر لەسـەر خۆتان و ماڵ و منداڵ و کەس و کارتان، ئەوانیش وتیان: مردن بۆ ئێمە لەمە باشترە، دواتر فەرمانیان دابە رووخاندنی پردەکانی نێو فستات و جەزیرە.[1]

لەم گفت و گۆیەی کە لە نێوان عوبادە و مەقۆقس بەرپا بوو، وریایی عوبادە و هەسـت کردنـی بـە مەبەست و نیازی بەرامبەری دەرکەوت کە هیچ کاریگەر نەبوو بەو شێوازانەی کـە مـەقۆقس بـەکاری هێنـا بـۆ کـارتێکردنی لـە ئاکـامی ئـەو گفتوگۆیانـە هـەروەك ئـەوەی کـە عوبـادەش لـە پێـشبینی ئامانجەکانیدا بە ڕوونی دەرکەوت، لە بڕینی ئەم قۆناغەدا ئەوەی لە یاد نەچوو کە بانگەواز بۆ ئیـسلام بکات و دەست بەرداری کەسانێك بێت کـە پەسـەندی ناکـەن، لێـرەدا ئـاوەڵابوونی موسـڵمانان بەسـەر کەسانی تروە لە گەلان و ئاینەکاندا دەردەکەوێت کە شوێنەوارێکی باشیان لـە نـاخی مـەقۆقس بـەجێ هێشت بە جۆرێك داوای ڕێك کەوتنی لەگەڵ موسڵمانان کرد.[2]

## دووەم: هونەرەکانی جەنگی لە ڕزگارکردنی میسردا

عەمری کوڕی عاص (ﷺ) لە ڕزگارکردنی میسردا چەندین هونەری جەنگی تاوتوێ کرد لەوانە:

### ١- جەنگی دەروونی:

کاتێك مەقۆقس فەرمانی دایە ئافرەتان کە لەسەر شوورەی بابلیۆن بۆ پێشوازی بە ڕوویاندا بوەستن تا ژوورەوە، و پیاوانی دانا کە بە چەکەوە بە ڕووی موسڵماناندا بوەستنەوە تا بەمە بیان تۆقێنن، عەمر

---

١ـ النجوم الزاهرة، ملوك كصر والقاهرة (ص: ١/ ١٠-١٦).
٢ـ الانصار في العصر الراشدي (ص: ٢١١).

نێردراوێکی نارد بۆ لای و فەرمووی:... ئێمە بینیمان کە تۆ چیت کرد، بە زۆریش کەس سەرنەکەوتووە بەسەرماندا، ئێمە دەستمان گەیشتە پادشاکەتان بە جۆرێك کە چاوەڕوانی نەبوو، مەقۆقس بە هاوڕێکانی وت: ئەوانە زۆر ڕاستگۆن، پادشاکەی ئێمەیان لە نێو لانەی مەملەکەتەکەی دەرهێنا تا بردیانە قوستەنتینیە کەواتە ئێمە لە پێشترین بە ملکەچ کردن؟[1] بە ڕاستی عەمری کوڕی عاص لەو سەرکردانە بوو کە خزمەتیان بە جەنگی دەروونی دەکرد وە ترساندنی دوژمن و پووچەڵ کردنەوەی گیانی جەنگ لە لای، لە جەنگدا پشتی دەبەست بە خوا پاشان بە عەقڵ و شمشێر بۆ بەدەست هێنانی یەك ئامانج کە ئەویش بریتیە لە سەرکەوتنی یەکلایی کەرەوە لە کۆتایی جەنگەکەدا.[2]

## ٢- ڕەفتاری کتوپڕی بە بۆسەکان:

عەمر لە جەنگی عەین شەمس شێوازی کت و پڕی و لە ناکاوی بە بۆسەکان تاوتوێ کرد، ئەم بۆسانەی بە شێوەیەکی تۆکمە ئامادە کرد بە جۆرێك ڕێگەی سەرکەوتنی تەواوی بۆ ئاسان کرد وناردی بۆ گرتنی شوێنە دیاری کراوەکان لە شەودا، هەڵبژاردنی ئەم شوێنانەی زۆر باش بوون، چەندین کاتی دەرچوونی ئەو هێزانەی دەست نیشان کرد کە هەر یەکەیان لە ساتێکدا بوو کە دوژمن تیایدا سەرقاڵ بوو بە بەرە لێگرتنی ، ئەم بۆسانە لە لای ڕاست و چەپەوە بە شێوەیەکی کت و پڕی بۆیان دەرپەڕین، بەمەش کە هەڵبژاردنی کاتەکان بوو کارێکی باشی کرد، کە سەعاتی سفر و ڕووبەڕووبوونەوە بوو لەگەڵ دوژمندا، بەم شێوەیە کردەی عەمر لە (کاری کت و پڕی بە بۆسەکان) لەم جەنگەدا لە زۆرترین کردە لە ناکاویە سەرکەتوو و دڵسۆزەکان بوو.[3]

## ٣- ڕەفتاری لە ناکاو لە کاتی گەمارۆکەدا:

عەمر هەروەها ڕەفتاری کت و پڕ و لە ناکاوی لە کاتی قەڵای بابلیۆن بەکار هێنا لە کاتێکدا کە ڕۆمەکان گەمارۆ درابوون لەو قەڵایە و دڵنیا بوون کە موسڵمانان ناتوانن تۆڵەیان لێ بکەنەوە، بەهۆی چاکی قەڵا و شورەکەیان و ئەوەی کە هەیانە لە کەل و پەل و پێداویستی و کۆمەکی و کەرەستەی جەنگی، بەهۆی ئەو کۆسپانەی کە لە تەلی دڕکاوی لەسەر دەرگاکانی قەڵاکە و لەو خەندەقەدا دایان نابوو کە ئاوەکەی بە هۆی دابەزینی ئاوی ڕووباری نیل وشکی کرد بەجۆرێ کە لە شەوێکی تاریکدا زوبێری کوڕی عەوام و دەستەیەك لە پیاوانی شورشگێڕ لە ناکاو دایان بەسەریاندا، هەر بە زویی بە شورەکەیاندا سەرکەوتن،لەناکاو شمشێرەکانیان بۆ خستنە کار، ئەو بەرگریکارانەی کە لە قەڵاکەدا بوون تێکشکان و داوای ڕێککەوتن و ژیان پارێزراویان کرد، موسوڵمانان بەسەرکەوتویی چونەنێو قەڵاکەوە.[4]

---

١ـ الحرب النفسية، الدكتور أحمد نوفل (ص: ١٧٤).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٧٤).
٣ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٣٢٠).
٤ـ الفن العسكري الاسلامي (ص: ٣٢٠).

## ٤- ڕەفتاری نەفەس درێژی لە گەمارۆکەدا:

عەمر لە گەمارۆکانی ناوچەی کریون و ئەسکەندەریە پشتی بە ڕەفتاری نەفەس درێژی بەست، کاتێك، کە دڵنیا بوو لە دژواری سەرکەوتن بەسەر ئەو ڕۆمانەی شوێنی خۆیان توند و تۆڵ کردبوو لە پێگە نەبەز و قەڵاکانی کریوندا، دەستی کردە پەلامار دانیان وەك هەوڵێك، بۆ یەکەمین جار- هێرشێکی کردە سەر قەڵاکە، بەڵام سەرکەوتو نەبوو، دواتر بەردەوام بوو لە پەلاماردان لێگەرا کات و سەردەم و ماندوو بوون و تەاوبوونی پێداویستەیەکان و کۆمەکیەکان و ئارامی پیاوان کە کاری خۆی بکات، هەر بەم شێویە بوو، هەر بەوەی کە گەمارۆی کریون چەند مانگێك بەردەوام بوو تا ئەوەی کە ڕۆمەکان دڵنیا بوون لە سووربوونی موسڵمانان لەسەر بەردەوامی بەم گەمارۆیە هیچیان نەدێتەوە باشتر لە خۆ بەدەستەوەدان و بە دەستەوەدانی قەڵاکە بۆ هێرش بەران، ئەمە یەکی گرتەوە لە گەمارۆی ئەسکەندەریەدا، جگە لەوەی ئەم گەمارۆیەیان ماوەیەکی درێژتر (سێ مانگ)ی خایاندا، ئەویش لەبەر ئەوەی کە ڕۆمەکان بە تەواوی هەستیان کرد کە ئەمە دوایین هەلە بۆ سوپاکەیان و بۆ هەموویان، ئەگەر لە ئەسکەندەریە بڕوخێن ئەوا بە تەواوی میسر و کیشوەری ڕەش دەشکێن، ئەمەش ڕوویدا.[1]

## سێیەم: مزگێنی ئازاد کردن بۆ ئەمیری باوەڕداران:

عەمری کوڕی عاص، موعاویەی کوڕی حەویجی وەك شاندێك نارد بۆ لای عومەرو مزگێنی پێدا بە ئازاد کردن و موعاویە پێی فەرموو: ئایا لەگەڵم نانووسی؟ عەمریش پێی فەرموو: من چی بکەم لە نووسین؟ ئایا تۆ پیاوێکی عەرەب نیت کە پەیامەکە دەگەیەنێت، ئەی ئەگەر مەرگ ڕێگەی پێ گرتم.[2] کاتێك چوویە لای عومەر و هەواڵی ئازاد کردنی ئەسکەندەریەی پێدا، عومەر بە شانازیەوە سوژدەی برد و فەرمووی: سوپاس بۆ خودا، لە موعاویەی کوڕی حەویج دەگەڕێین کە چیرۆکی گەیاندنی مزگێنی ئازاد کردنەکەمان بۆ عومەر بگێڕێتەوە، موعاویە دەفەرمووێت: کاتێك کە عەمری کوڕی عاص ناردمی بۆ لای عومەر گەشتمە مزگەوت و کاتێك لەوێ دانیشتبووم یەکێك لە خزمەتچیەکانی عومەر لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە، بینیمی کە شڵەژاوم و ڕەنگی سەفەرم پێوەیە، هات بۆ لام، پێی وتم: تۆ کێیت؟ موعاویەی کوڕی حەویجم، نێردراوی عەمری کوڕی عاص، ئەو لە من دەرکەوتەوە و گەرایەوە بۆ لام و منیش جار لە دوای جار زیاتر گوێم لە خشەخشی جلوبەرگی پێیەکانی دەبوو هەتا لێم نزیك بوویەوە و وتی: هەستە ئەمیری باوەڕداران بانگت دەکات، من شوێنی کەوتم وە کاتێك کە چوومە ژوورەوە بینیم عومەر بە یەکێك لە دەستەکانی عەباکەی دەداتە دەستەکەی تری وە جلەکانی بە یەکێکی تر توند و تۆڵ دەکاتەوە، فەرمووی: چیت پێیە؟ منیش وتم: باشە ئەی ئەمیری باوەڕداران، خوای گەورە ئەسکەندەریەی بۆ ئازاد کردین پاشان لەگەڵم هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت و بە بانگ بێژی فەرموو: بانگ بدە، تا خەڵکی بێن بۆ نوێژ دواتر خەڵکەکە کۆبوونەوە، پاشان پێی فەرمووم: هەستە هەواڵ بدە هاوڕێکانت منیش هەستام و هەواڵەکەم پێدان، ئینجا نوێژی کرد و گەرایەوە ماڵەکەی،

---

١- الفن العسكري الاسلامي (ص: ٣٢٠).
٢- فتوح مصر والمغرب (ص: ١٠٤، ١٠٥).

ڕووی کردە قیبلە، چەند نزایەکی کرد، دواتر دانیشت و فەرمووی بە خزمەتکارەکەی: ئایا هیچ خواردنێك هەیە؟ ئەویش نان و زەیتەکەی هێنا بۆی عومەر فەرمووی: بخۆ منیش بە شەرمەوە دەستم کردە خواردن، پاشان فەرمووی: بیخۆ ڕێبوار حەز بە نان خواردن دەکات ئەگەر من بمخواردایە ئەوا لەگەڵ تۆ نانم دەخوارد و ئەو شەرمەم دەپێکا، لە دوای ئەوانە فەرمووی: ئەی موعاویە کاتێك کە هاتیتە مزگەوت چیت وت؟ منیش وتم: ڕەنگە ئەمیری باوەڕداران — خەوی قەیلولەی — کردبێت — ئەویش فەرمووی: خراپت وتووە و گومانی خراپت بردووە، ئەگەر بە ڕۆژ بخەوم کاری خەڵکەکەم لە دەست دەدەم و ئەگەر بە شەویش بخەوم کاری خۆم لە دەست دەدەم، کەواتە خەو چۆنە لەگەڵ ئەم دوو هەل و مەرجەدا ئەی موعاویە؟[1]

لەم هەواڵەوە ئەوەمان دەست دەکەوێت کە مزگەوت لە سەردەمی یەکەمی ئیسلامدا وەك گرنگترین هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەکارهاتووە بە جۆرێك کە موسڵمانان تیایدا بە هاواری نوێژی بە کۆمەڵ کۆبوونەتەوە، ئەم بانگ کردنەش مانای ئەوەیە کە کارێکی گرنگ هەیە دەکرێت بگەیەنرێتە گوێی هەموو موسڵمانان، هەر کە کۆدەبوونەوە چەندین هەواڵی سەربازی و کاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و چەند شتێکی تریان پێ دەگەیشت، هەروەها لەم هەواڵەدا سوود لە چۆنیەتی ژیانی عومەر (ﷺ) دەبینین کە خەلیفەی موسڵمانانە و بە موعاویەی کوڕی حەدیج دەفەرمووێت: ئەگەر بەڕۆژ بنووم خەڵکەکە لەدەست دەدەم و ئەگەر بە شەو بنووم خۆم لەدەست دەدەم، ئەی کەواتە خەو لەگەڵ ئەم دوو هەلومەرجەدا چۆنە ئەی موعاویە؟ ئەمەش دەلالەت دەکاتە سەر تەواوی بێداری بۆ مافی خود و مافی کەسانی تر، ئەگەر موسڵمان توانی خۆی لە نێوان ئەم هەموو لەبەر چاو گرتنەدا کۆبکاتەوە ئەوا ئەو کەسە لە چاکەخوازە لە خوا ترسەکان دەبێت.[2]

## چوارەم: سوور بوونی عومەری فاروق لەسەر پەیمان پارێزی:

إبن الاثیر باس لەوە دەکات کە... موسڵمانان کاتێك گەیشتنە بلهیب سەبایاکانیان گەیشتە یەمەن، خاوەنەکەیان نێردراوێکی نارد بۆ لای عەمری کوڕی عاص وتی: من سەرانەم داوەتە کەسانێك کە لە ئێوە ڕق و کینەدارتر بوون بۆ من کە ئەوانیش فارس و ڕۆمن، ئەگەر پێت خۆشە سەرانەت پێ بدەم پێت دەدەم بە مەرجێك زەوی و زارەکانم کە بەدەست کەوت بردووتە بۆمی بگێڕیتەوە. عەمر نامەیەکی بۆ عومەر نووسی و لەم بارەیەوە داوای مۆڵەتی کرد، جەنگیان ڕاگرت تا وەڵامی نامەکەی لای عومەر دێتەوە، لە وەڵامی عومەردا هاتووە کە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە سەرانەیەکی ڕەسێنراو بۆ ئێمە خۆشترە لە غەنیمەتێك کە دابەش دەکرێ وەك ئەوەی کە نەبووە، بەڵام سەبایەکان ئەگەر پادشاکەیان سەرانەی دابێت لەسەر ئەوەی کە ئەوانەی لای ئێوەن سەرپشك بکرێن لە نێوان ئیسلام و ئاینی مللەتەکەیان وە هەر کەس ئاینی ئیسلامی هەڵبژارد ئەوا لە موسڵمانانە و هەر کەسیش ئاینی میللەتەکەی هەڵبژارد ئەوا سەرانەی بخەسەر، ئەوانەی کە پەرش و بڵاو بوونەتوە بە نێو

---

١ـ فتوح مصر والمغرب(ص: ١٠٥)،فتح مصر بين الرؤية الاسلامية والرؤية النصرانية، د.إبراهيم المتناوي(ص: ١١٤).
٢ـ التأريخ الاسلامي للحميدي (١١، ١٢/٣٤٨-٣٤٩).

ولاتانی تردا ئەوا ئێمە ناتوانین بیانگێڕینەوە دواتر عەمر ئەمەی خستە بەردەم خاوەنی ئەسکەندەریە، ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە کە تەواوی سەبایەکانیان کۆکردەوە، گاورەکانیش کۆبوونەوە و یەك بەیەك سەرپشك کران، هەر موسڵمانانی هەڵدەبژارد(الله اکبر)یان دەکرد، هەر کەس ئاینی گاوری هەڵدەبژارد سەرانەیان لەسەر دادەنان، تا لێ بوونەوە.[1]

ئەمە بە شایەدێکی ڕاستگۆ دادەنرێت لەسەر ئەوەی کە هاوەڵانی (خوایان لێ ڕازی بێت) لەسەر بووە، لە نامۆیی لە دونیا بە دەمەوەچوونی دواڕۆژ، و ئاەرزوومەندی ڕاستگۆیانە لە ڕێنموونی زانایان بۆ ئیسلام، چونکە بەندیەکان کە دێنە ژێر سایەی ئاینی ئیسلام لە دونیا سوودێك بە موسڵمانان دەگەیەنن، مانەوەیان لەسەر ئاینی خۆیان دەڕواتە چوارچێوەی سوودە دونیاییەکان بۆیان بە جۆرێك پابەند دەبن بە دانی سەرانە بە موسڵمانان، لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە ئەوەی بەدی دەکەین کە عومەر(ﷺ) فەرمان دەدات بە سەرپشك کردنی بەندیەکان لە نێوان موسڵمان بوون یان سەرانە، کاتێ کە بەجێ هێنانی ئەم کارە تەواو بوو یاران و ئەوانەش کە لەگەڵیان دابوون بە جۆرێك (الله اکبر)یان دەکرد کە بەتینتر بوو لە (الله اکبر)ی جەنگە ڕزگاریخوازەکان کاتێ ئەو گاورانە ئاینی ئیسلامیان هەڵدەبژارد و خەشم و قین دەیگرتن بە توندی کاتێك کە دەیان بینی سەباياکان لەسەر ئاینی خۆیان دەمێننەوە تەنانەت وای لێهات کە ئەو بەندیانە وەك ئەوە وابوون کە لە گروهی موسڵمانان بوون و وازیان لە ئاینی ئیسلام هێناوە، ئەوەی کە لەم هەواڵەدا جێگەی ئاوڕ دانەوەیە ئەوەیە یاران سوور بوون لەسەر خولقاندنی وەفا و ئەمەش لەو وتەیەی عومەر(ﷺ) ڕوون دەبێتەوە کە لە نووسراوەکەیدا هاتووە: بەڵام ئەوانەی بە ولاتانی تردا بڵاو بوونەتەوە ئێمە توانای گەڕاندنەوەیانمان نیە وە لە ڕیوایەتێکی تر دا هاتووە کە... پێمان خۆش نیە لەسەر کارێك لەگەڵیدا ڕێك بکەوین کە ئەو هیچ بەرپەرچدانەوەیەکی بۆ نیە،[2] پاشان عومەر(ﷺ) پێش مۆرکردنی هەر ڕێك کەوتنێك لەگەڵ دوژمنانیدا سەیری پەیمان پارێزی دەکات، ئەم ڕەفتارەش بە قۆناغێکی بەرز لە وەفا دادەنرێت، کە بریتیە لە ڕەفتاری سەرکەوتن— لەبەر ئەوەی هەر کەسێك ڕێك کەوتنێك بە ئیمزا بگەیەنێت لەسەر کارێك و نەتوانێت وەفای بۆی هەبێت ئەوا بەهانەی هەیە، بەڵام کاتێك کە بیر دەکاتەوە و کار بە یەدەکە پێویستیەکان دەکات، بۆ بابەتی پەیمان پارێزی هەتا پاش ئەوە خۆی نەبینێتەوە کە پەك کەوتنە لە وەفا، ئەمە کۆتایی هاتنی کارسازیە، و لووتکەی ڕووانینی ڕووناکی دەرە.[3]

## پێنجەم: عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص (ﷺ):

عەمر بە سوپایەکەوە بەرەو ئەسکەندەریە بەڕێ کەوت، لە ڕێگەیدا بۆ ئەوێ لە نێوانی و نێوان دانیشتوانی ئەو ولاتانەدا کە پێیدا تێدەپەڕێت ڕووبەڕووی چەندین جەنگ بوویەوە کە سەرکەوتن تیایدا هاوپەیمانی موسڵمانان بوو، لەو هەڵوێستانەی کە لێرەدا باسی لێوە دەکرێت ئەوەیە کە عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص لە شەڕەکەیدا لە دژی خەڵکی کریۆن دووچاری برینگەلێکی زۆر بوو کاتێك

١ـ الكامل في التأريخ (٢/١٧٧).
٢ـ التأريخ الاسلامي للحميدي (١٢/٣٥١).
٣ـ التأريخ الاسلامي للحميدي (١٢/٣٥١).

کە باوکی نێردراوێکی نارد بۆ لای کە پرسیاری برینەکانی لێ بکات عبدللە فەرمووی:

أقول إذا ماجاشت النفس إحبري فعما قليل نحمدي أو تلامي

پاشان نێردراوەکەی عەمر گەڕایەوە بۆ لای و ئەوەی عبداللە پێی فەرموو پێی وت، عەمریش فەرمووی: بە ڕاستی ئەمە کوڕی منە،[1] ئەمەش هەڵوێستێکە لە هەوڵوێستەکانی ئارامی و خۆگرتن، باس لەوە دەکرێت کە عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص(ﷺ)ناسراوە بەکەسێکی خاوەن زانیاری و پەرستش و لەگەڵ ئەمەشدا جوامێری و ئارامگری لەسەر دژواریەکان لە خۆیدا کۆکردبوویەوە.[2]

## شەشەم: لە میسر خانوویەك بۆ ئەمیری باوەڕداران بنیات نرا:

عەمری کوڕی عاص هەواڵی نارد بۆ عومەرکە: ئێمە لە لای مزگەوتی گەورە نەخشەی خانوویەکمان بۆ تۆ داڕشتووە، عومەریش لە وەڵامدا فەرموویەتی: چۆن دەکرێك پیاوێك لە حیجاز بێت و لە میسر خانوویەکی هەبێت؟! پاشان فەرمانی دا بە عەمر کە بیکاتە بازێڕێك بۆ موسڵمانان.[3]

بە ڕاستی ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەواوی خواناسی عومەر(ﷺ) و ئاینگەرێتی لە ڕووکارەکانی ژیانی دونیادا، ئەگەر گەورە پیاوان و سەرکردەکان ئەو کەسانە بن کە خۆیان بەرز ڕادەگرن لە قوڕ و چڵپاوی دونیا، و چێژە فەوتاوەکان، ئەوا لەسەر ئەوانەی دەوروبەریان لە دەروازەی یەکەم پێویستە خۆیان لەمە بەرز ڕاگرن.[4]

## حەوتەم: سکاڵای سووتانی کتێبخانەی ئەسکەندەریە لە دژی موسڵمانان:

دکتۆر عبدالرحیم محمد عبدالحمید دەڵێت: ئێمە ڕێمان نەکەوتووە لە دەقێك یان ئاماژە پێ کردنێك سەبارەت بەوەی کە عەمری کوڕی عاص کتێبخانەی ئەسکەندەریەی سووتاندبێت، ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە لەم کارەدا ئەوەیە ئێمە دەقێکی (إبن القضطي)مان خوێندۆتەوە کە إبن العبری (٦٨٥ك، ١٢٨٦ز) دەڵێت: لە نێو ئیسلامیەکاندا وا باوە کە یەحیای نەحوی کە پیاوێکی خەڵکی ئەسکەندەریە بووە، لەوێ ژیانی بەسەر بردووە تا عەمر شاری ئەسکەندەریەی ڕزگار کردووە، پاشان ئەم پیاوە هاتووە بۆ لای عەمر ئەویش پلە و پایەی لە زانستدا زانیوە و ڕێزی لێ گرتووە و لە وتەکانیدا گوێی لە چەند وتەیەکی فەلسەفی بووە کە هیچ هاودەمێکی وەك ئەویان نەبووە، ئێمە (إبن القضطي) (٦٤٦ك،١٢٧٦ز) دەبینین ئەم چیرۆکە تەواو دەکات و دەڵێت: عەمر پێی فەرموو: تۆ چیت دەوێ بۆ ئەم کارە؟ ئەویش وتی: کتێبەکانی ژیری و ڕێنموونی کە لە گەنجینەی پادشایەتیدان... سەد وپەنجا و چوار هەزار کتێبە، عەمر زیاتر بە دوای ئەوەدا ڕۆیشت کە یەحیا وتی و فەرمووی: من ئەگەر پاش مۆڵەتی ئەمیری باوەڕداران کارێ بکەم ئەگینا ناتوانم هیچ فەرمانێك ڕابگەیەنم، بۆیە لەم بارەیەوە نامەیەکی بۆ عومەر نووسی، قسەکانی یەحیای پێ ڕاگەیاند، لە نووسراوەکەی عومەردا هاتووە کە

---

١ـ فتوح مصر(ص: ٥٧).
٢ـ التأريخ الاسلامي للحميدي(١٢/٣٣٠).
٣ـ فتوح مصر(ص: ٦٩).
٤ـ التأريخ الاسلامي للحميدي (١٢/٣٥٦).

دەفەرمووێت: سەبارەت بەو کتێبانەی کە باست کردن ئەگەر تێیاندا هەیە هاودەنگی قورئان بێت وە وا لە قورئاندا لێی بێ نیاز بە، ئەگەر تێیاندا هەیە ناتەبایی و ناجۆر بێت بە قورئان ئەوا ئێمە هیچ پێویستیەکمان پێیان نیە، دەست بکە بە لەناوبردنیان، بۆیە عەمری کوڕی عاص هەستا بە دابەش کردنی ئەو کتێبانە بەسەر گەرماوەکانی ئەسکەندەریەدا و سووتاندنیان لە توون و ئاگردانەکاندا، ئەو دەمە هەندێ لە حەمامچیەکان باسی ئەوەیان بۆ کردم ئەوانە بۆ ماوەی شەش مانگ سوودیان لە سووتاندنی ئەو کتێبانە وەرگرتووە بە گوێی خۆت بیبیستە کەچی ڕوویداوە سەرت سوور دەمێنێت.[1]

جگە لەمەش ئەم چیرۆکی کتێب سووتاندنە پێش (إبن القـفطي)و پێش إبن العبری باسی لێوە کراوە، ئەوە عبداللطیف البغدادي(٦٤٩ك، ١٢٣١ز) هێناویەتی دەڵێت: ئەوە ئەو یانەی زانستیەیە کە ئەسکەندەر لە کاتی بنیاتنانی شارەکەدا بنیاتی ناوە کە تیایدا ئەو گەنجینەی کتێبەی تێدا بووە عەمری کوڕی عاص بە مۆڵەتی عومەر(ﷺ) سووتاندوویەتی،[2] وە لە کاتی تاوتوێ کردنی ئەم گێڕانەوانەدا ئێمە دەبینین کە پێویستە ئەم تێبینیانە ڕەچاو بکرێت:

١- هیچ پەیوەندیەك لە نێوان ئەم سێ گێڕانەوەیەدا نیە، هیچ پەیوەندیەك لە گواستنەوەی مێژوویدا نیە کە ئەوانەی دایان ناوە لە سەردەمێکی لێك نزیك لەیەك ژیاون.

٢- هیچ پاڵپشتیەك نیە کە ئەم گێڕانەوانەی بۆ بگێڕدریتەوە بەڵکو ئەمە کۆمەڵە سەپاندنێکن کە خاوەنەکانیان سەپاندوونیان.

٣- ئەمە پاش ماوەیەکی دوور و درێژ لە سەردەمی ڕزگار کردنی میسر و عەمری کوڕی عاص دۆزراونەتەوە، بە هەموو متمانەیەکەوە دەتوانین بڵێین کە ئەم چیرۆکە زۆر بە ڕوونی جیاوازە و دەکرێ لەم لایەنانەوە تانەی تێدا بێت:

- چیرۆکی ئەم سووتاندنی کتێبانەی ئەسکەندەریە باسی ئەوەی نەکردووە کە کێ مێژووی بۆ وڵاتی میسر و مێژووەکەی داناوە لەوەی پێشتر ژیاوە لەوانەی، کە باسی ئەم چیرۆکەیان کردووە پێش چەند سەدەیەك.

- هیچ کام لە واقدی و (طبري) باسی ئەم چیرۆکەیان نەکردووە و (إبن الاثیر)یش هاوڕا و هاودەنگ نەبووە لەگەڵیدا، هەروەها إبن خەلدونیش باسی نەکردووە سەرباری ئەوەش إبن عبدالحکم لەو بارەیەوە هیچی نەوتووە، یاقووتی حەمەویش لە وەسفی ئەسکەندەریە باسی ئەمەی نەکردووە.

- دەکرێت ئەم چیرۆکە بگەڕێنرێتەوە بۆ ماوەی جەنگی خاچپەرستەکان، لە لایەنی ئەلبەغدادیەوە وە ڕەنگە لە ژێر فشارێکی دیاری کراودا داینابێت وە یان پاش ئەوە هەڵی وەشاندبێتەوە.

- ئەگەر ئەم کتێبخانەیەت دێتەوە بەچاوتێبڕاوی دەکرێت بوترێت:ئەو ڕۆمانەی کە ئەسکەندەریەیان بەجێ هێشت لەتوانایاندا بووە لەگەڵ خۆیان دەری بکەن، یان ڕەنگە ئەو کارەیان کردبێت.

- عەمر لە توانایدا بوو کە ئەو کتێبخانەیە لە ماوەیەکی کەمدا فڕێ بداتە ئاوی دەریاوە لە بری ئەوەی کە سووتاندنی شەش مانگ بخایەنێت، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو مەبەستە لە ڕازاندنەوە و

---

١ـ عمر بن العاص القائد والسیاسي (ص: ١٣٣).

٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ١٣٤).

داڕشتنی ئەو چیرۆکە، دەکرێت بەبێ ترس بڵێین: بە ڕاستی عومەر و عەمری کوڕی عاص (خوایان لێ ڕازی بێت) پاکن لەوەی کە لەم چیرۆکە دروستکراوەدا ددراوەتە پاڵیان و ئەمەش لە وڕێنەکانی ئەو کەسانەیە کە حەزیان بە مەترسی خستنەوە بووە وە ئێوە وەرن بیر لە شتێك بکەنەوە کە نەبوویێت.[1]

## هەشتەم: بە یەك گەیشتنی عەمری کوڕی عاص و پاپا بنیامین:

إبن عبدالحکمی مێژوونووس دەڵێت: ئەسقەفی قیبتیەکان کە پێیان دەوت بنیامین لە ئەسکەندەریە بوو، لە ناوچە دەشتاییەکان هەڵهاتبوو بە هۆی ئەو چەوسانەوە مەزهەبیەی کە قیبتیەکان لەسەر دەستی ڕۆمانە مەسیحیەکان دووچاری بووبوون وە کاتێك کە عەمری کوڕی عاص گەیشتە میسر، نامەیەکی بۆ قیبتیەکان نوسی و ئاگاداری کردنەوە کە ڕۆمەکان هیچ دەوڵەتێکیان نیە، پادشاکەیان نائومێد بووە، فەرمانیان دەداتێ بە بینینی عەمر، دەڵێن ئەو قیبتیانە کە ئەو دەمە لە فەرما بوون بۆ عەمر بوونەتە هاوکارێك،[2] لە گێڕانەوەیەکی ساوریس کوڕی موقەنەعی مێژوونووسی قیبتیەکاندا هاتووە کە ئەو دەمە سانۆیتۆس یەکێك لە سەرکردەکانی قیبتی بووە، لە ماوەی دیار نەمانی بنیامیندا سەرپەرشتی کاروباری کەنیسەی کردووە، پاشان چیرۆکی ئەم پیاوە شۆڕشگێڕە کە بنیامینە دەگێڕنەوە بۆ عەمر، کە چۆن لە ترسی ڕۆمەکان هەڵهاتووە، بەم هۆیەوە عەمر نامەیەك دەنووسێت بۆ کاربەدەستانی میسرو تیایدا دەفەرمووێت ئەو شوێنەی، کە بنیامینی بەتریارکی گەورە گاورە قیبتیەکانی تێدایە پەیمان و بەڵێن و پارێزراوی سەلامەتی لەخوداوە بۆ ئەو لێیە، پاشان بەپارێزراوی و دڵنیاییەوە ئامادە بێت و هەلومەرجی بەیعەت و سیاسەتی هۆزەکەی چارەسەر بکات، کاتێك کە بنیامین ئەمەی بیست پاش ون بوونێکی(١٣)ساڵی بە خۆشیەکی گەورەوە گەڕایەوە بۆ ئەسکەندەریە، کاتێك دەرکەوت تەواوی میللەت و تەواوی شار بە هاتنەوەی خۆشحاڵ بوون ،عەمر بە گەیشتنەوەی زانی فەرمانی دا بە ڕێز و سەرفرازی و خۆشەویستیەوە بیهێنن بۆ لای، کاتێك عەمر بینی ڕێزی لێنا و فەرمووی بە هاوڕێکانی: لە تەواوی ئەو گوندانەی کە تا ئێستا بە دەستامان هێناون هیچ پیاوێکم بە وێنەی ئەم کابرایە نەبینیووە وە بنیامین پیاوێك بوو زۆر ڕووکاری جوان و شیرین بووە، قسە خۆش و هێمن و بەڕێز بووە، پاشان عەمر ئاوڕی بۆ دایەوە و پێی فەرموو: هەموو پیاوەکانت ڕێك بخەوە و هەلومەرجیان ساز بکە، زۆر بە ڕێز و دڵ فراوانیەوە لای عەمر ڕۆیشت، مامۆستا ئەلشەرقاوی لەسەر ئەم دیدار و بەیەك گەیشتنە دێتە دوان و دەڵێت: بەتریارك بنیامین هێندە لە عەمر نزیك بوویەوە هەتا بوویە یەکێك لە ئازیزترین دۆستەکانی، عەرەبە ڕزگاریخوازەکان لە میسر لە خۆیان دڵنیا بوون، عەمری ئەمیریان لە مزگەوتی فستات یەکەمین وتاری نوێژی هەینی پێ ڕاگەیاندن و فەرمووی:... ئامۆژگاری ئەو قیبتیانە بکەن کە دراوسێتانن، چونکە بۆ ئێوە لەوان بەڵێن پێدان و خزمایەتی هەیە، دەست بەرداریان مەبن، بە داوێن پاکی خۆتان ڕابگرن و چاوی خۆتان بپۆشن و بیپارێزن لە تاوان.[3]

---

١ـ عمر بن العاص القائد والسياسي (ص: ١٣٤).
٢ـ فتوح مصر وأخبارها(ص: ٧٣-٧٤).
٣ـ الفاروق (ص: ٢٤٧).

# دوانگەی چوارەم

## گرنگترین وانە و پەند و قازانجەکان لەجەنگە ڕزگاریخوازەکانی فاروقدا

### یەکەم: سروشتی ڕزگاریخوازی ئیسلامی:

هەندێ لە مێژوونووسانی گاور و ڕۆژهەڵاتی هەوڵی ئەوەیان داوە کە ڕووی ڕاستەقینەی جەنگە ڕزگاریخوازە ئیسلامیەکان لەسەردەمی ڕاشیدیندا بشێوێنن، وایان نیشان داوە کە ئەو ڕزگار کردنانە شەڕێکی ئاینین و وتوویانە: موسڵمانانی خاوەن بیروباوەڕن، بەلام نەتەوە پەرستیەکی بێ سنوور پاراونەتەوە، خەڵکانێکیان ملکەچ کردووە بۆ بنەما ئاینیەکانیان بە زۆری زۆرداری و ناچار کردن، بۆ ئەم مەبەستەش دەریای خوێن ڕێژی و دڵ ڕەقیان گرتۆتە بەر، ئەوان بە دەستێکیان قورئان و بە دەستەکەی تریان شمشێریان هەڵگرتووە،[1] وە لە ڕیزبەندی ئەوانەی کە تەرکیزیان لەسەر ئەم بیر و بۆچوونە کردۆتەوە (سیدیۆ) و (میور) و (فیبور) هەن، کە (میور) لە (فیبور)ەوە هێناویەتی دەڵێت: زۆر پێویست بوو بۆ بەردەوامی ئیسلام لە وتارە دوژمنکاریەکەیدا کە سزای شمشێر بەکاربهێنێت بەوەی کە مەبەستیەتی لەوەی کە خەڵکی بە تەواوی بچنە ژێر سایەی ئیسلام، یان لای کەم دەسەڵاتی جیهانی خۆی بەرفراوان بکات، جگە لەوەش بۆ هیچ دیانەتێك نیە کە لە یەکێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا شوێنکەوتەکانی بۆ جەنگێك ڕێك بخات، لە ئیسلامیشدا هەر بەم شێوەیە، بەڵام وا دەردەکەوێت کە موسڵمانان بەهێز ئامانجیان بۆ بانگەواز بەکار هێناوە، یان ئەوان زیاتر لە کەسانی تر شەڕفرۆش بوون، وای دەرخستووە کە نکۆڵیەکەی نکۆڵیەکی تەواوە،[2] وە هەندێ لە ڕۆژهەڵاتیەکان بەرپەرچی ئەم قۆناغەیان داوەتەوە و ئازادیخوازە ئیسلامیەکان بە نموونەیەکی بەرز و ڕەوشتێکی گەورە پێناسە کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) کوشتنی پیاوە ئاینیەکان و ئافرەتان و منداڵان و پەککەوتەکانی لێ قەدەغە کردوون، لە هەمان کاتدا وێران کردنی کێڵگەکان و بڕینەوەی دار و درەختەکانی لێ قەدەغە کردوون،[3] موسڵمانانیش لە جەنگەکانیاندا زۆر بە وردی شوێنی ئەم فەرمانانە کەوتوون، ئەوان شوێنە پیرۆزەکانیان وێران نەکردووە و زەوی و زارە کشتوکاڵیەکانیان نەشێواندووە، لە کاتێکدا ڕۆمەکان تیری

---

١ـ تأريخ العرب العام، سيديو (ص: ١٣٣).

٢ـ فتح مصر بين الرؤية الاسلامية والرؤية النصرانية (ص: ١٢٦).

٣ـ الرسول (ﷺ) لا يحرم من تلقاء نفسه بل بالوحي الإلهي.

ژەهراویان ئاراستە کردوون، ئەوان ئاڵوگۆڕی تاوانیان بە تاوان لەگەڵ دوژمنەکانیان نەکردووە، بە ڕاستی وێران کردنی گوندەکان و سوتاندنیان ڕۆمەکان لە کاتی پێشڕەوی و پاشەکشەیاندا کاریان لەسەر کردووە، بەڵام موسڵمانان پارێزگاریان لە ڕەوشتی بەرزیان کردووە و هیچیان لەمەدا نەگۆڕیووە،[1] هەروەها روزنتاك دەڵێت شارستانیەتی ئیسلامی بە بەرفراوانی گەشەی کرد نەك بە قووڵ بوونەوەی بانگخوازان بۆ لای بیرو باوەڕەکەیان ، گفت و گۆ کردن بۆ ئەم بزوتنەوە ڕۆشنبیریانەی کە ئێستا هەن و لە سەرو هەموو ئەمانەشەوە پێشکەوتنی ئیسلامە و پاشان بەربەستە کۆنەکان لە زمان و عاداتەکان یەك بە دوای یەکدا هاتوون،هەلی دەگمەن بۆ هەموو گەلان و شارستانیەتەکان دەستەبەر بووە،تا ژیانی ڕۆشنبیری نوێی خۆی لەسەر بنەمای یەکسانی ڕەهاو کێ بەرکێیەکی سەربەستانە دەست پێ بکات.[2]

ڕاستیە مێژوویەکان دەڵێن کە موسڵمانان کەسیان ناچار نەکردووە لەسەر موسڵمان بوون چونکە ئەوان پابەند بوون بەو ئایەتەی خوای گەورەوە کە دەفەرموویت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة: ٢٥٦).

بەڵام پێشوازی کردن و بە دەمەوەهاتنی گەلان بەرەو ئیسلام ئەوە هۆکارەکەی ئەوەبوو کە لە خودی ئیسلامدا بەدیان کردووە، ئەوە بریتیە لە نیعمەتێکی گەورە، لەوەی کە بەر چنگیان کەوتووە لە نێو موسڵماناندا لە ڕەفتارکردن بە ڕەفتاری ئیسلام و پابەند بوون بە حوکم و فەرمانەکەی و قەدەغەکراوەکانی و ئەوەش بەر چنگیان کەوتووە لەو سەرکردە و سەربازانەی کە هەڵدەستن بە کاری بانگەواز بە شێوەی چەسپاندنێکی کردەیی، هەڵوێستەکانیان بە جوانترین هەڵوێست گەلێك جیاکراونەتەوە کە مێژوو بە خۆیەوە دیوویەتی، تەواوی خەلیفە و سەرکردەکان ئامۆژگاری سەربازانیان کردووە بە کۆمەکی خواستن لە خودا، ویستنی کاری قیامەت بەسەر دونیادا، و دڵسۆزی لە جیهاد و خواستی خوای گەورە لە کارەکان، و دوور کەوتنەوە لە تاوان، ئەوان ئارەزوویەکی جەخت لەسەر کراوەو پەیمان بەستیان هەبووە بۆ ڕزگارکردنی گەلان و تاکەکانی لە بەندایەتی بەندەوە بۆ بەندایەتی خودا، ڕاگواستنەوەیان لە تەنگەڵانی دونیا بۆ بەختەوەری دوارۆژ، سەرکردەکانی ئیسلام لە سەرووی سەربازەکانیانەوە ڕووبەڕووی یەکەمین کۆسپ بوونەتەوە لە جەنگە جیهادیەکاندا، ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید بووە، لە کاتی سەقامکیری و گەرانەوەدا ئەو سەرکردانە لە پشتەوەی سەربازەکانیانەوە ڕێیان بڕیووە و بەزەییان پێدا هاتوونەتەوە و پەککەوتەکانیان هەڵگرتووە و لاوازەکانیان دامەزراندووە، ئەم سەرکردانە بانگخواز بوون لە پێگەی یەکەمدا، بە تەواوی بنەماکانی جەنگی ئیسلامیان بەجێ هێناوە و لە ڕاستیشدا ئەو موسڵمانانە لە پێناوی خودا جیهادیان کردووە، وەك ئەو جەنگانە نەبووە کە دەوڵەتانی تر سازیان کردووە.[3]

---

١ـ الاسلام وحركة التأريخ أنور الجندي (ص: ٨٣).
٢ـ علم التاريخ عند المسلمين، ترجمة صالح أحمد العلي (ص: ٤٦).
٣ـ فتح مصر، الدكتور إبراهيم المتناوي (ص: ١٢٧).

## دووەم: شێوازی عومەری لە هەڵبژاردنی سەرکردەکانی سوپا:

عومەر(ﷺ)ڕێگەیەکی تایبەتی هەبووە لە دەستنیشان کردن و دیاری کردنی سەرکردە ئازادیخوازەکاندا، ئەمە و چەندین هەل و مەرج و خۆسازدانی داناوە بۆ هەڵبژاردنی سەرکردە سەربازیەکان بەم شێوەیە:

### ١. پێویستە خۆپارێز و لە خواترس و شارەزای حوکمە شەرعیەکان بێت:

عومەر(ﷺ) هەمیشە دووپاتی دەکردەوەو دەیفەرموو: هەر کەس خراپەکارێك بکاتە کاربەدەست و بزانێت خراپەکارە وەك ئەو وایە،[1] وە کاتێك کەناردی بەدوای سەعیدی کوڕی عامر تا لە هەندێ ناوچەی شامدا بیکاتە کاربەدەست، سەعید بەرپەرچی دایەوە، ئەویش فەرمووی: نەخێر سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم ئەرکە ناخەنە گەردنی من و خۆتان لەنێو ماڵەکانتاندا دابنیشن.[2]

### ٢- پێویستە ناسراو بێت بە شێنەیی و تێڕامان:

کاتێك عومەر(ﷺ)عوبەیدەی سەقەفی کردە کاربەدەست پێی فەرموو هیچ شتێك بەری بە من نەگرتووە کە کەسێکی بە زەبر بکەمە فەرماندە جگە لە خێراییەکەی لە جەنگ، و لە پەلە کردن بۆ جەنگی لە کیس چوو جگە لە ڕوونی، سوێند بە خوا لەبەر خێراییەکەی نەبووایە دەمکردە فەرماندە بەڵام جەنگ یەکێك هەڵکردە نەبێت نایسازێنێت.[3]

### ٣- پێویستە بوێر و جوامێر و تیرئەندازبێت:

کاتێك عومەر ویستی سەرکردەیەك بۆ سوپای موسڵمانان و ڕزگار کردنی نەهاوەند،[4] دابنێت، ڕاوێژی بە خەڵکەکە کرد و ئەوانیش وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ شارەزاتری بە دانیشتوانی عێراق و سەربازانت چەندین شاندیان ناردۆتە لات ،ئەوانت بینیوە و قسەت لەگەڵ کردوون، پاشان عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا کاریان دەدەمە دەست پیاوێك تا ببنە یەك زمان، ئەگەر سبەینێ پێی گەشت، ئەاونیش وتیان: ئەوە کێیە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ فەرمووی: نوعمانی کوڕی موقرنی موزنی، ئەوانیش وتیان: شایستەیەتی.[5]

### ٤- پێویستە خاوەنی دانایی و زرنگی ژیری بێت:

عومەر(ﷺ) فەرمووی: پێویستە لەسەرم ڕووبەڕووی تیاچوونتان نەکەمەوە و کۆت و بەندتان نەکەم لە دەروازەکانتاندا،[6] کاتێك عەمری کوڕی عاص و سوپاکەی لەسەر ڕۆمەکان لە ئەجنادین لایاندا بۆ

---

١ـ موسوعة فقه عمر (ص: ١٠٠) عن سيرة عمر لإبن الجوزي (ص: ٦٧).
٢ـ موسوعة فقه عمر (ص: ١٠٠) عن مصنف عبدالرزاق (١١/٣٤٨).
٣ـ تأريخ الطبري (٤/٢٦٦).
٤ـ نەهاوەند ولاتێکی فارسەکانی لە نزیك هەمەدان.
٥ـ تأريخ الطبري (٥/١٠٩).
٦ـ موسوعة فقه عمر (ص: ١٠٩).

ڕزگارکردنی ئەو دەمە سەرکردەی ڕۆمەکان ئەرتەبۆن بوو کە ژیرترین پیاوی ڕۆمەکان و دووربینترین ڕۆچوویان بووە و کارسازترینیان بووە، ئەم پیاوە ژمارەیەك سەربازی لە ڕملە و ئیلیاء دانا و عەمر نامەیەکی نووسی بۆ عومەر و ئەم هەواڵەی پێ گەیاند، کاتێك عومەر نامەکەی پێ گەشت فەرمووی: ئەرتەبوونی ڕۆمان بە ئەرتەبوونی عەرەب تیرباران کردووە و سەیر بکەن بزانن چیە وە سەر دەردەکات،[١] کاتێك کە عەمر ویستی زانیاری دەربارەی ئەرتەبۆن و سوپاکەی کۆبکاتەوە،تا پلانێکی ژیرانە دابنێت بۆ پەلاماردانی و سەرکەوتن بەسەریدا، عەمری کوڕی عاص چوویە نێو سەربازگەی سەرکردەی ڕۆمەکان نزیك بوو بکوژرێت بەڵام خوای گەورە ڕزگاری کرد و عەمری کوڕی عاص ئەرتەبۆنی ڕۆمی هەڵخەڵەتاند، کاتێك کە هەواڵی ئەم کارە گەیشتە عومەر فەرمووی: عەمر سەرکەوت بەسەریدا، خوای گەورە پشتیوانی عەمرە.[٢]

## ٥- پێویستە سەرکردە شارەزاو لێهاتوو بێت و ڕاو بۆچوون و بینایی بەجەنگەکان هەبێت:

إبن قودامەی حەنبەلی خاوەنی (المغنی) لە وتەکانیدا سەبارەت بە فەرماندەی جەنگ دەفەرمووێت: پێویستە لەو کەسانە بێت کە ڕا و بۆچوون و عەقڵ و توانا و بینینی بە جەنگ و تەڵەکەی بۆ دوژمن هەبێ، پێویستە سەر ڕاستی و ئامۆژگاری بۆ موسڵمانان پێ بێت، هەر لەبەر ئەوە عومەر پاش ڕاوێژی خەڵکی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی جەنگی عێراق.[٣]

## ٦- ئارەزوومەندی لە کاردا:

لەنێو پلانەکانی عومەر(ﷺ)داوا هاتبوو،کە کار نەسپێرێتە کەسێك،کە ئارەزووی نەکات و قەناعەتی پێ نەبێت مەگەر ناچاربکرێت بۆئەو کارە ئەمەش بۆ ئەوەی کارەکان زۆر بەدڵسۆزانەتر ئەنجام بدرێن، عومەر جارێك هانی خەڵکی داو وروژاندنی بۆجەنگی فارس لەعێراقدا،بەڵام کەسێك لەوخەڵکە هەڵنەستایەوە بە دەم داواکەیەوە پاشان ڕۆژی دووەم بە هەمان شێوە کەس هەڵنەستا، دواتر لەڕۆژی سێیەم هانیدان و ڕۆژی سێیەمیش بەهەمان شێوە بوون،کاتێك کە ڕۆژی چوارەم وروژاندنی یەکەمین کەسێك کە هەستایە سەرپێ ئەبوعوبەیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو، پاشان خەڵکەکە یەك لە دوای یەك هەستان، ئینجا عومەر ئەبوعوبەیدەی کردە فەرماندەی هەموویان—لەبەر ئەوەی کە شایستەی ئەوکارە بوو—بەڵام ئەبو عوبەیدە لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)نەبوو بۆیە بەعومەریان فەرموو: بۆ هاوەڵێك ناکەیتە فەرماندە بەسەریانەوە؟ عومەریش فەرمووی: من کەسێك دەکەمە فەرماندەیان کە بەدەم داواکەوە هاتووە[٤] هەموو ئەم سیفەتانە لە هەر یەکە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح و عەمری کوڕی عاص(خوایان لێ ڕازی بێت)و کەسانی تری زۆردا هەبووە.

١ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣١).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٣٢).
٣ـ المغني لإبن قدامة (٨/٣٥٢).
٤ـ البداية والنهاية (٧/٢٦).

## سێیەم: مافەکانی خودا و سەرکردە و سەربازان لە میانی پەیامەکانی فاروقدا

### * مافەکانی خودا:

عومەر(ﷺ) ڕێنمایی سەرکردە و سەربازانی دەکرد لە میانی پەیامەکانیەوە و ئامۆژگاریەکانیەوە کە کار بۆ گرنگی و پابەندی بە مافەکانی خوای گەورەوە بکەن کە گرنگترینیان ئەمانەن:

### ١- هێمنی دوژمن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (ال عمران: ٢٠٠).

عومەر سەبارەت بە خۆگری کاتێك کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی نارد بۆ عێراق پێی فەرموو: ئەوەش بزانە کە هەر خوویەك کەرەستەیەکی خۆی هەیە، ە کەرەستەی چاکە ئارامیە، ئارام بگرە لەسەر ئەوەی کە دووژارت دەبێت یان جێت دەگرێتەوە، سام و پەروای خوات بۆ کۆدەبێتەوە،[١] هەروەك عومەر نامەیەکی بۆ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاج لە شام نووسی کە تیایدا دەفەرمووێت: ستایشی خوای گەورە دەکەم لەسەر خۆگری ئەو گەلە، پاشان ئەم ئایەتەی نووسی، کە دەفەرمووێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ (ال عمران: ١٤٥-١٤٨).

بەڵام پاداشتی دونیا غەنیمەت و ڕزگار کردنە و پاداشتی ڕۆژی دوایش لێبووردن و بەهەشتە، ئەم نامەیەم بەسەر خەڵکیدا بخوێنەوە وە فەرمانیان پێ بدە کە لە پێناوی خوادا بجەنگن و خۆ ڕاگر بن هەتا خوای گەورە پاداشتی دونیایان بداتەوە و باشترین پاداشتیش دوارۆژە.[٢]

### ٢- مەبەستیان لە جەنگەکەیان سەرکەوتنی ئاینی خودا بێت:

بە ڕاستی عومەر(ﷺ) زۆر لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشتبوو کە دەفەرمووێت: (هەر کەس بجەنگێت بۆ بەرزی وشەی(ألله) ئەوا ئەو کارەی لە پێناوی خودایە)[٣] ئێمە ژیان و ئامۆژگاری و پەیامەکانی بەدی دەکەین کە ئەم واتا گەورەیە شایەدی بۆ دەدەن.

---

١ـ تأريخ الطبري (٣٠٦/٥).
٢ـ تأريخ فتوح الشام (ص: ١٨٣).
٣ـ البخاري رقم (٢٦٥٥).

### ٣- بەجێهێنانی ئەمانەت:

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ (ال عمران: ١٦١).

لە وەسیەتەکانی عومەر بۆ سەرکردە و سەربازان لە نەبوونی خیانەت و ناپاکیە کـە دەفـەرموویت: (ئەگەر گەلاشتن بە دوژمن هەڵمەیەن، ئەگەر غەنیمەتتان دەست کەوت خیانەتی لێ مەکەن).[١]

### ٤- نەبوونی لایەنگیری و خۆش ویستن لە سەرکەوتنی ئاینی خودا:

لە وتە بەناوبانگەکانی عومەر(ﷺ) شتێك هەیە دەربارەی لایەنگری و دۆستایەتی ، دەفـەرموویت: هەر کەسێك پیاوێك بکاتە کاربەدەسێك بۆ دۆستایەتیەك یـان خزمایەتیـەك ئـەوا خیانـەتی لـە خـوا و پێغەمبەرەکەی کردووە، هەر کەس خراپەکارێك بکاتە کاربەدەست و بزانێت کە خراپەکارە ئەوا خۆشی وەك ئەو وایە.[٢]

### * مافەکانی سەرکردە:

عومەر لە پەیام و ئامۆژگاریەکانیدا مافی سەرکردەکانی ڕوون کردۆتەوە لەوانە:

### ١- پابەند بوون بە ملکەچیەوە:

عومەر کاتێك کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی مەسعوبدی سەقەفی بە سەرکردایەتی سـوپایەك نـارد بـۆ عێراق بە یارمەتی ئەو سەلەی کوڕی ئەسلەمی خەزرەجی و سەلیطی کوڕی قەیسی ئەنصاری (خویـان لێ ڕازی بێت) نارد لە لەگەڵیدا و فەرمانی پێدا کە بێ ئەوان هیچ کارێـك نـەکات، ئاگـاداری کـردەوە ئەوان بەدرین پاشان ئەبو عوبەید لە جەنگی ئەلجسر لە دژی فارسەکان جەنگاو و سەلیط ئاماژەی پێدا کە لە پردەکە نەڕواتە ئەو بەر وە نەپەڕێتەوە بۆ لای دوژمن بـەڵام ئـەبو عوبەیـدە گـوێی بـۆ نـەگرت و ئەوەش بوویە مایەی شکانی سوپای موسڵمانان وە سەلیط لە هەندێ لە قسەکانیدا دەفەرمێت- ئەگەر من ڕقم لە ناکۆکی و ملکەچی نەبووایەتەوە خەڵکەکەم دوور دەخستەوە بەڵام من گوێڕایەڵ و ملکەچی دەبم ، ئەگەر من هەڵەیەکم کرد ئەوا عومەر منی کردۆتە هاوبەشت.[٣]

### ٢- دەسەڵاتی کارەکانیان بۆ لای ئەو بگێڕنەوە:

خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ

---

١ـ الخراج لإبي يوسف (ص: ٨٥).
٢ـ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/٦٦).
٣ مروج الذهب (٢/٣١٥-٣١٦).

ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَـٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ (النساء: ٨٣).

خوای گەورە وای کردووە کە خەڵکی دەسەڵاتی کارەکانیان بگێڕنەوە بۆ لای کاربەدەستانی وەك هۆیەك بۆ دەستکەوتنی زانیاری و زانست و تۆکمەیی ڕا و بۆچوونەکان، پاشان ئەگەر ڕاستیەکانیان بۆ دەرکەوت و لە ئەو شاراوە بوو بەوە ئاماژە دەدەنە کاربەدەستەکە وە لەبەر ئەوە ئەمیر پێویستی بە ڕاوێژکردن هەیە بۆ گەڕانەوە بۆ لای ڕاستیەکان،[1] عومەر(ﷺ) بۆ هەر سەربازگەیەك یەك فەرماندەی دادەنا تا گرفتەکانیان بگێڕنەوە بۆ لای ڕای ئەو و سەرپشکی بکەن بۆ چارەسەرکردنی تا ڕاکانیان ناتەبا نەبێت چونکە بەمە قسەیان ناکۆك دەبێت.[2]

لەو ساڵەی کە عومەر سوپای موسڵمانانی نارد بۆ نەهاوەند و فەرمانی پێدان بە کۆبوونەوە لەوێ ئەو دەمە سوپا پێك هاتبوو لە سەربازانی دانیشتوی مەدینە لە کۆچکەران و پشتگیریکەران و لە نێوانیاندا عبداللە کوڕی عومەر(ﷺ) هەبوو و سەربازانی بەصرە بە سەرکردایەتی ئەبو موسای ئەشعەری(ﷺ) هاتن و سەربازانی کوفەش بە سەرکردایەتی حوزەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ) ئامادەبوون، پاش کۆبوونەوەیان عومەر نامەیەکی نووسی بۆیان کە دەفەرمووێت: ئەگەر بەیەك گەیشتن ئەوا ئەمیرەکەتان نوعمانی کوڕی موقرنی موزنیە.[3]

### ٣- پەلەکردن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی:

لە خەلافەتی عومەر(ﷺ)دا یەکەمین کارێك کە پێی هەستا بریتی بوو لە ڕێکخستنی سوپا بۆ جەنگی فارس بە جۆرێ ماوەی سێ ڕۆژ بانگی کردن و کەسێك بەدەم داواکەیەوە نەچوو، لە ڕۆژی چوارەمدا یەکەمین کەسێك کە ئەو نوێنەرایەتیەی بە هەند گرت ئەبو عوبەیدەی کوڕە مەسعودی سەقەفی بوو کە ئەمەش وای لە عومەر(ﷺ) کرد کە سەرکردایەتی ئەو سوپایەی پێ بسپێرێت هەرچەندە لە ڕیزی سوپاکەدا ژمارەیەك لە هاوەڵان بەدی دەکران چونکە ئەبو عوبەیدە بە خێرایی بەدەم وەڵامدانەوەی ئەو داوایەوە ڕۆیشت،[4] کاتێك عومەر عوتبەی کوڕی غەزوانی نارد بەرەو بەسرە ئامۆژگاری کرد و یادی هێنایەوە بە وتەیەکی کە دەفەرمووێت: لە خودا بترسە لەو کارەی کە پێت سپێردراوە، نەکەی دەروونت دووبەرەکیت بکات بۆ لای خۆ بەزلزانینێك کە براکانت لەسەرت خراپ بکات، تۆ پاش ژیانی نەفامی هاوەڵی پێغەمبەری خوات(ﷺ)کرد و پێی سەرفراز بوویت، پاش لاوازیت پێی بەهێز بوویت تا بوویتە فەرماندەیەکی دەسەڵاتدار و پادشایەك کە گوێڕایەڵیت دەکرێت تۆ دەدوێی و خەڵکی گوێت لێ دەگرن وە فەرمان دەردەکەیت ملکەچی فەرمانەکانت دەکرێت ئای کە چ نیعمەتێکە ئەگەر لە سەرووی تواناتەوە هەڵت نەبرێت و لەوانەی خوار خۆشت بابیت نەکات.[5]

---

١ـ الاحكام السلطانية (ص: ٤٨).
٢ـ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية نشأتها واتطورها (١/ ١٠٠).
٣ـ هەمان سەرچاوە (١/ ١٠٠).
٤ـ هەمان سەرچاوە (١/ ١١٣).
٥ـ هەمان سەرچاوە.(١/ ١١٤).

### ٤- ڕکەبەرایەتی نەکردنی لە شتێك لە دابەشکردنی غەنیمەتەکان:

ئەوەی کە عومەر سەبارەت بە دابەشکردنی غەنیمەتەکان فەرموویەتی ئەمەیە: خوای گەورەا من بە شایەتت دەگرم لەسەر فەرماندەی ناوچەکان وە من ڕەوانەم کردوون تا خەڵکی فێری ئاینەکەیان و سووننەتی پێغەمبەرەکەیان بکەن و دەستکەوتەکانیان دابەش بکەن و دادپەروەر بن لە ناویان و هەر کەس لەسەر ئەمەوە گرفتێکی هەبوو با بەرزی بکاتەوە بۆ لام،[1] لەمەوە لە ڕزگارکردنی ئیبلە،[2] کاتێك کە دابەش کردنی غەنیمەتەکان تەواو بوو لە نێو سەربازەکاندا بەشی یەکێکیان بڕێ مس بوو، کاتێك کردیە دەستیەوە دەرکەوت کە ئەمە زێڕە پاشان سەربازەکان بەمەیان زانی و سکاڵایان لە لای فەرماندەکەیان کرد،[3] ئەمەش بوویە کێشە و گرفتێك لەسەر فەرماندەی سوپاکە بۆیە ئەویش وەك بەجێهێنانی ئەرکی سەرشانی نامەیەکی نووسی بۆ عومەر(ﷺ) عومەریش بەمە وەڵامی دایەوە: سوێندی بدە کە نەیزانیووە کە زێڕە تا پاش ئەوەی کە بۆتە موڵکی ئەگەر سوێندی خوارد ئەوە بۆی بگێڕەوە ئەگەر سەرپێچی کرد ئەوا دابەشی بکە لە نێو موسڵمانان بەڵام ئەو سەربازە سوێندی خوارد و پارچە زێڕەکەی بۆ گێڕایەوە،[4] پاشان کاتێك غەنیمەتەکان لە جەنگی جەلەولا کۆکرانەوە جویەیری کوڕی عبداللە باسی لەوە کرد، کە چواریەکی تەواوی ئەو غەنیمەتانە بۆ خۆی و کەس و کارەکەیەتی و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیش(ﷺ) نامەیەکی لەم بارەیەوە نووسی بۆ عومەر، عومەریش لە وەڵامدا فەرمووی: جویەیر ڕاستی وتووە و من پێم وتووە، ئەگەر ویستی خۆی و کەس و کارەکەی لەسەر دڵ داهێنراوی بجەنگن ئەوا بەشی خۆیان پێ بدە، ئەگەر وابوون ئەوا ئەوان لە پێناوی خوای گەورە ئاینەکەی نەبێت نەجەنگاون ئەوەی کە لایەنی وای بێتە هەژمار کە ئەوان لە موسڵمانانن ئەوەی کە بۆ ئەوانە موڵکی ئەوانە و ئەوەی کە لەسەریانە لەسەریانە، کاتێك کە پەیامەکەی عومەر گەیشتە سەعد بەمە هەواڵی دایە جویەیر، ئەویش فەرمووی: ئەمیری باوەڕداران ڕاستی وتووە چاکی کردووە، ئێمە پێویستیمان بەو چوار یەکە نیە بەڵکو ئێمە لە موسڵمانانین.[5]

### * مافی سەربازان:

عومەری فاروق (ﷺ) لە پەیام و ئامۆژگاریەکانیدا مافی سەربازانی روون کردۆتەوە لەوانە:

### ١- نواندن و بەسەرکردنەوەی بارودۆخیان:

سەبارەت بە عومەر لە کاری بەڕێوەبردندا دەگێڕنەوە فەرموویەتی: من سوپاکە ڕێك دەخەم و من لە نوێژدام لەبەر ئەوەی کە عومەر(ﷺ) فەرمان پێکراوە بە جیهاد لە کاتێکدا کە ئەو ئەمیری

---

١ـ الخراج لإبي يوسف (ص: ٥٠).
٢ـ الأبلة: شارۆچکەیەکە لەسەر کەناری بەسرەی گەورە لە گۆشەی کەنداوەوە.
٣ـ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/١٢٠).
٤ـ مناقب أكير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ١٢٨).
٥ـ الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (١/١٢١).

باوەڕدارانە ئەمیری جیهادیشە بەمە[١] لە هەندێ ڕووەوە لە شوێنی نوێژخوێنێکە کە نوێژی ترس (صلاة الخوف) دەکات لە کاتی تێڕوانینی دوژمن، کاتێ کە لەشکرەکانی پێکدەهێنا بۆ سەرکردەکانی پێش ئەوەی کە بەڕێیان بکات بۆ غەزا دەیدواندن و ئامۆژگاری دەکردن وە لەوەی کە پێی دەفەرموون ئەمە بوو: جلوبەرگتان بپۆشن پێڵاوتان لە پێ بکەن وموتان بتاشن و مەبەستەکانتان وەلانێن ئەسپ و حوشترەکانتان ئالف بدەن و دەرپەڕنە سەر ئەسپەکانتان و پێویستە لەسەرتان ئامادە بن ، واز لە خۆشگوزەرانی و پۆشاکی عەجەم بهێنن وە بە هێزەکانتان مرخن نابن هەتا دەرپەڕن و لەسەر پشتی ئەسپەکانتان دابەزن و بە شوێنکەوتنی یەکتان بکەوێت،[٢] ئەمەش مەودای سووربوونی فاروقمان(ﷺ) بۆ دەردخات لەسەر ئامادەباشی و ئاشکراکردنی هێز و هاوتایی سەرکردەکانی دەکرد لە ڕیزی نمایشی سەربازی و دەرخستنی هێزی بۆ دوژمن ئەگەر لە جەنگدا بوایە یان لە کاتی خۆئامادەکردن بوایە ، عەمری کوڕی عاص(ﷺ) لە نوێژی هەینی لە میسر وتاری بۆ سەربازان دەدا و هانی دەدان لەسەر قەڵەوکردنی ئەسپەکانیان لە وتەکانی: من نازانم بۆ پیاوێك دێتە لام خۆی قەڵەو کردووە و ئەسپەکەی لاواز ، ئەوەش بزانن کە من ئەسپەکەم بەخێو دەکەم و خواردنی دەدەمێ وەك چۆن خۆم خواردن دەخۆم ،هەر کەس ئەسپەکەی بەبێ هۆیەك لاواز بکات ئەوا لەو فەرزەی داشکاندوە،[٣] کاتێك عومەر(ﷺ) لە کاتی هاتنی بۆ شام گەیشتە موعاویە خۆهەڵکێشانی پادشا و جل و بەرگەکەی لە کەل و پەل و پێداویستیەوە پێوە بینی لالووت بوو لێی و پێی فەرموو: ئایا تۆ کیسرایت یان موعاویەی؟ ئەویش فەرمووی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من لە دەلاقەیەکدا لە ڕووی دوژمنەوە بەرەو خۆهەڵکێشانی ئەوان دەڕۆین بە جل و بەرگی شەڕ و جیهاد پێویستیەکمان هەیە، بێدەنگ بوو وە بە هەڵەی نەزانی لەوەی کە بە مەبەستێك لە مەبەستەکانی ڕەوا و ئاینی لەسەری کۆبۆتەوە.[٤]

## ٢- بەزەیی هاتنەوە بە سەربازاندا لە کاتی ڕێکردندا:

عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) کە تیایدا فەرمووی: بەزەییت بە موسڵماناندا بێتەوە لە کاتی ڕۆیشتنیانو بەڕێکردنیاندا ئازاریان مەدە ،ماندوویان مەکە و کەم تەرخەم مەبە بەرمبەریان ، هەتا دەکەنە دوژمنەکانیان وە سەفەر هێزیان لێ ناچنێ، چونکە ئەوان دەڕۆن بۆ لای دوژمنێکی نیشتەجێ زۆر و زەبەن، هەموو هەینیەك شەو و ڕۆژێك لەگەڵیان دابنیشە تا ئەو دانیشتنە بۆیان ببێتە پشوویەك بۆیانو چەك و تفاقەکانیان کۆبکەنەوە وە شوێنەکانیان لە گوندەکانی دانیشت وریکەوتوو[٥] لابدە، عومەر(ﷺ) سەربازگەلێکی نارد بۆ شام بە مەبەستی هاریکاری هێزەکان وسەعیدی کوڕی عامری کردە فەرماندەیان، کاتێك کە بەڕێکەوتن عومەر فەرمووی: لەسەر خۆت بە

١ـ الفتاوى (٢٢/٦٠٩).
٢ـ نهارية الارب (٦/١٦٨).
٣ـ توح مصر لإبن عبدالحكم (ص: ١٤١).
٤ـ الادارة العسكرية (١/١٣٧) نقلا عن المقدمة.
٥ـ نهارية الارب (٦/١٦٩).

هەتا ئامۆژگاریت دەکەم پاشان بە پیادە بەرەو سوپاکە ڕۆیشت و پێی فەرموو: ئەی سەعید من ئەم سوپایەم سپارد بە تۆ و تۆش باشترین کەس نیت تیایدا جگە لەوەی کە خواپەرستی، هەر کە بەرێکەوتیت بەزەییت پێیاندا بێتەوە تا دەتوانی وە ناموسیان لەکەدار نەکەیت و بچووکیان بە کەم نەزانیت وە بەهێزکانیان تاو مەدە ،شوێنی کەسانی تر مەکەوە وە ڕێگەی ئەشکەوت و شاخاویان پێ مەگرەبەر وە ڕێگای دەشتیان پێ ببڕە وە لە زۆربەی ڕێگەکەدا مەیان خەوێنە، خوای گەورە و باڵادەست خەلیفەی منە لەسەر تۆ و ئەوەی لەگەڵتە لە موسڵمانان.[1]

## ٣- لە کاتی بەڕێکردنی ماڵئاوایی لێ دەکردن:

عومەر لەکاتی بەڕێکردنی سوپاکاندا ماڵئاوایی لێ دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن بە پەیڕەوی کردنی ڕەوشت بەرزی ، عومەر فەرمانی دا بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ)، کە بە وەفابێت لەگەڵ دوژمنانی کاتێك داوای پارێزراوی لێ دەکەن و ناپاك نەبن بەرامبەریان وە ئەوەشی بۆ ڕوون کردەوە کە هەڵە لە ناپاکیدا تیاچوونە و لاوازیە بۆی و بە هێزیە بۆ دوژمنان.[2]

## ٤- بە گژانەچوونەوەی سەربازان لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمندا هەتا ناتەبایی و سەرنەکەوتن ڕوونەدات:

لە وەسیەتەکانی عومەر(ﷺ) بۆ سەرکردەکانی لەم بارەیەوە ئەوە بوو کە دەیفەرمووك- ئەمیر سزای هیچ ئەندامێکی سوپا و لەشکرەکەی نادات تا ڕێگە و ڕێباز دەردەکەوێت تا شەیتان سواری ملیان نەبێت و بیگەیەنێتە بێباوەڕان،[3] کاتێك عومەر(ﷺ) سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی باهلی بەسەرکرایەتی سوپایەك نارد عەمری کوڕی مەعد یەکروب و طلحتی کوڕی خووەیلدی ئەسەدی کردە ئەمیریان و لە نێوان عەمری کوڕی مەعد یەکروب و سەلماندا چەند گرفتێك ڕوویدا کە هەواڵەکەی گەیشتە عومەر(ﷺ) ئەویش نامەیەکی بۆ سەلمان نووسی کە تیایدا دەفەرموێت: لەپاشدا ، هەواڵی ئەوەم پێ گەشتووە کە چیت بە عەمر کردووە، تۆ بەمە کارێکی چاکت نەکردووە وە جوانی تێدا نەنواندووە ئەگەر من لە شوێنی تۆدابام لە گۆڕەپانی جەنگدا سەیری عەمر و طلحتم دەکرد و تۆ ئەوان لە خۆت نزیك بکەرەوە گوێیان بۆ بگرە ئەوان لە جەنگدا شارەزایی و ئەزموونێکیان هەیە. هەر کاتێك گەشتیە گۆڕەپانی ئاشتی ئەوا بیان گێڕەوە کە خۆیان پێگەیاندووە لە خەڵکانی تێگەیشتوو و شارەزا لە قورئان نزیك بەرەوە،[4] هەروەها عومەر(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ عەمری کوڕی مەعد یەکروب: لەپاشدا، هەواڵم پێ گەیشتووە بەگوێی ئەمیرەکەت نەکردووە سووکایەتیت پێکردووە، تۆ شمشێرێکت هەیە کە ناوی لێ ناوە سازندە وە منیش شمشێرێکم هەیە ناوم لێناوە دانراو، من سوێند بە خوای

---

١ـ تاريخ فتوح الشام (ص: ١٨٦) للأزدي.
٢ـ الادارة العسكرية (١/١٧٩).
٣ـ تاريخ الخلفاء للسيوطي (ص: ١٣١).
٤ـ الاوائل للعسكري (٢/٤٥).

گەورە کە سەری خستمە سەر تەوقی سەرت بەرزی ناکەمەوە تا دووکەرتت دەکەم پێی، کاتێك کە پەیامەکە گەشتە عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ئەوا ئەوانە ئەم کارە دەکەن،[1] لەم دوو دەقەی پێشوودا تێگەیشتنی عومەر دەردەکەوێت لەوەی کە سەرکردە سوودی لێ وەردەگرێت لە گۆڕەپانی جەنگ بریتیە لە ڕێکخستنی دڵەکان بە تایبەتی کە ئەوان لە بەرامبەر دوژمنیانن. پێویستە لەسەر سەرکردە ڕاوێژ بکات بەو کەسەی کە شارەزایی هەیە بەجەنگ ئەمەش مانای لێك دابڕانی پەیوەندی و سۆز و بەزەیی نیە لەنێوانیاندا لەکاتی گەرانەوەیان بۆ گۆڕەپان، لە ئازادکردنی شارەکاندا،[2] لەسەر دەستی عەیازی کوڕی غەنەم بڕێك هاریکاری بە سەرکردایەتی بسری کوڕی ئەرتەئەی عامری پێ گەیشت و بە زەیدی کوڕی ئەبوسوفیان بەفەرمانێکی عومەر(ﷺ) ڕووی لێنا و بەمەش ناکۆکییەك لە نێوانیان ڕوویدا لە کاتێکدا کە لە گۆڕەپانی جەنگدا بوون، عەیاز زۆر بێنیاز بوو بەو هاریکاریە و داوای لە بسر کرد بگەڕێتەوە بۆ شام، پاشان عومەر(ﷺ) نامەیەکی نوسی بۆ عەیاز و داوای لێکرد کە هۆی ئەو گەرانەوەی بۆ ڕوون بکاتەوە بە تایبەتی ئەوان بۆ هاریکاری وترساندنی دوژمن هاتوون هاوکاریەکانیش یەك لەدوای یەك بۆ تۆ دێن بەڵام دڵیان دەشکێت و پەلە دەکەن لە ملکەچیت، عەیازیش وەڵامی دایەوە: ترسام لەوەی کە شتێك لە یاخی بوون ڕوویدات و دڵی سەربازان ناتەبا بێت کاتێ کە من بێنیاز بووم لە کۆمەکیەکەی پۆزشم بۆهێنایەوە و فەرمانم پێدا بە گەرانەوە و ئەمەش هۆی گەرانەوەکەی بوو،[3] لێرەدا عومەر(ﷺ) بەڕاستی زانی و دوعای خێری بۆ کرد بە تایبەتی لەکاتێکدا کە ئەوان لە بەرامبەر دوژمندان هەتا چەند دەنگ نەبن لەسەر کێشمەکێشمی نێوانیان لە یەکتری بدەن و سەرنەکەوتن.[4]

٥- پاسەوانی کردنیان لە هێرشە ناکاوەکانی دوژمن لە کاتی ڕۆیشتن ومانەوەیاندا:

عومەری فاروق بایەخی تەواوی دەدا بە کاری پاسەوانی لەبەر ئەوە فەرمانی دەدا بە سەرکردەکانی بە سوربوون و ئاگاداربوون لە هێرشی ناکاوی دوژمن لە شەواندا و داوای لێ دەکردن کە پاسەوانی بکەن لە مانەوەورۆیشتنیاندا ا، لەمەشدا فەرمانێکی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەر دەکات و پێی دەفەرمێت: پاسەوانەکانت وریا بکەرەوە دیلێکت بەدەست کەوت و بەڵێن و پەیمانی نەبوو بدە لە گەردنی تا دوژمنی خودا ودوژمنی خۆتی پێ دەترسێنی،[5] هەروەها عومەر(ﷺ) ئامۆژگاری سەرکردەکانی دەکرد کە هەوڵگری هەبێت لە دوژمناندا وناردنی پێشەنگەکان لە کاتی گەیشتن بە شوێنی دوژمن، تا لەسەر شارەزایی و زانیاری بن بە حاڵ و نیازی دوژمنان، لەو پەیامانەی کە بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص نوسیوە: ئەگەر گەیشتیە سەر زەوی دوژمن چاوەکان بێدار بکەرەوە لە

---

١- الاوائل للعسكري (٢/٤٥).
٢- ڕەها:- شارێکە لە جەزیرە لە نێوان موصل و شام.
٣- فتوح الشام إبن أغثم (١/٢٥٣-٢٥٥).
٤- الادارة العسكرية (١/١٨٨)
٥- نهارية الارب (٦/١٧٠).

نێوانی خۆت و ئەواندا کاری ئەوانت لەبەر جاو ون نەبێ وە با خەڵکانێکی عەرەب یان خەڵکی ئەو شوێنەت لە لابێ کە متمانەیان پێ دەکەیت وە دڵنیا دەبیت لە ئامۆژگاری و ڕاستگۆییان، چونکە پیاوی درۆزن هەواڵەکەی سوودت پێ ناگەیەنێ ئەگەرچی هەندێکی هەواڵەکەی ڕاست بێ، ناپاکیش جاوی لە سەرتە نەك جاوی لێت بێت، با لەکاتی نزیك بونەوەش لە زەوی دوژمن پێشڕەویەکانت زیاتر بن و لەشکر لە نێوان خۆت و دوژمنانت دامەزرێنی چونکە ئەو لەشکرانە کۆمەکی و هاریکارییان دەپچڕێنێ و پێشرەوەکانیش شوێن نەنگیەکانیان دەکەون، خەڵکانی خاوەن هێز و ڕاو بۆچوون بۆ ئەو پێشڕەوانە لە یارانت هەڵبژێرە و لە ئەسپەکانیش پێشینەکانیان بۆ دیاری بکە، جونکە ئەگەر گەشتنە دوژمن ئەوا یەکەمین شت لە هێزێك پێیان دەگات ڕاو بۆچوونی تۆیە،[1] وە لەم وەسێتە بەنرخەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە عومەر(ﷺ) کەمتەرخەمی نەکردووە لە بایەخدانی بە بەهەندگرتنی سەرچاوەکان لەسەر دوژمن بەڵکو لە نێو سوپا ئیسلامیەکانیشدا بەهەندگرتنی لە چاودێری ئیداری لەسەر والی و کاربەدەست و سەرکردە و سەربازان هەتا شارەزا بێت لە بارودۆخ و ڕەوش و مامەڵە و بەڕێوەچوونی کارە سەربازیەکانیان عومەر لە هەر سوپایەکدا چەند سەرچاوەیەکی هەبوو کە ڕاپۆرتیان بۆ بەرز دەکردەوە لەوەی کە لە نێو ڕیزەکانی ئەو سوپایەدا ڕوو دەدات،[2] کاتێ عومەیری کوڕی سەعدی ئەنصاری سکاڵای خۆی گەیاندە عومەر کاتێ لە سەر تیرەیەك خەڵکی شامەوە بوو هات بۆ لای ووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، لە نێوان ئیمە و ڕۆمەکاندا شارێك هەیە کە پێی دەڵێن عەرەب سوس،[3] ئەوان لە نەنگیەکانمان لە دوژمن ناشارنەوە وە هیچ لە نەنگیەکانی دوژمن لای ئێمە ئاشکرا ناکەن، عومەریش فەرمووی: ئەگەر گەیشتیە ئەو شارە سەرپشکیان بکە لەوەی کە جێی هەر مەڕێك دوو مەڕ لە جێی هەر حوشترێك دوو حوشتر لە جێی هەر شتێك دوو شتیان پێ بدە ئەگەر بەمە قایل بوون ئەوا پێیان بدە و پاشان شارەکە بگرە ، ئەگەر قایل نەبوون ئەوا ماوەی یەك ساڵ مولەتیان بدە پاشان وێرانی بکە،[4] پاشتر کاتێ عومەری کوڕی سەعد چوویە سەریان ئەو مەرجەی خستە بەردەمیان قایل نەبوون لەبەر ئەوە ساڵێك مۆڵەتی دان و دواتر شارەکەی وێران کرد.[5]

## ٦. هەڵبژاردنی شوێنی مانەوەیان بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمن:

عومەر ئامۆژگاری سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی کردکە لەگەڵ دوژمن نەجەنگی تا شارەزا دەبێت لە سروشتی تەواوی زەوی و زاری دوژمن بە تەواوی لە بەشی ناوەوە و دەرەوەی و زۆری ئاو و شوێنی لەنگەرگرتنی کەشتیەکان تیایدا و ئەوەی کە ئەم کارانە بەڕێ دەکات،[6] هەروەها لە پێش ڕوودانی جەنگی قادسیەش بۆی نووسی کە پێویستە بچووکترین بەرد بناسێت لەبەر ئەوەی ئەوان زیاتر بە ڕێرەوی شارەزاترن لە دوژمنانیان کەواتە کەی شکست توانیویەتی جێ نشین بێت لە پاشەکشێ بە

١ـ نهاریة الارب (١٦٩/٦).
٢ـ الادارة العسكرية (٣٩٦/١).
٣ـ مدينة بالثغر من ناحية الحرث.
٤ـ فتوح البلدان للبلاذري (١٨٥/١).
٥ـ هەمان سەرچاوە (١٨٥/١)، الادارة العسكرية (٣٩٧/١).
٦ـ نهاية الارب (١٧٠/٦)، الادارة العسكرية (٢٠٥/١).

سەربازان پاشان ئەوان ڕزگاریان دەبێت لە جەنگ و دوژمن ناتوانێ خۆی پێیان بگەیەنێ بە هۆی دووری لە شوێنکەوتووانیان و نەزانینی ڕێگەکانیان،[١] سەرباری ئەوەش عومەری فاروق سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و سەلمانی فارسی و حوزەیفەی کوڕی یەمانی کرد بە ئەمیری سوپا لە هەڵبژاردنی شوێن و ڕێگەی لادان و مانەوەی، هەروەها عومەر هەستا بە دابەشکردنی ئەرکە ئیداریەکان لە نێوان سەرکردەکاندا،[٢] عومەر لە کاری بەڕێوەبردنی سەربازیدا و لە کاتی هەڵبژاردنی پێگە و لادانیان و سازدانی سەربازگە جەنگیەکانیان مەرجی ئەوەی دادەنا کە ئاو دایان نەبڕێت لە بارەگای سەرکردایەتی سەرباری ئەوەش بۆ ئەوەی کە ناوەندێکی تایبەتی هەیە لە نەخشەسازی و ئاسان گەیشتنی هاوکاری و کۆمەکیەکان،[٣] هەروەها عومەر(ﷺ) نامەی بۆ ئەبو عوبیدەی کوری جەڕاح نوسی و فەرمووی: سوپاکەت لە شوێنێ دامەزرێنە کە پێش ئەوەی ملکەچ بیت بۆیان و بزانێت ئایندەی چۆنە.[٤]

## ٧- ئامەدەکردنی ئەوەی سەربازان پێویستیانە لە خۆراك و ئالف:

عومەر(ﷺ) لە مەدینەوە مەرومالاَت و قوربانیەکانی دەنارد بۆ سەربازی موسڵمانان لە عێراق،[٥] پارێزگاری لە نەقیع و ڕبزە دەکرد، بۆ ئەو نیعمەتەی کە لە پێناوی خوادا بارە بەسەریانەوە، هەروەها لە هەموو شارێك چەند ئەسپێکی لەصەدەقە وەر دەگرت لەوەی کە دەخرانە ڕوو لەمەش چوار هەزار ئەسپی لە کوفە وەرگرت،لە بەسرەش بە نزیکەی هەمان ژمارە، لە هەر شارێك لە شارەکان بە پێی توانای خۆیانی لێ ستاندن،[٦] کاتێ عومەر(ﷺ) هات بۆ شام بۆ ڕێکخستن و ئاشت کردنەوەی دانیشتوانی قودس بەڕێوەبەرایەتیەکی دامەزراند بۆ هاریکاری کردنی سوپاکە ناسرابوو بە ئەهرا،[٧] عەمری کوڕی محمد عەبس یەکەمین فەرمانبەر بوو کە دیاری کرا بۆ بەرێوبەرایەتی هاریکاری سوپا.[٨]

## ٨- هاندانیان لەسەر جەنگ:

عومەر(ﷺ) نامەیەکی نوسی بۆ ئەبو عومەیدە و تیایدا هانیدا لەسەر جیهادکردن و فەرموی : بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، لە بەندەی خوا عومەری کوڕی خەتاب ئەمیری باوەڕداران بۆ متمانە پێ کراوی ئومەت ئەبوعومەیری کوڕی جەڕڕاح سلاَوی خوات لێ بێت، سوپاسی خوا دەکەم بە ئاشکرا و نهێنی و وشیاریتان پێ دەدەم لەسەر پێچی کردنی خوای گەورە و وشیاریتان پێ دەدەم و ڕێگریتان لێ دەکەم کە لەو کەسانە بن خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ

---

١- الادارة العسكرية (٢٠٥/١).
٢- هەمان سەرچاوە. (٢٠٦/١).
٣- الادارة العسكرية (٢٠٦/١).
٤- الادارة العسكرية (٢٠٧/١)، نقلا عن تأريخ الطبري.
٥- فتوح البلدان للبلاذري (٣١٤/٢).
٦- الادارة العسكرية (٢١٧/١).
٧- هراء: ماڵێکی گەورە بوو کە خۆراکی دەسەڵاتدارانی تێدا کۆدەکرایەوە.
٨- الادارة العسكرية (٢١٧/١).

وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ (التوبة: ٢٤).

سڵاوی خوای گەورە لەسەر کۆتا پێغەمبەر و پێشەوای نێردراوان.[١] کاتێ ئەم پەیامە گەیشتە ئەبو عوبەیدە بۆ موسڵمانانی خوێندەوە و ئەوانیشن زانیان کە ئەمیری باوەڕداران هانیان دەدات بۆ جەنگ و کەسێك لە موسڵمانان نەمایەوە کە بۆ ئەم پەیامەی عومەر فرمێسك نەڕێژێ، هەروەها عومەر نامەیەك بۆ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و ئەوانەی لەگەڵی دا بوون لە سەربازان هانیدان بۆ جەنگی بێ باوەڕان و سوێندی دان و فەرمانی پێ کردن بە پابەندبوون بە چاکیەکان وشیاری کردنەوە لە ئەنجام دانی تاوانەکان،[٢] ئەمەو لە کاری گرنگی فەرماندە وەیەکەکان لەسەر بەڕێوەبەرێتی عومەر(رضي الله عنه) هاندانیان بوو لەسەر جەنگ.[٣]

٩- پاداشتی خوداییوگەورەیی شەهادەتیان بە بیر بهێنێتەوە:

لەسەردەمی فاروقدا سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص لە شەڕی قادسیەدا پاداشتی خودای و ئەوەی بۆی ئامادە کردون لە ناز و نیعمەت لە قیامەتدا وەیادی سەربازانی هێنایەوە و ئارەزوومەندی کردن لەسەر جیهاد کردن و ئاگاداری کردنەوە لەسەرکەوتن لە پەیمان و بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی وە ئەوەشی بۆ ڕوون کردنەوە کە ئەو دەسکەوت و غەنیمەت و ماڵاتانە دەکەوێتە دەستیانەوە وە فەرمانی دا بە خوێنەرانی قورئان کە سورەی جیهاد(الانفال) بخوێنن،[٤] هەروەها ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح لە شام و لە نێو سەربازەکانیدا وتارێکی داو پاداشتی خودای و نیعمەتەکانی وە یاد هێنانەوە هەواڵی پێ دان کە جیهاد کردن باشترین شتە بۆ ئەوان لە دنیاو ئەوەشی کە تیایدایە،[٥] عەمری کوڕی عاصیش بەوە بەناوبانگە بەسەربازانی لەفەلە ستین فەرمووە: هەرکەس کە کوژرا شەهیدە و هەرکەس ژیا ئەوە بەختەوەرە ، فەرمانی دا بەسەربازانی کە قورئان بخوێنن و هانیدان لەسەر ئارامگری و خواستی پاداشتی و بەهەشتەکەی.[٦]

---

١ـ فتوح الشام للواقدي (١/١١٧).
٢ـ الادارة العسكرية (١/٢٣٩).
٣ـ الادارة العسكرية (١/٢٣٩).
٤ـ تأريخ الطبري (٤/٣٥٦).
٥ـ الادارة العسكرية (١/٢٤٣).
٦ـ فتوح الشام للواقدي (١/١٨-٢٠).

### ١٠- پابەند بێت بەومافانەی کە خوای گەورە کردوونی بەواجب لەسەرشانی:

عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و ئەو سەربازانەش نوسی کە لەگەڵیدا بوون وەسیەتی بۆکردن بەم وتەیە کە فەرمویەتی : پاش ئەوە من فەرمان بەخۆت و ئەو سەربازانەش دەدەن کە لەگەڵتدان بە خواپەرستی لەسەر هەموو حاڵەکانەوە چونکە خواپەرستی باشترین ئامادە باشیە لەسەر دوژمن و بەهێزترین چەکە لە جەنگدا، فەرمان بە خۆت و یارانت دەدەم کە زیاتر لە تاوان خۆتان بپارێزن وەك لەوەی کە خۆتان لە دوژمن دەپارێزن چونکە تاوانی سوپا مەترسیدارترە لەسەریان لە دوژمنەکانیان ،خوای گەورە موسڵمانان سەرکەوتوو دەکات بەهۆی سەرپێچی کردنی دوژمنانیان بۆخودا.[١]

### ١١- بەریان پێ بگرێت لە خۆسەرقاڵکردن بە کاری بازرگانی و کشتوکاڵی و هاوشێوەکانی:

عومەر(ﷺ) فەرمانی بە جارچیەکەی دا بچێتە دەرەوە بۆ لای فەرماندەی سوپاکان و ئەوانیش بەسەربازانیان بگەیەنن کە موچەکانیان بەردەوام و ڕزق و ڕۆزی منداڵەکانیان پارسەك و بەریان پێ بگرێت لە کشتوکاڵ کردن و تەنانەت سزای ئەو کەسانەشی دا سەرقاڵی ئەو کارانە بوون،[٢] هەموو ئەمانەش سووربوونی عومەر(ﷺ) بوو لەسەر خۆ یەکلایی کردنەوەی سەربازان بۆ جیهاد و بڵاوکردنەوەی ئیسلام و بۆ ئەوەی کە نەنوسێن بە زەویەوە کاتێ کشتوکاڵ دەکەن چونکە بۆ ئەم کارە گۆشەگیر دەبن و دڵیان سەرقاڵ دەبێت، لەبەر ئەوە عومەر(ﷺ) توانی کۆمەڵە سەربازێکی خۆیەکلاکەرەوە بۆ جەنگ بەدی بکات کە ئامادەین بۆ کاتی پێویست و خوازراو لە چوارچێوەی بڵابونەوەیان بۆکۆکردنەوەی بەروبووم و ئەوەی لە دروێنە سووربوون و کڕین و فرۆشتنندا بەدوای بینی.[٣]

### چوارەم: بایەخدانی عومەر بەسنووری دەوڵەت:

عومەر(ﷺ) بەهۆی مەترسی سەلامەتی گیانی موسڵمانان و سنووری دەوڵەتی ئیسلامی بۆ فراوان بوونی و بێزاری بۆ جەنگی ڕۆم ، هەر کاتێك کە باسی ڕۆم دەکرا دەیفەرموو: سوێند بە خوا پێم خۆش بوو کە ئەو ڕێبازە پشکۆیەك بوایە لە نێوانی ئێمە و ئەواندا، ئەوەی کە لە خواریەوەیەتی بۆ ئێمە و ئەوەش کە لە پشتیەوەیەتی بۆ ڕۆمەکان بوایە،[٤] سەبارەت بە سنووری دەوڵەتی ئیسلامیش بەرەو فارسەکان هەمان شتی فەرموو: پێم خۆش بوو کە لە نێوان عێراق و نێوان چیاکەدا بەربەستێك هەبوایە کە نە ئێمە پێچمان بۆ ئەوان لێدابا و نە ئەوان پێچیان بۆ ئێمە لێدابا، ئێمە وامان زانی لە گوندەکانی عێراق وە من سەلامەتی موسڵمانان دەوروژێنم لەسەر ئەنفال،[٥] بۆیە فەرمانی د ابە

---

١ـ الفاروق عمر بن الخطاب، محمد رشيد رضا (ص: ١١٩).
٢ـ الادارة العسكرية (١/٢٥٦).
٣ـ هەمان سەرچاوە (١/٢٥٧).
٤ـ تأريخ اليعقوبي (٢/١٥٥).
٥ـ تأريخ الطبري نقلا عن الادارة العسكرية (١/٣٥٢).

ڕەساندنی چەند بنکەیەکی سەربازی ئیسلامی کە ژمارەیەك ئەرك و کاری هەبوو کە پێشتر ئاماژەمان بە هەندێکیان کردووە سەربازی بوونی وەك چەند مەڵبەندێکی جەنگی لە پێگە ستراتیژیە پێشکەوتووەکاندا لەسەر سنوور و لە نێوانی و نێوان وڵاتە ڕزگارکراوەکان هەتا هەر دوژمنکاریەکی دەرەکی بگێڕێتەوە و وەك مەڵبەندگەلێك وابێت بۆ کۆکردنەوەی سەربازان و بڵاوکردنەوەی ئیسلام و لە پێشەنگی ئەمانەوە شاری بەصرە و کوفە بون لە هاوسێکانی دەوڵەتی فارس و فستات لە میسر،[1] چەندین پێگەیەکی لە کەنارەکانیدا و لە کەناری شامدا بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی ڕۆم لە دەریاوە، سەربازی چوار سەربازگە بوون لەوانەی لە دواییدا هاتن کە دەوترێت سەربازی حمص و سەربازی دیمەشق و سەربازی ئەردەن و سەربازی فەلەستین بە جۆرێك کە بۆ پسپۆڕی ئەوان بووە هەتا پێی شارەزا بن وە ئەوان نیشانەی کۆکردنەوەیان هەبووە لەسەر ڕەچەڵەك و بەمە لای فەرماندەکانیان ناسراونەتەوە بۆ ئاسان کردنی کاری بەڕێوەبەرایەتیەکەیان لە ئەرکی گرنگی سەربازی و چاودێری کردنی کاروبارەکانیان لەوانەش موچە،[2] ئەمە سەبارەت بە لایەنی سەربازگەکان قایمکاریەکان کە لە پێگەکاندان و پێشتر دوژمنانیان تێدا وەدەرنراوە و موسڵمانان دەستیان بەسەردا گرتووە و کردوویانەتە پێگەیەکی سەربازی و سەربازەکانیان تێدا نیشتەجێ کردووە بۆ پارێزگاری کردن لە سنووری دەوڵەتی ئیسلامی،[3] پاشان موسڵمانان هەرچەند لە ڕزگارکردن پێشکەوتوون لە کۆتایی بەرفراوان کردنەکانیان پێگەیەکیان دروست کردووە، کە پارێزگاری لە سنوورەکان کردووە و بە سەربازە یەکگرتووەکاندا بە هێز بۆتەوە و یەکێك لە لێهاتووترین سەرکردەکان کاری بەڕێوەبردنی گرتۆتە دەست،[4] لە گرنگترین ئەو لێپرسینەوانەی، کە عومەر(ﷺ) لە هەرێمەکانی عێراق و ڕۆژهەلات و ئەو پێگانەی کە لە نێوان موسڵمانان و فارسەکان گرتەبەر لە کاتێکدا بوو کە کۆبوونەوەی فارسەکان لەسەردەستی یەزدجەرد گەیشتە موسەنای کوڕی حارسە و موسڵمانان و ئەوانیش نامەیەکیان لەم بارەیەوە بۆ عومەر نووسی خەلیفەش بەمە وڵامی دانەوە، دەفەرمووێت: بەڵام پاش ئەوە لە نێوان پشتێنەکانی عەجەمەکان بێنە دەرەوەو لەنێو ئەو ئاوانەدا بڵاوەی لێ بکەن کە لە دوای عەجەمەکانەوە دێن لەسەر سنووری زەویەکانتان و زەویەکانیان... پاشان موسەنا فەرمانەکەی بەجێ هێنا،[5] هەروەها عومەر(ﷺ) وەسیەتی بۆ سەعد کرد لە پێش ڕووداوی جەنگی قادسیە فەرمووی: ئەگەر گەشتیتە قادسیە ئەوا بنکە پڕ چەکەکانت لەسەر ڕێگەی چیاکاندا بێت،[6] لە نزیك شاری جەلەولا عومەر(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ سەعد کە تیایدا دەفەرمووێت: ئەگەر خوای گەورە سەربازگە شکست پێ بهێنێت، سەربازگەی میهران و سەربازگەی ئەنتاق پاشان قەعقاعی کوڕی عەمر لە یەکێك لە پێگەکانی حەلوان

١ـ الادارة العسكرية (١/٤٥٢).
٢ـ فتوح البلدان (١/١٥٦).
٣ـ تأريخ التمدن، جرجي زيدان (١/١٧٩).
٤ـ الادارة العسكرية (١/٤٥٣).
٥ـ الادارة العسكرية (١/٤٥٣).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

بە سەربازگەلێکی موسڵمانان پێشڕەوی کرد بۆ پاراستنی ناوچەکە و پارێزگاری لێ کردنی لە پێشڕەوی دوژمنان هەتا بێتە ڕۆشنابییەك بۆ سەربازە جەنگاوەرەکان و نیشتەجێگانی موسڵمانان،[1] لەبەر ئەوە سەرکردە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(ﷺ) لە عێراق داوا لە سەربازەکانی دەکات و دەیان وروژێنێ لەسەر پێشڕەوی کردن بەرەو ناوچەکانی فارس و هەواڵیان دەداتێ کە پێگە و دەروازەکان داخراون ، دەفەرمووێت: لە پشتانەوە شتێك نیە کە دەست بەردارانتان لە خاوەن ڕۆژگاران لێوەی بێنە دەری و ئەوان دەروازەکانی خۆیان پەك خست و خۆیان لە ناو برد،[2] جێگەی سەرنجە کە بنکە سەربازیەکان لە سەردەمی عومەردا بە فەرمانی سەرکردەیەکی باڵای مەڵبەندەکان نەبوایە بۆ بەڕێوەبەرایەتیە سەربازیەکان تەشەنەی نەدەکرد وە ئەمەش لەو وتەیەی عومەردا هاتووە کە بە سەرکردەی ئەو بنکانە دەفەرمووێت: فارسەکان لە براکانتان سەرقاڵ بکەن و بەمەش ئومەت و زەویەکانتان بپارێزن و لەسەر سنوورەکانی نێوان فارس و ئەهواز نیشتەجێ بن تا فەرمانی منتان پێدەگات،[3] لەسەردەمی فاروقدا پێگەو دەروازەکانی کوفە بە تەنها گەیشتە چوار دەروازە کە بریتی بوون لە دەروازەکانی حەلوان کە قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی سەرپەرشتی دەکرد، دەروازەی ماسیزان کە خەراری کوڕی خەتاب سەرپرشتی دەکرد، دەروازەی قرقیسیا،[4] کە عومەری کوڕی مالکی ئەلزەهری و دەروازەی موسڵ کە عبداللە کوڕی مەعتەمی عەبسی سەرپەرشتیان دەکرد وە هەریەکە لەم سەرکردانە کەسێکیان هەبوو کە نوێنەرایەتی دەکردن ئەگەر خۆیان بۆ ڕاپەڕاندنی کارێك لەوێ نەبوونایە، ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە موسڵمانان لە هیچ جێگەیەکدا شوێنی قایم و تۆکمەی خۆیان بنیات نەدەنا و لە هیچ ناوچەیەکدا شارێکیان پێك نەدەهێنا هەتامزگەوتێکیان تێدا بنیات نەنایە، ئەمەش لەبەرئەوەی ڕۆڵی بانگەوازی و پەروەردەییو جیهادی خۆی هەبووە هەروەك ئەوەی کە زانراوە،[5] بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی بە پاراستنی سنووری نێوان ڕۆم و موسڵمانانەوە هەیە لە بەرەی شامەوە لە سەردەمی عومەر(ﷺ)، بایەخی عومەر بەمە دەستی پێکرد هەر لە سەرەتای ڕزگاریخوازی ئیسلامی بۆ وڵاتی شام بە جۆرێك بۆ ئەمە چەندین لێپرسینەوەی بەرگریکارانەی زۆر و هەژماری بۆ پاراستنی ناوچەکە گرتەبەر، لەمانە بنیاتنانی چەندین رووکاری کار و ڕەساندنی پاسەوان و بە هەندگرتنی بنکە چەکداریەکانی پێی بتەوکردنی شارە کەناریەکان بۆ لایەنی ئیشکگری هەمیشەیی سەربازی چوون قەلا ڕزگارکراوەکان و ڕێکخستنی جەنگاوەران تیایدا، واتا سەربازی جەنگی و سیاسەتی ڕاگواستنەوەیان گواستنەوەکە کەنارەکانی شامی بە تەواوی لە ژێر سایەی ئیدارەتی سەربازی یەکگرتوو کۆ کردنەوە، لەو ساڵەی کە عومەر تیایدا ڕۆیشت بۆ شام بە مەبەستی مۆرکردنی ئاشتەوایی دانیشتوانی قودس هەندێ دەروازەی شامیەکانی

١ـ الادارة العسكرية (٤٥٤/١) نقلا عن الطبري.
٢ـ هەمان سەرچاوە.
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ بلد على نهر الخابوور قرب مالك بن طوق وعندها مصب الخابوور في الفرات.
٥ـ الادارة العسكرية (٤٥٥/١).

بەسەر کردەوە و تیایاندا چەندین پارێزەر و بنکەی سەربازی دانا و تیایدا فەرمانداەی هەواڵ و سەرکردەکانی ڕێکخست و دەروازە و بنکە چەکداریەکانی بەستەوە بە نێوانیاندا سووڕایەوە هەتا پێویستیە بەرگریخوازەکانیان بە هەند بگرێت،[1] پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە و پێش گەڕانەوەشی وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و فەرمووی: ئەوەش بزانن کە من کراومەتە والی بە سەتانەوە ئەوەی کە لە سەرمە بەجێم هێناوە لەوەی کە خوای گەورە لە کاری ئێوەی پێ سپاردووم ئێمە یەکسانی دەسکەوتەکانتان و پلە و پایەکانتان و شەڕگەکانتان دابەش کردووە لە نێوانتاندا، پێمان گەیشتووە کە چیتان لە لایە لەبەر ئەوە سەربازگەڵێکمان بۆ ئامادەکردوون و چەندین دەروازەمان بۆ سازدان وە بەرفراوانمان کرد لە سەرتان ئەوەی کە گەیشتە دەستکەوتەکانتان وە ئەوەی کە ئێوە لەسەری جەنگاون لە شانتان و چاوتێڕینەکانتانمان بۆ ناونان فەرمانماندا بە دیاری کردنی موچە و ڕزق و ڕۆزی و دەستکەوتەکانتان هەر کەس شارەزا بوو وە شتێکی زانی کە کاری پێ بکرێت ئەوا پێمانی ڕابگەیەنێت إنشاألله کاری پێ دەکەین وە هیچ هێزێك نەبووە مەگەر بە پشت بەستن بە خوای گەورە،[2] کاتێ ئەبوعەبەیدەی کوڕی جەڕاح دەروازەی ئەنتاکیەی بە سنووری شامی باکووری ئازاد کرد عومەر(ﷺ) نامەیەکی بۆ نوسی کە تیایدا دەفەرموێ: لە ئەنتاکیە گروپێك لە موسڵمانان لە خەڵکانی خاوەن نیازی ڕەسەن ڕێك بخە و تیایدا بیان کەرە ئێشکگر و موچەیان بدەرێ[3] بۆیە ئەبو عوبەیدە خەڵکانێکی لە دانیشتوانی شاری حمص و بەعلەبەك گواستەوە و تیایدا کردنیە ئێشکگر بۆ پاراستنی سنووری ناوچەکە لە هەر دوژمنایەتیەکی دەرەکی وە لەسەر ئەو دەروازە حەبیبی کوڕی موسلمەی فەهری دانا کە لە دەروازەی ئەنتاکیە پێگەیەکی بەهەند گرت بۆ پێشڕەوی کردنی بۆ جەنگێك لە پشت سنورە ئیسلامیەکانەوە، هەر لەو شوێنەوە یارمەتی و کۆمەکی دەگەیشتە هێڵەکانی پێشەوە لە بەرەی ڕۆمیداو لەوانەش جەنگی بۆجەرجومە. کە لەگەڵ خەڵکەکەیدا ڕێکەوت تا ببنە پشتیوانێك بۆ موسڵمان و سەرچاوە و بنکەی چەکداری بن لە چیای لوکام لە دژی ڕۆمەکان،[4] هەروەها کاتێ ئەبوعوبەیدە ڕۆشت بۆ دەروازەی بالس[5] تیایدا ژمارەیەك جەنگاوەری ساز کرد و میلەتێکی لە عەرەبەکانی شام نیشتە جێ کرد کە پاش هاتنی موسڵمانان بۆ پاراستنی دەروازەکە و ڕێکخستنی لە هێرشەکانی ڕۆم موسڵمان بووبوون،[6] لە بتەوکاریەکان و ئەو هۆکارە بەرگریخوازانەی، کە موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان وەك والیەك بەهەندگرتی بۆ پاراستنی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی بۆ کەنارەکانی شام لە کۆتای سەردەمی عومەر و سەرەتای خەلافەتی عوسمان(ﷺ) بریتی بوو لە هەستانی بە بنیاتنانی چەندین قەڵای وەك ئەترەسوس و مەرقیەو بلنیاس و پتاسەلیمە، سەرباری هەستانی بە

---

١ـ الادارة العسكرية (١/٤٥٧).
٢ـ تأريخ الطبري (٤/٤٠).
٣ـ فتوح البلدان (١/١٧٥).
٤ـ معجم البلدان (٢/١٣٢).
٥ـ بالس:- شارێکە لە شام لە نێوان حەلەب و ڕقە.
٦ـ فتوح البلدان للبلاذري (١/٢٤٤).

گەشەدان بەو قەلاّیانەی، کە موسڵمانان لە کەنارەکانی شام دەستیان بە سەرداگرت و هەموویانی بەهێزکرد بەسەربازانی جەنگاوەر و کردنی بە چەند کەرتێکەوە تیایدا و چەندین ڕووکاری تێدا بنیاتناو پاسەوانی تیادانا بۆ چاودێری کردنی نزیك بوونەوەی دوژمن وە هەریەك لەو پاسەوانانە لەو کاتەدا هەڵدەستێت بە کردنەوەی ئاگرێك بۆ ئەوەی دوای خۆی هەتا هەواڵەکە دەگاتە شار و دەروازە و بنکە چەکداریەکان لە ماوەیەکی کەم و کورتدا و ئەوانیش بە خێرای بەرەو ئەو بەرەیە بەرێ دەکەون کە دوژمن لێوەی پێشڕەوی کردووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی و بەرپێگرتنی لە سەرکەوتن،[1] و ئەوەی کە پەیوەندی بە پاراستنی سنوورەوە هەیە لە نێوان موسڵمانان و ڕۆمەکان لە بەرەی میسریەوە بۆ ئیدارەی عومەر(ﷺ) ئەوە چاودێری و بایەخ پێدانی دەیگرێتەوە وەك هاوشێوەکانی لە بەرەکانی تردا، عەمری کوڕی عاص فەرمانی دا بەبنیاتنانی فستات وەك پێگەیەکی سەربازی یەکەم بۆ گرتنەخۆی سەربازانی موسڵمانان لە ناوچەکە وە بۆ هەر تیرە و هۆزێك شوێنێکی پاسەوانی و زانایەکی دانا لەوانەش کە دەروازەیەك بوون لە جەنگی ڕزگاریخوازە ئیسلامیەکان بۆ باکووری ئەفریقا سەرباری ئەوەی کە یەکێك بوو لە پارێزەرە بەرگریکارە گرنگەکان بۆ دەروازەی میسری بۆ ئەوەی کە لەوێدا کارێکی گرنگ هەبێت کە پیایدا لاربوونەتەوە، عومەر(ﷺ) لە شوێنی مەرجی دانا هەروەك ئەوەی کە لە شوێنی پێگەکانی پێشوویدا مەرجی لەسەر دانابوون بەوەی کە لە نێوانی و نێوان سەرکردایەتی بالای ناوەندیدا لە شار ئاوێك یان ڕووبارێك نەبێت هەتا پەیوەندی نێوانیان بەردەوام و ئاسان بێت،[2] عەمری کوڕی عاصیش وە بیری سەربازانی هێنایەوە کە پێگەیان لە میسر کە پێك هاتبوو لە دەستبەندێك و ئەمەش لەو وتەیەدا هاتووە کە دەفەرموێت: ئەوەش بزانن کە ئێوە لە پێوەندێکدان تا ڕۆژی دوایی و بە هۆی دوژمنەوە لەدەوروبەرتان ئارەزوومەنبینی دڵیان بۆئێوەو بۆ شوێنەکەتان کە کانگەی کشتوکاڵ و ماڵ و چاکەی زۆر و فرە و بەرەکەتی بوژایەوە، لەو ماوەیەی کە موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر قەلا و ئەو بنکە چەکداریانەی، کە لە دەروازەە میسریەکاندا بوون کە هەستان بە نوێکردنەوە و ڕێکخستنەوەی و سوود وەرگرتن لێی لە شوێنی پێوەندەکانیاندا کە بەهێزیان کردۆتەوە بە سەربازەکان وە ئەو دەمە عەمریش یەکەمین بنکەی چەکداری میسر و کاربەدەستانی بووە،[3] هەروەها فاروق فەرمانی دا بە ڕەساندنی بنکە چەکداریەکان لە سەرانسەری کەنارەکانی میسر،[4] وە کاتێك کە عەمری کوڕی عاص دەروازە و دەروازەی ئەسکەندەریەی ئازاد کرد هەزار کەس لە یارانی پڕ چەکی تێدا دانا بۆ پاراستن و پارێزگاری لێکردنی، ژمارەیان هێندە نەبوو کە بە مەبەستی خوازراو بێت لەوەی کە وابکات لە ڕۆمەکان لە دەریاوە بگەڕێنەوە بۆ لایان پاشان کەوتنە گیانی ئەم هەزار کەسە و ژمارەیەکیان لێ کوشتن و ژمارەیەکیان هەڵهاتن، دواتر عەمری کوڕی عاص جارێکی تر ئەگەرایە وە سەر ڕۆمەکان و

---

١ـ فتوح البلدان (١/١٥٠-١٥٨).
٢ـ فتوح لإبن عبدالحكم، الادارة العسكرية (٤٦٢/١).
٣ـ تأريخ اليعقوبي (ص: ٣٣٠).
٤ـ البداية والنهاية (١٠٣/٧).

دەروازەکەی ڕزگارکرد و لە یارانی ژمارەیەکی بۆ پێوەنبینی ئەسکەندەریە تەرخان کرد کە چواریەکی سوپاکەی بوو هەروەها لە کەنارەکانیش چواریەکی دانا و نیوەکەی تر ی لە شاری فستات لەگەڵی مایەوە[1]، عومەری فاروق هەموو ساڵێك ژمارەیەك لە چەکدارانی خەڵکی مەدینەی پرشنگداری دەنارد بۆ پەیوەندی دەروازی ئەسکەندەریە و نامەی بۆ والیەکانی دەنوسی کە لێی بێ ئاگا نەبن و پێوەندەکانی چڕوپڕتر بکەنەوە، سەرباری ئەوەی کە عەمر چەندین کەسی لە پێوەندچیان بۆ ئەوکارە تەرخان کردبوو،[2] بەمەش عومەر(ﷺ) تێگەیشتن و شارەزای دووری خۆی لە پاراستنی سنوورە وشکانیەکان و تۆکمەکردنیان لە بەرە جەنگیە سێ دانەیەکانی عوامە و شام و میسرەوە تەواوکرد،[3] وە ئەم کارە کەمتەرخەم نەبوو لەسەر ئەم هۆکارە بەرگریکارانەیە بۆ پاراستنی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی بەڵکو عومەر یاسا و ڕێسای هاوینە و زستانەی بۆ دانابوون کە بریتی بوون لەو هەڵمەتانە کە ساڵانە بەرێك و پێکی وەك ئێشکگران لە هەردوو وەرزی هاوین و زستان دەردەچوون،[4] وە هەڵمەتەکانی هاوینە و زستانە کەمتەرخەم نەبوون لە بەسەرکردنەوەی دەروازەکانی شام بەڵکو تەواوی سنووری دەوڵەتە ئیسلامیەکانی ئەو سەردەمەی دەگرتەوە و گەورە سەرکردەکانی وەك ئەبو عو بەیدەی کوڕی ئەلجەراح و موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و نوعمانی کوڕی موقرن و زۆرێکی تر سەرپەرشتیان دەکرد،[5] عومەر لە موچە و رزق و ڕۆزی ئەو سەربازانەی زیاد دەکرد کە دەچوون بۆ ئەو دەروازانە بۆ ئێشکگری تیایدا هەتا دامەزرانیان لەسەر دان بەخۆداگرتنی دوای خۆیان بێت و کەرت کەرتیان بکات تیایدا،[6] ئێمە سەرکردەکانی عومەر لە بەڕێوەبەرایەتی سەربازیەکانیان بەدی دەکەین بۆ جەنگەکان کە دەستکەوتەکانیان دابەش دەکرد بەسەر دانیشتوانی بنکە چەکداریەکان بەو شێوەیەی کە بۆیان دابەش دەکرێت لەبەر ئەوەی کە ئەوان کراسێك بوون بۆ موسڵمانان هەتا لە هەر ڕوویەك لە ڕویەکانەوە مەترسی ڕویان لێ نەنێ،[7] وە کاتێ کە مەرگ ڕێگەی بە خەلیفە عومەر(ﷺ) گرت ئەو لە کاتی کۆچی دوایدا وە سیەتی بۆ خەلیفەی دوای خۆی کرد و فەرمووی ئەوسیەت بۆ خەلیفەکەی دوای خۆم دەکەم کە باش بێت لەگەڵ خەڵکی شارەکان لەبەر ئەوەی کە ئەوان عەیامی ئیسلام و باج کۆکەرەوەی سامان و ڕق ئەستوری دوژمنن، داوام لەو خەلیفەیە ئەوەیە کە جگە لە چاکەیان کە بە ڕەزامەندی خۆیانە هیچی تریان لێ وەرنەگرێت.[8]

---

١ـ البحرية في مصر الاسلامية وانارها الباقية، سعاد ماهر (ص: ٧٧).
٢ـ فتوح مصر (ص: ١٩٢)، الخطط للمقزري (١٦٧/١).
٣ـ الادارة العسكرية (٤٦٤/١).
٤ـ هەمان سەرچاوە.(٤٦٤/١).
٥ـ فتوح البلدان للبلاذري (١٩٤/١-١٩٥).
٦ـ الفن الحربي في صدر الاسلام عبدالرؤوف عون (ص: ٢٠١)، الادارة العسكرية (٤٦٥/١).
٧ـ الادارة العسكرية (٤٦٥/٢)، تأريخ الطبري (١٣٤/٤).
٨ـ مناقب أمير المؤمنين لأبن الجوزي (ص: ٢١٩-٢٢٠).

پێنجەم: پەیوەندی عومەر بە پادشاکانەوە:

پەیوەندی ئەو دەمەی عومەر لەگەڵ پادشای فارس پەیوەندیەکی شەڕخوازانەبووە، ئەو هەتا کۆچی دوای کرد لەگەڵ سوپاکەیدا سەرقاڵی ڕاوەدوونانی یەزدجەرد بوو لە وڵاتەکەیدا و سەروەت و سامانەکەی دوچاری ژانە سەر دەکرد، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ پادشای ڕۆمەکان ڕێکەوتن لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا بەرپابوو بەتایبەتی پاش ئەوەی، کە عومەر(ﷺ) هەریەکە لە شام و جزیرەی ڕزگارکرد و لەنێوانی و نێوان پادشای ڕۆمەکان چەند نامە گۆڕینەوەیەك هاتە کایەوە، مێژوونوسان باس لەوە دەکەن کە ئەم نامەگۆڕینەوانە لەگەڵ هێرەقلدا بوون بەڵام باسیان لەوە نەکردوە کە ئایا لەگەڵ هیرەمکی یەکەمدا بووە کە عومەر وڵاتی شامی لێ سەند یان لەگەڵ کوڕەکەیدا کە هیرەمکی دووەم بووە و ناسراوە بە هیرەمکی قوستەنتین، لەبەر ئەوەی کە هیرەمکی یەکەم ساڵی ٦٤١ ز کە هاوکاتە لەگەڵ ساڵی ١١ ك مردووە و ئەو کوڕەی کە پێشتر ناوی هاتووە دەستەڵاتی گرتۆتە دەست واتە پێش کۆچی دوای عومەر(ﷺ) بە دوو ساڵ و ئەگەرچی ئەو نامە ناردن و نامە گۆڕینەوانە لەگەڵ هیرەمکی یەکەم یان دووەمدا بووبێت، پەیامنێران لە نێوانیاندا بەردەوام بوون لە نامە گۆڕینەوەی نێوانیان، جارێك ئوم کەلسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالب(ﷺ)و خێزانی عومەری کوڕی خەتاب جارێك لەگەڵ پەیامنێری مەدینەدا دیاریەك لە نەرم و نیانترین دیاریەکانی مەدینە دەنێریت بۆ ئیپراتۆرەی ڕۆم کە خێزانی هیرەقل دەکات لە بەرامبەردا ئەویش دیاریەکی جوان و هاوشێوەی ئەو دیاریە دەنێرێت بۆ ئوم کەلسوم کە ئەنگوستیلەیەکی زێڕ دەبێت، بەڵام عومەر لێی وەردەگرێت و دەیگێڕێتەوە بۆ(بيت المال)، لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتووە کە ئوم کەلسوم ئەم دیاریەی لەگەڵ پۆستەی عومەردا ڕەوانە کردووە.[1]

شەشەم: لە ئەنجامەکانی فتوحاتی عومەر:

١- ڕامالێنی دەوڵەتی فارسی (ساسانی) لە بوون و لە لایەنی بەرامبەردا کە بارستی دەوڵەتی ڕۆمی (بێزەنتینی) بینی و پاشان ئەو دووبەرەکیە نەفامیەی کە لە نێوان فارسەکان و ڕۆمەکان هەڵگیرسا بوو گەلانی ئەو ناوچەیەی کەمەنکێش کرد بەرەو جەنگێکی بەردەوام کە هەردوو دەوڵەتەی پێکەوە کۆتایی پێهێنا، ئەمەش بۆ هیچ نەبوو جگە لە پارێزگاری کردن لە بەرژەوەندی سەرکردەکان بوو لە هەردوو دەوڵەتەکەدا.

٢- بوونی یەك سەرکردەی جیهانی بۆ ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە ناوەنبینی کۆی هەموو زەویەوە و درێژ بۆتەوە لە سنووری چینی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای عەرەبی بۆ بەشی ڕۆژئاوا، دەریای عەرەبی باشوورەوە هەتا ئاسیای بچووك لە باکوورەوە، ئەم سەرکردایەتیە سەرکردایەتیەکی نوێیە بە چەند کەرەستەیەکەوە کە مرۆڤایەتی بە خۆیەوە نەیبینیبووە. وە لە تۆکمەییدا بە هاوشێوەی و بە هاوشێوەی تەواو ڕۆڵەی گەلانی ناوچەکە بووە بە بەها و هاوشێوە و ڕێسا.

---

١ـ تأريخ الطبري (٢٥٩/٥)، اشهر مشاهيد الاسلام (٣٥٩/٢).

٣- گەورەیی و دەست بەسەرا گرتنی بەرنامەی خودایی بەسەر تەواوی خەڵکیدا بێ ئەوەی کە فشاریان لێ بکرێت لە گۆڕینی بیروباوەڕ و ئاینیان، بەبێ جیاوازی لە نێوان ڕەش و سوور و سپی و زەردیدا، بەڵکە تەواوی خەڵکی لە بەردەم شەرعی خوادا یەکسانن وە جیاوازی لە نێوانیاندا ناکرێت جگە بە لە خوا ترسان، خەڵکی بەرووبوومی بەرنامەی خوداییان لە ژیانیان لە سەقامگیری و نیشتەجێبوون چنگ بکەوێت، لەگەڵ بەرەکەتەکان و گووشادی لەگەڵ ڕزق و ڕۆزی و شتەکانی تردا.

٤- لە دونیای خەڵکیدا ئومەتی ئیسلام دەرکەوت کە لە نێوان تاکەکانیدا بیروباوەڕی یەکتاپەرستی و شەریعەتی خودایی کۆکردەوە وە دانەکرەی هۆزایەتی و ڕەچەڵەك پەرستی و دان پێدانراوە سەر زەمینیەکانی تری هەڵماڵی، و لە نێو ئەم ئومەتەدا کۆمەڵێك سەرکردە لە ڕەگەزی هۆزایەتی دەرکەوتن، کە پلە و پایەیەکی بەرز و بڵندیان هەبووە لە ناوەنبینی ئەم ئومەتەدا، شتێك نەبووە کە نەنگی بدۆزێتەوە یان شوێنەواری لە نێو ئەم ئومەتدا بگۆڕێت، لەبەر ئەوە بووە کە بەو کەسانەی کە لەگەڵیان دەجەنگان دەیان وت: ئەگەر بە دەمانەوە هاتن بۆ سەر بڕواهێنان بە ئاینەکەمان ئەوا قورئانتان لە نێودا بەجێ دێڵین و لەسەری دەتان سازێنین، هەتا کار بە حوکمەکانی بکەن و پاشەکشە لە کاروبار و وڵاتتان بکەین.[1]

٥- شارستانیەتیەکی خودایی تەواوکار هاوسەنگ و بەڕووی یەکدا ڕیزکراو دەرکەوت کە لە نێو سەرانسەریەکانیدا کارلێکی میللەتان و گەلانێکی پلەداری گرتەوە لە ژێر سایەی شەرعی خودا و لە نێو بە ئەندام بوونیدا تەواو جیهانیانی هەڵگێڕایەوە، ڕەش و زەرد و سپیەکەشی بە پێی بەرنامەی خودایی و حوکمەکانی، عومەر بوویە نموونەیەك لە سەرکردایەتی شارستانیەتیدا بۆ مرۆڤایەتی کە لەسەردەمی خۆیدا وێنەیەکی پڕشنگدارمان بۆ مرۆڤێکی بەهێز و ئیماندار لە جیهاندا دەداتێ — کە تەواوی تواناکانی دەوڵەتەکەی و سوپاکەی و شوێنکەوتووانی و زانیاری و زانستیەکانی و هۆکارەکانی دەخاتە ئەگەر بوو بەهێزکردنی شەرعی خودای و جێنشین کردنی ئاینەکەی و خزمەتی مرۆڤایەتی، و بەرزڕاگرتنی وشەی (ألله)، و دەرکردنی مرۆڤایەتی لە تاریکیەوە بۆ ڕووناکی و لە پەرستنی مرۆڤ و مادده بۆ پەرستنی خودا، ئەو ئایەتانەی خوای گەورە پەیڕەو دەکات کە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾ (الحج: ٤١).

بە ڕاستی جەنگە ڕزگاریخوازە ئیسلامیەکان شارستانیەتێکی بەرزی مرۆڤایەتیان لە سایەی ئاینی ئیسلام بەرهەم هێنا، بەمەش دەتوانین شارستانیەتی خودایی بناسین بەوەی کە: کارلێکی چالاکیە مرۆییەکانە بۆ یەك گروە بۆ جێنشینی خودا لەسەر زەوی بە پێی کاتەکان، لە چوارچێوەی تێگەیشتنی ئیسلامی لە ژیان و ئەگەردوون و مرۆڤایەتی.[2]

---

١ـ دراسات في عهد النبوة للشجاع (ص: ٣٧٠).
٢ـ الاسلام والحضارة للندوة العالمية للشباب (١/ ٩٠).

# دوانگەی پێنجەم

## ڕۆژانی دوایی لە ژیانی عومەری فاروق

بە ڕاستی ئەمیری باوەڕداران عومەر(ﷺ) نموونەی خەلیفەیەکی دادپەروەری ئیماندار بوو، موجاهیدی لە خوا ترس و خواناس بوو، بە هێز و متمانە پێکراو بوو قەڵایەکی نەبەز بوو بۆ ئومەتی ئیسلامی و بیروباوەڕەکەی، تەواوی ڕۆژانی خەلافەتەکەی(ﷺ) لە پێناو خزمەتی ئاینەکەی و بیروباوەڕەکەی و ئەو ئومەتەی بەسەر برد کە کاری سەرکردایەتی کردنی گرتە دەست، بە ڕاستی سەرکردەی باڵا بوو بۆ سوپا و شارەزایەکی تێکۆشەر بوو کە هەمووان دەگەڕێنەوە بۆ لای ڕا و بۆچوونەکانی، دادپەروەرێکی دادپەروەر و بێگەرد بوو، باوکێکی بە سۆز و بەخشندە بە خەڵکەکانی بوو، بە گەورە و بچووکیەوە، بەلاواز و بێدەسەڵات و بەهێز و دەسەڵاتداریەوە، بە هەژار و سەرمایەداریەوە ئیماندارێکی ڕاستگۆ بووە بە خوا و پێغەمبەرەکەی، کەسایەتیەکی سیاسی بەهێزی ئەزموونداری ئیداری و دانایەکی دووربین بووە، بە سەرکردایەتی خۆی کۆشك و تەلاری ئومەتی تۆکمەو پتەو کردووە، لەسەردەمی ئەودا پشتیوانیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی پێکەوە نووساون، بەو سەرکردایەتیەی گەورەترین سەرکەوتنی بەسەر دەوڵەتی فارسیدا دەستەبەر کردووە لە جەنگە ڕزگاریخوازەکاندا، کە هەریەکە لە جەنگەکانی قادسیە و مەدائن و جەلەولا و نەهاوەند بوو، پاشان ئازاد کردنی وڵاتی شام و میسر لە کۆنترۆڵی ڕۆمە بێزەنتینیەکان تەواو کرا،[1] و دواتر ئیسلام چوویە نێو زۆربەی وڵاتەکانی دەوروبەری دوورگەی عەرەبی، خەلافەتیش بەربەستێکی نەبەز بوو لەبەردەم بەدکاریەکاندا، خوێنی عومەر دەرگایەکی داخراو بوو کە یارانی بەدکار نەیانتوانی لە ماوەی ژیانیدا پێ بخەنە نێو بازنەی موسڵمانانەوە، خراپەکاریش لە سەردەمی ئەودا نەیتوانیووە سەری بڵندا بکاتەوە.[2]

### یەکەم: گفت و گۆی نێوان عومەرو حوزەیفە لەسەر فیتنەو( نزیك کەوتنەوەی شکانی دەرگاکە )

حوزەیفەی کوڕی یەمان(ﷺ) دەفەرمووێت: ئێمە لای عومەر(ﷺ) بووین فەرمووی: کامتان فەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ)ی لەبەرە سەبارەت بە فیتنە؟ منیش وتم: من لەبەرمە هەروەك ئەوەی کە خۆی فەرموویەتی! ئەویش فەرمووی: بێنە، بە ڕاستی تۆ بوێری، وتم: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو

١ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٥١).
٢ـ الخلفاء الراشدون للخالدي (ص: ٧٧).

کە دەیفەرموو: ((فیتنەی پیاو لە نێو کەس و کاری و ماڵی و گیانی و کوڕی دراوسێیدا، ڕۆژوو نوێژ و چاکە، و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەیشارێتەوە)) عومەر فەرمووی: من ئەوەم ناوێ، بەڵکو ئەو فیتنەیەم دەوێ کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات! منیش وتم: تۆ چیتە بەو کارەوە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ لە نێوان تۆ و ئەودا دەرگایەکی داخراو هەیە!! ئەویش وتی: ئەو دەرگایە دەشکێت یان دەکرێتەوە؟ منیش وتم: نەخێر، بەڵکو دەشکێت!! ئەویش فەرمووی: ئەمە شایستەتر ئەگەر هەرگیز دانەخرێت، تا هاتنی قیامەت!! ئەبو وائلی ڕاوی لە حوزەیفەوە هێناویەتی و دەفەرمووێت: ئایا عومەر هیچ لە بابەتی ئەو دەرگایە دەزانێت؟ حوزەیفە فەرمووی: بەڵێ هەروەك ئەوەی کە دەزانێت بە دوای ڕۆژدا شەو دێ! من فەرموودەیەك بۆ باس کردووە کە هەڵە نیە ئەبو وائل فەرمووی: ترسای لەوەی کە پرسیارێك بکەیت لە حوزەیفە: ئەو دەرگا کێیە؟ بە مەسروقمان وت: پرسیار بکە لە حوزەیفە ئەو دەرگایە کێیە؟ مەسروق بە حوزەیفەی وت: ئەو دەرگایە کێیە؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە عومەرە!!![1]

بە ڕاستی حوزەیفە ئەو زانیاریەی پێشکەش بە عومەر(ﷺ) کرد، کە ئەو دەرگا نەبەزە هەر ئەو دەرگایەیە کە بەر بە تەشەنەکردنی فیتنە لەسەر موسڵمانان دەگرێت، حەرامی دەکات لێیان، ئەم دەرگایە تێك شکانێك تێك دەشکێت وە زۆر خراپ ورد و خاش دەبێت، ئەمەش مانای وایە کە هەرگیز پاش ئەوە تا ڕۆژی قیامەت داناخرێت ، ئەمە هەر ئەوە کە عومەر لێی تێگەیشت واتا ئەو فیتنەیە لە نێو موسڵمانان‌دا بە پەرش و بڵاوی دەمێنێتەوە و هەرگیز ناتوانن دای بماڵن یان ڕای بگرن یان زاڵ بن بەسەریداوە حوزەیفەش ئەم بڕیارە لە خۆیەوە دەرناکات، پێشبینیشی ناکات، لە غەیب نازانێت بەڵکو ئەمەی لە پێغەمبەر(ﷺ)ەوە بیستووە و تێی گەیشتووە و لەبەری کردووە، هەر لەبەر ئەوەشە درێژە بە قسەکەی بۆ عومەر دەدات و دەفەرمووێت: من بە جۆرێك ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕاوەتەوە کە لە کارە هەڵەکان نیە، واتا من فەرموودەیەکی ڕاست و دروستم بۆ گێڕاوەتەوە، کە نە هەڵەی تێدایە و نە درۆی تێدایە، لەبەر ئەوەی من لە پێغەمبەر(ﷺ)م بیستووە: پاشان عومەر(ﷺ) ئەوا ڕاستیەی دەزانی کە حوزەیفە هەواڵی پێدا، پاش ئەوەش عومەر ئەوەی دەزانی کە خەلافەتەکەی دەرگایەکی نەبەزیووە و ڕێگە لە تەشەنەکردنی فیتنە دەگرێت لەسەر موسڵمانان وە فیتنە لە میانی خەلافەت و سەردەم و ژیانیدا هەرگیز ناتوانێت بەگژ موسڵمانان‌دا بچێتەوە،[2] عومەر لە پێغەمبەری خواوە ئەوەی دەزانی کە شەهید دەبێت، بە شەهیدی دەگاتە بارەگای خودایی، ئەنەسی کوڕی مالك دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) چوویە سەر کێوی ئوحد و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانی لەگەڵ بوو، چیاکە ئەوانی خستە لەرزە، پێغەمبەر(ﷺ) بە پێیە پیرۆزەکانی پێی فەرموو: ((خۆت ڕابگرە ئەی ئوحود، تۆ ئێستا پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە))[3]

---

١ـ البخاري كتاب: الفتن رقم (٧٠٩٦).
٢ـ الخلفاء الراشدون للخالدي (ص: ٧٩).
٣ـ البخاري ك: العصا.

## ١- نزای عومەر لە دوایین حەجیدا لە ساڵی (٢٣)ی کۆچی:

سەعیدی کوڕی موسەیب دەفەرموویت: عومەر (ﷺ) کاتێك کە لە مینا بە ڕاکشانەوە یخیدا تەپۆلکەی لە چەم دروست دەکرد، چمکێکی جلەکەی لەسەر دادەنا و پاشان پیای دەکێشا و دەستەکانی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و دەیفەرموو: خوای گەورە! من بە ساڵاچووم و هێزم نەماوە و خەڵکەکانم پەرش و بلاو بوونەتەوە تکایە گیانم بکێشە بەبێ وون بوون و بەفیڕۆدەر، پاشان هاتەوە مەدینە.[١]

## ٢- داخوازی عومەر بۆ شەهیدی:

زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە و ئەویش لە عومەرەوە هێناویەتی کە دەفەرموویت: خوای گەورە! لە پێناوی ڕێگە و ڕێبازەکەت بە شەهیدی ڕزقم بدەیت، مردنم لە شاری پێغەمبەرەکەت پێ ببەخشیت، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە دەفەرموویت: خوای گەورە! کوژرانێك لە ڕێبازەکەت و مردنێك لە شاری پێغەمبەرەکەتم پێ ببەخشیت، وتیان بە عومەر(ﷺ): ئەمە چۆن دەبێت؟ فەرمووی: خوای گەورە ئەگەر بیەوێت دەینێرێت،[٢] شێخ یوسف کوڕی حسن کوڕی عبدالهادی لەسەر داخوازی عومەر بۆ شەهیدی دەفەرموویت: خوازیاری شەهیدی باش و پەسەند کراوە، ئەمە پێچەوانەی خوازیاری مردنە وە ئەگەر بڵێین جیاوازی نێوانیان چیە؟ دەڵێین خوازیاری مردن، خوازیاری پەلەکردنی مردنە لە پێش کاتی خۆی، مرۆڤ تەمەنی زیاد ناکات مەگەر بە چاکە، خوازیاری شەهیدی ئەوەیە کە مرۆڤ داوای ئەوە بکات لە کاتی کۆتایی هاتنی مەرگیدا بە شەهیدی بمرێت، ئەمە خوازیاری پێشخستنی مەرگی تێدا نیە لە کاتی خۆیدا، بەڵکو خوازیاری چاکیەکی تێدایە.[٣]

## ٣- خەونی عەوفی کوڕی مالکی ئەشجەعی:

عەوفی کوڕی مالکی ئەشجەعی دەفەرموویت: پەتێکم بینی کە لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە، ئەمەش لە خێزانی ئەبو بەکرە(ﷺ) کە خەڵکی سەرکێشی بۆ دەکەن، عومەر بە سێ هەنگاو بەدی کردن، منیش وتم: ئەمە چیە؟ فەرمووی: لەبەر ئەوەی کە ئەو خەلیفەیەکە لە خەلیفەکانی خوای گەورە لەسەر زەویدا، ئەو لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت و بە شەهیدی دەکوژرێت، منیش خێرا چووم بۆ لای ئەبو بەکر و خەونەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: ئەی لاو بڕۆ بۆ لای ئەبو حەفص و بۆم بانگ بکە، کاتێك کە هات فەرمووی: ئەی عەوف بۆی بگێڕەوە بەو شێوەیەی کە دیوتە، کاتێك کە گەیشتمە ئەوەی کە خەلیفەیەکە لە خەلیفەکانی خوای گەورە لەسەر زەوی، عومەر فەرمووی: ئایا نوستوو هەموو ئەمانە دەبینێت، ئەویش فەرمووی: بۆی بگێڕەوە،[٤] وە کاتێك کە بوویە کاربەدەست

---

١ـ تأريخ المدينة، وإسناده صحيح الى سعيد بن المسيب (٨٧٢/٣).
٢ـ الطبقات لإبن سعد (٣٣١/٣) سناده حسن، تأريخ المدينة (٨٧٢/٣).
٣ـ محض الصواب في فضائل أمير المؤمنين عمر بن الخطاب (٧٩١/٣).
٤ـ محض الصواب (٨٦٩/٣).

هاتە ئەستێلەکە، ئەو کە وتاری دەدا بانگی کردم و داینام وە کاتێك کە لە وتارەکەی بوویەوە فەرمووی: خەونەکەتم بۆ بگێڕەوە، منیش وتم: ئایا بەرت پێ نەگرتم لێی؟ ئەویش فەرمووی: ئەی پیاو فێڵم لێ کردی،[١] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە: عەوف دەفەرمووێت: ئایا بە درۆت نەزانی؟ عومەر فەرمووی: نەخێر بەلام شەرمم لە ئەبو بەکر کردن بۆمی بگێڕەوە، [٢] کاتێك کە بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: سەبارەت بە خەلافەت وەك ئەوەی کە دەیبینی پێی گەیشتم، بەڵام ئەوەی کە من لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسم، تکام وایە کە ئەو ئەمەی لە من زانیبێت، سەبارەت بەوەی کە بە شەهیدی بکوژرێم، ئەوا من شەهادەتم دەکرێتە خەڵات لە کاتێکدا کە لە دوورگەی عەرەبدام.[٣]

## ٤- خەونی ئەبو موسای ئەشعەری دەربارەی کۆچی دوایی عومەر:

ئەنەسی کوڕی مالك لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: من وام دەزانی لە خەوندا ئەسپێکی زۆرم گرت هەتا وای لێهات هەموویان لەبەر یەك هەڵدەوەشێنەوە هەتا یەکێکیان مایەوە، پاشان گرتم و بردم بۆ چیای زەلیق، بینیم، کە پێغەمبەر(ﷺ) لەوێیە و ئەبو بەکر وا لە تەنیشتیەوە دەستی بۆ عومەر درێژ دەکرد وەرە، ئەنەس دەفەرمووێت: ئایا تیایدا بۆ عومەرت نەنووسی وەرە؟ پاشان فەرمووی: من نامەوێت هەواڵی مردنی خۆی پێ ڕابگەیەنم.[٤]

## ٥- دوایین وتاری هەینی عومەر لە مەدینە:

عبدالرحمن کوڕی عەوف باس لە بەشێکی ئەو وتارە دەکات کە عومەر لە وتاری هەینی ڕۆژی(٢١)ی (ذی الحجة)ی ساڵی(٢٣)ی کۆچیدا فەرموویەتی کە ئەوە دوایین وتاری بووە وە ئەوەی کە عبدالرحمن کوڕی عەوف لەو وتارە فەرموویەتی من لە کاتی باسەکەمدا دەربارەی چۆنیەتی جێنشین کرانی ئەبو بەکر لە کتێبی(الانشراح ورفع الضيق بسير أبي بكر الصديق)دا باسم کردووە، کە عومەر خۆی هەواڵی ئەو خەونەی کە دیویەتی دەیداتە موسڵمانان و بۆیان شی دەکاتەوە، هەر لە هەمان ئەو وتارەیدا فەرموویەتی: من خەونێکم دیووە، وا دەزانم کە نایبینم مەگەر بۆ هاتنی مەرگم نەبێت، من بینیم کە کەڵەشێرێك دوو دەنووکی لێدام وە گەلێك فەرمانیان پێدام کە کەسێك لە پاش بۆ کاری خەلافەت دیاری بکەم، خوای گەورە هەرگیز ئاینەکەی و خەلافەتەکەی لە یاد ناکات، ئەو ئەمانەتەش لە یاد ناکات کە پێغەمبەرەکەی پێ ناردووە، ئەگەر ئەو کارە پەلەی پێ کردم ئەوا خەلافەت ڕاوێژێکە لە نێوان ئەو شەش کەسەی کە پێغەمبەر(ﷺ) تا وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو.[٥]

---

١ـ تأريخ المدينة (٣/٨٦٨-٨٦٩)،اسناده حسن فيه عبدالرحمن بن السعودي صدوق إختلط قبل موته التقريب رقم ٣٩١٩.

٢ـ الطبقات (٣/٣٣١)، محض الصواب (٣/٨٦٨).

٣ـ محض الصواب (٣/٨٦٩).

٤ـ الطبقات لإبن سعد (٣/٣٣٢) إسناده صحيح.

٥ـ الموسوعة الحديثية الأمام أحمد رقم (٨٩) إسناده صحيح.

## ٦- کۆبوونەوەی عومەر لەگەڵ حوزەیفە پێش لێدانی:

ڕۆژی یەك شەممە بەرواری ٢٣ی (ذي الحجة) بە چوار ڕۆژ پێش شەهید بوونی عومەر چاوی بە دوان لە یاران کەوت کە حوزەیفەی کوڕی یەمان و سەهلی کوڕی حەنیف (خوایان لێ ڕازی بێت) بوون، عومەر حوزەیفەی دامەزراندا تا باجی ئەو زەویانە دیاری بکات کە بە ئاوی ڕووباری دیجلە ئاو دەدرێن سەهلی کوڕی ەنیفی داکەزراند بۆ ئەوەی باجی ئەو زەویانە دیاری بکات کە بە ئاوی ڕووباری فورات ئاو دەدرێن، پێی فەرموون: چۆنتان کرد؟ من دەترسم کە ئێوە بارێکتان دابێت بەسەر زەویدا کە نەیتوانبێت، ئەوانیش وتیان: ئێمە بارێکمان داوە بەسەریدا کە زۆر لە بارە، پاشان عومەر فەرمووی: ئەگەر خوای گەورە سەلامەتم بکات وا دەکەم کە بێوەژنانی عێراق پاش من هەرگیز پێویستیان بە هاریکاری هیچ پیاوێکی ترنەبێت، بەڵام عومەر لەڕۆژی چوارەمی ئەو وت و وێژەی نێوانیان لێی درا.[1]

## ٧- بەرگری کردنی عومەر لە مانەوەی سەبایاکان لە شاری مەدینە:

عومەر(رضي الله عنه) ڕێگەی بە سەبایای وڵاتە ئازادکراوەکان نەدەدا کە بێنە شاری مەدینەی پرشنگدارەوە، کە پایتەختی دەوڵەتی خەلافەتە، هەروەها بەرگری لە مەجووسی عەراق و فارسەکان، گاورەکانی شام و میسر لە نیشتەجێ بوونیان لە شاری مەدینە مەگەر مسڵمان بن و بێنە نێو ئەم ئاینەوە، ئەمەش هەڵوێستێکە دەلالەت لە ژیری و وردبینی عومەر دەکات، لەبەر ئەوەی ئەم میللەت و گەلانە دژاو و شکست خواردوو و ڕقاوین لەسەر ئیسلام، ڕقیان لێ دەبێتەوە و ئامادەن بۆ پیلان گێڕان و فێڵ کردن لە دژی ئیسلام و موسڵمانان لەبەر ئەوە عومەر بەرگری لێ کردن لە نیشتەجێ بوو لە مەدینە بۆ پاڵپێوەنانی شەڕ لە موسڵمانان بەڵام هەندێ لە هاوەڵان (خویان لێ ڕازی بێت) بەندە و نەداریان لەو سەبایانەی گاوران و مەجووس هەبوو، هەندێکیان بەردەوام داوایان لە عومەر دەکرد کە ڕێگە بدات کە لە مەدینە بێننەوە تا لە کار و کردەوەکانیدا کۆمەکیان پێ بخوازێ، پاشان عومەر ڕێگەی بە هەندێکیان دا کە لە شاری مەدینە بێننەوە، لەسەر بێزاری لێی و ئەوەی کە عومەر پێشبینی دەکرد ڕوویدا وە ئەمەش ئەوەبوو کە وریایی لێوە دەدا.[2]

دووەم: شەهدکردنی عومەر و چیرۆکی دەستەی ڕاوێژ:

١- شەهیدبوونی عومەر (رضي الله عنه):

عەمری کوڕی مەیموون دەفەرمووێت: من لە ڕیزدا بووم و چاوەڕوانی نوێژی بەیانی بووم، لە نێوانی من و ئەودا تەنها عبداللە ی کوڕی عەباس هەبوو، بەرەبەیان دەیپێکا و ئەگەر بە نێو ڕیزەکاندا بڕۆیشتایە دەیفەرموو ڕێك ڕاوەستن وە کاتێك کە ڕێك دەوەستان، پێش دەکەوت و (الله اکبر)ی دەکرد، ڕەنگە سوورەتی یوسف یا نەحل یان شتێکی لەو بارەی بخوێندایە لە ڕکاتی یەکەمدا هەتا خەڵکی بە

---

١ـ الخلفاء الراشدون للخالدي (ص: ٨٢)، البخاري رقم (٣٧٠٠).
٢ـ الخلفاء الراشدون للخالدي (ص: ٨٣).

تەواوی کۆدەبوونەوە، هەر کە (الله اکبر)ی کرد، گوێم لیێ بوو کە فەرمووی: کوشتمی — یان خواردمی — ئەو سەگە — کاتێك کە لێیدا — ئەو بێباوەڕە بە چەقۆیەکی دوو لانەوە هەڵهات، نەیدەدا بە لای کەسێکدا لە لای ڕاست و چەپی هەتا برینداری دەکرد، هەتا (١٣) پیاوی بریندار کرد و حەوتیان مردن، کاتێك کە ئەم پیاوە ئەوەی لە موسڵمانان بینی عەباکەی دا بەسەر خۆیدا، کاتێك کە گیراوە خۆی کوشت، عومەر دەستی بە عبدالرحمانی کوڕی عەوف گرت و بردیە پێشەوە — تانوێژ بە خەڵك بکات — ئەوەی کە لە دوایی عومەرەوە بوو، ئەوەی بینی کە بینی ،بەڵام دەورویەری مزگەوت بەمە نازانن، جگە لەوەی کە دەنگی عومەریان لەدەستدا وە ئەوان کاتێك کە گوێیان لە دەنگی عبدالرحمانی کوڕی عەوف دەبێت کە نوێژێکی کورتیان پێ دەکات دەڵێن: سبحان الله ـ کاتێك کە خەڵکەکە بڵاوەیان لیێ کرد عومەر فەرمووی: ئەی ئیبن عباس سەیرم بکە کێ کوشتمی، توورفرۆشی سەردەم، پاشان هات و فەرمووی: خزمەتکاری موغیرە، فەرمووی: خراپەکارە، ئەویش فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: خوا بیکوژێت من چاکەم لەگەڵ کرد، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە مەرگمی نەخستە دەست پیاوێك کە بانگەشە بۆ ئیسلام بکات وە تۆ و باوکت — واتا عەباس — و کوڕەکەی عبدالله، پێتان خۆش بوو کە بێباوەڕان لە مەدینە زۆر بن، عەباس زۆرترین کەسانی غەریبیان لابوو، عبدالله فەرمووی: ئەگەر بتویستایە ئەو کارەت دەکرد، واتا: ئەگەر بتویستایە دەتکوشتن، ئەویش فەرمووی: درۆت کرد، واتا — هەڵەت کرد — پاش ئەوەی قەسیان بە زمانی ئێوە دەکرد و نوێژی بە قیبلەکەتان دەکرد، حەجی ئێوەیان بەجیێ دەهێنا، پاشان عومەریان هەڵگرت تا بیبەنەوە بۆ ماڵەکەی خۆ عبدالله لەگەڵی ڕۆیشت، هەروەك ئەوەی کە خەڵکی هەتا پێش ئەو ڕۆژەش دووچاری هیچ نەبووبن، پاشان هەندێ شەربەتیان[1] بۆ هێنا و خواردیەوە بەڵام لە ناو سکیەوە هاتە دەرەوە، دواترلا هەندێ شیریان بۆ هێنا و کە خواردیەوە لە برینەکەیەوە هاتە دەرەوە، پاشان زانیان کە مردووە، ئێمە چووینە ژورەوە بۆ لای وە خەڵکی دەهاتن لەسەری دەستیان دەکردە گریان و پیاهەڵدان، بە عبدالله کوڕی عومەری فەرمووی: سەیر بکە، چ قەرزێکم لەسەرە، کاتێك کە قەرزەکانیان ژمارد بینیان(٨٦) هەزار درهەم یان زیاترە، عومەر فەرموو ئەگەر سەروەت و سامانی عومەر تەواوی کرد ئەوا لەوە بیبژێرن وە ئەگەرنا داوا لە هۆزی عودەی کوڕی کەعب بکە وە ئەگەر بەشی نەکرد، داوا لە قورەیش بکە، مەیژمێرن بۆ کەسانی تر، ئەم ماڵەم لەسەر لابدە، بچۆ بۆ لای عائیشەی دایکی باوەڕداران پێی بڵیێ: عومەر سڵاوت لیێ دەکات، نەڵێی ئەمیری باوەڕداران لەبەر ئەوەی من لەمڕۆوە ئەمیری باوەڕداران نیم، بڵیێ عومەری کوڕی خەتاب داوات لیێ دەکات کە ڕێگەی پیێ بدەیت کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا بمێنێتەوە، پاشان عبدالله کوڕی عومەر سڵاوی کرد، مۆڵەتی وەرگرت و پاشان چوویە ژورەوە بۆ لای عائیشە بینی کە دانیشتووە دەگری ، عبدالله فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب سڵاوت لیێ دەکات ، داوات لیێ دەکات کە لە لای هەردوو هاوڕێکەی بە خاك بسپێری، عائیشە فەرمووی: من ئەو شوێنەم بۆ خۆم داناوە، ئەمڕۆ لە خۆمی دەبوێرم، کاتێك کە هاتەوە، وتیان: ئەوە عبدالله کوڕی عومەرە هات، عومەر فەرمووی: بەرزم

---

[1] ـ خورمای خۆشەکراوە لە ئاودا هەتا چێژی ئاوەکە خۆش بکات.

بکەنەوە، پیاوێك خۆی دایە ژێر شانی، عومەر فەرمووی: چیت پێیە؟ عبداللە فەرمووی: ئەوەی کە پێت خۆشە ئەی ئەمیری باوەڕداران، مۆڵەتم وەرگرت، عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ خوا، هیچ شتێك بە لامەوە هێندەی ئەوە گرنگ نیە... ئەگەر گیانم سپارد هەڵم بگرە و پاشان سڵاو بکە و بڵێ: عومەری کوڕی خەتاب داوا مۆڵەتی هاتنە ژوورەوە دەکات وە ئەگەر مۆڵەتی پێدام ببەنە ژوورەوە وە ئەگەر گەڕاندمیەوە بمگێڕنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان، عبداللە فەرمووی:کاتێك کە تەواو بوو بردمانە دەرەوە، بەڕێکەوتین بڕۆین، عبداللە کوڕی عومەر فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب داوای مۆڵەت دەکات، عائیشە فەرمووی: بیبەنە ژوورەوە، ئەویش هێنرایە ژوورەوە، لەوێ لەگەڵ دوو هاوڕێکەیدا بە خاك سپێردرا،[1] وە لە چەند ڕیوایەتێکی تردا هاتووە هەندێ لەو ڕووداوانەی کە عەمری کوڕی مەیموون باسی لێوە نەکردووە درێژ کراوەتەوە، إبن عەباس(ﷺ) دەفەرمووێت: عومەر لە بەرەبەیاندا لێی درا، ئەبو لۆلۆەی بەندەی موغیرەی کوڕی شوعبە لێیدا کە پیاوێکی مەجووسی بوو،[2] وە ئەبو ڕافع(ﷺ) دەفەرمووێت: ئەبو لۆلۆە بەندەیەکی موغیرەی کوڕی شوعبە بوو ئەو خەنجەر و شمشێر و لەو بابەتانەی دروست دەکرد و موغیەر ئیشی پێ دەکرد و ڕۆژی چوار درهەمی دەدایە، جارێك ئەبو لۆلۆە دەگاتە عومەر، دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران موغیرە ژیانی لەسەر قورس کردووم، قسەی لەگەڵ بکە بەڵکو کەمێك لەسەرم سووك بکات، عومەریش فەرمووی: لە خوا بترسە و لەگەڵ گەورەکەت باش بە، لە نیازی عومەر وابووە کە بگات بە موغیرە و قسەی لەگەڵ بکات کە ئەرکی سەر شانی کەمێك سوك بکات، ئەو کۆیلەیە پەست دەبێت، دەڵێت: دادپەروەری عومەر هەمووی گرتۆتەوە من نەبێ؟! پێویستە لەسەر کوشتنی خۆم لەڕ و لاواز بکەم، بۆیە خەنجەرێکی دوسەری دروست کرد، تیژی کرد و ژەهراوی کرد، پاشان ئەبو لۆلۆە لەگەڵ خۆی هێنای بۆ لای هورمزان، پێی وت: چۆنی دەبینی؟ ئەویش پێی وت: من وای دەبینم کە تۆ بەم خەنجەرە لەکەس نادەیت تا نەیکوژیت، وتی: ئەبو لۆلۆە بۆ لای عومەر بەڕێکەوت، لە نوێژی بەیانیدا هات بۆ لای تا لە دوای عومەر وەستا، عومەر کاتێك کە نوێژی دادەبەست دەیفەرموو: ڕیزەکانتان ڕێکوپێك بکەن، ئەو هەر بەو شێوەیە و وەك جاران ئەمەی فەرموو: کاتێك کە (اللە اکبر)ی کرد، ئەبو لۆلۆە خەنجەرێکی دا لە شانی و یەکێکی تری دا لە ژێر دەستی، عومەر کەوت،[3] عەمری کوڕی مەیموون ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێت: کاتێك کە لێی درا گوێم لێ بوو کە ئەو ئایەتەی خوێند کە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ (الاحزاب: ٣٨).

## ٢- داهێنانی ڕێگەیەکی نوێ لە هەڵبژاردنی خەلیفەی دوای خۆی:

بایەخ گرنگی پێدانی عومەری فاروق بە پاراستنی یەك ڕیزی ئوممەت و داهاتووی بەردەوام بوو، تەنانەت لە ساتە وەختەکانی کۆتایی ژیانیدا، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو بەدەست ئازاری برینە سەختەکانەوە دەیناڵاند، کە ئەو ساتە وەختانە نەمرن و هەرگیز لە یاد ناچن ، تیایدا ئیمانی قووڵی

---

١ـ البخاري كتاب: فضائل الصحابة رقم (٣٧٠٠).
٢ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ٣٦٩).
٣ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ٣٧٠).

عومەر(ﷺ)و دڵسۆزی و وروژاندنی وەدەردەکەوێت،[1] عومەر لەو ساتە ناسکانەدا ڕێگەیەکی نوێ دادەنێت کە پێشتر لە هەڵبژاردنی خەلیفەدا هەنگاوی بۆ نەنراوە و ئەمەش بەڵگەیەکی بەرچاوە، و شتێکی ڕوونە لە تێگەیشتنی عومەر لە سیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامی، پێغەمبەر(ﷺ) ژیانی خۆی تێپەڕاند و بە دەقێکی ڕاشکاوانەوە کەسێکی لە دوای خۆی نەکردە جێنشین، ئەبو بەکریش کە ژیانی خۆی بەسەربرد پاش ڕاوێژی گەورە یاران عومەری کردە خەلیفە وە کاتێك کە داوای عومەری کرد کە بکرێتە خەلیفە لەسەر جێگەی مرگ بوو، ئەو بە تەواوی بیری لەم کارە کردەوە وە بڕیاریدا کە ڕێگەیەك بگرێتە بەر کە شیاو بێت لەگەڵ بارودۆخەکەدا، پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ)کە خەڵکی بەجێ هێشت هەمووان دانیان بە چاکی و پێشینەیی ئەبو بەکردا دەنا بەسەریاندا پاشان ئەگەری ڕوودانی ناتەبایی زۆر کەم و دەگمەن بوو بە تایبەتی، کە پێغەمبەر(ﷺ) بە کردار و گوفتار ڕووی ئومەت بوو بۆ ئەوەی کە ئەبو بەکر ئەولاترە بە گرتنە دەستی ئەو کارە لە پاشی خۆی، ئەبو بەکر کاتێك کە عومەری کردە جێنشینی کردە خۆی دەیزانی کە لای هاوەڵان قەناعەتێك هەیە کە عومەر بەهێزترین و بە تواناترین و پیاوچاکترین کەسە کە بتوانێت لە پاشی خۆی بەرگەی ئەم هەموو بەرپرسیارێتیە بگرێت، بۆیە پاش ڕاوێژی گەورە هاوەڵان کردیە خەلیفە و هیچ کامیان ناتەبای ڕاکەی نەبوونن پاشان یەکدەنگی بە بەیعەت پێدانی عومەر دەستەبەر بوو،[2] بەلام ڕێگەی هەڵبژاردنی خەلیفەی نوێ پشت دەبەستێت بەوەی کە ڕاوێژ لە نێوان ژمارەیەکی دیاری کراودا بێت، عومەر (٦) هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەست نیشان کرد کە هەموویان لە بەشدارانی جەنگی بەدر بوون و کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد لە هەموویان ڕازی بوو وە هەمووشیان شیاو بوون بۆ ئەوەی کاریان بەسەردا بسپێرێت ئەگەرچی ئەوان جیاواز بوون، عومەر(ﷺ) ڕێگە و ماوەی هەڵبژاردنی بۆ دیاری کردن، لەگەڵ ژمارەی ئەو دەنگانەی کە بەسە بۆ هەڵبژاردنی خەلیەف و دیاری کردنی حوکم لە دانیشتگە و شیاویەکاندا ئەگەر دەنگەکان بەرامبەر بوون، فەرمانی دا بەسەر کۆمەڵە سەربازێکدا کە چاودێری بە ڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکە بکەن و سزای ئەو کەسەش بدەن کە لە دژی فەرمانی بە کۆمەڵ دەجووڵێتەوە وە بەر لە ئاژاوە بگرن بە جۆرێك ڕێگە نەدەنە هیچ کەسێك بێتە نێو خەڵکانی خاوەن ڕا و پەیمان[3] یان گوێیان لێ بگرێت، ئەم ڕوون کردنەوەیەش لە جوانترین بڕگەکانی پێشوو بوو:

### أ- ژمارە و ناوی ئەوانەی کە دیاری کرد بۆ ڕاوێژ:

سەبارەت بە ژمارەیان شەش کەس بوون کە ئەمانەن: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، عوسمانی کوڕی عەففان، عبدالرحمان کوڕی عەوف، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، زوبێری کوڕی عەوام، طلحەتی کوڕی عبداللە (خوایان لێ ڕازی بێت)، وازی لە سەعدی کوڕی نەفیل هێنا کە یەکێك بوو لە دە مژدەپێدراوەکەی بەهەشت ڕەنگە ئەوەش لەبەرئەوە بووبێت کە لە تیرەکەی خۆی بووکە بەنی عودەیە.[4]

---

١ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٦١).
٢ـ أوليات الفاروق (ص: ١٢٢).
٣ـ أوليات الفاروق (ص: ١٢٥).
٤ـ البداية والنهاية (١٤٢/٧).

ب- ڕێگەی هەڵبژاردنی خەلیفە:

عومەر فەرمانی پێدان کە لە ماڵی یەکێکیان کۆببنەوە و ڕاوێژ لە نێوان خۆیاندا بکەن وە ئاماژەی بەوەش دا کە عبداللە ی کوڕی بە تەنها ئامادەی ئەو دانیشتنە دەبێت و هیچ پەیوەندی بە کارەکەوە نابێت، لە کاتی ئەو پرس و ڕاوێژەدا سوهەیبی ڕۆمی نوێژ بە خەڵکەکە دەکات، فەرمانی دا بە میقدادی کوڕی ئەسوەد و ئەبو طلحەی ئەنصاری کە چاوەدێری بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکە بکەن.[1]

ج- ماوەی هەڵبژاردن یان ڕاوێژ:

عومەر ئەو ماوەیەی بە سێ ڕۆژ دیاری کرد کە کاتێکی تەواوە ئەگەر درێژیان کردەوە مانای ئەوەیە کە دەروازەی ناتەبایی بەرفراوان دەبێت لەبەر ئەوە فەرمووی: نابێت ڕۆژی چوارەم بەسەرتاندا بێت تا ئەمیری خۆتان دیاری دەکەن.[2]

د- ژمارەی دەنگە تەواوەکان بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە:

عومەر فەرمانی پێدا بە کۆبوونەوە و ڕاوێژ کردن وە ئەوەی بۆ دیاری کردن ئەگەر پێنج کەستان لەسەر یەکێکیان تەبا بوون و شەشەم سەرپێچی کرد ئەوا بەشمشێر بدەن لە گەردنی،وە ئەگەر چوارتان بە کەسێك قایل بوون و دووا لە ئێوە سەرپێچیان کرد ئەوا بدەن لەسەری ئەو دوانەش.[3]

ئەمەش لەو ڕیوایەتانەیە کە پاڵپشتێکی دروستی نیە وە ئەمەش لەو کارە نامۆیانەیە کە ئەبو موخەننەف بەڕێی کردووە و تیایدا ناتەبایە لەگەڵ دەقە ڕاست و دروستەکاندا و ئەوەی کە لە ژیانی هاوەڵان (خوایان لێ ڕازی بێت) بەرگوێ کەوتووە و زانراوە، ئەوەی کە ئەبو موخەنەف هێناویەتی و باسی لێوە کردووە ئەوەیە کە ئەو وتەیەی عومەرە کە بە سوهەیب دەفەرموویێت لەسەر سەریان بوەستە — واتا دەستەی ڕاوێژ — ئەگەر پێنجیان کۆك بوون و قایل بوون بە کەسێك و شەشەم سەرپێچی کرد ئەوا بە شمشێرەکەت سەری بشکێنە، ئەگەر چواریان قایل بوون و دوانیان سەرپێچیان کرد، ئەوا بدە لەسەریان[4] وە ئەمەش قسەیەکی دان پیا نەنراوە، عومەر(ﷺ) چۆن شتی وا دەڵێت لە کاتێکدا کە ئەو ئەوە دەزانێت کە ئەمانە لە پاڵفتەی یارانی پێغەمبەر(ﷺ)ن و خۆی دەست نیشانی کردوون بۆ ئەم کارە لەبەر ئەوەی لە توانا و چاکیان شارەزایە،[5] لە إبن سەعدەوە هێناویانە کە عومەر بە ئەنصاریەکانی فەرمووە: بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بیان کەنە ژوورێکەوە، ئەگەر ساز بوون باشە وە ئەگەرنا بچنە ژورەوە بۆیان و بدەن لە گەردنیان،[6] ئەم ڕیوایەتەش بە جیا و بێ پەیوەندیە لە سەنەدەکەیدا

---

١ـ أشهر مشاهيد الاسلام في الحرب والسياسة (ص: ٦٤٨).
٢ـ الطبقات لإبن سعد (٣٦٤/٣).
٣ـ تأريخ الطبري (٢٢٦/٥).
٤ـ تأريخ الطبري (٢٢٦/٥).
٥ ـ مرويات أبي مخنف في تأريخ الطبري، د. يحيى اليحيى (ص: ١٧٥).
٦ـ الطبقات لإبن سعد (٣٤٢/٣).

(سەماکی کوڕی حەرب) هەیە و لاوازە گۆڕاوە بە کەسێکی تر.[١]

ئەوەی کە ڕاست و دروستە لەمەدا هەر ئەوەیە کە إبن سعد بە پاڵپشتی چەند پیاوێکی متمانەپێکراو هێناویەتی کە عومەر(ﷺ) فەرموویەتی بە سوهەیب: سێ ڕۆژ نوێژ بە خەڵکی بکە و لەم گروپە بگەرێ کە سێ ڕۆژ لە ماڵێکدا بمێننەوە وە ئەگەر تەبا بوون لەسەر پیاوێك وە هەر کەس ناتەبایان بوو بدەن لەسەری،[٢] عومەر(ﷺ) فەرمانی دا بە کوشتنی هەر کەسێك کە بیەوێت ناتەبا بێت لەگەڵ ئەم گروپەدا و درز بخاتە نێو ڕیزی موسڵمانانەوە دووبەرەکی بخاتە نێوانیانەوە، کار بەو وتەیەی بکەن دەیفەرموو: هەر کەس هاتوو فەرمانی دایە هەموتان، لەسەر پیاوێك لە خۆتان وە هەرکەس ویستی دەروازەیێك بخاتە نێوانتانەوە، یان دوبەرەکیتان لەنێو ساز بدات ئەوا بیکوژن.[٣]

ه- دادکردن لە حاڵەتی ناکۆکی و نا تەبایدا:

عومەر وەسیەتی کرد کە عبداللە کوڕی عومەر لەو کۆڕە لەگەڵیان ئامادە بێت و هیچ پەیوەندیەکی بە کارەکەوە نەبێت بەڵام پێی وتن: ئەگەر سێ کەسیان بە پیاوێك قایل بوون و سێ کەسی تریان بە پیاوێکی تریان قایل بوون ئەوا با دادیان بدەنە دەست عبداللە ی کوڕی عومەر، ئەو دادی بۆ هەر گروپێك دا با پیاوێك لەو گروپە هەڵبژێرن، ئەگەر بە دادەکەی عبداللە ی کوڕی عومەر قایل نەبوون ئەوا با لەگەڵ ئەو کەسانە دا بن کە عبدالرحمان کوڕی عەوفیان لەگەڵدایە، عومەر وەسفی عبدالرحمانی کوڕی عەوفی کرد بەوەی کە بەربەستکارێکی تێگەیشتووە وە دەربارەی فەرموویتی: خاوەن ڕایەکی باشە، عبدالرحمانی کوڕی عەوف و بەربەستکارێکی تێگەیشتووە و لە لای خوداوە پارێزراویەکی هەیە بۆیە داوات لێ دەکەم کە گوێی لێ بگرن.[٤]

و- گروپێك لە پیاوانی خودا چاودێری هەڵبژاردنەکە و بەر لە ئاژاوە دەگرن:

عومەر(ﷺ) داوای لە ئەبو طلحةی ئەنصاری کرد و پێی فەرموو: ئەی ئەبو طلحة ئیسلام بە ئێوەوە سەرفراز بوو لەبەر ئەوە (٥٠) پەنجا پیاو لە ئەنصاریەکان دەست نیشان بکە و هانی ئەم گروپە بدە هەتا کەسێك لە خۆیان هەڵدەبژێرن،[٥] وە عومەر بە میقدادی کوڕی ئەسوەدی فەرموو: ئەگەر منتان خستە گۆڕەکەمەوە ئەو گروپە بکەنە ژوورێکەوە هەتا یەکێك لە خۆیان هەڵدەبژێرن.[٦]

بەم شێوەیە ژیانی عومەر کۆتایی هات و نە ئەو نەهامەتیەی کە ڕووی لێنا و نە گیان کێشانێش سەرقاڵی نەکرد لە چارەسەری گیروگرفتی موسڵمانان، ڕێسایەکی باش و چاکی بۆ دەستەی ڕاوێژ دانا کە پێشتر کەس پەی پێ نەبردووە، گومانی تێدا نیە کە ئەسڵی ڕاوێژ کردن لە قورئان و سوننەتی

---

١ـ مرويات أبي مخنف في تأريخ الطبري، د. يحيى اليحيى (ص: ١٧٦).
٢ـ مرويات أبي مخنف من تأريخ الطبري، د. يحيى اليحيى (ص: ١٧٦).
٣ـ الطبقات لإبن سعد (٣/٣٤٢).
٤ـ مسلم (٣/١٤٨٠).
٥ـ تأريخ الطبري (٥/٢٢٥).
٦ـ هەمان سەرچاوە.

کرداروگوفتاری بڕیاری لەسەر دراوە وە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر کاریان پێ کردووە عومەر سەبارەت بە بنەڕەتەکەیەوە داهێنەر نەبووە تیایدا بەڵکو ئەوەی عومەر وەکاری خستووە بریتیە لە دیاری کردنی ئەو ڕێگەیەی کە لێوەی خەلیفە هەڵدەبژێردرێت و ژمارەیەکی دیاری کراوی دیاری کرد و لەوانی دانا و ئەمەش کارێکە کە نە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکری صدیق(ﷺ) ئەنجامیان نەداوە، بەڵکو یەکەمین کەسێك کە پێی هەستاوە عومەر بووە، ئەمە باشترین شت بووە کە کردوویەتی وە ئەمە باشترین ڕێگەی شیاو بووە بۆ هەلومەرجی هاوەڵان لەو کاتەدا.[1]

سێیەم: وەسیەتی عومەر (ﷺ) بۆ خەلیفەی دوای خۆی:

عومەر(ﷺ) وەسیەتی بۆ خەلیفەی پاش خۆی کرد کە سەرکردایەتی ئومەت دەگرێتە دەست بەوەسیەتێکی گرنگ کە تیادی دەفەرموێت: وەسیەتت بۆ دەکەم بە ترسان لەو خوایەی کە تاك و تەنهایە و هاوەڵی نیە، وەسیەتت بۆ دەکەم بە چاکە بۆ کۆچەریە یەکەمینەکان بە جۆرێك کە پێشینەیان بۆ بزانی، وەسیەتی چاکەت بۆ دەکەم بە ئەنصاریەکان لە چاکەخوازانیان نزیك بەرەوە، لە خراپەکارانیان چاوپۆشی بکە، بە خەڵکی ناوچەکانیش وەسیەتی چاکەت بۆ دەکەم، لەبەر ئەوەی کە ئەوان دژی دوژمن و کۆکەرەوەی دەستکەوتەکانن وە کەسیان لێ هەموار مەکە مەگەر چاکیەك بێت لێیانەوە، وەسیەتت بۆ دەکەم کە لەگەڵ خەڵکانی دەشتەکیدا باش بیت چونکە ئەوان عەرەبی ڕەسەن و کەرەستەی ئیسلامن ئەگەر لە کەناری ماڵ و سامانەکەت بردن ئەوا دەیگێڕیتەوە بۆ هەژارەکانیان، وەسیەتت بۆ دەکەم کە چاك بیت لەگەڵ ئەوانەی کە ناموسڵمانن و باج و سەرانە دەدەن و بەڵێنێکیان لە لایەن ئێمەوە پێدراوە، کە لە پشتیانەوە بجەنگیت، لەسەری توانای خۆیانەوە باری سەرشانیان قورس مەکە ئەگەر ئەوەی لەسەریان بوو بە ویستی خۆیان دایانە باوەڕداران، وەسیەتت بۆ دەکەم بە لە خوا ترسان، بە ئاگابوون لێی، ترسان لە ڕق و کینەی کە لێت بە ئاگا بێت لەسەری گومانێکەوە ، وەسیەتت بۆ دەکەم کە لەبەر خەڵك لە خوا بترسیت، لەبەر خوا لە خەڵك بترسیت، وەسیەتت بۆ دەکەم کە لە نێو خەڵکیدا دادپەروەر بیت، خۆت یەکلایی بکەیتەوە بۆ پێداویستی و گرتنی دەروازە و دەروازەکانیان، سەرمایەداریان نەورووژێنیت بەسەر هەژاریاندا، ئایا لەمەدا بە هاوکاری خوای گەورە پاکی دڵ و دەروونتی تێدایە، ئەمە دابەزاندنێکە بۆ گوناه و تاوانەکانت، چاکەیەکە لە پاشەڕۆژی کارەکەت تا لەمەدا کەسێك دەردەکەوێت پەنهانیەکانت دەزانێت و لە نێوان تۆ و دڵتدا دەگۆڕێت ، فەرمانت پێ دەکەم کە توند بیت لە بەجێ هێنانی کار و فەرمانی خودا، لە سزای و لە سەرپێچی کردنی لەسەر نزیکترین و دوورترینی کەس، پاشان بەزەییت بەکەسدا نەیەتەوە، هەتا وەك تاوانەکەی دەیشکێنێت، وا بکە لە خەڵکی کەلە لای تۆ یەکسان بن وە باکت نەبێت لەسەر یەکێك کە ڕەوای کردۆتە واجب، لەبەر خودا لۆمەی لۆمەکەران مەگرە گوێ، وشیار و بە ئاگا بە لە خۆشویستنی ئەوەی کە خوا کردوویتیە بەرپرس لەوەی کە دەست باوەڕدارانە، چونکە بەمەت جەور و ستەم دەکەیت، دەروونی خۆت قەدەغە دەکەیت لەوەی کە خوای گەورە گوشادی کردووە لەسەرت، تۆ بەم کارەت بوویە خاوەنی پلە و

١ـ تاريخ الطبري (٥/٢٢٥).

پایەیەك لە پلە و پایەکانی دونیا و ڕۆژی دوایش، ئەگەر دادپەروەری و پاکیەکت بۆ دونیات ئەنجامدا لەوەی کە بۆت ساز دراوە ئەوا بەم کارەت باوەڕێك و بەدەست هێنانی ڕەزامەندیەکت پێ ئەنجام داوە، ئەگەر هەوا و هەوەسی دونیا زاڵ بوو بەسەرتدا ئەوا بەم کارەت خەشم و قینی خوات ئەنجام داوەی وە وەسیەتت بۆ دەکەم کە ڕێگە بە خۆت و هیچ کەسێکی ترنەدەیت کە ستەم لەو کەسانە بکەن کە لەگەڵ موسڵمانانندا بەڵێن و ڕێککەوتنیان هەیە، ئەوا من وەسیەتم بۆ کردی، تایبەتمەند و ئامۆژگاریم کردی تۆش بەمە خوازیاری دیداری خوای گەورە و ڕۆژی دوایی بە، تۆ لە نیشانەکانی خۆت شتێکت هەڵبژارد کە نە من و نە کوڕم لەسەری جێ نەمابووین، ئەگەر تۆ بەوە بزانیت کە ئامۆژگاریم کردوویت، گەیشتیە ئەوەی کە فەرمانم پێ کردوویت و بەشێکی سوودمەند بەختێکی باشت لێ بەدەست هێناوەن وە ئەگەر ئەمە پەسەند نەکەیت، بە لاتەوە گرنگ نەبێت، واز لە زۆربەی ئەو کارانە نەهێنیت کە لای ئەو خوای گەورە پێی لێت ڕازی دەبێت، ئەمە بە تۆ دەبێتە کەم بوونەوەیەك، و ڕاوبۆچونت دەست تێوەردانی تێدا دەبێت،، لەبەر ئەوەی کە ئارەزووەکان هاوبەشن، سەری تاوانەکەش ئیبلیسە کە بانگ خوازە بۆ هەموو تیاچوونێك، پێش تۆ چەندین شاخداری گومڕا کردووە، پاشان هەموویان دەباتەوە ناو ئاگری دۆزەخ ئایا چەند خراپە ئەو شوێنەی کە ئەوانی بۆ دەبرێت، خراپترین بەها و نرخە کە بەختی کەسێك پەناگای دوژمنی خودا بێت، بانگخواز بۆ سەرپێچی و تاوان بێت، پاشان تێکەڵاوی ڕەوایە، تەنگ و چەڵمەکان بۆ لای ئەو ڕاوەشێنە، ئامۆژگاری خۆت بکە، سوێندت دەدەم کە بەزەییت بە کۆمەڵی موسڵمانان دابێتەوە، ڕێز لە گەورەیان بگریت، و میهرەبان بیت بۆ بچوکەکانیان، ڕێز لە دانا و زانایان بگریت، لێیان نەدەیت چونکە زەلیل دەبن، بە دەستکەوت خۆت ڕامەوەشێنە بەسەریاندا چونکە پەستیان دەکەیت، لە موچەکانیان لە کاتی خۆیدا بێبەشیان مەکە چونکە هەژاریان دەخەیت، لە شاندەکاندا کۆیان مەکەوە چونکە وەچەیان دادەبڕێت، ماڵ و موڵك مەکەرە شپرزەیی و ئاژاوەیەك لەنێوان دەوڵەمەندەکان تیایدا، دەرگاکەت دامەخە بە ڕووی بێ دەسەڵاتەکانیان، چونکە دەسەڵاتدارەکانیان بێ دەسەڵاتەکانیان لەناو دەبات و دەیخوات وە ئەمە وەسیەتی منە بۆ تۆ، خوای گەورەت بە شاهید لەسەر دەگرم وە سڵاوت لێ بێت.[1]

ئەم وەسیەتە بەڵگەیە لەسەر دووربینی عومەر لە مەسئەلەکانی فەرمانڕەوای و بەڕێوەبردندا، ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی بەرنامە و ڕێسا و فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبرنێکی تەواو دەدات، ئەم وەسیەتە کۆمەڵێك ئەرك و کاری لەوپەڕی گرنگی و بایەخپێداندا لە خۆی گرتووە، ڕەوایە کە بەڵگەنامەیەکی بە نرخ و بەها بێت، لەوەی کە لە یاسا و بنەمای بنەڕەتی بۆ فەرمانڕەواییەکی تەواو لە لایەنە ئایینی و سیاسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان پێکهاتووە کە لە پێشی هەموویانەوە:

١- لایەنی ئاینی، کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- وەسیەت بە سووربوونی توند و تۆڵ، لەسەر لەخوا ترسان، ترسان لێی لەپەنهانی و ئاشکرایی و لە کردار و گوفتاردا، لەبەر ئەوەی هەر کەس لە خوا بترسێت خوای گەورە دەیپارێزێت، هەر کەس لێی

---

١ـ الطبقات لإبن سعد (٣٣٢/٣)، البيان والتبين للجاحظ (٤٦/٢)، جمهرة خطب العرب (٢٦٣/٢-٢٦٥)، الكامل في التأريخ (٢١٠/٢)، الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٧١-١٧٢).

بترسێت ئاگاداری دەبێت و دەیپارێزێت (وەسیەتت بۆ دەکەم بە ترسان لە خوای تاك و تەنها کە هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نیە)، (وەسیەتت بۆ دەکەم بە لە خوا ترسان و بە ئاگابوون لێی... وە وەسیەتت بۆ دەکەم بەوەی لە خودا بترسیت).

ب- ڕەساندنی سزای خودایی لەسەر نزیك و دوور (باکت لەسەر کەسێك نەبێت کە حەدێکی لەسەری واجب بوە) (وە لەبەر خوا لۆمەی لۆمەکەران مەگرە گوێ) لەبەر ئەوەی کە سزای خودایی شەریعەتی خوای گەورە کە لە ئاین دایە بۆتە دەق بەسەریەوە وە لەبەر ئەوەی کە شەریعەت بەڵگە و بەهانەیەکە لەسەر خەڵکی، کردار و گوفتاریان بە ناو کرۆکەکانی دەپێورێت، بێئاگابوون لێی خراپ بوونە بۆ ئاین و بۆ کۆمەڵگاش.

ج- دامەزراوی (دامەزرێ وەك ئەوەی فەرمانم کردووە) ئەمەش لە پێویستیە ئاینی و دونیاییەکانە، پێویستە لەسەر فەرمانڕەوا پابەند بێت پێوەی بە کردار و گوفتار یەکەم و پاشان خەڵکی (ئامۆژگارکار بە بۆ خۆت) (وە بەمەش دیداری خوای گەورە و ڕۆژی دوایی بخوازە).[1]

٢- لایەنی سیاسی، کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- پابەندبوون بە دادپەروەری، لەبەر ئەوەی بنەمای فەرمانڕەواییە، ڕەساندنی لە نێو خەڵکیدا هێزو هەیبەت و تۆکمەییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ فەرمانڕەوا دەستەبەر دەکات، لە سام و ڕێزی فەرمانڕەوا لە ناخی خەڵکدا زۆر دەکات (وەسیەتت بۆ دەکەم بە مافداری) (وە وا بکە لە خەڵکی کە لە لات یەکسان بن).

ب- بایەخدان بە موسڵمانە یەکەمینەکان لە کۆچەران و پشتگیریکاران بۆ پێشینەیان لە ئیسلامدا، لەبەر ئەوەی کە بیروباوەڕەکە و ئەوەی کە جیای کردۆتەوە لە ڕژێمێکی سیاسی لەسەر شانی ئەوان ڕەساوە، ئەوان خەڵکی و بارهەڵگری و پارێزەری ئەم ئاینەن (وەسیەتت بۆ دەکەم کە باش بیت بۆ کۆچکەران، بە جۆرێك کە پێشینەیان بۆ بزانی، وەسیەتت بۆ دەکەم کە باش بیت لەگەڵ پشتگیریکاران، بە دەم چاکەیانەوە بڕۆ و چاوپۆشی لە خراپەکارانیان بکە).

٣- لایەنی سەربازی، کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- بایەخدانی سوپا و ئامادەکردنی بە شێوەیەك کە شیاو بێت وە بەرپرسیاریەتی پێگەیشتووی سەرشانی گەورە کرد بۆ پاراشتنی سەلامەتی و سەقامگیری دەوڵەت، بایەخدان بە دابینکردنی پێویستیەکانی جەنگەوەران (خۆیەکلایی کردنەوە بۆ پێداویستی و دەروازەکان).

ب- دوورکەوتن لە هێشتنەوەی سەربازان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە بنکە و بارەگاکان و دوور لە خێزانەکانیان ئەویش بە هۆی ئەوەی کە ئەمە هۆکارە بۆ بێ ئومێدی و دوودڵی و دابەزینی ورە و وزەکان، زۆر پێویستە کە مۆڵەتی دیاری کراویان لە کاتی دیاری کراودا پێ بدرێت هەتا لەو ماوەیەدا پشووی خۆیان وەربگرن چالاکیەکانیان نوێ بکەنەوە لە لایەك و بگەڕێنەوە نێو خێزانەکانیان هەتا

---

١ـ الادارة الاسلامية في عصر عمر بن الخطاب (ص: ٣٨١).

نەکانیان دانەبڕێت و کۆتایی پێ نەیەت لە لایەنی دووەمەوە (وە لە بارەگاکاندا کۆیان مەکەوە چونکە وەچەیان دادەبڕێت) وە وەسیەتت بۆ دەکەم، کە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکاندا باش بیت، چونکە ئەوان دژی دوژمنن.

ج- پێدانی هەر دەستکەوت و موچەیەك بەو سەربازانەی کە شایستەی ئەو شتانەن، ئەمەش بۆ زامن کردنی دەستکەوتێکی چەسپاو بۆ خۆی و خێزانەکەی کە پاڵی پێوە دەنێت بۆ جیهاد کردن، بیرکردنەوەی کاروباری دارایی لێ دەڕەوێتەوە (خۆت مەوروژێنە بە سەریاندا بە دەستکەوتەکان چونکە پەستیان دەکەیت وە مووچەکانیان لە کاتی خۆیدا دوا مەخە چونکە هەژاریان دەخەیت).

٤- لایەنی دارایی و ئاووری، کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- بایەخدان بە دابەشکردنیماڵیات لە نێوان خەڵکی بە شێوەیەکی دادپەوەری و دروست، هەموو ئەوانەی کە لە کاروبارەکانیدا تێکەڵ دەبن کۆکردنەوەی ماڵیاتە لای چینێکیان بەبێ ئەوی تریان (ماڵیاتەکان شپرزە مەکە و ئاژاوەیی نێوان دەوڵەمەندەکان تیایاندا).

ب- قورس نەکردنی باری سەرشانی ئەو کەسانەی کە ناموسڵمانن و بەڵێنیان هەیە لەگەڵ موسڵمانان و ئەوەی کە لەسەریانە بە ویستی خۆیان بەجێی دێنن لە پابەند بوونی ماڵی بۆ دەوڵەت (ئەگەر ئەوەی لەسەریانە دایانە باوەڕداران ئەرکی سەرشانیان قورستر مەکە لە سەرووی توانایانەوە).

ج- زامن کردنی مافە ماڵیەکان بۆ خەڵك و زیادەڕۆیی نەکردن پێی، دوور کەوتنەوە لە فەرزکردنی ئەوەی توانایان نیە بەسەریدا (وە کەسیان لێ هەموار مەکە مەگەر بە چاکەیەك بێت لێیانەوە) (ئەگەر لە کەناری ماڵ و سامانەکەت بردن ئەوا دەیگێڕیتەوە بۆ هەژارەکانیان).[1]

٥- لایەنی کۆمەڵایەتی، کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- بایەخدان بە خەڵکی، کارکردن لەسەر بەسەرکردنەوەی کارەکانیان و بەجێ هێنانی پێداویستیەکانیان و پێدانی مافەکانیان لە موچە و دەستکەوت (لە کاتی خۆیدا لە موچەکانیان بێ بەشیان مەکە).

ب- دوورکەوتنەوە لە هەڵبژاردن و لایەنگیری کردن و شوێنکەوتنی ئارەزووەکان، لەوەی کە چەند هۆکارێکی مەترسیداری تێدایە کە بەرپرس بەرەو لادان دەبات، و دەبێتە هۆی خراپ بوونی کۆمەڵگا و شێواندنی پەیوەندیە مرۆڤیەکان (نەکەی و وریابە لە هەڵبژاردن و لایەنگیری کردنی ئەوەی خوای گەورە پێی سپاردووی) وە دەوڵەمەندەکانیان بەسەر هەژارەکانیاندا مەوروژێنە).

ج- ڕێزگرتنی خەڵکی و خۆ بەکەم زانین بۆیان، لە گەورە و بچووکیان، لەوەی کە لەمەدا ڕێزدارییەك لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا هەیە، کە دەبێتە هۆی زۆربوونی دەست دانە یەخەی سەرکردەکەی و خۆش ویستنی بۆی (وە سوێندت دەدەم بە خوا کە بە بەزەیی بیت لەسەر کۆمەڵی موسڵمانان، بە چاوی پشکۆوە لە گەورەکانیان بڕوانەن بەزەیت بە بچووکیاندا بێتەوە و ڕێز لە زاناکانیان بگرە).

---

١ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٧٤-١٧٥).

د- کرانەوە لەسەر خەڵك، ئەمەش بە گوێگرتن لە سکاڵاکانیان، دادپەروەری هەندێکیان لە هەندێکیان و بە پێچەوانەشەوە پەیوەندیەکانی نێوانیان دەشێوێت و شلەژان باڵی دەکێشێت بەسەر کۆمەڵگەدا (دەرگات دامەخە بە ڕووی بێ دەسەڵاتەکانیاندا، چونکە دەسەڵاتدارەکانیان بێ دەسەڵاتەکانیان دەخوات).

هـ- شوێنکەوتنی ڕەوا، سووربوون لەسەر دەستەبەرکردنی لەکۆمەڵگەدان، لە هەموو هەل ومەرج و بار و دۆخێکدا، لەبەر ئەوەی کە ئەمە پێویستیەکی کۆمەڵایەتیە و پێویستە لە نێو خەڵکیدا بەدی بێت، (پاشان تێکەڵاوی هەق ببە، تەنگ و چەڵەمەکان بۆ لای ئەو ڕاوەشێنە) (وە کارێکی وا بکە خەڵکی لای تۆ یەکسان بن، باکت نەبێت لەسەر ئەوەی کە ڕەوا واجب دەکات).

و- دوورکەوتنەوە لە ستەم بە هەموو جۆر و شێوەکانیەوە، بە تایبەتی لەگەڵ خەڵکی بەڵێن پێدراوان، لەبەر ئەوەی دادپەروەری ڕەساندنی خوازراوە لە نێوان تەواوی خەڵکیدا بە موسڵمانان و بەڵێن پێدراوانەوە، هەتا تەواوی خەڵکی چێژ لە دادپەروەری ئیسلام وەربگرن (وەسیەتت بۆ دەکەم کە ڕێگە بە خۆت و هیچ کەسێکی تر نەدەیت کە ستەم لە بەڵێن پێدراوان بکات).

ز- بایەخدان بە خەڵکی دەشت نشین و چاودێری کردنیان و بایەخ پێدانیان (وەسیەتت بۆ دەکەم کە باش بیت لەگەڵ خەڵکی دەشت نشین، لەبەر ئەوەی کە ئەوان عەرەبی ڕەسەن و کەرەستەی ئیسلامن).[١]

ح- وە لە چوارچێوەی وەسیەتەکەی عومەر بۆ کەسی دوای خۆی هاتووە کە: کە لە ساڵێك زیاتر کار نەداتە دەست هیچ کاربەدەستێك، ئەبو موسای ئەشعەریان بۆ ماوەی چوار ساڵ لە کارکەی هێشتەوە.[٢]

چوارەم: دواین ساتەکان:

ئەوە ئیبنو عەباسە دواین ساتەکانی ژیانی عومەری فاروقمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: عومەر کاتێك کە هەوڵی تیرۆرەکەی درا و بریندار بوو ، چووم بۆ لای، پێم وت: مژدەی بەهەشت لێبێت ، ئەی ئەمیری باوەڕداران، موسڵمان بوویت کاتێك کە خەڵك بێباوەڕ دەبوون، لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) جیهادت کرد لە کاتێکدا کە خەڵکی سووکایەتیان پێ دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) وە فاتی کرد و لێت ڕازی بوو، لە سەردەمی خەلافەتتدا دوو کەس ناتەبا نەبوون پێکەوە، بە شەهیدی دونیا بە جێدێڵی، عومەر فەرمووی بۆم دووبارە بکەرەوە، منیش بۆم دووبارە کردەوە، ئەویش فەرمووی: سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لەو، ئەگەر لەسەر زەوی لە زەردایی و سپیایی چیم هەبوایە هەمویم لە ترسی قیامەت و سەختیەکانی هەمویم دەبەخشی،[٣] وە لە ڕیوایەتێکی بوخاریدا هاتووە: ئەوەی کە باست کرد لە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ)و ڕازی بونی لە من ئەوە فەزڵی خودایە و بە یەکێ

---

١ـ الخليفة الفاروق عمر بن الخطاب للعاني (ص: ١٧٣-١٧٥).
٢ـ عصر الخلافة الراشدة (ص: ١٠٢).
٣ـ صحيح التوثيق في سيرة وحياة الفاروق (ص: ٣٨٣).

لەسەر وەریەکانم دەزانم و شانازی پێوە دەکەم ، بەلاّم ئەوەی کە تۆ دەیبینی لە بێتاقەتیم ئەوە لە پێناوی تۆ و هاوڕێکانتدایە، سوێند بە خوا ئەگەر بە قەدەر چرۆی گۆلکانی زەوی زێڕم هەبوایە دەمبەخشی لە بری سزای خودا پێش ئەوەی ببینم.[1]

عومەر(ﷺ) زۆر لەسزا و ئەشکەنجەی خودا دەترسا لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێداوە، لەگەڵ ئەوەی کە هەوڵێکی زۆری دا لە پێناوپیادە کردنی حوکمی خوا و دادپەروەری وچەسپاندنی دادگەری و جیهاد و چەندین شتی تر لە کاری چاکە، ئەوا لەمەدا وانەیەکی جوانی بۆ موسڵمانان تێدایە ئەویش پشت گوێ نەخستین سزا و ئازاروەهامەتیەکانی دواییە.[2]

ئەمەش عوسمانە(ﷺ) باسی دواین ساتەکانی ژیانی عومەری فاروقمان بۆ دەکات دەفەرمووێت: من دوایین کەستان بوم کە چومە لای عومەر، چوومە ژوورەوە، کە سەری لەسەر ڕانی عبدالله ی کوڕی دابوو، عومەر فەرمووی بە عبدالله: ڕوومەتم بخەرە سەر زەوی، پاشان فەرمووی: ئایا ڕوومەتم بەتەواوی لەسەر زەویە ؟ دیارە عەبدوڵای کوڕی دڵی نەهات رومەتی بخاتە سەر زەوی و لەسەر ڕانی لایدا،بۆیە فەرمووی: ڕوومەتم بخەرە سەر زەوی بێ دایك، لە دووەم جاردا یان لە سێیەم جاردا، پاشان تێك ئالاّ بە نێو پێیەکانیدا وە گوێم لێ بوو دەیفەرموو: هەی هاوارم، هەی هاوار بۆ دایکیشم ئەگەر خوا لێم نەبوورێت ، تا گیانی سپارد، ئەمە یەکێکە لەو نموونانەی کە عومەر ئەمیری بڕواداران(ﷺ)ی پێ وەسف دەکرێت لە ترسی خوای گەورە تەنانەت دوایین وتەشی دوعا کردنە لەسەر خۆی بە هەی هاوار ئەگەر خوای گەورە لێی نەبوورێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە یەکێکە لە(١٠) مژدە پێدراوەکەی بەهەشت، بەلاّم هەر کەس کە زیاتر خودا بناسێت زیاتر لێی دەترسێت، سوور بوونی لەسەر ئەوەی کە کوڕەکەی ڕوومەتی بخاتە سەر زەوی، ئەمەش خۆ بەکەم زانینو ملکەچی نواندنی تێدایە بەرامبەر خوای گەورە، تا ئەمە هۆکارێك بێت بۆ وەرگرتنی نزاو پاڕانەوەکانی،ئەمەش وانەیەکە چۆنیەتی گرێدانی دڵمان لەگەڵ خوای گەورەدا بۆ ڕوون دەکاتەوە.[3]

١- مێژووی مردنی و تەمەنی:

(ئەلذەهەبی) دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) چوار شەممە شەهید کرا، کە سێ تا چوار ڕۆژ لە مانگی (ذي الحجة) مابوویەوە، لە ساڵی(٢٣)ی کۆچیدا، واتا تەمەنی بەپێی ڕاسترین راو بۆچون(٦٣) ساڵ بووە،[4] ماوەی خەلافەتەکەی دە ساڵ و شەش مانگ و چەند ڕۆژێك بوو،[5] وە لە مێژووی ئەبی زەرعە لە جویەیری ئەلیحیەوە هێناویەتی کە دەفەرمووێت: من لە لای موعاویە بووم کە دەفەرمووێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە تەمەنی(٦٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، ئەبو بەکری صدیق هەر لە تەمەنی(٦٣)

---

١ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٦٩٢).
٢ـ التأريخ الاسلامي (١٩/٣٣).
٣ـ التأريخ الاسلامي (١٩/٤٤-٤٥).
٤ـ في التهذيب ق ١٧٧/ب نقلا عن محض الصواب (٣/٨٤٠).
٥ـ سير السلف لأبي القاسم الاصفهاني (١/١٦٠).

ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە وە عومەریش کاتێك شەهید کرا تەمەنی(٦٣) ساڵان بوو.[١]

٢- سەبارەت بە شۆردن و نوێژ لەسەر کردن و بە خاك سپاردنی:

لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە(ﷺ) دەگێڕنەوە: عومەر شۆراوە و کفن کراوە، نوێژی لەسەر کراوە، شەهیدیش بووە،[٢] وە زانایان ناتەبا بوون لەوەی کە کەسێك بە ستەم لێکراوی بکوژرێت ئایا وەك شەهید ناشۆرێت یان نا؟ دوو ڕای لەسەرە:

یەکەمیان: ئەو کەسە دەشوورێت، ئەمەی عومەریش بەڵگەی خاوەنی ئەم بۆچونەیە.[٣]

دووەمیان: ئەو کەسە ناشوردرێت و نوێژی لەسەر ناکرێت، وەڵامیش سەبارەت بە چیرۆکی عومەر ئەوەیە کە عومەر پاش ئەوەی ریندار بوو بۆ ماوەیەك ژیا، شەهیدیش تەنانەت شەهیدی جەنگیش پاش ئەوەی کە لێی دەدرێت ئەگەر نان و ئاوی خوارد وە یان مانەوەی درێژی کێشا ئەوا دەشۆردرێت، نوێژی لەسەر دەکرێت، عومەریش مانەوەی درێژەی کێشا هەتا ئاوی خواردەوە، لەگەڵ ئەو دەرمانانەش کە دکتۆر بۆی نوسیبوو، هەر لەبەر ئەمە عومەر(ﷺ) شۆردرا و نوێژی لەسەر کرا.[٤]

٣- کێ نوێژی لەسەر کرد؟

(ئەلذەهەبی) دەفەرمووێت: سوهەیبی کوڕی سنان نوێژی لەسەر کرد،[٥] وە إبن سەعد دەفەرمووێت: عەلی کوڕی حسەین پرسیاری لە سەعیدی کوڕی ئەلموسەیب کرد: کێ نوێژی لەسەر عومەر کرد؟ ئەویش فەرمووی: سوهەیب، فەرمووی: چەند ألله اکبری لەسەر کرد؟ فەرمووی: چوار ، فەرمووی: لە کوێ نوێژی لەسەر کرد؟ فەرمووی: لە نێوان گۆڕ و مینبەر،[٦] وە إبن ئەلموسەیب دەفەرمووێت: موسڵمانان سەرنجیان دا کە سوهەیب نوێژە فەرزەکانیان بۆ دەکات بە فەرمانی عومەر(ﷺ)و ئەوانیش کردیانە پێشەوای خۆیان، پاشان نوێژی لەسەر عومەر کرد،[٧] عومەر (ﷺ) هیچ کام لە شەش پاڵێوراوەکەی بۆ خەلافەت پێش نەخست هەتا گومانیان وانەبێت کە پێشخستنیان لە عومەرەوە هەنگاوێکە بۆ هەڵبژاردنیان هەروەها سوهەیب پلە و پایەیەکی بەرزی گەورەی هەبوو لای عومەر و هاوەڵانیش (خوایان لێ ڕازی بێت) وە عومەر سەبارەت بە سوهەیب فەرموویەتی: سوهەیب بەندەیەکی باش بووە ئەگەر لە خواش نەترسایە سەرپێچی نەدەکرد.[٨]

---

١ـ مسلم، فضائل الصحابة رقم (٢٣٥٢)، محض الصواب (٨٤٣/٣).
٢ـ الطبقات (٣٦٦/٣) إسناده صحيح.
٣ـ الانصاف للمرداوي (٥٠٣/٢) محض الصواب (٨٤٤/٣).
٤ـ محض الصواب (٨٤٥/٣).
٥ـ هەمان سەرچاوە.
٦ـ الطبقات (٣٦٦/٣) و في إسناده خالد بن إلياس وهو متروك.
٧ـ الطبقات (٣٦٧/٣)، محض الصواب (٨٤٥/٣).
٨ـ الفتاوى (١٤٠/١٥).

٤- سەبارەت بە خاك سپاردنی:

(ئەلذەهەبی) دەفەرمووێت: عومەر(ﷺ) لە ژوورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) نێژراوە،[١] وە إبن الجوزی لە جابرەوە هێناوەیەتی دەفەرمووێت: هەر یەکە لە عوسمان و سەعیدی کوڕی زەید و سوهەیب و عبداللە ی کوڕی عومەر دابەزینە گۆڕەکەی عومەر،[٢] وە هیشامی کوڕی عوروە دەفەرمووێت: لە سەردەمی وەلیبینی کوڕی عبدالملك گۆڕەکان ڕووخان –گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو بەکر و عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت)- هەستان بە نۆژەن کردنەوەیان،[٣] پێیەك بۆیان دەرکەوتن وە گومانیان کرد کە ئەمە پێی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ)ە وە کاتێك کەسێکی شارەزایان لەو بارەوە نەبینیەوە، هەتا عەروە پێی فەرموون: نەخێر سوێند بە خوا ئەوە پێی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) نیە، ئەوە جگە لە پێی عومەر(ﷺ) پێی کەسی تر نیە،[٤] وە ئێمە باسمان لەوە کرد کە: عومەر عبداللە ی کوڕی نارد بۆ لای عائیشەی دایکی بڕواداران (خوای لێ ڕازی بێت) و پێی فەرموو: مۆڵەتم بۆ وەربگرە کە لەگەڵ دوو هاوڕێکەم بە خاك بسپێردرێم عائیشەش وەڵامی ئەرێ دایەوە ڕازی بوو، هیشامی کوڕی عەروەی کوڕی زوبێر دەفەرمووێت: ئەگەر پیاوێك بۆ ئەم مەبەستە بیناردایە بۆ لای – واتا عائیشە – لە هاوەڵان دەیفەرموو: نا وسێند بە خوا هەرگیز بە کەسێکی تر ڕازی نابم،[٥] ڕاکان هەمویان یەکن کە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر و عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) لەو شوێنەدان کە خرایە سەر مزگەوت پاش گەورە کردنی کە باشترین سڵاو و درووود لەسەر خاوەنەکەی بێت.[٦]

٥- ئەوەی کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب(ﷺ)دەربارەی عومەری فاروق فەرمووی:

إبن عباس دەفەرمووێت: عومەر لەسەر ڕاخەرەکەی دانرا پاشان خەڵکی کفنیان کرد و دوعایان بۆ کرد و نوێژیان لەسەر کرد، پێش ئەوەی بەرز بکرێتەوە، من لە نێوانیاندا بووم، بەدەستی پیاوێك ڕاچلکیم کە شانمی گرت،ئاوڕم دایەوە بینیم عەلیە، نزای بۆ عومەر کردو فەرمووی: کەسێکت بەجێ نەهێشت کە خۆشەویستتر لە لام کە بە وێنەی کاری لە تۆ وە بگاتە خوای گەورە، سوێند بە خوا من گومانم وابوو کە خوای گەورە لەگەڵ دوو هاوڕێکەت دات بنێت، من زۆرم لەدەم پێغەمبەر(ﷺ)ەوە بیستوە کە دەیفەرموو: (من و ئەبو بەکرو عومەر ڕۆیشتین، من و ئەبو بەکرو عومەر چووینە ژورەوە و ئەبو بەکرو عومەر هاتینە دەرەوە).[٧]

---

١ـ محض الصواب (٣/٨٤٦).
٢ـ البخاري، ك: الجنائز رقم (١٣٢٦).
٣ـ إبن مروان الاموي من خلفاء بني أمية.
٤ـ البخاري، ك: الإعتصام، رقم (٢٦٧١) رقم (٦٨٩٧).
٥ـ محض الصواب (٣/٨٤٧).
٦ـ هەمان سەرچاوە.
٧ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٤٨٢).

٦- ئاسەوارەکانی شەهید بونی لەسەر موسڵمانان:

بە ڕاستی ئەم کارەساتە زۆر گەورە بوو لەسەر موسڵمانان، ڕووداوێك نەبوو وەك نەخۆشیەك عومەری پێ وەفات بکات ، ئەوەی کە زیاتر نارەحەت و دژوار بوو ئەوە بوو ئەم ڕووداوە لە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕوویدا لە کاتێکدا کە عومەر نوێژی بەیانی بۆ موسڵمانان دەکرد، تێك چونی شیرازەی ژیانی موسڵمانان دوای ئەم کارەساتە زیاتر شوێنەواری گەورەی ئەم کارەساتەمان بۆ دەردەخات لەسەر دەرونی موسڵمانان ، عومەری کوڕی مەیمون دەفەرموێت:... ئەو خەڵکە بە شێوەیەك بوون دەتگوت پێشتر دووچاری هیچ کۆسپێك نەبوونەتەوە، إبن عەباس دەڕوات هەتا هەواڵی پاش کوژرانی عومەر بە ئاگا بێت وە بۆ ئەوەی کە پێی بڵێت: کە ئەو بە لای فریشتەیەکدا تێنەپەڕیوە مەگەر ئەوان گریابن و وەك ئەوەی کە ئەوان نۆبەرەی منداڵیان ون کردبێت،[1] بە ڕاستی عومەر یەکێك بوو لە مامۆستایانی ڕێ نیشاندەر و جیاکەرەوەی نێوان ڕەوا و نارەوا بوو لەبەر ئەوە سروشتیە کە خەڵکی بە لەدەستدانی کاریگەربن،[2] ئەم کاریگەریەش بە ڕوونی توندی کاریگەربوونی خەڵکی پێوەی ڕوون دەکاتەوە وە لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: عومەر کاتێك کە لێی درا فەرمانی دا بە سوهەیب نوێژ بە خەڵکی بکات و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ نان و ئاویان بدات هەتا لەسەر هەڵبژاردنی پیاوێك کۆك دەبن، کاتێك کە خوانەکان ئامادە کران خەڵکەکە دەست بەرداری خواردنەکە بوون وە عەباس فەرمووی: ئەی خەڵکینە پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد وە ئێمە نان و ئاوی خۆمان هەر خوارد، دواتریش ئەبو بەکر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد و ئێمەش نان و ئاوی خۆنا هەر خوارد، پێویستە خەڵکی نان و ئاوی خۆیان هەر بخۆن.[3]

عبداللە ی کوڕی مەسعود(ﷺ) کاتێك کە باسی عومەریان بۆ دەکرد دەستی دەکردە گریان و هەتا بەرد و چەو بە فرمێسکەکانی تەڕ دەبوون پاشان دەیفەرموو: بە ڕاستی عومەر بۆ ئیسلام قەڵایەك بوو کە خەڵکی دەچوونە نێویەوە و لێی نەدەهاتنە دەرەوە وە کاتێك کە کۆچی دوایی کرد قەڵاکە درز و دەروازەی تێکەوت و خەڵکیش لە ئیسلام هاتنە دەرەوە.[4]

بەلام ئەبو عوبەیدەی کوڕی ئەلجەراح، پێش ئەوەی کە عومەر شەهید بکرێت دەیفەرموو: ئەگەر عومەر بمرێت ئیسلام تەنك و ناسك دەبێت، من پێم خۆش نیە کە لە دوای عومەر بمێنم و خۆرم لێ ئاوا بێت و خۆرم لێ هەڵ بێت، خەڵکی پێیان وت: بۆچی؟ ئەویش فەرمووی: ئەگەر مان بۆ ئەوەی من دەیڵێم بە چاوی خۆتان دەیبینن، بەلام ئەو بە ڕاستی دۆستی والی بوو پاشان دەیگرتن بەوەی کە عومەر پێی دەگرتن بەلام خەڵکی گوێیان بۆ نەدەگرت بەم شێوەیە و هیچ ئەرکێکیان نەدەسپارد، ئەگەر لاواز بووایە دەربارەیان دەیان کوشت.[5]

---

١ـ العشرة المبشرون بالجنتن محمد صالح عوض (ص: ٤٤).

٢ـ هەمان سەرچاوە.

٣ـ محض الصواب (٨٥٥/٣).

٤ـ الطبقات الکبری(٢٨٤/٣).

٥ـ الطبقات الکبری(٢٨٤/٣)، العشرة المبشرون بالجنتن محمد صالح عوض (ص: ٤٤).

پێنجەم: گرنگترین سوود و وانە و پەندەکان:

١- بە ئاگا بوون لەسەر ئەو خەشمەی کە دڵی بێباوەڕانی لەسەر نووشتاوەتەوە لە دژی باوەڕداران:

بەڵگەش لەسەر ئەمە شەهید بوونی عومەر(ﷺ) بە دەستی ئەبو لؤلؤە، ئەمە سروشتی بێباوەڕانە لە هەموو سات و جێگەیەکدا، دڵانێك کە هیچیان بۆ موسڵمانان پێ نیە جگە لە ڕق و کینە و ئیرەیی و قین، دەرونێك جگە لە شەڕ و خراپە و تیاچوون و زیان بۆ باوەڕداران هیچی تر نین، جگە لە هەڵگەرانەوەی موسڵمانان لە ئاینەکەیان و بێباوەڕ بوونیان لە پاش موسڵمان بوونیان هیچ خۆزگە و ئاواتێکیان نیە،[1] هەر کەس بە باشی سەیری چیرۆکی شەهید بوونی عومەر(ﷺ) بکات لەگەڵ ئەوەی کە ئەبو لؤلؤەی مەجوسی قین لە دڵ کردی ئەوا لەم چیرۆك و ڕووداوەدا دوو ئەرك و کاری گرنگ هەڵدەگۆزێت، کە ئەو ڕقە دەخەنە ڕوو کە ئەو بێباوەڕە لە دڵیدا چاندبووی لە دژی عومەر و ئەمەش ئەو دوو ئەرکەیە:

أ- لە کتێبی (الطبقات الکبری)بە سەنەدێکی ڕاست و دروستی ئەلزەهریدا[2] بۆ إبن سعد چەپساوە کە عومەر(ﷺ) ڕۆژێك بەو مەجووسیەی فەرموو: ئایا ئەوە ڕووی نەداوە کە تۆ دەیڵێیت: ئەگەر بمەوێت دروست دەکەم کە بە بۆن بڕێت، ئەو مەجووسیەش بە ناوچاو گرژیەکەوە ئاوڕی دایەوە و وتی: خەنجەرێکت بۆ دروست دەکەم کە خەڵکی باسی لێوە بکەن، عومەریش لە هاوڕێکانی چوویە پێشێ و فەرمووی: ئەو بەندەیە بەڵێنی پێدام.

ب-گرفتی دووەم بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕق و کینەیەی کە دڵی ئەو مەجووسیەی پڕ کردبوو، کاتێك کە بە خەنجەرەکەی دای لە عومەر(ﷺ)، لەگەڵیدا دای لە (١٣) هاوەڵی تر کە حەوتیان شەهید بوون، لە ڕیوایەتی بووخاریدا هاتووە کە دەفەرمووێت: ئەبو لؤلؤە باڵی لێ پەیدا بوو، بە خەنجەرێکی دوو دەمەوە هەر کەس بە لای ڕاست و چەپیدا کە تێدەپەڕی برینداری دەکرد، تا (١٣) پیاوی لێ بریندار کردن کە حەوتیان مردن،[3] عومەر(ﷺ) ئەگەر بێت و ستەمکار بوویێت بەرامبەر ئەو مەجووسیە بەڵام تاوانی ئەو هاوەڵانە چی بوو کە ئەبو لؤلؤە هێرشی کردە سەریان؟! وە پەنا دەگرم بە خودا ئەگەر بێت و عومەر ستەمی لێ کردبێت و ستەمکار بوویێت بەرامبەری، لە ڕیوایەتی بوخاریدا هاتووە کە عومەر کاتێك کە بریندار بووە فەرموویەتی: ئەی کوڕی عەباس، سەیر کە کە کێ کوشتوومی توور فرۆشی سەردەم پاشان فەرمووی: خزمەتکارەکەی موغیرە، فەرمووی: خراپەکە، یان خراپەکارەکە، وتی: بەڵێ، فەرمووی: خوا بیکوژێت، من چاکەیەکم لەگەڵ کرد، سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە مەرگی نەدامە دەست کەسێك کە بانگەشە بۆ ئیسلام بکات،[4] ئەم پیاوە مەجووسیە دۆستەکانی کە دوژمنانی

---

١ـ سیر الشهداء دروس وعبر، عبدالحمید السحیباني (ص: ٣٦).

٢ـ الطبقات (٣/٣٤٥) إسناده صحیح.

٣ـ البخاري، کتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٧٠٤).

٤ـ هەمان سەرچاوە.

ئیسلامن هەستان بە دروست کردنی دیمەنێکی یادگاری بۆی لەسەر سەکۆی سەربازێکی ون لە وڵاتی ئێران، حەسەن موسەوی کە یەکێکە لە زانایانی ئێرانی لە شاری نەجەف دەڵێت: ئەوەش بزانن کە ئەم دیمەنە لە شاری کاشانی ئێران لە ناوچەیەك کە پێی دەڵێن (باغی فین) کە دیمەنێکە لەسەر مەزاری سەربازی ون کە گۆڕی خەیاڵی ئەبو لۆلۆەی فەیروزی فارسی مەجووسی لێیە، کە بکوژی عومەری کوڕی خەتابی خەلیفەی دووەمە، کە ناوێکیان لێ ناوە کە عەرەبییەکەی (مەرقەدی بابا شجاع الدین)ە، بابا شجاع الدین نازناوێکە دراوە بە ئەبو لۆلۆە لەبەر ئەوەی کە عومەری شەهید کردووەن وە لەسەر دیواری ئەم دیمەنگایە نووسراوە (مرگ بر ئەبو بەکر، مرگ بر عومەر، مرگ بر عثمان) واتا بە کوردیەکەی (مردن بۆ ئەبو بەکر، مردن بۆ عومەر، مردن بۆ عوسمان) وە ئەم دیمەنگایە لە لایەن شیعەکانی ئێرانەوە بە زۆری سەردانی دەکرێت، بەردەوام چەندین خێرات و ماڵ بەخشینی تێ فڕێ دەدرێت وە من (صلابی) ئەو دیمەنگایەم بە چاوی خۆم بینیووە، هەروەها وەزارەتی ڕێنمایی ئێران چەند جار هەستاوە بە گەورە کردن و نۆژەن کردنەوەی، لە سەروو ئەمانەشەوە هەستاون بە چاپکردنی وێنەی ئەو دیمەنگایە لەسەر کۆمەڵە کارتێك کە بەکاردێ بۆ پەیام ناردن و نووسراوەکان.[1]

٢- دەرکەوتنی تێکشکانی ئەو زات و ترسەی کە عومەر(ﷺ)ی پێ جیادەکرایەوە:

ئەوەی کە بەڵگە لەسەر ئەو ترسەی کە زاڵ بوو بەسەر دڵی عومەر(ﷺ) دا پێش شەهید بوونی ئەو ووتە یەیەتی کە کاتێك زانی ئەبو لۆلۆەی کۆیلەی مەجووسی لێیداوە فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە مەرگی نەدامە دەستی پیاوێك کە بانگەشە بۆ ئیسلام بکات،[2] ئەمە و عومەر لەگەڵ ئەو دادپەروەریەی کە پێی وەسف کرابوو، ئەوەی کە پەڕاگەندە و دوور و نزیك و عەرەبی و عەجەمی دانیان پێداناوە، بەڵام ترسا لەوەی کە ستەمی لە یەکێك لە موسڵمانان کربێت، ئەو مەجووسیە بە کوشتنی تۆڵەی خۆی لێ کردەوە، ئەمەش بەڵگەیە بۆی لای خوای گەورە، هەروەها ئەمەش لە ڕیوایەتی إبن شهاب بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە: عومەر فەرموویەتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی وای کرد لە بکوژەکەم لای خوای گەورەم هەژاری نەخستوون بەوەی کە هەرگیز سەجدەیەکی بۆ خوا نەبردووە، هەروەها ڕیوایەتەی مویارەکی کوڕی فەزالەدا هاتوە: هەژاری خستووم و دەڵێت:٠ لا الـه الا الله،[3] کە ئەمەش سەرسامیەکە لە سەرسامیەکانی ئەم پێشەوا زانا و خواناسە، کە دەکرێت بانگخوازان و چاکسازانی لەسەر پەروەردە بووە و پێویستە ئەم تێکشکانەش نیشانەیەك بێت لە گەورەترین نیشانەکانی هەتا خوای گەورە سوودیان پێ بگەیەنێت، هەروەك ئەوەی کە سوودی بە پێشینەکانی وەك عومەر (ﷺ) گەیاندووە، هەتا وتەی سەر زاری هەموان ئەوەبێت کە دەفەرمووێت:

---

١ـ لله ثم للتأريخ كشف الاسرار وتبرئة الأئمة الاطهار (ص: ٩٤).
٢ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٧٠٤).
٣ـ سير الشهداء دروس وعير، عبدالحميد السحيباني (ص: ٤٠).

| | |
|---|---|
| واحسرتي، واشقوتـــي | من يوم نشر كتابيــه |
| وأطول حزني إن أكــن | أوتيته بشماليــــــه |
| وإذا سئلت عن الخطــأ | ماذا يكون جوابيــه؟ |
| وأحر قلبي أن يكـــون | مع القلوب القاسيـة |
| كلا ولا قدمت لـــــي | عولا ليوم حسابيــه |
| بل إنني لشقاوتـــــي | وقساوتي وعذابيــه |
| بارزت بالزلات فـــي | أيام دهر خاليــــه |
| من ليس يخفي عنه من | قبح المعاصي خافيـه[1] |

**٣- خۆ بەکەم زانینی گەورە لای عومەر و خۆشەویستی گەورە لای عائیشە:**

**أ- خۆ بەکەم زانینی گەورە لای عومەر(ﷺ):**

لە چیرۆکی شەهید بوونیدا ئەو وتەیەی کە بە عبداللە ی کوڕی فەرموو بەڵگەیە لەسەری کە دەفەرموویێت: بڕۆ بۆ لای عائیشەی دایکی باوەڕداران، پێی بڵێ: عومەر سڵاوت لێ دەکات، مەڵێ، ئەمیری باوەڕداران، چونکە من لەمڕۆوە ئەمیری باوەڕداران نیم،[2] هەروەها ئەو وتەیەی بۆ کوڕەکەی بەڵگەیە لەسەری کاتێك کە عائیشە مۆڵەتی پێدا بۆ بە خاك سپاردنی لای دوو هاوڕێکەی کە پێی فەرموو: ئەگەر تەواو بووم هەڵم بگرن، پاشان سڵاوی لێ بکە، پاشان بڵێ: عومەری کوڕی خەتاب داوای مۆڵەتت لێ دەکات، ئەگەر مۆڵەتی پێدام ئەوە بمبەنە ژوورەوە، ئەگەر گێڕامیەوە ئەوا بمگێڕنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان،[3] خوای گەورە بەزەیی بە عومەر(ﷺ) بێتەوە، بە ڕەوشتی ئەو ڕزقمان بدات، لەو خۆ بەکەم زانینەی بێ بەشمان نەکات، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە بەوەی کە پاداشتی لە خوا ترسانی خۆ بەکەم زانان دەداتەوە، بە ڕاستی خوای گەورەم نزیك و گوێڕایەڵە.[4]

**ب- خۆ نەویستی گەورە لای عومەر (ﷺ):**

ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر خۆنەویستی لای عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەوەیە کە خوازیاری ئەوەیە کە لای هاوسەرەکەی (ﷺ) و ئەبو بەکری بابی بە خاك بسپێردرێت، کاتێك کە عومەر داوای مۆڵەتی لێکرد بۆ ئەو کارە مۆڵەتی پێدا و خۆنەویستی بە خۆیدا و فەرمووی: من بۆ خۆمم دەویست وە ئەمڕۆ ئەو خۆ نەویستیە دەدەمە خۆم.[5]

---

١ـ الرقائق لمحمد أحمد الراشيد (ص: ١٢١-١٢٢).
٢ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٧٠٤).
٣ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم: (٣٧٠٠).
٤ـ سير الشهداء (ص: ٤١).
٥ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم (٣٧٠٤).

٤- فەرمان کردن بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە لەسەر جێگای مردندا:

بایەخدانی عومەری فاروق بە کاری فەرمان کردن بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە بە ڕاستی کارێك بوو کە تەنانەت لە کاتێکیشدا کە ڕووبەڕووی مرگ دەبوویەوە بە تەواوی ئەشکەنجە و ئازار و دژواریەکانیەوە، لەو کاتەی کە لێی درا لاوێك چوویە ژورەوە بۆ لای و پیایدا هەڵدا، وتی: مژدەبێ ئەی ئەمیری باوەڕداران بەو مزگێنیەی کە خوای گەورە پێی داویت، لە هاوەڵی کردنی پێغەمبەر(ﷺ)وە لە ئیسلام ئەوەی کە پێشکەشی کرد تۆ زانیت، پاشان کارت پێ سپێردرا و تۆش دادپەروەر بوویت، پاشان شەهیدی بوویە خەڵات، عومەر فەرمووی : خوازیار بووم بەم نوکی شمشێرە، لە نە سەر خۆم و نە بۆ خۆم، کاتێك کە پشتی تێکرد ئەگەر هاوکاری کرد ئەوا خۆی لە زەوی گیر دەکرد، پاشان فەرمووی: ئەو لاوەم بۆ بگێڕنەوە پاشتر فەرمووی: ئەی برازاکەم، جلەکانت بەرز بکەرەوە و هەڵێبڕە وەمە باشترە بۆ جل و بەرگەکەت و مایەی لە خوا ترسانترە،[1] وە ئەمە بەری بە عومەر(ﷺ) نەگرت لەوەی کە لە مردن فەرمان کردنی بە چاکە تێدایە، لەبەر ئەوەیە کە إبن مەسعود(ﷺ) لەوەی کە عومەری کوڕی شبە ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێت: ڕەحمەتی خوا لە عومەر بێت کە مەرگ بەری پێ نەگرت کە بەردەوام بێت لەسەر قسەی ڕاست و ڕەوا،[2] وە بایەخدانە بە چاوەکانی لە فەرمان کردن بە چاکە و بەرگرتن لە خراپە هەروەها لەم حاڵەتەدایە، کاتێك کە حەفصە (خوای لێ ڕازی بێت) چوویە لای فەرمووی: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا و ئەی زاوای پێغەمبەری خوا، و ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەر بە عبداللە ی کوڕی فەرموو: ئەی عبداللە دامبنیشێنە من ئارامم نەما لە گوێ بیستی ئەم قسانە، ئەویش دایە پاڵ سنگی خۆی، و بە حەفصەی وت: من قەدەغە دەبم لەسەرت، بەوەی کە لەسەرتە لە هەق و ڕاستی بۆ من ئەگەر پاش ئەم دانیشتنەت باسم بکەیت، بەڵام چاوەکانت من خاوەنیان نیم،[3] ئەنەسی کوڕی مالك دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: کاتێك کە عومەر لێیدرا حەفصە قیژاندی و عومەر فەرمووی: ئەی حەفصە گوێت لە پێغەمبەر(ﷺ) نەبووە، کە دەیفەرموو: ئەوەی کە ئەوەی شینو ڕۆڕۆی لەسەر بکرێت ئەشکەنجە دەدرێت؟ پاشان سوهەیب هات و فەرمووی: عومەرم ڕۆ، ئەویش پێی فەرموو: هاوار بۆ تۆ ئەی سوهەیب ئایا ئەوەت پێ نەگەیشتووە کە ئەوەی شینو ڕۆڕۆی لەسەر بکرێت ئەشکەنجە دەدرێت؟[4] عومەر (ﷺ) لە گرژیدا لەسەر ڕاستی هەر بەردەوام بوو تەنانەت پاش لێدانی و خوێن لێ ڕۆیشتنی پیاوێك هاتە لای وتی ئەی عومەر: عبداللە ی کوڕت لە شوێنی خۆت بکە خەلیفە، عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا من ئەوەم لە خودا نەویستووە.[5]

---

١ـ البخاري، كتاب: فضائل الصحابة، رقم رقم (٣٧٠٤).
٢ـ فتح الباري (٦٥/٧) سير الشهداء (ص: ٤٢).
٣ـ مناقب أمير المؤمنين (ص: ٢٣٠)، الحسبة، د. فضل إلهي (ص: ٢٧).
٤ـ فضائل الحصابة، أحمد بن حنبل، (٤١٨/١) وإسناده صحيح.
٥ـ سير الشهداء (ص: ٤٣).

٥- ڕێ پێدراوە پیاهەڵدان (الثناء) لەسەر پیاوێك بەو سیفەتەی کە تیایدا هەیە ئەگەر تووشی فیتنە نەبێت بەو پیا هەڵدانە:

ئەمە وەك ئەو هەل و مەرجەی ئێستایە لەگەڵ عومەر(رضي الله عنه)دایە، بە جۆرێك کە لە لایەن ژمارەیەك لە هاوەڵانەوە بەسەر عومەردا هەڵیان داوە چونکە ئەوان زانیویانە پیا هەڵدان فیتنەیەك بەرپا ناکات، إبن عباس(رضي الله عنه)، کە زانایەکی خوانـاس و شـارەزایەکی گـەورە بـووە دەفـەرمووێت: ئایا ئـەوە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نیە کە دەفەرمووێت ئیسلام و موسڵمانان شانازیت پێوە دەکەن، لـە کاتێکدا کـە لـە مەککە دەترسان، بە ڕاستی کاتێك کە موسـڵمان بویـت موسـڵمان بوونـت مایـەی سـەربەرزی بـوو وە ئیسلامیش بە تۆوە دەرکەوت... خوای گەورە تۆی خستە نێو هەموو ماڵێکەوە بۆ بەختـەوەر بوونیـان لە ئاینەکەیان، بەختەوەر بوونیان لە ڕزق و ڕۆزیان، پاشان ئەم کارەی بە شەهیدی بۆ تەواو کردی، دەی پیرۆزت بێت، بەم شێوەیە ئەم وشـانە کاریـان نـەدەکردە سـەر دڵـی عومـەر بـە هـیچ شـێوەیەك، پێـی بەختەوەر نەبوو، لەسەر ئەوە وەڵامی ئیبو عەباسی دایەوە و فەرمووی: سوێند بە خوا پیاوی لەخۆبایی ئەو کەسەیە کە لە خۆی بایی دەکەن.[1]

٦- هەڵوێست دروستی کەعبی ئەحبار لە شەهید کرانی عومەر(رضي الله عنه):

کەعبی ئەحبار ناوی کەعبی کوڕی مانعی ئەلحومەیری، ناسـراو بـە ئـەبو ئیـسحاق و بـە کـەعبی ئەحبار بەناوبانگ بووە، پیاوێك بووە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی ناسیووە و لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا باوەڕی هێناوە، لە ساڵی(١٢)ی کۆچیدا،[2] پێش موسـڵمان بـوونی وا ناسـراوە کـە یەکێکـە لـە گـەورە زانایانی جوولەکە لـە یەمـەن، پـاش موسـڵمان بـوونی زانـستەکانی قورئـان و سـوننەتی لـە یارانـەوە وەرگرتووە و خەڵکانی ترش هەواڵیان سەبارەت بە گەلانی ڕابـردوو یـان پێـشتر لێ وەرگرتـووە، پاشـان بەرەو شام کەوتۆتە ڕێ و لە شاری حمص نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە،[3] کـەعبی کوڕی ئەحبار لە پلانـی کـوژرانی عومـەری ئـەمیری بـاوەڕداران تۆمـەتبار کـراوە وە لـە ڕیوایـەتێکی (الطبري)دا هاتووە کە مسوری کوڕی موخرمە(رضي الله عنه) ئاماژە بەو تۆمەتەی دەکات لە کوژرانی عومەردا لە ڕیوایەتەکەدا هاتووە:... پاشان عومەر ڕۆیشت بۆ ماڵەکەی، پاشـان بـۆ سـبەینێ کـە ڕۆژ بوویـەوە کەعبی ئەحبار هات و وتی بە عومەر: ئەی ئەمیری باوەڕداران، بەڵێنت پێ دەدەم کە لە مـاوەی سـێ ڕۆژی تردا تۆ مردووی، عومەر فەرمووی: جا چـۆن دەزانـی؟ مـن لـە پـەڕاوی خـوا تەوراتـدا دیومـە، عومەر فەرمووی: ألله، ئایا تۆ عومەری کوڕی خەتابت لە تەوراتدا بینیوە؟ ئەویش وتی: نەخێر، بەڵام

---

١ـ سير الشهداء دروس وعبر (ص: ٤٥).
٢ـ جولة تأريخية في عصر الخلفاء الراشدين محمد السيد الوكيل (ص: ٢٩٤).
٣ـ سير أعلام النبلاء (٣/٤٨٩-٤٩٤).

سیفەت و چەکتم دیووە وە مەرگت کۆتایی پێ هاتووە، فەرمووی: بەڵام عومەر هەست بە هیچ ئێش و ئازارێك ناکات، پاشان کە ئەو ڕۆژە تێپەڕی و سبەینێ داهات وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕۆژێك تێپەڕی و شەو و ڕۆژێکت ماوە وە ئەم شەوەش تا بەرەبەیان بۆ تۆیە، دەفەرمووێت: کاتێك کە بەیانی داهات، ڕۆیشت بۆ نوێژ، عومەر پیاوانی لە ڕیزەکەدا ڕێك دەکرد، هەر کە ڕێك بوون، هات الله اکبری کرد، وتی: ئەبو لۆلۆە هاتە نێو خەڵکەکە و خەنجەرێکی بە دەستەوە بوو کە دوو سەری هەبووە چەقەکەی لە ناوەڕاستەکەیدا بوو، شەش خەنجەری دا لە عومەر یەکێکیانی دا لە ژێر ناوکی،وە هەر ئەوەش بوو کە شەهیدی کرد،[١] وە هەندێ لە بیریارە نوێیەکان لەسەر ئەم ڕیوایەتەن کە ئاکامەکەی ئەمەیە کە: کەعبی ئەحبار هاوبەشی کردووە لە پیلانی شەهیدنی عومەر(ﷺ)هەروەك ئەوەی د.جەمیل عبدالله ئەلمیسری لە کتێبی: (أثر أهل الكتاب في الفتن والحروب الأهلية في القرن الاول الهجري) و عبدالوهاب النجار لە کتێبی: (الخلفاء الراشدون) و مامۆستاغازی محمد فریح لە کتێبی: (النشاط السري اليهودي في الفكر والممارسة)دا[٢] هێناویانە، دکتۆر ئەحمەدی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئیبراهیمی زوغەیبی لەسەر ئەو تۆمەتەی کە ئاراستەی کەعبی ئەحبار دێتە وەڵام و دەڵێت: ئەوەی کە من لەم چیرۆکە ئاڵۆزەدا دەیبینم: ئەو گێڕانەوەیەیە وە ئەوەی کە پێشەوا(الطبري) - ڕەحمەتی خوای لی بێت — ڕیوایەتی کردووە لەبەر زۆر شتێك دروست نیە لەوانە:

أ- ئەم چیرۆکە ئەگەر ڕاست بووایە ئەوەی، کە عومەر(ﷺ) چاوەڕوان دەکرا ئەوە بوو کە هەر بەم قسەیەی کەعبەوە نەدەوەستا، بەڵام لەبەر زۆری تیرەکە لەوانەی کە لە جوولەکەکان موسڵمان بوون وە چوارچێوەیەکی لە تەوراتەوە هەبووە وەك عبدالله ی کوڕی سەلام، پرسیاری ئەم چیرۆکەی لێ دەکردن، عومەر ئەگەر ئەم کارەی بکردایە ئەوا قسەی کەعب ئاشکرا دەبوو، درۆکردنەکەی بۆ خەڵکی بەدەردەکەوت، بۆ عومەر(ﷺ)یش دەردەکەوت کە ئەم هاوبەشی ئەو پیلانەیەکە داڕێژراوە بۆ کوشتنی، یان لێی بە ئاگا دەبوو، ئەو دەمە عومەر(ﷺ) کاری دەکرد لەسەر هەڵماڵینی بە جۆرەها شێواز وە هەڵسوڕێنەرانی سزا دەدا، و لەوانەش کەعب، ئەمەیە لە هەموو فەرمانڕەوایەك چاوەڕوان دەکرێت، لەگەڵ عومەر ناسراوە بە تەواوی و کەماڵ وژیری، و بە ڕاکردن بە شوێن ئەو هەواڵانەدا بەڵام شتێك لەم بابەتەوە هەرگیز ڕووی نەداوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ناتەبایی بووی.[٣]

ب-ئەم چیرۆکە ئەگەر لە تەوراتدا هەبووایە ئەوا تەنها کەعب — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — تیایدا شارەزا نەدەبوو، بەڵکو هەموو ئەوانە تیایدا بەشدار دەبوون کە زانیاریان دەربارەی تەورات هەیە وەك عبدالله ی کوڕی سەلام (ﷺ).[٤]

---

١ـ تأريخ الطبري (٢/١٨٢-١٨٣).
٢ـ العنصرية اليهودية وآثارها في المجتمع الاسلامي (٢/٥١٨-٥١٩).
٣ـ الحديث والمحثون، أو عناية الامة الاسلامية بالسنة، محمد أبو زهو (ص: ١٨٢).
٤ـ الحديث والمحثون، أو عناية الامة الاسلامية بالسنة، محمد أبو زهو (ص: ١٨٢).

ج- ئەگەر ئەم چیرۆکە ڕاست بێت مانای وایە کەعب دەستی لەم پیلانەدا هەیە و خۆی خۆی ئاشکرا دەکات ئەمەش لە بەرامبەر ناتەبایی سروشتی خەڵکی شتێکی ناڕەوایە و زانراویشە کە کەسێك بەشداری پلانێك دەکات، ئەوا پاش ڕوودانی زیاتر زیادەڕۆیی دەکات لە شاردنەوەیدا، ئەویش بە سوود وەرگرتن لە بەرگەگرتنی پاشکەوتەکان، پەردە لادان لەسەر کارێکی وەها پێش ڕوودانی لە کەسێکی گێلی بێ ئاگا نەبێت ناوەشێتەوە ئەمەش پێچەوانەی ئەو بارودۆخەیە کە کەعبی تێدا بوو، لە بیرتیژی.[1]

د- پاشان تەورات چی داوە لە دیاری کردنی تەمەنی خەڵکی؟ خوای گەورە کتێبەکانی خۆی دابەزاندووە بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵکی نەك بۆ ئەم جۆرە هەواڵانەی کە خاوەنەکانیان نایەنە هەژمار.[2]

هـ- هەروەها و دواتر ئەم تەوراتەی کە ئێستا لە نێو دەستی ئێمەدایە هیچ شتێکی بە ڕوونی لەو بارەیەوە تێدا نیە، پاش ئەوەی کە شێخ محمد محمد ئەبو زەهو[3] ئەم چوار ڕەخنەیەی پێشووی هێناوەتەوە، بە دواداچوونی بۆ دەکات بەم وتەیەی کە: لە هەموو ئەمانەوە، بۆت دەردەکەوێت کە ئەم چیرۆکە بە بێ هیچ گومان لێکردنێکەوە هەڵبەستراوە، تۆمەتبارکردنی کەعب بە پیلانێك لە دژی ئیسلام و لە کەسێکی وەك عومەر، درۆکردنیش لە گواستنەوەی دەقەکانی تەورات تۆمەتێکی ناڕەوایە، بە هیچ بەڵگە و بنەمایەك بەرگری لێ ناکرێت.[4]

دکتۆر (محمد السید حسین الذهبي) — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — دەڵێت: گێڕانەوەی إبن جورەیری (الطبري) بەڵگە نیە لەسەر دروستی چیرۆکەکە، لەبەر ئەوەی کە إبن جورەیری (الطبري) لە هەموو ئەو شتانەی کە گێڕاویەتیەوە پابەند نەبووە بە ڕاستی و دروستیانەوە، ئەوەی کە لە تەفسیرەکەیدا چاوەڕوانی لێ دەکرێت ئەوەیە کە شتانێکی تێدایەکە زۆر ڕاست نین،[5] وە ئەوەی کە لە تأریخەکەیدا گێڕاویەتیەوە بەوە نایەتە هەژمار کە لە پێش ئەو هاوەڵانەی کە وەری گرتووە ڕاست یان دروست بن، کەسێك تا ئێستا نەیبینیووە ئەوەی کە لە (کتب التأریخ)دا[6] گێڕاویەتیەوە ڕاست و دروستن،[7] پاشان درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: ئەوەی کە دەربارەی کەعبی ئەحبار دەزانرێت لەئاینی و ڕەفتاری و پارێزراوی و متمانەی زۆربەی یارانی سەرڕاست بۆی،[8] وامان لێ دەکات کە فەرمان بەوە بدەین کە ئەم چیرۆکە شتێکی هەڵبەستراوە لەسەری، ئێمە پاکی و پوختی کەعب ڕادەگەیەنین بەوەی کە هاوبەشێك بوو بێت لە کوژرانی عومەر، یان بە ئاگا بوو بێت لە کەسێك کە کاری کوشتنی عومەر بەجێ دێنێت و

---

١ـ الحديث والمحثون، أو عناية الامة الاسلامية بالسنة، محمد أبو زهو (ص: ١٨٢).
٢ـ العنصرية اليهودية وآثارها في المجتمع الاسلامي (٥٢٤/٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە.
٤ـ الحديث والمحثون، أو عناية الامة الاسلامية بالسنة، محمد أبو زهو (ص: ١٨٣).
٥ـ العنصرية اليهودية وآثارها في المجتمع الاسلامي (٥٢٥/٢).
٦ـ العنصرية اليهودية وآثارها في المجتمع الاسلامي (٥٢٥/٢).
٧ـ الاسرائيليات في التفسير والحديث (ص: ٩٩).
٨ـ الاسرائيليات في التفسير والحديث (ص: ٩٦).

پاشان ئەم کارە بۆ عومەر ئاشکرا ناکات، هەروەها پوختی کەعب لەوە ڕادەگەیەنین کە ئەو کەسێکی درۆزن و ناکەس بێت، چاوبەستی بکات لەسەر جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە هەواڵی کوژرانی عومەر دەدات بە نیسبەت تەوراتەوە، لە بۆنەیەکی ئیسرائیلیدا دایرێژێتەوە،[1] هەتا دەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێت: خوای گەورەا کەعب ستەم لێکراوە لە تاوانبارانیەوە وە من سەبارەت بەو هیچ نالێم: چەند ڕیوایەتێکی داوەتە پاڵ کە زۆربەیان پڕوپوچی و شتی نارەوان، بۆ ئەوەی بەمە لە لای خەڵکی بەها پەیدا بکات، و هەتا ناکردەکانیش لە نەفامی خۆیان ئەمە پەسەند بکەن.[2]

بەڵام دکتۆر محمد السيد الوكيل دەڵێت: یەکەمین شتێك کە ڕووبەڕووی ئەم توێژەرە دەبێتەوە هەڵویستی عوبەیدالله ی کوڕی عومەرە کە ئەوەندە نەمابوو گوێ بۆ ئەو ڕووداوە بگرێت کە لە باوکی ڕوویداوە تا شمشێرەکەی هەڵگرت و وەك دڕندەیەك بۆ شەڕ چاوی چوو بە قوڵدا، هەریەکە لە هورمزان و جوفینە و کچە بچووکەکەی ئەبو لۆلۆە دەکوژێت، دەی ئایا تۆ ئەوە دەبینی کە عوبەیدالله واز لە کەعبی ئەحبار بهێنێت لە کاتێکدا کە گومان دەوری داوە، و کچی بچووکی ئەبو لۆلۆە دەکوژێت؟ کەسێك بابەتێکی بە شێوەیەکی زانستیانە تاوتوێ بکات ناکرێك ئەم شتە پەسەند بکات، لە سەرووی ئەمەشەوە جمهوری مێژوونووسان نەك هەر باسی ئەم چیرۆکەیان نەکردووە، بەڵکو ئاماژەشیان پێ نەکردووە، پاشان إبن سعد لە کتێبی (الطبقات) زۆر بە وردی ئەم بابەتەی باس کردووە و هەرگیز ئاماژەی بەم ڕووداوە نەکردووە، بەڵکو ئەوەی کە باسی لێوە دەکرێت سەبارەت بە کەعی ئەحبارئەوە بووە کە لەبەر دەرگای ماڵی عومەر وەستاوە و گریاوە و فەرموویەتی: سوێند بە خوا ئەگەر ئەمیری باوەڕداران سوێندی لەسەر خوا بخواردایە کە مەرگی دوا بخات ئەوا دوای دەخست،[3] پاشان دوای ئەوەی کە پزیشك هەواڵی نزیك بوونەوەی مەرگی عومەری داوەتێ چۆتە ژورەوە و فەرموویەتی: ئایا من پێم نەوتی کە تۆ بە شەهیدی نەبێت نامریت، تۆش دەتفەرموو: لە کوێوە لە کاتێدا من لە دوورگەی عەرەبم[4] پاشان إبن سعدی کوڕی عبدالبر لە کتێبی (الاستيعاب) ئەم باسە دێنێ و بە هیچ شێوەیەك باسی کەعبی ئەحباری ناکات،[5] إبن كثير دەفەرموێت: بەڕاستی ژوانی ئەبو لۆلۆة سەر لە ئێوارەی ڕۆژی سێ شەممە بوو، ئەو لە بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە شەهید کرا، کە چوار ڕۆژی مانگی ذي الحجة مابوو،[6] مۆڵەت لەنێوان هەرەشە و ڕاپەڕاندندا جگە لە چەند کاتژمێرێکی دیاری کراودا هیچی تر نەبوو، ئەی چۆن کەعبی ئەحبار چوو بۆ لای عومەر و ئەوەی پێ وت کە فەرمووی: من بەڵێنت پێ دەدەم لە ماوەی سێ ڕۆژی تردا تۆ مردووی، پاشان دەفەرموێت: ڕۆژێك تێپەڕی و دوو ڕۆژی ماوە

---

١ـ الاسرائيليات في التفسير والحديث (ص: ٩٩).
٢ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٩٩).
٣ـ الطبقات (٣/٣٦١).
٤ـ هەمان سەرچاوە (٣/٣٤٠).
٥ـ جولة تأريخية في عصر الخلفاء الراشدين محمد السيد الوكيل (ص: ٢٩٦).
٦ـ البداية والنهاية (٧/١٣٧).

پاشان دوو ڕۆژ تێپەڕی و شەو و ڕۆژێك ماوەتەوە، کەعب ئەم سێ ڕۆژەی لە کوێوە هێنا ئەگەر هەڕەشەکە لە شەو و ڕاپەڕاندنی کارەکە لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بووە؟ پاشان مێژوونووسانی تر دێن، سیوطی لەکتێبی (تأريخ الخلفاء) و عاصمی لەکتێبی (صمط النجوم العوالي) وە شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب، عبدالله ی کوڕی لە کتێبەکەیاندا (مختصر سيرة الرسول) وە حسن ئیبراهیم حسن لە کتێبی (تأريخ الاسلام السياسي) و کەسانی تریش کە باس لەم چیرۆکە بکات چ لە دوور و چ لە نزیکەوە، ئەی ئایا ئەمە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە ئەم چیرۆکە بە شێوەیەك نەچەسپاوە کە وا بکات لە توێژەر دڵنیا بێت لە باسکردنی ئەمە ئەگەر هەڵگری کەسێکی تری دروستکراو نەبێت خەریك بووە پێی کە هەندێ کەس لە موسڵمانان لە کەعب ڕاپەڕن، ئەمەش هەر ئەوەیە کە دەروون بۆ لای دڵنیا دەبێت و دڵیش ئارەزووی بەرەو پیری چوونی دەکات، بە تایبەتی پاش ئەوەی کە زانیمان بە چاکی ئیسلامی وەرگرتووە و شوێنی متمانەی زۆرێك لە هاوەڵان بووە و تەنانەت لە ئەوەوە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)یان گێڕاوەتەوە.[1]

## ٧- پیاهەڵدانی هاوەڵان و سەلەف بەسەر فاروقدا:

### أ- قەدرو ڕێزگرتنی عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت) بۆی پاش بەخاك سپاردنی:

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: من لەوماڵەمدا بووم کە گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)و باوکمی تێدا بوو، کاتێك کە عومەر(ﷺ) لەگەڵیان بە خاك سپێردرا سوێند بە خوا وەك شەرمێك ئەگەر بە تەواوی خۆم پۆشتە نەکردایەتەوە نەدەچوومە ئەو ژوورەوە،[2] قاسمی کوڕی محمد لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) هێناویەتی کە دەفەرموێت: هەر کوڕی خەتابی دیبێت، زانیویەتی کە ئەو بێ نیازیەکی بۆ ئیسلام خولقاندووە، سوێند بە خوا ئەو کەسێکی وابوو کە بە باشی دەچوو بە دەم کارەکانەو، چنراوێکی تەنها بوو، بۆ هەر کارێك وەچەکانی ئامادە دەکرد،[3] عەروە لە عائیشەوە هێناویەتی، کە دەفەرموێت: ئەگەر باسی عومەرتان کرد ئەوا دانیشتنەکەمان خۆش دەبێت.[4]

### ب- سەعیدی کوڕی زەید (ﷺ):

لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە کە لە کاتی مردنی عومەردا گریاوە پێیان وتووە: بۆچی دەگریێت؟ فەرمووی: بۆ ئیسلام، بە ڕاستی مردنی عومەر کەلێنێکی وای کردە ئیسلامەوە کە تا ڕۆژی دوایی ناچنرێتەوە.[5]

---

١ـ جولة تأريخية في عصر الخلفاء الراشدين محمد السيد الوكيل (ص: ٢٩٦).
٢ـ محض الصواب (٨٥٢/٣).
٣ـ محض الصواب (٨٥٣/٣) رجاله كلهم ثقات إلا عبدالواحد بن أبي عوف صدوق يخطيء.
٤ـ هەمان سەرچاوە (٨٥٣/٣) نقلا عن مناقب أمير المؤمنين (ص: ٢٤٩).
٥ـ الطبقات (٣٧٢/٣) أنساء الاشراف الشيخان (ص: ٣٨٧).

ت- عبدالله کوڕی مەسعود (ﷺ):

عبدالله ی کوڕی مەسعود(ﷺ) دەفەرمووێت: ئەگەر زانست و زانیاری عومەر بخەینە تای تەرازوویەك و زانیاری و زانستی تەواوی خەڵکی بکەینە تاکەی تریەوە ئەوا زانیاری عومەر براوە دەبێت،[1] هەروەها دەفەرمووێت: من پێم وایە عومەر لە دە بەش نۆ بەشی زانیاری سەر زەوی لەگەڵ خۆی برد،[2] عبدالله ی کوڕی مەسعود دەفەرمووێت: موسڵمان بوونی عومەر ڕزگاریەك بوو وە کۆچی سەرکەوتنێك و ئەمیرایەتی کردنەکەشی میهرەبانیەك بوو.[3]

پ- ئەبو طلحە ی ئەنصاری دەفەرمووێت:

سوێند بە خواماڵێك نیە لە ماڵی موسوڵمانان، کە مردنی عومەری تێ چوو بێت و ڕووبەڕووی کەم و کورتی نەبوبێتەوە لە ئاییني و لە دونیای.[4]

ج- حوزەیفەی کوڕی یەمان دەفەرمووێت:

بەڕاستی نمونەیی ئیسلامی ڕۆژانی عومەر بە وێنەی داهاتویەك وایە کە بەردەوام لە ڕوو تێکردندایە، کاتێك کە کوژرا پشتی هەڵکرد و بەردەوام لە پشت هەڵکردندایە.[5]

ح- عبدالله ی کوڕی سەلام:

پاش ئەوەی کە نوێژ لەسەر عومەر(ﷺ) کرا، عبدالله کوڕی سەلام(ﷺ) هات و فەرمووی: ئەگەر ئێوە بە نوێژ کردن لەسەری پێشم کەوتن، بەڵام بە پیاهەڵدانیدا پێشم ناکەون، پاشان فەرمووی: باشترین برای ئیسلام بوونی ئەی عومەر، بەخشندە بوی بە ڕەوا، و ڕژد بووی بەرامبەر ناڕەوا، لە خۆش نوودی قایل و لە تووڕەیی بێزار بوویت، خاوەن بۆنێکی خۆش، بە ڕەوشت و داوێن پاك بوویت.[6]

خ- عەباسی کوڕی عبدالمطلب:

عەباسی کوڕی عبدالمطلب دەفەرمووێت: من دراوسێی عومەر(ﷺ) بووم لە نێو خەڵکیدا کەسێکم نەبینی کە باشتر بێت لە عومەر، شەو هەر نوێژ، ڕۆژی هەر ڕۆژوو، بە دەم پێویستی خەڵکەوە بوو، کاتێك کە کۆچی دوایی کرد لە خوای گەورە پاڕامەوە کە: خەوی پێوە ببینم پاشان لە خەومدا بینیم کە بە خۆشحاڵیەوە لە بازاڕی مەدینە بەرەو ڕووم دەهات، پاشتر سڵاوم لێکرد و ئەویش سڵاوی لێ

---

١ـ منصف بن أبي شيبه (٣٢/١٢) إسناده صحيح.
٢ـ المعجم الكبير للطبراني (١٧٩/٩-١٨٠) وإسناده صحيح.
٣ـ المعجم الكبير للطبراني (١٧٨/٩) إسناده ضعيف فيه إنقطاع.
٤ـ الطبقات (٣٧٤/٣).
٥ـ الطبقات (٣٧٣/٣) وإسناده صحيح.
٦ـ الطبقات (٣٦٩/٣).

کردم، دواتر پێم وت: تۆ چۆنی؟ فەرمووی: زۆر باشم، وتم: چیت دێتەوە؟ فەرمووی: ئێستاکە لە کار و بارەکانم بوومەوە، ئەگەر خوای گەورەی بەخشندەم نەبینیایەوە عەرشەکەم خەریك بوو دەکەوت.[١]

### د- موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان:

موعاویە دەفەرموێت: ئەبو بەکر دونیا نەویست بوو دونیاش ئەوی نەویست، بەڵام عومەر دونیا دەیویست بەڵام خۆی دونیا نەویست بوو، کەچی ئێمە بە بەروپشتەوە تیایدا نەزان بووین.[٢]

### ذ- عەلی کوڕی حوسەین:

إبن أبی حازم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە: پرسیاریان کرد لە عەلی کوڕی حوسەین دەربارەی ئەبو بەکرو عومەر (خوایان لیێ ڕازی بێت) و نزیکیان لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرمووی: وەك نزیکی ئەمڕۆیان وایە، کە لە لای ڕاکشاون.[٣]

### ر- قەبیسەی کوڕی جابر:

شەعبی دەفەرموێت: گوێم لە قەبیسەی کوڕی جابر بوو دەیفەرموو:هاوەڵی عومەرم (ﷺ) کردووە کەسێکم نەدیووە لەو زیاتر کە خوێنەری قورئان و تێگەیشتووتر لە ئاینی خودا و باشتر بێت لە تاوتوێ کردنیدا.[٤]

### ز- حەسەنی بەسری:

ئەگەر ویستتان کۆڕ و کۆبوونەوەتان خۆش بێت ئەوا بە زۆری باسی عومەری تێدا بکەن،[٥] هەروەها فەرموویەتی: هەر ماڵێك هەستیان بە لەدەستدانی عومەر نەکرێت ئەوا ماڵێکی خراپن.[٦]

### س- عەلی کوڕی عبداللە کوڕی عەباس دەفەرموێت:

لە ڕۆژێکی زۆر سارددا چووم بۆ لای عبدالملك کوری مەروان کە لە نێو گومەزیەکی ناوسپی زەردباو، و ڕووکارەکەشی (خزاعیز) بوو،[٧] بە دەوریدا چوار کورە هەبوون، فەرمووی: کە سەرمای لە شەولگەمدا بینیووە،[٨] پاشان فەرمووی: جگە لە سەرما هیچ گومانێك بۆ ئەم ڕۆژەمان نابەم، منیش

---

١ـ تأريخ المدينة (٣/٣٤٥) فيه إنقطاع، الحلية (١/٥٤).
٢ـ تأريخ الاسلام عهد الخلفاء الراشدين للذهبي (ص: ٢٦٧).
٣ـ محض الصواب (٣/٩٠٨).
٤ـ المعرفة والتأريخ للقسوي (١/٤٥٧) في إسناده محي الدين سعيد تغير اخر عمره.
٥ـ مناقب أمير المؤمنين لإبن الجوزي (ص: ٢٥١)، محض الصواب (٣/٩٠٩).
٦ـ الطبقات (٣/٣٧٢).
٧ـ محض الصواب (٣/٩١١).
٨ـ القاموس (ص: ١٠٩٤).

وتم: خوای گەورە چاك بۆ ئەمیر بکات خەڵکی شام گومانیان وایە کە لەمە ڕۆژی ساردتریان نەدیووە، باسی دونیای کرد و زەمی کرد، و کاری لێکرد و فەرمووی: ئەوە موعاویەیە کە چل ساڵ (٢٠) ئەمیر،(٢٠) خەلیفە ژیاوە وە چاکەی إبن حەنتەمە— واتا عومەر(ﷺ) بۆ خودایە کە کەسێك شارەزاتر لە دونیا نەبووە.[١]

٨- ڕای هەندێ لە زانایان و نوسەرانی هاوچەرخ:

أ- دکتۆر محمد محمد ئەلفەحامی شێخی پێشووی ئەزهەر دەفەرموویێت: کارەکانی عومەر لە پێشکەوتنی سیاسیدا دەرکەوت، ئەو بەهەر ژمێردراوانەی کە خاوەنیان بوو لە بلیمەتیە نەمریەکەیدا دەردەکەوێت کە هەتا ئێستاش ڕێگەی بەردەمان ڕووناك دەکاتەوە لە چارەسەری زۆرێك لە گرفتە جۆربەجۆرەکان و ئەو کێشە و گرفتانەی کە عومەر لە کاتی خەلافەتەکەیدا ڕووبەڕووی بۆتەوە.[٢]

ب- عەباس مەحموود عەقاد دەفەرموویێت: ئەم پیاوە گەورەی لەو پیاوە گەورانەی کە من ناسیومە و دژوارە کە ڕەخنەی لێ بگیرێت و سەرزەنشت بکرێت وە لە زۆرتری هونەرمەندیەکانی ئەوە بوو کە لە لوتکەی بڕار کردن و لە لوتکەی سەرسامیدا بوو لە فەرمان بۆی یان لەسەری پێك دەگەیشتن، کتێبەکەم بە ناونیشانی (عبقرية عمر)، کە بە دەستپێکردنی ژیانێکە بۆ عومەر و نە بە مێژویەکە بۆ سەردەمەکەی لەسەر شێوازی ئەو مێژووانەی کە مەبەست پێی ڕووداو و هەواڵەکانە، بەڵام پێناسەیەکە بۆی و تاوتوێ کردن و بە دواداچوونێکە بۆ گەشەسەندووەکانی، بەڵگەیە لەسەر تایبەتمەندی گەورەیی و سوود وەرگرتن لەو تایبەتمەندیە بۆ زانستی دەروونزانی و زانستی ڕەوشتی و ڕاستیەکانی ژیان،... عومەر بە پیاوێکی شیاوی ئامادە دێتە هەژمار بۆ ئەم سەدەیەی کە ئێستا ئێمەی تێداین، لەبەر ئەوەی ئەو سەردەمەی کە بەندە بەهێزە ملهوڕەکان تیایدا ژیاون وە دوورە نەوەکان بە ئاینەکەی بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە هێز و دەسەڵات و ڕەوایی دوو کاری جیاواز بوون، ئەگەر تێگەیشتنمان تەنها گەورەیەك بێت وەك عومەری کوڕی خەتاب ئەوا ئاینی هێزە ملهوڕەکانمان لە بنەڕەتەوە وێران کردووە لەبەر ئەوەی کە ئێمە پیاوێك دەگەین لە لوتکەی هێز و دەسەڵات، و لە لوتکەی دادپەروەری، و لە لوتکەی بەخشندەییدا... وە ئەم تێگەیشتنەش بادەی چارەسەری سەردەمە شیفای کەسێکی پێ دەدرێت کە لە شیفا بێ ئومێد نیە.[٣]

ت- دکتۆر أحمد شەلەبی دەفەرموویێت:... هەوڵدان لە دیارترین کاری لایەنەکان بووە لە ژیانی عومەردا لە میانی سات و دەمی خەلافەتیدا کە پڕ و لێوان لێو بووە لە ڕووداوەکان، عومەر توانی ئاین بپارێزێت وە بەیداخی جیهاد بەرز بکاتەوە و چەندین وڵات ڕزگار بکات و لە نێو بەندەکاندا

---

١ـ محض الصواب (٩١١/٣)، إبن الجوزي (ص: ٢٥٢).
٢ـ الادارة في الاسلام في عهد عمر بن الخطاب (ص: ٣٩١).
٣ـ هەمان سەرچاوە (ص: ٣٩٢).

دادپەروەری بڵاو بکاتەوە، و یەکەمین وەزارەتی دارایی لە نێو ئیسلامدا دامەزراند، سوپایەکی ڕێك و پێکی پێك هێنا بۆ بەرگری و پاراستنی سنورەکان، مووچە و کۆبۆنی ڕێك خست، و چەندین دیوانی دامەزراند، و ژمارەیەك والی و کاربەدەست و دادوەری دامەزراند، دراوی دیاری کرد بۆ ئاڵوگۆڕی ژیانی و کاری پۆستەی ڕێك خست، و ڕژێمی ژماردنی دانا، و مێژووی کۆچی جێگیر کرد، و زەویە ڕزگارکراوەکانی بەبێ دابەشکردن هێشتەوە و نەخشەی بۆ شارە ئیسلامیەکان دارشت و بنیاتی نان، ئەو بەڕاستی ئەمیری باوەڕداران و بنیاتنەری دەوڵەتی ئیسلامی بوو.[١]

ث- ڕاوێژکار عەلی مەنسور دەڵێت: بەڕاستی پەیامی عومەر لە بارەی دادوەری یەوە بۆ ئەبو موسای ئەشعەری پێش چواردە سەدە لەمەوبەر لە سەردەمی دەستوردا بۆ دادوەر و داد پێکراوان، بریتیە لە تەواو ترینی ئەو پەیامانەی کە یاساکانی دادخوازی کاتی و یاساکانی سەربەخۆی داد پێی گەیشتووە.[٢]

ج- سەرلەشکر مەحمود شیت خەتاب دەڵێت: ئەگەر هۆکارەکانی ئازادیخوازی ئیسلامی زۆر بووبن، ئەوا لە سەروی ئەو هۆکارانەوە تاکە شتێك کە هەبوو بێت عومەر چێژی پێ وەرگرتبێت لە ڕەفتارە سەرکردایەتی یە شازەکانی بووە کە ئەم سیفەتە بە درێژایی ساڵ و سەدەکان مەگەر بە دەگمەن ئەگینا لە کەسانی تردا دووبارە نابێتەوە.[٣]

ح- دکتۆر صبحي المحصاني دەڵێت: بە کۆتایی هاتنی سەردەمی خەلیفە عومەری خەلیفەی ڕاشیدی، سەردەمی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسلامی کە سنورەکەی بەرفراوان، و هۆکارەکانی چەسپا بون کۆتایی هات، بەڕاستی عومەر نمونەی سەرکردەی ئاراستەکار، و ئەمیری دوربین و دانا،و دادوەرێکی بەهێز و دادپەروەر و هاوڕێیەکی بەسۆز بوو، پاشان وەك قوربانیەکی پێویست، و شەهیدێکی ڕاست و چاکساز مرد، عومەر (ﷺ) بەڕاستی لەگەڵ ڕاستگۆیان و چاکە خوازان و دۆستانی خودا دەبێت و ناوی عومەر بە نەمری و ڕەونەق داری لە مێژووی شارستانیەت و تێگەیشتندا دەمێنێتەوە.[٤]

خ- شێخ عەلی طنطاوي: من هەر کات زۆرتر هەواڵی عومەر بەسەر دەکەمەوە زۆرتر گەورەیی و سەرسامیم بە عومەر زیاتر دەکات، من ژیانی هەزاران کەس لە گەورەی موسڵمانان و ناموسڵمانانم خوێندۆتەوە، لە نێویاندا ئەوەم بەدی کردووە، کە کێ خاوەن بیری گەورە، و کێ خاوەنی پەیامی گەورەیە، کێ خاوەنی ڕەفتاری گەورە و کێ گەورەیە بە خۆنەویستی، من عومەرم بینیووە کە لە دەوری خۆی ئەم گەورەییانەی کۆکردۆتەوە، بە ڕاستی عومەر خاوەن بیر و ڕەفتار و پەیامی گەورەیە، ئەگەر گەورە تێگەیشتوان و زانایانم هەژمار بکردایە، ئەوا عومەرم لە پێشەنگدا دادەنا، ئەگەر ئەو لە

---

١ـ الادارة في الاسلام في عهد عمر بن الخطاب (ص: ٣٩٢)، التأريخ الاسلامي (٦٠٩/١).
٢ـ الادارة في الاسلام في عهد عمر بن الخطاب ص: ٣٩٢).
٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٣٩٣).
٤ـ تراث الخلفاء الراشدين في الفقه والقضاء (ص: ٤٦-٤٧).

تێگەشتنی خۆی بەدەر هیچی تری نەبوایە ئەوا پێی گەورە دەبوو، ئەگەر وتاربێژان و ڕەوانبیژانم بژماردایە، ئەوا ناوی عومەر لەسەرووی هەموو ناوەکانەوە دەبوو، ئەگەر باسی بلیمەتە ئاوگەکانم بکردایە یان باسی سەرکردە سەربازیە هەڵکەتووەکانم بکردایە، یان باسی گەورە بەڕێوەبەرە سەرکەوتووەکانم بکردایە ئەوا عومەرم لە پێشەوایەتی هەموو ئەم گروهانە، و گەورە لەم هەموو هۆزانە دەدیتەوە وە ئەگەر ئەو پیاوە گەورانەم سەقامگیر بکردایە کە بینای دەوڵەتیان ناوە، و لەسەر زەویدا شوێنەوارێکیان بەجێ هێشتووە، ڕەنگ نەبوو کە لە نێویاندا لە عومەر شکۆمەنددارتر هەبێت، ئەو لەسەرووی ئەمەوە گەورە لە ڕەوشتی و گەورە لە ناخیدا بوو.[1]

٩- ڕای هەندێك لە ڕۆژهەلات ناسان سەبارەت بە عومەر (ﷺ):

أ- موریر لە کتێبەکەیدا (الخلافة) دەڵێت: ئاسانکاری و هەستان بە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان لە گرنگترین بیر و ڕاکانی عومەر بوون ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئیدارەکەی بە نەبوونی هەڤاڵداری و ڕووکردنە خودا وە عومەر بەرپرسیارێتی بە شێوەیەکی ڕەوا هەڵدەسەنگاند وە هەستی بە دادپەروەری زۆر بەهێز بووە و لە هەڵبژاردنی کاربەدەستەکانیدا لایەنگری بۆ هیچ کەسێك نەکردوە، لەگەڵ ئەوەشدا گۆچانەکەی هەڵدەگرت و ئەشکەنجەی تاوانبارانی دەدا لە کاتی خۆیدا تەنانەت دەڵێن: قامچیەکەی عومەر و تیژتر و بڕندەتر بووە لە شمشێری کەسانی تر جگە لەوەش کەسێکی دڵنەرم بووە و چەندین کاریشی هەیە کە لە هەگبەی بەزەیی هاتنەوەیدا تۆکار کراون، لەوانەش بەزەیی هاتنەوەی بەهەتیوان و بێوەژناندا.[2]

ب-دائیرەتولمەعاریفی بەریتانی دەربارەی عومەر دەڵێت: بە ڕاستی عومەر فەرمانڕەوایەکی ژیر، و دووربین بووە و کارێکی گەورەی بۆ ئیسلام کردووە.[3]

ج- مامۆستا واشنگتۆن ئیرفنگ لە کتێبەکەیدا (محمد وخلفاؤه) دەڵێت: ژیانی عومەر لە سەرەتاییەوە تا کۆتایی بەلگەن لەسەر ئەوەی کە عومەر پیاوێکی خاوەن بەهرەی ژیری گەورە بووە، زۆر جێگیر بوون و دادپەروەری بە هەند گرتووە، هەر ئەو بوو بنەمای دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراندووەو ئارەزوو و خواستەکانی پێغەمبەر(ﷺ)ی بەجێ هێناوە و دایمەزراندوون وە بە ئامۆژگاریەکانی کۆمەکی ئەبو بەکری لە ماوەی کورتی خەلافەتیدا کردووە، چەندین ڕێسای بتەوی داناوە بۆ بەڕێوەبەرێتیە دووربینیەکەی لە تەواوی ئەو وڵاتانەی کە موسڵمانان ڕزگاریان کردوون، ئەو دەستە بەهێزانەی کە لەسەر گەورەترین سەرکردە خۆشەویستەکانی داینا لە لایەن سوپاوە لە وڵاتە دوورەکاندا، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر لێهاتوویی بڕندەی بۆ بەڕێوەبردنی حوکم، عومەر بە ساتایی ڕەوشتی و ڕق لێ بوونەوەی بۆ جوانی و خۆشگوزەرانی، پابەند بووە بە پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو

---

١ـ أخبار عمر (ص: ٥).

٢ـ الفاروق عمر بن الخطاب، محمد رشيد رضا (ص: ٥٤-٥٥).

٣ـ هەمان سەرچاوە. (ص: ٥٥).

بەکرەوە(رضي الله عنه)وە لە کتێبەکانی ئامۆژگاریەکانی بۆ سەرکردەکان لەسەر شوێن پێی ئەوان ڕێی کردووە.[١]

٩- دکتۆر مایکل هارت دەڵێت: کاروبارە باش و پەسەندکراوەکانی عومەر بە ڕاستی کارگەلێکی باش و پەسەنکراو بوون، بە ڕاستی کەسایەتی سەرەکی بووە لە پاش پێغەمبەر(ﷺ) لە بواری پەرەسەندنی ئیسلام،[٢] بەبێ ئەو جەنگە ڕزگاریخوازەخێرایانەی جێگەی گومان بوو کە ئیسلام بەو شێوەیەی ئێستای بلاو ببێتەوە، لە سەروی ئەوەشەوە زۆربەی ئەو زەویانەی کە لە سەردەمی ئەودا ڕزگار کران هەر بە عەرەبی مانەوە،[٣] هەر لەو سەردەمەوە هەتا ئێستاش، ڕوون و ئاشکرایە کە محمد(ﷺ) کارزانیەکی گەورەی هەیە لەم مەیدانەدا، بەڵام یەکێك لە هەڵە زەقەکان ئەوەیە کە ڕۆڵی عومەر و سەرکردایەتیە تێگەیشتوانەکەی لە یاد بکەین.[٤]

١٠- ئەو هۆنراوانەی کە لە پیاهەڵدانی عومەر(رضي الله عنه) وتران:

عاتکەی کچی زەیدی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) دەفەرموویێت:

فجعني فيـــــروز لا درده ... بأبيض تالٍ للكتاب منيـب

رؤوف على الأدنى غليظ على العدا ... أخي ثقة في النائبات مجيـب

متى مالا يقل لا يكذب القول فعله ... سريع الى الخيرات غير قطوب[٥]

هەروەها دەفەرمووێت:

فجعتني المنون بالفـــارس ... المعلم يوم الهياج والتلبيـب[٦]

عضمة الفارس والمعين علـــى ... الدهر وغيث المنتاب والمحروب

قل لأهل السراء والبؤس موتـوا ... قد سقته المنون كأس شـعوب[٧]

بەم شێوەیەو بەکۆچی دوایی عومەر(رضي الله عنه)ی یەکێك لە خەلیفە دادپەروەرەکانی ڕاشیدی یەکێك لە کارزانترین و پوختترین لاپەڕەکانی مێژوو پێچرایەوە، کە مێژو تیایدا پیاوێکی شایستەی لە جۆری نایابەکان تێدا ناسی، ئەو بە پەرۆشی کۆکردنەوەی سەروەت و سامانەوە نەبوو، ئارەزوو و هەواداری نەخشی ڕەنگینی دەسەڵات نەبوو، بە هۆیەوە لە شەقامی ڕاستی و هەڵکوتانە سەر دەسەڵات لاینەداوە، خزم و دۆستانی و نەوەکانی نەکردۆتە باربەسەر شانی خەڵکەوە، بەڵکو هەموو پەرۆشی و

---

١ـ الفاروق عمر بن الخطاب، محمد رشيد رضا (ص: ٥٥).

٢ـ ڕەنگە مایکل هارد شارەزا نەبوویێت لە ژیانی ئەبو بەکر (رضي الله عنه).

٣ـ ئەو زەویانە کەوتنە نێو سنووری دەوڵەتی ئیسلامیەوە.

٤ـ هەروەها هەڵەیەکی گەورەیە کە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆڵی ئەبو بەکر و سەرکردایەتیە تێگەیشتوانەکەی لە یاد بکەین.

٥ـ المائة الاوائل ترجمة خالد عيسى واحمد سبانو (ص: ١٦٣).

٦ـ التلبيب: الاخذ بالصدر، كفاية عن إشتداد المعركة.

٧ـ تأريخ الطبري (٥/٢١٤)، الايام الاخيرة في حياة الخلفاء، د. إيلي منيف شهلة (ص: ٤٠).

خەم و خەفەتێکی سەرکەوتنیئاینی ئیسلام و گەورەترین هیواو ئامانجەکانی سەرکردایەتی شەریعەت و بەرزترین مەبەست و ئاواتیشتی دەستەبەر کردنی دادپەروەری نێوان تاکەکانی خەڵکەکەی بووە، هەموو ئەمانە بە پشتیوانی خوای گەورە لەو ماوە کورتەدا دەستەبەر بوون کە لە تەمەنی ولاتدا بەشتێکی باسکراو نایەتە هەژمار.[1]

بەڕاستی تاوتوێ کردنی ئەم ژیاننامە بۆنخۆشە نەوەکانی چین و توێژێك بەو سەرفرازیە عومەریانە هاوکاری دەکات، کە ڕەونەقی ڕۆژانی ڕابردووی قەشەنگ و ئاسوودەیی خۆشگوزەرانیەکەی بۆ ژیان دەگێڕێتەوە،ڕێنمایی تەواوی نەوە و چین و توێژەکان دەکات کە دواینەکانیان چاك نابن بە هەمان ئەو هۆکارانە نەبێت کە پێشینەکانیان پێی چاك بوون و ئەمەش هاوکاری بانگخوازان و زانایان دەکات بە پابەند بوون بەو سەردەمی ڕاشیدیەوە و ناسینی ئەرك و کارە گرنگ و سیفەت و بەرنامەکانی لە بەڕێکردنی دونیا خەڵکی و ئەمەش هاوکاری ڕۆڵەکانی میللەت دەکات لەسەر ڕۆڵی شارستانی سەر لەنوێوە.

من (عەلی محمد محمد الصلابی) لە ڕۆژی چوارشەممە کاتژمێر ٥. :٧ بە بەرواری(١٣)ی ڕەمەزانی ساڵی(١٤٢٢)ی کۆچی بەرامبەر(٢٨)ی تشرینی دووەمی ساڵی(٢٠٠١)ی زایینی لە نووسینی ئەم کتێبە و بە فەزڵی خوا و لە دوایەوە لێ بوومەوە، لە خوای گەورە داواکارم، کە ئەم کارەم لێ وەربگرێت و دڵی بەندەکانی بکاتەوە بۆ سوود لێ وەرگرتنی و پیرۆزی تێ بکات بە خەڵات و بەخشندەیی و ڕێز و چاوتێری خۆی هەروەك ئەوەی، کە دەفەرموێت: ﴿مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ (فاطر: ٢).

لەکۆتایی ئەم کتێبەدا هیچ بوارێکم نەماوەتەوە جگە لەوەی بە دڵێکی کزو گەردن کەچیەوە لەبەردەم خوای گەورەدا بوەستم و دان بەکارزانی و بەرێزی و بەخشندەیی و چاوتێریدا بنێم بەوەی کە ئەو خاوەنی ڕێزلێنان و پایە بەرزی و هەر ئەوە دانەرو بەختەوەرو سەرکەوتووە، سوپاس بۆ ئەو خودایەی لە سەرەتا و لە کۆتاوە کە ئەمەی کردە خەڵات، بەناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی داواکارم کە ئەم کارەم بە پوختی بۆ خۆی و بە سوودمەندی بۆ بەندەکانی لێ وەربگرێت وە پاداشتم بداتەوە لەسەر نووسینی هەموو پیتێکی و بیخاتە تەرازووی چاکەکانمەوەو پاداشتی تەواوی ئەو برایانەم بداتەوە کە هاریکاریان کردووم بە هەموو شێوەیەك لەسەر تەواوکردنی ئەم هەوڵی خۆیەکەم زانیە، داوا لە هەموو موسڵمانێك دەکەینکە ئەم پەرتووکە دەخوێنێتەوە ئێمەی بەندەی هەژاری لەیاد نەچێت لەکاتی داواکردنی لێخۆش بوون و لێبووردن و سۆزو بەزەیی و ڕەزامەندی خوای گەورە و لە

---

[1] ـ جولة تأريخية في عصر الخلفاء الراشدين محمد السيد الوكيل (ص: ٢٩٧).

دوعاکانیشیدا، خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾(المنل: ١٩).

پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایش بۆ تۆ ئەی خوای گەورەم، شایەبدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تۆوە من داوای لێبوردن و لێخۆش بوون و تەوبەت لێ دەکەم وە دوایین داخوازی و داواکاریمان سوپاسی خودای گەورەی جیهانیانە...

**هەژار و نەدار بۆ لێبوردن و لێخۆشبوون و ڕەزامەندی خودای گەورە**

**عەلی محمد الصلابی**

**١٣ ڕەمەزان ١٤٢٢ کۆچی**

